ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين)

ڕوونکردنەوەی

# منهاج الطالبين

للإمام النواوي

لە تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعي) رضي الله عنه

دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

دار المعرفة

بيروت - لبنان

# ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين)

## ڕوونکردنەوەی

# ﴿مِنْهَاجِ الطّالِبِين﴾

للإمام النواوي

له تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

له سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعی) رضي الله عنه

بەرگی یەکەم

دانانی

عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی

چاپی پوختەکراو

دانەر بەخۆی پێیدا چۆتەوەو چەند مەسەلەیەکی تێدا زیاد کردون

محرم (١٤٣٠)ی کۆچی

بەفرانبار (٢٧٠٨)ی کوردی

کانونی‌دووەم (٢٠٠٩)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (١٩٤) ساڵی (٢٠٠١)ز، له کتێبخانەی‌گشتی هەولێر، دراوەتێ

## ناسنامە:

**ناوی کیتاب: ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین).**

**بابەت: شەریعەتی ئیسلام.**

**دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.**

**نۆبەتی چاپ: دوایین چاپی پوختەکراو و زێدەکراو.**

**بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.**

**چاپخانە:** دار المعرفة بەیرووت

## شارەزاکردن:

### ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشیخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.
* رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.
* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. یان ڕوون کراوەتەوە. مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢ –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهیتمي).

٣ –(نهایةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤ –(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطیب الشربیني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ. ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

### ئەی قوتابیی خۆشەویستو ڕێزدار، تکایە:

١– پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.

٢– بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستای ئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

## ( پێشەکی ڕوونکەرەوە )

اَلْحَمْدُ لِلَّـهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغفِرُهُ وَنَعُوذُ بِه مِنْ شُرُورِ أَنْفُسنا، مَنْ يَهْدِاللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُه، اَللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِه كَما صَلَّيْتَ عَلى إِبْراهِيمَ وَعَلى آلِ إِبْراهِيمَ فِي الْعالَمِينَ، إِنَّكَ حَميدٌ مَجيدٌ.

ئەی موسڵمانی بەڕێز، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێ: ﴿وَما خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالانْس إلاّ لِيَعْبُدُونِ﴾ من جنۆکەو ئادەمیزادم بۆ هیچ دروست نەکردون، تەنها بۆ ئەوە نەبێ: تا بمپەرستن. واتە: تەنها من بە دادوەرو پەروەردەگاری خۆیان بناسن.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: واجبە گشت کاروبارێکی خواپەرستیو رامیاریو...هتد، بەگوێرەی ئەو یاسا پیرۆزە بێ: کە لە لای خوای گەورەو کارلەجێ بۆ پێغەمبەری ڕێزدارمان ﷺ هاتوەو ئەویش بە فەرمانی خوای گەورە بە ئێمەی ڕاگەیاندوە، کە ئەفەرموێ: ﴿ياأَيُّهَاالرَّسُولُ بَلِّغْ ما أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خەڵکی ڕابگەێنە: ئەو قورئانەی لە لای خوای خۆتەوە بۆت ناردراوەتە خوارەوە.

ئینجا هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمانی ڕاگەیاندنی پێکراوە، ئێمەش -ئۆممەتی ئەم پێغەمبەرە ﷺ- فەرمانی وەرگرتنمان پێکراوە، هەروەك خوا ئەفەرموێ: ﴿وَمَا آتاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾ هەر فەرمانێکی پێغەمبەر ﷺ دایە ئێوە، ئێوەش وەریبگرن، هەرشتێکی لێ‌قەدەغە کردن، مەیکەن.

جیاوازی نیە ئەم فەرمانو قەدەغەیە: واتەو ووشەی لە لای خوای‌گەورەوە هاتبێ: وەکو قورئانی‌پیرۆز، یان تەنها واتەی لە لای خواوە هاتبێو پێغەمبەر ﷺ ووشەکەی فەرمووبێ، وەکو حەدیس، هەروەك خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿وَما يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ الاّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ پێغەمبەر ﷺ بە هەواو هەوەس- لە کاروباری ئایین- هیچ ناڵێ، بەڵکو گشت فەرموودەیەکی ئایینی لە لای‌خواوە بە (وَحْي) بۆی هاتوە.

ئینجا کە بۆمان ئاشکرا بوو: سەرچاوەی ئایینی‌ئیسلام قورئانو حەدیسە، ئەبێ بزانین: بەکەڵکترین بەرهەمی قورئانو حەدیس- لە دوای یەکخواناسین- تێگەیشتنە لە (شەریعەتی‌ئیسلام)-کە پێی ئەگوترێ: (فِقْه)- هەروەکو پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: ﴿مَنْ يُرِدِاللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ﴾ رواه البخاري ومسلم، هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ چاکەی بداتێ، لە (شەریعەتی‌ئیسلام) تێی ئەگەێنێ.

بەڵێ، هەر بە تێگەیشتنی (شەریعەتی ئیسلام) مرۆڤ ئەزانێ خواو پێغەمبەرﷺ کام یاسایان داناوە بۆ خواپەرستی و مامەڵەکردن و میراتگرتن و ژن هێنان و تەڵاقدان و خێزانداری و سزای تاوانەکان و جەنگکردن و دادکردن و کێ شیاوی جێنشینی پێغەمبەرەﷺ بۆ چەسپاندنی ئەم یاسایە، چونکە ئەگەر ئەو کردارانە گشتی بەگوێرەی (شەریعەتی ئیسلام) نەبێ، خوای گەورە پێی ڕازی نابێ، هەروەك بەگەورەیی خۆی ئەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِيناً فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ هەر کەسێك جگە لە ئیسلام یاسایەکی تری بوێ، لێی وەرناگیرێو ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا لە زەرەرمەندەکانە.

ئینجا هەر بۆ ڕازیبوونی خوایگەورە، زانایانی ئیسلام- لە هەر چوار مەزهەبەکان- کتێبی جۆراوجۆرو بەنرخیان داناوە، بۆ شارەزاکردنی موسڵمانان لە (شەریعەتی ئیسلام)، خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە، آمین.

ئینجا یەکێك لە پوختەترین و بەکەڵکترین کتێبەکانی (شەریعەتی ئیسلام) لە مەزهەبی ئیمامی (شافعی)دا کتێبی (مِنْهاج الطّالِبِين)ە، کە زانای دونیا ناویستی بە ناوبانگ: ئیمامی (النواوی) دایناوە، خوا پاداشتی چاکەی بداتەوەو بە بەهەشتی شاد بکا، آمین.

جا بە نرخی (مِنْهاج الطّالِبِين) لە وەدایە: کە ئیمامی(النواوی) لە کتێبی (اَلْمُحَرَّر)ی دانراوی ئیمامی(الرافعي)ی کورت کردۆتەوە، ئەم ئیمامەش (الْمُحَرَّر)ی لە کتێبی (اَلْوَجِين) کورت کردۆتەوە، (اَلْوَجِين)ش لە کتێبی(اَلْوَسِيط)و ئەمەش لە کتێبی(اَلْبَسِيط) کورت کراوەتەوە-کە هەر سێکیان دانراوی ئیمامی(اَلْغَزالي)ن- (اَلْبَسِيط)ش لە کتێبی (النِّهايَة)ی دانراوی (إمام الْحَرَمَيْن) کورت کراوەتەوە-کە شەرحی (مُخْتَصَرالْمُزَنِي)یە- ئەمەشیان لە کتێبی (اَلأُمّ)ی دانراوی ئیمامی(الشافعي) کورت کراوەتەوە، هەروەك لە (بُجَيْرِمِي)دا وەهای فەرمووە.

جا زنجیرەی زانستی ئیمامی(الشافعی)ش لە ڕێگەی (ابن عباس)رضي الله عنهما دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، هەروەك لە پێناسەکەیدا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

جا لە بەر ئەوە، منیش بەندەی پێویست بە ڕەحمەتی خوای گەورە: (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی)-غفرالله لي ولوالديّ- بۆ ڕازیبوونی خوایگەورە، ویستم خزمەتێك پێشکەش بە گەلی کوردی موسڵمان بکەم، تاکو نەختێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا بن، ناوی خوام هێناو دەستم کرد بە ڕوونکردنەوەی ئەم (منهاج الطالبين)ە بە سودەی ئیمامی(النواوی)، بە زمانی کوردیو، ناوم لە ڕوونکردنەوەکەم نا:

**﴿ ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين) ڕوونکردنەوەی (مِنْهاج الطّالِبِين)﴾.**

له خوای گەورە ئەپاڕێمەوەو ئەڵێم: خوایە یارمەتیم بدە بۆ تەواوکردنیو بیکە بە دانراوێکی بە سودو ڕۆشنکەرەوە، آمین.

ئینجا بۆ ئەم ڕوونکردنەوەیە -إن شاء الله تعالى- سود لەم سەرچاوانە وەردەگرم:

١- (اَلْمَجْمُوع: شَرْح الْمُهَذَّب) دانراوی (الأمام النواوی)، مطبعة التضامن الاخوی، تادەگاتە سەرەتای (رِبا)، لەویَ بەو لاوە تەنها (اَلْمُهَذَّب) سەرچاوەیە.

٢- (تُحْفَةالْمُحْتاج: شَرْح الْمِنْهاج) دانراوی ئیمام (ابن حَجَرالْهَيْتَمی)، هەروەها هەردوو (حاشية)ی (ابن قاسم)و (الشروانی): کە لەگەڵیدا چاپ کراون.

٣- (مُغْنیالْمُحْتاج: شَرْح الْمِنْهاج) دانراوی ئیمام (محمدالخطیب الشربینی) .

٤- (نِهايَـةالْمُحْتاج: شَرْح الْمِنهاج) دانراوی ئیمام (محمدالرملي)، هەروەها هەردوو (حاشية)ی (عَلِي الشُبْرامَلْسِی)و (الرشيدی): کە لەگەڵیدا چاپ کراون.

ئینجا هەر کاتێك مەسەلەیەك لە هەر چواریان بهێنم، دەڵێم: (هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەوهایە).

بەڵام ئەگەر لە هەرچواریان نەیهێنم، بەڵکو لە زۆریەیان بیهێنم، دەڵێم: (هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا ئەوهایە). ئەگەر نا: ناوی سەرچاوەکە دەڵێم.

هەروەها: جگە لە وانەش چەند سەرچاوەیەکیتریش هەنە: لە شوێنیخۆیاندا ناویان دەهێنم، ان شاء الله تعالى.

هەروەها هەر کاتێك لە دوای حەدیسی پێغەمبەرﷺ گوتم: (رواه الشیخان). مەبەستم ئیمامی(البخاري)و ئیمامی(مسلم)ن، وە ئەگەر گوتم: (رواه اصحاب السنن). مەبەستم ئیمام (ابوداود)و ئیمامی(النسائي)و ئیمامی(الترمذی)ن.

ئیتر ئەی موسڵمانی بەڕێز، هەر کاتێك لەم ڕوونکردنەوەیەدا گومانێکت لێپەیدا بوو، بگەڕێوە بۆ ئەو سەرچاوانەی ناوم هێناون، تاکو دڵنیاببیو گومانت نەمێنیَ، هەڵەکانیشم بۆ ڕاست بکەوەو چاوپۆشی لە کەموکوڕیەکانم بکە.

خوای گەورە لە منو لە تۆو لە دایكو باوکمانو لە خۆشەویستانمان خۆش بیَو بە بەهەشت شادمان بکا، آمین، وحسبناالله ونعم الوکیل نعم المولی ونعم النصیر.

## ﴿ پێناسەی ئیمامی (الشّافِعِي) ﷺ ﴾

ئیمامی(الشّافِعِي) ناوی (محمد) کوڕی (إدریس) کوڕی (العباس) کوڕی (عثمان) کوڕی (شافع) کوڕی (السائب) کوڕی (عبید) کوڕی (عبد یزید) کوڕی (هاشم) کوڕی (المطّلب) کوڕی (عبدمناف)ە، کەوابو: ئیمامی (الشافعي) لە هۆزی قوڕەیشییە: کە هۆزە بەڕێزەکەی پێغەمبەرەﷺ لە باپیرەینۆیەمیدا نەژادی ئەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، چونکە

(عبدمناف) باپیرەی‌سێ‌یەمی پێغەمبەرە‌ﷺ، بەڵام لەو هەموو باپیرانە، ئیمامی (الشافعي) تەنها نیسبەت ئەدرێتە لای (شافع)-کە باپیری سێ‌یەمیەتی- چونکە (شافع) خۆی‌و (السائب)ی باوکی هەردووکیان سەحابەی پێغەمبەرﷺ بون.
جا بە هۆی ئەم نەژادە پیرۆزە، ئیمامی(الشافعي) بووەتە جێگەی متمانەی زانایانی (سَلَف)و (خَلَف)، چونکە ئەو قورئانە پیرۆزەی بە زمانی(قورەیش) هاتۆتە خوارەوەو ئەو حەدیسانەی لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەرێکی(قورەیشی)یەوەﷺ هاتونە دەرەوە، بێگومان زانایەکی (قورەیشی)ی وەکو ئیمامی(الشافعي)ش باشتر لێیان تێ‌ئەگاو جوانتر ئەتوانێ بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، کەوابو: ئیمامی(الشافعي) بەڵگەو سوارچاکی ڕێزمانی(عربی)یە.
ئیمامی(الشافعي) لە مانگی(رجب) ساڵی(١٥٠) سەدوپەنجای کۆچی، لە شاری (غَزَّة)ی خاکی (فَلَسْطِين) لە دایك بووە، ئینجا لە تەمەنی (٢) دوو ساڵی‌دا بردیانەوە بۆ (مكة)ی پیرۆز، هەر لە (مكة)دا لە تەمەنی (٧) حەفت ساڵی‌دا هەموو قورئانی پیرۆزی لە بەر کرد، ئینجا لە تەمەنی (١٠) دە ساڵی‌دا (مُوَطَّأ)ی لە بەر کرد.
جا چونکە ئیمامی(الشافعي) یەتیم‌و هەژار بوو و پارەی نەبو کاغەز بکڕێ، دەرسی خۆی لە ئێسقان ئەنووسیەوە.
ئینجا لە تەمەنی (١٥) پانزە ساڵی‌دا (إِجازَة)-بڕوانامەی (فتوا)دانی درایێ لە لای مامۆستای‌خۆی: (مُفتِی) شاری(مكة) ئیمام (مُسلِم بن خالِد الزَّنجِي) کە دەرسی (فِقه)ی لە لا خوێندبو، ئینجا لە تەمەنی (١٥) پانزە ساڵی‌دا بۆ خوێندن چووە (مَدینة)ی پیرۆز، لەوێش لە لای ئیمام (مالك) خوێندی‌و (إجازة)-بڕوانامەی لەم بەڕێزەش وەرگرت.
ئینجا لە ساڵی(١٩٥) سەدو نەوەدو پێنج چووە (بغداد)و زانایانی وەك ئیمام (أحمد)و (أبوثور)و (الزعفراني)و (الكرابيسی) دەرسیان لە لا خوێندو (المَذْهَب القَدِیم)=مەزهەبی کۆنی لەوێ داناو کتێبی (الرِّسالة)ی لە (أصُول الفِقْه) دانا، واتە: ئیمامی(الشافعي) یەکەم کەسە: کە گفتوگۆی لە (أصول الفِقْه) کردوە.
ئینجا گەڕاوە بۆ (مكة)ی پیرۆز، ئینجا هاتەوە (بغداد)و لە دوای دوو مانگ چووە (مصر) لەوێش زانایانی وەك ئیمامی(المُزَني)و (البُوَيْطي)و (الرَّبيع)و (حَرْمَلة)و چەندانی‌تر لە لایان خوێندو (المَذْهَب الجَدِید)=مەزهەبی نوێی لەوێ داناو ژیانی‌خۆی لە (مصر)دا بە خواپەرستی‌و بڵاوکردنەوەی زانست دەبردە سەر، بە جۆرێکی وەها: سێ‌یەکێکی شەوێ هەر شەونوێژی ئەکردو سێ‌یەکێکی‌تریش بە زانست خەریك بوو و سێ‌یەکێکیش دەنوست، لە شەو و ڕۆژێکدا ختمێکی قورئانی ئەکرد، بەڵام لە مانگی ڕەمەزان لە شەو و ڕۆژێکدا دوو ختمی دەکردن.

ئینجا بزانە: زنجیرەیزانستی ئیمامی(الشافعي) لە ڕێگەی حەزرەتی(عبدالله بن عباس) رَضِيَ اللهُ عَنهُما دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، چونکە ئیمامی(الشافعي) لە لای (مسلم بن خالد الزنجي)ی خوێندوە، ئەویش لەلای (عِكرَمة)و (مُجاهِد)، ئەوانیش لە لای حەزرەتی (ابن عباس) رَضِيَ اللهُ عَنهُما: کە هەم (صحابة)و هەم کوڕە مامی پێغەمبەرەﷺ.

ئیمامی(الشافعي) لە تەمەنی (٥٤) پەنجاوچوار ساڵیدا لە شەوی هەینی کۆتایی مانگی (رجب) ساڵی(٢٠٤) دووسەدوچواری کۆچی، لە (مصر)دا وەفاتی کرد، هەر لەوێش بە خاك سپێردراوە.

کەوابو: ئیمامی(الشافعي) یەکێکە لە زانا بەرزو بەڕێزەکانی (السلف الصالح)، چونکە لە سەدەی دووەمو سێیەمی کۆچیدا ژیاوەو حەدیسی سێ سەدەیەکە ئەیگرێتەوە، کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ﴾ رواه البخاري ومسلم، باشترینی ئۆممەتم ئەم سەدەیەی خۆمە، ئینجا سەدەی دوای ئەوان، ئینجا سەدەی دوای ئەوان.

کەواتە: ووشەی (خَيْرُ أُمَّتِي) بەرزترین شاهیدییە بۆ زانستو پیاو چاکیی زانایانی ئەو سێسەد ساڵە، خوای گەورە لە ئیمامی (الشافعي)و سەرجەم زانایانیتری ئایینی ئیسلامو لە ئێمەش ڕازی بێ، ئەوانو ئێمەش بە بەهەشت شاد بکا، آمین.

## ﴿ پێناسەی ئیمامی (النَّواوِي) رحمه الله تعالى﴾

ئیمام (النَّواوِي) ناوی (يَحْيَى) کوڕی (شرف) کوڕی (مُرِّي) کوڕی (حسن) کوڕی (حسين) کوڕی (محمد) کوڕی (جمعة) کوڕی (حزام)ە، لە مانگی(محرم) ساڵی(٦٣١) شەشسەدو سیو یەکی کۆچی، لە گوندی (نَوَى) لە ناوچەی حۆلانی سەر بە (دمشق) لە دایك بووە، هەر لە گوندی (نَوَى) لە تەمەنی منداڵیدا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردوە.

ئینجا لە تەمەنی(١٩)نۆزدە ساڵیدا باوکیخۆی بردی بۆ (دمشق) لە خوێندنگەی (الرواحية) بۆ خوێندن دایمەزراند، ئەم بەڕێزە لە لای چەند مامۆستایەکی پایە بەرز هەموو ڕۆژێك دوانزە دەرسی دەخوێندن -کە یەکێك لە مامۆستایەکانی ناوی (الشيخ سالار)ی کوردی بوو، یەکێکیتریش ناوی(الشيخ عزالدين)ی هەولێری بوو- تا بە ماوەیەکی کەم ئەم کتێبانەی هەموو خوێندنو لەبەری کردن:

(صحيح البخاري، صحيح مسلم، سنن أبيداود، سنن الترمذي، سنن النسائي، سنن إبن ماجه، موطأ الامام مالك، مسند الامام الشافعي، مسند الامام احمد، سنن الدارمي، مسند أبييعلى، سنن الدارقطني، سنن البيهقي، شرح السنة للبغوي، تفسير معالم التنزيل، عمل اليوم والليلة لابن السّنّي، الأنساب للزبير بن بكار)و چەند کتێبیکیتریش، تا ئەوەندە

زانستەی وەدەست هێنا: بووە سەر کردە لە زانینی مەزهەبی ئیمامی(الشافعي)و بووە مامۆستای خوێندنگەی (دارالحديث)، لە وێ بە دەرس‌و کتێب دانان خەریك بوو.

ئیمامی (النواوي) ئەم کتێبە بەنرخانەی داناون: (شرح صحيح مسلم، الأذكار، رياض الصالحين، الأربعين، التبيان، منهاج الطالبين، روضة الطالبين، الايضاح في مناسك الحج، تهذيب الأسماء واللغات، المجموع بشرح المهذب)و چەند کتێبێکی‌تریش.

ئیمامی(النواوي) زانایەکی ئەوەندە بەڕێزە، بووەتە جێگەی متمانەی زانایانی هەر چوار مەزهەب، گشت زانایان باوەڕیان بە فەرموودەکانی هەیە، چونکە هەم لە (حديث)و هەم لە (فِقه) دەستێکی بالای هەبوە، کەوابو: بە سەیری مەزانە، کە ئیمامی (السُبْكي) لە دوای وەفاتی ئیمامی(النواوي)، چووە (دمشق) لە ڕێگەدا گوێی لە پیاوێك بوو، ئەیگوت: (من خۆم ئەم پرسیارەم لە ئیمامی(النواوي) کردوە). جا ئیمام (السُبكي) کە ئەمەی بیست، یەکسەر لە وولاغەکەی دابەزی‌و سوێندی لە پیاوەکە خواردو فەرمووی: من سواری وولاغ نابم لە کاتێکدا چاوێك ئیمامی(النواوي)ی دیتبێ‌و بە پیادەیی بڕوا، ئینجا پیاوەکەی تا ناو شاری (دمشق) سواری وولاغەکەی‌خۆی کرد.

ئینجا کە ئیمام (السبكي) گەیشتە خوێندنگەی (دارالحديث) بەم لاو بەولای‌دا ئەسوڕایەوەو ڕووی خۆی بە بەرماڵەکەی ئیمامی(النواوي) دائەهێنا—کە کاتی‌خۆی بۆدەرس گوتنەوە لە سەری دانیشتبو— جا ئەیگوت: تکام وایە ڕووی من بەو شوێنە بکەوێ: کە ئیمامی (النواوي) پێی خۆی لێ‌داناوە.

ئیمامی (النواوي) لە تەمەنی(٤٥)چل‌و پێنج ساڵ‌و نیودا، لە مانگی(رجب) ساڵی(٦٧٦) شەشسەدو حەفتاو شەشی کۆچی لە گوندی (نَوَى) وەفاتی کرد، ڕەحمەتی خوا بڕژێ بە سەر گۆڕی‌دا، خوای گەورە ئەویش‌و ئێمەش بە بەهەشت شاد بکا، آمین.

## ﴿ بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام ﴾

خوای گەورە لە قوڕئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾ بڕیاردان تەنها مافی خوایە، خوا فەرمانی‌داوە: جگە لەوی کەسی‌تر مەپەرستن‌و بە دادوەری مەزانن، ئەوە ئایینی ڕاست‌و تەواوە.

ئینجا بزانە: بڕیارەکانی خوای‌گەورە—کە شەریعەتی ئیسلام باسیان لێئەکا— حەفتن:

١—(واجِب)—(فَرْض)—(لازِم)، واتە: پێویست، ئەوەیە: بە کردنی پاداشتی بدرێتێ لە لای خوای گەورەو لە سەر نەکردنی سزا بدرێ لە لای‌خوای گەورە.

ئینجا بزانە: (واجِب) دوو جۆرە، یەکەمیان: (فَرْضُ العَيْن)، واتە: پێویستە گشت مرۆڤێکی داوالێکراو بۆ خۆی بیکاو پاداش‌و سزاش هەر بۆ خۆیەتی: وەکو نوێژو ڕۆژوو...هتد.

دووەمیـان: (فَرضُ الْكِفايَة)، واتە: ئەگەر یەكێك، یان كۆمەڵێك لە داوالێكراوان واجبەكە بە تەواوی ئـەنجام بـدا، خێرەكـە بـۆ خۆیـەتیو سزای نەكردنیشـی لـە سـەر موسڵمانانیتر لائەچێ، ئەگەر نا: گشتیان تاوانبار ئەبن: وەكو شۆردنو كفنو نوێژو ناشتنی مردوو.

٢-(سُنَّة)-(مَنْدُوب)-(مُسْتَحَبّ)، واتە: خێر، ئەوەیە: بـە كردنـی پاداشـتی بـدرێتێ لـە لای خوایگەورەو لە سەر نەكردنی سزا نەدرێ: وەكو سیواك كردن.

٣-(حَرام)-(مَحْظُور)، واتـە: قەدەغـەكراو، ئەوەیـە: بـە تـاوانیكردنی سـزا بـدرێو بـە وازلێهێنانی پاداشتی بدرێتێ لە لای خوای گەورە: وەكو دزیو زیناو...هتد.

٤-(مَكْرُوه)، واتە: ناپەسند=ناڕێك، ئەوەیە: لە سەر كردنی سـزا نـەدرێ، بـەڵكو گلـەیی لێبكرێو ئەگەر بۆ گوێڕایەڵی شەرع وازی لێبێنێ پاداشتی بـدرێتێ لـە لای خـوای گـەورە: وەكو خواردن، یان خواردنەوە بە دەستی چەپە.

٥-(حَلال)-(جائِز)-(مُباح)، واتـە: دروسـت=ڕێگـەدراو، ئەوەیـە: كـردنو نـەكردنی یەكسان بێ، واتە: نە پاداشتی پێ بدرێتێو نە لە سەری سزا بدرێ، بەڵام ئەگەر بە نیازی خواپەرستی بیكا خێری ئەگاتێ: وەكو نوستنو خواردن.

٦-(صَحِيح)-(مُجْزِئ)-(مُنْعَقِد)، واتە: دروست=دامەزراو، ئەوەیە: بەگوێرەی داواكاری شـەرعی خوایگەورە ئـەنجام بدرێ، واتـە: بـە تـەواوی بكـرێو مەرجەكانیشـی لێبێنـە جـێ: وەكو نوێژكردن بە دەستنوێژەوە.

٧-(باطِل)-(فاسِد)-(غَيْرمُنْعَقِد)، واتـە: ناتـەواو=نادروسـت=دانەمـەزراو، ئەوەیـە: بەگوێرەی داواكاری شەرعیخوا ئەنجام نەدرێ، جیـاوازی نیـە: بـە ناتـەواوی بكـرێ، یـان تەواو بێو مەرجێكی شەرعی لێنێتە جێ: وەكو نوێژ بە بێ(ركوع)، یان بە بێدەستنوێژ.

جا ئەوەش بزانە: چەند زانایەك دەفەرموون: (باطِل)-ناتەواو، ئەوەیە: ناتەواوی لە (رُكْن)-بەشەكانیدا بێ، (فاسِد)-نادروست، ئەوەیە: ناتەواوی لە (شَرْط)-مەرجەكانیدا بێ.

## ﴿ پێناسەی چەند زاراوەیەكی شەریعەتی ئیسلام ﴾

١-(رُكْن)، واتە: بەش، ئەوەیە: بەشێك بێ لە خودیكردارەكەو كردنیشی (واجب) بێ، بە نەكردنیشی كردارەكە (باطل)=ناتەواو بێ: وەكو (فاتحة)و (ركوع)و (سجود) لە نوێژدا.

٢-(شَرْط)، واتـە: مـەرج، ئەوەیـە: بەشـێك نـەبێ لـە خودیكردارەكـە، بـەڵام هـەبوونی (واجب) بێ، چونكە مەرجە بۆ دروستبوونیكردارەكەو بە نەبوونیشی كردارەكە (فاسِد)=نادروست دەبێ: وەكو دەستنوێژو ڕوو لە قیبلەكردن لە نوێژدا.

٣-(اداء)، واتە: كردنی (عبادة)=خواپەرستی لە كاتی دیاركراوی خۆیدا: وەكو بـەڕۆژوو بوونی ڕەمەزان لە مانگیڕەمەزاندا، نوێژكردن لە كاتیخۆیدا.

٤-(قَضاء)، واتە: قەزا کردنەوە=گێڕانەوە، ئەوەیە: (عبادة)=خواپەرستی لە کاتی دیارکراویخۆیدا نەکرابێو لە دوای بەسەرچوونی کاتیخۆیدا بکرێ: وەکو بەڕۆژوو بوونی ڕەمەزان لە مانگێکی تردا، کردنی نوێژینیوەڕۆ لە دوایهاتنی کاتیعەسر.
٥-(إعادَة)، واتە: دووبارەکردنەوەی (عبادة)=خوا پەرستی، لە کاتی دیارکراوی خۆیدا، بۆ پاداشتی زیاتر، یان لە بەر ناتەواویو نادروستی خواپەرستیەکە لە جارییەکەمدا.

## ﴿ سەرچاوەکانی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام ﴾

لەو ئایەتە پیرۆزەی ڕابردوودا بۆمان دەرکەوت: کە دادوەرو بڕیاردەر تەنها خوای گەورەیەو هاوبەشی نیە، هەروەك خۆی ئەفەرموێ: ﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً﴾ خوای گەورە هیچ کەسێك ناکاتە هاوبەش لە بڕیاری خۆیدا.
ئینجا بزانە: ئەو بڕیارانەی خوای گەورە-کە بوونەتە شەریعەتیئیسلام-: یان لە (قُرآن)، یان لە (حَدیث)، یان لە (إجْماع)، یان لە (قِیاس) وەر ئەگیرێنو ئەزاندرێن.

## ﴿ بەڵگەی یەکەم: قورئانی پیرۆز ﴾

(قُرْآن)ی پیرۆز: فەرموودەی خوایگەورەیە، حەزرەتی(جُبْرائیل) ووشەو واتەی بە (وَحْي) لە لای خواوە بۆ پێغەمبەرﷺ هێناوە، تاکو ببێتە (مُعْجِزَة)ی بەردەوامی پێغەمبەرﷺ یاسایەکی بەردەوام بۆ دانیشتووانی سەر زەمین، خوێندنەوەشی ببێتە خواپەرستی.
ئینجا بزانە: ئەم قورئانە پیرۆزە، پێغەمبەرﷺ بە (صَحابَة)کانی ڕاگەیاندوەو لە وانیشەوە چین بە چین ڕاگەیاندراوە، تا بە بێگۆڕانکاری گەشتۆتە ئێمە، تا دونیاش وێران ئەبێ هەر وەك خۆی ئەمێنێتەوە، زانایانی(مُجْتَهِد)، واتە: ئەو زانا ئایینیانەی گەیشتۆنەتە پلەی (اِجْتِهاد)-بە تایبەتی لە چینی(سَلَف)- بڕیارەکانی خوایگەورەیان لە قورئان دەرهێناوەو لە کتێبە بەنرخەکانی شەریعەتیئیسلامدا تۆماریان کردوەو بۆ ئەم خەڵکەیان ڕوون کردۆتەوە، خوایگەورە پاداشتی چاکەیان بداتەوە.

## ﴿ بەڵگەی دووەم: حەدیسی پێغەمبەرﷺ ﴾

٢-(حَدِیث)ی پێغەمبەرﷺ: یان فەرموودەیپێغەمبەرەﷺ، یان کرداریپێغەمبەرەﷺ، یان ڕازیبوونی پێغەمبەرەﷺ: بە کرداری، یان بە گوفتاری کەسێکیتر.
ئینجا بزانە: هەروەك واجبە موسڵمان ڕەفتار بە قورئانیپیرۆز بکا، ئەوەهاش واجبە ڕەفتار بە (حَدیث)ی پێغەمبەرﷺ بکا، چونکە (حَدیث)ش وەکو (قُرآن) بە (وَحْي) لە لای خوای گەورەوە هاتوە، بەڵام پێغەمبەرﷺ بە زمانە شیرنەکەی خۆی ووشەی بۆ داناوە، هەروەك خوایگەورە ئەفەرموێ: ﴿وَما يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ پێغەمبەرﷺ بە هەواو هەوەس هیچ نالێ، هەرفەرموودەیەك-دەربارەی ئایین- بڵێ، هەر لە لای خوای گەورەوە بە (وَحْي) بۆی هاتوە.

ئینجا بزانە: ئەو حەدیسانەی بڕیارەکانی شەریعەتی‌ئیسلامیان لێوەرئەگیرێ، پێویستە: یان (صَحیح) بن، یان (حَسَن) بن، جیاوازی نیە: حەدیسەکە (حَسَنٌ لِذاتِه) بێ، یان (حَسَنٌ لِغَیْرِهِ) بێ:

*(حَسَنٌ لِذاتِه) ئەو جۆرە حەدیسەیە: نە لە (سَنَد)و نە لە (مَتْن)ی حەدیسەکەدا هیچ نیشانەی (ضُعْف)-بێهێزی نەبێ.

*(حَسَنٌ لِغَیْرِهِ) ئەو جۆرە حەدیسەیە: (سَنَد)ی (ضَعیف) بێ، بەڵام: یان لە زۆر ڕێگەی ترەوە ئەم حەدیسە هاتبێ، یان (مَتْن)ی حەدیسەکە، لەگەڵ واتەی حەدیسێکی‌تری (صَحیح) تێك بکاتەوە، ئینجا بە بەشی‌یەکەم ئەگوترێ: (حَسَنٌ بکَثْرَةِ طُرُقِهِ)و بە بەشی دووەم ئەگوترێ: (حَسَنٌ بِشَواهِدِهِ).

هەروەها بزانە: ئەگەر مرۆڤ لە زانستی (حَدیث)دا لەو پلەیە نەبو: حەدیسی (صَحیح)و (حَسَن)و (ضَعیف) لێك جیا بکاتەوە، واجبە: تەماشا بکا: ئەگەر دیتی ئیمامێکی (حدیث)زان حەدیسێکی بە (صحیح)، یان بە (حسن) دانابو، بۆی دروستە: بە مەزهەبی ئەم ئیمامە ڕەفتار بکا، بەو مەرجەی بزانێ مەزهەبەکەی ڕاستە، هەروەك (ابن حجر الهیتمي) وەهای فەرمووە لە (فتح المبین)دا ل(١٩٤)و لە (تحفة)دا ب(١٠) ل(١٠٨)

*دەربارەی (حدیث)ی (ضعیف)-بێهێز، ئیمامی (النواوی) لە پێشەکیەکانی (المجموع)و (الاذکار)و (الاربعین)دا دەفەرموێ: (زانایانی (حدیث)و (شەرع) هاودەنگن‌و دەفەرموون: دروستەو سوننەتە: ڕەفتار بە (حدیث)ی(ضعیف) بکرێ بۆ کاروباری چاکەو بۆ هاندان‌و ترساندن، بەو مەرجەی (مَوْضُوع) نەبێ).

*(المدابغي) لە ئیمامی(الشافعي ﷺ) دەگێڕێتەوە: (ئەگەر خەڵك -واتە: زانایانی‌ئایین- بە حەدیسێکی (ضَعیف) ڕازی بون‌و قبوڵیان کرد، ئەوە دەبێتە بەڵگەیەکی شەرعی‌و بۆ بڕیارەکانی شەریعەت‌و شتی‌تر ڕەفتاری پێ‌دەکرێ).

هەروەها لە ئیمام (أحمد ﷺ) دەگێڕێتەوە: (ڕەفتار بە حەدیسی(ضَعیف) دەکرێ بەو مەرجەی حەدیسێکی‌تر لەم بابەتەدا نەبێ‌و دژیشی نەبێ-واتە: نە لە (قُرآن)و نە لە (حدیث)-لە ڕیوایەتێکی‌تردا دەفەرموێ: حەدیسی(ضعیف) لە لای‌ئێمە خۆشەویستترە لە ڕای زاناو لە (قیاس)، بەو مەرجەی حەدیسێکی‌تر لەم بابەتەدا نەبێ).(حاشیةالمدابغی) ل(٣٢).

﴿ ئاگاداری ﴾: ئیمامی(الشافعی ﷺ) فەرموویەتی: (إذا صَحَّ الْحَدِیثُ فَهُوَ مَذْهَبِی) رواه الامام النواوی فی‌المجموع، هەر کاتێك حەدیسێکی (صحیح) هەبو، ئەوە مەزهەبی منە. واتە: بە حەدیسەکە ڕەفتار بکەن.

جا ئیمامی (النـواوی) ئەفـەرموێ: ئـەم فەرموودەیـەی ئیمامی(الشـافعی) مانـای وانیـە: هەرکەسێك حەدیسێكی (صَحیح)ی بینـی بڵـێ: ئەمـە مەزهـەبی (شـافعي)یـەو بـە واتـەی ئاشکرای حەدیسەکە ڕەفتـار بکـا، بـەڵکو ئەمـە بۆ ئـەو زانایەیـە: پلـەی (اِجْتِهـاد)ی لـە مەزهەبی(شافعی)دا هەبێو بەو مەرجەش: قەناعەتی بەهێز بێ: کە ئیمامی(شـافعي) ئـەو حەدیسەی پێنەگەیشتوە، یان بە (صَحیح)ی نەزانیوە، ئەم زانستەش دەست ناکەوێ تـا تەماشـای گشـت کتێبـەکانیتری زانایـانی مەزهـەبی(شـافعي) ئـەکا، ئەمـەش مـەرجێکی سەختەو کەم کەس وەدەستی دێنێ. بڕوانە: (المجموع بشرح المذهب) ب(١) ل(٦٤).

## ﴿ بەڵگەی سێیەم: (إجْماع)ی زانایانی ئیسلام ﴾

(إجْماع): ڕێککەوتنی گشت زانا (مُجْتَهِد)ەکـانی ئیسـلامە، لـە سـەر بڕیـارێکی شـەریعەتی ئیسلام-کە لە قورئان، یان لە حەدیس دەریان هێناوە- دەربارەی ڕوداوێك لە کاتێکدا لە کاتەکانی دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ.

جا ئەگـەر هـاتو (اِجْمـاع) لـە سـەر بڕیـارێکی شـەریعەتی ئیسـلام بەسـترا، واجبـە گشـت موسڵمانێك ڕەفتـاری پێبکـاو هـیچ زانایـەکی (مُجْتَهِـد)ش بـۆی دروسـت نیـە دەسـتکاری (اجماع) بکاو (فتوا) بە پێچەوانەی (اجمـاع) دەریکـا، کەواتـە: شـوێنکەوتنی ئـەم جـۆرە زانایە گومڕابوونو سەرلێشێوانە، چونکە خوای گەورە هەڕەشە ئـەکاو ئەفـەرموێ: ﴿وَمَنْ يُشاقِقِ الرَّسُولَ مِنْ بَعْدِ ماتَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبيلِ الْمُؤْمِنين نُوَلِّهِ ماتَوَلّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسائَتْ مَصيراً﴾ هەر کەسێك دژایەتی ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بکا پاش ئەوەی ڕێگای ڕاستی بۆ ڕوون بۆوەو جگە لە ڕێگـەی ئیمانـداران شـوێن ڕێگەیـەکیتر بکـەوێ، ئێمـە دەیدەینـە دەست ڕێبازەکەی خۆیو دەیبەینە دۆزەخ کە خراپترین شوێنە.

ئیمامی(الشافعي) بەم ئایەتە بەڵگەی هێناوەتەوە لـە سـەر (اجمـاع). بڕوانـە (تفسـیرالآیة (١١٥) سورةالنساء) لە تـەفسیری (القرطبی)و (الفخرالرازی)و (الآلوسی).

جـا لـە بـەر ئـەوەی خوایگـەورە لـەو ئایەتـەدا، سـزای دژایەتیپێغەمبـەرﷺ دژایـەتی (اجماع)ی بە یەك جۆر داناوە، پێغەمبـەرﷺ ئەفـەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بِالْجَماعَةِ وَإيّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطانَ مَعَ الْواحِدِ وَهُوَ مِنَ الإِثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرادَ بَحْبُوحَةَالْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمِ الْجَمَاعَـةَ﴾ رواه الترمذی بسند صحیح، واتە: پێویستە ئێوە هەر لەگەڵ کۆمەڵدا بن، ئاگاداری خۆتان بن لـە پەرتەوازەو تاکڕەوی، چونکە شەیتان لەگەڵ یەك کەسدایەو لـە دووکەسـان دوورتـرە، هـەر کەسێك ناوەندی بەهەشتی ئەوێ، پێویستە هەر لەگەڵ کۆمەڵدا بێ.

ئینجا بزانە: (اجماع)ی ئەم چوار مەزهەبەی(أَهْلِ السُّنَّة) بەڵگەیـەکی شەریعەتیئیسـلامە، کەوابو: دروست نیە لەم چوار مەزهەبە لابدەین، چونکە ئەم چوار مەزهەبە لە سـەدەکانی

(السَّلف الصّالح)دا دامەزراون‌و بە (اجماع)ی زانایانی(السَّلف) متمانەیان پێ‌كراوە، پێغەمبەریش‌ﷺ شاهیدی‌ی بۆ داون‌و ئەفەرموێ: ﴿خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ﴾ رواه البخاري ومسلم، واتە: چاكترینی ئۆممەتم سەدەی خۆمە، ئینجا سەدەی دوای ئەوان، ئینجا سەدەی دوای ئەوان.

ئیمام (ابن الصلاح) دەفەرموێ: (بە (إجماع)ی زانایانی‌ئیسلام دروست نیە مرۆڤ (تَقْليد)ی هیچ كەسێك بكا-جگە لەم چوار ئیمامەی سەر مەزهەب-: نە بۆ دادكردن‌و نە بۆ (فتوا)دان).

هەروەها ئیمامی(السُّبكی) ئەفەرموێ: (دژایەتی ئەم چوار مەزهەبە وەك دژایەتی (إجماع) وایە). بڕوانە (بغيةالمسترشدين) ل(٨)و (تحفةالمحتاج)ب(١٠) ل(١٤٤-١٤).

﴿ ئاگاداری ﴾: ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (مَتَى خالَفَ خَبَرُالآحادِ نَصَّ الْقُرآنِ أَوْ إِجْماعاً وَجَبَ تَرْكُ ظاهِرِه) هەركاتێك حەدیسی(آحاد) دژایەتی لەگەڵ دەققی قورئان، یان لەگەڵ (إجماع) هەبو، واجبە واز لە واتەی ئاشكرای حەدیسەكە بهێندرێ. (واتە: واجبە: واتەی حەدیسی(صحيح) لەگەڵ (قرآن)و (اجماع)دا بگونجێندرێ). بڕوانە: (المجموع شرح المذهب)ب(٤) ل(٣٤٢) .

## ﴿بەڵگەی چوارەم: (قیاس) ﴾

(قِیاس) ئەوەیە: ڕوداوێك-كە بڕیاری شەرعی لە سەر نەبێ- ببردرێتە سەر ڕوداوێك كە بڕیاری شەرعی‌ی لە سەر هەبێ، تاكو ئەویش هەمان بڕیار وەربگرێ، چونكە هەردوو ڕووداوەكان یەكسانن لە هۆكاری بڕیارەكەدا.

بۆ نموونە: خوای‌گەورە خواردنی ماڵی (يَتِيم)ی بە حەرام داناوەو دەفەرموێ: ﴿وَلا تَأْكُلُوا أَمْوالَهُمْ﴾ ماڵی یەتیمان مەخۆن. كەوابو: سووتاندنی ماڵی (يَتِيم))ش (قیاس) ئەكرێتە سەر خواردن‌و هەمان بڕیاری حەرامی‌ی بۆ دائەندرێ، چونكە خواردن‌و سووتاندن هەردووكیان یەكسانن بۆ زیان لێدان‌و لە ناوبردنی ماڵی (يَتِيم).

(قِیاس) بەڵگەی چوارەمی شەریعەتی ئیسلامە، چونكە پێغەمبەرﷺ لە چەند ڕووداوێكدا (قیاس)ی كردوە، بۆ نموونە: ﴿جاءَ رَجُلٌ إِلى النَّبِيِّﷺ فَقال: إنَّ أُمِّي ماتَتْ وَعَلَيْها صَوْمُ شَهْرٍ أَفَأَقْضِيهِ عَنْها؟ فَقالَﷺ: لَوْ كانَ عَلى أُمِّكَ دَيْنٌ أَكُنْتَ قاضِيهِ عَنْها؟ قال نَعَمْ، قالﷺ: فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى﴾ رواه البخاري و مسلم، پیاوێك بە پێغەمبەری‌ﷺ گوت: دایكم مردوەو ڕۆژووی مانگێكی لەسەرن، ئایا بۆی قەزا بكەمەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر قەرزێك لەسەر دایكت هەبایە بۆت دەدایەوە؟ گوتی: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: كەوابو: قەرزی خوای گەورە ئەبی باشتر بدرێتەوە.

واته: پێغەمبەرﷺ، خواپەرستنێکی نەکراوی -کە ڕۆژووە- (قیاس) کردە سەر قەرزی ئادەمیزاد: کە واجبە بدرێتەوە، هەروەها لە (حج)ی نەکراو و لە چەند ڕووداوێکیتردا پێغەمبەرﷺ (قیاس) ی کردوە.

## ﴿ چۆنیەتی (فَتوا)و (تَقْلِید)کردن ﴾

ئەی موسوڵمانیڕێزدار، دوای ئەوەی سەرچاوەکانیشەریعەتیئیسلامت بۆ ڕوون کرانەوە، پێویستە بزانی چۆنیەتی دەرهێنانی بڕیارەکانی شەریعەتیئیسلام لە قورئانو حەدیس، هەروەها زانینی (إجماع)و (قیاس) تەنها لە دەسەڵاتی زانایانی (مُجْتَهِد)دایەو هیچ لە دەسەڵاتی ئێمەدا نیە -إن شاء الله- لە (کتاب القضاء)دا مەرجەکانی (مُجْتَهِد) ڕوون ئەکەینەوە.

کەوابو: واجبی سەر شانی ئێمە (تَقْلید)ە، واتە: شوێنکەوتنی زانایەکانی (مُجْتَهد)و باوەڕ پێکراو، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾ پرسیار لە زانایانی ئایینی بکەن ئەگەر بەخۆتان نازانن.

ئینجا ئەو زانا ئایینیانەی متمانەیان پێدەکرێو جێگەی باوەڕن بۆ (فتوا)و زانست لێوەرگرتن: زانا شوێنکەوتووەکانی هەر چوار مەزهەبی (أهل السُنَّة)ن، چونکە ئەو چوار مەزهەبە لەو سێسەد ساڵەدا دامەزراون: کە پێغەمبەرﷺ بە حەدیسەکەی﴿خَيْرُأُمَّتِي﴾ی ڕابردوو شاهیدیی بۆ داونو ئەو زانا باوەڕ پێکراوانەش بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلامیان لەو چوار سەرچاوانەیڕابردوو وەرگرتوەو لە کتێبە بەنرخەکانی خۆیاندا نووسیتیانەوە، ئینجا شوێنکەوتووانی ئەوانیش ڕوونیان کردونەوە.

کەوابو: هەر کەسێك شارەزای ئەو کتێبە بە نرخانە نەبێ دروست نیە: نە (فتوا) بداو نە (فتوا)شی لێوەربگیرێ؟ چونکە نەزانەو خەڵکیش گومڕا دەکا، هەروەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿إنَّ اللهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ إنْتِزاعاً يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبادِ وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَماءِ حَتَّى إِذا لَمْ يَبْقَ عالِمٌ إتَّخَذَ النَّاسُ رُؤُوساً جُهّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِعِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا﴾ رواه البخاري ومسلم، خوایگەورە ئەم زانستەی ئایین وەها وەرناگرێتەوەو لەناوی نابا: کە لە سینەی بەندەکانی دەریبهێنێ، بەڵکو بە هۆی مراندنی زانایانیئایینی زانستەکە وەردەگرێتەوە، تا وای لێدێ زانای ئایینی نامێنێو خەڵك چەند سەرکردەو ئەمیری نەزان بۆ خۆیان دەگرنو پرسیاری ئایینیان لێدەکرێ، ئەوانیش بە بێزانست فتوا دەدەنو وەڵام دەدەنەوەو خۆیان گومڕا دەبنو خەڵکەکەش گومڕا دەکەن.

ئینجا بزانە: (فتوا)دان خەبەردانە لە جیاتی خواو پێغەمبەرﷺ لەو بڕیارە شەرعیەدا، کەوابو: ئەم خەبەرە لە مرۆڤی نەزانو درۆزن وەرناگیرێ، هەروەك ئیمام (محمد بن سیرین) دەفەرموێ: (إِنَّ هَذَاالْعِلْمَ دِينٌ فَانْظُرُوا عَمَّنْ تَأْخُذُونَ دِينَكُمْ) رواه مسلم فی

مقدمة صحيحه، ئەم زانستەی ئیسلام، ئایینی ئیسلامە، کەوابو: تەماشا بکەن ئایینی خۆتان لە کێ وەردەگرن؟.

کەوابو: ئەو کەسەی ئەو بارەی پێ هەڵناگیرێ، دروست نیە بێتە مەیدانی (فتوا)و ئەو ئەرکە گرانە بخاتە ئەستۆی و خۆی تووشی باری تاوان بکا، چونکە ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ: (فتوا)دان شـەرەفێکی گەورەیـەو ڕێـزی زۆرە، چـونکە (فتـوا)دەر میراتگری پێغەمبەرانـەو -صلوات الله وسلامه عليهم- بە جێبەجێ کردنی (فَرْضُ الْكِفايَة) هەڵدەستێ، بەڵام لەوانەیـە تووشـی هەڵە ببێ، بۆیێ فەرموویانە: (فتوا)دەر لەجیاتی خوای گەورە ئیمزا دەکا.

*(ابـن المنکـدر) دەفـەرموێ: (زانای ئـایینی لـە نێـوان خوای گـەورەو لـە نێـوان بەندەکانی خوای گەورەدایە، کەوابو: ئەبێ چاك بیر بکاتـەوەو تەماشا بکا: چۆن دەچێتە نێوان خواو بەندەکانی خوا). واتە: دەبی لە (فتوا)دان بترسێ.

*(عبـدالرحمن ابــن ابی لیلــی) دەفــەرموێ: (گەیشـتمە سەدوبیســت (صَـحابة)ی پێغەمبــەرﷺ، یــەکێکیان پرســیارێکی لێ دەکــرا، ئــەویش دەینــاردە لای (صَـحابة)یــەکی تر، ئەمــەش دەینــاردە لای ئــەوی تر، تــا دەگــەڕاوە لای یەکەمەکەیان). واتە: لە (فتوا)دان دەترسان.

*(ابن مسعود)و (ابن عباس)ﷺ -کە دوو (صحابة)ی پێغەمبەرنﷺ- دەفـەرموون: (ئەو کەسەی هەر پرسیارێکی لێ بکرێ (فتوا) بدا، ئەوە شێتە).

*ئیمام (مالك) دەفەرموێ: (من (فتوا)م نەدەدا، تا حەفتا زانای ئایینی شاهیدییان بۆ دام: کە من بە کەڵکی (فتوا)دان دێم).

ئینجا ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: ((تَساهُل)، واتە: نەرمی و ئاسانی لە (فتـوا)دانـدا حەڕامـە، هـەر کەسێکیش بە نـەرم و ئاسـانیی (فتـوا) ناسـراو بێ، ئـەوە حەڕامـە داوای (فتـوا)ی لێ بکـرێ، بەشێکی (تَسـاهُل) ئەوەیـە: بە بێ لێکۆڵینـەوە، بە پەلـە (فتوا) بدا، هەروەها مەبەستە نادروستەکانی وای لێ بکەن: کە بە شوێن فڕوفێڵە حەڕامەکانـدا، یـان ناپەسـەندەکاندا بگـەڕێ و دەسـت بـە فـەرموودە بێ هێـزو ناتەواوەکانـەوە بگـرێ، تـاکو ڕێگـە بـۆ کەسـێك ئاسـان بکـا: کە بیـەوێ سـودی پێ بگەیێنی و لە دژی کەسێك توند بکا: کە بیەوێ زیانی لێ بدا). بڕوانـە (المجموع بشرح المهذب)ب(١) ل(٤٠ و ٤٦).

*ئیمـام (ابـن الصـلاح) دەفـەرموێ: (بـە (إجمـاع)ی زانایانی ئایین: (تَقْلِيـد)، واتـە: شوێنکەوتنی هیچ کەسێك دروست نیە: نە بۆ (فتـوا)دان و نـە بـۆ دادکـردن، جگـە لە شوێنکەوتنی ئەم چوار پێشەوایەی سەر مەزهەب).

*ئیمامی(السُبْکي) دەفەرموێ: (لادان لەو چوار مەزهەبە، وەکو لادانە: لە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام).
*ئیمام (ابن حجرالهیتمي) دەفەرموێ: (تَقْلِید) واتە: شوێنکەوتنی هەر یەکێك لەو چوار پێشەوایەی سەر مەزهەب دروستە، هەروەها دروستە: (تَقْلِید)کردنی زانایانیتریش: کە مەزهەبیان پارێزراو بێو تۆمار کرابێ، جا ئەو (تَقْلِید)کردنەش تەنها بۆ کاری تایبەت بەخۆی دروستە، نەك بۆ (فتوا)دانو دادکردن، چونکە لە (فتوا)دانو دادکردندا جگە لەو چوار پێشەوایانە (تَقْلِید)کردنی کەسیتر دروست نیە بە (اجماع)ی زانایانی ئیسلام.
(مەبەستی ئەوەیە: زانای(لامذهبي)-بێمەزهەبو هەم ئەو زانایەی مەزهەبی تۆمار نەکراوە، متمانە بە زانستیان ناکرێو بە هیچ جۆرێك (تَقْلِید)کردنیان دروست نیە،وَاللهُ أعْلَم).
*ئیمامی(السبکي) دەفەرموێ: ئەگەر (فتوا)دەر بەرژەوەندی ئایینی مەبەست بوو، دروستە: بە مەزهەبێکیتر، یان بە فەرموودەی زانایەك (فتوا) بدا، بەڵام واجبە ناوی مەزهەبەکە، یان زانایەکە بۆ ئەو کەسەی بڵێ کە پرسیاری لێکردوە. (بەم جۆرە (فتوا)یە دەگوترێ: (إرْشادِي) واتە: ڕێنمونیکردن) .
*دیسان ئیمامی(السبکي) دەفەرموێ: دروستە: ڕەفتار بە فەرموودە بێهێزەکانی مەزهەب بکا: بۆ کاری تایبەت بەخۆی، (واتە نەك بۆ (فتوا)و دادکردن)، چونکە هەر بە خۆی دەفەرموێ: دادکردن بە فەرموودەی بێهێز، دادکردنە بە پێچەوانەی قورئان، هەروەهاش ئیمامی(القرافي)و ئیمام (ابن الصلاح) دەفەرموون: (اجماع) لە سەر ئەوە بەستراوە: کە دادکردن بە فەرموودە بێهێزەکانی مەزهەب دروست نیە.
*ئیمام (ابن حجرالهیتمي) دەفەرموێ: بۆ دروستبوونی (تَقْلِید) بە مەرج دانراوە: نابێ بڕیاری قازی هەڵبوە شێنێتەوە، ئینجا دەفەرموێ: هەروەها بە مەرج دانراوە: نابێ بە شوێن فەرموودە ئاسانەکاندا بگەڕێ، بەو جۆرەی: لە هەر مەزهەبێك ئاسانترەکە وەربگرێ، چونکە بەم ئاسانگەڕیە پەتی داواکردنیخوای لە ئەستۆ هەڵدەوەشێتەوە، کەوابو: مرۆڤ بەم ئاسانگەڕیە (فاسِق) دەبێ.
ئینجا دەفەرموێ: هەروەها بە مەرج دانراوە: نابێ (تَلْفِیق) بکا، واتە: نابێ دوو فەرموودە لێك بداو شتێکی سێیەم لە نێوانیاندا دەربچێ: کە یەکێك لەو دوو ئیمامە، ئەو سێیەمەیان لە لا دروست نەبێ: وەکو لە سەر مەزهەبی ئیمامی(الشافعي) بەشێکی سەری خۆی (مسح) بکاو لە سەر مەزهەبی ئیمام(مالك) دەست لە سەگ بدا، ئینجا بەم جۆرە نوێژێك بکا، ئەمە دروست نیە؟ چونکە لە لای(شافعي) لەشی گڵاوە، لە لای (مالکی)ش دەستنوێژی ناتەواوە. بۆ ئەم باسە بڕوانە (تحفةالمحتاج)و (حاشیةالشرواني) ب(١٠) ل(١٠٩ و ١١٠ و ١١٢ و ١٤٤ و ١٤٥).

ئینجا بزانە: تاکو لە فەرموودە بەهێزەکانی مەزهەبی(الشافعی) شارەزا ببی، (ابن حجر) دەفەرموێ: فەرموودەی بەهێز ئەوەیە: کە ئیمامی (الرافعی)و ئیمامی (النواوی) لە سەری ڕێك کەوتبن–ئەم دوو بە ڕێزە لە مەزهەبی(شافعی)دا بە (اَلشَّیْخان) ناو ئەبرێن– ئینجا ئەگەر فەرموودەی ئەم دووانە لێك جیاواز بوو، ئەوە فەرموودەکەی ئیمامی (النواوی) بەهێزترە.

بەڵام ئەگەر زانایانی مەزهەب لایەنگری ئیمامی (الرافعی) بون، ئەو کاتە فەرموودەی وی بەهێز ترە. بڕوانە (تحفةالمحتاج) ب(١) ل(٣٩) .

(الشیخ سعیدالمکی) دەفەرموێ: (فتوا)دان یەکەمجار بە (تحفة)ی(ابن حجر)و بە (نهایة)ی (الرملی) دەبێ، ئەگەر ئەم دووانە لێك جیاواز بون، ئەوە دروستە: بە هەر کامەیان (فتوا) بدرێ، ئینجا بە کتێبەکانی (الشیخ زکریاالأنصاری)، ئینجا کتێبەکانی (الخطیب)، ئینجا حاشیەکانی (الزیادی)و (ابن قاسم)و (الشُّبراملسی)و (الحلبی)و (الشَّوْبری)و ئەوانی‌تریش، ئەمە بۆ (فتوا)، بەڵام بۆ کرداری تایبەت بە خۆی، ڕەفتار بەم کتێبانەو بە وانی‌تریش هەر دروستە. بڕوانە (إعانةالطالبین) ب(١) ل(١٩)و (جواهرالفتاوی) ب(١) ل(١٤) .

ئینجا منیش بەندەی تاوانبارو بێ‌دەسەڵات: (عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی)، لە خوای‌گەورە دەپاڕێمەوە: یارمەتیم بدا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم کتێبە: (منهاج الطالبین)ی دانراوی ئیمامی(النواوی)، لە سەر مەزهەبی ئیمامی(الشافعی ﷺ)، تاکو خوێندەواری کوردی موسڵمان دڵنیا ببی‌و بزانێ چۆن ئیمامی(الشافعی) بڕیارەکانی شەریعەتی‌ئیسلامی لەو چوار بەڵگەیە وەرگرتوە، کە لە بنچینەدا گشتیان سەرچاوەیان ئەگەڕێتەوە لای خوای گەورە.

وَعَلَى اللهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ حَسْبِي وَنِعْمَ الْوَكِيلُ نِعْمَ الْمَوْلَى وَنِعْمَ النَّصِيرِ وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ، وَلاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ.

هەولێر–کوردستان.

(٢٧)ی (شعبان)ی (١٤١٨) کۆچی.

بسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

اَلْحَمْدُ للّهِ الْبَرِّ الْجَوادِ الَّذِي جَلَّتْ نعمَهُ عَنِ الإِحْصَاءِ بِالأَعْدادِ اَلْمانِّ بِاللُّطفِ وَالإِرْشَادِ اَلْهادِي إِلى سَبِيلِ الرَّشَادِ اَلْمُوَفِّقِ للتَّفَقُّهِ فِي الدِّينِ مَنْ لَطَفَ بِهِ وَاخْتَارَهُ مِنَ الْعِبادِ، أَحْمَدُهُ أَبْلَغَ حَمْدٍ وَأَكْمَلَهُ وَأَزْكاهُ وَأَشْمَلَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَإِلهَ إِلاّاللّهُ الْواحِدُ الْغَفَّارُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ الْمُصْطَفَى الْمُخْتارُ صَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ وَزَادَهُ فَضْلاً وَشَرَفاً لَدَيْهِ.

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ الأَشْتِغالَ بِالْعِلْمِ مِنْ أَفْضَلِ الطَّاعَاتِ وَأَوْلَى مَا أُنْفِقَتْ فِيهِ نَفَائِسُ الأَوْقاتِ،

---

## ﴿ پێشەكیی (مِنهاج)ی ئیمامی (النَّواوي) رحمه الله تعالى ﴾

(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان دەست بە دانانی ئەم کتێبە ئەكەم (اَلْحَمْدُ للّهِ الْبَرِّ الْجَوادِ) سوپاس بۆ خوای چاكەكارو زۆر بەخش (الَّذِي جَلَّتْ نِعَمُهُ عَنِ الإِحْصاءِ بِالأَعْدادِ) ئەو خودایەی چاكەی زۆر لەوە گەورەترن: كە سەرژمێر بكرێن بە ژماردن (اَلْمانُّ بِاللُّطْفِ وَالإِرْشادِ) چاكەكارە: بە دورستكردنی هێزی خواپەرستیو بە گەیاندنە رێگەی راست (اَلْهادِي إِلى سَبِيلِ الرَّشَادِ) شارەزاكەرە بۆ رێگەی بەختەوەری (اَلْمُوَفِّقِ لِلتَّفَقُّهِ فِي الدِّينِ) توانابەخشە بۆ تێگەیشتنی ئایین (مَنْ لَطَفَ بِهِ وَاخْتارَهُ مِنَ الْعِبادِ) توانین ئەداتە ئەو كەسانەی بیەوێ چاكەیان بداتیو هەڵیبژاردون لە بەندەكانیخۆی (أَحْمَدُهُ أَبْلَغَ حَمْدٍ وَأَكْمَلَهُ وَأَزْكاهُ وَأَشْمَلَهُ) سوپاسی خوا ئەكەم: بە بەهێزترینو تەواوترینو زێدەترینو گشتترین سوپاس.

(وَأَشْهَدُ أَنْ لاَإِلهَ إِلاّاللّهُ الْواحِدُ الْغَفّارُ) شایەدی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو خودایەی ناوی (الله)یەو تاكو تەنیایەو داپۆشەری گوناهەكانە.

(وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ الْمُصْطَفَى الْمُخْتارُ صَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَيْهِ وَزَادَهُ فَضْلاً وَشَرَفاً لَدَيْهِ) هەروەها شایەدی دەدەم كە (محمد)ﷺ بەندەو پێغەمبەرێكی پوختەو بژاردەی خوایگەورەیە.

(أَمَّا بَعْدُ) ئینجا لە دوای سوپاس بۆ خواو سەلەوات لە سەر پێغەمبەرﷺ، بزانە: (فَإِنَّ الأَشْتِغالَ بِالْعِلْمِ) خەریكبوون بە زانستیئایین (مِنْ أَفْضَلِ الطّاعاتِ) لە گەورەترینی خواپەرستنەكانە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فَضْلُ الْعالِمِ عَلَى الْعابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْناكُمْ﴾ رواه الترمذي، ئەندازەی گەورەییزانا لە سەر خواپەرست وەكو گەورەیی منە لە سەر بچووكترین (صحابة).

(وَأَوْلَى مَا أُنْفِقَتْ فِيهِ نَفَائِسُ الأَوْقاتِ) لە شیاوترینو لە پێشترین ئەو كارانەیە: كە كاتە بەنرخەكانیان پێ تەواو ئەكرێ.

وَقَدْ أَكْثَرَ أَصْحابُنَا-رَحِمَهُمُ اللهُ تعالى- مِنَ التَّصْنِيفِ مِنَ الْمَبْسُوطاتِ وَالْمُخْتَصَرات، وَأَتْقَنُ مُخْتَصَرِ (اَلْمُحَرَّرُ) لِلإِمَامِ أَبِي الْقاسِمِ الرَّافِعِيِّ-رَحِمَهُ اللهُ تعالى- ذِي التَّحْقِيقَات، وَهُوَ كَثِيرُ الْفَوَائِد عُمْدَةٌ فِي تَحْقِيقِ الْمَذْهَبِ مُعْتَمَدٌ لِلْمُفْتِي وَغَيْرِهِ مِنْ أُولِي الرَّغَبَات، وَقَد الْتَزَمَ مُصَنِّفُهُ-رَحِمَهُ اللهُ- أَنْ يَنُصَّ عَلَى مَاصَحَّحَهُ مُعْظَمُ الأَصْحَاب وَوَفَّى بِمَاالْتَزَمَهُ وَهُوَ مِنْ أَهَمِّ أَوْ أَهَمُّ الْمَطْلُوبَات، لَكِنْ فِي حَجْمِهِ كِبَرٌ يَعْجِزُ عَنْ حِفْظِهِ أَكْثَرُ أَهْلِ الْعَصْرِ إِلاَّ بَعْضَ أَهْلِ الْعِنَايَات، فَرَأَيْتُ اخْتِصَارَهُ فِي نَحْوِ نِصْفِ حَجْمِهِ

---

(وَقَدْ أَكْثَرَ أَصْحابُنَا-رَحِمَهُمُ اللهُ تعالى- مِنَ التَّصْنِيفِ) بە ڕاستی زانایەکانی مەزهەبی(شافعي)مان -خوا ڕەحمیان پێ بکا- زۆر کتێبیان دانابو (مِنَ الْمَبْسُوطاتِ وَالْمُخْتَصَرات) لە جۆری کتێبە درێژەکان‌و کورتەکان (وَأَتْقَنُ مُخْتَصَرِ) وە باشترین‌و لە جێترینی کتێبە کورتەکان (اَلْمُحَرَّرُ) بوو (لِلإِمَامِ أَبِي الْقاسِمِ الرَّافِعِيِّ-رَحِمَهُ اللهُ تعالى-) کە دانراوی ئیمامی(الرافعي)یە:

ئەم بەڕێزە ناوی (عبدالكريم بن محمد)ە، خەڵکی شاری (قەزوێنە)و لە نەژادی حەزرەتی(رافع بن خديج)ی (صحابة)ی پێغەمبەرە ﷺ، لە تەمەنی(٦٦)شەست‌وشەش ساڵی‌دا، ساڵی(٦٢٣)شەشسەدو بیست‌و سێ‌ی کۆچی لە شاری(قَزْوين) وەفاتی کردوە

(ذِي التَّحْقِيقَات) ئیمامی(الرافعي) خاوەنی ڕوونکردنەوەکانی زانست بووە بە بەڵگەوە.

(وَهُوَ) کتێبی(الْمُحَرَّر)، (كَثِيرُالْفَوَائِد) سودەکانی زۆرن‌و (عُمْدَةٌ فِي تَحْقِيقِ الْمَذْهَبِ) پاڵپشتە لە ڕوونکردنەوەی مەزهەبی ئیمامی(شافعي)دا (مُعْتَمَدٌ لِلْمُفْتِي وَغَيْرِهِ مِنْ أُولِي الرَّغَبَات) پاڵپشتە بۆ فتوادەرو خەڵکی‌تریش: کە بە شوێن وەدەستهێنانی چاکەدا ئەگەڕێن (وَقَد الْتَزَمَ مُصَنِّفُهُ-رَحِمَهُ اللهُ-) دانەری (المحرر) بە ئەرکی سەر شانی خۆی داناوە (أَنْ يَنُصَّ عَلَى مَاصَحَّحَهُ مُعْظَمُ الأَصْحَاب) دەقی ئەو فەرموودەیە بڵێ کە زۆرترینی زانایان بە ڕاستیان داناوە (وَوَفَّى بِمَاالْتَزَمَهُ) ئەو ئەرکەشی گەیاندە جێ (وَهُوَ) ئەو ئەرکە (مِنْ أَهَمِّ أَوْ أَهَمُّ الْمَطْلُوبَات) گرنگترینی داواکاریەکانی شەرعزانانە: بۆ فتوادان‌و دادکردن‌و دەرس گوتنەوە، چونکە دادکردن‌و فتوادان بەفەرموودە بێ‌هێزەکانی‌مەزهەب دروست نیە، هەروەك لە پێشەکی‌دا روونمان کردەوە.

(لَكِنْ فِي حَجْمِهِ كِبَرٌ) جا هەرچەندە (اَلْمُحَرَّر) ئەوەندە کتێبێکی باش بوو، بەڵام قەبارەی زۆر گەورە بوو (يَعْجِزُ عَنْ حِفْظِهِ أَكْثَرُ أَهْلِ الْعَصْر) زۆربەی خوێندەوارانی چەرخی ئێمە ناتوانن لەبەری بکەن (إِلاَّ بَعْضَ أَهْلِ الْعِنَايَات) تەنها چەند کەسێك نەبێ: کە زۆر بایەخی پێ‌ئەدەن، واتە: کەم کەس دەیتوانی (اَلْمُحَرَّر) لەبەر بکا.

(فَرَأَيْتُ) جا لە بەر ئەوەی (اَلْمُحَرَّر) بەم شێوەیە بوو، وام پێ باش بوو (اخْتِصَارَهُ فِي نَحْوِ نِصْفِ حَجْمِهِ) کورتی بکەمەوە لە وێنەی نیوە قەبارەی‌دا

لِيَسْهُلَ حِفْظُهُ مَعَ مَاأَضُمُّهُ إِلَيْهِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى مِنَ النَّفَائِسِ الْمُسْتَجَادَاتِ: مِنْهَا التَّنْبِيهُ عَلَى قُيُودٍ فِي بَعْضِ الْمَسَائِلِ هِيَ مِنَ الأَصْلِ مَحْذُوفاتٌ، وَمِنْهَا مَوَاضِعُ يَسِيرَةٌ ذَكَرَهَا فِي الْمُحَرَّرِ عَلَى خِلافِ الْمُخْتَارِ فِي الْمَذْهَبِ كما سَتَرَاهَا إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى وَاضِحات، وَمِنْهَا إِبْدَالُ مَا كَانَ مِنْ أَلْفَاظِهِ غَرِيباً أَوْ مُوهِماً خِلافَ الصَّوَابِ بِأَوْضَحَ وَأَخْصَرَ مِنْهُ بِعِبَارَاتٍ جَلِيّاتٍ، وَمِنْهَا بَيَانُ الْقَوْلَيْنِ وَالْوَجْهَيْنِ وَالطَّرِيقَيْنِ وَالنَّصِّ وَمَرَاتِبِ الْخِلافِ فِي جَمِيعِ الْحَالاتِ،

---

(لِيَسْهُلَ حِفْظُهُ) تاكو لەبەركردنی ئاسان بێ (مَعَ مَاأَضُمُّهُ إِلَيْهِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى مِنَ النَّفَائِسِ الْمُسْتَجَادَاتِ) لەگەڵ ئەو مەسەلە بەنرخو جوانانەی من لەگەڵ کورتکردنەوەکەدا دەینووسم:

(مِنْهَا) بەشێك لەو مەسەلە بەنرخانە (اَلتَّنْبِيهُ عَلَى قُيُودٍ فِي بَعْضِ الْمَسَائِلِ) ئاگادارکردنە: لە سەر چەند ناتۆرێکی جیاکەرەوە لە چەند مەسەلەیەکدا (هِيَ) ئەو چەند ناتۆرە (مِنَ الأَصْلِ) لە (اَلْمُحَرَّر)دا (مَحْذُوفاتٌ) نەگوتراون.

(وَمِنْهَا مَوَاضِعُ يَسِيرَةٌ) بەشێکیتر لەو مەسەلە بەنرخانە ئەوەیە: چەند شوێنێکی کەم هەنە: نزیکی پەنجا مەسەلەیە (ذَكَرَهَا فِي الْمُحَرَّرِ عَلَى خِلافِ الْمُخْتَارِ فِي الْمَذْهَبِ) ئیمامی(الرَّافعي) لە (اَلْمُحَرَّر)دا بە پێچەوانەی فەرموودە بەهێزەکەی مەزهەبی(شافعي) باسی کردون، منیش بەگوێرەی فەرموودە بەهێزەکە دەیانڵێم (كما سَتَرَاهَا إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى وَاضِحاتٍ) هەروەکو لەمەودوا دەیانبینی بە ئاشکرایی، ان شاء الله تعالى.

(وَمِنْهَا إِبْدَالُ مَا كَانَ مِنْ أَلْفَاظِهِ غَرِيباً) بە شێکیتر لەو مەسەلە بە نرخانە: گۆڕینی ئەو ووشە نامۆیانەیە: کە لە (اَلْمُحَرَّر)دا هەنە (أَوْ مُوهِماً خِلافَ الصَّوابِ) یان ووشەکان هەڵە ئەخەنە بیری خوێنەر (بِأَوْضَحَ وَأَخْصَرَ مِنْهُ بِعِبَارَاتٍ جَلِيَّاتٍ) دەیانگۆڕمەوە بە چەند ووشەیەکی ئاشکراترو کورتتر بە نووسینێکی ڕۆشن.

(وَمِنْهَا بَيَانُ الْقَوْلَيْنِ) بە شێکیتر ڕوونکردنەوەی فەرموودەکانی ئیمامی(شافعی)یە: ئایا کامەیان بەهێزە؟ (وَالْوَجْهَيْنِ) هەروەها ڕوونکردنەوەی فەرموودەکانی زانایانی مەزهەبی (شافعی)یە: ئایا کامەیان ڕاستە؟ (وَالطَّرِيقَيْنِ) ڕوونکردنەوەی ڕێگایەکانی گێڕانەوەی مەزهەبی (شافعی)یە: ئایا کامەیان مەزهەبی ڕاستەقینەیە؟

(وَالنَّصِّ) هەروەها ڕوونکردنەوەی دەقی فەرموودەی ئیمامی (شافعی)یە (وَمَرَاتِبِ الْخِلافِ فِي جَمِيعِ الْحَالاتِ) هەروەها ڕوونکردنەوەی پلەی جیاوازییە لە نێوان ئەو فەرموودانەدا: ئایا کامەیان بەهێزە، یان بەهێزترە، یان لاوازە:

فَحَيْثُ أَقُولُ: فيالأَظْهَرِ أَوْ اَلْمَشْهُور فَمِنَ الْقَوْلَيْنِ أَوِ الأَقْوال،فَإِنْ قَوِيَ الْخلاَفُ قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ، وَإِلاّ فَالْمَشْهُورُ، وَحَيْثُ أَقُولُ: اَلأَصَحُّ أَوْ اَلصَّحِيحُ فَمِنَ الْوَجْهَيْنِ أَوِ الأَوْجُه، فَإِنْ قَوِيَ الْخلاَفُ قُلْتُ: اَلأَصَحُّ وإلاّ فَالصَّحِيحُ، وَحَيْثُ أَقُولُ: اَلْمَذْهَبُ فَمِنَ الطَّرِيقَيْنِ أَوِ الطُّرُقِ، وَحَيْثُ أَقُولُ: اَلنَّصُّ فَهُوَ نَصُّ الشَّافِعِيِّ-رَحِمَهُ اللهُ تعالى-

---

(فَحَيْثُ أَقُولُ) كەوابو: لە هەر شوێنێكی ئەم كتێبەدا من بڵێم: (فيالأَظْهَرِ أَوْ اَلْمَشْهُورِ) واتە: ئەگەر یەكێكم لەم دوو ووشەیە گوت، ئەوە (فَمِنَ الْقَوْلَيْنِ أَوِ الأَقْوالِ) مەبەستم فەرموودە بەهێزەكەی گشت فەرموودەكانی ئیمامی(شافعي)یە ﷺ.

(فَإِنْ قَوِيَ الْخلاَفُ) جا ئەگەر فەرموودە بێهێزەكەی ئیمامی(شافعي)ﷺ بەڵگەی بەهێز بوو (قُلْتُ) دەڵێم: (اَلأَظْهَرُ)- ئاشكراتر، واتە: ئەم ووشەیە بەكار دێنم، چونكە فەرموودە بەهێزترەكە بەڵگەی ئاشكراترە، فەرموودەكەی بەرامبەریشی(ظاهر)-ئاشكرایە (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر فەرموودە بێهێزەكەی ئیمامی(شافعي)ﷺ بەڵگەی بەهێز نەبو (فَالْمَشْهُورُ) بۆ بەهێزەكە ئەم ووشەیە بەكار دێنم، واتە: ناسراو، چونكە بێهێزەكەی بەرامبەری نەناسراوەو ڕەفتاری پێناكرێ.

(وَحَيْثُ أَقُولُ) وە لە هەر شوێنێكی ئەم كتێبەدا بڵێم: (اَلأَصَحُّ أَوْ اَلصَّحِيحُ) واتە: یەكێك لەم دوو ووشەیە بەكار بێنم، ئەوە (فَمِنَ الْوَجْهَيْنِ أَوِ الأَوْجُهِ) مەبەستم فەرموودە بەهێزەكەی گشت فەرموودەكانی زانایانی مەزهەبی(شافعي)یە.

(فَإِنْ قَوِيَ الْخلاَفُ) جا ئەگەر فەرموودە بێهێزەكەی زانایانیمەزهەب بەڵگەی بەهێز بوو (قُلْتُ) دەڵێم: (اَلأَصَحُّ)-ڕاستتر، واتە: ئەم ووشەیە بەكار دێنم، چونكە فەرموودە بەهێزترەكە بەڵگەی ڕاسترەو فەرموودەكەی بەرامبەریشی (صحیح)-ڕاستە (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر فەرموودە بێهێزەكەی زانایان بەڵگەی بەهێز نەبو (فَالصَّحِيحُ) بۆ بەهێزەكە ئەم ووشەیە بەكار دێنم، واتە: ڕاست، چونكە بێهێزەكەی بەرامبەری ڕاست نیەو ڕەفتاری پێناكرێ.

(وَحَيْثُ أَقُولُ) لە هەر شوێنێكی ئەم كتێبەدا بڵێم: (اَلْمَذْهَبُ)، واتە: ئەم ووشەیە بەكار بێنم، ئەوە (فَمِنَ الطَّرِيقَيْنِ أَوِ الطُّرُقِ) مەبەستم گێڕانەوە بەهێزەكەی ئەو زانایانەیە: كە مەزهەبی (الشَّافِعِي) دەگێڕنەوە، واتە: لە مەزهەبی (شافعی)دا تەنها فەرموودەكانی بەهێزو گێڕانەوەكانی بەهێز بۆ دادكردنو (فتوا)دان بەكاردێن، هەروەك لە پێشەكیەكەدا ڕوونمان كردۆتەوە.

(وَحَيْثُ أَقُولُ) وە لە هەر شوێنێكی ئەم كتێبەدا بڵێم: (اَلنَّصُّ)، واتە: ئەم ووشەیە بەكار بێنم (فَهُوَ) ئەوە مەبەستم (نَصُّ الشَّافِعِيِّ-رَحِمَهُ اللهُ تعالى-) دەقی فەرموودەی ئیمامی

وَيَكُونُ هُنَاكَ وَجْهٌ ضَعِيفٌ أَوْ قَوْلٌ مُخَرَّجٌ، وَحَيْثُ أَقُولُ: اَلْجَدِيدُ فَالْقَدِيمُ خِلاَفُـهُ، أَوِ الْقَدِيمُ أَوْ فِي قَوْلٍ قَدِيمٍ فَالْجَدِيدُ خِلاَفُه، وَحَيْثُ أَقُولُ: وَقِيلَ كَذَا فَهُوَ وَجْـهٌ ضَـعِيفٌ وَالصَّحِيحُ أَوِ الأَصَحُّ خِلاَفُهُ،

---

(شافعي)یەﷺ (وَيَكُونُ هُنَاكَ وَجْهٌ ضَعِيفٌ) وا دەبێ: لە بەرامبەر فەرموودەی ئیمامی(شافعي)ش فەرموودەیەکی بێهێزی زانایەك هەیە، بەڵام ڕەفتاری پێناکرێ (أَوْ قَوْلٌ مُخَرَّجٌ) یان فەرموودەیەکیوەرگیراو-لە فەرموودەی(شافعي)- هەیە بەڵام بێهێزەو ڕەفتاری پێناکرێ.

(وَحَيْثُ أَقُولُ) وە لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا بڵێم: (اَلْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی ئیمامی (شافعي)ﷺ ئەوهایە (فَالْقَدِيمُ خِلاَفُهُ) ئەوە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي) بە پێچەوانەی نوێیەکەیە (أَوِ الْقَدِيمُ أَوْ فِي قَوْلٍ قَدِيمٍ) یان ئەگەر بڵێم: فەرموودەیکۆن، یان لە فەرموودەیەکی کۆنی ئیمامی(شافعي)دا ئەو هایە (فَالْجَدِيدُ خِلاَفُه) ئەوە فەرموودەکەی نوێ بە پێچەوانەیەتی، بەڵام ڕەفتاریش هەر بە فەرموودەکەی نوێی ئیمامی(شافعي) دەکرێ، تەنها لە چەند شوێنێکدا نەبێ: کە لە (منهاج)دا زۆربەیان باس ئەکرێن،ان شاء الله تعالى.

( **پێناسە** ): فەرموودەیکۆن=(الْقَدِيم) ئەو فەرموودەیە: کە ئیمامی(شافعي) لە (عێراق)دا پێش چوونە (مصر) فەرموویەتی، ئیمام (احمد بن حنبل)و (الزعفراني)و (الكرابيسي)و (أبوثور) گێڕاویەتیانەوە، بەڵام ئیمامی(شافعي) لە فەرموودەی کۆن=(الْقَدِيم) پەشیمان بووەتەوە. فەرموودەی نوێ=(الْجَدِيد) ئەو فەرموودەیە: کە ئیمامی(شافعي) لە دوای چوونی بۆ (مصر) فەرموویەتی، ئیمامی(البويطي)و (المزني)و (الربيع المرادي)و (حرملة)و چەند زانایەکیتر گێڕاویەتیانەوە.

ئیمامی (النواوی) لە (المجموع)دا دەفەرموێ: لە هەر مەسەلەیەکدا دوو فەرموودەی کۆنو نوێی ئیمامی(شافعي) هەبن، ئەوە نوێیەکە ڕاستەو ڕەفتاری پێدەکرێ، چونکە لە فەرموودەکەی کۆن پەشیمان بووەتەوە، ئینجا دەفەرموێ: بەڵام ئەگەر فەرموودەیەکی کۆنی ئیمامی(شافعي) حەدیسێکی(صحيح) -بێ ڕووبەڕووبوونەوە- پشتی بگرێ، ئەوە مەزهەبی(شافعي)یە ئەگەر مەرجە ڕابردووەکانی فەرموودەکەی (إذا صَحَّ الْحديثُ فَهُوَ مَذْهَبِي)ی لێبێنە جێ.

(وَحَيْثُ أَقُولُ) وە لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا بڵێم: (وَقِيلَ كَذا) ئەوها گوتراوە، واتە ووشەی (قِيلَ)م بەکار هێنا (فَهُو وَجْهٌ ضَعِيفٌ) ئەوە نیشانەیە: کە فەرموودەیەکی بێهێزە (وَالصَّحِيحُ أَوِ الأَصَحُّ خِلاَفُهُ) فەرموودەی بەهێزی، یان بەهێزتری زانایانی مەزهەب بە پێچەوانەیەتی.

وَحَيْثُ أَقُولُ: وَفِي قَوْلٍ كَذا، فَالرّاجِحُ خِلافُهُ. وَمِنْها مَسائِلُ نَفِيسَةٌ أَضُمُّها إِلَيْهِ يَنْبَغِي أَنْ لاّ يُخْلَى الْكِتابُ مِنْها، وَأَقُولُ فِي أَوَّلِها: قُلْتُ، وَفِي آخِرِها: وَاللهُ أَعْلَمُ، وَما وَجَدْتَهُ مِنْ زِيادَةِ لَفْظَةٍ وَنَحْوِها عَلى ما فِيالْمُحَرَّرِ فَاعْتَمِدْها فَلابُدَّ مِنْها، وَكَذلِكَ ما وَجَدْتَهُ مِنَ الْأَذْكارِ مُخالِفاً لِما فِيالْمُحَرَّرِ وَغَيْرِهِ مِنْ كُتُبِ الْفِقْهِ فَاعْتَمِدْهُ فَإِنِّي حَقَّقْتُهُ مِنْ كُتُبِ الْحَدِيثِ الْمُعْتَمَدَةِ، وَقَدْ أُقَدِّمُ بَعْضَ مَسائِلِ الْفَصْلِ لِمُناسَبَةٍ أَوْ اخْتِصارٍ وَرُبَّما قَدَّمْتُ فَصْلاً لِلْمُناسَبَةِ، وَأَرْجُو إِنْ تَمَّ هَذاالْمُخْتَصَرُ أَنْ يَكُونَ فِي مَعْنَىالشَّرْحِ لِلْمُحَرَّرِ، فَإِنِّي لاأَحْذِفُ مِنْهُ شَيْئاً

---

(وَحَيْثُ أَقُولُ) وه له هه‌ر شوێنێکدا بڵێم: (وَفِي قَوْلٍ كَذا) له فه‌رمووده‌یه‌کدا ئه‌وهایه (فَالرّاجِحُ خِلافُهُ) ئه‌وه فه‌رمووده‌که‌ی به‌هێزی ئیمامی(شافعي) به پێچه‌وانه‌یه‌تی.

(وَمِنْها) هه‌ندێکی‌تر له‌و مه‌سه‌لانه‌ی من زیادم کردون: (مَسائِلُ نَفِيسَةٌ) چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌کی به‌نرخن (أَضُمُّها إِلَيْهِ) ده‌یانهێنمه ناو (مِنْهاج)، چونکه له (الْمحَرّر)دا نه‌گوتراون‌و (يَنْبَغِي أَنْ لاّ يُخْلَىالْكِتابُ مِنْها) پێویسته ئه‌م کتێبه لێیان چۆل نه‌کرێ (وَأَقُولُ فِي أَوَّلِها: قُلْتُ) له سه‌ره‌تای ئه‌و مه‌سه‌لانه‌دا، ده‌ڵێم: من گوتومه، واته: ڕسته‌ی(قُلْتُ) به‌کار دێنم-ئێمه‌ش له واته‌که‌ی‌دا ده‌ڵێین: ئیمامی(النواوي) ده‌فه‌رموێ- (وَفِي آخِرِها: وَاللهُ أَعْلَم) وه له کۆتاییشدا ڕسته‌ی (وَاللهُ أَعْلَم) به کاردێنم، واته: خوا زاناتره.

(وَما وَجَدْتَهُ) هه‌رچی له (مِنْهاج)دا دیتت (مِنْ زِيادَةِ لَفْظَةٍ وَنَحْوِها) ده‌رباره‌ی ووشه‌یه‌کی، یان پیتێکی زیادکراو (عَلى ما فِيالْمُحَرَّرِ) له سه‌ر کتێبی (المحرر)، (فَاعْتَمِدْها فَلابُدَّ مِنْها) پشتی پێ ببه‌سته چونکه ئه‌م زێده‌یه پێویسته (وَكَذلِكَ ما وَجَدْتَهُ مِنَ الْأَذْكارِ) هه‌روه‌ها هه‌ر زیکرێکت بینی (مُخالِفاً لِما فِيالْمُحَرَّرِ وَغَيْرِهِ مِنْ كُتُبِ الْفِقْهِ) جیاواز بوو له گه‌ڵ ئه‌و زیکرانه‌ی له (المحرر)و کتێبه شه‌رعیه‌کانی‌تردا گوتراون (فَاعْتَمِدْهُ) پشتی پێ ببه‌سته (فَإِنِّي حَقَّقْتُهُ مِنْ كُتُبِ الْحَدِيثِ الْمُعْتَمَدَةِ) چونکه من له کتێبه باوه‌ڕپێکراوه‌کانی حه‌دیس وه‌رم گرتوه (وَقَدْ أُقَدِّمُ بَعْضَ مَسائِلِ الْفَصْلِ لِمُناسَبَةٍ أَوْ اخْتِصارٍ) جاری وا هه‌یه: هه‌ندێك مه‌سه‌له‌ی به‌شێك به پێش دێخم: یان له به‌ر وێکچون، یان بۆ کورتی (وَرُبَّما قَدَّمْتُ فَصْلاً لِلْمُناسَبَةِ) هه‌ندێ جار به‌شێك به ته‌واوی به پێش دێخم له به‌ر وێکچون.

(وَأَرْجُو إِنْ تَمَّ هَذاالْمُخْتَصَرُ) تکام وایه: ئه‌گه‌ر ئه‌م کتێبه کورتکراوه‌یه ته‌واو ببێ (أَنْ يَكُونَ فِي مَعْنَىالشَّرْحِ لِلْمُحَرَّرِ) ببێته شێوه‌ی ڕوونکردنه‌وه بۆ (المحرر)-ئێمه‌ش ده‌ڵێین: (اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ) کتێبه‌که ته‌واو بوو و ناویشی لێناوه: (اَلْمِنهاج)، خودا یارمه‌تی ئێمه‌ش بدا بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی، آمین- (فَإِنِّي لاأَحْذِفُ مِنْهُ شَيْئاً) چونکه من هیچ له (المحرر) لانابه‌م

مِنَ الْأَحْكامِ أَصْلاً وَلاَ مِنَ الْخِلاَفِ وَلَوْ كَانَ وَاهِياً مع مَا أَشَرْتُ إِلَيْهِ مِنَ النَّفَائِسِ، وَقَدْ شَرَعْتُ فِي جَمْعِ جُزْءٍ لَطِيفٍ عَلَى صُورَةِ الشَّرْحِ لِدَقَائِقِ هذَاالْمُخْتَصَرِ وَمَقْصُودِي بِـهِ التَّنْبِيهُ عَلَىالْحِكْمَةِ فِيالْعُدُولِ عَنْ عِبارَةِالْمُحَرَّرِ وَفِيإِلْحاقِ قَيْدٍ أَوْ حَـرْفٍ أَوْ شَـرْطٍ لِلْمَسْئَلَةِ وَنَحْوِ ذلِكَ وَأَكْثَرُ ذلِكَ مِنَ الضَّرُورِيَّاتِ الَّتِي لاَبُدَّ مِنْهَا، وَعَلَـىاللهِ الْكَـرِيمِ اعْتِمادِي وَإِلَيْهِ تَفْوِيضِي وَاسْتِنَادِي وَأَسْأَلُهُ النَّفْعَ بِهِ لِي وَلِسَائِرِالْمُسْلِمِينَ وَرِضْوَانَهُ عَنِّي وَعَنْ أَحِبَّائِي وَجَمِيعِ الْمُؤْمِنِينَ.

---

(مِنَ الْأَحْكامِ أَصْلاً) نه له بڕیارەکانو (وَلاَ مِنَ الْخِلاَفِ وَلَوْ كَانَ وَاهِياً) نـه لـه فـەرمووده جیاوازەکان هەر چەند جیاوازیەکەش زۆر بێهێـز بـێ (مَعَ مَا أَشَرْتُ إِلَيْهِ مِنَ النَّفَائِسِ) گشتی دەڵێم له گەڵ ئەو مەسەله بەنرخانەی باسمان کردن.

(وَقَدْ شَرَعْتُ فِي جَمْعِ جُزْءٍ لَطِيفٍ) هـەر لەگـەڵ دەسـت پێکردنـی(المنهـاج)دا دەسـتم بـه کۆکردنـەوەی پـەڕتووکێکی بچـکۆلەش کـرد (عَلَـى صُـورَةِ الشَّـرْحِ) لـه سـەر شـێوەی ڕوونکردنەوە (لِدَقَائِقِ هذَاالْمُخْتَصَرِ) بۆ ووردەکاری ئەم کورتکراوەیـە: کـه (منهـاج)ی پـێ دەگوترێ، کتێبه بچکۆلەکەش پێی دەگوترێ: (دَقَائِقُ الْمِنْهاجِ).

(وَمَقْصُودِي بِهِ) وه مەبەستم بەم پەڕتووکەی(دقائق)، (التَّنْبِيهُ عَلَى الْحِكْمَةِ فِيالْعُدُولِ عَنْ عِبارَةِالْمُحَرَّرِ) ئاگادارکردنەوەیە: له هـۆی لادانم لـه نووسـینی (المحـرر) بـۆ نووسـینێکیتر (وَفِي إِلْحاقِ قَيْدٍ أَوْ حَرْفٍ أَوْ شَرْطٍ لِلْمَسْئَلَةِ) هـەروەها: ئاگادارکردنەوەیـە: لـه هۆیـەکانی زیادکردنی ناتۆرێکی جیاکەرەوە، یان پیتێـك، یـان مـەرجێك بۆ مەسـەلەکە (وَنَحْـوِ ذلِـكَ) چەند شـتێکیتری لـەم بابەتـەش (وَأَكْثَـرُ ذلِـكَ مِـنَ الضَّـرُورِيَّاتِ الَّتِـي لاَبُـدَّ مِنْهَـا) زۆربـەی ئەوانەی باسمان کردن لەو ناچاریانەن: که پێویسته بگوترێن.

(وَعَلَىاللهِ الْكَرِيمِ اعْتِمادِي) پشت بەستنم تەنها به خـوای زێـده بەخشـه (وَإِلَيْـهِ تَفْوِيضِـي) کاری خۆم تەنها به خوا دەسپێرم (وَاسْتِنَادِي) پشتی خۆم تـەنها بـه خـوا بـەهێز دەکـەم (وَأَسْأَلُهُ النَّفْعَ بِهِ لِي) داوای سودی ئەم کتێبه له خوا دەکەم: بۆ خۆمو (وَلِسَائِرِالْمُسْلِمِينَ) بۆ سەرجەم موسڵمانان (وَرِضْوَانَهُ عَنِّي وَعَنْ أَحِبَّائِي وَجَمِيعِ الْمُؤْمِنِينَ) داوای ڕازیبوون له خوا دەکەم: له خۆمو له خۆشەویستانمو له گشـت ئیمانـداران. بێگومـان ئێمەیهـەزاریش ئیمانداریـنو دوعایەکه ئێمەش دەگرێتەوە، آمین.

لێرەدا پێشـەکیەکەی (مِنْهـاج)ی ئیمـامی (النـواوي) تـەواو بـوو، ئینجـا دەسـت بـه ناوەڕۆکی (منهاج) دەکاو دەفەرموێ:

# (كتابُ الطَّهارَة)

**قال اللهُ تَعالى: وَأَنْزَلْنا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً. يُشْتَرَطُ لِرَفْعِ الْحَدَثِ وَالنَّجَسِ مَاءٌ مُطْلَقٌ وَهُوَ ما يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ مَاءٍ بِلاَ قَيْدٍ،**

---

## ﴿ كِتابُ الطَّهارَةِ: ئەم پەڕتووكە باسی پاككردنەوە دەكا ﴾

**واتە: لابردنی پیسیو بێدەستنوێژیی گەورەو بچوك.**

(قَالَ اللهُ تَعَالَى) خوایگەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّماءِ ماءً طَهُوراً﴾ ئێمە لە ئاسمانەوە ئاوێكی پاككەرەوەمان دابەزاندۆتە خوارەوە.

(يُشْتَرَطُ) لە شەریعەتیئیسلامدا بە مەرج دادەندرێ (لِرَفْعِ الْحَدَثِ) بۆ لابردنی بێدەستنوێژیی گەورەو بچوك (وَالنَّجَسِ) هەروەها بۆ لابردنی پیسی (ماءٌ مُطْلَقٌ) دەبی ئاوێكی ڕووت بە كار بهێندرێ ﴿عن أبي‌هريرة‌ﷺ: بالَ أَعْرابِيٌّ فِي‌الْمَسْجِدِ فَتَناوَلَهُ النّاسُ، فَقالَ لَهُمُ النَّبِيُّ‌ﷺ: دَعُوهُ وَهَرِيقُوا عَلى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوتدا كردو خەڵكیش لێیان قیڕاند، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وازی لێبێنن‌و دۆلچەیەكی ئاو بڕژێننە سەر میزەكەی.

(وَهُوَ) ئاوی ڕووت (مايَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ ماءٍ بِلاقَيْدٍ) ئەو ئاوەیە: ناوی ئاوی بۆ بگوترێ بە بێناتۆرەی پێویست، واتە: ئەگەر (قَيْد)-ناتۆرەكە پێویست نەبو لە گەڵ ئاوەكەدا بگوترێ، ئەوە هەر بە ئاوی ڕووت ناو ئەبرێ، وەكو یەكێك لەم حەفت ئاوانە، یان دڵۆپەی هەڵمی یەكێك لەم حەفتانە: كە سێیان ئاوی ئاسمانن: وەكو ئاوی باران‌و بەفرو تەزرە، بە بەڵگەی ئایەتەكەیڕابردوو و دوعای پێغەمبەرﷺ: ﴿اَللّهُمَّ اغْسِلْ خَطاياي بِالْماءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ﴾ رواه الشيخان، خوایە تاوانەكانم بشورێنە بە ئاو و بەفرو تەزرە.

چوارەكەیتریش ئاوی زەمینن: وەكو ئاوی ڕوبارو سەرچاوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهْراً بِبابِ أَحَدِكُمْ يَغْتَسِلُ مِنْهُ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرّاتٍ، هَلْ يَبْقَى مِنْ دَرَنِهِ شَيْءٌ؟﴾ الحديث رواه الشيخان، پێم بڵێن ئەگەر ڕوبارێك لە بەر دەرگەی یەكێكتان بێ‌و هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێبشۆرێ، ئایا هیچ چڵكی پێوە دەمێنێ؟.

هەروەها ئاویدەریا، پێغەمبەرﷺ دەرهەقی دەریا دەفەرموێ: ﴿هُوَالطَّهُورُ ماؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ﴾ رواه‌أصحاب السنن بسندصحيح، ئاوی دەریا پاككەرەوەیەو مردووەكەشی حەڵاڵە.

هەروەها ئاوی بیر، پێغەمبەرﷺ دەرهەقی بیری (بُضاعَة) دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْماءَ طَهُورٌ لايُنَجِّسُهُ شَيْءٌ﴾ صححه الامام احمد، ئاوی ئەم بیرە پاككەرەوەیەو هیچ شتێك پیسی ناكا. واتە: چونكە لە (قُلَّتَيْن) زۆرترە.

فَالْمُتَغَيِّرُ بِمُسْتَغْنًىعَنْهُ كَزَعْفَرَانٍ تَغَيُّراً يَمْنَعُ إِطْلَاقَ اسْمِ الْماءِ غَيْرُ طَهُورٍ، وَلَايَضُرُّ تَغَيُّرٌ لَايَمْنَعُ الاِسْمَ،

---

بەڵام ئەگەر ناتۆرەکە پێویست بوو: وەکو ماستاو، ئەوە بە ئاوی ڕووت ناو نابرێو پاککەرەوە نیە، هەروەك دەفەرموێ: (فَالْمُتَغَيِّرُ) کەوابو: هەر ئاوێك-زۆر بێ، یان کەم بێ- ڕەنگ، یان تام، یان بۆنی بگۆڕێ (بِمُسْتَغْنًىعَنْهُ) بە شتێکی پاك، کە تێکەڵی ئاو ببێو ئاویش پێویستی پێی نەبێ (كَزَعْفَرانٍ) وەکو زەعفەرانو نەفتو دیتۆڵو خۆێی چیاییو ماستو چایەو بەری درەختو هەر جۆرە دەرمانێکو...هتد (تَغَيُّراً) بە ئەندازەیەکی وەها زۆر بگۆڕێ: کە (يَمْنَعُ إِطْلَاقَ اسْمِ الْماءِ) قەدەغە بکا پێی بگوترێ: ئاو (غيرُ طَهُورٍ) ئەم ئاوە گۆڕاوە-هەرچەند پاکە- بەڵام پاککەرەوە نیەو پێی ناگوترێ: ئاوی ڕووت، کەواتە: بۆ دەستنوێژو لابردنی پیسی بەکار نایێ.

ئینجا بزانە: جگە لە ئاویڕووت، هیچ شلەیەکیتر-وەکو سرکەو ئاوی میوەو ئاوی درەختو گوڵاو و نەفتو بەنزینو دیتۆڵو...هتد: ئەم جۆرە شلانە-نە دەستنوێژیان پێ دەشۆرێو نە پیسییان پێ پاك دەبێتەوە، چونکە خوایگەورە دەربارەیدەستنوێژ دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِدوا ماءً فَتَيَمَّمُوا﴾ ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت تەیەمموم بکەن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ لە بارەی میزی پیاوەکەیڕابردوو فەرمووی: ﴿هَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشيخان، دۆڵچەیەکی ئاو بڕژێننە سەر میزەکەی.

هەروەها دەربارەی خوێنیحەیز فەرمووی: ﴿تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْماءِ ثُمَّ تَنْضَحُهُ ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ﴾ رواه الشيخان، خوێن لە جلەکەی دەڕنێ، ئینجا لە گەڵ ئاودا هەڵیدەگوشێ، ئینجا بە ئاو دەیشۆرێ، ئینجا نوێژی پێوە دەکا.

واتە: لە ئایەتەکەدا فەرمان بە تەیەمموم کراوەو لە حەدیسەکانیشدا فەرمان بە شۆرینی بە ئاو کراوە، کەوابو: هەر کەسێك لە شۆریندا، یان لە دەستنوێژدا، شلەیەکی جگە لە ئاو بە کار بێنێ، ئەوە فەرمانی خواو پێغەمبەریﷺ جێبەجێ نەکردوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلا يَضُرُّ) زەرەر لە ئاوی پاککەرەوە نادا (تَغَيُّرٌ) گۆڕانێکیکەم، بە شتێکیپاك: کە (لا يَمْنَعُ الإِسْمَ) ناوی ئاو قەدەغە نەکا: وەکو کەمێك ماست، یان شتێکیتری پاك بکەوێتە ناو ئاو و کەمێك بیگۆڕێ ﴿عن أُمِ هانيٍرَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّهُﷺ اغْتَسَلَ هُوَ وَمَيْمُونَةُ مِنْ قَصْعَةٍ فِيها أَثَرُ الْعَجِينِ﴾ إسناده على شرط الصحيح رواه ابن ماجه والنسائي، پێغەمبەروﷺ (ميمونة)رَضِيَ اللهُ عَنها لە ئاوی تەشتێك-کە ئاسەواری هەویری پێوە بوو- خۆیان شۆرد.

وَلاَ مُتَغَيِّرٌ بِمُكْثٍ وَطِينٍ وَطُحْلُبٍ وَمَا فِي مَقَرِّهِ وَمَمَرِّهِ، وَكَذَا مُتَغَيِّرٌ بِمُجَاوِرٍ كَعُودٍ وَدُهْنٍ أَوْ بِتُرَابٍ طُرِحَ فِيهِ فِي الأَظْهَرِ،

(وَلاَ مُتَغَيِّرٌ) هەروەها زەرەری نیە گۆڕانی ئاوێك، كە (بِمُكْثٍ) گۆڕانەكەی بە هۆی زۆر وەستانەوە بێ، هەرچەند ڕەنگو تامو بۆنیشی زۆر گۆڕابێ (وَطِينٍ) هەروەها زیانی نیە كە بە هۆی قوڕ گۆڕابێ (وَطُحْلُبٍ) هەروەها زیانی نیە كە بە هۆی قەوزە سەوزەكەی ئاو گۆڕابێ، یان بە هۆی گەڵای درەخت گۆڕابێ، بەو مەرجەی بە خۆی بكەوێتە ناو ئاوەكە، هەر چەند درەختەكەش لە ئاوەكە دوور بێو گەڵایەكەشی لە ناو ئاوەكەدا ڕزیبێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا گوتراوە.

(وَمَا فِي مَقَرِّهِ) هەروەها زەرەری نیە گۆڕانی ئاو بە شتێكی پاك: كە لە شوێنی وەستانی ئاوەكەدا بێ: وەكو ئەو ئاوەی بگۆڕێ بە هۆی كوندەیەك كە بە جەفت خۆش كرابێ، یان بە هۆی مەشكەیەك كە ماستی لێ بەتاڵ كرابێ، یان بەهۆی بەرمیلێك، یان تەنكەرێك كە نەفتو بەنزینو ڕونی لێ بەتاڵ كرابێ.

(وَمَمَرِّهِ) هەروەها زەرەری نیە گۆڕانی ئاو بە هۆی شتێكی پاك: كە لە جۆگەی ئاوەكەدا بێ: وەكو كانگەی گۆگردو نەفتو خوێچیاییو ئەو جۆرە شتانەی دەكەونە ڕێگەی ئاو، چونكە پاراستنی ئاو لەو جۆرە گۆڕانانەیڕابردوو، زەحمەتە.

(وكذا مُتَغَيِّرٌ) هەروەها زەرەری پێناكەوێ: ئاوێك كە گۆڕابێ (بِمُجاوِرٍ) بە هۆی شتێكی پاك، كە تێكەڵی ئاو نەبێ–هەروەك لە (المهذب)دا وەهای فەرمووە– (كَعُودٍ وَدُهْنٍ) وەكو دارو ڕون، هەرچەند بۆنیشیان هەبێو گۆڕانەكەش زۆر بێ، یان وەكو دانەوێڵەو ئەو جۆرە شتانەی هیچ بەشێكیان لێ جیا نابێتەوەو تێكەڵی ئاو نابێ.

بەڵام ئەگەر دانەوێڵەكە بە هۆی كوڵاندن تێكەڵی ئاو بوو و گۆڕاندی، یان هەر بە خۆی بەشێكی لێ جیا بۆوەو تێكەڵی ئاو بوو و گۆڕاندی: وەكو مێوژو قەیسیو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە ئەگەر گۆڕانەكە زۆر بوو، زەرەری هەیە، ئەگەر نا: زەرەری نیە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا وەهایان ڕوون كردۆتەوە.

(أَوْ بِتُرَابٍ طُرِحَ فِيهِ) یان گۆڕانەكەی بە هۆی گڵێكیپاك بێ، هەر چەند گڵەكەش بە دەست فڕێ بدرێتە ناو ئاوەكەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودە بەهێزترەكەی ئیمامی (شافعي)دا زەرەری نیە، چونكە گڵیش وەكو ئاو پاككەرەوەیە، هەروەها خوێی ئاوی– وەكو گڵ– زەرەری نیە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر هاتو: شلەیەكی پاكی هاوچەشنیئاو، تێكەڵی ئاو بوو: وەكو ئاوی درەختو ئاویگوڵ كە بۆنی نەمابێ، ئاوەكە پیس نابێ، بەڵام سوننەتە شلەكە وەك

دڕێکی ناوەنجی ئەندازەی بۆدابندرێ، واتـە: دەڵێین: ئەگـەر بـە ئەنـدازەی ئـەم شـلەیە، ئاوی هەنار، یان ئاوی ترێ، یان گیای بۆژانە تێکەڵی ئـەم ئـاوە بکـرێ، ئایـا ڕەنـگ، یـان تام، یان بۆنی دەگۆڕێ، یـان نـا؟ ئەگـەر دامانـنـا: زۆر دەیگـۆڕی، ئـەوە ئاوەکـە لـە کـار دەکەوێ، ئەگەر نەیدەگۆڕی، یان گۆڕانەکەی کەم بوو، ئەوە زەرەری نیە.

ئینجا بزانە: ئاوی (مُسْتَعْمَل)، واتـە: بـەکارهاتوو، هـەمان بڕیـاری بـۆ دەدرێ، بـەڵام بـەو مەرجەی بکەوێتە ناو ئاوێکی کەمتر لە (قُلَّتَيْن)و هەردووکیان بە یەکەوە نەگەنە (قُلَّتين)، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و (شرواني)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

(ويُكْرَهُ) ناپەسندە بەکارهێنانی ئاوی (الْمُشَمَّسُ) واتە: ئەو ئاوەی بە گـەرمایی تیشـکی ڕۆژ لە قاپێکی ئاسن، یان مس، یان سفردا گەرم بوبێ، لە وڵاتێکی وەهادا: کە پلەی گـەرمی‌ی زۆر بەهێز بێ، ئینجا بزانە: بەکارهێنانی ئەم ئاوە، تەنها بۆ لاشەی مرۆڤ، لە کاتی گـەرمی‌دا ناپەسندە، چونکە مەترسی بەڵەکبوونی لێدەکرێ-هەروەك ئیمامی(عمرﷺ) فەرموویـەتی- کەواتە: ئەگەر لە ناو گۆزە، یان حەوز، یان کوندە، یان نایلۆنـدا گـەرم بـوو، یـان بـە ئـاگرو هیتەری‌کارەبا لە ناو ئاسن‌و سـفردا گـەرم کـرا، یـان پلـەی گـەرمی شـوێنەکە بـەهێز نـەبو، بەکارهێنانی ئەوانە هیچیان ناپەسند نیە.

## ﴿ ئاوی (مُسْتَعْمَل): بەکارهاتوو ﴾

(وَالْمُسْـتَعْمَلُ) ئـاوی بـەکارهاتوو-کـە لـە (قُلَّتَـيْن) کـەمتر بـێ- و (فِـي فَـرْضِ الطَّهـارَةِ) لـە پاککردنەوەیەکی واجبدا بەکار هاتبێ: وەك جاری یەکەمی دەستنوێژی واجب، یان غوسـلی واجـب (قِيـلَ) لـە فەرموودەیـەکی بێهێـزدا گـوتراوە: (وَنَفْلِهـا) ئـەو ئـاوەی لـە سـوننەتی دەستنوێژو غوسلیش بەکار هاتوە، هەر یەکێك لەم دوو جۆرە ئاوە پاکە، بەڵام (غَيْرُ طَهُورٍ) هیچێك لەم دووانە پاککەرەوە نیە (فِيالْجَدِيدِ) لە فـەرموودەی نـوێی ئیمـامی (شـافعي)دا، واتە: هەر چەند پاکە، بەڵام بۆ دەستنوێژو غوسلێکی‌تر بە کار نایێ‌و پیسیشی پێ لاناچـێ، ئیمامی (النواوي) لە (المجموع)دا بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە:

﴿پێغەمبەروﷺ (صحابة)کانﷺ لـە سـەفەرە زۆرەکانیانـدا پێویسـتیان بـە ئـاو دەبـو، ئاوی (مُستعمَل)- بەکارهاتوویان کۆ نەدەکردەوەو جارێکی‌تر بـە کاریـان نـەدەهێنا﴾.

واتە: تەیەمومیان دەکرد، هەروەك لە (المَحلِي)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: لە فەرموودەی بەهێزی‌نوێدا: تەنها ئەو ئاوەی لـە پاککردنەوەیـەکی واجبـدا بەکار هاتبێ بـە (مُسْـتَعْمل) دادەنـدرێ، کەواتـە: ئـاوی بـەکارهاتوو لـە پاککردنەوەیـەکی

سوننەتدا: وەکو ئاوی دەستنوێژی‌نوێکراوەو غوسلی‌سوننەت‌و ئاوی جاری دووەم‌و سێیەمی غوسل‌و دەستنوێژ، (مُسْتَعْمَل) نیە، بەڵکو پاکەو پاککەرەوەشە، هەروەك لە (المَحلِّي)و (مغني)دا فەرموویانە.

(فَإِنْ جُمِعَ) جا ئەگەر ئاوی (مُسْتعمل)=بەکارهاتوو کۆ کراوە لە ناو بەرمیلێك، یان لە ناو حەوزێکدا (فَبَلَغَ قُلَّتَيْنِ) جا ئەوەندە زۆر بوو، تا گەیشتە قوللەتێن (فَطَهُورٌ) ئاوەکە دەبێتە پاککەرەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی‌ڕاستتردا، واتە: بۆ دەستنوێژو غوسل‌و لابردنی پیسی بەکار دێ، هەر چەند لە مەودواش بە هۆی هەڵێنجان کەم ببێتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: هەر کاتێك ئاو لە ئەندامە شۆراوەکە جیا بۆوە دەبێتە (مُسْتَعْمَل)، کەوابو: ئەگەر بە ئاوێکی کەمتر لە (قُلَّتَيْن) غوسلی کرد، یان دەستنوێژی گرت، واجبە: ئاگادار بێ: پرۆشکەکانی ئاوشۆرەکە نەکەونە ناو ئاوەکە، چونکە ئەگەر پرۆشکەکان زۆر بن، ئاوەکە لە کار دێخن، بەڵام پیسی ناکەن، هەروەك لە ئاگاداریەکەی‌ڕابردوودا باسمان کرد.

هەروەها لە دوای نیەتی غوسل‌و لە دوای کۆتایی چاوشۆردن لە دەستنوێژدا واجبە بە نیەتی ئاودەرهێنان دەستی‌خۆی بخاتە ناو ئاوە کەمەکەو ئاو دەربێنی‌و بەکاری بێنی، نەوەکو ببێتە (مُستَعمل)و بۆ ئەندامەکانی‌تری لە کار بکەوێ، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە ﴿عن أَبِي‌هريرةﷺ: قال رَسُولُ اللهِﷺ: لايَغْتَسِلْ أَحَدُكُمْ فِي الْماءِ الدّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ، فَقال: كَيْفَ يَفْعَلُ يا أباهُرَيْرَةَ؟ قال: يَتَناوَلُهُ تَناوُلاً﴾ رواەمسلم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کەستان لە ناو ئاوی وەستاودا غوسلی (جنابة) نەکا-(واتە: چونکە ئەگەر ئاوەکە لە (قُلَّتَيْن) کەمتر بێ لە کار دەکەوێ)- بە (أبي‌هريرة)یان گوت: ئەی چۆن خۆی بشۆرێ؟ فەرمووی: بە دەست ئاوەکە دەربێنێ.

ئینجا بزانە: لە (المجموع)دا دەفەرموێ: لاشەی جەنابەتدار بە یەك ئەندام دادەندرێ، کەوابو: هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: ئەگەر هاتو لە ناو ئاوێکی کەمتر لە (قُلَّتَيْن)دا دەستنوێژی گرت، یان غوسلی کرد، ئەگەر لە دوای خۆ نقومکردن نیەتی هێنا، ئەوە دەستنوێژو غوسلی‌دروستن‌و ئاوەکەش دەبێتە (مُسْتَعْمَل).

هەروەها: ئەگەر تا ئەژنۆی چووە ناو ئاوەکە، ئینجا نیەتی هێنا، ئینجا بە تەواوی خۆی نقوم کرد، دیسان دەستنوێژو غوسلی دروستن‌و ئاوەکەش دەبێتە (مُسْتَعمل)، بەڵام ئەگەر بە تەواوی خۆی نقوم نەکرد بەڵکو هاتە دەرەوە، ئەوە تەنها ئەو بەشەی کەوتۆتە ناو ئاوەکە غوسلی دەردەچێ، واتە: چونکە بە هۆی هاتنەدەرەوە ئاوەکە لە بەشە نوقومکراوەکە جیا بۆتەوەو بووەتە (مُسْتَعْمَل)، کەوابو: نە بۆ ئەندامەکانی‌تری‌و نە بۆ

کەسێکی‌تر بەکار نایێ، بەڵام ئەگەر ئاوەکە (قُلَّتَیْن)ی تەواو بوو، ئەوە نابێتە (مستعمل)، هەروەك لە (شرح مسلم)و لە (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئیمامی (الرافعي) لە (فتح العزیز)دا دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەفەرموێ: یەکسانە ئاوەکە بە سەر لاشەکەدا بێ، یان لاشەکە بە سەر ئاوەکەدا بێ. واتە: ئەگەر جەنابەتدار یەك جار ئاوی بە سەری‌خۆی داکردو بە لاشەی‌دا چووە خوارەوە تا بەری پێ‌ی، ئەوە غوسلی دەردەچێ‌و ئاوەکەش دەبێتە (مُسْتَعمل).

کەوابو: پێویست ناکا یەکە یەکە ئاو بە ئەندامەکانی‌دا بکا، چونکە گشت لاشەی جەنابەتدار بە یەك ئەندام دادەندرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر بە مەبەستی ئاو خواردنەوە، یان تاقی‌کردنەوە، دەستی خۆی بخاتە ناو ئاوەکە: ئایا گەرمە، یان ساردە؟ ئەوە نابێتە (مُسْتَعْمل)، هەر چەندە بێ‌دەستنوێژو جەنابەتداریش بێ، هەروەك لە (تحفة)دا ئاماژەی بۆ کردوە.

دیسان بزانە: ئیمامی (شافعي) کە دەفەرموێ: ئاوی (مستعمل) پیس نیە، بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە: (کە پێغەمبەرﷺ (صحابە)کانﷺ دەستنوێژیان دەگرت‌و ئاوەکەش دەچکاوە سەر جلکەکانیان‌و نەیاندەشۆرد). هەروەك لە (المجموع)دا گێڕاویەتیەوە.

ئینجا ئاگاداریە: ئاوی بەکارهاتوو لە لابردنی‌پیسی‌دا، لە (باب النجاسة)دا ڕوون ئەکەینەوە، ان شاء الله تعالی.

## ﴿ ئاوی پیس ﴾

(وَلا تَنْجُسُ قُلَّتاالْماءِ) قوللەتێنی‌ئاو پیس نابێ (بِمُلاقاةِ نَجِسٍ) بە تێکەوتنی شتێکی پیس، بەو مەرجەی نەیگۆڕێ، جیاوازی نیە: پیسەکە ووشك بێ، یان شل بێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا كانَ الْماءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ﴾ وفی‌رواية: ﴿لَمْ يَنْجُسْ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، هەر کاتێك ئاو بووە قوللەتێن پیس نابێ.

لە (نهاية)دا دەفەرموێ: ئەگەر قشپلێك —واتە: یان پیسێکی‌تر— فڕێ‌درا ناو دەریا —واتە: ئاوێکی قوللەتێن— جا بە هۆی ئەمە دڵۆپە ئاوێك کەوتە سەر شتێك، ئەوە پیسی ناکا.

(فَإنْ غَيَّرَهُ) بەڵام ئەگەر پیسە تێکەوتووەکە ئاوە قوللەتێنەکەی گۆڕی (فَنَجِسٌ) ئەوە ئاوەکە پیسە بە (اجماع)ی زانایانی ئایین، هەروەك سەرچاوەکانمان بەڵگەیان پێ هێناوەتەوە.

ئینجا جیاوازی نیە گۆڕانەکە: زۆر بێ، یان کەم بێ، ڕەنگ، یان تام، یان بۆنی گۆڕا بێ، پیسەکە تێکەڵی ئاو ببێ، یان تێکەڵی نەبێ.

فَإِنْ زَالَ تَغَيُّرُهُ بِنَفْسِهِ أَوْ بِمَاءٍ طَهَرَ، أَوْ بِمِسْكٍ وَزَعْفَرَانٍ فَلاَ وَكَذا تُرَابٌ وَجِصٌّ فِي الأَظْهَرِ، وَدُونَهُمَا يَنْجُسُ بِالْمُلاَقَاةِ،

---

جا ئەگەر هاتو: بەشێکی قوڵلەتێنەکە گۆڕاو بەشەکەیتری نەگۆڕا، ئەوە تەماشای ئەکرێ: ئەگەر بەشە نەگۆڕاوەکەش بە تەنها دەگەیشتە قوڵلەتێن، ئەوە پیس نابێ، ئەگەر نا: پیس دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

(فَإِنْ زَالَ تَغَيُّرُهُ) جا ئەگەر قوڵلەتێنە پیسبووەکە، گۆڕانەکەی نەما (بِنَفْسِهِ) هەر لەخۆیەوە بێ ئەوەی هیچی تێبکرێ: وەك زۆر مانەوە، یان پێکەوتنی ڕۆژ، یان با (أَوْ بِماءٍ) یان بە هۆی تێکردنی ئاوێکیتر هەرچەند ئەویش پیس بێ، یان بە هۆی دەرهێنانی بەشێکی ئاوەکە گۆڕانی نەما، بەو مەرجەی ئەو بەشەی ماوەتەوە قوڵلەتێنی تەواو بێ، ئەوە لەو حاڵەتانەدا (طَهَرَ) ئاوە پیسەکە پاك دەبێتەوەو شتیتریش پاك دەکاتەوە، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموویەتی، چونکە قوڵلەتێنەو هۆی پیسبوونەکەش لاچووە.

(أَوْ بِمِسْكٍ وَزَعْفران) یان بە هۆی میسكو زەعفەرانو گوڵاو و ئەم جۆرە شتانە گۆڕانەکەی نەما (فَلا) ئاوەکە پاك نابێتەوە، چونکە نازانین: گۆڕانەکە لاچووە، یان بەو شتانە داپۆشراوە.

(وكَذا تُرابٌ وَجِصٌّ) هەروەها ئەگەر بە هۆی گڵ، یان گەچ گۆڕانەکەی نەما، هەر پاك نابێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام ئەگەر ئاوەکە ڕوون بوەوەو لیلاییی نەماو گۆڕانەکەی پێشوویشی نەما، ئەوە گڵەکەو ئاوەکەش پاك دەبنەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرمویانە.

هەر لەم دووانەشدا دەفەرموون: ئەگەر شلەیەکی پیسی هاوچەشنیئاو تێکەڵی ئاوی قوڵلەتێن بوو: وەکو ئاوی پیسو میزی بێبۆن، ئەوە سوننەتە: -هەروەك لە (شرواني)دا دەفەرموێ- وەك دژێکیبەهێزتر ئەندازەی بۆ دابندرێ، واتە: ئەگەر بە ئەندازەی ئەم شلەپیسە، مەرەکەب، یان سرکە، یان میسك، بکەوێتە ناو ئەو ئاوە، ئایا دەیگۆڕێ، یان نا؟ ئەگەر داماننا: دەیگۆڕێ، ئەوە پیس دەبێ، ئەگەر نا: نا.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاوەکە لە قوڵلەتێن کەمتر بوو، ئەوە یەکسەر پیس دەبێو ئەو ئەندازە دانانەی ناوێ، هەروەك ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (وَدُونَهُما) ئاوی کەمتر لە قوڵلەتێن (يَنْجُسُ بِالْمُلاقاةِ) پیس دەبێ بە هۆی تێکەوتنی شتی پیس، جیاوازی نیە: بگۆڕێ، یان نا، پیسەکەی تێکەڵ ببێ، یان نا، هەستی پێ بکرێ، یان نا، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿إِذا كانَ الْماءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَنْجُسْ﴾ هەر کاتێك ئاو بووە قوڵلەتێن پیس نابێ. واتە: ئەگەر قوڵلەتێن نەبو پیس دەبێ.

فَإِنْ بَلَغَهُماَ بِماَءٍ وَلاَ تَغَيُّرَ بِهِ فَطَهُورٌ، فَلَوْ كُوثِرَ بِإِيرَادِ طَهُورٍ فَلَمْ يَبْلُغْهُماَ لَـمْ يَطْهُـرْ، وَقِيلَ طَاهِرٌ لاَطَهُورٌ،

(فَإِنْ بَلَغَهُما) جا ئەگەر ئاوە کەمە پیسبووەکە گەیشتە قوللەتێن (بِماءٍ) بە هۆی تێکردنی ئاوێکی‌تر، هەرچەند پیسیش بێ، یان (مُسْتَعْمَل)ش بێ (وَلا تَغَيُّرَ بِهِ) هیچ گۆڕانێکی پێوە نەما (فَطَهُورٌ) ئاوەکە دەبێتە پاککەرەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو، واتە: چونکە بووەتە قوللەتێن‌و گۆڕانەکەشی نەماوە، کەواتە: ئەگەر لەمەودوا بەش بەشیش بکرێ زیانی نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.
(فَلَوْ كُوثِرَ) ئەگەرئاوە کەمە پیسبووەکە زۆر کرا (بِإِيرادِ طَهُورٍ) بە هۆی تێکردنی ئاوێکی پاککەرەوەی لە خۆی زیاتر (فَلَمْ يَبْلُغْهُما) بەڵام نەگەیشتە قوللەتێن (لَمْ يَطْهُرْ) هەر پاك نابێتەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو، چونکە نەبوەتە قوللەتێن (وَقِيلَ طاهِرٌ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەم ئاوە پاکە (لاطَهُورٌ) پاککەرەوە نیە، بەڵام فەرموودەی بەهێزتر ئەوەیە: ئەم ئاوە هەر پیسەو پاك نەبوەتەوە، کەوابو: ئەگەر ئاوێکی کەمتر لە قوللەتێن پیس بوو، ئینجا لە خۆیەوە گۆڕانەکەی لاچوو، پاك نابێتەوە، هەروەك لە (نهاية)و (بجيرمى)دا فەرموویانە.
﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر سەگ دەمی بنێتە ناو ئاوێکی قوللەتێن‌و لە قوللەتێنیش کەمی نەکاتەوە، ئەوە نە ئاوەکەو نە شوێنی ئاوەکە هیچیان پیس نابن، بەو مەرجەی دەمی سەگەکە بە تەڕی بە شوێنە چۆڵەکان نەکەوێ، بەڵام ئەگەر لە قوللەتێن کەمتر بوو، ئەوە ئاوەکەو شوێنەکە هەردووکیان گڵاو دەبن، ئینجا ئەگەر ئاوەکە زۆر کرا تا گەیشتە قوللەتێن، ئەوە تەنها ئاوەکە پاك دەبێتەوە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی، بەڵام لە (مغنى)دا دەفەرموێ: (امام الحرمين) ئەو فەرموودەی بە ڕاست داناوە: کە شوێنەکەش پاك دەبێتەوە.
ئینجا بزانە: ئەگەر سەگێك سەری خۆی بخاتە ناو قاپێك کە ئاوێکی‌کەم، یان شلەی تێدا بێ، ئینجا سەری دەرهێناو نەزاندرا: دەمی لێداوە، یان نا؟ ئەوە هەر پاکەو پیس نابێ، هەرچەند دەمیشی تەڕ بێ-لە فەرموودەی ڕاستردا- چونکە دەگونجێ: تەڕیەکە لیکاوی خۆی بێ، هەروەك لە (المجموع)و (مغنى) لە (باب النجاسة)دا فەرموویانە.
هەروەها بزانە: ئەگەر ئاوی بیرێك لە قوللەتێن کەمتر بوو، ئینجا پیس بوو، ئەوە بە هەڵێنجان پاك نابێتەوە، چونکە قووڵایی بیرەکەو تەنیشتەکانیشی پیس بوینە، بەڵکو پێویستە بە ئاو تێکردن، یان بە ڕاگرتن زۆر بکرێ تا دەگاتە قوللەتێن، تاکو پاك ببێتەوە، ئینجا ئەگەر زۆر کراو پیسەکەی تێدا وردو بڵاو بوو: وەك تووکی مشك‌و پشیلەو...هتد،

ئەوە پێویستە گشت ئاوەکە دەربدرێ، تا قەناعەتمان بێ: مووەکان نەماون، هەروەك لە (المجموع)و (مغنى)دا فەرموویانە.

هەر لەم دووانەدا دەفەرموون: ئەگەر ئاوەکە تەنها قوللەتێن بوو و زیاتر نەبو، پیسیەکی ووشکی تێدا بوو بەڵام نەیگۆڕی، ئینجا بە دۆلچەیەك ئاویان لێدەرهێنا، ئەوە تەنها ئاوی ناو دۆلچەکە پاکە، ئەوەندەی ماوەتەوە یەکسەر پیس دەبێ، چونکە لە قوللەتێن کەمتر بووەو پیسە پەیتەکەشی تێدا ماوەتەوە، کەوابو: لای دەرەوەی دۆلچەکەش پیس دەبێ، بەڵام ئەگەر پیسەکە لە گەڵ ئاوەکە هێندرا دەرەوە: ئەوە بە پێچەوانەوە، تەنها ژوورەوەی دۆلچەکەو ئاوی ناو دۆلچەکە پیسەو ئاوەکەی ماوەتەوە پاکە.

﴿ ئاگاداریەکیتر ﴾: ئەوەیڕابردوو دەربارەی ئاو بوو، چونکە گشت شلەیەك-جگە لە ئاو- بە تێکەوتنی پیسی یەکسەر پیس دەبێ، هەرچەند شلەکەش لە قوللەتێن زیاتر بێ و پیسەکەش کەم بێ، هەروەك لە (المجموع)و سەرچاوەکانیتردا فەرموویانە.

بەڵام (وَيُسْتَثْنَى) جیا دەکرێتەوە لەو پیسانەی ئاویکەمو شلە پیس دەکەن (مَيْتَةٌ) مرداربوویێکی وەها (لاَدَمَ لَهَا سَائِلٌ) کە خوێنی لە بەر نەڕوا ئەگەر بە زیندوویەتی برینـدار بکرێ: وەکو مێشو پێشولەو قالۆچەو سیسرکەو هەنگو زەنگەسۆرەو زەرگەتەو دووپشكو مارمیلۆکەو قێچو ئەسپێو...هتد (فَلاَ تُنَجِّسُ مَائِعاً) ئەو جۆرە شتانە هیچ شلەیەك پیس ناکەن، هەروەها ئاوی کەمیش پیس ناکەن (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی بەهێزی مەزهەب، جیاوازی نیە: بە زیندوویەتی بکەوێتە ناو شلەو ئاوەکەو تێیدا بمرێ، یان بە مردوویەتی، بەو مەرجەی بە دەست فڕێنەدرێتە ناو شتەکە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا وَقَعَ الذُّبابُ فِي شَرابِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لِيَطْرَحْهُ فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَناحَيْهِ شِفاءً وَفِي الآخَرِ داءً﴾ رواه البخاری، هەر کاتێك مێش کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێکتان، با هەمووی نقوم بکاتە ناو خواردنەوەکە، ئینجا فڕێی بداتە دەرەوە، چونکە لە باڵێکیدا شیفا هەیەو لە باڵەکەیتریدا دەرد هەیە.

واتە: وا دەبێ مێشەکە بە هۆی نقومکردنی لە ناو شلەکەدا دەمرێ، بەڵام چونکە فەرمانی پێغەمبەرەﷺ بۆیێ شلەکە پیس ناکا، ئەوانەیتریش (قیاس) کراونەتە سەر مێش، بەڵام جگە لە مێش نقومکردنی ئەوانیتر سوننەت نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو کرمەی لە ناو میوەو شلەو خواردنـدا دروست دەبێ: وەکو کرمی هەنجیرو سێو و پەنیرو سرکەو...هتد، ئەوە ئەگەر تێیدا بمرێ پیسی ناکا، ئەگەر لەگەڵی

وَكَذَا فِي قَوْلٍ نَجِسٌ لايُدْرِكُهُ طَرْفٌ، قُلْتُ: ذَاالْقَوْلُ أَظْهَـــرُ وَاللهُ أَعْلَـــمُ، وَالْجَـــارِي كَرَاكِدٍ، وَفِي الْقَدِيمِ لاَيَنْجُسُ بِلاَ تَغَيُّرٍ،

---

بخوریٚ دروسته، ئەگەر لەگەڵ میوەشدا بگوشریٚ زیانی نیە، شلەیترو ئاویش پیس ناکا، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَكذا فِي قَوْلٍ) هەروەها جیا دەکرێتەوە لە فەرموودەیەکدا (نَجِسٌ) پیسیەکی ئەوەندە کەم: کە لە بەر کەمی (لا يُدْرِكُهُ طَرْفٌ) چاو نەیبینیٚ: وەکو پرِوشکێکی میز، یان شەڕاب، یان ئەو پیسیەی بە قاچی مێشەوەیە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرمویٚ: (ذاالْقَوْلُ) ئەم فەرموودەیەی کە دەڵیٚ: ئەو پیسیەی چاو نەیبینیٚ شت پیس ناکا (أَظْهَرُ) بە هێزترە لە فەرموودەکەیتر کە دەڵیٚ: پیس دەکا (وَاللهُ أَعْلَم) کەوابو: نە ئاو و نە شلەو نە لاشەو نە بەرگ پیس ناکا، هەروەك لە (المجموع)و (المحلی)دا فەرموویانە.

### ﴿ ئاوی ڕەوان ﴾

(وَالْجارِي) ئاوی ڕەوان، واتە: ئەو ئاوەی دەڕواو لە هیچ شوێنێکدا نەپنگاوە (كَراكِدٍ) وەکو ئاوی وەستاوە لە گشت بڕیارەکانیڕابردوودا، کەواتە: ئەگەر هەر شەپۆلێکی ئاوەکە قوللەتێنی تەواو بوو، ئەوە ئەگەر بە هۆی پیسەکە نەگۆڕیٚ پیس نابیٚ، بەڵام ئەگەر شەپۆلەکە لە قوللەتێن کەمتر بوو و پیسەکەش لە گەڵ شەپۆلەکەدا دەڕۆیشت، ئەوە ئەو شەپۆلەو شوێنی شەپۆلەکە پیس دەبیٚ، شوێنەکەش بە شەپۆلی دواوە پاك دەبێتەوەو شەپۆلەکانیڕابردوو: کە پیسەکەیان نەگەیشتوەتیٚو شەپۆلەکانیداهاتوو: کە نەگەیشتونە پیسەکە، گشتیان پاککەرەوەنە، هەروەك لە (المهذب)و سەرچاوەکانیتردا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِيالْقَدِيم) لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعي)دا (لايَنْجُسُ) ئاوی ڕەوان پیس نابیٚ (بِلا تَغَيُّرٍ) بە بیٚگۆڕان، واتە: ئەگەر پیسی بکەوێتیٚو نەگۆڕیٚ، پیس نابیٚ، هەرچەند لە قوللەتێنیش کەمتر بیٚ، (امام الحرمين)و (الامام الغزالي)و چەندانیتر ئەم فەرموودە کۆنەیان هەڵبژاردووەو لە (المجموع)دا ئەم هەڵبژاردنەی بە بەهێز داناوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر پیسیەکی ووشك دەکەوتە سەر ڕێگەی ئاوێکی کەمو لە گەڵ ئاوەکەشدا نەدەڕۆیشت، ئەوە شوێنی پیسیەکەو هەر شەپۆلێکی بە سەریدا دەڕوا پیس دەبیٚ، هەر چەند نەشگۆڕیٚ، مەگەر لەو لاوە لە حەوزێکدا کۆ ببێتەوە تا دەبێتە قوللەتێن، هەروەك لە (نهاية)و (فتح العزيز)دا، فەرموویانە، واتە: لە ویٚدا دەبێتە پاککەرەوە، بەو مەرجەی گۆڕانی نەبیٚ.

وَالْقُلَّتَانِ خَمْسُمِأَةِ رِطْلٍ بَغْدَادِيٍّ تَقْرِيباً فِي الْأَصَحِّ، وَالتَّغَيُّرُ الْمُؤَثِّرُ بِطَاهِرٍ أَوْ نَجِسٍ طَعْمٌ أَوْ لَوْنٌ أَوْ رِيحٌ، وَلَوِ اشْتَبَهَ مَاءٌ طَاهِرٌ بِنَجِسٍ

---

کەوابو: ئەو شوێنانەی ئاوی جۆگەکانیان کەمەو پیسایی ئادەمیزادو جیقنەی باڵندەو ڕیخی ئاژەڵو لاشەی مرداریوو دەکەوێتە ناو جۆگەکانو ڕەنگو تامو بۆنی ئاوەکەش ناگۆڕێ، پێویستە ڕەفتار بە فەرموودەی کۆنی ئیمامی (شافعي) بکەن: بۆ دەستنوێژو غوسلو خواردنەوەو لابردنی پیسی، هەروەك لە (المجموع) وەردەگیرێ.

بەڵکو لە (تحفة)دا دەفەرموێ: زۆر لە زانایانی مەزهەبی(شافعي) مەزهەبی ئیمام(مالك)یان هەڵبژاردوە: کە لە لای ئەوی هیچ جۆرە ئاوێك پیس نابێ، تا نە گۆڕێ، جا کەم بێ، یان زۆر بێ، ڕەوان بێ، یان وەستاو بێ.

ئینجا بزانە، ئاوی ڕنگاو هەر بە ئاوی وەستاو دادەندرێ لە گشت بڕیارەکانیڕابردوودا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

## ﴿ ئەندازەی قوللەتێن ﴾

(وَالْقُلَّتَانِ) ئەندازەی قوللەتێن بە کێشانە (خَمْسُمِأَةِ رِطْلٍ بَغْدَادِيٍّ تَقْرِيباً) نزیکەی پێنج سەد ڕیتلیبەغدایییە: کە بە پێوانەیڕبەیی دەکاتە (١٩٢) سەدونەوەدو دوو (لیتر)، واتە: نزیکەی بەرمیلێکینەفتی دوانزە تەنەکەیی (فِي الْأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها بە پێوانەیزەمینی لە حەوزی چوار گۆشەدا: قووڵایی گەزێكو چوارێکە گەزێکە، هەروەهاش بەرینیو هەروەهاش درێژایی، بەڵام لە حەوزی بازنەییدا: دوو گەزو نیو قووڵاییو یەك گەز بەرینی لە هەموو لایەکەوە، ئینجا بزانە: لێرەدا مەبەست گەزی دەستی ئادەمیزادە: کە درێژایی (٥٠) پەنجا سنتیمترە.

(وَالتَّغَيُّرُ الْمُؤَثِّرُ) ئەو گۆڕانەی کار لە ئاو دەکا (بِطَاهِرٍ) جا گۆڕانەکە بە شتێکی پاك بێو ئاوەکە لەکار بێخێ (أَوْ نَجِسٍ) یان گۆڕانەکە بە شتێکی پیس بێو ئاوەکە پیس بکا (طَعْمٌ) ئەوەیە: یان تامی ئاوەکە بگۆڕێ (أَوْ لَوْنٌ) یان ڕەنگی بگۆڕێ (أَوْ رِيحٌ) یان بۆنی بگۆڕێ، واتە: ئەگەر یەکێك لەم سێ سیفەتەی ئاو بگۆڕێ: ئەگەر بە شتێکی پیس بێ، ئاوەکەش پیس دەبێ، ئەگەر بە شتێکی پاك بێو گۆڕانەکەش زۆر بێ، ئاوەکە لە کار دەکەوێ، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

## ﴿ دوو دڵی لە پاكو پیسیدا ﴾

(وَلَوْ اشْتَبَهَ ماءٌ طاهِرٌ) ئەگەر کەسێك لێی شێواو کەوتە دوو دڵی دەربارەی گلێ، یان ئاوێکی پاك، یان پاككەرەوە (بِنَجِسٍ) لە گەڵ گلێ، یان ئاوێکیتری پیسبوو، یان بەکارهاتوو، واتە: نەیزانی لەم دوو ئاوە کامەیان پیسەو کامەیان پاکە، یان کامەیان

اجْتَهَدَ وَتَطَهَّرَ بِماَ ظَنَّ طَهاَرَتَهُ، وَقِيلَ إنْ قَدَرَ عَلَى طَاهِرٍ بِيَقِينٍ فَلاَ، وَالْأَعْمَى كَبَصِيرٍ فِيْالْأَظْهَرِ، أَوْ مَاءٌ وَبَوْلٌ لَمْ يَجْتَهِدْ عَلَىالصَّحِيحِ بَلْ يُخْلَطَانِ ثُمَّ يَتَيمَّمُ،

---

به كار هاتوه، كامەيان بەكار نەهاتوه (اجْتَهَدَ) واجبه (اجْتِهاد) بكا ئەگەر بۆ نوێژ ئاوێكيتری دەست نەكەوێ، واتە: هەوڵ بدا تا دڵی بۆ ئاوێك لەم دوو ئاوە دەچێ (وتَطَهَّر بما) ئينجا ئەو ئاوە بەكار دێنێ بۆ دەستنوێژو غوسلو لابردنی پيسی: كە (ظَنَّ طَهارَتَهُ) دڵی بۆ چووە پاككەرەوەيە: وەك بە هۆی ڕەنگ، يان بۆن، يان تامكردنی يەكێكيان-نەك هەردووكيان- دڵی بە لای ئاوێكدا بڕوا، يان ئاسەواری سەگێك لە نزيك يەكێكيان ببينێ، يان ئاو لە دەرەوەی يەكێكيان ڕژابێ...هتد.

بەڵام تامكردنی هەردووكيان دروست نيە، چونكە گومان نيە يەكێكيان پيسە، هەروەها ئەگەر بە بێ(اجْتِهاد) يەكێكيانی بەكار هێنا، ئەوە نوێژەكەی دروست نيەو شتەكەشی پاك نابێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: سەر لێشوان: دەربارەی جل و بەرگی پاك و پيس، يان جل و بەرگیخۆی لە گەڵ هی كەسێكیتر، يان خواردەمەنیی پاك و پيس، هەمان بڕياری (اجتهاد)ی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەيەكی بێهێزدا (إنْ قَدَرَ عَلى طاهِرٍ بِيَقِينٍ) ئەگەر توانای هەبو ئاوێكیبێگومانی پاك، يان پاككەرەوە وەدەست بێنێ (فَلا) دروست نيە (اجتهاد) بكا (وَالأعْمَى كَبَصِيرٍ) مرۆڤی كوێر لەم (اجتهاد)كردنەدا، وەكو چاوساغ وايە (فِيالأظهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە كوێريش بە هۆی گوێلێبوونو دەست لێدانو بۆنكردنو تامكردنیيەكێكيان دەتوانێ بگاتە مەبەست.

(أوْ ماءٌ وَبَوْلٌ) يان لێی شێوا دەربارەی ئاو و ميزێكی بێبۆن (لَمْ يَجْتَهِدْ) دروست نيە (إجْتِهاد) بكا لەم دووانەدا بۆ غوسلو دەستنوێژو شۆردن (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە ميز هەر لە بنچينەیدا پاك نيەو پاكيش نابێتەوە (بَلْ يُخْلَطانِ) بەڵكو هەردووكيان تێكەڵ دەكرێن، يان دەڕژێندرێن (ثُمَّ يَتَيَمَّمُ) ئينجا تەيەمموم ئەكاو نوێژ ئەكاو دووبارەكردنەوەینوێژەكەشی ناوێ-هەروەك لە (نهاية)دا فەرموويەتی- چونكە لەو حاڵەتەدا ئاوێكیپاك نيە، كەوابو، ئەگەر پێش تێكەڵكردنيان، يان پێش ڕژاندنيان تەيەمموومی كرد، ئەوە دروست نيە، چونكە لەو حاڵەتەدا بێگومان ئاوێكیپاك هەيە، هەرەوك لە (تحفة)دا فەرموويەتی.

أَوْ وَمَاءُ وَرْدٍ تَوَضَّأَ بِكُلٍّ مَرَّةً وَقِيلَ لَهُ الاجْتِهَادُ، وَإِذَا اسْتَعْمَلَ مَا ظَنَّهُ أَرَاقَ الآخَرَ، فَإِنْ تَرَكَهُ وَتَغَيَّرَ ظَنُّهُ لَمْ يَعْمَلْ بِالثَّانِي عَلَى النَّصِّ بَلْ يَتَيَمَّمُ بِلاَ إِعَادَةٍ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ أَخْبَرَهُ بِتَنَجُّسِهِ مَقْبُولُ الرِّوَايَةِ وَبَيَّنَ السَّبَبَ أَوْ كَانَ فَقِيهاً مُوَافِقاً اعْتَمَدَهُ.

---

(أَوْ وَمَاءُ وَرْدٍ) یان لێی شێوا دەربارەی ئاو و ئاوی گوڵ: کە بۆنی نەمابێ‌و پاك بێ (تَوَضَّأَ بِكُلٍّ مَرَّةً) بە هەر یەکێکیان جارێك دەستنوێژ دەگرێ تاکو بێگومان دەستنوێژی بگیرێ، کەوابو: (اجتهاد) لەم دووەشدا دروست نیە، چونکە ئاوی گوڵ هەر لە بنچینەیدا پاککەرەوە نیە (وَقِيلَ لَهُ الأَجْتِهادُ) لە فەرمودەیەکی بێهێزدا دروستە: (اجتهاد) بکا بەڵام ئەم فەرموودەیە ڕەد کراوەتەوە.

(وَإِذا اسْتَعْمَلَ ماظَنَّهُ) هەر کاتێك ئەو ئاوەی بەکار هێنا: کە دڵی بۆ چووە پاکە (أَراقَ الآخَرَ) سوننەتە ئاوەکەیتریش بڕژێنێ، ئەوەك بیری بگۆڕێ‌و تووشی دوو دڵی ببێتەوە، بەڵام ئەگەر پێویستی بە ئاوە پیسەکە هەبو: بۆ ئاودانی ئاژەڵ، یان بۆ خۆی لە کاتی مەترسی مردندا، ئەوە با ئاوەکە هەڵبگرێ، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(فَإِنْ تركَهُ) جا ئەگەر ئاوەکەی هێشتەوەو نەیڕژاند (وَتَغَيَّرَ ظَنُّهُ) دڵی گۆڕاوە: کە ئەو ئاوەی ماوەتەوە پاکە (لَمْ يعْمَلْ بِالثَّانِي) ڕەفتار بە دڵ بۆچونەکەیدووەم ناکا (عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەقی فەرموودەی ئیمامی (شافعی) (بَلْ يَتَيَمَّمُ بِلا إِعادَةٍ) بەڵکو تەیمموم ئەکاو دووبارەکردنەوەی نوێژی ناوێ، چونکە ئاوێکیبێگومان نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَلَوْ أَخْبَرَهُ) ئەگەر لە دوای بەکارهێنان، یان لە پێش بەکارهێنانی ئاوەکە، یەکێك پێی ڕاگەیاند: کە (بِتَنَجُّسِهِ) ئەم ئاوە پیس بوە، یان بەکار هاتوە (مَقْبُولُ الرِّوايَةِ) ڕاگەێنەرەکەش باوەڕپێکراو بوو (وَبَيَّنَ السَّبَبَ) هۆی پیسبوون، یان بەکارهاتنیشی ئاشکرا کرد (أَوْ كانَ فَقِيهاً) یان ڕاگەێنەرەکە شەرعزان بوو (مُوافِقاً) هاومەزهەبی وی بوو (اِعْتَمَدَهُ) واجبە باوەڕی پێبکاو ئاوەکە بە کار نەهێنێ.

جا ئەگەر ئاوە پیسەکەی بە کار هێنابو، ئینجا هەواڵی پیسیی پێ ڕاگەیاندرا، یان هەر لەخۆیەوە زانی ئاوە پیسەکەی بە کار هێناوە، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا ئەو ئەندامو شوێنانەی ئاوە پیسەکەیان پێ کەوتوە، واجبە بیانشۆرێ‌و دەستنوێژەکە بگرێتەوەو نوێژەکەش دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

﴿ پاشکۆ ﴾ یەکەم: ئەگەر هاتو ئاوێکی کەم، یان شلەیەکیتری لە دوو مەنجەڵەوە بە جامێك دەرهێناو کردیە ناو مەنجەڵێکیتر، جا کە تەماشای کرد: مشکێکی مردووی تێدا

بوو و نەیزانی لە کام مەنجەڵدا بووە، واجبە (اجْتِهاد) بکا، جا ئەگەر قەناعەتی وابوو: لە مەنجەڵی یەکەمدا بووەو هەر بە یەك جامیش دەری هێنابو، ئەوە هەردووکیان بڕیاری پیسییان بۆ دەدرێ، بەڵام ئەگەر قەناعەتی وابو: لە مەنجەڵی دووەمدا بووە، ئەوە مەنجەڵیدووەم بە پیس دادەندرێ، هەر وەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، کەوابو: مەنجەڵیسێیەم –لە هەردوو مەسەلەکەدا– بڕیاری پیسیی بۆ دەدرێ.

دووەم: ئەگەر بێگومان دەیزانی لە سەربانێکدا پیسیەکی ووشکی وەها هەیە: بە ئاوی باران لاناچێ، ئەوە سولاوکەو چۆڕاوکەی ئەو بەشە بانە بە پیس دادەندرێ، جا ئەگەر سولاوکەکەو چۆڕاوکەکان بەم پیسیە نەگۆڕابون، ئەوە دروستە: بە فەرموودەی کۆنی ئیمامی (شافعي) ڕەفتار بکرێ کە دەفەرموێ: ئاوی ڕەوان –ئەگەر نەگۆڕێ– پیس نابێ، کەوابو: دەتوانێ بۆ دەستنوێژو لابردنی پیسی، ئاوی ئەم بانە بەکار بێنێ، هەر وەك لە باسی ئاوی ڕەواندا ڕوونمان کردەوە.

بەڵام ئەگەر گومان لە پیسی سولاوکەکەدا هەبو، ئەوە لە (المجموع)دا دەفەرموێ: ئەگەر بە تەواوی نەیدەزانی پیسە، یان پاکە، ئەم ئاوە هەر بە پاك دادەندرێ، چونکە ئەگەر پیسیش لەوێ هەبێ، بە ئاوەکە دەشۆرێتەوە، هەروەها دڵۆپەو چۆڕاوکەی سەربان –کە گومان لە پیسیو پاکیدا هەیە– هەمان بڕیاری پاکیی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (الجمل) لە (شروط الصلاة)دا، فەرموویەتی.

هەروەها ئەو ئاوشۆرەی لە سەر خانوویماڵەکانەوە دەڕژێندرێتە خوارەوە –یان ئەو ئاوەی لە سولاوکەی سەرشۆرگەی ماڵەکان دێتە خوارەوە– ئەویش هەر بڕیاری پاکیی بۆ دەدرێو لێکۆڵینەوە لەم ئاوشۆرە سەر لێشێوانە، هەر وەك (ابن العماد) فەرموویەتی.

سێیەم: ئارەقەو چڵمو فرمێسکو لیکاو و تەڕایەتی دەمی گشت گیانلەبەرێك پاکە، جا گۆشتی بخورێ، یان نا –جگە لە سەگو بەراز– هەروەك لە (فتح العزیز)و (المجموع)دا فەرمویانە، هەرچەند کاوێژیش بکا، هەر وەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی ﴿عن عمرو بن خارجةﷺ: خَطَبَنا رَسُولُ اللهِﷺ بِمِنىً وَهُوَ عَلى راحِلَتِه وَلُعابُها يَسِيلُ عَلى كَتِفِي﴾ رواه احمد والترمذي وصححه، پێغەمبەرﷺ لە سەر پشتی ووشترەکەی لە (مِنی) ووتاری بۆ داین، لیکاوی ووشترەکەی بە سەر شانمدا دەچکاوە خوارەوە.

کەوابو: بەرماوەی گشت گیانلەبەرێك –جگە لە سەگو بەراز– پاکەو ئەگەر بەرماوەکە ئاوێکی کەمیش بێ، لە کار ناکەوێ ﴿عن كَبْشة: دَخَلَ أبوقَتادَة فَسَكَبْتُ لَهُ وَضُوءً، فَجاءَتْ هِرَّةٌ

فَأَصْغَى لَها الإناءَ حَتَّى شَرِبَتْ، فَرَآنِي أَنْظُرُ إلَيْه، فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يا بِنْتَ أَخِي؟ إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قال: إِنَّها لَيْسَتْ بِنَجِسٍ إِنَّها مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، (ابوقتادة) هاته لامان، منيش ئاوى‌دەستنوێژم بۆ دانا، كتكيك-پشيلەيەك هات لە ئاوەكەى خواردەوە، ئەويش قاپەكەى بۆ خوار كردەوە تا تێرى خواردەوە، كە ديتى تەماشاى ئەكەم، گوتى: برازام ئەوە پێت سەيرە وادەكەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموويەتى: پشيلە پيس نيە، چونكە ئەويش لە گەڕيدەكانى سەر ئێوەيە لە ماڵەوەدا.

چوارەم: چاوپۆشى دەكرێ لەو قشپلانەى لە كاتى دۆشيندا دەكەونە ناو شير، بەو مەرجەى پاراستنى زەحمەت بێ-هەروەك لە (نهاية)دا فەرموويەتى- بەلام لە تێكەوتنى ميزو ڕيخى‌شل چاوپۆشى ناكرێ، چونكە تێكەڵى شيرەكە دەبن‌و ناهێندرێنە دەرەوە، هەروەها چاوپۆشى دەكرێ لەو پۆلكو تۆزەى ئاگردان كە لە كاتى شير كولاندندا دەكەوێتە ناو شيرەكە.

هەروەها چاوپۆشى دەكرێ لە دەمى شێت‌و منداڵ‌و ليكاوى دەمى منداڵ دەربارەى مەمكى دايكى‌خۆى‌و كەسانى‌تريش، بە تايبەتى ئەوانەى لەگەڵ منداڵەكە تێكەڵن، هەروەك لە (نهاية)و (الشبراملسى)دا فەرموويانە.

بەڵكو لە (المجموع)دا دەفەرموێ: تفى دەمى منداڵ بە پاك دادەندرێ، هەرچەند بە زۆريش پيسايى بخاتە ناو دەمى خۆى، هەروەها بەرماوەى منداڵ هەرچەند شليش بێ، هەر بە پاك دادەندرێ‌و دروستە: خواردنيان لە گەڵدا بخورێ، چونكە لە (بخارى ومسلم)دا هاتوە: ﴿پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵێكدا شتێكى‌كوڵاوى خواردوە﴾.

هەروەها ئەندامەكان‌و جلى منداڵيش هەر بە پاك دادەندرێ، كەوابو: نوێژيشى پێ بەتاڵ نابێ، هەروەك (الشبراملسى) فەرموويەتى ﴿عن أبي قتادة ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي وَهُوَ حامِلٌ أُمامَةَ بِنْتَ زَيْنَبَ رضي الله عنهما﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نوێژى دەكردو (أُمامَة)ى كيژى (زَيْنَب)ى كيژى‌خۆى لە باوەشدا هەڵگرتبو، كە كيژۆڵەيەكى بچكۆڵە بوو. ئيتر لە (باب النجاسة)داو لە مەرجەكانى نوێژدا زياتر باسى چاوپۆشى لەپيسى، ڕوون ئەكەينەوە، ان شاء الله تعالى.

## ﴿ باسى قاپ و كەلوپەلى چێشت و ئاو ﴾

(وَيَحِلُّ) دروستە: (إِسْتِعْمالُ كُلِّ إناءٍ طاهِرٍ) بەكارهێنانى گشت قاپێكى پاك: بۆ چێشت‌و خواردنەوەو دەستنوێژو...هتد، جا قاپەكە دار بێ، بەرد بێ، پيستە بێ، ئاسن بێ، شوشە بێ (إلاّذَهَباً وفِضَّةً) تەنها بەكارهێنانى قاپى زێڕو زيو نەبێ (فَيَحْرُمُ) بەكارهێنانى

وَكَذَا اتِّخَاذُهُ فِي الأَصَحِّ، وَيَحِلُّ الْمُمَوَّهُ فِي الاَصَحِّ، وَالنَّفِيسُ كَيَاقُوتٍ فِي الأَظْهَرِ، وَمَا ضُبِّبَ بِذَهَبٍ أَوْ فِضَّةٍ ضَبَّةً كَبِيرَةً لِزِينَةٍ حَرُمَ، أَوْ صَغِيرَةً بِقَدْرِالْحَاجَةِ فَلا، أَوْ صَغِيرَةً لِزِينَةٍ أَوْ كَبِيرَةً لِحَاجَةٍ جَازَ فِي الأَصَحِّ، وَضَبَّةُ مَوْضِعِ الإِسْتِعْمَالِ كَغَيْرِهِ فِي الأَصَحِّ،

---

قاپی زێڕو زیو حەڕامە بۆ پیاو و بۆ ئافرەت: وەك تەشتو مەنجەڵ و كەوچكو...هتد، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاتَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَلا تَأْكُلُوا فِي صِحافِهِما فَإِنَّها لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَكُمْ فِي الآخِرَةِ﴾ رواه الشيخان، لە جامەی زێڕو زیودا مەخۆنەوەو لە قاپی زێڕو زیودا مەخۆن، چونكە قاپی زێڕو زیو لە دونیادا بۆ كافرانەو لە قیامەتیشدا بۆ ئێوەی موسڵمانە.

(وكَذا إتِّخاذُهُ) هەروەها هەڵگرتنیشیان بۆ پیاو و بۆ ئافرەت هەر حەڕامە، هەر چەند بەكاریشیان نەهێنن (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەوابو: ئەو پیاڵەو چادانو كەوچكو قاپەی لە زێڕ، یان لە زیو دروست دەكرێنو بۆ جوانی لە ناو جامخانەو تاقو دیوار دادەندرێن، گشتی حەڕامە: بۆ پیاو و بۆ ئافرەت.

(ويَحِلُّ الْمُمَوَّهُ فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا دروستە: بەكارهێنانی ئەو قاپەی ئاوزێڕ كراوە، یان ئاوزیو كراوە، بەو مەرجەی كەم بێ، واتە: بە هۆی ئاگر هیچ زێڕ، یان زیوی لێوەدەست نەیێ، هەروەها ئاوزێڕكردنی ئەنگوستیلەو كەلوپەلی جەنگیش بەو مەرجە دروستە، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَالنَّفِيسُ) هەروەها بەكارهێنانی قاپی زۆر بە نرخیش دروستە: (كَياقُوتٍ) وەكو قاپی دروستكراو لە یاقوتو مەرجانو... هتد (فِي الأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَماضُبِّبَ) هەر قاپێك پینە كرابێ (بِذَهَبٍ أوْ فِضَّةٍ) بە پینەی زێڕ، یان زیو (ضَبَّةً كَبِيرَةً) پینەكەش گەورە بوو: وەك دوگمە، یان پولەكەیەكی گەورەی زێڕ، یان زیو (لِزِينَةٍ) بۆ جوانی پینەكە لێدرابو، نەك بۆ چاككردنەوەی كونو دەرەزی قاپەكە (حَرُمَ) هەڵگرتنو بەكارهێنانی ئەم قاپە پینەكراوە حەڕامە (أوْ صَغِيرَةً) یان پینەكە بچوك بوو (بِقَدْرِالْحاجَةِ) بە ئەندازەی پێویست بوو، واتە: بۆ چاككردنەوە بوو و بە ئەندازەی شوێنە كونبووەكە بوو (فَلا) حەڕام نیە (أوْ صَغِيرَةً لِزِينَةٍ) یان پینەكە بچوك بوو و بۆ جوانی لێدرابو: وەكو دوگمەو پوولەكەی بچوكی زێڕو زیو (أوْ كَبِيرَةً لِحاجَةٍ) یان پینەیەكی گەورە بوو بۆ چاككردنەوەی قاپەكە، ئەوە (جازَ فِي الأصَحِّ) دروستە لە فەرموودەیڕاستتردا.

(وَضَبَّةُ مَوْضِعِ الإِسْتِعْمالِ) پینەی شوێنی بەكارهێنانی قاپەكە: وەكو لولەو شوێنی ئاو پێ خواردنەوە (كَغَيْرِهِ) وەك شوێنەكانیتری قاپەكە وایە: لە حەڕامیو حەڵاڵیدا (فِي الأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەو گوێرەی باسمان كرد.

قُلْتُ: اَلْمَذْهَبُ تَحْرِيمُ ضَبَّةِ الذَّهَبِ مُطْلَقاً وَاللهُ أَعْلَمُ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرمویٚ (اَلْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی بەهێزی مەزهەبی(شافعي): (تَحْرِيمُ ضَبَّةِ الذَّهَبِ مُطْلَقاً وَاللهُ أَعْلَم) پینەی زێڕ بە هەموو جۆرێکیەوە حەڕامـە، جیاوازی بچوك و گـەورەش نیـە ﴿عَنْ عَليٍّ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً وَذَهَباً فقال: إِنَّ هَذَيْنِ حَـرامٌ عَلَى ذُكُـورِ أُمَّتِـي﴾ وفیروایة: ﴿حِـلٌّ لإِناثِهـا﴾ رواه اصحاب السنن بسندصحيح، پێغەمبەرﷺ ئارمووش و زێڕی بە دەستەوە گرت و فەرمووی: ئەم دووانە لە سەر نێرینـەی ئوممەتم حەڕامن و بۆ ئافرەتەکانی ئوممەتم حەڵاڵن.

بەڵام پینەی زیو بۆ چاککردنەوە دروستە ﴿عن أنسٍ﵁: أَنَّ قَدَحَ النَّبِيِّ ﷺ انْصَدَعَ فَسَلْسَلَهُ بِفِضَّـةٍ﴾ رواه البخاري، پەرداغەکـەی پێغەمبـەرﷺ دەرەزی کـەوتێ، جـا بـە زیـو چـاکی کردەوە. ئینجا بزانە: باسی زێڕ و زیو لە (كتاب الزكاة)دا زیاتر ڕوون ئەکەینەوە،ان شاء الله تعالى.

﴿پاشـکۆ﴾: حـەڕام نیـە بـەڵام ناپەسـندە: بـە کارهێنـانی قـاپ و کەلوپـەلی خـواردن و خواردنەوەی کافران و دەبەرکردنی جل و بـەرگیان، هـەر چـەند ڕەفتـاری ئایینەکەشیان بەکارهێنانی پیسی بێ، جیاوازی جولەکەو گاورو کافرەکانیتر نیـە ﴿عن أبي ثعـلبة﵁: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ إِنَّا نُجاوِرُ أَهْلَ الْكتابِ وَهُم يَطْبُخُونَ فِي قُـدُورِهِمُ الْخِنْزِيـرَ وَيَشْـرَبُونَ فِي آنِيَتِهِمُ الْخَمْرَ؟ فَقال: إِنْ وَجَدْتُمْ غَيْرَها فَكُلُوا فِيها وَاشرَبُوا، وَإِنْ لَـمْ تَجِـدوا غَيْرَهـا فَارْحَضُوها بِالْماءِ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا﴾ رواه الشيخان، (ابوثعلبة) پرسـیاری لـە پێغەمبـەرﷺ کـرد: ئێمـە دراوسـێی کافرەکـانی خـاوەن (کتـاب)یـن، ئـەوانیش گۆشـتی بـەراز لـە مەنجەڵەکانیاندا دەکوڵێنن و لە جامەکانیاندا شەڕاب دەخۆنەوە؟ پێغەمبەرﷺ فـەرمووی: ئەگەر جگە لە قاپەکانی ئەو کافرانە قاپیتریان دەست کەوت، ئـەوە لـەو قاپـەدا بخـۆن و بخۆنەوە، ئەگەر جگە لە قاپەکانی ئەوان هیچیتریان دەست نەکـەوت، ئـەوە قاپـەکانیان بە ئاو بشۆن و تێیاندا بخۆن و بخۆنەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِذا كان جُنْحُ اللَّيْلِ أَوْ أَمْسَيْتُمْ فَكُفُّوا صِبْيانَكُمْ فَـإِنَّ الشَّيْطانَ يَنْتَشِرُ حينَئذٍ فَإِذا ذَهَبَ ساعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقوا الْأَبْوابَ واذْكُروا اسْمَ اللهِ فَإِنَّ الشَّيْطانَ لايَفْتَحُ باباًمُغْلَقاً، وَأَوْكِئوا قِـرَبَكُمْ واذْكُروا اسْـمَ اللهِ، وخَمِّـروا آنِيَـتَكُمْ وَاذْكُروا اسْمَ اللهِ وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْها شَيْئاً، وَأَطْفِئُوا مَصابِيحَكُمْ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێـك بووە ئێوارەو تاریك داهات ڕێگە مەدەن منداڵەکانتان لە ماڵەو بچنە دەرەوە.

لە ڕیوایەتێکیتردا دەفەرموێ: ڕێگە مەدەنە ئاژەڵەکانیشتان، چونکە شـەیتان لـەو کاتـدا دەست بە گەڕان دەکا، ئینجا کە سەعاتێك لە شەو ڕۆیشت ڕێگەیان بـدەن، دەرگـەکانتان کلیل بدەن و بڵێن: (بســم الله). چونکە شـەیتان دەرگـەی کلیلدراو ناکاتەوە، دەمـی

(بابُ أَسْبَابِ الْحَدَث)

هِـيَ أَرْبَعَـةٌ، أَحَـدُهَـا: خُـرُوجُ شَـيْءٍ مِـنْ قُـبُلِـهِ أَوْ دُبُرِهِ إلاّ الْـمَـنِيَّ،

---

کوندەکانتان ببەستن‌و بڵێن: (بسم الله). قاپەکانتان داپۆشن‌و بڵێن: (بسم الله). ئەگەر هەر نەبێ دارێك لە سەر قاپەکانتان دابنێن، چرایەکانتان بکوژێننەوە.

لە حەدیسێکیتردا دەفەرموێ: ﴿إنَّ هذهِ النّارَ إنّما هِيَ عَدوٌّ لَكُمْ فَإذا نُمتُمْ فَأَطْفِئُوها عَنْكُمْ﴾ رواه مسلم، ئەو ئاگرە دوژمنی ئێوەیە، جا هەر کاتێك خەوتن، لە ماڵەکانتاندا بیکوژێننەوە.

﴿ بابُ أَسْبابِ الْحَدَث: **باسی هۆیەکانی بێ دەستنوێژی** ﴾

واتە: بێدەستنوێژیی بچوك (هِيَ) هۆیەکانی بێدەستنوێژی (أَرْبَعَـةٌ) چوارن: (أَحَدُهَا) یەکێك لەو چوارە: (خُرُوجُ شَيْءٍ) هاتنەدەرەوەی شتێکە (مِنْ قُبُلِهِ) لە پێشەوەی مرۆڤ، واتە: لە ئەندامی میزکردن (أَوْ دُبُرِهِ) یان لە پشتەوە، واتە: لە کونی پیسایی کردن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَوْ جاءَ أَحَدٌ مِنكُمْ مِنَ الْغائطِ أَوْ لامَسْتُمُ النّساءَ فَلَمْ تَجِدُوا مـاءً فَتَيَمَّمُوا﴾ الآیة، واتە: یان یەکێك لە ئێوە لە پیساییکردن هاتەوە، یان دەستتان لە ئافرەتان دا، جا ئاوتان دەست نەکەوت، تەیەمموم بکەن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لا وُضُوءَ إلاّ مِنْ صَـوْتٍ أَوْ رِيـحٍ﴾ رواه الترمذی وصححه، دەستنوێژ واجب نابێ تەنها لە ترو فس نەبێ.

ئینجا بزانە: لەو شتەی کە لە کونی پێشەوە، یان لە کونی پشتەوە دێتە دەرەوە، جیاوازی پیاو و ئافرەت نیە، هەروەها جیاوازی نیە: شتەکە کەم بێ، یان زۆر بێ، میزو پیسایی بێ، یان کێم، یان خوێن، یان کرم، یان بەرد، یان با، یان هەر شتێکیتر بێ، هەروەها بزانە: دەگونجێ پیاوی قوڕ لە ئەندامی میزکردندا بای لێبێتە دەرەوە، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، کەوابو: دەگونجێ ئافرەتیش لە منداڵدانەوە بای لێبێتە دەرەوە.

هەروەها (مَـذْي)و (وَدْي)ش دەستنوێژ دەشکێنن، هەر وەك لە (باب الغسل)دا، بە بەڵگەوە باسیان دەکەین، ان شاء الله تعالى (إلاّ الْمَنِـيَّ) تەنها هاتنە دەرەوەی (مَنی)ی خۆی دەسنوێژ ناشکێنێ، چونکە شتێکی گەورەتر واجب دەکا: کە غوسل کردنە؟ وەك بە هۆی تەماشاکردنی ئافرەت، یان پیاو، یان بیرکردنەوە، (مَنی)ی بێتە دەرەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر هاتو دەرمان، یان شتێکیتری خستە ناو کونی پێشەوە، یان پشتەوە، ئەوە ئەگەر لێیبێتە دەرەوە دەستنوێژی دەشکێ، ئەگەر نا: نا، هەر وەك لە (المجموع) وەردەگیرێ.

وَلَوْ انْسَدَّ مَخْرَجُهُ وَانْفَتَحَ تَحْتَ مَعِدَتِه فَخَرَجَ الْمُعْتَادُ نَقَضَ، وَكَذا نَادِرٌ كَدُود فِي الأَظْهَرِ، أَوْ فَوْقَهَا وَهُوَ مَنْسَدٌّ أَوْ تَحْتَهَا وَهُوَ مُنْفَتِحٌ فَلاَ فِيالأَظْهَرِ. اَلثَّانِي: زَوَالُ الْعَقْلِ

---

(وَلَوْ انْسَدَّ مَخْرَجُهُ) ئەگەر کەسێك کونی پێشەوە، یان پشتەوەی گیرا (وَانْفَتَحَ تَحْتَ مَعِدَتِه) لە لای خوارەوەی ناوکی کونێکیتر بۆوە (فَخَرَجَ الْمُعْتَادُ) ئینجا میز، یان پیسایی، یان هەر دووکیان لەو کونەوە هاتنە دەرەوە (نَقَضَ) دەستنوێژی دەشکێنێ، چونکە مرۆڤ پێویستە: ئەو دوو شتانەی لێبێنە دەرەوە (وَكَذا نادِرٌ) هەروەها ئەو شتەی کەم جارەش دێتە دەرەوە (كَدُودٍ) وەکو کرمو کێمو خوێنو با (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا: ئەوانەش دەستنوێژ دەشکێنن، چونکە ئەم کونە لە جیاتی یەکێك، یان هەردوو کونەکەیترە، بەڵام تەنها بۆ دەستنوێژ شکان نەبێ، واتە: بە دەست لێدانی دەستنوێژ ناشکێو تارەتکردنیشی بە بەرد دروست نیە، هەرەوك (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(أَوْفَوْقَها) یان کونەکە لە سەرەوەی ناوك، یان هەر لە ناوکدا بۆوە (وَهُوَ مُنْسَدٌّ) لە کاتێکدا کونی خوارەوە گیرابو، ئەوە دەستنوێژی ناشکێ، چونکە بە ڕشانەوە دەچێ (أَوْتَحْتَها) یان کونەکە لە خوارەوەی ناوکدا بۆوە (وَهُوَ مُنْفَتِحٌ) کونیخوارەوەش کرابۆوە (فَلا فِيالأَظْهَرِ) دەستنوێژی ناشکێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە هیچ پێویست بەو کونە نیە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەم ڕوونکردنەوەیە دەربارەی ئەو کەسە بوو: کە کونێکی، یان هەردوو کونی خوارەوەی بە هۆیەك بگیرێ، بەڵام ئەگەر لە زگماکدا–واتە: هەر کە لە دایك بوو– کونێك، یان هەردوو کونی خوارەوەی نەبو، بەڵکو لە شوێنێکیتر کونێکی هەبو، یان پزیشك کونێکی بۆ کردەوە، ئەم کونە لە هەر شوێنێکدا بێو هەر شتێکی لێبێتە دەرەوە، دەستنوێژی پێدەشکێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

هەروەها بزانە: بە هۆی ڕشانەوەو لووت داڕسانو خوێن هاتنە دەرەوە: لە هەر کونێکیتر، یان لە دەمار، یان لە برین: بە هیچیان دەستنوێژ ناشکێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(اَلثَّانِي) دووەم لەو شتانەی دەستنوێژ دەشکێنن: (زَوالُ الْعَقْلِ) لاچوونی هۆشە: بە هۆی نوستن، یان سەرخۆشی، یان نەخۆشی، یان بوورانەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْعَيْنان وِكاءُ السَّهِ فَمَنْ نامَ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾ رواه ابوداود و ابن ماجه، وحسنه النووي في المجموع، واتە: چاو زاربێنی کونیپشتەوەیە، کەوابو: هەر کەسێك نوست دەبی دەستنوێژ بگرێتەوە. کەواتە: جیاوازی خەوتنی کەمو زۆر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(إلاّ نَوْمَ مُمَكّنٍ مَقْعَدَهُ) تەنها نوستنی ئەو کەسەی کونی پشتەوەی لە شوێنی دانیشتنی گیر کردبێ دەستنوێژ ناشکێنێ: وەك قاچیخۆی، یان شتێکیتری بە دانیشتوویی لە بن خۆی دانابێ‌و بۆشایش لە نێواندا نەبێ، جا زیانی نیە ئەگەر پاڵیش بداتە شتێك، چونکە دڵنیا دەبێ کە هیچی لێنایێتە دەرەوە ﴿عن أنس ﷺ: كَانَ أَصْحابُ رَسُولِ اللهﷺ عَلىٰعَهْدِهِ يَنْتَظِرُونَ الْعِشاءَ حَتّى تَخفِقَ رُؤُوسُهُمْ ثُمَّ يُصَلُّون وَلا يَتَوَضَّأُونَ﴾ رواه ابوداود وصححه الدارقطني، لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ (صَحابَة)کان چاوەڕوانی نوێژی عیشایان دەکرد، تا بە هۆی نوستن سەریان بە لادا دەچو، ئینجا نوێژیان دەکردو دەستنوێژیان نەدەگرتەوە، واتە: چونکە بە دانیشتوویی خەوتبون.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر بەو شێوەیە بە دانیشتوویی خەوتبو، تەماشا دەکا: ئەگەر پێش هەشیار بوونەوە لە سەر شتەکە لاچوبو، ئەوە دەستنوێژی دەشکێ، ئەگەر لە گەڵ هەشیاربوونەوەدا لاچو، یان لە دوایی‌دا، یان نەیزانی کامەیان لە پێشدا بووە، ئەوە دەستنوێژی ناشکێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر لە سەر پشت، یان لە سەر تەنیشت بخەوێ، دەستنوێژی دەشکێ، هەرچەند کونەکەشی گیر بکا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بە هۆی بۆرژان دەستنوێژی ناشکێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلّي فَلْيَرْقُدْ حَتّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إذا صَلّى وَهُوَ ناعِسٌ لا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك یەکێکتان بۆرژاو نوێژی دەکرد، با لە دوای نوێژەکە بخەوێ، تا خەو وازی لێدێنێ، چونکە کاتێك بە بۆرژانەوە نوێژ بکا، نازانێ لەوانەیە بیەوێ دوعای لێخۆشبوون بۆ خۆی بکا، لەجیاتی ئەوە لە دژیخۆی دوعا دەکا. واتە: ئەگەر بە بۆرژان دەستنوێژ بشکێ، فەرمانی دەستنوێژگرتنەوەی دەکرد، هەروەها بزانە: یەکێك لە نیشانەکانیبۆرژان ئەوەیە: گوێی لە دەنگی دەوروبەری خۆی بێ هەر چەندەش لێی تێنەگا، نیشانەی خەوتنیش خەون دیتنە.

(اَلثّالِثُ) سێیەم لەو شتانەی دەسنوێژ دەشکێنن: (الْتِقاءُ بَشَرَتَي الرَّجُلِ وَالْمَرْأَةِ) بە یەککەیشتنی پیستی پیاو و ئافرەتی نامەحرەمە، بە بێپەردە، هەر چەند بە ویستی خۆیشیان نەبێ‌و لە بیریشان نەبێ کە دەستنوێژیان هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَوْ لامَسْتُمُ النِّساءَ فَلَمْ تَجِدوا ماءً فَتَيَمَّمُوا﴾ الآية، یان ئەگەر دەسستتان لە ئافرەتان دا، جا ئاوتان دەست نەکەوت، تەیەممومم بکەن.

﴿عن ابن عُمَرَرَضِيالله عَنهما: قُبْلَةُ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ أَوْ جَسُّها بِيَدِهِ مِنَ الْمُلامَسَةِ، فَمَنْ قَبَّلَ امْرَأَتَهُ أَوْ جَسَّها بِيَدِهِ فَعَلَيْهِ الْوُضُوءُ﴾ رواه الامامان: مالك والشافعي، وقال النواوي فيالمجموع: هذا إسناد في نهاية من الصحة، واته: پیاو ئافرەتی خۆی ماچ بکا، یان دەستیخۆی لێبدا، هەردووکیان لەو پێککەوتنەیە: کە لە ئایەتەکەدا هاتوە، جا هەر کەسێك ژنیخۆی ماچ بکا، یان دەستی لێبدا دەستنوێژی دەکەوێتە سەر.

﴿ئاگاداری﴾: لە حەدیسێکدا—لە چەند رێگەوە— هاتوە: ﴿پێغەمبەرﷺ ژنێکی خۆی ماچ کرد، ئینجا نوێژی کردو دەستنوێژیشی نەگرتەوە﴾. ئیمامی(البخاری)و زانایانیتری حەدیس ئەم حەدیسەیان بە بێهێز داناوە، هەروەك ئیمامی (الترمذی) فەرموویەتی.

هەروەها لە حەدیسێکیتردا حەزرەتی(عائشة)رَضِيالله عَنها دەفەرموێ: ﴿لە پێش پێغەمبەرﷺ خەوتبوم، کاتێ سوجدەی دەبرد پێیەکانی دەگرتم﴾. هەروەها دەفەموێ: ﴿پێغەمبەرﷺ نوێژی دەکردو دەستم بە پێی کەوت﴾. ئەم دوو حەدیسانە (صحیح)ن، بەڵام دەگونجێ: پێیەکانیان ڕووت نەبوبن، بۆیێ نەکراونە بەڵگەی دەستنوێژ نەشکان، ئیمامی (النواوی)ش لە (المجموع)دا ئەم سێ حەدیسانەی ڕوون کردونەوە.

(إلاَّ مَحْرَماً) تەنها ئافرەتیمەحرەم، یان پیاویمەحرەم دەستنوێژی لێناشکێ، چونکە گومانی دەمارهەڵسانی لێناکرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرمودەی بەهێزتردا.

جا مەبەست بە مەحرەم: ئەو پیاو و ئافرەتەیە: مارەییان لە یەکتری نەیێ بە یەکجاری، واتە: تەماشاکردنی یەکتریشیان حەڵاڵ بێ، جا بە هۆی نەژاد، یان بە هۆی شیرخواردن، یان زاواو خەزورایەتی: وەکو دایكو خوشكو کیژو داپیرەو برازاو خوشکەزاو نەوەو خەسوو و کیژە ژنی گواستراوەو ژنیباوكو ژنیکوڕو...هتد: ئەوانەی لە کتاب (النکاح)دا باسیان ئەکەین، ان شاء الله تعالى.

بەڵام ئەگەر ئێستا مارەیی لە پیاوەکە دەهات: وەکو ژنیخۆی، یان لە مەودوا: وەکو خوشکیژنو پلکیژن، یانوەکو خاڵۆژنو مامۆژنو براژنو گشت ئافرەتیتری بێگانەش، ئەوانە مەحرەم نین، کەواتە: گشتیان دەستنوێژیان لێدەشکێو تەماشاکردنی گشتیان —جگە لە ژنیخۆی— حەرامە. ئیتر جیاوازی نیە لەم پێکەوتنەدا: ئەندامەکە دەست بێ، یان ئەندامێکیتر بێ، هەردووکیان زیندوو بن، یان یەکێکیان مردوو بێ، بەڵام دەستنوێژی مردووەکە ناشکێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَالْمَلْمُوسُ) دەست لێدراو—واتە: ئەوەی دەستی لێدراو— جا پیاو بێ، یان ئافرەت (كَلامِسٍ) وەکو دەست لێدەرەکەیە، واتە دەستنوێژی هەردووکیان دەشکێ (فِيالأَظْهَرِ)

وَلاَ تَنْقُضُ صَغِيرَةٌ وَشَعَرٌ وَسِنٌّ وَظُفْرٌ فِي الأَصَحِّ. اَلرَّابِعُ: مَسُّ قُبُلِ الآدَمِيِّ بِبَطْنِ الْكَفِّ،

---

له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا، جیاوازی نیه: ده‌ماریان هه‌ڵبستێ، یان نا، هه‌رچه‌ند یه‌کێکیان پیره‌مێرد، یان پیره‌ژن بێ، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا فه‌رموویه‌تی.

هه‌روه‌ها له وێدا ده‌فه‌رموێ: ئه‌گه‌ر له پاڵه‌په‌سته‌ی پیاو و ئافره‌تدا، به بێ‌په‌رده ده‌ستی به پیسته‌ی یه‌کێك که‌وت، به‌ڵام نه‌یزانی پیسته‌ی پیاو بوو، یان هی ئافره‌ت بوو، یان نه‌یزانی پیسته‌ی مه‌حره‌م بوو، یان هی نامه‌حره‌م بوو، یان لایه‌نێك نێره‌موك بوو، واته: ئه‌ژن نه‌پیاو بوو، ئه‌وه له‌و مه‌سه‌لانه‌دا ده‌ستنوێژی هیچ لایه‌ك ناشكێ، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر په‌رده‌ش له نێواندا هه‌بێ ده‌ستنوێژ ناشكێ، هه‌رچه‌ند په‌رده‌كه‌ش ته‌نك بێ.

(ولاتَـنْقُضُ صَـغِيرَةٌ) كیژۆڵه‌ی‌بچـووك‌و كوڕی‌بچـووك ده‌شـتنوێژ ناشـكێنن‌و ده‌سـتنوێژی خۆیشـیان ناشـكێ، هـه‌روه‌ك (الشبراملسـی) فه‌رموویـه‌تی، مه‌به‌ست به بچـووك ئه‌وه‌یه: نه‌گه‌یشتبێته سنورێكی وه‌ها: حه‌زی لێبكرێ‌و ده‌ماری لێ‌هه‌ڵبستێ.

(وَشَعَرٌ) هه‌روه‌ها ده‌ست لێدانی موو ده‌ستنوێژی پێ‌ناشكێ، جا ئه‌گه‌ر ده‌ستی به شـتێك كـه‌وت‌و نـه‌یزانی مـوو بـوو، یـان پیسـته بـوو، ئـه‌وه ده‌سـتنوێژی ناشـكێ (وسِـنٌّ) ددان ده‌ستنوێژی پێ‌ناشكێ (وَظُفْـرٌ) نینـۆك‌و ئێسـقان ده‌سـتنوێژیان پێ‌ناشـكێ (فِي الأَصَـحِّ) لـه فه‌رمووده‌ی‌ڕاستتردا.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر ئه‌ندامێكی ئافره‌ت، یان پیاو-جگه لـه ئه‌نـدامی‌میزكردن- لـه لاشـه جیـا كـراوه، ده‌سـتنوێژ ناشـكێنێ، بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر پیـاو، یـان ئـافره‌ت دوو لـه‌ت كـرا: ئـه‌وه پارچه‌كه‌ی گه‌وره‌تر ده‌ستنوێژ ده‌شكێنێ‌و پارچه‌كه‌ی بچوكتریش: ئه‌گه‌ر نـاوی نێـر، یـان مێی بۆ ده‌گوترا، ئه‌ویش ده‌ستنوێژ ده‌شكێنێ، ئه‌گـه‌رنا: نـا، هـه‌روه‌ك لـه (الشـروانی)دا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

(اَلرَّابِعُ) چواره‌م له‌و شتانه‌ی ده‌سـتنوێژ ده‌شـكێنن: (مَـسُّ قُبُـلِ الآدَمِـيِّ) ده‌سـت لێـدانی ئه‌ندامی میزكردنی ئاده‌میزاده، جا نێر بێ، یان مێ، جیـاوازی مـه‌حره‌م‌و نامـه‌حره‌م نیـه (بِبَطْنِ الْكَفِّ) ده‌ست لێدانه‌كه‌ش به به‌ری‌ده‌ست بێ‌و به بێ‌په‌رده بێ، جـا ئه‌ندامه‌كـه‌ش: هی خۆی بێ، یان نا، هه‌ر به لاشه‌وه بێ، یان لێی جیا كرابێتـه‌وه، بـه ویسـتی‌خۆی بـێ، یان نا، پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فـه‌رموێ: ﴿إِذَا أَفْضَى أَحَدُكُمْ بِيَدِهِ إِلَى فَرْجِهِ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا سِتْرٌ وَلاَ حَائِلٌ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾ رواه الامامان: الشـافعي واحمـد وصـححه الحـاكم، هـه‌ر كاتێـك یـه‌كێكتان به‌ره‌ده‌ستی خۆی گه‌یانده ئه‌ندامی میزكردنی، په‌رده‌ش له نێـوان ده‌سـت‌و ئه‌ندامه‌كـه‌دا نه‌بو، با ده‌ستنوێژی بگرێته‌وه.

وَكَذا فِي الْجَديد حَلْقَةُ دُبُرِه، لا فَرْجُ بَهيمَة، وَيَنْقُضُ فَرْجُ الْمَيِّت وَالصَّغيرِ وَمَحَلُّ الْجَبِّ وَالذَّكَرُ الأَشَلُّ، وَبالْيَدِ الشَّلاّءِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يَنْقُضُ رَأْسُ الأَصابِعِ وَمَا بَيْنَهَا. وَيَحْرُمُ بِالْحَدَث: اَلصَّلاةُ،

---

(وَكَذا فِي الْجَديدِ حَلْقَةُ دُبُرِهِ) هەروەها بازنەی کونیپشتەوەش دەستنوێژ دەشکێنێ، لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعي)دا بە (قیاس) لە سەر ئەندامی پێشەوە، کەوابو: جیاوازی هی خۆی و کەسێکیتر نیە.

(لافَرْجُ بَهيمَةٍ) بەڵام ئەندامی میزکردنی ئاژەڵو کونی پشتەوەی ئاژەڵو باڵندە دەستنوێژ ناشکێنێ، چونکە جێی دەمارهەڵسان نیەو تەماشاکردنیشی حەرام نیە.

(وَيَنْقُضُ فَرْجُ الْمَيِّتِ) ئەندامیمیزکردنی ئادەمیزادیمردوو، دەستنوێژ دەشکێنێ (وَالصَّغيرِ) هەروەهاش هـی منداڵیبچووك دەستنوێژ دەشکێنێ، هەرچەند تەمەنیشی یەك ڕۆژ بێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی (وَمَحَلُّ الْجَبِّ) ئەو شوێنەش کە ئەندامەکەی لێ جیا کراوەتەوە، ئەوێش دەستنوێژ دەشکێنێ (وَالذَّكَرُالأَشَلُّ) هەم ئەندامینێرینە کە شەلەپەتە بووە دەستنوێژ دەشکێنێ (وَبِالْيَدِالشَّلاّءِ) هەروەها بە بەرە دەستی شەلەپەتەش، واتە: لەکارکەوتوو، کە بەئەندامەکە بکەوێ دەستنوێژ دەشکێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام جگە لە بەرەدەست، بە هیچ ئەندامێکیتر دەستنوێژ ناشکێ.

(وَلا يَنْقُضُ رُؤوسُ الأَصابِعِ) پێکەوتنی سەرە پەنجەکان دەستنوێژ ناشکێنێ (وَما بَيْنَهُما) هەروەها نێوان پەنجەکانیش دەستنوێژ ناشکێنێ، واتە: هەرکاتێك هەردوو بەرە دەستەکانی تۆزێك بە هێزەوە خستنە سەر یەکتری، ئەوەی پەنهان ببێ بە بەرەدەست دادەندرێ.

ئینجا بزانە: گونو بەری ئافرەتو بەری پیاو و نەرمە ڕانی پێشەوەو پشتەوەو دەووبەری کونی پشتەوە، هیچیان دەستنوێژ ناشکێنن، هەروەها ئەوەی دەستی لە ئەندامەکە دراوە، دەستنوێژی ناشکێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، واتە: بەو مەرجەی لایەنێك ئافرەتی نامەحرەم نەبێ، هەروەك ڕوون کراوە.

## ﴿ ئەو شتانەی بە بێدەستنوێژی حەرامن ﴾

(وَيَحْرُمُ بِالْحَدَثِ) حەرامە بە بێدەستنوێژیەوە: سێ شت، ئەگەر ناچار نەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، یەکەم: (اَلصَّلاةُ) نوێژکردن: جا سوننەت بێ، یان واجب بێ، هەروەها نوێژی(جَنازَة)و سوجدەی (شُكْر)و(تِلاوَة)و ووتاری(جُمُعَة)ش وەکو نوێژکردن حەرامن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لايَقْبَلُ اللهُ صَلاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ﴾ رواه مسلم، خوای گەورە هیچ نوێژێك قبولْ ناکا بە بێدەستنوێژی.

وَالطَّوَافُ وَحَمْلُ الْمُصْحَفِ وَمَسُّ وَرَقِه -وَكَذا جِلْـدُهُ عَلَى الصَّـحِيحِ- وَخَرِيطَـةٌ وَصُنْدوقٌ فِيهِما مُصْحَفٌ وَمَا كُتِبَ لِدَرْسِ قُرْآنٍ كَلَوْحٍ فِي الأَصَحِّ،

---

دووهم: (وَالطَّوافُ) هەروەها تەواف کردنی (کَعْبة)ی ماڵیخوا، بە بێدەستنوێژی حەرامە، جا سوننەت بێ، یانواجب ﴿عن ابن عباس رضي الله عنهما: اَلطَّوافُ حَولَ الْبَيْتِ مِثلُ الصَّلاةِ...﴾ صحح الحاكم رفعه، وصحح النواوي وقفه على ابن عباس، واتە: تەواف کردنی ماڵیخوا وەکو نوێژە: بە بێدەستنوێژی دروست نیە.

سێیەم: (وَحَمْلُ الْمُصْحَفِ) هەڵگرتنی قورئانو (وَمَسُّ وَرَقِهِ) دەست لێدانی پەڕی قورئان هەردووکی حەرامن، لە مەزهەبی ئێمەو لە فەرموودەی هەرسێك ئیمامەکەیتری سەر مەزهەبدا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی (وكَذا جِلْدُهُ) هەروەها دەست لێدانی بەرگی قورئانیش حەرامە (عَلى الصَّحِيحِ) لە فەرموودەی ڕاستدا، هەرچەند لە قورئانیش جیا کرابێتەوە، هەروەك لە (مغنی)و (نهایة)دا ڕوون کراوەتەوە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لايَمَسُّهُ إلاّ الْمُطَهَّرُونَ﴾ دەست لە قورئان نادەن تەنها بە دەستنوێژەکان نەبێ. واتە: جگە لەوان نابێ کەسیتر دەستی لێبدا، ئاشکرایە: هەڵگرتن گرنگترە لە دەست لێدان.

جا ئەگەر هاتو نەگونجا دەستنوێژ بگرێ، یان تەیەمموم بکاو مەترسیش هەبو قورئانەکە لە ناو بچێ، یان پیس ببێ، یان سوکایەتی پێبکرێ، ئەوە واجبە ڕزگاری بکا، هەر چەند بە بێدەستنوێژیش هەڵیبگرێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَخَرِيطَةٌ) دەست لێدانی کیسەیەکو (وَصُنْدُوقٌ) دەست لێدانی سوندوقێك (فِيهِما مُصْحَفٌ) کە قورئانیان لە ناودا بێ حەرامە، هەروەها دەست لێدانی ئەو کورسیەی قورئانی لە سەر داندراوە ئەویش حەرامە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَما كُتِبَ لِدَرْسِ قُرْآنٍ) هەروەها حەرامە دەست لەو شتەش بدرێ: کە بۆ دەرس خوێندن قورئانی لێنووسراوەتەوە (كَلَوْحٍ) وەکو تەختەی قوتابیان، یان دەفتەر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام ئەگەر بۆ دەرس خوێندن نەنووسرابو: وەکو نووسینی سەر دیرهەمو دینارو نامەو ئەنگوستیلەو دیوارو جلو بەرگو شتی وەها، ئەوە دەست لێدانو هەڵگرتنی حەرام نیە.

هەروەها دروستە: بە بێدەستنوێژ، یان بە جەنابەتەوە قورئان بنووسێتەوە، بەو مەرجەی لە کاتی نووسینەوەدا دەست لە نووسراوەکە نەداو هەڵیشی نەگرێ، ئەگەر نا: حەرامە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر بە مەبەستی (تَبَرُّك) ئایەتی قورئانی لێنووسرابێتەوە: وەکو نوشتە، ئەوەش دەست لێدانو هەڵگرتنی حەرام نیە، بەڵام هەڵگرتنی هەموو قورئان بە مەبەستی (تَبرُّك) بە هەر جۆرێك بێ حەرامە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَصَحُّ حِلُّ حَمْلِه فِي أَمْتِعَةٍ وَتَفْسِيرٍ وَدَنَانِيرَ، لاَ قَلْبِ وَرَقِهِ بِعُودٍ، وَأَنَّ الصَّبِيَّ الْمُحْدِثَ لاَ يُمْنَعُ، قُلْتُ: الأَصَحُّ حِلُّ قَلْبِ وَرَقِهِ بِعُودٍ وَبِهِ قَطَعَ الْعِرَاقِيُّونَ وَاللهُ أَعْلَمُ.
وَمَنْ تَيَقَّنَ طُهْراً أَوْ حَدَثَاً وَشَكَّ فِي ضِدِّهِ عَمِلَ بِيَقِينِهِ،

---

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (حِلُّ حَمْلِهِ فِي أَمْتِعَةٍ) حەڵاڵە بە بێدەستنوێژی قورئان هەڵبگیرێ کە قورئانەکە لە ناو کەلوپەلێکدا بێ: وەکو جل‌و بەرگ‌و ئەو جۆرە شتانە، بەو مەرجەی مەبەستی تەنها هەڵگرتنی قورئان نەبێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.
ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر موبایل‌و کومپیوتەرو سی‌دی هەموو قورئانیشیان تێدا تۆمار کرابێ، دروستە بە بێدەستنوێژی هەڵبگیرێن، والله أعلم.
(وَتَفْسِيرٍ) هەروەها دەست لێدان‌و هەڵگرتنی ئەو قورئانەی لە گەڵ تەفسیردا نووسراوەتەوە بە بێدەستنوێژی حەڵاڵە، بەو مەرجەی تەفسیرەکە زۆرتر بێ (وَدَنَانِيرَ) هەروەها دەست لێدان‌و هەڵگرتنی ئەو دینارو دیرهەمانەی قورئانی لە سەر نووسراوە دروست-هەروەك باسمان کرد- چونکە مەبەست هەڵگرتنی قورئان نیە (لاَقَلْبُ وَرَقِهِ بِعُودٍ) بەلام وەرگێڕانی پەڕی قورئان بە داروچکە دروست نیە.
(وَأَنَّ الصَّبِيَّ الْمُحْدِثَ) بە فەرموودەی ڕاستتر: منداڵی بێدەستنوێژ (لاَيُمْنَعُ) واجب نیە قەدەغە بکرێ لە دەست لێدان‌و هەڵگرتنی قورئان‌و تەختەی دەرس خوێندن: بۆ پێویستەکانی دەرس‌و دەورکردنەوەو هێنانی بۆ مامۆستای خۆی.
(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: (حِلُّ قَلْبِ وَرَقِهِ بِعُودٍ) حەڵاڵە وەرگێڕانی پەڕی قورئان بە داروچکەو پێنووس‌و ئەو جۆرە شتانە، هەرچەند دەستنوێژیشی نەبێ (وَبِهِ قَطَعَ الْعِرَاقِيُّونَ وَاللهُ أَعْلَمُ) بەم فەرموودەیە زانایانی عێراق بڕیارەکەیان براندۆتەوە، چونکە نە هەڵی‌گرتووەو نە دەستی لێداوە، زانایانی ئیسلامیش یەك دەنگن: کە قورئانخوێندن بە بێدەستنوێژی دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ گومان‌و بێگومانی لە دەستنوێژدا ﴾

(وَمَنْ تَيَقَّنَ طُهْراً) هەر کەسێك بێگومان بوو: کە دەستنوێژی هەیە (أَوْحَدَثَاً) یان بێگومان بوو: کە بێدەستنوێژە (وَشَكَّ فِي ضِدِّهِ) بەلام لە دژی یەکێك لەو دووانە کەوتە گومان: ئایا دەستنوێژی ماوە، یان نا، ئایا دەستنوێژی گرتۆتەوە، یان نا (عَمِلَ بِيَقِينِهِ) دەبێ بە بێگومانیەکەی‌خۆی ڕەفتار بکاو گوێ نەداتە گومانەکە، کەواتە: لە مەسەلەی‌یەکەمدا دەستنوێژی ماوەو لە مەسەلەی‌دووەمدا هەر بێدەستنوێژە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئاً فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ: أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ؟

فَلا يَخرُجَنَّ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتاً أَو يَجِدَ رِيحاً﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك هەوایەك لە ناو زگی یەكێكتان پەیدا بوو، ئینجا كەوتە گومان: ئایا هیچی لێهاتۆتە دەرەوە، یان نا؟ ئەوە با لە مزگەوت نەچێتە دەرەوە بۆ دەستنوێژگرتن، تا گوێی لە دەنگێك دەبێ، یان بۆنێكی بۆ دێ، واتە: تڕ، یان فس.

جا هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە زانایانیئایین بنچینەیەكی (أُصُولُ الْفِقْهِ)یان داناوەو دەفەرموون: (اَلْيَقِينُ لايَزُولُ بِالشَّكِّ) بێگومانی بە گومان لاناچێ. واتە: وەك دوو مەسەلەكەیڕابردوو.

(فَلَوْ تَيَقَّنَهُما) جا ئەگەر بێگومان دەیزانی لە مەوپێش دەستنوێژی هەبوەو بێدەستنوێژیشی هەبوە (وَجَهِلَ السَّابِقَ) بەڵام نەیزانی كامەیان لەم دووانە لە پێشدا بووە، ئەوە (فَضِدُّ ماقَبْلَهُما فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا: بە دژی پێش هەردووكیان ڕەفتار دەكا، واتە: ئەگەر بێگومان دەیزانی لە دوای ڕۆژهەڵات دەستنوێژی هەبوەو دەستنوێژیشی شكاوە، بەڵام نەیزانی كامەیان لە پێشدا بووە، واجبە بیر بكاتەوە: ئەگەر لە پێش كاتی ئەم دووانەدا بێدەستنوێژ بوبێ، ئەوە ئێستا دەستنوێژی هەیە، ئەگەر لە پێش ئەم دووانەدا دەستنوێژی هەبوبێو لەوانەش نەبێ دەستنوێژی نوێ بكاتەوە، ئەوە ئێستا بێدەستنوێژە، بەڵام لە (المجموع)دا دەفەرموێ: لە گشت حاڵەتێكدا واجبە دەستنوێژ بگرێتەوە، ئەمە فەرموودەی بەهێزترو هەڵبژاردراوە،وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ پاشكۆ: دەربارەی قورئانی پیرۆز ﴾

بزانە: خێری قورئانخوێندن گەورەترە: لە (تَسْبِيحات)و (لاإِلهَ إِلاَّالله)و گشت زیكرێكیتر، تەنها لەو زیكرانە نەبێ: كە بەڵگەی كاتو شوێنی دیاركراویان لە سەرە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يَجِيءُ الْقُرآنُ يَوْمَ الْقِيامَةِ فَيَقُولُ: يارَبِّ حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تاجَ الْكَرامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يارَبِّ زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرامَةِ، ثُمَ يَقُولُ: يارَبِّ ارْضَ عَنْهُ فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَتُزادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، لە ڕۆژی قیامەتدا قورئانی پیرۆز دێتو بۆ قورئانخوێنەكەی دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خوایە ئەم قورئانخوێنە جوان بكە. ئینجا تاجی ڕێزداریی لە سەر دەندرێ، ئینجا دەڵێ: خوایە زیاتری بدێ. ئینجا خشڵی ڕێزداریی دەبەر دەكرێ، ئینجا دەڵێ: خوایە لێی ڕازی ببە. خوای گەورەش لێی ڕازی دەبێو جا پێیدەگوترێ: قورئان بخوێنەوە–واتە: وەك لە دونیادا دەتخوێندو– لە نهۆمەكانی بەهەشت سەركەوەو بە خوێندنی هەر ئایەتێكیش چاكەیەكت بۆ زیاد دەكرێ.

له حەدیسێکی‌تردا دەفەرموێ: ﴿مامِنْ رَجُلٍ يُعَلِّمُ وَلَدَهُ الْقُرْآنَ إلاّ تُوِّجَ يَوْمَ الْقِيامَةِ بِتاجٍ فِي الْجَنَّةِ﴾ اخرجه الطبراني، هەر کەسێك منداڵی‌خوی فێره قورئان خوێندن بکا، ڕۆژی قیامەت له بەهەشتدا تاجێکی له سەر دەندرێ.

ئینجا بزانه: له (المجموع)و (الاتقان)دا دەفەرموون: گەورەترین کات بۆ قورئانخوێندن: ناو نوێژه، ئینجا شەو، ئینجا نیوەی دووەمی شەوێ، له ڕۆژیشدا له دوای نوێژی بەیانی، هەروەها دەفەرموون: قورئانخوێندن بە چاولێکردنی‌قورئان خێری زیاتره له خوێندنی بێ‌چاولێکردن، چونکه تەماشاکردنی قورئان (عِبادَة)یکی‌تره، مەگەر کەسێك بە لەبەر خوێندن چاکتر لێی ورد بێتەوه، ئەو کاته بە لەبەر خوێندن خێری زیاتره.

هەروەها دەفەرموون: قورئانخوێندن بە دەمی پیس ناپەسندە، هەروەها سوننەته دەمی خۆی بە سیواك پاك بکاتەوەو ڕوو له قیبله بە هێمنی‌و ڕێزو ترسەوه له شوێنێکی‌پاك دابنیشێ، بەڵام قورئانخوێندن له گەرماو و له ڕێگەدا ناپەسند نیه.

ئینجا بە دەنگ بڵێ: (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ)، چونکه خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿فَإذا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ﴾ هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی، خۆت بە خوا بپارێزه له شەیتانی‌تێهەڵدراو.

ئینجا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) له سەرەتای گشت سورەتێك –جگه له (بَراءة)– هەم له ناو هەر سورەتێکدا: کە لێیەوه دەست بە خوێندن بکا، هەروەك له (الاتقان)دا فەرموویەتی.

ئینجا کە خوێندنەکەی کۆتایی هات، سوننەته بڵێ: (صَدَقَ اللهُ الْعَظِيمُ وَبَلَّغَ رَسُولُ اللهِﷺ وَأَنا عَلى ذلِكَ مِنَ الشّاهِدِينَ). هەروەك ئیمامی(القرطبي) له پێشەکی تەفسیرەکەی‌دا ئاماژەی بۆ کردوه، واته: چونکه خوای گەوره دەفەرموێ: ﴿قُلْ صَدَقَ اللهُ فَاتَّبِعُوا مِلَّةَ إِبْراهِيمَ حَنِيفاً﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: خوا ڕاست دەکا، کەوابو: ئێوه شوێن ئایینی إبراهیم پێغەمبەرﷺ بکەون کە ئایینی ئیسلامه.

هەروەها له (المجموع)و (الاتقان)دا دەفەرموون: سوننەته بە دەنگێکی خۆش‌و بە (تجوید) قورئان بخوێنێ، چونکه پەلەکردن ناپەسندە، خوای‌گەوره دەفەرموێ: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً﴾ بە ڕوون‌و لەسەرخۆ قورئان بخوێنەوه، واته: گشت پیتێك مافی خۆی بدرێتی‌و ئاشکرا بکرێ. هەم سوننەته له کاتی خوێندنی ئایەتی‌سوجدەدا سوجده ببا، بەو شێوەی له سوجدەی(تلاوة)دا ڕوونی ئەکەینەوه ان شاء الله تعالى.

هەروەها سوننەته هەر ئایەتێکی له باسی‌ڕەحمەت خوێند له خوا بپاڕێتەوه ڕەحمی پێ‌بکا، هەر ئایەتێکی له باسی‌عەزاب خوێند له خوا بپاڕێتەوه له عەزاب بیپارێزێ، هەر ئایەتێکی

تەسبیحی خوێند بڵێ: (سُبْحانَ اللهِ). لە ئایەتی (أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقادِرٍ عَلى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتى)و لە ئایەتی (أَلَيْسَ اللهُ بِأَحْكَمِ الْحاكِمِينَ) بڵێ: (بَلى وَأَنا عَلى ذَلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ). لە ئایەتی (فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ) بڵێ: (آمَنَّا بِاللهِ). هەروەك لە (الإتقان)دا بەڵگەی بۆ هێناون.

هەروەها پێویستە: خۆی لە پێکەنین‌و خۆ مەشغولکردن بپارێزێ، سوننەتە دەنگ هەڵێنێ، مەگەر لە (رياء) بترسێ، یان نوێژکەران ئازار بدا، لەو کاتانەدا بە بێدەنگ هەڵێنان سوننەتە ﴿عن أبي‌سعيدﷺ: إعْتَكَفَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي‌الْمَسجِد فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِراءَةِ فَكَشَفَ السِّتْرَ وَقالَ: أَلا إِنَّ كُلَّكُمْ مُناجٍ لِرَبِّهِ فَلايُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضاً وَلايَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلى بَعْضٍ فِي‌الْقِراءَةِ﴾ رواه ابوداود بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتدا (اِعتِكاف)ی کرد، گوێی لێبو (صحابة)کان بە دەنگ هەڵێنان قورئانیان دەخوێند، ئەویش پەردەی لاداو فەرمووی: ئاگاداربن هەر هەمووتان (مُناجاة)ی خوای خۆی دەکا، کەوابو: یەکتری ئازار مەدەن‌و دەنگ بە سەر یەکتری‌دا بەرز مەکەنەوە.

هەروەها ئەگەر پژمی، بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ). ئەگەر کەسێکی‌تریش پژمی پێی بڵێ: (يَرحَمُكَ الله). ئەگەر گوێی لە دەنگی بانگ و ئیقامەت بوو با واز لە قورئانخوێندن بێنێ‌و وەڵام بداتەوە، هەروەها ئەگەر سەلامی لێکرا دەبێ وەڵامی سەلامیش بداتەوە.

ئینجا بزانە: کە یەکەمجار قورئانی ختم کرد، سوننەتە زیافەتێك بکا بە نیەتی قورئان ختم کردن، کە پێی دەگوترێ: (اَلْحَذاق). هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ عُمَرَﷺ: أَنَّهُ لَمَّا حَفِظَ سُورَةَ الْبَقَرَةِ نَحَرَ جَزُوراً شُكْراً لِلّٰهِ تَعالى﴾ رواه القرطبي في مقدمة تفسيره، واتە: کە ئیمامی(عمرﷺ) سورەتی(البقرة)ی لەبەر کرد: ووشترێکی سەر بڕی تاکو ببێتە شوکری‌خوای گەورە. کەوابو: ئەگەر منداڵیش قورئانی ختم کرد، سوننەتە ئەم زیافەتەی بۆ بکرێ.

هەروەها لە (الاذكار)دا دەفەرموێ: هەر جارێك قورئانی ختم کرد، سوننەتە زۆر زۆر دوعا بکا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (أُبَيٍّ)ی‌داهاتوو، هەم: ﴿عن الحكم بن عُتيبة عن مجاهد وَعبدة قالا: اَلدُّعاءُ مُسْتَجابٌ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ﴾ وفي رواية: ﴿إِنَّ الرَّحْمَةَ تَنْزِلُ عِنْدَ خَتْمِ الْقُرْآنِ﴾ رواه ابن ابي‌داود بسندصحيح، لە کاتی قورئان ختم کردندا دوعا قبوڵەو لە کاتی قورئان ختم کردندا ڕەحمەت دێتە خوارەوە. هەروەها سوننەتە لە ڕۆژی ختم کردندا بەڕۆژو بێ‌و خزم‌و دۆستەکانی خۆی کۆ بکاتەوە، هەروەك لە (الاذكار)و (الاتقان)دا فەرموویانە.

جا سوننەتە ئەوانیش بێ‌دەنگ بن‌و گوێ لە قورئان ڕابگرن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُوا لَهُ وَأَنْصِتُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ هەر کاتێك قورئان خوێندرا گوێی لێڕابگرن‌و بێ‌دەنگ بن، بەڵکی خودا ڕەحمتان پێ بکا.

جا دەربارەی ئەو قورئانخوێنەی لە سەرو بۆرو ژێری قورئاندا هەڵە دەکا، لە (الاتقان)دا فەرموویەتی: ئەوە قورئانخوێندن نیەو خێری ناگاتیٚ، بەڵام ئیمامی(القرطبی) لە پێشەکی تەفسیرەکەی‌دا حەدیسێکی هێناوە: لێی وەردەگیریٚ: کە خێری بۆ دەنووسریٚ،وَاللهُ أعْلَم.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿إقْرَؤُوا القُرآنَ ما ائْتَلَفَتْ عَلَيْهِ قُلُوبُكُم فَإذا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ﴾ رواه الشيخان، ئێوە قورئان بخوێنن، تا دڵتان یەك ڕایە لە سەری‌و دڵتان بە خوێندنی خۆش دەبیٚ، ئینجا هەر کاتێك جیاوازی بیرو ڕاتان بوو، یان لە خوێندنی ماندوو بون، یەکسەر هەڵسن ململانە مەکەن‌و مەیخوێنن. واتە: نەوەك تووشی هەڵە ببن.

هەروەها لە(الاذکار)و لە(الاتقان)دا دەفەرموون: هەر کاتێك ختمێکی تەواو کرد، سوننەتە یەکسەر دەست بە ختمێکی‌تر بکا ﴿عن أُبَيِّ بن كَعب؇: أنَّ النَّبيَّﷺ كانَ إذا قَرأَ (قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ النّاسِ)، إفْتَتَحَ مِنْ (ألْحَمْدُ) ثُمَّ قَرَأَ مِنَ الْبَقَرَةِ إلى (وَأُولئكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)، ثُمَّ دَعا بِدُعاءِ الْخَتْمةِ ثُمَّ قامَ﴾ اخرجه الدارمی، قال السيوطی: بسند حسن، پێغەمبەرﷺ کە ختمی تەواو دەکردو (قُل أعوذُ بِرَبِّ النّاسِ)ی دەخوێند، دەستی بە سورەتی فاتیحە= (ألْحَمْدُ) دەکرد، ئینجا پێنج ئایەتی لە سەرەتای سورەتی(الْبَقَرَة) دەخوێندن، واتە: تا (الْمُفْلِحُونَ)، ئینجا دوعای (ختم)ی دەکرد، ئینجا هەڵدەستا.

هەروەها: وا باشترە بەگوێرەی ڕیزی سورەتەکانی‌قورئان، واتە: لە لای (فاتحة)و (البَقَرة)وە بخوێنێتەوە، بەڵام بۆ دەرس پێ‌گوتنی منداڵان ئەگەر لە لای (قُلْ أعُوذُ)ەکانیشەوە بەرەو سەرەوە بیٚ، زیانی نیە، هەروەك لە (المجموع) دا فەرموویەتی.

هەروەها: وا باشە: لایەنی‌کەم ساڵیٚ دوو جار قورئان ختم بکا ﴿عن أبي‌حنيفة؇: مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّتَيْنِ فَقَدْ أدّى حَقَّهُ لأنَّ النَّبيَّﷺ عَرَضَ عَلى‌جِبْريلَ فِي‌السَّنَةِالَّتي قُبِضَ فِيها مَرَّتَيْنِ﴾ نقله فی‌الاتقان، والحدیث رواه البخاری فی فضائل القرآن عن ابی‌هریرة، واتە: ئیمام (ابوحنیفة) دەفەرمویٚ: هەر کەسێك ساڵیٚ دوو جار قورئان ختم بکا، ئەوە مافی قورئانی داوە، چونکە پێغەمبەرﷺ لەو ساڵەی تیٚیدا وەفاتی کرد، دوو جار قورئانی لە لای حەزرەتی(جبرائیل) دەور کردەوە.

ئینجا ئەگەر توانای هەبیٚ، وا جوانە: لە هەر سیٚ ڕۆژێکدا ختمێك بکا، هەروەك لە (الاتقان)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿لَمْ يَفْقَهْ مَنْ قَرَأَالْقُرْآنَ فِي أقَلِّ مِنْ ثَلاثٍ﴾ رواه الترمذی وصححه، لە واجبی سەر شانی خۆی تێنەگەیشتوە، ئەو کەسەی لە کەمتر لە سیٚ شەواندا قورئان ختم بکا. هەروەها سوننەتە لە سەرەتای ڕۆژیٚ‌دا، یان لە سەرەتای شەویٚ‌دا ختم تەواو بکا، هەروەك لە (الاذکار)و (الاتقان)دا فەرموویانە.

له (المجموع)دا دەفەرموێ: (اِجْماع)ی ئوممەت لە سەر ئەوەیە: واجبە ڕێز لە قورئان بگیرێ، هەر کەسێك سوکایەتی بە قورئان، یان بە بەشێکی قورئان بکا، یان فڕێی بداتە ناو پیسایی، یان باوەڕی بە بەشێکی قورئان نەبێ ئەوە کافرە.

هەروەها دەفەرموێ: حەرامە بە دەستی پیس دەست لە قورئان بدرێ، حەرامە قورئان لە سەر شتێکی پیس دابندرێ، یان بە شتێکی پیس بنووسرێتەوە، حەرامە پالّی وێبدرێ، هەروەها دەفەرموێ: کڕین و فرۆشتنی قورئان لە مەزهەبی ئێمەدا دروستە.

جا ئەگەر خواردەمەنیەك قورئانی لە سەر نووسرابێ، دروستە: بخورێ و ئەگەر نووسراوەکەش بە ئاو بشۆرێتەوە دروستە: ئاوشۆرەکە بخورێتەوە، واتە: بەلاّم خواردنی ئەو کاغەزەی قورئانی لێنووسراوە دروست نیە، لە (تحفة)و(نهایة)دا دەفەرموون: ئەگەر قورئان پیس بوو، بە پیسێکی وەها: چاوپۆشی لێنەدەکرا، واجبە بشۆرێ، هەرچەند قورئانەکەش تێك بچێ و ملکی یەتیمیش بێ، واتە: ئەگەر پیسەکە بە نووسراوەکەی قورئان کەوتبێ.

لە (الاتقان)دا دەفەرموێ: ناپەسندە قورئان لە سەر دیوارو بان بنووسرێ، لە سەرچاوەکانماندا دەفەرموون: ناپەسندە قورئان لە سەر (قَبْر)-گۆڕ بنووسرێ، بەلاّم ئیمامی (الاذرعی) دەفەرموێ: حەرامە، هەروەك لە باسیمردوودا ڕوونی دەکەینەوە،ان شاء الله تعالی.

هەروەها لە (الاتقان)دا دەفەرموێ: لەبیر چوونەوەی قورئان گوناهێکی گەورەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي فَلَمْ أَرَ ذَنْباً أَعْظَمَ مِنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيَهَا رَجُلٌ ثُمَّ نَسِيَهَا﴾ حَسن بشواهده رواه ابوداود والترمذی، گوناهەکانی ئوممەتم هێندرا بەر چاوم، لەو گوناهە گەورەترم نەبینی کە مرۆڤ سورەتێك، یان ئایەتێکی قورئان فێر بوبێ، ئینجا لەبیر خۆی بباتەوە.

هەر لە (الاتقان)دا دەفەرموێ: سوننەتە قورئان ماچ بکرێ چونکە (عِکْرِمَة) ماچی دەکرد، هەروەها سوننەتە بۆنخۆش بکرێ، جا ئەگەر پێویستی بە پەڕی قورئان نەما-لە بەر هەر هۆیەك- ئەوە دروست نیە بخرێتە ناو کونە دیوار، دروستیش نیە پارچە پارچە بکرێ، بەلّکو دەبی بە ئاو بیشواتەوە، یان بە ئاگر بیسوتێنێ، بە بەلگەی ﴿ئیمامی(عثمان) چەند پارچە قورئانێکی سوتاند﴾ هەروەها حەرامە قاچ بەرەولای قورئان درێژ بکرێ.

هەروەها سوننەتە بۆ ڕێزلێنان لە بەر قورئان هەلّبستێ، هەروەك لە (التبیان)دا فەرمویەتی، هەم ﴿وَصَحَّ أَنَّهُﷺ قَامَ لِلتَّوْرَاةِ﴾ نَقَلَهُ ابن حجر فی‌التحفة، واتە: لە حەدیسی (صحیح)دا هاتوە: پێغەمبەرﷺ لە بەر (تَوْرَاة) هەلّساوە. جا لە (تحفة)دا دەفەرموێ: لەوانەیە: دەیزانی ئەو (توْراة)ە دەستکاری نەکراوە.

هەم لە (تحفة)و (الشروانی)دا دەفەرموون: حەڕامە قاچی بنێتە سەر شتێك كە قورئان، یان ناوی خوایگەورەی لێنووسرابێ، هەم حەڕامە پارە لە ناو شتێك دابندرێ، كە قورئانی لێنووسراوە، هەروەها ئەگەر پارچە كاغەزێك: قورئان، یان ناوی خوایگەورەی لێنووسرابێو لە سەر زەمین فڕێدرابێ، واتە: یان لە سەر شتێكی پیس داندرابێ، حەڕامە وازی لێبێنێ، بەڵكو واجبە هەڵیبگرێتەوە، هەر وەها حەڕامە شتێك لە سەر قورئان دابنێ.

جا ئەو ڕێزلێنانەی بۆ قورئان داندراوە -جگە لە دەست لێدانو هەڵگرتن- گشتی بۆ كتێبەكانی ئاینیش ڕەفتاری پێدەكرێ، هەر وەك لە (الجمل)دا ڕوونی كردۆتەوە.

هەروەها سوننەتە لە بەر زانایئاینی هەڵسێ، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتیو سوننەتە ڕێز لە قورئانخوێن بندرێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مِنْ إِجْلالِ اللهِ-تعالى-إِكْرامَ ذِیالشَّیْبَةِالْمُسْلِمِ، وَحامِلِ الْقُرْآنِ غَیْرِ الْغالِیفِیهِ وَالْجافِیعَنْهُ، وإِكْرَامَ ذِیالسُّلْطانِ الْمُقْسِطِ﴾ رواه ابوداود بسندصحیح، بە ڕاستی بەشێك لە ڕێزلێنانو بە گەورە ناسینیخوای گەورە ئەوەیە: ڕێز لە ڕیش سپیی موسڵمان بندرێ، ڕێز لەو قورئانخوێنە بندرێ: كە لە قورئاندا زێدەڕۆیی ناكاو لێیشی دوور ناكەوێ، ڕێز لە كاربەدەستیدادپەروەر بندرێ.

جگە لەو ڕەووشتانەش چەندیتر ماوە: لە (المجموع)و (الانكار)ی ئیمامی(النواوی)و (الاتقان)ی ئیمامی(السیوطی)دا -كە سەرچاوەی سەرەكی ئەم پاشكۆیە بون- بە درێژی باسیان كراوە، هەندێكیتریش لە باسی فاتیحەو سورەتی دوای فاتیحەدا باسی دەكەین، ان شاء الله تعالى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چوونە ئاودەسخانە ﴾

(یُقَدِّمُ داخِلُ الْخَلاءِ) ئەو كەسەی دەچێتە ئاودەسخانە، واتە: شوێنی میزكردنو پیسایی كردن، سوننەتە بە پێش بێخی (یَسارَهُ) قاچی چەپەی، واتە: قاچی چەپە لە پێشدا بنێتە ژوورەوە (وَالْخارِجُ یَمِینَهُ) ئەو كەسەی لە ئاودەسخانەش دێتە دەرەوە، سوننەتە قاچی ڕاستەی لە پێشدا بێنێتە دەرەوە.

جا لە (المجموع)دا دەفەرموێ: زانایان فەرموویانە: سوننەتە ڕاستە بە پێش بێخرێ لە گشت كارێكی بۆ ڕێزلێنان بكرێ: وەكو دەستنوێژو غوسلو دەبەركردنیبەرگو پێلاو و گۆرەویو دەرپێو چوونە مزگەوتو سیواكو كل لە چاوكردنو نینۆك كردنو سمێڵ كردنو بن هەنگڵ پاككردنەوەو سەر تاشینو سەلامدانەوەینوێژو هاتنەدەرەوە لە ئاودەسخانەو خواردنو خواردنەوەو تۆقەكردنو دەست لێدانی(الْحَجَرُالاسْوَد)و وەرگرتنو بەخشینو... هتد: ئەم جۆرە شتانە ﴿عن عائشة رضی‌الله عنها: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ یُعْجِبُهُ التَّیَمُّنُ فِی طُهُورِهِ وَتَرَجُّلِهِ وَتَنَعُّلِهِ وَفِی شَأْنِهِ كُلِّهِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ پێی خۆش

بوو لە ڕاستەوە دەست پێبکا: لە دەستنوێژو سەر شانەکردنو پێڵاو دەبەرکردنو گشت کارەکانی. واتە: ئەوانەی بۆ ڕێزلێنانو جوانی دەیکردن.

هەروەها دەفەرموێ: سوننەتە چەپە پێش بێخرێ لە دژی ئەوانەدا: وەکو لووت پاککردنو تارەتکردنو چوونە ئاودەسخانەو هاتنە دەرەوە لە مزگەوتو بەرگو پێڵاو داکەناندنو هەر کارێکی چڵکنی تێدابێ ﴿عن عائشة رضي الله عنها: كَانَتْ يَــدُ رَسُــولِ اللهِ ﷺ اَلْيُمْنَى لِطُهُورِهِ وَطَعَامِهِ، وَكَانَتِ الْيُسْرَى لِخَلاَئِهِ وَمَا كَانَ مِنْ أَذىً﴾ رواه ابوداود باسناد صحيح، دەستی ڕاستەی پێغەمبەر ﷺ بۆ دەستنوێژو خواردن بوو، چەپەشی بۆ ئاودەسخانەو کاری چڵکنی بوو.

(وَلا يَحْمِلُ ذِكْرَاللهِ تعالى) نابێ، واتە: ناپەسندە لە شوێنی میزو پیسایی کردندا شتێکی وەها هەڵبگرێ: کە فەرموودەی خوای گەورەی لێنووسرابێ ﴿عن أنس ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَــانَ إِذا دَخَلَ الْخَلاء وَضَعَ خاتَمَهُ﴾ رواه الترمذي وحسّنه، پێغەمبەر ﷺ کاتێ دەچووە ئاودەسخانە ئەنگوستیلەکەی دادەنا. واتە: چونکە لێی نووسرابو (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ) ﷺ.

هەروەها هەڵگرتنی ناوی خواو پێغەمبەرانو (ملائكة)ش ناپەسندە، بەڵام ئەگەر ئەو فەرموودەیە بە مەبەستی ڕێزلێنان نەنووسرابو: وەکو ناوی سەر ناسنامە، یان بە مەبەستی (تَبَرُّك) نووسرابو: وەکو نووشتە، ئەوە هەڵگرتنی ناپەسند نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام لە (المجموع)دا دەفەرموێ: هەڵگرتنی نوشتە بەو مەرجە ناپەسند نیە: ئەگەر لە ناو شەمێ، یان لە ناو شتێکیتر دابندرێ.

ئینجا بزانە: هەڵگرتنی قورئان، یان ئایەتێکی قورئان، لە ڕووێکیترەوە حەرامە، کە بێدەستنوێژییە، هەروەك (الشبراملسي)و (الشرواني) ڕوونیان کردۆتەوەو بە درێژیش باسمان کرد.

(وَيَعْتَمِدُ جالِساً يَسارَهُ) لە کاتی دانیشتن بۆ پیسایی‌کردن، سوننەتە گرانایی خۆی بخاتە سەر لای چەپەیو قاچی ڕاستەشی لە سەر پەنجەکانی دابچەقێنێ، تاکو بە ئاسانی پیسەکەی لێدەرێ.

(وَلا يَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ) نابێ ڕوو لە قیبلە پیسایی‌و میز بکا (وَلا يَسْتَدْبِرُها) نابێ پشت لە قیبلە پیسایی بکا، بەڵام ئەگەر ئاودەسخانەکە ڕوو لە قیبلە، یان پشت لە قیبلە داندرابو، حەرام نیە ﴿عن ابن عمر رضي الله عنهما: اِرْتَقَيْتُ فَوْقَ بَيْتِ حَفْصَةَ رضي الله عنها فَرَأَيْتُ رَسُــولَ اللهِ ﷺ يَقْضِــي حاجَتَهُ مُسْتَدْبِرَالْقِبْلَةِ﴾ رواه الشيخان، لە سەر ژوورەکەی (حفصة)وە پێغەمبەرم ﷺ بینی پشت لە قیبلە لە ئاودەسخانە دانیشتبو.

(ويَحْرُمَانِ بِالصَّحْراء) ڕوو له قیبلەکردن‌و پشت تێکردنی له کاتی‌پیسایی‌کردندا له بیاباندا حەرامن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا أتى أَحَدُكُمُ الْغائطَ فَلا يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَــةَ وَلايُوَلِّهــا ظَهْرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك یەکێکتان ڕۆیشتە پیسایی‌کردن، نابێ ڕوو لـه قیبلـه بکـاو نـابێ پشـتی تێبکـا لـه کـاتی میـزو پیسـایی‌کردندا، بـەڵکو بـەرەو ڕۆژهەڵات، یان ڕۆژئاوا دانیشن.

جا ئەگەر هاتو داوێنی جلەکەی خۆی شۆڕ کردەوەو کردیە پەردە له نێوان خۆی‌و قیبلە، یان شتێکی‌بەرزی به قەد چل (سنتیمتر)ی خستە پێشە خۆی‌و نێوانیان له سێ گەز زیاتر نەبو، ئەوە دروستە، هەروەك له (المجموع)دا فەرموویەتی، هـەروەها ڕوو لـه ڕۆژو مـانگ کـردن-نـەك پشـت تێکردنیـان- لـه کـاتی میـزو پیسـایی‌کردندا ناپەسـندە، هـەروەك لـه زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَبْعُدُ) سوننەتە له بیاباندا له خەڵکی دوور کەوێتەوە به ئەندازەیەکی وەها: گوێیـان لـه دەنگی دەرچوونی پیسایی نەبێ‌و بۆنیشیان بۆ نـەیێ ﴿عن المغيرةﷺ: كانَ النَّبِــيُّﷺ إِذا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَــدَ﴾ رواه اصـحاب السـنن بسـند صـحيح، پێغەمبـەرﷺ کـه دەچـووە پیسایی‌کردن، دوور دەکەوتەوە.

(وَيَسْتَتِرُ) سـوننەتە خـۆی داپۆشـێ بـه شـێوەیەکی وەهـا: عـەورەتی نـەبینرێ، وەك لـه پەنای گرد، یان وولاغ، یان دیوار، یان داوێنی‌خۆی به دەوروبەری خۆی‌دا شۆڕ بکاتـەوە، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَنْ أَتَى الْغائطَ فَلْيَسْــتَتِرْ...﴾ رواه احمـد بسـند حسـن، هـەر کەسێك چووە پیسایی‌کردن، دەبی خۆی داپۆشێ. جا ئەگەر کەسێك تەماشـای دەکـرد، ئەو کاتە واجبە خۆی داپۆشێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلايَبُولُ فِي ماءٍ راكِدٍ) نابێ، واتە: ناپەسندە میز، یان پیسایی له ناو ئاوی وەستاودا بکا ﴿عن جابرﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِﷺ أَنْ يُبالَ فِي الْماءِ الرّاكِدِ﴾ رواه الشـيخان، پێغەمبـەرﷺ قەدەغەی کردوە: میز له ناو ئاوی‌وەستاودا بکرێ.

(وَجُحْرٍ) ناپەسندە میز، یان پیسایی له ناو کون‌و قڵیشایی زەمین بکا؟ نـەوەك ئـاژەڵێکی بێ‌هێزی تێدا بمرێ، یان ئاژەڵێك بێتە دەرەوەو ئـازاری بـدا ﴿عن عبدالله بن سَرْجِسﷺ: نَهى رسولُ اللهِﷺ أَنْ يُبالَ فِي الْجُحْرِ﴾ رواه احمد باسناد صحيح، پێغەمبەرﷺ قەدەغـەی کردوە میز له ناو کونی زەمین بکرێ.

(ومَهَبِّ رِيحٍ) ناپەسندە بەرەو ئەو لایەی بای لێدێ میز، یان پیسایی بکا، نەوەك پرووشکی پێ‌بکەوێتەوە (وَمُتَحَدَّثٍ) نابێ لـەو شـوێنەدا میـز، یـان پیسـایی بکـا: کـه خـەڵك لێی کۆ دەبێتەوە، جا سێبەری هاوینان بێ، یان بەر ڕۆژی زستانان، یان شوێنێکی‌تر.

(وَطَرِيقٍ) نابیّ له ڕێگەدا میز، یان پیسایی بکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اتَّقُوا الْمَلاعِنَ الثَّلاثَةَ: الْبَرازَ فِي الْمَوارِدِ وَقارِعَةِ الطَّرِيقِ وَالظِّلِّ﴾ رواه ابوداود باسناد جيد، خۆتان بپارێزن لەو سێ شوێنانەی دەبنە هۆی لەعنەت لێکردنتان: پیسایی‌کردن لە ڕێگەی هاتوچۆی ئاو و لە سەر ڕێگەو لە سێبەر. لە (المجموع)دا دەفەرموێ: پێویستە پیسایی‌کردن لەو سێ شوێنانەدا بە حەڕام دابندرێ.

(وَتَحْتَ مُثْمِرَةٍ) ناپەسندە میز، یان پیسایی لە بن داری بەردەر بکا، ئەوەك بەرەکەی پیس ببێ، یان خەڵك دڵی بۆ نەچێ، جیاوازی نیە: دارەکە هی خۆی بێ، یان نا، بەڵام ئەگەر دارەکە هی کەسێکی‌تر بوو و گومانی لەوەدا هەبو: ئایا ڕازی‌یە بچێتە ناو مڵکەکەی، یان نا؟ ئەوە حەڕامە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوونی کردۆتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: بە بێ‌عوزر ناپەسندە میز بە پێوە بکا، ئەوەك پرۆشکی‌میزەکەی پێ بکەوێ ﴿عن عائشة رضي الله عنها: مَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ يَبُولُ قائماً فَلا تُصَدِّقُوهُ، ما كانَ يَبُولُ إلاّ قاعِداً﴾ رواه احمد والترمذي باسناد جيد، هەر کەسێك پێی گوتن: پێغەمبەرﷺ میزی بە پێوە دەکرد، باوەڕی پێ مەکەن، پێغەمبەرﷺ میزی نەدەکرد تەنها بە دانیشتنەوە نەبێ.

بەڵام ئەگەر ئەژنۆ، یان پشتی دەهێشا، یان نەدەگونجا دابنیشێ، ئەوە لەو کاتانەدا ناپەسند نیە ﴿عن حذيفةﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَتَى سُباطَةَ قَوْمٍ فَبالَ قائماً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ هاتە سەر گوفەکی ماڵێك‌و میزی بە پێوە کرد. ئیمامی(الخطابي)و ئیمامی(البيهقي) دەفەرموون: وا تێدەگەین: پێغەمبەرﷺ لەو کاتەدا پشتی دەهێشا. هەروەك لە (المجموع)دا گێڕاویەتیەوە.

(وَلا يَتَكَلَّمُ) نابێ، واتە: ناپەسندە قسە بکا لە کاتی میز، یان پیسایی‌کردندا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لايَخْرُجِ الرَّجُلانِ يَضْرِبانِ الْغائِطَ كاشِفَيْنِ عَنْ عَوْرَتِهِما يَتَحَدَّثانِ فَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَمْقُتُ عَلى ذلِكَ﴾ رواه احمد وغيره باسناد حسن، نابێ دوو مرۆڤ بچنە پیسایی‌کردن‌و عەوڕەتی خۆیان بە دەر بێخن‌و گفتوگۆ بکەن، چونکە خوای گەورە زۆر لەم ڕەفتارە تووڕە دەبێ. کەواتە: لە کاتی میز، یان پیسایی کردندا وەڵامی سەلامیش ناداتەوەو هیچ زیکرێکیش ناکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَلا يَسْتَنْجِي بِماءٍ فِي مَجْلِسِهِ) نابێ، واتە: ناپەسندە تارەت بە ئاو بکا لەو شوێنەی بۆ پیسایی‌کردن لێی دانیشتوە، ئەوەك پرۆشکە پیسەکانی پێ‌بکەونەوە، کەواتە: دەبی

وَيَستَبْرِئُ مِنَ الْبَوْلِ، وَيَقُولُ عِنْدَ دُخُولِه: بِسْمِ اللهِ اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبائِثِ. وَعِنْدَ خُرُوجِه: غُفْرانَكَ اَلْحَمْدُ للَّه الَّذي أَذْهَبَ عَنِّي الأَذَى وَعَافَانِي.
وَيَجِبُ الإِسْتِنْجَاءُ بِماءٍ أَوْ حَجَرٍ، وَجَمْعُهُما أَفْضَلُ،

---

نەختێك بەولاتر بڕوا، وە ئەگەر لە ئاودەستخانەدا بوو، یان تارەتی بە بەرد دەكرد، ئەوە هەر لە شوێنیخۆی بمێنێتەوە.
(وَيَسْتَبْرِئُ مِنَ الْبَوْلِ) سوننەتە بە تەواوی میز لە ئەندامەكەی دەربێنێ: بە هۆی كۆكەو دەست پێداهێنانی ئەندامەكەو دەوروبەری، بێئازاردانیو بێگوشینیتوند، نەوەك دڵۆپە میزێك لە دواییدا بێتە دەرەوە.
ئینجا بزانە: ناپەسندە لۆكە، یان شتێكیتر بنێتە ناو كونی ئەندامەكەیو ناپەسندە زۆر لە سەر پیسایی‌كردن بمێنێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.
(وَيَقُولُ عِنْدَ دُخولِهِ) هەر كاتێك ویستی بڕواتە شوێنی پیسایی‌كردن، سوننەتە بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ﴾ رواه احمد وحسنه، ئینجا ئەم دوعایەش بكا: ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبائِثِ﴾ رواه الشيخان، واتە: خوایە خۆم دەپارێزم بە تۆ: لە شەیتانە نێرەكانو مێیەكان.
(وَعِنْدَ خُرُوجِهِ) هەر كاتێك لە شوێنی پیسایی‌كردن لاچوو، سوننەتە بڵێ: ﴿غُفْرانَكَ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، واتە: خوایە تكای لێخۆشبوون لە تۆ دەكەم، ئینجا سوپاسی خوا بكاو بڵێ: ﴿اَلْحَمْدُ للَّه الَّذي أَذْهَبَ عَنِّي الأَذَى وَعافَانِي﴾ قال الامام النواوي: حديث ضعيف رواه النسائي، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەم پیسیەی لێڕۆیاندمو بێبەڵای كردم. جا بزانە: بۆیێ لە پێشدا داوای لێخۆشبوون لە خوا دەكا، چونكە بە تەواوی سوپاسی ئەو نیعمەتەی پێ ناكرێ: كە خوا ئەم خواردنە خۆشەی داوەتیو ئەم پیسیە ناخۆشەشی لە كۆڵ كردۆتەوە.

## ﴿ باسی تارەتكردن ﴾

(وَيَجِبُ الإِسْتِنْجاءُ) تارەتكردن واجبە، واتە: پاككردنەوەی زاركی هەردوو كونەكەی میزو پیسایی (بِماءٍ) تارەتەكە بە ئاو بكا ﴿عن أنس ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْخُلُ الْخَلاءَ فَأَحْمِلُ أَنا وَغُلامٌ نَحْوي إِداوَةً مِنْ ماءٍ وَعَنَزَةً فَيَستَنْجي بِالْماءِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ دەچووە ئاودەسخانە، جا منو منداڵێكی وەك خۆم جامە ئاوێكو دارعەسایەكی بچوكمان هەڵدەگرت، ئینجا تارەتی بە ئاوەكە دەكرد.
(أَوْ حَجَرٍ) یان تارەتەكە بە بەرد بكا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلْيَستَنْجِ بِثَلاثَةِ أَحْجارٍ﴾ رواه الشافعي وغيره باسناد صحيح، دەبی بە سێ بەرد تارەت بكا. (وَجَمْعُهُما أَفْضَلُ)

کۆکردنەوەی ئاو و بەرد خێری گەورەترە، واتە: لە پێشدا بە سێ بەرد تارەت بکا، ئینجا بە ئاو، تاکو بەرد پیسایی لاببا و ئاویش ئاسەواری پیسیەکە لاببا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: تارەتکردن لەو کاتەدا واجبە، کە بیەوێ خواپەرستیەکی وەها بکا، کە بە پیسیەوە دروست نەبێ: وەکو نوێژو تەواف و سوجدەی(تلاوة)و (شُکر).

بەڵام ئەم **ئاگاداریەش گرنگە**: ئەگەر پیاوێك، یان ئافرەتێك میزی کردو تارەتی بە ئاو نەکردو (مَنی)ی لێهاتە دەرەوە، ئەو (مَنی)یە پیس دەبێ، هەر چەند تارەتیشی بە بەرد کردبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان لە (باب النجاسة)دا فەرموویانە، واتە: هەر شوێنێکیش ئەو (مَنی)یەی پێبکەوێ پیس دەبێ‌و واجبە بشۆرێ، کەوابو: ئەگەر ژن‌و مێرد، یان هەر یەکێکیان میزی کردو تارەتی بە ئاو نەکرد، حەرامە جیماع بکەن، هەر چەند تارەتیشیان بە بەرد کردبێ، چونکە (مَنی)یەکە بە پیسبوویی دەچێتە ناو منداڵدانەکە، هەروەك لە (النهاية)و (الشبراملسي)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِي مَعْنَى الْحَجَرِ) وەکو بەرد وایە: بۆ تارەتکردن (كُلُّ جامِدٍ) هەر شتێك ووشك بێ‌و (طاهِرٍ) پاك بێ‌و (قالِعٍ) هەڵکەن بێ، واتە: پیسەکە لاببا‌و (غَيْرِ مُحْتَرَمٍ) ڕێزدار نەبێ، واتە: ئەگەر مەرجێك لەو مەرجانە نەبو: تارەتەکە دروست نیە‌و شوێنەکە پاك نابێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن أبي هريرةﷺ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّﷺ فقال: ابْغِ لِي أَحْجاراً أَسْتَنْفِضْ بِها وَلا تَأْتِنِي بِعَظْمٍ وَلا رَوْثٍ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ فەرموویە (ابوهريرة): سێ بەردم بۆ بێنە بۆ تارەتکردن، بەڵام نە ئێسقان‌و نە ڕیخم بۆ مەهێنە.

جا لێرەدا دوو بەڵگەمان مەبەستن، یەکەم: ئەگەر–جگە لە بەرد– بە شتی‌تریش دروست نەبوایە، دەیفەرموو: جگە لە بەرد هیچی‌ترم بۆ مەهێنە. دووەم: بۆیێ بە ئێسقان دروست نیە، چونکە ڕێزدارە؟ کە خواردەمەنی‌ی جنۆکەیە، ڕیخیش پاك نیە‌و پیسە.

کەوابو: گۆشت خواردەمەنیەکی ئادەمیزادو گۆشت ئەندامێکی‌ئادەمیزاد: هی‌خۆی بێ، یان هی‌کەسێکی‌تر، هەم گۆشت نووسراوێکی‌زانستی‌ئایینی، یان ناوێکی‌خواو پێغەمبەران‌وعليهم الصلاة والسلام (ملائكة) ڕێزدارن‌و وەکو ئێسقان تارەتیان پێ‌دروست نیە.

هەروەها گۆشت قشپل‌و جیقنەو تەرس‌و بەردو ئاوی پیسبوو و مردراو...هتد، هەمان بڕیاری ڕیخی بۆ دەدرێ‌و تارەتی پێ‌دروست نیە، هەروەهاش–جگە لە ئاو– بە هیچ شلەیەکی‌تر تارەت دروست نیە، چونکە پاککەرەوە نیە، هەروەها بە شوشەو بە قامیشی‌لوس‌و بە گڵی ورد دروست نیە، چونکە هەڵکەن نین، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو چوار مەرجە بە درێژی ڕوون کراونەوە.

وَجِلْدٍ دُبِغَ دُونَ غَيْرِهِ فِي الأَظْهَرِ، وَشَرْطُ الْحَجَرِ: أَنْ لاَّ يَجِفَّ النَّجِسُ وَلاَ يَنْتَقِلَ وَلاَ يَطْرَأَ أَجْنَبِيٌّ، وَلَوْ نَدَرَ أَوِ انْتَشَرَ فَوْقَ الْعَادَةِ وَلَمْ يُجَاوِزْ صَفْحَتَهُ وَحَشَفَتَهُ جَازَ الْحَجَرُ فِي الأَظْهَرِ،

---

(وَجِلْدٍ دُبِغَ) هەروەها تارەتكردن بە گشت پيستەيەكى دەباغ كرابێ دروستە (دُونَ غَيْرِهِ فِي الأَظْهَرِ) بەلام بە پيستەى دەباغ نەكراو دروست نيە، چونكە ئەگەر پاك بێ، خواردنێكى ڕێزدارە، ئەگەر مردار بێ، پيسە.

(وَشَرْطُ الْحَجَرِ) مەرجى دروستبوونى تارەت: بە بەردو ووشكەكانىتر (أَلاَّ يَجِفَّ النَّجِسُ) ئەوەيە: ميزو پيسيەكە-بە كونەكانەوە- ووشك نەبێتەوە، واتە: ئەگەر بە كونەكانەوە ووشك بونەوە، واجبە تارەتەكە بە ئاو بكرێ، بەلام ئەگەر لە دواى ووشكبوونەوە تارەتى نەكردو دووبارە ميز، يان پيسايى كردو بە ئەندازەى پێشوش كونەكانى تەڕ بونەوە، دروستە: تارەت بە بەرد بكا، هەروەك لە زۆريەىسەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلاَيَنْتَقِلَ) مەرجێكىتر ئەوەيە: نابێ ميزو پيسيەكە لە شوێنى هاتنە دەرەوەيان بگواسترێنەوە شوێنێكىتر، واتە: ئەگەر ميز، يان پيسيەكە لە شوێنى خۆيان جيا بونەوە بۆ شوێنێكىتر، واجبە بە ئاو بشۆرێ، وەكو پيسبووەكانىتر.

هەروەها مەرجێكىتر ئەوەيە: نابێ لە شوێنى پيسايىكردن هەڵسێتەوە پێوە، چونكە ئەگەر هەڵسێ، لێوەكانى قينگى دەگەنەوە يەكترو پيسيەكە لەم لا بۆ ئەو لا دەگواسرێتەوە، ئەو كاتە واجبە تارەت بە ئاو بكا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتى.

(وَلاَيَطْرَأَ أَجْنَبِيٌّ) مەرجێكىتر ئەوەيە: شتێكى بێگانە نەپەڕێتە سەر كونەكان: وەكو دڵۆپە ئاوى پيس، يان پاك، يان ميز، واتە: ئەگەر ئەو شتانە پەڕينە سەر كونەكان واجبە تارەت بە ئاو بكا، هەروەها ئەگەر بە بەردێكى تەڕبوو، يان بە هەر شتێكى ديكەى تەڕبوو، يان بە هەر شتێكى ديكەىتەڕ تارەتى كرد، ئەوە دروست نيەو واجبە بە ئاو تارەتەكە بكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ نَدَرَ) ئەگەر ئەو پيسيەى لەو دوو كونەوە دێتە دەرەوە، لەو جۆرە شتانە بوو: كە كەم جار دێنە دەرەوە: وەكو خوێنو كێمو (مَذْيِ)و (وَدْيُ)، ئەوە تارەتكردن لەو شتانەش واجبە، جا ئەگەر بە ئاو تارەتى كرد، ئەوە باشترە، ئەگەر نا: ئەوە لە فەرموودەى بەهێزتردا دروستە: بە بەرد تارەت لەو جۆرە شتانەش بكا، هەروەك لە (المجموع)شدا ڕوون كراوەتەوە.

(أَوْ انْتَشَرَ فَوْقَ الْعَادَةِ) يان ئەگەر هاتو ميزو پيسيەكە لە عادەتى خەڵكى زياتر بڵاو بوو (وَلَمْ يُجَاوِزْ صَفْحَتَهُ) بەلام پيسيەكە لە ڕووى ژوورەوەى لێوەكانى قينگى تێپەڕ نەبو (وَحَشَفَتَهُ) ميزەكەش لە گۆيەكەى ئەندامى ميزكردن تێپەڕ نەبو (جَازَ الْحَجَرُ فِي الأَظْهَرِ) لەو دووحاڵەتەشدا تارەتكردن بە بەرد دروستە، لە فەرموودەىبەهێزتردا.

وَيَجبُ ثَلاَثُ مَسَحاَت وَلَوْ بأَطْرَاف حَجَر، فَإِنْ لَمْ يُنْق وَجَبَ الْإِنْقَاءُ، وَسُنَّ الْإِيتَارُ وَكلُّ حَجَرٍ لِكُلِّ مَحَلِّه، وَقيلَ يُوَزَّعْنَ لجانِبَيْه وَالْوَسَط، وَيُسَنُّ الْإِسْتنْجاءُ بِيَسَارِه، وَلاَ اسْتنْجاءَ لِدُود وَبَعَرٍ بلاَلَوْث فِيالأَظْهَر.

---

(وَيَجِبُ) واجبـه لە تارەتكردن بە بەرد (ثَلاثُ مَسَحَاتٍ) سێ جار بـەرد بـە سـەر كـونی میـزو سێ جار بە سەر كونی پیسایی‌دا بهێندرێ (وَلَوْ بِأَطْرَافِ حَجَرٍ) هـەرچەند سێ جارەكەش بـە سـێ لای بـەردێك بـێ ﴿عن سلمانﷺ: نَهانا رسولُ اللهِﷺ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَـلِّ مِـنْ ثَلاثَـةِ أَحْجارٍ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لێی قەدەغەكردین: بە كەمتر لە سێ بەرد تارەت بكەین.

(فَإِنْ لَمْ يُنْقِ) جا ئەگەر شوێنەكە بە سـێ بـەرد پـاك نـەبۆوە (وَجَبَ الإِنْقـاءُ) واجبـە پـاك بكرێتەوە بە بەردی زیاتر.

(وَسُنَّ الإِيتارُ) سوننەتە ژمـارەی بـەردە زیادەكـانیش بكاتـە تـاك، واتـە: یـان پێـنج، یـان حەفت، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُـوتِرْ﴾ رواه الشیخان، هـەر كەسـێك تارەتی كرد، بابیكاتە تاك.

(وَكُلُّ حَجَرٍ) سوننەتە هەر بەردێك (لِكُلِّ مَحَلِّـهِ) بـۆ هـەموو شـوێنی پیسـیەكە تـەرخان بكـا، واتە: هەر بەردێك لە لای ڕاستەوە بە سەر كونەكەدا بسوڕێنێ تـا ئەیهێنێتـەوە شـوێنەكەی خۆی (وَقِيلَ) لـە فەرموودەیـەكی بـێ‌هێزدا (يُوَزَّعْنَ) بـەردەكان دابـەش دەكـرێن (لِجانِبَيْـهِ) دووانیان بۆ هەردوو تەنیشتی ڕاستەو چـەپەی كونەكـە (وَالْوَسَـطِ) سـێیەمیان بـۆ ناوەنـدی كونەكە.

(وَيُسَنُّ الإِسْتِنْجاءُ بِيَسارِهِ) تارەتكردن بە دەستی چـەپە سـوننەتە، كەواتـە: بـە دەسـتی ڕاستە ناپەسندە ﴿عن سـلمانﷺ: نَهانا رسولُ اللهِﷺ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ﴾ رواه مسـلم، پێغەمبەرﷺ لێی قەدەغە كردین: بە دەستی ڕاستە تارەت بكەین.

ئینجا بزانە: پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِذا بالَ أَحَدُكُمْ فَلا يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِـهِ﴾ رواه الشیخان، هـەر كاتێك یـەكێكتان میـزی كـرد، نـابێ ئەنـدامی‌میزكردنی بـە دەستی‌ڕاستـە بگرێ. كەواتە: ئەوەش ناپەسندە.

(وَلا اسْتِنْجاءَ) تارەتكردن‌واجـب نیـە (لِـدُودٍ) بـە هـۆی هاتنـەدەرەوەی كـرم‌و بـەردو ئـەو شتانەی تـەڕایەتییان لە گەڵدا نیـە (وَبَعَرٍ) هـەروەها بـە هـۆی هاتنـە دەرەوەی قشـپلیش واجب نیە (بِلا لَوْثٍ) كە تـەڕایەتی لە گەڵدا نەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا، هەروەها ناپەسندە بە هۆی تڕ و فـس تـارەت بكـا، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ بابُ الْوُضُوءِ: باسی دەستنوێژگرتن ﴾

دەستنوێژگرتن: بەکارهێنانی ئاوە -بە نیەتەوە- لەم چوار ئەندامانەی خوایگەورە باسی کردوون و دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهاالَّذينَ آمَنُوا إذا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرافِقِ وامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ هۆ ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەر کاتێك ویستتان هەڵسن بۆ نوێژکردن، ڕوخسارتان بشۆن و دەستەکانتان لە گەڵ ئەنیشکەکان بشۆن و سەرتان مەسح بکەن و پێیەکانتان لە گەڵ هەردوو گوزینگەکان بشۆن.

ئینجا بزانە: دەستنوێژگرتن بە بێدەستنوێژیو لە گەڵ ویستنی نوێژکردندا واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: ئەگەر دەستنوێژی هەبو، هەرچەندی نوێژی پێبکا هەر دروستە تا بێدەستنوێژ دەبێ ﴿عن أنس ﷺ: كانَ النَّبيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ، قُلْتُ: كَيفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنَا الْوُضُوءُ مالَمْ يُحْدِثْ﴾ رواه البخاری واصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ بۆ هەر نوێژێکی واجب دەستنوێژی دەگرت، بەڵام ئێمەی (صحابة) بۆ گشت نوێژەکان دەستنوژێکمان دروست بوو تا بێدەستنوێژ دەبوین. ﴿وعَنْ بُرَيْدَةَ ﷺ: صَلَّى النَّبيُّ ﷺ الصَّلَواتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ واحِدٍ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ لە (فَتْح)ی (مكة)دا هەر پێنج نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کردن.

﴿ ئاگاداری ﴾: چەند مەرجێکی دەستنوێژو غوسل ئەمانەن: **یەکەم**: دەبی دەستنوێژگرو غوسلکەر موسڵمان بن و جیاوازی نێوان چاکەو خراپەش بکەن، کەوابو: دەستنوێژو غوسلی کافرو شێت و منداڵی نەفام دروست نیە، واتە: ئەگەر کافر موسڵمان بوو و شێت چاك بۆوەو منداڵیش فاماندی، واجبە: غوسل و دەستنوێژ دووبارە بکەنەوە، بەڵام غوسل و دەستنوێژی منداڵی فامیدە دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەم مەسەلە ڕوون کراوەتەوە.

**دووەم**: واجبە ئاوی ڕووت بەکار بێنێ، هەروەك باسمان کرد.

**سێیەم**: شتێکی وەها لە سەر ئەندام و مووەکان نەبێ: کە ئاوەکە بگۆڕێ و لە کاری بێخی.

**چوارەم**: شتێکی وەها لە سەر ئەندام و مووەکان نەبێ: کە ڕێگەی ئاو بگرێ و نەگاتە پیستە و مووەکان: وەك ماڵحەم و ڕونی پەیت و چڵکی ژێر نینۆك و سبوغ و بۆیاغ و ئەو جۆرە شتانە، بەڵام ڕەنگی مەرەکەب و خەنە و چەورایەتی زیانی نیە.

**پێنجەم**: دەبی ئاوەکە بە سەر ئەندامەکاندا بڕوا نەك تەنها بە ئاو تەڕیان بکا.

**شەشەم**: ئەگەر پیسیەکی وەها لە سەر ئەندامەکە هەبو: لە گەڵ شەپۆلی یەکەمدا نەدەڕۆیشت، واجبە لە پێشدا بیشۆرێ ئینجا دەستنوێژی بگرێ، یان غوسل بکا، جگە لەو مەرجانەش چەندی‌تر ماوە، لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراونەوە.

فَرْضُهُ سِتَّة، أَحَدُهَا: نِيَّةُ رَفْعِ حَدَث أَوْ اسْتِبَاحَةَ مُفْتَقِرٍ إِلى طُهْرٍ أَوْ أَداءِ فَرْضِ الْوُضُوءِ، وَمَنْ دَامَ حَدَثُهُ–كَمُسْتَحَاضَة– كَفَاهُ نِيَّةُ الإِسْتِبَاحَةِ دُونَ الرَّفْعِ عَلَىالصَّحِيحِ فِيهِمَا، وَمَنْ نَوَى تَبَرُّداً مَعَ نِيَّة مُعْتَبَرَةٍ

---

(فَرضُهُ) پێویستیەکانی دەستنوێژ، واتە: ڕوکنەکانی (سِتَّةٌ) شەشن، چواریان لە ئایەتەکەیڕابردوداو دووانیش لە حەدیسدا باسیان کراوە:

(أحَدها: نيَّةُ رَفعِ حَدَثٍ) یەکێکیان: نیەتهێنانی لابردنی بێدەستنوێژیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّماالأعْمالُ بِالنِّيَّاتِ وَإنَّما لِكُلِّ امْرِئٍ ما نَوَى﴾ رواه الشيخان، هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ، بە نیەتهێنانەوە نەبێ دانامەزرێ، گشت مرۆڤێك تەنها خێری ئەو کردەوەیەی هەیە: کە نیەتی بۆ هێناوە.

کەواتە: پێویستە لە نیەتەکەیدا خواپەرستیەکە دیاری بکرێ، وەك بڵێ: (نَوَيْتُ رَفْعَ الْحَدَثِ) نیەتم وەیە ئەم بێدەستنوێژیەم لادەبەم (أوْ اسْتِباحَةِ مُفْتَقِرٍ إلى طُهْرٍ) یان نیەتی حەڵاڵکردنی شتێك بێنێ: کە پێویستی بە دەستنوێژ هەیە، وەك بڵێ: نیەتم وەیە نوێژ لە خۆم حەڵاڵ دەکەم، یان (طواف)، یان دەست لێدانی قورئان (أوْ أداءِ فَرْضِ الْوُضُوءِ) یان نیەتی بە جێهێنانی فەرزی دەستنوێژ بێنێ، یان بڵێ: (نَوَيْتُ الْوُضُوءَ) نیەتی دەستنوێژم هێنا، واتە: لە نیەتی دەستنوێژدا مەرج نیە: ناوی فەرز بێنێ چونکە دەستنوێژ تەنها دەبێتە خواپەرستن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَمَنْ دامَ حَدَثُه) هەر کەسێك بێدەستنوێژیەکەی بەردەوام بوو (كَمُسْتَحاضَةٍ) وەکو ئەو ئافرەتەی خوێنچڕکەی هەبێ، یان ئەو مرۆڤەی چۆڕمیزکەی هەبێ (كَفاهُ نِيَّةُ الأسْتِباحَةِ) نیەتی حەڵاڵکردنەکەیڕابردووی–بە تەنها– بۆ دروستەو بەسیەتی، هەروەهاش نیەتی فەرزی دەستنوێژیشی بۆ دروستە (دُونَ الرَّفْعِ) بەڵام نیەتی لابردنی بێدەستنوێژی–بە تەنها– بۆی دروست نیە، چونکە بێدەستنوێژیەکەی لا ناچێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (فِيهِما) لە هەردوو مەسەلەکەدا: کە نیەتەکە دروست بوو و دروست نەبو.

ئینجا بزانە: بۆ گشت کردارێکی خواپەرستی–واجب بێ، یان سوننەت بێ– واجبە: نیەتهێنان لە ناو دڵدا بێ زمان هیچ پەیوەندی بە دروستبوونیەوە نیە، واتە: بە دڵ بیەوێ ئەم خواپەرستنە بکا، بەڵام سوننەتە بە زمانیش نیەتەکە بڵێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: تاکو زمانیش یارمەتی دڵ بدا، هەروەك لە نیەتی نوێژدا بەڵگەشی بۆ دێنین ان شاء الله تعالى.

(وَمَنْ نَوى تَبَرُّداً) هەر کەسێك بە دەستنوێژەکەی مەبەستی فێنکبوونەوە، یان پاکبوونەوە بوو و (مَعَ نِيَّةٍ مُعْتَبَرَةٍ) لە گەڵ ئەم مەبەستەشدا نیەتی دەستنوێژیشی، یان لابردنی

جَازَ عَلَى الصَّحِيحِ، أَوْ مَا يُنْدَبُ لَهُ وُضُوءٌ كَقِراءَة فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَيَجِبُ قَرْنُهَا بِــأَوَّلِ الْوَجْهِ، وَقِيلَ يَكْفِي بِسُنَّة قَبْلَهُ، وَلَهُ تَفرِيقُهَا عَلَى أَعْضَائه فِي الأَصَحِّ.

---

بیّدەستنوێژیشی هێنا (جازَ) دەستنوێژە کەی دروستە (عَلى الصَّحيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە ئەگەر مەبەستیشی نەبێ، فێنکبوونەوە، یان پاکبوونەوەکە هەر دەبێ، کەوابو: ئەو مەبەستە نابێتە هاوبەش دانان، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ ما يُندَبُ لَهُ وُضُوءٌ) یان نیەتی دەستنوێژی بۆ ئەو کردارە هێنا: کە بە دەستنوێژەوە سوننەتەو بە بیّدەستنوێژیش دروستە (كَقِراءَة) وەکو خوێندنی قورئان: بە بێ دەست لێدانی قورئان و خوێندنی حەدیس و چونە مزگەوت و بانگدان و دەرس گوتنەوە (فَلا) ئەو دەستنوێژە دروست نیە، واتە: بیّدەستنوێژیەکەی لا ناچێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو کردەوانە بە بیّدەستنوێژیش دورستن، کەواتە: ئەو مەبەستە لابردنی بیّدەستنوێژی ناگرێتەوە.

(ويَجِبُ قَرْنُها) واجبە: نیەتی دەستنوێژ بەرامبەر بێ (بِأَوَّلِ الْوَجْهِ) لە گەڵ سەرەتای شۆردنی ڕوخسار، واتە: کاتی نیەتهێنانی دەستنوێژ، واجبە: لە سەرەتای شۆردنی ڕوخساردا بێ، جا ئەگەر تا کۆتایی دەستنوێژ بەردەوام بێ، ئەوە سوننەتەو خێری زیاترە، کەوابو: ئەگەر لە سەرەتای شۆردنی ڕوخساردا نیەتی هێنا، بەڵام تا کۆتایی دەستنوێژ بەردەوام نیەتەکەی لە بیردا نەبو، دەستنوێژەکەی دروستە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە سەرەتای شۆردنیڕوخساردا نیەتی نەهێناو بەشێکی ڕووی شۆراند، ئینجا نیەتی هێنا، واجبە: ئەو بەشەی لە پێش نیەتەکەدا شۆراوە، دووبارە بیشۆرێتەوە، ئینجا دەست بە شۆردنیدەستەکانی بکا، بەڵام لەم مەسەلەدا پێویست نیە نیەتەکەی دووبارە بکاتەوە، ئەو مەسەلانە لە (المجموع)دا ڕوون کراونەوە.

هەروەها بزانە: ئەگەر لە کاتی باسك شۆردندا نیەتی هێنا، ئەمەش هەر دروست نیەو واجبە دووبارە–بە نیەتەوە– ڕوخساری بشۆرێتەوە، ئینجا باسکەکانی، هەروەك لە (شرح المحلى)و (شرح المنهج)و (مغنى)دا فەرموویانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بیّهێزدا (يَكْفِي بِسُنَّةٍ قَبْلَهُ) دروستە: نیەتەکە لە گەڵ سوننەتێکی پێش ڕوخساردا بهێنێ، وەك دەست شۆردن و ئاو لە دەم وەرکردن، بەڵام لە بەر بیّهێزی ڕەفتار بەم فەرموودەیە ناکرێ (وَلَهُ) بۆ دەستنوێژگرەکە دروستە (تَفْرِيقُها عَلىٰ أَعْضائِهِ) نیەتەکە دابەش بکاتە سەر ئەندامەکانی، واتە: لە گەڵ شۆردنی هەر ئەندامێك بڵێ: نیەتمە بیّدەستنوێژی لەم ئەندامە لاببەم (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

اَلثَّاني: غَسْلُ وَجْهِه، وَهُوَ مَا بَيْنَ مَنَابِت رَأْسِه غَالِباً وَمُنْتَهى لَحْيَيْه وَمَا بَيْنَ أُذُنَيْه، فَمِنْهُ مَوْضِعُ الْغَمَمِ وَكَذَاالتَّحْذيفُ فِيالأَصَحِّ، لاَ النَّزْعَتان وَهُمَا بَيَاضَان يَكْتَنِفان النَّاصِـيَةَ، قُلْتُ: صَحَّحَ الْجُمْهُورُ أَنَّ مَوْضِعَ التَّحْذِيفِ مِنَ الرَّأْسِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَجِبُ غَسْلُ كُـلِّ هُدْب وَحَاجِب وَعِذَار

---

(اَلثَّاني) دووەم لە ڕوکنەکانی دەستنوێژ: (غَسْلُ وَجْهِه) شۆردنی دەرەوەی ڕوخساری خۆیەتی، بە بەڵگەی ئایەتەکە (وَهُوَ) ئەندازەی ڕوخسار بە درێژی (ما بَيْنَ مَنابِتِ رَأْسِه غالِباً) نێوان پێشە سەرە: کە بە زۆری مووی لێدەڕوێو (وَمُنْتَهى لَحْيَيْه) لای بنەوەی کۆتایی هەردوو شەویلیەتی، کە پـێی دەگـوترێ: چەناکە، واتـە: ئـەو دوو ئێسقانەی ددانەکانی خوارەوەیان لـە سـەر دەڕوێ (وَما بَيْنَ أُذُنَيْه) بە پـانیش لـە نێوان هـەردوو گوێیەتی، واتە: مێخەگوێیەکانی بە ڕوو داناندرێن.

(فَمِنْه) بەشێکە لە ڕوخسار (مَوْضِعُ الْغَمَمِ) ئەو شوێنەی مووی پێشە سەری بە سـەردا شۆڕ دەبێتـەوە، کـە پـێی دەڵـێن: تـەختی تەوێڵـە، کەواتـە: واجبـە بشـۆرێ (وكذا التَّحْذيفُ) هەروەهاش شوێنی جوانکردن، واتە: هەردوو شوێنی ئەو مووە وردیلانەی لە نێوان زولـفـو قۆچەکانی سەردانە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (لا النَّزْعَتانِ) بەڵام قۆچەکانیسـەر بەشێك نینە لە ڕوخسار (وهُما) هەردوو قۆچەکان (بَياضانِ) دوو شوێنی بێمـووە (يَكْتَنِفانِ النّاصيَةَ) دەورە لە پێشە سەر دەدەن، واتە: واجب نیە بشۆرێن.

(قُلْتُ) ئیمـامی (النـواوی) دەفـەرموێ (صَحَّحَ الْجُمْهـورُ) کۆمەڵـە زۆرەکـەی زانایـان ئـەو فەرموودەیان بە ڕاست داناوە: کە (أَنَّ مَوْضِـعَ التَّحْـذِيفِ مِـنَ الـرَّأْسِ) شـوێنی جـوانکردن بەشێکە لە سەر، چونکە مووەکان پەیوەندییان بە سەرەوە هەیە، بەڵام خەڵك بۆ جـوانی لایاندەبەن تاکو ڕوخساریان بەرین ببێ، کەواتە: شۆردنی واجب نیە (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: شۆردنی سۆرایی هەردوو لێوەکان واجبە، هەروەها شۆردنی هـەر دوو قونکـە چاویش واجبەو ئەگەر جیقنەی چاویشـیان لـە سـەر بـوو واجبـە لابـدرێ ئینجـا بشـۆرێن، هەروەها ئەگەر ناو دەمو ناو لووتو ناو چاو پیس بون واجبە بشۆرێن، بەڵام ئەگەر پـیس نەبون ئەوە شـۆردنی نـاو دەم و لـووت سـوننەتەو شـۆردنی نـاو چـاویش سـوننەت نیـە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(ويجبُ غَسْلُ كُلِّ هُدْبٍ) واجبە شۆردنی گشت برژانگە چاوەکان (وَحاجِبٍ) واجبـە: شـۆردنی برۆ و (وَعِذارٍ) واجبە: شۆردنی گێسوو، واتـە: ئـەو دوو بەسـتە مـووەی لـە بەرامبـەر مێخـی گوێیەکانو بەرەو خوارەوەترن تا دەگاتە ڕوومەتەکان، چونکە بەشێکن لە ڕوخسار، بـەڵام هەردوو زولفەکان، واتە: ئەو دوو بەستە مـووەی لـە مێخیگوێیـەکان بـەرەو سـەرەوەترنو

وَشَارِب وَخَدّ وَعَنفَقَة شَعَراً وَبَشَراً، وَقِيلَ لاَ يَجبُ بَاطِنُ عَنفَقَة كَثِيفَـة، وَاللِّحْيَـةُ إِنْ خَفَّتْ كَهُدْب وَإِلاَّ فَلْيَغْسِلْ ظَاهِرَهَا، وَفِي قَوْلٍ لاَيَجِبُ غَسْلُ خَـارِجٍ عَـنِ الْوَجْـهِ. اَلثَّالِثُ: غَسْلُ يَدَيْه مَعَ مِرْفَقَيْه،

---

چینێکی کوردەواری پێیان دەڵێن: بسك، بەشكێن لـە سـەر، هـەروەك لـە (تحفة)دا ڕوونـی كردۆتەوە، كەواتە: شۆردنی زولفەكان واجب نیە، بەڵكو سوننەتە؟ چونكە چەند زانایەك بە واجبی داناوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَشارِبٍ) واجبە: شۆردنی سمێڵ‌و (وَخَدّ) كولمـەو (وَعَنفَقَـةٍ) مـووی سـەر لێـوی خـوارەوە (شَعراً وبَشَراً) گشتیان بە موو و پیستەوە واجبە بشۆرێن، واتـە: لـە برژانگـەوە تـا ئێـرە، هەر چەند مووی ئەو شوێنانەش زۆر درێـژو پـڕیش بـن، هـەر واجبـە بشـۆرێن (وَقِيـلَ) لـە فەرموودەیەكی بێهێزدا (لاَيَجِبُ باطِنُ عَنفَقَةٍ كَثِيفَةٍ) واجـب نیـە شـۆردنی موەكـانی سـەر لێوی خوارەوە ئەگەر پڕ بن.

(واللِّحْيَةُ) ڕیشی پیـاو، واتـە: مـووی سـەر چـەناكەو ڕوومـەت (إِنْ خَفَّـتْ) ئەگەرتـەنك بـوو (كَهُدْبٍ) وەكـو بـرژانگ واجبـە دەرەوەو نـاوەوەی بشـۆرێ (وَإِلاّ) بـەڵام ئەگـەر پـڕ بـوو: پیستەی ڕووی لە پەنادا نەدەدیترا لە دانیشتنی گفتوگۆدا (فَلْيَغْسِـل ظاهِرَهـا) واجبـە لای دەرەوەی بشۆرێ، بەڵام واجب نیە پیستەو لای‌ناوەوەی بشـۆرێ ﴿عن ابن عبـاس رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّهُ أَخذَ غُرْفَةً مِنْ ماءٍ فَغَسَلَ بِها وَجْهَهُ...ثُمَّ قال: هكَذا رأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّـأ﴾ رواه البخـاری، (ابـن عبـاس) بـە كۆلمـە ئاوێـك ڕووی‌خـۆی شـۆراند، ئینجـا فـەرمووی: پێغەمبەرم ﷺ بینی ئەوها دەستنوێژی گرت. واتە: ڕیشە پیرۆزەكەی پێغەمبەر ﷺ زۆر پڕ بوو، بە كۆلمەئاوێك لای‌ناوەوەی تەڕ نەدەبو.

ئینجا بزانە: ئەوە دەربـارەی پیـاو بـوو، بـەڵام ڕیشـی‌ئافرەت واجبـە دەرەوەو نـاوەوەی بشۆرێ، هەر چەند زۆریش پڕ بێ، چونكە بۆ ئافرەت سـوننەتە ڕیشـی‌خۆی بتاشـێ، یـان هەڵیكەنێ، واتە: لە بەر ئەوەی ڕیش بۆ ئافرەت بە هەتك‌و ناشـیرنی دادەنـدرێ، هـەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَفِي قَوْلٍ) لەفەرموودەیەكی بێهێزدا (لاَيَجِبُ غَسْلُ خارِجٍ عنِ الْوَجْهِ) واجب نیە: شۆردنی مووی ڕیش‌و شوێنەكانی‌تری ڕوخسار: كە لە سنوری ڕوخسار دەرچونە لە درێژی، یان لـە بەرینی، بـەڵام لـە فەرموودەی‌ڕاستدا واجب بـوو و لـە پێشـدا ڕوونمـان كـردەوە، ئینجـا سوننەتە لە لای سەرەوەدا دەست بە شۆردنی ڕوخسار بكاو لە هـەردوو دەسـتیشـی‌دا بـە یەكەوە ئاو پڕ بكاو بە ڕوخساری دابكا.

(اَلثَّالِثُ) سێیەم لە ڕوكنەكانی‌دەستنوێژ: (غَسْل يَدَيْهِ) شۆردنی هەردوو دەستیەتـی (مَـعَ مِرْفَقَيْـهِ) لەگـەڵ هـەردوو ئەنیشـكەكانی، بـە بەڵگـەی ئایەتەكـە، كـەوابو: واجبـە بـن

فَإِنْ قُطِعَ بَعْضُهُ وَجَبَ غَسْلُ مَا بَقِيَ، أَوْ مِنْ مِرفَقَيْه فَرَأْسُ عَظْمِ الْعَضُد عَلَى الْمَشْـهُور، أَوْ فَوْقَهُ نُدِبَ بَاقِي عَضُده. اَلرَّابِعُ: مُسَمَّى مَسْحٍ لِبَشَرَةِ رَأْسِهِ أَوْ شَـعَرٍ فِـي حَـدِّه، وَالْأَصَحُّ جَوَازُ غَسْله وَوَضَعُ الْيَد بلاَ مَدّ.

---

نینۆکەکانی بشۆرێو چاوپۆشی لە چڵکی بن نینۆك ناکرێو واجبە لابدرێ ئەگەر ڕێگەی ئاو بگرێ، هەروەك لە (تحفة)و (المجموع)دا فەرموویانە، کەواتە: چاوپۆشی لە سبوغی سەر نینۆکەکانیش ناکرێو واجبە بۆ دەستنوێژو غوسل لابدرێ.

(فَإِن قُطِعَ بَعْضُهُ) جا ئەگەر بەشێکی دەستی لێکراوە (وَجَبَ غَسْلُ مابَقِيَ) واجبە ئەوەندەی ماوە بشۆرێ (أَوْ مِنْ مِرْفَقَيْهِ) یان ئەگەر لە هەردوو ئەنیشکەوە لێکراوە (فَرَأْسُ عَظْمِ العَضُدِ عَلَى المَشْهُورِ) واجبە سەری ئێسقانەکەیقۆڵی بشۆرێ، لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب (أَوْ فَوْقَهُ) یان ئەگەر لە سەرەوەی ئەنیشکدا لێکراوە (نُدِبَ باقِيعَضُدِهِ) سوننەتە ئەوەندە قۆڵەی ماوە بشۆرێ تاکو ئەندامەکەی بێدەستنوێژ نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر یەکێك هەردوو دەستی نەبو و نەیتوانی دەستنوێژ بگرێ، واجبە: بە یارمەتیکەسێکیتر دەستنوێژ بگرێ بە خۆڕایی، یان بە کرێی هاوێنە، جائەگەر کەسی دەست نەکەوت بەڵام تەیەممومی پێدەکرا، واجبە: تەیەمموم بکاو نوێژەکەش بە دەستنوێژ دووبارە بکاتەوە، جا ئەگەر تەیەممومیشی پێنەکرا، واجبە: بە بێدەستنوێژی نوێژ بکا، ئینجا کە دەستنوێژی گرت، واجبە: نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەم مەسەلەی ڕوون کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر بە مەسینە، یان بەلوعە دەستنوێژی گرت، واجبە ئاگاداری پشتە دەستەکانی بێ تاکو تەواو بشۆرێن.

(اَلرَّابِعُ) **چوارەم** لە ڕوکنەکانیدەستنوێژ: (مُسَمَّىمَسْحٍ) ناوی مەسح=تەڕکردنێکە بە ئاوێکی بەکارنەهاتوو (لِبَشرَةِ رَأْسِهِ) بۆ بەشێکی پیستەی سەری، هەر چەند کەمیش بێ (أَوْ شَعَرٍ) یان تەڕکردنی مووی سەرە (فِي حَدِّهِ) لە سنوری سەردا، واتە: ئەگەر موەکە ئەوەندە درێژ بوو لە سنوری سەر دەردەچو، ئەوە مەسحکردنی ئەم جۆرە مووە دروست نیە: نە لە دەرەوەی سەرو نە لە سنوری سەردا، بەڵکو واجبە، لایبنەوەی مووەکە-کە لە سنور دەرنەچوە- مەسح بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ جـوازُ غَسْلِهِ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: دروستە سەری بشۆرێو بە بەر مەسحکردن دەکەوێ (وَوَضْعُ الْيَدِ بِلامَدٍّ) دروستیشە دەستیتەڕ لە سەر سەری دابنێ بە بێڕاگرتن، چونکە مەبەست تەڕکردنی سەرە، جا بە هۆی دەست بێ، یان شتێکیتر، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(اَلْخامسُ) پێنجەم لە ڕوكنەكانیدەستنوێژ: (غَسْلُ رِجْلَيْهِ) شۆردنی هەردوو پێیەكانیەتی (مَعَ كَعْبَيْهِ) لەگەڵ هەردوو گوزینگەكەی، بە بەڵگەی ئایەتەكە، جا ئەگەر لە گوزینگەوە پێی لێبۆوە، واجبە سەر ئێسقانەكە بیشۆرێ، ئەگەر لە سەرەوەی گوزینگ لێبۆوە، ئەوە واجب نیە، بەڵكو سوننەتە بیشۆرێ، هەروەك سەرچاوەكان ڕوونیان كردۆتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە شۆردنی ڕوخسارو دەستو پێدا، واجبە لە ئەندازەیواجب نەختێك زیاتر بشۆرێ، تاكو دڵنیا ببێ: كە ئەندازەیواجب بە تەواوی شۆراوە، چونكە (قاعدة)یەكی شەرعییە: (ما لايَتِمُّ الْواجِبُ إلاّ بِهِ فَهُوَ واجِبٌ) هەر كارێك واجب تەنها بەویەوە تەواو ببێ، ئەو كارەش واجبە.

هەروەها بزانە: ئەگەر دڕكێك-واتە: یان پارچە دارێك، یان پارچە ئاسنێك- بچەقێتە ناو ئەندامێكی مرۆڤ، ئەوە تەماشا دەكەین: ئەگەر بەو ئەندازەیە بوو: لە دوای هێنانەدەر شوێنەكەی بە بۆشی دەماوەو یەكتری نەدەگرتەوە، ئەوە دەرهێنانی واجبەو تا بمێنێ دەستنوێژی ناگیرێ-واتە: غوسلی ئەو شوێنەش دەرناچێ- بەڵام ئەگەر بەو ئەندازەیە نەبو، بەڵكو لە دوای هێنانەدەر شوێنەكەی یەكتری دەگرتەوە، ئەوە هێنانەدەری واجب نیەو دەستنوێژەكەش دروستە، جا ئەگەر ئەو شتە لە ناو ئەندامەكەدا داپۆشرا بوو و هیچی بە دەرەوە نەبو، ئەوە هێنانەدەری واجب نیەو دەستنوێژەكەشی دروستە، هەروەك لە (بجیرمی)و (الشبراملسی)دا ڕوون كراوەتەوە.

دیسان بزانە: لە دەستنوێژو لە غوسلدا، ناو پسانەوەو ناو قڵێشاییو ناو كونو ناوەوەو هەردوو لایكونی دوودەر -وەك كونی خەزێمی لووت- گشتیان واجبە بشۆرێن، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە، هەروەها ئەو دەرمانەی لە ناویاندایە، یان لە سەر ئەندامەكانیترە: وەكو خەنەو ماڵحەمو ڕونی پەیتو سبوغو ئەو جۆرە شتانە گشتی واجبە لابدرێ: بۆ دەستنوێژو بۆ غوسل، بەڵام ڕەنگی خەنەو مەرەكەبو چەورایی ماڵحەمو ڕونو نەفتو ئەو جۆرە شتانە زیانی نیە، هەرچەند تەڕایەتی ئاوەكەش لە سەر ئەندامەكە نەمێنێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە، جا ئەگەر هاتو: نەگونجا ئەو جۆرە شتانە لابدرێن چونكە بۆ برینەكە، یان بۆ ئەندامەكە زیانی هەبو، ئەوە واجبە تەیەمموم بكا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتیو لە باسی (تیمم)دا ڕوونی دەكەینەوە، ان شاء الله تعالى.

هەروەها ئەگەر شوێنێكی بریندار بوو و قەتماغی گرتەوە، یان لەت بوو و یەكتری گرتەوە، یان پیستەی لێهەڵبو، ئینجا لەگەڵ گۆشتدا یەكتری گرتەوە، ئەوە تەنها لای

اَلسَّادِسُ: تَرْتِيبُهُ هكَذَا. وَلَوْ اِغْتَسَلَ مُحْدِثٌ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ أَمْكَنَ تَقْدِيرُ تَرْتِيبٍ بِأَنْ غَطَسَ وَمَكَثَ

---

سەرەوەی واجبە بشۆرێ‌و حەڕامە لێك بكرێتەوە، بەڵام ئەگەر یەكتری نەگرتبو، یان لێك بۆوە، یان پیستەكەی لێ‌هەڵبۆوە، ئەوە بۆ دەستنوێژو بۆ غوسل واجبە سەرەوەو بنەوەی بشۆرێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

(اَلسَّادِسُ) شەشەم لە ڕوكنەكانی‌دەستنوێژ: (تَرْتِيبُهُ) ڕیزكردنی شۆردنی ئەندامەكانی دەستنوێژە (هكَذا) وەك ئەو ڕیزەی لە ئایەتەكەدا هاتوە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە:

﴿عن عثمانﷺ أَنَّهُ دَعا بِوَضُوءٍ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ الْيُسْرَى مِثْلَ ذلِكَ ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ الْيُسْرى مِثْلَ ذلِكَ، ثُمَّ قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هذا﴾ رواه الشيخان، ئیمامی(عثمان) دەستنوێژی گرت‌و لە كۆتایی دەستنوێژەكەی‌دا فەرمووی: پێغەمبەرمﷺ دیت بەم شێوەیەی من دەستنوێژی گرت: لە سەرەتادا هەردوو لەپە دەستەكانی سێ جار شۆردن، ئینجا ئاوی لە دەمی وەركردو ئاوی لە لووتی وەركردو ئاوەكەی فڕی‌دا دەرەوە، ئینجا ڕوخساری سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی ڕاستەی لەگەڵ ئەنیشكدا سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی چەپەشی وەكو ڕاستە لەگەڵ ئەنیشكدا سێ جار شۆرد، ئینجا سەری مەسح كرد، ئینجا پێی ڕاستەی لەگەڵ گۆزینگەكاندا سێ جار شۆرد، ئینجا پێی چەپەشی وەكو ڕاستە لەگەڵ گۆزینگەكاندا سێ جار شۆرد.

كەوابو: ئەگەر بە پێچەوانەی ئەم ڕیزە دەستنوێژی گرت: وەك پێی پێشی دەستەكان بشۆرێ، یان یەكێك لەم دووانە پێش ڕوخساری بشۆرێ، یان ئەندامێك بە تەواوی نەشۆرێ‌و دەست بە ئەندامی دوایی بكا، ئەوە دەستنوێژەكەی دروست نیە، هەروەك لە (نهاية)و (الرشيدي)دا ڕوون كراوەتەوە، بەڵام ئەگەر لە جاری یەكەمدا ئەندامەكەی تەواو نەشۆردو پارچەیەكی هێشتەوە، ئینجا لە جاری دووەم، یان سێیەمدا شۆرا، ئەوە بێ‌دەستنوێژی ئەم ئەندامە لادەچێ، واتە: دروستە دەست بە ئەندامی دوایی بكا، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ اِغْتَسَلَ مُحْدِثٌ) ئەگەر مرۆڤی بێ‌دەستنوێژ –لە جیاتی‌دەستنوێژگرتن– غوسلی كرد، واتە: هەموو لاشەی‌خۆی شوشت‌و نیەتێكی‌دەستنوێژیشی هێنا، ئەوە (فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ أَمْكَنَ تَقْدِيرُ تَرْتِيبٍ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوهایە: ئەگەر دەگونجا ئەندازە بۆ ڕیزی‌ئەندامەكان دابندرێ (بِأَنْ غَطَسَ) بەو جۆرەی: خۆی نقوم كردە ناو ئاو (وَمَكَثَ) بە

صَحَّ، وَإِلاَّ فَلاَ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ اَلصِّحَّةُ بِلاَ مُكْثٍ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَسُنَّتُهُ: اَلسِّوَاكُ عَرْضاً بِكُلِّ خَشِنٍ لاَ أُصْبُعِهِ فِي الأَصَحِّ،

---

ئەندازەی ڕێزدانانەکەش لە ناو ئاودا مایەوە (صَحَّ) دەستنوێژکەی دروستە (وَإلاَّ) ئەگەر نەماوەو یەکسەر هاتە دەرەوە (فَلا) دروست نیە، بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحّ) فەرموودەیڕاستتر ئەوەیە: (اَلصِّحَّةُ) دەستنوێژەکەی دروستە (بِلامُكْثٍ وَاللهُ أَعْلَم) بە بێمانەوە لە ناو ئاوەکەدا، چونکە غوسل کردن جەنابەت لادەبا-کە بێدەستنوێژیەکی گەورەیە- کەوابو: چاکتر ئەم بێدەستنوێژیە بچوکە لادەبا.

ئینجا بزانە: ئەو دروستبوونە بە هۆی خۆ نقومکردنە ناو ئاو بوو، بەڵام ئەگەر بە جامە، یان بە مەسینە ئاو بەخۆیدا بکا، ئەو ڕیزکردنەیڕابردوو واجبە، ئەگەر نا: دەستنوێژی دروست نیە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە، هەروەها بزانە: ئەگەر بێدەستنوێژ بوو و جەنابەتیشی لە سەر بوو: ئەوە بەغوسلکردنی جەنابەت-بە هەر جۆرێك بێ- هەردووکی لە سەر لادەچن، هەروەك لە کۆتایی (غسل)دا ڕوونی ئەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

## ﴿ باسی سیواكو سوننەتەكانی دەستنوێژ ﴾

(وَسُنَنُهُ) یەكێك لە سوننەتەكانیدەستنوێژ: (اَلسِّوَاكُ) سیواك كردنە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ﴾ رواه مالك وابن خزيمة وصححه، ئەگەر لە بەر ماندووکردنی ئۆممەتم نەبوایە، فەرمانم ئەدانێ: لەگەڵ گشت دەستنوێژگرتنێکدا سیواك بکەن.

(عَرْضاً) سوننەتە: سیواك كردن لە پانایيددانەكانو درێژاییدەمەوە بێ، واتە: لە لای ڕاستەی دەمیەوە دەست پێ بکاو بە سەر ئەم دیوەو ئەو دیوی ددانەکانیدا بێنێ تادەگاتە ناوەندی دەمی، ئینجا لە چەپەوە بەم شێوەیە-هەروەك لە (نهاية)و (مغني)و (حاشيةالعوض)دا ڕوون کراوەتەوە- بەڵام سیواك كردنی زوبان سوننەتە: لە درێژاییدا بێ، واتە: لە سەر بانی دەمو گەروویەوە بۆ سەری زوبانی، هەروەك لە (الشرواني)و (الشبراملسي) وەردەگیرێ.

(بِكُلِّ خَشِنٍ) سیواك كردن بە گشت شتێکی زبر دروستە: کە پاك بێو چڵكو ڕەنگی سەر ددانەكان لاببا، هەر چەند پەڕۆکیش بێ، چونکە مەبەستی سیواك كردن-کە پاككردنەوەیە- دێتەجێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلسِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ﴾ رواه النسائي باسناد صحيح، سیواك كردن پاككەرەوەی دەمەو هۆی ڕازیکردنی خودایە.

(لا أُصْبُعِهِ) بەڵام سیواك بە پەنجەیخۆی نابێ، واتە سوننەتی سیواك کردنی دەست ناکەوێ، هەر چەند پەنجەکەشی زبر بێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو

حەدیسەی دەفەرموێ: ﴿پەنجە بە بەر سیواك دەكەوێ﴾. ئیمامی (البیهقی) بە بێهێزی داناوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: سیواك كردن بە دەستی ڕاستە سوننەتە، هەروەها سوننەتە سیواك لە داری (الأراك) بێ‌و پێش سیواك كردن بە ئاو نەرمی بكاو لە دوای سیواك كردن بیشۆرێ، بەڵام ناپەسندە سیواك لە بستێك درێژتر بێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(ويُسَّن) سیواك كردن سوننەتە (لِلصَّلاةِ) لەو كاتەی دەیەوێ نوێژ بكا، جا نوێژەكە سوننەت بێ، یان واجب، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلى أُمَّتِــي لأَمَــرْتُهُمْ بِالسِّواكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ﴾ رواه الشيخان، ئەگەر لە بەر ماندووكردنی ئوممەتم نەبوایە، فەرمانم ئەدانێ: لە كاتی گشت نوێژكردنێكدا سیواك بكەن.

كەوابو: ئەگەر زۆر سوننەتی دەكردن، لە بۆ گشت دوو ڕەكعەتێك سیواك كردن سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَتَغَيُّرِالفَمِ) هەروەها سیواك كردن سوننەتە: لەو كاتەی تام، یان بۆن، یان ڕەنگی دەم دەگۆڕێ: بە هۆی خەوتن، یان بێدەنگبوون، یان خواردنی شتێكی بۆن ناخۆش ﴿عــن حذيفةﷺ: كانَ النَّبِيُّﷺ إذا قــامَ لِيَتَهَجَّــدَ يَشُــوصُ فَــاهُ بِالسِّــواكِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ كە لە خەو هەڵدەستا بۆ شەونوێژ، سیواكی بە دەمی‌خۆیدا ئەهێنا. هەروەها حەدیسەكەی ﴿اَلسِّواكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ﴾ی ڕابردوو بەڵگەیە بۆ ئێرەش.

(وَلا يُكرَهُ) لە هیچ كاتێكدا سیواك كردن ناپەسند نیە، واتە: لە گشت كاتێكدا سوننەتە (إِلاَّ لِلصَّائِمِ بَعْدَالزَّوالِ) تەنها بۆ مرۆڤی بەڕۆژوو نەبێ لە دوای هاتنی كاتی نوێژی‌نیوەڕۆ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَخُلُوفُ فَمِ الصّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَاللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْــكِ﴾ رواه الشيخان، بۆنی دەمی مرۆڤی‌بەڕۆژوو لە لای خوای‌گەورە لە بۆنی میسك خۆشترە. واتە: چونكە بە هۆی سیواك كردن ئەم بۆنە دەڕوا، بەڵام لە پێش نیوەڕۆ و لە دوای بەربانگ ناپەسند نیە، جا لە (المجموع)دا ئەو فەرموودەی هەڵبژاردوە: كە هیچ كاتێك بۆ مرۆڤی بەڕۆژووش سیواك كردن ناپەسند نیە.

هەروەها سیواك كردن سوننەتە: بۆ چوونە ناو مزگەوت‌و چوونە ماڵەوەو بۆ خوێندنی قورئان‌و حەدیس‌و دەرسی ئایینی‌و بۆ زیكری خواو بۆ سوجدەی شوكرو تیلاوەو بۆ نوێژی (جنازة)و بۆ تەوافی ماڵی‌خواو بۆ خەوتن‌و بۆ نەخۆش لە كاتی ئامادەبوونی گیان دەرچوونی.

ئینجا بزانە: پاككردنەوەی نێوان ددانەكان لە پاشماوەی‌خواردن، سوننەتێكی گرنگە، بەڵام پاككردنەوەیان بە ئاسن ناپەسندە، جا ئەو خواردنەی بە دارۆچكە دەیهێنێتە

وَالتَّسْمِيَةُ أَوَّلَهُ فَإِنْ تَرَكَ فَفِي أَثْنائه. وَغَسْلُ كَفَّيْهِ فَإِنْ لَمْ يَتَيَقَّنْ طُهْرَهُما كُرِهَ غَمْسُهُما فِي الإِنَاءِ قَبْلَ غَسْلِهِمَا. وَالْمَضْمَضَةُ وَالإِسْتِنْشَاقُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ فَصْلَهُمَا أَفْضَلُ، ثُمَّ الأَصَحُّ

---

دەرەوە ناپەسندە بیخوا، بەڵام ئەگەر بە زوبان هێنایە دەرەوە زیانی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالتَّسمِيَةُ أَوَّلَهُ) سوننەتێکیتری دەستنوێژ: (بِسْمِ اللهِ)کردنە، لە سەرەتای دەستنوێژدا، واتە: بڵێ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿تَوَضَّئُوا بِاسْمِ اللهِ﴾ رواه البیهقی باسناد جید، دەستنوێژ بگرن بە ناوی خوای گەورە.

(فَإِنْ تَرَكَ) جا ئەگەر لە سەرەتای دەستنوێژدا بە ویستی خۆی (بِسْم اللهِ) نەکرد، یان لەبیری چوو (فَفِي أَثْنائِهِ) با لە ناو دەستنوێژگرتندا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ)، واتە: بە (قیاس) لە سەر خواردن، کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا أَكَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَذْكُرِاسْمَ اللهِ، وَإِنْ نَسِيَ أَنْ يَذْكُرَ اسْمَ اللهِ فِي أَوَّلِهِ فَلْيَقُلْ بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ﴾ رواه الترمذی بسند صحیح، هەر کاتێك یەکێکتان ویستی شتێك بخوا، دەبێ (بسم الله) بکا، ئەگەر لە سەرەتادا لە بیری چوو، با بڵێ: (بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ) بە ناویخوا لە سەرەتاو لە کۆتاییدا.

(وَغَسْلُ كَفَّيْهِ) سوننەتێکیتری دەستنوێژ: شۆردنی هەردوو لەپە دەستیەتی، تا جومگەی دەستی، لەگەڵ (بسم الله)کردندا، هەرچەند دەستیشی پاك بێ، یان بە مەسینە، یان بەلوعە دەستنوێژ بگرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردووی ئیمامی(عثمان).

(فَإِنْ لمْ يتَيَقَّنْ طُهْرَهُما) جا ئەگەر بێگومان نەبو: کە لەپەدەستەکانی پاکە (كُرِهَ غَمْسُهُما فِي الأَناءِ) ناپەسندە لەپەدەستەکانی بنێتە ناو قاپێکی وەها: کە ئاوێکی لە قوللەتێن کەمتر، یان شلەیەکی تێدابێ (قَبْلَ غَسْلِهما) پێش شۆردنیان سێ جار، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذااسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلا يَغْمِسْ يَدَهُ فِيالاِناءِ حَتّى يَغْسِلَها فَإِنَّهُ لايَدْرِي أَيْنَ باتَتْ يَدُهُ﴾ رواه الشیخان، هەر کاتێك یەکێکتان لە خەو هەڵسا، دەستی نەخاتە ناو قاپ، تا دەیشۆرێ، چونکە نازانێ لە کاتیخەوتندا دەستی لە کام شوێن داندراوە.

ئینجا بزانە: لە دوای شۆردنی لەپەدەست، کاتی سیواك کردن دێ، جا ئەگەر لەم کاتەدا نەیکرد، با لە ناو دەستنوێژگرتندا بیکا، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَالْمَضْمَضَةُ) سوننەتێکیتری دەستنوێژ: ئاو لەدەم وەرکردنە، لە دوای لەپەدەست شۆردنو سیواك کردن (وَالأَسْتِنْشاقُ) سوننەتێکیتریش: ئاو لە لووت وەرکردنە، لە دوای ئاو لەدەم وەرکردن، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردووی ئیمامی(عثمان).

(وَالأَظْهَرُ أَنَّ فَصْلَهُما أَفْضَلُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: لێك جیاکردنەوەی ئاو تێوەرکردنی دەمو لووت خێری زیاترە (ثُمَّ الاصَحُّ) ئینجا فەرموودەی ڕاستتر:

يَتَمَضْمَضُ بِغُرْفَةٍ ثَلاَثاً ثُمَّ يَسْتَنْشِقُ بِأُخْرَى ثَلاَثاً، وَيُبَالِغُ فِيهِمَا غَيْرُ الصَّائِمِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ تَفْضِيلُ الْجَمْعِ بِثَلاَثِ غُرَفٍ: يَتَمَضْمَضُ مِنْ كُلٍّ ثُمَّ يَسْتَنْشِقُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَتَثْلِيثُ الْغَسْلِ وَالْمَسْحِ وَيَأْخُذُ الشَّاكُّ بِالْيَقِينِ.

---

(يَتَمَضْمَضُ بِغُرْفَةٍ ثَلاثاً) به كۆلمه ئاوێك سێ جار ئاو له دهمی وهردهكا (ثُمَّ يَسْتَنْشِقُ بِأُخْرَى ثَلاثاً) ئینجا به كۆلمهیهكیتریش سێ جار ئاو له لووتی وهردهكا.

(وَيُبالِغُ فِيهِما غَيْرُالصَّائِمِ)–جگه له مرۆڤی بهڕۆژوو– له ئهندازه بهدهر ئاو لهدهمو لووتی وهر بكا تا ئاوهكه دهگاته سهر گهروو و گشت تهنیشتهكانی دهمی، تا دهگاته لای ژۆری لووتی ئاو ههڵمژێ، پێغهمبهرﷺ به پیاوێكی فهرموو: ﴿بالِغْ فِي الأسْتِنْشاقِ إلاّ أَنْ تَكُونَ صائِماً﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، له ئهندازه بهدهر ئاو له لووتت وهربكه، تهنها ئهگهر بهڕۆژوو بووی وا مهكه.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دهفهرموێ (اَلأَظْهَرُ) فهرموودهی بههێزتر به لایمنهوه ئهوهیه: (تَفْضِيلُ الْجَمْعِ) كۆكردنهوهی دهمو لووت خێری زیاتره (بِثَلاثِ غُرَفٍ) به سێ كۆلمه ئاو، بهم شێوهیه: (يَتَمَضْمَضُ مِن كُلٍّ) به بهشێكی ههر كۆلمهیهك ئاو له دهمی وهربكا (ثُمَّ يَسْتَنْشِقُ) ئینجا به بهشهكهیتریش ئاو له لووتی وهربكا، ئینجا كۆلمهی دووهمیش، ئینجا كۆلمهی سێیهمیش بهو جۆره (وَاللهُ أَعْلَم)، ئینجا بزانه: به ههر شێوهیهك لهو دوو شێوهیه ڕهفتار بكا، خێرهكهی ههر دهست دهكهوێ، بهڵام ئهم شێوهیه خێرتره، چونكه حهدیسهكانی ڕاستن، ههروهك له سهرچاوهكاندا فهرموویانه.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: پێغهمبهرﷺ دهفهرموێ: ﴿إذااسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَنامِهِ فَلْيَسْتَنْثِرْ ثَلاثاً فَإنَّ الشَّيْطانَ يَبِيتُ عَلى خَيْشُومِهِ﴾ رواه الشيخان، ههر كاتێك یهكێكتان له خهو ههڵسا، با سێ جار ئاو له لووتی وهربكا، چونكه شهیتان له سهر لای ژۆری لووتی له كاتی خهوتندا دهمێنێتهوه.

(وَتَثْلِيثُ الْغَسْلِ وَالْمَسْحِ) سوننهتێكیتری دهستنوێژ: سێجار سێجار شۆردنی ئهندامهكانی دهستنوێژهو سێ جار مهسحكردنیسهره، به بهڵگهی حهدیسهكهیڕابردووی ئیمامی (عثمان)و حهدیسهكهیداهاتوو (وَيَأْخُذُ الشّاكُّ بِالْيَقِينِ) مرۆڤیگوماندار لایدڵنیایی لێدهگرێ، واته: ئهگهر كهوته گومان: ئایا دوو جار ئهندامهكهی شۆردوه، یان سێ جار؟ ئهوه لایكهم لێدهگرێ: كه دووهو لێی دڵنیایه، واته: جارێكیتریش ئهندامهكه دهشۆرێ.

ئینجا بزانه: زیاتر له سێ جار به نیهتیدهستنوێژ، ههروهها: كهمتر له سێ جار به بێعوزر، ههردوو لا دروستن، بهڵام ههردووكیش ناپهسندن، ههروهك له سهرچاوهكاندا فهرموویانه ﴿عَنْ عمرو بن شعيب عن أبيه عن جَدِّهِ تَوَضَّأَالنَّبِيُّﷺ ثَلاثاً ثَلاثاً ثُمَّ قالَ: هكَذا الْوُضُوءُ

وَمَسْحُ كُلِّ رَأْسِهِ ثُمَّ أُذُنَيْهِ، فَإِنْ عَسُرَ رَفْعُ الْعِمامَةِ كَمَّلَ بِالْمَسْحِ عَلَيْها. وَتَخْلِيلُ اللِّحْيَةِ الْكَثَّةِ

---

فَمَنْ زادَ عَلى هذا أَوْ نَقَصَ فَقَدْ أَساءَ وَظَلَمَ﴾ رواه أبوداود وغيره باسنادصحيح، پێغەمبەر ﷺ سێ جار سێ جار دەستنوێژی گرت، ئینجا فەرمووی: دەستنوێژ ئەوهایە، جا هەر کەسێك زیاتر، یان کەمتر بکا، ئەوە خراپەو ستەمی کردوە.

کەواتە: بە یەك جاریش دەستنوێژ دەگیرێ، بەو مەرجەی بە تەواوی ئەندامەکە بشۆرێ ﴿عن ابن عباس رضی‌الله عنهما: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ مَرَّةً مَرَّةً﴾ رواه البخاری، پێغەمبەر ﷺ یەك جار، یەك جار دەستنوێژی گرت. هەروەها: دوو جاریش لە (بخاری)و (مسلم)دا هاتوە.

(وَمَسْحُ كُلِّ رَأْسِهِ) سوننەتێکی‌تری دەستنوێژ: مەسحکردنی هەموو سەریەتی ﴿عَنْ عبدالله بن زيد ﷺ فِي صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ: مَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِيَدَيْهِ وَأَدْبَرَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ سەری‌خۆی مەسح کردو هەردوو دەستەکانی بە سەر سەری‌دا هێنا تا پشتەوە، ئینجا هێنانیەوە سەر پێشە سەر.

(ثُمَّ أُذُنَيْهِ) ئینجا لە دوای مەسحی سەر، سوننەتە هەردوو گوێیەکانی مەسح بکا: دەرەوەو ناوەوەیان بە ئاوێکی بەکار نەهاتوو، واتە: هەردوو پەنجەکانی شادە بخاتە دیوی ناوەوەی گوێیەکان‌و هەردوو پەنجە گەورەکەش بخاتە سەر پشتی گوێیەکان، ئینجا بیانگەڕێنێتە ئەم لاو ئەو لا ﴿عن عبدالله بن عمرو رضی‌الله عنهما: فِي صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ: وَأَدْخَلَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّاحَتَيْنِ فِي أُذُنَيْهِ وَمَسَحَ بِإِبْهامَيْهِ ظاهِرَ أُذُنَيْهِ﴾ رواه ابوداود بسندحسن، لە دەستنوێژدا پێغەمبەر ﷺ هەردوو پەنجەی شادەی خستنە ناو گوێیەکانی‌و بە هەردوو پەنجە گەورەکانیشی دەرەوەی گوێیەکانی مەسح کرد.

(فَإِنْ عَسُرَ رَفْعُ الْعِمامَةِ) جا ئەگەر زەحمەت بوو مێزەرەکەی لاببا، یان هەر شتێکی‌تر: کە سەری پێ‌داپۆشراوە (كَمَّلَ بِالْمَسْحِ عَلَيْها) با مەسحی تەواوی‌سەری –لە دوای واجبەکە– لە سەر ئەو داپۆشەرە تەواو بکا، واتە: واجبە بەشێکی سەری بە ڕووتی مەسح بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن المغيرة ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِناصِيَتِهِ وَعَلى الْعِمامَةِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت‌و مەسحی پێشەسەری کردو لە سەر مێزەرەکەش مەسحی کرد.

ئینجا بزانە: مەسحکردنی ئەستۆ سوننەت نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَتَخْلِيلُ اللِّحْيَةِ الْكَثَّةِ) سوننەتێکی‌تری دەستنوێژ: پەنجە تێوەردانی ڕیشێکی پڕە، ئینجا وەهاش سوننەتە: بە ئاوێکی تایبەت بێ ﴿عن أنس ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ إِذا تَوَضَّأَ أَخَذَ كَفًّا مِنْ ماءٍ فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ وَقالَ: هكذا أَمَرَنِي رَبِّي﴾ رواه ابوداود باسناد

صحيح، كە پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی دەگرت، گولمە ئاوێکی دەبردە ژێر مەلاشوویو ریشی پێ تێکوەردەداو فەرمووی: ئەوها خوایخۆم فەرمانی پێکردوم.

(وَأَصابِعِه) سوننەتێکیتری دەستنوێژ: پەنجە تێوەردانی نێوان پەنجەکانی دەستو پێیەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا تَوَضَّأتَ فَخلّلْ بَيْنَ أَصابعِ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، هەر کاتێك دەستنوێژت گرت، پەنجە لە نێوان پەنجەکانی دەستو پێیەکانت وەردە. جا ئەگەر هاتو: پەنجەکان پاڵیان دابوە یەکتری، ئەو کاتە ئاو بردنە ناویان واجبە، بەلام ئەگەر یەکتریان گرتبو، حەرامە لێکیان بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە (المجموع)دا دەفەرموێ: ئەگەر ئەنگوستیلەی لە پەنجەدا بوو و ئاوی نەدەچووە ژێرەوە، واجبە ئاوی بگەینێتێ بە جولاندنی، یان بە داکەندنی، بەلام ئەگەر ئاوی دەگەیشتە ژێرەوە، ئەو کاتە جولاندنی سوننەتە ﴿عن علي وابن عمرﷺ: أَنَّهُما إذا تَوَضَّآ حَرَّكا الْخـاتَمَ﴾ رواه البيهقي، ئەم دوو (صحابة)یە کە دەستنوێژیان دەگرت، ئەنگوستیلەیان دەجولاند.

هەروەها دەست بە سەرداهێنانی ئەندامەکانی دەستنوێژ سوننەتە ﴿عن عبدالله بن زيدﷺ: أَنَّهُﷺ جَعَلَ يَدْلُكُ ذِراعَيْهِ﴾ صححه ابن خزيمه، پێغەمبەرﷺ-لە دەستنوێژدا- دەستی بە سەر هەردوو باسکەکەیخۆیدا ئەهێنا. واتە: تا باش تەڕ ببێ.

کەوابو: دەبی پاشنەیپێ زیاتر بایەخی پێبدرێ بە تایبەتی لە زستاندا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِلأَعْقابِ مِنَ النَّارِ﴾ رواه الشيخان، سەرشۆڕی لە ئاگری دۆزەخ بۆ ئەوانەی کەمترغەمی ئەکەن لە شۆردنی پاشنەیپێدا. هەروەها سوننەتە ڕوو لە قیبلەو بێقسەکردن دەستنوێژ بگرێ.

(وَتَقْدِيمُ الْيُمْنَى) سوننەتێکیتری دەستنوێژ: پێشخستنی شۆردنی ئەندامی ڕاستەیە، لە سەر چەپە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا تَوَضَّأتُمْ فَابْدَءُوا بِمَيامِنِكُمْ﴾ صححه ابن خزيمة، هەر کاتێك دەستنوێژتان گرت، دەست بە ڕاستەکانتان بکەن.

(وَإِطالَةُ غُرَّتِهِ) سوننەتێکیتریدەستنوێژ: زیاتر شۆردنە لە ئەندازەی واجبی ڕوخساری تا پێشەسەرییو گوێیەکانیو گەردەنی (وَتَحْجِيلِه) هەروەها زیاتر شۆردنە: لە ئەندازەی واجبی دەستو پێیەکانی تا بەشێکی قۆڵیو بەشێکی لولە قاچی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِينَ مِنْ آثارِ الْوُضُوءِ فَمَنِ اسْتَطاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ﴾ رواه الشيخان، ئوممەتی من لە ڕۆژی قیامەت بانگ دەکرێن بە

وَالْمُوَالاةُ وَأَوْجَبَهاالْقَديمُ. وَتَرْكُ الإِسْتِعَانَةِ وَالنَّفضِ وَكَذاالتَّنشيفُ فِى الأَصَحِّ. وَيَقُولُ بَعْدَهُ: أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، اَللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ، سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

ڕوخساری سپی‌و بە دەست‌و پێی سپیەوە، جا هەر کەسێك لە ئێوە دەتوانێ لە ئەندازەی واجب زیاتر بشۆرێ لە دەستنوێژدا، با وا بکا.

(وَالْمُوالاةُ) سوننەتێکی‌تری دەستنوێژ: شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژە بە دوای یەکتردا، بە جۆرێکی وەها: یەکەمیان ووشك نەبێتەوە کە دەست بە ئەندامەکەی‌تر دەکا (وَأَوْجَبَها الْقَديمُ) فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعی) شۆردنی بە دوای‌یەکتردای بە واجب داناوە.

(وَتَرْكُ الإِسْتِعانَةِ) سوننەتە بۆدەستنوێژگرتن داوای یارمەتی‌دان بۆ ئاو پێداکردن لە کەس نەکا، مەگەر نەخۆش بێ، یان عوزرێکی‌تری هەبێ (وَالنَّفْضِ) سوننەتە ئاو لە دەستەکانی دانەوەشێنێ لە دوای دەستنوێژ، بەڵام لە (المجموع)دا دەفەرموێ: حەڵاڵە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌داهاتوو (وكَذا التَّنْشيفُ) هەروەها سوننەتە ئەندامەکانی ووشك نەکاتەوە بە پەڕۆو ئەو جۆرە شتانە (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا ﴿عن ميمونة رضي الله عنها: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ ماءً لِلْغُسْلِ...فَأَتَيْتُه بِخِرْقَةٍ فَلَمْ يُرِدْها فَجَعَلَ يَنْفُضُ الْماءَ بِيَدِهِ﴾ رواه الشيخان، ئاوی غوسل کردنم بۆ پێغەمبەرﷺ داناو لە دوای غوسل پەڕۆیەکم بۆ هێنا خۆی پێ ووشك بکاتەوە، ئەویش پەڕۆیەکەی نەویست‌و بە دەستی‌خۆی ئاوی دادەوەشاند.

ئینجا بزانە: ئەگەر پێویستی بە ووشککردنەوە هەبو ناپەسند نیە، بەڵکو لە (شرح مسلم)دا ئەو ڕایەی هەڵبژاردوە: کە کردن‌و نەکردنی یەکسانە.

(وَيَقُولُ بَعْدَهُ) سوننەتە کە دەستنوێژی تەواو کرد، قسە نەکاو ڕوو لە قیبلە دەست بەرز بکاتەوەو بڵێ: ﴿أَشْهَدُ أَنْ لاَّإِلَهَ الاَّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ﴾ رواه مسلم والترمذی وزاد: ﴿اَللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾. ئینجا سوننەتە بڵێ: ﴿سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ اِلَيْكَ﴾ رواه النسائی مرفوعاً وموقوفا، قال ابن حجرالعسقلانی فی‌التلخیص: واما الموقوف فلا شك فی صحته.

ئینجا بزانە: لە دوای دەستنوێژگرتن ئەم دوعایەش سوننەتە: ﴿اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِى ذَنْبِى وَوَسِّعْ لِى فِي دارِى وَبارِكْ لِى فِى رِزْقِى﴾ رواه النسائي باسناد صحيح فی عمل اليوم والليلة، ئینجا سەلەواتیش لە دوای ئەو زیکرانەی‌ڕابردوو سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَحَذَفْتُ دُعاءَ الْأَعضاءِ إِذْ لاَ أَصْلَ لَهُ.

(وَحَذَفْتُ دُعاءَ الاعْضاءِ) ئەو دوعایانەی لە گەڵ شۆردنی ئەندامەکانی دەستنوێژدا دەگوترێن، مــن نەمنووسین (إِذْ لا أَصْلَ لَهُ) چونکە لە کتێبەکانی حەدیسدا هیچ بنچینەیەکی وەهایان نیە پشتی پێ ببەسترێ.

هەروەها لە دوای دەستنوێژگرتن سوننەتە: دوو ڕەکعەت بکا بە نیەتی (سُنَّةُالْوُضُوءِ)= سوننەتیدەستنوێژ، جا لە گشت کاتێکدا ئەو سوننەتە دروستەو هەم بە نوێژێکیتریش ئەو سوننەتە پێك دێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ عثمانﷺ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهﷺ يَقُولُ: لاَيَتَوَضَّأُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ فَيُصَلِّى صَلاَةً إِلاَّ غَفَرَاللهُ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلاَةِ الَّتِي تَلِيهَا﴾ رواه الشيخان، هەر مرۆڤێکی موسڵمان دەستنوێژێکی پوختەو تەواو بگرێ، ئینجا نوێژێك بکا، خوایگەورە دەیبوورێ: لە تاوانە بچوکەکانی نێوان دەستنوێژەکەو نوێژێکیتر: کە لە دوای ئەو نوێژە دادێ.

﴿ پاشکۆ: لە باسی چەند ڕەووشتێکی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام ﴾

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشاقُ الْماءِ، وَقَصُّ الْأَظْفارِ، وَغَسْلُ الْبَراجِمِ، وَنَتْفُ الإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعانَةِ، وَانْتِقاصُ الْماءِ، قال مُصعَب: وَنَسِيتُ الْعاشِرَةَ: إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ﴾ رواه مسلم، دە ڕەووشتی پاك لە ڕێبازیپێغەمبەرانن عليهم الصلاة والسلام: سمێڵ کورتکردن، ڕیش هێشتنەوە، سیواك کردن، ئاو لە لووت وەرکردن، نینۆك قرتاندن، شۆردنی لۆچی پەنجەکان، دەرهێنانی مووی بن هەنگڵ، بەر تاشین، تارەتکردن بە ئاو، (مصعب) دەفەرموێ: دەیەمم لەبیر چۆتەوە، مەگەر ئاو لە دەم وەرکردن بێ. لە (شرح مسلم)دا دەفەرموێ: دەشگونجێ سوننەتکردن بێ.

ئینجا بزانە: سیواكو ئاو لە دەمو لووت وەرکردنو تارەتکردن، گشتیان لە مەوپێش ڕوون کرانەوە —والحمد لله تعالى—، سوننەتکردن لە (کتاب الصِّيال)دا، ئەوانەیتریش لێرەدا ڕوون دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

*نینۆك قرتاندن: لەم سوننەتەدا پیاو و ئافرەت یەکسانن، ئیمامی(الشافعی) فەرموویەتی: نینۆك قرتاندنو ئەو موو لابردنە، لە ڕۆژی هەینیدا سوننەتن، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

هەروەها لە (المجموع)و (شرح مسلم)دا فەرموویەتی: سوننەتە لە پەنجەی شادەی دەستی ڕاستەیەوە دەست پێبکاو بەرەو لای قلیجە (واتە پەنجەی هەرە بچکۆڵە)، ئینجا بێتەوە سەر پەنجە گەورەکە، ئینجا دەست بە قلیجەی دەستی چەپە بکا تا کۆتایی،

ئینجا قلیجەی پیّی ڕاستەی تا کۆتایی، ئینجا پەنجە گەورەکەی قاچی چەپە تا کۆتایی، ئینجا پێویستە یەکسەر شوێنی نینۆکە قرتاوەکان بشۆریّ، چونکە ئەگەر خۆی پیّبخورێنیّ مەترسی بەڵەکبوونی لیّدەکریّ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

*دەرهێنانی مووی بن هەنگڵ: لەم سوننەتەشدا پیاو و ئافرەت یەکسانن‌و سوننەتە لە ڕاستەوە دەست پیّبکریّ‌و مووەکان دەربهێنن، بەڵام ئەگەر بیتاشن، یان بە دەرمان لایببەن، سوننەتەکە هەر دەست دەکەویّ، هەروەك لە (شرح مسلم) و (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

*بەر تاشین: لەم سوننەتەدا پیاو و ئافرەت یەکسانن، بەڵام ئەگەر مێرد داوا لە ژنەکەی بکا مووی بەری لاببا، ئەو کاتە لە سەر ژنەکە واجب دەبیّ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، ئینجا سوننەتە پیاو مووی بەری‌خۆی بتاشیّ‌و ئافرەتیش دەری‌بهێنیّ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە، جا ئەگەر بە هەر ڕێگایەکی‌تر پیاو و ئافرەت مووەکانی‌بەریان لاببەن هەر دروستە، هەروەك لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی، بەڵام حەڕامیشە مرۆڤ بە کەسێکی‌تر بەری خۆی پاك بکاتەوە، مەگەر ژنی‌خۆی بیّ، ئەو کاتە حەڕام نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

*شۆردنی لۆچی پەنجەکان: پاککردنەوەی لۆچی پەنجەو کەلێنەکانی دەورەی نینۆك لە چڵك‌و چەوری، سوننەتێکی سەربەخۆیە بۆ پیاو و ئافرەت، تایبەت نیە بە دەستنوێژگرتن، هەروەك لە (المجموع)و (شرح مسلم)دا فەرموویانە.

*سمێڵ کورتکردن: سوننەتێکی زۆر گرنگە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویّ: ﴿مَنْ لَمْ يأخُذْ مِنْ شارِبِه فَلَيْسَ مِنّا﴾ رواه الترمذي وقال حسن صحيح، هەر کەسێك سمێڵی‌خۆی کورت نەکا، لە ئێمە نیە، واتە: لە سەر ڕەووشتی ئێمە نیە. ئینجا بزانە: لە (المجموع)دا دەفەرمویّ: سوننەتە ئەوەندە سمێڵەکانی کورت بکا: تا ڕۆخی لێوی دەردەکەویّ. ئیمام (مالك) دەفەرمویّ: سمێڵ تاشین بیدعەیەکە لە ناوخەڵکی‌دا پەیدا بووە.

ئینجا بزانە: (أنس)ﷺ دەفەرمویّ: ﴿وُقِّتَ لَنا فِي قَصِّ الشّارِبِ وَتَقْلِيمِ الأظْفارِ وَنَتْفِ الإبْطِ وَحَلْقِ العانَةِ: ألاّ نَتْرُكَ أكْثَرَ مِنْ أرْبَعِينَ لَيْلَةً﴾ رواه مسلم، لە پێغەمبەرەوەﷺ کاتمان بۆ داندراوە: بۆ سمێڵ کورتکردن‌و نینۆك قرتاندن‌و بن هەنگڵ پاککردنەوەو بەر تاشین، لە چل شەو تێنەپەڕیّ. کەواتە: لە چل ڕۆژ کەمتریش هەر کاتێك ئەوانە درێژ بون دەبی لایانببەین، ئینجا سوننەتە: نینۆك و مووەکان لە ژێرخاکدا بشاردرێنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

*ڕیش هێشتنەوە سوننەتەو ڕەووشتی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام، دەرهێنان‌و تاشینی ناپەسندە، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە، بەلام دەققی فەرموودەی ئیمامی(شافعی) ئەوەیە: (تاشینی ڕیش حەڕامە). هەروەك لە (الشروانی)و (إعانة)دا گێڕاویەتیانەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿خالِفُوا الْمُشْرِكِينَ: وَفِّرُوااللِّحى وَأَحْفُواالشَّوارِبَ﴾ رواه الشيخان، خۆتان لە کافران جیا بکەنەوە: ڕیشتان بهێڵنەوەو سمێڵەکانتان کورت بکەن.

جا بزانە: ناپەسندە لە کاتی سەر تاشیندا مووی بسکەکانی بهێڵێتەوە تاکو ڕیشی زیاد ببێ، ناپەسندە مووی گێسووەکانی لەگەڵ سەرتاشیندا بتاشێ، ناپەسندە تەنیشتەکانی مووی لێوی‌خوارەوە هەڵبکەنێ، جگە لەمانەش-واتە: وەك مووەکانی سەر کولمەکان- بەلام ئیمام (احمد) دەفەرموێ: لابردنی مووەکانی لای‌گەرووی ناپەسند نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: سەر تاشین حەلالە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەلام ئەگەر چڵکن بوو و پێی خزمەت نەدەکرا، ئەو کاتە سوننەتە بیتاشێ، هەروەك لە (تحفة)و(مغنی)دا فەرموویانە، بە تایبەتیش ئەگەر چڵکنیەکە بە هۆی ماتەمینی بێ ﴿عن عبدالله بن جعفر رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَمْهَلَ آلَ جَعْفَرَ ثَلاثاً، ثُمَّ أَتاهُمْ فَقالَ: لاتَبْكُوا عَلىأَخي بَعْدَالْيَوْمِ، ثُمَّ قالَ: اُدْعُوا لِي بَنِيأَخِي، فَجِيءَ بِنا، فَقالَ: اُدْعُوا لِيالْحَلاّقَ، فَأَمَرَهُ فَحَلَّقَ رُؤُوسَنا﴾ رواه أبوداود باسناد صحيح، لە دوای شەهیدبوونی حەزرەتی(جعفر)، پێغەمبەرﷺ چووە لای منداڵەکانی‌و فەرمووی: لەم ڕۆ بەو لاوە هیچی‌تر لە سەر برام-(جعفر)- مەگریێن، ئینجا فەرمووی: کوڕەکانی برامم بۆ بانگ بکەن، جا ئێمەیان هێنا، ئینجا فەرمووی: سەرتاشم بۆ بانگ بکەن، ئینجا فەرمانی پێ‌کرد سەری ئێمەی تاشی. واتە: چونکە منداڵەکان بە هۆی ماتەمینی‌باوکیان تۆزاوی‌و داماو بوون.

بەلام (الْقَزَع) واتە: تاشینی‌بەشێکی‌سەرو هێشتنەوەی‌بەشێك ناپەسندە، چونکە پێغەمبەرﷺ منداڵێکی بینی بەشێکی‌سەری تاشراوەو بەشێکیش نا، جا فەرمووی: ﴿احْلِقُوهُ كُلَّهُ أَوِ اتْرُكُوهُ كُلَّهُ﴾ رواه ابوداود بسند صحیح، یان هەموو سەری بتاشن، یان هیچی مەتاشن.

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: سەرتاشین بۆ ئافرەت-بە بێ‌عوزر- حەڕامە، هەروەك لە (ارشاد الساری)دا فەرموویەتی، بەلام لە فەرموودە ڕاستترەکەی سەرچاوەکانماندا بە ناپەسند داندراوە، تەنها بۆ پێویستیەکی وەك دەرمانکردن نەبێ.

ئینجا بزانە: دروستە ئافرەت مووی سەری‌خۆی کورت بکاتەوە، تاکو ئەرکی سووک ببێ ﴿عن أبي‌سلمةﷺ قال: كانَ أَزْواجُ النَّبِيِّﷺ يأخُذْنَ مِنْ رُؤُوسِهِنَّ حَتَّى تَكُونَ كَالْوَفْرَةِ﴾ رواه مسلم، ژنەکانی پێغەمبەرﷺ مووی سەری‌خۆیان دەبڕی تا دەگەیشتە ئاستی گوێیەکانیان، یان لە شانیانی دەدا. لە (شرح مسلم)دا دەفەرموێ: لەمەدا بەڵگە هەیە کە دروستە: مووی سەری ئافرەت سووک بکرێ.

دووەم: حەرامە درێژکردنی مووی سەری ئافرەت، بە هۆی پێوەلکاندنی مووی ئافرەتێکی‌تر ﴿عن عائشة رضي‌الله عنها: أَنَّ جارِيَةً مِنَ الأَنْصارِ تَزَوَّجَتْ وَأَنَّها مَرِضَتْ فَتَمَعَّطَ شَعَرُها، فَأَرادُوا أَنْ يَصِلُوها، فَسَأَلُوا النَّبِيَّﷺ؟ فَقالَ: لَعَنَ اللهُ الْواصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ﴾ رواه الشيخان، کیژێکی (انصار)یەکان شووی کردو نەخۆش کەوت، جا بە هۆی نەخۆشیەکە مووی سەری هەڵوەری‌و ویستیان مووی ئافرەتێکی‌تری بە سەریەوە بنێن‌و لە پێغەمبەریانﷺ پرسی؟ ئەویش فەرمووی: لەعنەتی خوا لەو ئافرەتە بێ: کە مووی ئافرەتێك بە سەری ئافرەتێکی‌ترەوە دەنێ‌و لەعنەتیش لەو ئافرەتە بێ: کە داوا دەکا مووی ئافرەتێکی‌تری بە سەریەوە بندرێ.

سێیەم: باریککردنی برۆ حەرامە ﴿عن عبداللهﷺ لَعَنَ اللهُ الْواشِماتِ وَالْمُسْتَوْشِماتِ وَالنّامِصاتِ وَالْمُتَنَمِّصاتِ وَالْمُتَفَلِّجاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّراتِ لِخَلْقِ اللهِ، وقال: مالِيَ لا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ رَسُولُ اللهِﷺ﴾ رواه الشيخان، لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانە بێ: کە خاڵ لە ئەندامی‌خەڵکی دروست دەکەن، لەعنەتیش لەو ئافرەتانە بێ: کە داوای ئەو کارە دەکەن، لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانە بێ: کە مووی برۆ و دەورەی ڕوخسار دەردێنن، لەعنەت لەو ئافرەتانەش بێ: کە داوای ئەو کارە دەکەن، لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانە بێ: کە بۆ جوانی نێوان ددانەکانیان دەڕنن‌و دروستکراوی خوا دەگۆڕن، ئینجا فەرمووی: چۆن لەعنەت لەوکەسانە نەکەم: کە پێغەمبەرﷺ لەعنەتی لێکردوون.

جا ئەگەر هاتو: ددان ڕنین بۆ جوانی نەبو، بەڵکو بۆ چارەسەری ددانەکان بوو، ئەو کاتە دروستە، هەروەها ئەگەر ئافرەت ڕیش، یان سمێڵی هەبو، سوننەتە بیانتاشێ، هەروەك لە (شرح مسلم)و سەرچاوەکانمادا فەرموویانە، هەروەها دروستە: ژن –بۆ مێردی‌خۆی– بە ئیزنی مێردەکەی برۆی خۆی‌و ڕوخساری جوان بکا، هەر وەك لە (نهاية)و (مغنی) لە مەرجەکانی نوێژدا ڕوونیان کردۆتەوە. جا بزانە: دروستکردنی خاڵ، لە (مەرجەکانی نوێژ)دا ڕوون دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ كانَ لَهُ شَعَرٌ فَلْيُكْرِمْهُ﴾ رواه ابوداود باسناد حسن، هەر کەسێك مووی هەبو، دەبی ڕێز لە مووەکانی بنێ. کەواتە: جار جارە سوننەتە مووەکانی شانە بکاو چەوریان بکا ﴿عن عبدالله بن مغفلﷺ: نَهى رَسولُ اللهﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إلاّغِبّاً﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: موو شانە بکرێ تەنها جار جارە نەبێ.

هەروەها بۆ پیاو و ئافرەت سوننەتە مووی سپی ڕەنگ بکەن: بە سوور، یان بە زەرد، بەو مەرجەی لەو جۆرە سبوغە نەبێ: ڕێگەی ئاو بگرێ، ئەگینا: دەستنوێژو غوسل دروست نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا بەمەرج داندراوەو لە مەرجەکانی دەستنوێژو غوسلدا ڕوونمان کردەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّ أَحْسَنَ ما غُيِّرَ بِهِ هذاالشَّيْبُ اَلْحِنّاءُ وَاْلكَتَمُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، جوانترین ڕەنگ: کە ئەو مووە سپیەی پێ بگۆڕدرێ: خەنەو کەتەمە. واتە: کە تێکەڵ کران ڕەنگی قاوەیی دەدەن.

بەڵام ڕەنگکردنی موو بە ڕەنگی ڕەش بۆ پیاو و بۆ ئافرەت حەرامە، تەنها بۆ (جهاد)کردن نەبێ، هەروەك لە (شرح مسلم)و سەر چاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن جابرﷺ: أُتِيَ بأَبِيقُحافَةَ والد أَبِيبكررضي الله عنهما يَوْمَ الْفَتْحِ وَرَأْسُهُ وَلحْيَتُهُ كَالثَّغامَةِ بَياضاً فَقال النَّبِيُّﷺ: غَيِّرُوا هَذا وَاجْتَنِبُواالسَّوادَ﴾ رواه مسلم، لە (فَتْح)ی (مَكَّة)دا باوکی ئیمامی (ابوبکر)یان هێنا سەرو ڕیشی وەکو کڵۆکی‌سپی بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم مووە سپیانە بە ڕەنگێك بگۆڕن‌و خۆتان لە ڕەنگی ڕەش بپارێزن.

بەڵام دروستە: ژن بە ئیزنی مێردەکەی مووی‌خۆی بە ڕەنگی ڕەش ڕنگ بکا، هەروەك ئیمامی (الرملی) لە (شرح الزبد)دا فەرموویەتی.

هەروەها دەست‌و پێ ڕەنگکردن بە خەنە، بۆ پیاوان حەرامە تەنها بۆ دەرمانکردن نەبێ، بەڵام بۆ ئافرەتان سوننەتە، هەروەك لە زۆربەی‌سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن عائشةرضي الله عنها: أَوْ مَأَتْ امْرَأَةٌ من وَراءِ سِتْرٍ بِيَدِها كِتابٌ إلىالنَّبِيِّﷺ فَقَبَضَ يَدَهُ فَقال: ما أَدْرِي أَيَدُ رَجُلٍ أَمْ يَدُ امْرأَةٍ؟ قالَتْ: بَلْ يَدُ امْرَأَةٍ، قال: لَوْ كُنْتِ امْرأَةً لغَيَّرْتِ أَظْفارَكِ بالْحِنّاءِ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، ئافرەتێك نووسراوێکی لە دەست بوو، لە پشت پەردەوە دەستی درێژ کرد بیداتە پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریش دەستی خۆی نوقاندو وەری‌نەگرت‌و فەرمووی: نازانم ئایا دەستی پیاوە، یان هی ئافرەتە؟ ئافرەتەکەش گوتی: بەڵکو دەستی ئافرەتە. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەگەر ئافرەت بی، دەبوایە ڕەنگی نینۆکەکانت بە خەنە بگۆڕی. بەڵام جگە لە خەنە سبوغکردنی نینۆك دروست نیە؟ چونکە ڕێگەی ئاو دەگرێ‌و غوسل‌و دەستنوێژی دروست نابێ.

## (بابُ مَسْحِ الْخُفِّ)

يَجُوزُ فِي الْوُضُوءِ لِلْمُقِيمِ يَوْماً وَلَيْلَةً وَلِلْمُسَافِرِ ثَلاثَةً بِلَيَالِيهَا مِنَ الْحَدَثِ بَعْدَ لُبْسٍ، فَإِنْ مَسَحَ حَضَراً ثُمَّ سَافَرَ أَوْ عَكَسَ لَمْ يَسْتَوْفِ مُدَّةَ سَفَرٍ،

---

### ﴿ بابُ مَسْحِ الْخُفِّ: باسی مەسحکردنی خوف ﴾

**پێناسەی خوف:** جووتە گۆرەویەکە لە چەرم، یان لە شتێکیتر دروست دەکریو ناوی تیناچی. (یَجُوزُ) دروستە: مەسحکردنی خوف لە جیاتی پێ شۆردن (فِی الْوُضُوءِ) لە دەستنوێژدا، واتە: لە غوسل کردندا دروست نیە (لِلْمُقِيمِ) بۆ نیشتەجێ، واتە: ئەو کەسەی لەماڵەوەیە، یان لە سەفەرێکی وەهایە: کە (قَصْر)-کورتکردنەوەی‌نوێژی بۆ دروست نیە (یَوْماً وَلَیْلَةً) ڕۆژێكو شەوێکی بۆ دروستە: مەسحی خوف بکا.

(وَلِلْمُسافِرِ) بۆ ئەو ڕێبوارەش: کە (قَصْر)ی بۆ دروستە (ثَلاثَةً بِلَیالِیها) سێ ڕۆژو سێ شەوی بە دوای‌یەکدا بۆی دروستە: مەسحی خوف بکا، واتە: بەو مەرجەی لە سەفەرەکەی‌دا نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژان نەهێنێ-هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی- دووریەکەشی لە (٨٠) هەشتا کیلۆمەتر کەمتر نەبێو سەفەری تاوانکاریش نەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن عَلِيٍّ -وَقَدْ سُئِلَ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ- فَقَالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْماً وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ﴾ رواه مسلم، ئیمامی(علی) دەربارەی مەسحی‌خوف، فەرمووی: پێغەمبەرﷺ سێ ڕۆژو سێ شەوی بۆ ڕێبوار داناوەو بۆ نیشتەجێش ڕۆژێكو شەوێکی داناوە.

(مِنَ الْحَدَثِ) ماوەی مەسحکردن-لە ماڵەوەو لە سەفەر- لە بێدەستنوێژیەوە دەست پێ دەکا (بَعْدَ لُبْسٍ) ئەو بێدەستنوێژیەی لە دوای دەبەرکردنی‌خوفەکان ڕوو دەدا، واتە: ئەگەر لە کاتژمێری‌چوار دەستنوێژی گرتو خوفەکانی دەبەر کردن، ئینجا لە کاتژمێری‌یازدە بێدەستنوێژ بوو، ئەوە ماوەکەی لە کاتژمێر یازدەوە دەست پێدەکا، واتە: ئەگەر مەسحیش نەکا ماوەکەی هەر لێدەڕوا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ مَسَحَ حَضَراً) جا ئەگەر لە دوای بێدەستنوێژی مەسحی‌خوفەکانی لە ماڵەوە کرد (ثُمَّ سافَرَ) ئینجا بۆ سەفەر ڕۆیشت (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانەوە: لە سەفەردا مەسحی خوفی کرد، ئینجا گەیشتەوە ماڵی‌خۆی، یان هەر لە سەفەردا نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژی هێنا -هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی- ئەوە (لَمْ یَسْتَوْفِ مُدَّةَ سَفَرٍ) لەو دوو مەسەلەدا نابێ ماوەی سەفەر تەواو بکا، بەڵکو تەنها شەو و ڕۆژێکی بۆ دروستە.

هەروەها ئەگەر سەفەرەکەش سەفەری تاوانکاری بوو: وەك بۆ دزی، یان ڕێگریو ئەو جۆرە شتانە بە سەفەر بچێ، یان سەفەرەکەی لە (٨٠)کیلۆمەتر کەمتر بێ، ئەوەش تەنها

وَشَرْطُهُ أَنْ يُلْبَسَ بَعْدَ كَمَالِ طُهْرٍ سَاتِراً مَحَلَّ فَرْضِه طَاهِراً يُمْكِنُ تبَاعُ الْمَشْيِ فِيهِ لِتَرَدُّدِ مُسَافِرٍ لِحَاجَاتِه، قِيلَ وَحَلَالاً، وَلاَيُجْزِئُ مَنْسُوجٌ لاَيَمْنَعُ مَاءً فِي الأَصَحِّ،

---

شەو و ڕۆژێکی بۆ دروستەو ماوەی سەفەری بۆ دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. ئینجا بزانە: لە دەستنوێژدا پێ شۆردن خێری زیاترە لە مەسحیخوف، چونکە پێغەمبەرﷺ لە زۆربەی کاتەکانیدا پێی شۆردوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، واتە: جار جارە مەسحیخوفی کردوە.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی مەسح لە سەر خوف، ئەمانەن: یەکەم: (أَنْ يُلْبَسَ بَعْدَ كَمالِ طُهْرٍ) جووتە خوفەکە دەبەر بکرێن لە دوای تەواوبوونی دەستنوێژو غوسل، واتە: ئەگەر پێیەکی شۆردو خوفەکەی دەبەر کرد، ئینجا پێیەکەیتریشی شۆرد، ئەوە مەسحکردنیان دروست نیە، بەڵکو واجبە هەردوو پێیەکان بشۆرێن ئینجا خوفەکان دەبەر بکرێن، هەروەها ئەگەر لە غوسل کردنیشدا ئەندامێکی نەشۆرابێ، هەر دروست نیە خوفەکان بۆ مەسحکردن دەبەر بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿...إِذا تَطَهَّرَ فَلَبِسَ خُفَّيْهِ أَنْ يَمْسَحَ عَلَيْهِما﴾ صححه ابن خزيمة والخطابي، هەر کاتێك دەستنوێژی گرت، ئینجا جووتە خوفەکەی دەبەر کردن، دروستە: مەسحیان بکا.

دووەم: (ساتِراً مَحَلَّ فَرْضِهِ) جووتە خوفەکە داپۆشەری شوێنی واجبیدەستنوێژ بن، واتە: پێیەکان بە گوزینگەوە داپۆشن. سێیەم: (طاهِراً) خوفەکان پاك بن، واتە پیس نەبوبنو لە شتێکی پیسیش دروست نەکرابن: وەك پێستەی مرداری دەباغنەکراو.

چوارەم: (يُمْكِنُ تِبَاعُ الْمَشْيِ فِيهِ) بگونجێ: بە بێپێڵاوی بە دوایەکدا لە سەریان بڕوا (لِتَرَدُّدِ مُسافِرٍ) بۆ هاتوچۆی ڕێبوار (لِحاجاتِهِ) بۆ پێویستیەکانی خۆی لە کاتی دابەزینو بارکردندا (قِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا، بە مەرج داندراوە: (وَحَلالاً) خوفەکان حەڵاڵ بن، واتە: دزراو و داگیرکراو و زێڕو زیو و ئارموش نەبن.

ئینجا بزانە: مەرجێکیتریش ئەوەیە: هەردوو پێیەکان خوفیان دەبەر بکرێ، واتە: دروست نیە پێیەکی بشورێو پێیەکەیتریش لە سەر خوف مەسح بکا، بەڵام ئەگەر تەنها یەك پێی هەبو، ئەو کاتە مەسحی بۆ دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَلا يُجْزِئُ مَنْسُوجٌ) مەسحکردن لە سەر خوفێکی چنراو دروست نیە (لا يَمْنَعُ ماءً) کە لەو جۆرە بێ: ڕێگەی ئاو نەگرێ، واتە: کە ئاوی بە سەردا بکرێ، ئاوەکەی تێبچێتە سەر پێیەکانی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا، کەوابو: ئەگەر ئاوی تێنەدەچو: وەك موشەممای خێمەو چادر، ئەوە مەسحکردنی دروستە، هەروەك لە (تحفة) وەردەگیرێ.

هەروەهاش ئەگەر لە شوێنی دروماندا ئاوی تێدەچو زیانی نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ جُرْمُوقَان فِي الأَظْهَرِ، وَيَجُوزُ مَشْقُوقُ قَدَمٍ شُدَّ فِي الأَصَحِّ، وَيُسَنُّ مَسْحُ أَعْلاَهُ وَأَسْفَلِهِ خُطُوطاً، وَيَكْفِي مُسَمَّى مَسْحٍ يُحَاذِي الْفَرْضَ إِلاَّ أَسْفَلَ الرِّجْلِ وَعَقِبَهَا فَلاَ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

بەلام ئەگەر ئەوەندە تەنك بوو: تەڕایەتی مەسحکردن دەگەیشتە پێی، ئەوە هەر دروست نیە، هەروەك لە (شرح المَحِلي)دا فەرمویەتی.

ئینجا بزانە: لێرەدا بۆمان دەرکەوت مەرجی دروستبوونی مەسح لە سەر گۆرەوی -لەگەڵ مەرجەکانی ڕابردووش- ئەوەیە: ئەوەندە ئەستوور بێ: ئەگەر ئاوی بە سەردا بکرێ، ئاوەکە نەچێتە خوارەوە بۆ سەر پێیەکانی، هەروەك لە (المجموع)شدا ڕوونی کردۆتەوە ﴿عن المغيرة ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ﴾ رواه اصحاب السنن وصححه الترمذی ﴿وقال سفيان الثوري وابن المبارك والشافعي وأحمد وإسحاق: يُمْسَحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ إِذَا كَانَا ثَخِينَيْنِ﴾ رواه الترمذی، پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی گرت و لە سەر گۆرەوییەکەو نەعلەکانی مەسحی کرد لە جیاتی پێ شۆردن، واتە: نەعلەکانی دانەکەناندن، چونکە پشتەپێیەکانی بە دەرەوە بوو.

ئەو پێنج ئیمامانەش دەفەرموون: بەو مەرجە مەسح لە سەر جووتە گۆرەوی دروستە: ئەگەر ئەستوور بن. واتە: گۆرەویەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەستوور بون و ئاویان تێنەدەچو، چونکە یان لە تووکی ووشتر، یان مووی بزن، یان خوریی مەڕ دروست دەکران، والله أعلم.

(وَلا جُرْمُوقَانِ) مەسحکردن لە سەر ئەو خوفەی لە سەر خوفێکیترە دروست نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەواتە: دەبی خوفی لای بنەوە مەسح بکرێ (وَيَجُوزُ مَشْقُوقُ قَدَمٍ) دروستە: مەسحکردن لە سەر خوفی قلێشاو، بەو مەرجەی (شُدَّ) قلێشەکە لێك درابێتەوە بە هۆی قەیتان، یان داوێکیتر، بە جۆرێکی وەها: پێی لە ناودا دەرنەکەوێ لە کاتی ڕۆیشتندا (فِي الأَصَحِّ) لەفەرموودەی ڕاستردا، کەواتە: خوفی دورایەوەش بەو مەرجە دروستە.

(وَيُسَنُّ مَسْحُ أَعْلاهُ وَأَسْفَلِهِ) سوننەتە: لای پشتەپێ و لای بەرەپێی خوفەکان مەسح بکرێ (خُطُوطاً) بە چەند خەتێکی پەنجەکانی، واتە: بەرەدەستی چەپەی لە ژێر پاشنەی دابنێ و هی ڕاستەش لە سەر پشتی پەنجەکانی، ئینجا پەنجەی دەستەکانیشی لێك بکاتەوەو دەستە ڕاستەکەی بەرەو لولە قاچی بهێنێ و چەپەکەشی بەرەو پەنجەکانی.

(وَيَكْفِي مُسَمَّى مَسْحٍ) بۆ دروستبوونی مەسح، ئەوەندە مەسحکردنە بەسە: کە (يُحَاذِي الْفَرْضَ) لە لای دەرەوە بێ و بەرامبەر ئەو بەشە پێیە بێ، کە واجبە لە دەستنوێژدا بشۆرێ (إِلاَّ أَسْفَلَ الرِّجْلِ وَعَقِبَهَا) تەنها بنەوەی پێ و پاشنەی پێ نەبێ (فَلا عَلَى الْمَذْهَبِ) ئەو دوو بەشە بە تەنها بەس نیە، لە سەر فەرموودەی ڕاستیمەزهەب.

قُــلْتُ: حَرْفُهُ كَأَسْفَلِه وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلاَ مَــسْحَ لِشَاكٍّ فِي بَقَاءِ الْمُدَّةِ، فَإِنْ أَجْنَبَ وَجَبَ تَجْدِيدُ لُبْسٍ، وَمَنْ نَزَعَ وَهُوَ بِطُهْرِالْمَسْحِ غَسَلَ قَدَمَيْهِ وَفِي قَوْلٍ يَتَوَضَّأُ.

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرمویٚ (حَرْفُهُ كَأَسْفَلِه وَاللهُ أَعْلَم) تەنیشتی پـێ وەكو بنـەوەی پـێیە، ئەویش بە تەنها بەس نیە، بەڵكو واجبەكە تەنها بە پشتە پێ پێك دێو بەشـەكانیتر سوننەتنو جێگەی واجب پـڕ ناكەنـەوە ﴿عَنْ عَلِيٍّ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَــانَ أَسْــفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلاهُ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْــهِ﴾ اخرجـه ابوداود باسناد حسن، ئەگـەر ئـایین بـە بـیرو بۆچـوون بووایـە، دەبـوا لـە مەسحكردندا لای بنەوەی خوف لەپێشتر بایە لە لای سەرەوەی- واتە: چونكە زۆرتر چڵكن دەبێ- بەراستی من پێغەمبەرم ﷺ بینی پشتە پـێی هەردوو خوفەكانی مەسح دەكرد.

ئینجا بزانە: شۆردنی خوف -لەجیاتی مەسحكردن- دروستە، بەڵام ناپەسندە، هـەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَا مَسْحَ) مەسحكردن دروست نیە (لِشاكٍّ فِي بَقاءِ الْمُدَّةِ) بۆ ئـەو كەسـەی گومانداره لـە ماوەی خوفەكاندا: ئایا ماوەی ماوە، یان نا؟ كەواتـە: دەبـی لـە دەسـتنوێژدا پـێیـەكانی بشۆری، ئینجا خوفەكان دەبەر بكاتەوە (فَإِنْ أَجْنَبَ) ئەگـەر مـرۆڤ جەنابـەتی بـە سـەردا هات، یان ئافرەت حەیز، یان زەیسانی تووش بوو (وَجَبَ تَجْدِيدُ لُبْسٍ) واجبـە: بـۆ غوسـل كردن خوفەكانی دابكەنێ، ئینجا لە دوای غوسل دەبەریان بكاتەوە، ئەگەر بیەوێ مەسح بكا ﴿عن صفوان بن عسال: كانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْمُرُنا إِذا كُنّا سَفْراً أَلاّ نَنْزِعَ خِفافَنا ثَلاثَةَ أَيّامٍ وَلَيالِيَهُنَّ إِلاّ مِنْ جَنابَــةٍ﴾ حـدیث صـحیح رواه الترمـذی وغـیره، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی پێدەكردین: لەو كاتەی لە سەفەر بین، سێ شـەو و سـێ ڕۆژان خۆفـەكانمان دانەكـەنێنن تەنها بە هۆی جەنابەت نەبێ. واتە: مەسحكردنی خوف لـە غوسـل كردنـدا دروسـت نیـە، بۆیێ فەرمانی بە داكەناندن كردوه.

(وَمَنْ نَزَعَ) هەركەسێك هەردوو خوفەكانی، یان هەر خوفێكی داكەناند، یان بـە بێویسـتی خۆی داكەنێندرا، یان كون بوو و پێی تێدا دەركەوت، یـان قـەیتانی بـڕوە، یـان مـاوەی تـەواو بـوو، یـان لـە پـێی دابـەزیو بەشـێكی پـێی دەركـەوت، بـە هـەر یـەكێك لەوانـە مەسحەكەی بەتاڵ دەبێتەوە (وَهُوَ) جا لەو كاتـەی مەسـحی بـەتاڵ بـڕوە (بِطُهْرِ الْمَسْحِ) دەستنوێژەكەی دەستنوێژی مەسحكردن بوو (غَسَلَ قَدَمَيْهِ) واجبـە: هـەردوو پـێیـەكانی بشۆرێتەوە، ئینجا خوف دەبەر بكاتەوە (وَفِي قَوْلٍ يَتَوَضَّأُ) لە فەرموودەیـەكی بێهێـزدا: دەبی دەستنوێژ بگرێتەوە، ئینجا بزانە: ئەگەر دەستنوێژەكەی دەستنوێژیمەسح نـەبو، بەڵكو دەستنوێژی پێ شۆردن بوو، واتە: لە دوای پێ شۆردن دەستنوێژەكەی نەشـكابو، بـەڵام خوفەكـەی داكەنانـد، ئـەوە پێویسـت ناكـا پـێیـەكانی بشـۆرێتەوە، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## (بابُ الْغُسْلِ)

مُوجِبُهُ: مَوْتٌ، وَحَيْضٌ، وَنِفَاسٌ وَكَذا وِلادَةٌ بِلاَ بَلَلٍ فِيالأَصَحِّ، وَجَنَابَةٌ بِدُخُولِ حَشَفَةٍ أَوْ قَدْرِهَا فَرْجاً،

---

### ﴿ بابُ الْغُسْلِ: باسی غوسل كردن ﴾

غوسل كردن: شۆردنی هەموو لەشە لە گەڵ نیەتهێنان (مُوجِبُهُ) ئەو شتانەی غوسل واجب دەكەن پێنجن، یەكەم: (مَوْتٌ) مردنی مرۆڤیموسڵمانە–جگە لە شەهید– هەروەك لە باسی مردوودا بە بەڵگەوە ڕوونی دەكەینەوە،ان شاء الله تعالی.

دووەم: (وَحَيْضٌ) پاكبوونەوەی ئافرەتە لە خوێنیحەیز. سێیەم: (وَنِفَاسٌ) پاكبوونەوەی ئافرەتە لە خوێنی پاش منداڵبوون، كە پێی دەگوترێ: زەیسانی، هەروەك لە باسی حەیز و نیفاسدا بە بەڵگەوە ڕوونیان دەكەینەوە، ان شاء الله تعالی.

(وكَذا) هەروەها چوارەمیش كە غوسل واجب دەكا: (وِلادَةٌ) منداڵ لێبوونە (بِلا بَلَلٍ) بە بێتەڕایەتی، واتە: هەرچەند خوێنیشی لە گەڵ نێتە دەرەوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە منداڵ لە (مَنِي)–تۆو دروست دەكرێو بە هاتنەدەرەوەی غوسل واجب دەبێ.

ئینجا بزانە: لەم منداڵ لێبوونەدا جیاوازی نیە: لە كاتی تەواوبوونیدا منداڵەكەی لێببێ، یان لە بەری هەڵكەنێو پێش تەواوبوونی لێیبێتە دەرەوە: جا زیندوو بێ، یان مردوو بێ، وێنەكراو بێ، یان لە كاتی پارچە خوێنیو پارچە گۆشتیدا بێتە دەرەوە، هەروەها جیاوازی نیە: لە كونی دامێنیەوە منداڵەكەی لێببێ، یان زگی هەڵبدڕێو لێیبێتە دەرەوە، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

پێنجەم: (وَجَنابَةٌ) جەنابەت بوونە، واتە: لەش پیسبوونی پیاو، یان ئافرەت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُوا﴾ ئەگەر بە جەنابەت بون خۆتان بشۆن.

ئینجا بزانە: جەنابەت= لەش پیسبوونی پیاو و ئافرەت بە یەكێك لەم دوو هۆیانەیە:

یەكەم: جیماع كردن (بِدُخُولِ حَشَفَةٍ) بە بردنە ژوورەوەی گۆی ئەندامی میزكردنی نێرینە (أَوْ قَدْرِها) یان ئەندازەی گۆیەكە–ئەگەر گۆیەكەی نەمابێ، یان نەیبێ– (فَرْجاً) بۆ ناو كونی پێشەوەی مێینە، یان كونی پشتەوەی نێرینە، یان مێینە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهاالأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَها فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ﴾ رواه مسلم، هەر كاتێك پیاو لە نێوان هەر چوار لێوی ئافرەت دانیشتو سەری هینەكەی بردە ژوورەوە، غوسل لە سەر هەردووكیان واجب دەبێ، هەر چەند (مَنِي)ش نێتە دەرەوە.

ئینجا بزانە: لەم غوسل واجببوونەدا، جیاوازی نیە ئەندامی نێرینەکە هی ئادەمیزاد بێ: جا مندالّ بێ، یان شێت بێ، یان هی ئاژەلّ بێ، دەماری هەلّساو بێ، یان پووچ و شەلەپەتە بێ، هی مردوو بێ، یان هی زیندوو بێ، ئەندامەکە بە ڕووتی تێبندرێ، یان شتێکی تێوەربگیرێ، بە ویستی خۆی بێ، یان نا، هەروەها کونی تێندراویش جیاوازی نیە: حەلالّ بێ، یان حەرام بێ، کونی پێشەوە بێ، یان کونی پشتەوە بێ، هیئاژەلّ بێ، یان هی ئادەمیزاد بێ، گەورە بێ، یان مندالّ بێ، یان شێت بێ، مردوو بێ، یان زیندوو بێ، بە ویستی خۆی بێ، یان زۆرلێکراو، یان خەوتوو بێ. بەلام لە هەردوو حالەتدا غوسل کردنی ئاژەلەکەو مردووەکە واجب نابێ، مندالەکەش بە جەنابەت دەبێ، واتە: سەرپەرشتکارەکەی فەرمانی غوسلکردنی پێدەکا، شێتەکەش هەر کاتێك هۆشی بوو، غوسل دەکا، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)دا ئەم دوو حالەتەی ڕوون کردوونەوە.

ئینجا بزانە: جگە لە تێنانی ئەندامی میزکردنی نێرینە، بە تێنانی هیچ شتێکیتر-دەناو کونی پیاو، یان ئافرەت- غوسل واجب نابێ، واتە: وەکو پەنجەو ئامێری دەرمانکردنو ئەو جۆرە شتانە، هەروەك لە (المجموع) وەردەگیرێ.

دووەم: (وَبِخُرُوجِ مَنِيٍّ) بە هاتنە دەرەوەی (مَنی)ی خۆی-واتە: عاشقاوی پیاو، یان ئافرەت- غوسل واجب دەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَاالْمَاءُ مِنَ الْمَاءِ﴾ رواه مسلم وغيره، غوسل کردن بە هۆی هاتنە دەرەوەی ئاو-(مَنی) واجب دەبێ. ئینجا جیاوازی نیە-(مَنی) کە هاتە دەرەوە- (مِنْ طَرِيقِهِ الْمُعْتَادِ) لە ڕێگەی عادەتیخۆی بێتە دەرەوە، واتە: بگاتە دەرەوەی ئەندامەکەی پیاو و دەرەوەی ئەندامەکەی کچ، یان ناو ئەندامەکەی بێوەژن: کە لە کاتی دانیشتنی لە سەر پێ بەدەر دەکەوێ، جیاوازی نیە، بە هۆی نەخۆشی بێتە دەرەوە، یان نا (وَغَيْرِهِ) یان لە کونێکیتری جگە لە ئەندامەکە بێتە دەرەوە: وەك کونێك لە ژێر پشتی پیاو، یان سینگی ئافرەت، بەو مەرجەش کونی ئەندامەکە گیراو بێو بە هۆی نەخۆشیش نەیەتە دەرەوە، ئەگینا: غوسل واجب ناکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لەم غوسل واجببوونەدا جیاوازی نیە هاتنە دەرەوەی (مَنی): بە ویستی خۆی بێ، یان نا، لە خەودا بێ، یان هەشیار بێ، بە دەستی خۆی بێ، یان بە دەستی کەسێکیتر بێ، بە دەستبازی بێ، یان بە تەماشاکردنو بیرکردنەوە بێ، ئەندامەکەی هەلّساو بێ، یان پووچ بێ، زۆر بێ، یان کەم بێ، هەر چەند نیو دلۆپەش بێ، شێت بێ، یان عاقلّ بێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

وَيُعْرَفُ بتَدَفُّقه أَوْ لَذَّة بخُرُوجه أَوْ رِيحِ عَجِينٍ رَطْباً أَوْ بَياضِ بَيْضٍ جَافّاً، فَإِنْ فُقِدَتِ الصِّفَاتُ فَلاَ غُسْلَ، وَالْمَرْأَةُ كَرَجُلٍ.

---

(وَيُعْرَفُ) به يەكێك لەم نيشانانە (مَنِي)ى پياو و ئافرەت دەناسرێ: يەكەم: (بِتَدَفُقِهِ) بە نەتر بێتە دەرەوە، واتە: جار لە دواى جار، هەرچەند ڕەحەتيش نەبێ. دووەم: (أَوْ لَذَّةٍ بخُرُوجِهِ) يان بە هاتنە دەرەوەى ڕەحەت ببێ، واتە: دڵخۆش ببێ ئينجا خاو ببێتەوە. سێيەم: (أَوْ رِيحِ عَجِينٍ) يان بۆنى هەويرى لێبێ (رَطْباً) لە كاتى تەڕيدا (أَوْ بَياضِ بَيْضٍ) يان بۆنى سپيلكى هێلكەى لێبێ (جافّاً) لە كاتى ووشكيدا، واتە: ئەگەر يەكێك لەو نيشانانە هەبو غوسل واجب دەبێ، هەر چەند (مَني)ش بە ڕەنگى خوێن بێتە دەرەوە، هەروەك لە (تحفة)و (ونهاية)دا فەرموويانە (فَإِنْ فُقِدَتِ الصِّفَاتُ) جا ئەگەر ئەو نيشانانە هيچيان نەبون (فَلا غُسْلَ) غوسل واجب نابێ.

(وَالْمَرْأَةُ كَرَجُلٍ) ئافرەتيش وەكو پياوە: بە يەكێك لەو دوو هۆيانەى ڕابردوو جەنابەتى دەبێو ئاوەكەشى بەو نيشانانە دەناسرێ ﴿عن أُمّ سَلَمة رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ أُمَّ سُلَيْم قالَتْ: يارَسُولَ الله هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذا احْتَلَمَتْ؟ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ نَعَمْ إِذا رَأَتِ الْماءَ﴾ رواه الشيخان، (أُمّ سُلَيْم) گوتى: ئەى پێغەمبەرىخوا ئەگەر ئافرەت لە خەوندا (إحتلام)ى بوو، واتە: جيماع كردنى لە خەوندا دى، ئايا غوسلى لە سەر واجبە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووى: بەڵێ، هەر كاتێك ديتى ئاوى هاتۆتە دەرەوە، واجبە غوسل بكا. كەواتە: ئەم حەديسە بەڵگەشە: ئەگەر پياو، يان ئافرەت جيماع كردنى لە خەوندا ديت، بەڵام ئاوى نەهاتە دەرەوە، غوسلى لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتى.

ئينجا بزانە: (امام الحرمين)و(الامام الغزالى) دەفەرموون: (مَني)ى ئافرەت تەنها بە ڕەحەتبوونو خاوبوونەوە دەناسرێ، ئيمامى(الرويانى)ش دەفەرموێ: بۆنى وەكو بۆنى (مني)ى پياوە، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)دا ڕوونى كردۆتەوە،

ئينجا بزانە: لە شەرعدا حەيزو نيفاسو جەنابەت، بە (بێدەستنوێژىگەورە)ش ناو دەبرێن.

﴿ئاگادارى﴾ يەكەم: ئەگەر لە دواى غوسل كردن، بەشێكىترى (مَني)ى لێهاتە دەرەوە، واجبە غوسلەكەى دووبارە بكاتەوە، جياوازى نيە: لە دواى ميزكردن (مني)ى بێتە دەرەوە، يان لە پێشدا بە بەڵگەى حەديسەكەى ﴿إِنَّما الْماءُ مِنَ الْماءِ﴾ى ڕابردوو، كەوابو: وا باشە لە پێش غوسل كردندا ميز بكا، تاكو (مني)ى ناو بۆڕيەكەى بێتە دەرەوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموويانە.

دووەم: ئەگەر پیاوێك جیماعی لە گەڵ ژنێكدا كردو هەردووكیان ڕحەت بون، ئینجا لە دوای غوسل كردن (مَني)ی پیاوەكە لە پێشەوەی ژنەكە هاتە دەرەوە، واجبە ژنەكە غوسلی خۆی دووبارە بكاتەوە، چونكە ئەو گومانە بەهێز دەبێ: كە ئاوەكەی خۆی تێكەڵی ئاوی پیاوەكە بووەو تازە دێتە دەرەوە، وەك ئاو هاتنی بە خەون-كە لە حەدیسەكەی (امّ سُلَیْم)دا باسمان كرد- بەڵام ئەگەر ئافرەتەكە ڕحەت نەبوبو، ئەوە نایەوێ غوسلەكەی دووبارە بكاتەوە، چونكە (مَني)یخۆی نیە، بەڵام دەستنوێژی دەشكێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

سێیەم: لە كاتی دەستبازی، یان دەمارهەڵسان، یان بیركردنەوە، چەند دڵۆپە ئاوێكی لیچو پەیتی سپی، یان زەرد، دێتە دەرەوە، پێی ڕحەت نابیو خاویش نابێتەوە، پێی دەگوترێ: (مَذْي)، زیاتر ئافرەتان ئەم ئاوەیان دێ؟ ئەم ئاوە غوسل واجب ناكا، بەڵام وەكو میز پیسەو دەستنوێژ دەشكێنیو بە هەر شوێنێكیش بكەوێ، واجبە ئەو شوێنەش بشۆرێ ﴿عَنْ عَلِيٍّ كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً فَأَمَرْتُ الْمِقْدادَ فَسَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ؟ فَقالَ: يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ﴾ رواه الشيخان، ئیمامی(علی) دەفەرموێ: من زۆر (مَذْي)م دەهات، بە (مقداد)م گوتو پرسیاری بۆم لە پێغەمبەرﷺ كرد؟ ئەویش فەرمووی: با ئەندامەكەی میزكردنی بشۆریو دەستنوێژیش بگرێتەوە.

هەروەها ئاوێكی لیڵو سپی وەك (مَني) لە كاتی میزكردن، یان هەڵگرتنی شتێكی گران دێتە دەرەوە، پێی دەگوترێ: (وَدْي) ئەویش وەكو (مَذْي) پیسەو غوسل واجب ناكا، بە بەڵگەی (اِجماع)، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

چوارەم: ئەگەر دیتی نوێن، یان جلەكەی (مَني)ی پێوەیەو نەشدەگونجا ئەو (مني)یە هی كەسێكی‌تر بێ، واجبە غوسل بكاو هەر نوێژێكیشی لە دوای ئەو (مني)هاتنە كردبێ، واجبە قەزای بكاتەوە، هەروەها ئەگەر كەوتە گومان: ئایا ئەوەی لێیهاتۆتە دەرەوە، (مَني)یە، یان (مَذي)یە، یان (وَدي)یە؟ ئەوە لێرەدا سەرپشكە: ئەگەر ویستی بە (مَني)ی دابنێو غوسل بكا، یان بە (مَذي)، یان بە (وَدي) دابنێو ئەو شوێنەی پێیكەوتوە بیشۆرێو دەستنوێژ بگرێ، هەروەك لە سەر چاوەكاندا ئەم دوومەسەلەیە ڕوون كراونەوە.

## ﴿ ئەو شتانەی بە هۆی جەنابەت حەرامن ﴾

(وَيَحْرُمُ بِها) حەرامە بە هۆی جەنابەت، پێنج شت: (ماحَرُمَ بِالْحَدَثِ) ئەو سێ شتانەی بە هۆی بێدەستنوێژی بچوك حەرام بونو بە بەڵگەوە ڕوونمان كردنەوە: وەك نوێژو تەوافو هەڵگرتنو دەست لێدانی قورئان، چونكە جەنابەتیش بێدەستنوێژیەكی گەورەیەو بەهێزتریشە.

وَالْمُكْثُ بِالْمَسْجِدِ لاَ عُبُورُهُ، وَالْقُرآنُ وَتَحِلُّ أَذْكَارُهُ لا بِقَصْدِ قُرْآنٍ.

چوارەم: (وَالْمُكْثُ فِي الْمَسْجِدِ) مانەوە لە مزگەوتدا حەرامە لە سەر جەنابەتدار، جیاوازی نیە: بە پێوە بێ، یان دابنیشێ، یان هاتوچۆ بکا (لاعُبُورُهُ) بەڵام تێپەڕبوون بە مزگەوتدا حەرام نیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا جُنُباً إلاّ عابِرِی سَبِیلٍ﴾ بە جەنابەتەوە مەچونە مزگەوت، تەنها بە تێپەربوونی ڕێگە نەبێ. هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنِّی لا أُحِلُّ الْمَسْجِدَ لِحائِضٍ وَلا جُنُبٍ﴾ رواه ابوداود وصححه ابن خزیمة، چوونە مزگەوت حەڵاڵ ناکەم: نە بۆ حەیزدارو نە بۆ جەنابەتدار.

ئینجا بزانە: مانەوە لە هەیوانو سەربانی مزگەوت وەکو مزگەوت حەرامە، هەروەك لە (نهایة)دا فەرموویەتی، جا ئەگەر لە مزگەوتدا جەنابەتی بوو، واجبە: یەکسەر بڕواتە دەرەوە، ئەگەر نەگونجا بڕواتە دەرەوە: بە هۆیترسێکی گیانی، یان ماڵیخۆی، یان دەرگە داخرابو، ئەو کاتە دروستە: بمێنێتەوە، بەڵام واجبە تەیەممومم بکا، نەك بە خۆڵێ مزگەوت– بەڵکو بەو تۆزەی هاتۆتە مزگەوت– هەروەك لە سەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

پێنجەم: (وَالْقُرآنُ) حەرامە لە سەر جەنابەتدار قوڕئانخوێندن، هەرچەند کەمیش بێ: وەك ووشەیەکی ئایەتێك ﴿عَنْ عَلِيٍّ﷛: کان رسولُ اللهِﷺ یُقْرِئُناالْقُرْآنَ مالَمْ یَکُنْ جُنُباً﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحیح، پێغەمبەرﷺ لە هەموو کاتێکدا قوڕئانی فێر دەکردین، تەنها لە کاتی جەنابەتدا نەبێ. ئینجا بزانە: خوێندنی قوڕئان تەنها بە زوبان حەرامە، بەو جۆرەی گوێی لە دەنگیخۆی ببێ، بەڵام بە دڵو بیرلێکردنەوەو بە تەماشاکردن حەرام نیە، هەروەك لەسەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَحِلُّ أذْكارُهُ) حەڵاڵە بۆ جەنابەتدار: دوعاو زیکرەکانی قوڕئان بڵێ، بە نیەتی دوعاو زیکر (لا بِقَصْدِ قُرْآنٍ) نەك بە مەبەستی قوڕئانخوێندن: وەك لە کاتی خواردنو خواردنەوەدا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِیمِ). یان لە کاتی سواربوونی وولاغ، یان ئۆتۆمبیل، یان فرۆکەدا بڵێ: (سُبْحانَ الَّذی سَخَّرَ لَنا هذا وَماکُنّا لَهُ مُقْرِنِینَ). یان لە کاتی بەلا بڵێ: (إنّا لِلّهِ وَإنّا إلَیْهِ راجِعُونَ). یان دوعایەکانیتری قوڕئان ﴿عن عائشةرَضِيالله عَنها: کانَ رَسُولُ اللهِﷺ یَذْکُرُاللهَ عَلی کُلِّ أحْیانِهِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لە هەموو کاتێکیدا زیکری خوای دەکرد. واتە: تەنها قوڕئانخوێندن نەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، تاکو ئەم حەدیسە دژایەتی نەکا لە گەڵ حەدیسەکەیڕابردوو.

ئینجا بزانە: ئامۆژگاریو چیرۆکەکانی قوڕئان–ئەگەر بە مەبەستی قوڕئانخوێندن نەبێ– دروستە: بگوترێن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئافرەتی زەیسانیو حەیزدارو منداڵلێبوو، لە حەرامیی ئەو پێنج شتانەدا لە گەڵ جەنابەتدار یەکسانو بەڵگەکانی جەنابەت بەڵگەی ئەوانەشە؟ چونکە

ئەوانەش بێدەستنوێژیی گەورەنەو لە جەنابەتیش بەهێزترن، هەروەك لە سەر چاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە. بەڵام لەمەزهەبی (حنفی)دا ئیمامی(الطحاوی)و ئیمامی(الكَرْخی) ڕێگەیان داوە: ئافرەتی حەیزدار دەرسی قورئان—ووشە لە دوای ووشە— بە قوتابی بڵێ، واتە: ووشەیەك بڵێ، ئینجا بوەستێ، یان قوتابی بە دوایدا بڵێتەوە، ئینجا دەست بە ووشەیەكیتر بكا، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: بۆ جەنابەتدارو حەیزدار وەها سوننەتە: نینۆكو موو و خوێنو هیچ بەشێكیتری لاشەیان لانەبەن، تا غوسل ئەكەن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

سێیەم: ئەگەر كافرێك موسڵمان بوو و لە كاتی كافریدا جەنابەت، یان حەیز، یان زەیسانی، یان منداڵبوونی بە سەردا هاتبو، ئەوە واجبە غوسل بكا، جا ئەگەر لە كاتی كافریدا غوسلیشی كردبێ، هەر واجبە دووبارەی بكاتەوە، چونكە غوسلەكەی دروست نەبوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوەو، لە مەرجەكانی دەستنوێژیشدا باسمان كرد.

چوارەم: هەر كاتێكی مرۆڤی جەنابەتدار ویستی پێش غوسل كردن بخەوێ، یان شتێك بخوا، یان بخواتەوە، سوننەتە ئەندامەكەیمیزكردنی بشۆریو دەستنوێژیش بگرێ ﴿عَنْ عائشة رضي الله عنها: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ إذا كانَ جُنُباً فأرادَ أنْ يأكُلَ أوْ يَنامَ تَوَضَّأَ وُضُوئَهُ للِصَّلاةِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ هەر كاتێك بە جەنابەت دەبو و ویستبای شتێك بخوا، یان بخەوێ، دەستنوێژێكی وەكو دەستنوێژی نوێژكردنی دەگرت.

ئینجا بزانە: ئەم شۆردنو ئەم دەستنوێژە بۆ ئافرەتی زەیسانیو حەیزداریش بۆ خەو و خواردنی پێش غوسل كردن سوننەتە، بەو مەرجەی كۆتایی خوێنیان هاتبێ، بەڵام ئەگەر خوێنەكەیان بەردەوام بوو، ئەو كاتە سوننەت نیە، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

پێنجەم: هەر كاتێك پیاوی جەنابەتدار ویستی جیماع بكا: لە گەڵ ژنی یەكەمجاریدا، یان لەگەڵ ژنێكیدیكەیدا، سوننەتە ئەندامەكەی بشۆریو دەستنوێژیش بگرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا أَتي أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرادَ أنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُما وُضُوءً﴾ رواه مسلم، زاد البيهقي: ﴿فإِنَّهُ أَنْشَطُ لِلْعَوْدِ﴾. هەر كاتێك یەكێكتان جیماعی كردو ویستی جیماعێكیتریش بكا، با دەستنوێژێك لە نێوانیاندا بگرێ، چونكە بەم دەستنوێژە گورجو گۆڵتر دەبێ.

ئینجا بزانە: لە ئاگاداریی چوارەمو پێنجەمدا بنچینەی سوننەتەكە بە شۆردنی ئەندامیمیزكردن پێك دێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، واتە: چونكە لە حەدیسی (بخاری)و (مسلم)دا فەرمانی پێكراوە.

**وَأَقَلُّهُ نِيَّةُ رَفْعِ جَنَابَةٍ أَوِ اسْتِبَاحَةِ مُفْتَقِرٍ إِلَيْهِ أَوْ أَدَاءِ فَرْضِ الْغُسْلِ، مَقْرُونَةً بِأَوَّلِ فَرْضٍ، وَتَعْمِيمُ شَعَرِهِ**

---

هەروەها ئەو حەدیسانەش بەڵگەنە: کە غوسل کردن یەکسەر واجب نیە، بەڵکو کە کاتی نوێژ هات لە سەری واجب دەبێ، هەروەك لە (شرح مسلم)دا ڕوونی کردۆتەوە.

## ﴿ چۆنیەتی غوسل کردن ﴾

(وَأَقَلُّهُ) لای کەمی غوسلیواجب –بە جەنابەتو حەیزو زەیسانیو منداڵلێبوون– دوو شتن: یەکەم: (نِيَّةُ رَفْعِ جَنابَةٍ) نیەتهێنانی لابردنی جەنابەتە بەدڵ، وەك بڵێ: (نَوَيْتُ رَفْعَ الْجَنابَةِ) نیەتم وەیە ئەم جەنابەتەم لادەبەم. جا ئەمەیان بۆ ئەو پیاوە، یان ئەو ئافرەتەیە: کە جەنابەتی لە سەر بێ، بەڵام ئەگەر غوسلی حەیز، یان زەیسانی بوو، واجبە بڵێ: نیەتم وەیە بێدەستنوێژیی حەیز، یان زەیسانی لادەبەم. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّماالأَعْمالُ بِالنِّيّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر کردەوەیەکی خوا پەرستی بێ، بە نیەتەوە نەبێ دانامەزرێ.

(أَوْ اسْتِباحَةَ مُفْتَقِرٍ إِلَيْهِ) یان نیەتی حەڵاڵکردنی شتێك بێنێ: کە پێویستی بە غوسل کردن هەبێ، وەك بڵێ: نیەتم وەیە نوێژ لە خۆم حەڵاڵ بکەم (أَوْ أداءِ فَرْضِ الْغُسْلِ) یان بڵێ: نیەتم وەیە فەرزی غوسل جێبەجێ دەکەم. یان نیەتم وەیە غوسلی واجب بەجێدێنم. یان نیەتم وەیە ئەم لەش پیسیەم لادەبەم، یان نیەتم وەیە ئەم بێنوێژیەم لادەبەم.

ئینجا بزانە: لە نیەتی حەڵاڵکردن بەم لایەوە: بۆ جەنابەتی پیاو و ئافرەتو بۆ حەیزو زەیسانیو منداڵلێبوون، هەر یەکێکیان بگوترێ دروستە، هەروەها ئەگەر پیاو هەردوو جۆرە جەنابەتی لە سەر بون، یان ئافرەت جەنابەتو حەیز، یان جەنابەتو زەیسانی لە سەر بون، ئەوە بۆ گشتیان تەنها یەك غوسلو یەك نیەت لەو نیەتانەیڕابردوو دروستەو بەسە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(مَقْرُونَةً بِأَوَّلِ فَرْضٍ) واجبە نیەتەکە لە گەڵ سەرەتای شۆردنی لەشدا بەرامبەر بێ، واتە: هەر بەشێکی لە پێش نیەتهێناندا شۆرابێ دروست نیەو واجبە دووبارە بیشۆرێتەوە، ئینجا بزانە: ئەگەر لە غوسل کردن لە جاری یەکەمدا پەڵەیەکی لاشەی نەشۆرا، بەڵام لە جاری دووەم، یان سێیەمدا شۆرا، ئەوە غوسلەکەی دروستە، هەروەها ئەگەر لە دوای غوسل کردنیش ئەو پەڵەیە بە نیەتی غوسل –بە تەنهاش– بشۆرێتەوە، دیسان غوسلەکەی دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا لە باسی دەستنوێژ ڕوونی کردۆتەوە، واتە: چونکە لە غوسل کردندا ڕیز دانەندراوە.

دووەم: (وَتَعْمِيمُ شَعَرِهِ) ئاو پێداکردنی دەرەوەو ناوەوەی گشت مووەکانیەتی، هەرچەند زۆریش پڕ بن ﴿عن عليٍّ﷛: عَنِ النَّبِيِّﷺ مَنْ تَرَكَ مَوْضِعَ شَعَرَةٍ مِنْ جَنابَةٍ لَمْ يَغْسِلْها فُعِلَ

بِهِ كَذا وَكَذا مِنَ النَّارِ﴾ صححه القرطبی والحافظ ابن حجرالعسقلانی فی‌التلخيص، لكن قيل: الصواب وقفه على عليّ‌ﷺ، هەر كەسێك شوێنی يەك دانە موو، لە جەنابەتدا نەشۆرێ، وەهاو وەهای لێدەكرێ لە ئاگری دۆزەخ.

كەوابو: ئەگەر پەلكە–واتە: كەزيەكانی ئافرەت– ئەوەندە توند بون: ئاو نەدەچووە ناوەوەيان، واجبە: بۆ غوسل كردن هەڵبوەشێندرێنەوە، بەلاّم ئەگەر شل بون‌و ئاويان دەگەيشتێ هەڵوەشاندنەوەيان واجب نيە، هەروەك لە سەر چاوەكاندا فەرموويانە ﴿عن أُمِّ سَلَمَةَ رضي‌الله عنها قُلْتُ: يارَسُولَ الله إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي، أَفَأَنْقُضُهُ لِلْحَيْضَةِ وَالْجَنابَةِ؟ قال: لا، إِنَّما يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِيَ عَلَى رَأْسِكِ ثَلاثَ حَثَيات ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْماءَ فَتَطْهُرِينَ﴾ رواه مسلم، (أُم سَلَمَة) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری‌خوا‌ﷺ من كەزیی سەری خۆم دەونم، ئايا بۆ غوسلی حەيزو جەنابەت هەڵيانبوەشێنم؟ پێغەمبەر‌ﷺ فەرمووی: نا، ئەوەندە بەسە: سێ مستە ئاو بە سەرت دا بكە، ئينجا ئاو بە سەر هەموو لەشت دا بكە لە بێ نوێژی پاك دەبيەوە. واتە: چونكە كەزيەكانی (ام سلمة) شل بون‌و ئاو دەچووە ناوەوەيان، هەروەك لە (المجموع)و (شرح مسلم)دا فەرموويەتی.

(وَبَشَرِهِ) هەروەها ئاو پێداكردنی هەموو پيستەی لەشيەتی، هەرچەند مووی زۆر پڕپشی پێوە بێ، يان كونی دوودەری تێدا بێ: وەك خەزێمی لووت‌و كونی گوارەی گوێ، ئەوانە گشتی واجبە بشۆرێن.

هەروەها واجبە ئاوەكە بگاتە ژێر نينۆك‌و ژێر چەرمی گۆی ئەندامی ميزكردن–ئەگەر سوننەت نەكراو بێ–، هەروەها ناو كونە گوێ: كە لە دەرەوەڕا ديارەو بن ئەنگوستيلەی بەو جۆرەی باسمان كرد لە دەستنوێژدا، هەروەها ناو پسانەوەو قلێشايی پێستەو بن هەنگڵ‌و ناو كەلێنی قينگ‌و ئەندامی ميزكردنی ئافرەت: كە لە كاتی دانيشتنی لە سەر پێ بەدەردەكەوێ‌و ناو لۆچەكانی‌تری لەش، هەروەك لە (المجموع)و(تحفة)دا ڕوونيان كردۆتەوە، واتە: بە بەڵگەی حەديسەكەی‌داهاتوو.

(وَلاتَجِبُ مَضْمَضَةٌ وَاسْتِنْشَاقٌ) واجب نيە لە غوسل كردندا ئاو لەدەم‌و لووتی وەر بكا، بەڵكو سوننەتە، پێغەمبەر‌ﷺ دەربارەی غوسلی جەنابەت فەرمووی: ﴿أَمّا أَنا فَيَكْفِيني أَنْ أَصُبَّ عَلَى رَأْسِي ثَلاثاً ثُمَّ أُفِيضَ بَعْدَ ذَلِكَ عَلَى سائِرِ جَسَدِي﴾ رواه الامام احمد باسناده الصحيح، من لە غوسلی جەنابەتدا سێ جار ئاو بەسەرم دا دەكەم، ئينجا بە هەموو لاشەم دا دەكەم‌و ئەوەندەم بەسە. كەواتە: ئەوەی‌ڕابردوو، لای كەمی غوسل بوو.

(وَأَكْمَلُهُ) تەواوترينی غوسل بە سوننەتەوە، ئەوەيە بڵێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيمِ)و نيەت بێنێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتی.

إزالَةُ الْقَذَرِ ثُمَّ الْوُضُوءُ-وَفِي قَوْلٍ يُؤَخِّرُ غسْلَ قَدَمَيْه- ثُمَّ تَعَهُّدُ مَعَاطِفِه ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِه وَيُخَلِّلُهُ ثُمَّ شِقِّهِ الأَيْمَنِ ثُمَّ الأَيْسَرِ، وَيَدْلُكُ وَيُثَلِّثُ، وَتُتْبِعُ لِحَيْضٍ أَثَرِهِ مِسْكاً وَإلاَّ فَنَحْوَهُ،

---

ئینجا (ازالَةُ الْقَذَرِ) لادانی چڵکی سەر لاشەیەتی: جا پاك بێ، یان پیس، جا ئەگەر ئاوەکەی دەگۆڕی، یان بە یەکەمجار لانەدەچوو، ئەو کاتە واجبە لە پێشدا لای ببا، ئینجا غوسل بکا، هەروەك لە (تحفة)و (المجموع)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

(ثُمَّ الْوُضُوءُ) ئینجا دەستنوێژگرتن بە تەواوی وەکو دەستنوێژی‌نوێژ (وَفِي قَوْلٍ يُؤَخِّرُ غَسْلَ قَدَمَيْهِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: شۆردنی پێیەکانی لە دەستنوێژی‌غوسلدا دوا دێخی تا غوسلی تەواو دەبێ، ئەو کاتە دەیانشۆرێ (ثُمَّ تَعَهُّدُ مَعَاطِفِهِ) ئینجا ئاو پێداکردنی لۆچ‌و کەلێنی لەشی: وەکو ناوك‌و قونکەچاو و کونە گوێ‌و لۆچی زگ‌و عەوڕەتی‌و ئەو شوێنانەی بە زەحمەت ئاویان دەگاتێ (ثُمَّ يُفِيضُ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ) ئینجا ئاو بە سەر سەری دا دەکا (وَيُخَلِّلُهُ) پەنجەکانی لە ناو مووی سەری وەردەدا (ثُمَّ شِقِّهِ الأَيْمَنِ) ئینجا لای ڕاستەی دەشۆرێ (ثُمَّ الأَيْسَرِ) ئینجا لای چەپەی دەشۆرێ‌و (وَيَدْلُكُ) دەستی‌تەڕ بە سەر لاشەی‌دا دەهێنێ تاکو باش تەڕ ببێ (وَيُثَلِّثُ) سێ جار ئاو بە خۆی دادەکا:

﴿عن عائشة رضي الله عنها: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ إذا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ، ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِه عَلَى شِمالِه فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوئَهُ لِلصَّلاةِ، ثُمَّ يَأْخُذُ الْماءَ فَيُدْخِلُ أَصابِعَهُ فِي أُصُولِ الشَّعَرِ حَتّى إذا رَأى قَدِاسْتَبْرَأَ حَفَنَ عَلَى رَأسِهِ ثَلاثَ حَفَناتٍ، ثُمَّ أَفاضَ عَلَى سائِرِ جَسَدِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك پێغەمبەرﷺ غوسلی جەنابەتی کردبا، یەکەمجار لەپە دەستەکانی دەشۆرد، ئینجا بە دەستی ڕاستەی ئاوی بە دەستی چەپەی‌دا دەکردو تارەتی دەکرد، ئینجا دەستنوێژی تەواوی دەگرت وەکو دەستنوێژی‌نوێژ، ئینجا ئاوی هەڵدەگرت‌و پەنجەکانی دەخستە ناو مووەکانی تا دەیزانی لە گەڵ پێستەدا ئاوی گەیشتۆتێ، ئینجا سێ مستە ئاوی بە سەری خۆی‌دا دەکرد، ئینجا ئاوی بە هەموو لاشەی خۆی‌دا دەکرد، ئینجا پێیەکانی دەشۆردن.

(وَتُتْبِعُ لِحَيْضٍ) سوننەتە: لە دوای غوسلی پاکبوونەوە لە حەیز، یان لە زەیسانی، ئافرەت دابنێتە (أَثَرِهِ) ناو کونی ئەندامی حەیز، هەر چەند بێمێردیش بێ (مِسْكاً) پارچە لۆکەیەك، یان پارچە پەڕۆیەك: کە میسکی لە ناو داندرابێ (وَإلاَّ) ئەگەر میسك نەگونجا (فَنَحْوَهُ) شتێکی‌تری بۆنخۆش بەو جۆرە دابنێتە ناو کونەکە، تاکو بۆنی خوێنەکە نەمێنێ، جا ئەگەر بۆنخۆشیش نەکا، با بە ئاو پوختە پاکی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر

وَلا يُسَنُّ تَجْدِيدُهُ بخلاَف الْوُضوء، وَيُسَنُّ أَن لاَ يَنقُصَ مَاءُ الْوُضوء عَنْ مُدّ وَالْغُسْلِ عَنْ صَاعٍ، وَلاَ حَدَّ لَهُ، وَمَنْ بِهِ نَجَسٌ يَغْسِلُهُ ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَلاَ تَكْفِي لَهُمَا غَسْلَةٌ، وَكَـذا فِي الْوُضُوءِ، قُلْتُ:

---

ئافرەتەکە کچ بوو، پێویستە ئاگاداری پەردەیکچێنیخۆی بێ؟ نەوەك لە کاتی بە جێهێنانی ئەم سوننەتەدا ببچڕێ ﴿عَن عائشة رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَت النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْغُسْلِ مِنَ الْحَيْضِ؟ فَقال: ...تَصُبُّ عَلَيْها الْماءَ، ثُمَّ تَأخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَطَهَّرُ بِها، فَقالَتْ عائشَةُ: تَتَّبِعِينَ أَثَرَالدَّمِ﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك دەربارەی غوسلیحەیز پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد؟ ئەویش فەرمووی: ئاو بە سەرخۆیدا دەکا، ئینجا لە دوای غوسل پارچە پەمۆیەکی بە میسککراو دادەنێتە ناو کونیحەیز. ئینجا بزانە: ئەو ئافرەتەی لە ژێر ئیحرامی حەج، یان عومرەدایە، ئەم بۆنخۆشکردنەی لێحەرامە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: چونکە فیدیەی دەکەوێتە سەر.

(وَلا يُسَنُّ تَجْدِيدُهُ) سوننەت نیە نوێکردنەوەی غوسل (بِخِلافِ الْوُضُوءِ) بەلام نوێکردنەوەی دەستنوێژ سوننەتە، واتە: دەستنوێژەکەی نەشکێو دەستنوێژێکیتر بگرێتەوە، بەلام بەو مەرجەی نوێژێکی واجب، یان سوننەتی بە دەستنوێژەکەیتر کردبێ، ئەگەر نا: نوێکردنەوەی ناپەسندە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا لەم نوێکردنەوەیەدا نیەتێك لە نیەتەکانیدەستنوێژ دێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَيُسَنُّ ألاّ يَنْقُصَ ماءُ الْوُضُوءِ عَنْ مُدٍّ) سوننەتە: ئاوی دەستنوێژگرتن لە مستێك کەمتر نەبێ (وَالْغُسْلِ عَنْ صاعٍ) سوننەتە ئاوی غوسلیش لە ساعێك کەمتر نەبێ، واتە: چوار مست (وَلا حَدَّ لَهُ) هیچ سنورێكو ئەندازەیەکی دیارکراو دانەندراوە: بۆ ئاوی غوسلو دەستنوێژ، بەڵکو تەنها ئەوە بە مەرج داندراوە: ئاو بە سەر گشت لاشەو ئەندامەکاندا بە تەواوی بڕوا، زانایانیش یەکڕانە: کە ناپەسندە: زۆر ئاو سەرف بکا، بە نیەتی غوسل، یان دەستنوێژ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هذِهِ الأُمَّةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطُّهُورِ وَالدُّعاءِ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، لە مەودوا لەم ئوممەتەی مندا کەسانێك دەبن: زیادەڕۆیی دەکەن لە غوسلو دەستنوێژو لە دوعاکردندا.

(وَمَنْ بِهِ نَجَسٌ) هەر کەسێك پیسیەکی بە شوێنێکی لاشەیەوە بوو (يَغْسِلُهُ) دەبی لە پێشدا بیشۆرێ (ثُمَّ يَغْتَسِلُ) ئینجا غوسل بکا (وَلا تَكْفِي لَهُما غَسْلَةٌ) تەنها یەك جار شۆردن بۆ هەردووکیان بەس نیە (وكَذا فِي الْوُضُوءِ) هەروەها لە دەستنوێژیشدا بەو شێوەیەیە، هەروەك لە شەشەم مەرجەکانی دەستنوێژدا باسمان کرد (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي)

اَلأَصَحُّ تَكْفِيه وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَنْ اغْتَسَلَ لِجَنَابَة وَجُمُعَة حَصَلاَ، أَوْ لأَحَدِهما حَصَلَ فَقط، قُلْتُ: وَلَوْ أَحْدَثَ ثُمَّ أَجْنَبَ أَوْ عَكَسُهُ كَفَى الْغُسْلُ عَلَىالْمَذْهَبِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ تَكْفِيه) لە فەرموودەی ڕاستتردا تەنها یەك جار شۆردن بۆ هەردووكیان بەسە (وَاللهُ أَعْلَم) بەو مەرجەی پیسیەكە لە گەڵ شەپۆلیەكەمدا لا بچێو ئاوەكەش نەگۆڕێو بشكاتە پیستەی ئەو شوێنەی پیسیەكەی لە سەر بووە، ئەگەر نا: غوسلی دروست نیەو شوێنەكەش پاك نابێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر شتێكی پاكی بە سەر شوێنێكی لاشەیەوە بوو و ڕێگەی ئاوی دەگرت بگاتە پیستە: وەكو سبوغو خەنەو مالحەمو ڕونیپەیتو هەویرو سبوغی سەر نینۆكو چڵكی بن نینۆكو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە واجبە لایببا ئینجا غوسل بكا، ئەگەر نا: غوسلی دروست نیە، بەڵام ڕەنگی خەنەو مەرەكەبو چەورایی نەفتو ڕون زیانی نیە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ئەم مەسەلانە ڕوون كراونەوەو، لە ڕوكنی پێنجەمی دەستنوێژیشدا بە درێژتر باسمان كردن.

(وَمَنْ اغْتَسَلَ لِجَنَابَةٍ وَجُمُعَةٍ) هەر كەسێك بە نیەتیجەنابەتو بە نیەتیجومعە، یەك غوسل بكا (حَصَلاَ) هەردووكی بۆ دەبن، واتە: جەنابەتی لادەچێو خێری غوسلی جومعەشی بۆ دەنووسرێ، بەڵام باشتر ئەوەیە: بە جیا جیا بیانكا (أَوْ لأَحَدِهِما) یان تەنها نیەتی یەكێكیانی هێنا (حَصَلَ فَقطْ) ئەوە ئەو غوسلەی نیەتی بۆ هێناوە، تەنها ئەوی بۆ دەبێو ئەوەیتر نابێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (وَلَوْ أَحْدَثَ ثُمَّ أَجْنَبَ) ئەگەر كەسێك بێدەستنوێژ بوو، ئینجا بە جەنابەت بوو (أَوْ عَكَسُهُ) یان بە پێچەوانەوە: بە جەنابەت بوو، ئینجا بێدەستنوێژ بوو (كَفَى الْغُسْلُ عَلَىالْمَذْهَب) ئەوە بۆ لاچوونی جەنابەتو بێدەستنوێژی تەنها غوسل بەسە، هەر چەند نیەتیدەستنوێژیش نەهێنێ (وَاللهُ أَعْلَم) چونكە هەردووكیان دوو پاكژی بچوكو گەورەنەو بچوكەكە لە ناو گەورەكەدا دێتە جێ، هەروەك لە كشت سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە غوسل كردندا ڕیز بۆ شۆردنی لەش دانەندراوە، چونكە لاشەی جەنابەتدار بە یەك ئەندام دادەندرێ، بەڵام سوننەتە لە لایسەریەوە دەست بە غوسل كردن بكا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، كەواتە: بە هەر جۆرێك غوسل بكا، غوسلو دەستنوێژ دروست دەبن، بەڵام ئەوەی گرنگە: ئەگەر بە مەسینە، یان بە بەلوعە غوسلی دەكرد–بۆ پاراستنی دەستنوێژ– پێویستە لە پێش غوسل كردندا تارەت بكاو نیەتی لابردنیجەنابەتیش لە گەڵ تارەتكردندا بێنێ، تاكو لە پاش دەست پێكردنی

غوسل پێویست به شۆردنی پیسایی شوێنی تارەت نەکا، چونکە ئەگەر بە دەستی ڕووت بیشۆرێ، دەستنوێژی دەشکێ-ئەگەر لە پێش غوسلدا دەستنوێژی گرتبێ- ئەگەر نا: دەستنوێژی ئەو ئەندامەی دەشکێ کە لە غوسلدا شۆراوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: لە هەردوو حاڵەتدا پێویستە بۆ نوێژکردن دەستنوێژ بگریتەوە، بەڵام لە هیچ حاڵەتێکدا دەستنوێژ شکان زیان لە غوسلەکەی نادا، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە، جا ئەگەر دەستنوێژی نەشکا، ئەوە پێویست ناکا دەستنوێژێکیتر بگرێتەوە ﴿عن عائشة رضي‌الله عنها: كانَ رسولُ اللهِﷺ لايَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ مِنَ الْجَنابَةِ﴾ رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، پێغەمبەرﷺ لە دوای غوسلی جەنابەت دەستنوێژی نەدەگرت.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی گەرماوی گشتی ﴾

خۆشۆردن لە (حمام)دا-واتە: گەرماوی گشتی- بۆ پیاوان دروستە، بەو مەرجەی عەورەتی خۆیان داپۆشن‌و تەماشای عەورەتی خەڵکیش نەکەن، چونکە خۆشۆردن بە ڕووتی لە بەر چاوی‌خەڵك دروست نیەو دروستیش نیە هیچ کەس دەست لە عەورەتی بدا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿احْفَظْ عَوْرَتَكَ إلاّ مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مامَلَكَتْ يَمينُكَ...﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، عەورەتی خۆت بپارێزە: تاکو کەس نەیبینێ‌و دەستی لێنەدا جگە لەژنی خۆت‌و (جارية)کەی خۆت.

بەڵام خۆ شۆردن لە گەرماوی گشتی‌دا بۆ ئافرەتان ناپەسندە، تەنها لە بەر نەخۆشی‌و زەیسانی نەبێ، ئەو کاتە ناپەسند نیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ما مِنْ امْـرأَة تَخْلَعُ ثِيابَها فِي‌غَيْرِ بَيْتِها إلاّ هَتَكَتْ مابَيْنَها وَبَيْنَ اللهِ تَعالى﴾ رواه الترمذي وقال حديث حسن، هەر ئافرەتێك جلی خۆی دابکەنێ-جگە لە ماڵی خۆی‌دا نەبێ- ئەوە پەردەی شەرمی لە نێوان خۆی‌و خوای خۆی‌دا دەپچڕێنێ.

ئینجا بزانە: دروست نیە ئافرەتانی موسڵمان‌و ئافرەتانی کافر بە یەکەوە بچنە گەرماو، جیاوازی نیە کافرەکە: جولەکە بێ، یان گاور، یان بتپەرست، چونکە ئیمامی(عمرﷺ) قەدەغەی کردوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی) لە باسی (نَظَر)دا فەرموویانە، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿وَلايُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إلاّ لِبُعُولَتِهِنَّ﴾ تا ﴿أَوْ نِسائِهِنَّ﴾ واتە: بە ئافرەتانی موسڵمان بڵێ: جوانی خۆیان بۆ هیچ کەسێك دیار نەخەن، تەنها بۆ مێردی خۆیان نەبێ‌و ...بۆ ئافرەتانی‌موسڵمان نەبێ.

هەروەها بزانە: لێرەدا مەبەست بە عەورەتی پیاو: نێوان ناوك‌و ئەژنۆیەتی، عەورەتی ئافرەت: هەموو لاشەیەتی، هەروەك لە باسی (نَظَر)دا ڕوونی دەکەینەوەان شاء الله تعالى.

## (بابُ النَّجاسَةِ)

هـــيَ كُـــلُّ مُـــسْكِـــرٍ مَـــائِـــعٍ، وَكَـــلْـــبٍ وَخِـــنْـــزِيـــرٍ

ئینجا بزانە: غوسل کردن بە ڕووتی لە شوێنی تەنهادا-کە هیچ کەس نەیبینێ- دروستە، هەروەها غوسل کردنی مێرد لە بەر چاوی ژنیخۆیو غوسلیژن لە بەر چاوی مێردی خۆی دروستە، بە بەڵگەی حەدیسەکەییەکەم، هەروەها دروستە: ژنو مێرد یەکتری بشۆنو دروستیشە لە یەك شوێندا بە یەکەوە غوسل بکەن ﴿عَنْ عائشة رَضِيالله عَنها: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّﷺ مِنْ إِناءٍ واحِدٍ﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی (عائشة) دەفەرموێ: منو پێغەمبەرﷺ لە یەك قاپەوە غوسلمان دەکرد.

### ﴿ بابُ النَّجاسَةِ: باسی پیسیو لابردنی پیسی ﴾

(هِيَ) پیسی لە شەرعدا: چڵکنێکە نوێژی پێوە دروست نەبێ ئەگەر شەرع چاو پۆشی ی لێنەکا، کەواتە: ئەگەر شەرع چاو پۆشی ی لە جۆرە پیسیەك کرد، ئەو کاتە نوێژی پێوە دروستە، هەروەك لە باسی ئاوەکاندا چەند جۆرێکمان ڕوون کردنەوە، لێرەو لە مەرجەکانی نوێژیشدا چەند جۆرێکیتر ڕوون دەکەینەوە ان شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: هەر شتێك پیس بێ، خواردنیشی حەرامە، تەنها لە ترسی مردن دروستە: مردار بخورێ، هەروەك لە باسی خواردەمەنیەکاندا بە بەڵگەوە ڕوونی دەکەینەوە ان شاءالله تعالى، هەروەها بۆ پێویستیش دروستە: دەرمانی پیس بخورێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(كُلُّ مُسْكِرٍ مائِعٍ) هەر شتێکی مرۆڤ سەر خۆش بکاو شلیش بێ، پیسە: وەکو شەڕاب، واتە: مەیو بیرەو ویسکیو...هتد، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يا أَيُّها الَّذينَ آمَنُوا إِنَّما الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصابُ وَالأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، شەڕابو قومارو ڕێزلێنانی بەردو فاڵگرتنەوەی بە تیرەکان، گشتی پیسەو لە کردەوەیشەیتانە، کەواتە: خۆتان لە هەموویان بپارێزن تاکو بەختەوەر ببن.

کەواتە: دروست نیە شەڕاب بۆ دەرمانکردنیش بەکار بێ، هەروەك لە باسی سزای شەڕابخۆردا بە بەڵگەوە ڕوونی دەکەینەوەان شاء الله تعالى.

(وَكَلْبٌ) هەروەها سەگیش پیسە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە گڵاوکردنەوەی کردوە، هەروەك لە باسی لابردنیپیسیدا بە بەڵگەوە ڕوونی دەکەینەوە ان شاء الله تعالى، ئینجا بزانە: تولەو تاژیش هەر بە سەگ دادەندرێنو گڵاون.

(وَخِنْزِيرٍ) هەروەها بەرازیش پیسە، چونکە لە سەگ خراپترە، خوای گەورەش لە قورئاندا خواردنی بەرازی حەڕام کردوە.

وَفَرْعِهِمَا، وَمَيْتَةَ غَيْرِالآدَمِيِّ وَالسَّمَكِ وَالْجَرَادِ،

(وَفَرْعِهِما) هەروەها وەچەی سەگو بەرازیش گڵاون هەر چەند تەنها باوك، یان دایکی سەگ، یان بەراز بێ‌و لایەنەکەی‌تریش لە ئاژەڵێکی پاك بێ.

ئینجا بزانە:—جگە لە سەگ و بەرازو وەچەی یەکێك لەو دووانە— گشت باڵندەو گشت ئاژەڵێك لە کاتی زیندووەتی‌دا پاکن، هەر چەند گۆشتیشی نەخورێ، واتە: بە مردووەتیش مردار بێ ﴿عن أبي‌قتادة‌ﷺ: قال النبيُّ‌ﷺ فِي‌الْهِرَّة: إِنَّها لَيْسَتْ بِنَجِسٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحیح، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: پشیلە پیس نیە. واتە: هەرچەند درندەشەو گۆشتیشی ناخورێ.

هەروەها بزانە: ئەگەر کارێك، یان بەرخێك بە شیری سەگو بەراز گەورە کرابێ، ئەویش گۆشتەکەی پاکە، هەروەك لە(المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام گڵاوکردنەوەی دەمی شیرخۆرەکە واجبە، هەروەك لە ئاگاداریەکەی گڵاوکرنەوەدا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(وَمَيْتَةِ) هەروەها مرداربووش پیسە، هەر چەند مێش‌و کرمیش بێ (غَيْرِالآدَمِيِّ وَالسَّمَكِ وَالْجَرادِ) جگە لە ئامیزادو ماسی‌و کلۆ، واتە: مردووی ئەم سێیانە پاکە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنا بَنِي‌آدَمَ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕێزمان لەئادەمیزاد ناوە. واتە: لە بەر ڕێزداری بە مردوویش پیس نابێ، جا کە لە دوای مردنیش دەشۆرێ، هەر بۆ زێدە ڕێزداری‌یە نەك لە بەر پیسبوون، جیاوازی موسڵمان‌و کافریش نیە، کەواتە: کە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّماالْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾ کافرەکان پیسن. مەبەست پیسی بیرو باوەڕە، نەك پیسی لاشە، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها دەربارەی مردووی کلۆو ماسی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَنا مَيْتَتانِ وَدَمانِ: اَلسَّمَكُ وَالْجَرادُ، وَالْكَبِدُ وَالطِّحالُ﴾ رواه الامام أحمد مرفوعاً ورجح البيهقي الموقوف وصححه، دوو مردوو و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراون: ماسی‌و کلۆ، جەرگو سپڵە، واتە: پاتەڕەشە. هەروەها دەربارەی مرداریش خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ﴾ حەڕام کراوە لە سەر ئێوە: مردارو خوێن. واتە: چونکە پیسن.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: هەر بە بەڵگەی ئەو ئایەتە: ئێسقان‌و پیستەو پەڕو کوڵك‌و خوری‌و موو و گشت بەشێکی‌تری مرداریش پیسە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمام (ابوحنیفة)و ئیمام(مالك)و ئیمام(احمد)دا: کوڵك‌و خوری‌و مووی ئاژەڵی مردار پیس نیە، هەروەك لە (المجموع)و کتێبەکانی‌خۆیاندا فەرموویانە، کەوابو: ئەگەر مرۆڤێکی گەداو هەژار پێویستی هەبو، بۆی دروستە: بە مەزهەبی ئەو سێ ئیمامانە ڕەفتار بکا: خوری‌و مووی ئاژەڵی مرداربوو لێبکاتەوەو بیشۆری‌و بە کاری بێنێ،والله أعلم.

ئینجا بزانە: مەبەست بە مردار: مردووی ئاژەڵێك، یان باڵدارێكە بە بێسەربڕینی‌شەرعی گیانی دەرچوبێ: وەك مردووی كەرو پڵینگو داڵەش‌و...هتد ئەو شتانەی گۆشتیان ناخورێ، بە سەربڕاویش هەر مردارن، چونكە سەربڕینیان ناشەرعی‌یە، یان وەك مردووی مەڕو بزن‌و مریشك كە بە بێسەربڕین، یان بە سەربڕینێكی دژ بە شەرع گیانیان دەرچوبێ: كە لە باسی سەربڕیندا ڕوونی دەكەینەوە،ان شاء الله تعالى.

(وَدَم) هەروەها خوێنیش پیسە، بە بەڵگەی ئایەتەكەی‌ڕابردوو، واتە: جگە لە جەرگو سپڵە، بە بەڵگەی حەدیسەكەی‌ڕابردوو (وَقَيْح) هەروەها كێم‌و خیزاویش پیسن، چونكە ئەوانیش خوێنن‌و گەنیون‌و گۆڕاون.

ئینجا بزانە: چڵم‌و لیكاو و ئارەقەو فرمێسكی گشت گیانلەبەرێك پاكە، تەنها هی سەگو بەرازو وەچەی یەكێك لەو دووانە نەبێ، هەروەك لە پاشكۆی ئاوەكاندا ڕوونمان كردۆتەوە.

(وَقَيْء) هەروەها ڕشانەوەش پیسە، چونكە ئەویش پیسایی نێو گەدەیە بە لای دەمی‌دا هاتۆتە دەرەوە، كەواتە: جیاوازی ئاو و خواردەمەنی نیە، ئینجا بزانە: ئەو ئاوەی لە دەمی مرۆڤی‌خەوتوو دێتە دەرەوە، ئەگەر لە گەدەوە بێتە دەرەوە، واتە: زەردو بۆگەنیو بێ، ئەوە پیسە، ئەگەر نا: پاكە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَرَوْث) هەروەها پیسایی ئادەمیزادو تەرسی وولاغو ڕیخ‌و قشپلی‌ئاژەڵی‌ترو جیقنەی باڵندە گشتی پیسە، جیاوازی نیە: گۆشتی بخورێ، یان نا، هەر چەند خوێنیشی لە بەر نەڕوا: وەكو مێش‌و كلۆ، هەروەك لە سەر چاوەكاندا فەرموویانە ﴿عن ابن مسعود ﷺ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِحَجَرَيْنِ وَرَوْثَةٍ-أَيْ لِيَسْتَنْجِيَ بِهِ- فَأَخَذَهُما وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ وَقالَ: إِنَّها رِكْسٌ﴾ رواه البخاري، واتە: دوو بەردو پارچە ڕیخێكم بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا تاكو تارەتی پێبكا، ئەویش بەردەكانی وەرگرت‌و ڕیخەكەشی فڕێداو فەرمووی: ئەمە پیسە.

(وَبَوْل) هەروەها میزیش پیسە، جا میزی ئادەمیزاد بێ، یان ئاژەڵ بێ، گۆشتی بخورێ، یان نا ﴿عن أنس ﷺ: بالَ أَعْرابِيٌّ فِي الْمَسْجِد...فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَرِيقُوا عَلى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوتدا كرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دۆلچەیەكی ئاو بڕژێننە سەر میزەكەی.

ئینجا بزانە: چاوپۆشی دەكرێ لەو میزو ڕیخەی لە كاتی گێرەدا، ئاژەڵەكانی‌گێرە دەیكەنە سەر كاو دانی گێرەكراو، هەروەك لە سەر چاوەكاندا فەرموویانە.

(وَمَذْي) هەروەها مەزیش پیسە (وَوَدْي) هەروەها وەدیش پیسە، هەروەك لە باسی غوسلدا ڕوونمان كردنەوە (وكَذا مَنِيُّ غَيْرِالآدَمِيِّ) هەروەها (مَنِی)ش-كە پێی دەگوترێ: عشقاو،

فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلاَصَحُّ طَهَارَةُ مَنِيِّ غَيْرِالْكَلْبِ وَالْخِنْزِيرِ وَفَرْعِ أَحَدِهِمَا وَاللهُ أَعْلَمُ.
وَلَبَنُ مَالاَ يُؤْكَلُ غَيْرَالآدَمِيِّ، وَالْجُزْءُ الْمُنْفَصِلُ مِنَ الْحَيِّ كَمَيْتَتِه

---

واته: تۆوی دروستبوونی گیانلەبەر–جگە لە ئادەمیزاد پیسە، بەلام (مَنی)ی ئادەمیزاد پاکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا ﴿عن عائشةرضي الله عنها: كُنْتُ أَفْرُكُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِﷺ فَرْكاً فَيُصَلِّي فِيهِ﴾ رواه مسلم، حەزرەتی(عائشة) دەفەرموێ: من بە نینۆکی خۆم (مَنی)م لە جلەکانی پێغەمبەرﷺ دەڕنیو نوێژی پێوە دەکرد.

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، لە سەر چاوەکاندا دەفەرموون: سوننەتە (مَنی) بشۆرێ ﴿عن عائشة رضي الله عنها: أَنَّها كانَتْ تَغْسِلُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی (عائشة) رضي الله عنها (مَنی)ی لە جلەکانی پێغەمبەرﷺ دەشۆرد.

(قُلْتُ) ئیمامی(نواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ طَهارَةُ مَنِيِّ غَيْرِالْكَلْبِ وَالْخِنْزِيرِ وَفَرْعِ أَحَدِهِما) بە فەرموودەیڕاستتر (مَنی)ی گشت گیانلەبەرێك–جگە لە سەگو بەرازو وەچەی یەکێکیان– پاکە، چونکە ئەویش وەکو (مَنی)ی ئادەمیزاد تۆوی ئاژەڵێکی پاکە (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: هێلکەی ئەو گیانلەبەرەی گۆشتی ناخورێ، پاکەو دروستە: بخورێ، بەو مەرجەی زیانی نەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، هەروەها هێلکەی گیانلەبەری مرداربوو کە توێکڵەکەی ڕەق بوبێ ئەویش دروستە بخورێ، بەلام ئەگەر ڕەق نەبوبێ پیسەو حەرامە، هەروەها ئەگەر هێلکە لە ناوەوەدا بووە خوێن، ئەویش پاکەو دروستە: بخورێ بەو مەرجەی تێك نەچوبێو بگونجێ فەرخەی لێدروست ببێ، ئەگەر نا: پیسەو حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەو هێلکەی بە بێپێدافسینی نێرینە دروست دەبێ، ئەگەر بووە خوێن، پیسەو حەرامە، چونکە فەرخەی لێدروست نابێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشبراملسی)دا فەرموویانە.

(وَلَبَنُ مالا يُؤْكَلُ) هەروەها شیری ئەو گیانلەبەرەی گۆشتی ناخورێ ئەویش پیسە، هەروەك گۆشتەکەشی پیسە (غَيْرِالآدَمِيِّ) جگە لە شیری ئادەمیزاد، واتە: شیری وی بە زیندوویی‌و بە مردوویی پاکە، چونکە ڕێزدارە، هەروەها شیری ئەو ئاژەڵەش کە گۆشتی بخورێ بە زیندوویی‌و بە سەربڕاوی پاکە، بەو مەرجەی مردار نەبێ، ئەگەر نا: پیسە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْجُزْءُ الْمُنْفَصِلُ) هەر پارچەیەکی جیا ببێتەوە (مِنَ الْحَيِّ) لە گیانلەبەریزیندوو (كَمَيْتَتِهِ) وەکو مردووەکەی وایە، واتە: ئەگەر مردووەکەی پاك بێ پارچەکەش پاکە، ئەگەر مردووەکەی مردار بێ پارچەکەشی مردارە، کەوابو: دەستو پێو گشت

ئەندامەکانیتری ئادەمیزادی زیندوو لە دوای لێکردنەوەشی پاکن، گشت پارچەیەکی ماسیی زیندوو لە دوای لێکردنەوەش پاکەو دروستە بشخورێ.

بەلام پارچەی هەر ئاژەڵێکی زیندوو لە دوای لێکردنەوەی پیسەو حەرامە، هەر چەند گۆشتیشی بخورێ، هەروەك لە سەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَن أَبِي واقدالليثي ﷺ: قَدمَ النَّبيُّﷺ الْمَدينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الإِبِلِ وَيَقْطَعُونَ أَلَيَاتِ الْغَنَمِ، فَقالَﷺ: مَا قُطِعَ مِنَ الْبَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهُوَ مَيْتَةٌ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، پێغەمبەرﷺ هاتە (مدينة)، خەڵکی (مدينة) قەپۆزی ووشترو دونگی مەڕەکانیان لێدەکردەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هەر پارچەیەك لە کاتیزیندوویيدا لە ئاژەڵ بکرێتەوە، پارچەکە مردارە. واتە: چونکە لە پێش سەربڕیندا لێیکراوەتەوە.

(إِلاّ شَعَرَالْمأكولِ) تەنها موو و کوڵكو خوریو پەڕی ئەو گیانلەبەرە نەبێ: کە گۆشتی بخورێ (فَطاهِرٌ) گشتی پاکە بە بەڵگەی (اجماع)، جیاوازی نیە: بە زیندوویی، یان بە سەربڕاوی لێیبکرێتەوە، بەلام موو و خوریو کوڵكو پەڕی ئەو گیانلەبەرەی گۆشتی ناخورێ، بە زیندوویيو بە مردوویی پیسە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتیو باسمان کرد.

ئینجا بزانە: مووی وولاغی سواری -کە گۆشتی ناخورێ- هەر چەند پیسە، بەلام دەریارەی سوار وولاغەکە لێبوردن هەیە، هەروەك لە (تحفة) لە باسیئاوەکاندا فەرموویەتی، هەروەها چاوپۆشی لە ئارەقەشی دەکرێ، هەر چەند لە شوێنی پیسیشدا دەگەوزێ، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە: ﴿کە پێغەمبەروﷺ (صحابة)کان بە سواریی کەرو هێستر دەچوونە سەفەرو جلەکانیشیان نەدەگۆڕیو نوێژیان پێوە دەکرد﴾.

(وَلَيْسَتِ الْعَلَقَةُ) ئەو پارچە خوێنە مەیيەی لە ناو منداڵدانەدا لە (مَنی)یەوە بووەتە خوێن، پیس نیە (وَالْمُضْغَةُ) ئەو پاچە گۆشتەش کە لە ناو منداڵدانەدا لە خوێنەکەوە بووەتە گۆشت، پیس نیە؟ چونکە بنچینەی هەردووکیان دەچێتەوە سەر (مَنی)و (مَنی)ش پاکە (وَرُطُوبَةُ الْفَرْجِ بِنَجَسٍ) تەڕایەتی ئەندامی (جِماع)ی مێینەش پیس نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا لەو سێیانەدا، کەواتە: منداڵو هێلکە -کە هاتنە دەرەوە- واجب نیە بشۆرێنو ئەندامی (جماع)کردنی پیاویش بە تەڕایەتی ئەندامەکەی ژن پیس نابێ، واتە: کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە شۆردنی کردوە، فەرمانی سوننەتە، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: مەبەست بەو تەڕایەتییە: ئاوێکی سپییە پێدەچێ: یان ئارەقە بێ، یان مەزی بێ، لە ناوەوەی ئەندامەکەی ئافرەت پەیدا دەبێ، بەلام ئەو ئاوەی لە لای ژێدی

وَلاَ يَطْهُرُ نَجسُ الْعَيْنِ إلاّ خَمْرٌ تَخَلَّلَتْ وَكَذا إنْ نُقِلَتْ مِنْ شَمْسٍ إلى ظِلٍّ وَعَكْسِهِ فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ خُلِّلَتْ بِطَرْحِ شَيْءٍ فَلاَ،

---

ئەندامەکەی دێتە دەرەوە پیسە، هەروەها ئەو ئاوەی لە پێش منداڵ لێبوون، یان لە گەڵ منداڵبووندا دێتە دەرەوە ئەویش پیسە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ جۆرەکانی پیسی ﴾

پیسی دوو جۆرە، یەکەم: (نَجِسُ الْعَيْن) پیسیبنچینەیی، واتە: خودی شتەکە لە بنچینەیدا پیس بێ: وەکو ئەو پیسیانەی ژماردنمان. دووەم: (مُتَنَجِّس) پیسبوو، واتە: خودیشتەکە لە بنچینەیدا پاك بێو بە هۆی وێکەوتنی پیسێك پیس بوبێ.

ئینجا هەر یەکێکیش لەو دووانە سێ پلەیە، یەکەم: (النجاسةالمغلظة) پیسیئەستوور: وەکو سەگو بەراز، کە لە کوردەواریدا پێی دەگوترێ: گڵاوبوو. دووەم: (النجاسةالمخففة) پیسیسووك: وەکو میزی کوڕیشیرخۆر. سێیەم: (النجاسةالمتوسطة) پیسیناوەنجی: وەکو پیسیەکانیتری جگە لەو دووانە.

ئینجا بزانە: لە پاککردنەوەی پیسیدا نیەتهێنان مەرج نیە، مەرجیش نیە بە کرداری (مُکلَّف)ێك لابردرێ، بەڵکو ئەگەر منداڵ، یان شێت، یان باران، یان ئاوەڕۆیەك پیسیەکەی شۆراند، یان با فڕێیدا ناو ئاوێکیزۆر–جگە لە وانەش– ئەگەر پیسیەکەی شۆراند، ئەوە پاك دەبێتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ پاککردنەوەی (نَجِسُ الْعَيْن) پیسی بنچینەیی ﴾

(وَلاَيَطْهُرُ) پاك نابێتەوە (نَجِسُ الْعَيْنِ) پیسیبنچینەیی بە هیچ جۆرێك: نە بە شۆردنو نە بە سوتاندنو نە بە هیچ گۆڕانکاریەکیتر (إِلاّ) تەنها دوو پیسی ناوەنجی نەبێ:

یەکەم: (خَمْرٌ) مەی، واتە: شەڕاب (تَخَلَّلَتْ) کە بە خۆی ببێتە سرکە (وَكَذا) هەروەها (إِنْ نُقِلَتْ مِنْ شَمْسٍ إِلى ظِلٍّ) ئەگەر شەڕابەکە گواستراوە لە بەر هەتاو بۆ سێبەر (وَعَكْسِهِ) یان لە بەر سێبەر بۆ هەتاو، ئەوجا بووە سرکە هەر پاك دەبێتەوە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هۆی پیسیو حەرامیی شەڕاب سەرخۆشکردنە، هۆیەکەشی نەما، کەوابو: پاك دەبێتەوە (فَإِنْ خُلِّلَتْ) بەلام ئەگەر شەڕاب بووە سرکە (بِطَرْحِ شَيْءٍ) بە تێهاویشتنی شتێك: وەکو خوێ، یان پیاز، یان هەرشتێکیتر، هەرچەند شتەکەش بە خۆی بکەوێتە ناو شەڕابەکە (فَلا) پاك نابێتەوە ﴿عن أنس ﷺ سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: عَنِ الْخَمـرِ تُتَّخَـذُ خَلاًّ؟ فقــالَ: لا﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لێکرا: ئایا دروستە: شەڕاب بە دەستکاری بکرێتە سرکە؟ فەرمووی: نا. واتە: پاك نابێتەوەو حەڵاڵیش نابێ.

وَجِلْدٌ نَجُسَ بِالْمَوْتِ فَيَطْهُرُ بِدَبْغِهِ ظَاهِرُهُ وَكَذا بَاطِنُهُ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَالدَّبْغُ نَـزْعُ فُضُولِهِ بِحِرِّيفٍ

## ﴿ دەباغكردنی پێستەی مردار ﴾

دووەم: لەو پیسە بنچینەییانەی پاك دەبنەوە (وَجِلْدٌ) پێستەیەكە (نَجُسَ بِالْمَوْتِ) بە هۆی مردن پیس بوبێ، واتە: گلاو نەبێ بەڵكو مردار بێ، جیاوازی نیە: گیانلەبەرەكە گۆشتی بخورێ، یان نا: وەكو پێستەی كەرو هێسترو گورگو پڵینگو...هتد (فَيَطْهُرُ) پێستەی مردار پاك دەبێتەوە (بِدَبْغِهِ) بە هۆی دەباغكردنی (ظاهِرُهُ) هەر دوو ڕووی دەرەوەی پشتو زگی –كە دەباغی گەیشتوتێ– پاك دەبێتەوە (وَكَذا باطِنُهُ) هەروەها ناوەو ئەو ڕووەش كە دەباغیان پێنەكەوتوە، پاك دەبنەوە (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی بەهێزی ناسراوی مەزهەب، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا دُبِغَ الإِهابُ فَقَدْ طَهَرَ﴾ رواه مسلم، هەر كاتێك پێستەی مردار دەباغ كرا پاك دەبێتەوە.

ئینجا بزانە: جگە لە پێستەی مردار، هیچ ئەندامێكی تری مردار پاك نابێتەوە، كەوابو: ئەو مووانەی بە سەر پێستەكەوەنە، ئەویش پیسنو بە دەباغ پاك نابنەوە، بەڵام چاوپۆشی دەكرێ: لەو مووە كەمانەی لە دوای دەباغكردن بە سەر پێستەوە دەمێننەوە، هەر وەك لە سەرچاوەكاندا ڕوونیان كردۆتەوە.

دیسان بزانە: پێستەی سەگو بەرازو وەچەی یەكێك لەو دووانە بە دەباغیش پاك نابێتەوە، چونكە بە زیندوییش گلاون، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بە (اجماع)ی زانایانیئیسلام: حەرامە ئادەمیزاد بگروێندرێو حەرامە پێستەكەی بەكار بێ، چونكە لە قورئاندا ڕێزی لێندراوە، هەروەك لە (المجموع) دا فەرموویەتی.

(وَالدَّبْغُ) مەبەست بە دەباغكردن: (نَزْعُ فُضُولِهِ) لابردنی زیدەگۆشتو خوێنو تەڕایەتی پێستەیە، بە جۆرێكی وەها: خۆش ببێو ئەگەر نقومی ناو ئاو بكرێ، ڕەقو بۆگەن نەبێ (بِحِرِّيفٍ) ئەو لابردنە مەرجە بە شتێكی تفتو تاڵ بێ: وەكو گلوانو مازوو و تویكڵی هەنارو...هتد، هەر چەند پیسیش بێ: وەكو جیقنەی باڵندە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عن میمونةرضی‌الله عنها: مَرَّ رَسُولُ اللهِﷺ بِشاةٍ يَجُرُّونَها فَقالَ: لَوْ أَخَذْتُمْ إِهابَها؟ فَقالُوا: إِنَّها مَيْتَةٌ، فَقالَ يُطَهِّرُهاالْماءُ وَالْقَرَظُ﴾ حديث حسن رواه ابوداود والنسائی، مەڕێكی مرداربوویان ڕادەكێشا فڕێی بدەن، پێغەمبەریشﷺ بە لایدا ڕابردو فەرمووی: دەبوا پێستەكەی بۆ خۆتان لێبكرنەوە؟ گوتیان: مەڕەكە مرداربووە، فەرمووی: بە ئاو و گەڵای (سَلم) پاك دەبێتەوە. واتە: چونكە تفتو تاڵە.

لاَ شَمْسٍ وَتُرَاب، وَلاَ يَجبُ الْمَاءُ فِي أَثْنَائِهِ فِي الأَصَحِّ، وَالْمَدْبُوغُ كَثَوْبٍ نَجُس، وَمَــا نَجُسَ بِمُلاقَاةِ شَيْءٍ مِنْ كَلْبٍ

(لاشَمْسٌ وَتُرابٌ) بەڵام بە تیشكی ڕۆژو بە گڵو بە خوێو بە هەر شتێكیتری زێدەگۆشتو خوێن لانەبا، دەباغكردن نابێ، چونكە خۆش نابێو بە كەوتنە ئاو بۆگەن دەبێ.

(وَلا يَجِبُ الْماءُ فِيأَثْنائِهِ) واجب نیە لە كاتی دەباغكردنـدا ئـاو بـەكار بهێنـدرێ، واتـە: دەرمانەكانی دەباغ بە ئاو تێكەڵ بكرێن (فِیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بە بەڵگەی حەدیسەكەیيەكەم، كەواتە: كە لە حەدیسەكەی دووەمدا باسـی ئـاوی كـردوە، مەبەسـت پاككردنەوەی تەواوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموويەتی، واتە: دەباغكردن تەنها (نَجاسَةُ العَيْن)=پيسیبنچينەيی پاك دەكاتەوەو پيسبوونەكەیدەباغ هەر دەمێنێ، جا هەر كاتێك بە ئاو شۆرا، بە تەواوی پاك دەبێتەوە، هەروەك دەفەرموێ:

(وَالْمَدْبُوغُ) پيستەی دەباغكراو (كَثَوْبٍ نَجُسَ) وەكو جلێكە پيس بوبێ، هەرچەند بە شتێكی پـاكيش دەبـاغ كرابـێ، كـەوابو: بـۆ نوێـژ لـە سـەركردنو نوێـژ پێـوەكردنو بـۆ بەكارهێنان لە شتیتەڕدا، واجبە بشۆرێ، هەروەك لە سەرچـاوەكاندا وەردەگـيرێ، واتـە: ئەگەر نوێژی پێوە نەكا، يان لە شتیووشكدا بەكاری بێنێ، واجب نيە بشۆرێ.

ئينجا بزانە: جگە لە شەڕابو پيستە، هيچ پيسێكیتریبنچينەيی بـە هـيچ جۆرێـك پـاك نابێتەوە، كەواتە: ئەگەر سەگ، يان ڕيخ، يان مردار بە ئاگر سوتێندراو بووە خۆڵـەمێش، يان ميز كوڵێندرا، يان كرا سەهۆڵ، يان بە هـەر دەسـتكاريەكیتر گـۆڕدرا، يـان بـە خـۆی گۆڕا، ئەوە پاك نابێتەوە، هەروەك لە (المجموع) وەردەگيرێ.

## ﴿ پاككردنەوەی (مُتَنَجِّس) پيسبوو ﴾

واتە: پيسبووی ئەستوورو سوكو ناوەنجی. ئينجا بزانە: لە پيسبوونی شتیپاكدا مەرجە: يـان دەبـێ پيسـەكە تـەڕ بـێ، يـان شـتە پاكەكـە تـەڕ بـێ، هـەروەك لـە (المجمـوع)دا فەرموويەتی، واتە: ئەگەر هەردوو لا ووشك بون، ئەو كاتە پيسەكە كار ناكاتە سـەر شـتە پاكەكەو پيسی ناكا، هەروەها بزانە: پەلەكردن لە لابردنی پيسیدا سوننەتە، بەڵام ئەگەر بە خۆپيسـكردنەكە تاوانبـار بوبـێ؟ چـونكە بـە بێعـوزر خـۆی پـيس كردبو، ئـەو كاتـە پەلەكردن واجبە، هەروەها بۆ نوێژكردنيش پەلەكردن لە لابردنیپيسیدا واجبە، هـەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

## ١-﴿ پاككردنەوەی پيسبووی ئەستوور-گلاوبوو ﴾

(وَما نَجُسَ) هەر شتێكی پاك كە پيس بوبێ (بِمُلاقاةِ شَيْءٍ مِنْ كَلْبٍ) بـە وێكـەوتنی شـتێكی سەگ: وەكو مرۆڤێك، يان ئاژەڵێكی بە ددان گرتبێ، يان دەمو ميزو گو و ليكاو و ئارەقەو

غُسِلَ سَبْعاً إِحْدَاهُنَّ بِتُرَابٍ، وَالأَظْهَرُ تَعَيُّنُ التُّرَابِ وَأَنَّ الْخِنْزِيرَ كَكَلْبٍ، وَلاَ يَكْفِي تُرَابٌ نَجِسٌ

خوێن‌و موو و هەر ئەندامێکی‌تری سەگ بە تەڕی بە شتێکی‌تەڕ، یان ووشك بکەوێ، یان بە ووشکی بە شتێکی‌تەڕ بکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئەوە (غُسِلَ سَبْعاً) واجبە حەفت جار بشۆرێ (إِحداهُنَّ بِتُرابٍ) یەکێك لەو حەفت جارە واجبە بە گڵێکی‌پاك بێ: کە تێکەڵی ئاوێکی پاك کرابێ بە جۆرێکی‌وەها: ئاوەکە لێڵ بکاو بە هۆی ئاوەکە بگاتە گشت شوێنە پیسبووەکان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿طَهُورُ إِناءِ أَحَدِكُمْ إِذا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ أَنْ يَغْسِلَهُ سَبْعَ مَرّاتٍ أُولاهُنَّ بِالتُّرابِ﴾ رواه مسلم، پاکبوونەوەی قاپی هەر یەکێکتان کاتێك سەگ دەمی تێوەنا، ئەوەیە: حەفت جار بیشۆرێ، جاری‌یەکەمیان بە گڵ. واتە: گڵەکە تێکەڵی ئاو ببێ، چونکە بە پێوەرکردنی گڵی ووشك بە بێ‌ئاو پاك نابێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا دەردەکەوێ، بۆیێ بەم پاککردنەوەیە دەگوترێ: (گڵاوکردنەوە).

ئینجا بزانە: واجبە خودی پیسیەکە لابردرێ، ئینجا حەفت جار بشۆرێ، کەواتە: ئەگەر بە شەش جار خودی‌پیسیەکە لاچو، ئەوە هەر بە یەك جار دەژمێردرێ‌و شەشی‌تریش واجبن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها بزانە: ئەم گڵاوکردنەوەیە دەربارەی شتی ووشك بوو، چونکە شتی شل بە هیچ جۆرێك پاك نابێتەوە، بەڵام ئەگەر شتی تەڕی‌پەیت: وەکو قوڕو ڕۆن‌و هەویرو...ئەو جۆرە شتانە سەگ پیسی کردن، ئەوە تەنها شوێنە پیسبووەکەو دەوروبەری فڕێدەدرێ‌و ئەوەی‌تریش پاکە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی‌و لە باسی شلی پیسبوودا بەڵگەی بۆ دێنینەوە،ان شاء الله تعالى.

(وَالأَظْهَرُ تَعَيُّنُ التُّرابِ) بە فەرموودەی بەهێزتر: تەنها گڵ دیاری کراوە بۆ پاککردنەوەی شتی گڵاوبوو، واتە:—جگە لە گڵ—گەچ‌و سابوون‌و هیچ دەرمانێك گڵاوی‌سەگ لانابا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنَّ الْخِنْزِيرَ كَكَلْبٍ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: بەرازیش وەکو سەگ وایە، واتە: شت گڵاو دەکاو واجبە حەفت جار بشۆرێ: بەو جۆرەی گوتمان، چونکە بەراز لە سەگ خراپترەو لە قورئانیش خواردنی حەرام کراوە، هەروەها وەچەی یەکێکیش لە سەگ، یان لە بەراز وەکو سەگ وایە، هەروەها ئەگەر شتێکی گڵاوبوو لە پێش حەفت جار شۆرینددا بە شتێکی‌تەڕ کەوت، یان بە تەڕی وە شتێکی‌تر کەوت، ئەویش گڵاو دەبێ‌و واجبە حەفت جار بشۆرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلا يَكْفي ترابٌ نَجِسٌ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: گڵی پیس بۆ پاککردنەوەی گڵاوبوو نابێ، بەڵکو واجبە گڵەکە پاك بێ، ئیتر جیاوازی گڵی ڕەش‌و سوورو زەرد نیە.

(وَلا مَمْزُوجٌ بِمائِعٍ) هەروەها گڵی تێکەڵکراو بە شتێکیشلیش دروست نیەو نابێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترردا.

﴿ئاگاداری﴾: ١- ئەگەر خۆڵ، یان قوڕ بە هۆی سەگو بەراز پیس بوو، پێویست بە گڵ ناکا، بەڵکو تەنها بە ئاو حەفت جار واجبە بشورێ.

٢- لە گڵاوکردنەوەدا سوننەتە: گڵەکە لە جارییەکەمدا بەکار بهێندرێ، واتە: لە جاری حەفتەمو جارەکانیتریشدا دروستە، چونکە گشتیان حەدیسیان دەربارە هاتوە.

٣- ئەگەر لە کاتی گڵاوکردنەوەدا پرِوشکە ئاوەکان بە شوێنێك کەوتن، ئەوە تێبینی دەکرێ: ئەگەر پرِوشکەکان لێڵاویجارییەکەم بون، ئەوە شەش جاریتر شوێنەکە دەشۆرێ، ئەگەر هی جاریدووەم بون پێنج جاریتر دەشۆرێ...هتد بەو جۆرە، جا ئەگەر پرِوشکەکان لێڵاو نەبون، واجبە جارێك لەو جارانەی ماون لێڵاوی تێدا بەکار بێ.

٤- ئەگەر گۆشتی سەگو بەرازی خوارد، یان میزەکەیانی خواردەوە، یان شتێکی گڵاوبووی خوارد، یان خواردیەوە، ئەوە تەنها گڵاوکردنەوەی دەمو ئەو شوێنانەی پیسەکەیان پێکەوتوە واجبە، واتە: هەردوو کونەکەی خوارەوە گڵاوکردنەوەیان ناوێ، بەڵکو تەنها تارەتکردنیان واجبە، بەڵام ئەگەر ڕشاوەو گۆشتەکە بە ساغی هاتە دەرەوە، دووبارە گڵاوکردنەوەیدەمی واجبە.

٥- ئەگەر دوو سەگ، یان سەگێكو بەرازێك شتێکیان پیس کرد، ئەوە بۆ هەموویان تەنها حەفت جارەکە واجبە.

٦- ئەگەر لە ناو ڕوبارێکی لێڵدا حەفت جار شتە پیسبووەکەی جولاند، ئەوە بە حەفت جار دەژمێردرێو پاك دەبێتەوە.

٧- لە ئاگاداریەکەی ئاویپیسدا چەند نمونەیەکی گرنگمان باس کردن بۆ ئێرەش گرنگن، ئینجا بزانە: ئەو ئاگادارییانەمان لە گشت، یان لە زۆربەی سەرچاوەکان هێناون.

## ٢-﴿ پاککردنەوەی پیسبووی سوك ﴾

(وَما تَنَجَّسَ) هەرشتێك پیس بوبێ (بِبَوْلِ صَبِيٍّ) بە میزیکوڕێکی وەها: کە (لَمْ يَطْعَمْ غَيْرَ لَبَنٍ) جگە لە شیر هیچیتری نەخواردبێو نەخواردبێتەوە بۆ پێژیان، تەمەنیشی لە دوو ساڵ زیاتر نەبێ (نُضِحَ) ئەو شتە پیسبووە بە میزی ئەم کوڕە، ئاوی بە سەردا دەپرژێندرێ، واتە: تەواوی شوێنەکە بە ئاو تەڕ دەکرێو پێویست ناکا ئاوەکەی لێجیاببێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجارِيَةِ وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلامِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، میزی کیژۆڵەیشیرخۆر دەشۆرێو میزی کوڕیشیرخۆر ئاوی بە سەردا دەپرژێندرێ.

وَمَا تَنجَّسَ بِغَيْرِهِمَا إِنْ لَمْ تَكُنْ عَيْنٌ كَفَى جَرْيُ الْمَاءِ، وَإِنْ كانَتْ وَجَبَ إِزالَةُ الطَّعْمِ،

---

ئینجا بزانە: لە شیرخواردندا جیاوازی شیری ئادەمیزادو گیاو ئاژەڵ نیە، جا ئەگەر کوڕەکە تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر بوو، یان کەمتر بوو بەلام لە گەڵ شیرخواردندا شتیتریشی دەخوارد، یان دەخواردەوە تاکو پێی بژیێ، ئەو کاتە واجبە میزەکەی وەکو میزی گەوران بشۆرێ، بەلام ئەگەر–جگە لە شیر– شتیتری بۆ دەرمانبوون، یان کرپوونەوە لە گریان دەخوارد، ئەوە زیانی نیە، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ٣–﴿ پاككردنەوەی پیسبووی ناوەنجی ﴾

(وَما تَنَجَّسَ بِغَيْرِهِما) هەر شتێك پیس بوبێ بە پیسیەکیناوەنجیی جگە لە ئەستووڕو سووك (إِنْ لَمْ تَكُنْ عَيْنٌ) ئەگەر پیسیەکە لاشەی نەبو، واتە: هەست بە ڕەنگو تامو بۆنی نەدەکرا، وەکو میزێك، یان ئاوێکیپیس کە ووشك بوبنەوە (كَفَى جَرْيُ الْماءِ) ئەوەندە بەسە: یەك جار ئاوەکە بە سەر شوێنە پیسبووەکەدا بڕواو لێی جیاببێتەوە، بەلام سێ جار خێرترە.

ئینجا بزانە: ئەگەر شتێکی وەکو زەمین بە شلێکی وەکو میز پیس بوو و هەڵیمژی ئەوەندە بەسە: ئاوێکی وەهای بە سەردا بکرێ: کە پیسیەکە وەبنەخۆی بگرێو لە ناوی ببا، ئیتر مەرج نیە ئاوەکە بە شوێنەکەدا ڕوبچێتە خوارەوە، مەرجیش نیە شوێنە پیسبووەکە ووشك بوبێتەوە، هەروەك لە (المجموع) دا فەرموویەتی.

بەلام ئەگەر خودی میزەکە مابۆوەو هەڵنەمژرابو، ئەو کاتە پاك نابێتەوە، چونکە بە هۆی تێکەڵبوون کێشی ئاوشۆرەکە زیاد دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن أبيهريرةﷺ: بالَ أعرابِيٌّ فِيالْمَسْجِدِ...فَقالَ النَّبِيُّﷺ: هَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مـاءٍ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك میزی لە ناو مزگەوتدا کرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دۆلچەیەکی ئاو بڕژێننە سەر میزەکەی. ئینجا بزانە: ئەگەر پیسەکە گڵاو بو: وەکو میزی سەگ، ئەوە واجبە: حەفت جار ئاوی بە سەردا بکرێ، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

هەروەها ئەگەر گۆشت بە ئاوێکیپیس، یان بە میز کوڵێندرا، ئەوە دەرەوەو ناوەوەی بە شۆردن پاك دەبێتەوەو پێویست بە کوڵاندنەوەو هەڵگوشین ناکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِنْ كانَتْ) بەلام ئەگەر پیسیەکە لاشەی هەبو: وەکو جیقنەو ڕیخو خوێن، واتە: پیسیەکە ڕەنگ، یان تام، یان بۆنی هەبو (وَجَبَ) واجبە لاشەی پیسیەکە لابدرێ، ئینجا (إِزالَةُ الطَّعْمِ) تامی پیسیەکەش واجبە لابدرێ، هەرچەند زەحمەتیش بێ، چونکە مانەوەی

وَلاَ يَضُرُّ بَقَاءُ لَوْنٍ أَوْ رِيحٍ عَسُرَ زَوَالُهُ، وَفِي الرِّيحِ قَوْلٌ، قُلْتُ: فَإِنْ بَقِيَا مَعاً ضَرًّا عَلَى الصَّحِيحِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُشْتَرَطُ وُرُودُ الْمَاءِ

---

تام نيشانەی مانەوەی خودی پیسیەکەیە ﴿عن أسماء رَضِيَ اللهُ عَنها: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي دَمِ الْحَيْضِ: تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ ثُمَ تَنْضَحُه ثُمَّ تُصَلِّي فِيهِ﴾ رواه الشيخان، خوێن لە جلەکەی دەڕنیو ئینجا بە ئاو هەڵیدەگوشیو ئینجا دەیشۆریْ، ئینجا نوێژی پێوە دەکا.

(وَلا يَضُرُّ بَقاءُ لَوْنٍ) زیانی نیە ڕەنگی پیسیەکە بە تەنها بمێنێتەوە (أَوْ رِيحٍ) زیانی نیە بۆنی پیسیەکە بە تەنها بمێنێتەوە (عَسُرَ زَوالُهُ) کە لاچوونی زەحمەت بێ، واتە: بە هەڵگوشینو بە سابوون لانەچێ، یان سابوونی دەست نەکەوێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە (وَفِي الرِّيحِ قَوْلٌ) دەربارەی بۆن فەرموودەیەك هەیە: کە مانەوەی بە تەنهاش زەرەری هەیە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەموی (فَإِنْ بَقِيا مَعاً) ئەگەر ڕەنگو بۆنی پیسیەکە بە یەکەوە مانەوە (ضَرًّا) زەرەری هەیەو شتەکە پاك نابێتەوە (عَلى الصَّحِيحِ) لەسەر فەرموودەی ڕاست (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: ئەگەر شتێك بە ڕەنگێکیپیس ڕەنگی گرت، ئەوە تا لاشەی پیسیەکە لادەچێ واجبە بشۆرێو تا ڕەنگەکەش بە هۆی ئاو لێی جیا ببێتەوە هەر واجبە بشۆرێ، ئیتر تەنها مانەوەی ڕەنگ زیانی نیە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵام ئەگەر پیسیەکە تێکەڵی خۆڵ بوو و نەگونجا جیا بکرێتەوەو لابردرێ: وەکو ووردە زبڵو کێمو خوێنی گۆڕستان، ئەوە بە هیچ جۆرێك ئەو خۆڵە پاك نابێتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

(وَيُشْتَرَطُ) لە فەرموودەیڕاستتردا مەرجە بۆ پاکبوونەوەی شتە پیسبووەکە: (وُرُودُ الْماءِ) ئاوەکە بێتە سەر شوێنە پیسبووەکە ئەگەر ئاوەکە کەم بێ، چونکە ئەگەر شتە پیسبووەکە دابندرێتە ناو ئاوە کەمەکە، پیسی دەکاو شتەکەش پاك نابێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتیو لە ئاوی پیسیشدا ڕوونمان کردەوە.

جا ئەم (قاعدة)یە: کە (جیاوازی هاتنەسەرو کەوتنە ناو دەکا)، لەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ وەرگیراوە: ﴿إِذااسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلا يَغْمِسْ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاثًا فَإِنَّهُ لايَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم، هەر کاتێك یەکێکتان لە خەو هەڵسا، نابێ دەستی بخاتە ناو قاپیئاو تا سێ جار دەیشۆرێ، چونکە نازانێ لە کاتی خەوتندا دەستی لە کام شوێندا داندراوە. واتە: ئەگەر دەستی پیس بێو بیخاتە ناو ئاوێکی کەم، ئاوەکە پیس دەبێ، بەڵام ئەگەر ئاوە کەمەکە بە سەر دەستە پیسەکەدا بکرێ، پاکی دەکاتەوە، چونکە لە کاتی بە سەرداکردندا ئاو هێزی هەیە.

لاَ الْعَصْرُ فِي الأَصَحِّ، وَالأَظْهَرُ طَهَارَةُ غُسَالَةٍ تَنفَصِلُ بِلاَ تَغَيُّرٍ وَقَدْ طَهَرَ الْمَحَلُّ، وَلَوْ تَنَجَّسَ مَائِعٌ تَعَذَّرَ تَطْهِيرُهُ،

---

ئینجا بزانە: ئەو حەدیسە بەڵگەشە: کە سوننەتە شتیپیسبوو سێ جار بشۆرێ، حەدیسی پیاوەکەش-کە میزی لە مزگەوت کرد- بەڵگەیە: کە شتیپیسبوو، بە یەك جار شۆرین پاك دەبێتەوە، کەوابو: ئەگەر قاپێك، یان دەمی پیس بوو، جارێك ئاویان تێوەر بکا پاك دەبێتەوە، بەو مەرجەی گشت تەنیشتەکانیان ئاویان بگاتێ، هەروەك لە (تحفة)دا روونی کردۆتەوە.

(لاالْعَصْرُ) بەڵام گوشینی شتە شۆراوەکە لە دوای شۆرین واجب نیە، بەڵکو سوننەتە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە ئەو تەڕیەتیەی بە شتە شۆراوەکەوە دەمێنێتەوە، بەشێکی ئاوشۆرەکەیە، ئاوشۆریش پاکە، هەروەك دەفەرموێ:

(وَالأَظْهَرُ طَهَارَةُ غُسَالَةٍ) لە فەرموودەیبەهێزتردا: ئەو ئاوشۆرەی جارییەکەم-کە پیسی پێشۆراوە- پاکە، بەڵام پاککەرەوە نیە، بەو مەرجەی (تَنْفَصِلُ) کە لە شتە شۆراوەکە جیا دەبێتەوە (بِلاتَغَيُّرٍ) هیچ گۆڕانێکی ڕەنگو تامو بۆنی نەبێو کێشیئاوەکەش زیاد نەبێ (وَقَدْ طَهَرَالْمَحَلُّ) شوێنە پیسبووەکەش پاك بوبێتەوە، جا ئەگەر ئاوەکە بە گۆڕاوی لە شتە شۆراوەکە جیا بۆوە، یان شوێنەکە پاك نەبۆوە، ئەو کاتە ئاوشۆرەکەش پیسە.

هەروەها ئەگەر قاپێك پیسێکی شلی تێدا بوو، جا پێش ئەوەی بیڕژێنێ ئاوی بە سەردا کرد، ئەو قاپەش پاك نابێتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

واتە: ئاوەکەش پیسە، چونکە کێشی زیاد بووە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي إِناءِ أَحَدِكُمْ فَلْيُرِقْهُ ثُمَّ لِيَغْسِلْهُ سَبْعَ مِرارٍ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك سەگ دەمی نا ناو قاپی یەکێکتان، دەبی ئەو شتەی تێیدایە بیڕژێنێ، ئینجا دەبی حەفت جار بیشۆرێ.

ئینجا بزانە: بۆیێ ئاوشۆرەکەی جارییەکەم پاککەرەوە نیە، چونکە لە لابردنیپیسیدا بەکار هاتوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنی)دا فەرموویانە.

بەڵام ئاوشۆرەکەی جاری دووەمو سێیەم-کە پیسی پێشۆراوە- هەردووکیان پاكو پاککەرەوەنە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ تَنَجَّسَ مائِعٌ) ئەگەر شتێکی شل پیس بوو (تَعَذَّرَ تَطْهِيرُهُ) بە هیچ جۆرێك پاك نابێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا وَقَعَتِ الْفَأْرَةُ فِي السَّمْنِ فَإِنْ كانَ جامِداً فَأَلْقُوها وَماحَوْلَها، وَإِنْ كانَ مائِعاً فَلا تَقْرَبُوهُ﴾ رواه اصحاب السنن بسندصحيح، هەر کاتێك مشك کەوتە ناو ڕون، ئەگەر ڕونەکە پەیت بوو، مشکە مردووەکە فڕێدەنە دەرەوەو دەوروبەری شوێنی مشکەکەش فڕێ بدەن، بەڵام ئەگەر ڕونەکە شل بوو، لێی نزیك مەبنەوە. واتە: چونکە پاك نابێتەوە.

وَقِيلَ يَطْهُرُ الدُّهْنُ بِغَسْلِهِ

(بابُ التَّيَمُّمِ)

يَتَيَمَّمُ الْمُحْدِثُ وَالْجُنُبُ لِأَسْبابٍ، أَحَدُها: فَقْدُ الْمَاءِ،

---

ئینجا بزانە: لە بڕیاری ئەم حەدیسەدا جیاوازی ڕۆن و شتە پەیتەکانی‌تر نیە، هەروەها جیاوازی پیسی ئەستوورو پیسەکانی‌تر نیە، هەروەك لە باسی گلاوکردنەوەشدا ڕوونمان کردەوە، هەروەها بزانە: مەبەست بە پەیت ئەوەیە: ئەگەر بەشێکی لێوەربگیرێ، لە کاتێکی زوودا شوێنەکەی بەوی‌تر پڕ نەبێتەوە، واتە: ئەگەر زوو وێك دەکەوتەوە، ئەوە شلە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَطْهُرُ الدُّهْنُ بِغَسْلِهِ) بە شۆردن ڕۆن پاك دەبێتەوە، بەلام بە حەدیسەکەی‌ڕابردوو ئەم فەرموودەیە ڕەد کراوەتەوە، کەوابو: ئێمەش ڕوونی ناکەینەوە.

﴿ بابُ التَّيَمُّمِ: باسی تەیەممم ﴾

**پێناسە**: تەیەممم ئەوەیە: لەجیاتی بەکارهێنانی ئاو-لە دەستنوێژو غوسلدا- تۆزی گڵێکی پاك بە ڕوخسارو دەستەکانی‌دا بدا بە چەند مەرجێکی تایبەت. واتە: جیاوازی نیە تەیەمممەکە: بۆ بێدەستنوێژی بچووك بێ، یان بۆ جەنابەت و حەیزو زەیسانی و منداڵبوون بێ، لە گشتیاندا تەنها ڕوخسارو هەردوو دەستەکان لە گەڵ ئەنیشەکەکان بە تۆزی گڵێکی‌پاك مەسح دەکرێن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك ئاو دەست نەکەوت و کاتی نوێژیش درەنگ بوو و ترسی نەمانی هەبو، لەو کاتدا تەیەممم واجبە، بەلام ئەگەر کاتی نوێژ زوو بوو، یان مەبەستی سوننەت کردن بوو، یان ئاوەکە بە پارەیەکی زیاتر لە هاونرخی خۆی دەست دەکەوت، لەو کاتانەشدا تەیەممم دروستە بەلام واجب نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(يَتَيَمَّمُ الْمُحْدِثُ) دروستە: مرۆڤی بێدەستنوێژ تەیەممم بکا (وَالْجُنُبُ) دروستە: مرۆڤی جەنابەتدارو ئافرەتی زەیسانی و حەیزدار تەیەممم بکەن، ئەگەر نەیانتوانی ئاو بەکار بێنن (لِأَسْبابٍ) لە بەر چەند هۆیەك لەو هۆیانەی‌داهاتوو:

(أَحَدُها) یەکێك لەو هۆیانە (فَقْدُ الْماءِ) نەبوونی ئاوی پاککەرەوەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ كُنتُم مَّرْضَىٰ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ ئەگەر ئێوە نەخۆش بون، یان لە سەفەردا بون، بە هۆی پیسایی‌کردن، یان بە دەست لێدانی ئافرەتان بێدەستنوێژ بون و ئاوتان دەست نەکەوت، بە گڵێکی پاك تەیەممم بکەن.

فَإنْ تَيَقَّنَ الْمُسافِرُ فَقْدَهُ تَيَمَّمَ بلاَ طَلَب، وَإنْ تَوَهَّمَهُ طَلَبَهُ مِنْ رَحْلِهِ وَرُفْقَتِهِ وَنَظَرَ حَوَالَيْهِ إنْ كانَ بِمُسْتَوٍ، فَإنْ احْتَاجَ إلى تَرَدُّد تَرَدَّدَ قَدْرَ نَظَرِه،

---

ئینجا بزانە: لە نەبوونی ئاودا جیاوازی نیە: کە بە هەستکراوی بێگومان ئاوەکە نەبێ، یان ئاو هەبێ بەڵام شەرع ڕێگای بەکارهێنانی نەدا، هەروەك لە هۆیەکەی ژمارە دووەمدا ڕوونی ئەکەینەوە، إن شاءالله تعالى، یان ئاو هەبێو شەرعیش ڕێگە بدا، بەڵام لە کاتی‌نوێژدا توانای وەدەستهێنانی نەبێ: وەکو دوژمن، یان دڕندەیەك ڕێگەی‌ئاوی گرتبێ، یان لە ناو دەریادا سواری کەشتی بوبێو توانای ئاو هەڵێنجانی نەبێ، یان ئاوی بیر بە تۆبەت بوو و تا تۆبەتی دەگەیشتێ کاتی‌نوێژ نەدەما، لەو مەسەلانەدا ئاوەکە بە نەبوو دادەندرێ، کەواتە: تەیەمموم دەکاو قەزاکردنەوەی نوێژیشی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردونەوە.

(فَإنْ تيَقَّنَ الْمُسافِرُ) جا ئەگەر ڕێبوار بێگومان دەیزانی (فَقْدَه) ئاو لەو شوێنەدا نیە (تيَمَّمَ) یەکسەر لە کاتی‌نوێژدا تەیەمموم دەکا (بِلاطَلَبِ) بێ ئەوەی بە دوای‌ئاودا بگەڕێ، چونکە گەڕانەکەی بێ‌سودە، کەواتە: قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، ئینجا بزانە: نیشتەجێ، واتە: ئەو کەسەی لە ئاوەدانی‌یە، ئەگەر ئەویش بێگومان دەیزانی ئاو نیە، یەکسەر تەیەمموم دەکا، بەڵام نوێژەکە قەزا دەکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر دادپەروەرێك پێی گوت: لەم شوێنەدا ئاو نیە. دیسان یەکسەر تەیەمموم دەکا، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی ﴿عن أبي ذرﷺ: أنَّهُ كان تُصيبُهُ الْجَنابَةُ، فَقالَ النَّبيُّﷺ اَلصَّعيدُ الطَّيِّبُ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَإنْ لَمْ يَجِدِ الْماءَ عَشْرَ سِنِينَ فَإذا وَجَدَ الْماءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، دەربارەی جەنابەتدار پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گڵی پاك دەستنوێژگری موسڵمانە، هەر چەند تا دە ساڵیش ئاوی دەست نەکەوێ، جا هەر کاتێك ئاوی دەست کەوت، با خۆی پێ پاك بکاتەوە لە بێ‌دەستنوێژی‌ی گەورەو بچوك. واتە: چونکە تەیەمموم بێ‌دەستنوێژی لانابا.

(وإنْ تَوَهَّمَه) ئەگەر دڵنیا نەبو، بەڵام دڵی بۆ ئەوە چوو: کە ئاو هەیە (طَلَبَهُ) واجبە لە کاتی نوێژدا بە دوای ئاودا بگەڕێ (مِنْ رَحْلِه) لە بارگەو بارخانەی خۆیو (وَرُفْقَتِه) لە لای هاوڕێکانی خۆیو (وَنَظَر حَوالَيْه) تەماشای هەر چوار لای‌خۆی دەکا (إنْ كانَ بِمُسْتَوٍ) ئەگەر لە شوێنێکی‌ڕاستان بێ، جا زیاتر بایەخ بە شوێنی سەوزاییو باڵندە دەدا.

(فانْ احْتاجَ إلى تَرَدُّدٍ) جا ئەگەر پێویستی بە هاتوچۆ هەبو، چونکە شوێنەکە ڕاستان نەبو، بەڵکو دۆڵایی، یان تەپۆلکە بوو، ئەوە (تَرَدَّدَ قَدْرَ نَظَرِه) بە ئەندازەی دیتنی‌خۆی بە دوای ئاودا دەگەڕێو دەچێتە سەر بەرزاییەکان، بەو ئەندازەیە دەگوترێ: (سنوری فریاکەوتن)، کە دەکاتە (١٥٠) مەتر.

**فَإنْ لَمْ يَجِدْ تَيَمَّمَ، فَلَوْ مَكَثَ مَوْضِعَهُ فَالأَصَحُّ وُجُوبُ الطَّلَب لِمَا يَطْرَأُ، فَلَوْ عَلِمَ مَـاءً يَصِلُهُ الْمُسَافِرُ لِحَاجَتِه وَجَبَ قَصْدُهُ إنْ لَمْ يَخَفْ ضَرَرَ نَفْس أَوْ مَال،**

---

کەواتە: هەر ئەوندە لە بارگەکەی دوور ئەکەوێتەوە: ئەگەر هـاوار بکاتـە هاوڕێکانی-لـەو کاتەی گفتوگۆ دەکەن‌و بە شتی‌ترەوە خەریکن- یەکسەر فریای بکەون‌و بـەو مەرجـەش لـە گیـان‌و مـاڵ‌و ناموسـیش دڵنیـا بـێ‌و کـاتی نوێژەکـەش نـەڕواو لـە هاوڕێکانیشـی دوا نەکەوێ، هەروەك لە سەر چاوەکاندا ڕوونیـان کردۆتـەوە (فَـإنْ لَـمْ يَجِدْ) جـا ئەگـەر لـەو سنورەدا گەڕاو ئاوی دەست نەکەوت (تَيَمَّمَ) تەیەممومم دەکاو قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، چونکە ئاو نیە.

(فَلَوْ مَكَثَ مَوْضِعَه) جا ئەگەر هەر لە شوێنەکەی خۆی مایەوە (فَالأصَحُّ وُجوبُ الطَّلَبِ) بە فەرموودەیڕاستتر: واجبە بە دوای ئاودا بگەڕێ (لِما يَطْرَأُ) بۆ ئەو پێویستی‌یەی دووبـارە ڕوو دەدا: وەك هەر لە شوێنەکەی‌خۆی‌دا تووشـی جەنابـەت ببـێ، یـان کـاتی نوێـژێکی‌تر هاتبێ، ئەوە دووبـارە واجبـە بـە دوای ئـاودا بگـەڕێ، بـەڵام گەڕانەکـەی لـە جاری‌یەکـەم سوکتر بێ، هەروەها بۆ نوێـژی سـێ‌یەم‌و چـوارەمیش-ئەگـەر لـە شـوێنی‌خۆی مایـەوە- هەمان ڕەفتار دەکا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر دوو نوێژی لە یەك کاتدا (جَمْع)-کۆ کردنـەوە، ئـەوە واجبـە لـە دوای سەلامدانەوەی نوێژی یەکەم، دووبارە بە دوای ئاودا بگەڕێ، واتە: تەنها لـە شـوێنی‌خۆی تەماشای هەر چوار لای خۆی بکـا، ئینجـا ئەگـەر ئـاو نـەبو، تەیـەممومم بکـاو دەسـت بـە نوێژی دووەم بکا، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

هەروەها ئەگەر ویستی چەند نوێژێك لە یەك شوێندا بە دوای یەکدا قەزا بکاتەوە، دیسـان واجبـە: بـەو شـێوەیە بـە دوای ئـاودا بگـەڕێ‌و ئینجـا تەیـەممومم بکـاو نوێـژێکی‌تر قـەزا بکاتەوە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(فَلَوْ عَلِمَ ماءً) جا ئەگەر بێگومان زانی لە شـوێنێکدا ئـاو هەیـە، یـان دادپـەروەرێك پـێ‌ی گوت: لەو شوێنەدا ئـاو هەیـە. شـوێنەکەش لـە سـنووری فریاکـەوتن دوورتـر بـوو، بـەڵام (يَصِلُهُ الْمُسافِرُ) ڕێبوار دەگەیشتە ئەو شوێنە (لِحاجَتِهِ) بۆ پێویستیەکانی‌خۆی: وەکو دار هێنـان‌و ئـاژەڵ لەوەڕانـدن-بـەم ئەندازەیـەش دەگـوترێ: (سـنوری نزیـك)، کـە دەگاتـە نزیکەی (٢٥٠٠) متر- کەوابو: (وَجَبَ قَصْدُه) واجبـە بڕواتـە ئـەو شـوێنەو ئـاو وەدەسـت بێنێ بۆ دەستنوێژو غوسل، بەم مەرجانە:

(إنْ لَمْ يَخَفْ ضَرَرَ نَفْسٍ أَوْ مالٍ) ئەگـەر نەترسـێ زیـان بـە گیـان‌و مـاڵ‌و ناموسـی خـۆی‌و کەسێکی‌تر بکەوێ‌و نەترسێ کاتی نوێژەکەش بڕواو نەترسێ لـە هاوڕێکانی دوا بکـەوێ،

**فَإِنْ كانَ فَوْقَ ذلكَ تَيمَّمَ، وَلَوْ تَيقّنَهُ آخرَالوَقْت فَانْتظَارُهُ أَفْضَلُ، أَوْ ظَنّهُ فَتعْجيلُ التَّــيمُّم أَفْضَلُ فِيالأَظْهَرِ، وَلَوْ وَجَدَ مَاءً لاَ يَكْفيه فَالأَظْهَرُ وُجُوبُ اسْتعْماله وَيَكُونُ قَبْلَ التَيمُّمِ،**

واتە: ئەگەر یەکێکی لەو مەترسیانەی هەبو، بۆی دروستە تەیەمموم بکاو واجب نیە بڕواتە سەر ئاوەکە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ كانَ فَوْقَ ذلك) جا ئەگەر ئاوەکە لە ئەندازەی (سنوری نزیك) دوورتر بوو-کە پـێی دەگوترێ: (سنوری دوور)- ئەوە واجب نیە: بڕواتە سەر ئاوەکە، بەڵکو (تَيمَّمَ) تەیەمموم دەکا، چونکە ڕۆیشتن بۆ سەرئاوەکە ماندووبوونێکی تەواوی دەوێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەو سـێ سنورە گشتی دەربارەی ڕێبوار بوو، چونکە ئەگەر نیشتەجێ دەیزانی لە شوێنێکی ئاوەدانیدا ئاو هەیە، دروست نیە تەیەمموم بکا، بەڵکو واجبە بڕواتە سەر ئاوەکـە، هەرچەند لـەم سەریشار بڕواتـە ئـەو سەریشـار و کـاتی نوێژەکـەش بـڕوا، چونکە ئەگەر نیشتەجێ لە بەر نـەبوونیئاو تەیـەمومیش بکـا، هـەر واجبـە نوێژەکـە قـەزا بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

(وَلَوْ تَيقّنهُ آخرَ الوقْت) ئەگەر بێگومان دەیزانـی: لـە کۆتـایی کـاتی نوێژدا ئـاوی دەست دەکەوێ (فإنْتظارُهُ أفْضَلُ) ئەوە چاوەڕوانی ئاوەکە بکا خێری زیاترە، چونکە نوێژی بـە دەستنوێژ خێری زیاترە لە نوێژی بە تەیەمموم (أوْ ظنَّه) یان گومانی هەبو کە لە کۆتـایی کاتینوێژدا ئاو دەبێ، یان نابێ (فَتَعْجِيلُ التَّيمُّم أفْضَلُ) ئەو کاتە بە پەلەکردنی تەیەمموم خێری زیاترە (فيالأظْهَر) لە فەرموودەی بە هێزتردا.

(وَلَوْ وَجَدَ ماءً) ئەگەر بێدەستنوێژ، یان جەنابەتدار، یان حەیزدار، هەندێك ئـاوی دەست کەوت، بەڵام (لايَكْفيه) ئاوەکەش کەم بوو بەشی دەستنوێژ، یان غوسل کردنی نەدەکرد، ئەوە (فَالأظْهَرُ وُجُوبُ اسْتعْماله) بە فەرموودەی بـەهێزتر واجبـە ئاوەکـە بـەکار بێنـێ تـا دەبڕێ، چونکە پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إذا أمَرْتُكمْ بِشَيْءٍ فَأتُوا منهُ ماسْتَطَعْتمْ﴾ رواه الشیخان، هەر کاتێك فەرمانم بە شتێك پێکردن، هەر چەندی تواناتان هەیـە فەرمانەکـەم بەجێ بهێنن. (ويَكُونُ قَبْلَ التَّيمُّمِ) واجبە: بە کارهێنانی ئاوەکە لە پێش تەیەمموم کردندا بێ، واتە: کە ئاوەکە نەما ئینجا تەیەمموم بکا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَـمْ تَجدُوا ماءً فَتَيمَّمُوا﴾ ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت تەیەمموم بکەن.

ئینجا بزانە: بۆ دەستنوێژگرتن واجبە: بەگوێرەی ڕیزیدەستنوێژ ئاوەکە بـەکار بێنـێ تـا ئاوەکە دەبڕێ، ئینجا تەیەمموم دەکا، بەڵام بۆ غوسل کردن سوننەتە: یەکەمجار ئاوەکە لە ئەندامەکانیدەستنوێژ بـەکار بێنـێ، ئینجـا سـەر، ئینجـا تەنیشتی ڕاستە، ئینجـا کـە ئاوەکە بڕا، تەیەمموم دەکا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

وَيَجِبُ شِرَاؤُهُ بِثَمَنِ مِثْلِهِ إِلاَّ أَنْ يَحْتَاجَ إِلَيْهِ لِدَيْنٍ مُسْتَغْرِقٍ أَوْ مُؤْنَـةِ سَـفَرِهِ أَوْ نَفَقَـةِ حَيَوَانٍ مُحْتَرَمٍ،

---

**﴿ئاگـاداری﴾**: ئەگـەر بێدەسـتنوێژ، یـان جەنابەتـدار، یـان حـەیزدار ئاویـان دەسـت نەکەوت، بەڵام بەفر، یان تەزرەیان دەسـت کـەوتو نـەیانتوانی بیانتاوێننـەوە، ئەوانـەش هەر بە نەبوو دادەندرێن، واتە: تەیەممومم دەکەنو قەزاکردنەوەیان لە سەر نیە، هـەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام ئەگـەر دەیـانتوانی بیانتاوێننـەوە، ئـەو کاتـە واجبـە: بەکاریان بێنن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

واتە: واجبە بە تاواندنەوەیان خەریك بێ، بەو مەرجەی نەترسێ کاتی نوێژەکـە بـڕوا، جـا ئەمە دەریاەی ڕێبوار بوو، بەڵام نیشتەجێ لە سەری واجبە بە تاواندنەوەیان خەریك بـێ، هەر چەند کاتی نوێژەکەش بڕوا، چونکە نیشتەجێ لە بەر بێئـاویش تەیـەممومم بکـا هـەر واجبە نوێژەکە قەزا بکاتەوە، هەروەك باسمان کرد.

ئینجا بزانە: ئەگەر پیسیەکی بە لاشەیەوە بـوو، ئـەو کاتـە واجبـە ئاوەکـە لـە پێشـدا لـە لابردنی پیسیدا بەکار بێنێ، ئینجا تەیەممومم بکـا، واتـە: ئەگـەر تەیـەممومی کـرد ئینجـا پیسیەکەی لابرد، یان هەر لای نـەبرد، ئـەوە تەیـەمموی دروسـت نیـە، چـونکە مـەرجێکی دروسـتبوونی تەیـەممومم ئەوەیـە: هـیچ پیسـیەکی لێنـەبوردراوی بـە لاشـەیەوە نـەبێ، جیاوازی ڕێبوارو نیشتەجێش نیە–هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانـە– بـەڵام لە فەرموودەی (تحفة) دەفامێندرێتەوە: ئەگەر ئەوندە ئاوەش نەبو پیسیەکەی پێ لاببـا، ئەو کاتە تەیەممومی دروستە. لە (نهاية)دا دەفەرموێ: ئاشکرایە پیسبوونی ئەو بەرگـەی ناتوانێ دایبکەنێ، وەکو پیسبوونی لاشەی وایە.

ئینجا بزانە: ئەگەر میز، یان پیسایی کرد، مەرجە لە پێش تەیەممومم کردندا: یان بە ئـاو، یان بە بەرد تـارەت بکـا، جـا ئەگـەر تـارەتی نـەکردو تەیـەممومی کـرد، تەیەمومەکـەی دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَجِبُ شِرَاؤُهُ) واجبە: بۆ دەستنوێژو بۆ غوسل لە کاتی نوێژدا ئاو بکڕێ، یـان کەرسـتەی ئاو هەڵێنجان بکڕێ (بِثَمَنِ مِثْلِهِ) بە پارەی هاونرخی خۆی: لەو کاتو لـەو شـوێندا (إِلاَّ أَنْ يَحْتَاجَ إِلَيْهِ) مەگەر پێویستی بەو پارەیە هەبێ (لِدَيْنٍ مُسْتَغْرِقٍ) بۆ قەرزێکی وەهـا: گشـت ماڵی دابگرێ (أَوْ مُؤْنَةِ سفَرِهِ) یان پێویستی بە پارەکـە هـەبێ بـۆ ئـەرکی سـەفەر: وەکـو هاتنو چوونو خواردنو خەوتنو سواری.

(أَوْنَفَقَةِ حَيَوَانٍ مُحْتَرَمٍ) یـان پێویسـتی پـێ هـەبێ بـۆ بـەخێوکردنی گیانلەبـەرێکی ڕێزدار: وەکـو دایکـیو بـاوکیو منداڵـەکانیو ژنـەکانیو خزمـەتکارەکانیو ئاژەڵـەکانی، جگـە لـە

وَلَوْ وُهِبَ لَهُ مَاءٌ أَوْ أُعِيرَ دَلْواً وَجَبَ الْقَبُولُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وُهِبَ ثَمَنَهُ فَلاَ، وَلَوْ نَسِيَهُ فِي رَحْلِه أَوْ أَضَلَّهُ فِيهِ فَلَمْ يَجِدْهُ بَعْدَالطَّلَبِ فَتَيَمَّمَ قَضَى فِي الأَظْهَرِ، وَلَوْ أَضَلَّ رَحْلَهُ فِي رِحَالٍ فَلاَ يَقْضِي.

---

سەگی زیانبەخش‌و خزمی کافربوو و نوێژنەکەر بە مەرجی خۆی‌و، زیناکەری موحسەن، چونکە ئەوانە ڕێزدار نین.

جا ئەگەر یەکێکی لەو پێویستیانەی‌ڕابردوو هەبو، یان بە زیاتر لە پارەی هاونرخ ئاوەکەیان پێ‌دەفرۆشت، واجب نیە بیکڕێ، بەڵام ئەگەر پارەکەی لەو پێویستانە زیاد بوو، ئەو کاتە واجبە بە پارەی هاونرخ ئاوەکە بکڕێ، یان کەرستەی ئاو هەڵێنجان بکڕێ، مەبەستیش بە پارە -لێرەدا- تەنها دراو و پول نیە، بەڵکو هەر جۆرە ماڵێکی هەبێ، واجبە: ئاوی پێ‌بکڕێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلَوْ وُهِبَ لَهُ ماءٌ) ئەگەر بۆ دەستنوێژ، یان بۆ غوسل ئاوی پێ‌بەخشرا، یان ئاوی بە قەرز درایێ (أَوْ أُعِيرَ دَلْواً) یان دۆلچە، یان کەرستەیەکی‌تری ئاو هەڵێنجانی بە خواستن وێدرا (وَجَبَ الْقَبُولُ) واجبە بەخشینەکە، یان قەرزەکە، یان خواستنەکە قبوڵ بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بەوەندە منەتێکی گەورەی لە سەر ناکرێ (وَلَوْ وُهِبَ ثَمَنَهُ) بەڵام ئەگەر پارەی پێ‌بەخشرا تاکو ئاوی پێ‌بکڕێ، یان پارەی ئاوکڕینی بە قەرز درایێ، یان کەرستەی ئاو هەڵێنجانی بە قەرز درایێ (فَلا) واجب نیە بەخشینی پارە، یان قەرزەکان قبوڵ بکا، چونکە منەتی گەورەیە.

(وَلَوْ نَسِيَه فِي رَحْلِه) ئەگەر ئاوەکەی، یان کەرستەی ئاو هەڵێنجانی لە ناو باری خۆی‌دا لەبیر چوو (أَوْ أَضَلَّه فِيهِ) یان لە ناو بارەکەی‌دا ونی کرد (فَلَم يَجِدْه بَعْدَالطَّلَبِ) پاش ئەوەی زۆر بە دوای‌دا گەڕا نەیدۆزیەوە (فَتَيَمَّمَ) جا تەیەمومی کردو نوێژی پێوە کرد (قَضَى ) واجبە نوێژەکە بە دەستنوێژ قەزا بکاتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە لە ڕاستی‌دا ئاوی هەیە، بەڵام کەم‌وکوڕی لە خۆیەتی (وَلَوْ أَضَلَّ رَحْلَه فِي رِحَالٍ) بەڵام ئەگەر ئاوەکە لە ناو بارەکەی‌دا بوو، بارەکەشی لە ناو باری هاوڕێکانی‌دا ون کرد (فَلا يَقْضِي) قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، چونکە کەم و کوڕی لە خودی‌خۆی نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر یەکێك ئاوی لە لا هەبو و پێویستیشی پێ‌نەبو، بەڵام یەکێکی‌تر -بۆ دەستنوێژ، یان بۆ غوسل- پێویستی پێ‌هەبو و داوای ئاوەکەی لێ‌کرد، خاوەن ئاوەکەش نە بە فرۆشتن‌و نە بە بەخشین‌و نە بە قەرز ئاوەکەی نەدایێ، ئەوە دروست نیە بە هێزو توانا ئاوەکەی لێ‌بستێنێ، بەڵکو تەیەموم دەکاو قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەها لە سەر خاوەن ئاوەکەش واجب نیە بۆ دەستنوێژو بۆ غوسل ئاو بداتە

یەکێکیتر، بەڵام بۆ خواردنەوە لە بەر زۆر تێنووەتی دروستە: بە هێزو تواناش ئاوەکەی لێبستێنێ—واتە: بە پارە، یان بە قەرز— ئەگەر خاوەنەکەی پێویستیی پێنەبێ، چونکە لە دەستنوێژو غوسلدا خوایگەورە گلی بە جێگریئاو داناوە، بەڵام لە پاراستنی گیاندا هیچ شتێك جێگری گیان نیە.

ئینجا بزانە: بە هیچ جۆرێك دروست نیە ئاوی دزراو، یان زەوتکراو، یان بە ئەمانەت داندراو، بەکار بێ: نە بۆ دەستنوێژو نە بۆ غوسل، بەڵکو تەیەمموم دەکاو قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە، جا ئەگەر بەو جۆرە ئاوانە دەستنوێژی گرت، یان غوسلی کرد، گوناهبار دەبێ، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا دەستنوێژو غوسلو نوێژەکەی دروستە، ئەم ئاگاداریە لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ تەیەمموم بە هۆی تێنووەتی ﴾

(اَلثَّانِي) دووەم لە هۆیەکانی تەیەمموم: نەبوونی ئاوە بەگوێرەی شەرع، واتە: ئاوەکە هەبێ، بەڵام شەرع ڕێگەی بەکارهێنانی نەدا: وەکو ئاوەکە پیس بێ، یانوەکو (أَنْ يُحْتَاجَ إِلَيْهِ) پێویست بە ئاوەکە ببێ (لِعَطَشِ مُحْتَرَمٍ) بۆ تێنووەتی گیانلەبەرێکی ڕێزدار—بە بەڵگەی (اجماع)— (وَلَوْ مَآلاً) هەر چەند پێویستیەکەش ئێستا نەبێ بەڵکو لە مەودوا بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَاالنَّاسَ جَمِيعاً﴾ هەر کەسێك ئادەمیزادێك لە مردن ڕزگار بکا، خێری وەك هەموو خەڵکی ڕزگار کردبێ ئەوهایە.

کەوابو: ئەگەر دەیزانی یەکێك لە هاوڕێکانی لە بەر تێنووەتی پێویستی بە ئاو هەیە —ئێستا، یان لە مەودوا— واجبە تەیەمموم بکاو لە کاتی پێویستیدا ئاوەکەی بداتێ: یان بە پارە، یان بە خۆڕایی، واتە: دروست نیە ئاوەکە: نە بۆ دەستنوێژو نە بۆ غوسلو نە بۆ لابردنی پیسی بەکار بێنێ، بەڵکو بە پیسیەوە نوێژ دەکاو قەزای دەکاتەوە؟ چونکە بە پیسیەوە نوێژی کردوە، هەروەك لە (الشراونی)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: لە پێویستی تینووەتیدا جیاوازی نیە گیانلەبەرەکە: بە خۆی بێ، یان کەسێکیتر بێ، خزم بێ، یان بێگانە بێ، یان ئاژەڵ بێ، گۆشتی بخورێ، یان نا، واتە: حەڕامە ئاوەکە لە دەستنوێژو غوسل بەکار بێنێ، بەڵکو واجبە ئاوەکە بۆ خواردنەوە دابنێو تەیەمموم بکا، قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە.

بەڵام ئەگەر گیانلەبەرەکە ڕێزدار نەبو: وەکو سەگی زیانبەخشو بەرازو جەنگاوەریکافرو موسڵمانیکافربوو و نوێژنەکەرو...هتد ئەوانەی کوشتنیان دروستە، ئەوە دروست نیە ئاوەکەیان بداتێ، بەڵکو واجبە: لە دەستنوێژو غوسلدا بەکاری بێنێ، واتە: ئەگەر

اَلثَّالِثُ: مَرَضٌ يَخَافُ مَعَهُ مِنَ اسْتِعْمَالِهِ عَلَى مَنْفَعَةِ عُضْوٍ، وَكَذَا بُطْءُ الْبُرْءِ أَوِ الشَّيْنُ الْفَاحِشُ فِي عُضْوٍ ظَاهِرٍ فِي الأَظْهَرِ، وَشِدَّةُ الْبَرْدِ كَمَرَضٍ،

---

ئاوەکەی دانێو تەیەمومی کرد، گوناهبار دەبێو واجبە: نوێژەکەش قەزا بکاتەوە، هەروەها ئەگەر ئاوەکە خێراتی‌خواردنەوە بوو، دروست نیە بۆ دەستنوێژو غوسل بەکاری بێنێ، بەڵکو تەیەمموم دەکاو قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ئەو مەسەلانەیان ڕوون کردونەوە.

هەروەها ئەگەر ڕێبوارە تینووەکە سەفەرەکەی تاوانباری بوو، ئەوە تا تۆبە نەکا دروست نیە تەیەمموم بکا، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ تەیەمومی بە هۆی نەخۆشیو سەرماو برینداری ﴾

(اَلثَّالِثُ) سێیەم لە هۆیەکانی‌تەیەمموم: (مَرَضٌ) نەخۆشی، یان برینێکی وەهایە: کە (يَخَافُ مَعَه مِنْ اسْتِعْمَالِه) ترسی هەبێ ئەگەر لە گەڵ ئەو نەخۆشیە، یان ئەو برینەدا، ئاو بەکار بێنێ (عَلَى مَنْفَعَةِ عُضْوٍ) ئەندامێك، یان سودی ئەندامێکی نەمێنێ: وەکو کوێر ببێ، یان ئەندامێکی لێببێتەوە، یان شەلەپەتە ببێ، یان کەڕ ببێ، یان نەخۆشیەکی‌تری تووش ببێ، واتە: بۆی دروستە: تەیەمموم بکا، بە بەڵگەی ئایەتی (وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى)ی‌ڕابردوو.

(وكذا بُطْءُ الْبُرْءِ) هەروەها درەنگ چاکبوونەوەی نەخۆشی‌و برین‌و زێدەبوونی نەخۆشی‌و زیدەبوونی ئازار، گشتی وەکو نەخۆشی وایە (أَوِ الشَّيْنُ الْفَاحِشُ) یان پەڵەیەکی زۆر ناشیرن پەیدا ببێ (فِيعُضْوٍظَاهِرٍ) لە ئەندامێکی‌دەرەوە: وەکو دەست‌و ڕوخسار، ئەویش وەکو نەخۆشی وایە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: لە هەردوو مەسەلەکەدا.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە تەیەمومی نەخۆشی‌و برینداری‌دا جیاوازی ڕێبوارو نیشتەجێ نیەو جیاوازی بێ‌دەستنوێژی بچوك‌و گەورەش نیە، هیچیان قەزاکردنەوەیان لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَشِدَّةُ الْبَرْدِ) سەرمای بەهێز (كَمَرَضٍ) وەکو نەخۆشی وایەو دەبێتە هۆی دروستبوونی تەیەمموم: بۆ ڕێبوارو بۆ نیشتەجێ، بەو مەرجەی هیچی دەست نەکەوێ ئاوی پێ‌گەرم بکا، یان خۆی پێ گەرم بکاتەوە ﴿عن عَمْرو بن العاصﷺ: أَنَّهُ احْتَلَمَ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ، فَأَشْفَقَ أَنْ يَغْتَسِلَ فَتَيَمَّمَ ثُمَّ صَلَّى بِأَصحابِه، فَذَكَرُوا ذلِكَ لِلنَّبِيِّﷺ فَلَمْ يُنْكِرْ عَلَيْهِ﴾ رواه ابوداود موصولا والبخاري تعليقاً، حەزرەتی (عەمر)ی کوڕی(عاس) لە شەوێکی سارددا لەشی بە جەنابەت بوو، لە ترسی سەرما نەیوێرا غوسل بکا، بەڵکو تەیەمومی کردو نوێژی بەیانی‌ی بە جەماعەت بۆ هاوڕێکانی کرد، جا ئەمەیان بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد، ئەویش ڕەخنەی لێ‌نەگرت.

وَإِذا امْتَنَعَ اسْتِعْمالُهُ فِي عُضْوٍ: إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ سَاتِرٌ وَجَبَ التَّـيَمُّمُ وَكَـذا غَسْـلُ الصَّحِيحِ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

ئینجا بزانه: ئەگەر شتێکی دەست کەوت ئاوی پێ گەرم بکا، واجبە: ئاوەکە گەرم بکا، هەر چەند کاتی نوێژەکەش نەمێنێ، هەروەها واجبە: هەوڵ بدا کەرستەی ئاو گەرم کردنیش پەیدا بکا، هەرچەند کاتی نوێژەکەش نەمێنێ، واتە: لە هەردوو مەسەلەکەدا بۆی دروست نیە بە تەیەممومم نوێژەکە لە کاتی خۆیدا بکا، چونکە ئاو هەیە، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی.

هەروەها ئەگەر بەکرێی هاونرخ ئاوەکەی بۆ گەرم دەکرا، یان بە پارەی هاونرخ ئاوی گەرمی پێ فرۆشرا، واجبە جێبەجێی بکاو دروست نیە تەیەمموم بکا نە لە سەفەرو نە لە ماڵەوە، هەروەها ئەگەر دەوێرا بەشێکی ئەندامەکانی بشۆرێ، واجبە بیانشۆرێو لە جیاتی ئەوەش کە ناوێرێ تەیەمموم دەکا، هەروەها ئەگەر دەیتوانی یەکە یەکە گشت ئەندامەکانی بشۆرێ دیسانواجبە وابکا.

جا بزانە: بە هەرجۆرێك لە ترسی سەرما تەیەمموم بکا، هەر واجبە قەزا بکاتەوە، جیاوازی ڕێبوارو نیشتەجێ نیە، هەروەك لە(المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر پیاوێك لە شوێنێك خەوتو جەنابەتی تووش بوو، شوێنەکەش ئافرەتی لێبوو و ئەگەر غوسلی کردبا، دەترسا بوختانێکی پێبکرێ، ئەویش لە سەری واجبە ئەوندەی دەوێرێ لە ئەندامەکانی بشۆرێ، ئینجا دروستە: تەیەمموم بکاو نوێژەکەش بکا، ئینجا کە غوسلی کرد، واجبە نوێژەکە قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (الشروانی) لە باسی جەنابەتدا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِذا امْتَنَعَ اسْتِعْمالُهُ) هەر کاتێك قەدەغە بوو نەوێرا ئاو بەکار بێنێ (فِيعُضْوٍ) لە ئەندامێك، واتە: لە شوێنێکی لەشیدا: بە هۆی برینداری، یان شکست، یان نەخۆشی (إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِ ساتِرٌ) ئەگەر داپۆشەر لە سەر شوێنەکە نەبو (وَجَبَ التَّيَمُّمُ) واجبە: تەیەممومێکی تەواو بکا، لە جیاتی شۆردنی شوێنەکە (وَكَذا غَسْلُ الصَّحِيحِ) هەروەها واجبە شوێنی ساغیش بشۆرێ ئەگەر بتوانێ (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

ئینجا بزانە: واجبە شوێنی دەوروبەری برینەکەش بشۆرێ، جا ئەگەر دەترسا برینەکە تەڕ ببێ، ئەوە بە هۆی شتێکی وەکو پەڕۆ دڵۆپە دڵۆپە ئاوی بە سەردا دەکا، ئیتر واجب نیە برینەکە بە ئاو مەسح بکا، بەڵام ئەگەر برینەکە لە ئەندامی تەیەممومدا بوو، واجبە بە تۆزی گڵ مەسح بکرێ، جا لە تەیەممومی ئەو بریندارو شکستەدا جیاوازی بێ دەستنوێژی بچوكو جەنابەتدارو زەیسانیو حەیزدار نیەو هیچیان قەزاکردنەوەیان لە سەر نیە.

وَلاَ تَرْتِيبَ بَيْنَهُما لِلْجُنُب، فَإِنْ كانَ مُحْدِثاً فَالأَصَحُّ اشْتِراطُ التَّيَمُّمِ وَقْتَ غَسْلِ الْعَلِيلِ، فَإِنْ جُرِحَ عُضْوَاهُ فَتَيَمُّمَان، فَإِنْ كانَ كَجَبِيرَة

---

بەلام ئەگەر نەیتوانی گشت شوێنە ساغەکانی بشۆرێ، واجبە: داوای یارمەتیدان لە یەکێکیتر بکا، هەرچەند بە کرێی هاونرخیش بێ، جا ئەگەر نەبو، واجبە بە گوێرەی توانای بیشۆرێو لە جیاتی شوێنە نەشۆراوەکەو برینداره‌کە تەنها یەك تەیەمموم دەکا، بەلام واجبە قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلا تَرْتِيبَ بَيْنَهُما) ڕیز واجب نیە لە نێوان تەیەممومو شۆردنی بەشە ساغەکەدا (لِلْجُنُبِ) بۆ جەنابەتدارو زەیسانیو حەیزدار، بەلام سوننەتە لە پێشدا تەیەمموم بکا، ئینجا ساغەکە بشۆرێو بە پێچەوانەش دروستە، هەرچەند برینەکەش لە ئەندامەکانی دەستنوێژدا بێ، چونکە گشت لەشی جەنابەتدارو حەیزدار بە یەك ئەندام دادەندرێ.

جا ئەگەر برینەکە، یان شکستەکە لە ئەندامەکانی دەستنوێژدا نەبو، واجبە: لە جیاتی جەنابەتو حەیز بۆ هەموو نوێژێك تەیەمموم بکاو ئەگەر بێدەستنوێژیش بوو دەستنوێژ بگرێ، هەر وەکو لە (شرح المنهج)و (بجیرمی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ كان مُحْدِثاً) بەلام ئەگەر بێدەستنوێژی بچوك بوو و برینەکەش لە ئەندامەکانی دەستنوێژدا بوو، ئەوە ڕیز واجبە، کەوابو: (فَالأَصَحّ) بە فەرموودەی ڕاستر (إشْتِراطُ التَّيَمُّم) مەرجە تەیەمموم بکا (وَقْتَ غَسْلِ العَلِيلِ) لەو کاتەی نۆبەتی شۆردنی ئەندامە برینداره‌کە دێ، تاکو ڕیزەکەی دەستنوێژ بێتە جێ، چونکە لە دەستنوێژدا دروست نیە دەستنوێژ، یان تەیەممومی ئەندامێکی تەواو نەبوبێو دەست بە ئەندامەکەی دوای وی بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ جُرِحَ عُضْواهُ) جا ئەگەر دوو ئەندامی دەستنوێژی بریندار بون: وەکو ڕوخسارو دەستی بریندار بوبن (فَتَيَمُّمانِ) دوو تەیەمموم واجبن، تاکو ڕیزەکە بێتە جێ، واتە: تەیەممومێکیتەواو لە جیاتی برینەکەی ڕوخساری دەکاو شوێنە ساغەکەی ڕوخساریش دەشۆرێ، ئینجا تەیەممومێکیتریش لە جیاتی برینەکەی دەستی دەکاو شوێنە ساغەکەی دەستەکانیشی دەشۆرێ، ئینجا مەسحی سەری دەکا.

هەروەهاش ئەگەر برینەکە لە سێ ئەندامی دەستنوێژدا بوو-جگە لە سەر- ئەو کاتە سێ تەیەمموم بەو شێوەیە واجبەو سەریشی بە ئاو مەسح دەکا، جا ئەگەر لە چوار ئەندامەکەی دەستنوێژ هیچ شوێنی ساغی نەمابێ-وەکو سوتابێ- ئەو کاتە یەك تەیەمموم بەسە، چونکە واجب نیە ئاو بە کار بێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِن كانَ) بەلام ئەگەر داپۆشەرێکی وەها لە سەر شوێنەکە هەبو ڕێگەی ئاوی دەگرت (كَجَبِيرَة) وەکو پێچەری شکستو پێچەری برینو مەزلەمەو مەلحەمو...هتد ئەو جۆرە

لاَ يُمْكِنُ نَزْعُهَا غَسَلَ الصَّحِيحَ وَتَيَمَّمَ كَما سَبَقَ، وَيَجبُ مَعَ ذلكَ مَسْحُ كُلِّ جَبِيرَتِــه بماء، وَقيلَ بَعْضُها، فَإذا تَيَمَّمَ لفَرْضٍ ثَانٍ وَلَمْ يُحْدِثْ لَمْ يُعِدِ الْجُنُبُ غَسْــلاً، وَيُعِيــدُ الْمُحْدِثُ ما بَعْدَ عَليله وَقِيل يَسْتَأْنِفان

---

دەرمانانەی ڕێگەی ئاو دەگرن (لاَيُمْكِنُ نَزْعُها) ناشکونجا پێچەرەکەو دەرمانەکە لابدرێو ئـاو بگاتـە شـوێنەکە، ئـەو کاتـە (غَسَـلَ الصَّـحِيحَ) شـوێنی سـاغ دەشـۆرێو (وَيَتَـيَمَّمُ) تەیەمومیش دەکا (كَماسَبَقَ) بەو شێوەی تازە ڕابرا لە باسی تەیەمومی برینو شۆردنی شوێنە ساغەکەو ڕیزی بێدەستنوێژو دوو تەیەمومو سێ تەیەموم.

بەڵام (وَ يَجبُ معَ ذلكَ) لە گەڵ ئەوەی ڕابردووشدا واجبە (مَسْحُ كُلِّ جبَيرَتِـه بِمـاءٍ) گشت پێچەرەکە، یان دەرمانەکە لە نۆبەتیئەندامەکەیدا بە ئاو مەسح بکا ﴿عن ابن عمررضـیالله عنهما: أنَّهُ تَوَضَّأَ وَكَفُّهُ مَعْصُوبَةٌ فَمَسَحَ عَلَيْها وَعَلىالْعِصابَةِ وَغَسَــلَ ماسِــوى ذلِــكَ﴾ رواه البيهقي باسناد صحيح، حەزرەتی(عبدالله ﷺ) دەستنوێژی گرتو لەپەدەستی پێچرا بـوو، مەسحی لە سەر لەپەدەستو پێچەرەکە کـردو ئەوەیتریشـی شـۆرد. (وَقِيـلَ بَعْضُـها) لـە فەرموودەی بێهێزدا بەشێکی پێچەرەکە مەسح بکرێ بەسە.

ئینجا بزانە: ئەگەر دەگونجا پێچەرەکە، یان دەرمانەکە لا بـدرێو زیانیشـی نـەبو، واجبـە لابدرێو شوێنەکە بشۆرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ **ئـاگـــاداری** ﴾: مەرجـە پێچـەرەکە تـەنها بـە ئەنـدازەی پێویسـتیگیربوونو وەسـتانی خوێنو ڕاوەستانی دەرمانو شکست، شوێنە ساغەکە داپۆشێ، واتە: ئەگەر لەو ئەنـدازە پێویستە زیاتر لـە شـوێنی سـاغ داپۆشـێ، واجبـە نوێژەکـە قـەزا بکاتـەوە-هـەروەك لـە (القليـوبی)و (الشبراملسـی)دا ڕوون کراوەتـەوە- هـەروەها ئەگـەر پێچـەرەکە لـە کـاتی بێدەسـتنوێژیدا پێچـرا بـوو، یـان لـە ئەندامـەکانی تەیـەموم پێچـرا بـوو، واجبـە: قـەزا بکاتەوە، هەروەك لە کۆتایی تەیەمومدا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

(فَـإذا تَـيَمَّمَ) جـا ئەگـەر ئـەو برینـدارەیڕابردوو، نوێـژێکی واجبـی کـردو ویسـتی تەیـەمومێکیتر بکـا (لِفَرْضٍ ثـانٍ) بـۆ نوێـژە فـەرزێکیتر (وَلَـمْ يُحْـدِثْ) تەیەمومەکـەی پێشووی-کە نوێژی پێوەکردبو- هەر مابو، بەتاڵ نەبوبو (لَمْ يُعِدِالْجُنُبُ غَسْلاً) برینـداری جەنابەتـدار، یـان حـەیزدار غوسلەکە-واتـە: شـۆردنی هـیچ شـوێنێکی لـەش- دووبـارە ناکەنەوە، بەڵکو تەنها تەیەموم دووبارە دەکەنەوە، چونکە جەنابەت بە تەنها بۆ هەموو نوێـژێك تەیـەموم واجـب دەکـا، هـەروەك لـە (تحفـة)دا لـە باسـی بێدەسـتنوێژیدا فەرموویەتی (وَيُعِيدُ الْمُحْدِثُ ما بَعْدَ عَليله) لە فەرموودەیەکدا: بێدەستنوێژ شۆردنی دوای برینەکە دووبارە دەکاتەوە (وَقِيل يَسْتَأْنِفانِ) لە فەرموودەیەکیتردا: هەردووکیان غوسلو دەستنوێژ دووبارە دەکەنەوە، بەڵام ئەم دوو فەرموودەیە بێهێزن.

وَقِيلَ اَلْمُحْدِثُ كَجُنُبٍ، قُلْتُ: هذَاالثَّالِثُ أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ.

(وَقِيلَ) له فەرموودەی سىێیەمدا (اَلْمُحْدِثُ كَجُنُبٍ) بىٚدەستنوێژیش وەكو جەنابەتدار وایە (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفەرموێ (هـذا الثَّالِثُ أَصَحُّ والله اعلم) ئەم فەرموودە سىێیەمە ڕاسـترە، كەواتـە: بىٚدەسـتنوێژیش وەكـو جەنابەتـدار-بـۆ نوێـژێكیتر- تـەنها تەیـەمموم دووبارە دەكاتەوە، بەو مەرجەی دووبارە بىٚدەستنوێژ نەبوبیٚ، بـەڵام ئەگـەر تەیەممومەكـەی پێشووی نەمابو، یان دووبارە بىٚدەستنوێژ بوو، یان دووبـارە تووشـی جەنابـەت، یـان حـەیز، یان زەیسانی بوو، ئەو كاتە بۆ نوێژێكیتر، واجبە: تەیـەممومو دەسـتنوێژو غوسـلو مەسـحی پێچەرو شۆردنی شوێنە ساغەكە، گشـتی دووبـارە بكرێنـەوە، بـەو شـێوەی لـە تەیـەمموومی بریندار‌دا باسمان كرد، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: تەیەممووم دەستنوێژی ناچاریەو هیچ بىٚدەسـتنوێژیەكی گـەورەو بچـووك لانابا-هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە- واتە: تەیەمموم نوێژو تەوافو قورئـانو ئـەو شتانەی بە جەنابەتو حەیز حەڕامن لە بـەر ناچـاری حـەڵاڵیان دەكـا، كەواتـە: هـەر كاتێك بىٚدەستنوێژو جەنابەتدارو زەیسـانیو حـەیزدار لـە دوای تەیـەمموم كـردن ئاویـان دەسـت كەوت، واجبە ئەو بۆ نوێژكردن دەستنوێژ بگرێ، ئەمانەش واجبـە غوسـل بكـەن، هـەروەها نەخۆشیش هەر كاتێك چاك بۆوە، واجبـە بـۆ نوێـژ دەسـتنوێژ بگـرێو لـە بـەر جەنابـەتو حەیزیش واجبە غوسل بكا، لە (المجموع)دا بەڵگەی بە چـەند حەدیسـێك هێناوەتـەوە: وەك حەدیسەكەی (أبیذر)و (عمرو بن العاص)رَضِیَ اللهُ عَنْهُمَا-كە ڕابران- بەم حەدیسەش:

﴿عن عمران بن الحصینﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ رَأَى رَجُلاً مُعْتَزِلاً لَمْ يُصَلِّ مَعَ الْقَوْمِ، فَقَـالَ: يَـا فُلاَنُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ الْقَوْمِ؟ فَقَالَ: أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ، فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ، فَلَمَّا حَضَرَالْمَاءُ أَعْطَى الرَّجُلَ إِنَاءً فَقَالَ: اِغْتَسِلْ بِهِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبـەرﷺ پیاوێكی دیت: خۆی جیا كردبۆوەو لە گـەڵ سـەحابەكاندا نوێـژی نـەكرد، جـا فـەرمووی: فڵان ئەوە بۆ نوێژت نەكرد؟ گوتی: جەنابەتم تووش بـووە، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: گڵ بەكار بێنە بۆت دروستە. ئینجا كە ئاو پەیدا بوو پێغەمبەرﷺ قاپە ئـاوێكی دا پیاوەكـەو فەرمووی: غوسلی پىٚبكە. واتە: چونكە بە تـەیەممومەكـە جەنابـەتی لانەچـوبو و ئـاویش پەیدا بوو، ناچاری نەما.

ئینجا بزانە: هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسانە، هەر كاتێك برین، یان شكست چاك بۆوەو لـە دوای تەیەممومیش دووبارە تووشـی بىٚدەسـتنوێژی، یـان جەنابـەتو حـەیز نـەبو، ئـەوە تەنها شوێنی برینەكە، یان شكستەكە واجبە بە نیەتی دەسـتنوێژ، یـان غوسـل بشـۆرێ، بەڵام لە دەستنوێژدا ئەندامەكانی دوای ئەندامە بریندارەكـەش واجبـە بشـۆرێنەوە؟ تـاكو ڕیزی دەستنوێژ بێتەجیٚ، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(فَصْلٌ) يَتَيَمَّمُ بِكُلِّ تُرَابٍ طَاهِرٍ حَتَّى مَا يُدَاوَى بِهِ وَبِرَمْلٍ فِيهِ غُبَارٌ، لاَ بِمَعْدَنٍ وَسُحَاقَةِ خَزَفٍ وَمُخْتَلِطٍ بِدَقِيقٍ وَنَحْوِهِ، وَقِيلَ: إِنْ قَلَّ الْخَلِيطُ جَازَ، وَلاَ بِمُسْتَعْمَلٍ عَلَى الصَّحِيحِ وَهُوَ مَا بَقِيَ بِعُضْوِهِ وَكَذا مَا تَنَاثَرَ فِي الأَصَحِّ،

---

بەڵام ئەگەر لە دوای تەیەممووم چاك بۆوەو دووبارەش تووشی بێدەستنوێژی، یان جەنابەت، یان حەیز بوو، ئەو کاتە واجبە بێدەستنوێژەکە دەستنوێژێکی تەواو بگرێو جەنابەتدارو حەیزداریش غوسلێکی تەواو بکەن، هەروەك لە پێش حەدیسەکەدا باسمان کرد، ئینجا بزانە: ئەگەر پێچەرەکەی لاداو دیتی برینەکە ماوەیەکە چاك بۆتەوە، ئەو کاتە واجبە نوێژەکانی ئەو ماوەیەی دوای چاکبوونەوە گشتیان قەزا بکاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ڕوکنەکانی تەیەممووم و چۆنیەتی تەیەممووم کردن ﴾

(يَتَيَمَّمُ) دروستە تەیەممووم بکا (بِكُلِّ تُرابٍ طاهِرٍ) بە گشت گڵێکی پاك کە تۆزی هەبێ، جا ڕەش بێ، یان زەرد بێ، یان سوور بێ (حَتَّى مايُداوَى بِهِ) تا تەیەممووم بەو جۆرە گڵەش دروستە: کە بۆ دەرمان بەکار دێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً﴾ تەیەممووم بکەن بە گڵێکی تۆزداری پاك. واتە: بە تۆزی گڵی پیس تەیەممووم دروست نیە (وَبِرَمْلٍ فِيهِ غُبارٌ) تەیەممووم بە لیمێکی وەهاش دروستە: کە تۆزی تێدا بێ، بەو مەرجەی ئەوەندە ورد نەبێ: بە ئەندامەکانەوە گیر ببێ.

(لا بِمَعْدِنٍ) بەڵام تەیەممووم بە کانگە دروست نیە، وەکو گۆگردو نۆرەو کلو ئەو جۆرە شتانە (وَسُحاقَةِ خَزَفٍ) تەیەممووم بە تۆزی گۆزەی وردکراو و بە تۆزی بەردی وردکراو دروست نیە؟ چونکە ئەو شتانە گڵ نین، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿جُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّها مَسْجِداً وَتُرْبَتُها طَهُوراً﴾...الحديث رواه مسلم، زەمین گشتی بۆ ئێمەی موسڵمان کراوەتە شوێنی نوێژ، گڵەکەشی کراوەتە دەستنوێژگر.

هەروەها بەو گڵەش دروست نیە: کە بە ئاگر سوتێندرابێ (وَمُخْتَلِطٍ بِدَقِيقٍ) هەروەها دروست نیە تەیەممووم بەو گڵە بکا کە تێکەڵی ئارد بووە (وَنَحْوِهِ) یان تێکەڵی شتێکی وەکو ئارد بووە: وەکو گەچو چیمەنتۆ، جا کەم بێ، یان زۆر بێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (إِنْ قَلَّ الْخَلِيطُ جازَ) ئەگەر شتە تێکەڵبووەکە کەم بێ دروستە.

(وَلا بِمُسْتَعْمَلٍ عَلَى الصَّحِيحِ) هەروەها دروست نیە بە گڵی بەکارهاتوو تەیەممووم بکرێ، لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَهُو مابَقِيَ بِعُضْوِهِ) گڵی بەکارهاتوو ئەو گڵەیە: کە بە ئەندامەکەیەوە دەمێنێتەوە لە دوای تەیەممووم کردن (وَكَذا ما تَناثَرَ فِي الأَصَحِّ) هەروەها ئەوەی لە ئەندامەکەی جیا دەبێتەوە هەر بە بەکارهاتوو دادەندرێ، لە فەرموودەی

وَيُشْتَرَطُ قَصْدُهُ، فَلَوْ سَفَتْهُ رِيحٌ عَلَيْهِ فَرَدَّدَهُ وَنَوَى لَمْ يُجْزِئْ، وَلَوْ يُمِّمَ بِإِذْنِهِ جَازَ، وَقِيلَ: يُشْتَرطُ عُذْرٌ. وَأَرْكَانُهُ: نَقْلُ التُّرَابِ، فَلَوْ نَقَلَ مِنْ وَجْهٍ إِلَى يَدٍ أَوْ عَكَسَ

---

ڕاستتردا، کەوابو: ئەگەر کۆمەڵێك چەندەها جار تەیەمموم بە گڵێکیکەم بکەن، دروستەو ناشبێتە بەکارهاتوو، هەر چەند مستە گڵێکیش بێ لە ناو کیسەیەکدا لە گەڵ خۆیاندا بیگێڕن، بەڵام بەو مەرجەی هیچ تۆزێك لە ئەندامەکانەوە نەکەوێتە ناو گڵەکە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ بۆ دروستبوونی تەیەمموم (قَصْدُهُ) بە مەبەستی گواستنەوە تۆزەکە لە گڵەکەوە بگوازێتەوە بۆ ئەندامەکان، چونکە ئەمە واتەی (فَتَيَمَّمُوا)وە لە ئایەتەکەدا (فَلَوْسَفَتْهُ رِيحٌ عَلَيْهِ) ئەگەر با تۆزەکەی بە سەر ئەندامەکەیدا کرد (فَرَدَّدَهُ) ئینجا ئەویش دەستی خۆی بە سەردا هێناو (وَنَوَى) نیەتی تەیەممومیشی هێنا (لَمْ يُجْزِئْ) تەیەممومەکەی دروست نیە، هەرچەند بە ویستی خۆیشی لە بەرامبەر با ڕابوەستێ تا تۆزی وێبکەوێ؟ چونکە گواستنەوەی تێدا نیە.

(وَلَوْ يُمِّمَ بِإِذْنِهِ) بەڵام ئەگەر بە ئیزندانی وی تەیەمومی بۆ کرا (جازَ) تەیەممومەکە دروستە، هەروەك دەستنوێژیش دروستە، چونکە ئیزندانەکەی وەکو کرداریخۆیەتی، کەوابو: ئەگەر بە بێئیزنی وی تەیەمومی بۆ کرا، ئەوە دروست نیە هەر چەند نیەتیش بێنێ، وەکو مەسەلەی بایەکە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُشْتَرَطُ عُذْرٌ) بە مەرج دادەندرێ عوزرێك هەبێ: وەکو نەخۆشیو بێدەستیو ئەو جۆرە شتانە.

ئینجا بزانە: مەرج نیە: تۆزەکە لە گڵ بگوازرێتەوە، بەڵکو هەر شتێك تۆزی گڵێکی پاکی پێوەبێ، دروستە دەستی لێبداو تەیەمومی پێبکا: وەکو دیوارو بالیفو جلو ڕایەخو گەنمو جۆی تۆزاویو ئاژەڵی تۆزاویو...ئەو جۆرە شتانە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عن أبي الجُهَيْم ﷺ سَلَّمَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلامَ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی نەداوە تا ڕووی کردە دیوارێکو ڕوخسارو هەردوو دەستەکانی بە تۆزی دیوارەکە مەسح کردن، ئینجا وەڵامی سەلامی داوە.

## ﴿ ڕوکنەکانی تەیەمموم ﴾

(وَأَرْكَانُهُ) ڕوکنەکانی تەیەمموم پێنجن، یەکەم: (نَقْلُ التُّرابِ) گواستنەوەی تۆزی گڵە: لە شوێنیخۆی بۆ ئەندامەکانیتەیەمموم (فَلَوْ نَقَلَ مِن وَجْهٍ) ئەگەر تۆزەکەی لە ڕوخسارەوە گواستەوە (إِلَى يَدٍ) بۆ دەستێك، واتە: لە دوای تۆزیتەیەمموم تۆزێکیتر هاتە سەر ڕوخساریو دەستی لێداو گواستیەوەو دەستەکەی پێ مەسح کرد (أَوْ عَكَسَ) یان بە

كَفَى فِي الأَصَحِّ. وَنِيَّةُ اسْتِبَاحَةِ الصَّلاَةِ لاَ رَفْعِ حَدَثٍ، وَلَوْ نَوَى فَرْضَ التَّيَمُّمِ لَمْ يَكْفِ فِي الأَصَحِّ، وَيَجِبُ قَرْنُهَا بِالنَّقْلِ وَكَذا اسْتِدَامَتُهَا إِلَى مَسْحِ شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ عَلَى الصَّحِيحِ، فَإِنْ نَوَى فَرْضاً وَنَفْلاً أُبِيحَا، أَوْ فَرْضاً فَلَهُ النَّفْلُ عَلَى الْمَذْهَبِ، أَوْ نَفْلاً أَوِ الصَّلاَةَ تَنَفَّلَ

---

پێچەوانەی کرد، واتە: تۆزی سەر دەستی گواستەوەو ڕوخساری پێ مەسح کرد (كَفَى فِي الأَصَحِّ) تەیەممومەکەی دروستە لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە گواستنەوەی ڕاستەقینە هاتۆتە جێ، کە باسمان کرد.

دووەم: (وَنِيَّةُ اسْتِبَاحَةِ الصَّلاَةِ) نیەتهێنانە، واتە: نیەتی حەڵاڵکردنی نوێژ، یان تەواف، یان دەست لێدانی قورئان، یان چوونە مزگەوت...هتد، وەك بە دڵ بڵێ: (نَوَيْتُ اسْتِبَاحَةَ الصَّلاَةِ) نیەتم وەیە نوێژ لە خۆم حەڵاڵ دەکەم...هتد، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ﴾ی ڕابردوو لە دەستنوێژدا.

جا بزانە: لەم نیەتەدا جیاوازی بێدەستنوێژو جەنابەتدارو حەیزدار نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا وەردەگیرێ (لاَ رَفْعِ حَدَثٍ) بەڵام نیەتی لابردنی بێدەستنوێژیی بچوك، یان گەورە دروست نیە، چونکە تەیەممم بێدەستنوێژی لانابا (وَلَوْ نَوَى فَرْضَ التَّيَمُّمِ) ئەگەر نیەتی هێنا: فەرزی تەیەممم بەجێ بهێنێ، یان نیەتی هێنا: تەیەممم بکا (لَمْ يَكْفِ فِي الأَصَحِّ) ئەم نیەتانەش دروست نینە لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە تەیەممم دەستنوێژی ناچارییە، هەروەك لە کۆتایی تەیەمممیبریندارردا بە بەڵگەوە باسمان کرد.

(وَيَجِبُ قَرْنُهَا بِالنَّقْلِ) واجبە: نیەتەکە بەرامبەر بێ، بە سەرەتای گواستنەوەی تۆز (وَكَذا اسْتِدَامَتُهَا) هەروەهاش واجبە نیەتەکە بەردەوام بێ (إِلَى مَسْحِ شَيْءٍ مِنَ الْوَجْهِ) تا بەشێکی ڕوخساریش مەسح دەکا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(فَإِنْ نَوَى فَرْضاً وَنَفْلاً) ئەگەر لە تەیەممومدا نیەتی حەڵاڵکردنی واجبێكو سوننەتێکی هێنا، واتە: بە دڵ گوتی: نیەتم وەیە نوێژی واجبو سوننەت حەڵاڵ دەکەم، ئەمە دروستەو (أُبِيحَا) هەردووکی بۆ حەڵاڵ دەبن (أَوْفَرْضاً) یان تەنها نیەتی حەڵاڵکردنی واجبێکی هێنا، واتە: بە دڵ گوتی: نیەتم وەیە نوێژێکی واجب لە خۆم حەڵاڵ دەکەم، ئەوەش دروستەو واجبەکەی پێ حەڵاڵ دەبێ، کەوابو: (فَلَهُ النَّفْلُ عَلَى الْمَذْهَبِ) بۆی دروستە: سوننەتەکانیش بەم تەیەممومە بکا، هەروەها نوێژی جەنازەشی بۆ دروستە.

(أَوْنَفْلاً) یان نیەتی حەڵاڵکردنی سوننەتێکی هێنا، ئەوە تەنها سوننەتو نوێژی جەنازەی بۆ دروست دەبێ (أَوِ الصَّلاَةَ) یان تەنها نیەتی حەڵاڵکردنی نوێژی هێناو باسی واجبی نەکرد، واتە: گوتی: نیەتم وەیە نوێژ لەخۆم حەڵاڵ دەکەم (تَنَفَّلَ) بەم نیەتەش

تەنها سوننەتو نوێژی جەنازەی بۆ دروستن (لا الفَرْضَ) بەڵام نوێژی واجبی بۆ دروست نیە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستیمەزهەب لە هەردوو مەسەلەکەدا، کەواتە: بۆ نوێژیواجب واجبە بڵێ: (نَوَيْتُ اِسْتِباحَةَ فَرْضِ الصَّلاةِ) نیەتم وەیە فەرزی نوێژ لە خۆم حەلاڵ دەکەم.

﴿ ئاگاداری ﴾: تەوافیواجب وەك نوێژیواجب وایە، تەوافیسوننەتیش وەك نوێژیسوننەت وایە، کەوابو: نیەتی حەلاڵکردنی نوێژیواجب، یان تەوافیواجب، ئەو واجبانەو گشت سوننەتێكو گشت ئەو شتانەش حەلاڵ دەکا: کە بە بێدەستنوێژیو جەنابەتو حەیز حەرامن، هەروەها نیەتی حەلاڵکردنینوێژیسوننەت، یان تەوافی سوننەت، گشت سوننەتێكو گشت ئەو شتانەیتریش حەلاڵ دەکا: کە بە بێدەستنوێژیو جەنابەتو حەیز حەرامن، بەڵام نوێژی واجبو تەوافی واجب حەلاڵ ناکا، هەروەها نیەتی حەلاڵکردنی شتێك لەو شتانەی جگە لە نوێژو تەوافن، گشت شتێکیتری پێ حەلاڵ دەبێ، تەنها نوێژو تەوافی واجبو سوننەت نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا بە درێژی ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: (وَمَسْحُ وَجْهِهِ) مەسحکردنی ڕوخساریەتی بە تۆزی گڵەکە، بە گوێرەی سنورەکەی دەستنوێژ. چوارەم: (ثُمَّ يَدَيْهِ مَعَ مِرْفَقَيْهِ) مەسحکردنی هەردوو دەستەکانیەتی لە گەڵ ئەنیشکەکانی بە تۆزی گڵەکە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا ماءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُوا بِوُجوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ﴾ ئەگەر ئاو نەبو تەیەمموم بکەن بە گڵێکی پاك، بە تۆزی گڵەکە ڕوخسارو دەستتان مەسح بکەن. پێنجەم: ڕیزکردنە، واتە: مەسحکردنی ڕوخسار لە پێش دەستەکاندا، هەروەك لە ئایەتەکەدا هاتوە.

ئینجا بزانە: لە ئایەتی تەیەمومدا باسی ئەنیشکەکان نەکراوە، بەڵام لە ئایەتی دەستنوێژدا باسیان کراوە، تەیەممومیش بۆ ناچاری جێگری دەستنوێژە، کەوابو: لە تەیەممومیشدا لە گەڵ دەستەکاندا ئەنیشکیش مەبەستن، بە بەڵگەی فەرموودەکەی (ابن عمر)ی داهاتوو و هەم ئەم حەدیسەش: ﴿عن أبي الجهيمﷺ: أقْبَلَ النَّبِيُّﷺ عَلَى الْجِدارِ فَمَسَحَ بِهِ وَجْهَهُ وَذِراعَيْهِ﴾ رواه الشافعي وقال: إن هذا أشبه بالقرآن. وقال البيهقي: جيِّد بشواهده. پێغەمبەرﷺ ڕووی کردە دیوارەکەو ڕوخسارو باسکەکانی بە تۆزی دیوارەکە مەسح کردن.

جا بزانە: ئەمەیان فەرموودەی نوێیبەهێزی ئیمامی(شافعی)یە، زانایانی مەزهەبیش لە سەر ئەم فەرموودەنە، چونکە لەگەڵ قورئاندا باشتر تێك دەکاتەوە، بەڵام ئیمامی (النواوي) فەرموودەکەیکۆنی ئیمامی(شافعي)شی بە بەهێز داناوە، کە دەفەرموێ: لەپە دەستەکان تەنها تا جومگەکان واجبە مەسح بکرێن، چونکە حەدیسەکەی(عمّار)–کە لە

وَلاَ يَجِبُ إِيصَالُهُ مَنْبَتَ الشَّعَرِ الْخَفِيفِ، وَلاَ تَرْتِيبَ فِي نَقْلِهِ فِي الأَصَحِّ، فَلَوْ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ وَمَسَحَ بِيَمِينِهِ وَجْهَهُ وَبِيَسَارِهِ يَمِينَهُ جَازَ. وَتُنْدَبُ التَّسْمِيَةُ وَمَسْحُ وَجْهِهِ وَيَدَيْهِ بِضَرْبَتَيْنِ، قُلْتُ: الأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ وُجُوبُ ضَرْبَتَيْنِ وَإِنْ أَمْكَنَ بِضَرْبَةٍ بِخِرْقَةٍ وَنَحْوِهَا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُقَدِّمُ يَمِينَهُ وَأَعْلَى وَجْهِهِ، وَيُخَفِّفُ الْغُبَارَ،

---

(بخاری)و (مسلم)دایە– بەڵگەیەتیو بەهێزترە، هەروەك لە (المجموع)دا هەردوو فەرموودەكەی ڕوون كرۆتەوە.

(وَلايَجِبُ) واجب نیەو سوننەتیش نیە (إِيصَالُهُ مَنْبَتَ الشَّعَرِ الْخَفِيفِ) تۆزەكە بگەیێندرێتە بنەوەی مووە سوكەكانی ڕوخسارو دەست، كەوابو: بنەوەی مووە پڕەكانیش واجب نیە (وَلا تَرتِيبَ فِي نَقْلِهِ) ڕیز واجب نیە لە گواستنەوەی تۆزەكەدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵكو تەنها لە مەسحكردندا واجبە.

بۆ وێنە: (فَلَوْ ضَرَبَ بِيَدَيْهِ) ئەگەر هەردوو دەستەكانی لە شوێنی تۆزەكەدانو (وَمَسَحَ بِيَمِينِهِ وَجْهَهُ) بە دەستی ڕاستەی ڕوخساری مەسح كرد (وَبِيسَارِهِ يَمِينَه) بە دەستی چەپەش دەستی ڕاستەی مەسح كرد (جَازَ) دروستە، بەومەرجەی جارێكیتریش دەستی ڕاستەی لێبداتەوەو تاكو دەستی چەپەشی مەسح بكا.

(وَتُنْدَبُ التَّسْمِيَةُ) لە سەرەتای تەیەمموم كردندا (بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحِيمِ) سوننەتە، هەرچەند جەنابەتدارو حەیزداریش بێ (وَمَسْحُ وَجْهِهِ وَيَدَيْهِ بِضَرْبَتَيْنِ) هەروەها دەبێ ڕوخسارو دەستەكانی بە دوو گواستنەوە مەسح بكا.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) دەقێی فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (وُجُوبُ ضَرْبَتَيْنِ) واجبە دوو جار دەست لە شوێنیتۆزەكە بدا تاكو ببێتە دوو گواستنەوە (وَإِنْ أَمْكَنَ بِضَرْبَةٍ) هەرچەند بشگونجێ بە یەك گواستنەوە ڕوخسارو دەستەكانی مەسح بكا (بِخِرْقَةٍ وَنَحْوِها وَاللهُ أَعْلَم) بە هۆی پارچە پەڕۆكێكی تۆزاوی، یان شتێكیتر ﴿عن ابن عمررضی الله عنهما: أَنَّهُ قال: اَلتَّيَمُّمُ ضَرْبَتانِ: ضَرْبَةٌ لِلْوَجْهِ وَضَرْبَةٌ لِلْيَدَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ﴾ رواه الدارقطنی وصححه البیهقی، (ابن عمر) دەفەرموێ: تەیەمموم دوو گواستنەوەیە: گواستنەوەیەك بۆ ڕوخسارەو گواستنەوەیەكیش بۆ دەستەكانە لە گەڵ ئەنیشكەكاندا. جا ئەگەر بە دوو گواستنەوە مەسحەكە تەواو نەكرا، واجبە: زیاتر بكا، تا تەواو دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيُقَدِّمُ يَمِينَهُ) سوننەتە دەستی ڕاستەی لە پێش دەستی چەپەیدا مەسح بكا (وأَعْلى وَجْهِهِ) سوننەتە سەرەوەی ڕوخساری لە پێش لایخوارەوەی مەسح بكا (وَيُخَفِّفُ الْغُبارَ) سوننەتە ئەو تۆزەی مەسحی پێدەكا سوكی بكا، واتە: یان لەپەدەستەكانی بتەكێنێ،

وَمُوالاَةُ التَّيمُّمِ كالْوُضُوءِ، قُلْتُ: وَكَذا الْغُسْلُ، وَيُنْدَبُ تَفرِيقُ أَصَابعه أَوَّلاً، وَيَجِبُ نَزْعُ خَاتَمه فِي الثَّانِيَة وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَنْ تَيَمَّمَ لفَقْد مَاء فَوَجَدهُ إِنْ لَمْ يَكُنْ فِي صلاَة بَطَلَ إِنْ لَمْ يَقْتَرِنْ بِمَانعٍ كَعَطَشٍ، أَوْ فِي صَلاَة لاَ تَسْقطُ بِه بَطَلَتْ عَلَى الْمَشْهُورِ،

---

یان فووهكیان لێبكا (وَمُوالاَةُ التَّيمُّمِ) سوننەتە بە دوایەكدا ئەندامەكانی تەیەمموم مەسح بكا (كَالْوُضُوءِ) هەروەك لە دەستنوێژیشدا سوننەت بوو (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفەرمووێ (وَكَذا الْغُسْلُ) هەروەها تیەممومیغوسلیش سوننەتە بە دوایەكدا بكرێ، هەروەها: لە دوای تەیەمموم دوعایەكەی دوایدەستنوێژیش سوننەتە.

(وَيُنْدَبُ تَفرِيقُ أَصابِعه أَوَّلاً) سوننەتە: لە سەرەتای دەست لێدانەكەوە گشت پەنجەكانی لێك بكاتەوە (وَيَجِبُ نَزْعُ خاتَمِه فِي الثَّانِيَةِ) واجبە ئەنگوستیلەكەی دابكەنێ لە لێدانی دووەمدا (وَاللهُ أَعْلَم) كەواتە: لە تەیەممومدا جولاندنی بەس نیە، چونكە خۆڵ وەكو ئاو ناچێتە بنەوەی ئەنگوستیلەكە.

## ﴿ ئەو شتانەی تەیەمموم بەتاڵ دەكەن ﴾

بزانە: سێ شت تەیەمموم بەتاڵ دەكەن، یەكەم: كافربوون–نعوذ بالله–. دووەم: یەكێك لە هۆیەكانی بێدەستنوێژیی بچوك‌و گەورە: كە لە بێدەستنوێژیو غوسلدا باسمان كردن.

سێیەم: دەستكەوتنی ئاو، هەروەك دەفەرمووێ:

(وَمَنْ تَيَمَّمَ) هەر كەسێك بۆ بێدەستنوێژیی بچوك، یان گەورە تەیەممومی كردبێ (لِفَقْدِ ماءٍ) لە بەر نەبوونی ئاو (فَوَجَدَهُ) ئینجا لە دوای تەیەمموم ئاوی دەست كەوت، یان بە هۆی شتێك كەوتە دڵی: ئاو هەیە: وەك كاروانێك ببینێ، یان تانكەرێكی ئاو، یان سەوزایی، ئەوە (إِنْ لَم يَكُنْ فِي صَلاة) ئەگەر ئەو كەسە لە ناو نوێژكردندا نەبێ، واتە: نوێژی دانەبەستبێ (بَطَلَ) تەیەممومەكەی بەتاڵ دەبێ (إِن لَمْ يَقْتَرِنْ بِمانعٍ) بەو مەرجەی لە كاتی دەستكەوتنی ئاوەكە قەدەغەیەك بۆ بەكارهێنانی ئاو ڕوونەدا (كَعَطَشٍ) وەكو تێنووەتیخۆی، یان گیانلەبەرێكی ڕێزدار، یان وەكو دوژمنێك، یان درندەیەك ڕێگەی ئاوی گرتبێ، ئەو كاتە تەیەممومەكەی بەتاڵ نابێ، چونكە لەو كاتانەدا ئاوەكە بە نەبوو دادەندرێ.

(أَوْ فِي صَلاة) یان نوێژی دابەستبو و لە كاتی نوێژكردندا ئاو پەیدا بوو، بەڵام (لا تَسْقطُ بِهِ) بەو تەیەممومە قەزاكردنەوەی لە سەر لانەدەچو، چونكە لە سەفەریتاوانباریدا بوو، یان لە شوێنێكی وەهادا تەیەممومی كردبو: كەم وادەبوو ئاوی نەبێ (بَطَلَتْ عَلَى الْمَشْهُورِ) نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، لە سەر فەرموودەی بەهێزی ناسراویمەزهەب، چونكە تەیەممومەكەش بەتاڵ بووە.

وَإِنْ أَسْقَطَهَا فَلاَ، وَقِيلَ يَبْطُلُ النَّفْلُ، وَالأَصَحُّ أَنَّ قَطْعَهَا لِيَتَوَضَّأَ أَفْضَلُ، وَأَنَّ الْمُتَنَفِّلَ لاَ يُجَاوِزُ رَكْعَتَيْنِ إِلاَّ مَنْ نَوَى عَدَدَاً فَيُتِمُّهُ،

---

(وَإِنْ أَسْقَطَهَا) بەلام ئەگەر ئەو تەیەمومە قەزایەکەی لە سەر لادەبرد، چونکە سەفەری تاوانباری نەبو و شوێنەکەش بە زۆری وادەبوو ئاوی نەبێ (فَلا) نوێژەکەی بەتاڵ نابێو با تەواوی بکا (وَقِيل يَبْطُلُ النَّفْلُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: سوننەت بەتاڵ دەبێ.
بەلام (وَالأَصَحّ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ قَطْعَهَا لِيَتَوَضَّأَ) بڕینی نوێژی واجب، یان سوننەت، تاکو بە دەستنوێژ بیکا (أَفْضَلُ) خێری زیاترە لەوەی بە تەیەموم تەواوی بکا (وَأَنَّ الْمُتَنَفِّلَ) ئەو کەسەی خەریکی نوێژی سوننەتەو لە کاتی نوێژکردندا ئاوی دەست کەوت (لاَيُجاوِزُ رَكْعَتَيْن) نابێ لە دوو ڕەکعەت زیاتر بکا، بەڵکو لە دوای دوو ڕەکعەت تەحیات دەخوێنێو سەلام دەداتەوە (إِلاّ مَنْ نَوى عَدَدَاً) تەنها ئەو کەسە نەبێ: کە نیەتی ژمارەی ڕەکعەتی هێناوە (فَيُتِمُّهُ) ئەو بۆی دروستەو ژمارەکە تەواو دەکا بەگوێرەی نیەتەکەی، جا ژمارەکە لە دوو ڕەکعەت کەمتر بێ، یان زیاتر.
﴿ ئاگاداری ﴾: تەیەمومی بێدەستنوێژیگەورە—تەنها دەربارەی نوێژو تەوافو دەست لێدانی قورئان— بە هۆیەکانی بێدەستنوێژی بچوك بەتاڵ دەبێ، نەك دەربارەی ئەو شتانەیتر: کە بە جەنابەتو حەیز حەرامن، واتە: ئەگەر بێدەستنوێژیش بێ، ئەوانەی هەر بۆ حەلاڵن، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: ئەگەر جەنابەتدار بۆ مانەوەی ناو مزگەوت، یان بۆ خوێندنی قورئان تەیەمومی کرد، یان حەیزدار بۆ حەلاڵبوونی جیماع تەیەمومی کرد، ئینجا بێدەستنوێژ بون، ئەو سێ شتانەیان هەر بۆ حەلاڵن، بەلام هەر کاتێك ئاویان دەست کەوت، واجبە یەکسەر وازیان لێبێنن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە
ئینجا بزانە: ئەگەر لە بەر نەخۆشی تەیەمومی کردبێ، هەر کاتێك چاك بۆوە تەیەمومی بەتاڵ دەبێ، واتە: بە وەدەستکەوتنی ئاو بەتاڵ نابێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ باسی تەیەمومی مردوو ﴾

ئەگەر لە بەر نەبوونیئاو مردووێك تەیەمموم کراو نوێژی جەنازەی لە سەر کرا، ئینجا لە پێش ناشتنیمردووەکە ئاو دەست کەوت، ئەوە واجبە مردووەکە بشۆرێو دووبارە نوێژەکەشی لە سەر بکرێتەوە، بەلام ئەگەر مردووەکە نێژرابو، ئەو کاتە دروست نیە بهێندرێتە دەرەوە، هەرچەند لە ئاوەدانیشدا تەیەمموم کرابێو نەشکۆرابێ.
هەروەها ئەگەر لە بەر نەبوونیئاو بە تەیەمموم نوێژیجەنازە لە سەر مردووێك کرا، ئینجا ئاو دەست کەوت، ئەوە واجبە بە دەستنوێژەوە دووبارە نوێژەکەی لە سەر بکرێتەوە، جا ئەگەر نێژرابو، واجبە لە سەر گۆڕەکەی نوێژەکەی لە سەر بکرێتەوە.

جا بزانە: ئەوەی ڕابردوو دەربارەی ئەو مردووەو ئەو نوێژکەرە بوو: کە لە ئاوەدانیدابن -واتە: لەو شوێنەی کەم وا دەبو ئاو نەبێ- بەڵام ئەگەر مردووەکە، یان نوێژکەرەکە لە سەفەردا بون -واتە: لەو شوێنەی بە زۆری وا دەبو ئاو نەبێ-و لە بەر نەبوونیئاو مردووەکە تەیەمموم کرا، یان نوێژکەرەکە بە تەیەمموم نوێژیجەنازەی لە سەر کرد، ئەوە دووبارەکردنەوەی هیچیان واجب نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئەگەر لە بەر برینو سووتان، یان ڕزین مردووەکە تەیەمموم کرا، ئەو کاتە شۆردنی واجب نیە، هەر چەند ئاویش هەبێ، هەروەك لە شۆردنیمردوودا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە کۆمەڵێك یەکێکیان مرد و ئاویخۆی پێبوو، واجبە بە ئاوەکەی خۆی بشۆرێ، بەڵام ئەگەر هاوڕێکانی تێنوو بون، یان دەترسان تێنوو ببن، ئەو کاتە دروستە: ئاویمردووەکە بخۆنەوەو واجبە تۆڵەی ئاوەکەشی بدەنە میراتگرەکانی: بە گوێرەی نرخی ئەو کاتەو ئەو شوێنە، هەروەها واجبە مردووەکەش تەیەمموم بکەن، هەروەها ئەگەر تەنها بەشی یەکێکیان ئاو هەبو، ئاوەکەش ملکی هیچیان نەبو-واتە: بۆ تێنووەتیش پێویستیان نەبو- ئەوە مردووەکە لە گشتیان لەپێشترە بە ئاوەکە بشۆرێ؟ چونکە دوا قۆناغی دونیایەتی، هەرچەند هاوڕێ زیندووەکانیشی جەنابەتدارو حەیزدار بن، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ ئەو شتانەی بە یەك تەیەمموم حەلاڵن ﴾

(وَلا يُصلِّي بِتَيَمُّمٍ غيرَ فَرْضٍ) دروست نیە جگە لە فەڕزێك هیچ فەڕزێکیتر بە یەك تەیەمموم بکا، جیاوازی نیە فەڕزەکان: دوو نوێژی واجب، یان زیاتر بێ، یان دوو تەوافی واجب، یان تەوافێکی واجبو نوێژێکی واجب بێ، یان ووتاریجومعەو نوێژیجومعە بێ، هەروەها جیاوازی تەیەممومی بێئاویو نەخۆشی نیە، جیاوازی تەیەممومی بێدەستنوێژیی بچوكو گەورەش نیە ﴿عن ابن عمررَضِيَ اللهُ عَنْهُما: يَتَيمَّمُ لِكُلِّ صَلاةٍ وَإِنْ لَمْ يُحْدِثْ﴾ رواه البيهقي باسناد صحيح، بۆ گشت نوێژێك واجبە تەیەمموم بکا، هەرچەند بێدەستنوێژیش نەبوبێ.

(وَيَتَنَفَّلُ ما شاءَ) دروستە: بە یەك تەیەمموم هەرچەند حەز بکا سوننەتەکان بکا: لە گەڵ نوێژی واجبدا، یان بە جیا، هەروەها تا حەز دەکا دروستە: بە یەك تەیەمموم قورئان بخوێنێ (وَالنَّذْرُ) نوێژو تەوافی نەزرکراو (كَفَرْضٍ) وەکو واجب وایە، واتە: دروست نیە لە نەزرکراوێك زیاتر بە یەك تەیەمموم بکا (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

وَالأَصَحُّ صِحَّةُ جَنَائِزَ مَعَ فَرْضٍ، وَأَنَّ مَنْ نَسِيَ إِحْدَى الْخَمْسِ كَفَاهُ تَيَمُّمٌ لَهُنَّ، وَإِنْ نَسِيَ مُخْتَلِفَتَيْنِ صَلَّى كُلَّ صَلاَةٍ بِتَيَمُّمٍ، وَإِنْ شَاءَ تَيَمَّمَ مَرَّتَيْنِ وَصَلَّى بِالأَوَّلِ أَرْبَعاً وَلاَءً وَبِالثَّانِي أَرْبَعاً لَيْسَ مِنْهَا الَّتِي بَدَأَ بِهَا، أَوْ مُتَّفِقَتَيْنِ صَلَّى الْخَمْسَ مَرَّتَيْنِ بِتَيَمُّمَيْنِ، وَلاَ يَتَيَمَّمُ لِفَرْضٍ قَبْلَ وَقْتِ فِعْلِهِ،

---

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (صِحَّةُ جَنَائِزَ مَعَ فَرْضٍ) دروستە: زۆر نوێژی جەنازە لەگەڵ واجبێکیشدا بە یەك تەیەمموم بکرێن و بە جیاش دروستە: بکرێن، چونکە نوێژی جەنازە (فَرْضُ الْكِفَايَة)یە، وەکو سوننەت دروستە: ئەو نەیکاو یەکێکی‌تر بیکا.

(وَأَنَّ مَنْ نَسِيَ إِحْدَى الْخَمْسِ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر یەکێك نوێژێکی لە پێنج نوێژە واجبەکان لەبیر کردبو و نەیکردو نەیدەزانی کامەیانە، واجبە هەر پێنج نوێژەکان بکاتەوە تاکو دڵنیا ببێ، بەڵام (كَفَاهُ تَيَمُّمٌ لَهُنَّ) بۆ هەر پێنجیان تەیەممومێك بەسە، چونکە لە ڕاستی‌دا تەنها یەك نوێژی واجبی لە سەرە (وَإِنْ نَسِيَ مُخْتَلِفَتَيْنِ) ئەگەر دوو نوێژی لێك جیاوازی لەبیر کردبون، بەڵام نەیدەزانی کامەو کامەیە، دیسان واجبە هەر پێنج نوێژەکان بکاتەوە بە یەکێك لەم دوو شێوەیە:

یەکەم: ئەگەر حەز بکا (صَلَّى كُلَّ صَلاَةٍ بِتَيَمُّمٍ) هەر نوێژێك بە تەیەممومێك دەکا، تا هەر پێنج نوێژەکان تەواو دەبن. دووەم: (وَإِنْ شَاءَ) ئەگەر حەز بکا (تَيَمَّمَ مَرَّتَيْنِ) دوو جار تەیەمموم دەکا (وَصَلَّى بِالأَوَّلِ أَرْبَعاً وَلاَءً) بە تەیەممومی‌یەکەم چوار نوێژ بە دوای‌یەکدا دەکا: نیوەڕۆ، عەسر، مەغریب، عیشا، (وَبِالثَّانِي أَرْبَعاً) بە تەیەممومی دوومیش چوار نوێژ دەکا (لَيْسَ مِنْهَا الَّتِي بَدَأَ بِهَا) ئەو نوێژەی لە تەیەممومی یەکەمدا دەستی پی‌کردبو، لەم چوارانە نەبێ، واتە: ئەم جارە عەسرو مەغریبو عیشاو بەیانی بێ (أَوْ مُتَّفِقَتَيْنِ) یان دوو نوێژی وەکو یەکتری لە دوو ڕۆژدا لەبیر کردبون، بەڵام نەیدەزانی کامەیانن (صَلَّى الْخَمْسَ مَرَّتَيْنِ) واجبە هەر پێنج نوێژەکان دوو جار بکا (بِتَيَمُّمَيْنِ) بە دوو تەیەمموم، تاکو دڵنیا ببێ: کە هیچی لە سەر نەماوە.

(وَلاَ يَتَيَمَّمُ لِفَرْضٍ) دروست نیە بۆ هیچ واجبێك تەیەمموم بکا (قَبْلَ وَقْتِ فِعْلِهِ) پێش کاتی کردنی واجبەکە، چونکە تەیەمموم دەستنوێژی ناچاری‌یە، کەواتە: تا ناچار نەبێ دروست نیە بیکا، مەبەستیش بە کاتی‌کردن: کاتی دروستبوونی واجبەکەیە، کەوابو: لە (جمع التقديم)دا پاش سەلامدانەوەی نوێژی‌یەکەم دەبی تەیەمموم بۆ نوێژی‌دووەم بکا. هەروەها بۆ نوێژی‌جەنازە دەبی لە دوای شۆردنی‌مردووەکە تەیەمموم بکا، هەروەها بۆ یەکێك لە پێنج نوێژە واجبەکان دەبی کاتی‌نوێژەکە بێ، ئینجا تەیەممومی بۆ بکا، جا ئەگەر لەو دەمەدا نوێژەکەی نەکرد، بەڵکو دوای خست، یان لە دوای کاتەکەی‌دا بەو تەیەممومە بە

وَكَذا النَّفلُ الْمُؤَقَّتُ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ لَمْ يَجِدْ مَاءً وَلاَ تُراباً لَزِمَهُ فِي الْجَدِيدِ أَنْ يُصَلِّيَ الْفَرْضَ وَيُعِيدَ، وَيَقْضِي الْمُقِيمُ الْمُتَيَمِّمُ لِفَقْدِ الْمَاءِ، لاَ الْمُسَافِرُ إلاَّ الْعَاصِيَ بِسَفَرِهِ

---

قەزا کردی هەر دروستە، بەو مەرجەی هەر لە شوێنیخۆی بێ‌و دڵیشی بۆ ئاو هەبوون نەچوبێ لەو ماوەیەدا، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وكذا النَّفلُ الْمُؤَقَّتُ) هەروەها سوننەتی کات بۆ دانداراویش وەکو واجب وایە، دروست نیە لە پێش کاتیخۆیدا تەیەمومی بۆ بکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەواتە: چێشتەنوێژ لە کاتیخۆیدا تەیەمومی بۆ دەکرێ، نوێژی باران لە کاتی کۆبوونەوەی خەڵك بۆ نوێژکردن، نوێژیجەژنەکان لە پاش ڕۆژ هەڵاتن...هتد: ئەو سوننەتانەی لە شوێنی خۆیاندا باسیان دەکەین، ان شاء الله تعالى.

## ﴿ قەزاکردنەوەی چەند نوێژێك: کە بە تەیەموم کراون ﴾

(وَمَنْ) هەر کەسێك-بێ‌دەستنوێژ، یان جەنابەتدار، یان حەیزدار بوو- (لَمْ يَجِدْ ماءً وَلا تُراباً) نە ئاوی دەست کەوت‌و نە گڵی دەست کەوت، چونکە شوێنەکە هەمووی قوڕ، یان گڵی تەڕ بوو، یان پیس بوو، یان بەفر دایپۆشی بوو و نەیدەتوانی بیتاوێنێتەوە، یان گڵەکە ووشك بکاتەوەو بە هەڵکەندنێکی کەمیش نەدەگەیشتە گڵی ووشك‌و پاك، ئەوە بەم جۆرە کەسە دەگوترێ: (فاقِدُالطَّهُورَيْنِ)، واتە: نەبوویی هەردوو دەستنوێژگرەکان: کە گڵ‌و ئاوە. کەوابو: (لَزِمَهُ فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی (شافعي)دا لە سەری واجبە (أَنْ يُصَلِّيَ الْفَرْضَ) کە کاتی نوێژ هات، نوێژە واجبەکە بکا لە بەر ڕێزداری کاتی نوێژ (وَيُعِيدَ) ئینجا هەر کاتێك ئاو، یان گڵی دەست کەوت، واجبە: نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لايَقْبَلُ اللهُ صلاةً بِغَيْرِطُهُورٍ﴾رواه مسلم، خوایگەورە هیچ نوێژێك بە بێ‌دەستنوێژی بچوك، یان گەورە قبوڵ ناکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئەو نوێژکەرەی (فاقِدُالطَّهُورَيْن) جەنابەتدار، یان حەیزدار بوو، ئەوە -جگە لە سورەتی(فاتحه)- دروست نیە هیچیتری قورئان لە نوێژدا بخوێنێ، هەروەها نوێژی سوننەت‌و دەست لێدانی قورئان‌و مانەوەی مزگەوت‌و جیماعکردنیحەیزدار گشتی حەرامەو بە هۆی نەبوونی گڵ‌و ئاو حەڵاڵ نابێ، هەروەها نوێژی سوننەت بۆ بێ‌دەستنوێژی بچوکیش دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَقْضِي الْمُقِيمُ) واجبە ئەو کەسەی نیشتەجێیە: نوێژەکە قەزا بکاتەوە (الْمُتَيَمِّمُ لِفَقْدِ الْماءِ) کە لە بەر نەبوونیئاو تەیەمومی کردوە، چونکە کەم ڕوودەدا لە ئاوەدانیدا ئاو نەبێ (لاالْمُسافِرُ) بەڵام ڕێبوارێك: کە لە بەر نەبوونیئاو تەیەمومی کردبێ، واجب نیە قەزا بکاتەوە (إلاّ الْعاصِيَ بِسَفَرِهِ) تەنها ڕێبواری تاوانبار بە هۆی سەفەرەکەی، واجبە قەزا

فِي‌الأَصَحِّ، وَمَنْ تَيَمَّمَ لِبَرْدٍ قَضَى فِي‌الأَظْهَرِ، أَوْ لِمَرَضٍ يَمْنَعُ الْمَاءَ مُطْلَقاً أَوْ فِي عُضْوٍ وَلاَ سَاتِرَ فَلاَ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِجُرْحِهِ دَمٌ كَثِيرٌ، وَإِنْ كَانَ سَاتِرٌ لَمْ يَقْضِ فِي‌الأَظْهَرِ إِنْ وُضِعَ عَلَى طُهْرٍ،

---

بکاته‌وه (فِي الأَصَحِّ) له فه‌رمووده‌ی‌ڕاستتردا، وه‌ك ڕێگرو ئافره‌تی‌ناشیزه‌و ڕێبوارێك: كه بۆ دزی، یان بۆ مرۆڤكوشتنی به ناهه‌ق بچێ، جیاوازی نیه ئه‌م تاوانباره: له به‌ر نه‌بوونی ئاو ته‌یه‌مومی كردبێ، یان له به‌ر نه‌خۆشی، یان برینداری، هه‌ر واجبه قه‌زا بكاته‌وه.

ئینجا بزانه: له باسی‌ته‌یه‌مومدا مه‌به‌ست به ڕێبوارو نیشته‌جێ، واته‌ی‌ڕاسته‌قینه نیه، به‌ڵكو له هه‌ر شوێنێكدا به زۆری ڕوو بدا: ئاو نه‌بێ‌و له به‌ر نه‌بوونی‌ئاو ته‌یه‌مموم بكا، قه‌زاكردنه‌وه‌ی له سه‌ر نیه هه‌رچه‌ند نیشته‌جێش بێ، هه‌روه‌ها له هه‌ر شوێنێك كه‌م ڕوو بدا: ئاو نه‌بێ‌و له به‌ر نه‌بوونی‌ئاو ته‌یه‌مموم بكا، واجبه: قه‌زا بكاته‌وه هه‌رچه‌ند ڕێبواریش بێ، هه‌روه‌ك له سه‌ر چاوه‌كاندا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

هه‌روه‌ها بزانه: له باسی‌ته‌یه‌مومدا جیاوازی سه‌فه‌ری درێژو كورتیش نیه، واته: ئه‌و سه‌فه‌ره‌ی له دوو قۆناغ كورتتره، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا فه‌رموویه‌تی.

(وَمَنْ تيمَّمَ لِبَرْدٍ) هه‌ر كه‌سێك له ترسی سه‌رما ته‌یه‌مومی كردبێ (قَضَى فِي‌الأَظْهَرِ) واجبه: نوێژه‌كان قه‌زا بكاته‌وه، له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا، جیاوازی ڕێبوارو نیشته‌جێ نیه، به‌ڵام به فه‌رمووده‌یه‌كی بێ‌هێزی ئیمامی(الشافعی): ڕێبوار قه‌زاكردنه‌وه‌ی له سه‌ر نیه، هه‌روه‌ك له (شرح المَحلِّی)و (مغنی)دا فه‌رموویانه.

(أَوْ لِمَرَضٍ) یان كه‌سێك له به‌ر نه‌خۆشی ته‌یه‌مومی كردبو (يَمْنَعُ الْمَاءَ) نه‌خۆشیه‌كه‌ش به‌كارهێنانی ئاوی قه‌ده‌غه ده‌كرد (مُطْلَقاً) له گشت ئه‌ندامه‌كانی ده‌ستنوێژ، یان غوسلدا (أَوْ فِي عُضْوٍ) یان ته‌نها له یه‌ك ئه‌ندامدا به‌كارهێنانی ئاوی قه‌ده‌غه ده‌كرد (وَلا ساتِرَ) داپۆشه‌ریش له سه‌ر ئه‌و ئه‌ندامه نه‌بو (فَلا قَضاءَ) قه‌زاكردنه‌وه‌ی له سه‌ر نیه له هه‌ردوو مه‌سه‌له‌كه‌دا، جیاوازی ڕێبوارو نیشته‌جێ نیه (إِلاَّ أَنْ يَكونَ بِجُرْحِهِ دَمٌ كَثِيرٌ) مه‌گه‌ر نه‌خۆشه‌كه خوێنێكی زۆری به برینه‌كه‌یه‌وه بێ‌و چاو پۆشی‌ی لێ‌نه‌كرێ، ئه‌و كاته واجبه قه‌زا بكاته‌وه، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر له سه‌فه‌ری تاوانباریشدا بێ، هه‌ر واجبه قه‌زا بكاته‌وه، هه‌روه‌ك له (تحفة)دا فه‌رموویه‌تی.

(وَإِنْ كانَ ساتِرٌ) هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر ئه‌ندامه‌كه داپۆشه‌ری له سه‌ر بوو (لَمْ يَقْضِ فِي الأَظْهَرِ) ئه‌وه‌ش قه‌زاكردنه‌وه‌ی له سه‌ر نیه له فه‌رمووده‌ی‌به‌هێزتردا (إِنْ وُضِعَ عَلَى طُهْرٍ) به‌و مه‌رجه‌ی له سه‌ر ده‌ستنوێژێكی‌ته‌واو داپۆشه‌ره‌كه‌ی دانابێ، واته: بێ‌ده‌ستنوێژی‌ی بچووك، یان گه‌وره‌ی نه‌بوبێ، هه‌روه‌ها مه‌رجه: داپۆشه‌ره‌كه‌ش له سه‌ر ئه‌ندامی‌ته‌یه‌مموم نه‌بێ.

فَإِنْ وُضِعَ عَلَى حَدَثٍ وَجَبَ نَزْعُهُ، فَإِنْ تَعَذَّرَ قَضَى عَلَى الْمَشْهُورِ.

(بابُ الْحَيْضِ)

---

(فَإِن وُضِعَ عَلَى حَدَثٍ) جا ئەگەر داپۆشەرەکەی لە سەر بێدەستنوێژیی بچووك، یان گەورە دانابو (وَجَبَ نَزْعُهُ) واجبە دایبکەنێو لە سەر دەستنوێژێکیتەواو دایبنێتەوە، چونکە ئەم داپۆشەرە وەکو خوف وایە.

(فَإنْ تَعَذَّرَ) جا ئەگەر نەیتوانی داپۆشەرەکە لابدا، چونکە تووشی زیان دەبو، ئەو کاتە تەیەمموم دەکاو نوێژ دەکاو هەم لە دوای چاکبوونەوەش (قَضى عَلَىالْمَشْهُورِ) واجبە نوێژەکە-بە دەستنوێژ- قەزا بکاتەوە، لە سەر فەرموودەی بەهێزیناسراویمەزهەب، چونکە لەو کاتەدا وەکو خوف نیە، جیاوازی نیە داپۆشەرەکە: لە ئەندامی تەیەمموم بێ، یان لە شوێنێکیتر.

هەروەها: ئەگەر داپۆشەرەکە لە سەر ئەندامیتەیەمموم بوو، دیسان واجبە قەزا بکاتەوە، هەر چەند لە سەر دەستنوێژیش دایبنابێ، چونکە جێگرو جێگراوەکە-کە گڵو ئاوە- هەردووکی ناتەواون، بەڵام بە فەرموودەیەکی بێهێز- ئەگەر نەگونجا داپۆشەرەکە لاببا- قەزاکردنەوە واجب نیە هەر چەند داپۆشەرەکەشی لە سەر بێدەستنوێژی دانابێ، یان لە ئەندامی تەیەممومدا بێ، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ پاشکۆ ﴾: ئەگەر یەکێك نەیدەزانی قیبلە لە کام لایە، یان لە بەر نەخۆشی نەیدەتوانی بسوڕێتە لای قیبلەو یارمەتیدەریشیان دەست نەکەوت، یان پەلبەست کرابو، یان نوقمی ناو ئاو بوبو، یان ڕێگەی نەدرا بە پێوە نوێژ بکا، یان سوجدەو ڕوکووع ببا، یان لە شوێنێکی پیس بەند کرابو، یان پیسیەکی وەهای بە لەشیەوە بوو: نەدەگونجا بیشۆرێ، ئەوانە گشتیان هەر چۆنێکی بگونجێ، واجبە: لە بەر ڕێزلێنانی کاتی نوێژ، نوێژەکە بکەنو واجبە قەزاشی بکەنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێك ڕووت بوو، یان جلێکی پیسی لەبەردا بوو، یان لە شوێنێکی پیس بوو: ئەگەر بە بەرگەوە نوێژی کردبا دەبوایە لە سەر پیسیەکە نوێژ بکا، ئەگەر جلەکەی ڕاخستبا بە ڕووتی دەماوە، لە هەر سێك مەسەلەدا واجبە: بە ڕووتی نوێژ بکاو قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە، جیاوازی سەفەرو ئاوەدانیش نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەم پاشکۆیە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ بابُ الْحَيْضِ: باسی حەیزو نیفاس ﴾

**حَیض**-بێنوێژی: خوێنێکە لە کاتی تایبەتیدا - بە بێنەخۆشی- لە منداڵدانەوە بە ئەندامی جیماعکردنیئافرەتدا دێتە دەرەوە.

**نِفاس**-زەيسانى: خوێنێكە بە ئەندامى جيماعكردنىئافرەتدا دێتە دەرەوە لە دواى چۆلبوونىمنداڵدانە: بە دانانى ئەو بارەى تێيدايە، جياوازى نيە بارەكە: منداڵێكى وێنەكراو بێ، يان هەر پارچەخوێن، يان پارچەگۆشت بێ.

**إِستِحاضَة**-خوێنچڕكە: خوێنێكە-جگە لە حەيزو نيفاس- بە هۆى نەخۆشيەوە بە ئەندامى جيماعكردنىئافرەتدا دێتە دەرەوە.

(أَقَلُّ سِنِّهِ) كەمترين تەمەن: كە بگونجێ ئافرەت خوێنىحەيزى تێدا ببينێ (تِسْعُ سِنِينَ) تەواوبوونى نۆ ساڵى مانگىيە، كە پێكهاتنى هەر ساڵێك لە دوانزە مانگىئيسلامىيە: كە دەكاتە (٣٥٤) ڕۆژ، كەوابو: هەر ئافرەتێك لە تەمەنى نۆ ساڵىئيسلامىدا خوێنى ديت، ئەوە بە خوێنىحەيز دادەندرێو ئافرەتەكە عەزەب دەبێ، هەر لە هەمان تەمەنيشدا دەگونجێ (مَنى)ى بێ.

هەروەها كوڕيش لە هەمان تەمەندا دەگونجێ (مَنى)ى بێو بلۆغى ببێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە، ئيتر لە تەمەنى نۆ ساڵى بەو لاوەتر هيچ سنورێك دانەندراوە، كەواتە: لە دواى تەمەنى نۆ ساڵى تا مردن لە هەر ساڵێكدا خوێنى هات، ئەوە خوێنى حەيزە، لە تەمەنى كەمتر لە نۆ ساڵيش ئەگەر خوێنى هات، ئەوە خوێنىحەيز نيە، بەڵكو خوێنچڕكەى نەخۆشىيە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونى كردۆتەوە.

ئينجا بزانە: كوڕيش لە بلۆغبووندا بە هەمان شێوەيە، جا ئەگەر ئافرەت تا تەمەنى پانزە ساڵى نە خوێنو نە (مَنى)ى نەديتو كوڕيش تا تەمەنى پانزە ساڵى (مَنى)ى نەديت، ئەوە هەردووكيان بە تەواوكردنى تەمەنى پانزە ساڵىئيسلامى بڕيارى بلۆغبوونيان بۆ دەدرێ، واتە: لە قۆناغى منداڵيەوە دەچنە ناو قۆناغى گەورەيىو لە شەريعەتىئيسلامدا وەك مرۆڤى گەورە ڕەفتاريان لەگەڵدا دەكرێ، هەروەك لە باسى قەدەغەكردنىمنداڵدا بە بەڵگەوە ڕوونى دەكەينەوە، ان شاء الله تعالى.

(وَأَقَلُّهُ) كەمترين ماوەىهاتنى خوێنىحەيز (يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ) ئەندازەى ڕۆژێك و شەوێكە بە بێپچڕان، واتە: بيستو چوار سەعاتى بەردەوام، جا بزانە: لەم ئەندازەيەدا مەرج نيە: خوێنەكە بەردەوام بێتە دەرەوەى ئەندامەكە، بەڵكو بە جۆرێكى وەها بەردەوام بێ: ئەگەر لەو ماوەيەدا هەر كاتێك لۆكە دابنێتە ناو كونەكە بە خوێن ببێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموويەتى.

(وَأَكْثَرُهُ) زۆرترين ماوەى هاتنى خوێنىحەيز (خَمْسَةَعَشَرَ) پانزە ڕۆژە (بِلَيالِيها) بە پانزە شەوەكانيشيانەوە، بە ئەغلەبيش: يان شەش، يان حەفت ڕۆژە بە شەوەكانيانەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

ئینجا بزانە: لە هەردوو ماوەی زۆرترو ئەغلەبیدا مەرج نیە: هەموو ڕۆژێك، یان هەموو شەوێك بە بێپچڕان بەردەوام خوێنی بێ، بەڵكو وا دەبێ: لە دوو ڕۆژدا جارێك خوێنی دێ، هەروەك لە كۆتایی باسەكەدا ڕوونی دەكەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(وَأَقَلُّ طُهْرٍ) كەمترین ماوەی پاكبوونەوە لە خوێنیحەیز (بَيْنَ الْحَيْضَتَيْنِ) لە نێوان حەیزیڕابردوو و حەیزیداهاتوودا (خَمْسَةَعَشَرَ يَوْماً) پانزە ڕۆژە بە شەوەكانیەوە (وَلا حَدَّ لأَكْثَرِهِ) هیچ سنورێك نیە بۆ زۆرترین ماوەی پاكبوونەوە لە خوێنیحەیز، بە بەڵگەی (اجماع)، چونكە ئافرەتی وەها هەیە: لە هەموو تەمەنیدا تەنها یەك حەیز دەبینێ، هی وەهاش هەیە: هەر حەیز نابینێ، بە ئەغلەبیش وەهایە: لە مانگێكدا حەیزێكو پاكبوونەوەیەك دەبینێ.

ئینجا بزانە: بەڵگەی ئەو ئەندازانەیڕابردوو: بەدواداگەڕانی ئیمامی(شافعی)یە‌ﷺ تا بە تەواوی بۆی ڕوون بۆتەوە لەو ئەندازانەیڕابردوو، كەمترو زۆرتر نیە، كەوابو: ئەگەر ئافرەتێك، یان زیاتر بە پێچەوانەی ئەو ئەندازانەیڕابردوو حەیزو پاكبوونەوەیان دەدیت، واتە: لە ڕۆژێكو شەوێك كەمتر، یان بە پچڕاوی خوێنی دەهات، یان لە پانزە شەو و ڕۆژ زیاتر خوێنی دەهات، یان لە پانزە كەمتر پاك دەبۆوە، ئەوە ڕەفتاری پێناكرێو بە حەیز ناو نابرێ، بەڵكو خوێنی(اسْتِحاضَة)یە، چونكە لێكۆڵینەوەی(سَلَف) تەواوترەو جێگەی متمانەیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ ئەو شتانەی بە هۆی حەیز و نیفاس حەڕامن ﴾

(وَيَحْرُمُ بِهِ) حەڕامە بە هۆیحەیز-هەروەها بە هۆی نیفاسیش- نۆ شت (ماحَرُمَ بِالْجَنابَةِ) ئەو شتانەی بە جەنابەت حەڕام بوون، وەكو:

یەكەم: نوێژ، جا واجب بێ، یان سوننەت، هەروەها: سوجدەی (تلاوَة)و (شُكْر)ش حەڕامن ﴿عن عائشةرضي الله عنها: قال النَّبيُّﷺ لفاطمةَ بنت أبيحُبَيْش: إذا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ وَإذا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك خوێنیحەیز هات، واز لە نوێژ بێنەو هەر كاتێكیش خوێنەكە كۆتایی هات، خوێنەكە بشۆرەو نوێژ بكە. واتە: لە دوای غوسل كردن.

دووەم: تەواف كردن، جا واجب بێ، یان سوننەت ﴿عن عائشة رضي الله عنها: قَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنــا حائِضٌ، فَقال النَّبيُّﷺ: افْعَلِي كَما يَفْعَلُ الْحاجُّ غَيْرَ أَلاَّ تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتّى تَطْهُرِي﴾ رواه الشيخان، بۆ حەج كردن هاتمە (مكة)و لەو كاتدا لە حەیزدا بووم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: گشت كردوەكانیحەج -وەكو حاجیان- بكە، بەڵام تەوافیماڵی خوا مەكە.

سێیەم: دەست لێدان‌و هەڵگرتنی قورئان، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿لاَيَمَسُّهُ إلاَّ الْمُطَهَّرُونَ﴾ نابێ دەست لە قورئان بدەن، تەنها پاکەکان نەبن.

چوارەم: خوێندنی‌قورئان ﴿عن عَلِيّ‌؄: لَمْ يَكُنْ يَحْجُبُ النَّبِيَّ‌ﷺ عَنِ الْقُرآنِ شَيْءٌ سِوَى الْجَنابَةِ﴾ صححه ابن السكن وحسنه الترمذي، هیچ شتێك ڕێگەی پێغەمبەری‌ﷺ نەدەگرت بۆ قورئانخوێندن، جگە لە جەنابەت نەبێ. واتە: حەیزو نیفاسیش وەکو جەنابەت بێدەستنوێژیەکی گەورەنە، جا ئەگەر بڵێین: ئەگەر حەیزدار قورئان نەخوێنێ لەبیری دەچێتەوە، لە وەڵامدا دەگوترێ: ماوەی حەیز کەمە، چونکە بە ئەغلەبی شەش، یان حەفت ڕۆژە، هەروەك لە حەدیسی(صحیح)دا هاتوە، هەروەها دەشتوانێ بە دڵ قورئان بخوێنێ —تاکو لەبیری نەچێتەوە— نەك بە زوبان، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئیمامی(الطحاوی)و ئیمامی(الکرخی) ڕێگەیان داوەتە مامۆستای زەیسانی‌و حەیزدار: ووشە لە دوای ووشە دەرسی قورئان بڵێتەوە، بەو شێوەی لە باسی (جنابة)دا ڕوونمان کردۆتەوە.

هەروەها جگە لەو چوارانە، پێنج شتی‌تریش بە حەیزو نیفاس حەرامن:

یەکەم: (وَعُبُورُالْمَسْجِدِ) ڕابردن بە مزگەوتدا (إنْ خافَتْ تَلْوِيثَهُ) ئەگەر بترسێ: بە پشکە خوێنەکان پیسی بکا، کەواتە: مانەوە لە ناو مزگەوتدا، بە هەموو جۆرێك حەرامە ﴿عن عائشة رَضِیَ‌اللهُ عَنها: قال النَّبِيُّ‌ﷺ: ناوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ. فَقُلْتُ: إِنِّي حائِضٌ. قال: إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر‌ﷺ لە مزگەوتەوە بە حەزرەتی (عائشة)ی فەرموو: بەرماڵەکەم بدە دەست. حەزرەتی(عائشە) فەرمووی: من حەیزدارم. پێغەمبەر‌ﷺ فەرمووی: پیسی‌حەیز لە دەستتدا نیە. واتە: حەزرەتی(عائشە) دەیزانی حەرامە حەیزدار بچێتە ناو مزگەوت، جا پێغەمبەر‌ﷺ تێی‌گەیاند: کە تەنها دەست درێژکردنی‌حەیزدار بۆ ناو مزگەوت حەرام نیە.

دووەم: (وَالصَّوْمُ) بەڕۆژووبوون حەرامە، جیاوازی واجب‌و سوننەت نیە (ويَجِبُ قَضاؤُهُ) واجبە: زەیسانی‌و حەیزدار ڕۆژووی واجب قەزا بکەنەوە (بِخلافِ الصَّلاةِ) بە پێچەوانەی نوێژ، واتە: دروست نیەو حەرامە: زەیسانی‌و حەیزدار نوێژ قەزا بکەنەوە ﴿عن عائشة رَضِیَ‌اللهُ عَنها: كانَ يُصيبُنا ذلِكَ فَنُؤْمَرُ بقَضاءِ الصَّوْمِ وَلا نُؤْمَرُ بِقَضاءِ الصَّلاةِ﴾ رواه الشیخان، ئێمە حەیزمان تووش دەبو، جا لە لای پێغەمبەر‌ﷺ فەرمانمان پێ‌دەکرا: ڕۆژوو قەزا بکەینەوەو فەرمانمان پێ‌نەدەکرا: نوێژ قەزا بکەینەوە.

وَمَا بَيْنَ سُرَّتِهَا وَرُكْبَتِهَا، وَقِيلَ لاَ يَحْرُمُ غَيْرُ الْوَطْءِ،

سێیەم: جیماع کردن، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ﴾ بۆ جیماع کردن نزیکی ئافرەتانیحەیزدار مەکەون تا پاك دەبنەوە، جا کە-لە دوای پاکبوونەوە- غوسلیان کرد، برۆنە لایان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێکردون، واتە: لە کونی پێشەوە جیماعیان لەگەڵ بکەن.

ئینجا بزانە: جیماع کردن، لە گەڵ ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار گوناهێکی گەورەیەو هەر کەسێکیش بە حەلاڵی دابنێ کافر دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

چوارەم: (وَما بَيْنَ سُرَّتِها وَرُكْبَتِها) هەروەها لەزەت وەرگرتن لە نێوان ناوكو ئەژنۆی ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار بە ڕووتی حەرامە، بەڵام لە سەر پەردەوە دروستە ﴿عَنْ عائشة رَضِيَ اللهُ عَنها: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُنِي فَأَتَّزِرُ فَيُباشِرُنِي وَأَنا حائِضٌ﴾ رواه الشيخان، (عائشة) دەفەرموێ: لەو کاتەی من حەیزدار بووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەکردم: پەشتەماڵێکم لە نێوان ناوكو ئەژنۆم دەبەست، جا لەزەتیخۆی وەردەگرت.

(وَقِيل) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (لا يَحْرُمُ غَيْرُ الْوَطْءِ) جگە لە جیماع کردن هیچیتر حەرام نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلاَّ النِّكاحَ﴾ رواه مسلم، گشت لەزەتێك لە حەیزدار وەربگرن تەنها جیماع کردن نەبێ. بەڵام فەرموودە بەهێزەکە دەفەرموێ: مەبەستی ئەم حەدیسە: ماچ کردنو دەست لەملانو لەزەتی سەر پەردەی نێوان ناوكو ئەژنۆیە.

هەروەها بۆ ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار دروستە: لەزەت لە مێردی خۆیان وەربگرن -هەرچەند ڕووتیش بێ- بە هەموو لەشی خۆیان، تەنها نێوان ئەژنۆو ناوکی خۆیان نەبێ بە ڕووتی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: خۆ ڕەحەتکردنی ژنو مێرد-واتە: ئاو هێنان- بە دەستییەکتری، یان بە هەر ئەندامێکیتری یەکتری دروستە، تەنها لە کاتی حەیزو زەیسانیدا نێوان ئەژنۆو ناوك بە ڕووتی قەدەغەیە-هەروەك باسمان کرد- بەڵام خۆ ڕەحەتکردن بە دەستیخۆی، یان بە هەر ئەندامێکیتری خۆی، یان بە هەر ئەندامێکی کەسێکیتر دروست نیەو حەرامە، بە بەڵگەی ئەم ئایەتو حەدیسە: خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حافِظُونَ إلاَّ عَلى أَزْواجِهِمْ أَوْ مامَلَكَتْ أَيْمانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ فَمَنِ ابْتَغَى وَراءَ ذلِكَ فَأُولئِكَ هُمُ الْعادُونَ﴾ ئەو کەسانەی پارێزەری ئەندامی جیماع کردنی خۆیانن تەنها لە ژنەکانیخۆیانو جاریەکانی خۆیان، یان مێردیخۆیان نەبێ، چونکە ئەوانە لۆمەکراو نین، کەوابو: هەر کەسێك لەو حەڵاڵە بەو لاوە لەزەتێکیتری بوێ، ئەوانە دوژمنێکی ستەمکارن لە سنوری خوا.

پێغەمبەریش ﷺ لە حەدیسەکەی ژن هێناندا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ﴾ رواه‌الشیخان، هەر کەسێك توانای ژن هێنانی نەبێ، با بەڕۆژوو بێ، چونکە ڕۆژوو شەهوەتی دەبڕێ. واتە: ئەگەر خۆ ڕحەتکردن بە دەستیخۆی دروست بوایە، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دەدا گەنجەکانو فەرمانی ڕۆژووی پێنەدەکردن.

ئینجا بزانە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا﴾ رواه اصحاب السنن بسند صالح، بەر لەعنەت کراوە ئەو کەسەی لە کونی پشتەوەدا جیماع لەگەڵ ژن دەکا. دووبارە بزانە: لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافعی)دا: هەرکەسێك لە سەرەتای حەیزدا جیماع لەگەڵ ژنیحەیزدار بکا، واجبە یەك میسقالی زێڕ (كَفَّارَة) بدا، واتە: بیکاتە خێر، ئەگەر لە کۆتاییو بێهێزیخوێندا جیماع بکا، واجبە نیو میسقالی زێڕ (كفّارة) بدا، بەڵام لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعی)دا: (كفّارة)ی ڕابردوو سوننەتەو واجب نیە، بەڵکو تەمبێ دەکرێو واجبە تۆبە بکا، حەدیسەکەی فەرموودەی کۆنیش بێهێزە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

پێنجەم: تەڵاقدان، هەروەك لە باسی تەڵاقی (بِدْعی)دا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

(فَإذَا انْقَطَعَ) جا هەر کاتێك خوێنیحەیز، یان زەیسانی کۆتایی هات (لَمْ يَحِلَّ قَبْلَ الْغُسْلِ) بۆی حەڵاڵ نابێ پێش غوسل کردن، یان تەیەمموم کردن (غَيْرُ الصَّوْمِ) تەنها ڕۆژوو نەبێو (وَالطَّلاقِ) تەنها تەڵاقدان نەبێ، واتە: ئەگەر بە شەوێ لە حەیز، یان لە نیفاس پاك بۆوە، بۆی دروستە: نیەتی ڕۆژووی سوننەت بێنێو ئەگەر ڕەمەزان بوو، واجبە نیەتی ڕۆژووی واجب بێنێو ڕۆژووەکەشی دروستە، هەر چەند تا دوای بانگیبەیانیش غوسل نەکا، هەروەها تەڵاقدانیشی دروستە، هەرچەند غوسلیشی نەکردبێ.

ئینجا بزانە: نیشانەی پاکبوونەوەیئافرەت ئەوەیە: خوێنەکەو زەردایيو لیڵایی نەمێنێ، واتە: هەرکاتێك ئەوانە نەمان پاك دەبێتەوە، جا ئاوە سپیەکە بێتە دەرەوە، یان نەیێ، کەواتە: واجبە: یەکسەر بۆ یەکەم نوێژی دوای پاکبوونەوە غوسل بکاو نوێژ بکاو ڕۆژوو بگرێ، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، کەوابو: بە تەنها پاکبوونەوە نوێژو ڕۆژووی لە سەر واجب دەبێو هەر نوێژێکی لە دوای پاکبوونەوە نەیکردبێ، واجبە: قەزای بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا ئاماژەیان بۆ کردوە.

## ﴿ باسی (إِسْتِحَاضَة): خوێنچڕکەی نەخۆشی ﴾

(وَالإِسْتِحَاضَةُ) خوێنچڕکەی نەخۆشی: کە لە دوای پانزە ڕۆژیحەیز بەو لاوە بەردەوام بێ (حَدَثٌ دَائِمٌ) بێدەستنوێژیەکی بچووکی بەردەوامە (كَسَلَسٍ) وەکو چۆڕمیزکەو ترو فسو

فَلا تَمْنَعُ الصَّوْمَ وَالصَّلاَةَ، فَتَغْسِلُ الْمُسْتَحَاضَةُ فَرْجَهَا وَتَعْصِبُهُ وَتَتَوَضَأُ وَقْتَ الصَّــلاةِ وَتُبَادِرُ بِهَا، فَلَوْ أَخَّرَتْ لِمَصْلَحَةِ الصَّلاَةِ

---

پیسایی بەردەوام ﴿عن حمنة رضي الله عنها: كُنْتُ أُسْتَحاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً، فَقَالَ النَّبِـيُّ ﷺ: إِنَّما هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطانِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، واتە: مـن خوێنچڕكەیەكی زۆرو بەهێزم تـووش دەبـو، جا پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: ئـەم خوێنچـڕكەیە لێدانێكـە لـە شەیتانەوەیە. واتە: حەیز نیە، بەڵكو شەیتان دەمارێكی مندڵدانەی بریندار كردوەو خـوێنی لێدەردەچێ.

كەوابو: (فَلا تَمْنَعُ الصَّوْمَ وَالصَّلاَةَ) ئـەم خوێنچڕكەیە نوێـژو ڕۆژوو قەدەغـەناكا، هـەروەك چۆڕمیزكە قەدەغەیان ناكا، بەڵام واجبە زۆر بایەخ بە پاكژیو دەستنوێژ بدا:

كەوابو: (فَتَغْسِلُ الْمُسْتَحاضَةُ فَرْجَها) واجبە: لە پێش دەستنوێژگرتن، یان تەیەمموم كردنـدا ئافرەتەكـە تـارەت بـە ئـاو بكـا، چـونكە پێغەمبـەر ﷺ لـە حەدیسـەكەی خوێنچڕكەدا بـە ئافرەتەكـەی فـەرموو: ﴿فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَـلِّي﴾ رواه الشيخان، خوێنەكـە لـە خـۆت بشۆرەو نوێژ بكـە. (وَتَعْصِبُهُ) ئینجـا لـە دوای تـارەتكردن واجبـە: ئەندامەكـەی ببەستێ، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خوێنچڕكە بـە ئـافرەتێكی فـەرموو: ﴿أَنْعَتُ لَكِ الْكُرْسُفَ. قَالَتْ إِنَّهُ أَكْثَرُ مِنْ ذلِكَ. فَقالَ: تَلَجَّمِي﴾ رواه الترمذى وقـال: حسـن صـحيح، لۆكـە دابنـێ نـاو كونی ئەندامەكە. ئافرەتەكەش گوتی: خوێنەكە لەوە زۆرترە: بە لۆكە ڕاناوەستێ. پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: لغاو بكە. واتە: ئەندامەكە ببەستەوە بەم جۆرە:

پشتێندێك، یان دۆخینێك لە ناو قـەدی دەبەستێ، ئینجـا پارچـە پـەڕۆكێكیش دادەنێتـە سەر ئەندامەكەو لایەكی لە لای پێشـەوەی پشتێنەكە دەبەستێو لایەكـەیتریش لـە لای پشتەوەی دەبەستێ، تاكو لـە مـاوەی نوێژكردنـدا خـوێن نێتـە دەرەوە، جا ئەگـەر بـەو بەستنە خوێنەكە نەوەستا، واجبە پارچە لۆكەیەك لە ناو كونی ئەندامەكە دابنـێ، ئەگـەر زۆر ئازاری نەداو بەڕۆژووش نەبێ، بەڵام ئەگەر بەڕۆژوو بوو دروست نیە، چـونكە ڕۆژووی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَتَتَوَضَّأُ) ئینجـا لـە دوای بەسـتن، واجبـە یەكسـەر بێمـاوەدان دەسـتنوێژ بگـرێ (وَقْـتَ الصَّلاةِ) لە كاتی نوێژدا، واتە: لە پێش هاتنی كاتی‌نوێـژ دەسـتنوێژی دروسـت نیـە (وَتُبـادِرُ بِها) واجبە: یەكسەر بێماوەدان لە دوای دەستنوێژگرتن نوێژ بكا، جا ئەگەر ئـەو بەسـتنەی بە توندی كردبو و هیچ كەمتەرخەمیی نەكردبو، لەگەڵ ئەوەشدا خوێنی لێهاتـە دەر، ئـەوە دەستنوێژەكەی ناشكێو نوێژەكەشی دروستە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَلَوْ أَخَّرَتْ) ئەگەر نوێژەكەی دواخست (لِمَصْلَحَةِ الصَّلاةِ) لـە بـەر بەرژەوەندی نوێژەكـە

كَسَتْرٍ وَانْتِظَارِ جَمَاعَةٍ لَمْ يَضُرَّ، وَإِلاَّ فَيَضُرُّ عَلَى الصَّحِيحِ، وَيَجِبُ الْوُضُوءُ لِكُلِّ فَرْضٍ، وَكَذا تَجْدِيدُ الْعِصَابَةِ فِي الأَصَحِّ، وَلَوِ انْقَطَعَ دَمُهَا بَعْدَ الْوُضُوءِ وَلَمْ تَعْتَدْ انْقِطَاعَهُ وَعَوْدَهُ

---

(كَسَتْرٍ) وەكو داپۆشینی عەورەتو (وَانْتِظَارِ جَمَاعَةٍ) چاوەڕوانكردنی نوێژی بە جەماعەت (لَمْ يَضُرَّ) دواخستنەكە زیانی نیە (وَإلاّ) بەڵام ئەگەر دواخستنەكە بۆ بەرژەوەندی نوێژ نەبو، بەڵكو بۆ خواردن، یان قسەكردن، یان كارێكیتر بوو (فَيَضُرُّ عَلَى الصَّحِيحِ) زیانی هەیە لە سەر فەرموودەی ڕاست، واتە: دەستنوێژی دەشكیٚو واجبە: تارەتو بەستنو دەستنوێژ دووبارە بكاتەوە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَيَجِبُ الْوُضُوءُ) واجبە: ئافرەتەكە دەستنوێژ بگرێ (لِكُلِّ فَرْضٍ) بۆ گشت نوێژێكی واجب، واتە: بە هەر دەستنوێژێك لە نوێژێكیواجب زیاتری بۆ دروست نیە، بەڵام هەر چەند حەز بكا: نوێژیسوننەتی بۆ دروستە، وەكو لە تەیەمومیشدا وابو، كەواتە: لەم دەستنوێژەدا واجبە: نیەتی حەڵاڵكردنی نوێژ بێنێ، نەك لابردنی بێدەستنوێژی، چونكە بێدەستنوێژیەكەی لاناچێ، بەڵكو تەنها قەدەغەكراوەكانی پێ حەڵاڵ دەبن، هەروەك لە دەستنوێژدا ڕوون كراوە.

(وَكَذا) هەروەها واجبە: بۆ گشت نوێژێك تارەت بكا، هەروەها واجبە (تَجْدِيدُ الْعِصَابَةِ) بۆ گشت نوێژێك بەستنەكەش نوێ بكاتەوە، هەر چەند پەڕۆكەكەش پیس نەبوبێو لە شوێنیخۆی لانەچوبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا ئەگەر پەڕۆكەكەش بە خوێنێكی زۆر بوبێ، یان ئافرەتەكە میزی كردبو، ئەو كاتە واجبە پەرۆكەكە بشۆرێو بەستنەكەش نوێ بكرێتەوە، ئیتر ئافرەتەكە تەنها یەك جار غوسلی لە سەر واجبە، ئەویش لەو كاتەدا: كە بە كۆتایی هاتنی خوێنیحەیز دادەندرێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە.

ئینجا بزانە: لە سەرەتای ئەم باسە تا ئێرە، ئەركی گشت بەشەكانی ئافرەتی بە خوێنچرِكەیە، تا خوا شیفای بۆ دەنێرێ.

(وَلَوِ انْقَطَعَ دَمُها) ئەگەر ئافرەتەكە خوێنی وەستا (بَعْدَالْوُضُوءِ) لە دوای دەستنوێژگرتن، جا نوێژەكەی دابەستبێ، یان نا (وَلَمْ تَعْتَدْ انْقِطاعَهُ وَعَوْدَهُ) عادەتی ئافرەتەكەش وەها نەبو: خوێنەكەی بوەستێو دووبارەش بێتەوە، ئەوە دەگونجێ نەخۆشیەكەی نەمابێو شیفای بۆ هاتبێ، كەوابو: ئەگەر لە كاتی دەستنوێژگرتندا، یان لە دوای دەستنوێژگرتندا خوێنی هاتبو، دروست نیە بەم دەستنوێژە نوێژ بكا، بەڵكو واجبە تارەت بكاو دەستنوێژ بگرێتەوە، بەڵام ئەگەر نە لە كاتیدەستنوێژو نە لە دوایدەستنوێژ خوێنی نەهاتبو، ئەوە دەستنوێژەكەی هەر بەردەوامەو نوێژیشی پێوە دەكا ، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

أَوْ اعْـتَادَتْ وَوَسِـعَ زَمَـنُ الانْقِـطَاعِ وُضُـوءً وَالـصَّلاَةَ وَجَـبَ الْـوُضُـوءُ.
(فَصْلٌ) رَأَتْ لِسِنِّ الْحَيْضِ أَقَلَّهُ وَلَمْ يَعْبُرْ أَكْثَرَهُ فَكُلُّهُ حَيْضٌ،

---

هەروەها ئەگەر لە دوای تەواوکردنی‌نوێژ خوێنەکەی وەستا، ئەوە ئەو نوێژە دروست بووە، بەڵام دەستنوێژەکەی لە کار دەکەوێ‌و نوێژی‌تری پێ دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(أَوْ اعْتَادَتْ) یان عادەتی وەها بوو: خوێنەکەی دەوەستاو دووبارەش دەهاتەوە (وَوَسِعَ زَمَنُ الانْقِطَاعِ وُضُوءً) کاتی خوێن‌وەستانەکەش ئەوەندە فراوان بوو: بەشی دەستنوێژگرتنی دەکردو (والصَّلاَةَ) بەشی نوێژی ئەو کاتەشی دەکرد، دیسان (وَجَبَ الْوُضُوءُ) واجبە: لە کاتی خوێن‌وەستاندا تارت بکاو دەستنوێژ بگرێتەوەو، هەر لەکاتی خوێن‌وەستانیشدا نوێژەکە بکا، کەوابو: ئەگەر بە دەستنوێژەکەی‌کۆن لە کاتی خوێن‌وەستاندا نوێژەکەی کرد، ئەم نوێژە دروست نیە، هەروەها ئەگەر لە کاتی خوێن‌وەستاندا دەستنوێژی نەگرت‌و نوێژی نەکرد، بەڵکو لە کاتی خوێن هاتندا دەستنوێژی گرت‌و نوێژی کرد، ئەم نوێژەش دروست نیە، چونکە کەمتەرخەمی‌ی کردوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو ئافرەتەی خوێنچرکەی تووش بووە، دروستە: مێردەکەی جیماعی لەگەڵ بکا، هەر چەند لە کاتی خوێن هاتنیشدا بێ، هەروەها قورئان خوێندنیشی بۆ دروستەو بە دەستنوێژەوەش دروستە: دەست لە قورئان بدا.

ئینجا بزانە: ئەو مرۆڤەی بەردەوام چۆڕمیزکەی هەیە، یان تړو فسی بەردەوامی هەیە، یان پیسایی، یان خوێنی مایسیری‌ی بەردەوام لێدێتە دەرەوە، بێ‌دەستنوێژی ئەوانەش بێ‌دەستنوێژیەکی بچوکی بەردەوامە، کەوابو: ئەوانەش وەکو ئافرەتی بە خوێنچرکە ڕەفتار دەکەن: لە تارەت‌و بەستن‌و دەستنوێژی ڕابردوودا، جا هەر کاتێك ئەوانەو ئافرەتی بە خوێنچرکە ئەو مەرجانەی بۆمان دانابون بەجێیان هێنان‌و نوێژیان کرد، قەزاکردنەوەیان لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر خاوەنی چۆڕمیزکە، تەنها بە پێوە میزی دەهات‌و بە دانیشتوویی نەدەهات، واجبە بە دانیشتووی نوێژ بکا تاکو دەستنوێژی نەشکێ، قەزاکردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەم باسانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿فَصْلٌ: لە باسی بەشەکانی خوێنچرکە﴾

(رَأَتْ لِسِنِّ الْحَيْضِ) هەر کاتێك ئافرەتێك خوێنی دیت، لە تەمەنی‌حەیزدا: کە نۆ ساڵی‌و بە سەرەوەترە (أَقَلَّهُ) لای کەمتری‌خوێنەکەی دیت: کە شەوێك‌و ڕۆژێکە، یان لە شەوێك‌و ڕۆژێك زیاتری دیت، بەڵام (وَلَمْ يَعْبُرْ أَكْثَرَهُ) لە لای زۆرتری خوێنەکەش تێنەپەڕێ، واتە: لە پانزە ڕۆژو شەو زیاتر نەهات (فَكُلُّهُ حَيْضٌ) هەمووی بە حەیز دادەندرێ، واتە: شەو و

ڕۆژەکەو پانزەکەو نێوانەکەش گشتی حەیزە، جیاوازی نیە: یەکەم حەیزی بێ لە ژیانیدا، یان دووەم جارو سێیەم‌و بەرەو سەرەوەتری بێ، هەروەهاجیاوازی نیە: عادەتی ئەم جارەش وەك جارەکانیتر بێ، یان جیابێ، خوێنەکە: یەك ڕەنگ بێ، یان هەندێك ڕەش بێ‌و هەندێك سوور بێ‌و هەندێك لێڵ بێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر تەمەنی ئافرەتەکە لە نۆ ساڵ کەمتر بوو و خوێنی هات، ئەوە خوێنی حەیز نیە، بەڵکو خوێنچڕکەیەنەخۆشییە، هەروەك لە سەرەتای حەیزدا باسمان کرد.

(وَالصُّفْرَةُ) ئەو خوێنەی وەکو کێمێکی زەردە (وَالْكُدْرَةُ) ئەو خوێنەی لێڵە (حَيْضٌ) هەردووکی بە خوێنیحەیز دادەندرێن، بەو مەرجەی خوێنەکان لە ماوەی پانزە ڕۆژەکەدا بن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەر چەند بە پێچەوانەی عادەتیڕابردووشی بێ ﴿كانَت النِّساءُ يَبْعَثْنَ إلى عائشة رضي الله عنها بالدُّرْجَة فيهاالْكُرْسُفُ فيه الصُّفْرَةُ منْ دَمِ الْحَيْضِ، فَتَقُولُ: لاتَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ الْقَصَّةَالْبَيْضاءَ. تُرِيدُ بِذَلِكَ: الطُّهْرَ مِنَ الْحَيْضَةِ﴾ رواه مالك والبخاري، ئافرەتان پارچە لۆکەیان لە ناو کونی ئەندامیحەیز دادەناو ڕەنگی زەرد دەبوو و دەیانناردە لای حەزرەتی(عائشة)، ئەویش دەیفەرموو: پەلە مەکەن تا ئاوە سپیەکە دەبینن. مەبەستی وەهابو: ئەم زەردە نیشانەیە کە لە حەیز پاك نەبۆتەوەو سپیەکەش نیشانەی پاکبوونەوەیە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ئافرەتەکە بەشێکی لای کەمی پاکبوونەوەی مابوو و خوێنی دیت، ئەوە حەیز نیە، کەواتە: ئەگەر سێ ڕۆژ خوێنی دیت، ئینجا دوانزە ڕۆژ پاك بۆوە، ئینجا سێ ڕۆژیتریش خوێنی دیت، ئەوە سێ ڕۆژەکەیدوایی حەیز نیە بە ڵکو خوێنچڕەکەیە، چونکە تەواوکەری پانزە ڕۆژەکەیپاکبوونەوەیە، هەر وەك لەسەر چاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك ئافرەت خوێنی دیت‌و دەشگونجا خوێنی حەیز بێ، واجبە: یەکسەر خۆی قەدەغە بکا لەو شتانەی بە حەیز حەرامن، ئینجا ئەگەر لە ماوەی کەمتر لە ڕۆژێك‌و شەوێك خوێنەکەی وەستا، ئاشکرا دەبێ: ئەو ماوەیە حەیز نەبوە بەڵکو خوێنچڕکەیە، کەوابو: نوێژەکانی ئەو ماوەیە قەزا دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر شەو و ڕۆژێکی -بێپچڕان- تەواو کردو خوێنەکە وەستا، یان تا پانزە ڕۆژ نەوەستا، یان لە نێوان شەو و ڕۆژێك‌و پانزەکەدا وەستا، ئەوە گشتی حەیزە، هەروەك باسمان کردو لە (المجموع)و (تحفة)شدا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: (فَإِنْ عَبَرَهُ) ئەگەر خوێنیئافرەتەکە لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بوو، بۆمان ئاشکرا دەبێ ئەو ئافرەتە حەیزو خوێنچڕکەی تێکەڵ بووە، کەوابو: دەکرێتە پێنج بەشی سەرەکی:

فَإِنْ كَانَتْ مُبْتَدَأَةً مُمَيِّزَةً بِأَنْ تَرَى قَوِيّاً وَضَعِيفاً: فَالضَّعِيفُ اسْتِحَاضَةٌ وَالْقَوِيُّ حَيْضٌ إِنْ لَمْ يَنْقُصْ عَنْ أَقَلِّهِ وَلاَ عَبَرَ أَكْثَرَهُ وَلاَ نَقَصَ الضَّعِيفُ عَنْ أَقَلِّ الطُّهْرِ.

---

یەكـەم: (اَلْمُبْتَدَأَةُ الْمُمَيِّزَةُ). دووەم: (اَلْمُبْتَدَأَةُ اللاَّمُمَيِّزَةُ). سێیەم: (اَلْمُعْتَادَةُ اللاَّمُمَيِّزَةُ). چوارەم: (اَلْمُعْتَادَةُ الْمُمَيِّزَةُ). پێنجەم: (اَلْمُتَحَيِّرَةُ).

ئینجا (اَلْمُتَحَيِّرَةُ)ش سێ حاڵەتی هەنە، كەوابو: بە تێكڕایی دەبێتە حەفت بەش- ان شاء الله- یەك لە دوای یەك هەر حەفت بەشەكە ڕوون دەكەینەوە:

**یەكەم:** دەربارەی (اَلْمُبْتَدَأَةُ الْمُمَيِّزَةُ)-دەست پێكراوی جیاكەرەوە، دەفەرموێ: (فَإِنْ كَانَتْ مُبْتَدَأَةً) ئەگەر ئافرەتەكە یەكەمجاری بوو لە ژیانیدا: خوێنیحەیزی دەستی بە هاتن كردبو (مُمَيِّزَةً) خوێنەكانیشی لێك جیا دەكردنەوە (بِأَنْ تَرَى قَوِيّاً) بە شێوەیەكی وەها: هەندێ جار خوێنێكی بەهێزی دەدیت (وَضَعِيفاً) هەندێ جاریش خوێنێكی بێهێزی دەدیت (فَالضَّعِيفُ إِسْتِحَاضَةٌ) ئەو كاتە خوێنە بێهێزەكە خوێنچڕكەیە (وَالْقَوِيُّ حَيْضٌ) خوێنە بەهێزەكەش حەیزە، بەم سێ مەرجانەی جیاكردنەوە:

یەكەم: (إِنْ لَمْ يَنْقُصْ عَنْ أَقَلِّهِ) خوێنە بەهێزەكە لە كەمترین ماوەیحەیز-كە ڕۆژێكو شەوێكە- كەمتر نەبێ. دووەم: (وَلا عَبَرَ أَكْثَرَهُ) بەهێزەكە لە زۆرترین ماوەیحەیزیش- كە پانزە شەو و ڕۆژە- تێنەپەڕێ. سێیەم: (وَلا نَقَصَ الضَّعِيفُ عَنْ أَقَلِّ الطُّهْرِ) خوێنە بێهێزەكەش لە كەمترین ماوەی پاكبوونەوە-كە پانزە شەو و ڕۆژە- كەمتر نەبێ.

بۆ وێنە: ئەگەر چوار ڕۆژ خوێنێكی ڕەشی دیت، ئینجا پانزە ڕۆژ، یان زیاتر خوێنێكی سوری دیت، ئەوە تەنها ڕەشەكە حەیزە؟ چونكە لە سورەكە بەهێزترە، سورەكەش خوێنچڕكەیە هەرچەندە چەند ساڵێكیش بەردەوام بێ، كەوابو: بەگوێرەی ئەم حەدیسە ڕەفتار دەكا:

﴿عن فاطمة بنت أبي حُبَيش رضي الله عنها: أنها قالَتْ يارَسُول الله إنِّي أُستَحاضُ؟ فَقالَ ﷺ لَها: إذا كانَ دَمُ الْحَيْضِ فإنَّهُ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذا كانَ ذلكِ فَأَمسِكي عَنِ الصَّلاةِ وَإِذاكانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئي وَصَلِّي فَإِنَّما هُوَ عِرْقٌ﴾ رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، (فاطمة) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من خوێنچڕكەم تووش دەبێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوێنی حەیز ڕەشەو دەناسرێ -واتە: بە ڕەنگو بۆنی- جا هەر كاتێك ئەو خوێنە بوو، واز لە نوێژ بێنە، هەركاتێكیش خوێنێكیتری بێهێز بوو، بۆ گشت نوێژێك دەستنوێژ بگرەو نوێژ بكە-واتە: لە دوای غوسل كردن- چونكە ئەمەیان خوێنی دەمارێكی منداڵدانەیە، واتە: حەیز نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر مەرجێك لەو سێ مەرجانەیڕابردوو نەهاتە جێ: وەك ڕۆژێك ڕەش بێو ڕوژێك سور بێ، یان چواردە ڕۆژ سور بێ، یان شانزە ڕۆژ ڕەش بێ، ئەوەیان وەك بەشی

أَوْ مُبْتَدَأَةً لاَ مُمَيِّزَةً بِأَنْ رَأَتْهُ بِصِفَةٍ أَوْ فَقَدَتْ شَرْطَ تَمْيِيزٍ فَالأَظْهَرُ أَنَّ حَيْضَهَا يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ وَطُهْرَهَا تِسْعٌ وَعِشْرُونَ.

---

دووەمی‌داهاتوو ڕەفتار دەکا، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها بزانە: خوێنی‌ڕەش لە خوێنی‌سوور بەهێزترە، ئینجا سوور لە کاڵ، ئینجا کاڵ لە زەرد، ئینجا زەرد لە لێڵ، هەروەها خوێنی‌پەیت لە خوێنی‌شل بەهێزترە، هەروەها خوێنی بۆگەن بەهێزترە لە خوێنی بێ‌بۆن، هەروەها ئەو خوێنەی سێ نیشانەی تێدا بن، بەهێزترە لەوەی دوو نیشانەی تێدانە، هەروەها دوو نیشانەش لە یەك نیشانە بەهێزترن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**دووەم:** دەربارەی (الْمُبْتَدَاةُ اللاّمُمَيِّزَة)=دەست پێکراوی جیانەکەرەوە، دەفەرموێ: (أَوْ مُبْتَدأَةً) یان ئەو ئافرەتەی خوێنەکەی لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بووە، یەکەمجاری بوو لە ژیانی‌دا خوێنی‌حەیزی دەستی بە هاتن کردبو، بەڵام (لامُمَيِّزَةً) خوێنەکانی لێك جیا نەدەکردەوە، ئەمەیان دوو حاڵەتی هەنە، یەکەم: (بِأَنْ رَأَتْهُ بِصِفَةٍ) وەك تەنها بە یەك جۆر خوێنەکەی دیت. دووەم: (أَوْ فَقَدَتْ شَرْطَ تَمْيِيزٍ) یان بە دوو جۆر، یان زیاتر دەیدیت، بەڵام مەرجێکی لە سێ مەرجەکانی‌جیاکرنەوەی نەبو-وەك بەهێزەکە لە ڕۆژێك‌و شەوێك کەمتر بێ، یان لە پانزە ڕۆژ زیاتر بێ، یان بێ‌هێزەکە لە پانزە ڕۆژ کەمتر بێ- ئەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ حَيْضَهَا) حەیزی ئەم ئافرەتە لە هەردوو حاڵەتدا (يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ) ڕۆژێك‌و شەوێکە، واتە: بیست‌و چوار سەعاتەو لە سەرەتای هاتنی خوێنەکەوە دەست پێ‌دەکا (وَطُهْرَهَا) پاکبوونەوەشی (تِسْعٌ وَعِشْرُونَ) بیست‌و نۆ ڕۆژەو لە کۆتایی شەو و ڕۆژەکەوە دەست پێ‌دەکا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەم ئافرەتە لە خولی یەکەمی‌دا واجبە خۆی قەدەغە بکا: لەو شتانەی بە هۆی حەیز حەرامن، تا پانزە ڕۆژ تەواو دەبن، جا ئەگەر لە پانزە ڕۆژ، یان کەمتر خوێنەکەی وەستا، ئەوە ئاشکرا دەبێ: ئەو ماوەیە گشتی حەیز بووە، کەوابو: لە دوای خوێن‌وەستانەکە، یەکسەر غوسل دەکاو نوێژ دەکاو...هتد.

بەڵام ئەگەر پانزە ڕۆژ تەواو بون‌و خوێنەکەی نەوەستا، ئەوە ئاشکرا دەبێ: حەیزەکەی تەنها شەوێك‌و ڕۆژێك بووەو ئەوی‌تریش خوێنچرکە بووە، کەوابو: واجبە یەکسەر غوسل بکاو دەست بە نوێژ بکاتەوەو نوێژو ڕۆژووی ئەو ماوەیەش: کە نەیکردون-جگە لە شەوو ڕۆژێك- واجبە قەزا بکاتەوە، ئینجا لە مەودوا لە خولی دووەم‌و سێیەم و...هتد، ئەو قەدەغەکردنەی ناوێ، بەڵکو کە شەو و ڕۆژێك تەواو بوو، یەکسەر غوسل دەکاو تا بیست‌و نۆ ڕۆژ تەواو دەبن گشت قەدەغەکراوەکانی لێ‌حەڵاڵن، بەو جۆرە خولی مانگانەی

دەبێتەوە سێ ڕۆژ، تا خوا شیفای بۆ دەنێرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە، ئینجا بزانە: ئەگەر ئافرەتی(مُبْتَدأة)=دەست پێكراو، سەرەتای هاتنی خوێنی نەدەزانی، ئەوە وەك سەر لێشێواوی بەشی پێنجەمە.

**سێیەم**: دربارەی (اَلْمُعْتَادَةُ اللاَّمُمَيِّزَة)=فێربووی جیانەكەرەوە، دەفەرموێ: (أَوْ مُعْتَادَةً) یان ئەگەر ئەو ئافرەتەی خوێنی لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بووە، فێرە حەیز بوو (بِأَنْ سَبَقَ لَها حَيْضٌ) بە شێوەیەكی وەها: لە ژیانیدا حەیزێكی دیتبو (وَطُهْرٌ) هەروەها پاكبوونەوەكیشی دیتبو، بەلام خوێنەكەی ئەم جارەی لێك جیانەدەكردەوە، یان مەرجێك لە سێ مەرجەكانی جیاكردنەوە نەهاتە جێ- واتە: بەهێزەكەی لە شەو و ڕۆژێك كەمتر بوو، یان لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بوو، یان بێهێزەكە لە پانزە ڕۆژ كەمتر بوو- ئەو كاتە (فَتُرَدُّ إِلَيْهِما) ئافرەتەكە دەگەڕێندرێتەوە لای حەیزەكەو پاكبوونەوەكەی پێشووی (قَدْرًا) بە گوێرەی ئەندازەی ڕابردوو و (وَوَقْتًا) بە گوێرەی كاتی ڕابردوو.

**بۆ وێنە**: ئەگەر حەیزیپێشووی پێنج ڕۆژ بوو لە ماوەی سی ڕۆژدا، ئەوە لە كاتی خوێنچڕكەدا پێنج ڕۆژ بە حەیز دادەندرێنو بیست وپێنجیش بە پاكبوونەوە، هەروەها ئەگەر لە ماوەی نەوەد ڕۆژدا، سێ ڕۆژ حەیزیپێشووی بوو، ئەوە لە كاتیخوێنچڕكەشدا سێ ڕۆژ حەیزەو هەشتاو حەفتیش پاكبوونەوەیە، سالێكو زیاتریش هەر بەو جۆرەیە ﴿عن حمنة بنت جحش رضي الله عنها: كُنْتُ أُسْتَحاضُ حَيْضَةً شَديدةً كَثيرَةً، فَقالَ لَها النَّبيُّ ﷺ: إِنَّما هِيَ رَكْضَةٌ مِنَ الشَّيْطانِ فَتَحَيَّضي سِتَّةَ أَيّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيّامٍ ثُمَّ اغْتَسِلي، فَإِذا اسْتَنْقَأْتِ فَصَلّي أَرْبَعَةً وَعِشْرينَ أَو ثَلاثَةً وَعِشْرينَ وَصومي وَصَلّي، وَكَذلِكَ فَافْعَلي...﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، (حمنة) فەرمووی: من خوێنچڕكەیەكی زۆرو بەهێزم تووش دەبو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە لێدانێكە لە شەیتانەوەیە، كەوابو: بە گوێرەی عادەتیپێشوو شەش ڕۆژ یان حەفت ڕۆژ بۆ حەیز دابنێ، ئینجا غوسل بكە، جا لە دوای غوسل هەر كاتێك تارەتت كردو ئەندامەكەت بەست، نوێژ بكە تا ماوەی بیستو چوار، یان بیستوسێ ڕۆژ، ڕۆژووش بگرەو بەم شێوەیە لە گشت مانگێكدا ڕەفتار بكە.

(وَتَثْبُتُ بِمَرَّةٍ) عادەتی پێشووی حەیزو پاكبوونەوە، بە تەنها یەك جار جێگیر دەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا. ئینجا بزانە: دەگونجێ عادەتی حەیزو پاكبوونەوە بە یەكەوە، یان هەر یەكێكیان بگۆڕێ، واتە: پێش بكەوێ، یان دوا بكەوێ، یان زیاد بكا، یان كەم بكا، جا ئەگەر هاتو ئافرەتێك عادەتەكانی لێك جیاواز بوو و خوێنچڕكەی تووش بوو، ئەو كاتە عادەتی پێش خوێنچڕكەكە ڕەفتاری پێدەكرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

..........................................................................

بۆ وێنه: ئەگەر له مانگەكانیپێشتردا حەیزەكەی پێنج ڕۆژ بوو، ئینجا بووه شەش ڕۆژ، ئینجا خوێنچڕكەی تووش بوو، ئەو كاته شەش ڕۆژەكه ڕەفتاری پیدەكریو دەبێته عادەتێكی جێگیربوو، هەروەك له (تحفة)دا فەرموویەتی ﴿عن أم سلَمة رضي الله عنها: أنَّ امْـرَأَةً كانَتْ تُهراقُ الدَّمَ، فقال النَّبيُّ ﷺ: لِتَنظُرْ عَدَدَالأَيامِ وَاللَّيالِى الَّتى كانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّـهْرِ قَبْلَ أنْ يُصيبَهاالَّذى أَصابَها فَلْتَدَعِ الصَّلاةَ قَدْرَ ذلكَ مِنَ الشَّهْرِ﴾ رواه ابوداود وغيره باسناد صحيح، ئافرەتێك زۆر خوێنی دەڕشت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: با تەماشای ژمارەی ئەو شەو و ڕۆژانه بكا: كه حەیزی تێدا دەدیت لەو مانگەی كه له پێش تووشبوونی خوێنچڕكەدا بوو، به ئەندازەی حەیزی ئەو مانگه لەم مانگەشدا واز له نوێژ بێنێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لەم بەشەی سێیەمیشدا، واجبه له یەكەمجاری خۆێنچڕكەدا خۆی قەدەغه بكا لەو شتانەی به هۆی حەیز حەڕامن، تا پانزه ڕۆژ تەواو دەبن، ئینجا ئەگەر له پانزه ڕۆژ، یان بەرەو خوارتر خوێنەكەی وەستا، ئەوە ئاشكرا دەبێ: ئەو ماوەیه گشتی حەیز بووەو عادەتی پێشووی گۆڕاوە، كەوابو: له دوای خوێنوەستانەكه یەكسەر غوسل دەكاو نویژ دەكاو...هتد.

بەڵام ئەگەر پانزه ڕۆژ تەواو بونو خوێنەكەی نەوەستا، ئەوە ئاشكرا دەبێ: خوێنچڕكەی تووش بووەو تەنها ئەندازەی حەیزی مانگەكەی پێش ئەم خوێنچڕكەیەی به حەیز بۆ دادەندریو ئەویتریش گشتی به پاكبوونەوە، كەوابو: واجبه یەكسەر غوسل بكاو دەست به نوێژ بكاتەوەو نوێژو ڕۆژووی ئەو ماوەیەش: كه نەیكردبون–جگه له ئەندازەی حەیز– واجبه: گشتی قەزا بكاتەوە، ئینجا له خولی دووەمو سێیەمو...هتد، ئەو قەدەغەكردنەی ناوێ، بەڵكو كه ئەندازەی عادەتیپێشوو تەواو بوو: یەكسەر غوسل دەكاو نوێژ دەكاو...بەم جۆره، تا خوا شیفای بۆ دەنێرێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

ئینجا بزانه: عادەتیحەیز–هەروەك به ژمارەی ڕۆژەكان جێگیر دەبێ– به ڕەنگی خوێنەكەش جێگیر دەبێ، كەواته: ئەگەر (مُبْتَدَأَةٌ مُمَيِّزَة) بوو، واته: یەكەمجاری بوو حەیز ببینێو ماوەی پێنج ڕۆژ خوێنێكی ڕەشی دیت، ئینجا بیستو پێنج ڕۆژیش خوێنێكی سوری دیت، ئینجا لەودواش هەر خوێنێكی جیانەكراوەی دیت، ئەوە بۆ خولی مانگەكانیتر پێنج ڕۆژی خوێنه ڕەشەكه به عادەت دادەندرێنو كه ئەو پێنجه تەواو بون یەكسەرغوسل دەكاو نوێژو ڕۆژوو...هتد دەكا، وەكو ئافرەتی پاكبووەوە، هەروەك له (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە.

**چوارەم:** دەربارەی (اَلْمُعْتَادَةُ الْمُمَيِّزَةُ)-فێربووی جیاکەرەوە، دەفەرموێ: (وَيُحْكَمُ) بڕیار دەدرێ (لِلْمُعْتَادَةِ) بۆ ئەو ئافرەتەی خوێنەکەی لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بووەو لە پێشداش حەیزو پاکبوونەوەی دیتووە (الْمُمَيِّزَةِ) خوێنەکەی ئێستاشی لێك جیا دەکردەوە (بِالتَّمْيِيزِ) بەگوێرەی جیاکردنەوە بڕیاری بۆ دەدرێ (لاَالْعَادَةِ) نەك بەگوێرەی عادەتی خوێنەکەی پێشووی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

کەواتە: ئەگەر عادەتی پێشووی پێنج ڕۆژ بوو لە سی ڕۆژدا، ئەم جارەش دە ڕۆژ خوێنێکی ڕەشی دیت، ئینجا بێوەستان ڕەنگی خوێنەکە سوور، یان زەرد بوو، ئەوە ئەم جارە بەگوێرەی عادەتی پێشوو-کە پێنج ڕۆژەکەیە- بڕیاری حەیزی بۆ نادرێ، بەڵکو بەگوێرەی ڕەنگی خوێنەکە دە ڕۆژەکەی بە حەیز بۆ دادەندرێ، ئەوی‌تریش خوێنچرکەیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: کە دە ڕۆژەکە تەواو بون، یەکسەر غوسل دەکاو دەست بە نوێژ دەکا ﴿عن فاطمة بنت أبي حبيش رضي الله عنها في حديثها السابق: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: دَمُ الْحَيْضِ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ، فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلاَةِ وَإِذَا كَانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي﴾ رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، خوێنی‌حەیز خوێنێکی ڕەشەو دەناسرێ، هەر کاتێك ئەم خوێنە ڕەشە هات، واز لە نوێژ بێنە، هەر کاتێکیش ئەوی‌تر بوو: دەستنوێژ بگرەو نوێژ بکە، واتە: لە دوای غوسل کردن.

ئینجا بزانە: ئەمە دەربارەی ئەو ئافرەتە بوو: کە عادەتی پێشووی لەبیر ماوە، کەوابو: ئەگەر عادەتی پێشووی لەبیر نەمابو، ئەویش هەر بەگوێرەی جیاکردنەوەی خوێن بڕیاری حەیزی بۆدەدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەها بزانە: ئەگەر مەرجێك لە سێ مەرجەکانی جیاکردنەوە نەهاتە جێ-واتە: خوێنە بەهێزەکە لە شەو و ڕۆژێك کەمتر بوو، یان لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بوو، یان بێ‌هێزەکە لە پانزە ڕۆژ کەمتر بوو- ئەوە دەگەڕێندرێتەوە سەر عادەتی پێشووی، هەروەك لە بەشی سێیەمدا ڕوون کراوە، جا ئەگەر عادەتەکەی‌پێشووی لەبیر نەمابو و ئەو سێ مەرجانەشی لێ‌نەهاتنە جێ، ئەوەش وەك سەر لێشێواوی بەشی پێنجەمە.

## ﴿ خوێنچرکەی ئافرەتی (اَلْمُتَحَيِّرَة)-سەرلێشێواو ﴾

**پێنجەم:** دەربارەی (اَلْمُتَحَيِّرَة)-ئافرەتی سەرلێشێواو، دەفەرموێ: (أَوْ مُتَحَيِّرَةٌ) یان ئەو ئافرەتەی خوێنەکەی لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بووە، سەرلێشێواو بوو، ئەوە دەکرێتە سێ بەش: بەشی یەکەمیان: (اَلْمُتَحَيِّرَةُ الْمُطْلَقَةُ) سەرلێشێواوی هیچ نەزان، واتە: (بِأَنْ نَسِيَتْ عَادَتَهَا) بە جۆرێکی وەها عادەتی‌پێشووی لە بیر کردبێ:

قَدْراً وَوَقْتاً: فَفِي قَوْلٍ كَمُبْتَدأَة، وَالْمَشْهُورُ وَجُوبُ الإحْتِيَاطَ: فَيَحْرُمُ الْـوَطْءُ وَمَـسُّ الْمُصْحَف وَالْقَرَاءَ ةُ فِي غَيْرِالصَّلاة، وَتُصَلِّي الْفَرَائِضَ أَبَداً، وَكَـذاالنَّفْلُ فِيالأَصَـحِّ، وَتَغْتَسِلُ لِكُلِّ فَرْضٍ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ ثُمَّ شَهْراً كَامِلَيْنِ فَيَحْصُلُ مِنْ كُلٍّ أَرْبَعَةَ عَشَرَ،

---

(قَدْراً وَوَقْتاً) نه ئەندازەو نه کاتەکەی هیچ لەبیر نەمابێ، یان سەرەتای خوێنمانگانەی لەبیر کردبو، یان سەرەتای هاتنیخوێنی نەدەزانی، لەو حاڵەتانەشدا جیاکەرەوەش نەبو، یان مەرجێکی جیا کردنەوەی لێنەهاتە جێ (فَفِي قَوْلٍ) له فەرمودەیەکی بێهێزدا: ئەو سەرلێشێواوە (کَمُبْتَدأَةٍ) وەکو دەست پێکراوی جیانەکەرەوە بڕیاری بۆ دەدرێ، واتە: له سەرەتای مانگەوە ڕۆژێكو شەوێکی بۆ به حەیز دادەندرێو بیستو هەشت، یان بیستو نۆ ڕۆژیشی پاکبوونەوەیە.

(وَالْمَشْهُورُ) بەلاّم به فەرموودەی بەهێزیناسراویمەزهەبی(شافعی): (وُجُوبُ الإحْتِيَاطِ) واجبە ئافرەتی سەرلێشێواو پارێزکاری بکا، چونکە گشت کاتێکی دەگونجێ حەیز بێو دەشگونجێ پاکبوونەوە بێ، بەلاّم ناگونجێ گشت کاتێکی بەردەوام حەیز بێ، هەروەها–لە بەر خوێن هاتنیش– ناگونجێ حەیزو پاکبوونەوە لێك جیا بکرێنەوە، واتە: نە حەیزو نە پاکبوونەوەی بێگومان نیە، کەوابو، واجبە بەم شێوەیداهاتوو پارێزکاری بکا:

(فَيَحْرُمُ الْوَطْءُ) حەرامە: مێرد جیماع لەگەڵ ئافرەتی سەرلێشێواو بکا (وَمَسُّ الْمُصْحَفِ) حەرامە: ئافرەتی سەرلێشێواو دەست لە قورئان بدا، یان هەڵیبگرێ، هەم (وَالْقِراءَ ةُ فِي غَيْرِ الصَّلاةِ) حەرامە: قورئان بخوێنێ جگە لە ناو نوێژدا نەبێ، واتە: لە ناو نوێژدا فاتحەو سورەتەکانی دوای فاتیحەشی بۆ حەلاّلە بیانخوێنێ، هەروەها چوونە ناو مزگەوتیش حەرامە ئەگەر ترسی پیسکردنی هەبێ (وَتُصَلِّيالْفَرائِضَ أَبَداً) هەروەها واجبە: ئافرەتی سەرلێشێواو بەردەوام نوێژەواجبەکان بکا (وَكَذاالنَّفْلُ) هەروەها دروستە: سوننەتەکانیش بکا (فِيالأَصَحِّ) لە فەموودەی ڕاستتردا.

(وَتَغْتَسِلُ لِكُلِّ فَرْضٍ) واجبە ئافرەتی سەرلێشێواو بۆ گشت نوێژێکیواجب لە کاتی نوێژەکەدا غوسل بکا، ئەگەر کاتی خوێنوەستانی پێشووی لەبیر نەمابێ، بەلاّم ئەگەر لەبیری مابو: کە لە حەیزیپێشووی لە کاتی ڕۆژئاوادا پاك دەبۆوە، ئەو کاتە هەموو ڕۆژێك تەنها یەك غوسل لە دوای ڕۆژ ئاوابووندا واجبە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَصُومُ رَمَضانَ) هەروەها واجبە: ئافرەتی سەرلێشێواو لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو ببێ (ثُمَّ) ئینجا لە دوایڕەمەزانیش (شَهْراً) مانگێکیتریش بەڕۆژوو دەبێ (كامِلَيْنِ) ڕەمەزانو مانگەکەی دوایڕەمەزان هەردووکیان سی ڕۆژی تەواو بن (فَيَحْصُلُ) جا بۆی جێگیر دەبێ (مِنْ كُلٍّ) لە هەر یەکێك: لە ڕەمەزانو لە مانگەکەی دوای ڕەمەزان (أَرْبَعَةَعَشَرَ) چواردە ڕۆژوو، کۆی هەردووکیان دەکاتە بیستو هەشت ڕۆژوو.

ثُمَّ تَصُومُ مِنْ ثَمَانِيَةَعَشَرَ: ثَلاَثَةٌ أَوَّلَهَا وَثَلاَثَةٌ آخِرَهَا فَيَحْصُلُ الْيَومَانِ الْبَاقِيَانِ، وَيُمْكِنُ قَضَاءُ يَوْمٍ بِصَوْمِ يَوْمٍ ثُمَّ الثَّالِثَ وَالسَّابِعَ عَشَرَ،

---

واته: چونكه دەگونجێ ئەو سەرلێشێواوە ماوەی پانزە ڕۆژیتەواو حەیزی بێ، هەروەها دەشگونجێ لە كاتێكی ڕۆژی یەكەمدا خوێنیحەیزی هاتبێو لە كاتێكی ڕۆژی شانزەمیندا خوێنیحەیزی وەستابێ، كەوابو: ئەگەر ڕەمەزان سی ڕۆژی تەواو بێ، ئەوە چواردە ڕۆژووی بۆ دروست دەبێو ئەگەر بیستو نۆ بێ، سێزدە ڕۆژووی بۆ دروست دەبێ، بەلاّم لە هەردوو حاڵەتدا شانزە ڕۆژوو قەرزدار دەمێنێتەوە، ئینجا كە لە مانگێكیتریشدا سی ڕۆژ بەڕۆژوو بوو، دیسان چواردە ڕۆژوویتریشی بۆ دروست دەبن، لەگەڵ چواردەكەی ڕەمەزاندا دەكاتە بیستو هەشت.

كەوابو: هێشتا دوو ڕۆژوویتر قەرزدار ماوەتەوە، ئەو دوو ڕۆژووانەش بە چەند ڕێگایەك قەزا دەكرێنەوە، بەلاّم لێرەدا دوو ڕێگای باس كردون:

ڕێگاییەكەم: (ثُمَّ) ئینجا بۆ قەزاكردنەوەی ئەو دوو ڕۆژووانەش (تَصُومُ مِنْ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ) لە هەژدە ڕۆژاندا شەش ڕۆژان بەڕۆژوو دەبێ، بەم جۆرە: (ثَلاَثَةٌ أَوَّلَهَا) سێ ڕۆژان لە سەرەتای هەژدەكەدا، واتە: یەكەمو دووەمو سێیەم (وَثَلاَثَةٌ آخِرَهَا) سێ ڕۆژانیش لە كۆتایی هەژدەكەدا، واتە: شانزەو حەڤدەو هەژدە (فَيَحْصُلُ الْيَوْمَانِ الْبَاقِيَانِ) بەو شەش ڕۆژانە ئەو دوو ڕۆژووەی قەرزدار مابۆوە جێگیر دەبنو لە سەری لادەچن، چونكە ئەگەر لە ڕۆژییەكەمدا خوێنیحەیزی هاتبێ، ئەوە لە شانزەدا پاك دەبێتەوەو بێگومان ڕۆژووی حەڤدەو هەژدەی دروست دەبن، ئەگەر لە ڕۆژیدووەمدا خوێنیحەیزی هاتبێ، ئەوە لە حەڤدەدا پاك دەبێتەوەو بێگومان ڕۆژووی یەكەمو هەژدەی دروست دەبن، ئەگەر لە سێیەمدا خوێنی حەیزی هاتبێ، ئەوە بێگومان یەكەمو دووەمی دروست بونە...هتد.

ڕێگایدووەم: (وَيُمْكِنُ) بە ڕێگایەكیتریش دەگونجێ (قَضَاءُ يَوْمٍ) یەك ڕۆژوو قەزا بكرێتەوە بە بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژان لە ماوەی حەڤدە ڕۆژاندا: (بِصَوْمِ يَوْمٍ) بە بەڕۆژووبوونیڕۆژی یەكەمو (ثُمَّ الثَّالِثَ) ئینجا بەڕۆژووبوونیڕۆژیسێیەمو (ثُمَّ السَّابِعَ عَشَرَ) ئینجا بەڕۆژووبوونی ڕۆژیحەڤدەمیش، واتە: بەو سێ ڕۆژانە، یەك ڕۆژووی لە سەر لادەچێ، چونكە ئەگەر لە ڕۆژی یەكەمدا خوێنیحەیزی هاتبێ، بێگومان ڕۆژووی حەڤدەی دروستە، ئەگەر لە دووەمو سێیەمدا هاتبێ، بێگومان ڕۆژووی یەكەمی دروستە...هتد.

جا ئەوە ئەگەر بیەوێ دوو ڕۆژووەكان جیا جیا لە دوو مانگدا قەزا بكاتەوە، بەلاّم ئەگەر بیەوێ–هەر بەم ڕێگەیدووەم– هەردوو ڕۆژووەكان، بە یەكەوە لە یەك مانگدا قەزا بكاتەوە، ئەوە بە بەڕۆژووبوونی پێنج ڕۆژان لە ماوەی نۆزدە ڕۆژاندا، دوو ڕۆژووەكان

وَإِنْ حَفِظَتْ شَيْئاً فَلِلْيَقِينِ حُكْمُهُ، وَهِيَ فِي الْمُحْتَمَلِ كَحَائِضٍ فِي الْوَطْءِ وَطَاهِرٍ فِي الْعِبادَاتِ، وَإِنْ احْتَمَلَ انْقِطَاعاً وَجَبَ الْغُسْلُ لِكُلِّ فَرْضٍ،

---

جێگیر دەبن‌و لە سەری لا دەچن، کەوابو: ڕۆژی یەکەم‌و ڕۆژی سێیەم‌و ڕۆژی پێنجەم بەڕۆژوو دەبێ، ئینجا ڕۆژی حەڤدەو نۆزدەش بەڕۆژوو دەبێ –هەروەك لە (المجموع)و (حاشیةالقلیوبي)دا ڕوون کراوەتەوە– چونکە ئەگەر لە ڕۆژییەکەمدا خوێنی‌حەیزی هاتبێ، ئەوە لە شانزدەدا پاکەو ڕۆژووی حەڤدەو نۆزدەی دروستن، ئەگەر لە ڕۆژی سێیەمدا هاتبێ، ئەوە لە هەژدەدا پاکەو ڕۆژووی یەکەم‌و نۆزدەی دروستن، ئەگەر لە چوارەم‌و بەو لاوەتر هاتبێ، ئەوە بێگومان یەکەم‌و سێیەمی دروستن، جگە لەوەی‌ڕابردوو، چەند شێوەیەکی‌تریش هەیە لە کتێبە درێژەکاندا ڕوون کراونەوە.

ئینجا دەربارەی بەشی دووەم‌و سێیەمی (متحیرة) دەفەرموێ (وَإِنْ حَفِظَتْ شَيْئاً) ئەگەر ئافرەتی سەرلێشێواو لە عادەتەکەی‌پێشووی شتێکی لەبیر مابو، ئەوە دەکرێتە دوو بەش، یەکەم: سەرلێشێواو لە ئەندازەدا، واتە: ئەندازەی‌حەیزەکەی لەبیر چوبێ‌و کاتەکەی لەبیر مابێ. دووەم: سەرلێشێواو لە کاتدا، واتە: کاتی‌حەیزەکەی لەبیر چوبێ‌و ئەندازەکەی لەبیر مابێ، بەم دوو بەشە دەگوترێ: (اَلْمُتَحَيِّرَةَ الْمُقَيِّدَةَ)، ئینجا لەو دوو حاڵەتەدا بەم شێوەیە ڕەفتار دەکا:

(فَلِلْيَقِينِ) بۆ حەیزی بێگومان‌و بۆ پاکبوونەوەی بێگومان (حُكْمُهُ) هەمان بڕیاری حەیزو پاککبوونەوەی‌ڕابردوو هەیە (وَهِيَ) ئافرەتەکە (فِي الْمُحْتَمَلِ) لەو کاتانەی دەگونجێ لە حەیزدابێ‌و دەشگونجێ پاك بێ (كَحَائِضٍ فِي الْوَطْءِ) وەکو حەیزدار ڕەفتاری لە گەڵدا دەکرێ: لە جیماع‌و دەست لێدانی قورئان‌و قورئانخوێندندا، واتە: ئەوانەی لێ‌حەرامن (وَطَاهِرٍ فِي الْعِبَادَاتِ) وەکو ئافرەتی پاك ڕەفتاری لە گەڵدا دەکرێ: لە خواپەرستنەکاندا، کەواتە: واجبە خواپەرستیە واجبەکان بکا (وَإِنْ احْتَمَلَ إِنْقِطَاعاً) لەو کاتەش کە دەگونجێ خوێنەکە بوەستێ (وَجَبَ الْغُسْلُ لِكُلِّ فَرْضٍ) واجبە: بۆ هەموو نوێژێکی‌واجب غوسل بکا، لە بەر پارێزکاری‌کردن، ئەمەش ڕوونکردنەوەی هەردوو بەشەکەیە:

یەکەم: سەرلێشێواو لە ئەندازەدا: کە کاتی حەیزەکەی لەبیر مابێ، وەك بڵێ: (حەیزەکەم لە سەرەتای مانگەوە دەستی پێ‌دەکرد، بەڵام نازانم چەند بوو). ئەوە بێگومان ڕۆژێك‌و شەوێك لە سەرەتای‌مانگەوە بە حەیز دادەندرێ‌و گشت قەدەغەکراوەکانی‌حەیزی لێ‌قەدەغە دەکرێن، چونکە حەیز لەو ئەندازەیە کەمتر نابێ، کەوابو: کە ڕۆژێك‌و شەوێك تەواو بوو، واجبە غوسل بکا، هەروەها نیوەی دووەمی مانگەکەش تا کۆتایی مانگ بێگومان پاکبوونەوەیەو گشت قەدەغەکراوەکانی لێ‌حەڵاڵن، چونکە حەیز لە پانزە ڕۆژ زیاتر نابێ،

هەروەها لە دوای ڕۆژەکەو شەوەکە تا کۆتایی پانزە ڕۆژەکە، دەگونجێ: حەیز بێ، دەشگونجێ پاکبوونەوە بێ، کەوابو: لەو نیوەیەدا واجبە: خوا پەرستیە واجبەکان بکاو خۆشی لە جیماع قەدەغە بکاو بۆ گشت نوێژێکی واجبیش، واجبە غوسل بکا، چونکە دەشگونجێ لەو نێوانەدا لە کاتێکدا خوێنی وەستابێ.

دووەم: سەرلێشێواو لە کاتدا: کە ئەندازەی حەیزەکەی لەبیر مابێ، وەك بڵێ: (لە گشت مانگێکدا لە دە ڕۆژەکەی یەکەمدا پێنج ڕۆژ لە حەیزدا بووم، ئیتر نازانم لە کام ڕۆژەوە دەستی پێدەکرد، بەڵام دەزانم لە ڕۆژی یەکەمیمانگدا من پاك بووم) ئەوە بێگومان شەشی مانگ بە حەیز دادەندرێ‌و گشت قەدەغەکراوەکانی حەیزی لێقەدەغە دەکرێن، هەروەها یەکەمیمانگ‌و بیستەکەیتریشی– واتە: یانزەو دوانزەو...تا کۆتاییمانگ– بێگومان گشتی پاکبوونەوەیەو گشت قەدەغەکراوەکانی لێحەڵاڵن، هەروەها لە دووی مانگەوە تا کۆتایی پێنجی مانگ، دەگونجێ: لە حەیزدابێ‌و دەشگونجێ پاك بێ، کەوابو: لەو نێوانەدا واجبە خوا پەرستیە واجبەکان بکاو خۆیشی لە جیماع قەدەغە بکا، هەروەها لە حەفتی مانگەوە، تا کۆتایی دەی مانگ دەگونجێ حەیزی بێ‌و دەگونجێ پاکبوونەوە بێ، دەشگونجێ لەو نێوانەدا لە کاتێکدا خوێنی وەستا بێ، کەوابو: واجبە: بۆ گشت نوێژێکی واجب غوسل بکا.

## ﴿ خوێنی ئافرەتی ئاوس ﴾

(وَالْأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ دَمَ الْحَامِلِ) ئەو خوێنەی ئافرەتیئاوس دەیبینێ بە حەیز دادەندرێ، ئەگەر مەرجەکانیڕابردوویحەیزی لێبێنە جێ، کەوابو: لە سەرەتای جێگیربوونی تۆوی پیاوەکە لە مندالدانەدا، تا کاتی مندالێبوون، هەر خوێنێك ببینێ‌و مەرجەکانی حەیزی لێبێنە جێ، ئەوە بە حەیز دادەندرێ‌و واجبە ئافرەتەکە خۆی قەدەغە بکا لە گشت قەدەغەکراوەکانی حەیز، کەواتە: کە ئافرەتیئاوس حەیز نابینێ، شتێکە بە زۆری وەها ڕوو دەدا، واتە: جار جارەش ڕوو دەدا ئافرەتیئاوس حەیز دەبینێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ خوێن‌وەستانی نێوان خوێنەکانیحەیز ﴾

(وَالنَّقَاءَ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: پاکبوونەوە، واتە: کاتی ئەو خوێن‌وەستانەی ڕوو دەدا (بَيْنَ أَقَلِّ الْحَيْضِ) لە نێوان خوێنەکانی کەمترین تا زۆرترینیحەیز (حَيْضٌ) ئەویش حەیزە، واتە: ماوەی خوێن هاتنەکەو ماوەی خوێن‌وەستانەکە هەردووکی حەیزە، بەو مەرجەی: ماوەی خوێن هاتنەکە لەگەڵ ماوەی خوێن‌وەستانەکە–بە یەکەوە– لە پانزە

ڕۆژ تێنەپەڕێو خوێنوەستانەکەش لە ماوەیپانزە ڕۆژدا لە نێوان دوو خوێنیحەیزدا بێو کۆی خوێن هاتنەکەش لە خوێنی ڕۆژێکو شەوێك کەمتر نەبێ.

کەوابو: ئەگەر ڕۆژێکو شەوێك خوێنی دەهاتو ڕۆژێکو شەوێك دەوەستا، بەلام-بەم شێوەیە- لە پانزە ڕۆژ تێپەڕ بوو، ئەوە خوێنچڕکەیەو لەگەڵ حەیزدا تێکەڵ بووە بەلام بچڕ بچڕە، هەروەها ئەگەر کەمتر لە ڕۆژێکو شەوێك خوێنی هات، ئینجا ماوەی پانزە ڕۆژ تەواو بوو و هیچ خوێنی نەهات، ئینجا لە دوای پانزە ڕۆژەکە دیسان بۆ ماوەی ڕۆژێکو شەوێك، یان زیاتر خوێنی هات، ئەوە خوێنەکەی پێش پانزە ڕۆژەکە خوێنچڕکەیەو هی دوای پانزە ڕۆژەکەش حەیزە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو دوو مەسەلەی ڕوون کردونەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەو فەرموودە بەهێزترەی: کاتەکانی خوێن هاتنو خوێنوەستان هەردووکی بە حەیز دادەنێ، پێی دەگوترێ: (قَوْلُ السَّحْب)و کۆمەڵە هەرە زۆرەکەی زانایانی مەزهەب بە بەهێزیان داناوە، هەم فەرموودەی ئیمامی(حنفی)یە، هەروەها فەرموودەی دووەمیش: کە تەنها کاتەکانی خوێن هاتن بە حەیز دادەنێو کاتەکانی خوێنوەستانیش بە پاکبوونەوە دادەنێ، پێیدەگوترێ: (قَوْلُ التَّلْفِيق)، ئەویش چەند زانایەك بە بەهێزیان داناوە، هەم فەرموودەی ئیمام (مالك)و ئیمام (احمد)ە.

ئینجا بزانە: هەرکاتێك ئافرەت ماوەی ڕۆژێکو شەوێك خوێنی هات، ئینجا لە ڕۆژی دووەمدا خوێنی وەستا، ئەوە-لە هەردوو فەرموودەی ڕابردوودا- واجبە: غوسل بکاو دەست بە نوێژو ڕۆژووەواجبەکان بکاتەوەو قەدەغەکراوەکانیتریشی بۆ دروستن، جا ئەگەر پانزە ڕۆژ تەواو بونو خوێنەکەی نەهاتەوە، ئەو کاتە ئاشکرا دەبێ بە تەواوی پاك بۆتەوەو خواپەرستیەکانیشی دروست بووە.

بەلام ئەگەر پانزە ڕۆژ تەواو نەبونو دیسان خوێنەکەی هاتەوە، ئەوە لە سەر بڕیاری فەرموودەیبەهێزتر: ئاشکرا دەبێ ئەو ئافرەتە هەر لە حەیزدا بووەو خواپەرستیەکانیشی دروست نەبوە، بەلام لە فەرموودەی دووەمدا: بە پێچەوانەیە، واتە: ئاشکرا دەبێ تەنها کاتی خوێن هاتن حەیز بووەو کاتی خوێنوەستانەکەش پاکبوونەوە بووەو خواپەرستیەکانیشی دروست بووە.

ئیتر لە گشت خوێنوەستانێك لە ماوەی ئەو پانزە ڕۆژەدا تا چواردە ڕۆژ تەواو دەبن، واجبە: بەو شێوەیڕابردوو غوسل بکاو دەست بە نوێژو ڕۆژوو بکاتەوە، تا خولی مانگییەکەمی تەواو دەبێ، ئینجا لە فەرموودەی بەهێزتردا: ئەم مانگەی یەکەمی بۆ

دەبێتە عادەت، واتە: لە مانگی دووەمو سێیەمو... هتد لە کاتی خوێنوەستانەکاندا نابێ غوسل بکاو نابێ نوێژو ڕۆژوو...هتد بکا، بەڵکو -بەگوێرەی پاکبوونەوەی مانگییەکەم لەم مانگەشدا- چاوەڕوانی پاکبوونەوەی یەکجاری دەکا، ئینجا ئەگەر لە یەکێك لەم مانگانەدا لە دوای خوێنوەستانەکە پانزە ڕۆژی تەواو خوێنی نەهات، ئەوە ئاشکرا دەبێ: پاك بۆتەوەو عادەتی گۆڕاوە، کەوابو: واجبە: نوێژو ڕۆژووەکان -کە لەو ماوەیەدا نەیکردون- قەزا بکاتەوە، بەو نەزانینەش تاوانبار نابێ.

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە ئەندازەی خوێنوەستانەکەو ئەندازەی خوێن هاتنەکە: یەکسان بێ، یان ئەندازەی یەکێکیان لەوی‌تر زیاتر بێ: وەك ڕۆژێك و شەوێك خوێن بێو ڕۆژێك و شەوێکیش بوەستێ، یان دوو ڕۆژ بێو دووش نەیێ، یان پێنج بە پێنج، یان شەش بە شەش، یان حەفت ڕۆژ بێ حەفتیش نەیێو ڕۆژێکی‌تریش بێ، یان ڕۆژێك بێو دە ڕۆژ نەیێ، یان ڕۆژێك و شەوێك بێو سێزدە ڕۆژیش نەیێو شەو ڕۆژێکی‌تریش بێ.

هەروەها ئەگەر نیو ڕۆژ خوێن دەهات و نیو ڕۆژ نەدەهات، هەمان بڕیاری بۆ هەیە، کەواتە: لەو حاڵەتانەیڕابردوودا کاتی خوێنوەستانەکە -لە فەرموودەی دووەمدا- بە پاکبوونەوە دادەندرێو هەر جارێك خوێنی وەستا غوسل دەکاو نوێژو ڕۆژوو و تەواف‌و قورئان خوێندنی دروست دەبێ، هەروەك لە (فتح العزيز)و (المجموع)دا، ئەو دوو فەرموودەیە، بە پوختی ڕوون کراونەوە.

کەواتە: ئەو جۆرە ئافرەتانە دەتوانن: بۆ تەوافی حەج سود لە فەرموودەیدووەم وەربگرن، بۆیێ لە باسی تەوافی‌حەج دا -بۆ حەیزدار- ئێرە دووبارە دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

## ﴿ باسی (نِفاس): زەیسانی ﴾

(وَأَقَلُّ النِّفاسِ) کەمترین ماوەی زەیسانی، واتە: هاتنی خوێنی‌ئافرەت لە دوای منداڵ لێبوون (لَحْظَةٌ) چاو چوقانێکە، واتە: هیچ سنورێك بۆ کەمترین ماوەی ئەم خوێن هاتنە دانەندراوە، کەواتە: هەر کاتێك خوێنی وەستا، واجبە: غوسل بکا، بەڵکو جاری وا هەیە: ئافرەت منداڵی دەبێو هیچ خوێنیشی نایێ، کەوابو: ئەم ئافرەتەش هەر کاتێك منداڵی لێجیابۆوە یەکسەر غوسلی منداڵلێبوون دەکاو دەست بە نوێژو ڕۆژوو دەکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَكْثَرُهُ سِتُّونَ) لایزۆری ماوەی هاتنی خوێنی‌منداڵلێبوون: شەست ڕۆژە، جا ماوەی ئەم شەست ڕۆژەو چل ڕۆژەکەی‌داهاتووش هەر لە دوای لێجیابوونەوەی منداڵ دەست پێدەکا، جیاوازی نیە: خوێنەکەش یەکسەر لە دوای منداڵلێبوونەوە بێ، یان لەمەودوا،

واته: پێش تەواوبوونی پانزە ڕۆژ هەر جۆرە خوێنێك بێ، ئەوە بە نیفاس دادەندرێ، پاکیی نێوان منداڵلێبوون و خوێن هاتنەکەش بە پاکبوونەوە دادەندرێ، کەواتە: ئەگەر لە دوای منداڵلێبوون خوێنی نەهات، واجبە -یەکسەر- غوسل بکاو نوێژو ڕۆژووی واجب بکا، قەدەغەکراوەکانیشی بۆ حەلاڵن.

جا ئەگەر لە دوای منداڵلێبوون پانزە ڕۆژ، یان زیاتر ڕۆیشتن، ئینجا خوێنی هات، ئەوە نیفاس نیە، بەڵکو خوێنیحەیزە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوەیڕابردوو، دەربارەی ئەو ئافرەتە بوو: کە لە دوای منداڵلێبوون هیچ خوێن نەبینێ، بەڵام ئەگەر خوێنی دەهاتو دەوەستا، ئەوە تەماشا دەکرێ: ئەگەر ماوەی خوێنوەستانەکە نەدەگەیشتە پانزە ڕۆژ، ئەوە کاتەکانی خوێن هاتنو خوێن وەستان گشتی بە نیفاس دادەندرێن، تا شەست ڕۆژەکە تەواو دەبێ.

بەڵام ئەگەر ماوەی خوێنوەستانەکە دەگەیشتە پانزە ڕۆژی تەواو: وەك سەعاتێك، یان ڕۆژێك، یان چەند ڕۆژێك، خوێنی بێ، ئینجا پانزە ڕۆژی تەواو، یان زیاتر خوێنی بوەستێ، ئینجا ماوەی شەو و ڕۆژێك، یان زیاتر، خوێنی هاتەوە، لەو حاڵەتەدا خوێنی یەکەم نیفاسەو خوێنەکەی دووەمیش حەیزێکی تازەیەو خوێنوەستانەکەی نێوانیان پاکبوونەوەیە؟ چونکە پانزە ڕۆژی تەواو کەوتۆتە نێوان دوو خوێن، هەوەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَغالِبُهُ أَرْبَعُونَ) بە ئەغلەبیش ماوەی هاتنی خوێنیمنداڵلێبوون چل ڕۆژە ﴿عن أُمِّ سلَمَة رضي الله عنها: كَانَتِ النُّفَساءُ تَقْعُدُ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ أَرْبَعِينَ يَوْماً﴾ حديث حسن رواه ابوداود، ئافرەتان لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ ماوەی چل ڕۆژ لە دوای منداڵ لێبوون دادەنیشتن. بەڵام ئەگەر لە ماوەی کەمتر لە چل ڕۆژ پاك بۆوە، واجبە: غوسل بکاو دەست بە نوێژ بکا، هەروەك لەحەدیسەکەی (ابن ماجه)دا هاتوە.

جا بزانە: لە کوردەواریدا کەم وادەبێ: ئافرەت ماوەی چل ڕۆژ لە زەیسانیدا بمێنێتەوە، بەڵکو دە ڕۆژەو دوانزەیەو بیستەو...هتد، ئیتر خوێنی نێوان لێجیابوونەوەیمنداڵ تا تەواوی شەست ڕۆژ، گشتی زەیسانییە.

(وَيَحْرُمُ بِهِ) حەرامە بە هۆی زەیسانی (ما حَرُمَ بِالْحَيْضِ) ئەو نۆ شتانەی بە هۆی حەیز حەرام بون، چونکە ئەم خوێنەش هەر خوێنیحەیزە، منداڵەکە ڕێگەی هاتنەدەرەوەی گرتبو، کەوابو: گشت بڕیارێکیحەیز لە زەیسانیدا دێتە جێ، بە بەڵگەی (اِجْماع)، کەواتە: قەزاکردنەوەی نوێژی لە سەر نیە، بەڵام قەزاکردنەوەی ڕۆژووی لە سەرە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَعُـــبُـورُهُ سِـــتِّـيـنَ كَـــعُـــبُـورِهِ أَكْـــثَـرَهُ.

## (كِتابُ الصَّلاةِ)

اَلْـمَـكْـتُـوبَـاتُ خَـمْـسٌ:

---

(وَعُبُورُهُ سِتِّينَ) تێپەڕبوونی زەیسانی لە شەست ڕۆژ (كَعُبُورِهِ أَكْثَرَهُ) وەكو تێپەڕبوونی حەیزە لە پانزە ڕۆژ، واتە: هەر پێنج بەشەكەی خوێنچڕكە لێرەشدا ڕەفتاری پێدەكرێ، كەواتە: ئەگەر فێرە منداڵلێبوون بوو دەگەڕێندرێتەوە سەر عادەتی پێشووی، ئەگەر خوێنەكەی لێك جیا دەكردەوە بەگوێرەی جیاكردنەوە ڕەفتار دەكا، بەو مەرجەی بەهێزەكە لە شەست ڕۆژ تێنەپەڕێ، ئەگەر دەست پێكراوی جیانەكەرەوە بوو چاوچوقانێكی بۆ بە زەیسانی دادەندرێ.

﴿ **دوا ووتە** ﴾: واجبە ئافرەت زانستی حەیزو زەیسانیو خوێنچڕكە فێر ببێ، جا ئەگەر مێردەكەی زانا بێ، واجبە ئەو فێری بكا، ئەگەر نا: واجبە لە لای كەسێكیتر فێر ببێو مێردەكەش بۆی نیە ڕێگەی فێربوونی ئەم زانستەی لێبگرێ، ئینجا منیش تكا لە دایكانو خوشكانو كیژانی بەڕێز دەكەم: لە فێربوونی ئەم زانستەدا هیچ شەرم نەكەن، چونكە هیچ لە دەسەڵاتی ئەواندا نیە، هەروەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿هذا شَيْءٌ كَتَبَهُ اللهُ عَلى بَناتِ آدَمَ﴾ رواه الشيخان، ئەم حەیزە شتێكە خوایگەورە لە سەر كیژەكانی باب ئادەمی نووسیوە.

الحمد لله لێرەدا (پەڕتووكیپاككردنەوە) كۆتایی هات، إن شاء الله تعالى (پەڕتووكینوێژ)ی بەدوادا دێ، هەروەك دەفەرموێ:

### ﴿ كِتابُ الصَّلاةِ: پەڕتووكی نوێژ ﴾

نوێـژ: دووەمین ڕوكنیئیسلامە، لە (مَكَّة)ی پیرۆز لە شەوی (مِعْراج)دا لە بیستو حەفتی مانگی(رَجَب)، ساڵێكو نیو پێش كۆچكردن، واجب كراوە.

(اَلْمَكْتُوباتُ) ئەو نوێژانەی لە گشت شەو و ڕۆژێكدا واجب كراون، بە فەرموودەی خوای گەورە: ﴿فَأَقِيمُوا الصَّلاةَ إِنَّ الصَّلاةَ كانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتاباً مَوْقُوتاً﴾ نوێژ بكەن، بە ڕاستی نوێژ لە سەر ئیمانداران نووسراوەو كاتی بۆ داندراوە.

(خَمْسٌ) نوێژە واجبەكان پێنجن، بە (اِجْماع)ی موسڵمانان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فَرَضَ اللهُ عَلى أُمَّتِي لَيْلَةَ الإِسْراءِ خَمْسِينَ صَلاةً، فَلَمْ أَزَلْ أُراجِعُهُ وَأَسْأَلُهُ التَّخْفِيفَ حَتّى جَعَلَها خَمْساً فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ﴾ رواه الشيخان، لە شەوی شەوڕۆییو سەركەوتنم بۆ ئاسمانەكان، خوای گەورە پەنجا نوێژی لە سەر ئوممەتیمن واجب كرد، بەڵام من هەر دەگەڕامەوە لای خواو تكای سووككردنم لێدەكرد، تا كردنیە پێنج نوێژ لە گشت ڕۆژو شەوێكدا.

## ﴿ کاتو ناوی پێنج نوێژەکان ﴾

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَسُبْحانَ اللهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّموات وَالأَرْضِ وَعَشِيّاً وَحِينَ تُظْهِرُونَ﴾ خوای گەورە بە پاك بناسنو نوێژی بۆ بکەن: لە کاتی شەوی‌دا نوێژی مەغریبو عیشا بکەن، لە کاتی بەیانی‌دا نوێژ بکەن، سوپاس تەنها بۆ خودایە لە ئاسمانەکانو لە زەمیندا، لە ئێوارەاندا نوێژی عەسر بکەنو لە کاتی نیوەڕۆدا نوێژ بکەن.

﴿عَنْ ابْنِ عَباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنِ النَّبيِّ ﷺ قال: أَمَّنِي جِبْرِيلُ -عليه السلام- عِنْدَ الْبَيْت مَرَّتَيْن: فَصَلَّى الظُّهْرَ فِي الْمَرَّةِ الأُولى حِينَ كانَ الْفَيْءُ مِثْلَ الشِّراك، ثُم صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ حِين وَجَبَت الشَّمْسُ وَأَفْطَرَ الصّائِمُ، ثُمَّ صَلَّى الْعشاءَ حِينَ غابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ صَلَّى الْفَجْرَ حِينَ بَرَقَ الْفَجْرُ وَحَرُمَ الطَّعامُ عَلَى الصّائِم. وَصَلَّى الْمَرَّةَ الثّانِيَةَ الظُّهْرَ حِينَ كانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ لِوَقْت الْعَصْرِ بِالأَمْسِ، ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَيْه، ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ لِوَقْته الأَوَّل، ثُمَّ صَلَّى الْعِشاءَ الآخِرَةَ حِينَ ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْل، ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ حِينَ أَسْفَرَت الأَرْضُ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ جِبْرِيلُ فَقال: يامُحَمَّدُ هذا وَقْتُ الأَنْبِياء قَبْلَكَ وَالْوَقْتُ فِيما بَيْنَ هذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ﴾ حديث صحيح رواه اصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: حەزرەتی (جُبْرائِیل) -کە مەلائیکەیەکی خوایە- دوو جار لە لای (کَعْبَة)ی ماڵی خوا پێشنوێژی‌ی بۆ کردم: جاری یەکەم: نوێژی نیوەڕۆی کرد لەو کاتەی سێبەر وەکو قەیتانی پێڵاو بوو، ئینجا نوێژی عەسری کرد لەو کاتەی سێبەری گشت شتێك وەکو خۆی بوو، ئینجا نوێژی مەغریبی کرد لەو کاتەی ڕۆژ بە تەواوی ئاوا بوو، ئینجا نوێژی عیشای کرد لەو کاتە سوورایی لە لای ڕۆژئاوا نەما، ئینجا نوێژی سبەینێ‌ی کرد لەو کاتەی ڕۆنایی بەیانی دەرکەوت. هەروەها جاری دووەمیش: نوێژی نیوەڕۆی کرد لەو کاتەی سێبەری گشت شتێك وەکو خۆی بوو، کە کاتی عەسری دوێنێ داهات، ئینجا نوێژی عەسری کرد لەو کاتەی سێبەری هەموو شتێك دوو ئەوەندەی خۆی بوو، ئینجا نوێژی مەغریبی هەر لە کاتەکەی پێشووی‌دا کرد، ئینجا نوێژی عیشای کرد لەو کاتەی سێیەکی شەوێ ڕۆیشت، ئینجا نوێژی سبەینێ‌ی کرد لەو کاتەی زەمین ڕۆشن بوو، ئینجا حەزرەتی (جُبْرائِیل) ئاوڕی لێدامەوەو فەرمووی: ئەی (محمد) ئەوەی ڕابردوو کاتی نوێژی پێغەمبەرکانی پێش تۆ بوو -علیهم الصلاة والسلام- کاتی هەر نوێژێکیش لە نێوان ئەو دوو کاتەی ڕابردوودایە.

ئینجا بە بەڵگەی ئەو حەدیسەو چەند حەدیسێکی تریش، ئیمامی (النواوی) دەربارەی کاتەکانی نوێژ دەفەرموێ:

اَلظُّهْرُ: وَأَوَّلُ وَقْته زَوالُ الشَّمْسِ، وَآخِرُهُ مَصِيرُ ظِلِّ الشَّيْءِ مِثْلَهُ سِوَى ظِلِّ اِسْتِوَاءِ الشَّمْسِ. وَهُوَ أَوَّلُ وَقْتِ الْعَصْرِ، وَيَبْقَى حَتَّى تَغْرُبَ، وَالْإِخْتِيَارُ أَنْ لاَّ تُؤَخَّرَ عَنْ مَصِيرِ الظِّلِّ مِثْلَيْنِ.

---

(اَلظُّهْرُ) یەکەم نوێژ لەو پێنج نوێژانە: نوێژی نیوەڕۆیە؟چونکە کە پێغەمبەرﷺ لە شەوی (معراج) گەڕاوە بۆ (مَكَّة)، کاتو چۆنیەتی نوێژکردنی پێنەگوترابو، بۆیێ نوێژی ئەو بەیانیە نەکرا، ئینجا لە کاتی‌نیوەڕۆدا حەزرەتی (جُبْرائِیل)-علیه السلام- هاتو پێشنوێژیی بۆ پێغەمبەرﷺ کردو کاتو چۆنیەتی نوێژکردنی بە پێغەمبەرﷺ گوت، هەروەك لە حەدیسەکەی‌ڕابردوودا ڕوون کراوە، کەواتە: نوێژی نیوەڕۆ یەکەم نوێژە لەو پێنجانە، کە لە ئیسلامدا کراوە.

(وَأَوَّلُ وَقْتِهِ) سەرەتای کاتی نوێژی‌نیوەڕۆ (زَوالُ الشَّمْسِ) لادانی‌ڕۆژە لە ناوەندی ئاسمان بەرەو لای ڕۆژئاوا (وَآخِرُهُ) کۆتایی کاتی نوێژی‌نیوەڕۆ (مَصِيرُ ظِلِّ الشَّيْءِ مِثْلَهُ) ڕۆیشتنی سێبەری هەموو شتێکە بە وێنەی‌خۆی (سِوىَ ظِلِّ اِسْتِواءِ الشَّمْسِ) جگە لە سێبەرە کورتەکەی(اِستِواء)، واتە: ئەو کاتەی ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە.

بۆ وێنە: شتێکی بەرز لە زەویەکی‌ڕاستاندا بچەقێنەو تەماشا بکە: لە پێش نیوەڕۆ بەرە بەرە سێبەرەکە کورت دەبێتەوە، تا دێتە بن شتە بەرزەکەو ڕادەوەستێ، ئا لەم کاتەی ڕاوەستانی‌دا پێی دەگوترێ: سێبەری (اِسْتِواء)، ئینجا کە ڕۆژ بەرەو ڕۆژ ئاوا لایدا، ئەو سێبەرە کورتەی (اِسْتِواء)ش بە پێچەوانەوە بەرەو ڕۆژهەڵات زیاد دەکاتەوە، ئینجا کە لە شوێنی سێبەرە کورتەکەی (اِسْتِواء) بەو لاوە سێبەرەکە بە ئەندازەی شتە بەرزەکە ڕۆیشت، ئەوە کاتی نیوەڕۆ کۆتایی دێو کاتی‌عەسر دەست پێ‌دەکا هەروەك دەفەرموێ:

(وَهُوَ) کە سێبەری هەموو شتێك–جگە لە سێبەری(اِسْتِواء)– بە قەد خۆی ڕۆیشت، ئەو کاتە (أَوَّلُ وَقْتِ الْعَصْرِ) سەرەتای کاتی نوێژی عەسرە: کە دووەمین نوێژە لەو پێنجانە (وَيَبْقَى) کاتی نوێژی عەسر دەمێنێ (حَتَّى تَغْرُبَ) تا ڕۆژ ئاوا دەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك بگاتە ڕەکعەتێکی نوێژی عەسر پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا ببێ، ئەوە گەیشتۆتە نوێژی عەسر. واتە: بە ئەدا لێی قبوول دەکرێ، کەواتە: ئەگەر زۆر درەنگیش ڕۆژ ئاوا ببێ، کاتی نوێژی‌عەسر هەر دەمێنێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالْإِخْتِيارُ) کاتی هەڵبژاردەی نوێژی عەسر: کە خێری تەواوی بگاتێ (أَنْ لاتُؤَخَّرَ) ئەوەیە نوێژەکە دوا نەخرێ (عَنْ مَصِيرِ الظِّلِّ مِثْلَيْن) لە ڕۆیشتنی سێبەری هەموو شتێك دوو ئەوەندەی خۆی، بە بەڵگەی حەدیسەکەی(جبريل)ی‌ڕابردوو.

وَالْمَغْرِبُ بِالْغُرُوبِ، وَيَبْقَى حَتَّى يَغِيبَ الشَّفَقُ الْأَحْمَرُ فِي الْقَدِيمِ، وَفِي الْجَدِيدِ يَنْقَضِي بِمُضِيِّ قَدْرِ وُضُوءٍ وَسَتْرِ عَوْرَةٍ وَأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ وَخَمْسِ رَكَعَاتٍ، وَلَوْ شَرَعَ فِي الْوَقْتِ وَمَدَّ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ الْأَحْمَرُ جَازَ عَلَى الصَّحِيحِ، قُلْتُ: اَلْقَدِيمُ أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئینجا بزانە: لە فەرموودەیبژاردەدا -بە بەلگەی چەند حەدیسێکی(صحیح)- نوێژی عەسر پێی دەگوترێ: ﴿اَلصَّلَاةُ الْوُسْطَى﴾ رواه الشيخان، واتە: نوێژی ناوەند -هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی- چونکە دەکەوێتە نێوان دوو نوێژی ڕۆژێو دوو نوێژی شەوێ، لە هەر چواریشیان گەورەترە، ئینجا نوێژی بەیانی لە ئەوانیتر گەورەترە، ئینجا نوێژی عیشا، ئینجا نوێژی نیوەڕۆ، ئینجا نوێژی مەغریب لە گەورەییدا لە دوای نیوەڕۆیە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَالْمَغْرِبُ) سەرەتای کاتی نوێژی مەغریب: کە نوێژی سێیەمە (بِالْغُرُوبِ) بە ڕۆژئاوابوونێکی تەواو دەست پێدەکا، واتە: لە شوێنی دەشتاییدا کولێرەی ڕۆژ بە تەواوی ئاوا بیێو لە شوێنەکانیتریش زەردەی ڕۆژ نەمێنێ لە سەری چیاکانو بەرزاییەکان، تاریکاییش لە لای ڕۆژ هەلاَت دەست پێ بکا (وَيَبْقَى) کاتی نوێژیمەغریب دەمێنێ (حَتَّى يَغِيبَ الشَّفَقُ الأَحْمَرُ) تا ڕۆناکیە سۆرەکەی لای ڕۆژئاوا ون دەبێ (فِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی (شافعی)دا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَقْتُ الْمَغْرِبِ مَالَمْ يَغِبِ الشَّفَقُ﴾ رواه مسلم، کاتی نوێژی مەغریب دەمێنێ مادام ڕۆناکیە سۆرەکە ون نەبوبێ.

(وَفِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعی)دا ئەوەندە ماوەی نیە، بەلکو (يَنْقَضِي) کاتی نوێژیمەغریب کۆتایی دێ (بِمُضِيِّ قَدْرِ وُضُوءٍ) بە ڕۆیشتنی ئەندازەی دەستنوێژگرتێنکو (وَسَتْرِ عَوْرَةٍ) داپۆشینی عەورەتو (وَأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ) بانگو ئیقامەتێكو (وَخَمْسِ رَكَعَاتٍ) پێنج ڕەکعەتیش، واتە: سێی مەغریبو دووش سوننەتی پاش مەغریب (وَلَوْ شَرَعَ فِي الْوَقْتِ) ئەگەر لە سەرەتای کاتیمەغریب نوێژی دابەستو (وَمَدَّ) نوێژەکەشی درێژ کرد (حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ) تا ڕۆناکیە سۆرەکە ون بوو (جَازَ عَلَى الصَّحِيحِ) نوێژەکەی دروستە، لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (اَلْقَدِيمُ أَظْهَرُ) فەرموودەکەیکۆنی ئیمامی(شافعی) -دەربارەی کاتی نوێژی مەغریب- بەهێزترە لە فەرموودەکەی نوێی (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە حەدیسی(صحیح) بەلگەیەتی، هەروەك ڕابرا.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەگەر لە شوێنێك ڕۆژئاوا بوو و لەوێ نوێژی مەغریبی کرد، ئینجا چووە شوێنێکیتر، کە تەماشای کرد هێشتا لەم شوێنەدا ڕۆژ ئاوا نەبوە، ئەوە واجبە: دووبارە نوێژی مەغریب بکاتەوە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

وَالْعِشاءُ بِمَغِيبِ الشَّفَقِ، وَيَبْقَى إِلَى الْفَجْرِ، وَالإِخْتِيَارُ أَنْ لاَ تُؤَخَّرُ عَنْ ثُلُثِ اللَّيْـــلِ، وَفِي قَوْلٍ نِصْفِه.

---

(وَالْعِشاءُ) سەرەتای کاتی نوێژی عیشا: کە نوێژی چوارەمە (بِمَغِيبِ الشَّفَقِ) بە ونبوونی ڕۆناکیە سوورەکەی لای ڕۆژئاوا دەست پێ دەکا.

(وَيَبْقَى) کاتی نوێژی عیشا دەمێنێ (إِلَى الْفَجْرِ) تا کاتی بەیانی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ، إِنَّمَاالتَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلاَةَ حَتَّى يَدْخُلَ وَقْتُ الأُخْرَى﴾ رواه مسلم، کەمتەرخەمی لە خەوتندا نیە، بەڵکو کەمتەرخەمی لە سەر ئەو کەسەیە: کە نوێژ لە کاتی‌خۆی‌دا ناکا تا کاتی نوێژێکی‌تر دێ. واتە: کاتی گشت نوێژێك-جگە لە بەیانی- تا کاتی نوێژەکەی‌تر دەمێنێ.

(وَالأَخْتِيَارُ) کاتی هەڵبژاردەی نوێژی‌عیشا: کە خێری تەواوی بکاتێ (أَنْ لا تُؤَخَّرَ عَنْ ثُلُثِ اللَّيْـــلِ) ئەوەیە: نوێژەکە لە سێیەکی‌شەوێ دوا نەخرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جُبْرائِيل)ی‌ڕابردوو (وَفِي قَوْلٍ نِصْفِه) لە فەرموودەیەکی‌تردا، کاتی هەڵبژاردە ئەوەیە: لە نیوەی شەوێ دوا نەخرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَقْتُ صَلاةِ الْعِشاءِ إِلَى نِصْـــفِ اللَّيْلِ﴾ رواه مسلم، کاتی نوێژی عیشا تا نیوەی شەوێیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە شوێنێکدا ڕۆناکیە سوورەکە درەنگ ون دەبو، ئەوە تا ون نەبێ کاتی عیشا دانایێ، هەرچەند بە گوێرەی وولاتانی‌تریش زۆر درەنگتر ون ببێ، بەو مەرجەی نەگاتە بەیانی، ئەگەر نا: بە گوێرەی نزیکترین شوێن ڕەفتار دەکەن، هەروەك لە (الشبراملسی)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر لە شوێنێکدا ڕۆناکیە سوورەکە نەبو، یان ون نەدەبو، ئەوە کاتی عیشا لەوێدا بە گوێرەی کاتی نزیکترین شوێن دادێ، واتە: تا کاتی ونبوونی ڕۆناکیەکە لەو وولاتەدا چاوەڕوان دەکەن، ئینجا دەست بە نوێژی عیشا دەکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر شەوی ئەم شوێنە ئەوەندە کورت بوو: ئەگەر ئەندازەی کاتی‌ڕابردووی بۆ دابندرێ، یەکسەر دەبێتە کاتی بەیانی، (واتە: شەوەکەی ئەم شوێنە هەر بەقەد نێوانی مەغریب‌و عیشای شوێنە نزیکەکان بوو)، ئەوە بەگوێرەی کات ئەندازە دانانرێ، بەڵکو بە گوێرەی بەشەکانی شەوی شوێنە نزیکەکان دادەندرێ، بۆ وێنە: ئەگەر لە شوێنە نزیکەکاندا شەشێکی شەوێ دەڕۆیشت ئینجا ڕۆناکیە سوورەکە ون دەبو، ئەوە لەم شوێنەشدا کە شەشێکی شەوێ ڕۆیشت کاتی نوێژی مەغریب دەڕواو کاتی نوێژی عیشا دێ، هەر چەند ماوەکەش زۆر کورت بێ، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالصُّبْحُ بِالْفَجْرِ الصَّادق وَهُوَ الْمُنْتَشِرُ ضَوْؤُهُ مُعْتَرِضاً بِالأُفُقِ، وَيَبْقَــى حَتَّــى تَطْلَــعُ الشَّمْسُ، وَالاخْتِيَارُ أَنْ لاَ تُؤَخَّرَ عَنِ الإسْفَارِ.

---

جا ئەگەر هاتو ڕۆژیش وەها کورت بوو، بە هەمان شێوە ئەندازە بۆ نوێژەکانی دادەندرێ، بەڵام ڕۆژوو تەنها لە بەیانەوە تا ڕۆژ ئاوا دەبێ واجبەو بە ڕۆژێکی تەواویش دەژمێردرێ، هەر چەند زۆریش کورت بێ، هەروەك لە (فتاوی السیوطی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالصُّبْحُ) سەرەتای کاتی نوێژیسبەینێ: کە نوێژیپێنجەمە (بِالْفَجْرِ الصَّادِقِ) بە دەرکەوتنی بەیانیڕاستگۆ دەست پێدەکا: کە بەیانیدووەمیشی پێدەگوترێ (وَهُوَ) بەیانیڕاستگۆ (اَلْمُنْتَشِرُ ضَوْؤُهُ) ئەو ڕۆناکیە سپیەیە کە بڵاو دەبێتەوە (مُعْتَرِضاً) بە پانایی، واتە: لە نێوان باکوورو باشووردا (بِالأفقِ) لە بنەوەی ئاسمانی لای ڕۆژهەڵات، واتە: بە دەرکەوتنی (اَلْفَجْرُالصّادِقِ)= بەیانیڕاستگۆ، شەو کۆتایی دێو ڕۆژ دەست پێدەکا، کەوابو: نوێژی سبەینێ لە نوێژەکانی ڕۆژێ دەژمێردرێ، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: لە پێش ئەم بەیانەدا بەیانێکیتر هەیە، پێی دەگوترێ: (اَلْفَجْرُالْکاذِبُ)= بەیانی درۆزن: کە ڕۆناکیەکە بە درێژایی بە ئاسمان دا دێ، وەکو کلکی گورگ وایە: لای سەرەوەی ڕۆناکترە، ئینجا ون دەبێو تاریکی دادێ، واتە: هێشتا شەو ماوە، ئینجا پاش ماوەیەك بەیانیڕاستگۆ دەردەکەوێ.

جا بزانە: ماوەی نێوان (الْفَجرُالْکاذِبُ)و (اَلْفَجْرُالصّادِقِ) پێنج (درجة)، واتە: بیست دەقیقەیە، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی، هەروەها بەو نێوانەش دەگوترێ: (سَحَر)، واتە: بەرە بەیان، هەروەك لە (بجیرمی)دا فەرموویەتی.

(وَيَبْقَى) کاتی نوێژیسبەینێ دەمێنێ (حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ) تا بەشێکی ڕۆژ هەڵدێ: وەك لە شوێنی دەشتاییدا بەشێکی کولێرەی ڕۆژ دەربکەوێو لە شوێنەکانیتریش هەتاو لە سەری چیاکان، یان لە سەری بەرزاییەکان بدا، کە پێی دەگوترێ: (گەزنگ).

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَقْتُ صَلاةِالصُّبحِ مِنْ طُلُوعِ الْفَجرِ مالَمْ تَطْلُعِ الشَّمْسُ﴾ رواه مسلم، کاتی نوێژی سبەینێ لە دەرکەوتنی بەیانەوە دەست پێ دەکاو دەمێنێ مادام ڕۆژ هەڵنەهاتبێ.

(وَالاَخْتِيارُ) کاتی هەڵبژاردەی نوێژی سبەینێ: کە خێری تەواوی بگاتێ (أَنْ لاتُؤَخَّرَ عَنِ الإسْفارِ) ئەوەیە: دوا نەخرێ لە ڕۆشنبوونەوەی زەمین، بە شێوەیەکی وەها: بە تەماشاکردن شتی نزیك لێك جیا بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جبرائیل)یڕابردوو.

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: ﴿عن النواس بن سمعانﷺ: ذَكَرَ رَسُولُ اللهِﷺ الدَّجّالَ، قُلْنا: يا رَسُولَ اللهِ وَما لُبْثُهُ فِي الأَرْضِ؟ قالَ: أَرْبَعِينَ يَوْماً: يَوْمٌ كَسَنَةٍ وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسائِرُ أَيّامِهِ كَأَيّامِكُمْ، قُلْنا: فَذلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَسَنَةٍ أَتَكْفِينا فِيهِ صَلاةُ يَوْمٍ؟ قالَ: لا، أُقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ باسی (دەجّال)ی کرد، ئێمەش گوتمان: (دەجّال) ماوەی چەند ڕۆژ دەمێنێتەوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: چل ڕۆژ دەمێنێتەوە: ڕۆژێکی وەکو یەك ساڵ درێژە، ڕۆژێکیشی وەکو مانگێك درێژە، ڕۆژێکیشی وەکو حەفتەیەك درێژە، ڕۆژەکانیتریشی وەکو ڕۆژەکانی ئێوەیە، گوتمان: لەو ڕۆژەیدا کە وەکو ساڵێك درێژە، ئایا نوێژی تەنها ڕۆژێکمان بەسە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا، ئەندازەی خۆی بۆ دابنێن.

واتە: وەکو جاران لە ماوەی هەر بیستو چوار سەعاتێکدا پێنج نوێژ بکەن بەم جۆرە: کە لە دوای دەرکەوتنی بەیان ئەندازەی نێوان بەیانو نیوەڕۆ ڕۆیشت نوێژی نیوەڕۆ بکەن، ئینجا کە ئەندازەی نێوان نیوەڕۆو عەسر ڕۆیشت نوێژی عەسر بکەن، ئینجا کە ئەندازەی نێوان عەسرو مەغریب ڕۆیشت نوێژی مەغریب بکەن، ئینجا نوێژیعیشاش بەو جۆرە، ئینجا سبەینێ، ئینجا نیوەڕۆ ئینجا عەسر، ئینجا مەغریب...تا ئەو ڕۆژە درێژەی وەکو ساڵێکە کۆتایی دێو کۆی هەموو نوێژەکان دەکاتە هەزارو هەشتسەد نوێژ، واتە: سێسەدو شەست نیوەڕۆ، سێسەدو شەست عەسر...هتد، ئینجا لەو ڕۆژەش کە وەکو مانگێکەو لەو ڕۆژەش کە وەکو حەفتەیەکە، لە هەر بیستو چوار سەعاتێکدا، هەمان ئەندازە دانان بەکار دێنن، هەروەك لە (شرح مسلم للنواوی)و (فتاوىالسيوطى)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئیتر ڕۆژوو و خوا پەرستیەکانیترو کاروباری ڕۆژانەش هەر بەو شێوەیە ئەندازەی بۆ دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، جا لە بەر ئەوەی لە کاتی فیتنەی (دەجّال)دا-خوا بمانپارێزێ- پێویست بەم مەسەلەیە دەبێو پێغەمبەریشﷺ بڕیاری شەرعی بۆ دیاری کردوە، بۆیێ لێرەدا ڕوونمان کردەوە.

دووەم: لە حەدیسە درێژەکەی نیشانەکانی دونیا وێرانبووندا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَنْ تَقُومَ السّاعَةُ...حَتّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِها﴾ رواه الشيخان، دونیا وێران نابێ تا ڕۆژ لە لای ڕۆژئاواوە هەڵدێ. ئینجا بزانە: ڕۆژەکە دەگاتە ناوەندی ئاسمانو دەگەڕێتەوە، کەواتە: هەر کاتێك دەستی بە گەڕانەوە کرد کاتی نوێژی نیوەڕۆیە، ئیجا کە سێبەری شت هەندی خۆی ڕۆیشت کاتی عەسرە، ئینجا کە ئاوا بۆوە کاتی مەغریبە، ئینجا لە مەودوا وەکو جاران لە ڕۆژ هەلاتەوە هەڵدێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

قُلْتُ: يَكْرَهُ تَسْمِيَةُ الْمَغْرِب عشَاءً وَالْعشاء عَتَمَةً وَالنَّوْمُ قَبْلَهَا وَالْحَديثُ بَعْدَهَا إلاَّ فِي خَيْرٍ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُسَنُّ تَعْجِيلُ الصَّلاة لأَوَّل الْوَقْت

---

سێیەم: ئەو شوێنانەی لە ماوەی بیستو چوار سەعاتدا شەوێكو ڕۆژێك نابینن، واتە ڕۆژەكەیان لە بیستو چوار سەعات زیاترە، ئەوە دانیشتووانی ئەو شوێنە وەكو ڕۆژە درێژەكانی (دجَّال) ئەندازە بۆ نوێژو ڕۆژوو و كاروباری ڕۆژانەیان دادەنێن، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا فەرموویانە.

هەروەها: ئەگەر شەویش لە بیستوچوار سەعات زیاتر بوو، هەمان ئەندازەی بۆ دادەندرێ، هەروەك لە (الشرواني) لە باسی نوێژی عەسردا ڕوون كراوەتەوە، بەڵام ئەگەر لە ماوەی بیستو چوار سەعاتدا شەوێكو ڕۆژێكیان دەدیتو شەوەكە، یان ڕۆژەكە زۆر لە عادەت كەمتر بوو، ئەوەشمان لە باسی نوێژی عیشادا ڕوون كردەوە، وَالحَمْدُ لله تعالی.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (يُكْرَه تَسْمِيَةُ الْمَغْرِبِ عشَاءً) ناپەسندە بە نوێژی مەغریب بگوترێ: عیشا، هەروەك لە (البخاري)دا گێڕدراوەتەوە. (وَالْعشَاءِ عَتَمَةً) هەروەها ناپەسندە بە نوێژی عیشا بگوترێ: (عَتَمَة)، واتە: ووشتر دۆشین، هەروەك لە (مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

(وَالنَّوْمُ قَبْلَها) خەوتن ناپەسندە، لە پێش نوێژكردنیعیشادا (وَالْحَديثُ بَعْدَها) قسەكردن ناپەسندە، لەدوای نوێژكردنی عیشا (الاَّ مِنْ خَيْرٍ وَاللهُ أعْلَم) تەنها دەربارەی كاروباری چاكە نەبێ ﴿عن أبي برزة ﷺ: أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعشاءِ والْحَديثَ بَعْدَها﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نوستنی پێش عیشای پێ ناخۆش بوو و قسەكردنی دوای عیشاشی پێ ناخۆش بوو.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەر كاتێك سەرەتای كاتی نوێژ داهات، نوێژی ئەو كاتەی لە سەر واجب دەبێ، بەڵام بۆی دروستە: نوێژكردنەكە دوا بخا تاكو لە پێش دەرچوونیكاتەكەیدا بیكا، بەو مەرجەی هەر لە سەرەتای كاتەكەدا نیازی كردنی هەبێ، بەڵام ئەگەر دەیزانی لە كاتی نوێژدا تووشی حاڵەتێكی وەها دەبێ: نوێژی پێناكرێ، وەكو بزانی دەكوژرێ، یان شێت دەبێ، یان بێهۆش دەبێ، یان حەیز، یان منداڵبوونی تووش دەبێ، ئەو كاتە واجبە: لە سەرەتای كاتەكەدا نوێژ بكا، ئەگینا: گوناهبار دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئامازەیان بۆ كردوە.

(وَيُسَنُّ تَعْجِيلُ الصَّلاةِ) سوننەتە: گشت نوێژێك زوو بكرێ (لأَوَّلِ وَقْتِها) لە سەرەتای كاتەكەیدا، واتە: بەو مەرجەی دڵنیابێ: كاتی نوێژەكە هاتوە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرات﴾ پەلە بكەن بۆ كاری چاكە.

وَفِي قَوْلٍ: تَأْخِيرُالْعِشَاءِ أَفْضَلُ، وَيُسَنُّ الإِبْرَادُ بِالظُّهْرِ فِي شِدَّةِالْحَرِّ، وَالْأَصَحُّ اخْتِصَاصُهُ بِبَلَدٍ حَارٍّ وَجَمَاعَةِ مَسْجِدٍ يَقْصِدُونَهُ مِنْ بُعْدٍ، وَمَنْ وَقَعَ بَعْضُ صَلَاتِهِ فِي الْوَقْتِ: فَالأَصَحُّ

---

ئینجا بزانە: پاراستنی نوێژی عەسر لە هەموو نوێژەکانی‌تر واجبترە، چونکە خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿حافِظُوا عَلَى الصَّلَوات وَالصَّلاةِالْوُسْطَى﴾ بەردەوام بن لە سەر پاراستنی نوێژەکان‌و نوێژی ناوەند. واتە: کە نوێژی عەسرە، هەروەك باسمان کرد.

کەوابو: ئەو عادەتەی لە چەند شوێنێکی کوردستاندا هەیە: کە نوێژی عەسر دوا دێخن تا خەڵك دەست لە کار هەڵدەگرن، ئینجا بانگ دەدەن‌و جەماعەت دەکەن، عادەتێکی ناپەسندەو دژ بەو دوو ئایەتەیەو واجبە: وازی لێبهێندرێ، نەوەك ئەو سوننەتە لە ناو بچێ، چونکە نوێژکردن لە سەرەتای کاتی‌دا، خێری زیاترە لە کاتی هەڵبژاردە، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە سەری بەردەوام بووەو فەرمانیشی پێ‌کردوە.

جا ئەگەر لە سەرەتای کاتدا خۆی خەریك کرد بەدەستنوێژو بانگ‌و جل گۆڕین‌و کارێکی سووك‌و گفتوگۆیەکی کەم‌و خواردنێکی کەم‌و چاوەڕوانکردنی جەماعەت، بەوە خێری سەرەتای کاتی لەدەست ناچێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوەو لە پاشکۆی بانگدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (تَأْخِيرُالْعِشَاءِ أَفْضَلُ) دواخستنی نوێژکردنی عیشا خێری گەورەترە، بەو مەرجەی لە کاتی هەڵبژاردە تێنەپەڕێ ﴿عن أبي‌برزةﷺ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَسْتَحِبُّ أَنْ يُؤَخِّرَالْعِشاءَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ پێی خۆش بوو نوێژی عیشا دوا بێخێ.

(وَيُسَنُّ الإِبْرادُ بِالظُّهْرِ) سوننەتە: فێنککردنی نوێژی نیوەڕۆ (فِي شِدَّةِ الْحَرِّ) لە کاتی گەرمای بەهێزدا، واتە: نوێژی نیوەڕۆ دوا بێخێ، تا دیوارەکان ئەوەندە سێبەریان پەیدا دەبێ: نوێژکەر تێیدا بڕوا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذااشْتَدَّالْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلاةِ فَإِنَّ شِدَّةَالْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك گەرما بەهێز بوو، نوێژی نیوەڕۆ فێنك بکەن، چونکە گەرمای بەهێز لە هەناسەی دۆزەخەوەیە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (اخْتِصاصُهُ) ئەو فێنککردنە تایبەتە (بِبَلَدٍ حارٍّ) بە شوێنێکی وەها: کە پلەی گەرمای بەرز بێ‌و (وَجَماعَةِ مَسْجِدٍ) نوێژی نیوەڕۆش لە مزگەوتێکدا بە جەماعەت بکرێ‌و (يَقْصِدُونَهُ مِنْ بُعْدٍ) نوێژکەرەکانیش لە دوورەوە بێنە مزگەوتەکە، واتە: ئەگەر یەکێك لەو چوار مەرجانە نەبو، فێنککردن سوننەت نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

(وَمَنْ وَقَعَ بَعْضُ صَلاتِهِ فِي الْوَقْتِ) هەر کەسێك دەستی بە نوێژ کردو بەشێکی نوێژەکەی کەوتە کاتی نوێژەکەو بەشێکیشی کەوتە دەرەوەی کاتی نوێژەکە، ئەوە (فَالأَصَحُّ)

أَنَّهُ إنْ وَقَعَ رَكْعَةٌ فَالْجَمِيعُ أداءٌ، وَإلاَّ فَقَضَاءٌ، وَمَنْ جَهِلَ الْوَقْتَ اجْتَهَدَ بِوِرْدٍ وَنَحْوِهِ، فَإنْ تَيَقَّنَ صَلاَتَهُ قَبْلَ الْوَقْتِ قَضَى فِي الأَظْهَرِ وَإلاَّ فَلاَ،

---

فەرمودەی ڕاستتر (أَنَّهُ إن وَقَعَ رَكْعَةٌ) ئەگەر ڕەكعەتێكی تەواو، یان زیاتر كەوتە كاتی نوێژ (فَالْجَمِيعُ أداءٌ) هەموو نوێژەكە بە ئەدا دادەنرێ، واتە: وا دادەندرێ لە كاتی خۆیدا كراوە (وَإلا) بەڵام ئەگەر ڕەكعەتێكی نەكەوتە كاتی نوێژ، بەڵكو لە پێش تەواوبوونی سوجدەی دووەم، كاتی نوێژ نەما (فَقَضاءٌ) ئەوە هەموو نوێژەكە بە قەزا دادەنرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصَّلاةِ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاةَ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك بگاتە ڕەكعەتێكی نوێژ، ئەوە گەیشتۆتە هەموو نوێژ.

ئینجا بزانە، بە تەواوبوونی سوجدەی‌دووەم ڕەكعەتێك تەواو دەبێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، كەواتە: لە سەرەتای(فاتحة)وە تا هەڵسانەوە لە سوجدەی‌دووەم، بە یەك ڕەكعەت دادەندرێ.

(وَمَنْ جَهِلَ الْوَقْتَ) هەر كەسێك كاتی نوێژی نەدەزانی، چونكە هەور بوو، یان لە شوێنێكی تاریكدا بەند كرابو، تواناشی نەبو بێگومان كاتەكە بزانێ، ئەوە (اجْتَهَدَ) واجبە: (اِجْتِهاد) بكا، واتە: هەوڵ بدا كاتی نوێژ بزانێ (بِوِرْدٍ) بە هۆی ئەندازەی خواپەرستی ڕۆژانەی: وەك قورئانخوێندن (وَنَحْوِهِ) یان شتی‌تر، وەك بەرگ دوروینو كارەكانی‌تر، یان دەنگی كەڵەشێرێكی تاقیكراوە.

هەروەها ئەگەر گوێی لەدەنگی بانگی باوەڕپێكراوێك بوو، كە لە كاتی‌نوێژەكان شارەزا بوو، یان باوەڕپێكراوێك بە چاو زانیبێتی كاتی نوێژ هاتوە، واجبە: باوەڕیان پێ‌بكا، جیاوازی كوێرەو چاوساغیش نیە، كەوابو: هەتا گومان هەبێ: ئایا كاتی‌نوێژ بووە، یان نا؟ حەڕامە: نوێژ دابیبەستێو نوێژەكەشی دروست نیە، واتە: هەر چەند ئاشكراش ببێ لە كاتی خۆیدا كراوە، هەر واجبە: قەزای بكاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرمویانە.

(فَإنْ تَيَقَّنَ صَلاتَهُ قَبْلَ الْوَقْتِ) ئەگەر هاتو (إجْتِهاد)ی كردو نوێژی كرد، ئینجا بێگومان زانی: نوێژەكەی لە پێش هاتنی‌كاتدا بووە (قَضَى فِي‌الأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا واجبە: نوێژەكە قەزا بكاتەوە، چونكە ڕەفتاری بە ئایەتی ﴿إنَّ الصَّلاةَ كانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتاباً مَّوْقُوتاً﴾ نەكردوە (وَإلّا) بەڵام ئەگەر بێگومان نەیزانی: نوێژی لە پێش هاتنی كاتدا كردوە، بەڵكو لە كاتی خۆیدا كردبوی، یان هیچی بۆ ڕوون نەبۆوە (فَلا) واجب نیە: قەزا بكاتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر هاتو چەند ساڵێك نوێژی سبەینێی-یان نوێژێكی‌تری- لە پێش هاتنی‌كاتدا كردبو، ئینجا غەڵەتەكەی ئاشكرا بوو، ئەوە قەزاكردنەوەی تەنها یەك نوێژ واجبە،

چونکه هەر نوێژێکی ڕۆژیدواوه بە بەر قەزای ڕۆژی پێشەخۆی دەکەوێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتیو لە باسی نیەتینوێژدا دووبارەی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

## ﴿ باسی قەزاکردنەوەی نوێژ ﴾

ئیمامی (النواوی) لە (المجموع)دا دەفەرموێ: (اِجْماع)-یەکدەنگی ئەو زانایانەی متمانەیان پێدەکرێ، لە سەر ئەوەیە: هەر کەسێك بە قەسدی نوێژی نەکردبێ، واجبە: قەزای بکاتەوە...چونکە ئەگەر کەسێك لە بیری چوبێ: نوێژ بکا، واجبە قەزای بکاتەوە، کەوابو: ئەو کەسەی بە قەسدی نەیکردوە، لەپێشترە کە قەزاکردنەوەی لە سەر واجب بێ.

ئینجا بزانە: (پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خندق)دا لە بەر خەریکبوونیجەنگ نوێژی عەسری نەکردو لە دوای مەغریب قەزای کردەوە). هەروەها (لە غەزای (بَنیقُرَيظَة)دا چینە (صحابة)یەك بە قەسدی نوێژی عەسریان نەکرد تاکو بگەنە جێ، ئینجا کە گەیشتنە جێ قەزایان کردەوە). هەروەها (لە غەزای (خَیبر)دا، پێغەمبەروﷺ (صحابة)کان بۆ نوێژی سبەینێ لە خەو هەڵنەستان تا ڕۆژ هەڵات، ئینجا ڕۆیشتنە ئەولاترو نوێژی سبەینێیان لە گەڵ سوننەتەکەیشی قەزا کردەوە).

ئەو حەدیسانە گشتی لە (بخاریومسلم)دانە، جگە لەوانەش چەند حەدیسێکیتر دەهێنین لێرەو لە باسی قەزاکردنەوەی نوێژە سوننەتەکاندا،ان شاء الله تعالى.

کەوابو: جیاوازی نیە: بە قەسدی نوێژی نەکردبێ، یان خەوتبێ، یان لە بیری چوبێ، یان ڕێگەی نوێژکردنی لێگیرابێ، بە (اِجْماع)ی زانایانی ئیسلام لە سەر گشتیان واجبە: نوێژەکە قەزا بکەنەوە، اَلْحَمدُ لِلّه هیچ زانایەکی(مُجْتَهِد)و متمانە پێکراویش لە (اجماع)ی زانایانی (اهل السنة) دەرنەچوە.

(وَيُبادِرُ بِالْفائِتِ) واجبە: پەلە بکا بۆ قەزاکردنەوەی نوێژی فەوتاو ئەگەر بە قەسدی نەیکردبێ، بەڵام ئەگەر لە بەر خەوتن، یان لە بیرچوون نوێژەکەی نەکردبێ، ئەو کاتە پەلەکردن سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّ إِذا ذَكَرَها، لا كَفَّارَةَ لَها إلاّ ذلكَ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك لە بیری چوو نوێژێك بکا، هەر کاتێك هاتەوە بیری با نوێژەکە بکا، هیچ شتێك تاوانی نوێژە نەکراوەکە لانابا تەنها کردنینوێژێکی وەك خۆی نەبێ.

ئینجا بزانە: پەلەکردن، لە پیتی(فاء)ی (فَلْيُصَلِّ) وەردەگیرێو ڕستەی﴿لا كَفَّارَةَ لَها إِلاّ ذلكَ﴾: هیچ شتێك تاوانی نوێژەنەکراوەکە لانابا تەنها کردنی نوێژێکی وەك خۆی نەبێ، بەڵگەیە: کە نوێژیسوننەتیش جێگەی نوێژیواجب پڕ ناکاتەوە.

وَيُسَنُّ تَرتِيبُهُ وَتَقْدِيمُهُ عَلَىالْحَاضِرَةِ الَّتِي لا يَخَافُ فَوْتَهَا.

كەوابو: لەم حەدیسەدا: كە خوای‌گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێ: ﴿اُنْظُرُوا فِي صَلاةِ عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا؟...فَإِذا انْتَقَصَ مِنْها شَيْئاً قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ﴾ رواه ابوداود بسندحسن، تەماشای ناو نوێژی بەندەی من بكەن: ئایا نوێژەكەی بە تەواوی كردوە، یان بە ناتەواوی؟ جا ئەگەر ناتەواو بوو، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ناتەواوی نوێژە واجبەكە بۆ بەندەی من لە نوێژە سوننەتەكەی تەواو بكەن. مەبەست خودی نوێژە نەكراوەكە نیە، بەڵكو مەبەست ناتەواوی ناو نوێژەكەیە: كە نەیزانیوە، هەروەها مەبەست خودی ئەو نوێژەیە: كە لەبیری چووەو هەر نەهاتۆتەوە بیری بیكا، هەروەك لە (تحفة)دا لە باسی نوێژی سوننەتدا ڕوون كراوەتەوە.

واتە: بە دیاری‌كردنی ئەم دوو مەبەستە، دژایەتی نێوان هەردوو حەدیسەكە لادەچێ، چونكە لە حەدیسەكەی‌یەكەمدا دەفەرموێ: (إِذا ذَكَرَها)، هەر كاتێك هاتەوە بیری، لە حەدیسەكەی دووەمیشدا دەفەرموێ: (اُنْظُرُوا فِي صَلاةِعَبْدِي)، تەماشای ناو نوێژی بەندەی من بكەن.

ئینجا بزانە: ئەگەر كەوتە گومان‌و نەیزانی: ژمارەی نوێژە فەوتاوەكان چەندە، ئەوە تا گومانی لادەچێ، هەر واجبە: قەزایان بكاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی كردۆتەوە.

(وَيُسَنُّ تَرْتِيبُهُ) سوننەتە: ڕیزكردنی نوێژە قەزاكراوەكان، واتە: نوێژی سبەینێ قەزا بكاتەوە، ئیجا نیوەڕۆ، ئینجا...هتد ﴿عن أبي‌سعيدالخدري: حُبِسْنا يَوْمَ الْخَنْدَقِ حَتّى ذَهَبَ هَوِيٌّ مِنَ اللَّيْلِ حَتّى كُفِينا، فَدَعَى رَسُولُ اللهِﷺ بلالاً فَأَمَرَهُ فَأَقامَ، فَصَلّى الظُّهْرَ وَأَحْسَنَ كَما كانَ يُصَلِّيها فِي وَقْتِها ثُمَّ أَقامَ الْعَصْرَ فَصَلاَّها كَذلِكَ ثُمَّ أَقامَ الْمَغْرِبَ فَصَلاها كَذلِكَ ثُمَّ أَقامَ الْعِشاءَ فَصَلاَّها كَذلِكَ﴾ رواه الأمامان الشافعي وأحمد بسند صحيح، ڕۆژێك لە غەزای(خندق) ڕێگەی نوێژكردنمان گیرا، تا بەشێكی شەویش ڕۆیشت، ئینجا ڕێگەی نوێژكردنمان بوو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە (بلال) كرد: ئیقامەتی بۆ نوێژی نیوەڕۆ كردو بە جوانی نوێژەكەی قەزا كردەوە هەروەك لە كاتی‌خۆی‌دا دەیكرد، ئینجا ئیقامەتی عەسری كرد بەو شێوەیە، ئینجا ئیقامەتی مەغریب، ئینجا ئیقامەتی عیشا. واتە: سێ نوێژی فەوتا بوون‌و قەزای كردنەوە.

(وَتَقْدِيمُهُ عَلَىالْحاضِرَةِ) سوننەتە: نوێژە فەوتاوەكە قەزا بكاتەوە لە پێش كردنی نوێژی ئێستای‌دا (الَّتِي لايَخافُ فَوْتَها) بەو مەرجەی ترسی نەبێ نوێژی ئێستایشی بفەوتێ، ئەگینا: دەبی نوێژی‌ئێستای بكا، ئینجا فەوتاوەكە قەزا بكاتەوە ﴿عن جابر: فاتَ النَّبِيَّﷺ الْعَصْرُ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَصَلاّها بَعْدَما غَرَبَتِ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلّى بَعْدَها الْمَغْرِبَ﴾ رواه

الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خندق) نوێژی عەسریی فەوتا، ئینجا لە دوای ڕۆژ ئاوابوون قەزای کردەوە، ئینجا نوێژی مەغریبی لە دوادا کرد.
ئینجا بزانە: ڕووداوی ئەم حەدیسە لە ڕۆژێکدا بوو، ڕووداوی حەدیسەکەی پێشداش لە ڕۆژێکی‌تردا بوو، هەروەك لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی.
﴿ئاگاداری﴾: واجبە گشت کاتێکی‌خۆی-جگە لە کاتی خەوتن‌و خواپەرستنی واجب‌و هەوڵدانی ژیان- لە قەزاکردنەوەی ئەو نوێژانەدا بەسەر ببا: کە بە قەسدی نەیکردون، دروستیش نیە نوێژی‌سوننەت بکا تا نوێژە واجبەکان بە تەواوی قەزا دەکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، واتە: نوێژە سوننەتەکەی دادەمەزرێ‌و قبوڵ دەبێ، بەڵام پێی گوناهبار دەبێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.
بەڵام حاشیەی(ابن قاسم) لە ئیمامی(الرملي) دەگێڕێتەوە: (**دروستە: سوننەتە دامەزراوەکانی پێش نوێژ، لە پێش ئەو نوێژە فەوتاوەدا بکرێن: کە واجبە بە پەلە قەزا بکرێتەوە**). جا ئەم فەرموودەیە وا دەگەیەنێ: ئەو کەسەی نوێژی قەزای لە سەرن، بۆی دروستە: سوننەتە دامەزراوەکانی پێش نوێژو دوای نوێژ بکا، کەواتە: مەبەستی (تحفة) ئەو سوننەتانە نین: کە (مُؤكَّدَة)نە، بەڵکو مەبەستی سوننەتەکانی‌ترن، وَاللهُ أعْلَم.
هەروەها بزانە: ئەگەر کەسێك زۆر نوێژو ڕۆژووی بە قەسدی نەکردبون‌و تۆبەی کرد، بەڵام بۆی نەگونجا بە پەلە قەزایان بکاتەوە، ئەوە واجبە بە دڵ بڕیار بداو نیازی وابێ: هەر کاتێك توانای هەبو قەزایان بکاتەوە، هەروەك لە (الشرواني) لە باسی (توبة)دا ڕوونی کردۆتەوە، کەواتە: هەر لە ئێستاوە واجبە: بە گوێرەی‌توانا قەزایان بکاتەوە، هەر چەند لە گەڵ هەر نوێژێکیشدا نوێژێك قەزا بکاتەوە، تاکو باری قەرزی سوکتر ببێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەربارەی ڕۆژوو و حەج دەفەرموێ: ﴿اُقْضُوا اللهَ فَاللهُ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ﴾ رواه الشيخان، قەرزی خوا بدەنەوە، چونکە خوا لەپێشترە کە قەرزی بدرێتەوە.

## ﴿ئەو پێنج کاتانەی کردنی نوێژی‌سوننەتیان تێدا حەڕامە﴾

(وَتُكْرَهُ الصَّلاةُ) لە پێنج کاتدا نوێژکردنی سوننەت ناپەسندە، بە ناپەسندیەکی‌حەڕام، واتە: نوێژەکە دانامەزرێ‌و تاوانباریش دەبێ:
**یەکەم‌و دووەم‌و سێیەم**: (عِنْدَالإسْتِواء) لەو کاتەدا: کە ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە، لەو کاتەدا: کە ڕۆژ خەریکی ئاوابوونە، لەو کاتەدا: کە ڕۆژ هەڵدێ ﴿عن عقبةﷺ: ثَلاثُ ساعاتٍ كانَ رَسولُ اللهِﷺ يَنهانا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ وَأَنْ نَقْبرَ فِيهِنَّ مَوْتانا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بازِغَةً حَتّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتّى تَزُولَ الشَّمْسُ، وَحِينَ تَتَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ﴾ رواه

إلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَبَعْدَالصُّبْحِ حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ كَرُمْحٍ، وَالْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ، إلاَّ لِسَبَبٍ: كَفَائِتَةٍ

---

مسلم، سێ كات هەنە پێغەمبەرﷺ قەدەغەی دەكردین نوێژیان تێدا بكەین‌و مردووەكانمان تێیاندا بنێژین: لەو كاتەیدا كە ڕۆژ هەڵدێ تا بە قەد ڕمێك بەرز دەبێ، لەو كاتەیدا كە ڕۆژ لە ناوەندی ئاسمانە تا لادەدا، لەو كاتەیدا كە ڕۆژ خەریكی ئاوابوونە.

(إلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ) تەنها لە ڕۆژی هەینیدا نوێژكردن لە كاتی(إستواء)دا حەرام نیە، چونكە لە حەدیسێكیتردا هاتوە: ﴿كَرِهَ النَّبِيُّ ﷺ الصَّلاةَ نِصْفَ النَّهَارِ إلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ﴾ رواه ابوداود بسندضعيف، لكنّه مؤيَّد بفعل الصحابةﷺ، پێغەمبەرﷺ پێی ناخۆش بوو لە نیوەی ڕۆژیدا نوێژ بكرێ، تەنها لە ڕۆژی(جمعة)دا نەبێ. ڕەفتاری (صَحابَة)كانیش وەك ناوەڕۆكی ئەم حەدیسە بێهێزە بووە.

**چوارەم:** (وَبَعْدَالصُّبْحِ) لە پاش نوێژكردنی سبەینێش نوێژی سوننەت حەرامە (حَتَّى تَرْتَفِعَ الشَّمْسُ كَرُمْحٍ) تا ڕۆژ هەڵدێ‌و بە قەد ڕمێكیش بەرز دەبێ.

**پێنجەم:** (وَالْعَصْرِ) لە پاش نوێژكردنی عەسرێش نوێژی سوننەت حەرامە، هەر چەند بە (جمع التقديم)ش لەگەڵ نیوەڕۆدا كردبێتی (حَتَّى تَغْرُبَ) تا ڕۆژ بە تەواوی ئاوا دەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاصَلاةَ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلاصَلاةَ بَعْدَالْعَصْرِ حَتَّى تَغِيبَ الشَّمْسُ﴾ رواه الشيخان، هیچ نوێژێكیسوننەت دروست نیە: لە پاش نوێژكردنی سبەینێ تا ڕۆژ هەڵدێ، هیچ نوێژی سوننەت دروست نیە: لە پاش نوێژكردنی عەسرێ تا ڕۆژ ئاوا دەبێ. واتە: ئەگەر نوێژی سبەینێی، یان عەسرێی نەكردبو، ئەوە گشت سوننەتێكی بۆ دروستە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(إلاَّ لِسَبَبٍ) نوێژكردن لەو پێنج كاتانەدا تەنها لە بەر هۆیەك دروستە، بەو مەرجەی هۆیەكە دواكەوتوو نەبێ، واتە: یان لە پێش نوێژەكەدا بێ، یان لە گەڵ نوێژەكەدا بەرامبەر بێ، بەو مەرجەش مەبەستی وەها نەبێ: نوێژەكە بە قەسدی لە یەكێك لەو پێنج كاتانەدا بكا، ئەگینا: هەر حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئاماژەیان بۆ كردوە، جا هۆیەكەش وەك ئەوانەیداهاتوو:

(كَفَائِتَةٍ) وەكو نوێژی فەوتاو، واتە: كە لە كاتیخۆیدا نەكرابێ، دروستە: لەو پێنج كاتانەشدا قەزا بكرێتەوە، بەو مەرجەی نەیكاتە پیشەی بەردەوامیخۆی‌و مەبەستیشی وەها نەبێ بە قەسدی بیهێنێتە ئەو كاتانە، جیاوازی نوێژی واجب‌و سوننەتیش نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ نَسِيَ صَلاةً فَلْيُصَلِّ إذا ذَكَرَها﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك نوێژێكی لە بیر چوو و نەیكرد، هەر كاتێك

وَكُسُوف وَتَحِيَّة وَسَجْدَة شُكْرٍ وَإِلاَّ فِي حَرَمِ مَكَّةَ عَلَى الصَّحِيحِ.
(فَصْلٌ) إِنَّمَا تَجِبُ الصَّلَاةُ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ بَالِغٍ عَاقِلٍ

---

هاتەوە بیری با نوێژەکە بکا. ئینجا بزانە: لە باسی قەزاکردنەوەی نوێژی سوننەت بەڵگەیتریش دەهێنین، إن شاء الله تعالى.

هەروەها سوننەتەکانی پێش نوێژیعەسرو پێش نوێژیسبەینێش دروستە: لە دوای نوێژەکەدا بکرێن ئەوەش بەو مەرجەی نەیکاتە پێشەی بەردەوامو مەبەستیشی وەها نەبێ: سوننەتەکان بە قەسدی لەو کاتانەدا بکا ﴿عن عائشة رضي الله عنها وَقَدْ سُئِلَتْ عَنِ السَّجْدَتَيْنِ اللَّتَيْنِ كانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّيهِما بَعْدَالْعَصْرِ؟ فَقالَتْ: كانَ يُصَلِّيهِما قَبْلَ الْعَصْرِ ثُمَّ إِنَّهُ شُغِلَ عَنْهُما أَوْ نَسِيَهُما فَصَلاَّهُما بَعْدَالْعَصْرِ ثُمَّ أَثْبَتَهُما﴾ رواه مسلم، پرسیار لە حەزەرتی(عائشە) کرا: دەربارەی ئەو دوو ڕەکعەتەی پێغەمبەرﷺ لە پاش نوێژی عەسریدا دەیکردن؟ فەرمووی: ئەوە دوو ڕەکعەت سوننەتەکەی پێش عەسر بون پێغەمبەرﷺ بە شتێکیتر خەریك کرابو، یان لە بیری چوبو لە پێش نوێژدا بیکا، جا لە دوای نوێژدا کردنی، ئینجا بەردەوام ئەو دوو ڕەکعەتەی دەکردن.

(وكُسُوف) هەروەها وەکو نوێژی ڕۆژگیران، هەروەها نوێژی بارانیش، ئەوانەش دروستە: لەو کاتانەدا بکرێن، چونکە هۆیەکەیان بەرامبەرە (وَتَحِيَّةٍ) هەروەها سوننەتی (تحيةُ الْمَسْجِدِ)و سوننەتیدەستنوێژو (وَسَجْدَةِ شُكْرٍ) سوجدەیشوکرو سوجدەی(تِلاوَة)و نوێژی (جَنازة)، ئەوانەش لەو کاتانەدا دروستە: بکرێن، چونکە هۆیەکانیان پێش کەوتوە. کەوابو: ئەگەر هۆیەکە نەبو: وەکو (صَلاةالتَّسْبِيح)و هەر سوننەتێکیتر: کە هۆیەکی نەبێ، یان هۆیەکەی دواکەوتوو بێ: وەکو (صَلاةُ الإسْتِخارة)و (سُنَّةُالإحْرام)، ئەوانە هیچیان دروست نیە لەو پێنج کاتانەدا بکرێن.

(وَإلاّ فی حَرَمَ مَكَّة) هەروەها تەنها لە حەرەمی(مكة)دا لە هیچ کاتێکدا هیچ جۆرە نوێژێك حەرام نیە (عَلى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يا بَنِي عَبدِمَناف لاتَمْنَعُوا أَحَداً طافَ بِهذاالْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ ساعَةٍ شاءَ: مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهارٍ﴾ صححه الترمذي وابن حبان، هیچ کەسێك قەدەغە مەکەن: کە تەوافی ئەم ماڵەیخوا دەکاو نوێژ دەکا لە هەر کاتێکدا بە شەو، یان بە ڕۆژ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو کەسانەی نوێژیان لە سەر واجبە ﴾

(إِنَّما تَجِبُ الصَّلاةُ) نوێژ واجبە: تەنها (عَلى كُلِّ مُسْلِمٍ) لە سەر هەر کەسێکی موسڵمان بێ، جا هەرچەند لە ڕابردووشدا موسڵمان بوبێو ئێستاش کافر بێ (بالِغٍ) بلوغی بوبێ: بەو جۆرەی لە سەرەتای حەیزدا باسمان کرد (عاقِلٍ) عەقڵی هەبێ، واتە: شێت نەبێ، جا

طَاهِرٍ، وَلاَ قَضَاءَ عَلَى الْكَافِرِ إِلاَّ الْمُرْتَدِّ، وَلاَ الصَّبِيِّ وَيُؤْمَرُ بِهَا لِسَبْعٍ وَيُضْرَبُ عَلَيْهَا لِعَشْرٍ،

---

لەو سێیانەدا جیاوازی نێرو مێ نیە (طاهِرٍ) پاك بێ: لە حەیزو زەیسانی، کەوابو: نوێژ واجب نیە: لە سەر کافری بنچینەیی‌و لە سەر منداڵ‌و لە سەر شێت‌و لە سەر ئافرەتی زەیسانی‌و حەیزدار.

هەروەها (وَلا قَضاءَ عَلَى الكافِرِ) نوێژ قەزاکردنەوەش واجب نیە: لە سەر کافری بنچینەی کە بووە موسڵمان، چونکە خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَّاقَدْ سَلَفَ﴾ بە کافرەکان بڵێ: ئەگەر واز لە کوفر بێنن‌و ببنە موسڵمان، لە رابردوویان دەبوردرێ. ئینجا بزانە: کافری‌بنچینەیی زەکات‌و ڕۆژوو و حەجیشی لە سەر واجب نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(إلاّالمُرْتَدِّ) تەنها کافری وەرگەڕاو قەزاکردنەوەی نوێژی لە سەر واجبە، واتە: ئەو نوێژانەی کاتی‌کافربوونەوە واجبە: قەزا بکاتەوە، چونکە بە هۆی ئیسلامەتی نوێژی لە سەر واجب بووە، کەوابو: بە کافربوون لە سەری لاناچێ، بەڵام لە فەرموودەی ئیمامی (حنفی)و ئیمام (مالك)دا کافری وەرگەڕاویش وەکو کافری بنچینەیی قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: مەبەست بە کافری‌بنچینەیی ئەو کافرەیە: بە نەژادەوە کافر بێ‌و هیچ کاتێکیش بە خۆی موسڵمان نەبوبێ، کافری وەرگەڕاویش ئەو کافرەیە: بە نەژادەوە، یان هەر بەخۆی لە کاتێکدا موسڵمان بوبێ، ئینجا کافر ببێ.

### ﴿ باسی پەروەردە کردنی منداڵ ﴾

(وَلاالصَّبِيِّ) هەروەها قەزاکردنەوەی نوێژ لە سەر منداڵیش واجب نیە کە بلۆغی بوو، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ﴾ رواه ابوداود باسناد صحيح، نووسینی تاوان لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە: لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

(وَيُؤْمَرُ بِها) فەرمان بە منداڵ دەکرێ: تاکو نوێژ بکا (لِسَبْعٍ) لە پاش تەواوکردنی تەمەنی حەفت ساڵی تاکو لێڕابهێندرێ، هەروەها واجبە هەڕەشەی لێبکرێ‌و فەرمانی قەزاکردنەوەشی پێبکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُضْرَبُ عَلَيْها) هەروەها لە سەر نەکردنی‌نوێژ لە منداڵ دەدرێ (لِعَشْرٍ) لە پاش تەواوکردنی تەمەنی دە ساڵی، جیاوازی کوڕو کچ نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

﴿مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أَبْناءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْها وَهُمْ أَبْناءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضاجِعِ﴾ رواه ابوداود باسنادحسن، فەرمانی نوێژکردن بە منداڵەکانتان بکەن هەر کاتێك تەمەنیان بووە حەفت ساڵ، لە سەر نوێژنەکردن لێیان دەن کە تەمەنیان بووە دە ساڵ، هەر لە تەمەنی دەساڵیشدا جێگەی خەوتنی نێرو مێ لێك جیا بکەنەوە. واتە: نەوەك ڕەووشتیان تێك بچێ.

ئینجا بزانە: ئەو فەرمانەو ئەو لێدانەی ڕابردوو، لە سەر دایك و باوك واجبە، ئینجا باپیر، ئینجا لە سەر سەرپەرشتکارەکانی‌تر، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم ئایەت‌و حەدیسانە هێناوە: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً﴾ ئەی ئیمانداران خۆتان‌و خزم‌و کەستان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن. پێغەمبەر یش ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لِوَلَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً﴾ رواه مسلم، بە ڕاستی منداڵەکەی خۆت مافی لە سەرت هەیە.

هەروەها واجبە: لە تەمەنی حەفت ساڵی‌دا منداڵ فێرە شادە هێنان بکرێ‌و ناوی خواو ناوی پێغەمبەرو ﷺ ناوی دایك‌و باوکی پێغەمبەری ﷺ پێ بگوترێ، هەروەها پێی بگوترێ، پێغەمبەر ﷺ (قُرَيْشي)يەو لە (مكة) لە دایك بووەو لە (مَدينة) وەفاتی کردوە، هەروەها واجبە واتەی پێغەمبەرایەتی تێبگەیەندرێ‌و فێرە خۆشویستن‌و ڕێزلێنانی خواو پێغەمبەر ﷺ بکرێ.

هەروەها واجبە فێرە دەستنوێژو نوێژو گشت لقەکانی شەریعەت بکرێ‌و لە گشت تاوانێکی گەورەو بچوك قەدەغەبکرێ ﴿عن أبي هريرة ﷺ: أَخَذَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رضي الله عنهما تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ فَجَعَلَها فِي فِيهِ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: كَخْ كَخْ لِيَطْرَحَها، ثُمَّ قالَ: أَمَا شَعَرْتَ إِنَّا لا نَأْكُلُ الصَّدَقَةَ؟﴾ رواه الشيخان، حەزرەتی(حَسَن)ی کوڕی ئیمامی(عَلی) رضي الله عنهما قەسپێکی لە قەسپەکانی زەکات دانا ناو دەمی خۆی‌و ویستی بیخوا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کخ کخ. تاکو بە پیسی تێبگاو فڕێی بدا، ئینجا فەرمووی: نەتزانیوەئێمە زەکات ناخۆین؟ چونکە بۆمان حەلاڵ نیە. واتە: هەرچەند حەزرەتی(حسن) منداڵ بوو، تاوانی لە سەر نەدەنووسرا، بەڵام چونکە پێغەمبەر ﷺ باپیری بوو، لە خواردنی حەرام قەدەغەی کرد.

﴿ ئاگاداری ﴾: کرێی ئەو فێرکردنانەی ڕابردوو و فێرکردنی قورئانیش، لە ماڵی منداڵەکە دەدرێ، جا ئەگەر ماڵی نەبو، لە ماڵی ئەو کەسە دەدرێ: کە واجبە بەخێوی بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها بزانە: ئیمام (ابن البزری) دەفەرموێ: لە سەر مێرد واجبە فەرمانی نوێژکردن بە ژنەکەی بکاو لە سەر نوێژنەکردن لێی‌بدا، لە (تحفة)دا دەفەرموێ: بەو مەرجەی مەترسی تۆرانی ژنەکەی نەبێ.

هەروەها بزانە: ئەو کەسەی بە کوێریو بە کەڕیو بە لاڵیلە دایك دەبێ، فەرمانەکانی شەریعەتیئیسلام نایگرێتەوە، هەروەها ئەو کەسەش ناگرێتەوە: کە بانگەوازی ئیسلامی نەگەیشتۆتێ، هەروەك لە (نهایة)دا فەرموویەتی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾ ئێمە هیچ کەسێك سزا نادەین تا پێغەمبەرێك دەنێرین.
کەوابو: هەر کاتێك کەڕو کوێرەکە چاك بونەوە، ئەویتریش بانگەوازیی پێگەیشتو بووە موسڵمان، هیچیان قەزاکردنەوەیان لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر بە ساغی لە دایك بوو، ئینجا لە دوای فاماندن تووشی کەڕیو کوێری بوو، ئەوە واجبە بە گوێرەی فاماندنەکە خواپەرستی بکا، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.
(وَلَا ذِیحَیْضٍ) هەروەها قەزاکردنەوە واجب نیە، لە سەر ئافرەتی خاوەن حەیز، یان زەیسانی، واتە: حەڕامە نوێژەکانی ماوەی حەیز، یان زەیسانی قەزا بکەنەوە، هەرەوەك لە باسی حەیزدا بەڵگەمان هێناوە (أَوْ جُنُونٍ) هەروەها لە سەر مرۆڤی شێت (أَوْ إِغمَاءٍ) یان مرۆڤی بێهۆشبوو، هیچیان لە سەریان واجب نیە نوێژەکانی ماوەی شێتیو بێهۆشی قەزا بکەنەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ﴾یڕابردوو.
(بِخِلافِ السُّكْرِ) بەڵام مرۆڤی سەرخۆش لە سەری واجبە نوێژەکانی کاتی سەرخۆشی قەزا بکاتەوە، هەروەها ئەو کەسەی بە قەسدی خۆی بێهۆش کردوە، یان بە قەسدی کارێکی وەهای کرد: پێی شێت بوو، ئەوانەش وەکو سەر خۆش واجبە نوێژەکانی ماوەی بێهۆشیو شێتی قەزا بکەنەوە، بەڵام ئەگەر بە زۆرلێکردن شەڕابیان پێخواردەوە، یان نەیدەزانی شەڕابە، یان نەیدەزانی ئەو جۆرە خواردنەوەیە سەرخۆشی دەکا، یان لە بەر پێویستی دەرمانێکی بێهۆشیی بەکار هێنا: وەك (بَنْج)=بەنگی نەشتەرگەری، ئەوانە هیچیان قەزاکردنەوەی ماوەی بێهۆشیو سەرخۆشییان لە سەر واجب نیە، هەروەك لە (المجموع)و (نهایة)دا ڕوون کراوەتەوە.
ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا رَقَدَ أَحَدُكُمْ عَنِ الصَّلاةِ أَوْ غَفَلَ عَنْها فَلْيُصَلِّها إِذا ذَكَرَها﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك یەکێکتان خەوتبو، یان لە بیری چوو نوێژ بکا، هەر کاتێك هاتەوە بیری با نوێژەکە بکا. کەواتە: خەوتنو لە بیرچوون تەنها تاوانی دواخستن لادەبەن نەك تاوانی نوێژنەکردن، کەوابو: ئەگەر کاتی نوێژ هات، حەڕامە لە پێش نوێژکردندا بخەوێ، واتە: تاوانبار دەبێ، مەگەر قەناعەتی وابێ: بۆ نوێژکردن خەبەری دەبێتەوە، ئەو کاتە خەوتن ناپەسندە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا لە باسی نوێژی (عشاء)دا فەرموویانە، هەروەها دەفەرموون: سوننەتە لە کاتینوێژدا خەڵك بۆ نوێژکردن هەڵبستێندرێ، بە تایبەتی ئەگەر کاتەکە زۆر درەنگ بێ.

وَلَوْ زَالَتْ هذه الأَسْبَابُ وَبَقِيَ مِنَ الْوَقْتِ تَكْبِيرَةٌ وَجَبَتِ الصَّلَاةُ، وَفِي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ رَكْعَةٌ، وَالأَظْهَرُ وُجُوبُ الظُّهْرِ بِإِدْرَاكِ تَكْبِيرَةٍ آخِرَ الْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ آخِرَ الْعِشَاءِ، وَلَوْ بَلَغَ فِيهَا أَتَمَّهَا وَأَجْزَأَتْهُ عَلَى الصَّحِيحِ، أَوْ بَعْدَهَا فَلاَ إِعَادَةَ عَلَى الصَّحِيحِ،

---

(وَلَوْ زَالَتْ هذه الأَسْبَابُ) ئەگەر ئەو هۆیانەی نوێژنەکردن لاچون، واتە: کوفرو مندالّیو حەیزو شێتی لە کۆتاییینوێژدا لاچون (وَبَقِيَ مِنَ الْوَقْتِ تَكْبِيرَةٌ) لە کاتی نوێژەکە تەنها بە قەد ماوەی (اللهُ أكبَر)یینوێژدابەستن مابو (وَجَبَتِ الصَّلَاةُ) نوێژەکەی ئەو کاتە واجبە، چونکە گەیوەتە بەشێکی کاتینوێژەکە، واتە: ئەو نوێژەی دەکەوێتە ئەستۆو واجبە قەزای بکاتەوە (وَفِي قَوْلٍ يُشْتَرَطُ رَكْعَةٌ) لە فەرموودەیەکدا بە مەرج دادەنرێ: بە قەد ماوەی ڕەکعەتێك کاتی نوێژەکە مابێ.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەوەیە: (وُجُوبُ الظُّهْرِ) نوێژینیوەڕۆ واجب دەبێ (بِإِدْرَاكِ تَكْبِيرَةٍ) بە گەیشتنە ئەندازی ماوەی (اللهُ أكبَر)ێکی نوێژدابەستن (آخِرَ الْعَصْرِ) لە کۆتایی کاتیعەسردا، ئەگەر ئەو هۆیانە نەمابن (وَالْمَغْرِبِ) هەروەها نوێژیمەغریبیش واجب دەبێ بە گەیشتنە ئەندازەی ماوەی (اللهُ أكبَر)ێك (آخِرَ الْعِشَاءِ) لە کۆتایی کاتیعیشادا، ئەگەر ئەو هۆیانە نەمابن:

واتە: ئەگەر لە کۆتایی کاتیعەسردا، یان لە کۆتایی کاتیعیشادا بە قەد (اللهُ أكبَر)ێکی نوێژدابەستن مابو، کافر موسڵمان بوو، یان منداڵ بلۆغی بوو، یان شێتو بێهۆش چاك بونەوە، یان ئافرەت لە حەیز، یان لە زەیسانی پاك بۆوە، ئەوە نوێژی عەسرو نیوەڕۆی بە یەکەوە لە سەر واجب دەبێو واجبە: هەردووکیان قەزا بکاتەوە، هەروەها نوێژی عیشاو مەغریبیشی بە یەکەوە لە سەری واجب دەبێو واجبە: هەردووکیان قەزا بکاتەوە، چونکە هەر لایەنێك لەو دوو نوێژانە -لە حاڵەتی عوزریسەفەردا- بە یەکەوە کۆ دەکرێنەوە، کەواتە: لە حاڵەتیناچاریدا، لەپێشترن کە بە یەکەوە واجب ببن.

جا بزانە: ئەو بڕیارە تایبەت بە عەسرو بە عیشایە، واتە: ئەگەر لە کاتی نوێژی نیوەڕۆ، یان مەغریب، یان سبەینێدا ئەو هۆیانە نەمان، ئەوە تەنها نوێژی ئەو کاتە واجب دەبێو نوێژی پێشەوە واجب نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ بَلَغَ فيها) ئەگەر کوڕ، یان کچ لە ناو نوێژدا بلۆغی بوو، واتە: تەمەنی پانزە ساڵی تەواو کرد (أَتَمَّها) با نوێژەکە تەواو بکا (وَأَجْزَأَتْهُ) نوێژەکەشی دروستەو بە بەر واجب دەکەوێ (عَلَى الصَّحِيح) لە سەر فەرموودی ڕاست (أَوْبَعْدَها) یان لە پاش نوێژکردن بلۆغی بوو و کاتی نوێژەکەش مابو (فَلا إِعادَةَ) دووبارەکردنەوەی ئەو نوێژە واجب نیە، بەڵکو سوننەتە (عَلَى الصَّحِيح) لە سەر فەرموودەیڕاست.

وَلَوْ حَاضَتْ أَوْ جُنَّ أَوَّلَ الْوَقْتِ وَجَبَتْ تِلْكَ إِنْ أَدْرَكَ قَدْرَالْفَرْضِ، وَإِلاَّ فَلاَ.
(فَصْلٌ) اَلأَذانُ وَالإِقامَةُ سُنَّةٌ، وَقِيلَ فَرْضُ كِفَايَةٍ، وَإِنَّمَا يُشْرَعانِ لِمَكْتُوبَةٍ، وَيُقَالُ فِي الْعِيدِ وَنَحْوِهِ:

---

(وَلَوْ حاضَتْ) ئەگەر ئافرەت لە سەرەتای کاتی نوێژێکدا حەیز، یان زەیسانیی تووش بوو (أَوْ جُنَّ) یان مرۆڤ شێت بوو، یان بێهۆش بوو (أَوَّلَ الْوَقْتِ) لە سەرەتای کاتی نوێژدا (وَجَبَتْ تِلْكَ) نوێژی ئەو کاتەی لە سەر واجب دەبێ (إِنْ أَدْرَكَ قَدْر الْفَرْضِ) ئەگەر لە سەرەتای کاتەکەدا گەیشتبێتە ئەندازەی ئەو نوێژکردنە، کەواتە: هەر کاتێك لە حەیز، یان لە زەیسانی پاك بۆوە، یان لە شێتی، یان لە بێهۆشی چاك بۆوە، واجبە ئەو نوێژە قەزا بکاتەوە (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر لە سەرەتای نوێژەکە نەگەیشتە ئەندازەی ئەو نوێژکردنەو حەیز، یان زەیسانی تووش بوو، یان شێت بوو، یان بێهۆش بوو (فَلا) نوێژی ئەو کاتەی لە سەر واجب نیە قەزا بکاتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی بانگو ئیقامەت ﴾

بزانە: لە دوای دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە ساڵی یەکەمی کۆچیدا، یەکێك لە (صحابة)کان: کە ناوی (عبدالله بن زيدالانصاری) بوو، بانگو ئیقامەتی لە خەوندا دیتەنو پێغەمبەریشﷺ بریاری لە سەر دان، هەروەك (أبوداود) گێراویەتیەوەو لە (المجموع)شدا روون کراوەتەوە.

(اَلأذانُ) بانگدان بۆ پێنج فەرزەکان (وَالأقامَةُ) ئیقامەت کردن بۆ نوێژدابەستن (سُنَّةٌ) هەردووکیان سوننەتن، کەواتە: ئەگەر بانگیش نەدرێو ئیقامەتیش نەکرێ، نوێژەکەی هەر دروستە (وَقِيل) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (فَرْضُ كِفايَةٍ) بانگو ئیقامەت (فَرْضُ الْكِفايَة)نە، واتە: ئەگەر دانیشتووانی شوێنێك یەکدەنگ بون: کە بانگ نەدرێ، یان ئیقامەت نەکرێ، ئەوە جەنگیان لەگەڵ دەکرێ، چونکە بانگو ئیقامەت لە دروشمە ئاشکرایەکانی ئیسلامن.

کەوابو: بۆ بەجێهێنانی ئەو سوننەتە، یان ئەو (فَرْضُ الْكِفاية)یە پێویستە لە هەر دێیەکیبچووك بانگێك بدرێو لە هەر شارێکیگەورەش لە چەند شوێنێکدا بانگ بدرێ، تاکو گشت دانیشتووانی ئەو شوێنە گوێیان لێبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِنَّما يُشْرَعانِ لِلْمَكْتُوبَةِ) بانگو ئیقامەت –لە شەرعدا– تەنها بۆ پێنج نوێژە واجبەکان داندراون، واتە: بۆ نوێژە سوننەتەکانو بۆ نوێژی (جنازة)و بۆ نوێژی نەزر دانەندراون (وَيُقالُ فِي الْعِيدِ) لە جیاتی بانگو ئیقامەت بۆ نوێژیجەژن دەگوترێ: (وَنَحْوِهِ) هەروەها بۆ نوێژە سوننەتەکانیتریش کە بە جەماعەت دەکرێن–وەکو نوێژی ڕۆژگیرانو

اَلصَّلاَةَ جامِعَةً. وَالْجَدِيدُ نَدْبُهُ لِلْمُنْفَرِدِ، وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ إِلاَّ بِمَسْجِدٍ وَقَعَتْ فِيهِ جَمَاعَةٌ، وَيُقِيمُ لِلْفَائِتَةِ وَلاَ يُؤَذِّنُ فِي الْجَدِيدِ، قُلْتُ: اَلْقَدِيمُ أَظْهَرُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

مانگگیران‌و نوێژی باران‌و تەراویحی ڕەمەزان– بۆ گشتیان دەگوترێ: ﴿اَلصَّلاَةَ جامِعَةً﴾ رواه الشیخان فی صلاةالکسوف.

ئینجا بزانە: لە لای (ابن حجر) ئەو دوو وشەیە بە یەکەوە دوو جار دەگوترێن، جارێك لە جیاتی بانگ، جارێکیش لە جیاتی ئیقامەت، بەڵام لە لای (الرّملی) تەنها یەك جار لە جیاتی ئیقامەت دەگوترێن، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ (نَدْبُهُ لِلْمُنْفَرِدِ) بانگدان سوننەتە بۆ ئەو کەسەی بە تەنهایی نوێژ دەکا، جیاوازی نیە: لە چۆلی بێ، یان لە ئاوەدانی، هەر چەند گوێشی لە بانگێکیتر بوبێ (وَيَرْفَعُ صَوْتَهُ) دەنگیخۆی بەرز دەکاتەوە (إِلاَّ بِمَسْجِدٍ) تەنها لە مزگەوتێکی وەهادا نەبێ (وَقَعَتْ فِيهِ جَمَاعَةٌ) کە نوێژی بە جەماعەتی تێدا کرابێ، نەوەك خەڵکەکە وا تێبگا: کاتی نوێژێکیتر هاتوە، یان بکەونە گومان کە کاتی نوێژەکەیان ڕاست نەبوە ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بن عبدالرحمن: أَنَّ أباسعيدالخدریّ قَالَ لَهُ: إِذا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلاَةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّداءِ فَإِنَّهُ لايَسْمَعُ مَدَى صَوتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلا إِنْسٌ وَلاَشَيْءٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ، سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ﴾ رواه البخاری، هەر کاتێك لە ئاژەڵ لەوەڕاندن بووی، یان لە چۆلی بووی‌و بانگت دا، دەنگت بەرز بکەوە، چونکە هەر جنۆکەو هەر ئادەمیزادێك‌و هەر شتێك گوێی لە دەنگی بانگدەر بێ، لە ڕۆژی قیامەتدا شاهیدی بۆ دەدەن، ئەوەی پێم گوتی، گوێم لە پێغەمبەرﷺ بووە.

ئینجا بزانە: لە فەرموودەی کۆن‌و نوێدا: ئیقامەتکردنیش سوننەتە بۆ ئەو کەسەی بە تەنهایی نوێژ دەکا، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَيُقِيمُ) سوننەتە ئیقامەت بکا (لِلْفائِتَةِ) بۆ قەزاکردنەوەی هەر یەکێك لەو پێنج نوێژە واجبانە، جا بە تەنهایی بێ، یان بە جەماعەت (وَلا يُؤَذِّنُ) بەڵام بانگ نەدا (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە غەزای (خندق)دا سێ نوێژی قەزا کردنەوەو فەرمانی بە (بلال) کرد: ئیقامەتی کرد، بەڵام فەرمانی بانگدانی پێنەکرد، هەروەك لە باسی قەزا کردنەوەی نوێژدا ڕوون کراوە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلْقَدِيمُ) فەرموودەی کۆن: کە بانگدان بۆ نوێژ قەزاکردنەوەش سوننەتە (أَظْهَرُ) بەهێزترە لە فەرموودەی نوێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە لە غەزای (خَيْبَر)دا پێغەمبەرﷺ بۆ قەزا کردنەوەی نوێژی سبەینێ فەرمانی بە (بلال) کرد: بانگیدا، ئینجا ئیقامەتیشی کرد، هەروەك لە (بخاری‌ومسلم)دا گێڕدراوەتەوە، ئاشکراشە: غەزای (خَيْبَرْ) لە دوای (خندق)دا هاتوە.

فَإِنْ كانَ فَوائِتُ لَمْ يُؤَذِّنْ لِغَيْرِالْأُولَى، وَيَنْدَبُ لِجَمَاعَةِ النِّساءِ الإِقامَةُ لاَ الْأَذانُ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَالْأَذانُ مَثْنَى، وَالْإِقَامَةُ فُرَادَى إِلاَّ لَفْظَ الْإِقَامَةِ،

---

(فَإِنْ كانَتْ فَوائِتُ) جا ئەگەر نوێژە فەوتاوەكان زۆر بونو دەیویست بە دوای یەكتردا قەزایان بكاتەوە (لَمْ يُؤَذِّنْ لِغَيْرِالأُولَى) جگە لە نوێژییەكەم بۆ هیچیتریان بانگ نەدا، هەروەها لە (المجموع)دا دەفەرموێ: ئەگەر ویستی دوو نوێژ بە (جمع التقدیم)، یان بە (جمع التأخیر) بكا، ئەوە بۆ نوێژی یەكەم بانگو ئیقامەت سوننەتە، بەلام بۆ نوێژی دووەم تەنها ئیقامەت سوننەتە، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە (حجّةالوداع)دا وایكردوەو لە (صحیح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

(وَيُنْدَبُ) سوننەتە (لِجماعَةِالنِّساءِ) بۆ نوێژ بە جەماعەتكردنی ئافرەتان لە پشت ئیمامێكی ئافرەت (الإِقامَةُ) ئیقامەتكردن، واتە: سوننەتە ئافرەتێك ئیقامەت بكا، بەلام ئەگەر ئیمامی ئافرەتەكە ئافرەت نەبو، بەلكو پیاو، یان نەنێر نەمێ بوو، ئەو كاتە دروست نیە ئافرەت ئیقامەتی بۆ بكا، واتە: بە بەر ئیقامەتینوێژ ناكەوێ، هەروەك لە (نهایة)و (بجیرمی)دا فەرموویانە، كەواتە: ئەگەر ئیقامەتكەری پیاو نەبو، ئەو كاتە هەر ئیمامەكە بە خۆی ئیقامەت دەكا.

(لاالأَذانُ) بەلام بانگدان بۆ جەماعەتكردنی ئافرەتان سوننەت نیە (عَلىالْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراویمەزهەب، واتە: سوننەت نیە ئافرەت بۆ جەماعەتكردنی ئافرەتان بانگ بدا، بەلام بە دەنگینزم دروستەو دەبێتە زیكر، نەك بانگ، جا ئەگەر پیاوی بێگانە گوێی لە دەنگی دەبو، ئەو كاتە حەرامە بانگ بدا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە، هەروەها بانگدانی ئافرەت بۆ پیاو و بۆ نەنێر نەمێش دروست نیە، جیاوازی مەحرەمو نامەحرەمیش نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالأَذانُ) زۆربەی ووشەكانی بانگ (مَثْنَى) دوو دووە (وَالأَقامَةُ) زۆربەی ووشەكان ئیقامەتیش (فُرادَى) یەك یەكە (إِلاّ لَفْظَ الإِقامَةِ) تەنها ووشەی (قَدْ قامَتِ الصَّلاةُ) نەبێ، ئەو دوو دووە ﴿عن أنسﷺ: أُمِرَ بلالٌﷺ أَنْ يَشْفَعَ الأَذانَ ويُوتِرَالإِقامَةَ إلاّالإِقامَةَ﴾ رواه الشیخان، لە لایەن پێغەمبەرﷺ فەرمان بە (بلال الحبشی) كرا: ووشەكانی بانگ بە جووت بلێو ووشەكانی ئیقامەتیش بە تاك بلێ، تەنها ووشەی (قَدْ قامَتِ الصَّلاةُ) نەبێ، ئەو دوو جارە.

كەوابو: بانگ بەم جۆرەیە: ﴿اَللهُ أَكْبَر اَللهُ أَكْبَر، اَللهُ أَكْبَر اَللهُ أَكْبَر، أَشْهَدُ أَن لاّإِلَـهَ إِلاّاللهُ أَشْهَدُ أَن لاّإِلَهَ إِلاّاللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسولُ اللهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسولُ اللهِ، حَيَّ عَلَىالصَّلاة حَيَّ عَلَىالصَّلاة، حَيَّ عَلَىالْفَلاح حَيَّ عَلَىالْفَلاح، اَللهُ أَكبَر اَللهُ أَكْبَر، لاإِلَـهَ إِلاّاللهُ﴾ رواه ابوداود والنسائی بسند صحیح.

وَيُسَنُّ إِدْرَاجُهَا وَتَرْتِيلُهُ وَالتَّرْجِيعُ فِيهِ وَالتَّثْوِيبُ فِى الصُّبْحِ وَأَنْ يُؤَذِّنَ قَائِماً لِلْقِبْلَةِ، وَيَجِبُ تَرْتِيبُهُ وَمُوَالاَتُهُ، وَفِى قَوْلٍ لاَ يَضُرُّ كَلاَمٌ وَسُكُوتٌ طَوِيلاَنِ،

---

ئیقامەتیش بەم جۆرەیە: ﴿اَللهُ أَكبَر اَللهُ أَكبَر، أَشْهَدُ أَن لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَّسولُ اللهِ، حَيَّ عَلَىالصَّلاة، حَيَّ عَلَىالْفَلاح، قَدْ قامَتِ الصَّلاة قَدْ قامَتِ الصَّلاة، اَللهُ أَكبَر اَللهُ أَكبَر، لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ﴾ رواه ابوداود بسند صحيح.

(وَيُسَنُّ إِدْراجُها) سوننەتە بە بێوەستان ئیقامەت بکا (وَتَرْتِيلُهُ) سوننەتە بە درێژکردنەوەو پەلە نەکردن بانگ بدا (وَالتَّرجِيعُ فِيهِ) هەروەها (تَرْجِيع) واتە: گەڕاندنەوەی شادە لە بانگدا سوننەتە، بەم جۆرە: دوو جار هەردوو ووشەی شادە بە دەنگی نزم بڵێ، ئینجا دووبارە بە دەنگی بەرزیش بیانڵێ، چونکە لە (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

جا ئەگەر (ترجيع)ی نەکرد، بانگەکە دروستە، بەڵام خێرە گەورەکەی لە دەست دەچێ هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالتَّثْوِيبُ) هەروەها (تَثْوِيب) واتە: دووبارەکردنەوەیبانگەواز سوننەتە: بەم ڕستەیە: (اَلصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) دوو جار (فِىالصُّبْحِ) لە بانگی یەکەمو دووەمی سبەینێدا، لە دوای (حَيَّ عَلَىالْفَلاح)ی دووەمدا ﴿عن أنس ﷺ مِنَ السُّنَّة: إذا قالَ الْمُؤَذِّنُ فِي أَذانِ الْفَجْرِ: حَيَّ عَلَىالْفَلاح. قال: اَلصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ﴾ رواه ابن خزيمة بسند صحيح، وابوداود عن ابىمحذورة باسناد جيد، واتەی دیارە.

جا ئەگەر (تَثْوِيب)ی نەکرد، بانگەکەی دروستە، بەڵام خێرە گەورەکەی لە دەست دەچێ، هەروەها ناپەسندە لە بانگەکانیتردا (تَثْوِيب) بکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَأَنْ يُؤَذِّنَ قائِماً) سوننەتە بە پێوە بانگ بداو ئیقامەت بکا (لِلْقِبْلَةِ) ڕووی لە قیبلە بێو لە سەر شوێنێکیبەرز بێ لە هەردوو (حَيَّ عَلَىالصَّلاة)دا بە لای ڕاستەیدا ئاوڕ بداتەوەو لە هەردوو (حَيَّ عَلَىالْفَلاح)دا بە لای چەپەیدا ئاوڕ بداتەوەو لە هەموو بانگدا هەردوو سەرە پەنجەیشادەی لە ناو کونیگوێیەکانیدابنێ، ئەوانە گشتی لە حەدیسی (صحيح)دا بەڵگەی لە سەرەو لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراونەتەوە.

(وَيَجِبُ تَرْتِيبُهُ) واجبە بانگو ئیقامەت بەو ڕیزە بگوترێن کە لە حەدیسەکاندا هاتون (وَمُوالاتُهُ) واجبە ووشەکانیبانگو ئیقامەت بە دوای یەکدا بنو ماوەیەکیدرێژ نەکەوێتە نێوان ووشەکان.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (لا يَضُرُّ كَلامٌ وَسُكوتٌ طَوِيلانِ) زیانی نیە: قسە کردنو بێدەنگبوون هەرچەند هەردووکیش درێژ بن، ئینجا بزانە: ئەگەر لە ناو بانگدا، یان لە ناو ئیقامەتدا پژمی، سوننەتە لە دڵدا بڵێ: (الحمد لله).

**وَشَرْطُ الْمُؤَذِّن: اَلإِسْلاَمُ وَالتَّمْيِيزُ وَالذُّكُورَةُ. وَيُكْرَهُ لِلْمُحْـدِث، وَلِلْجُنُـب أَشَـدُّ، وَالإِقَامَةُ أَغْلَظُ، وَيُسَنُّ صَيِّتٌ حَسَنُ الصَّوْتِ عَدْلٌ، وَالإِمَامَةُ أَفْضَلُ مِنْـهُ فِي الأَصَـحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ أَنَّهُ أَفْضَلُ مِنهَا وَاللهُ أَعْلَمُ.**

---

هەروەها ئەگەر کوێرێك، یان منداڵێکی دیت خەریك بوو بکەوێتە بیرێك، یان لە بانێك بکەوێ، واجبە ئاگاداری بکاتەوە، واتە: ئینجا هەر بە خۆی بانگ، یان ئیقامەتەکەی تەواو دەکا، بەڵام دروست نیە یەکێکیتر بۆی تەواو بکا، واتە: ئەگەر بەشێکی بانگ، یان ئیقامەتی گوت، ئینجا وازی لێهێنا، یان مرد، یان بێهۆش بوو، دروست نیە یەکێکیتر ئەو بانگو ئیقامەتەیەی تەواو بکا، بەڵکو لە سەرەتاوە دەست بە بانگو ئیقامەت دەکاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراوەتەوە.

(وَشَـرْطُ الْمُـؤَذِّنِ) مەرجەکانی بانگدەرو ئیقامەتکەر: یەکەم: (اَلأسْلاَمُ) ئیسلامەتیيە. دووەم: (وَالتَّمْيِيزُ) فاماندنە، کەوابو: بانگو ئیقامەتی کافرو سەرخۆشو منداڵینەفام دروست نیە، بەڵام بانگو ئیقامەتی منداڵیفامیدە دروستە، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموويانە. سێيەم مەرجی بانگدەر: (وَالذُّكُورَةُ) نێرایتیيە، چونکە بانگدانی ئافرەت بۆ پیاو و بۆ نەنێر نەمێ دروست نیە، هەرچەند مەحرەمیش بن -واتە: بە بەر بانگی نوێژ ناکەوێ- بەڵام بانگدانی ئافرەت بۆ ئافرەتان دروستەو سوننەت نیە، هەروەك لەمەوبەر بە درێژی هەردوو مەسەلەمان ڕوون کردنەوە.

(وَيُكْرَهُ) ئیقامەتو بانگدان ناپەسندن (لِلْمُحْدِثِ) بۆ پیاوی بێدەستنوێژ (وَلِلْجُنُبِ أَشَدُّ) بۆ جەنابەتدار ناپەسندیەکە بەهێزترە، بەڵام دروستیشن (وَالأقَامَـةُ) ئیقامەتکردنی بێدەستنوێژو جەنابەتدار (أَغْلَظُ) ناپەسندیەکەی گەورەترە لە ناپەسندیی بانگدانەکەیان (وَيُسَنُّ صَيِّتٌ) سوننەتە بۆ بانگدان: پیاوێکی دەنگ بەرز بێ (حَسَنُ الصَّوْتِ) دەنگی خۆش بێ (عَدْلٌ) دادپەروەر بێ.

(وَالأمامَةُ) ئیمامەتی نوێژیجەماعەت (أَفْضَلُ مِنْهُ فِي الأَصَحِّ) خێری گەورەترە: لە بانگدان (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (اَلأَصَحّ أَنَّـهُ أَفْضَـلُ مِنْـها) بە فەرموودەی ڕاستتر بانگدان خێری گەورەترە لە ئیمامەتی نوێژ (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللهِ وَعَمِلَ صالِحاً﴾ کێ گوفتاری جوانترە لەو کەسەی بانگەواز بۆ خواپەرستی دەکاو کردەوەی چاکیش دەکا؟. حەزرەتی (عائشە) دەفەرموێ: مەبەست بانگدەرەکانن. هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەموويانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر پیاو بۆی بگونجێ بانگ بداو ئیمامەتیش بکا، ئەوە سوننەتە هەردووکیان بکا، هەروەها سوننەتە: بانگدەر ئیقامەتینوێژ بکا، کەواتە: ئەگەر یەکێك

وَشَرْطُهُ اَلْوَقْتُ إلاَّالصُّبْحَ فَمِنْ نِصْفِ اللَّيْلِ، وَيُسَنُّ مُؤَذِّنَانِ لِلْمَسْجِدِ يُؤَذِّنُ وَاحِدٌ قَبْلَ الْفَجْرِ وَآخَرُ بَعْدَهُ، وَيُسَنُّ لِسَامِعِهِ مِثْلُ قَوْلِهِ إلاَّ فِي حَيَّعَلَتَيْهِ فَيَقُولُ: لاَحَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إلاَّ بِاللهِ. قُلْتُ: وَإِلاَّ فِي التَّثْوِيبِ فَيَقُولُ: صَدَقْتَ وَبَرِرْتَ. وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

بانگیدا، یەکێکی تریش ئیقامەتی کرد، ئەوەش دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی بانگ (اَلْوَقْتُ) دەبێ کاتی نوێژەکە هاتبێ، واتە: بانگدان لە پێش هاتنی کاتی‌نوێژدا حەرامە (إلاّالصُّبْحَ) تەنها بانگی سبەینێ نەبێ (فَمِنْ نِصْفِ اللَّيْلِ) ئەو لە نیوەی‌شەوی‌ەوە دروستە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّ بِلالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتّى يُنادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ﴾ رواه الشيخان، (بلال الحبشي) لە پێش بەیاندا بە شەوێ بانگ دەدا، ئێوە لە پاشیودا بخۆن‌و بخۆنەوە تا (عبدالله ابن أُم مكتوم) بانگ دەدا.

(وَيُسَنُّ) هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: سوننەتە (مُؤَذِّنانِ لِلْمَسْجِدِ) مزگەوت دوو بانگدەری هەبن: (يُؤَذِّنُ واحِدٌ قَبْلَ الْفَجْرِ) یەکێکیان لە پێش بەیاندا بە شەوێ بانگ بدا (وَآخَرُ بَعْدَهُ) ئەوی‌تریشیان لە پاش دەرکەوتنی‌بەیان بانگ بدا، هەروەك (بلال)و (عبدالله) وایان دەکرد.

## ﴿ وەڵامی بانگ‌و ئیقامەت ﴾

(وَيُسَنُّ لِسامِعِهِ) سوننەتە بۆ ئەو کەسەی گوێی لە بانگدەرو لە ئیقامەتکەرە: وەڵامی بانگ‌و ئیقامەت بداتەوە، واتە: (مِثْلُ قَوْلِهِ) گشت ووشەیەك لە دوای ئەودا وەکو وی بڵێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا سَمِعْتُمُ النِّداءَ فَقُولُوا مِثْلَ مايَقُولُ الْمُؤَذِّنُ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك گوێتان لە بانگ بوو، ئێوەش وەکو بانگدەر بڵێن.

(إلاّ فِي حَيَّعَلَتَيْهِ) تەنها لە هەردوو (حَيَّ عَلَى‌الصَّلاةِ)و (حَيَّ عَلَى‌الْفَلاحِ)دا نەبێ (فَيَقُولُ) لە وەڵامی ئەو دووانەدا دەڵێ: (لاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إلاّ بِاللهِ) رواه مسلم. (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَإلاّ فِي التَّثْوِيبِ) تەنها لە (تثويب)ی بانگی سبەینێش نەبێ (فَيَقُولُ) لەوەڵامی (اَلصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّومِ)دا دەڵێ: (صَدَقْتَ وَبَرِرْتَ)، چونکە ئەمەیان لەو شوێنە دەوەشێتەوە (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: ئەگەر گوێی لە دوو بانگ، یان زیاتر بوو، ئەوە وەڵامی گشتیان سوننەتە، بەڵام وەڵامی یەکەمیان خێری زیاترە، هەروەها ئەگەر خەریکی قورئانخوێندن، یان دەرس، یان زیکرکردن بوو، سوننەتە: واز بێنێ‌و وەڵامی بانگ بداتەوە، بەڵام ئەگەر لە نوێژدا بوو، یان لە ئاودەستخانەدا بوو، یان خەریکی جیماع بوو، ئەوە لە دوای تەواوکردنی ئەوانە، وەڵامی بانگ دەداتەوە، هەروەها لە ئیقامەتیش لە وەڵامی (قَدْ قامَتِ الصَّلاةُ) بڵێ: (أقامَها اللهُ وأدامَها). چونکە حەدیسێکی بێ‌هێزی دەرهەق هاتوە، هەروەك

له سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا کە ئیقامەت کۆتایی هات، ئەو کاتە بۆ نوێژدابەستن هەڵدەستن، هەروەك لە باسی جەماعەتدا فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر لە ڕۆژی هەینی لە کاتی بانگی بەردەستی ووتارخوێندا چووە ناو مزگەوت، ئەوە بە پێوە وەڵامی بانگ دەداتەوە، ئینجا بە سووکی سوونەتی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) دەکا، هەروەك لە (ابن قاسم)دا فەرموویەتی، واتە: سوونەتە وەڵامی بانگ بداتەوە، ئینجا نوێژ دابیەستێ،، بەڵام ئەگەر نوێژ بکا، ئینجا وەڵامی بانگ بداتەوە، ئەوەش لە سوونەت دوور نیە، هەروەك (الشبراملسی) فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: هەرکاتێك ئیقامەت دەستی پێ‌کرا، ناپەسندە خۆی بە نوێژی سوونەت خەریك بکا، جیاوازی هیچ جۆرە سوونەتێکش نیە، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم حەدسە هێناوەتەوە، کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا أُقيمَتِ الصَّلاةُ فَلا صَلاةَ إِلاّالْمَكْتُوبَةُ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك ئیقامەتی نوێژ کرا، جگە لە نوێژیواجب هیچ نوێژێکیتر نیە.

## ﴿باسی سەلاوات و دوعای دوای بانگ و ئیقامەت﴾

(وَلِكُلٍّ) سوونەتە بۆ گشتیان، واتە: بۆ بانگدەرو ئیقامەتکەرو بۆ ئەو کەسەش کە گوێی لە بانگدەرو ئیقامەتکەرە (أَنْ يُصَلِّيَ) سەلاوات لێبدا بە سەلامەوە (عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) لە سەر پێغەمبەرﷺ (بَعْدَ فَراغِه) پاش تەواوبوونی بانگ، یان ئیقامەت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مايَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِها عَشْراً، ثُمَّ سَلُوااللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّها مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاتَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبادِاللهِ تَعالى وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفاعَةُ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، هەر کاتێك گوێتان لە بانگدەر بوو، ئێوەش وەکو وی بڵێن (واتە: وەڵامی بانگ بدەنەوە)، ئینجا سەلاوات لە سەر من لێبدەن، چونکە هەر کەسێك سەلاواتێکم لە سەر لێبدا، خوایگەورە بەو سەلاواتە دە ڕەحمەتی بۆ سەر دەنێرێ، ئینجا لە دوای سەلاواتیش دوعای وەسیلەم بۆ بکەن، چونکە وەسیلە پلەیەکە لە بەهەشتدا تەنها بۆ یەك بەندەیخوا دەبێ، منیش تکام وایە من ئەو بەندەیە بم کە ئەو پلەیەی دەدرێتێ، جا هەر کەسێك دوعای وەسیلەم بۆ بکا، شەفاعەتی منی دەگاتێ لە ڕۆژی قیامەت.

کەوابو: بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: سەلاواتێك لە دوای بانگ سوونەتە، جا بە دەنگی نزم بێ، یان بە دەنگی بەرز، چونکە لە حەدیسەکەدا چۆنیەتی سەلاواتەکە دیاری نەکراوە، جا چۆنیەتی ئەو سەلاواتەی ئێستا -لە دوایبانگ- بانگدەر دەیڵێ، ئەوە (صلاح الدين الأيوبي) فەرمانی پێ‌کردوە، لەبارەی ئەو چۆنیەتیە چەند زانایەکیئیسلام فتوایان داوە:

ثُمَّ اَللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِى وَعَدْتَهُ.

---

(بنچینەی سەلاواتەکە سوننەتەو چۆنیەتی‌ی (بِدْعَة)یە). واتە: (بِدْعَةحَسَنَة)یە؟ چونکە (ابن حجرالهیتمي) دەفەرموێ: (کارێکی‌باشی کردوە، خوا پاداشتی‌چاکەی بداتەوە). هەروەك لە (الفتاوی‌الکبری)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای سەلاوات لێدان، بەم ووشانە دوعای(اَلْوَسیلَة) بۆ پێغەمبەرﷺ دەکا: ﴿اَللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوَةِالتَّامَّةِ وَالصَّلاَةِالْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّداً الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَّحْمُوداً الَّذِى وَعَدْتَهُ﴾ رواه البخاری واصحاب السنن.

ئینجا بزانە: بەڵگەی سەلاواتو دوعای (الوسیلة) لە دوای ئیقامەتیش ئەمەیە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿بَيْنَ كُلِّ أَذانَيْنِ صَلاةٌ﴾ رواه الشیخان، لە نێوان گشت بانگو ئیقامەتێکدا نوێژێکی سوننەت هەیە. واتە: چونکە پێغەمبەرﷺ لێرەدا ئیقامەتیشی بە بانگ داناوە، حەدیسەکانی دوای‌بانگ ئیقامەتیش دەگرنەوە.

جگە لەوەش: ئیمامی(النواوی) لە (الاذکار)دا دەربارەی سەلاواتو دوعای(اَلْوَسیلَة) لە دوای ئیقامەت، ئەم فەرموودەیەی هێناوە: ﴿عَنْ أَبِي‌هريرةؓ: أَنَّهُ كانَ إِذا سَمِعَ الْمُؤَذِّنَ يُقيمُ الصَّلاَةَ يَقُولُ: (اَللّهُمَّ رَبَّ هَذهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِالْقائِمَةِ صَلِّ عَلى‌مُحَمَّدٍ وَآتِهِ سُؤْلَهُ يَوْمَ الْقِيامَةِ)﴾ رواه ابن السنی، واتە: کە (ابوهریرة) گوێی لێدەبو: بانگدەر ئیقامەتی دەکرد، ئەویش بەو ووشانەی‌ڕابردوو سەلاواتی لێدەداو دوعای وەسیلەی بۆ پێغەمبەرﷺ دەکرد.

ئینجا بزانە: لە دوای ئیقامەتیش هەر دوعایەکەی حەدیسی‌ڕابردوو خێرترە، چونکە ووشەکانی هی پێغەمبەرەﷺ بەڵام ووشەکانی ئێرە هی(ابی‌هریرة)یەؓ.

دیسان بزانە: لە لای ئیمامی(النواوی) سوننەتە: لە پێش ئیقامەتیش سەلاوات لێبدرێ، هەروەك (فتح المعین)و (بغیةالمسترشدین) گێڕاویەتیانەوە.

﴿پاشکۆ﴾ یەکەم: هەر کاتێك بانگ درا، ناپەسندە: بانگدەرو خەڵکی‌تریش لە مزگەوت -واتە: لە شوێنی‌جەماعەت- دەرچن تا نوێژ دەکەن، مەگەر عوزرێکیان هەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن أبي‌الشعثاء: كُنَّا مَعَ أَبِي‌هريرةؓ فِي‌الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ رَجُلٌ حِينَ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ، فَقَال أبوهريرة: أَمَّا هَذا فَقَدْ عَصَى أَبَاالْقاسِمِﷺ﴾ رواه مسلم، ئێمە لە گەڵ (أبی‌هریرة) لە مزگەوتدا بوین، لەو کاتەی بانگدەر بانگی‌دا پیاوێك لە مزگەوت چووە دەرەوە، جا (ابوهریرة) فەرمووی: ئەم پیاوە بەرامبەر پێغەمبەرﷺ تاوانی کرد. واتە: چونکە لە پێش نوێژکردندا چووە دەرەوە.

**دووەم:** سوننەتە: لە دوای بانگ -جگە لە سەلاوات و دوعایەکەی ڕابردوو- بڵێ: ﴿أَشْهَدُ أَن لآإِلَهَ إلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ باللهِ رَبّاً وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبالإِسْلامِ دِيناً﴾ رواه مسلم. هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لايُرَدُّالدُّعاءُ بَيْنَ الأذانِ وَالأقامَةِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، دوعا ناگەڕێندرێتەوە-واتە: قبوڵ دەبێ- لە نێوان بانگ و ئیقامەتدا.

جا پێغەمبەرﷺ ئەم دوعایەی بۆ دوای بانگ بە گرنگتر داناوە: ﴿اَللّهُمَّ إنِّي أسألُكَ الْعافِيَةَ فِي الدُّنيا وَالآخِرَةِ﴾ رواه الترمذی بسند حسن، خوایە: تکای بێبەڵاییت لێدەکەم لە دنیاو لە قیامەتدا.

**سێیەم:** سوننەتە لە دوای بانگدان-جگە لە مەغریب- ئەوەندە ماوە بدرێ: تا خەڵك بۆ جەماعەت کۆ دەبێتەوەو سوننەتەکانی پێش نوێژەکەش دەکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا لە (الشروانی)دا لایکەمی ئەندازەی ئەو ماوەیەی بە چوارێکە سەعاتێك داناوە.

کەوابو: هەر کاتێك ئەندازەی چوارێکە سەعاتێك لە سەرەتای کاتی نوێژەکە ڕۆیشت، ئیمام نوێژی جەماعەت لە گەڵ ئەوەندە کەسانەدا دەکا: کە ئامادە بونە، هەرچەند کەمیش بن، واتە: ناپەسندە چاوەڕوانی کەسێکیتر بکا، هەر چەند ڕێزداریش بێ، چونکە لە فەرموودەیبەهێزتردا: جەماعەتیکەم لە سەرەتایکاتدا خێری گەورەترە لە جەماعەتیزۆر لە کۆتاییکاتدا، هەروەك (تحفة) لە باسی کاتەکانی نوێژدا ڕوونی کردۆتەوەو بەڵگەشی بەم دوو حەدیسانە هێناوەتەوە:

١-﴿پێغەمبەرﷺ جارێك لە جەماعەتیعەسر-بە هۆی کێشەی نێوان (بنیعمرو)- لە عادەتیخۆی دوا کەوت و ئیمامی(ابوبکر)ﷺ پێشنوێژی بۆ (صحابة)کان کرد، پێغەمبەریشﷺ گەیشتە نوێژەکەو نوێژی لە پشت دابەست و بەوکارەش ڕازی بوو﴾، هەروەك لە (بخاریو مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

٢-﴿لە غەزای(تبوك)دا پێغەمبەرﷺ لە نوێژی سبەینێ دوا کەوت و حەزرەتی (عبدالرحمن بن عوف) پێشنوێژی بۆ (صحابة)کان کرد، پێغەمبەریشﷺ لە ڕەکعەتی دووەمدا گەیشتە نوێژەکەو نوێژی لە پشت دابەست و بەو کارەش ڕازی بوو﴾، هەروەك (مسلم و ابن سعد) گێڕاویەتیانەوە.

..........................................................................................

کەواتە: بە بەڵگەی ئەو دوو حەدیسەش-جگە لە مەغریب- تا ماوەی چوارێکە سەعاتێك چاوەڕوانی ئیمامی مزگەوت دەکرێ، جا ئەگەر لە دوای چوارێکە سەعاتێك ئامادە نەبو، یەکێك پێشنوێژی بۆ خەڵکەکە دەکا، تاکو خێری سەرەتای کاتیان لە دەست نەچێ، وَاللهُ أعْلَم.

**چوارەم**: هەر کاتێك ویستی نوێژ بکا، سوننەتە لە پێش ئیقامەتدا ئەم زیکرانە بکا: کە لەم حەدیسەدا هاتون‌و ئیمامی(النواوی) لە (الاذکار)دا هێناویەتی: ﴿عن أمّ رافعٍ ﷺ أنَّها قالَتْ: يارَسُولَ الله دُلَّني عَلى عَمَلٍ يَأجُرُني الله عَزَّوَجلّ عَلَيْه؟ قالَ ﷺ: يا أُمّ رافع إذا قُمْتِ إلى الصَّلاة فَسَبِّحي الله تعالى عَشْراً، وَهَلِّليه عَشْراً، وَاحْمَديه عَشْراً، وَكَبِّريه عَشْراً، وَاسْتَغْفِريه عَشْراً...﴾ رواه ابن السني، ئەی پێغەمبەری‌خوا لە کردەوەیەك شارەزام بکە: کە خوای‌گەورە پاداشتم لە سەر بداتێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (دایکی‌ڕافیع)، هەر کاتێك ویستت هەڵبستی نوێژ بکەی، دە جار بڵێ: (سُبحانَ الله)، دە جار بڵێ: (لاإلهَ إلاالله)، دە جار بڵێ: (ألْحَمْدُ لله)، دە جار بڵێ: (اللهُ أكبر)، دە جار بڵێ: (أسْتَغْفِرُالله) .

**پێنجەم**: کە منداڵ لە دایك بوو، سوننەتە لە گوێی ڕاستەی‌دا بانگ بدرێ‌و لە گوێی چەپەی‌دا ئیقامەت بکرێ، هەروەك لە باسی (عَقيقة)دا بەڵگەی بۆ دێنین، ان شاء الله تعالى.

هەروەها بانگدان سوننەتە: لە گوێی ووڵاغی شەموسداو لە گوێی مرۆڤی بەد ڕەفتارو غەمبارو لە هۆشچوودا، هەروەها بانگدان سوننەتە لە کاتی تێکرژانی سوپای‌ئیسلام‌و سوپای‌کافرەکان‌و لە کاتی ئاگر تێبەربوون‌و لە کاتی‌ترسان لە جنۆکەو شەیتان‌و لە کاتی خۆنیشاندانی جنۆکەو شەیتان لە وێنەی شتی‌تردا، هەروەك لە (الاذکار)و (تحفة)دا فەرموویانە، بەڵگەی گشتیان ئەم حەدیسەیە:

﴿عن سُهَيل: أرْسَلَني أبي إلى بَني‌حَارِثةَ وَمَعي غُلامٌ لَنا، فَناداهُ مُناد منْ حائط باسْمه فأشْرَفَ عَلى‌الحائط فَلَمْ يَرَ شَيْئاً، فَذَكَرْتُ ذلكَ لأبي، فَقالَ: لَوْ شَعَرْتُ أنَّكَ تَلْقى هذا لَمْ أرْسِلْكَ وَلكنْ إذا سَمعْتَ صَوْتاً فَناد بالصَّلاة فَإنّي سَمعْتُ أباهُرَيْرة ﷺ يُحَدِّثُ عَنْ رسُول الله ﷺ أنّه قال: إنَّ الشَّيْطانَ إذا نُودِيَ بالصَّلاةِ وَلّى وَلَهُ حُصاصٌ﴾ رواه مسلم، باوکم منی ناردە لای ماڵەکانی (بنی‌حارثة)و خزمەتکارێکی‌خۆمان لە گەڵمدا بوو، لە باغێکەوە یەکێك بە ناوی خۆی بانگی کرد، کە تەماشای کرد: کەس دیار نەبو، منیش ئەو ڕووداوەم بۆ باوکم گێڕایەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر هەستم دەکرد تووشی ئەو ڕووداوە دەبوی نەمدەناردی، بەڵام هەر کاتێك گوێت لە دەنگێك بوو، بانگی نوێژ بدە، (ابوهريرة) فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێك شەیتان گوێی لە دەنگی بانگ بوو، پشت دەداو ڕادەکاو تڕی لێبەر دەبێ. واتە: ئەو ڕووداوەی ڕابردوو لە شەیتانەوە بوو.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى ڕوو لەقیبلەکردن له نوێژدا ﴾

(اسْتِقْبالُ الْقِبْلَةِ) ڕوو لەقیبلەکردن له نوێژدا (شَرْطٌ) مەرجە (لِصَلَاةِالْقادِرِ) بۆ دروستبوونی نوێژی ئەو کەسەی توانای هەبێ، خوایگەورە دەفـەرموێ: ﴿فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ وَحَيْثُماكُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَـطْرَهُ﴾ ڕووی خـۆت وەرگێـڕە لای(الْمَسْجِدِالْحَرام)، واتە: (كَعْبَة)ی ماڵیخوا له (مَكَّة)ی پیرۆز، جا لـە هـەر شـوێنێك بـون-ئـەی موسـڵمانان- ئێوەش له نوێژدا ڕوو بکەنە لای(كَعبة): کە قیبلەی موسڵمانانە.

جا بزانە: مەبەسـت بـە ڕوو لەقیبلـەکردن ئەوەیـە: لای پێشـەوەی هـەموو لاشـەی بـەرەو قیبلە بێ، هەر له زەمینیحەفتەمەوە تا ئاسمانیحەفتەم له هەر شوێنێك بێ، هەروەك له (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

هەروەها بزانە: ماوەی شانزە مانگ پێغەمبـەروﷺ موسـڵمانان لـە (مَدينـة) بـەرەو (بَيْـت الْمُقَدَّس)-کە له (فَلَسْطِين)ە- نوێژیان دەکرد، ئینجا لـە پـانزەی مـانگی(شـعبان) سـاڵی دووی کۆچـی لـە نـاو نوێـژینیوەڕۆدا لـە مزگـەوتی(بَنيسَلَمَة)دا ئـەو ئایەتـەیڕابردوو بـۆ پێغەمبەرﷺ هاتە خوارەوە، لەو کاتدا دوو ڕەکعەت نوێژی نیوەڕۆی به جەماعەت کردبو، ئینجا هەر له ناو نوێژەکەدا پێغەمبـەروﷺ (صحابة)کـان خۆیـان سـوڕاندە لای (كعبـة)ی ماڵیخوا-کە له (مكة)ی پیرۆزە- بۆیێ مزگەوتەکەش بە (مَسْجِدِالْقِبْلَتَيْن) نـاو دەبـرێ، هەروەك له کتێبەکانی (تفسیر)و (سیرة)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر توانای ڕوو لەقیبلەکردنی نەبو؟ چونکە نەخۆش بوو و کەسی دەست نەکەوت ڕووی له قیبله بکا، یان بەسترا بۆوە، یان نەدەوێرا له وولاغ-یان له ئۆتومبیل- دابـەزێ، یان دەترسا گیان، یان ماڵی له دەست بچێ، لەو حاڵەتانەدا هەر چۆنێك بگونجێ واجبـە: نوێژەکە بکاو دووبارەشی بکاتەوە، جا ئەگەر بە دانیشتوویی دەگونجا ڕوو له قیبلـە بکـا بەڵام به پێوە نـەدەگونجا، ئـەو کاتـە واجبـە: بـە دانیشـتوویی ڕوو لـە قیبلـە نوێـژ بکـا، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، واتە: دووبارەکردنەوەی نوێژەکەشی له سەر نیە، هەروەك (الشبراملسي) فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئەو کەسـەی لـە سـەر زەمـین نوێـژی واجب، یـان سـوننەت دەکـا بـە قەسدی سینگی خـۆی لـە قیبلـە وەرگێـڕا، یـان بـە قەسـدی پشـتی لـە قیبلـە کـرد، یـان کەسـێکیتر بـە زۆرداری لـە قیبلـە لایدا، ئـەوە نوێژەکـەی بـەتاڵ دەبـێ، هـەروەك لـە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە، جا بزانە: لادانـی سـوار ووڵاغ و سـوار کەشـتی لـە شوێنیخۆیاندا باس دەکەین، ان شاء الله تعالى.

إلاّ في شدّةالْخوْف ونَفلِ السَّفر: فللْمُسافِرِ التّنفُّلُ راكباً وماشياً، ولاَ يُشترَطُ طُولُ سَفرِهِ عَلىالْمَشهُورِ، فإنْ أمْكنَ اسْتقْبالُ الرَّاكِبِ فِي مَرْقَدٍ وإتْمامُ رُكوعه وسُجُوده لَزِمَهُ،

(إلاّ) تەنها لە دوو حاڵەتدا ڕوو لەقیبلەکردن مەرج نیە، یەکەم: (فِی شِدَّةِ الْخَوْفِ) لەو کاتەدا: کە ترس زۆر بەهێزە، وەك لە جەنگدا لەشکرەکان تێکەڵ بوبن، یان تووشی هەڵاتنێکی حەڵاڵ بوبێ: وەك لە ترسی ئاگر، یان لافاو، یان دڕەندەیەك، یان ستەمکارێك ڕا بکا، ئەوە لە کاتی ڕاکردندا نوێژە واجبەکان دەکاو ئەگەر نەیتوانی سوجدەو ڕوکووع ببا، ئاماژەیان بۆ دەکا، بەڵام سوجدەی لە ڕوکووع نزمتر بێ، لەو مەسەلانەشدا دووبارە کردنەوەی نوێژی لە سەر نیە، هەروەك لە (تحفة) لە نوێژیترسدا فەرموویەتی، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿(فَإِنْ خِفتُمْ فَرِجالاً أوْ رُكْباناً) قال ابْن عمررَضِیَاللهُ عَنهُما فِي تَفْسِيرها: (مُسْتَقبِلِيالْقِبلَةِ وَغَيْرَمُسْتَقْبِلِيها)﴾ رواه البخاری، ئەگەر لە شتێك ترسانو هەڵاتن، نوێژەکەتان بکەن: بە پیادەیی، یان بە سواری: جا ڕووتان لە قیبلە بێ، یان نا.

بەڵام ئەگەر هەڵاتنەکە حەڵاڵ نەبو، ئەو جۆرە نوێژەی بۆ دروست نیە، هەروەك لە نوێژی ترسدا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالى.

دووەم: (وَنَفْلِ السَّفَرِ) لە نوێژە سوننەتەکانی سەفەردا، واتە: نەك نوێژە واجبەکان (فَلِلْمُسافِرِ) دروستە بۆ ڕێبوار: کە سەفەرەکەی حەڵاڵ بێو بۆ شوێنێکی دیارکراو بێ (اَلتَّنَفُّلُ راكِباً) نوێژی سوننەت بکا بە سواریو (وَماشِياً) بە پیادەیی، بەڵام نوێژی واجب نە بە سواریو نە بە پیادەیی بۆی دروست نیە ﴿عَن جابرٍ وابن عُمرَ ﷺ: كانَ النَّبيُّ ﷺ يُصَلِّي عَلى راحِلَتِه حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِه، فَإذا أرادَالْفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ بە سواری وڵاغەکەی نوێژی سوننەتی دەکرد، جا وڵاغەکەی بۆ هەر لایەك بڕۆشتبایە، بەڵام هەر کاتێك ویستبای نوێژی واجب بکا، دادەبەزیو ڕوو لە قیبلە نوێژی دەکرد.

(وَلا يُشْتَرَطُ) بە مەرج داناندێ (طُولُ سَفَرِهِ) سەفەرەکەی دوو قۆناغ درێژ بێ، بەڵکو لە سەفەری کورتیشدا بە سواریو بە پیادەیی نوێژی سوننەت دروستە (عَلَىالْمَشْهُورِ) لە سەر فەرمودەی بەهێزی ناسراو، جا بزانە: ئەگەر سەفەرەکەی سەفەری تاوانباری بوو، یان نەیدەزانی بۆ کوێ دەڕوا، ئەوە نە بە سواریو نە بە پیادەیی سوننەتی بۆ دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ أَمْكَنَ) جا ئەگەر ئاسان بوو (اِسْتِقْبالُ الرّاكِبِ) ڕێبواری سوار لە هەموو نوێژەکەیدا ڕوو لە قیبلە بکا (فِی مَرْقَدٍ) وەك لە ناو کەژاوەدا بێ لە سەر پشتی وڵاغ (وَإِتْمامُ رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ) هەروەها ئاسانیش بوو ڕوکووعو سوجدەو ڕوکنەکانیتریش بە تەواوی بکا (لَزِمَهُ)

وَإلاَّ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إنْ سَهُلَ الاسْتِقْبَالُ وَجَبَ وَإلاَّ فَلاَ، وَيَخْتَصُّ بِالتَّحَرُّمِ، وَقِيلَ: يُشْتَرَطُ فِي السَّلاَمِ أَيْضاً، وَيَحْرُمُ انْحِرَافُهُ عَنْ طَرِيقِهِ إلاَّ إلَى الْقِبْلَةِ،

---

واجبه: له هەموو نوێژەكەیدا ڕوو له قیبله بكاو ڕوكووعو سوجدەو ڕوكنەكانیتریش تەواو بكا، جیاوازی نیه: وولاغەكه ڕاوەستاو بێ، یان له ڕۆیشتندا بێ.

(وَإلاَّ) بەلام ئەگەر نەگونجا له هەموو نوێژەكەیدا ڕوو له قیبله بكا، یان نەگونجا ڕوكووعو سوجده تەواو ببا، وەك له سەر كورتان، یان له سەر زین سواری وولاغ بوبێ (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ إنْ سَهُلَ الإسْتِقْبَالُ) ئەگەر لەو واجبانەی ڕابردوو تەنها ئاسان بوو ڕوو له قیبله بكا، چونكه وولاغەكه ڕاوەستا بوو، یان دەیتوانی وولاغەكه وەرگێڕێتە لای قیبله (وَجَبَ) ئەوه تەنها ڕوو له قیبلەكردن واجبه (وَإلاَّ) بەلام ئەگەر نەگونجا له سەر پشتی وولاغ خۆی بسوڕێنێو ڕوو له قیبله بكا، یان نەگونجا وولاغەكه وەرگێڕێتە لای قیبله (فَلا) ئەو كاته ڕوو له قیبلەكردنیش واجب نیه، به بەلگەی حەدیسەكەیڕابردوو.

(وَيَخْتَصُّ) ئەو ڕوو لەقیبلەكردنه ئاسانەی سەر كورتانو زین كه واجبه، تایبەته: (بِالتَّحَرُّمِ) به كاتی (اللّه أكبَر)ی نوێژدابەستن، واته: لەوێ به دواوه ڕوو له قیبلەكردن واجب نیه ﴿عَن أنس‌ﷺ: كان رَسُولُ اللّهِ‌ﷺ إذا سافَرَ فَأَرادَ أنْ يَتَطَوَّعَ اسْتَقْبَلَ بِناقَتِهِ الْقِبْلَةَ فَكَبَّرَ ثُمَّ صَلَّى حَيْثُ تَوَجَّهَ رِكابُهُ﴾ رواه ابوداود بسند حسن، هەر كاتێك پێغەمبەرﷺ له سەفەردا ویستبای نوێژی سوننەت بكا، ووشترەكەی دەسوڕانده لای قیبلەو (اللّه أكبَر)ی نوێژدابەستنی دەگوت، ئینجا له سەر پشتی ووشترەكه نوێژی دەكرد بۆ هەر لایەك ڕۆشتبایه. واته: هەر چەند لای قیبلەش نەبایه (وَقِيلَ) له فەرموودەیەكی بێهێزدا (يُشْتَرطُ فِيالسَّلام أيْضاً) له سەلامدانەوەشدا ڕوو له قیبلەكردن واجبه.

(وَيَحْرُمُ انْحِرافُهُ) حەڕامه نوێژكەرەكه لابدا (عَنْ طَرِيقِهِ) له ڕێگەی ئەو شوێنەی مەبەستیه بۆی بڕوا (إلاَّ إلىالْقِبْلَةِ) تەنها بەرەو لای قیبله حەڕام نیه، جا لەم مەسەلەدا جیاوازی ڕێبواری سوارو پیاده نیه، هەروەك له (المجموع)دایه، كەوابو: ئەگەر سوار، یان پیاده له ڕێگەی خۆی بەرەو هەر لایەكیتری جگه له قیبله به قەسدی لابدا نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، ئەگەر بەرەو لای قیبله لابدا زیانی نیه، یان بەرەو لایەكیتر لابدا بەلام نەیزانی حەڕامه، یان له بیری چوو له نوێژدایه، یان دەسەلاتی نەبو وولاغەكەی بگەڕێنێتەوە، ئەوه ئەگەر زوو بەرەو قیبله بگەڕێتەوە نوێژەكەی بەتاڵ نابێو ئەگەر درەنگ بگەڕێتەوە بەتاڵ دەبێ، هەروەك له سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

وَيُومِئُ بِرُكُوعِهِ وَسُجودُهُ أَخفَضُ، وَالأَظهَرُ أَنَّ الْمَاشِيَ يُتِمُّ رُكُوعَهُ وَسُجُودَهُ وَيَستَقبِلُ فِيهِمَا وَفِي إِحْرَامِهِ، وَلاَ يَمْشي إِلاَّ فِي قِيَامِهِ وَتَشَهُّدِهِ،

---

(وَيُومِئُ بِرُكُوعِهِ) نوێژکەرەکە بۆ ڕوکووع نەختێك خۆی کووڕ دەکاتەوە (وَسُجودُهُ أَخْفَضُ) سوجدەکەشی لە ڕوکووع نزمتر دەبا، واتە: واجب نیە سەر بنێتە سەر قەبۆزی کورتان، یان زین، یان باری سەر پشتی وولاغ ﴿عن جابرﷺ: كانَﷺ يُصَلِّي عَلَى راحِلَتِهِ وَالسُّجُودُ أَخفَضُ مِنَ الرُّكُوعِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ لە سەر پشتی وولاغەکەی نوێژی دەکرد، سوجدەکەی لە ڕوکووع نزمتر دەبرد.

﴿ئاگاداری﴾: ئەوەیڕابردوو دەربارەی سوار وولاغ بوو، بەڵام سواری کەشتیو فڕۆکەو ئۆتومبیل، گشتیان واجبە: ڕوو لە قیبلە بکەنو واجبە گشت ڕوکنەکانی نوێژیش بە تەواوی بکەن، تەنها شوفێرەکە نەبێ، واتە: ڕوو لە قیبلەکردنو تەواوکردنی ڕوکنەکان لە سەر شوفێر واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، جا ئەگەر هاتو: سوارەکانی تری-جگە لە شوفێر- نەیانتوانی لە هەموو نوێژدا ڕوو لە قیبلە بکەنو ڕوکنەکانیش بە تەواوی بکەن، ئەو کاتە دروست نیە نوێژی سوننەت بکەن لە سەر فەرموودەی بەهێز، هەروەك لە حاشیەکانی(القليوبی)و(الشروانی)و(البجيرمی)دا فەرموویانە.

(وَالأَظهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر دەربارەی ڕێبواری پیادە ئەمەیە: (أَنَّ الْمَاشِيَ) ڕێبواری پیادەش بۆی دروستە: بە ڕێگەدا بڕواو نوێژیسوننەتیش بکا، بەڵام (يُتِمُّ رُكُوعَهُ وَسُجُودَهُ) واجبە ڕوکووعو سوجدە بە تەواوی بباو (وَيَستَقبِلُ فِيهِمَا) هەروەها واجبە لە ڕوکووعو سوجدەو لە دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەدا ڕوو لە قیبلە بکا (وَفِي إِحْرَامِهِ) هەروەها واجبە لە کاتی (اللهُ أكبرَ)ی نوێژدابەستنیش ڕوو لە قیبلە بکا.

(وَلا يَمْشِي) نابێ نوێژکەرەکە بڕوا (إِلاَّ فِي قِيَامِهِ) تەنها لە کاتی فاتیحەو سوڕەتی دوای فاتیحەو (وَتَشَهُّدِهِ) لە کاتی تەحیات خوێندندا نەبێ، بەڵام ئیمامی(الاذرعی) باسی کردوە: ئەگەر لە ڕێگەدا قوڕ، یان بەفر، یان ئاو هەبو، ئەو کاتە بۆی دروستە: بۆ سوجدەبردن ئاماژە بکا، تاکو جلەکانی تەڕ نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا هێناویانە.

ئینجا بزانە: مەرجە بۆ دروستبوونی نوێژی ڕێبواری سوار: جلەکانو کورتانو لغاو و هەر شوێنێکی وولاغەکە: کە بە لاشەی دەکەوێ، دەبی گشتی پاك بێ، جا ئەگەر وولاغەکە میز، یان تەرسی کرد، یان بە سەر پیسیدا ڕۆیشت زیانی نیە، هەروەها پیادەش واجبە: خۆی لە پیسی تەڕ بپارێزێ، واتە: ئەگەر بە بێویستی خۆی بە سەر پیسیەکی تەڕدا ڕۆیشت، یان بە قەسدی بە سەر پیسیەکی ووشکدا ڕۆیشت، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر بەقەسدی نەبو، نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، چونکە واجب نیە خۆی لە پیسی ووشك بپارێزێ.

وَلَوْ صَلَّى فَرْضاً عَلَى دَابَّةٍ وَاسْتَقْبَلَ وَأَتَمَّ رُكُوعَهُ وَسُجُودَهُ وَهِيَ وَاقِفَةٌ جَازَ، أَوْ سَائِرَةٌ فَلاَ،

هەروەها مەرجە: رێبوارو سوار لە کاتی‌نوێژدا قسە نەکەن‌و جموجۆڵی بێ‌پێویست نەکەن، واتە: ئەگەر پێویستیان بە غاردان بوو، یان قاچی لە وڵاغ دا تاکو بڕوا زیانی نیە، بەڵام ئەگەر جگە لە ڕۆیشتن بە بێ‌پێویست جموجۆڵی‌تر بکەن نوێژیان بەتاڵە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ نوێژی واجب بە سواری وڵاغ و ئۆتۆمبیل ﴾

بزانە: مەرجە بۆ دروستبوونی نوێژی واجب: ڕوو لە قیبلە بکاو -جگە لە کاتی‌ترس- لە شوێنی‌نوێژدا جێگیر بێ‌و هەموو ڕوکنەکانیش تەواو بکا، کەوابو: نوێژی واجب لە کاتی ڕۆیشتندا دروست نیە، هەرچەند ڕووشی لە قیبلە بێ، هەروەها بە سواریش دروست نیە ئەگەر ڕووی لە قیبلە نەبێ، یان ڕوکنێکی‌نوێژی تەواو نەبێ، هەروەك لە (فتح العزيز)و (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن ابْن عمر رضي الله عنهما: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلى الرَّاحِلَةِ ...غَيْرَ أَنَّهُ لايُصَلِّي عَلَيْها الْمَكْتُوبَةَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ نوێژی‌سوننەتی لە سەر پشتی وڵاغ دەکرد، بەڵام نوێژی‌واجبی لە سەر پشتی وڵاغ نەدەکرد.

(وَلَوْ صَلَّى فَرْضاً) ئەگەر کەسێك نوێژی‌واجبی کرد (عَلى دابَّةٍ) لە سەر پشتی وڵاغێك (وَاسْتَقْبَلَ) لە هەموو نوێژەکەی‌دا ڕووی لە قیبلە بوو و بە پێوەش بوو، واتە: لە ناو کەژاوەدا، یان لە سەر تەختێك بوو (وَأَتَمَّ رُكُوعَهُ وَسُجُودَهُ) ڕوکووع‌و سوجدەو گشت ڕوکنەکانی تەواو کردن (وَهِيَ واقِفَةٌ) وڵاغەکەش ڕاوەستاو بوو (جازَ) نوێژەکە دروستە، چونکە هەرسێك مەرجەکانی هاتونەتە جێ (أَوْ سائِرَةٌ) بەڵام ئەگەر وڵاغەکەی لە کاتی نوێژدا دەڕۆیشت (فَلا) نوێژەکەی دروست نیە، چونکە مەرجێکی نوێژ -کە جێگیربوونە- ناتەواوە؟ لە بەر ئەوەی ڕۆیشتنی وڵاغ سەر بە سوارەکەیەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: نوێژی‌واجب دروستە: لە ناو کەشتی‌دا -واتە: لە ناو ئۆتومبیل‌و فڕۆکەشدا- هەم لە سەر تەختەیەك کە پیاو هەڵیبگرن، بەو مەرجەی ڕوو لە قیبلە بکاو گشت ڕوکنەکانیش بە تەواوی بکا، جیاوازی نیە: ئەوانە ڕاوەستاو بن، یان لە ڕۆیشتندا بن، چونکە ڕۆیشتنی ئەوانە سەر بە سوارەکە نیە، واتە: ئەوانە لە گەڵ وڵاغ جیانە، جا ئەگەر نەگونجا ڕوو لە قیبلە بکا، یان گشت ڕوکنەکانی نوێژ تەواو بکا، واجبە دابەزێ‌و لە سەر زەمین نوێژی واجب بکا، جا ئەگەر دابەزیبا هاوڕێکانی بەجێیان دەهێشت، یان نەیدەتوانی دووبارە سوار ببێتەوە، یان هەر نەیدەتوانی داببەزێ، یان مەترسی لەدەستدانی گیان، یان ماڵی هەبو، لەو حاڵەتانەدا واجبە: نوێژە واجبەکان بکاو واجبیشە دووبارەیان بکاتەوە.

وَمَنْ صَلَّى فِي الْكَعْبَةِ واستَقبَلَ جِدَارَهَا أَوْ بَابَهَا مَرْدُوداً أَوْ مَفْتُوحاً مَعَ ارْتِفَاعِ عَتَبَتِهِ ثُلُثَيْ ذِرَاعٍ أَوْ عَلَى سَطْحِهَا مُسْتَقبِلاً مِنْ بِنَائِهَا مَا سَبَقَ جَازَ، وَمَنْ أَمْكَنَهُ عِلْمُ الْقِبْلَةِ حَرُمَ عَلَيْهِ التَّقْلِيدُ وَالاجْتِهَادُ، وَإِلاَّ أَخَذَ بِقَوْلِ ثِقَةٍ يُخْبِرُ عَنْ عِلْمٍ،

---

جا بزانە: ئەگەر بە هۆی با، کەشتیەکە لایداو ئەویش ڕووی لە قیبلە وەرگەڕا، واجبە بە پەلە خۆی وەرگێڕێتەوە لای قیبلە، چونکە ئەگەر پەلە نەکا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، شتێکی ئاشکراشە: لادان لە قیبلە بە هۆی لادانی ئۆتومبیل، یان فڕۆکە هەمان بڕیاری لادانی کەشتی بۆ دەدرێ، چونکە لە دەسەڵاتی ئەودا نیە، جا هەر لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە: بۆ سوار کەشتی –واتە: بۆ ئەوانەی‌تریش– لە ترسی سەر سوڕان، یان لە بەر هۆیەکی‌تر، دروستە: بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن، واتە: دووبارەکردنەوەی نوێژیشیان لە سەر نیە، هەروەك (الشبراملسي) فەرموویەتی.

(وَمَنْ صَلَّى) هەرکەسێك نوێژێکی واجب، یان سوننەت بکا (فِي الْكَعْبَةِ) لە ناو ژووری (کعبة)، واتە: قیبلەدا (وَاسْتَقْبَلَ جِدَارَهَا) ڕووی لە دیواری (کعبة) کرد (أَوْ بَابَهَا) یان ڕووی لە دەرگەی (کعبة) کرد (مَرْدُوداً) دەرگەکەش داخراو بوو (أَوْمَفْتُوحاً) یان کرابۆوە (مَعَ ارْتِفَاعِ عَتَبَتِهِ ثُلُثَيْ ذِرَاعٍ) لەگەڵ ئەوەشدا کۆسپەی دەرگەکە دوو سێیەکە گەز بەرز بوو (أَوْ عَلَى سَطْحِهَا) یان لە سەربانی (کعبة) نوێژی کرد (مُسْتَقْبِلاً مِنْ بِنَائِهَا) هەر لە سەر بانەکە ڕووی کردبوە بەشێکی بەرزی (کعبة)، بەقەد (ماسَبَقَ) بەرزیەکەی ڕابردوو، واتە: دوو سێیەکە گەز، وەك زێدە دیوارێکیش دوو سێیەکە گەز بەرز بێ (جازَ) لە هەموو مەسەلەکاندا نوێژی دروستە.

(وَمَنْ أَمْكَنَهُ عِلْمُ الْقِبْلَةِ) هەر کەسێك بۆی بگونجێ بزانێ قیبلە کامەیە، وەك لە (مكة)دا بە چاوی خۆی ببینێ (حَرُمَ عَلَيْهِ التَّقْلِيدُ) حەڕامە بۆ زانینی قیبلە شوێن یەکێکی‌تر بکەوێ (وَالْاِجْتِهادُ) حەڕامە (اجْتِهاد)ش بکا، بەڵکو بە دیتنی خۆی ڕەفتار دەکا (وَإِلَّا) ئەگەر بۆی نەگونجا بزانی قیبلە کامەیە، یان لە کام لایە (أَخَذَ بِقَوْلِ ثِقَةٍ) واجبە بە قسەی چاوساغێکی باوەڕپێکراو بکا، جا پیاو بێ، یان ئافرەت، بەو مەرجەی منداڵ، یان شێت نەبێ (يُخْبِرُ عَنْ عِلْمٍ) لە ڕووی زانستەوەش قسەکەی بداتێ، وەك بڵێ: ئەوە (کعبة)یە بە چاو دەیبینم، یان بڵێ: خەڵکێکی زۆرم دیت بەرەو ئەم لایە نوێژ دەکەن.

هەروەها واجبە: بە (مِحْراب)ی مزگەوتیش باوەڕ بکا، ئەگەر لە شوێنێکی وەها بێ: خەڵکێکی زۆر نوێژی لێکردبێ‌و ڕەخنەشی لێنەگیرابێ، هەروەها واجبە: بە قسەی خاوەن ماڵیش باوەڕ بکا: دەربارەی لای قیبلە، هەروەها واجبە: بگەڕێ‌و پرسیاری قیبلە لە

فَإنْ فَقَدَ وَأمْكَنَ الاجْتِهَادُ حَرُمَ التَّقْلِيدُ، فَإنْ تَحَيَّرَ لَمْ يُقَلِّدْ فِي الأظْهَرِ وَصَلَّى كَيْفَ كَانَ وَيَقْضِي، وَيَجبُ تَجْدِيدُ الاجْتِهَاد لِكُلّ صَلاَة تَحْضُرُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الإجْتِهَادِ وَتَعَلُّمِ الأَدِلّةِ كَأَعْمَى قَلَّدَ ثِقَةً عَارِفاً، وَإنْ قَدرَ فَالأَصَحُّ وُجُوبُ التَّعَلُّمِ فَيَحْرُمُ التَّقْلِيدُ،

---

باوەڕپێکراوێك بکا، ئەگەر ماندووبوونی تێدا نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لەو سێ مەسەلەیەدا تەنها دەربارەی لای قیبلە واجبە باوەڕ بکا، واتە: دەربارەی ڕاستەو چەپە بۆی دروستە: (اجتهاد) بکا، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(فَإنْ فَقَدَ) جا ئەگەر هیچێك لەو سێیانەی ڕابردووی دەست نەکەوتن و (وَأمْكَنَهُ الاجْتِهادُ) بۆی دەگونجا (اجتهاد) بکا، چونکە شارەزای بەڵگەکانی قیبلە بوو (حَرُمَ التَّقْلِيدُ) حەرامە شوێن کەسێکیتر بکەوێ، بەڵکو واجبە (اجتهاد) بکاو قیبلە بدۆزێتەوە.

ئینجا بزانە: بەڵگەکانیقیبلە زۆرن: وەکو ڕۆژو مانگو ئەستێرە، جا لە هەموویان بەهێزتر: ئەستێرەی(قُطْب)ی باکورە، کە دوا ئەستێرەی حەفتەوانەی بچوکەو دەکەوێتە نزیك ئەستێرەی(جدی)، واتە: ئەگەر لە ڕۆژهەڵاتیکوردستاندا بەرەو قیبلە ڕابوەستێ، ئەستێرەی(قطب) دەکەوێتە پشت گوێیڕاستە، لە ڕۆژئاوایکوردستانیشدا دەکەوێتە سەر زنجیرەی پشتێ، هەروەك لە (الشرواني) وەردەگیرێ. دیسان بزانە: قیبلەنامەکانی ئێستاش یەکێکن لە بەڵگەکانی قیبلەو دروستە: پشتیان پێببەسترێ، وَاللهُ أعْلَم.

(فَإنْ تَحَيَّرَ) جا ئەگەر کەسێك لێی شێواو نەیتوانی (اجتهاد) لە قیبلەدا بکا، چونکە هەور بوو (لَمْ يُقَلِّدْ فِي الأظْهَرِ) دروست نیە شوێن کەسێکیتر بکەوێ، لە فەرموودەیبەهێزتردا (وَصَلّى) بەڵکو واجبە نوێژ بکا (كَيْفَ كانَ) هەر چۆنێك بێ، لە بەر ڕێزلێنانی کاتی نوێژەکە (وَيَقْضِي) واجبە نوێژەکەش قەزا بکاتەوە کاتێ قیبلەی دۆزیەوە.

(وَيَجِبُ تَجْدِيدُ الاجْتِهادِ) واجبە (اجتهاد) دووبارە بکاتەوە (لِكُلِّ صَلاةٍ تَحْضُرُ) بۆ گشت نوێژێك کە کاتی هات (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام ئەگەر بەڵگەی (اجْتِهاد)ی یەکەمی لەبیر مابو، واجب نیە (اجتهاد) دووبارە بکاتەوە.

(وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الاجْتِهادِ) هەر کەسێك توانای (اجتهاد)کردنی لە قیبلەدا نەبو (وَتَعَلُّمِ الأدِلَّةِ) هەروەها توانای شارەزابوونی بەڵگەکانیقیبلەشی نەبو (كَأَعْمَى) وەکو کوێر، یان نازیرەك (قَلَّدَ ثِقَةً) واجبە: شوێن باوەڕپێکراوێك بکەوێ (عارِفاً) زانا بێ: بە بەڵگەکانیقیبلە (وَإنْ قَدَرَ) بەڵام ئەگەر توانای فێربوونی بەڵگەیقیبلەی هەبێ (فَالأَصَحّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: (وُجُوبُ التَّعَلُّمِ) واجبە: خۆی فێرە بەڵگەی قیبلە بکا (فَيَحْرُمُ التَّقْلِيدُ) کەوابو: حەرامە شوێن کەسێکیتر بکەوێ، بەڵکو واجبە بەگوێرەی بەڵگەکان (اجتهاد) بکا.

وَمَنْ صَلَّى بالاجْتِهَاد فَتَيَقَّنَ الْخَطَأَ قَضَى فِي الأَظْهَرِ، فَلَوْ تَيَقَّنَهُ فِيهَا وَجَبَ اسْتِئْنَافُهَا، وَإِنْ تَغَيَّرَ اجْتِهَادُهُ عَمِلَ بِالثَّانِي وَلا قَضَاءَ حَتَّى لَوْ صَلَّى أَرْبع رَكَعات لأَرْبَعِ جِهَاتٍ بالاجْتِهَاد فَلا قَضَاءَ.

---

(وَمَنْ صَلّى بِالأجْتِهادِ) هەر كەسێك بەگوێرەی (اجتهاد)ی خۆی، یان بە (اجتهاد)ی شوێنكەوتووی‌خۆی نوێژی كرد (فَتَيَقَّنَ الْخَطَأَ) جا لە دوای‌نوێژەكە بێگومان زانی: هەڵە بووەو قیبلە لە لایەكی‌تر بووە (قَضَى) واجبە: نوێژەكە دووبارە بكاتەوە (فِي الأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، واتە: ئەو دوو حەدیسەی كراونە بەڵگە: (كە دووبارەكردنەوە واجب نیە)، هەردوو حەدیسەكان بێ‌هێزن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(فَلَوْ تَيَقَّنَهُ فِيها) بەڵام ئەگەر لە ناو نوێژەكەدا بێگومان زانی هەڵەیەو قیبلە لە لایەكی‌ترە (وَجَبَ اسْتِئْنافُها) واجبە: نوێژەكە ببڕێ‌و دووبارە بەرەو قیبلە دایببەستێتەوە.

(وَإِنْ تَغَيَّرَ اجْتِهادُهُ) جا ئەگەر نەیزانی هەڵەیە، بەڵام (اجتهاد)ی گۆڕا: كە قیبلە لە لایەكی‌ترە (عَمِلَ بالثّاني) واجبە ڕەفتار بە (اجتهاد)ی‌دووەمیش بكا، هەرچەند لە ناو نوێژیشدا بێ، واتە: واجبە خۆی وەرگێڕێتە لایەكەی‌تر (وَلاقَضاءَ) بەڵام دووبارەكردنەوەی لە سەر نیە، چونكە (اجتهاد) بە (اجتهاد)ێكی‌تر هەڵناوەشێتەوەو بێگومانیش نەیزانیوە هەڵەی كردوە، كەواتە: ئەوەی بە (اجتهاد)ی‌یەكەمیش كردویەتی هەر دروستە (حَتّى) تا بە شێوەیەكی وەها (اجتهاد)گۆڕان دروستە (لَوْ صَلّى أَرْبَعَ رَكَعاتٍ) ئەگەر یەك نوێژی چوار ڕەكعەتی‌ی كرد (لأرْبَعِ جِهاتٍ) بەرەو هەر چوار لا (بِالإجْتِهادِ) بە چوار (اجتهاد)، هەر ڕەكعەتێك بەرەو لایەك (فَلا قَضاءَ) دووبارەكردنەوەی لە سەر نیە، چونكە بێگومان هەڵەی بۆ ئاشكرا نەبوە لە هیچ ڕەكعەتێكدا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەی‌ڕابردوو گشتی دەربارەی ئەوە كەسە بوو: كە لە لایەكەی قیبلە بە هەڵەدا بچێ، جا ئەگەر لە لایەكەی قیبلە بە هەڵەدا نەچوبو، واتە: نوێژەكەی بەرەو لای قیبلە كردبو، بەڵام لە ڕاستەو چەپە بە هەڵەدا چوبو، بەم شێوەیە ڕەفتار دەكا:

ئەگەر لە دوای نوێژكردن بە هۆی (اجتهاد) ئاشكرابو: كە بە لای ڕاستەدا، یان بە لای چەپەدا هەڵەی كردوە، ئەوە نوێژەكەی دروستەو دووبارەكردنەوەی ناوێ، هەروەها ئەگەر لە ناو نوێژدا بە هۆی (اجتهاد) ئەو هەڵەیە ئاشكرابو، ئەوەش زیانی نیە، بەڵكو یەكسەر خۆی لە لای‌هەڵە لا دەداو لە لایەكەی‌تر خۆی لەگەڵ قیبلە ڕاست دەكاو نوێژەكە تەواو دەكا، بەڵام ئەگەر ئاشكرابوونی بەهەڵەداچوون: لە ڕاستەو چەپەدا بە هۆی (اجتهاد) نەبو، بەڵكو بێگومان–لە ناو نوێژدا، یان لە دوای نوێژ– زانی هەڵە بووە، ئەوە لە فەرموودەی بەهێزتردا: واجبە نوێژەكە دووبارە بكاتەوە، لەفەرموودەی بێ‌هێزیشدا واجب نیە، هەروەك لە (فتح العزیز)و (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

## (بابُ صفَةِ الصَّلاة)

**أَرْكانُهَا ثَلاثَةَ عَشَرَ، اَلأَوَّلُ: اَلنِّيَّةُ، فَإِنْ صَلَّى فَرْضاً وَجَبَ قَصْدُ فِعْلِهِ، وَتَعْيِينُهُ، وَالأَصَحُّ وُجُوبُ نِيَّةِ الْفَرْضِيَّةِ دُونَ الإِضَافَةِ إِلَى اللهِ تَعَالى،**

---

جا بزانە: لەم مەسەلەیەدا –لە فتوادا– ئیمامی(الغزالی) فەرموودەکەی بێهێزی بە ڕاست داناوەو دەفەرموێ: ئەگەر لە ڕاستە، یان لە چەپەدا هەڵەی کرد، بەلام هەر بەرەو لای قیبلەش بوو، ئەوە دووبارەکردنەوەی نوێژی لە سەر واجب نیە، هەروەك لە (إحیاء العلوم)دا ڕوونی کردۆتەوە، والله أعلم.

### ﴿ بابُ صفَةِالصَّلاة: باسی چۆنیەتی نوێژکردن ﴾

(أرْكانُها) ڕوکنەکانی‌نوێژ، واتە: ئەو واجبانەی بەشێکی‌نوێژن‌و نوێژیان لێپێك دێ، ئەگەر یەکێکیان نەبێ نوێژەکە دروست نابێ (ثَلاثَةَعَشَرَ) سێزدە ڕوکنن:

### ١–﴿ نیەتهێنان ﴾

(اَلنِّيَّةُ) ڕوکنی‌یەکەم لە ڕوکنەکانی‌نوێژ: نیەتهێنانە، پێغەمبەرﷺ دەفەموێ: ﴿إنَّماالأعْمالُ بِالنِّيَّاتِ وَإنَّما لِكُلِّ امْـــرِئٍ ما نَوَى﴾ رواه الشيخان، هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ، بە نیەتهێنانەوە نەبێ دانامەزرێ، گشت مرۆڤێك تەنها پاداشی ئەو کردەویەی هەیە کە نیەتی بۆ هێناوە. کەوابو: (فَإنْ صَلَّى فَرْضاً) ئەگەر یەکێك ویستی نوێژێکی واجب بکا، ئەوە لە نیەتهێنانەکەی‌دا سێ شت مەرجن‌و واجبن:

یەکەم: (وَجَبَ قَصْدُ فِعْلِهِ) واجبە مەبەستی نوێژکردنەکەی هەبێ. دووەم: (وَتَعْيِينُهُ) واجبە ناوی نوێژەکە دیاری بکا: وەك نیوەڕۆ، یان عەسر...هتد. سێیەم: (وَالأصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (وُجُوبُ نِيَّةِ الْفَرْضِيَّةِ) واجبە نیەتی واجبیەکەشی بێنێ، تاکو لە سوننەت جیا ببێتەوە، وەك بە دڵ بڵێ: (أُصَلِّي فَرْضَ الظُّهْرِ) نیەتم وەیە فەڕزی نوێژی نیوەڕۆ دەکەم، یان (أُصَلِّيالظُّهْرَ فَرْضاً) نیەتم وەیە نوێژی نیوەڕۆ بە فەڕز دەکەم، یان (أُصَلِّي الظُّهْرَ الواجِبَ) نوێژی نیوەڕۆی واجب دەکەم.

ئینجا بزانە: لە نیەتهێنانی واجبیەکەدا جیاوازی گەورەو منداڵ نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(دُونَ الاضافةِ الی اللهِ تَعالی) بەلام واجب نیە بڵێ: بۆ خوا ئەو نوێژە دەکەم، چونکە خواپەرستی هەر بۆ خودایە، هەروەها واجب نیە باسی ڕوو لە قیبلەو ژمارەی ڕکعەتەکان بکا، بەڵکو سوننەتە، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لە فەرموودەی ڕاستتردا: نیەتی قەزاکردنەوە لە نوێژی قەزاکراوەدا واجب نیە بەڵکو سوننەتە، هەروەها نیەتی (أداء)ش لەو نوێژەی لە کاتی‌خۆی‌دا دەکرێ واجب نیە بەڵکو سوننەتە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَأَنَّهُ يَصِحُّ الْأَدَاءُ بِنِيَّةِ الْقَضَاءِ وَعَكْسُهُ، وَالنَّفلُ ذُوالْوَقْت أَوِ السَّبَب كَالْفَرْضِ فِيمَا سَبَقَ، وَفِي نِيَّةِ النَّفْلِيَّةِ وَجْهَان، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ لاَ تُشْتَرَطُ نِيَّةُ النَفْلِيَّةِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَكْفِي فِي النَّفلِ الْمُطْلَقِ نِيَّةُ فِعْلِ الصَّلاة،

---

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر (يَصِحُّ الْأَدَاءُ) دروستە: نوێژی(أداء) لە کاتیخۆیدا بکرێ (بِنِيَّةِ الْقَضاءِ) بە نیەتی قەزاکردنەوە، بەو مەرجەی بە گاڵتە وا نەکا، بەڵکو بە هەڵەدا چوبێو وا تێگەیشتبێ کاتینوێژەکە نەماوە.

(وَعَكْسُهُ) بە پێچەوانەش دروستە، واتە: نوێژی قەزاکراوە بە نیەتی(أداء) بکرێ، وەك بەهەڵەدا چوبێو واتێبگا کاتینوێژەکە ماوە.

کەوابو:-بۆ وێنە- ئەگەر کەسێك ماوەی بیست ساڵ نوێژی سبەینیێ لە پێش هاتنی کاتەکەیدا کردبێ، ئینجا بۆی ئاشکرا بوو کە بە هەڵەدا چووە، ئەوە قەزاکردنەوەی تەنها یەك نوێژی سبەینیێ لە سەر واجبە، چونکە هەر نوێژێکی ڕۆژیدواوە بە بەر قەزای ڕۆژی پێشەخۆی دەکەوێ، واتە: چونکە نیەتی قەزاکردنەوە واجب نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالنَّفلُ ذُوالْوَقْتِ) ئەو سوننەتانەی خاوەن کاتن: وەکو سوننەتەکانی پێشو دوای نوێژەکانو وەترو تەراویحو نوێژیجەژنەکانو چێشتەنوێژ (أَوِالسَّبَبِ) یان ئەو سوننەتەی خاوەن هۆیە: وەکو ڕۆژگیرانو مانگگیرانو نوێژیباران (كَالْفَرْضِ) وەکو نوێژی واجب وایە (فِيما سَبَقَ) لەو نیەتەیڕابردوودا، واتە: مەرجە مەبەستی نوێژکردنەکەی هەبێو ناوی سوننەتەکەش دیاری بکا، وەك بڵێ: نوێژی جەژنیقوربان، یانوەتر، یان تەراویح دەکەم، هەروەها مەرجە دیاری بکا سوننەتەکە: (قَبْلِيَّة)-پێش نوێژەکەیە، یان (بَعْدِيَّة)-دوای نوێژەکەیە، وەك سوننەتی پێش نوێژینیوەڕۆ، یان سوننەتی دوایمەغریب، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَفِي نِيَّةِ النَّفْلِيَّةِ) دەربارەی نیەتهێنانی سوننەتایەتی (وَجْهان) دوو فەرموودە هەنە: (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (الصَّحِيحُ) فەرموودەیڕاست لەو دوو فەرموودەیە ئەوەیە: (لاتُشْتَرَطُ نِيَّةُ النَّفْلِيَّةِ) نیەتیسوننەتایەتی مەرج نیە (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە سوننەتایەتی هەر لە ناوەکەی خۆیدا دەردەکەوێ.

(وَيَكْفِي فِي النَّفْلِ الْمُطْلَقِ) لە نیەتهێنانی سوننەتیبێناودا-واتە: ئەو سوننەتەی کاتو هۆی نیە- ئەوەندە بەسە: (نِيَّةُ فِعْلِ الصَّلاةِ) نیەتی نوێژکردنەکە بێنێ، واتە: پێویست ناکا نیەتی سوننەتایەتی بێنێ.

وَالنِّيَّةُ بِالْقَلْبِ، وَيُنْدَبُ النُّطْقُ قُبَيْلَ التَّكْبِيرِ. اَلثَّانِي: تَكْبِيرَةُ الْإِحْـرَامِ، وَيَتَعَـيَّنُ عَلَـى الْقَادِرِ: اَللّٰهُ أَكْبَر. وَلاَ تَضُرُّ زِيَادَةٌ لاَ تَمْنَعُ الاِسْمَ كَاللّٰهُ الْأَكْبَر، وَكَذَا اَللّٰهُ الْجَلِيلُ أَكْبَـر فِي الْأَصَحِّ، لاَ أَكْبَرُ اللّٰه عَلَى الصَّحِيحِ، وَمَنْ عَجَزَ تَرْجَمَ

---

(وَالنِّيَّـةُ) نیـەتهێنان بـۆ نوێـژو بـۆ هـەموو خواپەرسـتیەکیتر–هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە–(بِالْقَلْبِ) واجبە بە دڵ بێ، بە بەڵگەی (اجماع)، واتـە: زوبـان هیچ پەیوەندی بە دروستبوونیەوە نیە، بەڵام (وَيُنْدَبُ النُّطْقُ) سوننەتە: بـە زوبـان نیـەت بێنێ (قُبَيْلَ التَّكْبِيرِ) تۆزێك لە پێش (الله اكبر)ی نوێژدابەستندا، تـاكو زوبـان یارمـەتی دڵ بدا، کەوابو: ئەگەر بـە زوبـان نیـەتی هێنـاو دڵ ئاگـادار نـەبو، ئـەو نیەتـە دروسـت نیـە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: نیەتهێنان بە زوبان–کە سوننەتە– (قیـاس) کراوەتـە سـەر نیەتیحـەج، هەروەك لە (تحفة)دا ئاماژەی بۆ کردوە ﴿عن عائشةرضي الله عنهـا: أَهَلَّ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ بِالْحَجِّ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ نیەتی بە حەجیتـەنها هێنـا. واتـە: دیـارە بـە دەنـگ نیـەتی هێناوە. هەروەها نیەتیڕۆژووشی بە دەنگ هێناوە ﴿عن عائشةرضي الله عنهـا: دَخَلَ الـنَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنا: لا. قالَ: فَإِنِّي اِذاً صائِمٌ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ ڕۆژێك هاتە ماڵەوەو فەرمووی: چیتان هەیە بیخۆم؟ گوتمان: نا. فـەرمووی: کـەوابو: مـن ئەمڕۆ بەڕۆژوومە.

## ٢–﴿(أللّٰهُ أكبَر)ی نوێژدابەستن ﴾

(اَلثّانِي) دووەم لە ڕوکنەکانینوێـژ: (تَكْبِيرَةُالإِحْرامِ) گـوتنی (اللّٰهُ أكْبَـر)ی نوێژدابەسـتنە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿تَحْرِيمُهاالتَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهاالتَّسْلِيمُ﴾ رواه اصحاب السنن باسناد صحيح، نوێژ بە (أللّٰهُ أكبر) دادەبەستریۆ بە سەلامدانەوەش تەواودەکرێ.

(وَيَتَعَيَّنُ عَلَىالْقادِرِ) دیاریدەکرێ لە سەر ئـەو کەسـەی توانـای هـەبێ، واجبـە بڵـێ: ﴿اَللّٰهُ أَكْبَر﴾ رواه ابن حبان وابن خزيمة والبـزار باسـناد صـحيح، کـەوابو: جگـە لـە ڕسـتەی(الله أكبر) هیچ ڕستەیەکیتر دروست نیە، بەڵام (وَلا تَضُرُّ زِيادَةٌ) زیـانی نیـە زێدەیـەکی وەهـا (لاتَمْنَعُ الاسْمَ) کە ڕێگەی ناوی (أللّٰهُ أكبَر) نەگرێ (كَ) وەکو بڵێ: (أللّٰه الأكبَر)، بە زێـدەیی ئەلیفو لام (وكَذا) هەروەها زیانی نیە بڵێ: (أللّٰهُ الْجَليل أكبَر)، بە زیدەی ووشەی(الجليل) لە نێوان (الله)و (أكبر)دا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا.

(لا) بەڵام دروست نیە بڵێ: (أكْبَرُ الله) کە ووشـەی (أكـبر) بـە پـێش ووشـەی (الله) بێخـی (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَمَنْ عَجَزَ) هەر کەسێك توانای نەبو بە عەرەبی بڵێ: (الله أكْبَر)، نەشـگونجا فێـری ببـێ، (تَرْجَمَ) واجبە: وەریبگێڕێتە سەر زمانێکیتر، وەك بە کوردی بڵێ: (خوا گەورەترە).

وَوَجَبَ التَّعَلُّمُ إِنْ قَدَرَ، وَيُسَنُّ رَفْعُ يَدَيْهِ فِي تَكْبِيرِهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ وَالأَصَحُّ رَفْعُهُ مَعَ ابْتِدَائِهِ، وَيَجِبُ قَرْنُ النِّيَّةِ بِالتَّكْبِيرَةِ، وَقِيلَ يَكْفِي بِأَوَّلِهِ

---

جا ئەمە لەو کاتەدایە: کە توانای فێربوونی نەبێ، کەوابو: (وَوَجَبَ التَّعَلُّمُ) واجبە: بە عەرەبی خۆی فێرە (الله أكبر) بکا (إِنْ قَدَرَ) ئەگەر توانای فێربوونی هەبێ، بەڵکو واجبە بە سەفەر بڕواتە شوێنێکیتر، ئەگەر لە شوێنیخۆی کەسێك نەبو فێری بکا، چونکە (قاعدة)یەکی شەرعییە: (مَا لايَتِمُّ الْواجِبُ إلاّ بِهِ فَهُوَ واجِبٌ) هەر شتێك واجب تەنها بەوی تەواو ببێ، ئەو شتەش واجبە. هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُسَنُّ) سوننەتە بۆ نوێژکەر: جا پیاو بێ، یان ئافرەت (رَفْعُ يَدَيْهِ) هەردوو دەستەکانی بەرز بکاتەوە (فِي تَكْبِيرِهِ) لە کاتی (الله اكبر)ی نوێژدابەستنیدا (حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ) بەرامبەر هەردوو شانەکانی، بەم جۆرە: بەرەدەستەکانی بەرەو قیبلە بێو سەرەپەنجەکانی بەرامبەر سەرەوەی گوێیەکانی بێو هەردوو پەنجەی گەورەشی بەرامبەر نەرمە گوێیەکانی بێو پشتەدەستەکانیشی بەرامبەر شانەکانی بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا وەها ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە (رَفْعُهُ مَعَ ابْتِدَائِهِ) سوننەتە: هەر لە گەڵ دەست پێکردنی (الله أكبر)دا دەستەکانی بەرز بکاتەوە، ئینجا دایانبنێتەوە سەر بنەوەی سینگی، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە ﴿عن وائل﷜: رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ يَدَيْهِ حِينَ دَخَلَ فِي الصَّلاةِ كَبَّرَ –وَصَفَ هُمَامٌ: حِيالَ أُذُنَيْهِ– ثُمَّ الْتَحَفَ بِثَوْبِهِ، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ کە نوێژی دابەست، (الله أكبر)ی گوتو دەستی تا بەرامبەر گوێیەکانی بەرز کردەوە، ئینجا بەرگی لە خۆی وەرپێچا، ئینجا دەستیڕاستەی لە سەر دەستیچەپەی دانا.

ئینجا بزانە: واجبە (الله أكبر)ی نوێژدابەستن بە پێوە بگوترێ لەو حاڵەتەدا: کە واجبە بە پێوە نوێژ بکا، هەروەها سوننەتە: ئیمام (الله أكبر)ینوێژدابەستنو ئەوانەیتریش بە دەنگ بڵێ، تاکو نوێژکەرەکان گوێیان لێبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَجِبُ قَرْنُ النِّيَّةِ) واجبە: نیەتهێنانەکە لە دڵدا بەرامبەر بکا (بِالتَّكْبِيرَةِ) بە (الله أكبر)ی نوێژدابەستن، واتە: واجبە نیەتەکە –بە هەرسێك مەرجەوە– لە دڵدا بەرامبەر بکا لە گەڵ سەرەتای(الله أكبر)، ئینجا نیەتەکەی هەر لە دڵدا بێ، تا (الله أكبر) کۆتایی دێ، هەروەك سەرچاوەکان فەرموویانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَكْفِي بِأَوَّلِهِ) ئەوەندە بەسە: کە نیەتەکە بەرامبەر بکا بە سەرەتای(الله أكبر)، واتە: واجب نیە تا کۆتایی (الله أكبر) نیەتەکەی هەر لە دڵدا بێ.

ئینجا بزانە: (امام الحرمین)و (الامام الغزالی)و (الامام النواوی) ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە: کە بەرامبەرکردنێکی عادەتی بەسە، واتە: لە بەشێکی (الله أکبر)دا لە دڵیدا بێ: کە ئەم نوێژە واجبە، یان سوننەتە دەکا، جیاوازی سەرەتاو ناوەندو کۆتایی(الله اکبر) نیە، (تحفة)و (مغنی)ش لایەنگیری ئەو هەڵبژاردنەیان کردوەو (الشرواني)ش بە درێژی ڕوونی کردۆتەوە، ئیتر لە دوای تەواوبوونی(الله أکبر) واجب نیە: لە ناو نوێژدا نیەتەکەی هەر لە دڵدا بێ، بەڵام ئەگەر بەرامبەری نەکرد، بەڵکو لە پێش گوتنی(الله أکبر) نیەتی هێنا، ئەوە لەو هەردوو مەسەلەدا نیەتەکەی دروست نیەو نوێژی دانابەسترێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر نوێژی دابەست، ئینجا کەوتە گومان: ئایا نیەتی هێناوە، یان نا؟ یان کەوتە گومان: ئایا نیەتەکەی ڕاست بووە، یان هەڵە بووە؟ ئەوە ئەگەر هیچ واجبێکی نوێژی نەکردو لە ماوەیەکی‌کورتدا هاتەوە بیری: کە نیەتی هێناوەو نیەتەکەشی ڕاست بووە، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام ئەگەر ماوەی بیرکردنەوەی درێژ بوو، ئینجا هاتەوە بیری: کە نیەتی هێناوەو نیەتەکەشی ڕاست بووە، یان لە حاڵەتی‌گوماندا واجبێکی کرد، وەك بەشێکی لە (فاتیحة) خوێند، یان ڕوکووعی برد، ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا نوێژی بەتاڵ دەبێ.

هەروەها ئەگەر نیەتی هێنا: نوێژەکەی ببڕێ، یان کەوتە گومان: ئایا نوێژەکەی ببڕێ، یان بەردەوام بێ، یان نیەتی هێنا: ئەگەر شتێك ببێ، یان شتێك نەبێ نوێژەکەی ببڕێ، لەو سێ مەسەلەیەشدا نوێژی بەتاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر نەکەوتە گومان بەڵکو تەنها (وَسْوَسَة)ی تووش بوو، ئەوە زیانی نیە، هەروەك (المجموع)و (مغنی)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

هەروەها ئەگەر لە ناو نوێژدا نیەتەکەی بۆ نوێژێکی‌تر بگۆڕێ: وەك لە ناو نوێژی‌نیوەڕۆدا نیەتی نوێژی‌عەسر بێنێ، یان بە بێ‌عوزر نیەتی نوێژێکی‌سوننەت بێنێ، ئەوە هەردوو نوێژەکەی بەتاڵ دەبن، واتە: نوێژەکەی ئێستاو هەم ئەوەش کە نیەتی بۆ هێناوە.

بەڵام ئەگەر لە ناو نوێژێکی‌واجبدا نیەت بێنێ: بیکاتە سوننەتێکی بێ‌ناوی دوو ڕکعەتی تاکو فریای جەماعەت کردن بکەوێ، ئەوە دروستەو بۆی دەبێتە سوننەت، چونکە عوزری بە دەستە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ٣-﴿ ڕاوەستان بە پێوە ﴾

(اَلثَّالِثُ) سێیەم لە ڕوکنەکانی‌نوێژ: (اَلْقِيَامُ) ڕاوەستانە بە پێوە: بۆ (الله أکبر)ی نوێژدابەستن‌و بۆ فاتیحەخوێندن (فِي فَرْضِ الْقَادِرِ) لە نوێژە واجبەکەی ئەو کەسەدا: کە

توانای ڕاوەستانی هەبێ، هەرچەند ڕاوەستانەکەش بە هۆی پاڵوێدانیشتێکیتر بێ: وەك دیوارو گۆچان، یان بە یارمەتیکەسێکیتر بێ، هەر واجبە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن عمرانﷺ: قالَ النَّبِيُّﷺ: صَلِّ قائماً، فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقاعداً، فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلى جَنْبٍ﴾ رواه البخاري، زاد النسائي: ﴿فَإنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَمُسْتَلْقِياً﴾. بە پێوە نوێژیواجب بکە، جا ئەگەر توانات نەبو، بە دانیشتنەوە نوێژ بکە، جا ئەگەر توانات نەبو، لە سەر تەنیشت نوێژ بکە، ئەگەر توانات نەبو، لە سەر پشت نوێژ بکە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە نوێژی سوننەتدا ڕاوەستان بە پێوە واجب نیە، هەروەها ئەگەر کەسێك بە پێوە نوێژی کردبا میزی لێدەچکاوە، یان بای لێبەردەبو، بەڵام ئەگەر بە دانیشتوویی بیکا میزەکە، یان بایەکە دەوەستا، ئەوە واجبە بە دانیشتوویی نوێژ بکا، دووبارەکردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەك لە خوێنچڕکەدا باسمان کرد، هەروەها ئەگەر کەسێك چاودێری لەشکری دوژمن بوو و ئەگەر بە پێوە نوێژی کردبا، ئاشکرا دەبوو و پلانەکە تێك دەچوو، یان چەند چەکدارێکیئیسلام لە (کَمِین)-مەکۆدا بن، ئەگەر بە پێوە نوێژ بکەن ئاشکرا دەبنو پلانەکە تێك دەچوو، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا دروستە: بە دانیشتوویی نوێژ بکەن، بەڵام لە سەر هەردوو لا واجبە نوێژەکەیان دووبارە بکەنەوە.

ئینجا بزانە: سوننەتە بە قەد بستێك پێیەکانی لێك جیا بکاتەوە: هەم لە ڕاوەستانداو هەم لە کاتی سوجدەدا، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، بەڵگەی ئەندازەی نێوان پێیەکانیش ئەم حەدیسەیە: ﴿عن أبيهريرةﷺ: قال النَّبِيُّﷺ: إذا صَلّى أحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ نَعْلَيْهِ بَيْنَ رِجْلَيْهِ﴾ رواه ابوداود بسندصحيح، هەر کاتێك یەکێکتان نوێژی کرد، با هەردوو کەوشەکانیخۆی لە نێوان هەردوو پێیەکانی دابنێ.

هەروەها سوننەتە: پەنجەی پێیەکانی ڕوو لە قیبلە بکا، بەڵام ناپەسندە: پێیەکی بە پێش پێیەکەیتری بێخێ، یان بە بێعوزر لە سەر یەك پێی ڕابوەستێ، هەروەك لە (المجموع) دا فەرموویەتی.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی بە پێوە ڕاوەستان ئەوەیە (نَصْبُ فَقارِهِ) زنجیرەی پشتی بە تەواوی ڕاست ببێتەوەو لە سەر پێیەکەی خۆی ڕابوەستێ، کەوابو: (فَإنْ وقَفَ) ئەگەر بە پێوە ڕاوەستا (مُنْحَنِياً) بەڵام بەرەو پێشەوە، یان پشتەوە بە قەسدی خۆی چەماندەوە (أوْ مائِلاً) یان بەرەو ڕاستە، یان چەپە بە قەسدی خۆی خوار کردەوە، یان لە سەر پێی خۆی ڕانەوەستا، بەڵکو بە دەستەکانی خۆی هەڵواسی بوو (بِحَيْث لا يُسَمَّى قائِماً) بە جۆرێکی وەها: کە پێی نەدەگوترا: ڕاوەستاو (لَمْ يَصِحَّ) ڕاوەستانەکەیدروست نیە، چونکە واجبەکەی بەجێ نەهێناوە.

فَإِنْ لَمْ يُطِق انْتِصَاباً وَصَارَ كَرَاكِعٍ فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ يَقِفُ كَذلِكَ، وَيَزِيدُ إِنْحِنَاءَ هُ لِرُكُوعِه إِنْ قَدِرَ، وَلَوْ أَمْكَنَهُ الْقِيَامُ دُونَ الرُّكُوعِ وَالسُّجُود قَامَ وَفَعَلَهُمَا بِقَدْرِ إِمْكَانِه، وَلَوْ عَجَزَ عَنِ الْقِيَامِ قَعَدَ كَيْفَ شَاءَ، وَافْتِرَاشُهُ أَفْضَلُ مِنْ تَرَبُّعِه فِي الأَظْهَرِ، وَيُكْرَهُ الإِقْعَاءُ بِأَنْ يَجْلِسَ عَلَى وَرِكَيْه نَاصِباً رُكْبَتَيْه،

---

(فَإِنْ لَمْ يُطِقْ اِنْتِصاباً) جا ئەگەر تواناى نەبو پشتى ڕاست بكاتەوە (وَصارَ كَراكِعٍ) وەكو حاڵەتىڕوكوع پشتى چەما بوەوە: بە هۆى پیرى، یان نەخۆشى (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەى ڕاست ئەمەیە: (أَنَّهُ يَقِفُ كَذلِكَ) واجبە بە پێوە بە پشت چەماوەیى ڕابوەستێ (وَيَزِيدُ اِنْحِناءَهُ لِرُكُوعِهِ) هەروەها واجبە: بۆ ڕوكوع زیاتر خۆى بچەمێنێتەوە (إِنْ قَدِرَ) ئەگەر تواناى هەبێ.

(وَلَوْ أَمْكَنَهُ الْقِيامُ) ئەگەر بۆى گونجا بە پێوە ڕابوەستێ (دُونَ الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ) بەڵام نەدەگونجا ڕوكوعو سوجدە ببا، چونكە نەخۆشىی پشتى هەبو، یان لە بەر هۆیەكىتر (قامَ) ئەو كاتە واجبە بە پێوە ڕابوەستێ (وَفَعَلَهُما) ڕوكوع و سوجدەش بە پێوە دەبا (بِقَدْرِ إِمْكانِهِ) بەگوێرەى بۆگونجانى خۆى، واتە: تۆزێك پشتى دەچەمێنێتەوە.

جا ئەگەر تواناى نەبو، ئەو كاتە سەرو ملى دەچەمێنێتەوە، جا ئەگەر ئەو توانایەشى نەبو، ئەو كاتە بە چاوەكانى ئاماژەیان بۆدەكا، بەڵام ئەگەر تەنها تواناى ڕوكووعى هەبو، ئەو كاتە ڕوكووع دەبا، ئینجا بۆ سوجدەش ڕوكووعەكە دووبارە دەكاتەوە، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ما أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ ما اسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الشيخان، هەر فەرمانێكم پێكردن، ئەوەندەى تواناتان هەیە فەرمانەكەم بەجێ بێنن.

## ﴿ نوێژكردن بە دانیشتنەوە ﴾

(وَلَوْ عَجَزَ عَنِ الْقِيامِ) ئەگەر تواناى نەبو لە نوێژى واجبدا بە پێوە ڕابوەستێ؟ چونكە هەردوو پێى نەبون، یان نەخۆشىی زیاد دەبو، یان ئازارێكى بەهێزى تووش دەبو، یان مەترسى لەناوچوونى هەبو (قَعَدَ) واجبە: بە دانیشتنەوە بەرەو قیبلە نوێژە واجبەكە بكا (كَيْفَ شاءَ) هەر جۆرە دانیشتنێكى حەز دەكا، بە بەڵگەى حەدیسەكەى (عمران)ىڕابردوو.

(وَافْتِراشُهُ) بەڵام دانیشتنى(افْتِراش)، واتە: لە سەر پێى چەپە دابنیشێو پێى ڕاستەش دابچەقێنێ، ئەو شێوەیە (أَفْضَلُ) خێرى زیاترە (مِنْ تَرَبُّعِهِ) لە دانیشتنى چوارگۆشەیى (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەى بەهێزتردا (وَيُكْرَهُ الإِقْعاءُ) ناپەسندە لە نوێژدا بە هەڵتوتكایى دابنیشێ (بِأَنْ) بەو جۆرە: (يَجْلِسَ عَلَى وَرِكَيْهِ) لە سەر هەردوو لاقینگى دابنیشێو (ناصِباً رُكْبَتَيْهِ) هەردوو ڕانو ئەژنۆیەكانیشى بەرز بكاتەوە بۆ بەرامبەر پەراسووەكانى.

ثُمَّ يَنْحَنِي لِرُكُوعِهِ بِحَيْثُ تُحاذِي جَبْهَتُهُ مَا قُدَّامَ رُكْبَتَيْهِ، وَالأَكْمَلُ أَنْ تُحَاذِيَ مَوْضِعَ سُجُودِهِ، فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الْقُعُودِ صَلَّى لِجَنْبِهِ الأَيْمَنِ، فَإِنْ عَجَزَ فَمُسْتَلْقِياً،

---

(ثُمَّ) ئینجا ئەو کەسەی بە دانیشتنەوە نوێژ دەکا (يَنْحَنِي لِرُكُوعِهِ) واجبە بۆ ڕوکووع خۆی کووڕ بکاتەوە (بِحَيْثُ) بە جۆرێکی وەها: (تُحاذِي جَبْهَتُهُ) نێوچاوانی بەرامبەر بێ (ماقُدَّامَ رُكْبَتَيْهِ) لە گەڵ پێشەوەی ئەژنۆیەکانی، ئەوەیان لای کەمی بوو (وَالأَكْمَلُ) لەوەش تەواوتر ئەمەیە: (أَنْ تُحاذِيَ مَوْضِعَ سُجُودِهِ) ئەوەندە بۆ ڕوکووع خۆی کووڕ بکاتەوە تا نێوچاوانی دەگاتە بەرامبەر شوێنی سوجدەی، ئاشکراشە: واجبە بە تەواوی سوجدە ببا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە شوێنێکی نەوی‌دا بەند کرابو، یان لە ترسی باران چوبوە شوێنێکی نەوی‌و نەیدەتوانی تەواو خۆی ڕاست بکاتەوەو شوێنێکی‌تریش نەبو، ئەو کاتە بە گوێرەی گونجان بۆی دروستە: بە چەماوەیی، ئەگەر نا: بە دانیشتوویی نوێژەکە بکا، دووبارەکردنەوەشی لە سەرنیە، بەڵگەش حەدیسەکەی (ماأمَرْتُكم)ی‌ڕابردووە.

هەروەها ئەگەر پزیشکێکی باوەڕپێکراو گوتی: ئەگەر لە سەر پشت نوێژ بکەی چاوت دەرمان دەبێ، ئەو کاتە بۆی دروستە: بە پێوە نوێژ نەکا، واتە: لە سەر پشت نوێژ بکا، دووبارەکردنەوەشی لە سەر نیە، لە (نهاية)و (الشبراملسى)دا ئەو دوو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(فَإِنْ عَجَزَ عَنِ الْقُعُودِ) جا ئەگەر توانای نەبو بە دانیشتنەوە نوێژە واجبەکە بکا؟ چونکە نەخۆشی‌ی زیاد دەبو، یان مەترسیەکانی‌تری‌ڕابردووی هەبون (صَلَّى لِجَنْبِهِ) واجبە: لە سەر تەنیشتی ڕوو لەقیبلە نوێژە واجبەکە بکا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (عمران)ی‌ڕابردوو (الأَيْمَنِ) سوننەتە لە سەر تەنیشتی ڕاستە نوێژەکە بکا، واتە: بە بێ‌عوزر ناپەسندە: لە سەر تەنیشتی چەپە نوێژ بکا.

(فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر لە سەر تەنیشتیش توانای نەبو، لە بەر هۆیەکانی‌ڕابردوو (فَمُسْتَلْقِياً) واجبە: لە سەرپشت نوێژ بکاو بەرەپێیەکانی بەرەو قیبلە بن‌و شتێکیش لە بن سەری دادەنێ تاکو ڕوخساریشی بەرەو قیبلەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (عمران)ی ڕابردوو.

ئینجا بزانە: ئەگەر نوێژکەری دانیشتوو و لە سەر تەنیشت‌و لە سەر پشت توانای ڕوکووع‌و سوجدەی هەبێ، واجبە بە تەواوی بیانبا، ئەگەر نا: بە سەری خۆی ئاماژەیان بۆ دەکاو سوجدەکەی لە ڕوکووع نزمتر دەبا، بەڵام ئەگەر دەیتوانی پێشەسەری، یان تەنیشتی سەری–کە لە لای زوڵفەوەیە– لە سەر زەمین دابنێ، ئەو کاتە واجبە دایبنێ.

وَلِلْقادِرِ اَلتَّنَفُّلُ قاعِداً وَكَذا مُضْطَجِعاً فِي الأَصَحِّ. اَلرَّابِعُ: اَلقِراءَ ةُ، وَيُسَنُّ بَعْدَالتَّحَرُّم دُعاءُ الإِفْتِتاحِ

---

جا ئەگەر نەیتوانی بە سەریش ئاماژە بۆ ڕوکووع و سوجدە بکا-وەك لە قنارە درابیّ- ئەو کاتە واجبە بە چاوەکانی ئاماژەیان بۆ بکا، جا ئەگەر بە چاوەکانیشی نەیتوانی ئاماژەیان بۆ بکا-وەك لە ترسیدوژمنێك خۆی بە مردوو بێنێتە بەرچاو- ئەو کاتە واجبە گشت کردارو گوفتارە واجبەکانینوێژ بەسەر دڵیدا بێنێ، بەڵگەش حەدیسەکەی (ماأمرتُكمْ)یڕابردووە.

ئینجا بزانە: لەو مەسەلانەیڕابردوودا لە هیچیان دووبارەکردنەوەی نوێژ واجب نیە، کەوابو: تا گیانی تێدا مابیّو تا هۆشی هەبیّ، نوێژی لە سەر لاناچیّ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردونەوە.

جا بزانە: ئەوەیڕابردوو دەربارەی نوێژیواجب بوو، چونکە (وَلِلْقادِرِ) بۆ ئەو کەسەی توانای ڕاوەسانی هەیە دروستە: (اَلتَّنَفُّلُ قاعِداً) بە دانیشتوویی نوێژیسوننەت بکا، جا هەر جۆرە سوننەتێك بیّ (وكَذا) هەروەها (مُضْطَجِعاً) لە سەر تەنیشتیشی بۆ دروستە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، هەرچەند توانای ڕاوەستانو دانیشتنیشی هەبیّ، بەلام واجبە بۆ ڕوکووع و سوجدە دابنیشیّ ﴿عن عمران﷜: قالَ النَّبيُّ ﷺ: مَنْ صَلَّى قائماً فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قاعِداً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِالْقائِم، وَمَنْ صَلَّى نائماً فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِالْقاعِدِ﴾ رواه البخاري، هەر کەسێك بە پێوە نوێژی سوننەت بکا، ئەوە خێری گەورەترە، هەر کەسێك بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت بکا، ئەوە نیوەی خێری بە پێوەی هەیە، هەر کەسێکیش بە پاڵدانەوە نوێژی سوننەت بکا، ئەوە نیوەی خێری دانیشتووی هەیە.

کەوابو: بە بیّعوزر نوێژی سوننەت لە سەر پشت دروست نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ٤-﴿ فاتیحە خوێندن ﴾

(اَلرَّابِعُ) چوارەم لە ڕوکنەکانینوێژ: (اَلْقِراءَةُ) خوێندنی سورەتی(الْفاتِحَة)یە، بە شێوەیەکی وەها: بەخۆی گوێی لە خوێندنیخۆی بیّ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيُسَنُّ) بۆ ئیمامو بۆ مەئمووم سوننەتە (بَعْدَالتَّحَرُّمِ) لە دوای(الله اكبر)ی نوێژدابەستن لە نوێژی سوننەتو واجبدا جگە لە نوێژی(جنازة): (دُعاءُ الافْتِتاحِ) ئەم دوعایەی (افْتِتاح) -کە هەم پیّی دەگوتریّ: (تَوَجُّه)- بخوێنیّ: ﴿وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذي فَطَرَ السَّماوات وَالْأَرْضَ حَنِيفاً مُسْلِماً وَمآ أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيايَ وَمَماتِي لِلَّهِ رَبِّ

الْعالَمِينَ لاشَرِيكَ لَهُ وَبِذلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسلِمِينَ﴾ رواه مسلم إلاّ (مُسْلِماً): فابن حبان.

ئینجا بزانه: ئیمام -به بیٚئیزنیمەئموموکان- لەو دوعایه زیاتر ناخوێنیٚ، بەلاٚم ئەگەر مەئمومەکان به درێژکردنی‌نوێژ ڕازی بون، یان به تەنها نوێژی دەکرد، ئەو کاتە چەند دوعاو زیکرێکی‌تریش سوننەتن: کە لە حەدیسی (صحیح)دا هاتونو لە زۆربەی سەرچاوەکاندا هێناویانن.

هەم فەرموویانه: ئەگەر بۆ نوێژدابەستن به پێوه نەگەیشتە ئیمام، یان گەیشتیٚ بەلاٚم ترسی هەبو فاتیحەی به تەواوی پیٚ نەخوێندریٚ، یان به قەسدی، یان به هەڵە دەستی به (أعوذُ بِالله)، یان (بِسْمِ الله) کرد، لەو حاڵەتانەدا دوعای (إفتِتاح) سوننەت نیه.

جا بزانه: مەرجی ئەو مەئمومانەی به درێژکردنی‌نوێژ ڕازینە: دەبی ژمارەیان دیاربیٚو کەسی‌تر نێتە گەڵیانو کۆیلەو ژنی به مێردو کارکەری بەکرێگیراویشیان لە گەڵدا نەبیٚ، هەروەك لە (تحفه)و (نهایه)دا فەرموویانه.

(ثُمَّ التَّعَوُّذُ) ئینجا لە دوای دوعای‌ڕابردوو-پێش دەست پێکردنی‌فاتیحە- سوننەته بڵیٚ: (أعوذُ بِالله مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ)، خوای گەورە دەفەرمویٚ: ﴿فَإِذا قَرَأْتَ الْقُرآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ﴾ هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنی خۆت به خوای گەورە بپارێزە لە شەیتانی تێهەڵدراو. جا ئەگەر دوعایەکەی‌ڕابردوو نەشخوێنیٚ، (أعُوذُ بِالله) هەر سوننەتە، بەلاٚم ئەگەر دەستی به فاتیحەخوێندن کرد، ئەو کاتە سوننەتەکەی لە دەست دەچیٚ.

(وَيُسِرُّهُما) سوننەتە بۆ ئیمامو بۆ مەئموم: دوعای (إفتِتاح)و (أعوُذُ بِالله) هەردووکیان به دەنگی نهێنی بڵێن، به جۆرێکی وەها: بەخۆی گوێی لیٚبیٚ، هەر چەند نوێژەکەش به دەنگ هەڵێنان بیٚ.

(وَيَتَعَوَّذُ فِي كُلِّ رَكعَةٍ) سوننەتە: لە هەموو ڕەکعەتێکدا (أعوُذ بِالله) بکا (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی بەهێزی‌مەزهەب، چونکە لە هەر ڕەکعەتێکدا فاتیحەیەکی نویٚ دەخوێنیٚ (وَالأُولى) بەلاٚم (أعُوذُ بِالله)کردن لە ڕەکعەتی یەکەمدا (آكَدُ) زیاتر خێرترە، چونکە زانایان لە سەری یەکدەنگن.

ئینجا بزانه: (أعوُذ بِالله)کردن سوننەتە بۆ هەر کەسێکی بیەویٚ قورئان بخوێنیٚ، جیاوازی نیه: لە سەرەتای سورەتەوە دەست پیٚ بکا، یان لە ناوەوە، جا لە نوێژدا بیٚ، یان لە دەرەوەی نوێژدا بیٚ، بەلاٚم لە دەرەوەی نوێژدا سوننەتە به دەنگ هەڵێنان (أعُوذُ بِالله) بڵیٚ، جا ئەگەر به قسەکردن، یان بیٚدەنگبوونێکی‌درێژ قورئانخوێندنەکەی نەپچڕاندبیٚ، ئەوە یەك (أعُوذُ بِالله)کردن بەسە، بەلاٚم ئەگەر پچڕاندبێتی، دووبارەکردنەوەی سوننەتە،

هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتى، هەروەها (بِسْمِ اللهِ)كردنيش هـەمان ڕوونكردنـەوەى بۆ بڕيار دەدرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) وەردەگيرێ.

هەروەها بزانە: فاتيحەو سوڕەتى دواىفاتيحە لـە نوێـژدا بـە يـەك قوڕئانخوێنـدن دادەنـدرێن، هەروەك (الشبراملسى) فەرموويەتى، كەواتە: (أعوذ بالله)و (بسم الله)كردن بـۆ قوڕئانخوێنـدنى پاش فاتيحە سوننەت نيە، مەگەر لە سەرى سوڕەتەوە دەست پىێ بكا، ئەو كاتە دەبـى (بسـم الله)ى سوڕەتەكە بخوێنىێ، چونكە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم) ئايەتێكـە لـە سـەرەتاى گشـت سوڕەتێك—جگە لە سوڕەتى(بَراءَة)— هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە، واتـە: (بسـم الله) خوێندن لە سـەرەتاى (بَـراءَة)دا حەڕامـە، هـەروەك لـە (تحفـة)دا فەرموويـەتى، بـەلاّم لـە لاى (الرملى) ناپەسندە، هەروەك لە (الشروانى)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَتَتَعَيَّنُ الْفاتِحَةُ) واجبە سوڕەتىفاتيحە بخوێندرێ (فِى كُلِّ رَكْعَةٍ) لـە هـەموو ڕەكعەتێكـدا جياوازى نيە: نوێژەكە واجب بىێ، يان سوننەت بىێ، نوێژكەرەكەش گەورە بىێ، يان منـداڵ بىێ، يان مەئمووم بىێ، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿لاصَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفاتِحَـــةِ الْكِتابِ﴾ رواه الشيخان، نوێژى ئەوكەسە دروست نيە: كە فاتيحەى تىێدا نەخوێنىێ.

ئينجا بزانە: چەند حەديسێك كراونەتە بەڵگە: كە لە سەر مەئمووم واجب نيە لە نوێژى بە جەماعەتدا فاتيحە بخوێنىێ، بەلاّم حەديسەكان گشتيان (ضَعيف) -بىێهێـزن، هـــەروەك ئيمامى(النـواوى) لە (المجموع)دا ڕوونى كردونەوە (اِلاّ رَكْعَةَ مَسْبُوقٍ) تـەنها لـە ڕەكعـەتى ئەو مەئموومەدا فاتيحە واجب نيـە: كـە لـە ئيمـام دوا كـەوتبىێو مـاوەى فاتيحەخوێنـدنى نەمابىێ، هەروەك لە باسى (جماعة)دا ڕوونى دەكەينەوە، ان شاء الله تعالى.

(وَالْبَسْمَلَةُ) ئايەتى (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم) (مِنْهـا) ئايەتێكـە لـە سـەرەتاى سـوڕەتى فاتيحە، واتە: واجبە بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم) دەست بە فاتيحـە بكـا ﴿عَنِ أُمِّ سَـلَمَةَ رَضِىَالله عَنها: أَنَّ النَّبِيَّﷺ قَرَأَ بِسْـــمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم فِي أَوَّلِ الْفاتِحَةِ وَعَدَّها آيَةً﴾ حديث صحيح رواه ابن خزيمة، وقال الدارقطنى: هو اسـناد صـحيح. پێغەمبـەرﷺ لـە سـەرەتاى فاتيحەدا (بسم الله)ى خوێندو بە ئايەتێكى ژمارد.

كەوابو: لە هەر نوێژێكدا فاتيحە بە ئاشـكرا بخوێنـدرێ، (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم)ش بـە ئاشـكرا دەخوێنـدرێ ﴿عن نعيم: صَلَّيْتُ وَراءَ أَبِىهريرةﷺ فَقَرَأَ: بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم، ثُمَّ قَرَأَ بِأُمِّ الْقُرْآنِ...ثُمَّ يَقُولُ إِذا سَلَّمَ: وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ إِنِّى لأَشْبَهُكُمْ صَـــلاةً بِرَسُـــولِ اللهِﷺ﴾ رواه النسائى وابن خزيمة فى صحيحه وابن حبان فى صحيحه والـدارقطنى وقـال: هذا حديث صحيح، وقال البيهقى: هو اسناد صحيح، واتە: لە پشت (ابىهريرة) نوێژمان بە

جەماعەت کرد، ئەویش بە دەنگ (بِسْمِ اللهِ الرحْمن الرَّحِيم)ی خوێند، ئینجا فاتیحەی خوێند، ئینجا کە سەلامی‌نوێژی داوە، سوێندی خواردو فەرمووی: من زیاتر لە هەمووتان لە نوێژکردندا وەکو پێغەمبەرمﷺ.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوانەی دەڵێن: (بسم الله)خوێندن بە دەنگی‌ئاشکرا سوننەت نیە، بەڵگەیان ئەم حەدیسەیە: ﴿عن أنس: صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ فَكَانُوا يَفْتَتِحُونَ بِالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾ رواه الشيخان، زاد مسلم: ﴿لا يَذْكُرُونَ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ وفي رواية لـه: ﴿فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَداً مِنْهُمْ يَقْرَأُ بِسْمِ اللهِ الـرَّحْمنِ الـرَّحِيمِ﴾. (أنس) دەفەرموێ: نوێژم لە پشت پێغەمبەروﷺ ئیمامی (أبوبكر)و ئیمامی (عمر)و ئیمامی (عثمان) کردوە، یەکسەر دەستیان بە فاتیحەخوێندن دەکرد، گوێم لە یەکێکیان نەبو بە دەنگی‌ئاشکرا (بسم الله الرحمن الرحيم) بخوێنێ.

جا بزانە: لە مەزهەبی(شافعی)دا ڕەفتار بە حەدیسەکانی (أمّ سلمة)و(أبی‌هريرة)ی‌ڕابردوو و چەند حەدیسێکی‌تری (صحيح) کراوەو، ڕەفتار بەم حەدیسەی(أنس) نەکراوە، بە هۆی دوو (قاعدة)ی شەرعی:

یەکەم: (اَلإثْبَاتُ مُقَدَّمٌ عَلَى النَّفْيِ) هەبوون بە پێش نەبوون دێخرێ. کەواتە: حەدیسەکەی (ابی‌هريرة) (مُثْبِتٌ)و هەبوون دەفامێنێتەوە، بە پێش حەدیسەکەی (أنس) دێخرێ، چونکە (نافی)و نەبوون دەفامێنێتەوە.

دووەم: (إذا تَعارَضَتْ تَساقَطَتْ) هەر کاتێك بەڵگەکان دژ بەیەکتری بون، یەك بە دوای یەکتردا لە کار دەکەون. کەواتە: ئەو حەدیسانەی‌ڕابردووی (انس)، دژایەتییان هەیە لە گەڵ حەدیسێکی‌تری (انس): کە لە (البخاري)و (المستدرك)دا گێڕدراوەتەوەو (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم)ی بە دەنگ خوێندوەو فەرموویەتی: ﴿كانَتْ-أيْ قِراءَةُالنَّبِيِّﷺ-مَدًّا، ثُمَّ قَرَأَ (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم)...﴾الحديث. هەم لەگەڵ ئەم حەدیسەشیدا: ﴿عن سعيد بن زيد: سَأَلْتُ أَنَسَاً أَكانَ رسولُ اللهِﷺ يَسْتَفْتِحُ بِالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ أَوْ بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم؟ فَقالَ أَنَسٌ: إِنَّكَ لَتَسْأَلُنِي عَنْ شَيْءٍ ما أَحْفَظُهُ وَماسَأَلَنِي عَنْهُ أَحَدٌ قَبْلَكَ﴾ رواه الامام احمد وابن خزيمة والدارقطني وقال: اسناده صحيح، لە (أنس)م پرسی: ئایا پێغەمبەرﷺ یەکسەر دەستی بە (اَلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِين) دەکرد، یان بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم)؟ لە وەڵامدا فەرمووی: تۆ لە شتێکی وەها پرسیارم لێدەکەی: کە لەبیرم نەماوەو کەسیش لە پێش تۆوە ئەم پرسیارەی لێنەکردوم، واتە: نازانم.

کەوابو: دژایەتی لەو ئاڵۆزیەدا پەیدا بووە: کە (أنس) لە یەك بابەتدا سێ جۆرە حەدیسی هەنە: (هەبوون، نەبوون، نەزانین)، جا بەو دژایەتیە گشتیان لە کار دەکەونو

وَتَشْدِيدَاتُهَا، وَلَوْ أَبْدَلَ ضَاداً بِظَاءٍ لَمْ تَصِحَّ فِي الأَصَحِّ، وَيَجِبُ تَرْتِيبُهَا وَمُوَالاتُهَا، فَإِنْ تَخَلَّلَ ذِكْرٌ قَطَعَ الْمُوَالاةَ،

---

ڕەفتار بە حەدیسەکانی‌تری دەنگ هەڵێنان دەکرێ، هەروەك ئیمامی (النواوی) لە (المجموع)دا زۆر بە درێژی ئەو مەسەلەی ڕوون کردۆتەوە، والحمدلله رب العالمین.

(وَتَشْدِيدَاتُهَا) هەروەها گرتنی پیتە تێکنراوەکان بەشێکە لە فاتیحەو واجبە بەجێی بێنێ، کەوابو: ئەگەر پیتێکی‌تێکنراوی لێك هەڵوەشاندەوە، یان نەیگرت، ووشەکە غەڵەت دەبێ، وەك بڵێ: (اَلْرَحْمنِ) یان (إِياكَ) یان (إِهْدِنا صِراطَ الْمُسْتَقِيم)، بەڵام ئەگەر پیتێکی سوکی گرت، وەك بڵێ: (مالِكٌ)، یان (نَعبُدُّ) یان (الْمَغْضُوبٌ) ئەوە خراپە، بەڵام خوێندنەوەیشی دروستە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها واجبە: گشت پیتەکانی فاتیحە بە بێ‌گۆڕین بخوێندرێنەوە، کەوابو: (وَلَوْ أَبْدَلَ ضاداً بِظاءٍ) ئەگەر پیتی(ض) بە پیتی(ظ) بگۆڕێ، وەك بڵێ: (وَلاالظّالِين)، (لَمْ تَصِحَّ فِي الأَصَحِّ) ئەم خوێندنەوەیە دروست نیە، لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها (بِثْمِ اللهِ)، یان (الرَّعْمنِ الرَّعِيمِ)، یان (الّزِينَ)، یان (أَنْحَمْتَ حَلَيْهِمْ)، یان لە سەرو ژێرو بۆردا هەڵە بکا، وەك بڵێ: (أَنْعَمْتُ)، یان (إِيّاكِ)و هەر هەڵەیەکی‌تر: کە واتەی ووشەکە بگۆڕێ، ئەوانە هیچیان دروست نینەو نوێژەکەش دروست نیە ئەگەر بە قەسدی بێ، یان لە فێربووندا کەمتەرخەمی‌ی کردبێ، کەوابو: واجـــبە خۆی فێرە خوێندنەوەی ڕاست بکاو، هەروەها واجبە ئەو نوێژانەش قەزا بکاتەوە: کە لە کاتی کەمتەرخەمی‌دا کردونی، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر توانای فێربوونی نەبو، ئەو کاتە نوێژەکەی‌خۆی دروستە، بەڵام ئیمامەتی‌ی دروست نیە، چونکە (أُمِّيّ)یە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانەو لە نوێژی جەماعەتدا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(وَيَجِبُ تَرتِيبُها) واجبە: بەو ڕیزە فاتیحە بخوێنێ: کە پێغەمبەرﷺ خوێندویەتی‌و لە قورئاندا نووسراوەتەوە، کەواتە: دروست نیە پێش‌و پاشی بکا (وَمُوالاتُها) هەروەها واجبە: بە دوای‌یەکدا فاتیحە بخوێنێ، کەوابو: (فَانْ تَخَلَّلَ ذِكْرٌ) ئەگەر زیکرێکی خستە نێوان ئایەتەکانی فاتیحە: وەك لە کاتی پژمیندا بڵێ: (اَلْحَمْدُلله)، یان هەر زیکرێکی‌تر بکا: کە پەیوەندی بە نوێژەوە نەبێ، وەك بڵێ: (سُبْحانَ الله) بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسێك: کە ئیمامی‌خۆی نەبێ، ئەوە (قَطَعَ الْمُوالاةَ) فاتیحە لێك دەپچڕێنێ، ئەگەر بە قەسدی زیکرەکەی کردبێ، بەڵام نوێژەکە بەتاڵ نابێ، کەوابو: واجبە لە سەرەتای‌فاتیحەوە دەست پێ‌بکاتەوە، بەڵام ئەگەر زیکرەکە بە قەسدی نەبو، بەڵکو بە سەهوو، یان بە

فَإِنْ تَعلَّقَ بِالصَّلاَة كَتأمينه لقراءَة إمَامه وَفَتحه عَلَيْه فَلاَ فِي الأَصَحِّ، وَيَقْطَعُ السُّكُوتُ الطَّوِيلُ وَكَذا يَسيرٌ قَصَدَ بِه قَطعَ القِرَاءَة فِي الأَصَحِّ، فَإِنْ جَهِلَ الْفَاتحَةَ

---

نەزانی بوو، یان بە قەسدی ئایەتێکیفاتیحەی دووبارە کردەوە، یان چونکە گومانی لە خوێندنەوەیدا هەبو، لەو حاڵەتانەدا فاتیحە ناپچڕێو لە سەر خوێندنەوەکەی بەردەوام دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ تَعلَّقَ بِالصَّلاة) بەڵام ئەگەر زیکرەکە پەیوەندی بە نوێژەوە هەبو (كَتَأمِينِه) وەك مەئمووم لە ناو فاتیحەدا بڵێ: آمین (لِقِرَاءَة إِمامه) لە بەر خوێندنی ئیمامەکەی، واتە: کە ئیمامەکەی لە کۆتایی فاتیحەدا گوتی: (وَلا الضَّالِّين) ئەویش بڵێ: آمین (وَفَتْحه عَلَيْه) هەروەها وەکو پێگوتنی ئیمام لەو کاتەی بێدەنگ دەبێ، یان خوێندنی لێتێك دەچێ، یان گوتنی (سُبْحانَ الله) بۆ ئاگادارکردنەوەی ئیمامیخۆی، یان سوجدەی(تِلاوة) لە گەڵ ئیمامەکەیدا ببا، بەوانە (فَلا) فاتیحە ناپچڕێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو مەسەلەکاندا سوننەتە: لە سەرەتای فاتیحەوە دەست پێبکاتەوە، هەروەك سەرچاوەکان فەرموویانە.

(وَيَقْطَعُ السُّكُوتُ الطَّوِيلُ) بێدەنگبوونێکیدرێژ فاتیحە دەپچڕێنێ، واتە: لە بێدەنگبوونی پشوودانو ماندووبوون درێژتربێو بە قەسدیش بێ، کەوابو: واجبە لە سەرەتای فاتیحەوە دەست پێبکاتەوە، بەڵام ئەگەر بە قەسدی نەبو، بەڵکو بە سەهوو بوو، یان ماندوو بوو، یان نەیدەزانی حەرامە، یان بۆ ئەوە بێدەنگ بوو: تاکو ئایەتی بێتەوە بیر، لەو حاڵەتانەدا فاتیحە ناپچڕێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَكَذا) هەروەها (يَسيرٌ) بێدەنگبوونێکی کەمیش فاتیحە دەپچڕێنێ (قَصَدَ بِهِ قَطْعَ القِرَاءَة) کە مەبەستی بەو بێدەنگبوونە: پچڕاندنی خوێندنیفاتیحەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە پێش چوونە ڕوکووع، یان لە ڕوکووعدا–واتە: یان لە سوجدەدا– هاتەوە بیری: کە فاتیحەی نەخوێندوە، یان کەوتە گومان: ئایا فاتیحەی خوێندوە، یان نا؟ لەو حاڵەتانەدا واجبە: یەکسەر بێوەستان بگەڕێتەوەو لە سەرەتای فاتیحەوە دەست پێ بکاتەوە، ئەگینا: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان لێرەداو لە ڕوکنی سێزدەمدا ڕوونیان کردۆتەوە، ئێمەش لەوێدا درێژتر ڕوونی دەکەینەوە،إن شاء الله تعالى.

(فَإِنْ جَهِلَ الْفَاتِحَةَ) جا ئەگەر هیچ ئایەتێکی فاتیحەی نەزانی، چونکە مامۆستای نەبو، یان نازیرەك بوو، یان نووسراوێکی دەست نەکەوت تێیدا بخوێنێ، یان کرێی فێربوونی

**فَسَبْعُ آيَات مُتَوالِيَةٌ فَإِنْ عَجزَ فَمتفرّقَةٌ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنصُوصُ جَوَازُ الْمُتَفرِّقَة مَـعَ حفْظه مُتَوالِيَةً وَاللهُ أَعْلَمُ، فَإِنْ عَجزَ أَتَى بِذِكْرٍ، وَلاَ يَجُوزُ نَقْصُ حُرُوفِ الْبَـدَلِ عَـنِ الْفَاتحَة فِي الأَصَحِّ،**

---

نەبو (فَسَبْعُ آياتٍ مُتَوالِيَةٌ) واجبە لە جیاتی فاتیحە حەفت ئایەتی‌تری قورئـان بـە دوای یەکتردا بخوێنێ (فَـإِنْ عَجَـزَ) جـا ئەگـەر توانـای حـەفت ئایـەتی بـە دوای یـەکتری نـەبو (فَمُتَفرِّقَةٌ) دەبی حەفت ئایەتی جیا جیا بخوێنێ.

(قُلْت) ئیمامی (النواوی) دەفـەرموێ: (الأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) دەققـی فـەرموودەی ڕاسـتتر ئەوەیە: (جَوازُ الْمُتَفَرِّقَةِ) دروستە: حەفت ئایەتی جیا جیـا بخـوێنێ (مَـعَ حِفْظِـهِ مُتَوالِيَـةً) هەر چەند حەفت ئایەتیشی بە دوای یەکتردا لەبەر بێ (وَاللهُ أَعْلَم) جیاوازی نیە: گشتی لـە یەك سورەتدا بن، یان لە چەند سورەتی جیا جیـادا بـن، ئینجـا بزانـە: لـە حـەفت ئایـەت زیاتر دروستە، بەڵام کەمتر دروست نیە، هەر چـەند ئایەتـەکانیش درێـژ بـن، هـەروەك لـە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر قورئانیشی نەزانی (أَتَى بِذِكْرٍ) واجبـە: لەجیاتی‌فاتیحە حـەفت جـۆرە زیکر بخوێنێ ﴿عن رفاعةﷺ: دَخَلَ رَجُلٌ يُصَلِّي فِي ناحِيَةِ الْمَسْجد...إلى أَنْ قال لَهُ النَّبِيُّﷺ: إذا أَرَدْتَ أَنْ تُصَلِّيَ فَتَوَضَّأْ كَما أَمَرَكَ اللهُ، ثُمَّ تَشَهَّدْ فَأَقِمْ ثُمَّ كَبِّرْ، فَإِنْ كانَ مَعَكَ قُرْآنٌ فَـاقْرَأْ بِهِ وَإِلاّ فَاحْمَدِاللهَ وَكَبِّرْهُ وَهَلِّلْهُ ثُمَّ ارْكَعْ...﴾ الحديث، رواه ابوداود والترمذی وقـال: حـديث حسن، پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: هـەرکاتێ ویسـتت نوێـژ بکـەی، دەسـتنوێژ بگـرە وەك خوا فەرمانی پێ‌کردوی، ئینجا شادە بێنە- یان واتە: بانگ بـدە- جـا ئیقامـەت بکـە، ئینجا (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بڵێ، جا ئەگەر قورئان دەزانی بیخوێنە، ئەگەر نا: لـەجیاتی فاتیحە زیکری‌خوا بکەو بڵێ: (اَلْحَمْدُ للهِ اَللهُ أَكْبَر لاإِلَهَ إِلاّالله)، ئینجا ڕوکووع ببە.

کەوابو: هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: دروست نیە: نە فاتیحەو نە ئایەتەکانی‌تری قورئـان لە عەرەبیەوە بگۆڕدرێن بـۆ زمـانێکی‌تر، بـەڵام ئەگـەر زیکرەکـانی بـە عـەرەبی نـەزانێ‌و توانای فێربوونیشی نەبو، ئەوان دروستە بـە زمـانێکی‌تر بگـوترێن، هـەروەك (الله اکبر)ی نوێژدابەستنیش دروست بوو بۆ زمانێکی‌تر بگۆڕدرێ‌و لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلا يَجُوزُ) دروست نیە (نَقْصُ حُـرُوفِ الْبَـدَلِ) پیتـەکانی جێگری‌فاتیحـە کـەمتر بـن (عَنِ الْفاتِحَةِ) لە پیتەکانی‌فاتیحە (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جـا جێگرەکـە: ئایـەتی قورئان بن، یان زیکر بـن، واتـە: واجبـە ژمـارەی پیتـەکان بگاتـە (١٥٦) پیـت: کـە کـۆی پیتەکانی فاتیحەیە، جا ئەگەر زیاتر بون زیانی نیە، ئیتر هیچ زیکرێکی تایبەت لە جیـاتی فاتیحە دیاری نەکراوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

فَإِنْ لَمْ يُحْسِنْ شَيْئاً وَقَفَ قَدْرَالْفَاتِحَةِ، وَيُسَنُّ عَقِبَ الْفَاتِحَةِ آمِينَ خَفِيفَةَ الْمِيمِ بِالْمَــدِّ، وَيَجُوزُ الْقَصْرُ،

---

(فَإِنْ لَمْ يُحْسِنْ شَيْئاً) جا ئەگەر هیچی لە قورئان‌و لە زیکر نەزانی‌و نەیتوانی نە بە عەرەبی‌و نە بە زمانێکی‌تر فێرە زیکر ببێ (وَقَفَ قَدْرَ الفَاتِحَةِ) واجبە بە ئەندازەی فاتیحە خوێندنێك بە بێ‌دەنگ بە پێوە ڕابوەستێ، ئینجا ڕوکووع بیا، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ما أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَأْتُوا مِنْهُ ماااستَطَعْتُمْ﴾ رواه الشيخان، هەر فەرمانێکم پێ‌کردن، ئەوەندەی تواناتان هەیە فەرمانەکەم بەجێ بێنن.

کەوابو: ئەگەر کەمتەرغەمی لە فێربووندا نەکردبو، قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، بەڵام هەر کەسێك لە فێربووندا کەمتەرغەمی کردبێ، واتە: دەگونجا خۆی فێرە فاتیحە بکاو بە قەسدی خۆی فێر نەکرد، ئەوە گوناهبار دەبێ‌و هەم واجبە: ئەو نوێژانەی بە بێ‌فاتیحە کردونی گشتیان قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو، دەربارەی ئەو کەسە بوو: کە هیچ ئایەتێك لە فاتیحە نەزانێ، چونکە ئەگەر ئایەتێك، یان زیاتری لە فاتیحە دەزانی، ئەو کاتە واجبە: بیخوێنێ‌و هەم واجبە ڕیزی فاتیحەش بپارێزێ، واتە: ئەگەر لە سەرەتای فاتیحە هەندێکی دەزانی، واجبە: لە پێشدا بیخوێنێ، ئینجا بە ئەندازەی ئەوەش: کە نایزانێ، ئایەتەکان بخوێنێ، جا ئەگەر ئایەتەکانیشی نەزانین، زیکر بکا، هەروەها ئەگەر لە کۆتایی فاتیحە هەندێکی دەزانی، ئەو کاتە واجبە: لە پێشدا بە ئەندازەی نەزاندراوەکە ئایەت بخوێنێ، جا ئەگەر ئایەتی نەزانی زیکر بکا، ئینجا ئەوەندەی لە فاتیحە دەزانێ بیخوێنێ.

هەروەها ئەگەر لە ناوەندی فاتیحە هەندێکی دەزانی، ئەو کاتەش لە پێشدا ئایەت، یان زیکر، ئینجا ئەوەندەی لە فاتیحە دەزانی، ئینجا ئایەت، یان زیکر، تا ئەندازەی فاتیحە تەواو دەبێ، کەواتە: ئەگەر جگە لە ئەوەندەی فاتیحە هیچ قورئان‌و هیچ زیکرێکی‌تری نەدەزانی، واجبە: بە ئەندازەی‌فاتیحە دووبارەو سێ‌بارەی بکاتەوە، هەروەهاش ئەگەر تەنها کەمتر لە حەفت ئایەتی دەزانی، یان تەنها کەمتر لە حەفت زیکری دەزانی، واجبە بە ئەندازەی فاتیحە دووبارەو سێ‌بارەی بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُسَنُّ) سوننەتە: بۆ فاتیحەخوێن (عَقِبَ الْفَاتِحَةِ) هەر کە فاتیحەی تەواو کرد، بڵێ: (آمِين). جا لە نوێژدابێ، یان لە دەرەوەی نوێژدابێ، بەڵام لە نوێژدا خێرترە (خَفِيفَةَ الْمِيمِ) میمەکە بە سووکی بخوێنێتەوە، واتە: نەیگرێ (بِالْمَدِّ) ئەلیفەکەش درێژ بکاتەوەو بڵێ: ئامین. واتە: خوایە قبوڵی بکە (وَيَجُوزُ الْقَصْرُ) دروستە: ئەلیفەکە بە کورتیش بخوێنیتەوەو بڵێ: ئەمین، چونکە واتەکەی تێك ناچێ ﴿عن أبي‌هريرة ووائل بن حُجْر

وَيُؤَمِّنُ مَعَ تَأمِينِ إمامِهِ، وَيَجْهَرُ بِهِ فِي الأَظْهَرِ، وَتُسَنُّ سُورَةٌ بَعْدَ الْفَاتِحَـــةِ إلاّ فِي الثَّالِثَـــةِ والرَّابِعَةِ فِي الأَظْهَرِ،

---

رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـــا: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ اذا فَرَغَ مِنْ قِراءَةِ أُمِّ الْقُرْآنِ رَفَعَ صَوتَهُ فَقالَ: آمِـــين﴾ رواه ابوداود وغيره باسناد حسن، پێغەمبەر ﷺ کاتێ فاتیحەی تەواو دەکرد، دەنگی هەڵدێناو دەیفەرموو: آمین.

(وَيُؤَمِّنُ) هەروەها بۆ مەئموومیش سوننەتە بڵێ: آمین (مَعَ تَأمِينِ إمامِهِ) لە گەڵ (آمین)ی ئیمامەکەی لە نوێژی بە ئاشکرادا، جا ئەگەر ئیمامەکەش نەڵێ: آمین. بۆ مەئمووم هەر سوننەتە: بیڵێو (وَيَجْهَرُ بِهِ) دەنگیشی ئاشکرا بکا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا قالَ الامامُ: غَيْرِالْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاالضَّالِّينَ. فَقُولُوا: آمين. فَإنَّهُ مَنْ وافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلائكَةِ غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِـــهِ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك ئیمام لە فاتیحەخوێندنەدا (غَيْرِالْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاالضَّالِّينَ)ی تەواو کرد، ئێوە بڵێن: آمین. چونکە هەر کەسێك (آمین)یخۆی لەگەڵ (آمین)ی (ملائکة) پێکەوە بگوترێن، لە تاوانە بچوکەکانیڕابردووی دەبووردرێ.

ئینجا بزانە: سوننەتە: لە دوای(وَلاالضَّالِّين) کەمێك بێدەنگ بێ، ئینجا بڵێ: (آمین)، تاکو بزاندرێ: ووشەی(آمین) بەشێکی فاتیحە نیە، هەروەك لە (المجموع)و(تحفة)دا فەرموویانە.

## ﴿ قورئان خوێندن لە دوای فاتیحە ﴾

(وَتُسَنُّ) سوننەتە: بۆ ئیمامو بۆ ئەو کەسەش: کە نوێژ بە تەنهایی دەکا (سُورَةٌ بَعْدَ الْفَاتِحَةِ) لە دوای فاتیحە سورەتێك بخوێنێ لە ڕەکعەتی یەکەمو دووەمدا، جا نوێژەکە واجب بێ، یان سوننەت بێ، بە دەنگی ئاشکرا بێ، یان نهێنی بێ (إلاّ فِي الثَّالِثَـــةِ) تەنها لە ڕەکعەتی سێیەمی مەغریبو نوێژەکانیتر نەبێ (وَالرَّابِعَـةِ) هەروەها لە ڕەکعەتی چوارەمی نوێژە چوار ڕەکعەتیەکان نەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

ئینجا لە گشت نوێژێکدا سوننەتە ڕەکعەتییەکەم لە ڕەکعەتیدووەم درێژتر بێ ﴿عَـــن أبِيقَتادةَ ﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ بِفاتِحَـــةِ الْكِتاب وَسُورَتَيْنِ وَيُسْمِعُنَا الآيَةَ أَحْياناً وَيُطَوِّلُ الرَّكْعَةَ الأُولى، وَيَقْرَأُ فِي الأُخْرَيَيْنِ بِفاتِحَـــةِ الْكِتابِ﴾ رواه الشيخان، وفي رواية: ﴿وَكان يُطَوِّلُ الرَّكْعَةَ الأُولى مِنْ صَلاةِ الصُّبْحِ﴾. پێغەمبەر ﷺ لە ڕەکعەتی یەکەمو دووەمی نیوەڕۆ و عەسردا فاتیحەی دەخوێندو سورەتێکی لە دوای فاتیحە دەخوێند، جارجارەش وایدەکرد گوێمان لێبێ، ڕەکعەتی یەکەمیشی لە ڕەکعەتی دووەم درێژتر دەکرد، لە ڕەکعەتی سێیەمو چوارەمدا تەنها فاتیحەی دەخوێند، لە نوێژی سبەینێشدا ڕەکعەتی یەکەمی لە دووەم درێژتر دەکرد.

قُلْتُ: فَإِنْ سُبِقَ بِهِمَا قَرَأَهَا فِيهِمَا عَلَى النَّصِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. ولاَ سُورَةَ لِلْمَأْمُومِ، بَلْ يَسْتَمِعُ فَإِنْ بَعُدَ أَوْ كَانَتْ سِرِّيَّةً قَرَأَ فِي الأَصَحِّ،

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (فَإِنْ سُبِقَ بِهِما) ئەگەر بە ڕەکعەتی سێیەمو چوارەم لە ئیمام دوا کەوتبو، واتە: کە مەئمووم نوێژی بە جەماعەت دابەست، ئیمام لە ڕەکعەتی سێیەمدا بوو (قَرَأَ فِيهِما) لە دوای سەلامدانەوەیئیمام، مەئمووم لە ڕەکعەتی سێیەمو چوارەمی خۆیدا، لە دوایفاتیحە سوڕەت دەخوێنێ (عَلَىالنَّصِّ) لە سەر دەققی فەرموودەی ئیمامی(شافعي)، تاکو نوێژەکەی بێسوڕەت نەبێ (وَاللهُ أَعْلَم).

جا ئەوە لە کاتێکدایە: کە لە پشت ئیمام لە دوایفاتیحە ماوەی خوێندنی سوڕەتی نەبوبێ، واتە: ئەگەر ئیمام بە سستی فاتیحەی خوێندو ئەویش پەلەی کردو لە یەکەمو دووەمی خۆیدا لە دوایفاتیحە سوڕەتی خوێند، ئەوە بەسەو سوننەت نیە لە سێیەمو چوارەمیشدا دووبارە بیخوێنێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە ڕەکعەتی سێیەمو چوارەمیشدا مەئمووم پێش ئیمام فاتیحەی تەواو کرد، ئەو کاتە سوننەتە لە چاوەڕوانکردندا خۆی بە سوڕەت خوێندن خەریك بکا، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

(وَلاسُورَةَ لِلْمَأْمُومِ) لە نوێژی ئاشکرادا سوڕەت خوێندن بۆ مەئمووم سوننەت نیە، ئەگەر گوێی لە دەنگی ئیمام بێ (بَلْ يَسْتَمِعُ) بەڵکو گوێ دەگرێ بۆ خوێندنی ئیمامەکەی ﴿عن عبادة: كُنَّا خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ فِي صَلاةِالْفَجْرِ فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِراءَ ة، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمامِكُمْ؟ قُلْنا: نَعَمْ نَفعَلُ هَذَا، قالَ: لاتَفْعَلُوا إِلاّ بِفاتِحَةِ الْكِتابِ فَإِنَّهُ لاصَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِها﴾رواه ابوداود والترمذی باسنادحسن، والبخاری فی جزءالقرآن وصححه، نوێژی سبەینێمان لە پشت پێغەمبەرﷺ کرد، ئەویش خوێندنی لە سەر گران بوو، ئینجا کە نوێژی تەواو کرد، فەرمووی: لەوانەیە ئێوە لە پشت ئیمامەکەتان قورئان بخوێنن؟ گوتمان: بەڵێ بە پەلە دەیخوێنین. فەرمووی: وا مەکەن، جگە لە فاتیحە هیچیتر مەخوێنن، چونکە هەر کەسێك فاتیحە نەخوێنێ نوێژی دروست نیە.

(فَإِنْ بَعُدَ) جا ئەگەر مەئمووم دوور بوو، یان کەڕ بوو و گوێی لە خوێندنیئیمام نەبو، یان تێی نەگەیشت (أَوْ كانَتْ سِرِّيَّةً) یان نوێژەکە لە نوێژە دەنگ نهێنیەکان بوو، یان لە نوێژە دەنگ ئاشکراکان بوو بەڵام ئیمام دەنگی هەڵنەدێنا (قَرَأَ) لەو هەموو حاڵەتانەدا سوننەتە: سوڕەت بخوێنێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: سوڕەت خوێندن لە پێش فاتیحەدا بە بەر سوننەت ناکەوێ، هەروەها ئەگەر فاتیحەش دووبارە بکاتەوە هەر بە بەر سوننەت ناکەوێ، بەڵام ئەگەر جگە لە فاتیحە هیچیتری نەدەزانی، ئەو کاتە بە بەر دەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَيُسَنُّ لِلصُّبْحِ وَالظُّهْرِ طِوالُ الْمُفَصَّلِ، وَلِلْعَصْرِ وَالْعِشَاءِ أَوْسَاطُهُ، وَلِلْمَغْرِبِ قِصَارُهُ، وَلِصُبْحِ الْجُمُعَةِ فِي الأُولى الم تَنْزِيل، وَفِي الثَّانِيَةِ هَلْ أَتَى.

---

(وَيُسَنُّ) سوننەتە بۆ ئەو کەسەی بە تەنهایی نوێژ دەکا، یان ئیمامەتی بۆ کۆمەڵێکی سەرژمێرکراو دەکاو بە درێژکردن ڕازی بن، بەو مەرجانەی لە (دعاء الإفتتاح)دا باس کران (لِلصُّبْحِ وَالظُّهْرِ) لە ڕەکعەتی یەکەم و دووەمی سبەینێو نیوەڕۆدا (طِوالُ الْمُفَصَّلِ) سوڕەتە درێژەکانی نێواندار بخوێنێ، بەڵام ئەگەر ئیمام بوو و ئیزنی گشت مەئموومەکانی وەرنەگرتبو، ئەو کاتە سوڕەتە کورتەکانی نێواندار دەخوێنێ، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا بزانە: سوڕەتی(الْمُفَصَّل)=نێواندار، لە (الْحُجُرات) تا (قُلْ أَعُوذ بِرَبِّ النَّاسِ)یە، جا درێژەکانی (الْمُفَصَّل) لە (الْحُجُرات) تا (عَمَّ)یە، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی، بۆیێ بە (الْمُفَصَّل)=نێواندار ناو دەبرێن، چونکە زۆر جار نێوان دەکەوێتە نێو سوڕەتەکانی: بە (بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم)، هەروەك لە (الإتقان)دا فەرموویەتی.

هەروەها (وَلِلْعَصْرِ وَالْعِشَاءِ) سوننەتە لە یەکەمو دووەمی عەسرو عیشادا (أَوْسَاطُهُ) ناوەنجیەکانی نێواندار بخوێندرێن، واتە: لە (عَمَّ) تا (الضُّحى).

هەروەها (وَلِلْمَغْرِبِ) سوننەتە: لە یەکەمو دووەمی مەغریبدا (قِصارُهُ) کورتەکانی نێواندار بخوێندرێن، واتە: لە (الضُّحى) تا (النَّاسِ).

هەروەها (وَلِصُبْحِ الْجُمُعَةِ) سوننەتە بۆ سبەینێی ڕۆژی هەینی لە دوای فاتیحە: (فِي الأُولى الم التَّنْزِيل) لە ڕەکعەتی یەکەمدا سوڕەتی (الم السجدة) بە تەواوی بخوێنێ (وَفِي الثَّانِيَةِ هَلْ أَتى) لە ڕەکعەتیدووەمیشدا سوڕەتی (هَلْ أَتى) بە تەواوی بخوێنێ، هەر چەند ئیمامیش بێو ئیزنی مەئموومەکانیشی وەرنەگرتبێ.

جا ئەگەر کاتەکە تەنگ بوو و هەر دوو سوڕەتی بە تەواوی پێ نەدەخوێندران، ئەو کاتە دوو سورەتی کورت دەخوێنێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی، بەڵام لە (نهایة)و (مغنی)دا دەفەرموون: بەشێکی سوڕەتییەکەم لە ڕەکعەتی یەکەمدا دەخوێنێو بەشێکی سوڕەتیدووەمیش لە ڕەکعەتیدووەمدا دەخوێنێ.

جا بزانە: دیاریکردنی ئەو سوڕەتانەیڕابردوو گشتی لە حەدیسی (صحیح)دا بەڵگەی لە سەرە، لە بەر درێژی نەماننووسی، هەروەها ئەو سوڕەتانەی تایبەت بە نوێژە سوننەتەکانن، هەر یەکەی لە شوێنیخۆیاندا باسیان دەکەین، ان شاء الله تعالی.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: سەرچاوەکان دەفەرموون: لە نوێژی بە ئاشکرادا سوننەتە: ئیمام لە دوای تەواوکردنی فاتیحەیخۆی بە قەد فاتیحە خوێندنێك بێدەنگ بێ، تاکو

مەئموومیش فاتیحەیخۆی بخوێنێ، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عن سَمُرةَ﷛: سَكْتَتانِ حَفِظْتُهما مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ: سَكْتَةٌ إذا كَبَّرَ وَسَكْتَةٌ إذا فَرَغَ مِنْ قِراءَةِ وَلا الضّالِّين﴾ رواه ابوداود والترمذی بسند حسن، دوو بێدەنگبوونم لە پێغەمبەرﷺ وەبیر دێ، یەکەم: لە دوای (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بۆ دوعای (افتتاح). دووەم: لە دوای تەواوکردنی فاتیحە. واتە: تاکو مەئموومەکانیش ماوەی فاتیحە خوێندنیان هەبێ.

جا دەفەرموێ: ئیمامی(السَّرَخسی) فەرموویەتی: سوننەتە لەو بێدەنگبوونەدا ئەم دوعایە بە نهێنی بخوێنێ-کە هەم لە (افتتاح)شدا سوننەت بوو-: ﴿أَللّهُمَّ باعِدْ بَيْني وَبَيْنَ خَطاياي كَما باعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، أَللّهُمَّ نَقِّني مِنَ الْخَطايا كَما يُنَقّى الثَّوبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، أَللّهُمَّ اغْسِلْ خَطاياىَ بِالْماءِ والثَّلْجِ وَالْبَرَدِ﴾ رواه الشيخان، بەڵام لە زۆربەی سەرچاوەکاندا دەفەرموون: لەو بێدەنگبوونەدا قورئانخوێندن خێرترە، کەوابو: لەو قورئانخوێندنەشدا دەبێ ئاگاداری ڕیزیقورئان بێو لە دوای یەکتریش بێ، واتە: ئەو ئایەتو سورەتانەی بە دەنگ دەیانخوێنێ، لە دوای ئەوە بن: کە بە بێدەنگ خوێندویەتی، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتیو ئێستاش لە سێیەمدا ڕوونی دەکەینەوە، ان شاء الله تعالی.

**دووەم:** ئەگەر لە ڕەکعەتی یەکەمو دووەمدا یەك سورەتی دووبارە کردەوە، دروستەو سوننەتەکە پێك دێ ، هەروەك لە (نهایە)دا فەرموویەتی ﴿قَرَأَالنَّبِيُّ ﷺ: إِذا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ فِيالرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِما﴾ رواه ابوداود باسنادصحیح، پێغەمبەرﷺ لە هەردوو ڕەکعەتی نوێژی سبەینێدا سورەتی (إذا زُلْزِلَتِ الارضُ)ی دووبارە کردەوە.

هەروەها دروستە: دوو سورەتو زیاتریش لە یەك ڕەکعەتدا بخوێنێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿قَرَأَ النَّبِيُّ ﷺ فِيالثّالِثَةِ مِنَ الْوَتْرِ: قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ﴾ رواه اصحاب السنن بسندحسن، پێغەمبەرﷺ لە ڕەکعەتی سێیەمی وەتردا (قل هوالله)و هەردوو (قل أعوذ)ی خوێندن. هەروەها دروستە: یەك سورەتیش بکرێتە دوویەش، هەر بەشێکی لە ڕەکعەتێکدا بخوێندرێ ﴿قَرَأَالنَّبِيُّ ﷺ فِي صَلاةِالْمَغْرِبِ بِسُورَةِالأعْرافِ، فَرَّقَها فِي رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه النسائی باسنادحسن، پێغەمبەرﷺ سورەتی (الاعراف)ی لە نوێژی مەغریبدا خوێند، بەسەر دوو ڕەکعەتدا بەشی کرد.

**سێیەم:** مەرج نیە لە دوای فاتیحە هەر سورەت بخوێندرێ، بەڵکو سوننەتەکە بە ئایەتێکیش پێك دێ، بەڵام سورەتێکی تەواو-هەرچەند کورتیش بێ- خێری گەورەترە لە چەند ئایەتێکی بە ئەندازەیخۆی، تەنها لە تەراویحی ڕەمەزاندا نەبێ؟ چونکە لە تەراویحدا

سوننەتە: تا کۆتایی ڕەمەزان هەموو قورئان ختم بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچـاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، جا ئەگەر ئایەتی خوێند، وەها خێرترە: لە هـەر ڕەکعەتێکدا لە سێ ئایەت کەمتر نەخوێنێ، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ثَلاثُ آياتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاتِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاثِ خَلِفاتٍ عِظامٍ سِمانٍ﴾ رواه مسلم، یەکێکتان سێ ئایەتی قورئان لە نوێـژدا لـە دوای فاتیحـە بخوێنێ، خێـری زیـاترە لـە سـێ ووشتری ئاوسی گەورەو قەڵەو.

ئینجا بزانە: سورەت بخوێنی، یان ئایەت، هەر سوننەتە لە سەر ڕیزی قورئان بێ: کـە لـە لای (الْبَقَرة)وە بۆ (قلْ أعُوذ)ە، هەم لە دوای یەکتریش بێ، واتە: کـە سـوڕەتێکی خوێنـد لە ڕەکعەتیدووەمیشدا سوڕەتی دوای ئەوی بخوێنێ، پاشەو پاش لە لای (قـل أعـوذ) بـۆ لای (البقرة) نەگەڕێتەوەو هیچ سوڕەتێکیش بەجێ نەهێڵێو نەڕواتە سـەر سـوڕەتێکیتر، مەگەر لە شەرعدا فەرمانی پێکرابێ: وەك نوێژی وەتـرو سبەینێی هـەینی—کـە باسمـان کرد— کەوابو: ئەگەر (قُلْ أعُوذ بِربِّ النَّـاسِ)ی خوێنـد، سوننەتە: لـە ڕەکعـەتی دووەمـدا بەشـێك لـە سـەرەتایی (الْبَقَـرة) بخـوێنێ، تـاکو ڕیـزی قورئـان تێـك نەچـێ، هـەروەك لـە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

کەوابو: ئەگـەر لـە ڕەکعەتییەکەمـدا (قُـلْ هُـوَ الله أحَـدٌ)ی خوێنـد، لـە ڕەکعـەتی دووەمیشـدا بەشێکی (قُلْ أعُوذُ بِربِّ الْفَلَق) دەخوێنێ، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتـەوە، واتە: بە تەواوی نایخوێنێ؟ نەوەك ڕەکعەتی یەکەم لە دووەم کورتتر ببـێ، پاشـە و پاشـیش ناگەڕێتەوە: تاکو (إنَّا أعْطَيْناك) بخوێنێ؟ نەوەك ڕیزی قورئان تێك بچێ، وَاللهُ أعْلَم.

**چوارەم:** ئەگەر قورئانخوێندنی دوایفاتیحەی لێ تێك چوو، یان ڕوودوایێکیتـری بـە سـەر هـات، دروستە: واز لە قورئانخوێندن بێنێو ڕوکووع ببا، هەروەها ئەگەر هیچ عوزرێکیشی نـەبێ هـەر دروستە، هەروەك لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی ﴿عن عبدالله بن السـائبﷺ صَـلَّى لَنـا النَّبِيُّﷺ الصُّبْحَ، فَاسْتَفْتَحَ سُورَةَالْمُؤْمِنِينَ حَتَّى جاءَ ذِكْرُ مُوسى أوْ ذِكْرُ عِيسى أخَذَتْـهُ سَـعْلَةٌ فَرَكَعَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ نوێژی سبەینێی بـە جەماعـەت بـۆ کـردینو دەسـتی بـە سوڕەتی(قَدْ أفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ) کرد، تا گەیشتە باسی (موسى)پێغەمبەر، یان (عیسـى)پێغەمبـەر علیهما الصلاة والسلام، کۆکەیەك گرتیو یەکسەر ڕوکووعی برد.

**پێنجەم:** بـۆ ئیمـامو بـۆ ئـەو کەسـەی بـە تـەنهایی نوێـژ دەکـا، سوننەتە لـەم نوێژانـەدا فاتیحەو سوڕەتی دوایفاتیحە بە دەنگیئاشکرا بخوێنن: لـە ڕەکعـەتی یەکـەمو دووەمـی مەغریبو عیشاو سبەینێو لە نوێژیجومعەو لەو نوێژانەی بـە شـەوێ قـەزایان دەکاتـەوە

اَلْخَامِسُ: اَلرُّكُوعُ، وَأَقَلُّهُ أَنْ يَنْحَنِيَ قَدْرَ بُلُوغِ رَاحَتَيْهِ رُكْبَتَيْهِ بِطُمَأْنِينَةٍ بِحَيْثُ يَنْفَصِلُ رَفْعُهُ عَنْ هَوِيِّهِ،

---

-هەرچەند نوێژی ڕۆژیش بن- و لە نوێژی جەژنەکان و باران و مانگگیران و تەراویح و وەتری ڕەمەزان و گشت سوننەتێکی‌تر: کە لە شەوی‌دا بکرێن، جگە لە (رواتب) -واتە: سوننەتەکانی پێش و دوای نوێژە واجبەکان- چونکە ئەوانە لە شەوی و لە ڕۆژی‌دا بە دەنگی نهێنی دەکرێن.

هەروەها بۆ هەردووکیان سوننەتە بە دەنگی‌نهێنی بخوێنن: لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسرو ڕۆژگیران و گشت سوننەتەکانی‌تر: کە لە ڕۆژی‌دا بکرێن و لەو نوێژانەی بە ڕۆژی قەزایان دەکاتەوە -هەر چەند نوێژی شەویش بن- بەڵام نوێژی(جَنازة) لە شەوی و لە ڕۆژی‌دا هەر بە دەنگی‌نهێنی دەکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو باسانە ڕوون کراونەوە بە بەڵگەی شوێنکەوتنی‌پێغەمبەرﷺ لە گشتیاندا، بۆ نمونە: ﴿عَنْ أَبِي‌معمر: سَأَلْتُ خَبَّاباًرضي الله عنه أَكَانَ النَّبِيُّﷺ يَقْرَأُ فِي‌الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قالَ: نَعَمْ. قُلْتُ بِأَيِّ شَيْءٍ تَعْلَمُونَ قِرائَتَهُ؟ قالَ: بِاضْطِرابِ لِحْيَتِهِ﴾ رواه البخاری، پرسیارم لە (خباب) کرد: ئایا پێغەمبەرﷺ لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا هیچی دەخوێند؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: بە چی دەتانزانی دەخوێنی؟ فەرمووی: بە لەرزینەوەی ڕیشی‌پیرۆزی دەمانزانی، واتە: دەنگی هەڵنەدەهێنا.

ئینجا بزانە: لە دوای تەواوکردنی‌فاتیحە، یان سورەت لە پێش (الله اکبر)ی ڕوکووعدا بێ‌دەنگبوونێکی‌کەم سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ٥-﴿ ڕوکووع ﴾

(اَلْخامِسُ) پێنجەم لە ڕوکنەکانی نوێژ: (اَلرُّكُوعُ) ڕوکووع بردنە، یەك جار لە هەموو ڕەکعەتێکدا، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا﴾ ڕوکووع ببەن و سوجدە ببەن. هەروەها پێغەمبەرﷺ بە نوێژکەرێکی فەرموو: ﴿ثُمَّ ارْكَعْ حَتّى تَطْمَئِنَّ راكِعاً﴾ رواه الشیخان، ئینجا لە دوای فاتیحە خوێندن ڕوکووع ببەو خۆت لە ڕوکووعدا ڕابگرە.

(وَأَقَلُّهُ) کەمترینی ڕوکووع بردن بە پێوە کە دروست بێ، ئەمەیە: (أَنْ يَنْحَنِيَ) پشتی بچەمێنێتەوە (قَدْرَ بُلُوغِ راحَتَيْهِ) بە قەد ئەوەندەی: هەردوو بەرە دەستەکانی بگەنە (رُكْبَتَيْهِ) هەردوو ئەژنۆیەکانی (بِطُمَأْنِينَةٍ) ماوەیەکیش لە ڕوکووعدا خۆی ڕابگرێ تا ئەندامەکانی جێگیر دەبن (بِحَيْثُ) بە شێوەیەکی وەها: (يَنْفَصِلُ رَفْعُهُ) هەڵسانەوەی جیا ببێتەوە (عَنْ هَوِيِّهِ) لە هاتنەخوارەوەی بۆ ڕوکووع، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو.

جا ئەگەر ئەوها ڕوکووع نەبا، نوێژەکەی دروست نیە ﴿عَن حذیفةرضي الله عنه: أَنَّهُ رَأى رَجُلاً لايُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَقالَ لَهُ: ماصَلَّيْتَ، وَلَوْ مُتَّ مُتَّ عَلى غَيْرِالْفِطْرَةِالَّتِي‌فَطَرَاللهُ مُحَمَّداًﷺ

وَلاَ يَقْصِدُ بِهِ غَيْرَهُ فَلَوْ هَوَى لِتِلاَوَةٍ فَجَعَلَهُ رُكُوعاً لَمْ يَكْفِ، وَأَكْمَلُهُ تَسْوِيَةُ ظَهْرِهِ وَعُنُقِهِ وَنَصْبُ سَاقَيْهِ وَأَخْذُ رُكْبَتَيْهِ بِيَدَيْهِ وَتَفْرِقَةُ أَصَابِعِهِ لِلْقِبْلَةِ، وَيُكَبِّرُ فِي ابْتِدَاءِ هَوِيِّهِ

---

عَلَيْها﴾ رواه البخاري، حەزرەتی(حذيفة) پیاوێکی دیت نوێژ دەکاو ڕوکووعو سوجدە تەواو ناکا، ئینجا (حذيفة) پێی فەرموو: نوێژت نەکرد-واتە: نوێژەکەت دروست نیە- ئەگەر بمری لە سەر ڕێبازە پاکەکەی پێغەمبەرﷺ نامری.

(وَلا يَقْصِدُ بِهِ غَيْرَهُ) مەبەستی بە چوونە ڕوکووع هیچیتر نەبێ، کەوابو: (فَلَوْ هَوَى) ئەگەر هاتە خوارەوە (لِتِلاوَةٍ) بە مەبەستی سوجدەی(تِلاوَة)، یان بە مەبەستێکیتر (فَجَعَلَهُ رُكُوعاً) ئینجا کە گەیشتە سنووری ڕوکووع، نیەتی گۆڕاو کردیە ڕوکووع، ئەوە (لَمْ يَكْفِ) دروست نیەو بە بەر ڕوکووع ناکەوێ، بەڵکو واجبە: پشتی بە تەواوی ڕاست بکاتەوە، ئینجا بە نیەتی ڕوکووع دووبارە بێتە خوارەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَكْمَلُهُ) تەواوترینی ڕوکووع لە گەڵ شێوەیڕابردووشدا (تَسْوِيَةُ ظَهْرِهِ وَعُنُقِهِ) ڕاستکردنی پشتو ئەستۆیەتی بە یەکسانی، واتە: پشتی کووڕ نەکاتەوەو سەریشی لە پشتی بەرزترو نزمتر نەبێ (وَنَصْبُ سَاقَيْهِ) هەردوو لولە قاچەکانی تا پشتێندی ڕاست دابچەقێنێ، واتە: ئەژنۆیەکان نەچەمێنێ (وَأَخْذُ رُكْبَتَيْهِ بِيَدَيْهِ) هەردوو ئەژنۆیەکانی بە دەستەکانی بگرێ (وَتَفْرِقَةُ أَصَابِعِهِ) پەنجەکانیشی لێك بڵاو بکا (لِلْقِبْلَةِ) بەرەو لای قیبلە، واتە: بەرەو ڕاستەو چەپە لایانندا ﴿عن ابي حُمَيدﷺ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ إِذا كَبَّرَ جَعَلَ يَدَيْهِ حِذاءَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەرمﷺ دیت: هەر کاتێك (الله اكبر)ی دەگوت، دەستەکانی تا بەرامبەر شانەکانی بەرز دەکردەوەو هەر کاتێك ڕوکووعی بردبا، هەردوو دەستەکانی لە هەردوو ئەژنۆکانی گیر دەکردن، ئینجا پشتی دەچەماندەوەو لە گەڵ ئەستۆی ڕاستی دەکرد.

ئینجا بزانە: سوننەتە پیاو ئەنیشکەکانی لە تەنیشتەکانی دوور بخاتەوەو ئافرەتیش بە پێچەوانەیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيُكَبِّرُ فِي ابْتِداءِ هَوِيِّهِ) سوننەتە لە سەرەتای هاتنەخوارەوەی بۆ ڕوکووع بڵێ: (أللهُ أكبر)، جا ئەگەر ئیمام بوو، سوننەتە دەنگی بەرز بکاتەوە ﴿عن أبي هريرةﷺ: كانَ رَسُولُ اللهِﷺ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْكَعُ، ثُمَّ يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ حِينَ يَرْفَعُ صُلْبَهُ، ثُمَّ يَقُولُ وَهُوَ قائِمٌ: رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ بۆ چوونە ڕوکووع دەیفەرموو: (الله أكبر)، ئینجا کە لە ڕوکووع هەڵدەستاوە دەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، ئینجا کە بە پێوە ڕادەوەستا، دەیفەرموو: (رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ).

وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ كَإِحْرامِهِ وَيَقُولُ: سُبْحانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ. ثَلاثاً، وَلاَ يَزِيدُ الإِمَامُ، وَيَزِيدُ الْمُنْفَرِدُ: اَللّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي وَمَا اسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي.

---

هەروەها (وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ) سوننەتە: لە گەڵ سەرەتای (الله أكبر)دا هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە (كَإِحْرامِهِ) وەك دەست بەرزكردنەوەی نوێژدابەستن، ئینجاكە دەستەكانی گەیشتنە بەرامبەر شانەكانی بۆ ڕوكووع دەچەمێتەوە، لەو (الله أكبر)و دەست بەرزكردنەدا جیاوازی هیچ نوێژێكو هیچ نوێژكەرێكو هیچ حاڵەتێكی نوێژ نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿عن ابْنِ عمر رضي الله عنهما: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ إذا قامَ في الصَّلاةِ رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَكانَ يَفْعَلُ ذلِكَ حِينَ يُكَبِّرُ لِلرُّكُوعِ وَإذا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، وَلايَفْعَلُ ذلِكَ فِي السُّجُودِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرم ﷺ دیت: لە كاتی نوێژدابەستندا هەردوو دەستەكانی تا بەرامبەر شانەكانی بەرز كردنەوە، هەروەها كە بۆ چوونە ڕوكووع (الله أكبر)ی دەگوتو كە لە ڕوكووع هەڵدەستاوە بە هەمان شێوە دەستی بەرز دەكردنەوە، بەڵام كە سوجدەی دەبردو كە لە سوجدە هەڵدەستاوە دەستی بەرز نەدەكردنەوە.

(وَيَقُولُ) ئینجا كە لە ڕوكووع جێگیر بوو، سوننەتە بڵێ: (سُبْحانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ) چونكە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَمّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ﴾ رواه مسلم، لە ڕوكووعدا ناوی پەروەردگار بە گەورە بێنن. (ثَلاثاً) لای كەمی سوننەتە سێ جار بیڵێ، بەڵام بە یەك جاریش بنچینەی سوننەتەكە وەدەست دێ، هەروەها سوننەتە: ووشەی (وَبِحَمْدِهِ)ش بە دوایدا بڵێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، واتە: چونكە سێ جارەكەو ووشەكە لە دوو حەدیسی بێهێزدا هاتون، كە لە (المجموع)دا هێناونیو هەم فەرموویەتی: زیكرەكانی ناو ڕوكووعو ناو سوجدەو هەم (سَمِعَ اللهُ)و (الله اكبر)ەكان -جگە لە نوێژدابەستن- گشتیان سوننەتنو واجب نین، كەوابو، ئەگەر هیچیشیان نەڵێ، نوێژەكە هەر دروستە.

(وَلايَزِيدُ الْامامُ) ئیمامی نوێژ لەو سێ جارە زیاتر هیچ زیكرێكیتر لە ڕوكووعدا ناكا، چونكە ئەگەر گشت مەئموومەكان ڕازی نەبن زیاتر ناپەسندە (وَيَزِيدُ الْمُنْفَرِدُ) بەڵام ئەو كەسەی بە تەنهایی نوێژ دەكا، سوننەتە لە دوای سێ جارەكە ئەم زیكرەش زێدە بكاو بڵێ: ﴿أَللّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي﴾ رواه مسلم، زاد ابن حبان: ﴿وَمااسْتَقَلَّتْ بِهِ قَدَمِي﴾. هەروەها بۆ ئیمامی كۆمەڵێكی سەرژمێركراویش -بەو مەرجانەی لە (دعاء الأفتتاح)دا باس كران، ئەگەر ڕازی بن- سوننەتە: ئەو زێدەیە بخوێنێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

اَلسَّادسُ: اَلاعْتدالُ قَائماً مُطْمَئناً، وَلاَ يَقصدُ غَيْرَهُ فَلَوْ رَفَعَ فَزَعاً مِنْ شَيْءٍ لَمْ يَكْــفِ، وَيُسَنُّ رَفْعُ يَدَيْهِ مَعَ ابْتِدَاءِ رَفْعِ رَأْسه قَائلاً: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَإذا انْتَصَبَ قَــالَ: رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمٰوات وَمِلْءَ الْأَرْض وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْــدُ. وَيَزِيــدُ الْمُنْفَرِدُ: أَهْلَ الثَّناء وَالْمَجْد أَحَقُّ مَا قَالَ الْعَبْدُ-وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ- أَللّهُمَّ لاَمَــانِعَ لِمــا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعطِيَ لِما مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَاالْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ.

---

## ٦-﴿ هەڵسانەوە لە ڕوکووع ﴾

(اَلسَّادِسُ) شەشەم لە ڕوکنەکانی نوێژ: (الإِعْتِدالُ) هەڵسانەوەیە لە ڕوکووع: تا پشتی ڕاست دەبێتەوە (قائِما) لەو کاتەی بە پێوە نوێژ دەکا، واتە: ئەگەر بە پێوە نەبو، واجبە: بگەڕێتەوە سەر شێوەی پێش ڕوکووع، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ارْفَعْ حَتّى تَعْتَدِلَ قائماً﴾ رواه الشيخان، ئینجا لە ڕوکووع هەڵسەوە تا پشتت ڕاست دەبێتەوە.

(مُطْمَئِنّـاً) واجبە: لەو ڕاستبوونەوەیەدا خۆی ڕابگرێ تا ئەندامەکانی جێگیر دەبن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ارْفَعْ حَتّى تَطْمَئِنَّ قائماً﴾ رواه ابن ماجه بسندصحيح، ئینجا لە ڕوکووع هەڵسەوەو بە پێوە خۆت ڕابگرە.

(وَلا يَقْصِدُ غَيْرَهُ) مەبەستی بەو هەڵسانەوەیە هیچیتر نەبێ (فَلَوْ رَفَعَ) ئەگەر هاتو: سەری بەرز کردەوە (فَزَعاً مِنْ شَيْءٍ) لە ترسی شتێك (لَمْ يَكْفِ) دروست نیەو بە بەر هەڵسانەوە ناکەوێ، بەڵکو واجبە: بگەڕێتەوە بۆ ڕوکووع، ئینجا دووبارە هەڵسێتەوە.

(وَيُسَنُّ رَفْعُ يَدَيْهِ) سوننەتە: هەردوو دەستەکانی بەرز بکاتەوە تا بەرامبەر شانەکانی، وەك دەست بەرزکردنەوەی نوێژدابەستن (مَعَ ابْتِداءِ رَفْعِ رَأْسِهِ) لە گەڵ سەرەتای سەر بەرزکردنەوەیدا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (ابْن عمر)ی ڕابردوو لە ڕوکووعدا (قائِلاً) لە کاتی هەڵسانەوەدا بڵێ: ﴿سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ﴾ رواه الشيخان، جا بزانە: سوننەتە ئیمام ئەو ڕستەیە بە ئاشکرا بڵێ.

(فَإذاانْتَصَبَ) جا کە تەواو پشتی ڕاست کردەوە، دەستەکانی بە تەنیشتەکانیدا شۆڕ دەکاتەوەو (قالَ) بە دەنگی‌نهێنی دەڵێ: ﴿رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ﴾ رواه الشيخان، ئینجا بۆ ئیمامو بۆ مەئموومو بۆ ئەو کەسەش: کە بە تەنهایی نوێژ دەکا، سوننەتە لە دوای (رَبَّنا لَكَ الْحَمْدُ) بە دەنگی‌نهێنی بڵێ: ﴿حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فيهِ﴾ رواه البخاری، هەم ﴿مِلْءَ السَّمَاواتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ وَمابَيْنَهُمَا وَمِلْءَ ماشِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ﴾ رواه مسلم.

جا ئەگەر ئیمام بوو، لەو زیکرانەی‌ڕابردوو زیاتر ناڵێ، بەڵام (وَيَزِيدُالْمُنْفَرِدُ) ئەو کەسەی بە تەنهایی نوێژ دەکا، سوننەتە لە دوای ئەو زیکرەی ڕابردوو، ئەم زیکرەش زێدە بکاو بڵێ: ﴿أَهْلَ الثَّناءِ وَالْمَجْدِ أَحَقُّ ما قالَ الْعَبْدُ-وَكُلُّنا لَكَ عَبْدٌ- أَللّهُمَّ لامانِعَ لِما أَعْطَيْتَ وَلامُعْطِيَ

وَيُسَنُّ الْقُنُوتُ فِي إعْتِدالِ ثانِيَةِ الصُّبْحِ، وَهُوَ أَللّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْت...إلى آخِرِهِ، وَالامامُ بِلَفْظِ الْجَمْعِ

---

لما مَنَعْتَ وَلايَنْفَعُ ذاالْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ﴾ رواه مسلم. هەروەها بۆ ئیمامی کۆمەڵێکی سەرژمێرکراویش-بەو مەرجانەی ڕابردوو لە (اِفتِتاح)دا، ئەگەر ڕازی بن- سوننەتە ئەو زێدەیە بخوێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ قونووت ﴾

(وَيُسَنُّ الْقُنُوتُ) خوێندنی قونووت سوننەتە (فِي إعْتِدالِ ثانِيَةِ الصُّبْحِ) لە ڕاستبوونەوەی ڕەکعەتی دووەمی نوێژی سبەینێ‌دا لە دوای (سَمِعَ اللهُ)...هتد ﴿عَنِ الْبَراءِ وأنس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كانَ يَقْنُتُ فِي الصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی سبەینێ‌و لە نوێژی مەغریبدا قونووتی دەخوێند.

ئینجا بزانە: بە بەڵگەی (اجماع): قونووت لە نوێژی‌مەغریبدا (نَسْخ) بۆتەوەو ناخوێندرێ، هەروەك لە (المجموع)و (ارشادالساری)دا فەرموویانە.

بەڵام لە نوێژی‌سبەینێ‌دا هەروەك سەردەمی پێغەمبەر ﷺ ماوەتەوەو دەخوێندرێ، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَن أنس ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَنَتَ شَهْراً يَدْعُو عَلَيْهِمْ ثُمَّ تَرَكَ، فَأَمّا فِي الصُّبْحِ فَلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ حَتّى فارَقَ الدُّنْيا﴾ حديث صحيح رواه الدارقطني مِنْ طُرُقٍ بأسانيد صحيحة، وصححه الحاكم والبيهقي، وصححه النواوي في المجموع، پێغەمبەر ﷺ ماوەی مانگێك لە هەموو نوێژەکاندا قونووتی دەخوێند دوعای لە دژی کافرەکان دەکرد، ئینجا وازی لە قونووت هێنا، بەڵام لە نوێژی سبەینێ‌دا وازی نەهێناو بەردەوام قونووتی دەخوێند تا وەفاتی کرد.

(وَهُوَ) قونووت ئەمەیە: ﴿أَللّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعافِنِي فِيمَنْ عافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبارِكْ لِي فِيما أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ ما قَضَيْتَ، فَإنَّكَ تَقْضِي وَلايُقْضَى عَلَيْكَ وَإنَّهُ لايَذِلُّ مَنْ والَيْتَ وَلايَعِزُّ مَنْ عادَيْتَ تَبارَكْتَ رَبَّنا وَتَعالَيْتَ﴾ رواه اصحاب السنن وغيرهم باسناد صحيح واللفظ للبيهقي، وزاد النسائي: ﴿وَصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ﴾.

هەروەها سوننەتە: لە دوای (تَعالَيْت)-واتە: لە پێش سەلەواتدا- بڵێ: ﴿فَلَكَ الْحَمْدُ عَلى ماقَضَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إلَيْكَ﴾. هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالامامُ) سوننەتە ئیمامی‌نوێژ قونووتەکە بخوێنێ (بِلَفْظِ الْجَمْعِ) بە (ضمیر)ی کۆمەڵ، واتە: بڵێ: (اِهْدِنا، وَعافِنا، وَتَوَلَّنا، وَبارِك لَنا، وَقِنا، نَسْتَغْفِرُك، نَتُوبُ). کەواتە: ناپەسندە ئیمام بە (ضمیر)ی تاك دوعای قونووت بخوێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لايَؤُمُّ عَبْدٌ قَوْماً فَيَخُصُّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ، فَإنْ فَعَلَ فَقَدْ خانَهُمْ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند

وَالصَّحِيحَ سَنُّ الصَّلَاةَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي آخِرِهِ وَرَفْعُ يَدَيْهِ، وَلاَ يَمْسَحُ وَجْهَهُ، وَأَنَّ الْإِمَامَ يَجْهَرُ بِهِ وَأَنَّهُ يُؤَمِّنُ الْمَأْمُومُ لِلدُّعَاءِ

---

حسن، هيچ مرۆڤێك ئیمامەتی بۆ كۆمەڵێك نەكاو تەنها بە تايبەتيش دوعا بۆ خۆی بكاو ئەوانيش بەشدار نەكا، جا ئەگەر وا بكا، بەڕاستی خيانەتی لە گەڵ كردوون.

ئينجا بزانە: دوعاكردن بۆ ئيمام لە ناو نوێژدا بە (ضَمير)ی كۆمەڵ، تايبەتە بە قونووت، واتە: ئيمام دوعايەكانی‌تر لە ناو نوێژدا بە (ضمير)ی تاك دەخوێنێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَالصَّحِيحِ) بە فەرموودەی ڕاست (سَنُّ الصَّلاةِ) سەلەوات سوننەتە (عَلى رَسُولِ اللهِ ﷺ) لە سەر پێغەمبەر ﷺ (فِي آخِرِهِ) لە كۆتايی قونووتدا، بە بەڵگەی زيادەكەی (النسائي) لە حەديسەكەی‌ڕابردوودا، هەروەها سەلامو بەشداركردنی (آلُ)و (صَحابة)ش سوننەتە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە، واتە: بڵێ: (وَصَلَّى اللهُ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ).

هەروەها ئەگەر بە تەنهايی نوێژی دەكرد، يان ئيمام بوو، بەڵام گشت مەئمومەكان بەو مەرجانەی‌ڕابردوو لە (اِفتِتاح)دا، ئيزنيان دابوو، سوننەتە: قونووتەكەی ئيمامی(عمر)ش بخوێنێ –كە لە نوێژی(وتر)دا باسی دەكەين– ان شاء الله تعالى، ئيتر مەرج نيە هەر ئەو ووشانە لە قونووتدا بڵێ، بەڵكو ئايەتەكانی قوڕئان –كە دوعايان تێدايە– ئەوانيش دروستن، بەڵام ناپەسندە قونووت درێژ بكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَرَفْعُ يَدَيْهِ) هەروەها سوننەتە لە كاتی خوێندنی‌قونووتدا هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوەو بەرەدەستەكانی بەرەو ئاسمان بێ، جياوازی ئيمامو مەئمومو بە تەنهاش نيە ﴿عن أنس ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ كُلَّما صَلَّى الْغَداةَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ يَدْعُو عَلَيْهِمْ﴾ رواه البيهقي باسناد حسن، پێغەمبەرم ﷺ ديت: هەر جارێك نوێژی سبەينێی كردبا، هەر دوو دەستەكانی بەرز دەكردنەوەو دوعای لە دژی كافرەكان دەكرد.

جا بزانە: ئەگەر بۆ لابردنی بەڵا قونووتی دەخوێند، ئەو كاتە سوننەتە پشتەدەستەكانی بەرەو ئاسمان بێ، هەروەك لە باسی(دوعای‌دوای‌نوێژەكان) بەڵگەی بۆ دێنين،ان شاء الله تعالى.

(وَلا يَمْسَحُ وَجْهَهُ) سوننەت نيە لە قونووتدا دەست بە ڕوخساری‌دا بێنێ، چونكە لە هيچ حەديسێكی (صحيح)دا نەهاتوە (وَأَنَّ الْاِمامَ يَجْهَرُ بِهِ) هەروەها سوننەتە ئيمام بە دەنگی‌ئاشكرا قونووت بخوێنێ، بەڵام ئەو كەسەی بە تەنهايی نوێژ بكا سوننەتە: بە نهێنی بيخوێنێ.

(وَأَنَّهُ يُؤَمِّنُ الْمَأْمُومُ) هەروەها سوننەتە: مەئموم بە دەنگ بڵێ: آمين (لِلدُّعاءِ) كە ئيمام دوعای قونووت دەخوێنێ: لە (اَللَّهُمَّ اهْدِنا) تا (شَرَّ ما قَضَيْتَ)، كەواتە: مەئموم دوعای

وَيَقُولُ الثَّناءَ، فَإنْ لَمْ يَسْمَعْهُ قَنَتَ، وَيُشْرَعُ الْقُنُوتُ فِي سَائِرِالْمَكْتُوبَاتِ لِلنّازِلَـةِ لاَ مُطْلَقاً عَلَى الْمَشْهُورِ. اَلسَّابِعُ: اَلسُّجُودُ، وَأَقَلُّهُ مُبَاشَرَةُ بَعْضِ جَبْهَتِهِ مُصَلاَّهُ،

---

قونـووت نـاخوێنێ، بـه‌ڵام (وَيَقُولُ الثَّنـاءَ) مـه‌دح‌و سوپاسـی خـوا بـه نهێنـی لـه گـه‌ڵ ئیمامه‌كه‌یدا ده‌خوێنێ، واته: (فَإِنَّكَ تَقْضِي) تا (وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)، هه‌روه‌ها لـه سه‌له‌واتیشدا ده‌ڵێ: آمین، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه (فَإِنْ لَمْ يَسْمَعْهُ) جا ئه‌گه‌ر مه‌ئمووم گوێی له قونووتی ئیمام نه‌بو، له به‌ر دووری، یان كه‌ڕی، یان تـێ‌ی نه‌گه‌یشت، ئه‌و كاته (قَنَتَ) سوننه‌ته به نهێنی قونووت بخوێنێ.

(وَيُشْـرَعُ الْقُنُـوت) قونـووت خوێنـدن سـوننه‌ته (فِـی سـائِرِ الْمَكْتُوبـاتِ) لـه گشـت نوێـژه واجبه‌كانی‌تریشدا: له هه‌ڵسانه‌وه‌ی ڕكووعی ئاخیردا (لِلنّازِلَةِ) به هۆی هاتنی به‌ڵایه‌ك بۆ سه‌ر موسوڵمانان: وه‌ك جـه‌نگ‌و گرانـی‌و مردنـی بـه كۆمـه‌ڵ‌و یـان دیـل بـوونی زانایـه‌كی ئیسلام، یان سه‌ركرده‌یه‌كی‌ئیسلام‌و ئه‌و جۆره به‌ڵایانـه ﴿عن أنس ﷺ: قَنَتَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْراً يَدْعُو عَلَى قاتِلِي الْقُرّاءِ﴾ رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ لـه دوای ڕكـووع ماوه‌ی مانگێك قونووتی خوێند، دوعای له دژی ئه‌و كافرانه ده‌كرد: كـه حـه‌فتا (صحابة) قورئانخوێنه‌كانیان شه‌هید كردبون.

(لامُطْلَقـاً) بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر بـه‌ڵا نـه‌هاتبو قونـووت سـوننه‌ت نیـه (عَلَى الْمَشْـهُورِ) لـه سـه‌ر فـه‌رمووده‌ی ناسـراوی‌مه‌زهه‌ب ﴿عن أنس ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ لايَقْنُتُ إِلاَّ إِذا دَعا لِقَوْمٍ أَو دَعا عَلَى قَوْمٍ﴾ صححه ابن خزيمة، پێغه‌مبه‌رﷺ له نوێژه واجبه‌كاندا قونووتی نه‌ده‌خوێند، مه‌گه‌ر دوعای بۆ چه‌وساوان كردبا، یان دوعای له دژی سته‌مكاران كردبا، واته: ئه‌و كاتـه قونووتی ده‌خوێند.

جا بزانه: ئه‌و قونووته‌ی به‌ڵا، له نوێژی (جَنازَة)و له نوێـژه سـوننه‌ته‌كاندا سـوننه‌ت نیـه، هه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه، هه‌روه‌ها قونووتی (وَتْر)ش له نوێژه سوننه‌ته‌كاندا باس ده‌كه‌ین، ان شاء الله تعالی.

## ٧-﴿ سوجده ﴾

(اَلسّابِع) حه‌فته‌م له ڕوكنه‌كانی‌نوێژ: (اَلسُّجُودُ) سوجده‌بردنه دوو جار له هـه‌موو ڕه‌كعه‌تێكدا، خوای‌گه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا﴾ ڕكووع ببه‌ن‌و سوجده ببه‌ن.

(وَأَقَلُّهُ) كه‌مترینی سوجده‌بردن: كه دروست بـێ (مُباشَرَةُ بَعْضِ جَبْهَتِـهِ) ئه‌وه‌یه: به‌شـێكی ته‌وێڵه‌ی –به ڕووتی– بكاته (مُصَلاّهُ) ئه‌و شوێنه‌ی نوێژی له سه‌ر ده‌كاو له سه‌ری جێگیر بكـا، پێغه‌مبه‌رﷺ به نوێژكه‌ره‌كه‌ی فـه‌رموو: ﴿ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَـئِنَّ سـاجِداً﴾ رواه الشيخان، ئینجا له دوای هه‌ڵسانه‌وه له ڕكووع، سوجده ببه‌و خۆت له سوجده‌دا ڕابگره.

فَإنَ سَجَدَ عَلَى مُتَّصلٍ به جَازَ إنْ لَمْ يَتَحَرَّكْ بحرَكَته، وَلا يَجِبُ وَضْعُ يَدَيهِ وَرُكْبَتَيـهِ وَقَدَمَيْهِ فِيالأظْهَرِ، قُلْتُ: الأَظْهَرُ وُجُوبُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ،

---

(فَإنْ سَجَدَ) جا ئەگەر سوجدەی برد (عَلـى مُتَّصِلٍ بِـهِ) لـە سـەر شتێكی كـە بەخۆیەوە لكابێ، واتە: هەڵگیراوی خۆی بێ (جازَ) سوجدەكە دروستە (إنْ لَمْ يَتَحَرَّكَ بِحَرَكَتِهِ) ئەگـەر شتەكە بە جولەی ئەوی نەجولێتەوە: وەكو دامێن، یان لیچكە جلێكی درێژ، بـەڵام ئەگـەر هاتو: سوجدەی لـە سـەر شتێك بـرد، كـە هـەڵگیراوی خۆی بـوو و بـە جولـەی ئـەویش دەجولاوە: وەك مێزەر دابنێتە سەر تەوێڵەی، یان دەستی دابنێتە بن تەوێڵەی، ئەو كاتـە سوجدەی دروست نیە ﴿عن خباب ﷺ: شَكَوْنا إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ حَرَّ الرَّمْضاءِ فَلَمْ يُشْكِنا﴾ رواه مسـلم، دەربـارەی گـەرمایی زەمـین لـە كـاتی سـوجدەدا، سـكالاّمان هێنـا لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش داواكاریەكەی بەجێ نەهێنایَن. كەواتە: واجبـە: تەوێڵـەی بـە ڕووتـی دابنێتە سەر شوێنی نوێژ.

ئینجا بزانە: دەربارەی حەدیسەكەی(أنس ﷺ) كە-لە (بخاریو مسلم)دایـەو- دەفـەرموێ: ﴿لە بـەر گـەرما نەمانـدەتوانی تەوێڵـەمان دابنـێین‌و لـە سـەر جلـەكانمان سـوجدەمان دەبرد﴾. ئیمامی (النواوی) دەفـەرموێ: ئـەم حەدیسـە بۆ سـەر جلێكـی داكەنـدراو بـەكار هێندراوە. هەم دەفەرموێ: ئەو دوو حەدیسەش كە دەفـەرموون: ﴿پێغەمبـەر ﷺ لـە سـەر مێزەرەكەی سوجدەی برد﴾. هەم ﴿لە ڕۆژێكی بارانیشـدا لـە سـەر پارچـە جلێكیخۆی سوجدەی برد﴾. هەردووكیان (ضعيف)-بێهێـزن. هـەروەها دەفـەرموێ: ئەگـەر تەوێڵـەی بریندار بوو و بـە شـتێك پێچـای، ئـەو كاتـە-بـە هـۆی عـوزر- دروستە: سوجدە لـە سـەر پێچەرەكە بباو دووبارەكردنەوەی نوێژیشی لە سەر نیە، لـە (المجمـوع)دا ئـەو حەدیسـانەو ئەو مەسەلەی ڕوون كردونەوە.

بەڵام ئەگەر لە كاتی سوجدەییەكەمدا گەڵایەك، یان شتێكیتری بە تەوێڵـەوە لكـا، ئـەوە واجبە: بۆ سوجدەیدووەم لایببا، ئەگینا: سـوجدەیدووەمی دروسـت نیـە، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە، هەروەها ئەگەر لە سەر تەختێك سوجدەی بـرد: كە بە جوولەی ئەوی دەجولاوە، ئەوەش دروستە، چونكە هەڵگیراوی خۆی نیە، هـەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلايَجِبُ) واجب نیە (وَضْعُ يَدَيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ وَقَدَمَيْهِ فِيالأظْهَرِ) هەردوو دەسـتەكان‌و هـەردوو ئـەژنۆكان‌و هـەردوو پێیـەكانی دابنێتـە سـەر شـوێنی نوێـژ (قُلْـت) ئیمـامی(النـواوی) دەفـەرموێ (الأظْهَـر) بـە فـەرموودەی بـەهێزتر (وُجُوبُـه وَاللهُ أعْلَـم) واجبـە ئـەو شـەش ئەندامەش گشتی لە كاتیسوجدەدا دابنێتە سەر شوێنی نوێژ ﴿عَنْ ابْن عبّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما:

وَيَجِبُ أَنْ يَطْمَئِنَّ وَيَنالَ مَسجدَهُ ثِقَلُ رَأْسِهِ، وأَنْ لا يَهوِيَ لِغَيْرِهِ فَلَو سَقَطَ لِوَجْهِهِ وَجَبَ الْعَوْدُ إِلىَ الإِعْتِدالِ، وأَنْ تَرْتَفِعَ أَسافِلَهُ عَلى أَعالِيهِ فِي الأَصَحِّ، وَأَكْمَلُهُ يُكَبِّرُ لِهَوِيِّهِ

---

عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ: عَلىَ الْجَبْهَةِ وَأَشارَ إِلَى أَنْفِهِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وأَطْرافِ الْقَدَمَيْنِ﴾ رواه الشيخان، فەرمانم پێکراوە: لە سەر حەفت ئێسقان سوجدە ببەم: لە سەر تەوێڵە -ئاماژەی بۆ لووتیشی کردو- لە سەر هەردوو دەستەکان‌و لە سەر هەردوو ئەژنۆکان‌و لە سەر زگی پەنجەی پێیەکان.

(وَيَجِبُ أَنْ يَطْمَئِنَّ) واجبە: لە سوجدەدا خۆی ڕابگرێ، بە بەڵگەی ﴿ثُمَّ اسْجُدْ حَتّى تَطْمَئِنَّ ساجِداً﴾ی ڕابردوو (وَيَنالَ مَسْجِدَهُ ثِقَلُ رَأْسِهِ) هەروەها واجبە: گرانایی سەری بگاتە سەر شوێنی سوجدەکەی بە شێوەیەکی وەها: ئەگەر لە سەر پووش، یان لۆکە، یان ئیسفنج نوێژ بکا، ئەوەندە هێز بداتە سەری: تا بۆشایی دەگاتەوە یەکتر، بە جۆرێکی وەها: ئەگەر دەستی لە بن دابنێ، هەست بە گرانیەکەی سەری بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَجَدَ وَأَمْكَنَ جَبْهَتَهُ وَأَنْفَهُ مِنَ الأَرْضِ﴾ رواه ابوداود والترمذی بسندصحیح، پێغەمبەر ﷺ سوجدەی بردو تەوێڵەو لووتی لە زەمین گیر کردن. ئینجا بزانە: لە سوجدەدا دانانی لووت واجب نیە بەڵکو سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ لا يَهْوِيَ لِغَيْرِهِ) هەروەها واجبە بە هیچ مەبەستێکی‌تر نەڕواتە خوارەوە (فَلَوْ سَقَطَ لِوَجْهِهِ) جا ئەگەر هاتو: بە سەر ڕووی‌دا کەوتە خوارەوە (وَجَبَ الْعَوْدُ) واجبە بگەڕێتەوە (إِلىَ الأَعْتِدالِ) بۆ حاڵەتی ڕاست ڕاوەستان بە پێوە، ئینجا بە نیەتی سوجدە دووبارە بڕواتە خوارەوە (وَأَنْ تَرْتَفِعَ أَسافِلُهُ) واجبە: لە سوجدەدا لای‌خوارەوە، واتە: لای‌قینگی بەرزتر بێ (عَلى أَعالِيهِ) لە لای سەرەوەی لاشەی: کە سەرو شانیەتی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

جا ئەگەر لە شوێنێکی وەك کەشتی‌دا بوو و بۆی نەگونجا لە سوجدەدا لای‌خوارەوەی لە سەرەوە بەرزتر بێ، ئەوە بە هەرجۆرێك بێ، واجبە نوێژەکە بکاو واجبە دووبارەشی بکاتەوە، بەڵام ئەگەر بە هۆی‌نەخۆشی نەیتوانی بەو شێوەیە سوجدە ببا، ئەو کاتە هەر چۆنێك سوجدە ببا، دروستەو دووبارەشی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر دەگونجا سەر دابنێتە سەر بالیفێك=سەرینێك‌و لای‌خوارەوەشی بەرزتر بێ، ئەو کاتە واجبە شتێکی وەکو بالیف= سەرین دابنێ‌و سوجدەی لە سەر ببا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَكْمَلُهُ) تەواوترینی‌سوجدەبردن ئەمەیە: (يُكَبِّرُ لِهَوِيِّهِ) بڵێ: (الله أكبر)، کە بۆ سوجدە دەڕواتە خوارەوە ﴿عن ابي‌هريرة: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكَبِّرُ حِينَ يَهْوِي وَحِينَ يَرْفَعُ

بِلا رَفْعٍ وَيَضَعُ رُكْبَتَيْهِ ثُمَّ يَدَيْهِ ثَمَّ جَبْهَتَهُ وأَنْفَهُ، وَيقُولُ: سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى. ثَلاثاً،

---

رَأْسَهُ، ثُمَ يُكَبِّرُ حِينَ يَسْجُدُ ثُمَّ يُكَبِّرُ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (الله أكبر)، كاتی چوونە سوجدەو كاتی هەڵسانەوەو كاتی چوونە سوجدەی دووەمو كاتی هەڵسانەوە لە سوجدەیدووەم.

(بِلارَفْعٍ) بەڵام دەستەكانی بەرز ناكاتەوە: نە لەو كاتەی دەچێتە سوجدەو نە لەو كاتەش كە لە سوجدە هەڵدەستێتەوە ﴿عن ابْن عمرﷺ: كانَ النَّبِيُّﷺ لايَفْعَلُ ذَلكَ حِينَ يَسْجُدُ وَلا حِينَ يَرْفَعُ رأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ﴾ رواه البخاری، پێغەمبەرﷺ كە دەچووە سوجدەو كە لە سوجدە هەڵدەستاوە، لە هیچیان دەستی بەرز نەدەكردەوە. جا حەدیسەكەش بە درێژی لە ڕوكووعدا ڕوون كراوە.

(وَيَضَعُ رُكْبَتَيْهِ) یەكەمجار هەردوو ئەژنۆیەكانی دادەنێ (ثُمَّ يَدَيْهِ) ئینجا هەردوو دەستەكانی دادەنێ (ثُمَّ جَبْهَتَهُ وَأنْفَهُ) ئینجا تەوێڵەو لووتی دادەنێ ﴿عن وائل بن حُجرﷺ: كانَ النَّبِيُّﷺ إِذا سَجَدَ يَضَعُ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ وَإِذا نَهَضَ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرﷺ كاتێ دەچووە سوجدە ئەژنۆیەكانی پێش دەستەكانی دادەنا، كاتێ لە سوجدە هەڵدەستاوە دەستەكانی پێش ئەژنۆیەكانی بەرز دەكردن.

ئینجا بزانە: پێچەوانەی ڕیزیڕابردوو ناپەسندە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵام حەدیسیتریش هەیە بە پێچەوانەوە دەفەرموێ: دەستەكانی پێش ئەژنۆیەكانی دابنێ، بۆیێ لە (المجموع)دا دەفەرموێ: بە گوێرەیحەدیس دەرناكەوێ لەو دوو ڕایانە یەكێك لەویتر بە بەهێزتر دابندرێ.

جا ئیمامی(الخطابی) دەفەرموێ: حەدیسەكەی پێشخستنی ئەژنۆیەكان چەسپاوترەو بۆ نوێژكەر خۆشترەو شێوەی جوانترە.

(وَيَقُولُ) سوننەتە لە سوجدەدا بڵێ: (سُبْحانَ رَبِّيَ الأعْلى). ﴿عن حذيفةﷺ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّﷺ ذاتَ لَيْلَة...إلى أَنْ قال: ثُمَّ رَكَعَ فَجَعَلَ يَقُولُ: سُبْحانَ رَبِّيَ الْعَظِيم...ثُمَّ قالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ...ثُمَّ سَجَدَ فَقالَ: سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لە ڕوكووعدا دەیفەرموو: (سُبْحانَ رَبِّيَ العَظِيم)، لە هەڵسانەوەدا دەیفەرموو: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه)، لە سوجدەدا دەیفەرموو: (سُبْحانَ رَبِّيَ الأعْلى).

جا ئەو زیكرەی سوجدەش (ثَلاثاً) لای كەمی سوننەتە: سێ جار بیڵێ، بەڵام بە یەك جاریش بنچینەی سوننەتەكە وەدەست دێ.

هەروەها سوننەتە ووشەی (وَبِحَمْدِهِ)ش بە دوایدا بڵێ، چونكە سێجارەكەو ووشەكە لە دوو حەدیسی بێهێزدا هاتونو لە (المجموع) هێناونی.

وَيَزِيدُالْمُنفَرِدُ: اَللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخالِقِينَ. وَيَضَعُ يَدَيْهِ حَـذْوَ مَنْكِبَيْـهِ، وَيَنْشُرُ أَصابِعَهُ مَضْمُومَةً لِلْقِبْلَةِ وَيُفَرِّقُ رُكْبَتَيْهِ،

---

ئینجا بزانە: ئیمامی نوێژ لەو سێ جارە زیاتر، هیچ زیکرێکیتر ناکا، بەلام (وَيَزِيدُالْمُنْفَرِدُ) ئەو کەسەی بە تەنهایی نوێژ دەکا سوننەتە لە دوای سێ جارەکە ئەم زیکرەش بکا: ﴿اَللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ، سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَـرَهُ، تَبـارَكَ اللهُ أَحْسَـنُ الْخـالِقِينَ﴾ رواه مسلم. هەروەها بۆ ئیمامی کۆمەڵێکی سەرژمێرکراویش-بەو مەرجانەیڕابردوو لە (اِفْتِتـاح)دا، ئەگەر گشت مەئموومەکان ئیزنی بدەن- سوننەتە ئەو زێدەیە بخوێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَضَعُ يَدَيْـهِ) لە کاتی سوجدەبردندا سوننەتە: هەر دوو لەپەدەستەکانی دابنێ (حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ) بەرامبەر هەردوو شانەکانی (وَيَنْشُرُ أَصابِعَهُ) پەنجەکانی دەستی دەکاتەوە، واتە: درێژیان دەکاو (مَضْمُومَةً) بە پێکەوەلکاوی (لِلْقِبْلَـةِ) بەرەو قیبلە لە سەر شوێنی نوێژ دایاندەنێ ﴿عن ابي حُمَيْدﷺ: كان النَّبِيُّﷺ إذا سَجَدَ أَمْكَنَ أَنْفَهُ وَجَبْهَتَهُ مِنَ الْأَرْضِ وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ وَوَضَعَ كَفَّيْهِ حَـذْوَ مَنْكِبَيْـهِ﴾ رواه الترمذي وقال: حسن صحيح، کاتێ پێغەمبەرﷺ سوجدەی دەبرد، لووتو تەوێڵەی لە زەمین گیر دەکرنو دەستەکانی لە تەنیشتەکان لادەدانو هەر دوو لەپەدەستەکانی بەرامبەر شانەکانی دادەنان.

(وَيُفَرِّقُ رُكْبَتَيْهِ) هەروەهاسوننەتە: هەردوو ئەژنۆیەکانو هەردوو پێیەکانی بە قەد بستێك لێك جیابکاتەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی(ابیهریرة): کە لە سەرەتای ڕوکنی سێیەمدا ڕوونمان کردەوە، ئینجا زگی پەنجەی پێیەکانی دادەنێتە سەر زەمین، تاکو سەرە پەنجەکان بەرەو قیبلە بن ﴿عن أَبِي حُميدﷺ: كانَ النَّبِيُّﷺ إذا سَجَدَ اسْـتَقْبَلَ بِـأَطْرافِ أَصابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ﴾ رواه البخاري، کە پێغەمبەرﷺ سوجدەی دەبرد، سەری پەنجەی پێیەکانی ڕوو لە قیبلە دەکردن.

ئینجا بزانە: لە سوجدەدا واجبە: بەرە دەستو زگی پەنجەی پێیەکان لە سەر زەمین دابندرێن، کەواتە: ئەگەر پشتە دەست، یان پشتی پەنجەکانی، یان پشتەپێی لە سەر زەمین دانا، ئەوە سوجدەکەی دروست نیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، هەم ئەم حەدیسەش: ﴿عن البراء: قال النَّبِيُّﷺ: إِذا سَجَدْتَ فَضَعْ كَفَّيْكَ وَارْفَعْ مِرْفَقَيْـكَ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك سوجدەت برد، لەپەدەستەکانت دابنێ سەر زەمینو ئەنیشکەکانت لە زەمین بەرز بکەوە. بەلام واجب نیە: گشت ئەندامەکە بە تەواوی دابندرێن، بەڵکو بەشێکی دابندرێتە سەر زەمین سوجدەکەی دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

وَيَرْفَعُ بَطْنَهُ عَن فَخذَيْهِ وَمِرْفَقَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ، وَتَضُمُّ الْمَرْأَةُ وَالْخُنْثى. اَلثَّامِنُ: اَلْجُلوسُ بَيْنَ سَجْدَتَيْهِ مُطْمَئِنّاً، وَيَجِبُ أَنْ لاَيَقْصِدَ بِرَفْعِهِ غَيْرَهُ، وَأَنْ لاَيُطَوِّلَهُ وَلاَالاعْتِدالَ،

---

(وَيَرْفَعُ بَطْنَهُ عَنْ فَخذَيْهِ) هەروەها سوننەتە: زگی لە ڕانەکانی بەرز بکاتەوەو (وَمِرْفَقَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ) هەردوو ئەنیشەکانی لە هەردوو تەنیشتەکانی دوور بخاتەوە (فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ) هەم لە ڕوکوعو هەم لە سوجدەدا ئەو بەرزکردنەوەو دوورخستنەوەیە ئەنجام بدا ﴿عن عبدالله بن بُجَينةﷺ: أنَّ النَّبيَّﷺ كانَ إذا صَلّى وَسَجَدَ فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتّى يُرى بَياضُ إبْطَيْهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ کە سوجدەی دەبرد، دەستەکانی لێك دوور دەکردەوە تا سپیایی بن هەنگڵی دەبینرا.

(وَتَضُمُّ الْمَرْأَةُ وَالْخُنْثى) بەڵام ئافرەتو نەنێر نەمێ ئەو ئەندامانەیڕابردوویان وێك دێننەوە، واتە: ئەنیشکەکانیان بە تەنیشتەکانیانەوە دەنێنو زگیان بە ڕانەکانیانەوە دەنێن، چونکە ئەوها باشتر دادەپۆشرێن، لەو بابەتەشدا حەدیسێك هەیە بەڵام بێهێزە، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی، ئەمەش حەدیسەکەیە:

﴿مَرَّ النَّبيُّﷺ عَلى امْرأَتَيْنِ تُصَلِّيانِ، فَقال: إذا سَجَدْتُما فَضُمّا بَعْضَ اللَّحْمِ إلىالأَرْضِ فَإنَّ الْمَرأةَ فيذلكَ لَيْسَتْ كَالرَّجُلِ﴾ رواه ابوداود مرسلا، پێغەمبەرﷺ بە لای دوو ئافرەتدا ڕابرد نوێژیان دەکرد، جا فەرمووی: هەر کاتێك سوجدەتان برد، بەشێکی خۆتان بلەکێنن بە زەمیندا، چونکە لەوەدا ئافرەت وەکو پیاو نیە.

## ٨-﴿ دانیشتن لە نێوان هەردوو سوجدەدا ﴾

(اَلثَّامِنُ) هەشتەم لە ڕوکنەکانینوێژ: (اَلْجُلوسُ) دانشیتنە (بَيْنَ سَجْدَتَيْهِ) لە نێوان هەردوو سوجدەکانیدا (مُطْمَئِنّاً) واجبە: لەو دانیشتنەشدا خۆی ڕابگرێ، پێغەمبەرﷺ بە نوێژکەرەکەی فەرموو: ﴿ثُمَّ ارْفَعْ حَتّى تَطْمَئِنَّ جالِساً﴾ رواه الشيخان، ئینجا لە سوجدە هەڵسەوەو بە دانیشتوویی خۆت ڕابگرە.

(وَيَجِبُ) واجبە (أَنْ لا يَقْصِدَ بِرَفْعِهِ) بەو هەڵسانەوەیەی مەبەستی هیچ نەبێ (غَيْرَهُ) جگە لە دانیشتنی نێوان سوجدە، واتە: ئەگەر لە ترسیشتێك، یان لە ئازاریدرکێك سەری بەرز کردەوە، ئەوە دروست نیە، بەڵکو واجبە: بگەڕێتەوە بۆ سوجدە، ئینجا بە نیەتی دانیشتن هەڵبستێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ لا يُطَوِّلَهُ) هەروەها واجبە: ئەو دانیشتنە درێژ نەکاتەوە (وَلاَالاعْتِدالَ) هەروەها ڕاستبوونەوەی دوای ڕوکوعیش درێژ نەکاتەوە، واتە: زیاتر لەو زیکرەی لە هەر یەکێکیاندا سوننەتە.

وَأَكْمَلُهُ يُكَبِّرُ وَيَجْلِسُ مُفْتَرِشاً واضِعاً يَدَيْهِ قَرِيباً مِنْ رُكْبَتَيْهِ وَيَنْشُرُ أَصابِعَهُ قـائِلاً: رَبِّ اغْفِر لِي وَارْحَمْنِي وَاجْبُرْنِي وَارْفَعْني وَارْزُقْني وَاهْدِني وَعَافِني. ثُـمَّ يَسْـجُدُ الثَّانِيَـةَ كَالأُولى، وَالْمَشْهُورُ سَنُّ جِلْسَةٍ خَفِيفَةٍ بَعْدَالسَّجدةِالثَّانِيَةِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ يَقُومُ عَنْها.

---

(وَأَكْمَلُـهُ) تـەواوترین دانیشـتنی نێـوان هـەردوو سـوجدەکان ئەوەیـە: (یُکَبِّـرُ) لـە کـاتی هەڵسانەوەدا دەڵـێ: (الله اکبر)، بـەڵام دەستەکانی بـەرز ناکاتـەوە، هـەروەك لـە سـوجدەدا بەڵگـەمان بـۆ هـەردووکیان هێنـاوە (وَيَجْلِسُ مُفْتَرِشـاً) پـێی چـەپەی ڕادێخـێ‌و لـە سـەری دادەنیشێ‌و پـێی ڕاستەشی دادەچەقێنێ (واضِعاً يَدَيْـهِ) هـەردوو دەستـەکانی دادەنێتـە سـەر هـەردوو ڕانـەکانی (قَرِيبـاً مِـنْ رُكْبَتَيْـهِ) لـە نزیکـی هـەردوو ئەژنۆیـەکانی (وَيَنْشُـرُ أَصـابِعَهُ) پەنجـەکانی دەستیشـی بـەرەو قیبلـە دەکاتـەوە، واتـە: سـەری‌پەنجەکانی لـە بەرامبـەر ئەژنۆیەکانی دادەنێ (قائِلاً) لە کاتی‌دانیشتندا بڵـێ: ﴿رَبِّ اغْفِرْلِي وَارْحَمْنِي وَاجْبُرْنِي وَارْزُقْنِي وَاهْدِنِي وَعافِنِي﴾ روى بعضه ابوداود باسناد جيد، والباقي غيره والحاكم باسناد صحيح.

(ثُمَّ يَسْجُدُالثَّانِيَةَ) ئینجا لە دوای ئەو دانیشـتنە، سـوجدەی‌دووەمیش دەبـا (كَـالأُولى) وەکو سوجدەی‌یەکەم لە شێوەو لە زیکرەکاندا، پێغەمبـەرﷺ بـە نوێژکـەرەکـەی فـەرموو: ﴿ثُـمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ ساجِداً﴾ رواه الشيخان، ئینجا لە دوای ئەو دانیشتنە سوجدەیەکی‌تریش ببەو خۆت لە سوجدەکەدا ڕابگرە.

(وَالْمَشْهُورُ) فەرموودەی ناسراوی‌مەزهەب ئەمەیە: (سَنُّ جِلْسَةٍ خَفِيفَةٍ) دانیشتنێکی سووك سوننەتە (بَعْدَالسَّجْدَةِالثَّانِيَةِ) لە دوای سوجدەی‌دووەم (فِي كُلِّ رَكْعَةٍ) لە گشت ڕەکعەتێکدا (يَقُومُ عَنْها) کە لەو دانیشتنەوە هەڵبستێتەوە بـۆ فاتیحـە خوێنـدن ﴿عَـنْ مالِـكِ بـنِ الحويرثِ‌ﷺ: أَنَّهُ رَأَى‌النَّبِيَّﷺ يُصَلِّي فَإِذا كانَ فِي وِتْرٍ مِنْ صَلاتِهِ لَمْ يَنْهَضْ حَتَّى يَسْـتَوِيَ قاعِداً﴾ رواه البخاري، پێغەمبـەرﷺ لـە ڕەکعەتـە تاکەکانی‌نوێـژدا هەڵنەدەسـتا پێـوە تـا دادەنیشت. کەوابو هـەر لـەو حەدیسـەش وەردەگـیرێ: کـە لـە تەحیاتـداو لـە نوێـژی بـە دانیشتنەوەدا ئەو دانیشتنە نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بەو دانیشتنە دەگوترێ: (جِلْسَةُ الإِسْتِراحَةِ). واتە: پشوودانێکە لە نێوان دوو ڕەکعەتـدا، ئـەو دانیشـتنەش–وەك دانیشـتنی تەحیاتی‌یەکـەم– بەشـێك نیـە لـە هـیچ ڕەکعەتێك، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

کەواتە: بـە تـەواوبوونی سـوجدەی‌دووەم، ڕەکعـەت تـەواو دەبـێ، هـەروەك لـە (تحفة)دا فەرموویەتی؟ چونکە لە دوای فێرکردنی سوجدەی‌دووەم، پێغەمبەرﷺ بە نوێژکـەرەکـەی فەرموو: ﴿ثُمَّ افْعَلْ ذلِكَ فِي صَلاتِكَ كُلِّها﴾ رواه الشيخان، ئینجا ئەوەی‌ڕابردوو لـە گشـت نوێژەکەتدا دووبارە بکەوە.

اَلتَّاسِعُ وَالْعَاشِرُ وَالْحَادِیعَشَرَ: اَلتَّشَهُّدُ وَقُعُودُهُ وَالصَّلاَةُ عَلَی النَّبِیِّﷺ، فَالتَّشَهُّدُ وَقُعُودُهُ إِنْ عَقَبَهُمَا سَلاَمٌ رُكْنَان، وَإِلاَّ فَسُنَّتَان، وَكَیْفَ قَعَدَ جَازَ، وَیُسَنُّ فِیالأَوَّل اَلإفْتِرَاشُ:

## ٩ و ١٠ و ١١-﴿ تەحیات، سەڵەوات، بە دانیشتنەوە ﴾

(اَلتَّاسِعُ) نۆیەمو (وَالْعاشِرُ) دەیەمو (وَالْحادِیعَشَرَ) یازدەهەم لە ڕوكنەكانیnوێژ: (اَلتَّشَهُّدُ) تـەحیات خوێندنـەو (وَقُعُـودُهُ) دانیشـتنە بـۆ تـەحیات خوێنـدنو (وَالصَّـلاةُ عَلیالنَّبِـیِّﷺ سەڵەوات لێدانە لە سەر پێغەمبەرﷺ لە تەحیاتدا.

(فَالتَّشَهُّدُ) جا تەحیات خوێندنو (وَقُعُودُهُ) دانیشتن بۆ تەحیات خوێندن لـە نوێـژی واجـبو سوننەتدا (إِنْ عَقَبَهُما سَلامٌ) ئەگەر سەلامدانەوەیان بە دوادا بیّ، واتە: ئاخیر تەحیات بیّ لە نوێژدا (رُكْنانِ) هەردووكیان ڕوكنی نوێژنو واجبن، جیاوازی نیە: نوێژەكە یەك ڕەكعەت بیّ، یان دوو ڕەكعەت بیّ، یان زیاتر ﴿عَن عبداللهﷺ: كُنّا نَقُولُ قَبْلَ أَنْ یُفْرَضَ عَلَیْنَـا التَّشَـهُّدُ: اَلسَّلامُ عَلیاللهِ اَلسَّلامُ عَلی جِبْریلَ وَمیكائیلَ. فقال رَسولُ اللهِﷺ قُولُوا: أَلتَّحِیّاتُ لِلّهِ...الخ﴾ رواه النسـائی والـدارقطنی والبیهقـی وقـالا: اسـناده صـحیح، واتـە: پـێش ئـەوەی تـەحیات خوێندن واجب ببیّ، بە ڕستەی (السَّلام عَلیاللهِ)...هتد، كۆتایی نوێژمان دەهێنا، ئینجا كە تەحیات واجب بوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی بڵێن: (اَلتَّحِیاتُ لِلّه)...هتد.

(وَاِلّا) بەڵام ئەگەر سەلامدانەوەیان بە دوادا نەئەهات، واتە: ئاخیر تەحیات نەبو لە نوێـژدا (فَسُنَّتانِ) تەحیاتو دانیشتن بۆ تەحیات خوێندن هەردووكیان سوننەتنو واجب نین ﴿عن عبدالله بن بُحَیْنَةَﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قامَ مِنَ اثْنَتَیْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ یَجْلِسْ بَیْنَهُما فَلَمّا قَضَی صَلاتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَیْنِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ لە نوێژی نیـوەڕۆدا لـە دوای دوو ڕەكعـەت هەڵسـاوەو دانەنیشـت تـەحیات بخـوێنیّ، ئینجـا لـە كۆتـایی نوێـژدا دوو سوجدەی سەهووی بردنو سەلامی دایەوە.

واتە: ئەگەر تەحیاتییەكەم واجب بیّ، پێغەمبەرﷺ سوجدەی سەهووی لەجیاتی نـەدەبرد، چونكە سوجدەی سەهوو جێگەی واجب پڕ ناكاتەوە، كـەوابو: لـە هـەر شـوێنێكدا تـەحیات واجب بـیّ دانیشتنیشـی واجبـە، واتـە: ئەگـەر تـەحیاتیش نـەزانیّ، واجبـە: بـە ئەنـدازەی تەحیات دابنیشیّ، هەروەها لە هەر شوێنێكدا تەحیات سوننەت بیّ دانیشتنیشی سـوننەتە، واتە: ئەگەر تەحیاتیش نـەزانیّ، سـوننەتە: بـە ئەنـدازەی تـەحیات دابنیشـیّ، هـەروەك لـە (تحفة)و (حاشیةالقلیوبی) لە باسی نەزانینی فاتیحەدا فەرموویانە.

(وَكَیْـفَ قَعَـدَ) بـە هـەر شـێوەیەك بـۆ تـەحیاتو بـۆ دانیشـتنەكانیتری نوێـژ دابنیشـیّ (جـازَ) دروسـتە، بـەڵام (وَیُسَـنُّ) سـوننەتە (فِـیالأَوَّلِ) لـە دانیشـتنی تـەحیاتی یەكەمـدا (اَلإِفْـتِراشُ) بە شێوەی (إِفْـتِراش) دابنیشیّ، واتە: پشـتی پـیّی چـەپەی ڕادێخـیّ، ئینجا

فَيَجْلِسُ عَلَى كَعْبِ يُسْرَاهُ وَيَنْصِبُ يُمْنَاهُ وَيَضَعُ أَطْرَافَ أَصَابِعِهِ لِلْقِبْلَةِ، وَفِي الآخِرِ التَّوَرُّكُ: وَهُوَ كَالافْتِرَاشِ لَكِنْ يُخْرِجُ يُسْرَاهُ مِنْ جِهَةِ يَمِينِهِ وَيُلْصِقُ وَرِكَهُ بِالأَرْضِ، وَالأَصَحُّ يَفْتَرِشُ الْمَسْبُوقُ وَالسَّاهِي، وَيَضَعُ فِيهِمَا يُسْرَاهُ عَلَى طَرَفِ رُكْبَتِهِ مَنْشُورَةَ الأَصَابِعِ بِلاَ ضَمٍّ،

---

(فَيَجْلِسُ عَلَى كَعْبِ يُسْرَاهُ) لە سەر گوزینگی پێی‌چەپە دابنیشێو (وَيَنْصِبُ يُمْنَاهُ) پێی‌ڕاستەی دادەچەقێنێو (وَيَضَعُ أَطْرَافَ أَصَابِعِهِ) زگی پەنجەکانی پێی‌ڕاستەی دادەنێتە سەر زەمین (لِلْقِبْلَةِ) سەرە پەنجەکان بەرەو قیبلە دەکا.

(وَفِي الآخِرِ) هەروەها لە دانیشتنی تەحیاتی‌ئاخیردا سوننەتە: (التَّوَرُّكُ) بە شێوەی (تورك) دابنیشێ، مەبەست بە تەحیاتی‌ئاخیر -لێرەدا- ئەو تەحیاتەیە سەلامدانەوەی بە دوادا بێ، جیاوازی نیە: نوێژەکە یەك ڕەکعەتی بێ: وەکو وەتر، یان دوو ڕەکعەتی بێ، یان زیاتر، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، کەواتە جیاوازی نوێژی واجبو سوننەت نیە.

(وَهُوَ) دانیشتنی (تَوَرُّك)ش (كَالافْتِرَاشِ) وەکو دانیشتنی (اِفْتِراش) وایە (لَكِنْ) بەڵام لەوەدا جیاوازن: (يُخْرِجُ يُسْرَاهُ) لە (تَوَرُّك)دا پێی چەپەی دەباتە دەرەوە (مِنْ جِهَةِ يَمِينِهِ) بە لای ڕاستەی‌داو (وَيُلْصِقُ وَرِكَهُ بِالأَرْضِ) لاقینگی‌چەپەی بە زەمینەوە دەلکێنێ ﴿عن ابي حميد ﷺ كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ إذا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى، وَإِذا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الأَخِيرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرى وَنَصَبَ الأُخْرى وَقَعَدَ عَلى مَقْعَدَتِهِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ کە دوو ڕەکعەتی تەواو دەکردن، بۆ تەحیات خوێندن لە سەر پێی‌چەپەی دادەنیشتو پێی‌ڕاستەشی دادەچەقاند، کە بۆ تەحیاتی ئاخیریش دادەنیشت، پێی‌چەپەی دەبردە پێش پێی‌ڕاستەی، پێی‌ڕاستەشی دادەچەقاندو لە سەر نەرمەی‌ڕانی دادەنیشت.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (يَفْتَرِشُ الْمَسْبُوقُ) ئەو مەئمومەی لە ئیمامەکەی دواکەوتووە، ئەویش لەو تەحیاتانەی لەگەڵ ئیمامدا دەیانخوێنێ، بە شێوەی (اِفْتِراش) دادەنیشێ، چونکە بەو تەحیاتە کۆتایی نوێژەکەی نایێ (وَالسَّاهِي) هەروەها ئەو کەسەی لە نوێژدا سەهووی کردوەو لە نیەتی‌دایە سوجدەی سەهوو ببا، ئەویش بە شێوەی (اِفتراش) دادەنیشێ، چونکە تەحیاتەکەی ئاخیری‌نوێژ نیەو سەلامدانەوەی بە دوادا نایێ، کەوابو: ئەگەر نیەتی سوجدەی سەهووی نەبو، بە (تَوَرُّك) دادەنیشێ.

## ﴿ چۆنیەتی دانانی دەستو پەنجە لە تەحیاتدا ﴾

(وَيَضَعُ فِيهِما يُسْرَاهُ) سوننەتە لە تەحیاتی یەکەمو دووەمدا دەستی‌چەپەی دابنێ (عَلَى طَرَفِ رُكْبَتِهِ) لە سەر ڕۆخی ئەژنۆی چەپەیو (مَنْشُورَةَ الأَصَابِعِ) پەنجەکانی دەستی چەپەشی کراوە بن (بِلا ضَمٍّ) پێکیانەوە نالکێنێ.

قُلْتُ: اَلأَصَحُّ اَلضَّمُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَقْبِضُ مِنْ يُمْنَاهُ اَلْخِنصَرَ وَالْبِنْصَرَ وَكَذاالْوُسْطى فِي الأَظْهَرِ وَيُرْسِلُ الْمُسبِّحَةَ وَيَرْفَعُهَا عِنْدَ قَوْلِه: إِلاَّاللهُ، وَلاَ يُحَرِّكُهَا،

---

بەڵام (قُلْت) ئیمامی(النـواوی) دەفـەرموێ (اَلأصَحُّ) فەرموودەیڕاسـتتر ئەمەیە: (اَلضَّمُّ) پەنجەکانی پێکەوە دەلکێنێ (وَاللهُ أَعْلَم) تاکو گشتیان ڕوو لە قیبلە بن.

هەروەها دەستیڕاستەشی دادەنێتە سـەر ڕانیڕاسـتەی لـە نزیـك ئـەژنۆیو (وَيَقْبِضُ مِنْ يُمْناهُ) لـە پەنجەکانیدەستیڕاسـتەی ئـەم سـێ پەنجانـە دەنوقێنێ: (اَلْخِنْصَرَ) قلیجـەو (وَالْبِنْصَرَ) مامەلیجـەو (وَكَذاالْوُسْطَى) هـەروەها دۆڵەدرێـژە (فِيالأَظْهَرِ) لـە فـەرموودەی بەهێزتردا (وَيُرْسِلُ الْمُسَبِّحَةَ) شادەنوێژەش درێـژ دەکاتـەوە نزیـك ئـەژنۆی (وَيَرْفَعُهـا) لـە کاتی شادەهێناندا شادەنوێژەکە بەرز دەکاتەوە (عِنْدَ قَوْلِـه) لـە کـاتی دەسـت پێکردنـی ووشەی (إِلاّالله)، نەختێکیش پەنجەکە شۆڕ دەکـاتـەوە؟ تاکو بـەرەو قیبلـە ببـێ، جـا تـا پەنجەکە بەرزکراو بێ، تەنها دەڕوانێتە پەنجەکە، بە بەڵگـەی حەدیسـەکەی داهـاتوو: لـە باسی (سوننەتەکانی ناو نوێژ)دا، ان شاء الله تعالى.

ئینجـا تـا هەڵدەسـتێتەوە، یـان تـا سـەلام دەداتـەوە هـەر بـە بـەرزکراوەیی ڕایـدەگرێو داینانێتەوە، مەبەستیشی بەو بەرزکردنەوەیە ئەوە بێ: خوایگەورە تاك و تەنیایە لـە زاتو سیفەتو کـرداردا، تـاکو لـەو یەکخواناسینەدا کرداروو گوفتـارو بـاوەڕیدڵ بـە یەکـەوە کۆ بکاتـەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوونیـان کردۆتـەوە ﴿عن ابْنِ عمررَضِـيالله عَنهُمـا: كانَ النَّبيُّﷺ إذا قَعَدَ للتَّشَهُّدِ وَضَعَ يَدَهُ الْيُسْرَى عَلى رُكْبَتِهِ الْيُسْرَى، وَالْيُمْنَى عَلىالْيُمْنَــى، وَعَقَدَ ثَلاثاً وَخَمْسِينَ وَأَشارَ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةَ﴾ رواه مسلم واصـحاب السـنن، پێغەمبـەرﷺ کـە بۆ تەحیات دادەنیشت دەستی چەپەی لە سەر ئەژنۆیچەپەی دادەنـاو دەسـتی ڕاستەشـی لە سەر ئەژنۆیڕاستەی دادەناو پەنجەکانی وەکو ژمێریـاری پـەنجاو سـێ دەنوقانـدنو بـە پەنجەی شادەی ئاماژەی بۆ یەکخواناسین دەکرد.

(وَلا يُحَرِّكُهـا) لـە مـاوەی بەرزکردنـەوەدا پەنجـەی شـادە نـاجولێنێ، چـونکە جولانـدنی ناپەسندە، هەروەك لـە سەرچـاوەکاندا فەرموویانـە، بـەڵکو لـە فەرموودەیەکیمەزهەبدا: جولاندنی حەڕامەو نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە، هەروەك لـە (المجمـوع)و (تحفـە)دا فەرموویانـە ﴿عن ابن الزبيررَضِيالله عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ يُشيرُ بالسَّبَّابَةِ وَلا يُحَرِّكُها﴾ رواه ابوداود باسناد صـحيح، وأحمـد والنسـائي وابـن حبـان فـي صـحيحه، وصـححه البيهقـي، پێغەمبـەرﷺ ئاماژەی بە پەنجەی شادە دەکردو نەیدەجولاند.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێکی(صحيح)دا هـاتوە: ﴿عن وَائِل بن حُجْرﷺ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ رَفَـعَ إِصْبَعَهُ، فَرَأَيْتَهُ يُحَرِّكُها يَدْعُو بِهـا﴾ رواه ابـن خزيمـة والبيهقـي وغيرهمـا باسـناد صـحيح،

وَالأَظْهَرُ ضَمُّ الإِبْهامِ إِلَيْها كَعَاقِدِ ثَلاثَةً وَخَمْسِينَ، وَالصَّلاةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَرْضٌ فِي التَّشَهُّدِ الأَخِيرِ،

---

پێغەمبەر ﷺ پەنجەی شادەی بەرز کردەوەو دیتم دەیجولاندو دوعای پێدەکرد. جا ئیمامی (البیهقی) دەفەرموێ: دەگونجێ مەبەستی بەم جولاندنە: ئاماژە پێکردنەکە بێ، نەك جولاندنی بەردەوام؟ تاکو دژایەتی نەبێ لەگەڵ حەدیسەکەی (ابن الزبیر)ی ڕابردوو و هەردووکیان پێك بگەنەوە.

هەروەها حەدیسەکەی ﴿ابْن عمر رَضِيَ الله عَنْهُما: تَحْرِيكُ الإِصْبَعِ مَذْعَرَةٌ لِلشَّيْطانِ﴾ جولاندنی پەنجە ترساندنە بۆ شەیتان. ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: ئەم حەدیسە (صحیح) نیەو بێهێزە، لە (المجموع)دا مەسەلەی پەنجەی بە درێژی ڕوون کردۆتەوە.

هەروەها ئەو حەدیسەش کە دەفەرموێ: ﴿لَهِيَ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطانِ مِنَ الْحَدِيدِ، يَعْنِي السَّبَّابَةَ﴾ پەنجەی شادە لە ئاسن بەهێزترە لە دژی شەیتان. مەبەست بە (لَهِيَ) خودی پەنجەکەیە، هەروەك لە کۆتایی حەدیسەکەدا بە (السَّبّابة) ڕاڤەی کراوە، کەوابو: لێرەشدا مەبەست جولاندن نیە؟ چونکە (هِيَ) بۆ (مُؤَنَّثْ) مێینە بە کار دێو (تَحْرِيك)ش (مُذَكَّر) نێرینەیە.

(وَالأَظْهَر) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (ضَمُّ الأَبْهامِ إِلَيْها) سوننەتە: پەنجەی گەورەش بە لای بنەوەی پەنجەی شادەنوێژەوە بلکێنێ (كَعاقِدِ ثَلاثَةٍ وَخَمْسِينَ) وەکو ژمێریاری پەنجاوسێ: کە بە پەنجەکانی ئاماژە بۆ ئەو ژمارەیە بکا، بە بەڵگەی حەدیسە صحیحەکەی (ابْن عمر)ی ڕابردوو، ئینجا بزانە: ناپەسندە بە پەنجەی دەستە چەپ ئاماژە بکا، هەر چەند دەستی ڕاستەشی نەمابێ، هەروەها ئاماژەکردن بە پەنجەکانی تری ڕاستەش سوننەت نیە، هەرچەند پەنجەی شادەشی نەمابێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفە)دا فەرموویانە.

## ﴿ سەلەوات لە تەحیاتدا ﴾

(وَالصَّلاةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) سەلەوات لێدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ (فَرْضٌ) ڕوکنێکی نوێژەو واجبە (فِي التَّشَهُّدِ الأَخِيرِ) لە تەحیاتی ئاخیردا، واتە: ئەو تەحیاتەی دەکەوێتە ئاخیری نوێژ، هەرچەند تەحیاتی تریشی لە پێشدا نەبێ: وەك ڕەکعەتێکی وەترو دوو ڕەکعەتی سبەینێو جومعەو نوێژی کورتکراوەو سوننەتە دووڕەکعەتیەکان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يا أَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيماً﴾ ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، سەلەوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لێبدەنو سەلامی لێبکەن.

جا بە بەڵگەی (اجماع): لە دەرەوەی نوێژدا سەلەوات لێدان واجب نیە، بەڵکو سوننەتە، کەوابو: بە فەرمانی ئایەتەکە سەلەوات لە ناو نوێژدا واجبە، هەم بە بەڵگەی ئەم حەدیسەش: ﴿عَنْ أَبِي مَسعود ﷺ: قالَ رَجُلٌ: يا رسولَ الله كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ إِذا نَحْنُ

وَالْأَظْهَرُ سَنُّهَا فِي الأَوَّلِ، وَلاَ تُسَنُّ عَلَى الآلِ فِي الأَوَّلِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَتُسَنُّ فِي الآخِرِ وَقِيلَ تَجِبُ. وَأَكْمَلُ التَّشَهُّدِ مَشْهُورٌ، وَأَقَلُّهُ: اَلتَّحِيَّاتُ لِلَّهِ سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ سَلاَمٌ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُ اللهِ.

---

صَلَّيْنا عَلَيْكَ فِي صَلاتِنا؟ قالَ: قُولُوا: ﴿أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ...﴾ الخ، رواه ابن خزيمة وابن حبان والدارقطني وقال: هذا إسنادحسن، والحاكم وقال: حديث صحيح، ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئێمە چۆن سەڵەوات لە سەر تۆ لێبدەین هەر کاتێك لە ناو نوێژدا ویستمان سەڵەوات لێبدەین؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بڵێن: (أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ...) هتد.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرمودەی بەهێزتر (سَنُّها فِي الأَوَّلِ) سەڵەوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ لە تەحیاتی‌یەکەمدا سوننەتە، هەروەك تەحیاتەکەش سوننەتە.

بەڵام (وَلاتُسَنُّ عَلَى الآلِ) سەڵەوات لێدان لە سەر خزمەکانی پێغەمبەرﷺ سوننەت نیە (فِي الأَوَّلِ) لە تەحیاتی یەکەمدا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام ئەگەر مەئمووم پێش ئیمام تەحیاتی‌یەکەمی تەواو کرد، ئەو کاتە سوننەتە سەڵەوات لە سەر (آلِ)ش‌و هەم سەڵەواتە درێژەکەش لێبدا هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

هەروەها (وَتُسَنُّ) سەڵەوات لە سەر (آل)=خزمەکانی پێغەمبەرﷺ سوننەتە (فِي الآخِرِ) لە تەحیاتی ئاخیردا (وَقِيلَ تَجِبُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واجبە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: لە سەوات لێداندا بڵێن: ﴿أَللَّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ﴾ رواه الشيخان.

جا بزانە مەرجە: سەڵەوات لێدانەکە بکەوێتە دوای شادەهێنانی‌تەحیات، واتە: لە دوای تەواوبوونی (أَشْهَدُ أَنْ لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُ اللهِ) سەڵەوات لێبدا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَأَكْمَلُ التَّشَهُّدِ) تەواوترین ووشەکانی تەحیات (مَشْهُورٌ) ناسراوەو لە چەند حەدیسێکی (صحیح)دا هاتوە، وەك: ﴿اَلتَّحِيّاتُ الْمُبارَكاتُ الصَّلَواتُ الطَّيِّباتُ لِلَّهِ، اَلسَّلامُ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ وَرَحْمَةُاللهِ وَبَرَكاتُهُ، اَلسَّلامُ عَلَيْنا وَعَلَى عِبادِاللهِ الصّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُ اللهِ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم.

(وَأَقَلُّهُ) کەمترین ووشەکانی‌تەحیات: کە نوێژی پێ دروست بێ، ئەمەیە: (اَلتَّحِيّاتُ لِلَّهِ، سَلامٌ عَلَيْكَ أَيُّها النَّبِيُّ وَرَحْمَةُاللهِ وَبَرَكاتُهُ، سَلامٌ عَلَيْنا وَعَلى عِبادِاللهِ الصّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَن لاَّإِلَهَ اِلاَّاللهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُ اللهِ). بەڵام ئەگەر لە هەردووکیاندا بڵێ: (اَلسَّلامُ) خێری زیاترە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَقيلَ يَحْذِفُ وَبَرَكاتُهُ وَالصَّالحين، وَيَقُولُ: وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُهُ. قُلْتُ: اَلأَصَحُّ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَّسُولُ اللهِ، وَثَبتَ فِي صَحيحِ مُسْلِمٍ وَاللهُ أَعْلَمُ، وَأَقَلُّ الصَّلاة عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَآلِه: اَللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَآلِه. والزِّيَادَةُ إِلى حَميدٌ مَجيدٌ سُنَّةٌ فِي الآخِرِ،

---

(وَقيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يَحْذِفُ) ئەم دوو ووشەیە نالێ: كە (وَبَرَكاتُه)و (الصَّالحِينَ)یە، (وَيَقُولُ) لە فەرموودەی بێهێزدا دروستە بلێ: (وَأَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُهُ) واتە: ووشەی (عَبْدُه)و دووبارەكردنەوەی (أَشْهَد)ی لە گەڵدا نەبێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحّ) بە فەرموودەی ڕاستتر دروستە بلێ: (وَأَنَّ مُحَمَّداًرَّسولُ اللهِ) واتە: ووشەی (أَشْهَدُ) دووبارە نەكاتەوە (وَثَبتَ) شادەی دووەم بە بێدووبارەكردنەوەی(أَشْهَدُ) هاتوە (فِی) لە (صَحيح مُسْلم)دا (وَاللهُ أَعْلَم).

بەڵام دووبارەكردنەوەی پیتی(واو) لە شادەیدووەمدا واجبە، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی، واتە: چونكە-جگە لە شادەی بانگ- لە هیچ حەدیسێكدا بە بێ(واو) نەگوتراوە، هەروەها (بسم الله)كردن لە سەرەتای تەحیاتدا سوننەت نیە، چونكە حەدیسەكەی بێهێزە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها ناپەسندە تەحیات بە دەنگی ئاشكرا بخوێندرێ، چونكە حەدیسی(صحيح) دەربارەی بە نهێنی خوێندنیی هاتوەو لە (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە.

(وَأَقَلُّ الصَّلاة) كەمترین ووشەكانی سەلەوات لێدان لە تەحیاتدا (عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) لە سەر پێغەمبەرﷺ (وَآلِه) لە سەر خزمەكانی پێغەمبەرﷺ ئەمەیە: (اَللّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّدٍ وَآلِه). واتە: ئەوەندە لە تەحیاتدا بگوترێ، نوێژەكەی دروستە، چونكە فەرمانی خوایگەورە بەجێ دەهێندرێ.

بەڵام (وَالزِّيادَةُ) لەوەش زیاتر (إلى) تا دەگاتە (حَمِيدٌ مَجِيدٌ)-كە لە چەند حەدیسێكی (صحیح)دا هاتوە-(سُنَّةٌ فِیالآخِرِ) لە تەحیاتی ئاخیردا سوننەتە، جا ئیمام بێ، یان مەئموم بێ، یان بە تەنهایی نوێژ بكا، كەوابو: لە دوای (وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ) یەكسەر بلێ: ﴿اَللّهُمَّ صَلِّ عَلىمُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَما صَلَّيْتَ عَلى إِبْراهيمَ وَآلِ إِبْراهيمَ، وَبارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَما بارَكْتَ عَلى إِبْراهيمَ وَآلِ إِبْراهيمَ-فِي الْعالَمينَ- إِنَّكَ حَميدٌ مَّجيدٌ﴾ رواه الامام الشافعی والشیخان، واللفظ للشافعی إلاّ (فِی الْعالَمِينَ) فلمسلم.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە سەلەواتەكەدا بلێ: (سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ) زیانی نیە، بەڵكو چەند زانایەك فەرموویانە: سوننەتە. جا ئەو حەدیسەش كەدەڵێ: ﴿لاتُسَيِّدُونِی فِیالصَّلاةِ﴾ لە ناو نوێژدا پێم مەڵێن (سَيِّد). حەدیسێكی پوچەڵەو هیچ بنچینەیەكی ڕاستی نیە، هەروەك لە (نهایة)و (الشروانی)دا ڕوونیان كردۆتەوە.

وَكَذا الدُّعاءُ بَعْدَهُ وَمأثورُهُ أَفْضَلُ، وَمِنْهُ: اَللّٰهُمَ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ إِلَى آخِرِه، وَيُسَنُّ أَنْ لاَ يَزِيدَ عَلَى قَدْرِالتَّشَهُّدِ والصَّلاَة علىالنَّبيِّﷺ، وَمَنْ عَجزَ عَنْهُمَا تَرْجَمَ،

## ﴿ دوعای دوای تەحیات ﴾

(وكَذا الدُّعاءُ بَعْدَهُ) هەروەها دوعاكردن لە دوای تـەحیاتی ئـاخیردا سـوننەتە، واتـە: كـە سەلەواتی تەواو كرد، دوعا بكا (وَمأْ ثُورُهُ أفْضَلُ) ئـەو دوعایانـەی لـە پێغەمبـەرەوەﷺ هاتون خێری زۆرترە (وَمِنْهُ) هەندێك لـەو دوعایانـە ئەمەیـە: ﴿اَللّٰهُمَّ اغفِرْ لِي ماقَدَّمْتُ وَما أَخَّرْتُ وَماأَسْرَرْتُ وَماأَعْلَنْتُ وَماأَسْرَفْتُ وَماأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّر، لاإِلَهَ إلاَّأَنْتَ﴾ رواه مسلم.

بەڵكو چەند زانایەك بە واجبیان داناوە: لە دوای تەحیات ئەم دوعایـە بكرێ: ﴿اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذابِ النّارِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيا وَالْمَماتِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِـيحِ الدَّجّالِ﴾ رواه الشيخان. هەروەها پێغەمبەرﷺ ئەم دوعایەشی فێری ئیمامی (ابوبكرﷺ) كردوە: ﴿اَللّٰهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماًكَثِيراً وَلايَغْفِرُالذُّنُوبَ إلاّ أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِـنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُالرَّحِيمُ﴾ رواه الشيخان.

ئینجا بزانە: لەو دوعایانەدا جیاوازی ئیمـامو مـەئمومو نوێژكـەری بـە تـەنها نیـە، بـەڵام (وَيُسَنُّ) سوننەتە: (أَنْ لايَزِيدَ) ئیمامیﻧوێژ دوعایەكەی دوایتەحیات زیاتر نەكا (عَلـى قَـدْرِ التَّشَهُّدِ) لە ئەندازەی كەمترینی تەحیاتو (وَالصَّلاةِ عَلىالنَّبِيِّﷺ) لـە كـەمترینی سـەلەوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ، واتە: سوننەتە لەو ئەندازەیە كەمتر بێ.

ئینجا بزانە: ئەو كەسەی بە تەنهایی نوێژ دەكا، هەر چەند دوعا درێژ بكا ناپەسند نیە، بـەو مەرجەی سەهوو نەكا، بەڵام دوعاكردن لە تەحیاتییەكەمدا ناپەسندە، جا ئەگـەر مـەئموم لە پێش ئیمامدا تەحیاتییەكەمی تەواو كرد، ئـەو كاتـە سـوننەتە لـە دوای سـەلەوات دوعا بكا، هەروەك لە (تحفة)و (نهايـة)دا فەرموویانـە، هـەروەها هـەر تـەحیاتێك: یەكـەمو ئـاخیر نەبێ–وەك ئـەو تەحیاتانـەی مـەئموم بـۆ شـوێنكەوتنیئیمامەكەی دەیـانخوێنێ– ئـەویش هەمان بڕیاری تەحیاتییەكەمی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ عَجَـزَ عَنْهُمـا) هـەر كەسـێك توانـای نـەبو تـەحیاتو سـەلەواتەكە بـە عـەرەبی بڵـێو نەشگونجا فێـر ببـێ (تَـرْجَمَ) واجبـە: وەریـان بگێڕێتـە سـەر زمـانێكیترو بـە زمـانێكیتر بیانڵێ، بەڵام ئەگەر توانای عـەرەبیی هـەبو و بـە قەسـدی خـۆی فێـر نـەكرد نوێژەكـەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی، جـا ئەگـەر توانـای وەرگێڕانیشـی نـەبو، واجبـە: بـە ئەنـدازەی تـەحیاتو سـەلەوات دابنیشـێ، هـەروەك لـە سـەرەتای تەحیاتـدا ڕوونمان كردەوە.

وَيُتَرْجِمُ لِلدُّعَاءِ وَالذِّكْرِالْمَنْدُوبِ اَلْعَاجِزُ لاَالْقَادِرُ فِي‌الأَصَحِّ. اَلثَّانِي‌عَشَـرَ: اَلسَّـلاَمُ، وَأَقَلُّهُ اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. وَالْأَصَحُّ جَوَازُ سَلاَمٌ عَلَيْكُمْ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ لاَ يُجْزِئُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَأَنَّهُ لاَ تَجِبُ نِيَّةُالْخُرُوجِ،

---

(وَيُتَرْجِمُ لِلدُّعاءِ) هەروەها دروستە: ئەو دوعایەش وەربگێڕیتە سەر زمانێکی‌تر: کە لە نوێـژدا سوننەتەو لـە پێغەمبـەرەوەﷺ هـاتوە (وَالذِّكْرِالْمَنْدُوبِ) هـەروەها دروستـە ئـەو زیکرەش وەربگێڕێتەسەر زمانێکی‌تر: کە لە نوێژدا سوننەتەو لە پێغەمبـەرەوەﷺ هـاتوە (اَلْعاجِزُ) ئەو کەسەی ناتوانێ بە عەرەبی بیانڵێ (لاَالْقادِرُ) نەك ئەو کەسەی توانای هەیـە: بە عەرەبی بیانڵێ، واتە: هەر کەسێك توانـای عـەرەبی‌ی هـەبێ‌و بـە زمـانێکی‌تر بیـانڵێ، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ (فِي‌الأَصَحِّ) لــە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها هـەر دوعایـەك‌و هـەر زیکرێـك: کـە لـە پێغەمبـەرەوەﷺ نـەهاتبێ، حەرامـە: لـە نوێژدا–جگە لە عەرەبی– بە زمانێکی‌تر بیڵێ‌و نوێژەکـەی پـێ بـەتاڵ دەبێ، هـەر چـەند توانای عەرەبیشی نەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ١٢-﴿ سەلامدانەوە ﴾

(اَلثّانِي‌عَشَـرَ) ڕوکنی‌دوانـزەمین لــە ڕوکنەکانی‌نوێـژ: (اَلسَّـلامُ) سـەلامدانەوەی‌یەکەمە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مِفْتاحُ الصَّلاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُها التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُها التَّسْـلِيمُ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، کلیلی‌نوێـژ: دەستنوێژە، دابەستنی‌نوێژ: گـوتنی (الله اكبر)ە، تەواوکردنی نوێژ: سەلامدانەوەیە.

جا بزانە: بە سەلامدانەوەی‌یەکەم نوێژ تەواو دەبێ، واتـە: سەلامدانەوەی‌دووەم بەشێك نیـە لە نوێژەکە، کەوابو: ئەگەر–لە دوای سـەلامدانەوەی‌یەکەم– لەگـەڵ سـەلامدانەوەی‌دووەمدا بێ‌دەستنوێژ ببێ، نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَأَقَلُّهُ) کەمترینی‌سەلامدانەوە ئەوەیە: بە دانیشتنەوە ڕوو لە قیبلە بڵێ: (اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ). یەك جار (وَالأَصَحّ جَوازُ) لە فەرموودەیەکدا دروستە بڵێ: (سَلامٌ عَلَـيْكُمْ). بـەڵام بێ‌هێـزە (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفـەرموێ: (اَلأَصَـحُّ الْمَنْصُـوصُ: لايُجْزِئُـهُ) دەققـی فـەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (سَلامٌ عَلَـيْكُمْ) دوروسـت نیـە (وَاللهُ أَعْلَـم) هـەروەها (سَلامِي عَلَـيْكُمْ) یـان (سَلامُ اللهِ عَلَيْكُم) یان (سَلامٌ عَلَيْكَ) یان (اَلسَّلامُ عَلَيْكَ)، ئەوانـەش هیچیـان دروسـت نـین‌و کشـتیان نوێـژ بـەتاڵ دەکـەن ئەگـەر بزانـێ‌و بـە قەسدی بیـانڵێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا فەرموویانـە (وَأَنَّـهُ) هـەروەها فـەرموودەی ڕاسـتتر ئەمەیـە: (لاتَجِـبُ نِيَّـةُ الْخُرُوجِ) واجب نیە نیەتی دەرچـوون لـە نوێـژ بێنـێ، چـونکە نیەتی‌نوێـژ سـەلامدانەوەش دەگرێتەوە، بە سەلامدانەوەی یەکەمیش نوێژ تەواو دەبێ.

وَأَكْمَلُهُ اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ. مَرَّتَيْنِ يَميناً وَشِمَالاً، مُلْتَفِتاً فِي الأُولَى حَتَّى يُرَى خَدُّهُ اَلأَيْمَنُ وَفِي الثَّانِيَةِ اَلأَيْسَرُ، نَاوِياً اَلسَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَنْ يَمينِهِ وَيَسَارِهِ مِنْ مَلاَئِكَةٍ وَإِنْسٍ وَجِنٍّ، وَيَنْوِي الإِمَامُ اَلسَّلاَمَ عَلَى الْمُقْتَدِينَ، وَهُمْ اَلرَّدَّ عَلَيْهِ. اَلثَّالِثَ عَشَرَ: تَرْتِيبُ اَلأَرْكَانِ كَمَا ذَكَرْنَا،

---

(وَأَكْمَلُهُ) تەواوترینی سەلامدانەوە ئەمەیە: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ)، واتە: (وَبَرَكَاتُهُ)ی لەگەڵدا نەبێ (مَرَّتَيْنِ) سوننەتە دوو جار سەلام بداتەوە: جارێك (يَمِيناً) سوننەتە بە لای ڕاستەدا (وَشِمَالاً) جارێکیش سوننەتە بە لای چەپەدا (مُلْتَفِتاً فِي الأُولَى) لە سەلامی‌یەکەمدا ئەوەندە ئاوڕ بداتەوە (حَتَّى يُرَى خَدُّهُ اَلأَيْمَنُ) تا لە پشتەوەڕا کوڵمەی‌ڕاستەی دەدیترێ‌و (وَفِي الثَّانِيَةِ اَلأَيْسَرُ) تا لە سەلامی‌دووەمیشدا کوڵمەی‌چەپەی دەدیترێ ﴿عن عبدالله ﷺ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ حَتَّى يُرَى بَيَاضُ خَدِّهِ: اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ﴾ رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، پێغەمبەر ﷺ بە لای ڕاستەی‌و بە لای چەپەی‌دا سەلامی دەداوە، تا سپیایی کوڵمەی دەدیترا، لە هەردوو لادا دەیفەرموو: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) .

ئینجا بزانە: لە لای چەند زانایەك (وَبَرَكَاتُهُ)ش سوننەتە، چونکە لە حەدیسێکی (ابی‌داود بسند صحيح) هاتوە، هەروەها سوننەتە: دەست بە ووشەی(السَّلاَمُ) بکا، ئینجا ئاوڕ بداتەوە.

هەروەها بزانە: ئاوڕدانەوە سوننەتە، واتە: ئەگەر لە هەردوو سەلامەکەی‌دا ڕوو لە قیبلە بێ‌و بە هیچ لایەکیشدا ئاوڕ نەداتەوە سەلامدانەوەکە دروستە، بەڵام سوننەتەکەی لە دەست دەچێ، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانەی ڕوون کردونەوە.

(نَاوِياً) سوننەتە بە سەلامدانەوەی‌یەکەم نیەتی ئەوها بێ: (اَلسَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَنْ يَمِينِهِ) سەلام لەو کەسانە بکا: کە لە لای ڕاستەی‌خۆیەتی‌و (وَيَسَارِهِ) بە دووەمیش نیەتی سەلامکردنی هەبێ لەو کەسانەی لە لای چەپەی‌خۆیەتی: (مِنْ مَلاَئِكَةٍ) لە فریشتەو (وَإِنْسٍ) لە ئادەمیزادو (وَجِنٍّ) لە جنۆکە (وَيَنْوِي الإِمَامُ) ئیمامی‌نوێژ بە سەلامدانەوەی‌خۆی لەگەڵ ئەو سێ چینەش نیەت دێنێ (اَلسَّلاَمَ عَلَى الْمُقْتَدِينَ) سەلام لە مەئموومەکانیش بکا (وَهُمْ) مەئموومەکانیش نیەت دێنن (اَلرَّدَّ عَلَيْهِ) وەڵامی سەلامەکەی‌ئیمام بدەنەوە، ئینجا بزانە: لە کۆتایی ئەم بابەدا چەند باسێکی‌تری سەلامدانەوە هەیە، لە وێدا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاءالله تعالى.

## ١٣-﴿(تَرْتِيبُ اَلأَرْكَانِ): ڕیزکردنی ڕوکنەکانی‌نوێژ ﴾

(اَلثَّالِثَ عَشَرَ) ڕوکنی‌سێزدەمین لە ڕوکنەکانی‌نوێژ: (تَرْتِيبُ اَلأَرْكَانِ) ڕیزکردنی ڕوکنەکانی نوێژە: لە (الله اکبر)ەوە تا سەلامدانەوە، کە گشتی لە پێغەمبەر ﷺ وەرگیراوە (كَمَا ذَكَرْنَا)

فَإِنْ تَرَكَهُ عَمْداً بأَنْ سَجَدَ قَبْلَ رُكُوعه بَطَلَتْ صَلاتُهُ، وَإِنْ سَهَا فَما بَعْدَالْمَتْرُوكِ لَغْـوٌ، فَإِنْ تَذَكَّرَ قَبْلَ بُلُوغِ مثْله فَعَلَهُ وَإلاَّ تَمَّتْ به ركْعَتُهُ وتَدَارَكَ الْبَاقِيَ،

---

هەروەك باسمان كرد، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلُّوا كَمَـا رَأَيْتُمُـونِي أُصَـلِّي﴾ رواه البخاري، نوێژ بكەن بەو جۆرەی منتان دیت نوێژم كرد.

(فَإِنْ تَرَكَهُ) جا ئەگەر ڕوكنەكانی ڕێز نەكردن (عَمْداً) بە قەسدی (بِأَنْ سَجَدَ قَبْـلَ رُكُوعِـهِ) وەك بە قەسدی پێش ڕوكووع سوجدە ببا، یان پێش فاتیحەخوێندن ڕوكووع ببـا (بَطَلَـتْ صَلاتُهُ) نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ‌و واجبە: لە سەرەتاوە نوێژەكەی دەست پێ‌بكاتەوە.

(وَإِنْ سَهَا) بەڵام ئەگەر بە قەسدی نەبو، بەڵكو بە سەهوو ڕیزی ڕوكنـەكانی تێـك دا، وەك بە سەهوو لە پێش ڕوكووعدا سوجدە ببا (فَما بَعْدَالْمَتْرُوكِ) ئەوە هەرچـی لـە دوای ڕوكنـە نەكراوەكـە كردویـەتی (لَغْـوٌ) گشـتی بێ‌سودە، چـونكە لـە ڕیزی‌خـۆی‌دا نـەكراوەو بـە پێچەوانەی حەدیسەكەی‌ڕابردووە.

كەوابو: (فَانْ تَذَكَّرَهُ) ئەگەر هاتەوە بیری: كە ڕوكنەكەی نەكردوە (قَبْلَ بُلُوغِ مِثْلِهِ) پـێش ئەوەی بگاتە ڕوكنێكی‌تری وەك خۆی (فَعَلَهُ) واجبە بە پەلـە بگەڕێتـەوە سـەر ڕوكنەكـەو بیكا، ئەگینا: نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ.

بۆ وێنە: سەهووی كردو ڕوكووعی نەبردو چووە سوجدە، ئینجا هاتـەوە بـیری، ئـەوە واجبە: بە پەلە بگەڕێتەوە بـۆ ڕاوەسـتان، ئینجـا ڕوكـووع ببـا، یـان ئەگـەر هەڵسـاوە بـۆ فاتیحەیەكی‌تر، ئینجا هاتەوە بیری، ئەو كاتەش واجبە واز لەم فاتیحەیە بێنـێ‌و بـە پەلـە بڕواتە ڕوكووع.

ئینجا بزانە: گومانیش وەكو هاتنەوەبیر وایە، واتە: ئەگـەر لـە ڕوكووعدا كەوتـە گومـان: ئایا فاتیحەی خوێندوە، یان نا، یان لە سوجدەدا كەوتـە گومـان: ئایـا ڕوكـووعی بـردوە، یان نا، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا واجبە: بە پەلە بگەڕێتـەوە بـۆ ڕاوەسـتان؟ تـاكو ڕوكنـە گومانلێكراوەكە بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَإلاّ) بەڵام ئەگەر هەر نەهاتەوە بیری تا گەیشتەوە ڕوكنێكی‌تری وەك خـۆی، واتـە: لـەو وێنەی‌ڕابردوودا، نەهاتەوە بیری تا گەیشتەوە ڕوكووعێكی‌تر، ئەو كاتە (تَمَّـتْ بِـهِ رَكْعَتُـهُ) بەم ڕوكنەی‌ئێستای ڕەكعەتە ناتەواوەكـەی تـەواو دەبـێ، بـەڵام ئـەوەی لـە دوای ڕوكنـە نەكراوەكە تا ئێستا كردویەتی گشتی بێ‌سودە، كەوابو: (وَتَدارَكَ الْباقِيَ) ئەو بەشەی‌–لـە نوێژەكە– لە دوای ئەو ڕوكنە ماوە، گشتی دەكـاو بـەردەوام دەبـێ تـا نوێژەكـەی تـەواو دەبێ، ئینجا لە گشت ئەو حاڵەتانەی‌ڕابردوودا سوننەتە: سوجدەی سەهوو ببا، هـەر وەك لە سوجدەی سەهوودا ڕوونی دەكەینەوە، ان شاء الله تعالى.

فَلَوْ تَيَقَّنَ فِي آخِرِ صَلَاتِهِ تَرْكَ سَجْدَةٍ مِنَ الْأَخِيرَةِ سَجَدَهَا وَأَعَادَ تَشَهُّدَهُ، أَوْ مِنْ غَيْرِهَا لَزِمَهُ رَكْعَةٌ، وَكَذَا إِنْ شَكَّ فِيهِمَا، وَإِنْ عَلِمَ فِي قِيَامِ ثَانِيَةٍ تَرْكَ سَجْدَةٍ فَإِنْ كَانَ جَلَسَ بَعْدَ سَجْدَتِهِ سَجَدَ، وَقِيلَ إِنْ جَلَسَ بِنِيَّةِ الاسْتِرَاحَةِ لَمْ يَكْفِهِ وَإِلاَّ فَلْيَجْلِسْ مُطْمَئِنّاً ثُمَّ يَسْجُدُ، وَقِيلَ يَسْجُدُ فَقَطْ، وَإِنْ عَلِمَ فِي آخِرِ رُبَاعِيَّةٍ تَرْكَ سَجْدَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثٍ جَهِلَ مَوْضِعَهَا وَجَبَ رَكْعَتَانِ، أَوْ أَرْبَعٍ فَسَجْدَةٌ

---

(فَلَوْ تَيَقَّنَ فِي آخِرِ صَلَاتِهِ) ئەگەر لە كۆتاییِ‌نوێژەكەی‌دا -پێش سەلامدانەوە- بێگومان زانی: (تَرْكَ سَجْدَةٍ) سوجدەیەكی نەبردوە (مِنَ الْأَخِيرَةِ) لە دوو سوجدەكەی ڕەكعەتی ئاخیر (سَجَدَهَا) واجبە: بە پەلە سوجدە بباو (وَأَعَادَ تَشَهُّدَهُ) هەم واجبە: دووبارە تەحیاتەكەشی بخوێنێتەوە، چونكە لە ڕیزی‌خۆی‌دا نەیخوێندبو.

(أَوْ مِنْ غَيْرِهَا) یان سوجدە نەكراوەكە لە ڕەكعەتێكی‌تر بوو-جگە لە ڕەكعەتی ئاخیر- ئەو كاتە (لَزِمَهُ رَكْعَةٌ) واجبە: بۆ وەدەستهێنانەوەی ئەو سوجدەیە، ڕەكعەتێكی‌تر بە تەواوی بكاتەوە، چونكە ڕەكعەتە ناتەواوەكە بە سوجدەی ڕەكعەتی دوای‌خۆی تەواو بووەو ئەوی‌تریش بی‌سودە، كەوابو: واجبە نوێژەكەش بەو ڕەكعەتە تەواو بكرێ.

(وَكَذَا) هەروەها واجبە ڕەكعەتێكی‌تر بكا (إِنْ شَكَّ فِيهِمَا) ئەگەر كەوتە گومان: ئایا سوجدە نەكراوەكە لە ڕەكعەتی ئاخیرە، یان لە یەكێكی‌ترە، ئینجا بزانە: ئەگەر لە دوای سەلامدانەوەش بێگومان زانی: سوجدەیەكی نەبردوە، ئەویش بە هەمان شێوەی‌ڕابردوو ڕەفتار دەكا، بەو مەرجەی ماوەیەكی‌زۆری پی‌نەچی‌و لەشی پیس نەبوبێ.

(وَإِنْ عَلِمَ فِي قِيَامِ ثَانِيَةٍ) ئەگەر لە هەڵسانەپی‌ی ڕەكعەتی دووەمدا زانی: (تَرْكَ سَجْدَةٍ) لە ڕەكعەتی‌یەكەمدا سوجدەیەكی نەبردوە (فَإِنْ كَانَ جَلَسَ بَعْدَ سَجْدَتِهِ) ئەوە ئەگەر لە پاش سوجدەی یەكەمدا دانیشتبێ (سَجَدَ) سوجدە نەكراوەكە دەباو لە سەر نوێژەكە بەردەوام دەبێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بی‌هێزدا (إِنْ جَلَسَ بِنِيَّةِ الْإِسْتِرَاحَةِ) ئەگەر دانیشتنی دوای سوجدەكە بە نیەتی (جِلْسَةِ‌الاسْتِرَاحَةِ) بوبێ (لَمْ يَكْفِهِ) بە بەر ناكەوێ (وَإِلَّا) بەلام ئەگەر دانەنیشتبو (فَلْيَجْلِسْ مُطْمَئِنّاً) بە پەلە دێتە خوارەوەو بە خۆڕاگری دادەنیشی‌و (ثُمَّ يَسْجُدُ) ئینجا سوجدە دەبا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بی‌هێزدا (يَسْجُدُ فَقَطْ) تەنها سوجدە دەباو دانیشتنی ناوێ، چونكە بە هەڵسانەوە نێوان كەوتۆتە بەینی هەردوو سوجدەكان.

(وَإِنْ عَلِمَ فِي آخِرِ رُبَاعِيَّةٍ) ئەگەر لە كۆتاییی نوێژێكی چوار ڕەكعەتی‌دا زانی: (تَرْكَ سَجْدَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثٍ) دوو سوجدە، یان سێ سوجدەی نەبردون (جَهِلَ مَوْضِعَهَا) نەیزانی: دوو سوجدەكە، یان سێ سوجدەكە لە كام ڕەكعەتن (وَجَبَ رَكْعَتَانِ) واجبە: دوو ڕەكعەتی‌تر بكا (أَوْ أَرْبَعٍ) یان هاتەوە بیری: چوار سوجدەی نەبردون (فَسَجْدَةٌ) واجبە: سوجدەیەك

ثُمَّ رَكْعَتَان، أَوْ خَمْسٍ أَوْ ستّ فَثَلاثٌ، أَوْ سَبْعٍ فَسَجْدَةٌ ثُم ثَلاثٌ. قُلْتُ: وَيُسَنُّ إِدامَةُ نَظَرِهِ إِلَى مَوْضِعِ سُجُودِه، وَقِيلَ: يُكْرَهُ تَغْمِيضُ عَيْنَيْه، وَعِنْدِى لاَ يُكْرَهُ إِنْ لَمْ يَخَفْ ضَرَراً، وَالْخُشُوعُ وَتَدَبُّرالْقِراءَةِ وَالذِّكْرِ،

---

بباو (ثُمَّ رَكْعَتَانِ) ئینجا دوو ڕەکعەتیتریش بکا (أَوْ خَمْسٍ أَوْ سِتٍّ) یان هاتەوە بیری: کە پێنج، یان شەش سوجدەی نەبردون (فَثَلاثٌ) واجبە سێ ڕەکعەتیتر بکا (أَوْ سَبْعٍ) یان هاتەوە بیری: کە حەفت سوجدەی نەبردون (فَسَجْدَةٌ) واجبە: سوجدەیەك بباو (ثُمّ ثَلاثٌ) ئینجا سێ ڕەکعەتیتر بکا.

## ﴿ سوننەتەکانی ناو نوێژ ﴾

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (يُسَنُّ) سوننەتە (إِدامَةُ نَظَرِهِ) لە نوێژدا بەردەوام بڕوانێ (إِلى مَوْضِعِ سُجُودِهِ) بۆ شوێنی سوجدەبردنەکەی، هەر چەند کوێریش بێ، یان لە تاریکاییدا بێ، چونکە ئەوها ملکەچترەو نزیکترە بۆ لەخواترسان.

بەڵام هەر کاتێك لە تەحیاتدا پەنجەی شادەی بەرز کردەوە، ئەو کاتە سوننەتە بەردەوام تەماشای پەنجە بەرزکراوەکە بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن ابن الزبير: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنى وَأَشارَ بِإِصْبُعِهِ وَلا يُجاوِزُ إِشارَتَهُ﴾ رواه ابوداود باسناد صحيح، پێغەمبەر ﷺ دەستیڕاستەی داناو ئاماژەی بە پەنجەکەی شادەی کردو چاوی لە پەنجەکەی لانەدەدا.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُكْرَهُ تَغْمِيضُ عَيْنَيْهِ) ناپەسندە لە نوێژدا چاوەکانی بچوقێنێ (وَعِنْدِى) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: بە لایمنەوە (لا يُكْرَهُ) چاوچوقاندن لە نوێژدا ناپەسند نیە (إِنْ لَمْ يَخَفْ ضَرَراً) ئەگەر لە زیانێك نەترسێ، چونکە هیچ حەدیسێکی (صحیح) دەربارەی قەدەغەکردنی نەهاتوە.

(وَالْخُشُوعُ) هەروەها سوننەتە: بە ملکەچیو لەخواترسی نوێژەکە بکا، واتە: جولە جول بە ئەندامەکانی نەکاو جگە لە نوێژ بیر لە هیچیتر نەکاتەوە، چونکە لە بەردەست خوایەکی ئەوها گەورە ڕاوەستاوە: کە بێگومان دەیبینێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ الَّذينَ هُمْ فِى صَلاتِهِمْ خاشِعُونَ﴾ بە ڕاستی ڕزگارو بەختەوەر بون ئەو کەسانەی لە نوێژەکەیاندا لەخواترسو ملکەچن.

کەواتە: ئەگەر نوێژکەر دڵی لەگەڵ خوا ڕاست بێو لە خوا بترسێ، ئەندامەکانیشی لە خوا دەترسێنو لە نوێژدا جولەجول ناکەن.

(وَتَدَبُّرالْقِراءَةِ) هەروەها سوننەتە بیر لە واتەیفاتیحەو سورەتەکان بکاتەوە (وَالذِّكْرِ) هەروەها سوننەتە بیر لە واتەی زیکرەکانی ناو نوێژ بکاتەوە، کەوابو: ناپەسندە درێژە

وَدُخُولُ الصَّلاةِ بِنَشاطٍ وفَراغِ قَلْبٍ، وجَعْلُ يَدَيْهِ تَحْتَ صَدْرِهِ آخِذاً بِيَمِينِهِ يَسَارَهُ، وَالدُّعَاءُ فِي سُجُودِهِ،

---

به دالّغەلیّدان بداو خۆی به ڕێكخستنیجلوبەرگی خەریك بكا، هەروەك له(تحفه)دا فەرموویەتی، هەروەها ئەگەر خۆی خەریك كرد به بیركردنەوه له دۆزەخو ئەو جۆره شتانه، ئەوەش بەشێكه له دالّغەلیّدان، هەروەك له (نهاية)دا فەرموویەتی، واته: ئەوەش ناپەسندە.

(وَدُخُول الصَّلاةِ) هەروەها سوننەته كه هەلّدەستیّ نوێژ دابەستیّ (بِنَشاطٍ) به دلّخۆشیو به چوستی هەلّبستیّ، چونكه خوای گەوره، باسی دوو ڕووەكان دەكاو دەفەرمویّ: ﴿وَإِذا قامُوا إِلى الصَّلاةِ قامُوا كُسالَى﴾ هەر كاتێك مونافقەكان هەلّبستن بۆ نوێژ كردن، به تەمبەلّی هەلّدەستن.

(وَفَراغِ قَلْبٍ) هەروەها سوننەته: بۆ نوێژكردن هیچ له دلّی خۆیدا نەهێلّێتەوه له كاروباری دونیا، تاكو جگه له نوێژكردن هیچیتری نەیەته ناو دلّ، چونكه ناپەسندە له نوێژدا بیر له كاروباری دونیاو له مەسەلەی شەرعی بكاتەوه، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانه.

## ﴿ چۆنیەتی دەست گرتن ﴾

(وَجَعْلُ يَدَيْهِ) سوننەته له دوای (الله اكبر)ینوێژدابەستن تا دەچێته ڕوكوع، هەردوو دەستەكانی دابنیّ (تَحْتَ صَدْرِهِ) له سەر بنەوەیسینگیو له سەرەوەیناوكی ﴿عن وائِلٍ ﷺ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلى يَدِهِ الْيُسْرَى عَلى صَدْرِهِ﴾ رواه ابن خزيمة فى صحيحه، پێغەمبەر ﷺ دەستیڕاستەی له سەر دەستیچەپەی له سەر سینگی دانان.

(آخِذاً بِيَمِينِهِ يَسَارَهُ) به لەپەدەستیڕاستەی جومگەو بەشێكی بازنەو بەشێكی باسكی چەپەی بگریّ ﴿عن وائِلٍ ﷺ: وَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلى ظَهْرِ كَفِّهِ الْيُسْرَى وَالرُّسْغِ وَالسَّاعِدِ﴾ رواه ابوداود باسناد صحيح، پێغەمبەر ﷺ دەستیڕاستەی دانا سەر پشته دەستیچەپەیو سەر جومگەو سەر بەشێكی باسكی.

(والدُّعاءُ فِيسُجُودِه) هەروەها سوننەته: له سوجدەدا دوعا بكا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿أَقْرَبُ مايَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ ساجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعاءَ﴾ رواه مسلم، نزیكترین حالّەت كه بەنده له خوایخۆی نزیك ببێتەوه، حالّەتیسوجدەیه، كەوابو: له سوجدەدا زۆر دوعا بكەن. جا بزانه: له كۆتایی تەحیاتدا ڕوونمان كردەوه: هەر زیكرێكو هەر دوعایەك له پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتبیّ، حەڕامه: به زمانێكیتری -جگه له عەرەبی- بگوتریّو نوێژ بەتالّ دەكاتەوه.

وَأَنْ يَعْتَمِدَ فِي قِيامِهِ مِنَ السُّجودِ وَالْقُعُودِ على يَدَيْهِ، وَتَطْوِيلُ قراءَةِ الْأُولى عَلى الثَّانِيَةِ فِي الأَصَحِّ،

## ﴿ چۆنیەتی هەڵسانەوە بۆ فاتیحە خوێندن ﴾

بزانە: کە لە سوجدە بۆ فاتیحە خوێندن هەڵدەستێتەوە، (الله اکبر) سوننەتە بەڵام دەست بەرزکردنەوە سوننەت نیە، هەروەك لە باسیسوجدەدا بەڵگەمان هێناوە، هەروەها: کە لە تەحیاتییەکەم هەڵدەستێتەوە: هەم (الله اکبر)و هەم دەست بەرزکردنەوەش سوننەتن، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عن أبي حميدﷺ قالَ فِي صِفَةِ صَلاةِ النَّبِيِّﷺ: وَإِذا قامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ كَبَّرَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ﴾ حديث صحيح رواه ابوداود، هەر کاتێك پێغەمبەرﷺ لە تەحیاتی دوای دوو ڕەکعەتەکان هەڵدەستاوە، (الله اکبر)ی دەگوتو دەستەکانیشی بەرز دەکردنەوە.

(وَأَنْ يَعْتَمِدَ فِي قِيامِهِ) سوننەتە لە کاتی هەڵسانەوە بۆ فاتیحە خوێندن (مِنَ السُّجُودِ) کە لە سوجدەیدووەم هەڵدەستێتەوەو (وَالْقُعُودِ) کە لە تەحیاتییەکەمیش هەڵدەستێتەوە (عَلى يَدَيْهِ) خۆی دابنێتەوە سەر هەردوو بەرەدەستیخۆی، واتە: هەردوو بەرە دەستی خۆی دابنێتە سەر زەمینو گرانایی‌خۆی باوێتە سەر هەردووکیانو هەڵبستێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن مالك بن الحويرثﷺ فِي صِفَةِ صَلاةِ النَّبِيِّﷺ: فَإِذا رَفَعَ مِنَ السَّجْدَةِ جَلَسَ وَاعْتَمَدَ عَلىالأَرْضِ ثُمَّ قامَ﴾ رواه البخاری، کە پێغەمبەرﷺ لە سوجدەیدووەم هەڵدەستاوە دادەنیشت، ئینجا گرانایی خۆی بە دەستەکانی دەخستە سەر زەمینو هەڵدەستاوە.

ئینجا بزانە: ئەو حەدیسەی ﴿عن ابْنِ عباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: كانَﷺ إِذا قامَ فِي صَلاتِهِ وَضَعَ يَدَيْهِ عَلىالأَرْضِ كَما يَضَعُ الْعاجِنُ﴾ کە پێغەمبەرﷺ هەڵدەستاوە، دەستەکانی دادەنا سەر زەمین هەروەك هەویرشێل دایاندەنێ. ئیمامی (النواوی) لە (المجموع)دا دەفەرموێ: ئەمە حەدیسێکی بێهێزە، یان پووچەڵەو هیچ بنچینەی ڕاستی نیە.

هەروەها ئیمام (ابن حجرالعسقلانی)ش لە (التلخيص)دا دەفەرموێ: ئیمام (ابن صلاح) دەفەرموێ: ئەم حەدیسە ڕاست نیەو دروست نیە بە بەڵگە دابندرێ، ئینجا لەو دووانەو لە سەرچاوەکانیتریشدا دەفەرموون: خۆ ئەگەر حەدیسەکە (صحيح)=ڕاستیش بێ، واتەی (الْعاجِنُ): پیری بە ساڵدا چووە، نەك هەویرشێل. کەوابو: پەنجە نووقاندن لە هەڵسانەوەدا سوننەت نیە.

(وَتَطْوِيلُ قِراءَةِ الْأُولى) سوننەتە: قوڕئانخوێندنی دوای فاتیحەی ڕەکعەتییەکەم درێژتر بکا (عَلىالثَّانِيَةِ) لە خوێندنی ڕەکعەتیدووەم (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە پێغەمبەرﷺ وای دەکرد، هەروەك لە سوڕەتی دوای فاتیحەدا بەڵگەمان هێناوە.

## ﴿ زیكرو دوعا له دوای نوێژەكان ﴾

(وَالذِّكْرُ بَعْدَها) هەروەها سوننەتە لە دوای تەواوبوونی نوێژ: ئەو زیكرانەیدا هاتوو بكا، هەم دوعاش بكا، چونكە چەندەها حەدیسی(صحیح) دەربارەی هەردووكیان هاتوە:

١- به تایبەتی لە دوای نوێژی سبەینیو مەغریبدا پێش ئەوەی هیچ قسەیەك بكاو پێش ئەوەی پێیەكانی ڕابگوێزێ، دە جار بڵێ: ﴿لاإلَهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ رواهماالترمذی: الفجر بسند صحیح، والمغرب بسند حسن.

هەروەها لە دوای هەردووكیاندا حەفت جار بڵێ: ﴿اَللّهُمَّ أجِرْنِي مِنَ النّارِ﴾ رواه ابوداود بسند صالح. هەم حەفت جاریش بڵێ: ﴿اَللّهُمَّ أدْخِلْنِي الْجَنَّةَ﴾، چونكە لە حەدیسێكدا-كە پەیوەندی بە نوێژەوە نیە- پێغەمبەرﷺ ئەو دووانەی وێكڕا باس كردونو دەفەرموێ: ﴿مااسْتَجارَ عَبْدٌ مِنَ النّارِ سَبْعَ مَرّاتٍ إلاّ قالَتِ النّارُ: يارَبِّ إنَّ عَبْدَكَ فُلاناً إسْتَجارَ مِنِّي فَأجِرْهُ. وَلا سَألَ عَبْدٌ الْجَنَّةَ سَبْعَ مَرّاتٍ إلاّ قالَتِ الْجَنَّةُ: يا رَبِّ إنَّ عَبْدَكَ فُلاناً سَألَنِي فَأدْخِلْهُ الْجَنَّةَ﴾ رواه أبويعلى بإسناد على شرط البخاري ومسلم.

جگە لەوانەش، سوننەتە: بەیانیانو ئێواران بڵێ: ﴿رَضِينا بِاللهِ رَبّاً وَبِالاِسْلامِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً﴾ رواه اصحاب السنن، واتە: سێ جار بیڵێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: هەر كەسێك ئەم دوعایەی (سَيِّدُ الاِسْتِغْفارِ) لە كاتی بەیانیاندا بخوێنێو لە ڕۆژەكەیدا بمرێ دەبێتە بەهەشتی، هەر كەسێكیش لە ئێوارەدا بیخوێنێو لە شەوەكەیدا بمرێ دەبێتە بەهەشتی: ﴿اَللّهُمَّ أنْتَ رَبِّي لاإلَهَ إلاّأنْتَ خَلَقْتَنِي وَأنا عَبْدُكَ وَأنا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مااسْتَطَعْتُ أعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ ماصَنَعْتُ أبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأبُوءُ بِذَنْبِي فاغْفِرْلِي فَإنَّهُ لايَغْفِرُالذُّنُوبَ إلاّ أنْتَ﴾ رواه البخاری.

هەروەها ﴿(قُلْ هُوَاللهُ أحَد)و (قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)و (قُلْ أعُوذُ بِرَبِّ الناسِ، ثَلاثَ مَرّاتٍ﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحیح، واتە: هەر یەكەیان سێ جار بخوێندرێن. جگە لەوانەش چەند زیكرێكیتر هەیە.

٢- لە دوای هەر پێنج نوێژەكان بە گشتی، سێ جار بڵێ: ﴿أسْتَغْفِرُاللهَ﴾. ئینجا جارێك بڵێ: ﴿اَللّهُمَّ أنْتَ السَّلامُ وَمِنْكَ السَّلامُ تَبارَكْتَ يا ذاالْجَلالِ وَالاِكْرامِ﴾ رواه مسلم.

هەروەها جارێكیش ﴿آيَةُالْكُرْسِي﴾ صححه ابن حبان. هەروەها جارێك ﴿لاإلَهَ إلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اَللّهُمَّ لامانِعَ لِما أعْطَيْتَ وَلامُعْطِيَ لِمامَنَعْتَ وَلايَنْفَعُ ذاالْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ﴾ رواه الشيخان.

هەروەها سی‌وسێ جار ﴿سُبْحانَ اللهِ﴾، سی‌وسێ جار ﴿اَلْحَمْدُ لِلّهِ﴾، سی‌وسێ جار ﴿اللهُ أَكْبَرُ﴾ رواه الشیخان. ئینجا لە دوای ئەوانەش یەك جار بڵێ: ﴿لاإِلَهَ إِلاّاللهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْد وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَديرٌ﴾ رواه مسلم. هەروەها دە جار ﴿لاإِلَهَ إِلاّاللهُ﴾ رواه الترمذی بسند حسن.

ئینجا بزانە: ئەگەر نەیتوانی ئەو سێ زیکرانەی‌ڕابردوو، هەر یەکێك سی‌وسێ جار بڵێ، ئەوە سوننەتە: لای کەمی هەر یەکێکیان دە جار دەجار بڵێ، هەروەك لە لای (اصحاب السنن) بەو ژمارەیەش هاتون.

جگە لەو زیکرانەی‌ڕابردووش زیکری‌تریش هەیە لە کتێبەکانی حەدیسدا هاتون، بە تایبەتی کتێبی (الأذکار للامام النواوی) کە پێویستە: گشت موسڵمانێك لێی ئاگادار بێت، چونکە دەڵێن: (بِعِ الدّار وَاشْتَرِ الْأَذْكار) خانوو بفرۆشەو (اَلْأذْکار) بکرە.

٣-﴿عن يسيرةرَضِیَ‌اللهُ عَنها: أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَمَرَهُنَّ أَنْ يُراعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالأَنامِلِ، فَإِنَّهُنَّ مَسْئُولاتٌ مُسْتَنْطَقاتٌ﴾ رواه اصحاب السنن بسندصالح، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردین: لە ژمارەی زیکرەکان ئاگادار بین‌و بە سەرە جومگەی‌پەنجەکانمان بیانژمێرین، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەهێندرێنە گوفتارو پرسیاریان لێدەکرێن. ﴿وعن عبدالله بن عَمْرورَضِیَ‌اللهُ عَنهُما: رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ يَعْقِدُالتَّسْبِيحَ بِيَمِينِهِ﴾ رواه اصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەرمﷺ دیت بە پەنجەکانی دەستی‌ڕاستەی تەسبیحاتی دەژمارد.

٤-﴿عن ابْنِ عباسرَضِیَ‌اللهُ عَنهُما: أَنَّ رَفْعَ الصَّوْتِ بِالذِّكْرِ حينَ يَنْصَرِفُ النّاسُ مِنَ الْمَكْتُوبَةِ كانَ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِﷺ، وَكُنْتُ أَعْلَمُ إِذاانْصَرَفُوا بِذلِكَ إِذا سَمِعْتُهُ﴾ وفی روایة: ﴿كُنْتُ أَعْرِفُ انْقِضاءَ صَلاةِ رَسُولِ اللهِﷺ بِالتَّكْبِيرِ﴾ رواه الشیخان، دەنگ هەڵێنان بەو زیکرانەی دوای نوێژ، لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ هەبو، من بەو دەنگ هەڵێنانە-کە گوێم لێدەبو- دەمزانی نوێژ تەواو بووە، هەروەها بەگوێ‌لێبوونی(الله اکبر) دەمزانی نوێژی پێغەمبەرﷺ تەواو بووە. واتە: مەبەستی سی‌وسێ (الله اکبر)ەکەیە.

جا ئیمامی(الشافعی) دەفەرموێ: ئەو زیکرانەی دوای‌نوێژ سوننەتە: بە نهێنی بکرێن، بەلام ئەگەر ئیمامی‌نوێژ بیەوێ مەئموومەکان لێی فێر بن، هەر ئەوندە دەنگ هەڵدێنێ: تا دەزانێ لێی فێر بونە، ئینجا دەنگی نزم دەکاتەوە. واتە: مەبەستی حەدیسەکە ئەوەیە، هەروەك لە (شرح مسلم)و (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

## ﴿ سەلەوات و دوعا لە دوای نوێژەکاندا ﴾

١-سەلەوات ﴿عن فُضالَةَ‌رَضِیَ‌اللهُ‌عَنهُ: دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلّى فَقالَ: اَللّهُمَّ اغْفِرْلي وَارْحَمْني، فَقالَ رَسُولُ اللهِﷺ: عَجِلْتَ أَيُّهاالْمُصَلِّي؟ إِذا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ، فَاحْمَدِاللهَ بِما هُوَ أَهْلُهُ وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُهُ﴾

رواه اصحاب السنن بسندصحيح، پیاوێك هاته مزگەوت‌و نوێژی كردو دوعای كردو گوتی: خوایە لێم خۆش ببەو ڕەحمم پێ بكە. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەی نوێژكەر پەلەت كرد، هەر كاتێك نوێژت كردو ئینجا دانیشتی، سوپاسی‌خوا بكە بەو سوپاسەی شایانی گەورەیی‌خوایە–وەك (الحمد لله رب العالمين)–و سەلەوات لەسەر من لێبدە–وەك (وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أجمعين)– ئینجا دوعا بكە.

ئینجا بزانە: بە تەنها یەك سەلەوات لە پێش دوعادا فەرمانی ئەو حەدیسە بەجێ دەهێندرێ، بەڵام ئەگەر زیاتر بێ، خێری زۆرترە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَوْلَى النَّاسِ بِي يَوْمَ الْقِيامَةِ أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلاةً﴾ رواه ابن حبان والترمذي وقال: حديث حسن، نزیكترین كەس لە من لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو كەسەیە: كە زۆرتر سەلەواتم لە سەر لێبدا. كەوابو: بە بەڵگەی ئەم دوو حەدیسە، ئەو دە سەلەواتەی ئێستا لە دوای نوێژەكان لێدەدرێن كارێكی باشە، ئینجا لە كۆتایی دوعاكردنیشدا: هەم سوپاسی خواو هەم سەلەواتیش سوننەتن، هەروەك لە (الاذكار)دا فەرموویەتی.

٢– دوعاكردن، حەدیسەكەی(فُضالَة)ی‌ڕابردوو بەڵگەیە، هەم ﴿عن أبي أمامةﷺ: قِيلَ يا رَسُولَ اللهِﷺ أَيُّ الدُّعاءِ أَسْمَعُ؟ قالَ جَوْفَ اللَّيْلِ الآخِرَ وَدُبُرَ الصَّلَواتِ الْمَكْتُوباتِ﴾ رواه الترمذي وقال حديث حسن، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا: كام دوعا زوتر قبوڵ دەبێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: دوعای ناوەندی نیوەشەوی ئاخیرو دوعای دوای پێنج نوێژە واجبەكان.

هەروەها پێغەمبەرﷺ بە (معاذ)ی فەرموو: ئەی (معاذ) بە خوا من تۆم خۆش دەوێ، ئامۆژگاریت دەكەم: واز مەهێنە لە دوای گشت نوێژێكدا ئەم دوعایە بكە: ﴿اَللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبادَتِكَ﴾ رواه ابوداود والنسائي باسناد صحيح.

٣–دەست بەرزكردن لە دوعادا ﴿عن أبي‌موسى وأنس‌رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: دَعا النَّبِيُّﷺ ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَياضَ إِبْطَيْهِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ دوعای كردو هەردوو دەستەكانی بەرز كردنەوە تا سپیایی بن هەنگڵیم دیت. ﴿وعن سلمانﷺ قالَ النَّبِيُّﷺ: إِنَّ رَبَّكُمْ حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُما صِفْراً﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن، خوای‌گەورە شەرمن‌و بەخشندەیە، شەرم لە بەندەی‌خۆی دەكا: كاتێ هەردوو دەستەكانی بەرز دەكاتەوەو لێی دەپاڕێتەوە، دەستەكانی بە بەتاڵی بگەڕێنێتەوە.

جگە لەوانەش: ئیمامی(النواوي) نزیكەی بیست حەدیسی‌تری (صحيح)ی لە (المجموع)دا دەربارەی دەست بەرزكردنەوە لە دوعادا هێناون.

٤-دەربارەی دوعای قونووتو دوعایەکانیتری دەرەوەی نوێژ، لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە: ئەگەر بۆ وەدەستهێنانی شتێك دوعا بکا، سوننەتە لە کاتی دەست بەرزکردنەوەدا بەرەدەستەکانی بخاتە لایئاسمان، بەلاَم ئەگەر بۆ لابردنی بەلاَ دوعا بکا، ئەوە سوننەتە: پشتەدەستەکانی بخاتە لای ئاسمان، لە (شرح مسلم)دا دەفەرمویٚ: بەلگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عن أنس ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اِستَسقَى فَأَشارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلى السَّماءِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ دوعای بارانی کردو بە پشتەدەستەکانی ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد. واتە: چونکە باران نەبارین بەلاَیە.

هەروەها دەربارەی دەست بە ڕوخساردا هێنان لە دوای دوعاکردن لە دەرەوەی نوێژدا، لە سەرچاوەکاندا دوو فەرموودەیان هێناوە: لە (المجموع)دا ئەو فەرموودەی بە ڕاست داناوە: کە سوننەت نیە، چونکە لە حەدیسی(صحیح)دا بەلگەی لە سەر نیە، لە فەرموودەکەیتریشدا دەست بە ڕوخساردا هێنان لە دوای دوعاکردن لە دەرەوەی نوێژدا سوننەتە، چونکە لە چەند حەدیسێکی(ضعیف)-بیٚهێزدا هاتوە، وَاللهُ أَعْلَم.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ئیمامینوێژ ویستی بۆ ئەو زیکرو دوعایانە بمێنێتەوە، سوننەتە بسورِیٚ: لایچەپەی بەرەو قیبلە بکاو لایڕاستەشی بەرەو مەئموومەکان بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن البراء ﷺ: كُنّا إِذا صَلَّيْنا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَحْبَبْنا أَنْ نَكُونَ عَنْ يَمِينِهِ يُقْبِلُ عَلَيْنا بِوَجْهِهِ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ فِي قُنُوتِهِ: رَبِّ قِنِي عَذابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ أَوْ تَجْمَعُ عِبادَكَ﴾ رواه مسلم، کە نوێژمان لە پشت پێغەمبەر ﷺ دەکرد پێمان خۆش بوو لە لای ڕاستەیپێغەمبەر ﷺ نوێژمان کردبا، چونکە ڕووی لە ئێمە دەکردو گوێم لیٚبوو: لە دوعادا دەیفەرموو: خوای من لە عەزابیخۆت بمپارێزە لەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیەوەو کۆیان دەکەیەوە.

ئینجا بزانە: لەو حەدیسەدا دەردەکەویٚ: کە ئەوها خێرترە ئیمامو مەئموومەکان لێك جیا نەبنەوەو بە کۆمەلّ ئەو زیکرو دوعایانە بکەن، تاکو بە بەر موژدەی ئەم حەدیسە بکەون: ﴿عن أبي هريرة ﷺ: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّ لِلّهِ مَلائِكَةً سَيّارَةً فُضْلاً يَلْتَمِسُونَ مَجالِسَ الذِّكْرِ، فَإِذا وَجَدُوا مَجْلِساً فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضاً بِأَجْنِحَتِهِمْ حَتَّى يَمْلَئُوا ما بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّماءِ الدُّنْيا﴾...إلى أنْ قالَ: ﴿فَيَقُولُ تعالى: قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ وَأَعْطَيْتُهُمْ ما سَأَلُوا...﴾ الحديث رواه الشيخان، خوایگەورە چەند مەلائیکەتێکی گەڕیدەی ڕێزداری هەنە، بە شوێن دانیشگەیزیکردا دەگەڕێن، جا هەر کاتێك دانیشگەیەکیان دەست کەوت: کە زیکرێکیخوای تیٚدا دەکریٚ، مەلائیکەتەکان لە گەلّیان دادەنیشنو بە باڵەکانی خۆیان دەورە لە یەکتری

وَأَنْ يَنْتَقِلَ لِلنَّفْلِ مِنْ مَوْضِعِ فَرْضِهِ، وَأَفْضَلَهُ إِلَى بَيْتِهِ، وَإِذا صَلَّى وَرَاءَهُمْ نِسَاءٌ مَكَثُوا حَتَّى يَنْصَرِفْنَ، وَأَنْ يَنْصَرِفَ فِي جِهَةِ حَاجَتِهِ، وَإِلاَّ فَيَمِينِهِ، وَتَنْقَضِي الْقُدْوَةُ بِسَلاَمِ الإِمَامِ،

دەدەن، تا نێوان ئەو زیکرکەرانەو نێوان ئاسمانیدونیا پڕ دەکەن...تا لە کۆتایی حەدیسەکەدا دەفەرموێ: خوایگەورە دەفەرموێ: بە ڕاستی من لەو کۆمەڵە زیکرکەرە خۆش بوم‌و هەرچی داوایان کرد پێم بەخشین.

(وَأَنْ يَنْتَقِلَ لِلنَّفْلِ) سوننەتە: نوێژکەر بۆ نوێژکردنیسوننەت بگوازێتەوە (مِنْ مَوْضِعِ فَرْضِهِ) لەو شوێنەی کە نوێژە واجبەکەی لێکردوە، بڕواتە شوێنێکیترو لەوێ سوننەتەکان بکا، تاکو زۆر شوێنی سوجدە لێبردن لە ڕۆژیقیامەتدا شاهیدیی بۆ بدەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عن أبي‌هريرة﵁ قال النبيُّ ﷺ في تفسير هذه الآية (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبارَها): فَإِنَّ أَخْبارَها أَنْ تَشْهَدَ عَلىٰ كُلِّ عَبْدٍ بماعَمِلَ عَلى ظَهْرِها﴾ رواه الترمذى بسند صحيح، پێغەمبەر ﷺ لە تەفسیری ئایەتی (يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبارَها) فەرمووی: ئەو هەواڵانەی لە ڕۆژی قیامەتدا زەمین قسەی لێدەکا، ئەوەیە: شاهیدی دەدا: لە سەر گشت- بەندەیەك- پیاوێك‌و ئافرەتێك بەو کردەوانەی لە سەر پشتی زەمین کردویەتی.

(وَأَفْضَلُهُ إِلى بَيْتِهِ) خێرتر ئەوەیە بۆ سوننەت کردن بڕواتەوە ماڵیخۆی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا قَضى أَحَدُكُمْ صَلاتَهُ في مَسْجِدِهِ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ مِنْ صَلاتِهِ نَصِيباً﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك یەکێکتان نوێژی واجبی لە مزگەوتدا کرد، با بەشێکی نوێژەکانی بۆ ماڵەوە دابنێ.

(وَإِذاصَلّى وَرائَهُمْ نِساءٌ) هەر کاتێك لە پشت پیاوەکان ئافرەتەکانیش نوێژیان دەکرد (مَكَثُوا) با پیاوەکان ماوەیەك لە شوێنیخۆیاندا بمێننەوە (حَتّى يَنْصَرِفْنَ) تا ئافرەتەکان لە مزگەوت دەڕۆنە دەرەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەو های دەکرد، هەروەك لە (بخاری)دا هاتوە، تاکو پیاو و ئافرەت تێکەڵ نەبن.

(وَأَنْ يَنْصَرِفَ مِنْ جِهَةِحاجَتِهِ) سوننەتە: نوێژکەر بەو لایەدا بڕوا: کە کارو پێویستیی لێ هەیە (وَإِلّا) ئەگەر پێویستیی لە هیچ لایەك نەبو (فَيَمِينِهِ) سوننەتە: بە لای ڕاستەیدا بڕواتە دەرەوە ﴿عن أنس﵁: أَكْثَرُ ما رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَنْصَرِفُ عَنْ يَمِينِهِ﴾ رواه مسلم، زۆرترین جار پێغەمبەرم ﷺ دەدیت بە لای ڕاستەیدا لە مزگەوت دەڕۆیشتە دەرەوە. واتە: جار جارەش بە لای چەپەیدا دەڕۆیشتە دەرەوە.

(وَتَنْقَضِيالْقُدْوَةُ) لە نوێژی جەماعەتدا پەیوەندی مەئموم بە ئیمامەکەیەوە دەپچڕێ‌و کۆتایی دێ (بِسَلامِ الإِمامِ) بە هۆی سەلامدانەوەیەکەمی ئیمامەکەی، چونکە بە سەلامدانەوەییەکەم نوێژکەر لە نوێژەکەی دەردەچێ-هەروەك ڕابرا- بەڵام وەها

فَلِلْمَأْمُومِ أَنْ يَشْتَغِلَ بِدُعَاءٍ وَنَحْوِهِ ثُمَّ يُسَلِّمُ، وَلَوْ اقْتَصَرَ إِمَامُهُ عَلَى تَسْلِيمَةٍ سَلَّمَ ثِنْتَيْنِ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(بابٌ)

شُـــرُوطُ الـــصَّـــلَاةِ خَـــمْـــسَـــةٌ: مَـــعْـــرِفَـــةُ الْـــوَقْـــتِ، وَالإِسْـــتِقْـــبَالُ،

---

سوننەتە مەئمووم سەلام نەداتەوە: تا ئیمامەکەی هەردوو سەلامەکانی دەداتەوە، کەوابو: (فَلِلْمَأْمُومِ) دروستە: بۆ مەئمووم لە دوای سەلامدانەوەی‌ئیمامەکەی، سەلام نەداتەوە، بەڵکو (أَنْ يَشْتَغِلَ بِدُعاءٍ وَنَحْوِهِ) خۆی خەریك بکا بە دوعاکردن‌و شتی‌تری وەکو زیکر (ثُمَّ يُسَلِّمُ) ئینجا سەلام بداتەوە.

بەڵام ئەگەر لە ئیمامەکەی دواکەوتبو، ئەو کاتە واجبە: لە دوای سەلامدانەوەی‌دووەمی ئیمام یەکسەر هەڵبستێتەوەو نوێژەکەی تەواو بکا، چونکە ئەگەر بزانێ مانەوەی حەرامەو بە قەسدیش بمێنێتەوە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَلَوْ اقْتَصَرَإِمامُهُ عَلیتَسْلِيمَةٍ) ئەگەر ئیمامەکەی تەنها سەلامی‌یەکەمی داوە (سَلَّمَ ثِنْتَيْنِ) سوننەتە مەئمووم هەردوو سەلامەکە بداتەوە، تاکو خێری سەلامدانەوەی دووەمیش وەدەست بێنێ (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: لە گشت سەرچاوەکاندا وا دەردەکەوێ: کە ئیمام لە هەر دوو سەلامدانەوەدا دەنگ هەڵدێنێ، بەڵام (ابن حامد) سەلامی‌یەکەمی بە دەنگی نهێنی دەداوەو لە سەلامی دووەمیشدا دەنگی هەڵدێنا، تاکو مەئموومەکان لە سەلامدانەوەدا بە پێشی نەکەون، هەروەك لە (مغنی ابن قدامة الحنبلي)دا گێڕاویەتیەوە.

## ﴿ بابٌ: لە باسی مەرجەکانی نوێژ ﴾

واتە: ئەو واجبانەی بەشێکی نوێژ نین، بەڵام مەرجن بۆ دروستبوونی نوێژ، ئەگەر یەکێکیان نەبێ نوێژەکە دروست نابێ.

(شُرُوطُ الصَّلَاةِ) مەرجەکانی‌نوێژ (خَمْسَةٌ) پێنجن، جیاوازی نوێژی واجب‌و سوننەت نیە:

یەکەم: (مَعْرِفَةُالْوَقْتِ) زانینی هاتنی‌کاتی‌نوێژەکەیە: بەو شێوەی لە باسی‌کاتی‌نوێژەکاندا بە بەڵگەوە باسمان کرد، کەوابو: ئەگەر نەیزانی کاتی‌نوێژ هاتوەو نوێژی کرد نوێژەکەی دروست نابێ، هەرچەند ئاشکراش ببێ لە کاتی‌خۆی‌دا کردویەتی، هەروەك ئەگەر وای زانی کاتی‌نوێژ هاتوەو نوێژی کرد، ئینجا ئاشکرا بوو لە پێش هاتنی‌کاتدا کردویەتی نوێژەکەی دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: (وَالإِسْتِقْبَالُ) ڕوو لەقیبلەکردنە: لە سەرەتای نوێژەکەوە تا کۆتایی، هەروەك لە (باسی ڕوو لەقیبلەکردن)دا بە بەڵگەوە باسمان کرد.

وَسَتْرُ الْعَوْرَةِ، وَعَوْرَةُ الرَّجُلِ مَا بَيْنَ سُرَّتِهِ وَرُكْبَتِهِ وَكَذاالأَمَةُ فِيالأَصَحِّ، وَالْحُرَّةِ مَا سِوَى الْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ،

---

سێیەم: (وَسَتْرُالْعَوْرَةِ) داپۆشینیعەورەتە: لە سەرەتای نوێژەکەوە تا کۆتایی، هەرچەند لە تاریکیشدابێو کەسیش نەیبینێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَقْبَلُ اللهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إلاَّ بِخِمارٍ﴾ رواه أبوداود والترمذی وقال حدیث حسن، خوایگەورە نوێژی ئافرەتی بلۆغبوو قبولێ ناکا تەنها بە لەچکەوە=دەسماڵەوە نەبێ.

ئینجا بزانە: چونکە بە ئەغڵەبی ئافرەتی بلۆغبوو نوێژ دەکا، بۆیێ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (بلوغبوو)، ئەگینا: منداڵیش لە سەری واجبە عەورەتیخۆی داپۆشێ، جیاوازی کوڕو کچیش نیە، کەوابو: هەر جۆرە نوێژکەرێك عەورەتی دەربکەوێ، نوێژی دروست نیە هەرچەند دەرکەوتووەکەش زۆر کەم بێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَعَوْرَةُالرَّجُلِ) عەورەتی نێرینە: جا پیاو بێ، یان منداڵ بێ (مَابَيْنَ سُرَّتِهِ وَرُكْبَتِهِ) نێوان ناوكو ئەژنۆیەتی ﴿عَنْ جابرٍ﷜ قَالَ النَّبِيُّﷺ: إذَا كَانَ الثَّوْبُ وَاسِعاً فَالْتَحِفْ بِهِ-يَعْنِي فِي الصَّلاَةِ- وَإنْ كَانَ ضَيِّقاً فَاتَّزِرْ بِهِ﴾ رواه الشیخان، ئەگەر جلەکەت بەرین بوو لە خۆتی بپێچە-لە نوێژدا- ئەگەر تەسك بوو بیکە پەشتەماڵی خوارەوە. واتە: (إزار) بە پەشتەماڵی نێوان ناوكو ئەژنۆ دەگوترێ.

ئینجا بزانە: لە دەرەوەی نوێژیشدا عەورەتی پیاو هەر وەهایە ﴿عَنْ جرْهَدٍ﷜ عَنِ النَّبِيِّﷺ: اَلْفَخِذُ عَوْرَةٌ﴾ رواه البخاری تعلیقاً وحسنهُ الترمذی وصححه إبن حبان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ڕانی مرۆڤ عەورەتە. (وَكَذاالأَمَةُ) هەروەها عەورەتی ئافرەتی کۆیلە-وەکو پیاو- نێوان ناوكو ئەژنۆیەتی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونکە بە (إجماع)ی زانایانی ئایین: سەری پیاو و سەری ئافرەتی کۆیلە عەورەت نیە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفه)دا فەرموویانە، کەوابو: لە عەورەتیشدا وەکو یەکترن.

(وَالْحُرَّةِ) عەورەتی ئافرەتیئازاد هەرچەند منداڵیش بێ (مَاسِوَىالْوَجْهِ وَالْكَفَّيْنِ) گشت لاشەیەتی لە سەریەوە تا بەری پێیەکانیشی جگە لە ڕوخسارو لەپەدەستەکانی، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إلاَّ مَاظَهَرَ مِنْهَا﴾ بە ئافرەتانی موسڵمان بڵێ: جوانی خۆیان بەدەر نەخەن تەنها ئەو جوانیە نەبێ کە ئاشکرا دەبێ. واتە: ڕوخسارو لەپەدەست، هەروەك (ابْن عباس)و (عائشة)﷞ فەرموویانەو (البيهقي) گێڕاویەتیەوە.

﴿وَعَنْ أُمِّ سَلَمَةَرَضِيَاللهُ عَنهـا أنَّهَا سَأَلَت النَّبِيَّﷺ أتُصَلِّيالْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ بِغَيْرِ إزارٍ؟ قَالَ: إذا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغاً يُغَطِّي ظُهُورَ قَدَمَيْهَا﴾ رواه أبوداود بإسنادٍ جید، لکن قَالَ: رواه أكثر الرواةِ موقُوفاً عَلى أُمِّ سَلَمَةَ، وَقَالَ الحَاكِمِ: صحیح عَلى شرط البخاري. ئایا دروستە:

وَشَرْطُهُ مَامَنَعَ إِدْرَاكَ لَوْنِ الْبَشَرَةِ وَلَوْ طِينٌ وَماءٌ كَدِرٌ، وَالْأَصَحُّ وُجُوبُ التَّطَيُّنِ عَلَى فاقدالثَّوْب،

---

ئافرەت نوێژ بکا بە دەسماڵێك=لەچکەیەك: کە سەرو گەردەنی دابپۆشێ لەگەڵ کراسێك؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەو مەرجەی کراسەکە ئەوەندە درێژ بێ: پشتە پێیەکانی دابپۆشێ. واتە: بەرەپێیەکانیشی بە زەمین دادەپۆشرێن.

جا هەر بە بەڵگەی ئەم حەدیسە ئەگەر ئافرەت لە کاتی سوجدەدا بەرەپێی بەدەر کەوت، یان لە ڕوکووعدا پاشنە پێی بەدەر کەوت، یان مووی سەری بەدەر کەوت، نوێژی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾ ڕوخسارو لەپەدەستی ئافرەت لە دەرەوەی نوێژ، لە ڕووی پیاوی بێگانەدا عەورەتەو واجبە: دایانپۆشێ ئەگەر بزانێ پیاوی بێگانە تەماشای ئەکا، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَنْ أَسْماءَرَضِيَ اللهُ عَنها: كُنَّا نُغَطِّي وُجُوهَنَا مِنَ الرِّجَالِ﴾ رواه الحاكم على شرط البخاري ومسلم، (أسماء) دەفەرموێ: ئێمە ڕوخساری خۆمان دائەپۆشی لە پیاوی بێگانە، واتە: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ. جا -إن شاءالله- لە باسی (نَظَر)دا درێژتر ڕوونی دەکەینەوە.

(وَشَرْطُهُ) مەرجی ئەو شتەی عەورەتی پێدادەپۆشرێ: (مَامَنَعَ) دەبێ شتێکی وەهابێ: قەدەغە بکا (إِدْرَاكَ لَوْنِ الْبَشَرَةِ) دیتنی ڕەنگی پێستەی مرۆڤ لە دانیشگەی گفتوگۆدا، کەوابو: ئەگەر داپۆشەرەکە چنراوێکی وەها بوو: لە نێوان ڕایەڵەکەیدا ڕەنگی پێستە دەدیترا، یان ئەوەندە تەنك بوو: ڕەنگی پێستەی تێدا دەدیترا، یان نایلۆنی ئاوی بوو: ئەوە نوێژی تێدا دروست نیە، بەڵام ئەگەر بە هۆی تیشکی ڕۆژ، یان بە هۆی ڕۆناکیەکی‌تر دەدیترا، ئەو کاتە زیانی نیە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ طِينٌ) هەر چەند داپۆشەری عەورەت قوڕیش بێ هەر دروستە، هەروەها داپۆشینی عەورەت دروستە: بە پووش و گەڵای درەخت و هەر شتێکی‌تر: کە لاشەی هەبێ، کەواتە: ڕەنگکردنی عەورەت بەو جۆرە ڕەنگانەی لاشەیان نیە: وەکو خەنەو مەرەکەب و...هتد بە داپۆشەر دانانرێ و نوێژی پێوە دروست نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَمَاءٌ كَدِرٌ) یان ئاوی لیڵ بێ؟ وەك لە ناو ئاوە لیڵەکەدا نوێژی (جَنَازَة) بکا، یان بتوانێ بە ئەندازەی سوجدە لە ناو ئاوە لیڵەکەدا بمێنێتەوە، هەر دروستە (وَالْأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (وُجُوبُ التَّطَيُّنِ) بۆ نوێژو لە دەرەوەی نوێژیش قوڕ لە لاشەدان واجبە (عَلَى فَاقِدالثَّوْب) لە سەر ئەو کەسەی جل و بەرگو ئەو شتانەی دەست ناکەوێ، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا داپۆشینی عەورەت واجبە.

وَيَجبُ سَتْرُ أَعْلاهُ وَجَوَانبه لاَ أَسفَله، فَلَوْ رُؤيَتْ عَوْرَتُهُ منْ جَيْبه فِي رُكُوعٍ أَوْ غَيْرِه لَمْ يَكْف فَلْيَزُرَّهُ أَوْ يَشُدُّ وَسَطَهُ، وَلَهُ سَتْرُ بَعْضها بيَده فِيالأَصَحِّ، فَإِنْ وَجَدَ كَافِيَ سَوْأَتَيْه تَعَيَّنَ لَهُمَا، أَوْ أَحَدهماَ فقُبُلَه، وَقيلَ:

---

(وَيَجِبُ سَتْرُ أَعْلاهُ) واجبه: لای سەرەوەیداپۆشەرەکە دابپۆشیّو (وَجَوانِبِه) تەنیشتەکانیشی دابپۆشیّ (لاَ أَسْفَلِه) بەلاّم لای خوارەوەیداپۆشەرەکە واجب نیە، کەوابو: (فَلَوْ رُؤيَتْ عَوْرَتُهُ) ئەگەر عەورەتی دیترا (مِنْ جَيْبِه) لە یەخەی کراسیەوە، واتە: لە لای سینگیەوە (فِي رُكُوعٍ) لە حاڵەتی ڕوکووع بردندا (أَوْ غَيْرِه) یان لە حاڵەتێکیتردا: وەك حاڵەتی سوجدە، یان دانیشتن، یان بە پێوە (لَمْ يَكْفِ) ئەو داپۆشینە دروست نیەو بە بەر ناکەویّ، کەوابو: (فَلْيَزُرَّهُ) واجبە: یان یەخەکەی دابێخیّ (أَوْ يَشُدُّ وَسَطَهُ) یان شتێك لە ناوقەدی ببەستیّ تاکو عەورەتی دیار نەبیّ.

جیاوازی نیە: هەر بە خۆی عەورەتی خۆی ببینیّ، یان کەسێکیتر ببینیّ ﴿عَنْ سَلَمَة: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ أَفَنُصَلِّي فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ؟ فَقَالَ: نَعَم، وَازْرُرْهُ وَلَوْ بِشَوْكَةٍ﴾ رواه أبوداود وغيره بإسنادٍ حسن، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە ناو یەك کراسدا نوێژ بکەین؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵیّ، یەخەی کراسەکەش دابێخە هەر چەند بە دڕکێکیش دایبێخی. بەلاّم ئەگەر لە لایدامێنیەوە لە بنەوەڕا عەورەتی بدیتریّ، زیانی نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَهُ) بۆی دروستە: (سَتْرُ بَعْضِهَا) بەشێکی عەورەتی دابپۆشیّ (بِيَدِه) بە دەستیخۆی: وەك شوێنێکی جلەکەی کون بوبیّ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەڵکو ئەگەر کونی جلەکەی دانەدەخرا، ئەو کاتە واجبە: بە دەستیخۆی دایبپۆشیّ، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر نوێژکەر پارچە داپۆشەرێکی دەست کەوت بەلاّم بەشی هەموو عەورەتی نەدەکرد، ئەوە واجبە: ئەوەندەی هەیە عەورەتی پیّدابپۆشیو نوێژ بکاو دووبارەکردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿إِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الشيخان، هەر کاتێك فەرمانێکم پیّکردن هەرچەندی توناتان هەیە بیکەن.

کەوابو: (فَإِنْ وَجَدَ كَافِيَ سَوْأَتَيْهِ) ئەگەرداپۆشەرێکی دەست کەوتو تەنها بەشی پێشەوەو پاشەوەی دەکرد (تَعَيَّنَ لَهُمَا) واجبە: هەردووکیانی پیّدابپۆشیّ، چونکە دەرکەوتنی ئەو دووانە زۆر عەیبە (أَوْ أَحَدهماَ) یان تەنها بەشی پێشەوەی، یان تەنها بەشی پشتەوەی دەکرد (فَقُبُلَهُ) واجبە: پێشەوەی پیّدابپۆشیّ، چونکە بەرەو قیبلەیە (وَقِيلَ) لە

فەرموودەیەکی بێهێزدا (دُبُرَهُ) پشتەوەی دادەپۆشێ، چونکە لە ڕوکووع و سوجدەدا زۆر نارێکە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا (يَتَخَيَّر) سەر پشکەو بە دڵی خۆی دەکا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر هیچی دەست نەکەوت عەورەتی پێداپۆشێ، یان توانای داپۆشینی نەبو، ئەو کاتە واجبە بە پێوە بە ڕووتی نوێژەکە بکاو سوجدەو ڕوکووعیش بە تەواوی ببا و دووبارەکردنەوەی نوێژیشی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمویانە، هەروەها نوێژی سوننەتیشی بۆ دروستن، جا ئەگەر هاتو: بە پێوە نوێژی کردبا عەورەتی بەدەر دەکەوت، بەڵام ئەگەر بە دانیشتوویی نوێژی کردبا عەورەتی دادەپۆشرا، ئەو کاتە بە دانیشتوویی‌و عەورەت داپۆشراوی نوێژ دەکا، هەروەك (الشبراملسي) ڕوونی کردۆتەوە.

هەروەها ئەگەر لە شوێنێکیپیسدا بەند کرابو و جلەکەشی بەشی داپۆشینیعەورەت‌و نوێژ لەسەرکردنی نەدەکرد، ئەو کاتە واجبە: جلەکە لە سەر پیسیەکە ڕابێخێ‌و بە ڕووتی نوێژی لە سەر بکاو دووبارە کردنەوەشی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی‌و لە پاشکۆی (تَيَمّم)شدا باسمان کرد.

هەروەها سوننەتە: بۆ نوێژکردن جوانترین بەرگ بکاتە بەرو مێزەر بنێتە سەری، بە بەڵگەی فەرموودەی خوایگەورە: ﴿خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ بەرگە جوانەکەی خۆتان دەبەر بکەن لە کاتی گشت نوێژکردنێکدا. هەروەها ناپەسەندە لە بەرگێکی وەهادا نوێژ بکا: کە وێنەی پێوەبێ‌و ناپەسەندە نوێژیشی لە سەر بکاو ناپەسندە نوێژیشی بەرامبەر بکا، هەروەها ناپەسندە لە ناو نوێژدا دەمیخۆی داپۆشێ، تەنها لە کاتی باوشکاندا سوننەتە دەستی خۆی دابنێتە سەر دەمی، هەروەها ناپەسندە لە ناو نوێژدا ڕوخساری خۆی داپۆشێ، جا لەو ناپەسندیانەیڕابردوودا جیاوازی پیاو و ئافرەت نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕون کراوەتەوە.

چوارەم: (وَطَهَارَةُالْحَدَث) پاکیی نوێژکەرەکەیە: لە بێدەستنوێژیی بچوك‌و گەورە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَقْبَلُ اللهُ صَلاَةً بِغَيْرِطُهُورٍ﴾رواه مسلم، خوایگەورە هیچ نوێژێك قبوڵ ناکا بە بێدەستنوێژی گەورە، یان بچوك.

کەوابو: (فَإِنْ سَبَقَهُ) ئەگەر بە بێویستیخۆی لە ناو نوێژدا، بێدەستنوێژ بوو: وەك شتێك لە کونی پشتەوەی، یان پێشەوەی بێتە دەرەوە، یان ئافرەتێکیبێگانە دەستی لێبدا، یان بێهۆش ببێ...هتد (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ‌و واجبە: لە سەرەتاوە نوێژەکەی بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا فَسَا أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاةِ فَلْيَنْصَرِفْ وَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُعِدِ

وَفِى الْقَدِيمِ يَبْنِى، وَيَجْرِيَانِ فِى كُلِّ مُنَاقِضٍ عَرَضَ بِلاَ تَقْصِيرٍ وَتَعَذَّرَ دَفْعُهُ فِى الْحَالِ، فَإِنْ أَمْكَنَ بِأَنْ كَشَفَتْهُ رِيحٌ فَسَتَرَ فِى الْحَالِ لَمْ تَبْطُلْ،

---

الصَّلاَةَ﴾ رواه أصحاب السنن وصححه إبن حبان، هەر کاتێك یەکێکتان لە ناو نوێژدا فسی لێبەربوو، با بڕوا دەستنوێژ بگرێتەوەو نوێژەکەش دووبارە بکاتەوە. کەواتە: ئەگەر بەقەسدی خۆی بێدەستنوێژ بکا، ئەو کاتە نوێژ بەتاڵبوونەکەی بەهێزترە، بە بەڵگەی (إجماع)، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعی) بوو، بەڵام (وَفِى الْقَدِيمِ) لە فەرموودەیکۆنیدا (يَبْنِى) دەستنوێژ دەگرێتەوەو ئەوەندەی لە نوێژەکە ماوە، تەواوی دەکا، بەڵام بەڵگەی فەرموودەیکۆن حەدیسێکی بێهێزە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: ڕەفتاری پێناکرێ.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِى صَلاتِهِ فَلْيَأْخُذْ بِأَنْفِهِ ثُمَّ لْيَنْصَرِفْ﴾رواه أبوداود بسندصالح، هەر کاتێك یەکێکتان لە ناو نوێژدا بێدەستنوێژ بوو، با لووتیخۆی بگرێ ئینجا بڕوا. واتە: تاکو خەڵك وا تێبگا: خوێن لە لووتی هاتووەو گاڵتەی پێنەکەن، هەر وەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەو کەسانەی بێدەستنوێژییان بەردەوامە، ئەگەر لەناو نوێژدا بێدەستنوێژ بون، نوێژەکەیان دروستەو قەزاکردنەوەیان لە سەر واجب نیە، هەر وەك لە ئاگاداریەکەی (استحاضة)-خوێنچڕکەدا ڕوونمان کردەوە، هەروەها ئەو کەسەی ئاو و گڵی دەست ناکەوێ بۆ دەستنوێژگرتنو غوسل کردن، ئەویش واجبە بە بێدەستنوێژی، یان بە جەنابەتەوە نوێژە واجبەکان بکا، بەڵام واجبە: قەزا بکاتەوە، هەر وەك لە (تیمم)دا ڕوونمان کردەوە.

(وَيَجْرِيان) هەردوو فەرموودەی نوێو کۆن دێنە جێ (فِى كُلِّ مُنَاقِضٍ) لە هەر دژێکی نوێژ بەتاڵ بکا (عَرَضَ) کە لە ناو نوێژدا ڕوو بدا (بِلاتَقْصِيرٍ) بە بێکەمتەرخەمینوێژکەرەکەو (وَتَعَذَّرَ دَفْعُهُ فِى الْحالِ) نەشگونجا دەمودەست لایببا: وەك لاشەی، یان جلەکەی بە پیسیەکی تەڕ پیس ببێو نەگونجێ جلەکەی دابکەنێ، ئەوە لە فەرموودەی ڕاستینوێدا: نوێژەکە بەتاڵ دەبێو واجبە: لە دوای لابردنی پیسیەکە لە سەرەتاوە نوێژەکە بکاتەوە.

(فَإِنْ أَمْكَنَ) بەڵام ئەگەر گونجا: دەمودەست دژەکە لاببا (بِأَنْ كَشَفَتْهُ رِيحٌ) وەك با عەوڕەتی بەدەر بێخێ، یان دۆخینی بپچڕێ، یان پەشتەماڵی خوارەوەی لێبێتەوە (فَسَتَرَ فِى الْحالِ) ئینجا دەمودەست عەوڕەتەکەی داپۆشیەوە (لَمْ تَبْطُلْ) نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، چونکە ماوەکە کەمە، هەروەها ئەگەر پیسیەکیووشکی کەوتە سەر و یەکسەر

وَإِنْ قَصَّرَ بِأَنْ فَرَغَتْ مَدَّةُ خُفٍ فِيهاَ بَطَلَتْ. وَطَهَارَةُ النَّجَسِ فِي الثَّوْبِ وَالْبَدَنِ وَالْمَكان، وَلَوْ اشْتَبَهَ طَاهِرٌ وَنَجِسٌ اجْتَهَدَ،

---

دایته‌کاند، یان پیسیه‌کی ته‌ڕی به‌ جله‌که‌ی که‌وت‌و جله‌که‌ی داکه‌ند، دیسان نوێژه‌که‌ی به‌تاڵ نابێ.

به‌ڵام (وَإِنْ قَصَّرَ) ئه‌گه‌ر له‌ لادانی‌دژه‌که‌دا که‌مته‌رغه‌می کردبو (بِأَنَ فرغَتْ مُدَّةُ خُفٍّ فِيهـا) وه‌ك ماوه‌ی خوف له‌ ناو نوێژدا کۆتـایی بـێ (بَطَلَتْ) نوێژه‌که‌ به‌تاڵ ده‌بێ، چونکه‌ له‌ کاتێکی وه‌هادا نوێژی دابه‌ستوه‌: که‌ ده‌یزانی ماوه‌ی خوفه‌که‌ نامێنێ.

پێنجه‌م: (وَطَهَارَةُالنَّجَسِ) پاکی‌ی نوێژکه‌ره‌که‌یه‌ له‌ پیسی (فِي الثَّـوْبِ) ده‌رباره‌ی جل‌و به‌رگی، واته‌: هه‌ر جۆره‌ به‌رگێکی به‌ لاشه‌و ئه‌ندامه‌کانیه‌وه‌ بێ: وه‌ك سه‌رو ده‌ست‌و پێ، خوای گه‌وره‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾ جله‌کانت پاك بکه‌ له‌ پیسی. که‌وابو: ئه‌گه‌ر جگه‌ له‌ به‌رگێکی‌پیس هیچ به‌رگێکی‌پاکی ده‌ست نه‌که‌وت عه‌وره‌تی پێ‌دابپۆشێ‌و توانای شۆردنی به‌رگه‌ پیسه‌که‌شی نه‌بو، واجبه‌: دایبکه‌نێ‌و به‌ ڕووتی نوێژه‌که‌ بکاو دووباره‌ کردنه‌وه‌شی له‌ سه‌ر نیه‌، هه‌ر وه‌ك له‌ (المجموع)دا فه‌رموویه‌تی.

(وَالْبَدَنِ) هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی لاشه‌ی، چونکه‌ پێغه‌مبه‌رﷺ به‌ ئافره‌تێکی‌حه‌یزداری فه‌رموو: ﴿فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي﴾ رواه الشيخان، خوێن له‌خۆت بشۆره‌، ئینجا نوێژ بکه‌. که‌وابو: واجبه‌: ناو ده‌م‌و لووت‌و چاو و گوێ‌ی –که‌ له‌ ده‌ره‌وه‌ دیاره‌– گشتی پاك بێ.

(وَالْمَكانِ) هه‌روه‌ها ده‌رباره‌ی شوێنی نوێژ لێکردن، چونکه‌ پیاوێك میزی له‌ ناو مزگه‌وت کردو پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رمووی: ﴿هَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ ماءٍ﴾ رواه الشيخان، دۆڵچه‌یه‌کی ئاو بڕژێننه‌ سه‌ر میزه‌که‌ی. واته‌: چونکه‌ مزگه‌وت شوێنی نوێژه‌.

که‌وابو: ئه‌گه‌ر له‌ شوێنێکی‌پیسدا به‌ند کرابو، واته‌: هیچیشی ده‌ست نه‌که‌وت ڕایبێخێ، ئه‌وه‌ واجبه‌ نوێژه‌که‌ بکا، به‌ڵام دروست نیه‌ بۆ سوجده‌ ئه‌ندامه‌کانی دابنێته‌ سه‌ر پیسیه‌که‌، به‌ڵکو به‌ ئه‌ندازه‌یه‌کی وه‌ها خۆی بۆ سوجده‌ کووڕ ده‌کاته‌وه‌: تا مه‌ترسی گه‌یشتنی پیسیه‌که‌ی ده‌بێ، که‌واته‌: هه‌ر به‌ پێوه‌ش ته‌حیات ده‌خوێنێ، به‌ڵام واجبه‌: نوێژه‌که‌ش دووباره‌ بکاته‌وه‌، له‌ (المجموع)دا بۆ ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ به‌ڵگه‌ی به‌م حه‌دیسه‌ هێناوه‌ته‌وه‌: ﴿إذا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتوا مِنهُ ماسْتَطَعْتُمْ﴾ رواه الشيخان، هه‌رکاتێك فه‌رمانێکم پێ‌کردن هه‌رچه‌ندی تواناتان هه‌یه‌ بیکه‌ن.

(وَلَوْ إِشْتَبَهَ طاهِرٌ ونَجِسٌ) ئه‌گه‌ر نوێژکه‌ر لێ‌ی شێوا: پاکێك‌و پیسێك، وه‌ك نه‌زانێ له‌م دوو شوێنه‌ کامه‌یان پاکه‌و کامه‌یان پیسه‌، یان له‌م دوو جله‌ کامه‌یان پاکه‌و کامه‌یان پیسه‌ (اِجْتَهَدَ) با (اِجْتِهاد) بکا، واته‌ هه‌وڵ بدا پاکه‌که‌ بدۆزێته‌وه‌، به‌و شێوه‌ی له‌ باسی قاپه‌کاندا

وَلَوْ نَجَسَ بَعْضُ ثَوْبٍ أَوْ بَدَنٍ وَجُهِلَ وَجَبَ غَسْلُ كُلِّهِ، فَلَوْ ظَنَّ طَرَفاً لَمْ يَكْفِ غَسْلُهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ غَسَلَ نِصْفَ نَجِسٍ ثُمَّ بَاقِيَهُ، فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ غَسَلَ مَعَ بَاقِيهِ مُجَاوِرَهُ طَهُرَ كُلُّهُ، وَإِلاَّ فَغَيْرُ الْمُنْتَصَفِ،

---

ڕوونمان کردەوە، جا ئەگەر (إجتهاد)ی کردو پاکەکەی بۆ ئاشکرا نەبو، ئەو کاتە لە بەر ڕێزلێنانی کاتی‌نوێژەکە، واجبە نوێژەکە بە ڕووتی بکا، یان لە یەکێك لەم دوو شوێنە پیسەدا بیکا، هەم قەزای بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو لە کاتێکدا بوو: کە ئاوی دەست نەکەوێ یەکێکیانی پی‌بشۆرێ، واتە: ئەگەر ئاوی دەست کەوت، واجبە بۆ نوێژکردن یەکێکیان بشۆرێ، جا ئەگەر هیچێکیانی نەشۆرد و (إجتهاد)شی نەکرد، بەڵکو لە هەر شوێنێك، یان بە هەر جلێکەوە جارێك نوێژەکەی کرد، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵەو دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانەی ڕوون کردونەوە.

هەروەها ئەگەر دیتمان یەکێك پیسیەکی پێوەیە-واتە: یان لە شوێنێکی‌پیسدا نوێژ دەکا- واجبە: ئاگاداری بکەینەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ نَجَسَ بَعْضُ ثَوْبٍ) ئەگەر بەشێکی جلەکەی پیس بوو (أَوْ بَدَنٍ) یان بەشێکی لاشەی پیس بوو (وَجُهِلَ) نەشزاندرا ئەو بەشە پیسبووە کامەیە (وَجَبَ غَسْلُ كُلِّهِ) واجبە هەموو شتە پیسبووەکە بشۆرێ، تاکو نوێژی پێوە دروست ببێ، کەوابو: (فَلَوْ ظَنَّ طَرَفاً) ئەگەر بە (إجتهاد) دڵی بۆ لایەکی جلەکە چوو: کە پیسە (لَمْ يَكْفِ غَسْلُهُ) شۆردنی تەنها ئەو لایە بەس نیەو جلەکە پاك نابێتەوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی‌ڕاست، چونکە (إجتهاد) لە تەنها یەك شتدا ناکرێ، بەڵام ئەگەر بە (إجتهاد) نەبو، بەڵکو بێگومان زانی: ئەم لایە پیس بوە، ئەوە تەنها لایە پیسبووەکە بشۆرێ بەسەو پاك دەبێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، هەروەها ئەگەر باوەڕپێکراوێك، یان شەرعزانێکی هاومەزهەب پی‌ی گوت: ئەم لایە پیس بوە، واجبە: بە قسەی بکا، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ غَسَلَ نِصْفَ نَجِسٍ) ئەگەر نیوەی جلێکی پیسی شۆرد بە ئاو پێداکردن (ثُمَّ بَاقِيَهُ) ئینجا نیوەکەی‌تریشی شۆرد (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستر (أَنَّهُ) ئەوەیە: (إِنْ غَسَلَ مَعَ بَاقِيهِ مُجَاوِرَهُ) ئەگەر لەگەڵ شۆردنی ئەو نیوەیەدا بەشێکی نیوەکەی‌تریشی لە لای ئەم نیوەیە دووبارە شۆردەوە (طَهُرَ كُلُّهُ) هەمووی پاك دەبێتەوە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بەشەکەی ئەم لایەی نەشۆردەوە (فَغَيْرُ الْمُنْتَصَفِ) جگە لەو شوێنەی بووەتە نیوە، ئەوەی‌تر پاك دەبێتەوە، واتە نێوان هەردوو لایە شۆراوەکە پاك نابێتەوە، چونکە بە تەڕی گەیشتۆتە پیسی، هەروەها ئەگەر جلەکە بخرێتە ناو ئاوێکی‌کەم، پاك نابێتەوەو ئاوەکەش پیس دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ تَصِحُّ صَلاَةُ مُلاَقٍ بَعْضُ لِبَاسِهِ نَجَاسَةً وَإِنْ لَمْ يَتَحَرَّكْ بِحَرَكَتِهِ، وَلاَ قَابِضٍ طَرَفَ شَيْءٍ عَلَى نَجِسٍ إِنْ تَحَرَّكَ وَكَذَا إِنْ لَمْ يَتَحَرَّكْ فِي الأَصَحِّ، فَلَوْ جَعَلَهُ تَحْتَ رِجْلِهِ صَحَّتْ مُطْلَقاً، وَلاَيَضُرُّ نَجِسٌ يُحَاذِي صَدْرَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

---

(وَلاتَصِحُّ صَلاَةُ) دروست نیه نوێژی ئەو کەسەی (مُلاَقٍ بَعْضُ لِبَاسِهِ نَجَاسَةً) بەشێکی بەرگەکەی، یان لاشەی بە پیسیەك بکەوێ (وَإِنْ لَمْ يَتَحَرَّك بِحَرَكَتِهِ) هەرچەند بەرگەکەشی بە جولەی وی نەجولێتەوە.

(وَلا قابِضٍ طَرَفَ شَيْءٍ) هەروەها دروست نیه نوێژی ئەو کەسەی لایەکی شتێکیپاکی بە دەست گرتبێ، یان لە خۆی بەستبێ، یان هەڵیگرتبێ، ئینجا لایەکەیتریشی: یان پیس بێ، یان (عَلى نَجِسٍ) لە سەر شتێکی پیس داندرابێ، یان لە شتێکی پیس بەسترابێ (إِنْ تَحَرَّكَ بِحَرَكَتِهِ) ئەگەر شتە بەستراوەکە، یان گیراوەکە بە جولەی وی بجولێتەوە (وَكَذا إِنْ لَمْ يَتَحَرَّ كْ) هەروەها ئەگەر بە جولەی وی نەشجولێتەوە نوێژەکەی هەر دروست نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا: وەك سەرەپەتێك، یان پارچەجلێك لە سەر شتێکیپیس دابنێ، یان لە ملی ئاژەڵێکیپیس ببەستێ، ئینجا سەرەکەیتریشی بە دەستیەوە بگرێ، یان لەخۆی ببەستێ، یان جلەوی وولاغێکیپیسبوو بە دەستیەوە بگرێ، یان لەخۆی بەستێ، ئەوە نوێژەکەی دروست نیە هەر چەند نەشجولێ.

(فَلَوْ جَعَلَهُ تَحْتَ رِجْلِهِ) بەلام ئەگەر لایەکی شتە پاکەکەی لە بن پێی خۆی داناو لایەکیتریشی بە پیسیەکەوە بوو (صَحَّتْ) نوێژەکە دروستە (مُطْلَقاً) بە هەموو جۆرێك: شتەکە بجولێ، یان نەجولێ، چونکە هەڵینەگرتوەو لە خۆیشی نەبەستوەو بە دەستیش نەیگرتوە، کەوابو: نوێژەکەی دروستە، هەروەك ئەگەر لە سەریانی ئاودەستخانەیەك نوێژ بکا، یان بەرماڵێك لە سەر زبڵ ڕابێخێو نوێژی لە سەر بکا، یان لە سەر لا بەرماڵێکی پاك نوێژ بکا: کە لایەکەیتری پیس بێو وێی نەکەوێ، لەو سێ مەسەلەیەشدا نوێژی دروستە، هەرچەند ڕاخراوەکەش بجولێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها لە سەرچاوەکان وەردەگیرێ، ئەگەر جلو لاشەی بە خودی پیسەکە نەکەوت، بەلام بە شتێکیپاك دەکەوتو شتە پاکەکەش بە پیسێکەوە گیرکرابو: وەك لە نوێژدا خۆی لە کەسێك بدا: کە جلەکانی پاك بێ، بەلام لاشەی پیس بێ، ئەوە زیانی نیە، چونکە هەڵینەگرتوەو بە دەستیش نەیگرتوەو لە خۆیشی نەبەستوەو بە خودی پیسیەکەش نەکەوتوە.

(وَلاَيَضُرُّ) زیان لە نوێژ نادا (نَجِسٌ) پیسیەکی وەها (يُحاذِي صَدْرَهُ) کە بەرامبەر سینگی، یان ئەندامێکیتری بێ (فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ) لە کاتی ڕکووعو سوجدە بردندا، یان لە

عَلَى‌الصَّحيحِ، وَلَوْ وَصَلَ عَظْمَهُ بنجسٍ لفقْد الطَّاهِرِ فَمَعْذُورٌ، وَإلاَّ وَجَبَ نَزْعُهُ إنْ لَمْ يَخَفْ ضَرَراً ظَاهِراً، قِيلَ وَإنْ خَافَ، فإنْ مَاتَ لَمْ يُنْزَعْ عَلَى‌الصَحيحِ،

---

کاتێکی‌تردا (عَلَى‌الصَّحيح) لـه سـەر فەرموودەی‌ڕاست، چـونکه پیسـیەکەی وێناکـەوێ، کەوابو: نوێژەکەی دروستە، بەڵام ناپەسندە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی لێبوردنی شەرع لە چەند جۆرە پیسیەك ﴾

(وَلَوْ وصَلَ عَظْمَهُ) ئەگەر کەسێك شکستی‌ئێسقانەکەی پێکوەناوە (بِنَجِسٍ) بە ئێسقانێکی پیس، یان بە ئێسقانی ئادەمیزادێك (لِفَقْدِالطَّاهِرِ) لـە بـەر ئـەوەی ئێسـقانێکی‌تری پـاکی دەست نەدەکەوت شکستکەی پی‌پێکوەبنێتەوە (فَمَعْذُورٌ) ئـەوە عـوزری بـە دەسـتەو لـە بەر ناچاری نوێژەکانی دروستن.

(وَإلاّ) بەڵام ئەگەر لە بـەر نەبوونی‌ئێسـقانی‌پاك نـەبو، بـەڵکو بـە حـەزی‌خۆی ئێسـقانێکی پیس، یان ئێسقانی‌ئادەمیزادێکی بـە شکسـتەکەوەناوە (وَجَبَ نَزْعُـهُ) واجبـە ئێسـقانەکە دەربێنێ، تاکو نوێژی دروسـت ببـێ (إنْ لَـم يَخَـفْ ضَـرَراً ظـاهِراً) بـەو مەرجـەی بـە هـۆی لابردنی لە زیانێکی ئاشکرا نەترسێ کە بگاتە ڕادەیەك: (تیمم)ی بۆ دروست بـێ، وەك لـە دەستچوونی گیان، یان سودی ئەندامێك، یان پەیدابوونی پەڵەیەکی ناشیرن، واتە: ئەگەر ئـەو جـۆرە ترسـانەی هـەبون دەرهێنـانی واجـب نیـەو نوێژەکەشـی دروسـتە (قِيـلَ) لـە فەرموودەیەکی بێهـێزدا: هـەر واجبـە ئێسـقانەکە دەربێنـێ (وَإنْ خـافَ) هـەر چـەند لـەو زیانانەی‌ڕابردووش بترسێ.

(فإنْ ماتَ) جا ئەگەر خاوەنی شکستەکە مردو ئێسقانە پیسەکەشی هـەر لـە لاشـەی‌دا بـوو (لَم يُنْزَع) واجـب نیـە ئێسـقانەکە دەربهێنـدرێ (عَلَى‌الصَّحِيحِ) لـە سـەر فەرموودەی‌ڕاسـت، چـونکە بـە هـۆی مـردن نوێـژی لـە سـەر لاچـووەو دەرهێنانیشـی سـووکایەتی‌کردنە بـە مردووەکە.

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: هەتا ئێسقانی‌ئاژەڵ هـەبێ، دروسـت نیـە: ئێسـقانی‌ئادەمیزاد بـەکار بهێندرێ، هەرچەند ئاژەڵەکە گڵاو، یان مرداریش بێ، هەروەها دەرمـانکردن بـە دەرمـانێکی پیس، یان دوروینـەوەی بـرین بـە داوێکـی‌پیس، یـان تێکردنـی خـوێن‌و شـتێکی‌تری پـیس، هەمان بڕیارەکانی ئێسقانیان بۆ دەدرێن، هـەروەك لـە سەرچـاوەکاندا ئـەو مەسـەلانە ڕوون کراونەوە.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: کە ئەندامەکانی‌تری ئادەمیزاد-جگە لە ئەندامـەکانی زاوزێ- قیـاس دەکرێنە سەر ئێسقانی‌ئادەمیزاد، واتە: لە حاڵەتی‌ناچاری‌دا بەو مەرجانـەی‌ڕابردوو دروسـتە بە ئادەمیزادێکی‌ترەوە بندرێن، والله أعلم.

دووەم: خاڵ دروستكردن–كە هەم پێیدەگوترێ: كوتین– حەرامەو پێغەمبەرﷺ لەعنەتی لێكردوە، هەروەك لە پاشكۆیدەستنوێژدا حەدیسەكەمان هێناوە، كەواتە: ئەگەر بە ڕەزامەندی مرۆڤەكە خاڵی بۆ دروست كرابو=كوترابو، ئەوە مرۆڤەكەو دروستكەرەكە هەردووكیان تاوانبارن، كەوابو: واجبە خاڵەكە لابیا، بەو مەرجەی لە زیانێكی وەها نەترسێ: كە (تیمم)ی بۆ دروست بێ: وەك لە دەستدانی گیان، یان سودی ئەندامێك، یان پەیدابوونی پەڵەیەكی ناشیرن، ئەگینا: نوێژەكەی دروست نیە، چونكە شوێنی خاڵەكە پیس بووە، بەڵام ئەگەر ئەو ترسانە هەبون ئەو كاتە لادانی واجب نیە، بەڵكو تەنها تۆبە واجبەو نوێژەكەشی دروستە.

جا ئەگەر لە سەردەمی منداڵیدا خاڵی لێدروست كرابو، ئەوە تەنها دروستكەرەكە تاوانبارە، منداڵەكە تاوانبار نابێو نوێژەكەشی دروستەو واجبیش نیە كاتێ گەورە بوو خاڵەكە لابیا، جیاوازی پیاو و ئافرەتیش نیە، هەروەك لە (شرح مسلم)و لە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلەیە ڕوون كراوەتەوە، بەڵام لە (تحفە)دا دەفەرموێ: ئەگەر لە كاتی منداڵیشدا خاڵی لێدروست كرابێ، هەر واجبە: لای ببا. وَاللهُ أَعْلَم.

(وَيُعْفَى) لێدەبوردرێ بۆ دروستبوونینوێژ (عَنْ مَحَلِّ إِسْتِجْمارِهِ) لە ئاسەواری پیسایەكەی شوێنی تارەتكردن، كە بە بەرد تارەتی كردبێ، جا ئەو لێبوردنە تەنها دەربارەی دروستبوونی نوێژیخۆیەتی، نەك نوێژیكەسێكیتر، كەوابو: (وَلَوْ حَمَلَ مُسْتَجْمِراً) ئەگەر نوێژكەرێك لە ناو نوێژدا كەسێكی هەڵگرت: كە تارەتی بە بەرد كردبو (بَطَلَتْ) نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا بزانە: ئەو حەدیسەی(بخاریو مسلم): ﴿كە پێغەمبەرﷺ لە ناو نوێژدا كیژۆڵەیەكی ناوی (أمامة)ی هەڵگرتوە﴾. وا داندراوە: كە تارەتی بە ئاو بۆ كراوە، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

كەوابو: ئەگەر ئەو كەسەی تارەتی بە بەرد كردوە، یان پیسیەكی پێوەیە، بە دەستی خۆی نوێژكەرێك، یان جلی نوێژكەرێك بگرێ، نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، هەروەها ئەگەر نوێژكەرەكەش بە دەستیخۆی تارەتكراوەكە، یان جلەكانی بگرێ، یان كەسێك بگرێ كە پیسیەكی پێوەیە، یان جلەكانی بگرێ، نوێژیخۆی بەتاڵ دەبێ، واتە: بەڵام بە تەنها خۆلێدان نوێژ بەتاڵ نابێ، هەروەك پێش ئێستا ڕوونمان كردەوە.

هەروەها ئەگەر لەناو نوێژدا مردووێك هەڵبگرێ كە پیسی لە ناودا بێ، دیسان نوێژی دروست نیە، هەر چەند خوێنیشی نەبێ، یان مردووەكە گۆشتیشی بخورێ، یان ئادەمیزاد بێ، بەڵام هەڵگرتنی زیندووی پاك: كە پیسیی پێوە نەبێ، نوێژ بەتاڵ ناكا، هەرچەندە

وَطِينُ الشَّارِعِ اَلْمُتَيَقَّنُ نَجَاسَتُهُ يُعْفَى عَنْهُ عَمَّا يَتَعَذَّرُ الإِحْتِرازُ مِنْــهُ غَالِبــاً، وَيَخْتَلِــفُ بِالْوَقْتِ وَمَوْضِعِه مِنَ الثَّوْبِ وَالْبَدَنِ، وَعَنْ قَلِيلِ دَمِ الْبَرَاغِيثِ وَوَنِيمِ الذُّبَابِ، وَالأَصَحُّ لاَيُعْفَى عَنْ كَثِيرِه وَلاَ قَلِيلٍ انْتَشَرَ بِعَرَقٍ، وَتُعْرَفُ الْكَثْرَةُ بِالْعَادَةِ،

---

ئاژەڵێکی وەهاش بێ: کە گۆشتی نەخورێ، بە بەڵگەی ﴿حەدیسەکەی (أمامـة)ی ڕابـردوو﴾، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَطِينُ الشَّارِعِ) قوڕو چڵکاوی ڕێگەو کۆڵان (اَلْمُتَيَقَّنُ نَجَاسَتُهُ) کە بێگومـان: پیسـە، هـەر چەند میزو پیسایی سەگو بەرازیشی تێکەڵ بوبێ، بەو مەرجـەی جیـا نەکرێتـەوە (يُعْفَى عَنْـهُ) لێی دەبـوردرێ ـــبۆ دروسـتبوونی نوێژـــ: هـەم لـە جل و بـەرگو هـەم لـە لاشـەی نوێژکەر (عَمَّا يَتَعَذَّرُ الأحْتِرازُ عَنْهُ) لەو ئەنـدازەی خۆ لێپاراستنی زەحمەتـە (غَالِباً) بـە ئەغلـەبی، واتـە: نـەك ئەئەندازەیـەکی وەهـا: خـەڵك وا تێبگـا قوڕکـاریی کـردوە، یـان بەرێۆەتەوە، یان کەمتەرغەمی کردوە.

(وَيَخْتَلِفُ) ئەو لێبوردنە دەگۆڕێو جیاوازی هەیە (بِالْوَقْتِ) بـە گـوێرەی کـات، واتـە: ئـەو ئەندازەی لە زستاندا لێیدەبوردرێ، جیایە لەگەڵ هـاوین (وَمَوْضِعِه) هـەروەها جیـاوازی هەیە بە گوێرەی شوێنی پیسیەکە (مِنَ الثَّوْبِ وَالْبَدَنِ) لە بەرگو لە لاشەی نوێژکەر، واتە: ئەو ئەندازەی لە دامێنو پـێی نوێژکەر لێیدەبوردرێ جیایە: لەگەڵ شوێنەکانیتری جلو لاشە، جا هەر چەند لێبوردن هەیە، بـەڵام دروسـت نیـە: بـەم قـوڕە مزگـەوت پـیس بکـا، هەروەهاش دروست نیە: لەو ڕێگەو کۆڵانە پیسانەدا بـە بێڕایـەخ نوێـژ بکـا، هـەروەك لـە (تحفة)و (الشبراملسی)دا ڕون کراوەتەوە.

(وَعَنْ قَلِيلِ دَمِ الْبَرَاغِيثِ) هەروەها لە کەمێکی خوێنی کێچو ئەسپێو پێشولە دەبـوردرێ ـــبۆ دروستبوونی نوێژـــ لە جلو لاشەو شوێنی نوێژ.

(وَوَنِيمِ الذُّبَابِ) هەروەها دەبوردرێ: لە کـەمێکی جیقنـەی مـێشو جیقنـەی ئـەو شتانەی خوێنیان لەبەر ناڕوا لـەکاتی لێکردنـەوەی ئەنـدامێك، بـەڵام دەربـارەی مـردووی هیچیان لێبوردن نیە، هەروەك باسمان کرد.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (لاَيُعْفَى عَنْ كَثِيرِهِ) لـە زۆر جیقنـەی مـێشو لـە خـوێنێکی زۆر نابوردرێ (وَلاَ قَلِيلٍ) لە کەمێکیشی نابوردرێ: کە (إِنْتَشَرَ بِعَرَقٍ) بـە هـۆی ئارەقـەوە بڵاو بوبێتەوە.

(وَتُعْرَفُ الْكَثْرَةُ بِالْعَادَةِ) زۆریو کەمی خوێن بە گوێرەی عادەت دەزانـدرێ، واتـە: ئـەوەی بە گوێرەی عادەت بە جلو لاشەوە دەکەوێو خۆ لێپاراستنی زەحمەتە: کەمـە، لـەوەش زیاتر زۆرە.

قُلْتُ: اَلأَصَحُّ عِنْدَ الْمُحَقِّقِينَ الْعَفْوُ مُطْلَقاً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَدَمُ الْبَثَرات كَالْبَرَاغِيث، وَقِيلَ إِنْ عَصَرَهُ فَلا، وَالدَّمَاميلُ وَالْقُرُوحُ وَمَوْضِعُ الْفَصْد وَالْحجَامَة قِيلَ كَالْبَثَرَات، وَالأَصَحُّ إِنْ كَانَ مِثْلُهُ يَدُومُ غَالِباً فَكَالاسْتِحَاضَة وَإِلاَّ فَكَدَمِ الأَجْنَبِيِّ فَلاَ يُعْفَى، وَقِيلَ يُعْفَى عَنْ قَلِيلِه، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ أَنَّهَا كَالْبَثَرَات،

---

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (عِنْدَالْمُحَقِّقِينَ) لە لای زانایانی ڕوونکەرەوە: (اَلْعَفْوُ) لێبوردنە لەو خوێنو جیقنانەی ڕابردوو (مُطْلَقاً) بە هەموو جۆرێك (وَاللهُ أَعْلَم) واتە: جیاوازی نیە: کەم بێ، یان زۆر بێ، بە هۆی ئارەقەوە بڵاو بوبێ، یان نا.

(وَدَمُ الْبَثَرات) خوێنی وورده زیپکەو قینچکە (كَالْبَرَاغِيثِ) وەکو خوێنی‌کێچ وایە، واتە: هەم لە کەمو هەم لە زۆرەکەی دەبوردرێ، بەو سێ‌مەرجانەی داهاتوو (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (إِنْ عَصَرَهُ) ئەگەر بە خۆی بیگوشێو خوێنی لێ‌دەربێنێ (فَلا) لێی نابوردرێ، بەڵام فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: ئەگەر بە خۆی بیگوشێو خوێنی لێبێنێ تەنها لە کەمەکەی دەبوردرێو لە زۆرەکەی نابوردرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالدَّمَامِيلُ) لوو و قونێرو (وَالْقُرُوحُ) برینو (وَمَوْضِعُ الْفَصْدِ) شوێنی خوێن لێ‌دەرهێنانی دەمارو (وَالْحِجَامَةِ) شوێنی خوێن لێ‌دەرهێنانی پیستە (قِيلَ) لە فەرموودەیەکدا خوێنی هەر چواریان (كَالْبَثَراتِ) وەکو خوێنی وورده زیپکە وایە: لەکەمو زۆری گشتیان دەبوردرێ، بەو مەرجەی بەخۆی خوێنیان لێ‌نەهێنێو خوێنەکەشی لە شوێنی‌خۆیو— بە گوێرەی‌عادەت— لەدەورەی خۆی بەولاوەتر نەڕواو جگە لە شوێنی بەرامبەر برینەکەش بە هیچ شوێنی‌تری جلەکانیەوە نەکەوێ، واتە: ئەگەر مەرجێك لەو سێ مەرجانە نەبو، ئەو کاتە—وەکو خوێنی‌بێگانە—تەنها لە کەمێکی‌خوێنەکە دەبوردرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (إِنْ كَانَ مِثْلُهُ يَدُومُ غَالِباً) ئەگەر ئەو جۆرە خوێن هاتنەی ڕابردوو زۆر بەردەوام دەبو (فَكَالأسْتِحَاضَةِ) وەکو خوێنچرکە بڕیاری بۆ دەدرێ، هەروەك لە شوێنی‌خۆی‌دا ڕونمان کردەوە (وَإِلّا) بەڵام ئەگەر بەردەوام نەبو (فَكَدَمِ الأَجْنَبِيِّ) وەکو خوێنی بێگانە وایە (فَلا يُعْفَى) لێی‌نابوردرێ (وَقِيلَ يُعْفَى عَنْ قَلِيلِهِ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: لە کەمێکی دەبوردرێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر لەو فەرموودانەی ڕابردوو، ئەو فەرموودەیە بوو: کە (أَنَّها) خوێنی ئەو چوارانەی‌ڕابردووش (كَالْبَثَراتِ) وەکو خوێنی وورده زیپکە وایە، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

وَالْأَظْهَرُ الْعَفْوُ عَنْ قَلِيلِ دَمِ الْأَجْنَبِيِّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَالْقَيْحُ وَالصَّدِيدُ كَالدَّمِ، وَكَذَا مَاءُ الْقُرُوحِ وَالْمُتَنَفِّطُ الَّذِى لَهُ رِيحٌ، وَكَذَا بِلاَ رِيحٍ فِي الْأَظْهَرِ. قُلْتُ: الْمَذْهَبُ طَهَارَتُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ صَلَّى بِنَجِسٍ لَمْ يَعْلَمْهُ وَجَبَ الْقَضَاءُ فِي الْجَدِيدِ،

---

(وَالْأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (اَلْعَفْو) لێبوردنە (عَنْ قَلِيل دَمِ الأَجْنَبِيِّ) لە کەمێکی خوێنی بێگانە، واتە: ئەو خوێنەی لە شوێنێکی لاشەی خۆی دێتەدەرەوە، بەڵام بە شوێنێکی‌تری لاشەکەی دەکەوێتەوە، یان هی گیانلەبەرێکی‌ترە: جا ئادەمیزاد بێ، یان ئاژەڵ-جگە لە سەگو بەراز-(وَاللهُ أَعْلَم) واتە: خوێنی‌گڵاو لێبوردنی نیە، هەروەها خوێنێکی زۆری بێگانەش لێبوردنی بۆ نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالْقَيْحُ) کێم (وَالصَّدِيدُ) خیزاو (كَالدَّمِ) هەردووکیان وەك خوێنن لە گشت مەرج‌و بڕیارەکانی‌ڕابردوودا: لە خوێنی خۆی‌و بێگانەدا، چونکە ئەو دووانەش لە بنچینەدا خوێنن‌و گۆڕاون (وكَذا ماءُ الْقُرُوحِ) هەروەها ئاوی برین‌و (وَالْمُتَنَفِّط) ئاوی پفکەو ئاوڵە (الَّذى لَهُ رِيحٌ) کە بۆنی هەیە، یان ڕەنگی گۆڕاوە، گشتی وەکو خوێن وایە: لە بڕیارەکانی‌ڕابردوودا (وكَذا بلا رِيحٍ) هەروەها ئەگەر ئاوەکە بۆنیشی نەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (اَلْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب ئەمەیە: (طَهارَتُهُ) ئاوی بێ‌بۆنی برین‌و پفکەو ئاوڵە گشتی پاکە (وَاللهُ أَعْلَم) ئیتر لە باسی ئاوەکان‌و لابردنی پیسی‌دا چەند لێبوردراوێکی‌ترمان ڕوون کردنەوە، لێ‌ئاگاداربوونەوەیان بۆ ئێرە پێویستە.

## ﴿ نوێژکردن بە پیسیەوە ﴾

(وَلَوْ صَلَّى) ئەگەر نوێژی کرد (بِنَجِسٍ) بە پیسیەکەوە: جا بە جلەکەیەوە بێ، یان بە لاشەیەوە، یان لە شوێنی نوێژدا بێ (لَمْ يَعْلَمْهُ) لە کاتی‌نوێژدابەستندا نەیزانی ئەو پیسیەی پێوەیەو پیسیەکەش لێبوردراو نەبو (وَجَبَ الْقَضاءُ) واجبە: نوێژەکە دووبارە بکاتەوە (فِي الْجَدِيد) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی (شافعی)دا، چونکە مەرجێکی نوێژەکە نەهاتۆتە جێ: کە پاکی‌یە لە پیسی، کەوابو: جیاوازی نیە لە دوای تەواوبوونی نوێژ پیسیەکە ئاشکرا ببێ، یان هەر لە ناو نوێژدا ئاشکرا ببێ، واتە: واجبە واز لەو نوێژە بێنێ‌و پیسیەکە لاببا، ئینجا لە سەرەتاوە دەست بە نوێژەکە بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێکی(صحیح)دا هاتوە: ﴿بَيْنَما رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِأَصْحابِهِ، إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ فَلَمَّا قَضَى صَلاتَهُ قَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ أَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِما قَذَراً أَوْ أَذىً﴾ رواه أحمد وأبوداود

بسند صالح، پێغـەمبەرﷺ جـەماعەتی دەکردو لە ناو نوێژدا کەوشەکانی داکەندن، جا کە نوێژی تـەواو کرد، فـەرمووی: (جبریل) پـێی گوتم: کەوشـەکانت چڵکنن، یان پیسییان پێوەیە، بۆیێ دامکەندن. مەبەست بەو چڵکنە: یان چڵکنێکیپاکە: وەك چڵمو بەڵغـەم، یان پیسیەکی لێبوردراوە، هەروەك سەرچاوەکان ڕوونیـان کردۆتـەوە، واتـە: بـۆیێ ڕەفتـار بـە فەرموودەکەیکۆن ناکرێ: کە بە بەڵگەی ئەو حەدیسە نوێژ دووبارە ناکاتەوە.

﴿ئاگـاداری﴾: ئـەو حەدیسـە بەڵگەیـە: کـە نوێـژ بـە پـێڵاوەوە دروسـتە، بەومەرجـەی پێڵاوەکە پاك بـێ، هـەروەك لـە (المجموع)دا فەرموویـەتی، واتـە: نوێـژکردن بـە پـێڵاوی پیسەوە دروست نیە، هەروەك لە مـەرجی پێنجـەمی ئـەم باسـەدا ڕوون کـراوە، هـەروەها مەرجێکیتریش پێویستە: کە بنی پێڵاوەکە –وەکو کەوشـەکانی سـەردەمیپێغەمبەرﷺ– نەرم بێو لە سوجدەدا بچەمێتەوە، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ﷜ فِي صِـفَةِ صَلاةِالنَّبِيِّﷺ: فَإِذا سَجَدَ إِسْتَقْبَلَ بِأَطْرافِ أَصابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ﴾رواهالبخاری، کە پێغەمبەرﷺ سـوجدەی دەبـرد، سـەرەپەنجەی پـێیەکانی ڕوو لەقیبلـە دەکـردن. واتـە: ئەگـەر بنـی پێڵاوەکەی ڕەق بێ: وەك قاڵتاغو پۆتینو کڵاش، ئەوە نوێژی پێوە دروست نیە، چونکە پـێی وەك لە ناو سندوقێکدا بێ وەهایـە، چونکە زگـی پەنجـەکانی لـە زەمـین گیرنـابێو سـەرەپەنجەکانی بـەرەو قیبلـە نـابنو نوێژەکـەی دروسـت نـابێ، هـەروەك لـە کۆتـایی سوجدەدا ڕوونمان کردەوە.

(وَإِنْ عَلِمَ) ئەگەر لە پێش نوێژدابەستندا، زانی پیسیەکی پێوەیە (ثُمَّ نَسِيَ) ئینجا لە بیری کـردو نوێـژی پێـوەکرد (وَجَـبَ الْقَضَـاءُ) دیسـان واجبـە: نوێژەکـە دووبـارە بکاتـەوە (عَلَىٰ الْمَذهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، جیاوازی نیە، لە دوایـنوێـژ پیسیەکە ئاشکرا ببێ، یان لە ناو نوێژدا، هەروەك باسمان کرد،.

ئینجا بزانە: هەر کاتێ دیتی پیسیەکی پێوەیە، ئەگەر دەگونجا لە دوایـنوێژ ئەو پیسیەی پێکەوتبێ، ئەوە دووبارەکردنەوەی نوێژ واجب نیـە، بـەڵام ئەگـەر زانـی ماوەیەکـە ئـەو پیسیەی پێوەیـە، ئـەو کاتـە هـەر نوێـژێکی بـەو پیسـیەوەی کردبـێ، واجبـە: دووبـارەی بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر لە کاتی نوێژدابەستندا بێگومـان بـوو: کـە هـەر پێـنج مەرجـەکانی نوێژی تەواون، بەڵام لە دوایـسەلامدانەوە کەوتە گومان لە نەمانی مەرجێك لە مەرجەکانی نوێژ، ئەو گومانە کار لە نوێژکە ناکاو دووبارەکردنەوەی ناوێ لە فـەرموودەی بـەهێزتردا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا لە باسی سوجدەیسەهوو ڕوون کراوەتەوە.

(فَصْلٌ) تَبْطُلُ بِالنُّطْقِ بِحَرْفَيْنِ أَو حَرْف مُفهِم، وَكَذَا مَدَّةٌ بَعْدَ حَرْف فِي الْأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ أَنَّ التَّنَحْنُحَ وَالضَّحِكَ وَالْبُكَاءَ وَالأَنِينَ وَالنَّفْخَ إِنْ ظَهَرَ بِهِ حَرْفَانِ بَطَلَتْ وَإِلاَّ فَلاَ، وَيُعْذَرُ فِي يَسِيرِ الْكَلَامِ إِنْ سَبَقَ لِسَانُهُ أَوْ نَسِيَ الصَّلَاةَ أَوْ جَهِلَ تَحْرِيمَهُ إِنْ قَرُبَ عَهْدُهُ بِالإِسْلَامِ،

---

جا ئەگەر گومان نەبو، بەڵكو لە دوایسەلامدانەوە بێگومان زانی مەرجێكی ناتەواو بووە، ئەو كاتە واجبە نوێژەكە دووبارە بكاتەوە، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەوە، تا ئێرە بە درێژی ڕوونمان كردەوە، والحمد لله تعالى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەكەن ﴾

(تَبْطُلُ) نوێژ بەتاڵ دەبێ (بِالنُّطْقِ) بە قسەكردنی بە قەسدی (بِحَرْفَيْنِ) بە دوو پیت: وەك ناو، نەء، هات، بۆ، نۆ، (أَوْ حَرْفٍ مُفْهِمٍ) یان تەنها پیتێك بێو واتەیەك بدا: وەك نا، ها، با، یان زیاتر لە دوو پیت بێ، هەر چەند قسەكردنەكەش بۆ بەرژەوەندی نوێژ بێ، هەر بەتاڵ دەبێ ﴿عَنْ زَيْد بِنِ أَرْقَم ﷺ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاةِ حتَّى نَزَلَتْ: (وَقُومُوا لِلّه قَانِتِينَ). فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ وَنُهِينا عَنِ الْكَلامِ﴾ رواه الشيخان، ئێمە لە ناو نوێژدا قسەمان لەگەڵ یەكتری دەكرد، تا ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە كە خوا فەرمویێ: (لە ناو نوێژدا بە ملكەچی بۆ خوا ڕابوەستن)، ئینجا فەرمانمان پیكرا: لە ناو نوێژدا بێدەنگ بینو قسە نەكەین.

(وكَذا مَدَّةٌ بَعْدَ حَرْفٍ) هەروەها درێژكردنەوەی پیتێك نوێژ بەتاڵ دەكا، هەر چەند واتەیەكیش نەدا، وەك بڵێ: وا، وو، وی (فِي الأصح) لە فەرموودەی ڕاستردا.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ التَّنَحْنُحَ) كۆكە (وَالضَّحِكَ) پێكەنین (وَالْبُكَاءَ) گریان (وَالأنِينَ) ناڵەناڵ (وَالنَّفْخَ) فووكردن، هەروەهاش باوشكانو پژمین (إِنْ ظَهَرَتْ بِهِ حَرْفَانِ) ئەگەر بە هەر یەكێك لەوانە دوو پیت ئاشكرا ببن (بَطَلَتْ) نوێژەكە بەتاڵ دەبێ (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر دوو پیت ئاشكرا نەبن: وەك زەردەخەنەو فرمێسك هاتنو كۆكەی بێ پیت (فَلا) نوێژەكە بەتاڵ نابێ.

(وَيُعْذَر) نوێژكەر عوزری دەدرێتێ (فِي يَسِيرِالْكَلامِ) لە قسەكردنێكی كەم: وەك دوو، یان سێ ووشەی عادەتی، واتە: نوێژەكە بەتاڵ نابێ (إِنْ) ئەگەر بە قەسدی نەبێ، بەڵكو بە بێویستیخۆی (سَبَقَ لِسانُهُ) قسەكەی لە دەمی دەرچو (أَوْ نَسِيَ الصَّلاةَ) یان لەبیری كرد كە لە نوێژدایە بۆیێ قسەی كرد (أَوْ جَهِلَ تَحْرِيمَهُ) یان نەیزانی قسەكردن حەرامە (إِنْ قَرُبَ عَهْدُهُ بِالإِسْلامِ) بەو مەرجەی تازە موسڵمان بوبێ بۆیێ نەیزانی حەرامە، یان لە زانایانی ئایینی دوور بوو، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (مُعاوية)ی‌دا هاتوو،

هەم ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: صَلَّى لَنا رَسُولُ الله ﷺ صَلاةَ الْعَصْرِ فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ، فَقالَ ذُوالْيَدَيْنِ: أَقُصِرَتِ الصَّلاةُ أَمْ نَسِيتَ يا رَسُولَ الله؟ فَقالَ ﷺ: كُلُّ ذلِكَ لَمْ يَكُنْ. فَقالَ: قَدْ

لاَ كَثيرِه فِيالأَصَحِّ، وَفِيالتَّنَحْنُحِ وَنَحْوِه لِلغَلَبَة وَتَعَذُّرِالقِراءَة، لاَ الْجَهْرِ فِيالأَصَحِّ، وَلَوْ أُكْرِهَ عَلىالكَلاَمِ بَطَلَتْ فِيالأَظْهَرِ، وَلَوْ نَطَقَ بِنَظْمِ الْقُرْآنِ بِقَصْدِ التَّفْهِيمِ كَيَا يَحْيَى خُذالْكِتَابَ.

---

كانَ بَعْضُ ذلكَ. فَقالَﷺ: أَصَدَقَ ذُوالْيَدَيْنِ؟ قالُوا: نَعَمْ. فَأَتَمَّﷺ مابَقِيَ مِنَ الصَّلاةِ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ نوێژی عەسری بە جەماعەت بۆ کردین، کە دوو ڕەکعەتی کردن سەلامی داوە، جا (ذُوالْيَدَيْنِ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ کورت کراوەتەوە، یان لەبیرت کرد تەواوی بکەی؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچێکیان نەبوە، گوتی: بێگومان یەکێکیان بووە. جا پێغەمبەرﷺ بە سەحابەکانی فەرموو: ئایا (ذُوالْيَدَيْنِ) ڕاستی کرد؟ گوتیان: بەڵێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ دوو ڕکعەتەکەیتریشی تەواو کردن. واتە: بەو قسەکردنە نوێژی هیچیان بەتاڵ نەبو، چونکە وایان زانی: لە نوێژدا نەماون‌و قسەکانیشیان کەم بوو.

کەوابو: (لاكَثِيرِهِ) لە قسەکردنێکیزۆردا –کە لە شەش ووشە زیاتر بێ– عوزری نادرێتی‌و نوێژی بەتاڵ دەبێ لە هەر سێك مەسەلەی ڕابردوودا (فِيالأصح) لە فەرموودەی ڕاستردا، هەروەك لە حاشیەی (القليوبي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِيالتَّنَحْنُحِ) هەروەها نوێژکەر عوزری دەدرێتێ: لە کەمێکی کۆکەو (وَنَحْوِهِ) لە کەمێکی ئەوانیتریش: وەکو پژمین‌و گریان‌و باوشکان، ئەگەر دوو پیتیش ئاشکرا بن (لِلْغَلَبَةِ) بە هۆی زاڵبوونی ئەو ڕووداوانە بە سەر نوێژکەرەکەدا: کە نەتوانێ بیانگەڕێنێتەوە (وَتَعَذُّرِ الْقِراءَةِ) هەروەها عوزری دەدرێتێ لە تەنها کەمێك کۆکەی بە پیت بۆ خوێندنی واجبەکانی نوێژ، واتە: تاکو بە هۆی کۆکە پشووی بێ‌و بتوانێ واجبەکان بخوێنێ (لاَالْجَهْرِ) بەلام عوزری نادرێتێ لە کۆکەی بە پیت بۆ دەنگ هەڵێنانیخوێندن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە دەنگ هەڵێنان واجب نیە، کەوابو: بۆ سوننەتەکانیتری نوێژیش عوزری نادرێتێ.

(وَلَوْ أُكْرِهَ) ئەگەر نوێژکەر زۆری لێکرا (عَلىالْكَلاَمِ) تاکو قسە بکا، ئەویش بە هۆی زۆرلێکردنەکە قسەی کرد (بَطَلَتْ) نوێژکەی بەتاڵ دەبێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها هەر کردارێکیتر: کە دژی نوێژ بێ‌و زۆری لێبکرێ‌و ئەویش بە هۆی زۆرلێکردنەکە بیکا نوێژی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (المجموع) دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ نَطَقَ بِنَظْمِ الْقُرْآنِ) ئەگەر لە ناو نوێژدا ئایەتێکی قورئانی خوێند، یان زیکرێکیتری گوت (بِقَصْدِالتَّفْهِيمِ) بە مەبەستی تێگەیاندنی کەسێکیتر (كَ) وەکو ئایەتی ﴿يَا يَحْيَى خُذِ الْكِتَابَ﴾ بخوێنێ بۆ کەسێك کە داوای ئیزندانی بردنی شتێك بکا، یان ئایەتی ﴿أُدْخُلُوها

إِنْ قَصَدَ مَعَهُ قِرَاءَةً لَمْ تَبْطُلْ وَإِلاَّ بَطَلَتْ، وَلاَ تَبْطُلُ بِالذِّكْرِ وَالدُّعَاءِ إِلاَّ أَنْ يُخَاطِبَ كَقَوْلِه لِعَاطِسٍ: يَرْحَمُكَ اللهُ.

---

بِسَلامٍ آمِنينَ﴾ بخوێنێ بۆ کەسێك کە داوای ئیزنی هاتنە ژوورەوە بکا، یان ئیمامەکە خوێندنی فاتیحە، یان سورەتی لێ تێك بچێو پێیبڵێتەوە، یان سەهوو بکاو بە (سُبْحَانَ اللهِ) ئاگاداری بکاتەوە، ئەوە (إِنْ قَصَدَ مَعَهُ قِراءَةً) ئەگەر نوێژکەرەکە لەگەڵ ئەو تێگەیاندنانەدا مەبەستیشی زیکر، یان قورئانخوێندن بێ (لَمْ تَبْطُلْ) نوێژەکەی بەتاڵ نابێ (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر مەبەستی تەنها تێگەیاندن بوو (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ.

ئینجا بزانە: گەیاندنی جموجۆڵی ئیمام بە مەئموومەکان: بە دەنگ بەرزکردنەوەی (الله أكبر)و (سَمِعَ اللهُ)، هەمان بڕیاریڕابردووی بۆ دەدرێ، واتە: ئەگەر مەبەستی گەیاندنو زیکر بێ، نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، ئەگەر مەبەستی تەنها گەیاندن بێ، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، چونکە ئەگەر دەنگی ئیمام بگاتە مەئموومەکان، ئەو کاتە بە یەکدەنگی هەر چوار ئیمامەکانی سەر مەزهەب ئەو گەیاندنە (بِدْعَة)یەکی ناپەسندە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، واتە: بەڵام ئەگەر دەنگی ئیمام نەدەگەیشتە مەئموومەکان، ئەو کاتە گەیاندنەکە سوننەتە، هەروەك لە دووەم سیفەتەکانی ئیمامینوێژدا بە حەدیسەکەی ئیمامی(أبوبكر﷜) بەڵگەی بۆ دێنین، ان شاء الله تعالى.

(وَلاتَبْطُلُ) نوێژ بەتاڵ نابێ (بِالذِّكر وَالدُّعاءِ) بە زیکرو دوعاکردن، بەو مەرجەی دوعایەکەی دروست بێو بە عەرەبی بێو قسەی ڕووبەڕووی دروستکراوی خوایگەورەش نەبێ، هەروەك دەفەرموێ: (إلاّ أنْ يُخاطِبَ) مەگەر بە دوعایەکەی گفتوگۆی ڕووبەڕوو بکا (كَقَولِـه لِعاطِسٍ) وەك بڵێتە یەکێکی پژمیو (يَرْحَمُكَ اللهُ)، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، چونکە گفتوگۆی ڕووبەڕووی کردوە ﴿عَنْ مُعاوِيَةَ بن الْحَكَمْ﷜: عَطَسَ رَجُلٌ فَقُلْتُ لَهُ -وَأنا أُصَلِّي- يَرحَمُكَ اللهُ. فَرَماني الْقَوْمُ بِأَبْصارِهِمْ، فَقُلْتُ: وَا ثُكْلَ أُمِّياه مَاشَأْنُكُمْ تَنظُرُونَ إلَيَّ؟ فَجَعَلُوا يَضرِبُونَ بِأَيْدِيهِم عَلىأَفْخاذِهِمْ يُصَمِّتُونَنِي، فَلَمّا صَلّى رَسُولُ اللهِ ﷺ قالَ: إنَّ هذِهِ الصَّلاةَ لايَصْلُحُ فِيها شَيْءٌ مِنْ كَلامِ النَّاسِ...﴾ الحديث رواه مسلم، (معاوية) دەفەرموێ: نوێژم دەکرد، پیاوێك پژمیو پێم گوت: (يَرْحَمُكَ اللهُ). جا یەکسەر سەحابەکان تەماشایان کردم، منیش گوتم: هەی دایکەڕۆ بۆ تەماشام دەکەن؟ ئەم جارە دەستیان لە ڕانی خۆیان دەدا تاکو بێدەنگ ببم و نوێژم بەتاڵ نەبێ، ئینجا پێغەمبەرﷺ نوێژی تەواو کردو فەرمووی: لە ناو ئەو نوێژەدا ناگونجێ هیچ جۆرە گفتوگۆیەکی ئادەمیزادان بکرێ. واتە: نوێژی پێبەتاڵ دەبێ، بەڵام بۆیێ نوێژی(معاوية) بەو قسانە بەتاڵ نەبو، چونکە تازە موسڵمان بوبو، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

وَلَوْ سَكَتَ طَوِيلاً بِلاَ غَرَضٍ لَمْ تَبْطُلْ فِي الأَصَحِّ، وَيُسَنُّ لِمَنْ نَابَهُ شَيْءٌ كَتَنْبِيهِ إِمَامِـهِ وَإِذْنِه لِدَاخِلٍ وَإِنْذَارِهِ أَعْمَى: أَنْ يُسَبِّحَ، وَتُصَفِّقُ الْمَرْأَةُ بِضَرْبِ الْيَمِينِ عَلَى ظَهْرِ الْيَسَارِ، وَلَوْ فَعَلَ فِي صَلاَتِهِ غَيْرَهَا إِنْ كَانَ مِنْ جِنْسِهَا بَطَلَتْ

---

هەروەها گفتوگۆی ڕووبەڕووی خواو پێغەمبەرﷺ نوێژ بەتاڵ ناکا، چونکە لە (فاتِحَة)و (اَلتَّحِيّات)دا هاتوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ سَكَتَ طَوِيلاً) ئەگەر لە ناو نوێژدا زۆر بێدەنگ بوو (بِلاَغَرَضٍ) بە بێهیچ هۆیەك (لَمْ تَبْطُل) نوێژەکەی بەتاڵ نابێ (عَلَى الصَّحِيح) لەسەر فەرموودەی ڕاست، بەڵام ئەگەر بێدەنگبوونەکە لە ناو (فاتيحة)دا بوو، ئەو کاتە واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە (فاتيحة) بکاتەوە، چونکە لێك پچڕاوە، هەروەك لە باسی (فاتيحة)دا ڕوون کراوە.

## ﴿ بەسەرهاتنی ڕووداوێك لە ناو نوێژدا ﴾

(وَيُسَنُّ) سوننەتە (لِمَنْ نابَهُ شَيْءٌ) بۆ ئەو کەسەی شتێکی لێڕوبدا لە ناو نوێژدا (كَتَنْبِيهِ إِمامِهِ) وەك بیەوێ ئیمامی‌نوێژەکەی ئاگادار بکاتەوە لە کاتی سەهووکردندا (وَإِذْنِهِ لِداخِلٍ) یان ئیزن بداتە یەکێك تاکو بێتە ژوورەوە (وَإِنْذارِهِ أَعْمى) یان کوێرێك، یان بێئاگایەك، یان منداڵێك لە مەترسیەك ئاگادار بکاتەوە (أَنْ يُسَبِّحَ) سوننەتە بڵێ: (سُبْحانَ الله). بە مەبەستی زیکرو ئاگادارکردنەوە ئەگەر نوێژکەرەکە پیاو بوو، بەڵام (وَتُصَفِّقُ الْمَرْأَةُ) سوننەتە لەو بەسەرهاتانەدا: ئافرەت چەپڵە لێبدا لە ناو نوێژدا (بِضَرْبِ الْيَمِينِ عَلى ظَهْرِ الْيَسارِ) بە لێدانی بەرەدەستی ڕاستە لە پشتەدەستی چەپە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ وَإِنَّما التَّصْفِيقُ لِلنِّساءِ﴾ رواه‌الشيخان، هەر کەسێك لە ناو نوێژدا شتێکی لێڕوودا، با بڵێ: (سُبْحانَ الله). چونکە چەپڵە بۆ ئافرەتانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە ناو نوێژدا دیتی یەکێك نزیکە بکەوێتە ناو بیرێك، یان بکەوێتە ناو ئاگرێك، یان ستەمکارێك، یان دڕندەیەك ئازاری بدا...هتد، نەشدەگونجا بە (سُبْحانَ الله)و چەپڵە ئاگادار بکرێتەوە، ئەو کات واجبە: یان بە کردار، یان بە قسەکردن ئاگاداری بکاتەوە، بەڵام نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ‌و واجبە: دووبارەی بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ جموجۆڵ لە ناو نوێژدا ﴾

(وَلَوْ فَعَلَ فِي الصَّلاةِ) ئەگەر لە ناو نوێژدا بە قەسدی کردارێکی کرد (غَيْرَها) جگە لە کردارەکانی نوێژ (إِنْ كَانَ مِنْ جِنْسِها) ئەگەر کردارەکە لە چەشنی کردارەکانی نوێژ بوو: وەك ڕوکووعێك، یان سوجدەیەك، یان دانیشتنێك بە قەسدی زیاد بکا (بَطَلَتْ) نوێژەکە بەتاڵ دەبێ، چونکە بە گاڵتە کردویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ

إلاَّ أَنْ يَنْسى، وَإلاَّ فَتبْطُلْ بكَثيرِهِ لاَ قَليلِه، وَالْكَثْرَةُ بِالْعُرْف، فَالْخَطْوَتَانِ أَوِ الضَّـرْبَتَانِ قَليلٌ وَالثَّلاَثُ كَثيرٌ إنْ تَوَالَتْ،

---

عَلَيهِ أَمْرُنا فَهُوَ رَدٌّ﴾ رواهمسلم، هەركەسێك لە ئاییندا کردارێك بکا: کە فەرمانی ئێمەی لـە سەر نەبێ، لێی قبول ناکرێو دەدرێتەوە بە سەریا.

(إلاّ أنْ يَنْسَى) مەگەر لـە بیر بکـا کـە لـە نوێژدایـە، یـان نـەزانێ حەرامـە، چـونکە تـازە موسڵمان بوو، یان لە زانایان دوور بوو، یان سەهوو بکا، ئەو کاتە نوێژەکەی بـەتاڵ نـابێ چونکە عـوزری بەدەسـتە ﴿عَنْ عبداللهﷺ: صَلَّى النَّبِيُّﷺ الظُّهْرَ خَمْساً، فَقَالُوا لَهُ: صَـلَّيْتَ خَمْساً؟ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواهالشیخان، پێغەمبـەرﷺ بـە سـەهوو نوێـژی‌نیوەڕۆی پێنج ڕەکعەت کرد، جا کە پێیان گوت: پێنج ڕەکعـەتت کـردن، یەکسـەر دوو سـوجدەی سەهووی بردن، ئینجا سەلامی داوە. واتە: چـونکە ڕەکعـەتی پێنجـەمی بـە سـەهوو زیـاد کردبو: نوێژەکەی بەتاڵ نەبو. هەروەها ئەگەر مەئمووم بە هۆی شوێنکەوتنی ئیمامەکەی سوجدە، یان دانیشتنی تەحیات، یان ڕاوەستانی قونووت زیاد بکا، زیـانی نیـە، هـەروەك لە باسی نوێژی جەماعەتدا ڕوونی دەکەینەوە ان شاء الله تعالی.

(وَإلاّ) بەڵام ئەگەر کردارەکە لە چەشنی کردارەکـانی نوێـژ نـەبو: وەك لێدان و ڕۆیشـتن‌و جموجۆڵی‌تر (فَتَبْطُـلُ بِكَـثيرِهِ) بـە کردارێکـی زۆر نوێـژ بـەتاڵ دەبـێ (لاقَليلِهِ) بـەڵام بـە کردارێکی‌کەم بەتاڵ نابێ، بەو مەرجەی مەبەستی گاڵتەکردن نەبێ، ئەگینا: بە کردارێکـی کەمیش بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَالْكَثْرَةُ) زۆری‌و کەمی کردارەکە (بِالْعُرْف) بە گوێرەی‌عادەت دەزاندرێ: کە لـە حەدیسـە صەحیحەکان وەرگیراوە، بۆ نموونـە: ﴿عَنْ أَبِيقَتادَةَﷺ رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ حاملاً أُمامَـةَ بِنْـتَ زَيْنَبَ وَهُوَ يُصَلِّي، فَإذا رَكَعَ وَضَعَها وَ إِذا رَفَعَ مِنَ السُّـجُودِ أَعادَهـا﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرمﷺ دیت نوێژی دەکردو (أُمامة)ی کیژی (زينب)ی کیژی‌خۆی هەڵگرتبو، جـا کـە دەچووە ڕوکووع دایدەنا، کە لە سوجدە هەڵدەستاوە هەڵیدەگرتـەوە. واتـە: هـەر چـەند جمووجۆڵەکەی پێغەمبەرﷺ زۆر بوو، بەڵام چونکە بەدوای یەکدا نەبو، بەگوێرەی عـادەت بە کەم دادەندرێ، هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە: لە نـاو نوێژیشـدا مـار و دووپشـك بکوژرێن‌و ئەو کەسەش بگەڕێندرێتەوە: کە بیەوێ بە پێش نوێژکەردا ڕابرێ.

ئینجا هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسانە: (فَالْخَطْوَتـانِ) دوو هـەنگاو (أوِ الضَّرْبَتانِ) یـان دوو لێدان (قَلِيلٌ) کەمەو نوێژ بەتاڵ ناکا (وَالثَّلاثُ) سـێ هـەنگاو، یـان سـێ لێـدان، یـان سـێ جموجۆڵی‌تر: جا بە هەر ئەندامێك بێ (كَثيرٌ) زۆرەو نوێژ بەتاڵ دەکا (إنْ تَوالَتْ) ئەگەر بە دوای یەکدا بێ، بەڵام ئەگەر بەدوای‌یەکدا نەبێ، هەر بە کەم دادەندرێ، هەر چەند لە سێ

وَتَبْطُلُ بِالْوَثْبَةِ الْفَاحِشَةِ، لاَالْحَرَكَاتِ الْخَفِيفَةِ الْمُتَوَالِيَةِ كَتَحْرِيكِ أَصَابِعِهِ فِي سُبْحَةٍ أَوْ حَكٍّ فِي الْأَصَحِّ،

---

كرداريش زياتر بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (أمامة)ی‌ڕابردوو، کەوابو: ئەگەر لە ناو نوێژدا تەماشای قورئان بکاو بیخوێنێ‌و جار جارەش پەڕەکانی وەربگێڕێ، دروستەو نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، چونکە جموجۆڵەکەی بەدوای یەکدا نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ڕۆیشتنی یەك دەست‌و هاتنەوەی بەدوای‌یەکدا هەردووکی بە یەك جار دادەندرێ، واتە: ئەگەر بەدوای یەکدا نەبێ دووجارە، هەروەها هی هەردوو دەستیش بە دوو جار دادەندرێ، جا لەگەڵ یەکدا بن، یان بەدوای یەکدا بن، هەروەها گواستنەوەی یەك پێ جارێکەو هی پێ‌یەکەی‌تریش جارێکی‌ترەو دەبێتە دوو جار، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها ڕۆیشتنی یەك پێ‌و گەڕانەوەیشی ئەویش دووجارە چونکە جولەی پێ‌و دەست جیاوازە، هەروەك لە (بجيرمی)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێکدا هاتوە: ﴿عَنْ عائشة رضي الله عنها قَالَتْ: جِئْتُ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي فِي الْبَيْتِ وَالْبابُ عَلَيْهِ مُغْلَقٌ، فَمَشَى حَتَّى فَتَحَ لِي ثُمَّ رَجَعَ إِلى مَكانِهِ، وَوَصَفَتِ الْبَابَ فِي الْقِبْلَةِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، (عائشة) فەرمووی: هاتمەوە ماڵ لەو کاتدا پێغەمبەر ﷺ نوێژی سوننەتی دەکردو دەرگاش کلیل درابو، پێغەمبەر ﷺ هات دەرگای کردەوەو گەڕاوە شوێنی خۆی، دەرگاکەش لە لای قیبلە بوو.

ئەم حەدیسە نابێتە بەڵگە: کە لە دوو هەنگاو زیاتر لە ناو نوێژدا دروست بێ؟ چونکە ژوورەکەی حەزرەتی(عائشة) بچووك بوو، دەرگاش لە لای قیبلە بوو و دەگونجێ بە یەك هەنگاو گەیشتبێتە دەرگاکە، واتە: هەر ئەو ژوورە بووە: کە ئێستا گۆڕی پێغەمبەری ﷺ تێدایە، جگە لەوەش نوێژەکەی سوننەت بوو، هەروەك لە ڕیوایەتێکدا هاتوە،والله أعلم.

(وَتَبْطُلُ) نوێژ بەتاڵ دەبێ (بِالْوَثْبَةِ الْفاحِشَةِ) بە یەك خۆ هەڵدانی ناشیرن (لاَالْحَرَكاتِ الْخَفِيفَةِ) بەڵام نوێژ بەتاڵ نابێ بە جولەجولی سووك (الْمُتَوالِيَةِ) کە بە دوای یەکدا بن، هەرچەند زۆریش بن (كَتَحْرِيكِ أَصابِعِهِ) وەك پەنجەکانی بجولێنێ (فِي سُبْحَةٍ) لە تەسبیحات کردندا (أَوْ حَكٍّ) یان لە خۆخوراندندا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، بەو مەرجەی لەپەدەستی لەگەڵ نەجولێنێ، ئەگینا: بە سێ جار نوێژ بەتاڵ دەبێ.

هەروەها جولاندنی لێو و زوبان‌و پێڵووەچاو و گوێ گشتی وەکو پەنجە وایەو نوێژ بەتاڵ ناکا، هەرچەند زۆریش بێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَسَهْوُ الْفِعْلِ كَعَمْدِه فِي الأَصَحِّ، وَتَبْطلُ بِقَلِيلِ الأَكْلِ، قُلْتُ: إلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاسِياً أَوْ جَاهِلاً تَحْرِيمَهُ وَاللهُ أَعْلَمُ، فَلَوْ كَانَ بِفَمِه سُكَّرَةٌ فَبَلِعَ ذَوْبَهَا بَطَلَتْ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَسَهْوُ الْفِعْلِ) به سههووكردنی ئهو جۆره كردارهی نوێژ بهتاڵ دهكا: له بهر زۆری، یان له بهر ناشیرنی (كَعَمْدِه) وهك كرداری به قهسدی وایه، واته: ئهگهر به سههوو، یان به نهزانی كردارێكی زۆر، یان ناشیرن بكا، نوێژی بهتاڵ دهبێ (فِي الأَصَحِّ) له فهرموودهی ڕاستتردا، چونكه ئهو جۆره سههووانه له ناو نوێژدا كهم ڕوو دهدهن.

﴿ خواردن و خواردنهوه له ناو نوێژدا ﴾

(وَتَبْطلُ) نوێژ بهتاڵ دهبێ (بِقَلِيلِ الأَكْلِ) به خواردهمهنیو خواردنهوهیهكی كهم، ههرچهند دهنكه كونجیهكیش بێ، چونكه خواردنو خواردنهوه ڕۆژوو بهتاڵ دهكهن-كه به كرداروگوفتار بهتاڵ نابێ- كهوابو: نوێژ له پێشتره بۆ بهتاڵبوون، چونكه *(ههر شتێك ڕۆژوو بهتاڵ بكا، نوێژیش بهتاڵ دهكا)*، ههروهك له (المجموع) دا فهرموویهتی، كهوابو: به كافربوونیش نوێژ بهتاڵ دهبێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دهفهرموێ (إلاَّ أَنْ يَكُونَ نَاسِياً) مهگهر له بیری بچێ كه له نوێژدایه (أَوْ جَاهِلاً تَحْرِيمَهُ) یان نهزانێ كه خواردنو خواردنهوه له ناو نوێژدا حهرامه؟ چونكه تازه موسڵمان بوو، یان له زانایانی ئایینی دوور بوو، ئهوانه به كهمێك خواردن، یان خواردنهوه نوێژهكانیان بهتاڵ نابێ (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بهڵام ئهگهر خواردن، یان خواردنهوهكه به گوێرهی عادهت زۆر بوو، ئهوه له ههموو حاڵهتێكدا نوێژهكانیان بهتاڵ دهكا، ههروهك له سهرچاوهكاندا فهرموویانه.

(فَلَوْ كَانَ بِفَمِه سُكَّرَةٌ) ئهگهر پارچه شهكرێكی له ناو دهمیدا بوو و تاواوه (فَبَلِعَ ذَوْبَهَا) جا له ناو نوێژدا به قهسدی تاواوهكهی قووتدا (بَطَلَتْ) نوێژهكهی بهتاڵ دهبێ (فِي الأَصَحِّ) له فهرموودهی ڕاستتردا، ههروهها ئهگهر چڵم دابهزێته ناو دهمیو به قهسدی قووتی بدا نوێژی بهتاڵ دهبێ، ههروهك له (تحفة)دا فهرموویهتی، بهڵام ئهگهر به قهسدی نهبو: وهك به بێویستی خۆی بڕواته خوارهوه، یان پاشماوهی نێوان ددانهكانی لهگهڵ تف تێكهڵ ببێو نهتوانێ لێكی جیا بكاتهوه، یان تامی خواردنو چایه قووت بداتهوه، ئهوانه هیچیان زیانیان نیه، ههروهك له (نهاية)و (الشبراملسی)دا ڕوون كراوهتهوه.

ههروهها ئهگهر بهڵغهم هاته ناو دهمیو دووباره قووتیداوه نوێژهكهی بهتاڵ دهبێ، بهڵام به قووتدانی تفی ناو دهم بهتاڵ نابێ، ههروهك له باسی ڕۆژوودا ڕوونی دهكهینهوه، إن شاءالله تعالى، ههروهها به نهمانی مهرجێك له مهرجهكانی نوێژ، نوێژهكه بهتاڵ دهبێ، ههروهك به درێژی ڕوونمان كردهوه. والحمدلله تعالى.

وَيُسَنُّ لِلْمُصَلِّي إِلى جِدَارٍ أَوْ سَارِيَةٍ أَوْ عَصاً مَغْرُوزَةٍ أَوْ بَسَطَ مُصَلًّى أَوْ خَطَّ قُبَالَتَهُ: دَفْعُ الْمَارِّ، وَالصَّحِيحُ تَحْرِيمُ الْمُرُورِ حِينَئِذٍ،

## ﴿ باسی (سُتْرَة): پێش سوجدەی نوێژکەر ﴾

(وَيُسَنُّ) سوننەتە (لِلْمُصَلِّي) بۆ نوێژکەر: (إِلى جِدارٍ) ڕوو بکاتە دیوارێك (أَوْ سارِيَةٍ) یان کۆڵەکەیەك (أَوْ عَصاً مَغْرُوزَةٍ) یان دارعەسایەکی چەقێندراو، یان شتێکیتر (أَوْ بَسَطَ مُصَلًّى) یان بەرماڵێکی ڕاخستبێ‌و نوێژی لە سەر بکا (أَو خَطَّ قُبالَتَهُ) یان هێڵێکی لە پێش خۆی ڕاکێشابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَل تِلْقاءَ وَجْهِهِ شَيْئاً فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَنْصِبْ عَصاً فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَلْيَخُطَّ خَطّاً ثُمَّ لايَضُرُّه مَنْ مَرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ رواه أحمد وأبوداود وصححه إبن حبان، هەر کاتێ یەکێکتان نوێژی کرد، با شتێك لە پێش سوجدەی خۆی دابنێ، ئەگەر هیچی دەست نەکەوت با دارعەسایەك لە پێش خۆی بچەقێنێ، ئەگەر نەبو: با هێڵێك لە پێش خۆی بکێشێ، ئینجا هەر کەسێ بە پێشیدا ڕاببرێ زیان لە نوێژەکەی نادا.

ئینجا کە نوێژکەر یەکێکی لەوانەی‌ڕابردووی لە پێش سوجدەی دانا، سوننەتە: (دَفْعُ الْمارِّ) ئەو کەسە بگەڕێنێتەوە: کە دەیەوێ لە نێوان ئەوی‌و پێش سوجدەکەی‌دا ڕاببرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەوها فەرمانی داوەو ڕابرەکەشی بە شەیتان داناوە (بخاري و مسلم) گێڕاویەتیانەوە. (وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست (تَحْرِيمُ الْمُرُورِ حِينَئِذٍ) ڕابردن بەپێش نوێژکەردا حەرامە لەو کاتەی (سُتْرَة): پێش سوجدەی دانابێ، بەڵام نوێژەکە بەتاڵ نابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَوْ يَعْلَمُ الْمارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي ماذا عَلَيْهِ لَكانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْراً مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ رواه الشيخان، ئەگەر ئەو کەسەی لە پێش سوجدەی نوێژکەردا ڕادەبرێ بزانێ چەندی گوناە لە سەر دەنووسرێ، چل ساڵ ڕاوەستێ باشترە لەوەی بە پێشی‌دا ڕاببرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: مەرجە نێوان پێش سوجدەکەو پێیەکانی‌نوێژکەرەکە لە سێ گەز، واتە: مترو نیوێك زیاتر نەبێ، ئینجا ئەگەر نوێژکەر ئەو (سُترة)=پێش سوجدەیەی دانەنابو: ئەو کاتە ڕابردن حەرام نیەو نوێژیش بەتاڵ نابێ، هەروەك لە حاڵەتی‌دانانیشدا بەتاڵ نابێ، کەوابو: ئەو حەدیسانەی دەفەرموون: ﴿ئافرەت‌و کەرو سەگ نوێژ دەبڕن﴾. مەبەست ملکەچی‌یە لە نوێژدا، چونکە بیری لە سەر نوێژ لادەچێ، واتە: مەبەست بڕینی خودی نوێژەکە نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها نوێژکردن بەرەو ڕوی خەوتوو ناپەسند نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

قُلْتُ: يُكْرَهُ الإلْتِفَاتُ لاَلِحَاجَةٍ، وَرَفْعُ بَصَرِهِ إلىالسَّماءِ، وَكَفُّ شَعَرِهِ أَوْ ثَوْبِهِ، وَوَضْعُ يَدِهِ عَلَى فَمِهِ بلاَحَاجَةٍ،

---

## ﴿ باسی چەند جۆرە (مَكْرُوه)=ناپەسندێك كە نوێژ بەتاڵ ناكەن ﴾

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرمویّ (يُكْرَهُ الألْتِفاتُ) ناپەسندە ئاوڕدانەوە لە ناو نوێژدا بە سەر و ملەوە (لا لِحاجَةٍ) بەلاّم بۆ پێویستی ناپەسند نیە ﴿عَنْ عائشةَ رضي الله عنها سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الإلْتِفاتِ فِيالصَّلاةِ؟ فَقَالَ: هُوَ إخْتِلاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطانُ مِنْ صَلاةِ الْعَبْدِ﴾ رواه البخاری، پرسیارم لە پێغەمەر ﷺ کرد: لە ئاوڕدانەوەی ناو نوێژ؟ فەرمووی: ڕفاندنێکە شەیتان لە نوێژی بەندە دەیرفێنیّ. ئینجا بزانە ئەگەر لەگەڵ ئاوڕدانەوە سینگی خۆی لە قیبلە لادا، ئەو کاتە نوێژی بەتاڵ دەبیّ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَرَفْعُ بَصَرِهِ إلىالسَّماءِ) ناپەسندە چاوەکانی بەرەو ئاسمان بەرز بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصارَهُمْ إلىالسَّماءِ فِيالصَّلاةِ أَوْ لاتَرْجِعُ إلَيْهِمْ﴾ رواه مسلم، با واز بێنن ئەو کەسانەی لە نوێژدا چاویان بەرەو ئاسمان بەرزدەکەنەوە، یان چاوەکانیان نەگەڕێتەوە لایان، واتە: کوێر ببن.

هەروەها ناپەسندە لە نوێژدا تەماشای شتی وا بکا کە بیری لە سەر نوێژ لاببا، هەم ناپەسندە نوێژیشی لە سەر بکا، بۆیێ ناپەسندە میحراب و دیواری مزگەوت بڕازاندرێتەوە، لە سەرچاوەکاندا ئەم حەدیسەیان کردۆتە بەڵگە: ﴿عَنْ عائشةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلّى فِي خَمِيصَةٍ لَها أَعْلامٌ فقالَ: شَغَلَتْنِي أَعْلامُ هذه، إذْهَبُوا بِها الى أَبِيجَهْمٍ وَائْتُونِي بِإنْبِجانِيَّتِهِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەر ﷺ لە جلێکی ڕەنگاو ڕەنگدا نوێژی دەکرد، جا فەرمووی: ئەم جلە بیری لە سەر نوێژ لادام، بۆ (أبیجَهم)ی ببەنەوەو، جلە سادەکەیم بۆ بێنن.

(وَكَفُّ شَعَرِهِ) ناپەسندە مووەکانی بپێچێتەوە (أَوْ ثَوْبِهِ) یان جلەکانی بپێچێتەوە، بەڵکو سوننەتە بیانکاتەوە، تاکو سوجدەی لەگەڵدا ببەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ وَلا أَكُفَّ ثَوْباً وَلا شَعَراً﴾ رواه الشیخان، فەرمانم پێکراوە: لە سەر حەفت ئێسقان سوجدە ببەم و جل و موو نەپێچمەوە.

(وَوَضْعُ يَدِهِ عَلىفَمِهِ) ناپەسندە دەستی دابنێتە سەر دەمی (بِلا حاجَةٍ) بە بیّپێویستی، واتە: ئەگەر باوشکا، ئەو کاتە سوننەتە دەستیچەپە دابنێتە سەر دەمی، جیاوازی ناو نوێژو دەرەوەی نوێژیش نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، پێغەبەر ﷺ دەفەرمویّ: ﴿إذا تَثاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلى فِيهِ فَإنَّ الشَّيْطانَ يَدْخُلُ﴾ رواه مسلم، هەرکاتێك یەکێکتان باوشکا، با دەستی لە سەر دەمی دابنیّ؟ چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە.

وَالْقِيامُ عَلَى رِجْلٍ، وَالصَّلاةُ حاقِناً أَوْ حاقِباً أَوْ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ يَتُوقُ إِلَيْه، وَأَنْ يَبْصُقَ قِبَلَ وَجْهِه أَوْ عَنْ يَمينِه، وَوَضْعُ يَدِه عَلَى خاصِرَتِه، وَالْمُبالَغَةُ فِي خَفْضِ الرَّأْسِ فِي رُكُوعِه،

---

(وَالْقِيامُ عَلى رِجْلٍ) ناپەسندە لە نوێژدا لە سەر یەك پێ ڕابوەستێ، چونكە ماندووبوونێكە ملكەچی لەدەست دەدا، بەڵام ئەگەر پێویست بوو، ئەو كاتە ناپەسند نیە.

(وَالصَّلاةُ) ناپەسندە نوێژكردن: (حاقِناً) لە حاڵەتێكدا كە میزی ڕاگرتبێ (أَوْ حاقِباً) یان پیسایی، یان بای ڕاگرتبێ (أَوْ بِحَضْرَةِ طَعامٍ) یان لەگەڵ ئامادەبوونی خواردنێك، یان خواردنەوەیەك: كە (يَتُوقُ إِلَيْه) دڵی بۆی بچێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَصَلاةَ بِحَضْرَةِالطَّعامِ وَلاَهُوَ يُدافِعُهُ الأَخْبَثانِ﴾ رواه مسلم، نوێژكردن تەواو نیە لەگەڵ ئامادەبوونی خواردەمەنیو لەو حاڵەتەی هەردوو پیسیەكە تەنگاوی دەكەن.

(وَأَنْ يَبْصُقَ) ناپەسندە لە ناو نوێژو لە دەرەوەی نوێژ تف فڕێ بدا (قِبَلَ وَجْهِه) بەرەو پێش ڕووی‌خۆی (أَوْ عَنْ يَمينِه) یان بەرەو ڕاستەی‌خۆی، بەڵكو بە لای چەپەی‌دا فڕێی دەدا، ئەگەر لە دەرەوەی مزگەوت بوو، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاةِ فَإِنَّهُ يُناجِي رَبَّهُ فَلايَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلا عَنْ يَمينِهِ وَلَكِنْ عَنْ شِمالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ﴾ رواه الشيخان، هەركاتێك یەكێكتان لە نوێژدا بوو، ئەوە (مناجاة)ی خوای‌خۆی دەكا، كەوابو: تف نەكاتە پێشەوەی‌خۆیو لای‌ڕاستەی، بەڵكو بیكاتە لای‌چەپەی لە ژێر پێی.

جا بزانە: تف فڕێدانە ناو مزگەوت بە هەموو لایەكدا هەر حەڕامە، كەوابو: لە ناو مزگەوت بە لای‌چەپەی‌دا دەیكاتە ناو پارچە جلێكی‌خۆی، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْبُصاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطيئَةٌ وَكَفّارَتُها دَفْنُها﴾ رواه الشيخان، تف فڕێدان لە ناو مزگەوت گوناهە، داپۆشەری ئەم گوناهە شاردنەوەی تفەكەیە. هەروەها تف فڕێدان بەرەو قیبلەش ناپەسندە، هەروەك لە (نهاية)و (مُغنى)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَوَضْعُ يَدِه عَلى‌خاصِرَتِه) ناپەسندە لە ناو نوێژدا دەستی دابنێتە سەر كەلەكەی، ئەگەر پێویست نەبێ ﴿عَنْ أَبِي‌هريرةﷺ نَهى رَسُولُ اللهِﷺ أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِراً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردوە: پیاو نوێژ بكا لە حاڵەتێكدا دەستی لە سەر كەلەكەی دابنێ.

(وَالْمُبالَغَةُ فِي خَفْضِ الرَّأْسِ) هەروەها ناپەسندە زۆر سەری‌خۆی شۆڕ بكاتەوە (فِي رُكُوعِه) لە ڕكووع بردنی‌دا ﴿ عَنْ عائشةَرَضِيَ‌اللهُ عَنها: كان النَّبِيُّﷺ إذا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ ﴾ ڕواەمسلم، كە پێغەمبەرﷺ ڕكووعی دەبرد، سەری بەرز نەدەكردەوەو شۆڕیشی نەدەكردەوە.

وَالصَّلاةُ فِي الْحَمَّامِ وَالطَّرِيقِ وَالْمَزْبَلَةِ وَالْكَنِيسَةِ وَعَطَنِ الإِبِلِ والْمَقْبَرَةِالطَّاهِرَة، وَاللهُ أَعْلَمُ.

## ﴿ له گۆڕستان و له چەند شوێنێكی تردا نوێژكردن ناپەسندە ﴾

بزانە: لە شوێنی زەوتكراودا -واتە: هەم لە سەر شتی زەوتكراویش- نوێژكردن حەرامە، بەڵام نوێژەكەش دروست دەبێ، واتە: واجبەكەی لە سەر لادەچێ بەڵام تاوانباریش دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە، ئینجا چەند شوێنێكی تریش هەنە، نوێژكردن تێیاندا ناپەسندە، بەڵام نوێژەكەش دروست دەبێ، هەروەك دەفەرموێ:

(وَالصَّلاةُ) نوێژكردن ناپەسندە (فِي الْحَمَّامِ) لە ناو گەرماودا، جیاوازی جێگەی خۆشۆردن و جل داكەندن نیە (وَالطَّرِيقِ) هەروەها نوێژكردن ناپەسندە: لە سەر ڕێگەو (وَالْمَزْبَلَةِ) لە زبڵخانەداو لە هەر شوێنێكی تریشدا: كە پیسی لێبێ، چونكە ڕوو لە پیسیكردن لە نوێژدا ناپەسندە، جا ئەگەر لاشەی، یان جل و بەرگی بە پیسیەكە بكەوێ، نوێژكەشی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە پێنجەم مەرجی نوێژدا باسمان كردن (وَالْكَنِيسَةِ) هەروەها نوێژكردن ناپەسندە لە كەنیسەو دێری جولەكەو گاوراندا، هەم (وَعَطَنِ الأَبِلِ) لە مۆڵگەی ووشتردا.

هەم (وَالْمَقْبَرَةِالطَّاهِرَةِ) نوێژكردن ناپەسندە لە گۆڕستانی پاكدا، واتە: ئەو گۆڕستانەی دووبارە هەڵنەكەندراوە تاكو مردوویتری تێدا بنێژری (وَاللهُ أَعْلَم) چونكە ناوەوەی گۆڕ بە كێم و خوێن پیس بووە، ڕووتێكردنی ناپەسندە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاتُصَلُّوا إلى الْقُبُورِ وَلاتَجْلسوُا عَلَيْها﴾ رواه مسلم، بەروە گۆڕەكان نوێژ مەكەن و لە سەریشیان دامەنیشن. جا ئەگەر گۆڕستانەكە دووبارە هەڵكەندرابو، ئەو كاتە نوێژكردن لە سەر خاكەكەی دروست نیە، چونكە گڵەكەی تێكەڵ بە كێم و خوێن بووەو پیس بووە، مەگەر شتێكی پاك لە سەر خاكەكە ڕابێخێ، یان لە شوێنێكی هەڵنەكەندراوی پاكدا نوێژبكا، ئەو كاتە نوێژەكە دروستە، بەڵام ناپەسندە؟ چونكە نوێژەكە بەرامبەر بە پیسیەكەیە، كەوابو: ئەگەر مردووێك لە ناو مزگەوتدا بنێژرێ هەمان بڕیاری ناپەسندیی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿الأَنْبِياءُ أَحْيَاءٌ فِي قُبُورِهِمْ يُصَلُّونَ﴾ رواه أبويعلى قال المناوي: هو حديث صحيح. پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام زیندوونە لە ناو گۆڕەكانیاندا نوێژ دەكەن. كەواتە لاشە پیرۆزەكانیان نارزێ و ناو گۆڕەكەیان پاكە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حەرامە لە نوێژدا ڕوو بكاتە گۆڕی پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام بە مەبەستی (تَبَرُّك)=بەرەكەت وەرگرتن، چونكە سەر ئەكێشێتە لای (شِرْك)، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

کەوابو: گۆڕی خەڵکی‌تری-جگە پێغەمبەران عَلَیهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ- لەپێشترە بۆ حەرامی، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلاَ وَإِنَّ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ كانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصالِحِيهِمْ مَساجِدَ، أَلاَ فَلاَ تَتَّخِذُواالْقُبُورَ مَساجِدَ إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذلِكَ﴾ رواه مسلم، ئاگادار بن: ئەو ئوممەتانەی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان‌و پیاوە چاکەکانیان دەکردە مزگەوت، ئێوە گۆڕەکان مەکەنە مزگەوت، من قەدەغەتان ئەکەم لەو کارە.

ئیمامی (النواوی) لە (شرح)ی ئەم حەدیسەدا دەفەرموێ: (کاتێ (صحابة)کان مزگەوتی پێغەمبەریانﷺ گەورە کردو گۆڕی پێغەمبەرﷺو ئیمامی(أبوبکر)و ئیمامی(عمر)رَضِیَ اللهُ عَنْهُما بەگەڵ (حَرَم)ی مزگەوت کەوتن، (صَحابة)کان چەند دیواری بەرزیان لە سەر گۆڕەکە دروست کردن تاکو دیار نەبێ، نەوەك خەڵك لە نوێژدا ڕووی تێبکاو سەر بکێشێتە لای حەرام). بڕوانە (شرح مسلم).

کەوابو: هەر مزگەوتێك گۆڕی تێدا بێ، حەرامە: بە مەبەستی (تَبَرُّك) نوێژی تێدا بکرێ، بەڵام ئەگەر بە مەبەستی (تَبَرُّك) نەبو زیانی نیە، بەو مەرجەی گۆڕەکە دوور بێ، یان دیوارێك لە نێوانیاندا هەبێ‌و ڕوو تێکردن نەمێنێ، هەروەك لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ ئەوهایەو، لە (تحفة)و (نهایة)ش دەفامێتەوە.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی مزگەوتەکان ﴾

پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿مَنْ بَنى مَسْجِداً يَبْتَغِي بِهِ وَجهَ اللهِ-تَعالى- بَنىَ اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك مزگەوتێك دروست بکا بۆ ڕەزامەندی‌خوا، خوای گەورە خانوویێکی وەك ئەو مزگەوتەی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکا.

ئینجا سوننەتە: مزگەوت لە شوێنێکی وەهادا دروست بکرێ: کە خەڵك بە ئاسانی بیگاتێ‌و نوێژی تێدا بکەن ﴿عَن عائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَمَرَ رَسولُ اللهِﷺ بِبِناءِ الْمَساجِدِ فِي الدُّورِ وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە: مزگەوت لە نێوان خانوواندا دروست بکرێ‌و پاك‌و خاوێن ڕابگیرێ‌و بۆنخۆش بکرێ.

کەوابو: حەرامە مزگەوت پیس‌و چڵکن بکرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذِهِ الْمَساجِدَ لاتَصْلُحُ لِشَيْءٍ مِنْ هذاالْبَوْلِ وَلا الْقَذَرِ، إِنَّما هِيَ لِذِكْرِاللهِ تَعالى وَقِراءَةِالْقُرْآنِ﴾ رواه مسلم، ئەو مزگەوتانە ناگونجێن نە بۆ میز تێداکردن‌و نە بۆ چڵکن کردن، بەڵکو تەنها بۆ زیکری خواو قورئان خوێندنن.

هەروەها ناپەسندە بۆن ناخۆش بکرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَكَلَ ثُوماً أَوْ بَصلاً فَلْيَعْتَزِلْنا أَوْ فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنا وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك سیر، یان پیازی

خوارد، با لێمان جیا بێتەوەو نەیەتە مزگەوت نوێژمان لەگەڵ نەکا، با لە ماڵی خۆی دانیشێ. واتە: با لە ماڵی خۆیدا نوێژ بکا تاکو بە بۆنە ناخۆشەکەی خەڵکی ئازار نەدا. کەواتە: ناپەسندە بە پێی بۆن پێڵاو و بەرگی چڵکنو بۆن ئارەقە بڕواتە ناو مزگەوت، چونکە خەڵکی ئازار دەدا.

هەروەها پێویستە ڕێز لە مزگەوت بندرێو دەنگی تێدا بەرز نەکرێتەوە، هەرچەند زیکرو قورئانخوێندنیش بێ، ئەگەر دەیزانی خەڵك نوێژی لێتێك دەچێ، هەروەها نابێ دەمەچەقەو پێکەنینی بە دەنگو کڕینو فرۆشتنی تێدا بکرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا لاَ أَرْبَحَ اللهُ تِجارَتَكَ، وَ إذا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ ضالَّةً فَقُولُوا لاَرَدَّهااللهُ عَلَيْكَ﴾رواه الترمذي وقال حديث حسن، هەرکاتێك یەکێکتان دیت لە مزگەوتدا کڕین، یان فرۆشتن دەکا، پێی بڵێن: خوا قازانج نەداتە بازرگانیەکەت، وە هەرکاتێك یەکێکتان دیت لە مزگەوتدا بانگەوازی بۆ شتی ونبوو دەکا، پێی بڵێن: خوا بۆت نەگەڕێنێتەوە. چونکە مزگەوت بۆ ئەو جۆرە کارانە دروست نەکراوە.

بەڵام نوستنو خواردن لە ناو مزگەوتدا زیانی نیە، بەو مەرجەی چڵکن نەکرێو لە نوێژکەرانیش بەرتەنگ نەکرێ ﴿عَنْ ابْنِ عمرَرَضِیَاللهُ عَنهُما: أَنَّهُ كانَ يَنامُ فِي مَسْجِدالنَّبِيِّﷺ وَهُوَ شابٌّ أَعْزَبُ﴾رواه البخاري، (عبدالله بن عمر) رَضِیَاللهُ عَنهُما لە مزگەوتیپێغەمبەرداﷺ دەخەوت لەو کاتدا گەنجێکی بێژن بوو. جا ئەگەر لە مزگەوتدا جەنابەتی تووش بوو، واجبە: یەکسەر بڕواتە دەرەوە، جا ئەگەر نەگونجا: وەك بەند کرابێ، یان ترسێکی گیانی، یان ماڵی هەبێ، واجبە: (تیمم) بکا، هەر وەك لە باسی جەنابەتدا ڕوونمان کردەوە.

هەروەها حەرامە ڕێگا بدرێتە منداڵی نەفامو شێتو ئافرەتی حەیزدارو ئاژەڵو سەرخۆشو ئەو جۆرە کەسانە بچنە ناو مزگەوت، ئەگەر مەترسی پیسکردنی هەبێ، ئەگینا: ناپەسندە، هەروەها حەرامە کافر بچێتە ناو مزگەوت تەنها بە ئیزنی موسڵمانێك نەبێ.

ئینجا بزانە: نوێژی واجب لە مزگەوتدا زۆر خێری زیاترە: لە نوێژی ماڵەوەو شوێنەکانیتر، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشى إلى بَيْتٍ مِنْ بُيوتِ اللهِ لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرائِضِ اللهِ كانَتْ خُطْوَتاهُ إحْداهُما تَحُطُّ خَطِيئَةً وَالأُخْرى ترفَعُ دَرَجَةً﴾ رواه مسلم، هەرکەسێك لە ماڵی خۆی دەستنوێژ بگرێ، ئینجا بە پێیان بچێتە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا —واتە: مزگەوتێك— تاکو نوێژێکی واجب لەوێدا بکا، هەر هەنگاوێکی خراپەیەکی لە سەر لائەداو هەر هەنگاوێکیتریشی پلەیەکی بەرز ئەکاتەوە.

ئینجا کە ویستی لە ماڵەوە بچێتە دەرەوە، سوننەتە بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ وَلا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِاللهِ﴾رواه أصحاب السنن وقال الترمذي: حديث حسن.

سُجُودُالسَّهْوِ سُنَّةٌ:

ئینجا کە ویستی بڕواتە ناو (حَرَم)ی مزگەوت سوننەتە بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ، اَلْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى رَسُولِ اللهِ، رَبِّ اغْفِرْ لِى ذُنُوبِى وَافْتَحْ لِى أَبْوابَ رَحْمَتِكَ﴾حديث حسن رواه الترمذي الاّ (التسمية والحمد) فابن السني.

ئینجا بڵێ: (بسم الله)و پێی ڕاستەی پێشدا بنێتە ژوورەوە، ئینجا بۆ هاتنە دەرەوەش هەمان زیکرو دوعا دەکا، بەڵام ئەم جارە دەڵێ: ﴿وَافْتَحْ لِى أَبْوابَ فَضْلِكَ﴾و پێی چەپەی پێشدا دەباتە دەرەوە.

هەروەها–جگە لەو دوعایەی ڕابردووش– بۆ چونە ناو مزگەوت ئەم دوعایەش سوننەتە: ﴿أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجِيمِ﴾رواه أبوداود بسند صالح. ئینجا کە چووە ناو مزگەوت، سوننەتە: نیەتی (إعتكاف) بێنێ، ئینجا دانەنیشێ تا دوو ڕەکعەت (تَحِيَّةُالْمَسْجِدِ) دەکا، هەروەك لە نوێژی سوننەتدا بە بەڵگەوە ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

جا ئەگەر لە بەر هەر هۆیەك (تحيةالمسجد)ی نەکرد، سوننەتە: چوار جار ئەم زیکرانەی (اَلْباقياتُ الصّالحات) بڵێ کە لەم حەدیسەدانە: ﴿عن أبي‌هريرة‌ﷺ: قال النَّبِيُّﷺ: إِذا مَرَرْتُمْ بِرِياضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا قُلْتُ: يا رَسُولَ اللهِ وَما رِياضُ الْجَنَّةِ؟ قال: اَلْمَساجِدُ. قُلْتُ: وَماالرَّتْعُ؟ قال: سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاإِلهَ الاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ﴾ رواه الترمذي بسند حسن، هەر کاتێك بە باغی بەهەشتدا ڕابردن بلەوەڕێن، گوتم: باغی بەهەشت چییە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: مزگەوتەکانن، گوتم: لەوەڕان چییە؟ فەرمووی: زیکری (سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاإِلهَ الاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَر)ە.

ئینجا تا لە مزگەوتدا بێ، سوننەتە: ئەو زیکرانە بەردەوام بڵێ‌و قورئان بخوێنێ‌و خۆی بە کاری ئایینی خەریك بکا، ئیتر جگە لەو ڕەووشتانەی ڕابردوو، چەندیتر ماوە لە (المجموع)و (الاذكار للنواوي)و (مغني)دا–کە سەرچاوەی ئەو پاشکۆیە بون– باسیان کراوە، چەندیتریش لە باسی جەنابەت‌و حەیزدا ڕابردن، پێویستە لێیان ئاگادار بی، وَآخِرُ دَعْوانا أَنِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعالَمِينَ.

## ﴿ بابٌ: لە باسی سوجدەی سەهوو ﴾

(سُجُودُالسَّهْوِ) سوجدەی سەهوو لە ناو نوێژدا (سُنَّةٌ) سوننەتە، جیاوازی نیە: نوێژەکە واجب بێ، یان سوننەت بێ، کەواتە: ئەگەر سوجدەی‌سەهوو نەشبا، نوێژەکەی دروستە، بەڵام ئەگەر ئیمام سوجدەی‌سەهووی برد، ئەو کاتە بە هۆی شوێنکەوتن لە سەر مەئموم واجب دەبێ، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموویەتی.

عِنْدَ تَرْكِ مَأْمُوربِه أَوْ فِعْلِ مَنهِيٍّ عَنْهُ، فَالأَوَّلُ إِنْ كَانَ رُكْناً وَجَبَ تَدَارُكُهُ، وَقَدْ يُشْرَعُ السُّجُودُ كَزِيَادَةٍ حَصَلَتْ بِتَدَارُكِ رُكْنٍ كما سَبَقَ فِي التَّرْتِيبِ، أَوْ بَعْضاً–وَهوَ الْقُنُوتُ أَوْ قِيَامُهُ أَوِ التَّشَهُّدُ الأَوَّلُ أَوْ قُعُودُهُ،

---

ئینجا سوجدەی سەهوو لە دوو حاڵەتدا سوننەتە: یەکەم: (عِنْدَ تَرْكِ مَأْمُورٍ بِهِ) لە کاتی نەکردنی فەرمان پێکراوێك لە نوێژدا، یان لە کاتی کەوتنە گومان لە کردن‌و نەکردنی‌دا.
دووەم: (أَوْ فِعْلِ مَنْهِيٍّ عَنْهُ) یان لە کاتی کردنی قەدەغەکراوێك لە نوێژدا:
(فَالأَوَّلُ) جا ئەو فەرمان پێکراوەی کە نەکراوە (إِنْ كانَ رُكْناً) ئەگەر ڕوکنێکی‌نوێژ بوو، واتە: ئەو واجبانەی نوێژیان لێ‌پێك دێ (وَجَبَ تَدَارُكُهُ) واجبە: بۆ ڕوکنەکە بگەڕێتەوەو بیکا، جیاوازی نیە: بێگومان بزانێ نەیکردوە، یان گومانی هەبێ ئایا کردویەتی، یان نا؟ چونکە سوجدەی‌سەهوو جێگەی ڕوکن ناگرێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام (وَقَدْ يُشْرَعُ السُّجُودُ) لەگەڵ گەڕانەوەیشی بۆکردنی ڕوکنەکە، هەندێ جار سوجدەی سەهووش سوننەتە (كَزِيادَةٍ) وەك زێدەبوونی کردەوەیەك: کە (حَصَلَتْ) لە ناو نوێژدا پەیدا ببێ (بِتدارُكِ رُكْنٍ) بە هۆی گەڕانەوە بۆ کردنی ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی‌نوێژ (كَماسَبَقَ) هەروەك ڕوونکردنەوەی ئەو زێدەیە ڕابرا (فِي التَّرْتِيبِ) لە باسی ڕیزکردنی ڕوکنەکانی نوێژدا.
بۆ وێنە: ئەگەر لە سوجدەدا زانی ڕوکووعی نەبردوە، واجبە یەکسەر هەڵستێتەوە پێوەو ڕوکووع بباو لە ڕوکووع هەڵسێتەوە، ئینجا بڕواتەوە سوجدە؟ تاکو ڕیزی‌نوێژ تێك نەچێ، بەڵام بە هۆی ئەو زێدەییە سوننەتە سوجدەی‌سەهووش ببا ﴿عن عمران بن الحُصَيْن‌ﷺ: سَلَّمَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي ثلاث رَكَعات مِنَ الْعَصْرِ...فَقالَ رَجُلٌ أَقُصِرَت الصَّلاةُ يارَسُولَ الله؟ فَخَرَجَ مُغْضَباً فَصَلَّى الرَّكْعَةَالَّتِي كانَ تَرَك ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ نوێژی‌عەسری سێ ڕەکعەت کردو سەلامی داوە، پیاوێك گوتی: ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە؟ جا پێغەمبەرﷺ ڕەکعەتەکەی‌تریشی کردو سوجدەی سەهووشی برد، ئینجا سەلامی داوە.
(أَوْ) یان ئەو فەرمان پێکراوەی کە نەکراوە (بَعْضاً) سوننەتێك بوو لەو سوننەتانەی ئەندامێکی نوێژن (وَهُوَ) ئەو جۆرە سوننەتانەی ئەندامێکی نوێژن، ئەمانەن:
یەکەم: (الْقُنُوتُ) قونووتی نوێژی سبەینێ‌و وەتری ڕەمەزانە. دووەم: (وَقِيامُهُ) بە پێوە ڕاوەستانی قونووتە: وەك ئەگەر یەکێك قونووتیش نەزانێ، هەر سوننەتە بە ئەندازەی قونووت بە پێوە ڕابوەستێ. سێیەم: (وَالتَّشَهُّدُ الأَوَّلُ) تەحیاتی‌یەکەمە. چوارەم: (أَوْ قُعُودُهُ) یان دانیشتنی تەحیاتی‌یەکەمە: وەك ئەگەر کەسێك تەحیاتیش نەزانێ، هەر

وَكَذَا الصَّلاَةُ عَلَى النَّبيِّ ﷺ فيه في الأَظْهَرِ - سَجَدَ، وَقِيلَ إِنْ تَرَكَهُ عَمْداً فَلاَ. قُلْتُ: وَكَذَا الصَّلاَةُ عَلَى الآلِ حَيْثُ سَنَنَّاهَا وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلاَ تُجْبَرُ سَائِرُ السُّنَنِ. وَالثَّانِي إِنْ لَمْ يُبْطِلْ عَمْدُهُ

---

سوننەتە بە ئەندازەی تەحیات دابنیشیّ. پێنجەم: (وَكَذا الصَّلاةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) هەروەها سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەر ﷺ (فِيهِ) لە کۆتایی قونووتو تەحیاتی‌یەکەمدا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

ئینجا هەر یەکێکی لەو پێنجانەیڕابردوو نەکرد، ئەوە ئەگەر دەستی بە واجبێکی‌تر کردبیّ، دروست نیە بۆی بگەڕێتەوە، بەڵکو (سَجَدَ) سوننەتە سوجدەی سەهووی لە جیاتی ببا، تاکو جێگەی ئەو سوننەتە نەکراوە بگرێتەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بیّهێزدا (إِنْ تَرَكَهُ عَمْداً) ئەگەر یەکێکی لەو سوننەتانەیڕابردوو بە قەسدی نەکرد (فَلا) سوجدەی سەهوو نابا، بەڵام ڕەفتار بەم فەرموودە بیّهێزە ناکریّ، چونکە فەرموودەی ڕاست ئەوەیە: بە سەهوو نەیکردبیّ، یان بە قەسدی، سوجدەی سەهوو لە هەردوو حاڵەتدا سوننەتە ﴿عن عبدالله بن بُحَيْنَة ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ قَامَ مِنْ اثْنَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ يَجْلِسْ بَيْنَهُمَا، فَلَمَّا قَضَى صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە دوو ڕەکعەتی نوێژی نیوەڕۆ هەڵساوەو دانەنیشت تەحیات بخوێنیّ، ئینجا کە نوێژی تەواو کرد، دوو سوجدەی سەهووی برد، ئینجا سەلامی داوە.

شەشەم: (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرمویّ (وَكَذا الصَّلاةُ عَلَى الآلِ) هەروەها سەلاوات لێدان لە سەر (آل)ی پێغەمبەر ﷺ یەکێکە لەو سوننەتانەی سوجدەی سەهوو لە جییاتیان دەبردریّ (حَيْثُ سَنَنَّاها) لەو شوێنەی بە بەڵگەی حەدیس بە سوننەتمان دانابو: کە تەحیاتی‌ئاخیرو قونووت بوو (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَ) هەروەها بزانە: جگە لەو سوننەتانەیڕابردوو: کە ئەندامێکی نوێژ بون (لا تُجْبَرُ سائِرُ السُّنَنِ) سوننەتەکانی‌تری نوێژ–ئەگەر نەکران– دروست نیە: سوجدەی سەهوو لە جێیان دابندریّ: وەك دوعای إفتتاحو (أعوذ بالله)و دەست بەرزکردنەوەکانو سوڕەتی دوای فاتیحەو تەسبیحاتی ڕوکووعو سوجدەو دەنگ هەڵێنانو قونووتی بەلا...هتد، واتە: ئەگەر یەکێکی لەو سوننەتانە نەکرد، یان هەر هیچی نەکردن: بە سەهوو، یان بە قەسدی، ئەوە دروست نیە: سوجدەی سەهوو لە جیاتیان ببا، چونکە پێغەمبەر ﷺ سوجدەی لە جیاتی نەبردون، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

کەوابو: ئەگەر بە قەسدیو بە بیّعوزر سوجدەی سەهوو لەجیاتی ئەو جۆرە سوننەتانە ببا، نوێژەکەی بەتاڵ دەبیّ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالثّانِي) هۆی دووەم: کە کردنی قەدەغەکراوێك بوو لە نوێژدا (إِنْ لَمْ يُبْطِلْ عَمْدُهُ) ئەگەر لەو جۆرە قەدەغەکراوە بوو: لە بەر کەمی بەقەسدیەکەشی نوێژی بەتاڵ نەدەکرد

كَالإلْتِفَات وَالْخَطْوَتَيْنِ لَمْ يَسْجُدْ لِسَهْوِه، وَإلاَّ سَجَدَ إِنْ لَمْ تَبْطُلْ بِسَهْوِه، كَكَلَامٍ كَثِيرٍ فِى الْأَصَحِّ، وَتَطْوِيلُ الرُّكْنِ الْقَصِيرِ يُبْطِلُ عَمْدُهُ فِى الْأَصَحِّ فَيَسْجُدَ لِسَهْوِهِ، فَالاعْتِدَالُ قَصِيرٌ وَكَذا الْجُلُوسُ بَيْنَ السَّجدَتَيْنِ فِى الْأَصَحِّ،

---

(كَالألْتِفاتِ) وەكو ئاوەڕدانەوەو (وَالْخَطْوَتَيْنِ) وەكو دوو هەنگاو (لَمْ يَسْجُدْ لِسَهْوِهِ) بۆ سەهووەكەشی سووجدەیسەهوو نابا، هەروەك بۆ بەقەسدیەكەشی سوجدە نابا، چونكە ﴿پێغەمبەرﷺ (امامة)ی لە ناو نوێژدا هەڵدەگرتو دایدەنا سوجدەیسەهووشی نەبرد﴾. هەروەك لە جموجۆڵی ناو نوێژدا ڕوونمان كردەوە.

(وَإلّا) بەڵام ئەگەر ئەو قەدەغەكراوەی بە قەسدی كردبا نوێژی بەتاڵ دەكرد: وەك ڕەكعەتێكیزیاد، یان سوجدەیەكیزیاد، یان ڕوكووعێكیزیاد: ئەگەر بە سەهوو ئەوانەی كرد (سَجَدَ) سوننەتە سوجدەی سەهو ببا ﴿عَنْ عبداللهﷺ: صَلَّى النَّبِيُّﷺ الظُّهْرَ خَمْساً، فَلَمَّا سَلَّمَ قِيلَ لَهُ: صَلَّيْتَ خَمْساً؟ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ بە سەهوو نوێژی نیوەڕۆی پێنج ڕەكعەت كرد، ئینجا كە سەلامی داوە، پێی گوترا: پێنج ڕەكعەتت كردن؟ جا دوو سوجدەی سەهووی برد، ئینجا دووبارە سەلامی داوە.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو بەو مەرجە بوو: (إِنْ لَمْ تَبْطُلْ بِسَهْوِهِ) ئەگەر نوێژەكە بە سەهووكردنی ئەو قەدەغەكراوە بەتاڵ نەبێ، واتە: بەڵام ئەگەر بە سەهووەكەشی نوێژەكە بەتاڵ دەبو (كَكَلامٍ كَثِيرٍ) وەكو قسەكردنێكی زۆر، یان بێدەستنوێژی، یان خواردن، یان جموجۆڵێكیزۆر، ئەوانە ئەگەر بە سەهووش بكا نوێژەكە بەتاڵ دەبێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەوابو: لەو حاڵەتەدا سوجدەی سەهووی ناوێ، چونكە لە نوێژدا نەماوەتەوەو واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە نوێژەكە بكاتەوە.

(وَتَطْوِيلُ الرُّكْنِ الْقَصِيرِ) درێژكردنەوەی ڕوكنێكیكورت (يُبْطِلُ عَمْدُهُ) بە قەسدیەكەی نوێژ بەتاڵ دەكا (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا درێژكردنەوەی بە هۆی بێدەنگبوون بێ، یان بە هۆی زیكرێكی وەها: كە سوننەت نەبێ –ئەگەر بە قەسدی بێ– نوێژ بەتاڵ دەبێ، كەوابو: (فَيَسْجُدَ لِسَهْوِهِ) ئەگەر بە سەهوو درێژی كردەوە سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا:

(فَالإِعْتِدالُ) هەڵسانەوە لە ڕوكووع (قَصِيرٌ) ڕوكنێكی كورتە، كەواتە: لە زیكری خۆی زیاتر –جگە لە قونووت لە شوێنی خۆیدا، یان تەسبیحاتی(صَلاةِ التَّسْبِيحِ)– دروست نیە بە هیچ زیكرێكیتر درێژ بكرێتەوە (وَكَذاالْجُلُوسُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ) هەروەها دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەش ڕوكنێكیكورتە (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەواتە: لە ئەندازەی زیكرەكەیخۆی نابێ زیاتر درێژ بكرێ.

وَلَوْ نَقَلَ رُكْناً قَوْلِياً كَفَاتِحَة فِي رُكُوعٍ أَوْ تَشَهُّد لَمْ تَبْطُلْ بِعَمْـدِه فِي الأَصَـحّ، وَيَسْـجُدُ لِسَهْوِه فِي الأَصَحِّ، وَ عَلَى هَذَا تُسْتَثْنَى هذه الصُّورَةُ مِنْ قَوْلِنَا: مَالاَ يُبْطِلُ عَمْدُهُ لاَ سُـجُودَ لِسَهْوِه. وَلَوْ نَسِيَ التَّشَهُّدَ الأَوَّلَ فَذَكَرَهُ بَعْدَ إِنْتِصَابِه لَمْ يَعُدْ لَهُ،

---

(وَلَوْ نَقَلَ رُكْناًقَوْلِيّاً) ئەگەر ڕوكنێكیزوبانیی گواستەوە: لە شوێنیخۆی بۆ لای ڕوكنێكیتـر (كَفاتِحَةٍ) وەك فاتیحە، یان بەشێكیفاتیحە بخوێنیّ (فِی رُكُوعٍ) لە ناو ڕوكووعدا، یان لە نـاو سوجدەدا (أَوْ تَشَهُّدٍ) یان لـە نـاو دانیشـتنیتەحیاتدا، یـان تـەحیات بـە پێـوە بخـوێنیّ (لَـمْ تَبْطُـل) نوێژەكـە بـەتالّ نـابیّ (بِعَمْـدِهِ) بـە بەقەسـدی گواسـتنەوەی ئـەو ڕوكنـە زوبانیـیە (فِی الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونكە شێوەی نوێژەكە تێك نەچوە.

ئینجا بزانە: ئەوە لە حاڵەتێكدا بوو: كـە ڕوكنـە زوبانیەكـە لـە شـوێنی خـۆیدا بخـوێنیّو دووبـارەش لـە نـاو ڕوكنێكیتـردا بیخوێنێتـەوە، هـەروەك لـە (حاشیةالجمل)دا ڕوونـی كردۆتەوە، چونكە ئەگـەر بـە قەسـدی لـە شـوێنی خـۆیدا نـەیخوێنیّ، نوێژەكـەی بـەتالّ دەبیّ، هەروەك لە (الأنوار)دا فەرموویەتی.

بەڵام ئەگەر لە پێش شوێنیخۆیدا بیخوێنیّ، ئەو كاتە واجبە ڕوكنە زوبانیەكە لە شـوێنی خـۆیدا دووبـارە بخوێنێتـەوە، هـەروەك لـە سـێزدەمین ڕوكنینوێـژدا لـە زۆربـەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا (وَیَسْجُدُ لِسَهْوِهِ) ئەگەر بە سەهوو، یان بە قەسدی گواستیەوە، سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا (فِی الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (وَعَلَى هذا) جـا لـە سـەر ئـەو فـەرموودە ڕاسترە (تُسْتَثْنَى هذهِ الصُّورَةُ) ئەو وێنەیە جیادەكرێتەوە (مِنْ قَوْلِنا:) لەو (قاعدة)یەی كە گوتمان: (ما لایُبْطِلُ عَمْدُهُ لاسُجُودَ لِسَهْوِهِ) هەر قەدەغـەكراوێك بـە قەسـدیەكەی نوێـژ بـەتالّ نـەكا، سوجدەیسـەهوو بـۆ سـەهووەكەی نـابردریّ، هـەروەك لـە سـەرەتای هۆیدووەمدا ڕوونمان كردەوە.

(وَلَوْ نَسِيَ التَّشَهُّدَ الأَوَّلَ) ئەگـەر تەحیاتییەكـەمی لـە بـیر كـردو نەیخوێنـد (فَـذَكَرَهُ) ئینجا هاتەوە بیری (بَعْدَ انْتِصابِهِ) پاش ئەوەی تەواو هەڵساوەو بە پێوە ڕاوەستا (لَـمْ یَعُـدْ لَـهُ) دروسـت نیـە بـۆ ئـەو تەحیاتەیەكـەم بگەڕێتـەوە، چـونكە دەسـتی بـە واجـب كـردوەو تەحیاتەكـەش سـوننەتە، كـەوابو: فاتیحـە دەخـوێنیّو لـەجیاتی تەحیاتەكـەش سـوجدەی سەهوو دەبـا ﴿عن زیاد بن علاقة: صَلَّى بِنا الْمُغيرَةُ فَلَمّا صَلّى رَكعَتَيْن قامَ وَ لَمْ يَجْلِـسْ، فَسَبَّحَ بِهِ مَنْ خَلْفَهُ فَأَشارَ إِلَيهِمْ: أَنْ قُومُوا. فَلَمّا فَرَغَ سَلَّمَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَقالَ: هكذا صَنَعَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ﴾ رواه أبوداود والترمذي و صححه، (المغیرة) نوێـژی جەماعـەتی بـۆ كردین لە دوای دوو ڕەكعەت هەڵساوەو دانەنیشت تەحیات بخوێنیّ، مەئموومەكان گوتیان:

فَإِنْ عَادَ عَالِماً بِتَحْرِيمِهِ بَطَلَتْ، أَوْ نَاسِياً فَلاَ، وَيَسْجُدُ لِلسَّهْوِ، أَوْ جَاهِلاً فَكَذَا فِي الأَصَحِّ، وَلِلْمَأْمُومِ الْعَوْدُ لِمُتَابَعَةِ إِمَامِهِ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: الأَصَحُّ وُجُوبُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(سُبْحانَ الله)، ئەویش ئاماژەی بۆ کردن: تا هەڵبستنەوە، ئینجا کە نوێژی تەواو کرد، لەجیاتی تەحیاتەکە دوو سوجدەی سەهووی بردو فەرمووی: پێغەمبەرﷺ ئەوهای کرد.
کەوابو: (فَإِنْ عَادَ) ئەگەر لە پێوە بە قەسدی گەڕاوە بۆ تەحیاتەکەو (عَالِماً بِتَحْرِيمِهِ) دەیزانی گەڕانەوەش حەرامە (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ (أَوْ نَاسِياً) یان لە بیری کردبو کە لە نوێژدایە، بۆیێ گەڕاوە (فَلاَ) نوێژەکە بەتاڵ نابێ، بەڵام هەرکاتێك هاتەوە بیری، واجبە: واز لە تەحیاتەکە بێنێو یەکسەر بۆ فاتیحەخوێندن هەڵسێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: (وَيَسْجُد لِلسَّهْوِ) سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا چونکە تەحیاتەکەی نە خوێندوەو دانیشتنێکیتری زیاد کردوە.
(أَوْ جاهِلاً) یان نەیدەزانی گەڕانەوە حەرامە، بۆیێ گەڕاوە تەحیات بخوێنێ (فَكَذا) ئەوەش وەکو مرۆڤی لەبیرچوو بڕیاری بۆ دەدرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، واتە: نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام هەر کاتێك زانی حەرامە، واجبە یەکسەر بۆ فاتیحە خوێندن هەڵسێتەوەو سوننەتە سوجدەی سەهووش ببا.
ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو دەرباری ئەو کەسە بوو کە ئیمامی نوێژ بێ، یان بەتەنهایی نوێژ بکا، بەڵام ئەگەر مەئموم بە سەهوو، یان بە نەزانی هەڵساوەو ئیمامەکەشی دانیشت بۆ تەحیات خوێندن، ئەو کاتە (وَلِلْمَأْمُومِ) بۆ مەئمومەکە دروستە (الْعَوْدُ) لە پێوە بگەڕێتەوە بۆ دانیشتن (لِمُتَابَعَةِ إِمامِهِ) بۆ شوێنکەوتنیئیمامەکە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: (وُجُوبُهُ) واجبە لە پێوە بگەڕێتەوەو لەگەڵ ئیمامەکەی دابنیشێ (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە شوێنکەوتنیئیمام لە نوێژدا واجبە، واتە: ئەگەر نەگەڕێتەوە، یان نیەتی جیابوونەوە نەهێنێ، نوێژەکەیخۆی بەتاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر هەڵسانەوەیمەئموم بە نەزانیو بە سەهوو نەبو، بەڵکو بە قەسدی بوو، ئەو کاتە گەڕانەوەی واجب نیە، بەڵکو سوننەتە، هەروەك لە(تحفه)دا فەرموویەتی.
هەروەها بزانە: ئەگەر ئیمامو مەئموم هەردووکیان هەڵسانەوە پێوە، ئەو کاتەش دروست نیە هیچێکیان بگەڕێنەوە بۆ تەحیات، جا ئەگەر ئیمامەکە گەڕاوە، دروست نیە مەئموم شوێنی بکەویو لەگەڵی بگەڕێتەوە، چونکە ئەگەر ئیمامەکە بەقەسدی گەڕابێتەوە نوێژی بەتاڵە، ئەگەر بە سەهوو، یان بە نەزانی گەڕابێتەوە شوێنکەوتنی دروست نیە، کەوابو: یان بەپێوە چاوەڕوانی دەکا تا ئەویش هەڵدەستێتەوە، یان نیەتی جیابوونەوە دێنێو نوێژەکەیخۆی بە تەنهایی تەواو دەکا.

وَلَوْ تَذَكَّرَ قَبْلَ إِنْتصابه عَادَ للتَّشَهُّد وَيَسْجُدُ إِنْ كَانَ صَارَ إِلىٰ الْقِيامِ أَقْرَبَ، وَلَــوْ نَهَــضَ عَمْداً فَعَادَ بَطَلَتْ إِنْ كَانَ إِلَىٰ الْقِيَامِ أَقْرَبَ، وَلَوْ نَسِيَ قُنُوتاً فَذَكَرَهُ فِي سُجُودِه لَمْ يَعُدْ لَهُ

---

دیسان بزانە: ئەگەر ئیمامەکە هەڵساوەو تەحیاتی نەخوێند، ئەو کاتەش دروست نیە مەئموم لێی دوا بکەوێو تەحیات بخوێنێ، چونکە بەو دواکەوتنە نوێژیخۆی بەتاڵ دەبێ، کەوابو: واجبە یەکسەر شوێنی بکەوێو هەڵسێتەوە، جا ئەگەر ئیمامەکە لە پێوە گەڕاوەو دانیشت، دیسان دروست نیە مەئموم لە دانیشتنەکەیخۆیدا بەردەوام بێ، بەڵکو واجبە: هەڵسێتەوە پێوە، ئینجا یان نیەتی جیابوونەوە دێنێ، یان بە پێوە چاوەڕاونی دەکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

ئینجا بزانە: ئەو باسەیڕابردووی تەحیاتییەکەم گشتی لەو حاڵەتەدا بوو: کە بە تەواوی هەڵسابێتەوە پێوە، چونکە (وَلَوْ تَذَكَّرَ) ئەگەر نوێژکەر هاتەوە بیری کە تەحیاتی یەکەمی نەخوێندوە (قَبلَ انْتصابِهِ) پێش ئەوەی بە تەواوی هەڵسێتەوەو بە پێوە ڕابوەستێ (عَادَ لِلتَّشَهُّدِ) سوننەتە: بگەڕێتەوە بۆ تەحیات خوێندن، چونکە هێشتا دەستی بە هیچ واجبێك نەکردوە، کەوابو: (وَيَسْجُدُ) سوننەتە: سوجدەی سەهووش ببا لەجیاتی ئەو هەڵسانەوەو ئەو گەڕانەوەیە (إِنْ كَانَ صَارَ) ئەگەر لە هەڵسانەوەدا گەیشتبێتە سنورێکی وەها: کە (إِلىٰ الْقِيَامِ أَقْرَبَ) لە پێوە نزیکتر بێ: وەك بگاتە سنوریڕوکوعو بگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر لە دانیشتن نزیکتر بێ: وەك پێش بگاتە سنوریڕوکوع بگەڕێتەوە، ئەو کاتە نابێ سوجدەی سەهوو ببا، هەروەك (الشيخ أبومحمد) ئەو سنورەی داناوەو لە (المجموع)دا هێناویەتی.

ئینجا بزانە: ئەو حاڵەتانەی تەحیاتییەکەم لە سەرەتاوە تا ئێرە، گشتی لە حاڵەتی نەزانینو سەهوودا بوو، چونکە (وَلَوْ نَهَضَ عَمْداً) ئەگەر بەقەسدی هەڵساوەو ویستی تەحیاتییەکەم نەخوێنێ (فَعادَ) ئینجا بەقەسدی گەڕاوە تاکو تەحیات بخوێنێ (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ (إِنْ كان) ئەگەر لە سنورێکی وەهادا بگەڕێتەوە: کە (إِلىٰ الْقِيامِ أَقْرَبَ) لە پێوە نزیکتر بێ نەك لە دانیشتن، چونکە بەقەسدی جموجۆڵێکی وەهای لە نوێژدا زیاد کردوە: شێوەی نوێژی گۆڕیوە، کەوابو: ئەگەر لە سنورێکی نزیکتر لە دانیشتن گەڕاوە، یان نەیزانی گەڕانەوە حەڕامە، ئەو کاتە نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، هەروەك لە (الشرواني) وەردەگیرێ.

(وَلَوْ نَسِيَ قُنُوتاً) ئەگەر قونووتی لە بیر کرد (فَذَكَرَهُ فِي سُجُودِهِ) ئینجا لە سوجدەدا قونووتەکەی هاتەوە بیر (لَمْ يَعُدْ لَهُ) دروست نیە بۆی بگەڕێتەوە، چونکە دەستی بە واجب کردوەو قونووتەکەش سوننەتە، جیاوازی ئیمامو نوێژکەری بە تەنهاییش نیە، کەوابو: سوننەتە سوجدەی سەهوو لەجیاتی قونووتەکە ببا، جا ئەگەر هاتو: بە قەسدی

له سوجده‌وه بۆ قونووت گه‌ڕاوه‌و ده‌یزانی گه‌ڕانه‌وه‌ش حه‌ڕامه، نوێژه‌كه‌ی به‌تاڵ ده‌بێ، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

(أَوْ) یان قونووته‌كه‌ی هاته‌وه بیر (قَبْلَهُ) له پێش سوجده بردندا، واته: پێش ئه‌وه‌ی گشت ئه‌ندامه‌كانی له سوجده‌دابنێ، ئه‌وه (عادَ) دروسته: بگه‌ڕێته‌وه، چونكه ده‌ستی به هیچ واجبێك نه‌كردوه، ئینجا (وَسَجَدَ لِلسَّهْوِ) سوننه‌ته: سوجده‌ی سه‌هووش ببا (إِنْ بَلَغَ حَدَّالرَّاكِعِ) ئه‌گه‌ر له هاتنه‌خواره‌وه‌دا گه‌یشتبێته سنوری ڕوكووعبه‌ر، چونكه ئه‌گه‌ر به‌قه‌سدی ئه‌وه‌نده هاتبا خواره‌وه نویژه‌كه‌ی به‌تاڵ ده‌بوو، كه‌وابو: ئه‌گه‌ر نه‌گه‌یشته سنوری ڕوكووع، نابێ سوجده‌ی سه‌هوو ببا.

ئینجا بزانه: ئه‌و بڕیارانه‌ی له ته‌حیاتی یه‌كه‌مدا ڕوونمان كردنه‌وه‌-ده‌رباره‌ی ئیمامو مه‌ئموومو نه‌زانینو به‌قه‌سدیو سه‌هوو- گشی له قونووتیشدا ڕه‌فتاری پێ‌ده‌كرێ به بێ‌جیاوازی، ته‌نها ئه‌وه نه‌بێ: لێره‌دا مه‌ئموم بۆی دروسته: له ئیمامه‌كه‌ی دوا بكه‌وێ تاكو قونووت بخوێنێ، به‌و مه‌رجه‌ی دواكه‌وتنه‌كه‌ی نه‌گاته دوو ڕوكن، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

﴿ ئاگاداری ﴾ یه‌كه‌م: ئه‌گه‌ر له دوای ڕه‌كعه‌تی‌یه‌كه‌م، یان له دوای ڕه‌كعه‌تی‌سێیه‌می نوێژی چوار ڕه‌كعه‌تی‌دا به سه‌هوو دانیشتو ته‌حیاتی خوێند، یان به‌شێكی ته‌حیاتی خوێند، ئینجا هاته‌وه بیری، ئه‌وه واجبه: واز له ته‌حیات بێنێو یه‌كسه‌ر هه‌ڵسێته‌وه بۆ فاتیحه خوێندن، هه‌م سوننه‌ته: سوجده‌ی سه‌هووش ببا، به هۆی زێده‌كردنی ئه‌و دانیشتنه درێژه، كه‌واته: ئه‌گه‌ر دانیشتنه‌كه له ئه‌ندازه‌ی (جِلْسَةُ الإِسْتِراحَة) زیاتر نه‌بو، دروست نیه سوجده‌ی سه‌هوو ببا، چونكه هیچی زیادی نه‌كردوه.

دووه‌م: ئه‌گه‌ر له بیری كردو له نوێژی چوار ڕه‌كعه‌تی هه‌ڵساوه بۆ ڕه‌كعه‌تی پێنجه‌م، ئینجا هاته‌وه بیری، ئه‌وه واجبه یه‌كسه‌ر بگه‌ڕێته‌وه بۆ دانیشتن، واته: ئه‌گه‌ر نه‌گه‌ڕێته‌وه نوێژه‌كه‌ی به‌تاڵ ده‌بێ، ئینجا ئه‌گه‌ر له دوای ڕه‌كعه‌تی چواره‌م پێش ئه‌و هه‌ڵسانه‌وه‌یه ته‌حیاتی خوێندبو، ئه‌وه ته‌حیاته‌كه‌ی دروست بووه، هه‌ر چه‌ند به نیه‌تی ته‌حیاتی‌یه‌كه‌میش خوێندبێتی، كه‌وابو: كه دانیشته‌وه، سوننه‌ته سوجده‌ی سه‌هوو ببا ئینجا سه‌لام بداته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ته‌حیاتی نه‌خوێندبو، ئه‌و كاته واجبه ته‌حیاته‌كه‌ش بخوێنێ، ئینجا له دوای ته‌حیات سوننه‌ته سوجده‌ی سه‌هوو ببا، ئینجا سه‌لام بداته‌وه.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر ڕه‌كعه‌تی‌پێنجه‌میشی ته‌واو كردو دانیشت، ئینجا هاته‌وه بیری، ئه‌ویش هه‌مان بڕیاری بۆ ده‌درێ، واته: ئه‌گه‌ر له دوای ڕه‌كعه‌تی‌چواره‌م ته‌حیاتی خوێندبو، ئه‌وه

وَلَوْ شَكَّ فِي تَرْكِ بَعْضٍ سَجَدَ، أَوْ إِرْتِكابِ مَنْهِيٍّ فَلاَ، وَلَوْ سَهاَ وَشَكَّ هَلْ سَجَدَ فَلْيَسْجُدْ، وَلَوْ شَكَّ أَصَلَّى ثَلاثاً أَمْ أَرْبَعاً أَتَى بِرَكْعَةٍ وَسَجَدَ،

---

نابیٚ دووباره بیخویٚنیٚتەوە، بەڵکو سوننەتە لەو دانیشتنەدا بڕواتە سوجدەی‌سەهوو، ئینجا سەلام بداتەوە، بەڵام ئەگەر تەحیاتی نەخویٚندبو، ئەوکاتە واجبە تەحیاتەکە بخویٚنیٚ، ئینجا سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، ئینجا سەلام بداتەوە.

بەڵام ئەگەر لە دوای ڕەکعەتی‌پیٚنجەم تەحیاتیشی خویٚند، ئینجا هاتەوە بیری، ئەوە ئەو تەحیاتەی دروست دەبیٚو بە بەر تەحیاتی‌ئاخیر دەکەویٚ، کەوابو: سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، ئینجا سەلام بداتەوە، لە (المجموع)و (مغنی)دا، ناوەڕۆکی ئەو ئاگاداری‌یە ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر بە سەهوو لە نویٚژی دوو ڕەکعەتی بۆ ڕکعەتی سیٚ‌یەم هەڵساوە، یان لە نویٚژی سیٚ ڕەکعەتی بۆ چوارەم هەڵساوە، هەر کاتیٚك هاتەوە بیری، واجبە: یەکسەر بگەڕیٚتەوە بۆ دانیشتن، ئەگینا: نویٚژی بەتاڵ دەبیٚ، ئینجا بە گویٚرەی ڕوونکردنەوەی ڕابردوو ڕەفتار دەکا، وَاللهُ أعْلَم.

## ﴿ کەوتنە گومان لەناو نویٚژدا ﴾

(وَلَوْ شَكَّ) ئەگەر کەوتە گومان (فِي‌تَرْكِ بَعْضٍ) لە نەکردنی‌سوننەتیٚك لەو سوننەتانەی ئەندامی نویٚژن: وەك قونووتو تەحیاتی‌یەکەم (سَجَدَ) سوننەتە سوجدەی‌سەهوو ببا (أَوْ) یان کەوتە گومان لە (إِرْتِكابِ مَنْهِيٍّ) کردنی قەدەغەکراویٚك: وەك قسەکردن (فَلا) نابیٚ سوجدەی سەهوو ببا (وَلَوْ سَهاَ) ئەگەر لە نویٚژدا سەهوویٚکی کردو (وَشَكَّ) کەوتە گومان (هَلْ سَجَدَ) ئایا لە جیاتی ئەو سەهووە سوجدەی بردوە، یان نا (فَلْيَسْجُدْ) با سوجدەی‌سەهوو ببا.

(وَلَوْ شَكَّ) ئەگەر لە نویٚژیٚکی چوار ڕەکعەتی‌دا کەوتە گومان: (أَصَلَّى ثَلاثاً أَمْ أَرْبَعاً) ئایا سیٚ ڕەکعەتی کردون، یان چوار (أَتَى بِرَكْعَةٍ) واجبە: ڕەکعەتیٚکی‌تریش بکاو (وَسَجَدَ) سوننەتە: سوجدەی‌سەهووش ببا، هەروەها ئەگەر لە نویٚژی دوو ڕەکعەتی، یان سیٚ ڕەکعەتی بکەویٚتە گومان هەمان بڕیاری بۆ دەدریٚ، پیٚغەمبەرﷺ دەفەمویٚ: ﴿إِذا سَها أَحَدُكُمْ فِي‌صَلاتِه فَلَمْ يَدْرِ واحِدَةً صَلَّى أَوْ إِثْنَتَيْنِ فَلْيَبْنِ عَلي‌واحِدَة، فَانْ لَمْ يَدْرِ ثِنْتَيْنِ صَلَّى أَوْ ثَلاثاً فَلْيَبْنِ عَلَى‌ثِنْتَيْنِ، وَ إِنْ لَمْ يَدْرِ ثلاثاً صَلَّى أَوْ أَرْبَعاً فَلْيَبْنِ عَلَى‌ثَلاثٍ، وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ﴾ رواه أحمد والترمذي وصححه، هەر کاتیٚك یەکیٚکتان لە نویٚژدا سەهووی کردو نەیزانی: ئایا یەك ڕەکعەتی کردوە، یان دوو، با وا دابنیٚ تەنها یەك ڕەکعەتی کردوە، ئەگەر نەیزانی ئایا دوو ڕەکعەتی کردون، یان سیٚ، با وا دابنیٚ دوو

وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَسْجُدُ وَإِنْ زَالَ شَكُّهُ قَبْلَ سَلاَمه، وَكَـذَا حُكْمُ مَـا يُصَـلِّيه مُتَـرَدِّداً وَاحْتَمَلَ كَوْنُهُ زَائِداً، وَلاَ يَسْجُدُ لِمَا يَجِبُ بِكُلِّ حَالٍ إِذَا زَالَ شَـكُّهُ، مِثَالُـهُ: شَـكَّ فِي الثَّالِثَةِ أَثَالِثَةٌ هِيَ أَمْ رَابِعَةٌ فَتَذَكَّرَ فِيهاَ لَمْ يَسْجُدْ، أَوْ فِي الرَّابِعَةِ سَجَدَ، وَلَـوْ شَـكَّ بَعْدَالسَّلاَمِ فِي تَرْكِ فَرْضٍ لَمْ يُؤَثِّرْ

---

ڕەكعەتی كردون، ئەگەر نەیزانی سیٚ ڕەكعەتی كردون، یان چوار، با وا دابنیٚ سیٚ ڕەكعەتی كردون، جا پێش سەلام بداتەوە با دوو سوجدەیسەهوو ببا.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر (أَنَّهُ يَسْجُدُ) لەو مەسەلەیڕابردوودا سوجدەی سەهوو دەبا (وَإِنْ زَالَ شَكُّهُ) هەر چەند گومانەكەشی نەمێنیٚ (قَبْلَ سَلامِه) پێش سەلامدانەوەی، واتە: ئەگەر پێش ئەوەی سەلام بداتەوە، هاتەوە بیری كە ڕەكعەتەكە چوارەم بووە، سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، چونكە بە دوو دڵی كردویەتی (وكَذا) وەك بڕیاری مەسەلەیڕابردوو وایە (حُكْمُ ما يُصَلِّيهِ مُتَرَدِّداً) بڕیاری هەر ڕوكنێكی بە دوو دڵی بیكاو (وَاحْتَمَلَ كَوْنُهُ زائِداً) بشكونجیٚ: ڕوكنەكە زیاد بیٚ، واتە: بە هۆی دوو دڵیەكەی سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، هەر چەند لە پێش سەلامدانەوەش گومانەكەی نەمێنیٚ.

بەڵام (وَلا يَسْجُدُ) نابیٚ سوجدەی سەهوو ببا (لِما يَجِبُ) بۆ كردنی ئەو ڕوكنەی واجبە: بكریٚ (بِكُلِّ حَالٍ) لە هەردوو حاڵەتی گومانو بێگومانیدا (إِذاَ زَالَ شَكُّهُ) هەر كاتێك لە پێش تەواوكردنی ئەو ڕوكنەدا گومانی نەما (مِثالُهُ:) ئەو مەسەلەیە بەم وێنەیە ڕوون دەكرێتەوە: (شَكَّ) لە نوێژی نیوەڕۆدا كەوتە گومان (فِي الثَّالِثَةِ) لە ڕەكعەتی سیٚیەمدا: (أَثالِثَةٌ هِيَ) ئایا ئەم ڕەكعەتەی ئێستا سیٚیەمە (أَمْ رابِعَةٌ) یان چوارەمە (فَتَذَكَّرَ فِيها) جا هەر لە ناو ئەم ڕەكعەتە سیٚیەمەدا بوو–پێش ئەوەی بۆ چوارەمەكە هەڵسێتەوە– هاتەوە بیری: كە لە ڕاستیشدا ئەمە سیٚیەمەكەیە (لَمْ يَسْجُدْ) نابیٚ سوجدەیسەهوو ببا، چونكە لە هەردوو حاڵەتی گومانو بێگومانیدا هەر واجبە ئەم ڕەكعەتەسیٚیەمە بكریٚ.

(أَوْ فِي الرَّابِعَةِ) یان لە ڕەكعەتی چوارەمدا هاتەوە بیری: كە ئەمە چوارەمە (سَجَدَ) سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، چونكە كە بۆ ئەم ڕەكعەتە هەڵساوەتەوە دوو دڵ بووە؟ لە بەر ئەوەی دەگونجا پێنجەم بوبیٚ، بەڵام بە هۆی نەمانی گومانەكە گونجانەكەش نەماوە، كەوابو: ئەگەر بێتەوە بیری كە ئەم ڕەكعەتەی ئێستا بۆی هەڵساوەتەوە پێنجەمە، ئەو كاتە واجبە یەكسەر بگەڕێتەوە بۆ دانیشتنو تەحیات بخوێنیٚ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ شَكَّ) ئەگەر كەوتە گومان (بَعْدَ السَّلامِ) لە دوای سەلامدانەوە (فِي تَرْكِ فَرْضٍ) لە نەكردنی ڕوكنێكینوێژ –جگە لە نیەتهێنانو (الله أكبر)ی نوێژدابەستن– (لَمْ يُؤَثِّرْ) ئەو

گومانەی دوایسەلامدانەوە کار لە نوێژەکە ناکا (عَلَىالْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب، چونکە ئەگەر ئەو جۆرە گومانە کار لە نوێژ بکا، ماندووبوونێکی زۆر تووشی خەڵك دەبێ، هەروەك ئەگەر لە دوایسەلامدانەوە لە مەرجێکی نوێژیشدا بکەوێتە گومان، ئەویش کار لە نوێژەکە ناکا لە فەرموودەی بەهێزدا.

بەڵام ئەگەر گومانەکە لە نیەت، یان لە (الله أكبر)ی نوێژدابەستندا بوو، ئەوە کار دەکا: وەك لە دوایسەلامدانەوە بکەوێتە گومان: ئایا (الله أكبر)ی نوێژدابەستنی گوتوە، یان نا، یان ئایا نیەتی هێناوە، یان نا، یان ئایا نیەتینیوەڕۆی هێناوە، یان نیەتیعەسر، یان ئایا نیەتی واجبی هێناوە، یان نیەتی سوننەت؟ لەو مەسەلانەدا واجبە: نوێژەکان دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەوەیڕابردوو گشتی لە حاڵەتیگوماندا بوو، کەوابو: ئەگەر سەلامی داوەو بێگومان زانی: ڕوکنێکی لە بیر چووە، ئەو کاتە ئەگەر لە دوایسەلامدانەوە بە گوێرەی عادەت ماوەیەکی زۆری پیٚچوو ئینجا هاتەوە بیری، یان بە سەر پیسیەك کەوت، یان ڕوکنە لە بیرکراوەکە: نیەت، یان (الله أكبر)ی نوێژدابەستن بوو، ئەوە لەو مەسەلانەدا واجبە لە سەرەتاوە نوێژەکە دووبارە بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر لە دوای سەلامدانەوە بە گوێرەیعادەت ماوەیەکیکەم پیٚچوو و هاتەوە بیری: کە ڕوکنێکی نەکردوە—جگە لە نیەتو (الله أكبر)ی نوێژدابەستن— بە سەر پیسیش نەکەوتبو، ئەوە یەکسەر دەگەڕێتەوە ناو نوێژەکەو لە سەرەتایڕوکنەکەوە نوێژەکە تەواو دەکا، بە بەڵگەی حەدیسەکانی (عمران)و (ذواليدين)یڕابردوو: لەم باسەو لە باسی ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەن، کەوابو: ئەگەر کەمێك قسەشی کرد، یان ڕۆیشت، یان پشتی لە قبیلە کرد، زیانی نیە، هەر وەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو، لە حاڵەتیدوایسەلامدانەوە بوو، بەڵام ئەگەر لە ناو نوێژدا کەوتە گومان، یان بێگومان زانی ڕوکنێکینوێژی نەکردوە، ئەوە ئەگەر ڕوکنەکە نیەت، یان (الله أكبر)ی نوێژدابەستن بوو، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵەو واجبە: لە سەرەتاوە نوێژەکە دووبارە بکاتەوە، هەر وەك ئێستا ڕوونمان کردەوە، بەڵام ئەگەر ڕوکنێکیتر بوو، ئەو کاتە دەگەڕێتەوە سەرەتای ڕوکنەکەو لەوێوە نوێژەکە تەواو دەکا، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەداو لە کۆتایی ڕوکنەکانینوێژدا ڕوونمان کردەوە، والحمد لله تعالى.

## ﴿ باسی سەهووی ئیمام و مەئموم ﴾

(وَسَهْوُهُ) ئەو سەهووەی مەئموم دەیکا (حَالَ قُدْوَتِهِ) لەو حاڵەتەی لەگەڵ ئیمام نوێژی بە جەماعەت دەکا (يَحْمِلُهُ إِمَامُهُ) ئیمامەکە لەجیاتی وی هەڵیدەگرێ، واتە: نابێ مەئموم بۆ

فَلَوْ ظَنَّ سَلاَمَهُ فَسَلَّمَ فَبَانَ خلافُهُ سَلَّمَ مَعَهُ وَلاَ سُجُودَ، وَلَوْ ذَكَرَ فِي تَشَهُّده تَرْكَ رُكْنٍ غَيْرِالنِّيَّة وَالتَّكْبِيرَة قَامَ بَعْدَ سَلاَمِ إِمَامِه إِلى رَكْعَته وَلاَ يَسْجُدُ، وَسَهْوُهُ بَعْـدَ سَـلاَمِه لاَ يَحْمِلُهُ، فَلَوْ سَلَّمَ الْمَسْبُوقُ بِسَلاَمِ إِمَامِه بَنَى وَسَجَدَ،

---

تەنها سەهووەکەیخۆی سوجدەیسەهوو ببا، چونکە سەربەخۆ نیە، هەروەك ئیمامیش لە بەر سەهووەکەیمەئموم نابێ سوجدە ببا، چونکە بەخۆی سەهووی نەکردوە.

(فَلَوْ ظَنَّ سَلامَهُ) ئەگەر مەئمووم وا تێگەیشت ئیمام سەلامی داوەتەوە (فَسَلَّمَ) ئەویش سەلامی داوە (فَبانَ خِلافُهُ) ئینجا ئاشکرا بوو: کە ئیمام سەلامی نەداوەتەوە (سَلَّمَ مَعَهُ) واجبە: لە پاش سەلامدانەوەیئیمام دووبارە سەلام بداتەوە (وَلاسُجُودَ) سوجدەی سەهووش دروست نیە، چونکە لە حاڵەتیجەماعەتدا سەهووی کردوەو ئیمامەکە لەجیاتی وی هەڵیدەگرێ.

(وَلَوْ ذكرَ فِي تَشَهُّدِهِ) ئەگەر مەئمووم لە تەحیاتی ئاخیردا، یان لەدوای تەحیات، یان لە پێش تەحیاتدا هاتەوە بیری: (تَرْكَ رُكْنٍ) کە ڕوکنێکینوێژی نەکردوە (غَيْرَالنِّيَّةِ وَالتَّكْبِيرَةِ) جگە لە نیەتو (الله أكبر)ی نوێژدابەستن، ئەوە دروست نیە ئێستا بۆ ڕوکنەکە بگەڕێتەوە، چونکە شوێنکەوتنیئیمامی لەدەست دەچێ، کەوابو: (قَام بَعْدَ سَلامِ إمامِهِ) لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکەی هەڵدەستێتەوە (إلى رَكْعَتِهِ) بۆ کردنەوەی ئەو ڕەکعەتەی لە دەستی چووە بە هۆی نەکردنیڕوکنەکە (وَلا يَسْجُدُ) دروست نیە سوجدەی سەهووش ببا، چونکە لە حاڵەتی جەماعەتدا سەهووی کردوەو ئیمامەکە لەجیاتی وی هەڵیدەگرێ.

ئینجا بزانە: لە هەر ڕوکنێکینوێژدا مەئمووم بێتەوە بیری: کە (الله أكبر)ی نوێژدابەستنی نەگوتوە، یان نیەتی نەهێناوە، یان نیەتی بە هەڵە هێناوە، ئەوە ئاشکرادەبێ: نوێژەکەی هەر دانەمەزراوەو بەتاڵە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: بە پێوە لەگەڵ (الله أكبر)ی نوێژدابەستندا نیەتی نوێژەکە بە جەماعەت دێنێ، ئینجا شوێن ئیمامەکە دەکەوێتەوە.

(وَسَهْوُهُ) ئەو سەهووەی مەئمووم دەیکا (بَعْدَ سَلامِهِ) لە پاش سەلامدانەوەی ئیمام (لايَحْمِلُهُ) ئیمام لەجیاتی هەڵیناگرێ، چونکە لە دوای تەواوبوونی جەماعەت سەهووی کردوە، کەوابو: کە نوێژەکەیخۆی کرد، پێش سەلام بداتەوە سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا (فَلَوْ سَلَّمَ الْمَسْبُوقُ) جا ئەگەر مەئموومیدواکەوتوو بە سەهوو سەلامی داوە (بِسَلامِ إمامِهِ) لە پاش سەلامدانەوەی ئیمامەکەی، ئینجا هاتەوە بیری کە نوێژی تەواو نەبوە (بَنَى) هەر لەوێوە دەست بە نوێژەکەی دەکاتەوەو (وَسَجَدَ) سوننەتە سوجدەی سەهووش ببا، چونکە لە دوای تەواوبوونی جەمەعات سەهووی کردوە.

وَيَلْحَقُهُ سَهْوُ إِمَامِه، فَإِنْ سَجَدَ لَزِمَهُ مُتَابَعَتُهُ، وَإِلاَّ فَيَسْجُدُ عَلَى النَّصِّ، وَلَوْ إِقْتَدَى مَسْبُوقٌ بِمَنْ سَهاَ بَعْدَ إِقْتِدَائِه -وَكَذَا قَبْلَهُ فِي الأَصَحِّ- فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ يَسْجُدُ مَعَهُ ثُمَّ فِي آخِرِ صَلاَتِه، فَإِنْ لَمْ يَسْجُدِ الإِمَامُ سَجَدَ آخِرَ صَلاَةِ نَفْسِه عَلَى النَّصِّ،

---

(وَيَلْحَقُهُ) دەگاتە مەئمووم (سَهْوُ إِمامِهِ) سەهووی ئیمامەکەی، واتە: هەر چەند مەئمووم سەهووشی نەکردبێ، هەر دەکەوێتە ئەستۆی، کەوابو: (فَإِنْ سَجَدَ) ئەگەر ئیمامەکە بە هۆی سەهووەکەی خۆی سوجدەی سەهووی برد (لَزِمَهُ مُتَابَعَتُهُ) واجبە: مەئمووم شوێنی بکەوێ هەر چەند نەشزانێ ئیمام سەهووی کردوە، واتە: ئەگەر بە قەسدی شوێنی نەکەوێو سوجدەی سەهووی لەگەڵ نەبا، نوێژی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ئیمام بۆ سەهووەکەی خۆی سوجدەی نەبرد (فَيَسْجُدُ) سوننەتە: مەئمووم سوجدەیسەهوو ببا (عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەققی فەرموودەیئیمامی(الشافعي)، ئینجا بزانە: ئەگەر مەئمووم دەیزانی ئیمام لەم سوجدەیسەهوو بە هەڵەدا چووە، ئەوە نابێ شوێنی بکەوێ، بەڵکو یان چاوەڕوانی دەکا، یان نیەتی جیابوونەوە دێنێو سەلام دەداتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية) دا فەرمویانە.

(وَلَوْ إِقْتَدَى مَسْبُوقٌ) ئەگەر مەئموومێکیدواکەوتوو نوێژی جەماعەتی دابەست (بِمَنْ سَهَا) لەگەڵ ئیمامێکی وەها: کە سەهووی کردبو (بَعْدَ إِقْتِدائِهِ) لە دوای نوێژدابەستنی مەئموومەکە (وَكَذَا قَبْلَهُ) هەروەها ئەگەر ئیمامەکە پێش دابەستنیمەئموومەکەش سەهووی کردبو (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، ئینجا لە هەردوو حاڵەتدا ئەگەر ئیمامەکە سوجدەی سەهووی برد (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: (أَنَّهُ) ئەو مەئموومە دواکەوتووە (يَسْجُدُ مَعَهُ) واجبە لەگەڵ ئیمامەکەیدا سوجدەی سەهوو ببا، تا شوێنکەوتنی لە دەست نەچێ (ثُمَّ) ئینجا سوننەتە: مەئموومەکە دووبارە سوجدەی سەهوو بباتەوە (فِي آخِرِ صَلاتِهِ) لە کۆتایی نوێژەکەیخۆیدا، چونکە سەهووی ئیمامەکەی کەوتۆتە ئەستۆو ئەو سوجدەی لەگەڵ ئیمامەکەش بردبوی تەنها بۆ شوێنکەوتن بوو، واتە: بۆ مەئموومەکە بە بەر سوجدەیسەهوو نەکەوتوە، چونکە لە شوێنی خۆیدا نەبوە، کەوابو: (فَانْ لَمْ يَسْجُدِ الامامُ) ئەگەر ئیمام لە هەردوو حاڵەتدا هەر سوجدەیسەهووی نەبرد (سَجَدَ) سوننەتە: مەئموومە دواکەوتووەکە سوجدەی سەهوو ببا (آخِرَ صَلاةِ نَفْسِهِ) لە کۆتایی نوێژەکەیخۆیدا، لە هەردوو حاڵەتدا (عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەققی فەرموودەی ئیمامی(الشافعي) رحمه الله تعالى.

وَسُجُودُالسَّهْوِ وَإِنْ كَثُرَ سَجْدَتَان كَسُجُودالصَّلاَة، وَالْجَديدُ أَنَّ مَحَلَّهُ بَيْنَ تَشَهُّده وَسَلاَمه، فَإن سَلَّمَ عَمْدَاً فَاتَ فِيالأَصَحِّ، أَوْ سَهْوَاً وَطَالَ الْفَصْلُ فَاتَ فِيالْجَديد، وَإلاَّ فَلاَ عَلَىالنَّصِّ، وَإذَا سَجَدَ صَارَ عَائداً إلَىالصَّلاَة

---

## ﴿ ژمارەو شوێنی سوجدەی سەهوو ﴾

(وَسُجُودُالسَّهْوِ) ژمارەی سوجدەیسەهوو-(وَ إِنْ كَثُرَ) هەر چەندە سەهووەكەش زۆربێ-(سَجْدَتَانِ) دوو سوجدەیە، بە بەڵگەی ئەو حەدیسانەی ڕابران (كَسُجُودِالصَّلاة) سوجدەی سەهوو وەكو سوجدەی نوێژە: لە هەر پێنج مەرجەكانینوێژداو لە دانانی هەر حەفت ئەندامەكانداو لە دانیشتنی نێوان هەردووكیانداو...هتد، كەوابو: هەمان تەسبیحاتی سوجدەینوێژ لە سوجدەیسەهووشدا سوننەتە، بەڵام چەند زانایەك فەرموویانە: سوننەتە بڵێ: (سُبْحانَ مَنْ لايَنامُ وَلايَسْهُو). چونكە ئەو زیكرە لەم شوێنە دەوەشێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی ئیمامی(الشافعي) ئەمەیە: (أَنَّ مَحَلَّهُ) شوێنی سوجدەی سەهوو (بَيْنَ تَشَهُّدِهِ وَسَلامِهِ) لە نێوان تەحیاتیئاخیرو سەلامدانەوەیە، واتە: لە پێش سەلامدانەوەیە، بە بەڵگەی حەدیسەكانیڕابردوو، جا بزانە: حەدیسی(صحیح) دەربارەی سوجدەیسەهوو لە دوایسەلامدانەوەش هاتووە، بەڵام ئیمامی(الشافعی) وای داناوە: كە سوجدەیسەهوو لە دوای سەلامدانەوە سەهووێكیتر بووەو دووبارە ڕوویداوە، چونكە حەدیسەكانی پێش سەلامدانەوە ئاشكرانو ناگونجێ لە كار بێخرێن، یان (تَأْوِيل) بكرێن، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی كردوونەوە.

(فَإِنْ سَلَّمَ عَمْدَاً) جا ئەگەر بە قەسدی سەلامی داوەو دەشیزانی سەهووی كردوە (فَاتَ) سوجدەی سەهووی لە دەست دەچێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، واتە: نابێ سوجدەكە ببا (أَوْ سَهْوَاً) یان بە سەهوو سەلامیداوە (وَطَالَ الْفَصْلُ) ماوەیەكیدرێژیش كەوتە نێوان، ئینجا هاتەوە بیری (فَاتَ) دیسان سوجدەكەی لەدەست دەچێ (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەینوێدا، واتە: نابێ سوجدەكە ببا (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر ماوەكە درێژ نەبو، بەڵكو زوو هاتەوە بیری (فَلا) لەدەستی ناچێ (عَلىالنَّصِّ) لەسەر دەققی فەرموودەیئیمامی(الشافعي)، واتە: سوجدەكە دەبا، چونكە لە حەدیسی (البخاريو مسلم)دا هاتوە: ﴿پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی بە سەهوو كردە پێنج ڕكعەتو سەلامی داوە، ئینجا گەڕاوە سوجدەی سەهووی بردو دووبارە سەلامی داوە﴾، هەروەك لەم باسەدا ڕوونمان كردەوە.

كەوابو: (وَإِذا سَجَدَ) هەر كاتێك لە دوایسەلامدانەوە سوجدەی سەهووی برد (صَارَ عائِداً إلِى الصَّلاةِ) وای لێ دێ: كە گەڕاوەتەوە بۆ نوێژكردن، واتە: هەر لە ناو نوێژدایەو واجبە:

فِـي الْأَصَـحِّ، وَلَـوْ سَـهَا إِمَامُ الْـجُمُعَةِ وَسَـجَدُوا فَـبَانَ فَـوتُهَا أَتَمُّوا ظُـهْراً وَسَـجَدُوا، وَلَـوْ ظَـنَّ سَـهْواً فَـسَجَدَ فَـبَانَ عَـدَمُهُ سَـجَدَ فِـي الْأَصَـحِّ.

(بَابٌ)

تُسَـنُّ سَـجَدَاتُ التِّلَاوَةِ، وَهُـنَّ فِي الْـجَدِيدِ أَرْبَعَ عَشَرَةَ: مِنْهَا سَـجْدَتَا الْـحَجِّ،

---

له دوای سوجدەی سەهوو دووبارە سەلام بداتەوە (فِي الأصَحِّ) لە فـەرموودەی ڕاستردا، بە بەڵگەی حەدیسەکە، کەوابو: ئەگەر لە ناو سوجدەکەدا بێدەستنوێژ ببێ، یان پیسی پێبکەوێ...هتد، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ.

(وَلَوْ سَهَا إِمَامُ الْجُمُعَةِ) ئەگـەر ئیمامی نوێژیجومعە سەهووێکی کـرد، ئینجا (وَسَـجَـدُوا) سوجدەی سەهوویان برد (فَبـانَ فَوتُهـا) ئینجـا ئاشکرا بـوو: جومعەکـە لەدەسـت چووە چونکە کاتەکەی نەمابو (أَتَمُّوا ظُهْراً) واجبـە: جومعەکـە بکەنـە چـوار ڕەکعـەتی تـەواوی نیوەڕۆ، ئینجا (وَسَجَدُوا) ئەم جارەش لـە کۆتـایی نوێژەکـەدا دووبـارە سوجدەیسـەهوو دەبەنەوە، چونکە ئاشکرا بوو: سوجدەیـیەکەم لە ناوەندی نوێژدا بووە.

(وَلَـوْ ظَـنَّ سَـهْواً) ئەگـەر مرۆڤێـك وایـزانـی سـەهووێکی کـردوە (فَسَجَدَ) ئینجا سـوجدەی سەهووشـی بـرد (فَبـانَ عَدَمُـهُ) ئینجـا ئاشـکرا بـوو: سـەهووی نـەکردبو (سَـجَدَ) دووبـارە سـوجدەی سـەهوو دەباتـەوە (فِي الأَصَـحِّ) لـە فەرموودەیڕاسـتردا، چـونکە ئاشـکرا بـوو: سوجدەکەی پێشدا کردارێکی زیاد بـووە، ئینجـا بزانـە: ئەگـەر بـە سـەهوو سـێ سـوجدەی سـەهووی بـردن، یـان لـە دوای سوجدەیسـەهوو سـەهووێکیتری کـرد، دروسـت نیـە سوجدەیسەهوو دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە (مُغنی)دا فەرموویەتی.

## ﴿بابٌ: لەباسی سوجدەی (تِلاوَة)و(شُكر)﴾

**پێناسـە:** سـوجدەی(تِـلاوَة)، واتـە: قورئانخوێنـدن، ئەوەیـە: لـە دوای خوێنـدنی ئـەو ئایەتانەی سوجدەیان تێدایە، سوجدەیەك بۆ خوا ببا، بەو جۆرەی باسی دەکەین:

(تُسَنُّ سَجَداتُ التِّـلاوَةِ) سـوجدەکانی(تِـلاوَة)، واتـە: قورئانخوێنـدن، گشـتیان سـوننەتن، کەواتە: ئەگەر سوجدەش نـەبا، گوناهبـار نـابێ (وَهُـنَّ فِي الْجَدِيدِ) سـوجدەکانی(تِـلاوَةِ)ی قورئانیپیرۆز (أَرْبَعَ عَشَرَةَ) چواردە سوجدەنە:

(مِنْها) لەو چواردانە (سَجْدَتا الْحَجِّ) دوو سوجدە لـە سـوڕەتی(الْحَجِّ)دانـە: لـە کۆتـایی ئایـەتی (١٨)و (٧٧)، سـوجدەیەکیش: لـە کۆتـایی(الأَعْراف) ئایـەتی(٢٠٦)، لـە (الرَّعْـد) کۆتـایی ئایەتی(١٥)، لە (النَّحْل) کۆتایی ئایەتی(٥٠)، لە (الإِسْراء) کۆتـایی ئایـەتی(١٠٩)، لـە (مَـرْيَم) کۆتایی ئایەتی(٥٨)، لە (الْفُرْقان) کۆتایی ئایـەتی(٦٠)، لـە (النَّمْـل) کۆتـایی ئایـەتی(٢٦)، لـە (الم السَّجْدة) کۆتایی ئایەتی(١٥)، لە (حم السَّجْدة) کۆتایی ئایەتی(٣٨)، لە کۆتـایی (وَالنَّجم) ئایەتی(٦٢)، لە (الإنشقاق) کۆتایی ئایەتی(٢١)، لە کۆتایی(الْعَلَقِ) ئایەتی(١٩).

لاَ (ص~) بَلْ هِيَ سَجْدَةُ شُكْرٍ تُسْتَحَبُّ فِيغَيْرِالصَّلاَةِ، وَتَحْرُمُ فِيهَا عَلَىالأَصَحِّ، وَتُسَنُّ لِلْقَارِئِ وَالْمُسْتَمِعِ، وَتَتَأَكَّدُ لَهُ بِسُجُودِالْقَارِئِ، قُلْتُ: وَتُسَنُّ لِلسَّامِعِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

واته: هەر كاتێك خوێندنی یەكێك لەم ئایەتانەیڕابردووو تەواو بوو، سوننەتە سوجدەیەكی (تِلاوَة) ببا ﴿عَنْ عمرو بن العاص‌ؓ أَنَّ النَّبِيَّ‌ﷺ أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشَرَةَ سَجْدَةً فِيالْقُـرْآنِ﴾ رواه أبوداود بإسنادٍ صالح، پێغەمبەرﷺ پانزە سوجدەی لە قورئاندا پیٚخوێندم.

(لا ص ٓ) بـەڵام سـوجدەكەی سـوڕەتی(ص ٓ)-كـە پـانزەمینی حەدیسـەكەیڕابردووە- سوجدەی (تِلاوَة) نیە (بَلْ هِيَ سَجْدَةُ شُكْرٍ) بەڵكو ئەو سوجدەیەی سوڕەتی(ص ٓ) سـوجدەی شوكرە، چونكە لەو كاتەی حـەزرەتی(داود)پێغەمبـەر علیه السلام لـە دادكردنـدا سـەهووی كردو تۆبەی كردو خوایگەورە تۆبەی قبولْ كرد، شوكری خوای كرد بەو سوجدەیە.

كەوابو: (تُسْتَحَبُّ) سـوجدەی سـوڕەتی(ص ٓ) سـوننەتە: (فِـي غَيْرِالصَّلاَة) لـە دەرەوەی نوێژدا ببردرێ، كـە ئایـەتی ﴿وَخَرَّ راكِعَاً وَأَنابَ﴾ی خوێنـد ﴿عَنْ أَبِيسَعيد الْخدري‌ؓ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ‌ﷺ وَهُوَ عَلَىالْمِنْبَرِ: (ص~)، فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ تَشَزَّنَ النَّاسُ لِلسُّـجُودِ، فَقَـالَ النَّبِيُّ‌ﷺ: إِنَّما هِيَ تَوْبَةُ نَبِيٍّ فَنَـزَلَ وَسَـجَدَ وَسَـجَدُوا﴾ رواه أبـوداود بإسـناد صـحيح، پێغەمبەرﷺ لە سەر مینبەر سوڕەتی(ص ٓ)ی خوێند، ئینجا كـە گەیشـتە ئایەتیسوجدە، خەڵكەكە خۆیان ئامـادە كـرد بۆ سـوجدە، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ئـەم سـوجدەیە هـی تۆبەی پێغەمبەرێكە شوكری خوای پیٚكردوە، ئینجـا پێغەمبـەرﷺ دابـەزیو سـوجدەكەی برد، خەڵكیش سوجدەیان برد.

كـەوابو: (وَتَحْـرُمُ فيهـا) ئـەو سـوجدەی(ص ٓ) لـە نـاو نوێـژدا حەڕامـەو وەك سـوجدە شوكرەكانیتر نوێژی پیٚ بەتاڵ دەبیٚ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

(وَتُسَنُّ) سوجدەی(تِلاوَة) سوننەتە (لِلْقَارِئِ) بۆ ئەو كەسـەی بـەخۆی قورئـان دەخـوێنیٚ، هەر چەند قوتابیەكی دەرس خوێنیش بیٚ، هەروەك لە (تُحفة)دا فەرموویەتی (وَالْمُسْتَمِعِ) هەروەها سوننەتە: بۆ ئەو كەسەی بە ویستیخۆی گویٚ لە قورئانخوێن دەگریٚ، واتـە: لـە تەواوی ئەو ئایەتەی سوجدەی تیٚدایە (وَيَتَأَكَّدُ لَهُ) سوجدەبردن بۆ گـوێگر زیـاتر دەبێتـە سوننەت (بِسُجُودِالْقَارِئِ) بە هۆی سوجدەبردنی قورئانخوێنەكە.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرمویٚ (وَتُسَنُّ) سوجدەی(تِـلاوَة) سـوننەتە (لِلسَّامِعِ) بـۆ ئـەو كەسەی گویٚی لە ئایەتەكەی سـوجدەیە، هەرچـەند بەویسـتی خۆیشـی گـویٚی لیٚنـەگرتبیٚ (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەڵام بۆ گوێگر خێرتـرە ﴿عَنْ ابْن عمر‌رضي‌الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ‌ﷺ كَانَ يَقْرَأُ السُّـورَةَ الَّتِي فِيهاالسَّجْدَةُ، فَيَسْجُدُ وَنَسْـجُدُ مَعَـهُ﴾ رواه الشـیخان، پێغەمبـەرﷺ ئـەو سـوڕەتەی دەخوێند كە سوجدەی تیٚدایە، ئینجا سوجدەی دەبرد، ئێمەش سوجدەمان لەگەڵ دەبرد.

**وَإِنْ قَرَأَ فِي الصَّلَاةِ سَجَدَ الإِمَامُ وَالْمُنْفَرِدُ لِقِرَاءَتِهِ فَقَطْ، وَالْمَأْمُومُ لِسَجْدَةِ إِمَامِهِ، فَإِنْ سَجَدَ إِمَامُهُ فَتَخَلَّفَ أَوْ انْعَكَسَ بَطَلَتْ صَلَاتُهُ، وَمَنْ سَجَدَ خَارِجَ الصَّلَاةِ نَوَى وَكَبَّرَ لِلإِحْرَامِ**

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە قورئانخوێنەکە: جنۆکە بێ، یان ئادەمیزاد بێ، پیاو بێ، یان ئافرەت بێ، گەورە بێ، یان منداڵێکی فامیدە بێ، دەستنوێژی بچوکی هەبێ، یان نەیبێ، موسڵمان بێ، یان کافر بێ، بۆ گوێگرەکە هەر سوننەتە سوجدەی(تِلاوَة) ببا، بەلام ئەگەر قورئانخوێنەکە جەنابەتدار–واتە: یان حەیزدار بوو– یان شێت، یان سەرخۆش بوو، یان خەوتوو بوو، یان باڵندە بوو، ئەو کاتە بۆ گوێگر سوننەت نیە سوجدەی(تِلاوَة) ببا.

هەروەها ئەگەر قورئانخوێنەکە ئاژەڵ، یان شتێکی بێگیان بوو، دیسان سوجدەی(تِلاوَة) سوننەت نیە، هەروەك (الشبراملسی) ڕوونی کردۆتەوە.

کەوابو: بۆ گوێ لێبوونی تۆمارکراوی ڕادیۆو تەلەفزیۆنو تەسجیل، سوجدەی(تِلاوَة) سوننەت نیە، بەلام ئەگەر تۆمارکراو نەبو، بەڵکو ڕاستەوخۆ بە هۆی بلندگۆ، یان تەلەفزیۆن، یان ڕادیۆ قورئانخوێندنەکە بلاودەکراوە، ئەو کاتە سوجدەی(تِلاوَة) سوننەتە، ئەگەر مەرجەکانیتریش تەواو بن،وَاللهُ أعْلَم.

(وَإِنْ قَرَأَ فِي الصَّلَاةِ) ئەگەر نوێژکەر لە ناو نوێژدا ئایەتێکیسوجدەی خوێند (سَجَدَ الإِمَامُ) سوننەتە: ئیمام سوجدەی(تِلاوَة) ببا (وَالْمُنْفَرِدُ) هەم ئەوەی بەتەنهاییش نوێژدەکا سوننەتە سوجدەی(تِلاوَة) ببا، هەر یەکەیان (لِقِرَائَتِهِ) تەنها بۆ قورئانخوێندنەکەی خۆی سوجدە دەبا (فَقَطْ) نەك بۆ قورئانخوێندنی کەسێکیتر، چونکە ئەگەر نوێژکەر بۆ خوێندنی کەسێکیتر سوجدە ببا، نوێژکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْمَأْمُومُ) مەئموومیش سوجدەی(تِلاوَة) دەبا (لِسَجْدَةِ إِمَامِهِ) بە هۆی سوجدەبردنی ئیمامەکەی، کەوابو: (فَإِنْ سَجَدَ إِمَامُهُ) ئەگەر ئیمامەکەی سوجدەی(تِلاوَة)ی برد (فَتَخَلَّفَ) مەئموومەکەش دواکەوتو سوجدەکەی نەبرد (أوْ انْعَكَسَ) یان بە پێچەوانەوە بوو: ئیمام سوجدەکەی نەبردو مەئموم بردی (بَطَلَتْ صَلَاتُهُ) نوێژی مەئموومەکە بەتاڵ دەبێ، چونکە شوێن ئیمامەکەی نەکەوتوە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيرةَ ﷺ: أَنَّهُ قَرَأَ فِي الصَّلَاةِ: إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ، فَسَجَدَ وَقَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ﴾ رواه الشيخان، (أبوهريرة) لە نوێژدا سورەتی (إِذَاالسَّمَاءُ انْشَقَّتْ)ی خوێندو سوجدەی(تِلاوَة)ی برد، جا لە دوای نوێژ فەرمووی: لە پشت پێغەمبەرﷺ جەماعەتم کردو ئەو سوجدەیەشم لە نوێژدا لەگەڵ ئەودا برد.

## ﴿ چۆنیەتیو مەرجەکانی سوجدەی (تِلاوَة) ﴾

(وَمَنْ سَجَدَ خَارِجَ الصَّلَاةِ) هەر کەسێك لە دەرەوەینوێژدا سوجدەی (تِلاوَة) ببا (نَوَى) واجبە: نیەتی سوجدەی (تِلاوة) بێنێو (وَكَبَّرَ لِلإِحْرَامِ) واجبە: (الله أكبر)ی

رَافِعاً يَدَيْه، ثُمَ لِلْهَوِيِّ بِلاَ رَفْعٍ وَسَجَدَ كَسَجْدَةِالصَّلاَة وَرَفَعَ مُكَبِّراً وَسَلَّمَ، وَتَكْبِيرَةُ الْإِحْرَامِ شَرْطٌ عَلَى الصَّحِيحِ، وَكَذَاالسَّلاَمُ فِي الأَظْهَرِ، وَتُشْتَرَطُ شُرُوطُ الصَّلاَة، وَمَنْ سَجَدَ فِيهَا كَبَّرَ لِلْهَوِيِّ وَلِلرَّفْعِ وَلاَ يَرْفَعُ يَدَيْه، قُلْتُ: وَلاَ يَجْلِسُ لِلإِسْتِرَاحَة وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَقُولُ: سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِه وَقُوَّتِه.

---

سوجەدابەستن بلێو (رَافِعاً يَدَيْـه) سوننەتە: هـەردوو دەستـەكانى بـەرز بكاتـەوە: وەك بەرزكردنـەوەى نوێـژ، واتـە: ئەوانـەىڕابردوو بـە دانيشـتنەوە دەكـا، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(ثُمَّ) ئينجا (ألله أكبر)ێكىتريش دەڵێ (لِلْهَوِيِّ) بـۆ چوونە سوجدە (بِلا رَفْـعٍ) بێدەست بەرزكردنەوەو (وَسَجَدَ) تەنها يەك سوجدە دەبا (كَسَجْدَةِ الصَّلاَةِ) وەكو سوجدەى نوێـژ (وَرَفَـعَ) ئينجـا هەڵدەسـتێتەوە (مُكَبِّـراً) لەگـەڵ هەڵسـانەوەش (ألله أكـبر)ێـك دەڵـێو دادەنيشێ، ئينجا (وَسَلَّمَ) واجبە سەلاميش بداتەوە: وەك سەلامدانەوەى نوێژ.

(وَتَكْـبِيرَةُ الإِحْـرَامِ) ئـەو (ألله أكـبر)ەى سوجدەدابەسـتن (شَـرْطٌ) مەرجـەو واجبـە بـۆ سوجدەدابەسـتن (عَلَى الصَّـحِيحِ) لـە سـەر فەرموودەىڕاسـت (وكَذَاالسَّـلامُ) هـەروەها سەلامدانەوەش مەرجەو واجبە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەى بەهێزتردا.

(وَتُشْتَرَطُ) بەمەرج داندراوە لە سوجدەى(تـلاوَة)دا: (شُروطُ الصَّلاَةِ) گشت مەرجەكانىنوێـژ بێنـەجێ: وەك دەسـتنوێژو پـاكىى لاشـەو شـوێنو بـەرگو ڕوو لەقيبلـەكردنو داپۆشينىعەورەتو هاتنى كاتى سوجدەبردن، واتە: مەرجە ئايەتەكەى سوجدەى بـە تـەواوى خوێندبێ، يان گوێى لێبوبێ، كـەوابو: ئەگـەر تـەنها يـەك پيـت مـابێ ئايەتەكە تـەواو ببـێ، دروسـت نيـە: نـە قورئانخوێنەكـەو نـە گوێگرەكـە هيچيان سـوجدە ببـەن، هـەروەك لەسەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَمَـنْ سَجَدَ فِيهـا) هـەر كەسێك لـە نـاو نوێـژدا سـوجدەى(تـلاوَة) ببـا (كَبَّـرَ لِلْهَوِيِّ) بـۆ هاتنەخوارەوەى سوجدە سوننەتە (الله أكبر) بلێو هەم (وَ لِلرَّفْـعِ) بـۆ هەڵسانەوەش (الله أكبر) بلێ، بەلام (وَلاَيَرْفَعُ يَدَيْهِ) دەستەكانى بەرز ناكاتەوە: نە لە هاتنـەخوارەوەو نـە لـە هەڵسانەوە.

(قُلْتُ) ئيمامى(النواوى) دەفەرموێ (وَلا يَجْلِسُ لِلإِسْتِراحَةِ) لـە دواى سـوجدەكە دانانيشـێ بۆ (جِلْسَةِ الإستراحَة)، بەڵكو يەكسەر هەڵدەستێتەوە پێوە (وَالله أعلَم).

(وَيَقُولُ) سوننەتە: لە ناو سوجدەى(تـلاوة)دا بلـێ: ﴿سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِى خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِـحَوْلِه وَقُوَّتِـهِ﴾ رواه أصحاب السنن بسندصحيح، زاد الحاكم والبيهقي: ﴿فَتَبارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾. جا لەم زيكرەدا جياوازى ناو نوێژو دەرەوەى نوێژيش نيە.

وَلَوْ كَرَّرَ آيَةً فِي مَجْلِسَيْنِ سَجَدَ لِكُلٍّ، وَكَذاالْمَجْلسُ فِيالأَصَحِّ، وَرَكْعَةٌ كَمَجْلِسٍ وَرَكْعَتَانِ كَمَجْلِسَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَسْجُدْ وَطَالَ الْفَصْلُ لَمْ يَسْجُدْ. وَسَجْدَةُ الشُّكْرِ لاَ تَدْخُلُ الصَّلاَةَ، وَتُسَنُّ لِهُجُومِ نِعْمَةٍ أَوِ انْدِفَاعِ نِقْمَةٍ أَوْ رُؤْيَةِ مُبْتَلىً أَوْ عَاصٍ، وَيُظْهِرُهَا لِلْعَاصِي لاَ لِلْمُبْتَلِي،

---

(وَلَوْ كَرَّرَ آيَةً) ئەگەر ئایەتێکی دووبارە کردەوە (فِي مَجْلِسَيْنِ) لە دوو دانیشگەدا (سَجَدَ لِكُلٍّ) لە هەموو جارێکدا سوجدەی(تلاوة) دەبا (وَكَذا المَجْلِسُ) هەروەها ئەگەر لە یەك دانیشگەدا ئایەتێك دوو جار بڵێتەوە، هەردووجار سوجدەی(تلاوة) دەبا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (وَرَكْعَةٌ) ڕەکعەتێکی نوێژ (كَمَجْلِسٍ) وەکو یەك دانیشگەیە، واتە: ئەگەر لە ڕەکعەتێکدا ئایەتێکی دووبارە کردەوە، لە فەرموودەی ڕاستردا: سوجدەش دووبارە دەباتەوە (وَرَكْعَتَانِ كَمَجْلِسَيْنِ) دوو ڕەکعەتیش وەکو دوو دانیشگەیە، واتە: ئەگەر ئایەتەکەی دووبارە کردەوە سوجدەش دووبارە دەکاتەوە.

(فَإِنْ لَمْ يَسْجُدْ) جا ئەگەر–لە دوای تەواوبوونیئایەتەکە– سوجدەی(تلاوة)ی نەبرد (وَطَالَ الْفَصْلُ) ماوەیەکیدرێژیش کەوتە نێوان تەواوبوونیئایەتەکەو سوجدەکە، ئەوە (لَمْ يَسْجُدْ) نابێ سوجدەکە ببا، کەواتە: قەزاش ناکرێتەوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە. بەڵام ئەگەر نێوانەکە نزیك بێ: وەك لە دوای تەواوبوونی ئایەتەکەیسوجدە یەکسەر تەنها ئایەتێکیتر بخوێنێو یەکسەر سوجدەی(تلاوة)ش ببا، ئەو کاتە سوجدەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە (الشرواني) لە سەرەتای ئەم باسەدا ڕوون کراوەتەوە.

﴿سوجدەی شوکر﴾

(وَسَجْدَةُ الشُّكْرِ) سوجدەی شوکر (لاتَدْخُلُ الصَّلاةَ) ناچێتە ناو نوێژ، واتە: ئەگەر بەقەسدی لە ناو نوێژدا سوجدەیشوکر بباو بشزانێ حەرامە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَتُسَنُّ) سوجدەیشوکر سوننەتە (لِهُجُومِ نِعْمَةٍ) لە کاتی پەیدابوونی نیعمەتێکینوێ: بۆ خۆی، یان بۆ موسڵمانان (أَوْ إِنْدِفاعِ نِقْمَةٍ) یان لە کاتی لاچوونی ناخۆشیەك: لە سەر خۆی، یان لە سەر موسوڵمانان ﴿عَنْ أَبِيبَكْرَةَ‌ﷺ: أَتَى النَّبِيَّ‌ﷺ أَمْرٌ فَسُرَّ بِهِ فَخَرَّ لِلّهِ ساجِداً﴾ رواه الترمذي وَحَسَّنَهُ، پێغەمبەرﷺ هەواڵێکی بۆ هاتو پێی دڵخۆش بوو، ئینجا یەکسەر بۆ خوا کەوتە سوجدە بردن.

(أَوْ رُؤْيَةِ مُبْتَلىً) یان لە کاتی دیتنی خاوەن بەلایەك (أَوْ عاصٍ) یان لە کاتی دیتنی گوناهبارێك، واتە: سوننەتە سوجدەی شوکر ببا؟ کە خوا لەو بەلایە، یان لەو گوناهە پاراستویەتی (وَيُظْهِرُها) سوننەتە: سوجدەی شوکر ئاشکرا بکا (لِلْعاصِي) بۆ ئەو گوناهبارەی گوناه دەکا، تاکو ڕووشکێن ببێ بەڵکی تۆبە بکا (لاَ لِلْمُبْتَلَي) بەڵام نابێ بۆ خاوەن بەلا سوجدەکە ئاشکرا بکا، نەوەك دڵی بشکێ.

وَهِيَ كَسَجْدَةِ التِّلاَوَةِ، وَالْأَصَحُّ جَوَازُهُماَ عَلَى الرَّاحِلَةِ لِلْمُسَافِرِ، فَإِنْ سَجَدَ لِتَلاَوَةِ صَلاَةٍ جَازَ عَلَيْهَا قَطْعاً.

(بابٌ)

---

(وَهِيَ) سوجدەی‌شوکر تەنها یەك سوجدەیە (كَسَجْدَةِ التِّلاوَةِ) وەکو سوجدەی(تِـلاوَة)ی دەرەوەی نوێژە: لە گشت مەرج‌و چۆنیەتی‌دا، قەزاش ناکرێتـەوە (وَالأصَحُّ) فـەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (جَوازُهُما) سوجدەی(تلاوَة)و سوجدەی شوکر هەردووکیان دروستن (عَلى الرَّاحِلَةِ) لە سەر پشتی وولاغ (لِلْمُسافِرِ) بۆ مرۆڤی ڕێبوار: بە ئاماژەکردن وەك سوجدەی نوێژی سوننەت (فَإنْ سَجَدَ لِتِلاوَةِ صَلاةٍ) ئەگەر سوجدەی برد لە بەر خوێندنی قورئـان لـە ناو نوێژدا (جَازَ عَلَيْها) ئـەوە سـوجدەی(تـلاوَة) لـە سـەر پشتی وولاغ بـەئاماژە دروسـتە (قَطْعاً) بە فەرموودەیەکی بڕاوە.

﴿**پاشـکۆ**﴾: خواپەرسـتی بـە ڕوکوعێکی‌تـەنها، واتـە: کـە لـە نوێـژدا نـەبێ، یـان بـە سوجدەیەك: کە هۆیەکی نەبێ- هەرچەند لە دوای‌نوێژیش بێ- گشتی حەڕامە، هـەروەها ڕوکووع، یان سوجدەبردن لە بەر دەست شێخ‌و مرۆڤی‌گەورەدا حەڕامە، هەرچـەند بـەرەو قیبلەش بێ، بەڵکو جاری وا هەیە: بەو ڕوکووع‌و سوجدەیە کافر دەبێ (أعاذَنا الله تعالى)، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

## ﴿ بابٌ: لە باسی نوێژی سوننەت ﴾

(**پێشـەکی**) بزانـە: لـە دوای ئیسـلامبوون، نوێـژکردن لـە گشـت خواپەرسـتیەکانی لاشـەیی گەورەترە، کەوابو: نوێژی‌واجب لە گشـت واجبـەکان گـەورەترەو نوێژی‌سـوننەتیش لـە گشـت سوننەتێك گـەورەترە، بـەڵام قورئـان لەبـەرکردن‌و هـەروەها خـەریکبوون بـە زانسـتی ئـایینی خێری زۆرترە لە نوێژی سوننەت-هەروەك ئیمامی(شافعي) فەرموویەتی- چونکە ئـەو دووانـە (فَرْضُ الْكِفايَةِ)نە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە. هەروەها خێـری واجب حـەفتا پلـە گەورەترە لە خێری سوننەت، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: پێویستە مرۆڤی موسـڵمان-لـە دوای بـەجێهێنانی واجـب- زۆر سـوننەت بکـاو بەردەوام بێ لە سەر ئەو سـوننەتانەی لێـرەدا باسـیان دەکـەین-إن شـاء الله تعـالى-تـاکو ببێتـە دۆسـتی ڕاسـتەقینەی خوای‌گـەورە، هـەروەك خوای‌گـەورە لـە حەدیسـێکی(قُدْسـي)دا دەفـەرموێ: ﴿مَنْ عَادَى لِي وَلِيّاً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَماتَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَـيَّ مِمَّاافْتَرَضْتُهُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَزَالُ عَبْدِي يَتَقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ...﴾ الحـديثَ رواه البخـاري، هەر کەسێك دژایەتی دۆستێکی من بکا، ئەوە بەڕاسـتی ئاگـادارم کـردەوە: جـەنگی لەگـەڵ دەکەم، هیچ شتێك لە لای من لە بـەجێهێنانی واجـب خۆشەویسـتتر نیـە کـە بەنـدە بیـەوێ

صَلاةُ النَّفلِ قسمَان: قسمٌ لايُسَنُّ جمَاعَةً، فَمنهُ الرَّوَاتبُ مَعَ الْفَرائضِ وَهِيَ: رَكْعَتَانِ قَبْلَ الصُّبحِ وَرَكْعَتَانِ قَبْلَ الظُّهرِ وَكَذَا بَعْدَهَا وَبَعْدَ الْمَغرِبِ وَالْعِشَاءِ،

---

خۆی پیٚ له من نزیك بكاتەوه، بەندەی من بەردەوام به سوننەت كردن خۆی له من نزیك دەكاتەوه، تا خۆشم دەویٚ... تا كۆتایی حەدیسەكە.

جگە له ناوەڕۆكی ئەو حەدیسەش نوێژە سوننەتەكان ناتەواوی نوێژە واجبەكان پڕ دەكەنەوه، هەم له قیامەتیشدا–نەك له دونیادا– جێگەی ئەو نوێژە واجبانە دەگرنەوه: كە له بیری چووە قەزایان بكاتەوه، هەروەك له (تحفە)دا ڕوونی كردۆتەوەو، له باسی قەزا كردنەوەی نوێژیش بە بەڵگەوە درێژتر ڕوونمان كردەوە.

﴿(اَلرَّواتِبُ): سوننەتەكانی دامەزراو لەگەڵ نوێژە واجبەكاندا﴾

(صَلاةُ النَّفلِ) نوێژی سوننەت (قِسمانِ) دوو بەشن: (قِسمٌ لا يُسَنُّ جَماعَةً) بەشێكیان سوننەت نیە: بە جەماعەت بكرێن، بەڵكو سوننەتە بە تەنهایی بكرێن، چونكە پێغەمبەرﷺ بە تەنهایی كردونی، بەڵام ئەگەر بە جەماعەتیش بكرێن، خودی سوننەتەكە دروست دەبیٚو ناپەسندیش نیە، هەروەك له سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَمِنْهُ) هەندێك لەو سوننەتانەی جەماعەتیان تیٚدا سوننەت نیە (اَلرَّواتِبُ) ئەو سوننەتە دامەزراوانە: كە (مَعَ الْفَرائِضِ) له پێش و له دوای نوێژە واجبەكاندا دەكرێن (وَهِيَ) ئەو سوننەتە دامەزراوانە ئەمانەن:

(ركْعَتانِ قَبْلَ الصُّبْحِ) دوو ڕەكعەت له پێش نوێژی سبەینیٚدا: بە نیەتی سوننەتی پێش نوێژی سبەینیٚ، یان بەیانی، له دوای فاتیحە: له ڕەكعەتی‌یەكەمدا سورەتی (قُلْ يَاأَيُّها الْكافِرُونَ)و له ڕەكعەتی‌دووەمدا سورەتی (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) دەخوێنیٚ، هەروەك (مسلم) گێڕاویەتیەوە.

جا بزانە: هەر نوێژێكی سوننەت: كە سورەتی‌تایبەتی‌ی بۆ دانەندرابیٚ–له دوای‌فاتیحە– ئەو دوو سورەتانەی‌ڕابردووی تیٚدا سوننەتن، هەروەك له (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَركْعَتانِ قَبْلَ الظُّهْرِ) دوو ڕەكعەتیش له پێش نوێژی نیوەڕۆدا: بە نیەتی سوننەتی پێش نیوەڕۆ (وكَذا بَعْدَها) هەروەها دوو ڕەكعەتیش له دوای نوێژی نیوەڕۆدا: بە نیەتی سوننەتی دوای نیوەڕۆ (وَبَعْدَالْمَغْرِبِ) دوو ڕەكعەتیش له دوای نوێژی مەغریبدا: بە نیەتی سوننەتی دوای مەغریب (وَالْعِشاءِ) دوو ڕەكعەتیش له دوای نوێژی‌عیشادا: بە نیەتی سوننەتی دوای عیشا ﴿عَنْ عبدالله بن عمر رضي الله عنهما: حَفِظْتُ مِنْ رَسولِ اللهِﷺ عَشَرَ رَكَعاتٍ: رَكْعَتَيْنِ قَبلَ الظُّهرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَها، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشاءِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبلَ صَلاةِ الصُّبْحِ﴾رواه الشیخان، دە ڕەكعەت سوننەتم له پێغەمبەرﷺ وەبیر دیٚ بەردەوام

وَقِيلَ لاَ رَاتِبَ لِلْعِشَاءِ، وَقِيلَ أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَقِيلَ وَأَرْبَعٌ بَعْدَهَا، وَقِيلَ وَأَرْبَعٌ قَبْلَ الْعَصْرِ، وَالْجَمِيعُ سُنَّةٌ وَإِنَّماالْخِلاَفُ فِيالرَّاتِبِ الْمُؤَكَّدِ، وَرَكْعَتَانِ خَفِيفَتَانِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ، قُلْتُ: هُمَا سُنَّةٌ عَلَىالصَّحِيحِ فَفِي صَحِيحِ الْبُخَارِيِّ الأَمْرُ

---

دەیکردن: دوو لە پێش نیوەڕۆ و دوو لە دوای نیوەڕۆ، دوو لە دوای مەغریب لە ماڵەوە دەیکردن، دوو لە دوای عیشا، دوو لە پێش نوێژی سبەینێ.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لاَ رَاتِبَ لِلْعِشَاءِ) نوێژی عیشا سوننەتی دامەزراوی نیە، چونکە دەگونجێ: دوو ڕەکعەتەکەی حەدیسیڕابردوو شەونوێژ بن (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتردا (أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ) چوار ڕەکعەت لە پێش نوێژی نیوەڕۆدانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتردا (وَأَرْبَعٌ بَعْدَهَا) چوار ڕەکعەت لە دوای نوێژی نیوەڕۆدانە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، هەر کەسێك بەردەوام چوار ڕەکعەت سوننەت لە پێش نیوەڕۆداو چواریش لە دوای نیوەڕۆدا بکا، خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ قەدەغەی دەکا.

(وَقِيلَ أَرْبَعٌ قَبْلَ الْعَصْرِ) لە فەرموودەیەکدا: چوار ڕەکعەت سوننەت لە پێش نوێژی عەسردانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿رَحِمَ اللهُ امْرَأً صَلَّى قَبْلَ الْعَصْرِ أَرْبَعاً﴾ رواه أبوداود والترمذي بسندحسن، خوا ڕەحم بەو کەسە بکا: کە لە پێش نوێژی عەسردا چوار ڕەکعەت سوننەت دەکا. هەروەها دوو ڕەکعەتیش لە پێش عەسردا سوننەتن ﴿عَنْ عَلِيٍّ: أَنَّ النَّبِيَّﷺ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الْعَصْرِ رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه أبوداود بإسنادٍ صحيح، پێغەمبەرﷺ لە پێش نوێژی عەسردا دوو ڕەکعەت سوننەتی دەکردن.

(وَالْجَمِيعُ سُنَّةٌ) گشت ئەوانەی باسمان کردن سوننەتن، چونکە لە حەدیسی(صحیح)دا هاتون، بەڵام (وَإِنَّمَاالْخِلاَفُ) تەنها جیاوازی (فِيالرَّاتِبِ الْمُؤَكَّدِ) لەوەدایە: سوننەتە دامەزراوەکان کامەیان (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ)ن، واتە: زۆر خێرن؟ لە فەرموودەیبەهێزدا: دە ڕەکعەتەکەی حەدیسییەکەم (سُنَّةٌ مُؤَكَّدَةٌ)ن، چونکە پێغەمبەرﷺ بەردەوام کردونی، ئەوانیتریش تەنها سوننەتن.

ئینجا بزانە: هەرکاتێك چوار ڕەکعەت سوننەتی کردن، سوننەتە: هەر کە دوو ڕەکعەتی تەواو کردن سەلام بداتەوە، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرمویەتی.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتردا (رَكْعَتَانِ خَفِيفَتَانِ) دوو ڕەکعەتی سووك سونەتن (قَبْلَ الْمَغْرِبِ) لە پێش نوێژیمەغریبدا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (هُمَا سُنَّةٌ) ئەو دوو ڕەکعەتە سوننەتن (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست (فَفِي صَحِيحِ الْبُخَارِي الأَمْرُ

بهما) چونكه لـه حەديسى(بخارى)دا فـەرمانيان پىٚكراوه، پێغەمبـەر ﷺ فەرموويـەتى: ﴿صَلُّوا قَبْلَ صَلاةِ الْمَغْرِبِ، ثُمَ قَالَ فِيالثَّالِثَةِ: لِمَــنْ شَــاءَ﴾ رواه البخاري، زاد أبوداود: ﴿رَكعَتَينِ﴾. لـه پـێش نوێژى مەغريبـدا دوو ڕەكعـەت سوننەت بكـەن، ئينجا لـه جارى سىٚيەمدا فەرمووى: بۆ ئەو كەسەى حەز دەكا.

هــەروەها دوو ڕەكعــەتيش لــه پــێش نوێژىعيشــادا ســوننەتن، چــونكه پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمویٚ: ﴿بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاةٌ، ثُمَ قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ﴾ رواه الشيخان، له نێوان گشت بانگ و ئيقامەتێكدا نوێژێكى سوننەت هەيە. واته: به يەكدەنگى زانايـان: (أَذانَيـْنِ) به بانگو ئيقامەت دەگوترێ، هـەر وەك لـه (المجموع)دا فەرموويـەتى، هـەم بـه بەلگـەى حەديسەكەى (عَبدُاللّه بن الزُّبَير)ىداهاتوو،إن شاء اللّه تعالى.

## ﴿ سوننەتى جومعە ﴾

(وَبَعدَ الْجُمُعَةِ أَرْبَعٌ) له دواىنوێژىجومعه چوار ڕەكعەت سونەتن، به نيەتىسوننەتى دواى جومعه، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: ﴿إِذاصَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْــدَها أَرْبَعــاً﴾ رواه مسلم، هەركاتێك يەكێكتان نوێژى جومعەى كرد، با چوار ڕەكعەت نوێـژى سوننەتيش لـه دواىدا بكا. هەروەها دوو ڕەكعەتيش له دواى جومعەدا سوننەتن ﴿عَنْ اِبْنِ عُمَرَرَضِىاللّه عَنْهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّى بَعْدَ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَينِ فِي بَيْتِهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبـەر ﷺ لـه دواى جومعه دوو ڕەكعەت سوننەتى له ماڵەوه دەكردن.

(وَقَبْلَهَا) هەم له پێش نوێژى جومعەشدا نوێژى سوننەت هەيە: به نيەتى سـوننەتى پـێش جومعه، وەك (مَا قَبْلَ الظُّهْرِ) ئەو سوننەتانەى پێش نيـوەڕۆ، واتـه: يـان چـوار ڕەكعـەت، يان دوو ڕەكعەت، به بەلگەى حەديسەكەى(أَذانَـيْنِ)ىڕابـردوو (وَاللّه أعلـم)، واتـه: چـونكه جومعەش بانگو ئيقامەتى له پێشدا هەيە.

هەم ﴿عَنْ عبداللّهِ بن الزُّبَيْرِرَضِىاللّه عَنْهُما: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: مَا مِنْ صَـــلاةٍ مَفْرُوضَـــةٍ إلاّ وَبَــيْنَ يَــدَيْها رَكْعَتانِ﴾ رواه إبن حبان وصـححه، هــەر نوێـژێكى واجـب بىٚ، دوو ڕەكعـەت سوننەتيشـى لـه پێشدا هەيە. واته: (جومعه)ش نوێژێكى واجبه، كەوابو: دوو ڕەكعەتيشى له پێشدا سوننەته.

هــەم ﴿وَعَنْ عبداللّه بنِ مسعود ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّى قَبْلَ الْجُمُعَةِ أَرْبَعاً وَبَعْدَهَا أَرْبَعاً وَكَانَ يَأْمُرُ بِهاَ﴾ رواه عبدالرزاق بسند صحيح والترمذي، فهو أثر صحيح، (عبداللّه بن مسعود) له پێش نوێژى جومعەدا چوار ڕەكعـەت سـوننەتى دەكـردنو لـه دواى جومعـەش چـوار ڕەكعـەتى دەكردن، فەرمانيشى دەدا: خەڵك ئەو سوننەتانه بكا، واتـه ئـەم (صـحابه) بـەڕێزەش لـه پێغەمبەرەوە ﷺ بەلگەيەكى هەبوه، بۆيێ واى دەكرد.

## ﴿ نوێژی وەتر ﴾

(وَمِنْهُ) یەکێکیتر لەو سوننەتانەی جەماعەتیان تێدا سوننەت نیە: (اَلْوِتْرُ) نوێژی وەترە، واتە: تاك، (وَأَقَلُّهُ) لای کەمی وەتر (رَكْعَةٌ) تەنها یەك ڕەکعەتە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْوِتْرُ حَقٌّ عَلى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلاثٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِواحِــدَةٍ فَلْيَفْعَــلْ﴾ رواه أبوداود بسندصالح، سوننەتیوەتر مافێکی ڕاستە لە سەر گشت موسڵمانێك، جا هەر کەسێك پێی خۆشە: با بە پێنج ڕەکعەت وەتر بکا، هەر کەسێك پێی خۆشە: با بە سێ ڕەکعەت وەتر بکا، هەر کەسێك پێی خۆشە: با بە یەك ڕەکعەت وەتر بکا.

ئینجا بزانە: لای کەمی وەتریتەواو سێ ڕەکعەتە، لە دوای فاتیحە: لە ڕەکعەتییەکەمدا سوڕەتی﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلى﴾ بخوێنێو لە ڕەکعەتیدووەمدا سوڕەتی﴿قُــلْ يَاأَيُّهَــا الْكَافِرُونَ﴾و لە ڕەکعەتیسێیەمدا سوڕەتی﴿قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ﴾و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)و (قُــلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن.

جا ئەگەر وەترەکەی لە سێ ڕەکعەت زیاتر بوو، ئەو کاتەش ئەو سوڕەتانەیڕابردوو، لە سێ ڕەکعەتەکەی ئاخیردا سوننەتنو لەوانی پێشداش سوننەتە: سوڕەتەکانیتر بە گوێرەی ڕیزی قوڕئان بخوێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَأَكْثَرُهُ) لای زۆریوەتر لە فەرموودەی بەهێزیمەزهەبدا (إِحْدَىعَشرَةَ) یانزە ڕەکعەتە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِىَاللهُ عَنها: كانَ النَّبِيُّ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَىعَشرَةَ رَكْعَةً يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَيُوتِرُ مِنْهَا بِواحِدَةٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ بە شەوێ یانزە ڕەکعەتی دەکردنو لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا سەلامی دەداوەو لەو یانزەیە یەکێکی دەکردە تاك. جگە لەوانەش: حەفت ڕەکعەتو نۆ ڕەکعەتیش لە حەدیسی(صحیح)دا هاتووە، خێرەکەش بە گوێرەی زۆرترەکەیەتی.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لای زۆریوەتر (ثَلاثَ عَشرَةَ) سێزدە ڕەکعەتە، هەروەك ئەوەش لە چەند حەدیسێکی (بخاریو مسلم)دا هاتووە، بەڵام فەرموودەی بەهێز وەڵامی دەداتەوە: کە دووانیان لەو سێزدەیە سوننەتی دوایعیشا بووە، کەوابو: لە سەر فەرموودەی بەهێز: لە یانزە ڕەکعەت–بە نیەتی وەتر– زیاتر دروست نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەم لە فەرموودەی بێهێزیش لە سێزدە ڕەکعەت–بە نیەتی وەتر– زیاتر دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

وَلِمَنْ زَادَ عَلَى رَكْعَةٍ اَلْفَصْلُ وَهُوَ أَفْضَلُ، وَالْوَصْلُ بِتَشَهُّدٍ أَوْ تَشَهُّدَيْنِ فِي الآخِرَتَيْنِ، وَوَقْتُهُ بَيْنَ صَلاَةِ الْعِشَاءِ وَطُلُوعِ الْفَجْرِ،

---

(وَلِمَنْ زَادَ عَلَى رَكْعَةٍ) دروسته: بۆ ئەو کەسەی لە ڕەکعەتێك زیاتر وەتر دەکا: (اَلْفَصْلُ) نێوان بخاتە وەترەکەی بە سەلامدانەوە: وەك لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا نیەت بێنیٚو تەحیات بخوێنیٚو سەلام بداتەوە، ئینجا بۆ تاکەکەش نیەت بێنیٚو بیکاو تەحیات بخوێنیٚو سەلام بداتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان نیەت بێنیٚ: گشت ڕەکعەتە جووتەکان بە یەکەوە بکا، ئینجا تەحیاتێك بخوێنیٚو سەلام بداتەوە، ئینجا بۆ تاکەکەش نیەت بێنیٚو بیکاو تەحیات بخوێنیٚو سەلام بداتەوە، هەروەك لە (القليوبى)و (الشروانى)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَهُوَ) ئەو نێوانە بە هەردوو شێوەیڕابردوو (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە لە پێکوەنانی داهاتوو، چونکە حەدیسەکانی زۆرترن: وەك حەدیسەکەی(عائشة)یڕابردوو و هەم حەدیسەکەی﴿صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى﴾ رواه الشيخان، نوێژی شەویٚ دوو دووە.

(وَالْوَصْلُ) هەروەها پێکوەنانی ڕەکعەتەکانی وەتریشی بۆ دروستە: (بِتَشَهُّدٍ) بە یەك تەحیات، واتە: نیەت بێنیٚ جووتەکانو تاکەکە بە یەکەوە بکاو لە کۆتاییدا یەك تەحیات بخوێنیٚو سەلام بداتەوە (أَوْ تَشَهُّدَيْنِ) یان بە دوو تەحیات (فِي الأَخِيرَتَيْنِ) لە هەردوو ڕەکعەتەکەی ئاخیردا: وەك نیەت بێنیٚ گشت جووتەکان بە یەکەوە بکاو تەحیاتێك بخوێنیٚو سەلام نەداتەوە، بەڵکو هەڵسێتەوە تاکەکەش بکاو تەحیات بخوێنیٚ، ئینجا سەلام بداتەوە، چونکە ئەم دوو شێوەیەش لە حەدیسی (صحيح)دا هاتون.

بەڵام لە حاڵەتی پێکوەناندا لەو دوو تەحیاتە زیاتر دروست نیە، هەم دروستیش نیە تەحیاتەکەیەکەم لە کۆتاییجووتەکانەوە بباتە ناو جووتەکان، چونکە پێغەمبەرﷺ ئەو دوو شێوەی نەکردون، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: یەك ڕەکعەت وەتر بکا، یان زیاتر، پێکەوە بیکا، یان نێوانی بخاتیٚ بە سەلامدانەوە، لە گشت حاڵەتێکدا نیەتیوەتر دەهێنیٚ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، ئینجا سوننەتە لە دوایوەتر سیٚ جار بڵیٚ: ﴿سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ﴾. ئینجا بڵیٚ: ﴿اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ﴾ الحديثان صحيحان رواهما أبوداود وغيره.

(وَوَقْتُهُ) کاتی نوێژیوەتر (بَيْنَ صَلاَةِ الْعِشَاءِ) لە نێوان کردنی نوێژی عیشاو (وَطُلُوعِ الْفَجْرِ) دەرکەوتنی بەیانە، بە (إجماع)ی زانایان، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

کەوابو: ئەگەر نوێژی عیشای بە (جمع التقديم) لە کاتیمەغریبدا کرد، ئەو کاتە وەتریشی بۆ دروستە، هەرچەند کاتیعیشاش نەهاتبیٚ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر نوێژی عیشای نەکردبو، یان کردبوی بەڵام دروست نەبو، ئەو کاتە وەتری بۆ دروست نیە، هەر چەند کۆتایی شەویش بێ، هەروەها ئەگەر نوێژی عیشای کردو وەتریشی کرد، ئینجا ئاشکرا بوو: نوێژی عیشای دروست نەبوە، ئەو کاتە وەترەکەشی دروست نەبوە، بەڵام مەرج نیە: سوننەتی دوای عیشا بکا، بەڵکو دروستە: وەتر بکا، ئینجا سوننەتی دوای عیشا بکا، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانەی ڕوون کردۆتەوە.

هەروەها ئەگەر نوێژی عیشای نەکردو فەوتا، ئەو کاتەش واجبە: لە پێشدا نوێژی عیشا قەزا بکاتەوە، ئینجا دروستە وەترەکەش قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة) و (نهایة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (شَرْطُ الإِيتَارِ بِرَكْعَةٍ) مەرجی دروستبوونی وەتر کردن بە یەك ڕەکعەت ئەوەیە (سَبْقُ نَفْلٍ) سوننەتێك لە پێش ڕەکعەتەکەدا بکرێ (بَعْدَ الْعِشَاءِ) لە دوای نوێژی عیشا، تاکو بەو ڕەکعەتە سوننەتەکە ببێتە تاك، بەڵام لە فەرموودەی ڕاستدا: ئەگەر سوننەتەکەش نەکرێ، ئەو کاتە ڕەکعەتەکە نوێژە واجبەکە دەکاتە تاك، ئەوەندەش بەسە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُسَنُّ) سوننەتە: (جَعْلُهُ آخِرَ صَلَاةِ اللَّيْلِ) گشت وەترەکەی لە دوای نوێژەکانی شەوێدا بکا: وەك سوننەتی عیشاو تەڕاویحو (تَهَجُّد)، واتە: ئەو شەونوێژەی لە دوای خەوتن دەکرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا﴾ رواه الشيخان، نوێژی وەتر بکەنە ئاخیری نوێژەکانتان لە شەوێدا. کەوابو: ئەگەر –لە ڕەمەزاندا– دەیویست لە دوای تەڕاویح زیاتر شەونوێژ بکا، ئەو کاتە لەگەڵ تەڕاویحدا هیچ بەشێکی وەترەکەی بە جەماعەت نەکا، بەڵکو سوننەتە: گشت وەترەکەی بخاتە ئاخیری شەونوێژەکانی، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە

بەڵام ئەگەر باوەڕی وا نەبو لە خەو هەشیار ببێتەوە، یان ماوەی وەتری نەدەما، ئەو کاتە سوننەتە: لە دوای سوننەتیعیشادا وەترەکەی بکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر تەنها وەترەکەش لە دوای خەوتن بکا، ئەوە خێری زۆرترە، چونکە هەم دەبێتە وەترو هەم دەبێتە (تَهَجُّدْ)، هەروەك لە (تحفة) و (نهایة)دا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ خَافَ أَلاَّ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ وَذَلِكَ أَفْضَلُ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك بترسێ: کە لە ئاخیری شەوێدا لە خەو هەڵنەستێ، با لە سەرەتای شەوێدا وەتر بکا، هەر کەسێك بە تەما بوو لە ئاخیری شەوێدا لە خەو هەڵستێ، با لە ئاخیری شەوێدا

فَإِنْ أَوْتَرَ ثُمَّ تَهَجَّدَ لَمْ يُعِدْهُ، وَقِيلَ يُشَفِّعُهُ بِرَكْعَة ثُمَّ يُعِيدُهُ، وَيُنْدَبُ الْقُنُوتُ آخِرَ وِتْرِهِ فِي النِّصْفِ الثَّانِي مِنْ رَمَضَانَ، وَقِيلَ كُلِّ السَّنَة، وَهُوَ كَقُنُوتِ الصُّبْحِ،

---

وەتر بکا، چونکە نوێژی ئاخیری شەوێ مەلائیکە ئامادەی دەبن‌و خێریشی گەورەترە.

واتە: چونکە هەم (تَهَجُّد)و هەم وەترە.

جا بزانە: هەر کاتێك وەتری کرد ڕێگەی وەترێکی‌تری لێ‌دادەخرێ، کەوابو: (فَإِنْ أَوْتَرَ) ئەگەر وەتری کرد (ثُمَّ تَهَجَّدَ) ئینجا لە خەو هەڵساو (تَهَجُّد)ی کرد (لَمْ يُعِدْهُ) دروست نیە: وەترەکە دووبارە بکاتەوە؟ چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لا وِتْرَانِ فِي لَيْلَة﴾رواه أصحاب السنن بسندحسن، دوو وەتر لە شەوێکدا نابن. کەوابو: ئەوەندەی توانای هەیە لە دوای وەترەکە جووت جووت شەونوێژ-(تَهَجُّد)- دەکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (يُشَفِّعُهُ) وەترەکە دەکاتەوە جووت (بِرَكْعَة) بە ڕەکعەتێکی‌تر (ثُمَّ يُعِيدُهُ) ئینجا لە دوای (تَهَجُّد) وەترەکەی دووبارە دەکاتەوە، جا بە مە دەگوترێ: (نَقْضُ الْوِتْر) هەڵوەشاندنەوەی وەتر، بەڵام ئەم فەرموودە بێ‌هێزە بە حەدیسەکەی‌ڕابردوو ڕەد کراوەتەوە.

(وَيُنْدَبُ الْقُنُوتُ) سوننەتە قونووت بخوێنێ (آخِرَ وِتْرِه) لە ئاخیری وەترەکەی‌دا، واتە: لە دوای ڕوکووعی ڕەکعەتە تاکەکە، هەر چەند تەنها بە یەك ڕەکعەتیش وەتر بکا (فِي النِّصْفِ الثَّانِي) لە نیوەی‌دووەمدا (مِنْ رَمَضَانَ) لە مانگی‌ڕەمەزاندا ﴿عَنْ عمرﷺ: اَلسُّنَّةُ إذاانْتَصَفَ شَهْرُرَمَضانَ: أنْ يَلْعَنَ الْكَفَرَةَ فِي الْوِتْرِ بَعْدَ ما يَقُولُ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ﴾ رواه الشيرازي في المهذب والرافعي في العزيز وابن زرقويه في الفوائد، وقال الحافظ العسقلاني في التلخيص: إسناده حسن، وروى محمد بن نصر: نحوه عن ابن عمر باسنادصحيح، ئیمامی(عمرﷺ) فەرمووی: هەر کاتێك ڕەمەزان بووە نیوە، سوننەتە: لەعنەت لە کافرەکان بکا لە نوێژی وەتردا، لە دوای (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: قونووت بخوێنێ.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (كُلِّ السَّنَة) لە تەواوی ساڵێ‌دا گشت شەوێك سوننەتە لە وەتردا قونووت بخوێنێ، لە (المجموع)دا-بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌داهاتوو- ئەم فەرموودەی بە بەهێز داناوە.

(وَهُوَ) قونووتی وەتر (كَقُنُوتِ الصُّبْحِ) وەکو قونووتی نوێژی سبەینێیە: لە ووشەکانی‌و لە شوێنی خوێندنی‌و لە دەنگ هەڵێنان‌و دەست بەرزکردن‌و سوجدەی‌سەهوو بۆ نەخوێندنی‌و ...هتد ﴿عَنِ الْحسن بن عَلِيٍّ رضي الله عنهما: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِﷺ كَلِماتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ: اَللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ...﴾ الحديث رواه أصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ چەند ووشەیەکی فێرکردم لە قونووتی وەتردا بیانڵێم: کە (اَللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ...) تا کۆتایی حەدیسەکەی‌ڕابردوو لە چۆنیەتی نوێژکردندا.

وَيَقُولُ قَبْلَهُ: اَللَّهُمَّ إِنَّا نَسْتَعِينُكَ وَنَسْتَغْفِرُكَ إلى آخره. قُلْتُ: اَلأَصَحُّ بَعْدَهُ، وَأَنَّ الْجَمَاعَةَ تُنْدَبُ فِي الْوِتْرِ عَقِبَ التَّرَاوِيحِ جَمَاعَةً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمِنْهُ الضُّحَى، وَأَقَلُّهَا رَكْعَتَانِ،

---

(وَ يَقُولُ قَبْلَهُ) سوننەتە: لە پێش قونووتیڕابردوودا ئەم قونووتەی ئیمامی(عمر) بخوێنێ: ﴿اَللَّهُمَّ إِنَّا نَسْتَعِينُكَ وَنَسْتَغْفِرُكَ وَنَسْتَهْدِيكَ وَنُؤْمِنُ بِكَ وَنَتَوَكَّلُ عَلَيْكَ وَنُثْنِي عَلَيْكَ الْخَيْرَ كُلَّهُ، نَشْكُرُكَ وَلاَ نَكْفُرُكَ وَنَخْلَعُ وَنَتْرُكُ مَنْ يَفْجُرُكَ، اَللَّهُمَّ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَلَكَ نُصَلِّي وَنَسْجُدُ وَإِلَيْكَ نَسْعَى وَنَحْفِدُ، نَرْجُوْ رَحْمَتَكَ وَنَخْشَى عَذَابَكَ إِنَّ عَذَابَكَ الْجِدَّ بِالْكُفَّارِ مُلْحِقٌ، اَللَّهُمَّ عَذِّبِ الْكَفَرَةَالَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ وَيُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ وَيُقَاتِلُونَ أَوْلِيَاءَكَ، اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَأَصْلِحْ ذَاتَ بَيْنِهِمْ وَأَلِّفْ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَاجْعَلْ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيْمَانَ وَالْحِكْمَةَ وَثَبِّتْهُمْ عَلَى مِلَّةِ رَسُولِكَ وَأَوْزِعْهُمْ أَنْ يُوفُوا بِعَهْدِكَ الَّذِي عَاهَدْتَهُمْ عَلَيْهِ وَانْصُرْهُمْ عَلَى عَدُوِّكَ وَعَدُوِّهِمْ إِلَهَ الْحَقِّ وَاجْعَلْنَا مِنْهُمْ﴾ رواه البيهقي بإسناد صحيح.

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ (اَلأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر (بَعْدَهُ) سوننەتە: لـە دوای قونووتەکەیتر، ئـەم قونووتـە بخوێنێ، چونکە ئـەو لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ هـاتووەو ئەمەش لە ئیمامی(عمر)ەوە ﷺ، کـەوابو: ئەگـەر ویستی تـەنها یـەکێکیان بخـوێنێ، یـان ئیمـام بـوو و مەئمومـەکان بـە درێـژکردن ڕازی نـەبون، ئـەو کاتـەش هـەر قونووتەکـەی پێغەمبەر ﷺ خێرترە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنَّ الْجَمَاعَةَ تُنْدَبُ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: جەماعـەت سـوننەتە (فِي الْوِتْرِ) لـە نوێـژی وەتری مانگی ڕەمەزاندا (عَقِبَ التَّرَاوِيحِ) لە دوای تەواوبوونی تەراویحی گشت شـەوێك: لـە سـەرەتای ڕەمەزانەوە تا کۆتاییڕەمەزان (جَمَاعَةً) کە بە جەماعـەت دەکرێن، چونکە لـە پێشینەی ئەم ئوممەتەی ئیسلامەوە تا ئێستا ئەوها کراوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایـة)دا فەرموویانە (والله أعلم).

هەروەها ئەگەر تەراویحی بە جەماعـەت نەشـکردبێ، یـان هـەر تـەراویحی نـەکردبێ، ئـەو کاتەش جەماعەت لە وەتریڕەمەزاندا هەر سوننەتە، بەڵام–جگە لە ڕەمەزان– لە وەتـری مانگەکانیتردا جەماعەت سوننەت نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئـەو مەسـەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ صَلاةُ الضُّحَى: چێشتەنوێژ ﴾

(وَمِنْهُ) یـەکێکیتر لـەو سـوننەتانەی جەماعـەتیان تـێدا سـوننەت نیـە: (اَلضُّحَى) چێشتـەنوێژە، نیـەتی(صلاةالضـحى)–واتـە: چێشـتەنوێژی– لێدێنـێ (وَأَقَلُّهَا) لایکـەمی چێشتەنوێژ (رَكْعَتَانِ) دوو ڕەکعەتە، هەروەك لە حەدیسی(أبيهريرة)و (أبيذر) لـە (بخاريو مسلم)دا هاتوە.

(وَأَكْثَرُهَا) لای زۆری چێشتەنوێژ (إِثْنَتاعَشَرَةَ) دوانزە ڕەکعەتە، چونکە لە حەدیسێکی (ضعیف)بێهێزدا ئەو ژمارەیە هاتوە.

بەڵام ئەگەر لای زۆری چێشتەنوێژ هەشت ڕەکعەت بکرێو بۆ گشت دوو ڕەکعەتێك نیەت بێنێو تەحیات بخوێنێو سەلام بداتەوە، خێری گەورەترە، چونکە بەڵگەی هەشت ڕەکعەتەکە حەدیسێکی (صَحیح)و بەهێزە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عن أُمِّ هانِئ رضي الله عنها صَلَّى النَّبِيُّ ﷺ سُبْحَةَالضُّحَى ثَمانِيَ رَكَعاتٍ﴾ رواه الشيخان، زاد أبوداود: ﴿يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ﴾. پێغەمبەر ﷺ هەشت ڕەکعەت چێشتەنوێژی کردو لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا سەلامی دەداوە.

هەروەها لای کەمی چێشتەنوێژیتەواو: چوار ڕەکعەتە، هەروەك لە حەدیسی(عائشة) لە (مسلم)دا هاتووە، هەم خوایگەورە لە حەدیسێکی(قدسی)دا دەفەرموێ: ﴿يا ابْنَ آدَمَ لاتُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعاتٍ مِنْ أَوَّلِ نَهارِكَ أَكْفِكَ آخِرَهُ﴾ رواه أبوداود بإسناد صحيح، ئەی ئادەمیزاد لە بیرم مەکە لە سەرەتای ڕۆژەکەتدا چوار ڕەکعەتم بۆ بکە، منیش تا کۆتایی ڕۆژەکەت دەتپارێزم.

ئینجا بزانە: لە دوای فاتیحە لە ڕەکعەتی یەکەمدا سوننەتە: سورەتی (والشمس) بخوێنێو لە دووەمدا سورەتی (والضحی)، جا ئەگەر دوو ڕەکعەت زیاتری کرد، ئەو کاتە لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا لە دوای فاتیحە لە یەکێك (الكافرون)و لەویتر (الاخلاص) دەخوێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

هەروەها بزانە: کاتی چێشتەنوێژ لە نێوان ئەو کاتەی ڕۆژ بە قەد ڕمێك بەرز دەبێو تا (زوال)ی دەبێ، بەڵام وا خێرترە: چواریەکیڕۆژێ بڕوا، ئینجا چێشتەنوێژ بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلاةُالأَوّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصالُ﴾ رواه مسلم، چێشتەنوێژ لەو کاتەیە: کە فەرخەکانیوشتر لە بەر گەرما سمی دەسووتێ.

## ﴿ سوننەتی (تَحِيَّةُالْمَسْجِد): سەلامیمزگەوت ﴾

(وَتَحِيَّةُالْمَسْجِدِ) یەکێکیتر لەو سوننەتانەی جەماعەتیان تێدا سوننەت نیە: سوننەتی (تَحِيَّةُالْمَسْجِد)ە، کە چووە ناو مزگەوت–جگە لە (الْمَسْجِدِالْحَرام) لە (مكة)ی پیرۆز؟ چونکە لەوێدا ئەگەر بیەوێ (طواف) بکا، ناپەسەندە: (تَحِيَّةُالْمَسْجِد) لە پێش (طواف)دا بکا، چونکە بە دوو ڕەکعەتەکەی دوای (طواف) دێتە جێ– هەروەهاش هەر کاتێك ئیقامەتینوێژ کرا، ناپەسەندە: (تَحِيَّةُالْمَسْجِدِ) بکا، هەروەك لە باسی بانگدا بەڵگەمان بۆ هێناوەو لە سەرچاوەکانیشدا هەر دوو مەسەلە ڕوون کراونەوە.

رَكْعَتَان، وَتَحْصُلُ بِفَرْضٍ أَوْ نَفْلٍ آخَرَ، لاَ بِرَكْعَة عَلَى الصَّحِيحِ، قُلْتُ: وَكَذَا الْجَنَازَةُ وَسَجْدَةُ التِّلاَوَةِ وَالشُّكْرِ، وَتَتَكَرَّرُ بِتَكَرُّرِ الدُّخُولِ عَلَى قُرْب فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(رَكْعَتَانِ) سوننەتی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) دوو ڕەكعەتە، بە نیەتی(تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلاَيَجْلِسْ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ﴾ رواه الشيخان، هەر كاتێك یەكێكتان چووە ناو مزگەوت با دانەنیشێ تا دوو ڕەكعەت نوێژ دەكا. كەوابو: لەو پێنج كاتانەشدا كە نوێژكردن تێیاندا حەڕامە، (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) هەر سوننەتە.

جا بزانە: ناپەسەندە (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) نەكاو دابنیشێ، واتە: ئەگەر بەقەسدی دانیشت، (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)ی لەدەست دەچێو سوننەت نیە قەزای بكاتەوە، بەڵام ئەگەر بە نەزانی، یان لە بیری چوو دانیشتو دانیشتنەكەش كەم بوو، یان ماوەیەك بە پێوە ڕاوەستا، ئەو كاتە ماوەی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) هەر دەمێنێو با بیكا.

هەروەها ناپەسندە بە بێدەستنوێژی-بۆ دانیشتن-بڕواتە ناو مزگەوت، جا ئەگەر بە بێدەستنوێژی چووە ناو مزگەوت، یان لە بەر هەر هۆیەكیتر (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)ی پێنەكرا، سوننەتە: چوار جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَلاإِلَهَ إِلاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَر)، هەروەك لە پاشكۆی مزگەوتەكاندا بەڵگەمان بۆ هێناوە، هەروەها سوننەتە: لە دوای ئەو زیكرانەدا بڵێ: (وَلاحَوْلَ وَلاقُوَّةَ إِلاّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيم) هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَتَحْصُلُ) سوننەتی(تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) دێتە جێو خێرەكەشی دەگاتێ (بِفَرْضٍ) بە كردنی نوێژێكی واجب: جا بە ئەدا بێ، یان بە قەزا بێ، هەر چەند نیەتی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)شی لەگەڵدا نەهێنێ (أَوْ نَفْلٍ آخَرَ) یان بە كردنی سوننەتێكیتر لە نوێژە سوننەتەكان، هەر چەند نیەتی (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)شی لەگەڵدا نەهێنێ، چونكە مەبەست ئەوەیە: سوكایەتی بە مزگەوت نەكرێ، بەڵكو بە نوێژكردنێك ڕێزی لێبندرێ.

(لا رَكْعَةٍ) بەڵام بە تەنها یەك ڕەكعەت سوننەتی(تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) نایەتەجێ (عَلَى الصَّحِيح) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە لە حەدیسەكەدا دوو ڕەكعەتی فەرمووە، ئینجا هەر بە بەڵگەی حەدیسەكە: (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (وَكَذا الْجَنازَةُ) هەروەها بە نوێژی (جنازە)و (وَسَجْدَةُ التِّلاوَةِ وَالشُّكْرِ) بە سوجدەی (تِلاوة)و شوكریش (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) نایەتە جێ، چونكە ئەوانە ڕەكعەتێكی تەواویش نین.

(وَتَتَكَرَّرُ) سوننەتی(تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) دووبارە دەبێتەوە (بِتَكَرُّرِالدُّخُولِ) بە هۆی دووبارەبوونەوەی چوونە ناو مزگەوت (عَلَى قُرْبٍ) لە چەند جارێكی لێك نزیكدا، واتە: هەر جارێك هاتە دەرەوەو چووە ژوورەوە، سوننەتە (تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ) بكاتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا، چونكە لە ووشەی (إِذا دَخَلَ)یحەدیسەكە وەها دەفامێتەوە (وَاللهُ أَعْلَم).

وَيَدْخُلُ وَقْتُ الرَّوَاتِبِ قَبْلَ الْفَرْضِ بِدُخُولِ وَقْتِ الْفَرْضِ وَبَعْدَهُ بِفِعْلِهِ، وَيَخْرُجُ النَّوْعَانِ بِخُرُوجِ وَقْتِ الْفَرْضِ، وَلَوْ فَاتَ النَّفْلُ الْمُؤَقَّتُ نُدِبَ قَضَاؤُهُ فِي الأَظْهَرِ.

## ﴿ قەزاكردنەوەی نوێژە سوننەتەكان ﴾

(وَيدْخُلُ وَقْتُ الرَّواتِبِ) كاتی (رَواتِب) واتە: سوننەتە دامەزراوەكان دادێ: (قَبْلَ الْفَرْضِ) ئەوانەی لە پێش نوێژە واجبەكاندا دەكرێن (بِدُخُولِ وَقْتِ الْفَرْضِ) بە هاتنی كاتی نوێژە واجبەكە (وبَعْدَهُ) كاتی ئەوانەش كە لە دوای نوێژە واجبەكان دەكرێن (بِفِعْلِهِ) بە كردنی نوێژە واجبەكە، هەر چەند نوێژە واجبەكەش قەزاكراوە، یان كۆكراوە بێ، واتە: تا كاتی نوێژە واجبەكە نەیێ، دروست نیە: سوننەتەكانی پێشدای بكا، تا نوێژە واجبەكەش بە دروستی نەكا، دروست نیە: سوننەتەكانی دواوەی بكا، جیاوازی نیە: نوێژە واجبەكە بە ئەدا بێ، یان قەزاكراوە بێ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيَخْرُجُ النَّوْعانِ) كاتی سوننەتەكانی پێش نوێژە واجبەكان و دوای نوێژە واجبەكان دەردەچێ (بِخُرُوجِ وَقْتِ الْفَرْضِ) بە دەرچوونی كاتی نوێژە واجبەكە، جیاوازی نیە: نوێژە واجبەكەی كردبێ، یان نا، كەوابو: ئەگەر بەقەسدی سوننەتەكەی پێشدای خستە دوای نوێژە واجبەكە، ئەوە دروستە و هەر بە ئەداش دادەندرێ، هەروەك لە (نهایة) و (مغنی)دا فەرموویانە ﴿عن عائشة رضی الله عنها: كانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذا لَمْ يُصَلِّ الأَرْبَعَ قَبْلَ الظُّهْرِ صَلاَّهُنَّ بَعْدَها﴾ رواه الترمذي وحسنه، هەر كاتێك پێغەمبەر ﷺ چوار ڕەكعەتەكەی پێش نوێژی نیوەڕۆی نەكردبا، لە دوای نوێژی نیوەڕۆدا دەیكردن.

ئینجا بزانە: لەگەڵ ئەوەشدا وەها خێرترە: سوننەتەكەی پێشدا هەر لە پێش نوێژە واجبەكەدا بكا، چونكە پێغەمبەر ﷺ زۆرتر وەهای كردوە، تەنها لە بەر خاتری نوێژی بە جەماعەت نەبێ، ئەو كاتەش با سوننەتەكەی پێشدا بخاتە دوای نوێژە واجبەكە، چونكە هەر كاتێك ئیقامەت دەستی پێكرا، ناپەسەندە: هیچ سوننەتێك بكا، تا جەماعەت تەواو دەكا، هەر چەند سوننەتی پێش نوێژیسبەینێش بێ، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی و لە باسی بانگدا بە بەڵگەوە ڕوونمان كردەوە.

(وَلَوْ فاتَ النَّفْلُ الْمُؤَقَّتُ) هەر كاتێك سوننەتێكی خاوەن كات فەوتا و لە كاتی خۆیدا نەكرا (نُدِبَ قَضاؤُهُ) سوننەتە قەزا بكرێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، مەبەست بە سوننەتی خاوەن كات: (رواتب)ی هەر پێنج نوێژە واجبەكانە و نوێژیجەژنەكانە و وەترە و تەراویحە و چێشتەنوێژە و شەونوێژە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ نامَ عَنِ الْوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذا ذَكَرَهُ﴾ رواه أبوداود بإسناد حسن، هەر كەسێك خەوت، یان لەبیری چوو سوننەتیوەتر بكا، هەر كاتێك هاتەوە بیری با بیكا.

هەم ﴿وعن أمِّ سلمةرضي الله عنها: صَلّى رَسُولُ اللهِﷺ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَالْعَصْرِ فَسَأَلْتُهُ؟ فَقالَ: أَتانِي ناسٌ فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَالظُّهْرِ فَهُما هاتانِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە دوای نوێژی عەسر دوو ڕەکعەت سونەتی کرد، ئینجا فەرمووی: خەڵکێك هاتنە لام و ماوەیان نەدام دوو ڕەکعەت سونەتەکەی دوای نیوەڕۆ بکەم، ئەوانە دوو ڕەکعەتەکەی دوای نیوەڕۆ بون ئێستا کردنم.

هەم ﴿وعن أبي قتادة وعمران بن حصينﷺ أَنَّ النَّبِيَّﷺ كانَ فِي مَسِيرٍ لَهُ فَنامُوا عَنْ صَلاةِ الْفَجْرِ فَاسْتَيْقَظُوا بِحَرِّالشَّمْسِ، فَارْتَحَلُوا وَنَزَلُوا مَكَاناً آخَرَ، فَأَذَّنَ بِلالٌ وَتَوَضَّؤُوا وَصَلَّوْا رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ ثُمَّ أَقَامَ بِلالٌ الصَّلاَةَ فَصَلّى بِهِمُ النَّبِيُّﷺ صَلاةَالصُّبْحِ﴾ رواه مسلم وأبوداود، پێغەمبەروﷺ (صحابە)کان لە کاتی نوێژی سبەینێدا خەوتبون و بە گەرمایی ڕۆژێ لە خەو هەڵسان–واتە: نوێژەکەیان نەکرد– ئینجا چوونە شوێنێکیترو (بلال الحبشي) بانگی داو دەستنوێژیان گرت و دوو ڕەکعەت سونەتی پێش نوێژی سبەینێیان قەزا کردەوە، ئینجا (بلال) ئیقامەتی نوێژی کردو نوێژی سبەینێشیان بە جەماعەت لە گەڵ پێغەمبەرﷺ قەزا کردەوە.

ئینجا بزانە: هەر سونەتێك خاوەن کات نەبێ، بەڵکو خاوەن هۆیەك بێ: وەك نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران و باران و سونەتی دەستنوێژو (تحیةالمسجد)و...هتد، ئەوانە هیچیان قەزا ناکرێنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەو حەدیسانەی ڕابردوو بەڵگەنە کە جیاوازی نیە: لە ماڵەوەو لە سەفەردا (رواتب)=سونەتە دامەزراوەکان لەگەڵ نوێژە واجبەکاندا دەکرێن و لە هەردوو حاڵەتیشدا گشتیان قەزا دەکرێنەوە، بەڵام لە ماڵەوە زیاتر سونەتن.

ئینجا بزانە: هەر کەسێك بەردەوام بێ: لە سەر نەکردنی(رواتب)ەکان، ئەوە شاهیدیی لێوەرناگیرێ، چونکە سوکایەتی بە ئایین دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەم ئاگاداریە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ باسی تەراویحی ڕەمەزان ﴾

(وَقِسْمٌ) بەشێکیتر لە نوێژە سونەتەکان: (يُسَنُّ جَمَاعَةً) سونەتە: بە جەماعەت بکرێن (كَالْعِيدِ) وەکو نوێژی جەژن و (وَالْكُسُوفِ) نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران و (وَالإِسْتِسْقاءِ) نوێژی باران، إن شاءالله هەر یەکەیان لە شوێنی خۆیدا بە بەڵگەوە ڕوون دەکەینەوە.

(وَهُوَ) ئەو بەشە سونەتەی جەماعەتی تێدا سونەتە (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە (مِمَّا لايُسَنُّ جَمَاعَةً) لەو بەشەی جەماعەتی تێدا سونەت نیە، چونکە پێغەمبەرﷺ جەماعەتی بۆ داناوە، ئەوەش بەڵگەی گەورەتریەکەیەتی.

(لَكِنِ الأَصَحُّ) بەڵام فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (تَفْضِيلُ الرَّاتِبَةِ) ئەو نوێژە دامەزراوانەی لەگەڵ نوێژە واجبەکاندا دەکرێن بە گەورەتر داندراون (عَلَى التَّرَاوِيحِ) لە سەر تەراویحی ڕەمەزان، هەر چەند تەراویح بە جەماعەتیش دەکرێن، چونکە پێغەمبەرﷺ بەردەوام (رواتب)ی کردون، بەڵام تەنها سێ شەوان تەراویحی لە مزگەوت کردوە، هەروەك لە حەدیسی(بخاری‌و مسلم)دا هاتوە.

(وَأَنَّ الْجَمَاعَةَ تُسَنُّ فِي التَّرَاوِيحِ) هەر بە فەرمووده‌ی ڕاستتر سوننەتە: تەراویح بە جەماعەت بکرێن، بە (إِجْمَاعِ)ی (صحابه)ی پێغەمبەرﷺ ﴿عن عبدالرحمن القاريّ: أَنَّ عُمَرَ بِنَ الخطابِ جَمَعَ النَاسَ فِي رَمَضانَ عَلَى أُبَيِّ بِنِ كَعْبٍ فَكانُوا يُصَلُّونَ بِصَلاتِهِ﴾ رواه البخاري، زاد البيهقي: ﴿وَالنِّساءَ عَلَى سُلَيْمانَ بِنِ أَبِي حَثْمَةَ﴾ ئیمامی(عمر) لە مانگی ڕەمەزاندا پیاوی کۆکردنەوە تاکو تەراویح بە جەماعەت لە پشت (أُبَيِّ بِنِ كَعْب) بکەن‌و ئافرەتانیش تەراویح بە جەماعەت لە پشت (سُلَيْمان بن أبي‌حَثْمة) بکەن.

ئینجا بزانە: تەراویح بە جەماعەت بکرێن، یان بە تەنهایی بکرێن: لە گشت چۆنیەتیەکاندا وەکو نوێژەکانی‌ترن، بەڵام وەها سوننەتە: لە دوای فاتیحە تا کۆتایی ڕەمەزان ختمێك تەواو بکا، هەروەك لە (الاذکار)دا فەرموویەتی‌و لە باسی سورەتی دوای‌فاتیحەش ڕوونمان کردەوە.

## ﴿ کات‌و ژمارەی تەراویح ﴾

بزانە: کاتی تەڕوایح لە دوای کردنی نوێژی عیشاوە دەست پێ‌دەکاو تا دەرکەوتنی بەیان کاتەکەی دەمێنێ وەك سوننەتی وەتر، واتە: ئەگەر نوێژی‌عیشای بە (جمع التقديم) لەگەڵ مەغریبدا کرد، ئەو کاتە دروستە: تەڕوایحیش بکا، بەڵام ئەگەر نوێژی عیشای نەکردبو، یان دروست نەبو، ئەو کاتە دروست نیە: تەراویح بکا.

هەروەها مەرجیش نیە سوننەتی دوای‌عیشا لە پێش تەراویحدا بکرێ، هەروەك لە نوێژی (وَتر)دا ڕوونمان کردەوە.

هەروەها بزانە ژمارەی تەراویح بیست ڕەکعەتە ﴿عن السائب بن يزيد: كانُوا يَقُومُونَ عَلَى عَهْدِ عُمَرَ بِنِ الخَطّابِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ بِعِشْرِينَ رَكْعَةً﴾ رواه البيهقي بالاسناد الصحيح، لە سەردەمی ئیمامی(عمر) لە مانگی‌ڕەمەزاندا بیست ڕەکعەت تەراویحیان دەکرد.

ئینجا بزانە: واجبە لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا نیەتی تەڕوایح، یان شەونوێژی ڕەمەزان بێنێ‌و لە دوای تەحیات سەلام بداتەوە، واتە: ئەگەر لە دوو ڕەکعەت زیاتر بە یەکەوە بکا تەراویحەکەی دروست نیە، چونکە بە پێچەوانەی ئەو شەرعەیە: کە لە پێغەمبەرەوەﷺ پێمان گەیشتوە.

وَلاَ حَصْرَ لِلنَّفْلِ الْمُطْلَقِ،

هەروەها: لەو ژمارەیەی ڕابردوو-بە نیەتی تەراویح- زیاتر دروست نیە، تەنها بۆ دانیشتووانی (مدینة)ی پیرۆز دروستە: سی‌و شەش ڕەکعەت تەراویح بکەن، چونکە ئەوان بە هۆی دراوسێیەتی پێغەمبەرﷺ بە شەرەفن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

دیسان بزانە: لە حەدیسێکیتری (صحیح)دا: هەشت ڕەکعەتیش ژمارەی تەراویح هاتووە ﴿عن جابرﷺ: صَلَّى بِنا رَسُولُ اللهِﷺ في رمضانَ ثَمانَ رَكَعاتٍ ثُمَّ أَوْتَرَ﴾ رواه ابن خزيمة وابن حبان في صحيحيهما، پێغەمبەرﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا هەشت ڕەکعەتی بە جەماعەت لەگەڵدا کردین، ئینجا وەتری کرد. بەڵام وەڵامی ئەو حەدیسە دراوەتەوە: کە دەگونجێ پێغەمبەرﷺ لە ماڵەوەی بیست ڕەکعەتەکەی تەواو کردبێ، هەروەك لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: چونکە ژمارەی بیست، کرداری (صحابە)کانەو فەرموودەی گشت زانایانە، جگە لە ئیمام (مالك)، ئەو دەفەرموێ: تەراویح سی‌وشەش ڕەکعەتە.

جا ئەی موسڵمانانی‌ڕێزدار -ئەگەر تەراویح هەشت بێ، یان بیست بێ- تکایە: تەراویحی مانگی ڕەمەزان لە دەست مەدەو لەو بەرەکەتە خۆت بێبەش مەکە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قامَ رَمَضانَ إِيماناً وَاحْتِساباً غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك لە شەوانی‌ڕەمەزاندا خواپەرستی بکا، باوەڕی پێ هەبێ‌و پاداشی لە خوا بوێ، لە تاوانە بچووکەکانی‌ڕابردووی دەبووردرێ.

## ﴿ سوننەتی بێناو ﴾

(وَلاَحَصْرَ) هیچ گەمارۆیەك دانەندراوە (لِلنَّفْلِ الْمُطْلَقِ) بۆ سوننەتی بێناو، واتە: ئەو سوننەتەی کات‌و هۆی نیە، لە شەرعدا ژمارەی بۆ دانەندراوەو ژمارەی ڕەکعەتەکانیشی دانەندراوە ﴿عن ثوبانﷺ: قال النَّبِيُّﷺ: عَلَيْكَ بِكَثْرَةِالسُّجُود لِلّه-تعالى- فَإِنَّكَ لا تَسْجُدُ لِلَّهِ سَجْدَةً اِلاّ رَفَعَكَ اللهُ بِها دَرَجَةً وحَطّ عَنْكَ بِها خَطِيئَةً﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: زۆر نوێژ بکە بۆ خوای گەورە، چونکە هەر سوجدەیەك بۆ خوا ببەی، خوای گەورە پلەیەکت بەرز دەکاتەوەو خراپەیەکیشت لێدەسڕێتەوە.

کەوابو: ئەگەر حەز دەکا: ڕکعەتێك بکا، ئەگەر حەز دەکا: سەد، یان هەزار ڕەکعەت بکا، جیاوازی شەوی‌و ڕۆژیش نیە، بەڵام حەرامە: لەو پێنج کاتانەدا بیکا: کە نوێژی‌سوننەتیان تێدا حەرامە، هەروەك باسمان کرد، کەوابو: دروستە: ڕەکعەتێك بکاو تەحیات بخوێنێ‌و سەلام بداتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

فَإنْ أَحْرَمَ بِأَكْثَرَ مِنْ رَكْعَةٍ فَلَهُ التَّشَهُّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَفِي كُلِّ رَكْعَةٍ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ مَنْعُهُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ وَاللهُ أَعْلَمُ، وَإِذَا نَوَى عَدَداً فَلَهُ أَنْ يَزِيدَ وَيَنْقُصَ بِشَرْطِ تَغْيِيرِ النِّيَّةِ قَبْلَهُمَا، وَإِلاَّ فَتَبْطُلُ، فَلَوْ نَوَى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَامَ إِلَى ثَالِثَةٍ سَهْواً فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَقْعُدُ ثُمَّ يَقُومُ لِلزِّيَادَةِ إِنْ شَاءَ.

---

هەروەها (فَإنْ أحْرَمَ بِأكْثَرَ مِنْ رَكْعَةٍ) ئەگەر نیەتی هێنا لە ڕەکعەتێك زیاتر سوننەت بکا (فَلَهُ التَّشَهُّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ) بۆی دروستە: لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا تەحیات بخوێنیٚو سەلامیش نەداتەوە، بەڵکو هەڵستێتەوە دوو ڕەکعەتیتریش بکا...هتد، ئینجا لە کۆتاییشدا تەحیات بخوێنیٚو سەلام بداتەوە.

هەروەها دروستیشە: هیچ تەحیاتێك نەخوێنیٚ تا سوننەتەکە تەواو دەبیٚ، ئینجا لە کۆتایی کۆیڕەکعەتەکاندا تەحیاتێك بخوێنیٚو سەلام بداتەوە، واتە: لە کۆتایی گشت نوێژێکی سوننەتدا -وەك نوێژی واجب- تەحیاتی ئاخیر ڕوکنێکی نوێژەو واجبە بخوێندریٚ، هەروەك لە (المجموع)و (مغني)دا فەرموویانە (وَفِي كُلِّ رَكْعَةٍ) لە گشت ڕەکعەتێکیشدا دروستە، بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەمویٚ (اَلصَّحِيحُ مَنْعُهُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: قەدەغەیەو دروست نیە (فِي كُلِّ رَكْعَةٍ) لە گشت ڕەکعەتێکدا تەحیات بخوێنیٚو سەلامیش نەداتەوە (والله أعلم) چونکە ئەو جۆرە نوێژە لە شەرعدا نەهاتوە.

(وَإِذَا نَوَى عَدَداً) هەر کاتێك لە نوێژی سوننەتی بیٚناودا نیەتی ژمارەیەکی ڕەکعەتەکانی هێنا: وەك یەك، یان دوو، یان سیٚ، یان چوار...هتد، ئەوە (فَلَهُ أَنْ يَزِيدَ) بۆی دروستە: لە ناو نوێژدا لە ژمارەی دیارکراو زیاتر بکاو (وَيَنْقُصَ) کەمتریش بکا، واتە: یەك ڕەکعەتەکە بکاتە دوو، یان دوو ڕەکعەتەکە بکاتە چوار، شەش، دە...هتد، یان چوار ڕەکعەتەکە بکاتەوە دوو، یان یەك (بِشَرْطِ تَغْيِيرِالنِّيَّةِ قَبْلَهُمَا) بەو مەرجەی لە ناو نوێژدا نیەتەکەی بگۆڕیٚ پێش زیدەکردن، یان کەمکردنەکە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە پێشدا نیەتەکەی نەگۆڕیٚو بە بیٚنیەت بە قەسدی زیدە بکا، یان کەم بکا (فَتَبْطُلُ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبیٚ، چونکە نیەتی بۆ نەهێناوە.

بەڵام ئەگەر بەقەسدی نەبو، نوێژەکە بەتاڵ نابیٚ، بۆ وێنە: (فَلَوْ نَوَىرَكْعَتَيْنِ) ئەگەر نیەتی دوو ڕەکعەت سوننەتی هێنا (ثُمَّ قَامَ إِلَى ثَالِثَةٍ سَهْواً) ئینجا بە سەهوو بۆ ڕەکعەتیسیٚیەم هەڵساوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر ئەمەیە: (أَنَّهُ يَقْعُدُ) واجبە یەکسەر بگەڕێتەوەو دانیشیٚ (ثُمَّ يَقُومُ لِلزِّيَادَةِ) ئینجا هەڵبستێتەوە بۆ ڕەکعەت زیادەکە (إِنْ شَاءَ) ئەگەر حەز بکا لەو دوو ڕەکعەتە زیاتر بکا، ئینجا لە کۆتاییدا سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا، بەڵام ئەگەر حەزی نەکرد لە دوو ڕەکعەت زیاتر بکا، ئەو کاتە کە

قُلْتُ: نَفلُ اللَّيْلِ أَفْضَلُ وَأَوسَطُهُ أَفْضَلُ ثُمَّ آخِرُهُ، وَأَنْ يُسَلِّمَ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ، وَيُسَنُّ التَّهَجُّدُ،

---

گەڕاوە تەحیات دەخوێنیٚو سەلام دەداتەوە، لە پێش سەلامدانەوەشدا سوننەتە سوجدەی سەهوو ببا.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە نیەتیژمارەی هێنابیٚ، بەڵام ئەگەر نیەتی ژمارەی نەهێنا، وەك بڵیٚ: نیەتم وەیە نوێژێکی سوننەت بکەم ئەوە هەر چەندی حەز بکا کەم بیٚ، یان زۆر بیٚ، دروستە: بیکا، هەروەها دروستە: لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا تەحیات بخوێنیٚو دروستە: نەشخوێنیٚ، هەورەها لەو حاڵەتەدا مەرج نیە بزانیٚ چەند ڕەکعەتی کردوە، کەوابو: هەر کاتێك ویستی کۆتایی بە نوێژەکە بێنیٚ، واجبە تەحیاتی ئاخیر بخوێنیٚ، ئینجا سەلام بداتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

## ﴿ باسی (تَهَجُّد)و شەونوێژ ﴾

**پێناسە:** هەر نوێژێکی سوننەت لە شەویٚدا بکریٚ، پیٚی دەگوتریٚ: (صَلاةُاللَّيْلِ) واتە: شەونوێژ، بەڵام (تَهَجُّد) بەو نوێژکردنە دەگوتریٚ: کە بە شەویٚ لە دوای خەوتنو لە دوای کردنی نوێژیعیشادا بکریٚ، جیاوازی نیە ئەو نوێژە: سوننەت بیٚ، یان واجب: وەك نوێژ قەزا کردنەوە، هەروەك لە حاشیەکانی (القليوبي)و (البجيرمي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، کەواتە: گشت (تَهَجُّد)ێك شەونوێژیشی پیٚدەگوتریٚ، بەڵام گشت شەونوێژێك (تَهَجُّد)ی پیٚ ناگوتریٚ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرمویٚ (نَفْلُ اللَّيْل) سوننەتە بیٚناوەکانی شەویٚ (أفْضَلُ) خێریان گەورەترە لە سوننەتە بیٚناوەکانی ڕۆژیٚ، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿أَفْضَلُ الصَّلاةِ بَعْدَالْفَرِيضَةِ صَلاةُ اللَّيْلِ﴾ رواه مسلم، گەورەترین نوێژ لە دوای نوێژیواجب شەونوێژە. (وَأَوْسَطُهُ) ناوەندیشەویٚ ئەگەر بکرێتە سیٚ بەش (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە لە سەرەتاو ئاخیری شەویٚ (ثُمَّ) ئینجا (آخِرُهُ) ئاخیری شەوێش خێری گەورەترە لە نیوەی یەکەمی شەویٚ، ئەگەر بیکاتە دوو بەش.

(وَأَنْ يُسَلِّمَ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ) ئەو کەسەی بە شەویٚ، یان بە ڕۆژیٚ نوێژی سوننەت دەکا، سوننەتە: لە گشت دوو ڕەکعەتێکدا لە دوایتەحیات سەلام بداتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿صَلاةُاللَّيْلِ وَالنَّهارِ مَثْنَى مَثْنَى﴾ رواه أبوداود بإسنادصحيح، سوننەتەکانی شەویٚو ڕۆژیٚ دوو دووە.

(وَيُسَنُّ التَّهَجُّدُ) سوننەتە (تَهَجُّد) بکا، واتە: بە شەو لە خەو هەڵسیٚو نوێژ بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ بەردەوام کردویەتی، خوای گەورەش دەفەرمویٚ: ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نافِلَةً لَكَ﴾ بەشێکی شەویٚ لە خەو هەڵسەو بۆ خۆت نوێژی زیاتر بۆ خوا بکە.

وَيُكْرَهُ قِيَامُ كُلِّ اللَّيْلِ دَائِماً وَتَخصِيصُ لَيْلَةِالْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ، وَتَرْكُ تَهَجُّدٍ اعْتَادَهُ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا قامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَحْ صَلاتَهُ بِـرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ﴾ رواه مسلم، هەر کاتێك یەکێکتان بە شەو لە خەو هەڵسا بۆ (تَهَجُّد)کردن، با لە پێشدا بە دوو ڕەکعەتی‌سوك دەست بە نوێژ بکا.

(وَيُكْرَهُ) ناپەسندە (قِيامُ كُلِّ اللَّيْلِ) بە شەوێ تا بەیانی نەخەوێ (دائماً) بە بەردەوامی، جا خواپەرستی بکا، یان نـەیکا ﴿عن عبدالله بن عمرورضي الله عنهما: قالَ لِيَ النَّبِيُّﷺ: أَلَمْ أُخْبَرْ: أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟ قُلْتُ: إِنِّي أَفْعَلُ ذلكَ. قالَ: فَإِنَّكَ إِنْ فَعَلْتَ ذلكَ هَجَمَتْ عَيْنُكَ وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، وَإِنَّ لِنَفسِكَ حَقٌّ وَلأَهْلِكَ حَقٌّ، فَصُمْ وَأَفطِرْ وَقُمْ وَنَمْ﴾ رواه الشيخان، ئەدی پێیان نەگوتم: تۆ بە شەوێ تا بەیانی ناخەوی‌و بە ڕۆژیش بەڕۆژوو دەبی؟ گوتم: بەڵێ وا دەکەم. فەمووی: ئەگەر بەردەوام وا بکەی، چاوت بێ‌هێز دەبێ‌و گیانت ماندوو دەبێ، گیانت مافی لە سەر تۆ هەیەو ژنەکەشت مافی لە سەر تۆ هەیە، کەوابو: هەندێ ڕۆژ بەڕۆژوو بەو هەندێکیش بەڕۆژوو مەبە، بەشێکی‌شەوێ بخەوەو بەشێکیشی هەڵسە شەونوێژ بکە.

کەواتە: ئەگەر بەردەوام نەبو لە سەر نەخەوتنی شەوێ تا بەیانی، ئەو کاتە ناپەسند نیە، چونکە بێ‌هێز نابێ‌و مافی خۆی‌و ژنەکەی پێ دەدرێ، هەروەك سوننەتە: دە شەوەکەی ئاخیری ڕەمەزان تا بەیانی نەخەوێ‌و خواپەرستی بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرمویانە، چونکە لە (بخاری)دا هاتوە.

(وَتَخْصِيصُ لَيْلَةِالْجُمُعَةِ بِقِيامٍ) هەورەها ناپەسندە بە تایبەتی تەنها لە شەوی‌جومعەدا شەونوێژ بکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاتَخُصُّوا لَيْلَةَالْجُمُعَةِ بِقِيامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيالِي﴾ رواه مسلم، تەنها شەوی‌هەینی لە نێوان شەوەکاندا تایبەت مەکەن بە نوێژکردن. واتە: ئەگەر تایبەتیەکە بە نوێژکردن نەبو، بەڵکو بە شتێکی‌تر بوو: وەك سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ ئەو کاتە ناپەسەند نیە، چونکە سەلاوات لێدان لە شەوی‌جومعەدا سوننەتە، هەروەك لە (نهاية)و(مغنى)دا فەموویانەو، لە حەدیسی(صحيح)دا بەڵگەی هەیە.

(وَتَرْكُ تَهَجُّدٍ) هەروەها ناپەسەندە واز لە (تهجد)ێك بێنێ: کە (اعْتادَهُ) کردبێتیە پیشەی خۆی (والله أعْلَم) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿يا عَبْدَالله لاتَكُنْ مِثْلَ فُلانٍ كانَ يَقُومُ اللَّيْلَ فَتَرَكَ قِيامَ اللَّيْلِ﴾ رواه الشيخان، ئەی (عبدالله) وەك فلانکەس نەکەی: کاتی خۆی شەونوێژی دەکرد، جا وازی لە شەونوێژ هێنا.

کەوابو: هەر ئەوەندە شەونوێژە بکاتە پیشەی خۆی: کە بتوانێ لە سەری بەردەوام بێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ مِنَ الأَعْمالِ ماتُطِيقُونَ فَإِنَّ اللهَ لايَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا

وَإِنَّ أَحَبَّ الأَعْمالِ إِلىاللهِ-تعالى- ماذُوومَ عَلَيْهِ وَإِنْ قَلَّ﴾ رواه الشيخان واللفظ لمسلم، هەر ئەوەندە کردەوانە بکەنە پیشەی خۆتان: کە بتوانن لە سەری بەردەوام بن، چونکە خوای گەورە خێری کردەوەکانتان لێنابڕێ تا ئێوە واز دێنن، خۆشەویسترینیکردەوەکان لە لای خوایگەورە ئەو کردەوەیە: بە بەردەوامی بکرێ هەر چەند کەمیش بێ.

کەوابو: ئەی موسڵمانیڕێزدار، ئەو هەلە لەدەست خۆت مەدەو بە شەو لە خەو هەڵسەو شەونوێژ بکە، هەر چەند تەنها دوو ڕەکعەتیش بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَيْكُمْ بقيامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالحينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ إِلَى رَبِّكُمْ وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئاتِ ومَنْهاةٌ عَنِ الأَثْمِ وَمَطْرَدَةٌ لِلدّاءِ عَنِ الْجَسَدِ﴾ رواه أحمد وغيره قال العزيزى هو حديث صحيح، شەونوێژ بکەن، چونکە شەونوێژ پیشەی پیاوچاکانی پێش ئێوەیەو شەونوێژ لە خوای خۆتان نزیکتان دەکاتەوەو تاوانەکانتان دادەپۆشێو گوناهتان لێقەدەغە دەکاو دەرد لە لاشەتان دەردەکا.

ئینجا بزانە: درێژکردنەوەی نوێژ: بە خوێندنی قورئان لە دوای فاتیحە، خێری گەورەترە لە زۆر نوێژکردن، هەروەها-جگە لە نوێژکردنیش- دوعاکردنو (أَسْتَغْفِرُاللّه) زۆر خێرە لە گشت کاتێکیشەوێدا، بە تایبەتی لە کاتی(سَحَر)=بەرەبەیاندا خێری گەورەترە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مايَهْجَعُونَ وَبِالأَسْحارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ پیاوچاکە لەخواترسەکان بە شەوێ کەم دەخەوتنو شەونوێژیان دەکردو لە کاتی بەرەبەیاندا تکای لێخۆشبوونی گوناهەکانیان لەخوا دەکردو دەیانگوت: (أَسْتَغْفِرَاللّهَ).

جا ئەگەر نەگونجا دەستنوێژ بگرێو شەونوێژ بکەی، ڕوو لە قبیلە خۆت بە زیکرو دوعا خەریك بکە، تاکو بە ڕەحمی خوای گەورە لە پۆلی خواپەرستانیشەوێ بنووسرێی، هەروەك لە (إحياء علوم الدين)دا فەموویەتی.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی چەند سوننەتێکیتر ﴾

ئینجا بزانە: چەند سوننەتێکیتر ماوە، جەماعەتیان تێدا سوننەت نیە، لە زۆربەی سەرچاوەکاندا گوتراون، ئێمەش هەندێکیان دەهێنین:

**یەکەم:** (صَلاةُالأَسْتِخارَة): داواکردنی کارەکەی باشتر، هەر کەسێك دوو دڵ بوو، ئایا ئەم کارە حەڵاڵە بکا، یان نا، با دوو ڕەکعەت سوننەت بکا، بە نیەتی (صَلاةُالإِسْتِخارَة)، ئینجا لە دوایسەلامدانەوە، ئەم دوعایە بکا: ﴿أَللّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخيرُكَ بعلْمكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، أَللّهُمَّ

إنْ كُنتَ تَعْلَمُ أنَّ هذاالأمْرَ(...) خَيْرٌ لي في ديني وَدُنْيايَ وَمَعاشي وَعاقِبَةِ أَمْـري-عاجِلـه وَآجِله- فَاقْدُرْهُ لي وَيَسِّرْهُ لي ثُمَّ بارِكْ لي فيه، أَللَّهُمَّ وَإنْ كُنتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمْرَ(...) شَرٌّ لي في ديني وَدُنْيايَ وَمَعاشي وَعاقِبَةِ أَمْري-عاجِلِه وَآجِلِه- فَاصْرِفْهُ عَنّي وَاصْرِفْني عَنْهُ وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِني بِهِ﴾ رواه البخاري.

ئینجا بزانه: له شوێنی دوو کەوانەکاندا ناوی کارەکـە دەهێنـێ، جا لـە دوای دووعایەکـە دڵی بۆ کام لا ڕۆیشت ئـەو لایـە دەکـا، هـەروەها بزانـە: بـۆ کردنـی کـاری (واجـب)، یـان (سُنَّة)، هەروەها بۆ نـەکردنی کـاری (حَـرام)، یـان (مَكْروُه)، نوێـژی (إسـتخارة) نـاکرێو سوننەت نیە، هەروەك له (فتح الباری)دا ڕوون کراوەتەوە.

**دووەم:** (صَلاَةُالتَّسْبِيحِ)، هەرچـەند حەدیسـەکەی بێهێـزە، بـەڵام چـونکە لـە زۆر ڕێگـەوە هـاتووە، بووەتـە (حَسَـنٌ لِكَثْـرَةِ طُرُقِـه)، هـەروەك لـە (تُحْفَـة)دا فەرموویـەتی، کەواتـە: حەدیسەکە ڕەفتاری پێدەکرێ، جا ئەو نوێژە چوار ڕەکعەتە: بە یەك سـەلام، یـان بـە دوو سەلام، بە نیەتی(صَلاَةُالتَّسْبِيح) نوێژەکە دادەبەسـتێ، ئینجـا لـە دوای خوێنـدنی فاتیحـەو سورەت پانزە جار دەڵێ: (سُبْحانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّـهِ وَلاإلـهَ إلاّاللهُ وَاللهُ أَكْبَـرُ). ئینجا لـە ڕوکووعدا دە جـاریتریش دەیڵـێ، ئینجـا لـە ڕوکـووع هەڵدەسـتێتەوەو دەجـاریتر دەیڵـێ، ئینجا لە سوجدەییەکەمدا دەجاریتر دەیڵـێو لـە دانیشـتنی نێـوان سـوجدەکاندا دە جـار دەیڵـێو لـە سـوجدەیدووەمدا دە جـار دەیڵـێو لـە دوای سـوجدەیدووەم بـۆ (جِلْسَـةُ الإسْتِراحَةِ)، یان بۆ تەحیات دادەنیشێو دە جار دەیڵێ، ئەوە دەکاتە حەفتاو پێـنج، ئینجـا هەڵدەستێتەوەو لە ڕەکعەتی دووەمو سـێیەمو چـوارەم بـە هـەمان ژمـارە دەیڵێتـەوە، تـا سێسەد جار تەواو دەبێ، هەروەها بە شێوەیەکیتریش دروستـە: وەك لـە پـێش فاتیحـەدا پانزە جار بیڵێو لە دوای فاتیحەو سورەتیش دە جار، واتە: لـە دوای سـوجدەی دووەم لـە (جِلْسَةُ الإسْتِراحَةِ)دا هیچ جارێك نەیڵێ.

**سێیەم:** (سُنَّةُالْقَتْلِ)، هەر کاتێك ویسترا بکوژرێ: بە هەق، یان بە ناهەق- ئەگـەر مـاوەی هـەبو- سـوننەتە دوو ڕەکعـەت بکـا، بـە نیـەتی سـوننەتی(الْقَتْـل)=کوشـتن، هـەروەك (خُبَيْب﷛) لە سـەردەمی پێغەمبـەرﷺ لـە (مکـة)دا کـردی لـەو کاتـەی کافرەکـان بردیـان بیکوژن، هەروەك لە (بخاري)دا گێڕدراوەتەوە.

**چوارەم:** (صَلاَةُالتَّوْبَةِ)، هەر کاتێك گوناهێکی کردو ویستی تۆبە بکـا، دەسـتنوێژ دەگـرێو دوو ڕەکعەت بە نیەتی(صَلاَةُالتَّوْبَةِ) دەکـاو لـە دوای سـەلامدانەوە دەسـت بـە (أَسْـتَغْفِرُالله) دەکـا، خوای گەورە دەیبورێ، هەروەك لە (ترمذی)و (ابن ماجه)دا (بسند حسن) گێڕدراوەتەوە.

## (كتابُ صَلاة الْجَماعَة)

هِـــيَ فِيالْــفَرَائِضِ غَـيْرِ الْــجُمُعَة سُـنَّةٌ مُــؤَكَّدَةٌ، وَقِــيلَ فَــرضُ كِفايَة للرِّجَالِ

---

**پێنجەم:** (سُنَّةُالسَّفَرِ)، کاتی چوونە سەفەر لە ماڵەوەدا، کـاتی گەڕانـەوەش لـە مزگەوتـدا دوو ڕەکعـەت بـە نیـەتی(سُنَّةُالسَّفَر) دەکـا، هـەروەك لـە پاشـكۆی (صَلاةُالْمُسـَافِر)دا بـە بەڵگەوە ڕوونیان دەکەینەوە، إن شاءالله تعالی.

**شەشەم:** دوو ڕەکعەت بە نیـەتی بووك گواستنەوە، هەم بۆ بووكو هەم بۆ زاوا لە پێش بـە زاوابووندا سوننەتن.

**حەفتــەم:** (صَـلاةُالأوّابِينَ)، لـە نێـوان مـەغریبو عیشـادا، لای کـەمی چـوار، یـان شـەش ڕەکعەتــە، لای زۆری بیسـت ڕەکعەتـە بـە نیـەتی(صَـلاةُ الأوّابـِينَ). ئینجـا بزانـە (صَـلاةُ الأوّابِينَ) هەم بە (صلاةالضّحی): چێشتەنوێژیش دەگوترێ.

**هەشتەم:** (صَلاةُالإِشْرَاق)، کاتێك ڕۆژ بە قـەد ڕمێـك بـەرز بۆوە، دوو ڕەکعـەت بـە نیـەتی (سُنَّةُالإِشْراق) سوننەتە، ئینجا بزانە: ئەمەیان جگە لە (صَلاةُالضُّحَی)یە.

جا بزانە: لەو سوننەتانەیڕابردوودا لە دوای فاتیحە: لە ڕەکعـەتی یەکەمـدا سـوڕەتی (قُلْ ياأَيُّهاالْكافِرُون)و لە دووەمدا (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) سوننەتە.

بەڵام **ئاگاداریە:** (صَلاةُالرَّغائِبِ): کە دوانزە ڕەکعەتە لە شـەوی یەکـەم جومعـەی مـانگی (رَجَب)دا دەکرێو هەم نوێژی شەوبەرات: کە سەد ڕەکعەتە لـە شـەوی نیـوەی شـەعباندا دەکـرێ، هـەردووکیان (بِدْعَـة)یـەکی ناشـیرننو حەدیسەکانیشـیان درۆنـەو ڕاسـت نینـە، کەوابو: لە هەر کتێبێکدا نووسرابن، پـێی هەڵمەخەڵـەتێ، هـەر وەك لـە سەرچـاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، والله اعلم.

### ﴿ كِتابُ صَلاة الْجَماعَة: پەڕتووکی نوێژی جەماعەت ﴾

(هِيَ) جەماعەت کردن (فيالْفَرائِضِ) لە هەر پێنج نوێژە واجبەکاندا-(غَيْرالْجُمُعَة) جگە لـە نوێژیجومعـە- (سُـنَّةٌ مُؤَكَّـدَةٌ) سـوننەتێکی(مُؤَكَّـدة) زۆر خێـرە، چـونکە پێغەمبـەرﷺ بەردەوام کردویەتیو هەم دەشـفەرموێ: ﴿صَلاةُالْجَماعَة تَفْضُلُ صَلاةَالْفَرْدِ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً﴾ رواه الشيخان، نوێژی بەجەماعەت خێری گەورەترە لە نوێژی بەتەنها: بە بیستو حەفت پلە.

(وَقِيلَ) لـە فەرموودەیەکدا کـە بـە ڕاسـتتر داندراوە: (فَـرْضُ كِفايَـةٍ لِلرِّجَـال) نوێـژی بـە جەماعەت (فَرْضُ الْكِفايَة)یە بۆ پیاوان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ ثَلاثَة فِي قَرْيَة وَلاَ بَدْوٍ لاتُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاةُ إلاّاسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ، فَعَلَيْكَ بِالْجَماعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الْــغَنَمِ الْــقَاصِيَةَ﴾ رواه أبوداود والنسائي بإسناد صحيح، لە هـەر دێیەكو لە هـەر هۆبـە

فَتجبُ بحَيْثُ يَظْهَرُ الشِّعَارُ فِيالْقَرْيَةِ فَإِن امْتَنَعُوا كُلُّهُمْ قُوتِلُوا، وَلاَ يَتَأَكَّدُ النَّدْبُ لِلنِّسَاءِ تَأَكُّدَهُ لِلرِّجَالِ فِيالأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنصُوصُ أَنَّها فَرْضُ كِفَايَةٍ

ڕەشماڵێکدا سێ پیاو هەبن‌و نوێژی بە جەماعەت نەکرێ، شەیتان زاڵ دەبێ بە سەریاندا، کەوابو: هەر لەگەڵ جەماعەت دا بە، چونکە گورگ مەڕی بە تەنها دەخوا.

ئینجا کە جەماعەت بۆ پیاوان (فَرْض الْكِفايَةِ)بێ (فَتَجِبُ) واجبە: جەماعەت بکرێ لە هەر پێنج نوێژەکاندا (بِحَيْثُ) بە شێوەیەکی وەها: کە (يَظْهَرُ الشِّعارُ) دروشمی جەماعەت ئاشکرا ببێ (فِیالْقَرْيَةِ) لە شوێنێکی دێیەکەدا ئەگەر بچوك بێ، بەڵام ئەگەر دێیەکە، یان هۆبە ڕەشماڵەکە گەورە بون، یان شوێنەکە شار بو، ئەو کاتە واجبە: لە چەند شوێنێکدا جەماعەت بکرێ‌و لە گشت شوێنێکدا بە شێوەیەکی وەها دروشمەکەی ئاشکرا ببێ: هەر کەسێك بیەوێ جەماعەت بکا بتوانێ بە بێ‌ماندووبوونێکی زۆر بگاتە شوێنەکە.

کەوابو: ئەگەر لە ناو بازاڕدا، یان لە ناو ماڵێکدا جەماعەت کرا، پێویستە: بە شێوەیەکی وەها دەرگاکان بکرێنەوە: کە هیچ کەسێك شەرم نەکا بچێتە ژوورەوە، هەروەك لە (تُحْفَة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

ئینجا (فَإِنْ امْتَنَعُوا كُلُّهُمْ) ئەگەر خەڵکی دێیەکە، یان گەڕەکەکە، گشتیان ڕێك کەوتن جەماعەت نەکەن (قُوتِلُوا) لە لایەن پێشەوایئیسلام، یان جێگرەکەی جەنگیان لەگەڵ دەکرێ، تا تۆبە دەکەن‌و بە ئاشکرایی جەماعەت دەکەن، کەواتە: ئەگەر ڕێککەوتنەکەیان لە سەر جەماعەت نەکردن بە گشتی نەبو، بەڵکو چینێکی کەم لە گشت شوێنێکدا جەماعەتیان دەکردو دروشمەکەشیان ئاشکرا دەکرد، ئەوە جەماعەتەکە بە ئەوان پێك دێ‌و تاوانیش لە سەر خەڵکی‌تر لادەچێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: جەماعەت بۆئافرەتان هیچ کاتێك نە (فَرْضُ الْعَيْنِ)و نە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)ش نیە، بەڵکو سوننەتە، جا لەگەڵ ئەوەشدا (وَلاَ يَتَأَكَّدُ النَّدْبُ لِلنِّساءِ) ئەوەندە بە گرنگی داوای جەماعەت لە ئافرەتان ناکرێ (تَأَكُّدَهُ لِلرِّجَالِ) وەك بە گرنگی داوا لە پیاوان دەکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، هەر چەندەش بڵێین بۆ پیاوان سوننەتە، کەوابو: جەماعەت نەکردن بۆ ئافرەتان ناپەسندیش نیە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) دەقی فەرموودەیڕاستر کە ئیمامی(شافیعی)ش فەرموویەتی (أَنَّها فَرْضُ كِفَايَةٍ) جەماعەت (فَرْضُ الْكِفايَةِ)یە، لە هەر پێنج نوێژەکاندا ـجگە لە جومعەـ لە سەر پیاوانی بالغ و ئازادو نیشتەجێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو.

وَقِيلَ فَرْضُ عَيْنٍ، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَفِي الْمَسْجِدِ لِغَيْرِ الْمَرْأَةِ أَفْضَلُ،

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (فَرْضُ عَيْنٍ) جەماعەت لە سەر پیاوان (فَرْضُ الْعَيْنِ)ەو واجبە: گشت پیاوێك بیکا، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَتُقَامَ، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِيَ بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لَايَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بِيُوتَهُمْ بِالنَّارِ﴾ رواه الشيخان، ویستم فەرمان بدەم ئیقامەتی‌نوێژ بکرێ، ئینجا فەرمان بدەم پیاوێك جەماعەت بۆ خەڵکی بکا، ئینجا منیش چەند پیاوێك لە گەڵ خۆم ببەم-کە باوەشە داریان پێبێ-و بچم ماڵی ئەو کەسانە بە ئاگر بسوتێنم: کە نایەن نوێژ بەجەماعەت بکەن.

جا بزانە: وەڵامی ئەو فەرموودەیە وەها دراوەتەوە: کە ئەو حەدیسە دەربارەی(مُنافِق)= دوو ڕووەکان گوتراوە، کەوابو: فەرموودەی (فَرْضُ الْكِفَايَةِ) ڕاسترە (وَاللهُ أَعْلَم).

دیسان بزانە: جەماعەت لە نوێژی جومعەدا (فَرْضُ الْعَيْنِ)ەو لە چەند نوێژێکی سوننەتیشدا سوننەتە، هەروەك باسمان کرد، بەڵام لەو نوێژە واجبانەی قەزا دەکرێنەوە، جەماعەت سوننەت نیە، بەڵکو دروستەو نەکردنی خێرترە، تەنها لە حاڵەتێکدا سوننەتە: ئەگەر نوێژەکەی‌ئیمامو نوێژەکەی‌مەئموم هەردووکی قەزا بن‌و لە یەك جۆریش بن، هەروەك مسلم و أبوداود گێڕاویەتیانەوە: کە ﴿پێغەمبەرﷺ و (صحابة)ﷺ نوێژی‌سبەینێیان بە جەماعەت قەزا کردەوە﴾. هەروەك لە قەزاکردنەوەی نوێژی واجبو سوننەتدا حەدیسەکانمان ڕوون کردنەوە، کەوابو: ئەگەر نوێژەکان یەك جۆر نەبون، یان یەکێکیان قەزا نەبو، ئەو کاتە بە تەنهایی قەزا بکرێنەوە خێرترە.

هەروەها جەماعەت بۆ منداڵی فامیدەش سوننەتە، بەڵام واجبە: سەرپەرشتکارەکەی فەرمانی پێبکا: بچێتە مزگەوتو جەماعەت، تاکو خووی پێوە بگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَفِي الْمَسْجِدِ) جەماعەت کردن لە مزگەوتدا-(لِغَيْرِ الْمَرْأَةِ) جگە بۆ ئافرەت- (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە لە جەماعەت کردن لە شوێنەکانی‌تردا، کەواتە: جگە لە مزگەوت لە هەر شوێنێکی‌تردا جەماعەت بکا، خێری جەماعەت-کە بیستو حەفت پلەیە- دێتەجێ: وەك لە ماڵەوەی‌دا جەماعەت بۆ ژن و منداڵەکانی بکا، هەروەك لە (نهاية)و(مغنى)دا فەرموویانە، بەڵام خێری مزگەوتی لە دەست دەچێ، چونکە پێغەمبەرﷺ بە زۆری لە مزگەوتدا جەماعەتی کردوەو هەم دەشفەرموێ: ﴿أَفْضَلُ صَلَاةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ﴾ رواه الشيخان، خێرترین نوێژی مرۆڤ ئەو نوێژەیە: لە ماڵەوەی‌دا بیکا، تەنها نوێژی‌واجب نەبێ، واتە: ئەو لە مزگەوتدا خێرترە.

ئینجا بزانە: ئەگەر پیاوێك ڕۆیشتبا مزگەوت، دانیشتووانیماڵەوەی بە تەنهایی نوێژیان دەکرد، بەلام ئەگەر لە ماڵەوەیدا بمابایەوە، جەماعەتیان لەگەڵ دەکرد، ئەو کاتە لە ماڵەوەیدا جەماعەتیان بۆ بکا خێرترە لە چوونە مزگەوت، هەروەها ئەگەر لە ماڵەوەیدا جەماعەت دەکراو لە مزگەوتدا نەدەکرا، دیسان لە ماڵەوەیدا خێرترە، هەروەك لە (تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە.

هەروەها بۆ ئافرەت لە ماڵەوەیدا خێرترە -نەك لە مزگەوتدا- پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتَمْنَعُوا نِسَاءَكُمُ الْمَسَاجِدَ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ﴾ رواەأبوداود بسندصحيح، ئافرەتەکانتان قەدەغە مەکەن لە مزگەوتەکان، بەلام لە ماڵەوەیاندا نوێژ بکەن خێرترە.

ئینجا بزانە: هەر بەبەلگەی ئەم حەدیسە، بە بێئیزنی (وَلي)، واتە: سەرپەرشتکار -وەك باوكو برا- یان بە بێئیزنیمێرد، حەرامە: ئافرەت بڕواتە مزگەوت، هەروەها ئەگەر مەترسی لە ئافرەتەکە بکرێ، هەر حەرامە، بەلام ئەگەر مێرد، یان سەرپەرشتکار ئیزنی بدا، ئەو کاتەش بە بەرگی جوان و بۆنیخۆشو هەم ئەو ئافرەتەی حەزی لێدەکرێ بۆ گشتیان ناپەسندە بڕۆنە جەماعەتیمزگەوت، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: لای کەمی جەماعەت دوو کەسن: یەکێکیان ببێتە ئیمام پێشنوێژی بکا، یەکێکیشان ببێتە مەئمووم شوێنی بکەوێ، واتە: خێری بیستو حەفت پلەیان بۆ دەنووسرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

بەلام (وَمَا كَثُرَ جَمْعُهُ) هەر شوێنێك کۆمەڵی خەلکی لە جەماعەتدا زۆرتر بێ (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە: لەو شوێنەی کۆمەڵی خەلکی لە جەماعەتدا کەمتر بێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلاَةُالرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ وَحْدَهُ وَصَلاَتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ مَعَ الرَّجُلِ، وَمَا كَانَ أَكْثَرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ﴾رواه أبوداود وصححه إبن حبان وإبن خزيمة، نوێژی بە جەماعەت لە گەڵ یەك پیاودا خێری زیاترە لە نوێژی بە تەنهایی، نوێژی بە جەماعەت لەگەڵ دوو پیاودا خێری زیاترە لە هی لەگەڵ یەك پیاودا، هەر جەماعەتێك کۆمەڵی زۆرتر بێ، ئەو لای خوایگەورە خۆشەویستترە.

کەوابو جەماعەتی مزگەوتیقەرەباڵغتر خێری گەورەترە لە مزگەوتێکیکەمتر، هەروەها لە شوێنێکیقەرەباڵغتریش خێری زیاترە لە شوێنێکیکەمتر، بەلام جەماعەتی کۆمەڵ کەم لە مزگەوتدا خێری گەورەترە: لە جەماعەتی کۆمەڵ زۆرترو قەرەباڵغتر لە شوێنێکیتردا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانەو لە پێش ئێرەشدا ڕوون کراوە.

(إلاّ) تەنها لە دوو حاڵەتدا جەماعەتی مزگەوتیقەرەباڵغتر خێرتر نیە، یەکەم: (لِبِدْعَةِ إِمَامِهِ) بە هۆی بیدعەکاری ئیمامی مزگەوتەکە: وەك لە کۆمەڵێکی (أَهْلِ الْبِدْعَةِ) بێ، یان

أَوْ تَعَطُّلِ مَسْجِد قَرِيبٍ لِغَيْبَتِهِ، وَإِدْرَاكُ تَكْبِيرَةِ الإِحْرَامِ فَضِيلَةٌ، وَإِنَّماَ تَحْصُلُ بِالْاشْتِغَالِ بِالتَّحَرُّمِ عَقِبَ تَحَرُّمِ إِمَامِهِ وَقِيلَ بِإِدْرَاكِ بَعْضِ الْقِيَامِ وَقِيلَ بِأَوَّلِ رُكُـــوعٍ، وَالصَّـــحِيحُ إِدْرَاكُ الْجَمَاعَةِ ماَ لَمْ يُسَلِّمْ،

---

(فاسِق)= گوناهكار بێ، یان مەرجێك، یـان ڕوكنێكـی نوێـژ بـە واجـب نـەزانێ، ئـەو كاتـە مزگەوتی كۆمەڵ كەم خێرترە، بەڵكو بە تەنهاییش نوێژ بكا خێرترە نەوەك لە پشـت ئـەو جۆرە ئیمامە بیكا، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

دووەم: (أَوْ تَعَطُّلِ مَسْجِدٍ قَرِيبٍ) یان مزگەوتێكی نزیك، یان دوور جەماعەتی تـێدا نـەكرێ (لِغَيْبَتِهِ) بە هۆی دیارنەبوونی ئەو كەسە، وەك پیاوماقوڵێك بێ، یان باوەڕ پێكراوێك بێ، یان هەر ئیمامی مزگەوتەكە بێ، ئەو كاتەش جەماعەت لەم مزگەوتەدا خێرترە، هەر چەند كۆمەڵەكەشی كەم بێ.

(وَإِدْرَاكُ تَكْبِيرَةِالإِحْرَامِ) وێڕاگەیشـتنی(الله أكـبر)ی نوێژدابەسـتن لەگـەڵ ئیمامـدا (فَضِـيلَةٌ) خێرێكی گەورەیەو فەرمانی پێكراوە (وَإِنَّماَ تَحْصُلُ) ئـەو خێـرەش تـەنها ئـەوها وەدەسـت دێ: (بِالْأَشْتِغَالِ بِالتَّحَرُّمِ) كـە ئامـادەی (الله أكـبر)ی ئیمامەكـەی بـێو بـە خۆیشـی خـۆی خەریك بكا بە نوێژدابەستن (عَقِبَ تَحَـرُّمِ إِمَامِـهِ) یەكسـەر لـە دوای تـەواوبوونی (الله اكبر)ی نوێژدابەستنی ئیمامەكەی، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّماَ جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤتَمَّ بِهِ، فَإِذا كَبَّـــرَ فَكَبِّرُوا﴾ رواه الشـيخان، ئیمـام بـۆ ئـەوە دانـدراوە: تـا شـوێنی بكـەون، جـا هـەر كاتێك (ألله‌اكبر)ی گوت، ئێـوەش یەكسـەر (الله أكـبر) بڵێن. واتـە: یەكسـەریەكە لـە پیتـی(فَ) وەردەگیرێ (وَ قِيـلَ) لـە فەرموودەیـەكی بێهێـزدا: خێرەكـەی دەسـت دەكـەوێ (بِإِدْرَاكِ بَعْضِ الْقِيامِ) بەوەی بگاتە بەشێكی ڕاوەستانی ئیمام، واتە: پێش چوونە ڕوكووع (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزیتردا: خێرەكـە دەسـت دەكـەوێ (بِـأَوَّلِ رُكُـوعٍ) بـەوەی بگاتـە ڕوكووعی ڕەكعەتییەكەم.

ئینجا بزانە: ئەو فەرموودانەیڕابردوو، دەربارەی خێرە هـەرە گەورەكـەی جەماعـەت بـون، بەڵام دەربارەی خودیجەماعەت (وَالصَّحِيح) فـەرموودەی ڕاست ئەمەیـە: (إِدْرَاكُ الْجَمَاعَـةِ) دەگاتە جەماعەتو خێـری دەگـاتێ كـە لـە پشـت ئیمـام نوێـژ دابەسـتێ (مَـالَمْ يُسَلِّمْ) لـە ماوەیـەكی وەهـادا: كـە ئیمـام سـەلامییەكەمی نەدابێتـەوە، واتـە: ئەگـەر لـە پـێش سـەلامدانەوەی یەكـەمیئیمام، نوێـژ دابیبسـتێ، خێـری جەماعـەتی بـۆ دەنووسـرێ، بـەڵام خێرەكەی ناگاتە خێرە گەورەكەی ئەو كەسەی لـە سـەرەتای جەماعەتـەوە تاكۆتاییەكـەی لەگەڵدا بووە، بۆیێ زانایـان فەرموویانـە: ئەگـەر مـرۆڤ گەیشـتە بەشـێكی جەماعـەتێكو لـە هـەمان كاتیشدا دەگـونجا جەماعەتێكیتر بكرێو بگاتە سەرەتای جەماعەتەكـە، ئـەو كاتـە

وَلْيُخَفِّف ٱلإمَامُ مَعَ فِعْل ٱلأبْعَاضِ وَٱلْهَيْئات إلاَ أَنْ يَرْضَى بِتَطْوِيلهِ مَحْصُورُونَ، وَيُكْرَهُ التَّطْوِيلُ لِيَلْحَقَ آخَرُونَ، وَلَوْ أَحَسَّ فِيالرُّكُوعِ أَوِ التَّشَهُّدِالأَخِيرِ بِدَاخِلٍ لَمْ يُكْرَهْ إنْتظَارُهُ فِيالأَظْهَرِ إنْ لَمْ يُبَالِغْ فيهِ وَلَمْ يَفْرُقْ

---

چاوەڕوانی جەماعەتەکەیتر بکا خێرترە، تاکو بە تەواوی خێرە گەورەکەی بۆ بنووسرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلْيُخَفِّفِ ٱلإمَامُ) سوننەتە: ئیمام نوێژەکەی بە سووکی بکا (مَعَ فِعْلِ ٱلأبْعَاضِ)-لە گەڵ ئەوەش کە بە سووکی دەیکا- ئەو سوننەتانەش بکا: کە ئەندامێکی‌نوێژن‌و (وَٱلْهَيْئَاتِ) هەم سوننەتەکانی‌تری نوێژیش بکا: وەك سورەتی دوای(فاتِحَة)و سێ جار تەسبیحات‌و ...هتد، بە شێوەیەکی وەها: بە لایە کەمەکە واز نەهێنێ و لایە تەواوەکەش هەمووی نەکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ، فَإنَّ فِيهِمُ الصَّغِيرَ وَالْكَبِيرَ وَالضَّعِيفَ وَذَاالْحَاجَةِ، وَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ﴾رواه الشيخان، هەر کاتێك یەکێکتان ئیمامەتی بۆ خەڵك کرد، با نوێژەکە بە سووکی بکا، چونکە لەو خەڵکەدا بچوك هەیەو پیر هەیەو بێ‌هێز هەیەو خاوەن ئیش‌و کار هەیە، هەر کاتێکیش بە تەنهایی نوێژی کرد، چۆن حەز دەکا با نوێژەکە بکا.

(إلاَّأنْ يَرْضَى بِتَطْوِيلِهِ مَحْصُورُونَ) مەگەر کۆمەڵە مەئموومێکی‌دیارکراو، بە درێژکردنەکەی ڕازی بن‌و-بەو مەرجەش- لە شوێنێکی وەهادا نوێژ بکەن: کەسی‌تر نێتە گەڵیان‌و کۆیلەو ژنی بەمێردو کارکەری بەکرێگیراویشیان لە گەڵدا نەبێ، ئەو کاتە سوننەتە نوێژەکە درێژ بکا، بەڵام ئەگەر مەرجێك لەو مەرجانە نەبو، ئەو کاتە ناپەسندە نوێژەکە درێژ بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَيُكْرَهُ) بۆ ئیمامی‌نوێژ ناپەسندە (التَّطْوِيلُ) نوێژەکە درێژ بکا (لِيَلْحَقَ آخَرُونَ) تاکو خەڵکی‌تر بگاتە جەماعەت، هەر چەند خەڵکەکەش عادەتی وەهابێ: لە دوای‌ئیقامەتکردن کۆمەڵ کۆمەڵ بێنە جەماعەت، هەروەها ئەگەر کاتی نوێژدابەستن هاتبو و کۆمەڵێکی‌کەم ئامادە بون، ئەو کاتەش سوننەتە: لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا جەماعەت بکاو چاوەڕوانی زۆربوونی جەماعەت نەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرمویانەو، لە پاشکۆی بانگدا بە بەڵگەوە ڕوونمان کردەوە.

بەڵام (وَلَوْ أَحَسَّ) ئەگەر ئیمام هەستی کرد (فِيالرُّكُوعِ أَوِ التَّشَهُّدِالأَخِيرِ) لە کاتی ڕوکووع بردندا، یان لە تەحیاتی‌ئاخیردا (بِدَاخِلٍ) یەکێك هاتە نوێژو دەیویست جەماعەتی لە پشت دابەستێ (لَمْ يُكْرَهِ إنْتِظَارُهُ) ناپەسند نیە چاوەڕوانی بکا (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (إنْ لَمْ يُبَالِغْ فِيهِ) بەو مەرجەی درێژە بە چاوەڕانکردنەکەی نەدا، هەم (وَلَمْ يَفْرُقْ

بَيْنَ الدَّاخلينَ، قُلْتُ: اَلْمَذْهَبُ اسْتحْبَابُ إنْتظَارِه وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلاَ يَنْتَظِرُ فــي غَيْرِهِـــا، وَيُسَنُّ لِلْمُصَلِّي وَحْدَهُ-وَكَذَا جَمَاعَةً فِي الأَصَحِّ- إِعَادَتُهاَ مَعَ جَمَاعَةٍ يُــدْرِكُها،

---

بَيْنَ الدَّاخِلِينَ) جياوازيش نەكا لە نێوان ئەو كەسانەی دێنە نوێژكردن، بەڵكو بۆ خوا بە یەكسانی چاوەڕوانی نوێژكەرەكان بكا، كەوابو: ئەگەر بۆ خۆشەویستیدونیا چاوەڕوانی دەكرد، یان لە بەر خاتریزانست، یان پلەو پایە، یان خزمایەتی، یان دۆستایەتی بوو، لەو حاڵەتانەدا چاوەڕوانكردن ناپەسندە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ (اَلْمَـذْهَبُ) فـەرموودەی ڕاستیمەزهەب ئەمەیە: (إِسْتِحْبَابُ انْتِظَارِه) سوننەتە: لە ڕوكووع و لە تەحیاتی ئاخیردا بەو مەرجانەیڕابردوو، چاوەڕوان بكا (وَاللهُ أَعْلَم) چونكە ئەو چاوەڕوانكردنە یارمەتیدانە بۆ چاكە، لە بەر ئەوەی ئەگەر مەئموم بگاتە ڕوكووع دەگاتە ڕەكعەتێك، هەروەها ئەگەر بگاتە تەحیاتی ئاخیر دەگاتە جەماعەت، كەوابو: (وَلاَ يَنْتَظِرُ) ئیمام چاوەڕوانی هیچ كەسێك ناكا، واتە: ناپەسندە چاوەڕوان بكا (فِي غَيْرِهِمـا) لە شوێنەكانیتری جگە لە ڕوكووعو تەحیاتی ئاخیر: وەك سوننەتو ڕوكنەكانیتری نوێژ؟ چونكە پێویست ناكا.

هەروەها ئەگەر مەئمومەكەش پیشەی ئەوەبو: سستیی دەكردو تا كاتی ڕوكووع نوێژی دانەدەبەست، ئەوكاتەش چاوەڕوانكردنی سوننەت نیە، ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو دەربارەی ئیمام بوو، واتە: نوێژكەری بەتەنها بۆی هەیە چاوەڕوان بكا هەر چەند نوێژەكەش زۆر درێژ ببێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی دووبارە كردنەوەی جەماعەت ﴾

(وَيُسَنُّ لِلْمُصَلِّيوَحْدَهُ) سوننەتە بۆ ئەو كەسەی نوێژی واجبی بەتەنهایی كردوە-(وَكَذَا جَمَاعَةً) هەروەها بۆ ئەو كەسەش كە بە جەماعەت كردویەتی (فِيالأَصَحِ) لە فەرموودەی ڕاستردا- (إِعَادَتُها) بۆ هەردووكیان سوننەتە: نوێژەكە دووبارە بكەنەوە (مَعَ جَمَاعَةٍ) لەگەڵ جەماعەتێكیتردا: كە (يُدْرِكُها) بگاتە ئەو جەماعەتە لە كاتینوێژەكەدا، هەر چەند جەماعەتەكەیدووەمیش تەنها ئیمامو مەئمومێك بن، بەڵام ئەگەر كاتینوێژەكە نەمابو، دووبارەكردنەوەی جەماعەت سوننەت نیە.

جا بەڵگەی نوێژكەری بە تەنهایی ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ يَزِيدَ بن الأَسْوَدِ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلَيْنِ بَعْدَ صَلاَةِالصُّبْحِ فِي نَاحِيَةِالْمَسْجِد لَمْ يُصَلِّيا، فَقَالَ لَهُما: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيا مَعَنا؟ قَالاَ: قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنا. فَقالَ: لاَتَفْعَلُوا، إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فِيرَحْلِه ثُمَّ أَدْرَكَ الإِمَـامَ وَلَـمْ يُصَلِّ فَلْيُصلِّ مَعَهُ فإِنَّها لَهُ نَافِلَةٌ﴾رواه أصحاب السنن بسندصحيح، پێغەمبەرﷺ نوێژیسبیەنیێ كردو دوو پیاوی لە مزگەوتدا دیتن نوێژیان نەكرد، فەرمووی: چی ئێوەی قەدەغە كرد نوێژمان

لەگەڵ بکەن؟ گوتیان: لە ماڵەوە نوێژمان کردوە. پێغەمبەرﷺ فەمووی: وامەکەن، هەر کاتێك یەکێکتان لە ماڵەوە بە تەنهایی نوێژی کرد ئینجا گەیشتە ئیمام نوێژی نەکردبو، با نوێژی لە گەڵدا بکاتەوە، چونکە نوێژەکەی دووەمی بۆ دەبێتە سوننەت.

هەروەها بەڵگەی نوێژکەری بە جەماعەتیش ئەم حەدیسەیە: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ أَنَّ رَجُلاً دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّى النَّبِيُّﷺ بِأَصْحَابِهِ فَقَالَﷺ: مَنْ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّيَ مَعَهُ؟ فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فَصَلَّى مَعَهُ﴾ رواه الإمام أحمد وحسنه الترمذي، پیاوێك هاتە مزگەوت لەو کاتەیدا پێغەمبەرﷺ نوێژی جەماعەتی بە (صحابة)کان کردبو، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کێ خێرێك بەم پیاوە دەکا نوێژی لەگەڵدا بکا؟ پیاوێك -کە ئیمامی(أبوبکر) بوو- هەڵسا نوێژی بە جەماعەتی لەگەڵ پیاوەکەدا کرد. واتە: لە پێشداش نوێژەکەی بە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ کردبو.

(وَفَرْضُهُ) نوێژە واجبەکەی نوێژکەری بە تەنهایی و نوێژکەری بە جەماعەت (الْأُولَى) نوێژەکەی یەکەمە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافعي)دا، واتە: نوێژەکەی یەکەم بۆ هەردووکیان بە بەر واجب دەکەوێ، نوێژەکەی دووەمیش -کە بە جەماعەت دووبارەی دەکەنەوە- بۆیان بە سوننەت دەنووسرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (یزید)ی ڕابردوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (وَالْأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (أَنَّهُ) ئەوەی نوێژەکە بە جەماعەت دووبارە دەکاتەوە (يَنوِي بِالثَّانِيَةِ الْفَرْضَ) هەر بە نیەتی فەرز نوێژەکەی دووەمیش دادەبەستێتەوە، وەك بە دڵ بڵێ: **(نیەتم وەیە فەرزی نیوەڕۆ بە جەماعەت دووبارە دەکەمەوە)**. تاکو بەو نیەتە خێری جەماعەتی بۆ بنووسرێ.

ئینجا بزانە: ئەو جۆرە سوننەتانەی جەماعەتیان تێدا سوننەتە ئەوانیش وەکو نوێژی فەرز سوننەتە بە جەماعەت دووبارە بکرێنەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، هەروەها دووبارەکردنەوەش لە گشت حاڵەتێکدا تەنها یەك جار سوننەتە، بەڵام نوێژی (إِسْتِسْقَاء) زیاتر لە جارێکیش هەر سوننەتە، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: حەدیسەکەی(أبی سعید)ی ڕابردوو، بەڵگەیە: لە مزگەوتە گشتیەکانی بازاڕو سەر ڕێگەو شوێنە گشتیەکانیتردا، دروستەو ناپەسند نیە: جەماعەت لە دوای جەماعەت بکرێ، هەر چەند ئیمامێکی دامەزراویشی هەبێ، هەر وەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام بەو مەرجەی ئیمامی مزگەوتەکە ئیزن بدا، یان بێدەنگ بێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشبراملسي)دا بە بەڵگەی حەدیسەکەی(أبی سعید) ڕوون کراوەتەوە.

وَلاَ رُخْصَةَ فِي تَرْكِهاَ وَإِنْ قُلْنَا سُنَةٌ إلاّ بِعُذْرِعَامٍّ كَمَطَرٍ أَوْ رِيحٍ عَاصِفٍ بِاللَّيْلِ وَكَـذَا وَحَلٌ شَدِيدٌ عَلَىالصَّحِيحِ، أَو خاَصٍّ كَمَرَضٍ وَحَرٍّ وَبَرْدٍ شَدِيدَيْنِ

---

هەروەها ئەگەر ئیمامیمزگەوت لەکاتینوێژدا ئامادە نەبو، سوننەتە ماوەیەك چاوەڕوانی بکەن، ئینجا ئەگەر نەهات، یەکێك پێشنوێژی بکا، تاکو خێری سەرەتایکاتیان لەدەست نەچێ، بەو مەرجەی لە گێچەڵ و ئاژاوە نەترسێن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتیو بەڵگەشی بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عن سهلﷺ: أَنَّ الـنَّبِيَّﷺ ذَهَـبَ لِيُصْـلِحَ بَـيْنَ بَنِيعمرٍو، فَقَدَّمَ النَّاسُ أَباَبَكْرٍﷺ لِيُصَلِّيَ بِهِمْ فَحَضَرَالنَّبِيُّﷺ وَهُمْ فِيالصَّلاة فَلَمْ يُنْكِرْ عَلَيْهِمْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت سولح لە نێوان (بنیعمرو)دا بکاو لە نوێژی عەسر دواکەوت، (صحابة)کانیش ئیمامی(أبوبکر)یان کردە ئیمامی نوێژەکە، جا ئەوان هەر لە نوێژدا بوون پێغەمبەرﷺ گەڕاوە، ڕەخنەشی لێنەگرتن.

بەڵام ئەگەر مەترسی ئاژاوە و گێچەڵ هەبو، ئەو کاتە بە تەنهایی نوێژ دەکەن، هەروەك لە (تحفة)و (نهایە)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: بەم ئاگاداریە مەبەستی (نهایة) ئاشکرا دەبێ، کە دەفەرموێ: لە مزگەوتیگشتیدا دروستە: لە یەك کاتدا دوو جەماعەت بکرێن. واتە: بەو مەرجەی ئیمامەکە ڕزای بێ، تاکو ئاژاوە ڕوو نەدا، والله أعلم.

## ﴿ عوزرەکانی جەماعەت نەکردن ﴾

(وَلاَ رُخْصَةَ فِيتَرْكِهاَ) هیچ ڕێگەیەك نەدراوە بۆ نەکردنیجەماعەت (وَإِنْ قُلْنا سُنَّةٌ) هەر چەندەش بڵێین: جەماعەت سوننەتە (إِلاَّ بِعُذْرٍ) تەنها بە هۆی عوزرێك لەم عوزرانەی داهاتوو نەبێ، جیاوزای نیە عوزرەکە: (عامٍّ) عوزرێکی گشتی بێ (كَمَطَرٍ) وەکو باران، یان بەفرێکی وەها جل و بەرگی تەڕ بکەن بە شەو، یان بە ڕۆژ (أَوْ رِيحٍ عَاصِفٍ) یان وەکو بایەکی بەهێز، یان بایەکیسارد (بِاللَّيْلِ) بە شەو، نەك بە ڕۆژ (وكذا وَحَلٌ شَدِيدٌ) هەروەها قوڕێکیبەهێز: کە بکەوێتە ناوی، یان خلیسکی لێبیا (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست ﴿عن ابـن عمررَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ كانَ يَأْمُرُالْمُؤَذِّنَ-إذا كانَتْ لَيْلَةٌ ذاتُ بَرْدٍ وَمَطَرٍ- يَقُولُ: أَلا صَلُّوا فِيالرِّحالِ﴾ رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دەدا بانگدەر-لە شەوی بارانو ساردا- بڵێ: ئاگادار بن لە ماڵەوە نوێژ بکەن.

(أَوْ خاصٍّ) یان عوزرەکە عوزرێکی تایبەت بێ (كَمَرَضٍ) وەکو نەخۆشیەکی وەها: بە هۆی هاتنە جەماعەت ئازاری بدا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشی مردنیدا چەند ڕۆژێك نەهاتە جەماعەت (وَحَرٍّ) هەروەها وەکو گەرما (وَ بَرْدٍ) وەکو سەرما (شَدِيدَيْنِ) کە زۆر بەهێز بن، بە شەو، یان بە ڕۆژ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی(اِبْن عمر) رضي الله عنهما.

وَجُوعٍ وَعَطَشٍ ظَاهِرَيْنِ وَمُدَافَعَةِ حَدَثٍ وَخَوْفِ ظَالِمٍ عَلَى نَفْسٍ أَو مَالٍ وَمُلاَزَمَةِ غَرِيمٍ مُعْسِرٍ وَعُقُوبَةٍ يُرْجَى تَرْكُهَا إِنْ تَغَيَّبَ أَيَّاماً وَعُرْيٍ وَتَأَهُّبٍ لِسَفَرٍ مَعَ رُفْقَةٍ تَرْحَلُ وَأَكْلِ ذِي رِيحٍ كَرِيهٍ وَحُضُورِ قَرِيبٍ مُحْتَضَرٍ أَوْ مَرِيضٍ بِلاَ مُتَعَهِّدٍ أَوْ يَأْنَسُ بِهِ.

---

هەم (وَجُوعٍ) وەکو برسیەتیو (وَعَطَشٍ) تێنووەتی (ظَاهِرَيْنِ) کە هەردووکیان بەهێز و ئاشکرا بنو خواردەمەنیو ئاوەکەش ئامادە بن (وَمُدَافَعَةِ حَدَثٍ) وەکو تەنگاوی میز و با و پیسایی، ئەگەر نەگونجێ: ئەو شتانە لە خۆی دەرکاتە دەرەوەو دەستنوێژ بگرێتەوەو بگاتە جەماعەت، چونکە لەو حاڵەتانەدا نوێژکردن ناپەسەندە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاصَلاةَ بِحَضْرَةِالطَّعامِ وَ لا هُوَ يُدافِعُهُ الأَخْبَثانِ﴾ رواه مسلم، نوێژکردن تەواو نیە لە کاتی ئامادەبوونی خواردەمەنیو لەو کاتەش کە هەردوو پیسەکان تەنگاوی دەکەن.

(وَخَوْفِ ظَالِمٍ) هەروەها وەك لە ستەمکارێك بترسێ (عَلَى نَفْسٍ) کە زیان لەگیان، یان لە ئەندامێکی بدا (أَوْ مَالٍ) یان زیان لە ماڵ و سامانی بدا، یان زیان لە ناموسی بدا، یان بترسێ باڵندە، یان ئاژەڵ زیانێکی ماڵی لێبدا.

(وَمُلاَزَمَةِ غَرِيمٍ مُعْسِرٍ) هەروەها وەك ترسی بەرۆکگرتنی خاوەن قەرزێکی هەبێو هیچیشی نەبێ قەرزەکەی پێبداتەوە (وَعُقُوبَةٍ) هەروەها وەکو ترسی سزادانێکی وەهای هەبێ: کە (يُرْجَى تَرْكُهَا) تەمای لاچوونی سزایەکە بکا (إِنْ تَغَيَّبَ أَيَّامًا) ئەگەر چەند ڕۆژێك خۆی بشارێتەوە.

هەم (وَعُرْيٍ) وەکو ڕووتی: کە بەرگێکی شیاوی دەست نەکەوێ، هەم (وَتَأَهُّبٍ لِسَفَرٍ) وەکو بەڕێکەوتن بۆ سەفەرێکیحەلاڵ (مَعَ رُفْقَةٍ) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی وەها: کە (تَرْحَلُ) لە پێش نوێژی جەماعەتدا دەست بە ڕۆیشتن بکەن (وَأَكْلِ ذِي رِيحٍ كَرِيهٍ) هەروەها وەکو خواردنی شتێکی بۆن ناخۆش: وەکو سیر.

(وَحُضُورِ قَرِيبٍ) وەکو ئامادەبوون لە لای خزمێکی، یان دۆستێکی وەها: کە (مُحْتَضَرٍ) لە سەرەمەرگدا بێو نزیکی گیاندان بێ (أَوْ مَرِيضٍ) یان لە لای نەخۆشێکی وەهابێ: کە (بِلاَ مُتَعَهِّدٍ) کەس نەبێ ئاگاداری بێ (أَوْ يَأْنَسُ بِهِ) یان نەخۆشەکە دڵی بە وی خۆش ببێ ئەگەر لە لای بمێنێتەوە.

هەروەها مانەوە لە لای ژنەکەی لە شەوانیزاوایەتیدا بۆ جەماعەتی عیشاو سبەینێ بە عوزر دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ئەو عوزرانەیڕابردوو تەنها بۆ ئەو کەسەیە: کە بۆی نەگونجێ لە ماڵەوە جەماعەت بکا، ئەگینا: داوالێکردنی جەماعەتی لە سەر لاناچێ، هەروەهاش ئەو عوزرانە تەنها تاوان، یان ناپەسندی نەکردنی جەماعەت لادەبەن، واتە: ئەگەر بە هۆی ئەو

(فَصْلٌ) لاَ يَصِحُّ إِقْتِدَاؤُهُ بِمَنْ يَعْلَمُ بُطْلاَنَ صَلاَتِه أَوْ يَعْتَقِدُهُ كَمُجْتَهِدَيْنِ اخْتَلَفَا فِي الْقِبْلَةِ أَوْ إِنائَيْنِ، فَإِنْ تَعَدَّدَ الطَّاهِرُ فَالأَصَحُّ الصِّحَّةُ مَالَمْ يَتَعَيَّنْ إِناءُ الْإِمَامِ لِلنَّجاسَةِ،

---

عوزرانـه جه‌ماعـه‌تی نـه‌کرد خێـری جه‌ماعـه‌تی بـۆ نانووسـرێ، هـه‌روه‌ك لـه زۆربـه‌ی سه‌رچاوه‌کاندا ڕوون کراوه‌ته‌وه.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر که‌سێك پیشـه‌ی وه‌هـابو: بـه‌رده‌وام بـوو لـه سـه‌ر جه‌ماعـه‌ت کـردن‌و ئه‌گـه‌ر عوزرێکی نه‌بوایه ئه‌م جاره‌ش ده‌یویست بڕواتـه جه‌ماعـه‌ت، ئـه‌و کاتـه‌خێری جه‌ماعـه‌تی ده‌گاتێ، هه‌روه‌ك له (تحفه)دا فه‌رموویه‌تی، پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فـه‌رموێ: ﴿إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سافَرَ كَتَبَ اللهُ تعالى لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلَ مَاكانَ يَعْمَلُ صَحِيحاً مُقِيماً﴾ رواه البخـاري وأحمـد، هه‌ر کاتێك به‌نـده‌ی ئیمانـدار نـه‌خۆش بـوو، یـان به‌سـه‌فه‌ر چـوو و خواپه‌رستـی جارانی پێنه‌کرا، خوای‌گه‌وره خێری وه‌ك ئه‌و خواپه‌رستیه‌ی بۆ ده‌نووسێ: که لـه کـاتی سـاغی‌و له ماڵه‌وه‌یدا ده‌یکرد.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی سیفه‌ته‌کانی ئیمامی نوێژ ﴾

بزانـــه: مه‌رجـــه ئیمامی‌نوێـــژ ئـــه‌م پێـــنج ســـیفه‌تانه‌ی‌داهاتووی تـــێدا بێنـــه‌جێ:

**یه‌که‌م:** ده‌بی نوێـژی ئیمامه‌کـه دروسـت بـێ، کـه‌وابو: (لاَيَصِحُّ) دروسـت نیـه (إِقْتِـداؤُهُ) ئیقتیدا بکا، واته: نوێژی خۆی ببه‌ستێته‌وه (بِمَنْ) بـه نوێـژی که‌سـێکی وه‌هـا: کـه (يَعْلَمُ بُطْلاَنَ صَلاَتِهِ) بزانێ نوێژه‌که‌ی به‌تاڵه، واته: دروست نیه جه‌ماعـه‌ت لـه پشـت ئیمـامێکی وه‌ها بکا: که بێگومان نوێژه‌که‌ی به‌تاڵ بێ: وه‌ك ئیمامه‌کـه کـافر بـێ، یـان ده‌سـتنوێژی ناتـه‌واو بـێ، یـان پیسـی پێـوه بـێ، واتـه: ئه‌گـه‌ر ئیقتیـدای پێبکـا، گوناهبـار ده‌بـێ‌و نوێژه‌که‌شی دروست نیه.

(أَوْ يَعْتَقِدُهُ) یان باوه‌ڕی وابێ: نوێـژی ئیمامه‌کـه‌ی به‌تاڵـه (كَمُجْتَهِدَيْن إِخْـتَلَفا فِي الْقِبْلَـةِ) وه‌کو دوو که‌س بۆچوونیان لێك جیابێ ده‌رباره‌ی قیبلـه (أَوْ إِنـائَيْنِ) یـان ده‌ربـاره‌ی دوو قاپه ئاوی ده‌ستنوێژ، واته: یه‌کێك بڵێ: ئه‌م لایه قیبله‌یه، یـان بڵـێ: قاپـه ئاوه‌کـه‌ی تـۆ پیسه. ئه‌وی‌تریش بڵێ: نا، قیبله لایه‌که‌ی‌تره، یـان بڵـێ: قاپه‌کـه‌ی مـن پاکـه. ئـه‌وه بـۆ هیچێکیان دروست نیه جه‌ماعه‌ت له پشت ئه‌وی‌تر بکا، چونکه هه‌ر یه‌که‌یان باوه‌ڕی وایه: نوێژی ئه‌وی‌تر به‌تاڵه.

ئینجا بزانه: ئه‌وه له‌و کاته‌دابو: که ته‌نها دوو قاپه ئاو هه‌بن، چونکه (فَإِنْ تَعَـدَّدَ الطّـاهِرُ) ئه‌گـه‌ر ژماره‌یـه‌ك قـاپی پـاك هـه‌بون: وه‌ك لـه سـێ قـاپ دووانیـان پـاك بـون (فَالأَصَـحُّ) فه‌رمووده‌ی ڕاستتر ئه‌مه‌یه: (اَلصِـحَّةُ) دروسته: جه‌ماعه‌ت له پشت یه‌کتری بکه‌ن (مـا لَـمْ يَتَعَيَّنْ إِناءُ الأِمامِ لِلنَّجاسَةِ) تا ئه‌و مـاوه‌یه‌ی قاپه ئاوه‌که‌ی ئیمام به پیس دانه‌ندرێ، واته:

فَإنْ ظَنَّ طَهَارَةَ إناء غَيْره اقْتَدَى به قَطْعاً، فَلَوْ اشْتَبَهَ خَمْسَةٌ فيهاَ نَجسٌ عَلَــى خَمْسَــةٍ فَظَنَّ كُلٌّ طَهَارَةَ إناء فَتَوَضَّأَ به وَأَمَّ كُلٌّ فِي صَلاَة فَفِي الأَصَحِّ يُعِيدُونَ الْعِشَاءَ إلاَّ إمَامَهـا فَيُعِيدُ الْمَغْرِبَ، وَلَوْ إقْتَدَى شَافِعِيٌّ بِحَنَفِيٍّ مَسَّ فَرْجَهُ أَوْ افْتَصَــدَ فَالأَصَــحُّ الصِّــحَّةُ فِي الْفَصْدِ دُونَ الْمَسِّ اعْتِبَاراً بِنِيَّةِ الْمُقْتَدِي،

---

هەر كاتێك قاپە ئاوی یەكێك بە پیس داندرا -كەسێیەمەكەیە- دروست نیە جەماعەت لە پشت ئەوی بكەن، كەوابو: لەو سێ كەسانە تەنها بۆ یەكێكیان دەبێ پێشنوێژی بۆ گشتیان بكا، چونكە بێگومان قاپە ئاوی یەكێكیان پیسە.

بەلام (فَإنْ ظَنَّ) ئەگەر یەكێكیان وایزانی (طَهارةَ إناءِ غَيْرِه) قاپە ئاوەكەی یەكێكی‌تریش -جگە لەخۆی- پاكە (إقْتَدَى بِهِ قَطْعاً) ئەوە بە بێ‌دوودڵی با جەماعەت لە پشت ئەویش بكا، هەروەك ئەگەر وای دەزانی قاپە ئاوی یەكێكیان پیسە دروست نیە جەماعەتی لە پشت بكا.

(فَلَوْ اشْتَبَهَ خَمْسَةٌ) ئەگەر پێنج قاپە ئاو شێوران (فِيها نَجِسٌ) لەو پێنجانەدا قاپە ئاوێكی پیس هەبو (عَلَى خَمْسَةٍ) شێورانەكەش لە سەر پێنج كەسان بوو (فَظَنَّ كُلٌّ طَهـارةَ إنـاءٍ) هەر یەكێك وایزانی قاپێك پاكەو (فَتَوَضَّأَ بِهِ) دەستنوێژی بەو قاپە گرتو (وَ أَمَّ كُلٌّ فِـي صَلاةٍ) هەر یەكە-بە نۆبەت- لە نوێژێكدا ئیمامەتی‌ی كرد (فَفِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (يُعِيدُونَ الْعِشاءَ) گشتیان نوێژی عیشا دووبارە دەكەنەوە، چونكە گشتیان وا تێگەیشتون قاپەكەی ئیمامی عیشا پیسە (إلاّ إمَامَها) تەنها ئیمامی عیشا نوێژی عیشا دووبارە ناكاتەوە، بەڵكو (فَيُعِيدُ الْمَغْرِبَ) ئەو نوێژی مەغریب دووبارە دەكاتەوە، چونكە بە تێگەیشتنی خۆی قاپەكەی ئیمامی مەغریب پیسە.

(وَلَوْ اقْتَدَى شافِعِيٌّ) ئەگەر یەكێكی شافعی‌مەزهەب جەماعەتی دابەست (بِحَنَفِيٍّ) لە پشت ئیمامێكی حەنەفی‌مەزهەب: كە (مَسَّ فَرْجَهُ) دەستی لە ئەندامی میزكردنی دابو، یان دەستی لە ئافرەتی بێگانە دابو (أَوِافْتَصَدَ) یان خوێنی لە لاشەی‌خۆی دەرهێنابو، یان فاتیحەی نەدەخوێند، یان (بِسْمِ اللهِ...)ی لە سەرەتای فاتیحە نەدەخوێند (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (الصِّحَّةُ) جەماعەتەكەی دروستە: (فِي الْفَصْدِ) لە مەسەلەی خوێن دەرهێناندا (دُونَ الْمَسِّ) بەلام لە مەسەلەی دەست لێدانەكە دروست نیە، هەروەها لە مەسەلەی نەخوێندنی(بِسْمِ اللهِ)و فاتیحەش دروست نیە (إعْتِباراً بنيّةِ الْمُقْتَدِي) چونكە بە گوێرەی باوەڕی مەئمومەكە ڕەفتار دەكرێ.

واتە: چونكە لە مەزهەبی(شافیعی)دا بە خوێن دەرهێنان دەستنوێژ ناشكێ نوێژی مەئمومەكە دروستە، چونكە بە هەردوو دەست لێدانەكان دەستنوێژ دەشكێ‌و بە

نەخوێندنی (بسم الله...)و فاتیحەش نوێژ بەتاڵە، بۆیێ نوێژی مەئمومەکەش بەتاڵە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

**دووەم**: دەبێ ئیمامەکە لە حاڵەتیجەماعەتدا سەربەخۆ بێ، کەوابو: (وَلاتَصِحُّ قُدْوَةٌ) دروست نیە ئیقتیداکردن (بِمُقْتَدٍ) بە مەئمومێك: کە لە حاڵەتی ئیقتیدادابێ، بە بەڵگەی (إجماع)، چونکە لەم نوێژکردنەیدا سەربەخۆ نیە.

ئینجا بزانە: لە (بخاري و مسلم)دا هاتوە: ﴿كَانَ أَبُوبَكْرٍ﴾ يُصَلِّي بِصَلاَةِ رَسُــولِ اللهِ ﷺ-أَيْ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ- وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِيبَكْرٍ﴾ ئیمامی(أبوبكر) ئیقتیدای بە پێغەمبەرﷺ کردبو لە نەخۆشی مردنیدا، خەڵکیش ئیقتیدایان بە ئیمامی(أبوبكر) کردبو. مەبەست ئەوەیە گشتیان ئیقتیدایان بە پێغەمبەرﷺ کردبو، بەڵام پێغەمبەرﷺ بە هۆی نەخۆشی دەنگەکەی بێهێز بوبو و ئیمامی(أبوبكر)ش جموجۆڵی پێغەمبەری دەگەیاندە خەڵکەکە، هەروەك لە ڕیوایەتی(مسلم)دا هاتوە: ﴿وَأَبُوبَكْرٍ يُسْمِعُهُمُ التَّكْبِيرَ﴾ ئیمامیأبوبكر (الله أكبر)ی دەگەیاندە گوێی خەڵکەکە. هەم لە (المجموع) شدا ئەوها ڕوونی کردۆتەوە.

کەوابو: ئەگەر وایدەزانی یەکێك بە تەنهایی نوێژ دەکاو ئیقتیدای پێکرد، ئینجا ئاشکرا بوو: ئەویش لە حاڵەتی ئیقتیدا بە کەسێکیتردا بووە، یان نەیدەزانی کامەیان ئیمامەو لە خۆیەوە ئیقتیدای بە یەکێکیان کرد، یان وایدەزانی ئیمامەو ئیقتیدای پێکرد ئینجا ئاشکرا بوو: ئەویش لەو کاتدا ئیقتیدای بە کەسێکیتر کردبو، لەو حاڵەتانەدا نوێژەکەی دروست نیەو واجبە: دووبارەی بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر لە حاڵەتی ئیقتیدا نەبو، بەڵکو ئیقتیدایەکە بچڕا بوو-وەك ئیمام سەلامی دابێتەوە- ئەو کاتە دروستە: ئیقتیدا بە مەئمومەکە بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە، هەروەرها دروست نیە: لە یەك کاتدا ئیقتیدا بە دوو کەسان بکا: کە بە تەنهایی نوێژ دەکەن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

**سێیەم**: نابێ ئیمامەکە دووبارەکردنەوەی نوێژەکەی لە سەر بێ، کەوابو: (وَ لا بِمَنْ) دروست نیە: ئیقتیدا بکا بە کەسێکی وەها: کە (تَلْزَمُهُ إِعادَةٌ) دووبارەکردنەوەی ئەو نوێژەی لە سەر بێ (كَمُقِيمٍ تَيَمَّمَ) وەکو یەکێك لە ئاوەدانیدا لە بەر نەبوونی ئاو تەیەمومی کرد بێ، یان برینەکەی لە ئەندامی تەیەمومدا بێو پێچەری لە سەر بێ، یان نە گڵو نە ئاوی دەست نەکەوێ، یان لە شوێنێکی پیس بەند کرابێ، یان بەسترابێتەوەو ڕوکنێکی نوێژی پێنەکرێ...هتد، ئەوانە گشتیان واجبە: نوێژەکە بکەنو دووبارەکردنەوەی نوێژەکەشیان لە سەر واجبە، کەوابو: دروست نیە ئیقتیدایان پێوە بکرێو ببنە ئیمامی

وَلاَ قارِئ بِأُمِّيٍّ فِي الْجَدِيد وَهُوَ مَنْ يُخِلُّ بِحَرْفٍ أَوْ تَشْدِيدَةٍ مِنَ الْفَاتِحَةِ، وَمِنْـهُ أَرَتُّ يُدْغِمُ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، وَأَلْثَغُ يُبْدِلُ حَرْفاً بِحَرْفٍ،

نوێژ، هەر چەند مەئموومەکەش وەکو ئیمامەکە بێ، بەڵام ئەگەر تەیەمومەکەی لە سەفەردا لە بەر نەبوونی ئاو بوو، یان لە ئاوەدانیدا بە هۆی نەخۆشیو برینداری بوو، ئەو کاتە دروستە: ئیقتیدای پێوە بکرێ، چونکە دووبارەکردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

**چوارەم:** دەبێ ئیمامەکە خوێندنی فاتیحەی ڕەوانو تەواو بێ، کەوابو: (وَلاقارِئٍ) دروست نیە: یەکێکی فاتیحە ڕەوان ئیقتیدا بکا (بِأُمِّيٍّ) بە ئیمامێکیئوممی، واتە: فاتیحە ناڕەوان (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافیعی)دا، هەر چەندەش بۆی نەگونجێ فاتیحەکەی ڕەوان بکا، هەورەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەم فەرموودە نوێیە مەزهەبی هەرسێك ئیمامەکەیترە، بەڵام لە فەرموودەی کۆنی ئیمامی(شافیعی)دا: ئیقتیدا لەو نوێژانەدا دروستە: کە فاتیحەیان بە بێدەنگ دەخوێندرێو لە بەدەنگەکان دروست نیە، هەورەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَهُوَ) ئوممی=فاتیحە ناڕەوان (مَنْ يُخِلُّ بِحَرْفٍ) ئەو کەسەیە ناتەواوی بگەیێنێتە پیتێکی فاتیحە: وەك نەیخوێنێتەوە، یان بە ڕاستی نەیخوێنێتەوە (أَوْ تَشْدِيدَةٍ مِنَ الْفَاتِحَةِ) یان ناتەواوی بگەینێتە شەددەیەکی فاتیحە، واتە: پیتێکی تێکنراو هەڵبوەشێنێتەوە، وەك بڵێ (اَلْرَحْمنِ الْرَحِيمِ). یان نەیگرێو سوکی بکا، وەك بڵێ: (إِيَاكَ).

ئینجا بزانە: ئەگەر شەددەکەی دەگرتو زۆر گرانی نەدەگرت، ئەو کاتە ئیقتیدا پێوەکردنی دروستە، بەڵام ناپەسەندە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

(وَمِنْهُ أَرَتُّ) پیتگر بەشێکە لە ئوممیو دروست نیە ئیقتیدای پێوە بکرێ: کە پیتەکە بگۆڕێو (يُدْغِمُ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ) لە ناوپیتێکیتری بنێو بیگرێ، شوێنەکەش جێی گرتن نەبێ، وەك بڵێ: (الْمُسَّقِيم)، یان (الْمُتَّقِيم). بەڵام ئەگەر پیتەکەی نەگۆڕی بەڵکو تەنها پیتێکی سوکی دەگرت، وەك بڵێ: (مَالِكِّ)، یان (نَعْبُدُّ) ئەوە زیانی نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَلْثَغُ) هەروەها پیتگۆڕ بەشێکە لە ئوممیو دروست نیە ئیقتیدای پێوە بکرێ: وەك (يُبْدِلُ حَرْفاً بِحَرْفٍ) پیتێك بە پیتێکیتر بگۆڕێتەوە، وەك بڵێ: (اَلْزِينَ)، یان (غَيْغِ الْمَغْظُوبِ)، یان (وَلا الظَّالِّينَ)، یان (الْمُثْتَقِيم)، بەڵام ئەگەر پیتەکەی نەدەگۆڕی بەڵکو تەنها بە بێگەردی نەیدەخوێندەوە، ئەوە زیانی نیە، هەورەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَتَصِحُّ بِمِثْلِه وَيُكْرَهُ بِالتِّمْتَامِ وَالْفَأْفَاءِ وَاللاَّحِنِ، فَإِنْ غَيَّرَ مَعْنىً كَأَنْعَمْتُ بِضَمٍّ أَوْ كَسْرٍ أَبْطَلَ صَلاَةَ مَنْ أَمْكَنَهُ التَّعَلُّمُ،

---

ئینجا بزانه: ئەگەر دەگونجا: ئوممیو پیتگرو پیتکۆڕ خۆیان فێره خوێندنەوەی ڕاست بکەنو بەقەسدی خۆیان فێر نەدەکرد، ئەو کاتە نوێژەکەشیان بەتاڵە، بەڵام ئەگەر نەگونجا: وەك زوبانەکەیان نەتوانێ پیتەکە ڕاست بخوێنێتەوە، یان ماوەی فێربوونی نەبو، ئەو کاتە نوێژەکەی خۆیان دروستە بەڵام ئیقتیدای فاتیحە ڕەوان بەوانەوە دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَتَصِحُّ) دروستە: ئوممی ئیقتیدا بکا (بِمِثْلِه) بە ئوممییێکی وەکو خۆی، واتە: هەردووکیان لە یەك پیتدا ناتەواو بن، هەر چەند لە شێوەی گۆڕینەکەشدا لێك جیا بن، وەك یەکێکیان بڵێ: (بِثْمِ اللهِ...). ئەویتریش بڵێ: (بِزْمِ اللهِ...). بەڵام ئەگەر لە پیتە ناتەواوەکانیش لێك جیابون: وەك یەکێك لە (راء)و یەکێکیش لە (سین)دا ناتەواو بێ، ئەو کاتە ئیقتیدای هیچێکیان بەویتر دروست نیە.

هەروەها دروست نیە زمانساغ ئیقتیدا بە لاڵ بکا، بەڵام دروستە: لاڵ ئیقتیدا بە لاڵێکی وەکو خۆی بکا، هەروەك لە (تحفه)دا فەرموویەتی، بەڵام لە (نهایه)دا دەفەرموێ: دروست نیە لاڵ ئیقتیدا بە لاڵ بکا. (وَتُكْرَهُ) ناپەسندە ئیقتیدا بکا (بِالتِّمْتَامِ) بەو کەسەی پیتی (تاء) دووبارە دەکاتەوە (وَالْفَأْفَاءِ) ناپەسندە ئیقتدا بکا بەو کەسەی پیتی(فاء) دووبارە دەکاتەوە، هەروەهاش ناپەسندە بە (الْوَأْوَاء) : کە پیتی(واو) دووبارە دەکاتەوە.

(وَاللاَّحِنِ) هەروەها ناپەسەندە ئیقتیدا بەو کەسە بکا کە لە سەرو بۆرو ژێری پیتێکی فاتیحەدا هەڵە دەکاو هەڵەکەشی واتەی ووشەکەی نەگۆڕێ: وەك بۆر بداتە (هاء)و بڵێ: (لِلّهُ)، یان سەر بداتە (باء)و بڵێ: (نَعْبَدُ).

بەڵام (فَإِنْ غَيَّرَ مَعْنىً) ئەگەر هەڵەکەی واتەی دەگۆڕی: (کـ) وەك لە (أَنْعَمْتَ)دا هەڵەبکا (بِضَمٍّ أَوْ كَسْرٍ) بۆر بداتە (تاء)، یان ژێری بداتێ و بڵێ: (أَنْعَمْتُ)، یان (أَنْعَمْتِ). یان بڵێ: (إِيَّاكِ). واتە: ژێر بداتە کافەکە (أَبْطَلَ صَلاَةَ مَنْ) ئەو جۆرە هەڵەیە نوێژی ئەو کەسە بەتاڵ دەکا: کە (أَمْكَنَهُ التَّعَلُّمُ) بۆی گونجابێ خۆی فێرە خوێندنەوەی ڕاست بکاو کەمتەرخەمی کردبێو خۆی فێر نەکردبێ، کەوابو: تاوانباریش دەبێو واجبە: بە پەلە خۆی فێر بکا، هەم واجبە گشت ئەو نوێژانەش قەزا بکاتەوە: کە لەکاتی کەمتەرخەمیدا کردونی، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

جا کە نوێژەکەیخۆی دروست نەبێ، دروستیش نیە: ئیقتیدای پێوە بکرێ، واتە: نوێژی مەئمووکانیش بەتاڵ دەبێ، هەورەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**فَإِنْ عَجزَ لسانُهُ أَوْ لَمْ يَمْضِ زَمَنُ إِمْكَانِ تَعَلُّمه: فَإِنْ كَانَ فِي الْفاتحة فَكَأُمّيٍّ وَإِلاَّ فَتَصِحُّ صَلاَتُهُ وَالْقُدْوَةُ بِهِ، وَلاَ تَصِحُّ قُدْوَةُ رَجُلٍ وَلاَ خُنْثَى بِامْرأةٍ وَلاَ خُنْثَى، وَتَصِحُّ لِلْمُتوضِّئِ بِالْمُتَيَمِّمِ**

---

(فَإِنْ) بەڵام ئەگەر هەڵەكە بە كەمتەرغەمی نەبو، بەڵكو (عَجزَ لِسانُهُ) زوبانەكەی توانای فێربونی نەبو (أَوْ لَمْ يَمْضِ زَمَنُ إِمْكَانِ تَعَلُّمِهِ) یان ماوەیەكی وەها نەبو خۆی فێر بكا: وەك تازە موسوڵمان بوبێ، یان منداڵەكە تازە فامیدە بوبێ–واتە: لێرەدا جیاوزای منداڵو باڵغ نیە_ ئەوە دوو حاڵەتی هەنە:

یەكەم: (فَإِنْ كان فِي الْفاتِحَةِ) ئەگەر ئەو هەڵەیە لە فاتیحەدا بوو (فَكَأُمِّيٍّ) ئەمە وەكو ئوممی وایە، واتە: نوێژەكەیخۆی دروستە، بەڵام دروست نیە یەكێكی فاتیحە ڕەوان ئیقتیدای پێوە بكا.

دووەم: (وَإِلاّ) بەڵام ئەگەر هەڵەكە لە فاتیحەدا نەبو، بەڵكو لە تەحیات، یان لە سوڕەتیدوایفاتیحە، یان لە زیكرەكانیتردا بوو، ئەو كاتە (فَتَصِحُّ صَلاتُهُ) نوێژەكەیخۆی دروستە، هەم (وَالْقُدْوَةُ بِهِ) ئیقتیدا پێوەكردنیشی دروستە.

ئینجا بزانە: ئەوە دەربارەی ئەو كەسە بوو: كە عوزری هەبێ، هەروەك گوتمان، كەوابو: ئەگەر عوزری نەبو و دەگونجا هەڵەكەی ڕاست بكاتەوەو بەقەسدی ڕاستی نەدەكردەوەو خۆیشی فێر نەدەكرد، ئەو كاتە نوێژەكەیخۆی بەتاڵەو نوێژی مەئمومەكەش بەتاڵە ئەگەر بزانێ بە كەمتەرغەمی هەڵە دەكا، واتە: لەو حاڵەتەیكەمتەرغەمیدا جیاوزای فاتیحەو سوڕەتو تەحیات نیە، هەورەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

**پێنجەم**: نابێ ئیمامەكە ناتەواوتر بێ لە مەئمومەكە، كەوابو: (وَلاتَصِحُّ قُدْوَةُ رَجُلٍ) دروست نیە نێرینە ئیقتیدا بكا هەر چەند منداڵیش بێ (وَلاخُنْثى) هەروەهاش دروست نیە، نەنێرنەمێ ئیقتیدا بكا هەرچەند منداڵیش بێ (بِامْرأةٍ وَلاخُنْثى) نە بە ئافرەتو نە بە نەنێرنەمێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلَّوْا أَمْرَهُمْ إِمْـرَأَةً﴾ رواه البخاري، بەختەوەر نابێ ئەو گەلەی كاریخۆیان بدەنە دەست ئافرەت.

ئینجا بزانە: دروستە مێینە ئیقتیدا بكا: هەم بە نێرینەو هەم بە نەنێرنەمێ، هەروەهاش دروستە: نەنێرنەمێ ئیقتیدا بە نێرینە بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَتَصِحُّ لِلْمُتَوَضِّئِ) دروستە بۆئەو كەسەی دەستنوێژی هەیە: ئیقتیدا بكا (بِالْمُتَيَمِّمِ) بە ئیمامێكی وەها: كە تەیەمموومی كردبێ، بەو مەرجەی دووبارەكردنەوەی نوێژی لە سەر نەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، چونكە لەو حاڵەتەدا تەواوە، واتە: بەڵام

وَبماسِحِ الْخُفِّ وَلِلْقائِمِ بِالْقَاعِدِ وَالْمُضْطَجِعِ، وَلِلْكَامِلِ بِالصَّبِيِّ وَالْعَبْدِ، وَالْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ سَوَاءٌ عَلَى النَّصِّ،

---

ئەگەر دووبارەکردنەوەی لە سەر بێ، ئیقتیدا پێوەکردنی دروست نیە، هەروەك لە سیفەتی سێیەمدا ڕوونمان کردەوە.

(وَبِماسِحِ الْخُفِّ) هەروەهاش دروستە: ئیقتیدا بەو ئیمامە بکا: کە مەسحی لە سەر خوف کردوە لە جیاتی شۆردنی پێیەکانی، چونکە تەواوەو دووبارەکردنەوەی لە سەر نیە، کەوابو: ئەگەر لە سەر گۆرەویەکی تەنك مەسحی کردبو، ئەو کاتە دروست نیە چونکە دەستنوێژی ناتەواوە، هەروەك لە باسی(مەسحی خوف)دا ڕوونمان کردەوە.

(وَلِلْقَائِمِ) دروستە بۆ ئەو کەسەی بە پێوەیە: ئیقتیدا بکا (بِالْقاعِدِ) بەو ئیمامەی بە دانیشتوویی نوێژ دەکا (وَالْمُضْطَجِعِ) هەروەها دروستە ئیقتیدا بەو کەسەش بکا: کە لە سەر تەنیشت نوێژ دەکا، چونکە ئەوانەش تەواون‌و دووبارەکردنەوەیان لە سەر نیە، کەوابو: ئیقتیدای دانیشتووش بە دانیشتوو و بە پاڵکەوتوو دروستە ﴿عَن عائشةرَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى بالنَّاسِ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ جالِساً إلى جَنْبِ أَبِيبَكرٍ، وَأَبوبَكرٍ وَالنَّاسُ قِياماً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشیی‌مردنی‌دا بە دانیشتوویی لە تەنیشت ئیمامی (أبوبکر) ئیمامەتی بۆ (صحابة)کان دەکردو ئەوانیش بە پێوە نوێژیان دەکرد.

ئینجا بزانە: بە بەڵگەی ئەو حەدیسە مەرجە: ئیمامەکە توانای نەبێ بە پێوە نوێژی واجب بکا، هەم دروست نیە: مەئموومەکانی بە توانا وەك ئیمام بە دانیشتوویی نوێژی واجب بکەن، جا هەرچەند ئیقتیدایەکەش دروستە، بەڵام لەو حاڵەتەدا وەها سوننەتە ئیمامەکە یەکێکی‌تر لە جێی‌خۆی دابنێ، تاکو ئیمامەتی بۆ خەڵك بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە زۆربەی ماوەی نەخۆشیەکەی‌دا ئیمامی(أبوبکر)ی لە جێی خۆی دانابو، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە، هەروەها لە نوێژی سوننەتدا ئەو مەرجە پێویست نیە، هەروەك لە ڕوکنی‌سێیەمی نوێژدا ڕوون کراوە.

(وَلِلْكامِلِ) دروستە: بۆ مرۆڤی تەواو، واتە: بالغو ئازاد ئیقتیدا بکا (بِالصَّبِيِّ) بە منداڵی فامیدەو (وَالْعَبْدِ) هەم بە کۆیلە ﴿عن عَمْرو بن سَلَمَةَ: أَنَّهُ كانَ يَؤُمُّ قَوْمَهُ عَلى عَهْدِ رسول اللهِ ﷺ وَهُوَ إِبْنُ سَبْعٍ أَوْ ثَمانٍ﴾ رواه البخاري، لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ (عمرو بن سلمة) ئیمامەتی بۆ گەلەکەی‌خۆی دەکرد، لەو کاتدا منداڵێکی حەفت، یان هەشت ساڵان بوو.

(وَالْأَعْمى) کوێرو (وَالْبَصِيرُ) چاوساغ بۆ ئیمامەتی نوێژ، هەردووکیان (سَواءٌ) یەکسانن (عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەقی فەرموودەی ئیمامی(شافیعی)، چونکە کوێر زیاتر بیری لە سەر نوێژەو چاوساغیش چاکتر خۆی لە پیسی دەپارێزێ ﴿عن أنس: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِسْتَخْلَفَ

وَالْأَصَحُّ صِحَّةُ قُدْوَةِالسَّلِيمِ بِالسَّلِسِ وَالطَّاهِرِ بِالْمُسْتَحَاضَةِ غَيْرِالْمُتَحَيِّرَةِ، وَلَوْ بَانَ إِمَامُهُ امْرَأَةً أَوْ كَافِراًمُعْلِناً -قِيلَ أَوْ مُخْفِياً- وَجَبَتِ الْإِعَادَةُ، لاَ جُنُباً وَذَا نَجَاسَةٍ خَفِيَّةٍ،

---

إِبْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ يَؤُمُّ النَّاسَ وَهُوَ أَعْمى﴾ حديث حسن رواه أبوداود وأحمد، پێغەمبەرﷺ (عبدالله بن أم مكتوم)ی لە (مەدینە) لە شوێن خۆی دانا: تاكو ئیمامەتی بۆ خەڵكی بكا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (صِحَّةُ قُدْوَةِ السَّلِيمِ) دروستە: مرۆڤی ساغ ئیقتیدا بكا (بِالسَّلِس) بەو ئیمامەی چۆڕمیزكەی هەیەو (وَالطَّاهِر) هەم دروستە: ئافرەتیپاك ئیقتیدا بكا (بِالمُسْتَحَاضَةِ) بەو ئافرەتەی خوێنچركەی نەخۆشی هەیە، بەو مەرجەی (غَيْرِالمُتَحَيِّرَةِ) ئافرەتەكە سەر لێشێواوی خوێنچركە نەبێ، چونكە ئەگەر سەر لێشێواو بێ، ئیقتیدا پێوەكردنی دروست نیە، هەورەها دروستە ئیقتیدا بەو كەسەش بكا: كە تارەتی بە بەرد كردوە، یان خوێن لە برینەكەی دێ، یان پیسیەكیلێبوردراوی پێوەیە، چونكە دووبارەكردنەوەیان لە سەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ بانَ) ئەگەر لە دوای تەواوبوونینوێژ، مەئمومینێر بۆی ئاشكرا بوو (إِمامُهُ إِمْرَأَةً) ئیمامەكەی ئافرەت بووە، یان نەنێرنەمێ بووە (أَوْ كافراً مُعْلِناً) یان ئیمامەكەی كافرێكی بە ئاشكرا بووە (قِيلَ) لە فەرموودەیەكدا (أَوْ مُخْفِياً) یان ئیمامەكەی كافرێكی بە نهێنی بووە (وَجبَتِ الأعادَةُ) لە هەر سێك حاڵەتدا واجبە: نوێژەكەی دووبارە بكاتەوە، چونكە هەر لە سەرەتاوە ئیقتیدا بەو سێیانەوە دروست نیە، كەوابو: ئەگەر لە ناو نوێژیشدا یەكێك لەو سێ حاڵەتانە ئاشكرا ببێ، واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە نوێژەكە بكاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەروەها ئەگەر ئاشكرا بوو: ئیمامەكەی شێتە، واجبە: نوێژەكەی دووبارە بكاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(لاجُنُباً) نەك ئەگەر لە دوای تەواوبوونی نوێژ ئاشكرا بوو: ئیمامەكەی جەنابەتدارە، یان بێدەستنوێژە (وَذا نَجاسَةٍ خَفِيَّةٍ) یان پیسیەكی لێنەبوردراوی شاردراوەی پێوەیە: كە بە بیرلێكردنەوەش پیسیەكە نەدیترێ، واتە: ئەگەر یەكێك لەو سێ حاڵەتانە لە دوای تەواوبوونی نوێژ ئاشكرا بوو، دووبارەكردنەوە واجب نیە.

ئینجا بزانە: هەر لە سەرەتاوە دروست نیە ئیقتیدا بەو كەسە بكا: كە بێدەستنوێژە، یان جەنابەتدارە، یان پیسیەكی لێنەبوردراوی شاردراوەی پێوەیە، واتە: ئەگەر دەیزانیو ئیقتیداشی بە یەكێكیان كرد، گوناهبار دەبێو نوێژەكەشی دروست نیە، بەڵام ئەگەر لە سەرەتاوە نەیدەزانی، بەڵكو لە ناو نوێژدا ئاشكرا بوو: كە بێدەستنوێژە، یان جەنابەتدارە، یان پیسیەكی لێنەبوردراوی شاردراوەی پێوەیە، ئەو كاتە واجبە: یەكسەر نیەتی جیابوونەوە بێنێو بە تەنهایی نوێژەكەی تەواو بكا، ئەگینا: نوێژەكەی بەتاڵ

قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنصُوصُ هُوَ قَوْلُ الْجُمْهُور: إنَّ مُخفِيَ الْكُفْرِ هُنا كَمُعْلنه وَاللهُ أَعْلَـمُ. وَالأُمِّيُّ كَالْمَرْأَة فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ اقْتدَىَ بخُنْثَى فَبَانَ رَجُلاً لَمْ يَسْقُط الْقَضَاءُ فِي الأَظْهَرِ، وَالْعَدْلُ أَوْلَى مِنَ الْفَاسِقِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ الأَفْقَهَ أَوْلَى مِنَ الأَقْرَإ وَالأَوْرَعِ،

---

دەبـێ، بـەڵام ئەگـەر ئیمامەکـە پیسـیەکی لێنـەبوردراوی ئاشـکرای پێـوەبێ: کـە بـە بیرلێکردنەوە پیسیەکە بدیترێ، ئەو کاتە دووبارەکردنەوەیئوێژ واجبە، جیاوزای نیە: لـە نـاو نوێـژدا ئـەو پیسـیە ئاشـکرا ببـێ، یـان لـە دوای تەواوبوونینوێـژ، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) دەققی فەرموودەی ڕاستتر (هُوَ قَوْلُ الْجُمْهُورِ) فەرموودەی زۆرترینی زانایانە: (أَنَّ مُخْفِيَ الْكُفْرِ) ئـەو کەسـەی کوفرەکـەی نهێنییە (هُنا) لە باسیجەماعەتدا (كَمُعْلِنِهِ) وەك ئەو کەسەیە کە بـە ئاشکرا کـافر بـێ، واتە: هەرکەسێك لە نوێژدا ئیقتیدای پێوە کردبێ، واجبە: نوێژەکـەی دووبـارە بکاتـەوە، جیاوزای نیە: لە دوای نوێژ، یان هەر لە ناو نوێژدا بزانێ کافرە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَالأُمِّيُّ) ئیمامی فاتیحە ناڕەوان (كَالْمَرْأَةِ) وەکو ئیمامی ئافرەت بڕیاری بۆ دەدرێ (فِـي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئەگەر فاتیحە ڕەوان لـە نـاو نوێـژدا بـۆی ئاشـکرا ببێ: ئیمامەکەی فاتیحەی ناڕەوانە، واجبە: لە سەرەتاوە دەست بـە نوێژەکـە بکاتـەوەو ئەگەر لە دوای نوێژ ئاشکرا ببێ، واجبە: نوێژەکە دووبارە بکاتەوە.

(وَ لَوْ إِقْتَدى بِخُنْثَى) ئەگەر مەئموومینێر ئیقتیدای کـرد بـە ئیمـامێکی نەنێرنـەمێ (فَبـانَ رَجُـلاً) جـا لـەدوای ئیقتیـدا ئاشـکرا بـوو: ئـەم ئیمامـە نێـر بـووە (لَـمْ يَسْقُطِ الْقَضـاءُ) دووبارەکردنەوەی لە سەر لاناچـێ (فِـى الأَظْهَـرِ) لـە فـەرموودەی بـەهێزتردا، چـونکە لـە سەرەتاوە بە باوەڕیخۆی ئیقتیدایەکەی دروست نەبوە.

(وَالْعَدْلُ) مرۆڤی دادپەروەر (أَوْلَى) لەپێشترە بۆ ئیمامەتینوێـژ هەرچـەند کـەم زانسـتیش بێ (مِـنَ الْفاسِقِ) لـە مرۆڤـی فاسق، یـان بیدعەچـی، هەرچـەند زۆریـش زانـابێ، چـونکە نوێژکردن لە پشت ئیمامی فاسق، یان بیدعەچی ناپەسـندە، بـەڵام نوێژەکـەش دروسـتە ﴿عَنْ عبدالكريم: أَدْرَكْتُ عَشْرَةَ مِنْ أَصْحابِ مُحَمَّدٍ ﷺ يُصَلُّونَ خَلْـفَ أئِمَّـةِالْجُورِ﴾ رواه البخاري فيالتأريخ، گەیشتمە دە (صحابة)ی پێغەمبـەر ﷺ نوێـژیان لـە پشـت پێشـەوایانی ستەمکار دەکرد.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ الأَفْقَهَ) ئـەو کەسـەی شـەرعزانترە لـە نوێـژدا (أَوْلَى) لەپێشترە بۆ ئیمامەتی (مِنَ الأَقْرَإِ) لەو کەسەی زۆر قوڕئـان دەزانـێو شـەرعزانتریش نیە (وَالأَوْرَعِ) هـەروەها شـەرعزان لەپێشتریشـە لـەو کەسـەی خـۆی لـە حـەرامو (شُبُهات)

وَيُقَدَّمُ الأَفْقَهُ وَالأَقْرَأُ عَلَى الأَسَنِّ النَّسِيبِ، وَالْجَدِيدُ تَقْدِيمُ الأَسَنِّ عَلَى النَّسِيبِ، فَإِنْ اسْتَوَيَا فَبِنَظَافَةِ الثَّوْبِ وَالْبَدَنِ وَحُسْنِ الصَّوْتِ، وَطِيبِ الصَّنْعَةِ وَنَحْوِهَا، وَمُسْتَحِقُّ الْمَنْفَعَةِ بِمِلْكٍ أَوْ نَحْوِهِ أَوْلَى فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلاً فَلَهُ التَّقْدِيمُ، وَيُقَدَّمُ عَلَى عَبْدِهِ السَّاكِنِ

---

دەپارێزێ، چونکە نوێژ پێویستی زیاتر بە شەرع هەیە، بەڵگە: ﴿پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشی‌مردنی‌دا ئیمامی(ابوبکر)ی لە جێ‌ی‌خۆی دانا بۆ پێشنوێژی کردن، لەگەڵ ئەوەشدا (صحابة)ی لەوی قورئان خوێنتر هەبون: وەك (ابيّ و معاذ و زيد و ابوزيد رضی‌الله عنهم﴾، هەروەك لە (بخاري)دا هاتوە.

(وَيُقَدَّمُ الأَفْقَهُ وَالأَقْرَأُ) هەر یەکێك لە مرۆڤی شەرعزانترو لە مرۆڤی قورئانخوێنتر بە پێش دێخرێ: بۆ ئیمامەتی‌نوێژ (عَلَى الأَسَنِّ النَّسِيبِ) لە سەر مرۆڤی بە تەمەنتری خاوەن نەژاد (وَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی‌نوێ (تَقْدِيمُ الأَسَنِّ) مرۆڤی بە تەمەنتر لە ئیسلامدا بە پێش دێخرێ بۆ ئیمامەتی‌نوێژ (عَلَى النَّسِيبِ) لە سەر مرۆڤی بە نەژاد (فَإِنْ إِسْتَوَيَا) جا ئەگەر ئیمام و مەئموم لە گشت سیفەتەکانی‌ڕابردوودا یەکسان بون (فَبِنَظَافَةِ الثَّوْبِ وَالْبَدَنِ) بە هۆی جوانی‌و پوختی جل‌و بەرگ‌و لاشە لە چڵکنی، بە پێش دێخرێ (وَحُسْنِ الصَّوْتِ) ئینجا بە دەنگ خۆشی (وَطِيبِ الصَّنْعَةِ) هەروەها بە هۆی ڕێزداری کارو پیشە: وەك بازرگانی‌و فەلاحەتی (وَنَحْوِهَا) هەم ئەو جۆرە سیفەتانەی ڕێزدارییان تێدایە: وەك شێوە جوانی‌و پاسکردنی بە چاکەو خاوەن ژنی، هەروەك لە (بجيرمی)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەو ڕیزەی‌ڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە ئیمامی دامەزراو نەبێ، چونکە ئیمامی دامەزراو بە پێش گشت ئەوانەی‌ڕابردوو دێخرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە بە بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو.

(وَمُسْتَحِقُّ الْمَنْفَعَةِ) ئەو کەسەی مافی سود وەرگرتنی لە شوێنێکدا هەیە (بِمِلْكٍ) بە هۆی ئەوەی خۆی خاوەنی‌شوێنەکەیە: وەك خاوەن ماڵ‌و زەوی (أَوْ نَحْوِهِ) یان بە هۆیەکی‌تر: وەك بەکرێ‌گرتن‌و وەقفکران‌و ئیزندان (أَوْلَى) ئەو خاوەن مافە لەپێشترە بۆ ئیمامەتی نوێژ: لە شەرعزان‌و گشت ئەوانەی تریش، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ وَلاَيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ علی تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾ رواه مسلم، نابێ پیاو ئیمامەتی بۆ پیاو بکا لە شوێنی دەسەڵاتی‌خۆی‌داو، کە چووە ماڵێك نابێ لە سەر جێگەی تایبەتی خاوەن ماڵ دابنیشێ تەنها بە ئیزنی خاوەنەکەی نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەوە لە حاڵەتێکدا بوو: کە شیاوی ئیمامەتی‌کردن بێ، کەوابو: (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلاً) ئەگەر خاوەن مافەکە بە خۆی شیاوی ئیمامەتی نەبو (فَلَهُ التَّقْدِيمُ) هەر ئەو مافی هەیە: یەکێك بە پێش بێخێ تاکو ئیمامەتی بکا (وَيُقَدَّمُ عَلَى عَبْدِهِ السَّاكِنِ)

لاَ مُـكاَتَبِه فِـي مِـلْكِه، وَالْأَصَـحُّ تَقدِيمُ الْمُـكْتَرِي عَـلى الْمُـكْرِي، وَالْمُـعِيرِ عَـلَى الْـمُسْـتَعِيرِ، وَالْـوَالِي فِي مَـحَـلِّ وِلاَيَته أَوْلَى مِنَ الْأَفْـقَـهِ وَالْـمَالِك.

(فَصْلٌ) لاَ يَتَقَدَّمُ عَلَى إِمَامه فِي الْمَوْقِف فَإِنْ تَقدَّمَ بَطَلَتْ فِي الْجَدِيد، وَلاَ تَضُرُّ مُسَاوَاتُهُ، وَيُنْدَبُ تَخَلُّفُهُ قَلِيلاً،

---

گەورە بە پێش کۆیلەی‌خۆی دێخرێ: کە لە ملکی گەورەکەی‌دا نیشتەجێیە (لاَمُكَاتَبِـهِ فِيمِلْكِـهِ) بـەلام بـە پـێش کۆیلـە نووسـراوپێدراوەکەی ناکـەوێ: کـە لـە ملکی‌خـۆی‌دا نیشتەجێیە.

(وَالأَصَحّ) فەرموودەی ڕاستتر (تَقْدِيمُ الْمُكْتَرِي) بەکرێگر بە پێش دێخرێ بۆ ئیمامەتی‌نوێژ (عَلىالْمُكْرِي) لە سەر خاوەنە بەکرێدەرەکە، چونکە بەکرێگرەکـە مـافی سـود وەرگرتنـی هەیە (وَالْمُعِيرِ) هەروەها ئەوەی شوێنێکی بە خوازتن داوەتە یەکێکی‌تر بە پێش دێخرێ (عَلىالْمُسْتَعِيرِ) لە سەر ئەو کەسەی بە خوازتن وەری‌گرتوە.

(وَالْـوَالِي) گـەورەی موسـڵمانان (فِـي مَحَـلِّ وِلاَيَتِـهِ) لـە شـوێنی دەسـەلاتی‌خۆی‌دا (أَوْلَى) لەپێشترە بۆ ئیمامەتی‌نوێژ (مِنَ الْأَفْقَهِ) هـەم لـە شـەرعزانترو (وَالمالِـكِ) هـەم لـە خـاوەن ملـك‌و خـاوەن مـاڵ‌و هـەم لـە ئیمامی‌مزگـەوتیش، هـەر چـەند ئـەو گەورەیـەش فاسـق‌و ستەمکاریش بـێ ﴿عَنْ ابْن عمررضیالله عنـهما: أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي خَلْفَ الْحَجّاجِ﴾ رواه البخـاري، (عبدالله) کوڕی ئیمامی(عمر)رَضِيَاللهُ عَنهُمَـا نوێـژی بـە جەماعـەت لـە پشـت (حجـاج الثقفـي) دەکرد. واتە: هەر چەند زۆریش ستەمکارو فاسق بوو.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند مەرجێکی ئیقتیدا ﴾

مەرجەکانی ئیقتدا حەفتن، یەکەم: (لاَ يَتَقَدَّمُ) دروست نیە: مەئموم پـێش بکـەوێ (عَلـى إِمَامِهِ) لە ئیمامەکەی خۆی (فِيالْمَوْقِفِ) لەو شوێنەدا: کە جەماعـەتی لێ‌دەکـەن، چـونکە ئەوانەی نوێژیان بە جەماعەت لـە پشـت پێغەمبـەر ﷺ هەرچـوار خەلیفـەکان رضی الله عنهم کردوە، هیچیان لە ئەوان بە پێش نەکەوتون لە شوێنی جەماعەتدا.

کەوابو: (فَإِنْ تَقَدَّمَ) ئەگەر لە شوێنەکەدا مـەئموم بـە پـێش ئیمامەکـەی کـەوت (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(شافیعی)دا، جیـاوازی نیە پێش کەوتنەکە: لە سەرەتا، یان لە ناوەوەی نوێژدا بێ، هـەروەك لـە سەرچـاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَتَضُرُّ مُسَاوَاتُهُ) زیانی نیە: بە یەکسانی لەگەڵ ئیمامەکەی ڕابوەستێ، واتە: نوێژەکەی بـەتاڵ نـابێ، بـەلام ناپەسـندە، کـەوابو: (وَيُنْـدَبُ تَخَلُّفُـهُ قَلِـيلاً) سـوننەتە لـە شـوێنی جـەماعەتدا مەئموم کەمێك لە ئیمامەکەی دوا بکەوێ، واتە: سەرە پەنجەی پێیەکانی لە

وَالإعْتِبَارُ بِالْعَقِبِ، وَيَسْتَدِيرُونَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَوْلَ الْكَعْبَةِ، وَلاَ يَضُرُّ كَوْنُهُ أَقْرَبَ إِلَى الْكَعْبَةِ فِي غَيْرِ جِهَةِ الإِمَامِ فِي الأَصَحِّ، وَكَذَا لَوْ وَقَفَا فِي الْكَعْبَةِ وَاخْتَلَفَتْ جِهَتَاهُمَا، وَيَقِفُ الذَّكَرُ عَنْ يَمِينِهِ، فَإِنْ حَضَرَ آخَرُ أَحْرَمَ عَنْ يَسَارِهِ، ثُمَّ يَتَقَدَّمُ الإِمَامُ أَوْ يَتَأَخَّرَانِ وَهُوَ أَفْضَلُ،

---

دواوەی پاژنەپێی ئیمامەکەی بێو لە سێ گەزیش دوورتر نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالإعْتِبَارُ بِالْعَقِبِ) پێشکەوتن‌و یەکسانی‌و دواکەوتن: لە پێوەو لەڕکووعدا بەگوێرەی پاژنەی پێیەکانەو لە دانیشتندا بەگوێرەی لاقینگەکانەو لە سوجدەدا بەگوێرەی پەنجەی پێیەکانەو لە پاڵدانەوەشدا بەگوێرەی تەنیشتەکانە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَسْتَدِيرُونَ) لە نوێژی جەماعەتدا مەئموومەکان بازنەیی ڕیز دەبن (فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) لە (المَسْجِدِ الْحَرَام) لە (مكة)ی پیرۆزدا (حَوْلَ الْكَعْبَةِ) لە دەورەی(كعبة)ی ماڵی‌خوای‌گەورە: کە قیبلەیە (وَلاَيَضُرُّ) زیانی نیە (كَوْنُهُ أَقْرَبَ إِلَى الْكَعْبَةِ) مەئموومەکە بۆ لای(كعبة) نزیکتر بێ (فِي غَيْرِ جِهَةِ الإِمَامِ) لە لایەکانی‌تری جگە لە لای ئیمام (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، واتە: چونکە ئەو پێشکەوتنە لە لایەکەی ئیمام نیە، بە ناشیرن دانانرێ (وكَذَا) هەروەها زیانی نیە (لَوْ وَقَفَا فِي الْكَعْبَةِ) ئەگەر ئیمام‌و مەئموم لە ناو ژوورەکەی(كعبة)دا نوێژ بکەن‌و مەئموومەکەش بۆ لای‌دیواری(كعبة) نزیکتر بێ، بەم مەرجە: (وَاخْتَلَفَتْ جِهَتَاهُمَا) لای ڕووتێکردنیان جیا بێ: وەك پشت لە یەکتر بکەن، کەواتە: ئەگەر هەردووکیان بەرەو یەك دیوار نوێژ بکەن، ئەو کاتە دروست نیە مەئموم بە پێش ئیمام بکەوێ.

(وَيَقِفُ الذَّكَرُ عَنْ يَمِينِهِ) سوننەتە: نێرینە –هەرچەند منداڵیش بێ– لە لای ڕاستەی ئیمام ڕابوەستێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جابر)ی‌داهاتوو (فَإِنْ حَضَرَ آخَرُ) جا ئەگەر نێرینەیەکی‌تریش هات (أَحْرَمَ عَنْ يَسَارِهِ) ئەویش لە لای چەپەی ئیمامەکەی نوێژ دادەبەستێ (ثُمَّ) ئینجا لە دوای نوێژدابەستن (يَتَقَدَّمُ الإِمَامُ) ئیمامەکە دەڕواتە پێشەوە (أَوْ يَتَأَخَّرَانِ) یان هەردوو مەئموومەکان دەکشێنەوە دوا وە، ئینجا دەبنە یەك ڕیز.

(وَهُوَ أَفْضَلُ) کشانەوەی مەئموومەکان خێرترە لە ڕۆیشتنە پێشەوەی‌ئیمامەکە ﴿عَن جابر﵁ قام النَّبيﷺ لِيُصَلِّيَ فَقُمْتُ عَنْ يَساره فَأَخَذَ بِيَدي فَأَدارَني حَتَّى أَقامَني عَنْ يَمينِه، ثُمَّ جَاءَ جَبَّارُ بنِ صَخْرٍ فَقَامَ عَنْ يَسارِهِ، فَأَخَذَ بِأَيْدِينا جَمِيعاً فَدَفَعَنا حَتَّى أَقامَنا خَلْفَهُ﴾ رواه مسلم في‌الزهد، پێغەمبەرﷺ هەڵسا نوێژ بکا، منیش لە لای چەپەی ڕاوەستام تاکو جەماعەتی لەگەڵ بکەم، ئەویش دەستی گرتم و سوڕاندمیە لای‌ڕاستەی، ئینجا (جبّار)ش هات لە لای

وَلَوْ حَضَرَ رَجُلاَنِ أَوْ رَجُلٌ وَصَبِيٌّ صُفَّا خَلْفَهُ، وَكَذَا امْرَأَةٌ أَوْ نِسْوَةٌ، وَيَقِفُ خَلْفَهُ الرِّجَالُ ثُمَّ الصِّبْيَانُ

---

چەپەی نوێژی دابەست، پێغەمبەرﷺ دەستی هەردووکمانی گرت و لە پشتە خۆی کردینیە یەك ڕیز.

کەوابو: ئەگەر لە لای چەپەی ئیمام ڕابوەستیٚ، یان یەکێك لە چەپەو یەکێك لە ڕاستە، یان هەردووکیان لە ڕاستە، یان هەردووکیان لە چەپە ڕابوەستن، یان یەکێك لە تەنیشتێکی ئیمامو ئەوی‌تریش لە پشتەوە ڕابوەستیٚ، ئەو حاڵەتانە گشتی ناپەسندن، بەڵام نوێژ بەتاڵ ناکەن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر نەگونجا مەئمومەکەی‌دووەم لە لای چەپەی‌ئیمام نوێژ دابەستیٚ، ئەو کاتە لە پشتەوەی ئیمام نوێژ دادەبەستیٚو مەئمومەکەی لای‌ڕاستەش دەکشێتەوە دواوە، بەڵام ئەگەر مەئمومەکەی‌دووەم ئافرەت بوو: ئەوە یەکسەر لە پشت مەئمومەکەی لای ڕاستەوە نوێژ دادەبەستیٚ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ حَضَرَ رَجُلاَنِ) ئەگەر لە سەرەتاوە دوو پیاو بە یەکەوە ئامادەبون (أَوْ رَجُلٌ وَصَبِيٌّ) یان پیاوێك و منداڵێکی نێرینە (صُفَّا خَلْفَهُ) هەردووکیان لە پشت ئیمامەکە بە یەك ڕیز ڕادەوەستن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو، هەم ﴿عَن أنسٍ؄ صَلّى النّبيُّ ﷺ فَصَفَفْتُ أَنَا وَالْيَتِيمُ وَرَاءَهُ وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ پێشنوێژی بۆ کردین من و کوڕە یەتیمەکە بە یەك ڕیز لە پشت پێغەمبەرﷺ ڕاوەستاین‌و پیرەدایکیشم لە پشت ئێمە ڕاوەستا.

(وكذا امْرَأَةٌ) هەروەها ئەگەر تەنها یەك ئافرەتیش ئامادە بوو، ئەویش لە پشت ئیمامە نێرەکە ڕادەوەستیٚ (أَوْ نِسْوَةٌ) یان ئەگەر کۆمەڵێك ئافرەت ئامادە بون ئەوانیش لە پشت ئیمامە نێرەکە ڕادەوەستن، هەرچەند مەحرەمیش بن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (أنسٍ)ی ڕابردوو، کەوابو: ناپەسندە ئافرەت لە تەنیشت ئیمامی‌نێر، یان لە تەنیشت مەئمومە نێرەکان نوێژ دابەستیٚ، هەرچەند مەحرەمیش بن، بەڵام نوێژەکە بەتاڵ نابیٚ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَ) هەرکاتێك لە سەرەتاوە مەئمومەکان زۆر بون بەم شێوەیە ڕیز دەبن: (يَقِفُ خَلْفَهُ الرِّجَالُ) پیاوەکان لە پشت ئیمامەکە ڕادەوەستن (ثُمَّ) ئینجا ئەگەر ڕیزەکەی‌پیاوان تەواو بوو (الصِّبْيَانُ) لە پشت پیاوەکانیش منداڵە نێرینەکان ڕیز دەبن، بەڵام ئەگەر ڕیزی پیاوەکان تەواو نەبو، ئەو کاتە بە منداڵە نێرینەکان تەواو دەکریٚ، هەروەها ئەگەر ئەو منداڵانە پێش پیاوەکان ئامادە بون و جێگەی خۆیان لە ڕیزی‌پێشەوە گرت، نابیٚ لایانبدەنە ڕیزی‌دواوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ثُمَّ النِّساءُ، وَتَقِفُ إِمامَتُهُنَّ وَسْطَهُنَّ، وَيُكْرَهُ وُقُوفُ الْمأْمُومِ فَرْداً بَلْ يَدْخُلُ الصَّفَّ إنْ وَجَدَ سَعَةً، وَإلاَّ فَلْيَجُرَّ شَخصاً بَعْدَالإحْرَامِ

---

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای ڕیزی منداڵە نێرینەکانیش (النِّساءُ) ئافرەت ڕیز دەبن، پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ﴿لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلامِ وَالنُّهَى ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ﴾ رواه مسلم، با خاوەن عەقڵ‌و بالغەکان لە پشتەوەی من نوێژ دابەستن، ئینجا ئەوانەی لەوان نزیکن لەو سیفەتەدا.

ئینجا بزانە: جیاوازی نیە ڕیزی نێرینەکان تەواو بوبێ، یان نا، ئافرەتەکان هەر لە پشت ئەوان ڕیز دەبن، بەڵکو ئەگەر تەنها یەك نێرینەش ئامادە بێ، ئەوە نێرینەکە لە ڕاستەی ئیمامەکە ڕادەوەستێ‌و ئافرەتەکانیش لە پشت مەئموومەکە ڕادەوەستن، هەر چەند مەحرەمیش بن ﴿عن أنسﷺ أنَّ النَّبِيَّﷺ أَمَّهُ وَامْرَأَةً مِنهُمْ، فَجَعَلَهُ عَنْ يَمِينِهِ والْمَرْأَةَ خَلْفَ ذَلِكَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ پێشنوێژی بۆ منو ئافرەتێکی‌خۆمانی کرد، منی خستە لای ڕاستەی‌خۆی‌و ئافرەتەکەشی خستە دواوە.

(وَتَقِفُ إِماَمَتُهُنَّ وَسْطَهُنَّ) سوننەتە: ئیمامە مێیەکەی ئافرەتان لە نێوانیاندا ڕابوەستێ ﴿عَن عائِشَةَ وأُمِّ سلمةرَضِيَ اللهُ عَنهُما: أنَّهُما أمَّتا نِساءً فَقامَتا وَسْطَهُنَّ﴾ رواهماالشافعي والبيهقي باسنادين حسنين، حەزرەتی (عائشةو أم سلمة) ئیمامەتییان بۆ ئافرەتان دەکردو لە نێوانیاندا ڕادەوەستان. بەڵام ئەگەر ئیمامەکەی ئافرەتان نێر بوو، یان نەنێرنەمێ بوو، ئەوە لە پێشەوە ڕادەوەستێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر کۆمەڵێکی ڕووت نوێژیان بە جەماعەت دەکردو ئیمامەکەشیان ڕووت بوو و چاوساغیان لەگەڵدا بوو و لە ڕۆناکیشدا نوێژیان دەکرد، ئیمامەکەی ئەوانیش-وەکو ئیمامەکەی ئافرەتان- لە نێوانیاندا ڕادەوەستێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُكْرَهُ وُقُوفُ الْمَأْمُومِ فَرْداً) ناپەسندە مەئمووم بە تەنها ڕابوەستێ ﴿عن أبي بَكْرَةَﷺ: أَنَّهُ دَخَلَ الْمَسْجِدَ والنَّبِيُّﷺ راكِعٌ فَرَكَعَ دُونَ الصَّفِّ فَقالَ النَّبِيُّﷺ: زادَكَ اللهُ حِرْصاً وَلا تَعُدْ﴾ رواه البخاري، (أبوبكرة) چووە مزگەوت‌و نوێژی دابەست، جا پێش بگاتە ڕیزی‌نوێژ ڕوکووعی برد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خوا زیاتر دڵت بخاتە سەر جەماعەت کردن، جارێکی‌تریش وا مەکە، واتە: لە دەرەوەی‌ڕیز نوێژ مەکە.

(بَلْ يَدْخُلُ الصَّفَّ) بەڵکو مەئمووم دەچێتە ناو ڕیزەکە (إِنْ وَجَدَ سَعَةً) ئەگەر کەلێنێکی دەست کەوت‌و خەڵکیشی ئازار نەدەدا (وَإِلَّا) بەڵام ئەگەر هیچ کەلێنێکی دەست نەکەوت (فَلْيَجُرَّ شَخْصاً) سوننەتە: یەکێك لە ڕیزەکە ڕابکێشێتە دەرەوە (بَعْدَالأِحْرامِ) پاش دابەستنی‌نوێژ، تاکو لە گەڵی ڕیز ببێ، واتە: پێش دابەستنی‌نوێژ حەرامە ڕایبکێشێتە دەرەوە

## وَلْيُساعِدْهُ الْمَجْرُورُ،

(وَلْيُسَاعِدْهُ الْمَجْرُورُ) سوننەتە مرۆڤە ڕاكێشراوەكەش یارمەتی بداو لەگەڵی ڕیز ببیٚ، تاكو خێری یارمەتیدانی لە سەر چاكەی دەست بكەوێ، كەواتە: ئەگەر مرۆڤەكە لەوانە نەبو یارمەتیی بدا، ئەو كاتە دروست نیە ڕایبكێشێتە دەرەوە؟ چونكە مەترسی ئاژاوەی لێدەكرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: سوننەتە نێوان ئیمامو ڕیزییەكەمی مەئموومەكانو هەروەها نێوان ڕیزی یەكەمو دووەمو...هتد، لە سێ گەز –واتە: مترو نیوێك– زیاتر نەبێو سوننەتە ڕیزەكان ڕاستو ڕێك بكرێن، ئینجا تا ڕیزێك تەواو دەبێ، ناپەسندە هیچ ڕیزێكیتر دابمەزرێندرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَما كانَ مِنْ نَقْصٍ فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ﴾ رواه أبوداود بإسناد حسن، ڕیزیپێشەوە تەواو بكەن ئینجا ڕیزی دوای وی، جا هەر ناتەواویەك هەبێ، با لە ڕیزیدواوە بێ.

هەروەها سوننەتە مەئموومەكان پاڵ بە یەكتری بدەنو كەلێن لە نێوانیاندا نەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَقِيمُوا الصُّفُوفَ وَحاذُوا بَيْنَ الْمَناكِبِ وَسُدُّوا الْخَلَلَ وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوانِكُمْ وَلا تَذَرُوا فُرُجاتٍ لِلشَّيْطانِ، وَمَنْ وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفّاً قَطَعَهُ اللهُ﴾ رواه أبوداود بإسناد صالح، ڕیزەكانینوێژ ڕاستو ڕێك بكەنو شانتان بەرامبەر یەكتری بكەنو كەلێنەكان پڕ بكەنەوە، شانتان بۆ دەستی براكانتان نەرمو شل بكەن، واتە: لە تەنیشت خۆتان جێگەیان بكەنەوەو، هیچ كەلێنێك بۆ شەیتان مەهێڵنەوە–واتە: شەیتان دێتە نێوان كەلێنەكان– هەركەسێك ڕیزێكینوێژ بگەیەنێتەوە یەك خوا بیگەیەنێتە ڕەحمەتی خۆی، هەركەسێك ڕیزێكینوێژ لێك بپچڕێنێ خوا لە ڕەحمەتی خۆی بیپچڕێنێ.

جا ئەگەر مەئموومەكان ئەو سوننەتەیان بەجێ نەهێنا، سوننەتە ئیمام فەرمانیان پێبكا ﴿عَنْ أَنَسٍ‌ؓ: أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا النَّبِيُّﷺ بِوَجْهِهِ فَقالَ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَراصُّوا﴾ رواه الشيخان، ئیقامەتینوێژ كرا، ئینجا پێغەمبەرﷺ ڕووی لە ئێمە كردو فەرمووی: ڕیزەكانتان ڕێك بكەن و پاڵ بە یەكتری بدەن.

ئینجا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ تَعالى وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ﴾ رواه أبوداود بسند صالح، خوایگەورە ڕەحمەت دەبارێنێتەسەر ئەو كەسانەی ڕیزەكانی یەكەم تەواو دەكەن، مەلائیكەتیش دوعای لێخۆشبوونیان بۆ دەكەن.

كەوابو: گەورەترین ڕیزی پیاوان ڕیزی یەكەمە: كە لە پشت ئیمامەوە دەست پێ دەكا، ئینجا ڕیزەكەیتر...هتد، هەروەها لای ڕاستەی گشت ڕیزێك–هەرچەند دووریش بێ– لە لای چەپە گەورەترە، هەرچەند نزیكیش بێ، بەڵام پشت ئیمام–بە هۆینزیكی– لە لای ڕاستەش گەورەترە، هەر وەك لە (الشبراملسي)و(الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

**وَيُشْتَرَطُ عِلْمُهُ بِانْتِقَالَاتِ الْإِمَامِ: بِأَنْ يَرَاهُ أَوْ بَعْضَ صَفٍّ أَوْ يَسْمَعَهُ أَوْ مُبَلِّغاً، وَإِذَا جَمَعَهُمَا مَسْجِدٌ صَحَّ الإِقْتِدَاءُ وَإِنْ بَعُدَتِ الْمَسَافَةُ وَحَالَتْ أَبْنِيَةٌ،**

---

ئەوەش وا دەگەیەنیٚ: کە ڕیزی دووەمو سیٚیەمو...هتد، لە پشت ئیمامەوە دەست پیٚدەکریٚ، ئینجا بە ڕاستەو چەپەدا تەواو دەکریٚ، بەڵگەش حەدیسەکەی (أنس)و یەتیمەکەی ڕابردووە، والله تعالی أعلم.

**دووەم مەرجی ئیقتیدا:** (وَيُشْتَرَطُ عِلْمُهُ) بە مەرج داندراوە: مەئمووم ئاگادار بیٚ (بِإنْتِقَالاتِ الإمامِ) لە جموجۆڵو دانیشتنو هەڵسانەوەی ئیمام (بِأنْ يَراهُ) وەك بەخۆی ئیمامەکە ببینیٚ (أوْ بَعْضَ صَفٍّ) یان بەشە ڕیزێکی مەئموومەکان ببینیٚ (أو يَسْمَعَهُ) یان گویٚی لە ئیمامەکە بیٚ (أوْ مُبَلِّغاً) یان گویٚی لە ڕاگەیەنەرێك بیٚ: کە جموجۆڵی ئیمام دەگەیەنێتە مەئموومەکان، جیاوازی نیە: ئەو ڕاگەیەنەرە بەخۆی نویٚژ بکا، یان نا، جا ئەگەر لە کاتی نویٚژکردندا ڕاگەیەنەرەکە ڕۆیشت، واجبە: مەئموومەکان نیەتی جیابوونەوە بێنن، مەگەر بزانن لە پێش تەواوبوونی دوو ڕوکن دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە چاوەڕوانی دەکەن، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا ڕوون کراوەتەوە.

**سیٚیەم مەرجی ئیقتیدا:** مەرجە ئیمامو مەئموومو لە حاڵەتی ئیقتیدادا لە یەك شوێندا کۆ ببنەوە، جا ئەم کۆبوونەوەیەش چوار حاڵەتی هەنە:

**حاڵەتی یەکەم:** هەردووکیان لە ناو مزگەوتدابن (وَإذا جَمَعَهُما مَسْجِدٌ) هەر کاتێك مزگەوتێك ئیمامو مەئموومی لە ناو خۆیدا کۆ کردنەوە (صَحَّ الأقْتِداءُ) دروستە: مەئمووم ئیقتیدا بە ئیمامەکە بکا (وَإنْ بَعُدَتِ الْمَسافَةُ) هەرچەند نێوانەکەشیان زۆر لێك دوور بیٚ: وەك ئیمام لە پێشەوەی مزگەوتدابیٚو مەئموومیش لە پشتەوەدابیٚ (وَحالَتْ أبْنِيَةٌ) هەرچەند دیوارو بانو شتی تریش بکەوێتە نێوان ئیمامو مەئموومەکە، بەڵام بەو مەرجەی دەرگایەکی وەهای تیٚدابیٚ: بتوانیٚ تیٚیدا بڕواتە لای ئیمامەکە بەگوێرەی عادەت:

واتە: لەم حاڵەتەی ناو مزگەوتدا هەرچەند لە چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەشدا خوار ببێتەوەو پشتی بکەوێتە قیبلە زیانی نیە، هەر وەك لە (الشروانی)و (إعانة)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: پەنجەرە وەك دەرگا نیە، واتە: ئەگەر دەرگا نەبو، ئیقتیدا لە پشت پەنجەرەی مزگەوتەوە دروست نیە، هەر وەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

کەوابو: مەرجە لە ژێر زەمینو سەربانی مزگەوتەوە دەرگاو پەیژەیەکی وەها هەبن: بگونجیٚ لەویٚوە بڕواتە ناو مزگەوت بەگوێرەی عادەت، ئەگینا: ئیقتیدا دروست نیە، جا لەو حاڵەتانەی ڕابردوودا جیاوازی نیە: دەرگاکە دابخریٚو کلیل درابیٚ، یان کراوە بیٚ.

وَلَوْ كَانَا بِفَضاءِ شُرِطَ أَنْ لاَيَزِيدَ ما بَيْنَهُماَ عَلَى ثَلاثَماَّة ذراعٍ تَقْرِيباً وَقيلَ تَحْديداً، فَـإِنْ تَلاَحَقَ شَخْصَانِ أَوْ صَفّان أُعْتُبِرَت الْمَسافَةُ بَيْنَ اْلأَخِيرِ وَاْلأَوَّلِ، وَسَواءٌ اَلْفَضاءُ الْمَمْلُوكُ وَالْوَقْفُ وَالْمُبَعَّضُ وَلاَ يُضُرُّالشّارِعُ الْمَطْرُوقُ وَالنَّهَرُ الْمُحْوِجُ إِلى سِباحَة عَلَى الصَّحيحِ،

هـەروەها بزانـە: هـەیوانو حەوشـی مزگـەوت هـەر بـە مزگـەوت دادەنـدرێن لـە گشـت بڕیارەكانیڕابردوودا، هەرچەند پیسو بێڕێزیش بكرێن، هـەر وەك لـە سەرچـاوەكانداو لە حاشیەكانی(القلیوبی)و (البجیرمی)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

حاڵەتیدووەم: هەردووكیان لە دەشتاییدا بن (وَلَوْ كانا بِفَضاءِ) ئەگەر ئیمامو مەئمووم لە شوێنێكی بەرفراوانی بێپەردەدا بون: وەك هۆڵێكی گەورەو بەرین، یان شوێنێكی دەشتایی (شُرِطَ) بە مەرج داندراوە (أنْ لايَزِيدَ مابَينَهُما عَلى ثَلاثمأةِ ذراعٍ) نێوان ئیمامو مـەئمووم لـە سێسەد گەز زیاتر نەبێ، واتە: لە سـەدو پـەنجا مـتر (تَقْرِيبـاً) ئـەو ئەندازەیـە ئەندازەیـەكی نزیككەرەوەیـە، كەواتـە: ئەگـەر سـێ گـەزیش زیـاتر بـێ زیـانی نیـە (وَقِيـلَ تَحْدِيـداً) لـە فەرموودەیەكی بێهێزدا: ئەو ئەندازەیە سنووردانانەو نابێ زیاتر بێ.

(فإنْ تَلاَحَقَ شَخْصانِ) جا ئەگەر لە پشت ئیمامـەوە دوو كـەس بـە دوایەكدا ڕاوەسـتان (أَوْ صَفّانِ) یان دوو ڕیز بە دوای یەكدا بەسـتران (أُعْتُبِـرَتِ الْمَسـافَةُ) ئـەو سێسـەد گـەزە ڕەچاو دەكرێ (بَيْنَ الأَخيرِ وَ اْلأَوَّلِ) لە نێوان ڕیزیئاخیرو ڕیزییەكەم، واتە: لە ئیمامـەوە ناژمێردرێ، چونكە هەر ڕیزێك وەك ئیمام وایە بۆ ڕیزی پشتەوەی.

(وَسَوَاءٌ) یەكسانە لەو بڕیارەیڕابردوودا (اَلْفَضاءُ الْمَمْلُوكُ) ئەو شوێنەی ملكـی كەسـێك بـێو (وَالْوَقْـفُ) ئەوەی وەقفكراو بێو (وَالْمُبَعَّضُ) ئەوەی بەشێكی ملك بێو بەشێكی وەقـف بـێ، یان هیچیان نەبێ، بەڵكو دەشتێكی بێخاوەن بێ.

(وَلاَيَضُرُّ الشّارِعُ الْمَطْرُوقُ) زیانی نیە ڕێگەیەكی بە ڕێبوار بكەوێتە نێوان (وَالنَّهَرُ الْمُحْـوِجُ إِلى سِباحَةٍ) هەروەها زیانی نیە ڕووبارێكی وەها بكەوێتە نێوان: كە پێویستی بـە مەلـەوانی بـێ (عَلىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونكە ئەو دووانە بە پـەردە دانانـدرێنو ڕێگـەی هاتوچۆ ناگرن.

كەوابو: ئەگەر ئیمام لە دەریادا لە ناو كەشتیەكی سـەر واڵادا بـوو و مـەئموومیش لـە نـاو كەشـتیەكیتری سـەر واڵادا بـوو، یـان ئـەو لـە سـەر بانێـك بـوو و مـەئموومیش لـە سـەر بانێكیتر بوو، هەردوو بانەكەش پەیژەیان دەهاتەوە ئەو كۆڵانەی نێوانیانو بە بێ پشت لە قیبلەكردن مەئمووم دەگەیشتە لای ئیمام، ئەوە لەو دوو حاڵەتەشدا ئیقتیدا دروستـە، بـەو مەرجـەی نێوانیـان لـە سێسـەد گـەز زیاتر نـەبێ، هـەر وەك لـە (تحفـە)و (نهایـە)و حاشیەكانیاندا هەردوو مەسەلە ڕوون كراونەوە.

فَإِنْ كانا فِي بِنائَيْنِ كَصَحْنٍ وَصُفَّةٍ أَوْ بَيْتٍ فَطَرِيقانِ أَصَحُّهُما: إِنْ كَانَ بِناءُ الْمَأْمُومِ يَمِيناً أَوْ شِمالاً وَجَبَ اتِّصالُ صَفٍّ مِنْ أَحَدِ الْبِنائَيْنِ بِالآخَرِ، وَلاَ تَضُرُّ فُرْجَةٌ لاَ تَسَعُ وَاقِفاً فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ كَانَ خَلْفَ بِناءِ الإِمَامِ فَالصَّحِيحُ صِحَّةُ الْقُدْوَةِ بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَكُونَ بَيْنَ الصَّفَّيْنِ أَكْثَرُ مِنْ ثَلاَثَةِ أَذْرُعٍ، وَالطَّرِيقُ الثَّانِي: لاَ يُشْتَرَطُ إِلاَّ الْقُرْبُ كَالْفَضاءِ إِنْ لَمْ يَكُنْ حَائِلٌ

---

حاڵەتی سێیەم: لە ناو خانوواندا بن (فَإِنْ كانا فِي بِنائَيْنِ) ئەگەر ئیمام و مەئمووم لە ناو دوو خانوودا بون (كَصَحْنٍ) وەك یەكێكیان لە ناو حەوشی خانووەكەدا بێ (وَصُفَّةٍ) یەكێكش لە ناو كەپرێكی خانووەكەدا بێ (أَوْ بَيْتٍ) یان یەكێكیان لە ناو ژوورێكی خانووەكەدا بێ و ئەویتریش لە شوێنێكیتردا بێ، لەو حاڵەتەدا (فَطَرِيقانِ) دوو ڕێگەی مەزهەب لەم مەسەلەیەدا هەنە:

(أَصَحُّهُما) یەكەمیان كە ئیمامی(الرافعي) بە ڕاستتری داناوە، ئەمەیە: (إِنْ كانَ بِناءُ الْمَأْمُومِ) ئەگەر ئەو ژوورەی مەئمووم تێیدا ڕاوەستاوە (يَمِيناً أَوْ شِمالاً) لە ڕاستەی ئیمامەكە بوو، یان لە چەپەی بوو (وَجَبَ إِتِّصالُ صَفٍّ مِنْ أَحَدِ الْبِنائَيْنِ) واجبە: ڕیزێك لە یەكێك لەو ژوورانەوە بگاتەوە یەك (بِالآخَرِ) لەگەڵ ڕیزی خانووەكەیتر، واتە: مەئموومی ئەو خانووە پاڵ وە مەئموومی ئەم خانووە بدا، بەڵام (وَلاَتَضُرُّ فُرْجَةٌ) زیانی نیە كەلێنێكی كەم لە نێوانیاندا هەبێ: كە (لا تَسَعُ واقِفاً) جێگەی مرۆڤێكی ڕاوەستاوی تێدا نەبێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام (وَإِنْ كانَ خَلْفَ بِناءِ الأِمامِ) ئەگەر شوێنی مەئموومەكە لە پشت شوێنی ئیمام بوو (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (صِحَّةُ الْقُدْوَةِ) دروستە ئیقتیدا بە ئیمامەكە بكا (بِشَرْطِ أَنْ لا يَكُونَ بَيْنَ الصَّفَّيْنِ أَكْثَرُ مِنْ ثَلاَثَةِ أَذْرُعٍ) بەو مەرجەی نێوان هەردوو ڕیزەكە لە سێ گەز زیاتر نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەم ڕێگەیەیەكەم لای زۆربەیزانایان بێهێزە، كەوابو: ڕەفتار بە ڕێگەی دووەمیان دەكرێ، كە ئەمەیە: (وَالطَّرِيقُ الثّانِي) ڕێگەیدووەم كە ڕاستترەكەیانە: (لايُشْتَرَطُ الاّ الْقُرْبُ) بە مەرج داناندرێ تەنها نزیكی نەبێ، واتە: مەرجە نێوان ئیمام و مەئمووم، یان ڕیزەكان لە سێسەد گەز زیاتر نەبێ (كَالْفَضاءِ) وەكو شوێنی دەشتایی، واتە: بە یەكگەیشتنەوەی ڕیزەكان مەرج نیە، كەوابو: جیاوزای نیە: مەئموومەكە لە ڕاستە، یان لە چەپە، یان لە پشتەوەی ئیمام بێ، بەڵام بەم مەرجەش (إِنْ لَمْ يَكُنْ حائِلٌ) ئەگەر پەردە لە نێوان شوێنیئیمام و مەئموومدا نەبێ: وەك مەئمووكە ئیمام ببینێ، یان مەئموومەكانیتر ببینێ و بشگونجێ بە بێپشت لەقیبلەكردن بڕواتە لای ئیمام.

أَوْ حَالَ بَابٌ نَافِذٌ، فَإِنْ حَالَ مَا يَمْنَعُ الْمُرُورَ لاَالرُّؤْيَةَ فَوَجْهَانِ، أَوْ جِدَارٌ بَطَلَتْ بِاتِّفَاقِ الطَّرِيقَيْنِ، قُلْتُ: اَلطَّرِيقُ الثَّانِي أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِذَا صَحَّ اقْتِدَاؤُهُ فِي بِنَاءٍ أَخَرَ صَحَّ اقْتِدَاءُ مَنْ خَلْفَهُ وَإِنْ حَالَ جِدَارٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الإِمَامِ،

---

(أَوحالَ) یان شتێکی وەها بووە پەردە: کە (بابٌ نافِذٌ) دەرگایەکی وەهای تێدا کرابێتەوە: هاتوچۆی تێدا بکرێو لە بەرامبەر دەرگاکەش مرۆڤێك، یان ڕیزێك ڕاوەستا بێو ئیمامەکە، یان مەئمومێکی پشت ئیمامەکە ببینێو بشگونجێ بە بێ‌پشت لەقیبلەکردن بڕواتە لای مرۆڤەکە، یان ڕیزەکە، چونکە ئەو مرۆڤە، یان ئەو ڕیزە وەکو ئیمام وایە بۆ ڕیزەکانی ناو ژووەرەکانیتر، کەواتە: لێرەدا دروست نیە لە شوێنی‌نوێژدا ئەوانەی ناوژووەرەکانیتر لە پێش ئەو مرۆڤە، یان ئەو ڕیزە ڕابوەستن‌و دروست نیە: پێش ئەوان نوێژ دابەستن‌و نابێ نێوانیان لە سێسەد گەز زیاتر بێ.

ئیتر جیاوزای نیە دەرگاکە: لە ڕاستە، یان لە چەپە، یان لە پشتەوەی ئیمام بێ، جا ئەگەر لە ناو نوێژدا مرۆڤەکە، یان ڕیزەکە نەما، یان دەرگاکە پێوەدراوەو نەشگونجا بکرێتەوە، ئەو کاتە زیانی نیە، بەو مەرجەی پێوەدرانەکەش بە فەرمان‌و کرداری وی نەبێو لە جموجۆڵی ئیمام ئاگادار بێ، چونکە ئەگەر ئاگادار نەبێ، واجبە: بە دڵ نیەتی جیابوونەوە بێنێو بە تەنها نوێژەکەی تەواو بکا، ئەگینا: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(فَانْ حَالَ) جا ئەگەر کەوتە نێوانیان (ما يَمْنَعُ الْمُرُورَ) پەردەیەکی وەها: کە ڕێگەی هاتوچۆی دەگرت (لاالرُّؤْيَةَ) بەڵام ڕێگەی دیتنی نەدەگرت: وەکو پەنجەرە، یان ڕێگەی دیتنی دەگرت بەڵام ڕێگەی هاتوچۆی نەدەگرت: وەکو دەرگای پێوەدراو (فَوَجْهانِ) دوو فەرموودە هەنە، ڕاسترەکەیان ئەمەیە: ئیقتیدایەکە دروست نیەو نوێژەکە بەتاڵە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (أَوْ جِدارٌ) یان دیوارێکی‌بێ‌دەرگا لە نێوانیاندا بووە پەردە، یان دەرگایەکی کلیلدراو (بَطَلَتْ) دیسان ئیقتیدایەکە بەتاڵەو نوێژەکە دروست نیە (بِاتِّفاقِ الطَّرِيقَيْنِ) بە یەکدەنگی ڕێگەی‌یەکەم‌ودووەم (قُلْتُ) ئیمامی(النـواوي) دەفەرموێ (اَلطَّرِيقُ الثّاني) ڕێگەی‌دووەم (أَصَحّ) ڕاسترە لە ڕێگەی‌یەکەم (وَاللهُ أَعْلَم).

(وَاذا صَحَّ إِقْتِداؤُهُ) هەر کاتێك ئیقتیدای مەئموم بە ئیمامەوە دروست بێ (في بِناءِ آخَرَ) کە مەئمومەکە لە ژوورێکی‌تردا بێ جگە لە ژوورەکەی ئیمام (صَحَّ إِقْتِداءُ مَنْ خَلْفَهُ) ئیقتیدای مەئمومەکانی پشتەوەیی‌و ڕاستەو چەپەشی دروستە (وَإِنْ حالَ جِدارٌ) هەرچەند دیوارێکیش بێتە پەردە (بَيْنَهُ وَبَيْنَ الأمامِ) لە نێوان ئیمام‌و مەئمومەکانی پشتەوەو ڕاستەو چەپە، چونکە بۆ ئەوانە ڕیزی پێشەخۆیان وەکو ئیمام وایە، کەوابو:

وَلَوْ وَقَفَ فِى عُلُوٍّ وَإمامُهُ فِي سُفْلٍ أَوْ عَكْسُهُ شُرِطَ مُحاذَاةُ بَعْضِ بَدَنه بَعْضَ بَدَنه، وَلَوْ وَقَفَ فِى مَوَات وَإمامُهُ فِى مَسْجِد فَإِنْ لَمْ يَحُلْ شَيْءٌ فَالشَّرطُ اَلتَّقارُبُ مُعْتَبَـراً مِـن آخرِ الْمَسْجِد، وَقِيلَ مِنْ آخرِ صَفٍّ، وَإِنْ حالَ جِدارٌ أَوْ بابٌ مُغْلَقٌ مَنَعَ،

---

هەر مەئموومێك بكەوێتە پێش ئەم ڕیزە ئیقتیدای دروست نیەو نوێژی بەتاڵە، چونكە بەخۆی ناتوانێ بە بێ پشت لەقیبلەكردن –بە ڕۆیشتنێكیعادەتی– بڕواتە لای ڕیزی پشتەخۆیو بە هۆی پەردەش پەیوەندیخۆی لەگەڵ ئیمامەكەیدا پچڕاوە، هەروەك باسمان كردو لە سەرچاوەكانیشدا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ وَقَفَ فِى عُلُوٍّ) ئەگەر مەئمووم لە سەر خانووێكی بڵند بوو (وَ إِمامُهُ فِىسُفْلٍ) ئیمامەكەش لە خوارەوە بوو (أَوْ عَكْسُهُ) یان بە پێچەوانە: ئەو لە خوارەوە بوو و ئیمامەكەش لە سەرەوە بوو (شُرِطَ مُحاذاةُ بَعْضِ بَدَنِه) بە مەرج داندراوە –لە ڕێگەی یەكەمی بێهێزدا– بەشێكی لاشەی مەئموومەكە بەرامبەر (بَعْضَ بَدَنِه) بەشێكی لاشەی ئیمامەكە بێ: وەك سەری خوارەوە بەرامبەر قاچی سەرەوە بێ، بەڵام لە ڕێگە دووەمەكەی ڕاستتردا: ئەوە مەرج نیە، بەڵكو تەنها مەرجە نێوانیان لە سێسەد گەز زیاتر نەبێ، هەروەها ئەگەر ئیمامو مەئمووم هەردووكیان لە ناو مزگەوتدا بون، ئەم مەرجەش پێویست نیەو بە هەموو جۆرێك ئیقتیدا دروستە، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

ئینجا بزانە: كەشتیی والا –واتە: هەم ئوتومبێلی والا– وەك دەشتو بیابان وایە، خێمەو كەشتیی سەرپۆشكراو–واتە: ئوتومبێلی سەرپۆشكراویش– وەكو ژوور وایە، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون كراوەتەوە.

**حاڵەتیچوارەم:** یەكێكیان لە مزگەوتدا ئەویتریش لە دەرەوەدا بێ (وَ لَوْ وَقَفَ فِى مَواتٍ) ئەگەر مەئمووم لە دەرەوەی مزگەوت لە كۆڵانێك، یان لە دەشتێكی بێخاوەندا بوو (وَإِمامُهُ فِى مَسْجِدٍ) ئیمامەكەشی لە ناو مزگەوتدا بوو، یان بە پێچەوانەوە بوو، لە هەردوو حاڵەتیشدا مزگەوتو كۆڵانەكە، یان دەشتەكە پێكەوە بوون (فَانْ لَمْ يَحُلْ شَيْءٌ) ئەگەر هیچ پەردەیەك لە نێوانیاندا نەبو (فَالشَّرْطُ اَلتَّقارُبُ) مەرجە: لێك نزیك بن، واتە: نێوانیان لە سێسەد گەز زیاتر نەبێ (مُعْتَبَراً مِنْ آخرِ الْمَسْجِدِ) ئەو سێسەد گەزە لە كۆتایی مزگەوتەوە ڕەچاو دەكرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (مِنْ آخرِ صَفٍّ) لە دواترین ڕیزەكانی ناو مزگەوتەوە ڕەچاو دەكرێ.

(وَإِنْ حالَ جِدارٌ) بەڵام ئەگەر دیوارێكی بێدەرگا لە نێوانیاندا بووە پەردە (أَوْ بابٌ) یان دیوارەكە دەرگای تێدا بوو، بەڵام (مُغْلَقٌ) كلیلدراو بوو (مَنَعَ) لە هەردوو مەسەلەدا ئیقتیدای مەئمومەكانی پشتەوەیان قەدەغە دەكاو نوێژەكە بەتاڵە، چونكە ڕێگەی هاتوچۆ نیە، جیاوزای نیە: دیوارەكە هی مزگەوت بێ، یان نا.

وَكَذاالْبَابُ الْمَرْدُودُ وَالشُّبَّاكُ فِي الْأَصَحِّ، قُلْتُ: يُكْرَهُ إِرْتِفَاعُ الْمَأْمُومِ عَلَى إِمامِهِ وَعَكْسُهُ إِلاّ لحاجة فَيُسْتَحَبُّ، وَلاَ يَقُومُ حَتَّى يَفْرُغَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الْإِقَامَةِ،

(وكَذاالْبَابُ الْمَرْدُوْد) هەروەها ئەگەر دەرگاکە پێوەدراویش بێ، ئیقتیدای مەئمومەکانی پشتەوەی دروست نیە، چونکە ڕێگەی دیتن دەگرێ (وَالشُّبَّاكُ) هەروەها ئەگەر پەنجەرەش لە نێواندا هەبێ ئیقتیدای مەئموومەکانی پشتەوەی دروست نیە، چونکە ڕێگەی هاتوچۆ دەگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها ئەگەر دەرگاکە کراوەش بێ، بەڵام هیچ کەس لە بەرامبەری ڕانەوەستابێ، دیسان ئیقتیدای ڕیزەکانی پشتەوەی دروست نیە، چونکە پەیوەندی لە نێواندا نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
ئینجا بزانە: مەبەست بە هاتوچۆ لە هەرسێك حاڵەتەکانی جگە لە ناو مزگەوتدا ئەوەیە: بە بێ پشت لەقیبلەکردن بتوانێ بڕواتە لایئیمامەکەی، واتە: بەڵام ئەگەر ڕاستە، یان چەپەی دەکەوتە لایقیبلە زیانی نیە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.
(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفـەرموێ (يُكْرَهُ إِرْتِفَاعُ الْمَأْمُومِ عَلى إمامِهِ) ناپەسندە: شوێنی مەئموم لە شوێنی ئیمامەکەی بەرزتر بێ‌و (وَ عَكْسُهُ) پێچەوانەش ناپەسندە، واتە: شوێنی ئیمام لە شوێنی مەئموم بەرزتر بێ، هەر چەند لە مزگەوتیشدا بن ﴿عَنْ حذيفة ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى عَلى دُكَّانٍ وَالنَّاسُ أَسْفَلُ مِنْهُ فَجَذَبَهُ أَبُومَسْعُودٍ وَقَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ أَصْحَابَكَ يَكْرَهُونَ ذَلِكَ﴾ رواه الشافعي وأبوداود وغيرهما بإسنادصحيح، حەزرەتی (حذيفة) لە سەربانی دوکانێك ئیمامەتی کردو مەئموومەکانیش لە خوارەوە بون، ئینجا (أبومسعود) ڕایکێشا خوارەوەو فەرمووی: نەتزانیوە (صحابە)کان ئەم کارەیان بە ناپەسند داناوە؟.
(إِلاَّ لِحَاجَةٍ) تەنها لە بەر پێویستیِنوێژ نەبێ: وەك فێرکردنی مەئموومەکان (فَيُسْتَحَبُّ) ئەو کاتە سوننەتە، چونکە جارێك ﴿پێغەمبەر ﷺ لە سەر مینبەر نوێژی کرد تاکو (صحابە) لێی فێر ببن﴾ هەروەك لە (بخاریو مسلم)دا هاتوە، هەروەها ئەگەر لە شوێنەکەدا یەکسانی نەگونجێ ئەو کاتەش ناپەسند نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.
(وَلاَ يَقُومُ) سوننەتە: ئیمامو مەئموم -ئەگەر دانیشتوو بون- هەڵنەستنەوە پێوە (حَتَّى يَفْرُغَ الْمُؤَذِّنُ مِنَ الإِقَامَةِ) تا بانگدەر -یان یەکێکیتر- هەموو ئیقامەتەکە تەواو دەکا، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم فەرموودەیپێغەمبەر ﷺ هێناوە: ﴿إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي﴾ رواه الشيخان، هەرکاتێك دەست بە ئیقامەت کرا، ئێوە هەڵمەستنە پێوە تا من دەبینن. واتە: پێغەمبەر ﷺ لە دوای تەواوبوونی ئیقامەت دەهاتە نوێژکردن، هەروەك

وَلاَ يَبْتَدِئُ نَفلاً بَعْدَ شُرُوعِه فيهاَ، فَإنْ كَانَ فِيه أتَمَّهُ إنْ لَمْ يَخْشَ فَوْتَ الْجَمَاعَةِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

(فَصْلٌ) شَرْطُ الْقُدْوَةِ: أَنْ يَنْوِيَ الْمَأْمُومُ مَعَ التَّكْبِيرِ الإقْتِدَاءَ

---

له (تحفه)دا فەرموویەتی، بەلاّم ئەگەر لە کاتی دەست پێکردنی ئیقامەتدا ئیمام، یان مەئموم بە پێوە بوو، یان لەو کاتدا هاتە ناو مزگەوت، ئەوە با هەر بە پێوە ڕابوەستێ‌و دانەنیشێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلاَ يَبْتَدِئُ نَفلاً) نابێ هیچ کەسێك هیچ جۆرە سوننەتێك دەست پێ بکا (بَعْدَ شُرُوعِه فِيها) لە پاش دەست پێکردنی ئیقامەت، چونکە گشت جۆرە سوننەتێك لەپاش دەست پێکردنی ئیقامەت ناپەسندە، هەروەك لە باسی بانگ و ئیقامەتدا بەلگەمان بۆ هێناوە، بەلاّم (فَإنْ كَانَ فِيه) ئەگەر ئەو لە ناو سوننەتەکەدا بوو، واتە: دابیەستبو، ئینجا ئیقامەت کرا (أتَمَّهُ) سوننەتە: تەواوی بکا، ئینجا جەماعەت بکا (إنْ لَمْ يَخْشَ فَوْتَ الْجَمَاعَةِ) بەو مەرجەی نەترسێ گشت جەماعەتێکی لە دەست بچێ (وَاللهُ أعْلَم).

کەواتە: ئەگەر تا ئەو سوننەتەکەی تەواو دەکرد ئیمام سەلامی دەداوەو چاوەڕوانی هیچ جەماعەتێکیتریش نەدەکرا، ئەو کاتە سوننەتە: سوننەتەکە ببڕێ‌و جەماعەت دابیەستێ، چونکە جەماعەت خێری گەورەترە، بەلاّم ئەگەر دەیزانی دەگاتە ئەم جەماعەتە، یان دەیزانی جەماعەتێکیتریش لە دوای ئەم جەماعەتە دەکرێ، ئەو کاتە لە هەردوو حاڵەتدا سوننەتە: سوننەتەکەی تەواو بکا، تاکو دوو خێری دەست بکەون، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر نوێژە واجبەکەی ئەم کاتەی دابەستبو، ئینجا دەست بە ئیقامەت کرا، ئەوە ئەگەر دەستی بە ڕەکعەتی سێیەم کردبو، ئەو کاتە سوننەتە: نوێژە واجبەکە تەواو بکا، ئینجا بە جەماعەت دووبارەی بکاتەوە ئەگەر مەترسی لە دەستچوونی جەماعەتی نەبێ، بەلاّم ئەگەر دەستی بە ڕەکعەتی سێیەم نەکردبو، ئەو کاتە سوننەتە: نوێژە واجبەکە بگۆڕێ‌و بیکاتە سوننەتێکی دوو ڕەکعەتی بێ‌ناو و سەلام بداتەوە، ئینجا نوێژە واجبەکە بە جەماعەت بکا ئەگەر مەترسی لە دەستچوونی جەماعەتی نەبێ، واتە: ئەگەر دەترسا جەماعەتی لە دەست بچێ، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا سوننەتە: نوێژە واجبەکە ببڕێ‌و بە جەماعەت بیکا، بەلاّم ئەگەر نوێژەکە واجبی ئەم کاتە نەبو، بەلّکو نوێژێکی قەزاکراوە بوو، ئەو کاتە دروست نیە بیگۆڕێ‌و بیکاتە سوننەت، بەلّکو واجبە: تەواوی بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چەند مەرجێکیتری ئیقتیدا ﴾

(شَرْطُ الْقُدْوَةِ) چوارەم مەرجی‌ئیقتیدا لە سەرەتادا: (أنْ يَنْوِيَ الْمَأْمُومُ مَعَ التَّكْبِيرِ) ئەوەیە: مەئموم لە گەلّ (الله أكبر)ی نوێژدابەستندا نیەت بێنێ: (الإقْتِدَاءَ) کە ئیقتیدا

أَوِ الْجَمَاعَةَ، وَالْجُمُعَةُ كَغَيْرِهَا عَلَى الصَّحِيحِ، فَلَوْ تَرَكَ هَذِهِ النِّيَّةَ وَتَابَعَهُ فِي الْأَفْعَالِ بَطَلَتْ صَلاَتُهُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلاَ يَجِبُ تَعْيِينُ الْإِمَامِ فَإِنْ عَيَّنَهُ وَأَخْطَأَ بَطَلَتْ صَلاَتُهُ،

---

بەم ئیمامە دەکا (أوِالجَمَاعَةَ) یان ئەم نوێژە بە جەماعەت دەکا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإنَّما لِكُلِّ امْرِئٍ مَانَوَى﴾ رواه الشيخان، گشت مرۆڤێك تەنها خێری ئەو کردەوەی بۆ دەنووسرێ: کە نیەتی بۆ هێناوە.

کەوابو: ئەگەر لەگەڵ (أللهُ أكبَر)ی نوێژدابەستندا نیەتی ئیقتیدا، یان جەماعەتی نەهێنا، ئەوە نوێژەکەی بە تەنهایی دادەبەسترێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْجُمُعَةُ كَغَيْرِهَا) نوێژی جومعەش وەك نوێژەکانیترە: لە سەر مەئمووم واجبە: لەگەڵ (أللهُ أكبَر)ی نوێژدابەستندا نیەتی ئیقتیدا، یان جەماعەتی بۆ بهێنی (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئەگینا: جومعەکەی بەتاڵ دەبێ (فَلَوْ تَرَكَ هَذِهِ النِّيَّةَ) ئەگەر یەکێك نیەتی ئیقتیدا، یان جەماعەتی نەهێنا، یان کەوتە گومان: ئایا ئەو نیەتەی هێناوە، یان نا؟ (وَتَابَعَهُ فِيالأفْعالِ) شوێن ئیمامەکەش کەوت لە کردارەکانینوێژدا (بَطَلَتْ صَلاَتُهُ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەرچەند تەنها لە یەك کرداریشدا شوێنی بکەوێ (عَلَىالصَّحِيحِ) لەسەر فەرموودەی ڕاست، چونکە ئەوە گاڵتە کردنە.

ئینجا بزانە: مەبەست بەو شوێنکەوتنە ئەوەیە: لە ڕوکووع و سوجدەو کردارەکانیتری نوێژدا ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی ئیمامەکە بکا، تاکو لەگەڵ ئەودا کردارەکە بکا، واتە: ئەگەر وا ڕێك دەکەوت لەگەڵ ئیمامەکەدا کردارێکی تەواو دەکردو دەستی بە کردارێکیتر دەکرد، یان ماوەیەکیکەم چاوەڕوانی دەکرد، ئەوە بە شوێنکەوتن دانانرێ‌و نوێژەکە بەتاڵ نابێ، هەر وەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلا يَجِبُ تَعْيِينُ الإمامِ) لە سەر مەئمووم واجب نیە، بەڵکو سوننەتیش نیە: لە نیەتەکەیدا ئیمامەکە دیاری بکا، وەك ناوی بێنێ، یان ئامارەی بۆ بکا (فَإنْ عَيَّنَهُ) جا ئەگەر لە نیەتەکەیدا ناوی ئیمامەکەی هێناو (وَأخْطَأ) لە ناوهێنانەکەشدا هەڵەی کرد، واتە: ئیمامەکە یەکێکیتر بوو (بَطَلَتْ صَلاَتُهُ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، واتە: هەر دانامەزرێ، بەڵام ئەگەر لە نیەتەکەیدا ئامارەی بۆ ئیمامەکە کرد، ئەو کاتە نوێژەکەی دروستە، هەرچەندەش لە ناوەکەیدا هەڵەی کردبێ، هەر وەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە شوێنێکدا لە یەك کاتدا دوو جەماعەت دەکران، ئەو کاتە واجبە: لە نیەتەکەیدا ئیمامەکەی خۆی جیا بکاتەوەو شوێنی بکەوێ، هەر وەك لە (المجموع) و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

**وَلاَ يُشْتَرَطُ للأَمَامِ نِيَّةُ اَلإِمَامَةِ بَلْ تُسْتَحَبُّ، فَإِنْ أَخْطَأَ فِي تَعْيِينِ تَابِـعِهِ لَمْ يَضُرَّ، وَتَصِحُّ قُدْوَةُ الْمُؤَدِّي بِالْقَاضِي وَالْمُفْتَرِضِ بِالْمُتَنَفِّلِ، وَفِي الظُّهْرِ بِالْعَصْرِ،**

---

(وَلايُشْتَرَطُ لِلإِمَامِ) بۆ ئیمامی‌نوێژ –جگە لە جومعە– بە مەرج دانانددرێ (نِيَّةُالإِمَامَةِ) نیـەتی ئیمامەتی، یان جەماعەت بێنێ چونکە سەربەخۆیە (بَلْ تُسْتَحَبُّ) بەڵکو بۆی سوننەتە: نیـەتی ئیمامـەتی، یـان جەماعـەت بێنـێ تـاکو خێـری جەماعـەتی بگـاتێ، بـە بەڵگـەی حەدیسەکەی ڕابردوو.

کەوابو: ئەگەر ئیمام ئەو نیەتە نەهێنێ، نوێژەکەی خۆی‌و مەئموومەکان دروستە، بەڵام ئەو خێری جەماعەتی ناگاتێ‌و مەئموومەکانیش خێریان دەگاتێ، جا ئەگەر لە ناو نوێژدا نیـەتی ئیمامەتی هێنا، ئەویش لەو کاتدا خێری بۆ دەنووسرێ، هەر وەك لە زۆربەی سەرچـاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: ئەگـەر لـە کـاتی نوێژدابەستندا هـیچ مـەئموومێك نـەبو ئیقتیـدای پێبکـا، بـەڵام دەیزانی لەمەودوا یەکێك دێ‌و ئیقتیدای پێ‌دەکا، ئەوە دروستە: لـە کـاتی نوێژدابەستندا نیـەتی ئیمامـەتی بێنـێ، بـەڵام دەشـکوترێ: بـا نیەتەکـەی دوا بێخـێ تـا مەئموومەکـە ئیقتیدای پێ دەکا، ئینجا لەو کاتدا لە ناو نوێژدا بە دڵ نیەتی ئیمامەتی بێنێ، هـەر وەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

قازی (الحُسَيْن) دەفەرموێ: ئەگەر بـە تـەنهایی نوێـژی دەکرد، ئینجـا ئیقتیـدایان پێ‌کرد، ئەویش نەیزانی ئیقتیدای پێ‌کراوە، بۆیی لە ناو نوێژدا نیەتی ئیمامەتی‌ی نەهێنا، ئـەو کاتـە ئیمامەکەش خێری جەماعەتی بۆ دەنووسرێ، هەر وەك لە (المجموع)دا گێڕاویەتیەوە.

ئینجا بزانە: لە نوێژی جومعەدا واجبە: ئیمامەکەش نیـەتی ئیمامـەتی بێنـێ هەرچـەند لـە چل کەسیش زیاتر بێ، واتە: ئەگەر نیـەتی ئیمامـەتی نـەهێنێ جومعەکـەی‌خۆی دروست نیەو بەتاڵە، هەر وەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ أَخْطَأَ فِيتَعْيِينِ تابِعِهِ) جا ئەگەر ئیمام هەڵـەی کـرد لـە دیاری‌کردنی مەئموومەکـەی خۆی: وەك نیەت بێنێ ئیمامەتی بۆ (محمد) بکا، بـەڵام مەئموومەکـە (أحمـد) بـوو (لَمْ يَضُرَّ) ئەو هەڵەیـە زیـانی نیـەو نوێژەکـەش دروسـتە، چونکە ئەگـەر نیـەتی ئیمامـەتیش نەهێنێ نوێژەکەی دروستە، وَاللهُ أَعْلَم.

**پێنجەم مەرجی‌ئیقتیدا** ئەوەیە: نوێژکردنەکەی ئیمام‌و مـەئموم تێـك بکاتـەوە، کـەوابو: (وَتَصِحُّ قُدْوَةُ الْمُؤَدِّي) دروستە: ئەو کەسەی نوێژی ئەدا دەکا، ئیقتیدا بکا (بِالْقَاضِي) بەو کەسەی نوێژەکە قەزا دەکاتەوە (وَالْمُفْتَـرِضِ) هەروەهاشـەو کەسـەی نوێـژی واجب دەکـا دروسـتە: ئیقتیدا بکا (بِالْمُتَنَفِّلِ) بەو کەسـەی نوێژی سونەت دەکا (وَفِـي الـظُّهْرِ بِالـعَصْرِ)

وَبِالْعُكُوسِ، وَكَذَاالظُّهْرُ بِالصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ، وَهُوَ كَالْمَسْبُوقِ، وَلاَ تَضُرُّ مُتَابَعَةُ الإِمَامِ فِيالْقُنُوتِ وَالْجُلُوسِ الأَخِيرِ فِيالْمَغْرِبِ، وَلَهُ فِرَاقُهُ إِذَا اشْتَغَلَ بِهِمَا، وَيَجُوزُ الصُّبْحُ خَلْفَ الظُّهْرِ فِيالأَظْهَرِ، فَإِذَا قَامَ لِلثَّالِثَةِ فَإِنْ شَاءَ فَارَقَهُ وَسَلَّمَ وَإِنْ شَاءَ انْتَظَرَهُ لِيُسَلِّمَ مَعَهُ، قُلْتُ: انْتِظَارُهُ أَفْضَلُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

هەروەها ئەوەی نوێژی نیوەڕۆ دەکا دروستە: ئیقتیدا بەو کەسە بکا: کە نوێژی عەسر دەکا (وَبِالْعُكُوسِ) بە پێچەوانەی گشت ڕابردووەکانیش دروستە: وەك قەزا بە ئەدا، سوننەت بە فەرز، عەسر بە نیوەڕۆ.

(وكَذَاالظُّهْرُ) هەروەها ئەو کەسەی نوێژی نیوەڕۆ، یان نوێژێکیتری چوار ڕەکعەتی دەکا، دروستە: ئیقتیدا بکا (بِالصُّبْحِ وَالْمَغْرِبِ) بەو ئیمامەی نوێژی سبەینێ، یان مەغریب دەکا، هەرچەند ژمارەی ڕەکعەتەکانیشی کەمترە، کەوابو: دروستە ئیقتیدا بەو ڕێبوارەش بکا: کە نوێژ کورت دەکاتەوە (وَهُوَ) ئەو جۆرە مەئمومەی نوێژەکەی لە نوێژی ئیمام درێژترە (كَالْمَسْبُوقِ) وەك مەئمومی دواکەوتووە، واتە: هەرکاتێك ئیمامەکەی سەلامی داوە، ئەو هەڵدەستێتەوە نوێژەکەی خۆی تەواو دەکا.

(وَلا تَضُرُّ) زیانی نیە (مُتَابَعَةُ الإِمَامِ) ئەو مەئمومە شوێن ئیمامەکەی بکەوێ (فِیالْقُنُوتِ) لە قونووتی نوێژیسبەینێو (وَالْجُلُوسِ الأَخِيرِ فِيالْمَغْرِبِ) لە دانیشتنی تەحیاتیئاخیری نوێژی مەغریبدا (وَلَهُ فِرَاقُهُ) هەم ئەم مەئمومە بۆی دروستە: نیەتی جیابوونەوە بێنێو سەربەخۆ نوێژەکەی خۆی تەواو بکا (إِذَا اشْتَغَلَ بِهِمَا) هەر کاتێك ئیمامەکە دەستی بە قونووتی سبەینێ، یان بە تەحیاتیئاخیری مەغریب کرد، واتە: چونکە ئەم جیابوونەوەیە بە هۆی عوزرێکی شەرعیە، خێری جەماعەتی لەدەست ناچێ، بەڵام شوێنکەوتنەکە خێرترە لە جیابوونەوەکە، هەر وەك لە (تحفه)و (نهایه)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَجُوزُ الصُّبْحُ) دروستە: نوێژی سبەینێ بکا (خَلْفَ الظُّهْرِ) لە پشت ئەو ئیمامەی نوێژی نیوەڕۆ دەکا، هەرچەند ژمارەی ڕەکعەتەکانیشی زیاترە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (فَإِذَا قَامَ لِلثَّالِثَةِ) جا کە ئیمامەکە بۆ ڕەکعەتی سێیەمی نیوەڕۆ هەڵساوە، مەئمومەکە—وەك مەسەلەیڕابردوو— سەر پشکە: (فَإِنْ شَاءَ فَارَقَهُ) ئەگەر حەز دەکا نیەتی جیابوونەوە دێنێو (وَسَلَّمَ) سەلام دەداتەوە (وَإِنْ شَاءَ انْتَظَرَهُ) ئەگەر حەزیش دەکا لە دانیشتنیتەحیاتدا چاوەڕوانی ئیمام دەکا (لِيُسَلِّمَ مَعَهُ) تاکو لەگەڵ ئیمام سەلام بداتەوە (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (إِنْتِظَارُهُ أَفْضَلُ) چاوەڕوانکردنەکەی خێرترە لە جیابوونەوەکە (وَاللهُ أَعْلَم) کەوابو: لەو چاوەڕوانکردنەدا لە دوای تەحیات سوننەتە دوعای زۆرو درێژ بکا، هەر وەك لە (تحفه) و (نهایه)دا فەرموویانە.

(وَإِنْ أَمْكَنَهُ الْقُنُوتُ) ئەگەر ئەم مەئمومە بۆی گونجا قونووتی سبەینێ بخوێنێ (فِي الثَّانِيَةِ) لە ڕەکعەتیدووەمدا، وەك ئیمامەکەی لە دوای ڕوکووع ماوەیەك ڕابوەستێ (قَنَتَ) سوننەتە قونووتەکە بخوێنێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بۆی نەگونجا (تَرَكَهُ) سوننەتە وازی لێبێنێ، نەوەك لە ئیمامەکەی دوا بکەوێ (وَلَهُ فِرَاقُهُ) هەم بۆ مەئمومەکە دروستە: نیەتی جیابوونەوە بێنێ (لِيَقْنُتَ) تاکو قونووت بخوێنێو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو بکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر نوێژی سبەینێی لە پشت مەغریب کرد، هەمان بڕیاریڕابردووی بۆ دەدرێ، بەڵام ئەگەر نوێژی مەغریبی لە پشت نوێژێکی چوار ڕەکعەتی کرد، ئەوە کە ئیمامەکە بۆ ڕەکعەتی چوارەم هەڵساوە، واجبە: مەئموم نیەتی جیابوونەوە بێنێو تەحیات بخوێنێو سەلام بداتەوە، چونکە ئەگەر شوێنی بکەوێ، یان چاوەڕوانی بکا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەر وەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ لە ووشەی (أَفْضَلُ)یڕابردوو وەردەگیرێ: کە لە گشت ئەو ئیقتیدایانەی ڕابردوودا خێری جەماعەتی بۆ دەنووسرێ، هەر وەك لە (تحفە)و (نهایە)دا ڕوونیان کردۆتەوە.

جا لە سەرچاوەکاندا بۆ نوێژی واجب لە پشت سوننەت بەڵگەیان بەم حەدیسە هێناوەتەوە: ﴿عَنْ جابِرٍ: كانَ مُعاذٌ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِشاءَ ثُمَّ يَطْلَعُ إِلى قَوْمِهِ فَيُصَلِّيها لَهُمْ، هِيَ لَهُ تَطَوُّعٌ وَلَهُمْ مَكْتُوبَةٌ﴾ رواه الشافعي والشيخان واللفظ للأول، حەزرەتی (معاذ) نوێژی عیشای بە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەرﷺ دەکرد، ئینجا دەگەڕاوە لای هۆزەکەی خۆی دووبارە نوێژی عیشای بە جەماعەت بۆ دەکردنەوە، ئەم نوێژەی دووەم بۆ ئەوی دەبووە سوننەتو بۆ ئەوانیش واجبەکەی عیشا بوو.

کەواتە: نوێژی عیشا لە پشت تەراویح دروستە، جا هەرکاتێك ئیمامی تەراویح سەلامی داوە، مەئموم هەڵدەستێتەوەو نوێژەکەی عیشا بۆ خۆی تەواو دەکا، هەروەها نوێژی سبەینێ لە پشت نوێژیجەژن دروستە، بەڵام وا باشترە: مەئموم لە (أَللهُ أَكْبَر)ەکانی نوێژیجەژندا شوێن ئیمامەکەی نەکەوێ، کەواتە: دەستەکانیشی بەرز ناکاتەوە، هەروەها بە پێچەوانەوە: نوێژی جەژنیش لە پشت سبەینێ دروستە، بەڵام سوننەتە مەئموم (أَللهُ أَكْبَر)ەکانی بڵێ، هەر وەك لە (نهایە) و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەوەش بزانە: قەزاکردنەوەینوێژ بە تەنهایی خێری زیاترە لە قەزاکردنەوەی بە جەماعەت، مەگەر لە پشت قەزاکراوەیەکی وەکو خۆی بێ، هەر وەك لە سەرەتای جەماعەتدا ڕوونمان کردەوە.

فَإنْ اخْتَلَفَ فِعْلُهُما كَمَكْتُوبة وَكُسوف أَوْ جَنازَة لَمْ تَصِحَّ عَلَى الصَّحيح.
(فَصْلٌ) تَجِبُ مُتابَعَةُ الإمامِ فِي أَفْعالِ الصَّلاة: بِأَنْ يَتأَخَّرَ ابْتِداءُ فِعْلِه عَنْ إبْتِدائه وَيَتَقَدَّمَ

(فَإنْ اِختَلَفَ فِعلُهُما) بەلام ئەگەر نوێژکردنەکەی ئیمامو مەئمووم لێك جیا بوونو تێکیان نەدەکردەوە (کَمَکْتُوبَةٍ وکُسُوفٍ) وەك یەکێك لە پێنج نوێژە واجبەکان لە پشت نوێژی ڕۆژگیران بکا، یان بە پێچەوانەوە (أوْ جَنازَةٍ) یان یەکێك لە پێنج نوێژە واجبەکان لە پشت نوێژی(جنازە) بکا، یان بە پێچەوانەوە (لَمْ تَصِحَّ) ئیقتیدایەکە دروست نیە (عَلَى الصَّحيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە شوێنکەوتن ناگونجێ.

**شەشەم مەرجی ئیقتیدا** ئەوەیە: مەئموومەکە لەگەڵ ئیمامەکەی ڕێك بێ: لە کردنی ڕوکنەکانی نوێژو لە کردنو نەکردنی ئەو سوننەتانەی ڕێك نەبوونیان تێدا بە ناشیرن دادەندرێ: وەك سوجدەی (تلاوة)و (سَهُو)و تەحیاتی یەکەم، واتە: ئەگەر لەکردنو نەکردنی ئەو جۆرە سوننەتانە شوێن ئیمامەکەی نەکەوێ نوێژی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّما جُعِلَ الأمامُ لِيُؤتَمَّ بِهِ﴾ رواه الشيخان، ئیمام بۆ ئەوە داندراوە: تاکو شوێنی بکەون.

ئینجا بزانە: دروست نیە لە نەکردنی ڕوکنی نوێژدا شوێن ئیمامەکەی بکەوێ، چونکە ئەگەر ئیمام بە قەسدی ئەو ڕوکنەی نەکردبێ، نوێژی بەتاڵە، ئەگەر بە سەهووش بێ، بە هیچ داناندرێ، هەر وەك لە سەرچاوەکانداو لە سێزدەمین ڕوکنی نوێژدا ڕوون کراوەتەوە، کەوابو: یان هەر لە شوێنی خۆیدا چاوەڕوانی ئیمامەکەی دەکا، یان بە دڵ نیەتی جیابوونەوە دێنێ.

هەروەها لە کردارە زیادەکانیشدا دروست نیە شوێن ئیمامەکەی بکەوێ: وەك ڕەکعەتی زیادو ڕوکووعی زیادو سوجدەی زیادو...هتد، چونکە ئەگەر بە قەسدی ئەو زێدەییانە بکا نوێژی بەتاڵە، ئەگەر نا: بە هیچ داناندرێ، کەوابو: یان هەر لە شوێنی خۆیدا چاوەڕوانی ئیمامەکەی دەکا، یان بە دڵ نیەتی جیابوونەوە دێنێو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو دەکا، هەر وەك لە باسی پچڕاندنی پەیوەندی ئیمامو مەئموومدا ڕوونی دەکەینەوە،ان شاء الله تعالى.

**﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجی حەفتەمی ئیقتیدا ﴾**

**حەفتەم مەرجی ئیقتیدا** ئەمەیە: (تَجِبُ مُتابَعَةُ الإمامِ) شوێنکەوتنی ئیمام لە سەر مەئمووم واجبە (فِي أفْعالِ الصَّلاةِ) لە کردارەکانی نوێژدا (بِأنْ) شوێنکەوتن بەم جۆرەیە:

(يَتَأَخَّرَ إبْتِداءُ فِعْلِهِ) دوا بکەوێ دەست پێکردنی کرداری مەئموومەکە (عَنْ إبْتِدائِهِ) لە دەست پێکردنی کرداری ئیمامەکە، واتە: ئیمامەکە دەست بە کردارەکە بکا، ئینجا لە دوای وی مەئموومیش دەستی پێ بکا، هەم (وَيَتَقَدَّمَ) پێش بکەوێ دەست پێکردنی کرداری

عَلَى فَرَاغِهِ مِنْهُ، فَإِنْ قَارَنَهُ لَمْ يَضُرَّ، إِلاَّ تَكْبِيرَةَ إِحْرَامٍ، وَإِنْ تَخَلَّفَ بِرُكْنٍ بِـأَنْ فَـرَغَ الْإِمَامُ مِنْهُ وَهُوَ فِيمَا قَبْلَهُ لَمْ تَبْطُلْ فِي ٱلْأَصَحِّ،

---

مەئمومەكە (عَلَى فَرَاغِهِ مِنْهُ) لە تەواوكردنی كرداریئیمامەكە، واتە: كە مەئموم دەست بە كردارەكە دەكا، ئیمام كردارەكەی تـەواو نـەكردبیّ، پێغەمبەرﷺ دەفـەرمویّ: ﴿إِنَّمـا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَ إِذَا رَكَعَ فَـارْكَعُوا...﴾الحديث رواه الشيخان، ئیمام بۆ ئەوە داندراوە: تاكو شوێنی بكەون، كەوابو: كە (ٱلله أكبر)ی نوێژدابەستنی گوت ئێوەش بیڵێن، كە چووە ڕكووع ئێوەش بڕۆنە ڕكووع.

ئینجا بزانـە: لـە گوفتارەكانینوێـژ، واتـە: لـە ڕوكنـە زمانیەكانـدا—جگـە لـە (الله أكبر)ی نوێژدابەستنو سـەلامدانەوە— شـوێنكەوتنیئیمام واجـب نیـە، كـەوابو: دروسـتە: لەگـەڵ ئیمامەكەی فاتیحەو تەحیات بخوێنیّ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِنْ قَارَنَهُ) جا ئەگەر هاوكاتیی كرد، واتـە: هـەر لـە گـەڵ ئیمامەكـەیدا—بیّدواكـەوتن— كردارێكینوێژی كرد، یان گوفتارێكی خوێند (لَمْ يَضُرَّ) زیانی نیەو نوێژەكـە بـەتاڵ نـابیّ، بەڵام هاوكاتیكردن لە كردارەكانینوێژدا ناپەسندەو خێری جەماعەت لـە دەست دەدەن —هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە— چونكە دژ بە حەدیسەكەیڕابردووە.

(إِلاَّ تَكْبِيرَةَ الأَحْرَامِ) تەنها (الله أكبر)ینوێژدابەستن نەبیّ، ئەو زیـانی هەیـە، واتـە: ئەگـەر پێش ئیمام، یان لە گەڵ ئیمامدا (الله أكبر)ینوێژدابەستن بڵـێ، دروست نیـەو نوێژەكـەی دانابەستریّ، كەوابو: مەرجە ئیمام (الله أكبر)ینوێژدابەسـتن تـەواو بكـا، ئینجا مـەئموم دەستی پیّبكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر پێش ئیمامەكەی سەلام بداتەوە، نوێژەكەی بەتاڵ دەبیّ، ئەگەر بە قەسدی بیّو نیەتی جیابوونەوەشی نەهێنابیّ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ باسی دواكەوتنی مەئمومی(ٱلْمُوافِق): ڕێككەوتوو ﴾

**پێناسـە**: مـەئمومی(ٱلْمُوافِـق): ڕێككـەوتوو، ئـەو مەئمومەیـە: لـە بـە پێوەڕاوەستانی ئیمامەكەیدا بكاتە ماوەی فاتیحەخوێندنێكی ناوەنجی، واتە: نە بە پەلەو نە بە سستی.

(وَإِنْ تَخَلَّفَ) ئەگەر مەئموم لە ئیمامەكەی دواكەوت (بِرُكْنٍ) بە تەنها ڕوكنێكینوێژ (بِأَنْ) بـەم جـۆرە: (فَـرَغَ الإِمَـامُ مِنْـهُ) ئیمامەكـەی ڕوكنەكـەی تـەواو كردبـو (وَهُـوَ فِيمـا قَبْلَـهُ) مەئمومەكـەش هـەر لـە ڕوكنەكـەی پـێش ئـەو ڕوكنـەدا بـوو: وەك ئیمـام لـە ڕوكـووع هەڵسێتەوەو مەئمومیش نەچوبێتە ڕوكووع (لَمْ تَبْطُلْ فِيالأَصَحِّ) نوێژەكـەی بـەتاڵ نـابیّ لە فەرمودەی ڕاستتردا، هەر چەند بـە قەسدیو بیّعوزریش دوا كـەوتبیّ، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرمویّ: ﴿لاَ تُبادِرُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ فَمَهْمَا أَسْبَقْكُمْ بِهِ إِذا رَكَعْتُ، تُدْرِكُونِي

أَوْ بِرُكْنَينِ بِأَنْ فَرَغَ مِنهُما وَهُوَ فِيما قَبْلَهُما فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عُذْرٌ بَطَلَتْ، وَإِنْ كَانَ: بِـأَنْ أَسْرَعَ قِرَاءَتَهُ وَرَكَعَ قَبْلَ إِتْمَامِ الْمَأْمُومِ الْفَاتِحَةَ فَقِيلَ يَتْبَـعُهُ وَتَسقُطُ الْبَقِيَّةُ،

---

إِذا رَفَعْتُ...﴾ حديث صحيح رواه أحمد وابن حبان، به ڕوکووعو به سوجده پێش من مەکەون، چونکه هەر چەندی من لێتان پێش بکەوم کاتێ دەچمە ڕوکووع، ئێوه دەگەنەوه من کاتێ هەڵسامەوه له ڕوکووع.

(أَوْ بِرُكْنَينِ) یان به دوو ڕوکن مەئمووم له ئیمامەکەی دوا کەوت (بِأَنْ) بەم جۆره: (فَرَغَ مِنهُما) ئیمامەکەی هەردوو ڕوکنەکانی تەواو کردبون (وَهُوَ فِيما قَبْلَهُمَا) مەئموومەکەش هەر لە ڕوکنی پێش هەردوو ڕوکنەکاندا بوو: وەك ئیمامەکەی دەست بە چوونە خوارەوەی سوجدە بکاو مەئموومیش هەر بە پێوە بێو نەچوبێتە ڕوکووع، ئەوە دوو حاڵەتی هەنە:

یەکەم: (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عُذرٌ) ئەگەر مەئمووم هیچ عوزرێکی نەبێ، بەڵکو خۆی بە سوننەتێك خەریك کردبێ: وەك بۆ سورەتی دوایفاتیحە، یان تەحیاتییەکەم، یان زیکرەکانی ڕوکووعو سوجده دوا کەوتبێ، یان بە قەسدی فاتیحەی نەخوێندبێ، یان بە هۆی وەسوەسە پێی تەواو نەکرابێ، ئینجا بۆ خوێندنیفاتیحە، یان بۆ تەواوکردنیفاتیحە دوا بکەوێ (بَطَلَتْ) لەو حاڵەتانەدا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، چونکە دواکەوتنەکەی بە بێعوزری شەرعیەو ناشیرنە، کەواتە: لەو حاڵەتانەدا لە دواکەوتنی بە تەنها ڕوکنێك چاوپۆشی لێدەکرێ، بەڵام بە تەواوبوونی دوو ڕوکن نوێژی بەتاڵ دەبێ، کەوابو: پێش ئەوەی ئیمامەکەی ڕوکنیدووەم تەواو بکا، واجبە: نیەتی جیابوونەوە بێنێو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا لێرەدا جیاوازی نیە: هەردوو ڕوکنەکان درێژ بن، یان درێژێكو کورتێك بن، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

دووەم: بەڵام (وَإِنْ كَانَ) ئەگەر مەئمووم عوزرێکی هەبێ نوێژەکەی بەتاڵ نابێ (بِأَنْ) عوزرەکەشی وەك (أَسْرَعَ قِرَاءَتَهُ) ئیمامەکەی بە پەلە فاتیحە بخوێنێو مەئموومەکەش سست بیخوێنێو توانای ئەو پەلەکردنەی نەبێ، یان مەئموومەکە چاوەڕوانی دەکرد لە دوای فاتیحەی ئیمام فاتیحەیخۆی بخوێنێ، بەڵام ئیمامەکەی ماوەی نەداو (وَرَكَعَ) لە هەر دوو حاڵەتدا ئیمامەکە چووە ڕوکووع (قَبْلَ إِتْمَامِ الْمَأْمُومِ الْفَاتِحَةَ) پێش ئەوەی مەئمووم فاتیحەی خۆی تەواو بکا (فَقِيلَ يَتْبَعُهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: واز لە فاتیحە دەێنێو شوێن ئیمامەکەی دەکەوێ (وَتَسقُطُ الْبَقِيَّةُ) ئەوەند فاتیحەی ماوە لە سەری لادەچێ.

وَالصَّحِيحُ يُتِمُّهَا وَيَسْعَى خَلْفَهُ مَالَمْ يُسْبَقْ بِأَكْثَرَ مِنْ ثَلاثَةِ أَرْكَانٍ مَقْصُودَةٍ وَهِيَ الطَّوِيلَةُ، فَإِنْ سُبِقَ بِأَكْثَرَ فَقِيلَ يُفَارِقُهُ، وَالْأَصَحُّ يَتْبَعُهُ فِيمَا هُوَ فِيهِ ثُمَّ يَتَدَارَكُ بَعْدَ سَلَامِ الإِمَامِ، وَلَوْ لَمْ يُتِمَّ الْفَاتِحَةَ لِشُغْلِهِ بِدُعَاءِ الإِفْتِتَاحِ فَمَعْذُورٌ، هَذَا كُلُّهُ فِي الْمُوَافِقِ،

---

بەلام (وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: دروست نیە واز لە فاتیحە بێنێو لە سەری لاناچێ، بەڵکو (يُتِمُّهَا) واجبە: فاتیحەیخۆی تەواو بکاو (وَيَسْعَى خَلْفَهُ) بەگوێرەی ڕیزی نوێژەکەیخۆی بە دوای ئیمامەکەیدا دەڕوا (مَالَمْ يُسْبَقْ) بەو مەرجەی لە ئیمامەکەی دوا نەکەوێ (بِأَكْثَرَ مِنْ ثَلاثَةِ أَرْكَانٍ مَقْصُودَةٍ) بە زیاتر لە سێ ڕوکنی مەبەست (وَهِيَ الطَّوِيلَةُ) ڕوکنە مەبەستەکان لێرەدا ڕوکنە درێژەکانن، کەواتە: هەڵسانەوە لە ڕوکووعو دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەکان بە ڕوکنیدرێژ دانانرێن، بەڵکو جگە لەو دووانە ڕوکنی درێژن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەگەر بە عوزر بە سێ ڕوکن، یان بە کەمتر لە ئیمامەکەی دوا کەوت، ئەوە هەر لە سەر ڕیزینوێژەکەی خۆی بە دوای ئیمامەکەیدا دەڕوا.

بەلام (فَإِنْ سُبِقَ بِأَكْثَرَ) ئەگەر بە عوزر بە زیاتر لە سێ ڕوکن لە ئیمامەکەی دواکەوت: وەك ئیمامەکەی لە سوجدەی دووەم هەڵساوە دەستی بە تەحیات، یان بە فاتیحە کردو مەئموومیش هەر بە پێوە بوو فاتیحەکەیتری دەخوێند، ئەوە (فَقِيلَ يُفَارِقُهُ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: بە دڵ نیەتی جیابوونەوە دێنێو نوێژەکەی تەواو دەکا.

بەلام (وَالْأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر: واجب نیە نیەتیجیابوونەوە بێنێ، بەڵکو (يَتْبَعُهُ) واجبە: شوێن ئیمامەکەی بکەوێ (فِيمَا هُوَ فِيهِ) لەو ڕوکنەدا: کە ئیمامەکەی تێیدایە، واتە: واز لە ڕیزی نوێژەکەیخۆی دێنێو دەڕواتە ئەو ڕوکنەی ئیمامەکەی گەیشتویەتیێ (ثُمَّ يَتَدَارَكُ بَعْدَ سَلَامِ الإِمَامِ) ئینجا لە دوای سەلامدانەوەیئیمامەکەی ئەوەی لە دەستی چووە دەیکاتەوە، واتە: وەك مەئمومی دواکەوتوو هەڵدەستێتەوە ڕەکعەتێکیتر دەکا.

(وَلَوْ لَمْ يُتِمَّ الْفَاتِحَةَ) ئەگەر ئەو مەئموومەیڕێککەوتوو فاتیحەی تەواو نەکرد (لِشُغْلِهِ بِدُعَاءِ الإِفْتِتَاحِ) چونکە خەریکی دوعای(إفتتاح)ی پێش فاتیحە بوو (فَمَعْذُورٌ) ئەوەشی بۆ بە عوزر دادەندرێو بە گوێرەی ئەو حاڵەتانەیڕابردوو بڕیاری بۆ دەدرێ.

(هَذَا) ئەوەی باسمان کرد: لە بارەی دوا کەوتنی مەئموم بە هۆی خوێندنیفاتیحە (كُلُّهُ فِي الْمُوَافِقِ) گشتی دەربارەی مەئمومی ڕێککەوتوو بوو.

## ﴿ باسی مەئمومی (الْمَسْبُوق): دواکەوتوو ﴾

**پێناسە**: مەئمومی(الْمَسْبُوق): دواکەوتوو، ئەو مەئموومەیە: لە بە پێوەڕاوەستانی ئیمامەکەیدا نەگاتە ماوەی فاتیحەخوێندنێکی ناوەنجی.

فَأَمَّا مَسْبُوقٌ رَكَعَ الإِمامُ فِي فَاتِحَتِه فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ لَمْ يَشتَغِلْ بِالإِفْتِتاحِ وَالتَّعَـوُّذِ تَـرَكَ قِرَائَتَهُ وَرَكَعَ وَهُوَ مُدْرِكٌ لِلرَّكْعَةِ، وَإِلاَّ لَزِمَهُ قِراءَةٌ بِقَدَرِهِ،

(فَأَمَّا مَسْبُوقٌ) بەلام مەئموومێکی‌دواکەوتوو (رَكَعَ الإِمامُ فِي فاتِحَتِه) کە ئیمامەکەی ڕوکووع ببا لەو کاتەی ئەو فاتیحە دەخوێنێ (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ إِنْ لَمْ يَشْتَغِلْ بِالافْتِتاحِ وَالتَّعَوُّذِ) ئەگەر ئەم مەئمومە خۆی خەریك نەکردبێ بە دوعای(إِفْتِتـاح)و بە (أعوذُ بِاللّه...) گوتن، بەڵکو هەر لە دوای (الله أكبر)ی‌نوێژدابەستن دەستی بە فاتیحە کردبو، بەلام پێش ئەوەی تەواوی بکا ئیمامەکەی چووە ڕوکووع (تَرَكَ قِرائَتَهُ) ئەویش واز لە فاتیحەخوێندن دێنی‌و (وَرَكَعَ) لەگەڵ ئیمامەکەی‌دا دەچێتە ڕوکووع (وَهُوَ مُدْرِكٌ لِلرَّكْعَةِ) بەم ڕوکووعە دەگاتـە هـەموو ڕەکعەتەکـە، چونکە ئەوەنـدەی لـە فاتیحـە نەیخوێنـدوە، ئیمامەکەی لە جیاتی وی هەڵیدەگرێ.

کەوابو: ئەگـەر مـەئموم (الله أكبر)ی نوێژدابەستنی گـوتو هـەر ئـەو دەم ئیمامەکـەش چووە ڕوکووع، واجبە: ئەویش لەگەڵی یەکسـەر بڕواتـە ڕوکووعو فاتیحەکەشـی لـە سـەر لادەچی‌و دەشگاتە هەموو ڕەکعەتەکە، هەر وەك لە (شَرْحُ المَحلّي)دا فەرموویەتی.

کەواتە: ئەگەر لەم حاڵەتەو لە حاڵەتی‌ڕابردوودا فاتیحەی تەواو کردو وێڕانەگەیشت لەگەڵ ئیمامەکەی ڕوکووع ببا، بەڵکو ئیمامەکەی لە ڕوکووع هەڵساوە ئینجا ئەو چووە ڕوکووع، ئەو کاتە هەموو ڕەکعەتەکەی لەدەست دەچێ، بـەلام نوێژەکـەی بـەتاڵ نـابێ، کەواتـە: واجبـە لـە دوای سـەلامدانەوەی‌ئیمام هەڵسـێتەوە ڕەکعـەتێکی‌تر بکـا، هـەر وەك لـە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِلاّ) بەلام ئەگـەر مەئمومی‌دواکـەوتوو خـۆی خـەریك کردبـو بـە دوعـای (إفتتـاح)، یـان (أعوذُ بِالله...) گوتن (لَزِمَهُ قِراءَةٌ بِقَدَرِهِ) ئـەو کاتـە واجبـە بـە ئەنـدازەی (إفتتـاح)، یـان (أعوذُ بِالله...) لـە فاتیحـە بخـوێنێ، ئینجـا ئەگـەر ئـەو ئەندازەیـەی لـە فاتیحـە خوێنـدو وێڕاگەیشت لە گەڵ ئیمام چووە ڕکووع، ئـەوە دەگاتـە ڕەکعەتـە کـە، بـەلام ئەگـەر ئـەو ئەندازەیـەی نەخوێنـدو چـووە ڕوکووع: ئـەوە ئەگـەر بـە قەسـدی بـی‌و بزانـێ حەڕامـە، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، وە ئەگەر نەزانێ حەڕامە، یان بە قەسدی نەبو، ئـەوە نوێژەکـەی بەتاڵ نابێ، بەلام ڕەکعەتەکەی لە دەست دەچێ.

هەروەها ئەگەر ئەندازەکەش بخوێنێ بەلام لەگەڵ ئیمامەکەی‌دا نەگەیشتە ڕوکووع، واتە: تا ئەو ئەندازەکەی تەواو کرد ئیمامەکەی لە ڕوکووع هەڵساوە، ئەو کاتە دروست نیـە ڕوکووع ببا؟ بەڵکو لە گەڵ ئیمامەکەی دەڕواتە سوجدەو ڕەکعەتەکەی لە دەست دەچێ، کەواتـە: لەم دوو حاڵەتەدا لە دوای سەلامدانەوەی‌ئیمام هەڵدەستێتەوە ڕەکعەتێکی‌تر دەکا.

وَلاَ يَشْتَغِلُ الْمَسْبُوقُ بِسُنَّةٍ بَعْدَالتَّحَرُّمِ بَلْ بِالْفَاتِحَةِ إِلاَّ أَنْ يَعْلَمَ إِدْرَاكَهَا، وَلَوْ عَلِمَ الْمَأْمُومُ فِي رُكُوعِهِ أَنَّهُ تَرَكَ الْفَاتِحَةَ أَوْ شَكَّ لَمْ يَعُدْ إِلَيْهَا، بَلْ يُصَلِّي رَكْعَةً بَعْدَ سَلاَمِ الْإِمَامِ، فَلَوْ عَلِمَ أَوْ شَكَّ وَقَدْ رَكَعَ الْإِمَامُ وَلَمْ يَرْكَعْ هُوَ قَرَأَهَا

---

ئینجا بزانە: زۆربەیزانایان فەرموویانە: ئەم مەئمومەش-وەك مەئمومەكەی مەسەلەكەیتر- لە گەڵ ئیمامەكەی ڕكووع دەباو بە هۆی شوێنكەوتنی ئیمامەكەی فاتیحەی لە سەر لادەچیو دەگاتە ڕەكعەتەكە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا﴾ رواه الشيخان، هەركاتێك ئیمام ڕوكووعی برد ئێوەش ڕوكووع ببەن.
جا ئەم مەسەلە ئاڵۆزە لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە، بۆیێ دەفەرموێ: (وَلاَ يَشْتَغِلُ الْمَسْبُوقُ) سوننەتە مەئمومیدواكەوتوو خۆی خەریك نەكا (بِسُنَّةٍ) بە هیچ سوننەتێك (بَعْدَ التَّحَرُّمِ) لە دوای (الله أكبر)ینوێژدابەستن، واتە: دوعای (إفتتاح)و (أعوذ بالله...) نەخوێنێ (بَلْ بِالْفَاتِحَةِ) بەڵكو یەكسەر دەست بە خوێندنی فاتیحە بكا، نەوەك بە هۆی سوننەت واجبی لە دەست بڕوا؟ چونكە فاتیحە واجبەو ئەوانیتریش سوننەتن (إِلاَّ أَنْ يَعْلَمَ إِدْرَاكَهَا) مەگەر بزانێ لەگەڵ ئیمام دەگاتە تەواوی فاتیحە: وەك ئیمامەكە فاتیحەو سوڕەتی دوای فاتیحە درێژ بكاتەوە، ئەو كاتە ئەو سوننەتانەیڕابردووش دەخوێنێ تاكو خێرەكەی لە دەست نەچێ.
(وَلَوْ عَلِمَ الْمَأْمُومُ فِي رُكُوعِهِ) ئەگەر مەئموم لە ناو ڕوكووعی خۆیدا زانی: (أَنَّهُ تَرَكَ الْفَاتِحَةَ) فاتیحەی نەخوێندوە (أَوْ شَكَّ) یان كەوتە گومان: ئایا فاتیحەی خوێندوە، یان نا (لَمْ يَعُدْ إِلَيْهَا) دروست نیە بگەڕێتەوە بۆ فاتیحەخوێندن، چونكە شوێنكەوتنی ئیمامەكەی لە دەست دەچێ، كەوابو: ئەگەر دەیزانی گەڕانەوە حەرامەو بە قەسدی گەڕاوە، نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ (بَلْ يُصَلِّي رَكْعَةً بَعْدَ سَلاَمِ الإِمَامِ) بەڵكو لە دوای سەلامدانەوەی ئیمام هەڵدەستێتەوە ڕەكعەتێكیتر دەكا، ئینجا ئەویش سەلام دەداتەوە.
بەڵام ئەگەر مەئموم نەبو، بەڵكو ئیمام بوو، یان نوێژكەری بە تەنهایی بوو، ئەو كاتە واجبە: بگەڕێتەوە بۆ فاتیحەخوێندن، هەروەك لە ڕوكنی سێزدەمینینوێژدا ڕوونمان كردەوە، جا ئەگەر ئیمام لە ڕوكووعەوە گەڕاوە بۆ فاتیحەخوێندنو مەئمومەكانیش لە گەڵی هەڵسانەوە، ئەو كاتە واجبە: ئەوان بڕۆنە سوجدەو لە سوجدەدا چاوەڕوانی ئیمام بكەن، هەروەك لە (الشرواني) دا ڕوون كراوەتەوە.
(فَلَوْ عَلِمَ أَوْ شَكَّ) ئەگەر مەئموم زانی فاتیحەی نەخوێندوە، یان كەوتە گومان لە خوێندنی فاتیحەدا (وَقَدْ رَكَعَ الإِمَامُ) لە كاتی پێزانین، یان گومانیئەودا ئیمام دەستی بە ڕوكووع كردبو، بەلام (وَلَمْ يَرْكَعْ هُوَ) ئەو هەر بە پێوە بوو و ڕوكووعی نەبردبو (قَرَأَهَا)

وَهُوَ مُتَخَلِّفٌ بِعُذْرٍ، وَقِيلَ يَرْكَعُ وَيَتَدَارَكُ بَعْدَ سَلَامِ الْإِمَامِ، وَلَوْ سَبَقَ إِمَامَهُ بِالتَّحَرُّمِ لَمْ تَنْعَقِدْ، أَوْ بِالْفَاتِحَةِ أَوِ التَّشَهُّدِ لَمْ يَضُرَّهُ وَيُجْزِئُهُ، وَقِيلَ تَجِبُ إِعَادَتُهُ، وَلَوْ تَقَدَّمَ بِفِعْلٍ كَرُكُوعٍ وَسُجُودٍ إِنْ كَانَ بِرُكْنَيْنِ بَطَلَتْ

---

لەم حاڵەتەدا واجبە: فاتیحە بخوێنێ، ئینجا بڕواتە ڕوکووع (وَ هُوَ مُتَخَلِّفٌ بِعُذْرٍ) ئەم مەئمومە بە هۆی عوزرێکی‌شەرعی لە ئیمامەکەی دواکەوتوە، واتە: بە گوێرەی ڕیزی نوێژەکەی‌خۆی بە دوای ئیمامەکەی‌دا دەڕواو چاوپۆشی‌ی لێ‌دەکرێ بەو مەرجەی بە زیاتر لە سێ ڕوکن لە ئیمامەکەی دوا نەکەوێ، هەروەك ڕوون کراوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (يَرْكَعُ) ڕوکووع دەباو (وَيَتَدارَكُ بَعْدَ سَلَامِ الإمامِ) لە دوای سەلامدانەوەی ئیمام هەڵدەستێتەوە ڕەکعەتێکی‌تر دەکا.

## ﴿ باسی پێشکەوتن لە ئیمامەکەی ﴾

(وَلَوْ سَبَقَ إِمَامَهُ) ئەگەر مەئموم پێش ئیمامەکەی کەوت (بِالتَّحَرُّمِ) بە نوێژدابەستن، واتە: پێش ئیمامەکەی (اللە أكبر)ی‌نوێژدابەستنی گوت (لَمْ تَنْعَقِدْ) نوێژەکەی دانابەسترێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی﴿إذا كَبَّـرَ فَكَبِّـرُوا﴾ی‌ڕابردوو، کەوابو: دروستیش نیە لەگەڵ ئیمامەکەی بیڵێ، بەڵکو مەرجە: ئیمام (اللە أكبر)ی‌نوێژدابەستنی‌خۆی تەواو بکا، ئینجا مەئموم دەستی پێ‌بکا.

هەروەها ئەگەر بە سەلامدانەوەش پێش ئیمامەکەی بکەوێ، نوێژی بەتاڵ دەبێ، ئەگەر نیەتی جیابوونەوەی نەهێنابێ، هەروەك ڕوونمان کردوە.

(أَوْ بِالْفَاتِحَةِ أَوِ التَّشَهُّدِ) یان بە فاتیحە، یان بە تەحیات پێش کەوت، واتە: پێش ئیمامەکەی فاتیحەو تەحیاتی خوێندن (لَمْ يَضُرَّهُ وَ يُجْزِئُهُ) زیانی لێ‌ناداو دروستەو بۆی بەردەکەوێ، هەروەك باسمان کرد، هەروەها ئەگەر لە گەڵ ئیمامەکەش بیانخوێنێ، هەر دروستە، چونکە ئەوانە ڕوکنە زمانیەکانن (وَ قِيلَ تَجِبُ إِعَادَتُهُ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا واجبە: دووبارەی بکاتەوە.

(وَلَوْ تَقَدَّمَ) ئەگەر مەئموم پێش ئیمام کەوت (بِفِعْلٍ) بە کردارێکی‌نوێژ (كَرُكُوعٍ وَ سُجُودٍ) وەکو ڕوکووع‌و سوجدە، ئەوە تەماشا دەکرێ: (إِنْ كَانَ بِرُكْنَيْنِ) ئەگەر پێشکەوتنەکە بە دوو ڕوکنی لە دوای یەکتری بێ (بَطَلَتْ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، ئەگەر بە قەسدی بێ‌و بشزانێ حەرامە، واتە: ئەگەر سەهووی کرد، یان نەیزانی حەرامە بۆیێ بە دوو ڕوکن لە ئیمامەکەی پێش کەوت، ئەو کاتە نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەلام ئەم ڕەکعەتەی دروست نابێ‌و واجبە: لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکەی هەڵسێتەوە ڕەکعەتێکی‌تر بکا.

وَإلاَّ فَـــــلاَ، وَقِــــيلَ تَـبْـطُــلُ بِـرُكْــــنٍ.

(فَصْلٌ) خَرَجَ الْإِمَامُ مِنْ صَلَاتِه انْقَطَعَت الْقُدْوَةُ، فَإِنْ لَمْ يَخْرُجْ وَقَطَعَها الْمَأْمُومُ جَازَ، وَفِي قَوْلٍ لاَ يَجُوزُ إلاَّ بِعُذْرٍ يُرَخِّصُ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ، وَمِنَ الْعُذْرِ تَطْوِيلُ الْإِمَامِ أَوْ تَرْكُهُ سُنَّةً مَقْصُودَةً كَتَشَهُّدٍ،

---

ئینجا بزانه: لەم پێشکەوتنەشدا جیاوازی نیە: هەردوو ڕوکنـەکان درێـژبن، یـان درێـژێكو كورتێك بـن: وەك پـێش ئیمام ڕوکـووع بـباو هەڵسێتەوەو بۆ سـوجدە شـۆڕ ببێتـەوە، ئیمامەکەشی نەچوبێتە ڕوکووع، واتە: بە پێشـکەوتنی بـەو دوو ڕوکنـە نوێژەکـەی بـەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإلاّ) بـەڵام ئەگـەر پێشـکەوتنەکەی بـە تـەنها ڕوکنێـك بـوو جگـە لـە سـەلامدانەوە (فَـلاَ) نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام ئەگەر بە قەسدی بێ حەرامە؟ چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ﴾ رواه الشيخان، ئایا ئەو کەسەی لە ڕوکووعو سوجدە پێش ئیمام سەری بەرز دەکاتـەوە، ناترسێ خوایگـەورە سەری بکاتە سەری کەر؟. (وَ قِيـلَ تَبْطُـلُ بِـرُكْنٍ) لـە فەرموودەیـەکی بێهێـزدا: نوێژەکـەی بەتاڵ دەبێ بە پێشکەوتنی بە تەنها ڕوکنێکیش، چونکە پێشکەوتن زۆر ناشیرنە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی پچڕاندنی پەیوەندی مەئموم بە ئیمامەکەیەوە ﴾

(خَرَجَ الأمامُ مِنْ صَلاَتِهِ) هەر کاتێك ئیمام لە نوێژەکەی دەرچوو: وەك نوێژەکـەی تـەواو ببێو سەلام بداتەوە، یان بە هۆی بێدەستنوێژی، یان بە هۆیەکیتر لە نوێژەکەی بڕواتـە دەر، یان بمرێ (إنقطَعَتِ الْقُـدْوَةُ) ئیقتدایەکـەی دەپچڕێ، واتـە: پەیوەنـدی مـەئموم بـە ئیمامەکەیەوە نامێنێ، وەك بە تەنها نوێژ بکا ئەوهایە.

(فَإنْ لَمْ يَخْرُجْ) جا ئەگەر ئیمام لە نوێژەکەی دەرنەچو، بەڵام (وَقَطَعَهاالْمَأْمُومُ) مەئموم بـە بێعوزر بە خۆی پچڕاندی، واتە: بـە دڵ نیـەتی جیابوونـەوەی هێنـاو سـەربەخۆ نوێژەکـەی تەواو کرد (جَازَ) دروستە، بەڵام ناپەسندەو خێری جەماعەتی لە دەست دەچێ (وَفِي قَـوْلٍ) لە فەرموودەیەکیکۆندا: (لاَ يَجُوزُ) دروست نیـە مـەئموم جەماعەتەکـەی ببڕێو سـەربەخۆ نوێژەکەی تەواو بکا (إلاَّ بِعُذْرٍ) تەنها بە عوزرێکی وەها نەبێ: کە (يُرَخِّـصُ فِيتركِ الْجَماعَـةِ) ڕێگە بدا بۆ نەکردنی جەماعەت: کە باسمان کردن.

(وَمِنَ الْعُذْرِ) یەکێك لەو عوزرانەی کـە دەخرێنـە پـاڵ عوزرەکـانیڕابردوو (تَطْوِيـلُ الأمـامِ) درێژەپێدانی ئیمامەکەیە: کە مەئموم توانای ئـەو درێـژە پێدانـەی نـەبێ (أَوْ تَرْكُـهُ سُـنَّةً مَـقْصُودَةً) یان ئیمـام سـوننەتێکیگرنگی نوێژ نەکا (كَتَشَهُّدٍ) وەکو تەحیـاتییەکەم، یان

قونووت، یان سورەتی دوایفاتیحە، واتە: بە هۆی ئەو عوزرانە مەئمووم بۆی دروستە: بە دڵ نیەتی جیابوونەوە بێنیو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو بکا، ئەو سوننەتانەش بخوێنێ.

ئینجا بزانە: هەر جیابوونەوەیەك بە هۆی عوزرێکیشەرعی بێ، ناپەسند نیەو خێری جەماعەتی لە دەست نادا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر ئیمام ڕوکنێکینوێژی نەکرد، دروست نیە مەئمووم شوێنی بکەوێ، هەروەك لە مەرجیشەشەمدا باسمان کرد، کەوابو: مەئموومەکە: یان لە شوێنی خۆیدا چاوەڕوانی ئیمامەکەی دەکا، بەو مەرجەی شوێنەکە ڕوکنێکیدرێژ بێ، یان بە دڵ نیەتی جیابوونەوە دێنیو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو دەکا، ئەگینا: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەها ئەگەر ئیمامەکەی کردارێکیزیادی کرد: وەك لە نوێژی دوو ڕەکعەتی هەڵسێتەوە بۆ ڕەکعەتیسێیەم، یان لە سێڕەکعەتی بۆ چوارەم، یان لە چوارەم بۆ پێنجەم، یان سوجدەیەك، یان ڕوکووعێك زیاد بکا، لەو حاڵەتانەشدا دروست نیە شوێنی بکەوێ، بەڵکو: یان چاوەڕوانی دەکا، یان بە دڵ نیەتیجیابوونەوە دێنیو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو دەکا، هەروەك لە چەند شوێنێکی جۆراوجۆری سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کرانەوە.

دووەم: هەر کاتێك مەئمووم بزانێ ئیمامەکەی بێدەستنوێژ بووە، یان پیسیەکی لێنەبوردراوی وێکەوتوە، یان عەوڕەتی بەدەرکەوتوە...هتد، لە گشت ئەو حاڵەتانەدا واجبە: بەدڵ نیەتی جیابوونەوە بێنیو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو بکا، ئەگینا: نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، جیاوازی نیە: ئیمامەکەش لەو حاڵەتانە ئاگادار بێ، یان نا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك ئیمام لە نوێژەکەی دەرچوو، واتە: بە هۆی بێدەستنوێژی، یان پیسی...هتد، وازی لە ئیمامەتی هێنا، یان بە بێهیچ هۆیەك وازی هێنا، لە گشت ئەو حاڵەتانەدا دروستە: یەکێك لە جێگەی خۆی بکاتە ئیمام تاکو نوێژەکە بە مەئموومەکان تەواو بکا، هەروەها بۆ مەئموومەکانیش دروستە: بە ئامازەکردن یەکێك بە پێش بێخن، لە هیچ حاڵەتێکیشدا دووبارەکردنەوەی نیەتیئیقتدا واجب نیە، بەڵگە: ﴿عَنْ عمرو بن میمون: حِينَ طُعِنَ عُمَرُ وَهُوَ فِي الصَّلَاةِ تَنَاوَلَ يَدَ عَبْدِالرَّحْمنِ بِنِ عَوْفٍ فَقَدَّمَهُ للصَّلَاةِ﴾ رواه البخاري، کە ئیمامی(عمر) لە ناو نوێژدا بریندار کرا، دەستی (عبدالرحمن)ی گرتو بە پێشی خست، تاکو ئیمامەتینوێژ تەواو بکا. لە کۆتایی نوێژی جومعەدا ئەم مەسەلەیە درێژتر ڕوون دەکەینەوە، ان شاء الله تعالی.

وَلَوْ أَحْرَمَ مُنفَرِداً ثُمَّ نَوَىٰ الْقُدْوَةَ في خِلَالِ صَلَاتِه جَازَ فِي الأَظْهَرِ -وَإِنْ كَانَ فِي رَكْعَةٍ أُخْرَىٰ- ثُمَّ يَتْبَعُهُ قَائِماً كَانَ أَوْ قَاعِداً، فَإِنْ فَرَغَ الإِمَامُ أَوَّلاً فَهُوَ كَمَسْبُوقٍ، أَوْ هُوَ: فَإِنْ شَاءَ فَارَقَهُ وَإِنْ شَاءَ انْتَظَرَهُ لِيُسَلِّمَ مَعَهُ، وَمَا أَدْرَكَهُ الْمَسْبُوقُ فَأَوَّلُ صَلَاتِهِ فَيُعِيدُ فِي الْبَاقِي الْقُنُوتَ،

---

(وَلَوْ أَحْرَمَ مُنْفَرِداً) ئەگەر یەکێك بە تەنهایی نوێژی دابەست (ثُمَّ نَوىَ الْقُدْوَةَ فِي خِلاَلِ صَلاتِه) ئینجا لە ناو نوێژەکەیدا بە دڵ نیەتی ئیقتیدای هێنا، واتە: ئیقتدای بە یەکێکیتر کرد (جَازَ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: دروستەو نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام ناپەسەندەو خێری جەماعەتی لەدەست دەدا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: وەها سوننەتە ئەم نوێژە واجبەی بکاتە سوننەتێکی دوو ڕەکعەتی بێناو و سەلام بداتەوە، یان نوێژەکەی ببڕێ ئینجا ئیقتیدای پێبکا، هەروەك لە پێش چوارەم مەرجی ئیقتیدا ڕوونمان کردەوە.

(وَإِنْ كَانَ فِي رَكْعَةٍ أُخْرى) هەر چەند مەئمومەکەش لە ڕەکعەتێکیتری جگە لە ڕەکعەتەکەی ئیمامدا بێ، هەر دروستە ئیقیتدای پێبکا (ثُمَّ) ئینجا لە دوای نیەتی ئیقتیدا (يَتْبَعُهُ) شوێن ئیمامەکەی دەکەوێ (قائِماً كانَ أَوْ قاعِداً) جا ئیمامەکەی بە پێوە بێ، یان دانیشتوو بێ، هەرچەندەش ڕیزی نوێژەکەی خۆی تێك بچێ:

(فَإِنْ فَرَغَ الأَمامُ أَوَّلاً) جا ئەگەر ئیمامەکەی پێش ئەوی نوێژەکەی خۆی تەواو کرد (فَهُوَ) ئەو مەئمومە (كَمَسْبُوقٍ) وەك مەئمومی دواکەوتووە، واتە: لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکەی نوێژەکەی خۆی تەواو دەکا.

(أَوْ هُوَ) یان ئەگەر مەئموومەکە پێش ئیمامەکەی نوێژی تەواوکرد، ئەو کاتە سەرپشکە: (فَإِنْ شاءَ فارَقَهُ) ئەگەر حەز دەکا بەدڵ نیەتی جیابوونەوە دێنێو سەلام دەداتەوە (وَ إِنْ شاءَ إِنْتَظَرَهُ) ئەگەر حەزیش دەکا لە دانیشتنی تەحیاتدا چاوەڕوانی ئیمامەکەی دەکا (لِيُسَلِّمَ مَعَهُ) تاکو لەگەڵ ئەودا سەلام بداتەوە.

## ﴿ باسی سەرەتای نوێژی مەئمومی دواکەوتوو ﴾

(وَما أَدْرَكَهُ الْمَسْبُوقُ) ئەو ڕەکعەتەی مەئمومی دواکەوتوو دەیگاتێو لەگەڵ ئیمامەکەیدا دەیکا (فَأَوَّلُ صَلاتِه) ئەوە سەرەتای نوێژەکەیەتی، ئەوەی لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکەشی دەیکا ئاخیری نوێژەکەیەتی، کەوابو: ئەگەر لە ڕەکعەتی دووەمی نوێژی سبەینێ گەیشتە ئیمامەکەی ئەوە لە بەر شوێنکەوتن لەگەڵ ئیمامدا قونووت دەخوێنێو هەروەها (فَيُعِيدُ فِي الْباقِي الْقُنُوتَ) لەو ڕەکعەتەش کە ماویەتی دووبارە قونووتەکە دەخوێنێتەوە، چونکە قونووت لە ڕەکعەتی ئاخیردا دەخوێندرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

وَلَوْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْمَغْرِب تَشَهَّدَ فِي ثَانِيَته، وَإِنْ أَدْرَكَهُ رَاكِعاً أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ، قُلْتُ: بِشَرْطِ أَنْ يَطْمَئِنَّ قَبْلَ ارْتِفَاعِ الإِمَامِ عَنْ أَقَلِّ الرُّكُوعِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ شَكَّ فِي إِدْرَاكِ حَدِّ الإِجْزَاءِ لَمْ تُحْسَبْ رَكْعَتُهُ فِي الأَظْهَرِ، وَيُكَبِّرُ لِلإِحْرَامِ ثُمَّ لِلرُّكُوعِ،

---

﴿فَما أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَما فاتَكُمْ فَأَتِمُّوا﴾رواه الشيخان، ئەوەندە نوێژەی لەگەڵ ئیمام وێراگەیشتن بیکەن‌و ئەوەی لە دەستتان چووە تەواوی بکەن.

هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: (وَلَوْ أدركَ ركعَةً مِنَ الْمَغْرِب) ئەگەر لەگەڵ ئیمامدا گەیشتە یەك ڕەكعەت لە نوێژی مەغریب (تَشَهَّدَ فِي ثانِيَته) لە دوای سەلامدانەوەی‌ئیمام سوننەتە: مەئمووم لە ڕەكعەتی دووەمی‌خۆی‌دا تەحیاتی‌یەكەم بخوێنێ، چونكە ئێرە شوێنی تەحیاتی یەكەمیەتی‌و ئەوەی لەگەڵ ئیمامدا خوێندویەتی تەنها لە بەر شوێنكەوتن بووە.

ئینجا بزانە: لێرەدا مەتەڵێك هەیە: (كام نوێژ سێ ڕەكعەت‌و چوار تەحیاتە)؟ وەڵام: ئەمە نوێژی مەغریبە: كە مەئمووم لە تەحیاتی یەكەمی‌ئیمامدا نوێژ داببەستێ، واتە: ئەو دوو تەحیاتەی لەگەڵ ئیمامدا دەیانخوێنێ بە بەر تەحیاتی‌یەكەمی نوێژی‌خۆی ناكەون.

(وَإِنْ أدركَهُ راكِعاً) ئەگەر مەئمووم لە حاڵەتی‌ڕوكووعدا گەیشتە ئیمام (أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ) دەگاتە هەموو ڕەكعەتەكە، واتە: بۆی بە بەر خوێندنی فاتیحەش دەكەوێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إذا جئْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدوا وَلاتَعُدُّوهُ شَيْئاً، وَ مَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاةَ﴾ رواه أبوداود و غيره بسندصالح، و في صحيح إبن خزيمة نحوه عن أبي‌هريرة، هەر كاتێك هاتنە نوێژی جەماعەت‌و ئێمە لە سوجدەدا بوین ئێوەش سوجدە ببەن بەڵام بە هیچ ڕوكنێكی‌نوێژی دامەنێن، وە هەر كەسێك بگاتە ڕوكووع دەگاتە ڕەكعەتێكی نوێژ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (بِشَرْطِ أنْ يَطْمَئِنَّ) بەو مەرجە ڕوكووعەكە بە ڕەكعەتێك دادەندرێ: كە لە ڕوكووعەكەدا خۆی ڕابگرێ (قَبْلَ إِرْتِفاعِ الامامِ) پێش هەڵسانەوەی ئیمام (عَنْ أَقَلِّ الرُّكوعِ) لە كەمترینی ڕوكووعەكەی: كە لە ڕوكنی پێنجەمی نوێژدا باسمان كرد (و اللهُ أَعْلَمُ).

كەوابو: (وَلَوْ شَكَّ) ئەگەر كەوتە گومان: (فِي إِدْرَاكِ حَدِّ الإِجْزاءِ) ئایا پێش هەڵسانەوەی ئیمام گەیشتۆتە سنووری‌دروستبوون، یان نا، واتە: ئایا لە ڕوكووعدا خۆی ڕاگرتوە، یان نا؟ (لَمْ تُحْسَبْ ركعَتُهُ) ئەم ڕوكووعەی بە ڕەكعەت ناژمێردرێ‌و واجبە لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەكەی ئەم ڕەكعەتەش بكاتەوە (فِي الأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

(وَ يُكَبِّرُ لِلاِحْرامِ) واجبە: مەئمومی‌دواكەوتوو بە پێوە (الله أكبر)ی‌نوێژدابەستن بڵێ (ثُمَّ لِلرُّكوعِ) ئینجا سوننەتە: یەكسەر (الله أكبر)ێكی‌تریش بۆ چوونە ڕوكووع بڵێ، چونكە دروست نیە خۆی بە فاتیحەخوێندن خەریك بكا.

فَإِنْ نَواهُما بِتَكْبِيرَة لَمْ تَنعَقِدْ وَقِيلَ تَنعَقِدُ نَفلاً، وَإِنْ لَمْ يَنوِ بِهاَ شَيْئاً لَمْ تَنعَقِدْ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلَوْ أَدْرَكَهُ فِي اعْتِدَاله فَماَ بَعْدَهُ انْتقل مَعَهُ مُكَبِّراً، وَالأَصَحُ أَنَّهُ يُوافِقُهُ فِي التَّشَهُّدِ وَالتَّسْبِيحَاتِ، وَأَنَّ مَنْ أَدْرَكَهُ فِي سَجْدَة لَمْ يُكَبِّرْ لِلإِنْتِقَالِ إِلَيْهَا، وَإِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ قَامَ الْمَسْبُوقُ مُكَبِّراً إِنْ كَانَ مَوْضِعَ جُلُوسِه،

---

(فَإِنْ نَواهُما بِتَكْبِيرَةٍ) جا ئەگەر بە تەنها یەك (الله أكبر) مەبەستی دابەستن‌و چوونە ڕوکووع بوو بە یەکەوە (لَمْ تَنعَقِدْ) نوێژەکەی دانابەسترێ؟ چونکە واجب‌و سوننەتی کردونەتە هاوبەش (وَقِيلَ تَنعَقِدُ نَفلاً) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: نوێژەکە بە نوێژێکی‌سوننەت دادەبەسترێ (وَإِنْ لَمْ يَنوِ بِها شَيْئاً) ئەگەر بەو (الله أكبر)ە هیچیانی مەبەست نەبو (لَمْ تَنعَقِدْ) دیسان نوێژەکەی دانابەسترێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

هەروەها ئەگەر توانای بە پێوەڕاوەستانی هەبێ‌و بە پێوە (الله أكبر)ی‌نوێژدابەستن نەڵێ، دیسان نوێژەکەی دانابەسترێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَدْرَكَهُ فِي إِعْتِدالِهِ) ئەگەر مەئمووم لە هەڵسانەوەی ڕوکووعی‌ئیمامدا گەیشتە ئیمامەکە (فَما بَعْدَهُ) هەروەهاش ئەگەر لە دوای ئەو هەڵسانەوەیەش بگاتە ئیمامەکە (إِنْتَقَلَ مَعَهُ مُكَبِّراً) لە گشت هەڵسانەوەو دانیشتندا شوێن ئیمام دەکەوێ‌و (الله أكبر)ەکانیش دەڵێ (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ يُوافِقُهُ) مەئموومی‌دواکەوتوو لە دوای ئیقتیدا لەگەڵ ئیمام ڕێك دەبێ (فِي‌التَّشَهُّدِ وَالتَّسْبِيحاتِ) لە خوێندنی‌تەحیاتەکان‌و لە تەسبیحاتەکاندا.

(وَأَنَّ مَنْ أَدْرَكَهُ فِي سَجْدَةٍ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر مەئموومی‌دواکەوتوو لە سوجدەدا گەیشتە ئیمامەکەی، یان لە دانیشتنی نێوان سوجدەکان، یان لە تەحیاتی یەکەم، یان لە تەحیاتی‌ئاخیر گەیشتە ئیمامەکەی، واتە: کە مەئمووم نوێژی دابەست ئیمامەکە لەو کردەوانەدا بوو (لَمْ يُكَبِّرْ) ئەوە لەدوای(الله أكبر)ی نوێژدابەستن هیچ (الله أكبر)ێکی‌تر نالێ (لِلإِنْتِقالِ إِلَيْها) بۆ ڕۆیشتنە خوارەوە بۆ ئەو کردارانە، چونکە بە تەنهایی دەڕوا تاکو لەو کردارانەدا شوێن ئیمام بکەوێ، کەوابو: کە گەیشتە ئیمام ئینجا لەگەڵ ئەودا (الله أكبر)ەکان دەڵێ.

(وَإِذا سَلَّمَ الإِمامُ) هەرکاتێك ئیمام سەلامی داوە (قامَ الْمَسْبُوقُ) مەئموومی دواکەوتوو هەڵدەستێتەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەی (مُكَبِّراً) سوننەتە: بۆ هەڵسانەوە (الله أكبر) بڵێ (إِنْ كانَ مَوْضِعَ جُلُوسِهِ) ئەگەر دانیشتنەکەی لە تەحیاتی‌ئیمامدا شوێنی دانیشتنی‌خۆی بێ

ئەگەر بە تەنها بوایە: وەك لە ڕەكعەتیدووەمی مەغریب، یان لە سێیەمی نیوەڕۆو عەسرو عیشادا بكاتە ئیمام، چونكە ئەم دانیشتنە بۆ وی تەحیاتییەكەمە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دانیشتنەكەی لە تەحیاتیئیمامدا شوێنی دانیشتنیخۆی نەبو: وەك لە ڕەكعەتی سێیەمی مەغریب، یان لە ڕەكعەتیدووەم، یان چوارەمی چوار ڕەكعەتیەكان بكاتە ئیمام (فَلاَ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: (الله أكبر)ی هەڵسانەوە سوننەت نیە.

ئینجا بزانە: هەر لە دوای تەواوبوونی سەلامدانەوەییەكەمیئیمام دروستە: مەئمومی دواكەوتوو هەڵسێتەوە نوێژەكەی تەواو بكا، بەڵام وەها سوننەتە: هەردوو سەلامەكەیئیمام تەواو ببێ، ئینجا هەڵسێتەوە.

هەروەها بزانە: دروست نیە مەئموم لە دوای سەلامدانەوەیدووەمی ئیمام لە دانیشتندا بمێنێتەوە، مەگەر شوێنی دانیشتنی خۆی بێ، ئەو كاتە زیانی نیە، واتە: ئەگەر دوای سەلامیدووەمی ئیمام بە قەسدی لە دانیشتندا بەردەوام بوو و دەشیزانی حەڕامە، نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر پێش تەواوبوونی سەلامدانەوەییەكەمی ئیمامەكەی بە قەسدی هەڵساوە پێوە، دیسان نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی...كۆتایی.

اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ لێرەدا –بە تەواوبوونی پەرتووكی نوێژیجەماعەت– بەرگی یەكەمی ﴿ ڕووناكی (رَبِّ الْعالَمِين) ڕوونكردنەوەی (مِنْهاجِ الطّالِبِين)﴾ كۆتایی هات لە شەوی دووشەممە (١٥)ی (شوال)ی (١٤١٩)یكۆچی، إن شاء الله بەرگیدووەمی بە دوادا دێ: كە بە (صَلاةُ الْمُسافِر: نوێژی ڕێبوار) دەست پێدەكا، لە خوایگەورە دەپاڕێمەوە: هێزو توانام بداتێ بۆ تەواوكردنی ڕوونكردنەوەی هەموو (منهاج)ی ئیمامی(النواوی) رحمه الله تعالی، منیش بەندەی بێچارە: (عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی)م، خودا لە خۆمو دایكمو باوكمو خۆشەویستانم خۆش ببێ، آمین، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ.

هەولێر – كوردستان

١٥ی شوال – ١٤١٩ی كۆچی

١٢ی ڕێبەندان – ٢٦٩٨ی كوردی

١ی شباط – ١٩٩٩ی زایینی

## شارەزاکردن:

**ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:**

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

*رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، یان ڕوون كراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار كتێبەنە:

١ –(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢ –(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

٣ –(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤ –(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جا ئەگەر یەكێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ، ئەو كاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا...

### ئەی قوتابیی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

١– پێشەكیەكەلە بەرگی یەكەمدا بە بیرلێكردنەوەیەكی ورد بخوێنەوە.

٢– بۆ تێگەیشتنی ئەم كتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵكو لە لای مامۆستایئایینی بیخوێنە، چونكە چەند پێناسەو زاراوەیەكی شەرعی هەیە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

## *دانراوەكانیتری دانەر:

١ – هۆنراوەی ﴿ ئیمان و ئیسلام ﴾

٢ – ڕوونكردنەوەی ﴿ الأربعين النواوية ﴾

٣ – ﴿ عەقیدەی ئیسلامی ﴾

٤ – ڕوونكردنەوەی ﴿ العقيدةالطحاوية ﴾

٥ – چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾

٦ – ڕوونكردنەوەی ﴿ متن فتح القريب ﴾

٧ – ڕوونكردنەوەی ﴿ قطرالعارض فی علم الفرائض ﴾

٨ – چۆنیەتی ﴿ حەج و عومرە ﴾

## ناوەڕۆکی بەرگی یەکەمی ﴿ ڕووناکی(رَبُّ الْعالَمين)﴾

# ناوەڕۆکی بەرگی یەکەمی ﴿ ڕووناکی(رَبّ العالَمِین)﴾

## دەربارەی شەریعەتی ئیسلام

١-خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ ﴾ (التوبة:١٢٢)، واتە: دەبوا لە هەر هۆزێكی موسوڵمانان كۆمەڵێك راپەڕیبان بۆ (جیهاد)كردن و كۆمەڵێكیش بۆ خوێندن، تاكو لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن.

٢- پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ يُرِدِاللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ﴾ رواه البخاری ومسلم، واتە: هەر كەسێك خوای گەورە بیەوێ چاكەی بداتێ، لە (شەریعەتی ئیسلام) تێی ئەگەێنێ.

٣-ئیمام (عمر بن الخطاب ﷺ) دەفەرموێ: ﴿ تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا، فَمَنْ سَوَّدَهُ قَومُهُ عَلَى فِقْهٍ، كانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُمْ ﴾ رواه الدارميُّ، واتە: لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن پێش ئەوەی بكرێنە گەورە، چونكە هەر كەسێك (شەرع) بزانێ و گەلەكەی خۆی بیكاتە گەورە، ئەبێتە هۆی ژیانێكی خۆش بۆ خۆی و بۆ ئەوان.

٤- ئیمام (الأعمش) دەفەرموێ: ﴿ يَامَعْشَرَالْفُقَهاءِ أَنْتُمُ الأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَةُ ﴾ رواه الصیمري، واتە: ئەی چینی(شەرعزانان) ئێوە پزیشكن، ئێمەی(حەدیس گێڕەوەش) دەرمانناسی دەرمانخانەین.

٥- ئیمام (الشافعی) دەفەرموێ: ﴿ مَنْ حَفِظَ الْفِقْهَ عَظُمَتْ قِيمَتُهُ وَمَنْ تَعَلَّمَ الْحَدِيثَ قَوِيَتْ حُجَّتُهُ ﴾ رواه ابن حجر الهیتمي، واتە: هەركەسێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا ببێ نرخی بەرز ئەبێتەوە، هەر كەسێك (حەدیس) فێر ببێ بەڵگەی بەهێز دەبێ.

٦-ئیمامی (البخاری) دەفەرموێ: ﴿ هُوَ-أَيَ الْفِقْهُ- ثَمَرَةُ الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ ثَوابُ الْفَقِيهِ دُونَ ثَوابِ الْمُحَدِّثِ ﴾ رواه القسطلاني، واتە: (شەریعەتی ئیسلام) بەرهەمی حەدیسە، پاداشتی (شەرعزان) كەمتر نیە لە پاداشتی (حەدیس گێڕەوە).

# ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين)

## ڕوونکردنەوەی

# «مِنْهَاجِ الطَّالِبِين»

للإمام النواوي

له تێگەیشتنی بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام

لە سەر ڕاڕەوی ئیمامی (الشافعی) رضي الله عنه

**بەرگی دووەم**


دانانی

**عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی**



چاپی پوختەکراو

دانەر بەخۆی پێیدا چۆتەوەو چەند مەسەلەیەکی تێدا زیاد کردون

محرم (١٤٣٠)ی کۆچی

بەفرانبار (٢٧٠٨)ی کوردی

کانونی دووەم (٢٠٠٩)ی زایینی

ژمارەی سپاردنی (١٩٤) ساڵی (٢٠٠١)ز، لە کتێبخانەی گشتی هەولێر، دراوەتێ

## ناسنامە:

**ناوی کیتاب: ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین).**
**بابەت: شەریعەتی ئیسلام.**
**دانەر: عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی.**
**نۆبەتی چاپ: دوایین چاپی پوختەکراو و زێدەکراو.**
**بڵاوکراوەی: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی، لە هەولێر.**
**چاپخانە:** دارالمعرفة بەیرووت

---

## شارەزاکردن:

### ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشیخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.
* رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.
* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ -(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).
٢ -(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهیتمي).
٣ -(نهایةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).
٤ -(مغنیالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطیب الشربیني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ، ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

---

### ئەی قوتابیی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

١- پێشەکیەکە لە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.
٢- بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستای ئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.

## (بابُ صَلاةِ الْمُسافِرِ)

إِنَّما تُقْصَرُ رُباعِيَّةٌ

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

اَلْـحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْـعَالَمِينَ وَالـصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِـينَ.
ئەمەیە بەرگی دووەمی﴿ ڕووناکی (رَبِّ الْعالَمِين) ڕوونکردنەوەی (مِنْهاجِ الطَّالِبِين) ﴾،
خوای گەورە یارمەتیم بدا بۆ تەواوکردنی، آمین.

ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ:

﴿ بابُ صَلاةِالْمُسافِرِ: **باسی چۆنیەتی نوێژی ڕێبوار** ﴾

لە ڕووی (قَصْر)، واتە: کورتکردنەوەی نوێژی چوار ڕەکعەتی، لە ڕووی (جَمْع)، واتە: کۆکردنەوەی دوو نوێژ لە کاتی یەکێکیاندا.

دەربارەی (قَصْر)=کورتکردنەوەی‌نوێژ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾.

﴿عَنْ يَعْلَى بن أُمَيَّةَ: قُلتُ لِعُمَرَ ﷺ: (فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا). وَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ؟ فَقالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ ذلِكَ؟ فَقالَ: صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، بە ئیمامی(عمر)م گوت: خوای‌گەورە دەفەرموێ: (هەر کاتێك بۆ سەفەر ڕۆیشتن گوناهبار نابن ئەگەر نوێژ کورت بکەنەوە، بەو مەرجە: بترسێن کافرەکان زیانتان لێبدەن). خۆ ئێستا خەڵك دڵنیایەو ڕێبوارەکان ناترسێن، ئەی بۆچی نوێژیش کورت ئەکەنەوە؟ ئیمامی(عمر ﷺ) فەرمووی: منیش-وەکو تۆ- پێم سەیر بوو و پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە خێرێکە خوای‌گەورە داویەتە ئێوە، کەوابو: خێرەکەی قبوڵ بکەن.

(إِنَّما تُقْصَرُ رُباعِيَّةٌ) لەو پێنج نوێژانە، تەنها نوێژە چوار ڕەکعەتیەکان کورت دەکرێنەوە بۆ دوو ڕەکعەت، کەواتە: نوێژی مەغریب و سبەینێ کورت ناکرێنەوە، بە بەڵگەی (إجماع)، هەم ﴿عَنْ عَائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: اَلصَّلاةُ أَوَّلَ مافُرِضَتْ رَكْعَتان، فَـأُقِرَّتْ صَلاةُالسَّفَر وَأُتِمَّتْ صَلاةُالْحَضَرِ﴾ رواه الشيخان، زاد أحمد وابن حبان وابن خزيمة: ﴿إلاّالْمَغْرِبَ فَإِنَّها وِتْرُ النَّهارِ، وَإلاّالصُّبْحَ فَإِنَّها تُطَوَّلُ فِيها الْقِراءَةُ﴾. یەکەمجار پێنج نوێژەکان دوو ڕەکعەت دوو ڕەکعەت واجب کران، ئینجا لە سەفەردا نوێژەکان وەك خۆیان بە دوو ڕەکعەتی مانەوەو لە ماڵەوەشدا تەواو کران، تەنها نوێژی مەغریب لە ماڵەوەو لە سەفەردا بە سێ

مُؤَدَّاةٌ فِي السَّفَرِ الطَّوِيلِ الْمُباحِ لاَ فائِتَةُ الْحضَرِ، وَلَوْ قَضَى فائِتَةَ السَّفَرِ فَالأَظْهَرُ قَصْرُهُ فِي السَّفَرِ دُونَ الْحضَرِ، وَمَنْ سافَرَ مِنْ بَلْدَةٍ فَأَوَّلُ سَفَرِهِ مُجاوَزَةُ سُورِها، فَإِنْ كانَ وَرَاءَهُ عِمارَةٌ اُشْتُرِطَ مُجاوَزَتُها فِي الأَصَحِّ،

---

ڕەکعەتی واجب کرا چونکە وەتری ڕۆژیە، نوێژی سبەینێش هەر دوو ڕەکعەتە چونکە خوێندنی قورئانی تێدا درێژ دەکرێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەو حەدیسەی دەفەرموێ: ﴿نوێژ لە کاتیترسدا یەك ڕەکعەتە﴾ مەبەست ئەوەیە: ڕەکعەتێکی بە جەماعەت دەکرێو ئەویتریشی بە تەنهایی، هەروەك لە سەرچاوەکان فەرموویانە، لە نوێژیترسدا ڕوونی دەکەینەوە إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(مُؤَدَّاةٌ) مەرجە نوێژە کورتکراوەکە: (أداء) بێ، واتە: نوێژی ئەو کاتە بێ (فِي السَّفَرِ الطَّوِيلِ) کورتکردنەوەکەش لە سەفەرێکی درێژ بێ، کە لای کەمی ئەندازەی (٨٠) هەشتا کیلۆمەتر درێژ بێ (الْمُباحِ) سەفەرەکەش سەفەرێکی حەڵاڵ بێ، واتە: سەفەری تاوانباری نەبێ (لاَ فائِتَةُ الْحضَرِ) نوێژەکە فەوتاویماڵەوە نەبێ، واتە: ئەگەر لە ماڵەوە نوێژی فەوتابو، دروست نیە: لە سەفەردا بە کورتکراوەیی قەزای بکاتەوە، چونکە بە تەواوی کەوتۆتە ئەستۆی، کەوابو: واجبە لە ماڵەوەو لە سەفەردا بە تەواوی قەزای بکاتەوە.

بەڵام (وَلَوْ قَضَى فائِتَةَ السَّفَرِ) ئەگەر نوێژە فەوتاوێکی سەفەرێکی درێژی قەزا کردەوە، واتە: لە سەفەرێکیدرێژدا نوێژەکەی فەوتابو، جا ویستی قەزای بکاتەوە، ئەوە (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (قَصْرُهُ فِي السَّفَرِ) دروستە: لەم سەفەرەدلو لە سەفەرێکیتری درێژیشدا نوێژە قەزاکراوەکەش کورت بکاتەوە، چونکە لە هەردوو حاڵەتی فەوتانو قەزاکردنەوەدا عوزری بە دەستە (دُونَ الْحضَرِ) بەڵام لە ماڵەوە دروست نیە نوێژە قەزاکراوەکە کورت بکاتەوە، چونکە عوزری نەماوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر کاتی نوێژەکە هاتبو، بەڵام لە ماڵەوە نوێژەکەی نەکردو ڕۆیشتە سەفەر، ئەوە بۆی دروستە: لە ڕێگەدا ئەم نوێژەش کورت بکاتەوە، هەروەها ئەگەر لە کۆتاییکاتەکەشدا–بە قەد نوێژکردنەکە– کاتینوێژەکە مابو و ڕۆیشتە سەفەر، دروستە: لە ڕێگەدا ئەم نوێژەش کورت بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: دروست نیە ڕێبوار نوێژ کورت بکاتەوە، تا دەست بە سەفەر دەکاو لە شوێنی نیشتەجێبوونی جیا دەبێتەوە، کەوابو: (وَمَنْ سافَرَ مِنْ بَلْدَةٍ) هەر کەسێك لە شارێکەوە بڕواتە سەفەر (فَأَوَّلُ سَفَرِهِ) ئەوە سەرەتای سەفەرەکەی (مُجاوَزَةُ سُورِها) تێپەڕبوونە لە شوورەی شارەکە، ئەگەر شوورەی هەبێ (فَإِنْ كانَ وَرَاءَهُ عِمارَةٌ) جا ئەگەر لەو دیوی شوورەکەش خانوو هەبن (اُشْتُرِطَ مُجاوَزَتُها فِي الأَصَحِّ) بە مەرج دانراوە:

قُلْتُ: اَلأَصَحُّ لاَ يُشْتَرَطُ وَاللهُ أَعْلَمُ. فَإِنْ لَمْ يَكُنْ سُورٌ فَأَوَّلُهُ مُجاوَزَةُالْعُمْرانِ لاَالْخَرَابِ وَالْبَسَاتِينِ، والْقَرْيَةُ كَبَلْدَة، وَأَوَّلُ سَفَرِ ساكِنِ الْخِيامِ مُجاوَزَةُالْحِلَّة، وَإِذا رَجَعَ انْتَهى سَفَرُهُ بِبُلُوغِهِ مَا شُرِطَ مُجَاوَزَتُهُ إِبْتِداءً،

---

لە خانووەکانیش تێبپەڕێ (قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (الأَصَحُّ لاَ يُشْتَرَطُ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: بە مەرج دانانرێ لەم خانووانەش تێبپەڕێ (وَاللهُ أَعْلَم) بەڵکو هەر کاتێك لە شوورەکە چووە دەرەوە، سەفەرەکەی دەست پێدەکاو دروستە نوێژ کورت بکاتەوە.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ سورٌ) بەڵام ئەگەر شارەکە شوورەی نەبو-وەك شارەکانی ئەم سەردەمە- (فَأَوَّلُهُ) ئەوە سەرەتایسەفەرەکەی (مُجاوَزَةُ الْعُمْرانِ) تێپەڕبوونە لە ئاوەدانیشارەکە: وەك خانوو و یاریگەی منداڵانو ئەو گۆڕستانەی بە ئاوەدانیەوەیە، هەر وەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە (لاَ الْخَرَابِ) بەڵام مەرج نیە لەو کاولە خانووانە تێبپەڕێ: کە بناغەیان نەماوە، یان کراونەتە باغو بێستان (والْبَسَاتِينِ) هەروەها مەرج نیە لە باغو بێستانی شارەکەش تێبپەڕێ، هەرچەند کۆڵیتو خانووشی تێدابێو لە چەند وەرزێکی ساڵدا خەڵکەکە تێیدا نیشتەجێ ببێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر لە شار-بۆ سەفەر- چونە دەرەوەو لە دەرەوەی شار چاوەڕوانی هاوڕێکانیان دەکرد، ئەوە ئەگەر نیەتیان وەها بێ: هەر کاتێك هاوڕێکانیان هاتن گشتیان بۆ سەفەر بڕۆن، ئەگەر نەهاتن بگەڕێنەوە، ئەوە دروست نیە لەوێ نوێژ کورت بکەنەوە؟ چونکە بە تەواوی بڕیاری سەفەریان نەداوە، بەڵام ئەگەر نیەتیان ئەوەبو: ئەگەر هاوڕێکانیشیان نەیێن، ئەوان هەر بڕۆن بۆ سەفەر، ئەو کاتە دروستە لەوێ نوێژ کورت بکەنەوە؟ چونکە بە تەواوی بڕیاریان داوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالْقَرْيَةُ) دێ، واتە: ئەو گوندەی لە شار بچووکترە (كَبَلْدَة) وەکو شار وایە: لە گشت ئەو بڕیارانەیڕابردوودا (وَأَوَّلُ سَفَرِ ساكِنِ الْخِيامِ) سەرەتای سەفەری ئەو کەسەی لە ڕەشماڵدا نیشتەجێیە: وەکو خێڵانو ڕەوەندەکان (مُجاوَزَةُالْحِلَّة) تێپەڕبوونە لە هۆبە ڕەشماڵەکە، واتە: لە گشت خێمەو یاریگەی منداڵانو مۆڵگەی ئاژەڵەکانو شوێنی ئاو لێهێنانی تایبەت بە خۆیان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِذا رَجَعَ) هەر کاتێك ڕێبوار لە سەفەرەکەی گەڕاوە (انْتَهى سَفَرُهُ) ئەوە سەفەرەکەی کۆتایی دێ (بِبُلُوغِهِ) بەوەی بگاتەوە (مَا شُرِطَ مُجاوَزَتُهُ ابْتِداءً) ئەو شوێنەی بە مەرج دانرابو لە سەرەتای سەفەرەکەی لێی تێبپەڕێ، واتە: کە لە گەڕانەوەی گەیشتەوە ئەوێ، هیچیتر دروست نیە نوێژ کورت بکاتەوە، هەرچەندە نەشگەیشتبێتەوە ماڵیخۆی.

وَلَوْ نَوَى إِقَامَةَ أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ بِمَوْضِعٍ إِنْقَطَعَ سَفَرُهُ بِوُصُولِه، وَلاَ يُحْسَبُ مِنْهَا يَوْما دُخُولِـه وَخُرُوجِه عَلَى الصَّحِيحِ،

ئینجا بزانە: ئەوە لە کاتێکدا بوو: کە لایکەمی ئەندازەی (٨٠) هەشتا کیلۆمتر ڕۆیشتبێ، بەلاّم ئەگەر ئەندازەی (٨٠) هەشتا کیلۆمتر نەڕۆیشتبو، واتە: لە ئەندازەیەکی کەمتر بۆ پێویستیەکیخۆی گەڕاوە، ئەوە ئەگەر بۆ وولاتیخۆی بگەڕێتەوە، هەر بە دەست پێکردنی گەڕانەوەکە سەفەرەکەی کۆتایی دێو کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروست نیە، بەلاّم ئەگەر بۆ شوێنێکیتر گەڕاوە -کە وولاتیخۆی نەبو- ئەوە هەر بە ڕێبوار دادەندرێو کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروستە، بەو مەرجەی بە نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژان نەگەڕێتەوە، ئەگینا: ئەویش هەر بە نیەتهێنانی گەڕانەوە سەفەرەکەی کۆتایی دێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کرانەوە.

(وَلَوْ نَوى إِقَامَةَ أَرْبَعَةِأَيَّامٍ بِمَوْضِعٍ) ئەگەر ڕێبوارێك نیەتی وەهابو: چوار ڕۆژ بە شەوەکانیانەوە، یان زیاتر لە شوێنێك بمێنێتەوە (اِنْقَطَعَ سَفَرُهُ) ئەوە سەفەرەکەی کۆتایی دێ (بِوُصُولِهِ) بە گەیشتنەجێی ئەو شوێنە (وَلاَ يُحْسَبُ مِنْها) لەو چوار ڕۆژانە ناژمێردرێ (يَوْما دُخُولِهِ وَخُرُوجِهِ) ئەو ڕۆژەی دەچێتە شوێنەکەو ئەو ڕۆژەی لێی دەردەچێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست، واتە: جگە لەم دوو ڕۆژانە، چوار ڕۆژو شەوی تەواو بێ، کەواتە: ئەگەر نیەتی مانەوەی سێ ڕۆژ، یان کەمتری هەبێ، ئەوە سەفەرەکەی کۆتایی نایێو کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروستە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿يُقِيمُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاَثًا﴾رواه الشيخان، سەحابە کۆچکەرەکان -لە دوای حەج کردن- تەنها سێ ڕۆژان لە (مكة)دا دەمێننەوە.

واتە: پێغەمبەرﷺ پێش (فتح مكة)، قەدەغەی کردبو سەحابە کۆچکەرەکان لە (مكة)دا نیشتەجێ بن -هەروەك لە (بخاریو مسلم)دا هاتوە- بەلاّم چونکە مانەوەی سێ ڕۆژان بە نیشتەجێیی دانانردێ، پێغەمبەرﷺ ڕێگەی داوە، کەوابو: بە مانەوەی سێ ڕۆژان بڕیاری ڕێبواریی لە سەر لاناچێ، بەلاّم بە چوار ڕۆژان لادەچێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾ یەکەم: هەر بە بەلگەی ئەو حەدیسە: ئەگەر حاجی بە چوار ڕۆژان پێش وەستانی(عَرَفَة) گەیشتە ناو شاری(مَكَّة)، ئەوە هیچیتر (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروست نیە: نە لە (مَكَّة)و نە لە(عَرَفَة)و نە لە(مُزْدَلِفَة)و نە لە(مِنى)؟ چونکە بوەتە نیشتەجێ، بەلاّم ئەگەر بە دوو ڕۆژان، یان سێ ڕۆژان پێش وەستانی(عَرَفَة) گەیشتە (مَكَّة)، ئەوە (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروستە: لە (مَكَّة)وە تا لە دوای ڕەجمی هەرسێك شەیتانەکان لە (مِنى) دەگەڕێتەوە بۆ

وَلَوْ أَقامَ بِبَلَد بِنيَّة أَنْ يَرْحَلَ إِذَا حَصَلَتْ حَاجَةٌ يَتَوَقَّعُهَا كُلَّ وَقْتٍ قَصَرَ ثَمَانِيَةَعَشَرَ يَوْماً، وَقِيلَ أَرْبَعَةً، وَفِي قَوْلٍ أَبَداً، وَقِيلَ الْخِلافُ فِي خَائِفِ الْقِتَالِ،

---

(مكّة)، ئینجا-له دوای گەڕانەوەی له (مِنی)- تەماشا دەکەین: ئەگەر نیەتی ئەوەبێ: چوار ڕۆژان، یان زیاتر له (مكّة)دا بمێنێتەوە، ئەوە هیچیتر (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروست نیە، بەڵام ئەگەر نیەتی مانەوەی کەمتر له چوار ڕۆژانی هەبو، ئەو کاتە (قَصْر)و(جَمْع)ی بۆ دروستە، هەروەك له (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر بە سەفەر چووە شوێنێك-کە هەشتا کیلۆمتر، یان زیاتر دوور بوو- بە مەبەستی ئەوە: ئەگەر لەوێ بگاتە فلانکەس لەگەڵی بمێنێتەوە تا چوار ڕۆژان، یان زیاتر، بەڵام ئەگەر نەیگاتێ، ئەو کاتە کەمتر له چوار ڕۆژان بمێنێتەوەو بگەڕێتەوە، ئەوە بۆی دروستە: نوێژ کورت بکاتەوە تا لە شوێنەکە دەگەڕێتەوە، ئینجا ئەگەر لەوێ گەیشتە فلانکەس، ئەوە هیچیتر کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروست نیە تا لەو شوێنە بە سەفەر دەڕواتە دەرەوە، هەروەك له (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ أَقامَ بِبَلَد) ئەگەر ڕێبوار بۆ کارێك لە شوێنێك مایەوە (بِنِيَّةِ أَنْ يَرْحَلَ) بەو نیەتەی لەو شوێنە بار بکا (إِذَا حَصَلَتْ حَاجَةٌ) هەر کاتێك کارەکەی بۆ پێك هات، کارەکەشی لەو جۆرە بوو: کە (يَتَوَقَّعُهَا كُلَّ وَقْتٍ) چاوەڕوانی پێکهاتنی دەکرد لە گشت کاتێکداو نەیدەزانی دەگاتە چوار ڕۆژان (قَصَرَ ثَمَانِيَةَ عَشَرَ يَوْماً) ئەوە دروستە هەژدە ڕۆژی تەواو نوێژ کورت بکاتەوە، واتە: جگە له ڕۆژی هاتنو دەرچوون ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَقامَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَكَّةَ تِسْعَةَعَشَرَ يَوْماً يَقْصُرُ﴾رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ نۆزدە ڕۆژان لە (مكّة)دا مایەوەو نوێژی کورت دەکردەوە. واتە: ڕۆژی نۆزدەمین بۆ هاتنو دەرچوون داندراوە، چونکە له حەدیسی(أبيداود بسندحسن) بە هەژدە ڕۆژ هاتوە.

بەڵام ئەگەر دەیزانی تا کارەکەی پێك دێ چوار ڕۆژ تەواو دەبن، ئەو کاتە لەو شوێنەدا کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروست نیە، هەروەك له سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَقِيلَ أَرْبَعَةً) له فەرمووەیەکی بێهێزدا: تەنها چوار ڕۆژان نوێژ کورت دەکاتەوە (وَفِي قَوْلٍ أَبَداً) له فەرموودەیەکیتری ئیمامی(الشافعي)دا: تا کارەکەی پێك دێ بەردەوام نوێژ کورت دەکاتەوە (وَقِيلَ) له فەرموودەیەکی بێهێزدا (الْخِلافُ) جیاوازی ئەو فەرموودانەی ڕابردوو: له چوار ڕۆژان زیاتر (فِي خَائِفِ الْقِتَالِ) دەربارەی ئەو جەنگاوەرەیە: کە بۆ جەنگێکی شەرعی بە سەفەر چوبێو مەترسی هەڵگیرسانی جەنگی هەبێ، بە بەڵگەی ﴿عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ أَقامَ بِآذربيجان سِتَّةَ أَشْهُرٍ يَقْصُرُالصَّلاَةَ﴾ رواه البيهقي بسندصحيح، (ابْن عمر)رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا ماوەی شەش مانگ بۆ غەزا لە (آذربیجان) مایەوە، نوێژی کورت دەکردەوە.

لاَ السَّاجِرِ وَنَحْوِهِ، وَلَوْ عَلِمَ بَقَائَهَا مُدَّةً طَوِيلَةً فَلاَ قَصْرَ عَلَى الْمَذْهَبِ.
(فَصْلٌ) وَطَوِيلُ السَّفَرِ ثَمَانِيَةٌ وَأَرْبَعُونَ مِيلاً هَاشِمِيَّةً، قُلْتُ: وَهُوَ مَرْحَلَتَانِ بِسَيْرِ الأَثْقَالِ،

---

(لاَالتَّاجِرِ وَنَحْوِهِ) نەك دەربارەی بازرگانو قوتـابیو ئـەو جـۆرە كەسانە، واتـە: ئەوانـە لـە چوار ڕۆژان زیاتر نوێژ كورت ناكەنەوە.
(وَلَوْ عَلِمَ بَقَائَهَا مُدَّةً طَوِيلَةً) ئەگـەر ڕێبـواری جـەنگاوەر دەیزانـی: كارەكـەی ماوەیـەكی درێـژ دەمێنێتەوە، واتە: چـوار ڕۆژان، یـان زیـاتر دەڕوا، تـا كارەكـەی پێـك دێ (فَلاَ قَصْرَ) ئـەوە كورتكردنەوەی نوێژی بۆ دروست نیە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.
كەوابو: حەدیسەكەی(ابْن عمر)ی ڕابردوو و هـەم ئـەم حەدیسـەی﴿أَنـس﴾: أَنَّ أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِﷺ أَقَامُوا بِرامهُرمز تِسْعَةَأَشْهُرٍ يَقْصُرُونَ الصَّلاَةَ﴾رواه البيهقي بسندصحيح، (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ نۆ مانگ لە (ڕامهرمز) بۆ غەزا مانەوەو نوێژیان كورت دەكردەوە.
لە لای فەرموودەی ڕاستتر وەڵامی ئـەو دوو حەدیسـە دراوەتـەوە: كـە (صـحابە)كـانﷻ لـەو ماوەیـەدا تـەنها لـە یـەك شـوێنی ئـەو ناوچـەیەدا نەدەمانـەوە، بـەڵكو لەچـەند شـوێنێكی ناوچـەكەدا دەگـەڕانو هێرشـیان دەبـردە سـەر كافرەكـان، هـەروەك لـە (المجمـوع)دا ڕوون كراوەتەوە، كەوابو: ئەو دوو حەدیسە نابنە بەڵگەی فەرموودە بێهێزەكانی ڕابردوو،وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەكانی (قَصْر) ؛ كورتكردنەوەی نوێژ ﴾

مەرجەكانی كورتكردنەوەی نوێژ، هەشتن:
مەرجی یەكەم: دەبێ سەفەرەكەی درێژ بێ (وَطَوِيلُ السَّفَرِ) ئەندازەی سـەفەری درێـژ بـە پێوانەی زەمین (ثَمَانِيَةٌ وَأَرْبَعُونَ مِيلاً هَاشِمِيَّةً) چلو هەشت میلی هاشمیـیە، واتـە: شـانزە فەرسەخ، كە دەكاتە (٨٠) هەشتا كیلۆمترو نیو كیلۆمترو سەدو چل مـتر (قُلْتُ) ئیمـامی (النواوی) دەفەرموێ (وَهُوَ) ئەندازەی سەفەری درێـژ بـە ڕۆیشـتن (مَرْحَلَتَانِ) دوو قۆناغـە، واتـە: دوو ڕۆژ، یـان دوو شـەو، یـان ڕۆژێـكو شـەوێك، كـە بگەنـە ئەنـدازەی بیسـتو چـوار سەعات، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.
جا ڕۆیشـتنەكەش (بِسَيْرِ الأَثْقَالِ) بـەگوێرەی ڕۆیشـتنی ووڵاغـە باركراوەكـانو پشـوودانو نوێژكردنە ﴿عَنْ ابنِ عُمرَ وَابنِ عَبَّاسﷺ: أَنَّهُمَا كَانَا يَقْصُرانِ وَيُفْطِرانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ، وَهِـيَ سِتَّةَعَشَرَ فَرْسَخاً﴾ رواه البخاري تعليقا والبيهقي باسنادصحيح، ئـەو دوو (صـحابە)یـە لـە سەفەردا لـە ئەنـدازەی چـوار بەریـد، واتـە: شـانزە فەرسـەخ، نوێژیان كـورت دەكـردەوەو بەڕۆژووش نەدەبون.
جا بزانـە: لـەم مەسـەلەیەدا هـیچ (صـحابە)یـەك جیـاوازیی لەگـەڵ ئـەو دوو (صـحابە)یـە نەبوە، وا دیارە لە پێغەمبەرەوەﷺ بەڵگەیان بە دەستەوە بـووە، واتـە: بووەتـە (الإجمـاع السكوتي)، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

وَالْبَحْرُ كالْبَرِّ، فَلَوْ قَطَعَ الأَمْيالَ فِيهِ فِي ساعَةٍ قَصَرَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُشْتَرَطُ قَصْدُ مَوْضِعٍ مُعَيَّنٍ أَوَّلاً،

---

ئینجا بزانه: به بهڵگهی حهدیسهکهی (ابن عباس)ی‌داهاتوو، مهرجه: ئهو شوێنهی به سهفهر بۆی دهچێ تهنها چوونهکهی دوو قۆناغ دوور بێ، نهك چوونو هاتن، واته: ئهگهر چوونهکهی قۆناغێك بوو، هاتنهوهشی قۆناغێك بوو، ئهوه کورتکردنهوهی نوێژی بۆ دروست نیه، ههروهك له سهرچاوهکاندا ڕوون کراوهتهوه.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئهم حهدیسهی ﴿أنس‌ﷺ: كَانَ رَسُول اللهِ ﷺ إذا خَرَجَ ثَلاثَةَ أَمْيالٍ أَوْ فَرَاسِخَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ﴾رواه مسلم، ههر کاتێك پێغهمبهرﷺ سێ میل، یان سێ فهرسهخ دهچووه دهرهوه، نوێژی دهکردهوه دوو ڕهکعهت. مهبهست ئهوه نیه: سهفهرهکهی تهنها سێ فهرسهخ دوور بووه، بهڵکو مهبهستی ئهوهیه: که پێغهمبهرﷺ بۆ سهفهرێکی دوور دهڕۆیشت، سێ میل، یان سێ فهرسهخ له (مدینة) دوور دهکهوتهوه، کاتی نوێژ دههاتو لهوێ نوێژی کورت دهکردهوه، ههروهك ئیمامی (النواوي) له (شرح مسلم) و (المجموع)دا ئهوهای فهرمووه.

ههم له (المجموع)دا دهفهرموێ: (له هیچ حهدیسێکدا به ئاشکرایی نههاتوه: که له ئهندازهی کهمتر له دوو قۆناغ پێغهمبهرﷺ نوێژی کورت کردبێتهوه، بهڵگهشی حهدیسهکهی (ابْن عمر وابْن عباس)ی‌ڕابردوه، ههم ﴿عَنْ عَطَا: سُئِلَ ابنُ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: أَأَقْصُرُ الصَّلاةَ إِلَى عَرَفَةَ؟ فَقالَ: لاَ، وَلَكِنْ إِلَى عُسْفَانَ وَإِلَى جِدَّةَ وَإِلَى الطَّائِفِ﴾ رواه الشافعي والبيهقي باسناد صحيح، پرسیار له (ابن عباس) کرا: ئایا که له (مكة) چوومه (عرفة) نوێژ کورت بکهمهوه؟ فهرمووی: نا، بهڵام که چوویه (عسفان)، یان (جدة)، یان (الطائف) نوێژ کورت بکهوه. واته: ههریهك لهو سێیانه لای کهم شانزه فهرسهخ=ههشتا کیلۆمهتر دوورن له (مكة)ی پیرۆز.

(وَالْبَحْرُ كالْبَرِّ) دهریا وهکو بیابان وایه: له مهرجی‌ئهندازهی ههشتا کیلۆمهتری‌ڕابردوودا (فَلَوْقَطَعَ الأَمْيالَ فِيهِ فِي ساعَةٍ) ئهگهر له دهریادا چڵو ههشت میلهکه=ههشتاکیلۆمهترهکه له یهك سهعاتدا به کهشتی، یان به مهلهوانی ڕۆیشت (قَصَرَ) دروسته نوێژ کورت بکاتهوه، ههروهها ئهگهر به یهك سهعات ههشتا کیلۆمهتر به ئۆتۆمبیل له زهمیندا، یان به فڕۆکه له ههوادا ڕۆیشت دروسته: نوێژ کورت بکاتهوه، وَاللهُ أَعْلَم.

مهرجی‌دووهم: (وَيُشْتَرَطُ) به مهرج دادهندرێ (قَصْدُ مَوْضِعٍ مُعَيَّنٍ) سهفهرهکهی به مهبهستی چوونه شوێنێکی زاندراو بێ: له ڕووی ڕۆیشتنهوه (أَوَّلاً) له سهرهتاوه، واته: ههر له سهرهتای سهفهرهکهی بزانێ لای‌کهم به ئهندازهی ههشتا کیلۆمهتر دهڕوا، ئیتر

فَلاَ قَصْرَ لِلْهائِمِ وَإِنْ طَالَ تَرَدُّدُهُ، وَلاَ طَالِب غَرِيمٍ وَآبِق يَرْجِعُ مَتَى وَجَدَهُ وَلاَ يَعْلَمُ مَوْضِعَهُ، وَلَوْ كَانَ لِمَقْصِده طَرِيقانِ: طَوِيلٌ وَقَصِيرٌ فَسَلَكَ الطَّوِيلَ لِغَرَضٍ كَسُهُولَةٍ أَوْ أَمْنٍ قَصَرَ، وَإِلاَّ فَلاَ فِي الأَظْهَرِ،

---

مەرج نیە بزانێ: بۆ کام شار دەڕوا، یان ناوی شوێنەکە بزانێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: (فَلاَ قَصْرَ لِلْهائِمِ) نوێژ کورتکردنەوە دروست نیە: بۆ ڕێبواری سەر لێشێواو، واتە: ئەو کەسەی نازانێ بۆ کوێ دەڕوا (وَإِنْ طَالَ تَرَدُّدُهُ) هەرچەند گەڕان و ڕۆیشتنیشی بە ئەندازەیەکی درێژ بێ و لە هەشتا کیلۆمەتر زیاتر بێ، چونکە لە سەرەتاوە نەیزانیوە مەبەستی لەو ڕۆیشتنە چەندە، واتە: بەڵام ئەگەر سەرلێشێواو لە سەرەتاوە مەبەستی بێ: لایکەمی هەشتا کیلۆمەتر بڕوا، بۆی دروستە نوێژ کورت بکاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ طَالِبِ غَرِيمٍ) هەروەها نوێژ کورتکردنەوە دروست نیە: بۆ ئەو کەسەی بە شوێن قەرزدارێکدا دەگەڕێ و (وَآبِقٍ) هەم بۆ ئەو کەسەش کە بە شوێن کۆیلەیەکی هەڵاتوودا، یان بە شوێن شتێکی دزراودا دەگەڕێ، کە هەر یەکێك لەوانە مەبەستی ئەوها بێ: (يَرْجِعُ) بگەڕێتەوە (مَتَى وَجَدَهُ) هەر کاتێك قەرزدارەکەی، یان کۆیلەکەی، یان دزراوەکەی دۆزیەوە (وَلاَ يَعْلَمُ مَوْضِعَهُ) لە سەرەتاوەش شوێنی قەرزدارەکەی، یان کۆیلەکەی، یان دزراوەکەی نەدەزانی، واتە: بەڵام ئەگەر ئەو ڕێبوارە لە سەرەتاوە دەیزانی پێویستە لای کەم هەشتا کیلۆمەتر بڕوا ئینجا دەگاتە مەبەستەکەی، ئەو کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروستە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ كَانَ لِمَقْصِدِهِ طَرِيقانِ) ئەگەر هاتو بۆ ئەو شوێنەی مەبەستیەتی، دوو ڕێگە هەبون: (طَوِيلٌ) ڕێگەیەکیان هەشتا کیلۆمەتر، یان زیاتر درێژ بوو (وَقَصِيرٌ) ڕێگەیەکیش کورت بوو: نەدەگەیشتە هەشتا کیلۆمەتر (فَسَلَكَ الطَّوِيلَ) ڕێبوارەکەش بە ڕێگە درێژەکەدا ڕۆیشت (لِغَرَضٍ) لە بەر هۆیەکی حەڵاڵ (كَسُهُولَةٍ) وەك درێژەکە ئاسان بێ، یان کرێیەکەی هەرزان بێ، یان ئاو و خواردەمەنیی لێبێ (أَوْ أَمْنٍ) یان دڵنیابێ: لە ڕێگرو گومرگ و دوژمنی خۆی، یان مەبەستی کڕین و فرۆشتن بێ، یان سەردانی نەخۆش و خزم و کەسی بێ (قَصَرَ) بۆی دروستە نوێژ کورت بکاتەوە، چونکە مەرجەکە هاتوتەجێ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بە هۆیەکی حەڵاڵ بەڕێگە درێژەکەدا نەڕۆیشت، بەڵکو بە بێ‌هۆ، یان تەنها بە مەبەستی کورتکردنەوەی نوێژ بە درێژەکەدا ڕۆیشت (فَلاَ) دروست نیە: نوێژ کورت بکاتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام ئەگەر بۆ شوێنەکە دوو

وَلَوْ تَبِعَ الْعَبْدُ أَوالزَّوْجَةُ أَوالْجُنْدِيُّ مَالِكَ أَمْرِهِ فِي‌السَّفَرِ وَلاَ يَعْرِفُ مَقْصِدَهُ فَلاَ قَصْــرَ، فَلَوْ نَوَوْا مَسَافَةَالْقَصْرِ قَصَرَالْجُنْدِيُّ دُونَهُمَا، وَمَنْ قَصَدَ سَفَراً طَوِيلاً فَسَارَ ثُــمَّ نَــوَى رُجُوعاً انْقَطَعَ،

---

ڕێگەی درێژ هەبون، واتە: هەردووکیان لای کەم هەشتا کیلومتر دەبون، بەڵام یەکێکیان لەوی‌تر درێـژتر بـوو، ئـەویش بە بێ‌هیچ هۆیـەك بـە درێژترەکـەدا ڕۆیشـت، ئـەوە بـۆی دروستە: نوێژ کورت بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَـوْ تَبِـعَ الْعَبْـدُ) ئەگـەر کۆیلـە ڕەگـەڵ گەورەکـەی کـەوت (أَوالزَّوْجَـةُ) یـان ژن ڕەگـەڵ مێردەکەی کەوت (أَوْ الْجُنْدِيُّ مَالِكَ أَمْرِهِ) یـان سـەرباز ڕەگـەڵ کاربەدەسـتی خـۆی کـەوت، یان دیل ڕەگەڵ دیلگرەکەی کەوت (فِي‌السَّفَرِ) ڕەگەڵکـەوتنی ئەوانـەش لـە سـەفەردا بـوو، بـەڵام (وَلاَ يَعْـرِفُ مَقْصِـدَهُ) هیچێکیان مەبەسـتی کاربەدەسـتی‌خۆی نـەدەزانی ئایا چـەند دەرواو دەچێتە کـوێ (فَـلاَ قَصْـرَ) هیچێکیان پـێش ڕۆیشـتنی دوو قۆنـاغ کورتکردنـەوەی نوێژیان بۆ دروست نیە، واتـە: بـەڵام ئـەگـەر هەشـتا کیلـۆمتر ڕۆیشـتن، ئـەوە لەمـەودوا بـۆ گشـتیان دروسـتە: نوێـژ کـورت بکەنـەوە، چونکە تـازە مەبەسـتی کاربەدەستەکەیان بـۆ ئاشکرا بوو، کـەوابو: ئەگـەر لـە سـەرەتاوە ئـەوانیش دەیـانزانی لای کـەم هەشـتا کیلـۆمتر دەڕۆن، دروستە ئەوانیش نوێژ کورت بکەنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَلَوْ نَوَوْا مَسَـافَةَ الْقَصْرِ) جـا ئەگـەر ئەوانـەی‌ڕابردوو، نیـەتیان هـەبو: بـە ئەنـدازەی (قَصْـرِ) کورتکردنەوەی‌نوێژ–کە هەشتا کیلۆمترە– بڕۆن (قَصَرَالْجُنْدِيُّ) تـەنها سـەربازی تۆمارنـەکراو نوێژ کورت دەکاتەوە، چونکە لە کارەکانی‌دا سـەربەخۆیەو ژێـر دەسـت نیـە (دُونَهُمَـا) بـەڵام ژن‌و کۆیلـە–هـەروەهاش دیـل– بـۆ هیچـیان دروسـت نیـە نوێـژ کـورت بکەنـەوە، چـونکە سەربەخۆ نین‌و ژێر دەستن، کەوابو: نیەتەکەیان کار ناکا.

ئینجا بزانە: لێرەدا مەبەست ئەو سەربازەیە: کـە بـە خۆشـی خـۆی ڕەگـەڵ کاربەدەسـتێك کەوتبێ، نەك ئەو سـەربازەی لـە تۆمارگـەی لەشـکردا نـاونووس کـراوە، چـونکە سـەربازی تۆمـارکراویش –وەکـو ژن‌و کۆیلـە– ژێـر دەسـتەو سـەربەخۆ نیـە، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَـنْ قَصَـدَ سَـفَراً طَـوِيلاً) هەرکەسێك ویسـتی بڕواتـە سـەفەرێکی درێـژ، واتـە: هەشـتا کیلۆمتر، یان زیاتر (فَسَارَ) جا بۆ سـەفەرەکە ڕۆیشـت (ثُـمَّ نَـوَى رُجُوعـاً) ئینجا لـە ڕێگـەدا نیـەتی گەڕانـەوەی هێنـا، یـان کەوتـە دوو دڵـی: ئایا بگەڕێتـەوە، یـان نـا (انْقَطَـعَ) لـەو شـوێنەوە، لـە کـاتی نیەتەکـەی‌دا سـەفەرەکەی دەپچـڕێ‌و تـا لـەو شـوێنەدا بمێنێتـەوە دروست نیە هیچی‌تر نوێژ کورت بکاتەوە.

فَإِنْ سَارَ فَسَفَرٌ جَدِيدٌ، وَلاَ يَتَرَخَّصُ الْعَاصِي بِسَفَرِهِ كَآبِقٍ وَنَاشِزَةٍ، فَلَوْ أَنْشَأَ مُبَاحاً ثُمَّ جَعَلَهُ مَعْصِيَةً فَلاَ تَرَخُّصَ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ أَنْشَأَهُ عَاصِياً ثُمَّ تَابَ فَمُنْشِئٌ لِلسَّفَرِ مِنْ حِينِ التَّوْبَةِ،

---

بەلام (فَإِنْ سَارَ) ئەگەر لەو شوێنە ڕۆیشتە شوێنێکیتر (فَسَفَرٌ جَدِيدٌ) ئەوە سەفەرێکی نوێ دەست پێدەکا، واتە: ئەگەر مەبەستی بوو: لێرە بەو لاوە هەشتا کیلۆمەتریتر، یان زیاتر بڕوا، دروستە نوێژ کورت بکاتەوە، ئەگەر نا: نا، جیاوازی نیە ڕۆیشتنە نوێیەکەی: بۆ وولاتی خۆی بێ، یان بۆ شوێنێکیتر، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

مەرجیسێیەم: سەفەرەکەی حەرام نەبێ، کەوابو: (وَلاَيَتَرَخَّصُ) ڕوخسەت وەرناگرێ، واتە: کورتکردنەوەی نوێژ دروست نیە: بۆ (الْعَاصِي بِسَفَرِهِ) ئەو کەسەی بە سەفەر چوونەکەی گوناهباری بێ (كَآبِقٍ) وەك کۆیلەی هەلاتوو (وَنَاشِزَةٍ) هەم ژنی ناشیزە، واتە: بە بێئیزنی مێردەکەی بۆ سەفەر بچێ، هەم ئەو قەرزدارەی توانای قەرزدانەوەی هەیەو بە بێڕەزامەندی خاوەن قەرزەکەی بە سەفەر بچێ، هەم ئەو کەسەی بۆ ڕێگری، یان بۆ کوشتنی بە ناهەق، یان بۆ هەر گوناهێکیتر بە سەفەر بچێ، هەم ئەو کەسەی تەنها بە مەبەستی شار دیتن شارەوشار دەگەڕێ، ئەوانە هیچیان نوێژ کورتکردنەوەیان بۆ دروست نیە، چونکە ڕوخسەتەکانی شەرعی نادرێنە مرۆڤی گوناهبار، هەروەك خوایگەورە دەربارەی ڕوخسەتی مردارخواردن دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾ هەر کەسێك لە ترسیمردن ناچار بوو لە برسیەتیدا مرداری خواردو مەیلی گوناهی نەبو، خوای گەورە لێی خۆش دەبێو ڕەحمی پێدەکا. واتە: بۆ وەرگرتنی ڕوخسەتی شەرعی خوای گەورە بە مەرجی داناوە: گوناهبار نەبێ.

(فَلَوْ أَنْشَأَ مُبَاحاً) ئەگەر ڕێبوارێك دەستی بە سەفەرێکی حەلال کردو ڕۆیشت (ثُمَّ جَعَلَهُ مَعْصِيَةً) ئینجا سەفەرەکەی کردە گوناهکاری، وەك بڕیار بدا: بۆ ڕێگری، یان بۆ زینا، یان بۆ گومرگ وەرگرتن، یان بۆ کوشتن بچێ (فَلاَ تَرَخُّصَ) ئەوە ڕوخسەتی بۆ نیە نوێژ کورت بکاتەوە، لەو کاتەوە: کە بڕیاری گوناهەکەی داوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام ئەگەر سەفەرەکەی حەلال بوو، لەکاتی سەفەردا گوناهێکی تووش بوو، ئەوە کورتکردنەوەی نوێژی بۆ دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: چونکە بە مەبەستی گوناه کردن بە سەفەر نەچوە.

(وَلَوْ أَنْشَأَهُ عَاصِياً) ئەگەر ڕێبوارێك دەستی بە سەفەرێکی گوناهکاری کردو ڕۆیشت (ثُمَّ تَابَ) ئینجا لە ڕێگەدا تۆبەی کردو بڕیاریدا: گوناهەکە نەکا (فَمُنْشِئٌ لِلسَّفَرِ مِنْ حِينِ التَّوْبَةِ) ئەم ڕێبوارە لە کاتی تۆبەکردنیەوە دەست بە سەفەرێکی تازە دەکا، واتە: ئەگەر لێرە بەو لاوە مەبەستی بوو: هەشتا کیلۆمەتر، یان زیاتر بڕوا، دروستە نوێژ کورت

وَلَو اقْتَدَى بِمُتِمٍّ لَحْظَةً لَزِمَهُ الْإِتْمَامُ، وَلَوْ رَعَفَ الْإِمَامُ الْمُسَافِرُ وَاسْتَخْلَفَ مُتِمّاً أَتَمَّ الْمُقْتَدُونَ وَكَذا لَوْ عَادَ الْإِمَامُ وَاقْتَدى بِهِ،

---

بكاتەوە، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە، كەواتە جياوازى نيە ڕۆيشتنە تازەكەى: بۆ وولاتى خۆى بێ، يان بۆ شوێنێكى‌تر.

ئينجا بزانە: ئەگەر بێدەسەلاتێك بەزۆرلێكردن سەفەرێكى گوناهكارىى پێ‌كرا، ئەوە بە گوناهبار دانانـدرێ‌و نوێـژ كورتكردنـەوەو ڕوخسـەتەكانى‌ترى سەفەريشى بـۆ دروسـتن، هەروەك لە (فتاوى إبن حجر)دا ڕوون كراوەتەوە.

مەرجى‌چوارەم: نابـێ نوێژەكـەى بـە جەماعـەت لـە پشـت ئيمـامێكى وەهـا بكـا: كـە نوێژەكـەى تـەواو بكـا، كـەوابو: (وَلَـوِ اقْتَـدَى بِمُـتِمٍّ) ئەگـەر ڕێبوارێـك ئيقتيـداى كـرد بـە ئيمامێكى وەها: كە نوێژەكەى تەواو دەكرد (لَحْظَـةً) ماوەيـەكى كـەم، هـەر چـەند بـە قـەد (الله أكبر)ێك، يان كـەمتر بـێ (لَزِمَـهُ الْإِتْمَـامُ) واجبـە: ڕێبوارەكـەش نوێژەكـەى تـەواو بكـا، جيـاوازى نيـە: ئيمامەكـەش ڕێبـوار بـێ، يـان نيشـتەجێ بـێ، هـەروەها جيـاوازى نيـە: نوێژەكەى ئيمام سێ ڕەكعـەتى، يـان چـوار ڕەكعـەتى بـێ، يـان دوو ڕەكعـەتى بـێ: وەكـو نوێژى جومعەو سبەينىێى قەزاكراوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتـەوە ﴿عَـنِ ابْنِ عَبّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ سُئِلَ: مَا بالُ الْمُسَافِرِ يُصَلّي رَكْعَتَيْنِ إِذَا انْفَرَدَ وَأَرْبَعاً إِذَاائْتَمَّ بِمُقِـيمٍ؟ فَقَالَ: تِلْكَ السُّنَّةُ﴾رواه الإمام أحمد بإسناد صحيح، پرسـيار لـە (ابـن عبـاس) كـرا: بۆچـى ئەگـەر ڕێبـوار نوێـژ بـە تـەنهايى بكـا دوو ڕەكعـەت دەكـا، ئەگـەر بـە جەماعـەت لـە پشـت نيشتەجێ بيكا چوار ڕەكعەت دەكا؟ فەرمووى: ئەوە ڕێبازى پێغەمبەرە ﷺ.

ئينجـا بزانـە: دروسـتە ئيمـامىڕێبوار پێشـنوێژى بـۆ نيشـتەجێ بكـا، هـەروەك لـە باسـى جەماعەتدا ڕابرا، هەروەها دروستە: ڕێبوار پێشنوێژى بـۆ ڕێبـوارو بـۆ نيشـتەجێ بـە تێكڕايـى بكا، ئينجا كە ئيمامەكـەو ڕێبوارەكـان سـەلاميان داوە، نيشـتەجێيەكان هەڵدەسـتنەوە چـوار ڕەكعەت تەواو دەكەن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتى.

(وَلَوْ رَعَفَ الْإِمَامُ الْمُسَافِرُ) ئەگـەر ئيمـامێكىڕێبوار لـووتى دارِسـا، واتـە: خـوێن لـە لـووتى هـاتو بـە لاشـەكەى كـەوت، يـان بـە هۆيـەكى‌تر نوێـژى بـەتاڵ بـوو (وَاسْـتَخْلَفَ مُتِمّـاً) ئيمامەكەش يەكێكى وەهاى لە جێى خۆى كردە ئيمام: كە نوێژەكەى تـەواو دەكـرد (أَتَـمَّ الْمُقْتَـدُونَ) واجبـە مەئمومـە ڕێبوارەكـانيش نوێژەكـە تـەواو بكـەن (وَكَـذا لَـوْ عَـادَ الْإِمَـامُ) هـەروەها ئەگـەر ئيمامـە ڕێبوارەكـەش گـەڕاوەو (وَاقْتَـدى بِـهِ) ئيقتيـداى بـە ئيمامـە تەولوكەرەكە كرد، ئەويش لە سەرى واجبە: نوێژەكەى تەواو بكا، چونكە گشـتيان مـەرجى چوارەميان لە دەست چووە.

وَلَوْ لَزِمَ الإِتْمَامُ مُقْتَدِياً فَفَسَدَتْ صَلاتُهُ أَوْ صَلاةُ إِمَامه أَوْ بَـانَ إِمَامُـهُ مُحْـدِثاً أَتَـمَّ، وَلَوِاقْتَدَى بِمَنْ ظَنَّهُ مُسَافِراً فَبَانَ مُقِيماً أَوْ بِمَنْ جَهِلَ سَفَرَهُ أَتَمَّ، وَلَـوْ عَلِمَـهُ مُسَـافِراً وَشَكَّ فِي نِيَّتِه قَصَرَ، وَلَوْ شَكَّ فِيها فَقَالَ: إِنْ قَصَرَ

---

(وَلَوْ لَزِمَ الإِتْمَامُ مُقْتَدِياً) ئەگەر مەئموومێکیڕێبوار لـە سەری واجب بوو نوێژەکەی تـەواو بکا؟ چونکە ئیقتیـدای بـە ئیمـامێکی نیشتەجێ کردبو (فَفَسَدَتْ صَلاتُهُ) ئینجا لـە دوای ئیقتیدا نوێژەکەی خۆی بەتاڵ بوو (أَوْ صَلاةُ إِمَامِه) یان نوێـژی ئیمامەکـەی بـەتاڵ بـوو (أَوْ بانَ إِمَامُـهُ مُحْدِثاً) یـان ئاشـکرا بـوو: ئیمامەکـەی بێدەستنوێژە، یـان جەنابەتـدارە، یـان پیسـیەکی شـاردراوەی پێوەیـە (أَتَـمَّ) واجبـە: مەئموومەکـە چـوار ڕەکعـەتی تـەواو بکـا، کەواتـە: لـە حاڵـەتی یەکەمـدا هـەرکاتێك نوێژەکـەی دووبـارە کـردەوە، واجبـە: بـە چـوار ڕەکعەتی دووبارەی بکاتەوە.

هەروەها ئەگەر مەئموم نەبو، بەڵکو بە تەنهایی نوێـژی دابەسـتو نیـەتی کورتکردنـەوەی نـەهێنا، ئینجـا نوێژەکـەی بـەتاڵ بـوو، واجبـە: بـە چـوار ڕەکعـەتی دووبـارەی بکاتـەوە، چونکە نوێژەکەیان بە تەواوی کەوتۆتە ئەستۆیان، هەروەك لـە (المجمـوع)دا فەرموویـەتی، بەڵام ئەگەر ئاشکرا بوو: هەر لە سەرەتاوە نوێژەکەی دانەمەزراوە—چونکە مـەرجی نوێـژی ناتەواو بوو— ئەو کاتە دروستە: بە کورتکراوەیی دووبارەی بکاتـەوە، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ اقْتَدَى بِمَنْ ظَنَّهُ مُسَافِراً) ئەگەر ڕێبوارێك ئیقتیدای کـرد بـە ئیمـامێکی وەهـا: کـە دڵـی بۆ دەچوو ئیمامەکەش ڕێبوار بێو نوێژ کورت دەکاتەوە (فَبَـانَ مُقِيمـاً) ئینجـا ئاشـکرا بـوو ئیمامەکـە نیشـتەجێیە، یـان ڕێبـوارە بـەڵام نوێـژ تـەواو دەکـا (أَوْ بِمَـنْ جَهِـلَ سَـفَرَهُ) یـان ئیقتیدای کرد بـە ئیمـامێکی وەهـا: کـە لێی دوو دڵ بـوو و نـەیزانی: ئایـا ڕێبـوارە، یـان نـا (أَتَمَّ) لەو سێ مەسەلانەدا واجبە نوێژەکەی تەواو بکا، هەرچەند لـەم سێیەمەشـدا ئاشـکرا ببێ: کە ئیمامەکەش ڕێبوارەو نوێژ کورت دەکاتەوە.

(وَلَوْ عَلِمَهُ مُسَافِراً) ئەگەر مەئمومی ڕێبوار دەیزانی ئیمامەکەش ڕێبوارە، بەڵام (وَشَـكَّ فِـي نِيَّتِهِ) لە نیەتی ئیمامەکەی کەوتە گومان: ئایا نیەتی کورتکردنـەوەی نوێـژی هێنـاوە، یـان نـا؟ جـا لەگـەڵ ئەوەشـدا مەئموومەکـە نیـەتی کورتکردنەوەینوێـژی هێنـا (قَصَـرَ) ئـەوە دروسـتە: نوێژەکـەی کـورت بکاتـەوە، بـەو مەرجـەی ئاشـکرا ببـێ: ئیمامەکـەش نوێژەکـە کورت دەکاتەوە.

هەروەها (وَلَوْ شَكَّ فِيها) ئەگەر ڕێبوارەکە—وەك مەسـەلەیڕابردوو— لـە نیـەتی ئیمامەکـەی کەوتە گومان (فَقَالَ) مەئمومـە ڕێبوارەکـە نیـەتێکی هەڵواسـراوی هێنـاو گـوتی (إِنْ قَصَـرَ

قَصَرْتُ وإلاَّ أتْمَمْتُ قَصَرَ فِي الأَصَحِّ، ويُشْتَرَطُ لِلْقَصْرِ نِيَّتُهُ فِي الإِحْرَامِ وَالتَّحَرُّزُ عَنْ مُنَافِيهَا دَوَاماً، وَلَوْ أَحْرَمَ قَاصِراً ثُمَّ تَرَدَّدَ فِي أَنَّهُ يَقْصُرُ أَوْ يُتِمُّ أَوْ فِي أَنَّهُ نَوَى القَصْرَ أَوْ قَامَ إِمَامُهُ لِثَالِثَةٍ فَشَكَّ هَلْ هُوَ مُتِمٌّ أَوْ سَاهٍ أَتَمَّ، وَلَوْ قَامَ القَاصِرُ لِثَالِثَةٍ عَمْداً بِلاَ مُوجِبٍ لِلإِتْمَامِ بَطَلَتْ صَلاَتُهُ،

---

ئەگەر ئیمامەکە نوێژەکەی کورت بکاتەوە، منیش کورتی دەکەمەوە (وَإِلاَّ قَصَرْتُ) ئەگەر نا: منیش تەواوی دەکەم (قَصَرَ) ئەوە دروستە: نوێژەکەی کورت بکاتەوە (أتْمَمْتُ) لە فەرموودەی ڕاسترا، بەو مەرجەی ئیمامەکەش کورتی بکاتەوە، واتە: (فِي الأَصَحِّ) ئەگەر -لەم مەسەلەو لە مەسەلەی پێشدا- ئیمامەکە نوێژەکەی تەواو بکا، واجبە: مەئموومە ڕێبوارەکەش تەواوی بکا، هەروەك لە (نهاية)و(مغني)دا فەرموویانە.

مەرجی پێنجەم: نیەتی (قَصْر)، واتە: کورتکردنەی نوێژ (وَيُشْتَرَطُ لِلْقَصْرِ) بە مەرج داندراوە بۆ دروستبوونی کورتکردنەوەی نوێژ (نِيَّتُهُ فِي الإِحْرَامِ) نیەتی کورتکردنەوەی نوێژەکە بێنێ لەگەڵ (الله أكبر)ی نوێژدابەستندا، واتە: ئەگەر لەگەڵ (الله أكبر)ی نوێژدابەستندا نیەتی کورتکردنەوەی نوێژەکەی نەهێنا، نوێژەکەی لە سەر تەواوی دادەبەسترێ، واتە: واجبە چوار ڕەکعەتی تەواو بکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

مەرجی شەشەم: (وَالتَّحَرُّزُ) خۆ پاراستنە (عَنْ مُنَافِيهَا) لە گشت دژێکی نیەتی کورتکردنەوە (دَوَاماً) لە بەردەوامی نوێژەکەیدا، کەوابو: (وَلَوْ أَحْرَمَ قَاصِراً) ئەگەر بە نیەتی کورتکردنەوە نوێژەکەی دابەست (ثُمَّ تَرَدَّدَ) ئینجا لە ناو نوێژەکەدا کەوتە دوو دڵی (فِي أَنَّهُ يَقْصُرُ أَوْ يُتِمُّ) لەوەدا: ئایا نوێژەکە کورت بکاتەوە یان تەواوی بکا (أَوْ فِي أَنَّهُ) یان لەوەدا کەوتە گومان: ئایا (نَوَى القَصْرَ) نیەتی کورتکردنەوەی هێناوە، یان نا (أَوْ قَامَ إِمَامُهُ لِثَالِثَةٍ) یان ئەگەر هاتو: ئیمامەکەی بۆ ڕەکعەتی سێیەم هەڵساوە (فَشَكَّ) ئینجا مەئموومەکەش کەوتە گومان: ئایا (هَلْ هُوَ مُتِمٌّ) ئیمامەکەی نوێژ تەواو دەکا (أَمْ سَاهٍ) یان بە سەهوو هەڵساوەتەوە؟ (أَتَمَّ) لەو سێ مەسەلانەدا واجبە: چوار ڕەکعەتی تەواو بکا، چونکە ئەو دوو دڵیو گومانە دژی نیەتی کورتکردنەوەیە.

(وَلَوْ قَامَ القَاصِرُ) ئەگەر ئەو ڕێبوارەی نیەتی کورتکردنەوەی هێناوە، هەڵساوە پێوە (لِثَالِثَةٍ) بۆ ڕەکعەتی سێیەم (عَمْداً) بە قەسدی هەڵساوە (بِلاَ مُوجِبٍ لِلإِتْمَامِ) هیچ هۆیەکی تەواوکردنیشی نەبو: وەك نیەتی تەواوکردن، یان نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژان لەو شوێنەدا (بَطَلَتْ صَلاَتُهُ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر ڕێبوارەکە لە ناو نوێژەکەدا نیەتی مانەوەی لەو شوێنەدا هێنا، یان لە ناو نوێژەکەدا دڵی گۆڕاو نیەتی تەواوکردنی هێنا، ئەوە نوێژەکەی بەتاڵ نابێو نیەتەکەش دروستە، کەوابو: واجبە هەڵسێتەوەو نوێژەکەی چوار ڕەکعەتی تەواو بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَإِنْ كَانَ سَهْوَاً عَادَ وَسَجَدَ لَهُ وَسَلَّمَ، فَإِنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ عَادَ ثُمَّ نَهَضَ مُتِمّاً، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ مُسَافِراً فِي جَمِيعِ صَلَاتِه، فَلَوْ نَوَى الإِقَامَةَ فِيهَا أَوْ بَلَغَتْ سَفِينَتُهُ دَارَ إِقَامَتِهِ أَتَمَّ، وَالْقَصْرُ أَفْضَلُ مِنَ الإِتْمَامِ عَلَى الْمَشْهُورِ إِذَا بَلَغَ ثَلَاثَ مَرَاحِلَ،

---

هەروەها (وَإِنْ كَانَ سَهْوَاً) ئەگەر هەڵسانەوەکەی بۆ ڕەکعەتی سێیەم بە سەهوو بوو، نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، بەڵام (عَادَ) واجبە: بگەڕێتەوە بۆ تەحیات خوێندن‌و (وَسَجَدَ لَهُ) سوننەتە سوجدەی سەهوو بۆ سەهووەکە ببا (وَسَلَّمَ) ئینجا سەلام بداتەوە (فَإِنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ) جا ئەگەر بە سەهوو هەڵساوە، ئینجا دڵی گۆڕاو ویستی چوار ڕەکعەتی تەواو بکا (عَادَ) واجبە: بگەڕێتەوە بۆ دانیشتن (ثُمَّ نَهَضَ مُتِمّاً) ئینجا دووبارە بە نیەتی تەواوکردن بۆ ڕەکعەتی‌سێیەم هەڵدەستێتەوەو نوێژەکەی بە چوار ڕەکعەتی تەولو دەکا.

مەرجی‌حەفتەم: (وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ: (كَوْنُهُ مُسَافِراً) نوێژکەرەکە هەر ڕێبوار بێ (فِي جَمِيعِ صَلَاتِه) لە هەموو نوێژەکەی‌دا، واتە: لە سەرەتای نوێژەکەوە تا کۆتایی سەلامدانەوە، هەر لە سەفەردابێ، کەوابو: (فَلَوْ نَوَى الإِقَامَةَ فِيها) ئەگەر لە ناو نوێژەکەدا نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژان، یان زیاتری هێنا لەو شوێنەدا (أَوْ بَلَغَتْ سَفِينَتُهُ دَارَ إِقَامَتِهِ) یان کەشتیەکەی –واتە: یان فڕۆکە، یان ئۆتومبیلەکەی– گەیشتە شوێنی مانەوەی (أَتَمَّ) واجبە: چوار ڕەکعەت تەواو بکا، چونکە هۆی کورتکردنەوەکە نەماوە.

مەرجی‌هەشتەم: دەبێ بزانێ: (قَصْر) کورتکردنەوەی نوێژ دروستە، واتە: ئەگەر نەیدەزانی: کورتکردنەوەی نوێژ دروستەو، لە خۆیەوە نوێژی کورت کردەوە، نوێژەکەی دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْقَصْرُ) کورتکردنەوەی نوێژ (أَفْضَلُ مِنَ الإِتْمَامِ) خێری گەورەترە لە تەواوکردنی نوێژ (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب (إِذَا بَلَغَ ثَلَاثَ مَرَاحِلَ) هەر کاتێك سەفەرەکەی بگاتە سێ قۆناغ، واتە: (١٢٠) سەدو بیست کیلۆمتر، یان درێژتر بێ، چونکە بەزۆری پێغەمبەرﷺو (الخلفاء الراشدون) لە سەفەرە درێژەکانیاندا کورتیان کردۆتەوە، ئیمامی(حَنَفِي)ش لە سێ قۆناغو درێژتر بە واجبی داناوە.

هەروەها ئەگەر کورتکردنەوەی نوێژی پێ ناخۆش بوو، یان گومانی لە دروستبوونی کورتکردنەوەدا هەبو، یان خەڵك شوێنکەوتەی دەبو، لەو حاڵەتانەشدا کورتکردنەوە خێری گەورەترە، بەڵام ئەگەر ئەو حاڵەتانە هیچیان نەبون، سەفەرەکەش نەدەگەیشتە سێ قۆناغ، ئەو کاتە تەواوکردن خێری گەورەترە.

ئینجا بزانە: لە گشت حاڵەتێکی سەفەردا دروستە: نوێژ تەواو بکاو کورتی نەکاتەوە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْصُرُ فِي السَّفَرِ وَيُتِمُّ، وَيُفْطِرُ وَيَصُومُ﴾ رواه الدارقطني

وَالصَّــــوْمُ أَفْــضَــلُ مِــنَ الْــفِــطْــرِ إِنْ لَــمْ يَتَضَــرَّرْ بِهِ.
(فَصْلٌ) يَجُوزُ الْجَمْعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ تَقْدِيمًا وَتَأْخِيرًا، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ كَــذَلِكَ فِي السَّفَرِالطَّوِيلِ،

---

والبيهقي بإسناد صحيح، پێغەمبەرﷺ لە سەفەردا نوێژی کورت دەکردەوەو تەواویشی دەکرد، هەم بەڕۆژوو نەدەبو و بەڕۆژووش دەبو.
(وَالصَّـوْمُ) بەرۆژووبوونی ڕەمەزان لە سەفەری دوو قۆناغیو درێژتردا (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە (مِنَ الْفِطْرِ) لە بەرۆژوو نەبوون، تاکو بە پەلە ئەو واجبەی لە ئەستۆ لابچێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُـمْ﴾ ئەگەر لە سەفەردا بەڕۆژوو بن بۆ ئێوە چاکترە. جا ئەوە بەم مەرجەیە: (إِنْ لَمْ يَتَضَـرَّرْ بِـهِ) ئەگەر بە هۆی ڕۆژوو تووشی زیان نەبێ، واتە: ئەگەر تووشی زیانێکی نالەبار دەبو، ئەو کاتە بەرۆژوونەبوون خێرترە
﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: رَأَى النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً صَائِماً فِي السَّفَرِ قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: لَـيْسَ مِـنَ الْبِـرِّ الصَّوْمُ فِي السَّــفَرِ﴾رواه الشيخان، پیاوێك لە سەفەردا بەرۆژوو بوو، بە هۆی گەرماو تینووەتی هۆشی نەمابو و سێبەری لە سەر کرابو، کە پێغەمبەرﷺ ئەوهای دیت، فەرمووی: بەڕۆژووبوون لە سەفەردا خێر=چاکە نیە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (جَمْع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ ﴾

(يَجُوزُ الْجَمْعُ) دروستە: کۆ بکاتەوە (بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ) لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا (تَقْدِيماً) بە (جَمْع التَّقْدِيم)، واتە: نوێژی عەسر پێش بێخیو لە کاتی نیوەڕۆدا بیکا، (وَتَأْخِيراً) هەم بە (جَمْع التَّأْخِير)، واتە: نوێژی نیوەڕۆ دوا بێخیو لە کاتی عەسردا بیکا، هەروەها نوێژی عەسر لەگەڵ (جُمُعَة)دا بە (جَمْع التَّقْدِيم) دروستە، بەڵام (جُمُعَة) بە (جَمْع التَّأْخِير) دروست نیە، چونکە ناگونجێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.
(وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ) هەروەها دروستە: نوێژی مەغریبو عیشا کۆ بکاتەوە (كَذَلِكَ) هەم بە (جَمْع التَّقْدِيم) پێشخستن، هەم بە (جَمْع التَّأْخِير) دواخستن.
جا (جَمْع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ کە دروستە (فِي السَّفَرِالطَّوِيلِ) لە سەفەری درێژدا–کە (قصر)ی تێدا دروست بێ– واتە: لای کەم سەفەرەکەی دوو قۆناغ= هەشتا کیلۆمتر درێژ بێ، هەم مەرجەکانیتری تێدا بێنەجێ: کە لە سەفەری (قصر)دا باس کران، هەروەك لە (الأنوار)دا فەرموویەتی، کەواتە: لە سەفەری گوناهکاریدا (جَمْع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروست نیە، هەروەك سەرچاوەکان فەرموویانە.
﴿عَنْ مُعَاذٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ: إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْـلَ أَنْ يَرْتَحِـلَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعَصْــرِ،

وَكَذَاالْقَصِيرِ فِي قَوْلٍ، فَإِنْ كَانَ سَائِراً وَقْتَ الأُولَى فَتَأْخِيرُهَا أَفْضَلُ وَإِلاَّ فَعَكْسُهُ،

---

وَفِي الْمَغْرِبِ مِثْلَ ذَلِكَ: إِنْ غَابَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعَشَاءِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعِشَاءِ ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَهُمَا﴾ رواه ابوداود وأحمد وحسنه الترمذي وصححه البيهقي، (معاذ) دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ لە غەزای (تبوك)دا ڕەفتاری بەم جۆرە بوو: ئەگەر پێش ڕۆیشتن کاتی نیوەڕۆ هاتبا، ئەوە نوێژی نیوەڕۆو عەسری بە (جَمْع التَّقْدِيم) دەکردن، بەلام ئەگەر پێش کاتی نیوەڕۆ ڕۆیشتبا، ئەو کاتە نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تا بۆ عەسر دادەبەزیو هەردووکی بە (جَمْع التَّأْخِير) دەکردن، لە مەغریبیشدا هەر بەم جۆرە: ئەگەر پێش ڕۆیشتن ڕۆژ ئاوا دەبو، ئەوە نوێژی مەغریبو عیشای بە (جَمْع التَّقْدِيم) دەکردن، بەلام ئەگەر پێش ڕۆژ ئاوابوون ڕۆیشتبا، ئەو کاتە نوێژی مەغریبی دوا دەخست تا بۆ عیشا دادەبەزیو هەردووکی بە (جَمْع التَّأْخِير) دەکردن.

(وَكَذَاالْقَصِيرِ) هەروەها لە سەفەری کورتیشدا کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە (فِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی کۆندا، بەلام لە فەرموودەیڕاستردا: لە سەفەری کورتدا (جمع) کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروست نیە، بەلکو لە سەرچاوەکاندا دەفەرمون: لە سەفەری درێژیشدا وەها خێرترە: (جمع) نەکاو هەر نوێژێك لە کاتیخۆیدا بکا، چونکە لە لای ئیمام (أبیحنیفة)—جگە لە (عرفات)و (مزدلفة)— (جمع) دروست نیە.

ئینجا بزانە: هەر بە بەلگەی حەدیسەکەی (معاذ)یڕابردووش نوێژی سبەینێ کۆ ناکرێتەوە: نە لەگەڵ عیشاو نە لەگەڵ نیوەڕۆ، هەروەها نوێژی عەسرو مەغریبیش لەگەڵ یەکتری کۆ ناکرێنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکانیشدا فەرموویانە.

دیسان هەر بە بەلگەی حەدیسەکە: (فَإِنْ كَانَ سَائِراً وَقْتَ الأُولَى) ئەگەر ڕێبوارەکە لە کاتی نوێژی یەکەمدا—واتە: لە کاتی نیوەڕۆ، یان مەغریب—لە ڕۆیشتندا بوو (فَتَأْخِيرُهَا أَفْضَلُ) ئەو کاتە دواخستنی نوێژەکەی یەکەم خێرترە، واتە: تاکو بە (جَمْع التَّأْخِير) بیکا.

(وَإِلَّا) بەلام ئەگەر لە کاتی نوێژی یەکەمدا لە ڕۆیشتندا نەبو، بەلکو دابەزی بوو (فَعَكْسُهُ) ئەو کاتە پێچەوانەیڕابردوو خێرترە، واتە: نوێژی عەسر، یان عیشا پێش بیخێ تاکو بە (جَمْع التَّقْدِيم) بیکا، بەلام ئەگەر لە کاتی نوێژی یەکەمو دووەمدا هەر لە ڕۆیشتندا بوو، یان هەر لە دابەزیندا بوو، ئەو کاتە (جَمْع التَّأْخِير) دواخستنی نوێژی یەکەم خێرترە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە، بەلام لە (تحفة)دا دەفەرموێ: (جَمْع التَّقْدِيم) پێشخستنی نوێژی دووەم باشترە، چونکە بە پەلە واجبەکەی لە ئەستۆ لادەچێ.

وَشُرُوطُ التَّقْدِيمِ ثَلاثَةٌ: اَلْبَدَاءَ ةُ بِالأُولَى، فَلَوْ صَلاَّهُمَا فَبَانَ فَسَادُهَا فَسَدَتِ الثَّانِيَةُ. وَنِيَّةُ الْجَمْعِ، وَمَحَلُّهَا أَوَّلُ الأُولَى وَتَجُوزُ فِي أَثْنَائِهَا فِي الأَظْهَرِ.

---

## ﴿ مەرجەكانى (جَمْع التَّقْدِيم)﴾

(وَشُرُوطُ التَّقْدِيمِ) مەرجەكانى (جَمْع التَّقْدِيم)، واتە: دروستبوونى پێشخستنى نوێژى دووەم (ثَلاثَةٌ) سێ مەرجن:

مەرجىيەكەم: (اَلْبَدَاءَ ةُ بِالأُولَى) پێشدا نوێژى يەكەم بە دروستى بكا، ئينجا كە سەلامى داوە، يەكسەر نوێژى دووەم بكا، كەوابو: (فَلَوْ صَلاَّهُمَا) ئەگەر نوێژى يەكەمو نوێژى دووەمى بە (جَمْع التَّقْدِيم) كردن (فَبَانَ فَسَادُهَا) ئينجا ئاشكرا بوو: نوێژى يەكەم بەتاڵەو دروست نەبووە (فَسَدَتِ الثَّانِيَةُ) ئەو كاتە نوێژەكەى دووەميش بەتاڵەو دروست نابێ، چونكە مەرجەكەى لە دەست چووە، كەوابو: واجبە هەردووكيان دووبارە بكاتەوە: يان بە (جَمْع التَّقْدِيم)، يان بە (جَمْع التَّأْخِير)، يان هەر يەكەى لە كاتى خۆىدا.

مەرجىدووەم: (وَنِيَّةُ الْجَمْعِ) نيەتهێنانى(جَمْع التَّقْدِيم)، واتە: پێشخستنى نوێژىدووەم (وَمَحَلُّهَا) شوێنى نيەتهێنانەكەش (أَوَّلُ الأُولَى) سەرەتاى نوێژى يەكەمە (وَتَجُوزُ فِي أَثْنَائِهَا) لە ناو نوێژى يەكەميشدا-پێش سەلامدانەوە- نيەتهێنانەكە دروستە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەى بەهێزتردا، واتە: لە (الله أكبر)ى نوێژدابەستنەوە تا تەواوبوونى سەلامدانەوەى نوێژىيەكەم، دروستە هەر كاتێك نيەت بێنێ: نوێژىدووەم پێش دێخێو بە (جَمْع التَّقْدِيم) دەيكا، ئيتر پێويست ناكا: لە كاتى دابەستنى نوێژىدووەمدا نيەتى (جَمْع التَّقْدِيم) دووبارە بكاتەوە.

جا بزانە: لە لاى ئيمامى (اَلْمُزَنِي) دروستە لە دواى سەلامدانەوەى نوێژىيەكەم، نيەتى (جَمْع التَّقْدِيم) بێنێ: پێش دابەستنىنوێژىدووەمو لە گەڵ دابەستنىى، هەروەك لە (إحياءالعلوم)و (المجموع)دا فەرموويانە.

ئينجا بزانە: ئەگەر لە ناو نوێژىيەكەمدا نيەتى(جَمْع التَّقْدِيم) پێشخستنى نوێژى دووەمى هێنا، ئينجا دڵى گۆڕاو نيەتى هێنا پێشى نێخێ، ئينجا ديسان دڵى گۆڕاوەو دووبارە نيەتى هێنا پێشى بێخێ، ئەوە لە فەرموودەى بەهێزتردا: زيانى نيەو دروستە (جَمْع التَّقْدِيم) بكا-هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە- بەڵام ئەگەر لە ناو نوێژى يەكەمدا دڵى نەگۆڕاوەو دووبارە نيەتى (جَمْع التَّقْدِيم)ى نەهێناوە، بەڵكو لە دواى سەلامدانەوەى نوێژى يەكەم دڵى گۆڕاوەو دووبارە نيەتى (جَمْع التَّقْدِيم)ى هێناوە، ئەوە سوودى نيەو (جَمْع التَّقْدِيم)ى بۆ دروست نيە، چونكە كاتى نيەتەكەى بەسەر چووە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَالْمَوَالاَةُ بِأَنْ لاَ يَطُولَ بَيْنَهُمَا فَصْلٌ، فَإِنْ طَالَ وَلَوْ بِعُذْرٍ وَجَبَ تَأْخِيرُ الثَّانِيَةِ الَى وَقْتِهَا، وَلاَ يَضُرُّ فَصْلٌ يَسِيرٌ، وَيُعْرَفُ طُولُهُ بِالْعُرْفِ. وَلِلْمُتَيَمِّمِ الْجَمْعُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلا يَضُرُّ

---

بەڵام ئەگەر لە ناو نوێژی یەکەمدا نیەتی (جَمْع التَّقْدِيم)ی هێنا، ئینجا لە دوای سەلامدانەوە دڵی گۆڕاو نیەتی هێنا: (جَمْع التَّقْدِيم) نەکا، ئینجا دڵیگۆڕاوەو نیەتی هێنا (جَمْع التَّقْدِيم) بکا، ئەو کاتە (جَمْع التَّقْدِيم)ی بۆ دروستە، بەو مەرجەی ماوەیەکی درێژ نەکەوێتە نێوان دڵ گۆڕانو نیەتەکان، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

مەرجیسێیەم: (وَالْمَوَالاَةُ) یەکسەر نوێژیدووەم لە دوای نوێژییەکەم بکا (بِأَنْ لاَ يَطُولَ بَيْنَهُمَا فَصْلٌ) بە جۆرێکی وەها: ماوەی نێوان هەردووکیان درێژ نەبێ.

(فَإِنْ طَالَ) جا ئەگەر نێوانەکەیان درێژ بوو (وَلَوْ بِعُذْرٍ) هەرچەند بە هۆی عوزرێکیش بێ: وەك سەهوو، یان هەر ڕووداوێکیتر، ئەو کاتە (جَمْع التَّقْدِيم)ی بۆ دروست نیە، کەوابو: (وَجَبَ تَأْخِيرُ الثَّانِيَةِ إلى وَقْتِهَا) واجبە: نوێژەکەی دووەم دوا بێخێ بۆ کاتەکەی خۆیو لە کاتەکەی خۆیدا بە تاك بیکا، بەڵام (وَلاَ يَضُرُّ فَصْلٌ يَسِيرٌ) نێوانێکیکەم زیان نادا: وەك ئیقامەت کردن بۆ نوێژیدووەم (وَيُعْرَفُ طُولُهُ بِالْعُرْفِ) درێژیو کورتی نێوان هەردوو نوێژەکان بە گوێرەی عادەت دەناسرێ.

کەواتە: ئەندازەی دوو ڕەکعەت نوێژی سووكو بە پەلە درێژەو (جَمْع التَّقْدِيم) بەتاڵ دەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ فِي صِفَةِ وُقُوفِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِعَرَفَاتَ: ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ لە (حجةالوداع)دا کە لە (عرفات)دا بانگی نیوەڕۆ دراو ئیقامەت کرا، نوێژی نیوەڕۆی کرد، ئینجا دووبارە ئیقامەت کراو نوێژی عەسری بە (جَمْع التَّقْدِيم) کردو هیچ سوننەتێکی لە نێوان هەردوو نوێژەکاندا نەکرد.

ئینجا بزانە: بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: لە (جَمْع التَّقْدِيم)دا دروست نیە هیچ سوننەتێك لە نێوان هەردوو نوێژەکاندا بکرێ، کەوابو: ئەگەر ویستی سوننەتەکانی پاش نوێژی نیوەڕۆو پێش عەسر بکا، یان سوننەتەکانی پاش نوێژی مەغریبو پێش نوێژی عیشا بکا، ئەوە با لە دوای تەواوکردنی هەردوو نوێژە واجبەکان ئەو سوننەتانە –بە ڕیز– بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلِلْمُتَيَمِّمِ الْجَمْعُ) کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە: بۆ ئەو ڕێبوارەی لە نێوان هەردوو نوێژەکاندا تەیەمموم دەکا (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، واتە: تەیەمموم کردن بۆ نوێژیدووەم زیان لە (جَمْع التَّقْدِيم) نادا، هەروەك دەستنوێژگرتنیش زیان نادا، چونکە نێوانەکەیان کەمە، کەوابو: (وَلا يَضُرُّ) زیان لە (جَمْع التَّقْدِيم) نادا

تَخَلُّلُ طَلَبٍ خَفِيفٍ، وَلَوْ جَمَعَ ثُمَّ عَلِمَ تَرْكَ رُكْنٍ مِنَ الأُولَى بَطَلَتَا وَيُعِيدُهُمَا جَامِعاً، أَوْ مِنَ الثَّانِيَةِ فَإِنْ لَمْ يَطُلْ تَدَارَكَ وَإِلاَّ فَبَاطِلَةٌ وَلاَ جَمْعَ، وَلَوْ جَهِلَ أَعَادَهُمَا لِوَقْتَيْهِمَـــا، وَإِذَا أَخَّرَ الأُولَى لَمْ يَجِبِ التَّرْتِيبُ

---

(تَخَلُّلُ طَلَبٍ خَفِيفٍ) گەڕانێكی سووك بە دوای ئاودا بكەوێتە نێوان هەردوو نوێژەكان، واتە: ماوەكەی كەم بێ‌و نەگاتە ئەندازەی دوو ڕەكعەتی سووك.

(وَلَوْ جَمَعَ) ئەگەر هەردوو نوێژەكانی بە (جَمْعِ التَّقْدِيم) كۆكردنەوە (ثُمَّ) ئینجا لە دوای تەواوكردنی هەردوو نوێژەكان، یان هەر لە ناو نوێژیدووەمدا پاش ماوەیەكی درێژ (عَلِمَ تَرْكَ رُكْنٍ مِنَ الأُولَى) زانی ڕوكنێكی لە نوێژی یەكەم نەكردوە (بَطَلَتَا) ئەوە هەردوو نوێژەكان بەتاڵ دەبن، چونكە یەكەمەكەیان ڕوكنێكی ناتەواوە، دووەمەكەش بە ڕیز نەكراوە، هەروەك لە مەرجییەكەمدا ڕابرا، كەوابو: (وَيُعِيدُهُمَا) واجبە: هەردوو نوێژەكان دووبارە بكاتەوە: (جَامِعاً) یان بە (جَمْعِ التَّقْدِيم)، یان بە (جَمْعِ التَّأْخِير)، یان ئەگەر حەز دەكا: هەریەكەی لە كاتی خۆیدا دەكا.

(أَوْ مِنَ الثَّانِيَةِ) یان لە دوای سەلامدانەوەی نوێژیدووەم زانی ڕوكنێكی لە نوێژیدووەم نەكردوە، ئەوە (فَإِنْ لَمْ يَطُلْ) ئەگەر نێوانی سەلامدانەوەو زانینەكەی درێژ نەبو (تَدَارَكَ) دەگەڕێتەوە ناو نوێژەكەو ڕوكنەكەی دەكاو لە ڕوكنەكەوە نوێژەكەی تەواو دەكاو هەردوو نوێژەكانی دروست دەبن (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نێوانی سەلام‌و زانینەكەی درێژ بوو (فَبَاطِلَةٌ) ئەو كاتە نوێژی دووەم بەتاڵەو (وَلاَ جَمْعَ) دروست نیە بە (جَمْعِ التَّقْدِيم) بیكا، بەڵكو واجبە: نوێژەكەیدووەم لە كاتی خۆیدا بكاتەوە.

(وَلَوْ جَهِلَ) ئەگەر نەیزانی ڕوكنە نەكراوەكە لە نوێژی یەكەمە، یان لە دووەمە، ئەو كاتەش (جَمْعِ التَّقْدِيم)ی بۆ دروست نیە، بەڵكو (أَعَادَهُمَا) واجبە: هەردوو نوێژەكان دووبارە بكاتەوە (لِوَقْتَيْهِمَا) هەریەكەی لە كاتی خۆیدا، یان ئەگەر حەز بكا: یەكەمەكەیان دوا بێخێ‌و لە كاتی دووەمەكەدا بە (جَمْعِ التَّأْخِير) بیكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: بۆ دروستبوونی (جَمْعِ التَّقْدِيم) مەرجە: ڕێبوارەكە هەر لە سەفەردابێ، لەو كاتەوە: كە لە ناو نوێژییەكەمدا نیەتی (جَمْعِ التَّقْدِيم) دێنێ، تا دابەستنی نوێژیدووەم، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ مەرجەكانی (جَمْعِ التَّأْخِير) ﴾

(وَإِذَا أَخَّرَ الأُولَى) هەر كاتێك ڕێبوار نوێژییەكەمی دواخست، تاكو بە (جَمْعِ التَّأْخِير) لە كاتی نوێژیدووەمدا بیكا (لَمْ يَجِبِ التَّرْتِيبُ) ڕیزكردن واجب نیە، واتە: واجب نیە

وَالْمُوَالاَةُ وَنِيَّةُالْجَمْعِ عَلَىالصَّحِيحِ، وَيَجِبُ كَوْنُ التَّأْخِيرِ بِنِيَّةِالْجَمْعِ وَإِلاَّ فَيَعْصِي وَتَكُونُ قَضَاءً، وَلَوْ جَمَعَ تَقْدِيمًا فَصَارَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ مُقِيماً بَطَلَ الْجَمْعُ، وَفِي الثَّانِيَةِ وَبَعْدَهَا

---

له پێشدا نوێژیيەكەم بكا (وَالْمُوَالاَةُ) هەروەها واجب نيە: يەكسەر نوێژیدووەم لە دوای نوێژیيەكەم بكا (وَنِيَّةُ الْجَمْعِ) هەروەها نيەتی (جَمْعِ التَّأْخِيرِ)ش لە دابەستنی نوێژیيەكەمدا واجب نيە، بەڵكو ئەو سێيانە گشتيان سوننەتن (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَيَجِبُ) بۆ دروستبوونی (جَمْعِ التَّأْخِيرِ) دوو شت واجبن، يەكەم: (كَوْنُ التَّأْخِيرِ بِنِيَّةِ الْجَمْعِ) واجبە: دواخستنی نوێژیيەكەم بە نيەتی (جَمْعِ التَّأْخِيرِ) بێ، وەك بڵێ: (نيەتمە ئەم نوێژەی نيوەڕۆ دوا بخەم تاكو لە كاتی عەسردا بيكەم.)؟ بۆ ئەوەی بەو نيەتە جياوازی هەبێ لەگەڵ ئەو كەسەی بە گوناهكاری نوێژەكە دوا دەخا-يان نايكا- هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشيەكانياندا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: واجبە: ڕێبوارەكە هەر لە سەفەردابێ: لە كاتی نيەتهێنانی دواخستنیNوێژەكەوە تا هەردوو نوێژەكان تەواو دەبن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانەو، لە پێش (كۆكردنەوەی دوو نوێژ بە هۆی باران) ڕوونی دەكەينەوە،إن شاءالله تعالى.

ئينجا بزانە: مەرجە نيەتی دواخستنینوێژەكەش لە كاتی نوێژەكەدا بێ، واتە: لای كەم بە ئەندازەی نوێژكردنەكە لە كاتی نوێژەكە مابێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

كەوابو: (وَإِلاَّ) ئەگەر بە نيەتی (جَمْعِ التَّأْخِيرِ) نوێژەكەی دوا نەخست، يان بەو نيەتە دوای خست، بەڵام درەنگ بوو و بە ئەندازەی نوێژكردنەكە لە كاتی نوێژەكە نەمابو (فَيَعْصِي) ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا گوناهبار دەبێ، چونكە لە كاتی نوێژەكەدا نيازی نوێژكردنەكەی نەبوە (وَتَكُونُ قَضَاءً) نوێژی يەكەم دەبێتە قەزا، چونكە بە بێنيەتی دواخستن لە كاتی خۆیدا نەكراوە، كەوابو: ئەگەر لە كاتی نوێژیدووەميشدا بيكا، نيەتی قەزای لێدێنێ.

(وَلَوْ جَمَعَ تَقْدِيماً) ئەگەر ويستی (جَمْعِ التَّقْدِيم) بكا، واتە: لە ناو نوێژیيەكەمدا نيەتی كۆكردنەوەی هێنا (فَصَارَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ مُقِيماً) ئينجا لە نێوان نوێژی يەكەمو دووەمدا، يان لە ناو نوێژیيەكەمدا بووە نيشتەجێ: وەك نيەتی نيشتەجێيی بێنێ، يان لە فرۆكەدا، يان لە ئۆتۆمبيلدا بگاتە جێ، ئەوە (بَطَلَ الْجَمْعُ) لەو مەسەلانەدا (جَمْعِ التَّقْدِيم)ی بەتاڵ دەبێ، چونكە لە سەفەردا نەماوە، كەواتە: نوێژەكەیيەكەمی دروست بووە، واجبە نوێژەكەی دووەميش لە كاتیخۆیدا بكا.

بەڵام (وَفِيالثَّانِيَةِ) ئەگەر ڕێبوارەكە (جَمْعِ التَّقْدِيم)ی كردو لە ناو نوێژیدووەمدا بووە نيشتەجێ (وَبَعْدَهَا) هەروەها ئەگەر لە دوای تەواوبوونی نوێژیدووەميش بووە نيشتەجێ:

لاَيَبْطُلُ فِي الأَصَحِّ، أَوْ تَأْخِيراً فَأَقَامَ بَعْدَ فَرَاغِهِمَا لَمْ يُؤَثِّرْ، وَقَبْلَهُ يَجْعَلُ الأُولَى قَضَاءً، وَيَجُوزُ الْجَمْعُ بِالْمَطَرِ تَقْدِيماً، وَالْجَدِيدُ مَنْعُهُ تَأْخِيراً، وَشَرْطُ التَّقْدِيمِ وُجُودُهُ أَوَّلَهُمَا،

---

وەك بگاتە شوێنی مەبەست، ئەوە (لاَيَبْطُلُ) لە هەردوو مەسەلەدا (جَمْع التَّقْدِيم)ی بەتاڵ نابێ‌و هەردوو نوێژەکانی دروستن، چونکە لە سەفەردا کراون (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، کەواتە: ئەگەر ڕێبوارێك هەردوو نوێژەکانی بە (جَمْع التَّقْدِيم) کردن، ئینجا کە گەیشتە جێ، یان کە هاتەوە ماڵ، هێشتا کاتی نوێژیەکەم هەر مابو، یان تەنها کاتی نوێژیدووەم مابو، ئەوە لە هیچ حاڵەتێکدا دووبارەکردنەوەی هیچ لەو دوو نوێژانەی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ تَأْخِيراً) یان ئەگەر ڕێبوارەکە هەردوو نوێژەکانی بە (جَمْع التَّأْخِير) کردن (فَأَقَامَ بَعْدَ فَرَاغِهِمَا) ئینجا لە دوای تەواوبوونی هەردوو نوێژەکان بووە نیشتەجێ: وەك بگاتەوە ماڵ (لَمْ يُؤَثِّرْ) ئەوە کار لە (جَمْع التَّأْخِير) ناکاو هەردوو نوێژەکانی دروستن.

بەڵام (وَقَبْلَهُ) ئەگەر لە پێش تەواوبوونی هەردوو نوێژەکان ببێتە نیشتەجێ، جیاوازی نیە: هیچیانی نەکردبن‌و بگاتە جێ، یان نوێژیەکەمی کردبو گەیشتە جێ، لەو حاڵەتانەدا (يَجْعَلُ الأُولَى قَضَاءً) نوێژیەکەم دەکاتە قەزا، واتە: وا دادەنێ: ئەو نوێژەی لە ماڵەوە نەکردوەو تاوانباریش نابێ، کەواتە: ئەگەر نوێژەکەی بە (قَصْر) کردبو-یان هەر نەیکردبو- واجبە: بە چوار ڕەکعەتی قەزای بکاتەوە، هەروەك لە (بجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: ئەگەر بە تەواوی کردبوی ئەوە وای بۆ دادەندرێ: قەزای کردۆتەوە، وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ کۆکردنەوەی دوو نوێژ بە هۆی باران ﴾

(وَيَجُوزُ الْجَمْعُ بِالْمَطَرِ) کۆکردنەوەی دوو نوێژ دروستە بە هۆی باران (تَقْدِيماً) بە (جَمْع التَّقْدِيم) بەو مەرجەی بارانەکە جل‌و بەرگی تەڕ بکا ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعاً وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعاً﴾ رواه الشيخان، زاد مسلم: ﴿مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَسَفَرٍ﴾. قالَ الإمام الشافعي -كالإمام مالك-: (أُرَى ذَلِكَ بِعُذْرِ الْمَطَرِ).

پێغەمبەر ﷺ لە (مەدینە) نوێژی نیوەڕۆو عەسری پێکەوە کۆ کردنەوەو نوێژی مەغریب‌و عیشایشی پێکەوە کۆ کردنەوە، هیچ ترس‌و سەفەریشی نەبو.

ئیمام (مالك)- هەم ئیمام(الشافعي)ش- دەفەرموێ: واتێدەگەم ئەو کۆکردنەوەیە بە هۆی باران بوو. (وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی ئیمام(الشافعي) ئەمەیە (مَنْعُهُ تَأْخِيراً) قەدەغەیە بە هۆی باران (جَمْع التَّأْخِير) بکرێ، بەڵکو تەنها (جَمْع التَّقْدِيم) دروستە، چونکە وا دەبێ: بۆ کاتی نوێژیدووەم باران بارین دەبڕێ.

(وَشَرْطُ التَّقْدِيمِ) مەرجی(جَمْع التَّقْدِيم)ی بە هۆی باران ئەمەیە: (وُجُودُهُ أَوَّلَهُمَا) باران بارینەکە لە سەرەتای هەردوو نوێژەکاندا هەبێ.

**وَالأَصَحُّ اِشْتِرَاطُهُ عِنْدَ سَلاَمِ الأُولَى، وَالثَّلْجُ وَالْبَرَدُ كَمَطَرٍ إِنْ ذَابَا، وَالأَظْهَرُ تَخْصِيصُ الرُّخْصَةِ بِالْمُصَلِّي جَمَاعَةً بِمَسْجِدبَعِيد يَتَأَذَّى بِالْمَطَرِ فِي طَرِيقِه.**

---

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە (اشْتِرَاطُهُ عِنْدَ سَلاَمِ الأُولَى) مەرجە: باران بارینەکە لە کاتی سەلامدانەوەی نوێژی یەکەمیش هەبێ، هەروەها ئەو سێ مەرجانەی لە (جَمْع التَّقْدِيم)ی سەفەردا ڕابران، مەرجن لە (جَمْع التَّقْدِيم)ی بارانیشدا هەبن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالثَّلْجُ) بەفر (وَالْبَرَدُ) تەزرە (كَمَطَرٍ) وەکو باران بڕیاری (جَمْع التَّقْدِيم) بۆیان دەدرێ (إِنْ ذَابَا) بەو مەرجەی هەردووکیان بتاوێنەوەو جلو بەرگ تەڕ بکەن.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (تَخْصِيصُ الرُّخْصَةِ) ئەو ڕێدانەی (جَمْع التَّقْدِيم)ی باران تایبەتە (بِالْمُصَلِّي جَمَاعَةً) بەو کەسەی نوێژەکان بە جەماعەت بکا (بِمَسْجِدٍ بَعِيدٍ) لە مزگەوتێکی دوور، کە (يَتَأَذَّى بِالْمَطَرِ) بە هۆی باران تووشی ئەزیەت ببێ (فِي طَرِيقِهِ) لە ڕێگەیدا.

کەواتە: ئەگەر مەرجەکانی نەهاتنە جێ، یان لە ماڵەوە نوێژی دەکرد، یان لە مزگەوت بە تەنها نوێژی دەکرد، یان لە ڕێگەدا بەرگی تەڕ نەدەبو، یان مزگەوتەکە نزیك بوو، لەو حاڵەتانەدا (جمع) دروست نیەو واجبە: گشت نوێژێك لە کاتی خۆیدا بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ کۆکردنەوەی دوو نوێژ بە هۆی نەخۆشی ﴾

بزانە: چەند زانایەکی مەزهەبی(شافعی) فەرموویانە: دروستە بە هۆی نەخۆشی دوو نوێژ کۆ بکاتەوە بە گوێرەی بۆگونجانی نەخۆشەکە: بە (جَمْع التَّقْدِيم)، یان بە (جَمْع التَّأْخِير)، لە (المجموع)دا ئەو فەرموودەیەی بە بەهێز داناوەو بەڵگەی بەم حەدیسە بۆ هێناوە: ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: جَمَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَمَطَرٍ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لە (مدينة) دوو نوێژی کۆکردنەوە، ترس و بارانیش نەبو.

ئینجا بزانە: لێرەدا مەبەست ئەوەیە نەخۆشیی لەو پلەیە بێ: بە هۆی نوێژکردن تووشی ئازارێکی ئاشکرا ببێ، کەوابو: ئەگەر لە کاتی نوێژی دووەمدا بەو جۆرە نەخۆشتر دەبو، ئەوە (جَمْع التَّقْدِيم) دەکا، بەو سێ مەرجانەی لە (جَمْع التَّقْدِيم)ی سەفەردا باس کران، هەم بەم مەرجەش: لە سەرەتای هەردوو نوێژەکاندا و لە کاتی سەلامدانەوەی نوێژییەکەمدا نەخۆشیی بەردەوام بێ، بەڵام ئەگەر لە کاتی نوێژییەکەمدا بەو جۆرە نەخۆشتر بوو، ئەوە بە نیەتی(جَمْع التَّأْخِير) نوێژەکەی دوا دێخێو لە کاتی نوێژیدووەمدا دەیکا، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

..........................................................

دیسان بزانە: مەزھەبی ھەر چوار ئیمامەكانو كۆمەڵی زانایانی ئیسلام ئەمەیە: دروست نیە دوو نوێژ لە یەك كاتدا كۆ بكرێنەوە بە بێ ترسو بێ بارانو بێ نەخۆشیو بێ سەفەر، ھەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ پاشكۆ: دەربارەی چەند ڕەوشتێكی سەفەر ﴾

یەكەم: ھەر كاتێك ویستی بە سەفەر بڕوا، سوننەتە: ڕاوێژ بە مرۆڤی لێزانو دیندار بكاو نوێژی (إستخارة) بكا، ئینجا كە دڵی ھاتە سەر ڕۆیشتن، واجبە: گەردەنی خۆی بە خاوەن مافان ئازاد بكاو مافەكانیان بداتەوە، ھەم ئەگەر كاتیقەرزدانەوە ھاتبو، قەرزەكان بداتەوەو، دڵی دایكو باوكی ڕازی بكا، ئینجا سوننەتە: خوا حافیزی لە خزمو كەسیو لە جیرانو دۆستو برادەران بكا، ئینجا وەھا سوننەتە ھەردوولا ئەم دوعایە بۆ یەكتری بكەن: ﴿أَسْتَوْدِعُ اللهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ﴾رواه أصحاب السنن بإسناد صحيح.

دووەم: سوننەتە: ڕۆژی پێنج شەممە، یان دوو شەممە دەست بە ڕۆیشتن بكاو پێش ئەوەی لە ماڵ بڕواتە دەرەوە دوو ڕەكعەت بە نیەتی (سُنَّةالسَّفَر) لە ماڵەوە بكا، ئینجا لە دوای سەلامدانەوە (آيَةالْكُرْسِيّ)و سوڕەتی(لإِيلاَفِ قُرَيْش) بخوێنێ، ئینجا لە كاتی چوونە دەرەوەدا بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَىاللهِ وَلاَحَوْلَ وَلاَقُوَّةَ إِلاَّ بِـاللهِ﴾حديث حسن رواه أصحاب السنن، ئینجا كە ویستی سواری وولاغ-واتە: یان كەشتی، یان فڕۆكە، یان ئۆتۆمبێل- ببێ، بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ﴾، ئینجا كە بە تەواوی سوار بوو، بڵێ: ﴿اَلْحَمْدُ لِلَّهِ، سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَىرَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ، اَلْحَمْدُ لِلَّهِ اَلْحَمْدُ لِلَّهِ اَلْحَمْدُ لِلَّهِ، اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ، سُبْحَانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي إِنَّهُ لاَيَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ﴾ رواه أصحاب السنن بإسناد صحيح.

ھەروەھا پێغەمبەرﷺ لە كاتی چوونە سەفەردا ئەم دوعایەشی دەكرد: ﴿اَللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِيالسَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِيالأَهْلِ، اَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِيالأَهْلِ وَالْمَالِ، اَللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَاالسَّفَرَ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن واللفظ لأبيداود.

سێیەم: لە ھەر قۆناغێك دابەزی، سوننەتە بڵێ: ﴿أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَاخَلَقَ﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، ئینجا ھەر كاتێك ویستی لە ھەر شوێنێك بڕوا، سوننەتە بە ھەمان شێوەیڕابردوو دوو ڕەكعەتیتر (سنةالسفر) بكا، ھەر كاتێك لە بەرزاییەكان سەركەوت بڵێ: (اَللهُ أَكْبَر)و، ھەر كاتێك لە بەرزاییەكان ھاتە خوارەوە بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ)، بەڵام دەنگی بەرز نەكاتەوە، وە ھەر كاتێك چاوی بە گوندێك-دێیەك، یان

شارێك كەوت، سوننەتە بڵێ: ﴿اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ وَخَيْرَ أَهْلِهَا وَخَيْرَ مَافِيهَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ أَهْلِهَا وَشَرِّ مَافِيها﴾حديث حسن رواه النسائي.

جا لە هەر شوێنێك لە جنۆكەو شەیتان ترسا، سوننەتە: بانگ بدا، ئەگەر لە خاوەن دەسەلاتێك، یان لە هەر كەسێكیتر ترسا، سوننەتە ئەم زیكرو دوعایانە بكا: ﴿لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ، سُبْحَانَ اللهِ رَبِّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لاَإِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ﴾ رواه ابن السنى ﴿اَللّٰهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فى نُحُورِهِمْ ونَعُوْذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ﴾ رواه أبوداود بإسناد صحيح.

چوارەم: هەر كاتێك كارو پێویستیەكانی پێك هات، سوننەتە: بە پەلە بگەڕێتەوە لای ماڵو خێزانی خۆی، سوننەتە: دیاریيەكیش لەگەڵ خۆی بێنێ بۆ ماڵو منداڵەكانی، هەروەها كە چاوی بە گوندەكەی خۆی، یان شارەكەی خۆی كەوت، سوننەتە ئەو دوعایەیڕابردوو بكا: ﴿اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الْقَرْيَةِ...﴾ هتد، ئینجا ئەم دوعایە: ﴿اَللّٰهُمَّ اجْعَلْ لَنَا بِهَا قَرَاراً وَرِزْقاً حَسَناً﴾حديث حسن رواه الطبرانى، ئینجا تا دەگاتەوە جێ بەردەوام بڵێ: ﴿آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ﴾رواه مسلم، ئینجا پێش ئەوەی بڕواتە ناو ماڵیخۆی سوننەتە: بڕواتە نزیكترین مزگەوتو دوو ڕەكعەت نوێژ لە ناو مزگەوتەكەدا بكا، بە ناوی سوننەتی گەڕانەوە-هەروەك لە (بخاري ومسلم)دا هاتووە- ئینجا بڕواتە ماڵی خۆی.

ئینجا سوننەتە زیافەتێك بكا- كە پێی دەگوترێ: (اَلنَّقِيعَة)- بە بۆنەی گەڕانەوەی ﴿عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ لَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ نَحَرَ جَزُوراً أَوْ بَقَرَةً﴾رواه البخاري، كە پێغەمبەرﷺ لە سەفەر گەڕاوە (مدينة)، ووشترێك، یان ڕەشە وولاغێكی سەر بڕی.

ئینجا سوننەتە: لە بەردەوامی سەفەریشدا-وەكو ماڵەوە- زۆر بایەخ بە نوێژە سوننەتەكانیش بدا؟ چونكە پێغەمبەرﷺ زۆر بایەخی پێدەدان، بە شێوەیەكی وەها: لە سەر پشتی وولاغیشڕنوێژە سوننەتەكانی دەكردن، هەروەك لە باسی قیبلەدا ڕوونمان كردنەوە، جا بزانە: سەرچاوەی ئەم پاشكۆیە: (المجموع)و(الأذكار)ی ئیمامی(النواوی) بون، وَالْحَمْدُ للهِ تعالَى.

## ﴿ بابُ صَلاةِالْجُمُعَةِ: باسی نوێژی جومعە ﴾

**پێشەكی** بزانە: ڕۆژی هەینی لە پێش ئیسلامدا بە (يَوْم الْعَرُوبَة) ناو دەبرا، هەروەها بزانە: ڕۆژیهەینی-جگە لە ڕۆژیعالفە- لە گشت ڕۆژەكانیتر گەورەترە، شەویهەینیش-جگە لە شەوی(لَيْلَةُالْقَدْر)- لە گشت شەوەكانیساڵ گەورەترە، هەروەها نوێژیجومعەش لە گشت نوێژەكانیتر گەورەترە.

إِنَّمَا تَتَعَيَّنُ عَلَى كُلِّ مُكَلَّفٍ حُرٍّ ذَكَرٍ مُقِيمٍ بِلاَ مَرَضٍ وَنَحْوِهِ، وَلاَجُمُعَةَ عَلَىمَعْذُورٍ بِمُرَخِّصٍ فِي تَرْكِ الْجَمَاعَةِ وَالْمُكَاتَبِ وَكَذَا مَنْ بَعْضُهُ رَقِيقٌ عَلَىالصَّحِيحِ،

---

نوێژی جومعە دوو ڕەکعەتە، واجبە: بە جەماعەت بکرێ، جا لە بەر گەورەیی جومعە گەورەترین هەڕەشە لەو کەسە کراوە: کە جومعە ناکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللهُ عَلَىقُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ﴾ رواه مسلم، سوێند بەخوا: ئەگەر ئەو کەسانەی جومعە ناکەن تۆبە نەکەنو واز لەو خراپەیە نەهێنن، خوای گەورە مۆری نیفاق لە سەر دڵەکانیان دەداو تامی ئیمانی تێدا نامێنێ، ئینجا لە ئایین بێئاگا دەبنو چاکە ناکەنو واز لە خراپە ناهێنن.

ئینجا بزانە: نوێژیجومعە پێش کۆچکردن لە (مكة)ی پیرۆزدا واجب کرا، بەڵام نەگونجا لە (مكة)دا بکرێ؟ چونکە موسڵمانان لەوێ بێهێز بون، جا یەکەم نوێژیجومعە لە (مدينة)ی پیرۆزدا –پێش کۆچکردن– (أسعد بن زرارة) کردی لەو سەردەمەدا: کە پێغەمبەرﷺ (مُصْعَب بن عُمَيْر)ی نارده (مدينة)ی پیرۆز، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(إِنَّمَا تَتَعَيَّنُ) نوێژی جومعە بە (فَرْض الْعَيْن) واجبە، تەنها (عَلَى كُلِّ مُكَلَّفٍ) لە سەر موسڵمانێکی داوالێکراوی شەرعی، واتە: بالغو عاقڵ بێ (حُرٍّ) ئازاد بێ (ذَكَرٍ) پیاو بێ (مُقِيمٍ) نیشتەجێی شوێنی جومعە بێ، هەرچەند خەڵکی شوێنەکەش نەبێ (بِلاَ مَرَضٍ) نەخۆش نەبێ (وَنَحْوِهِ) عوزرەکانیتری لەو جۆرەشی نەبن: کە لە جەماعەتدا ڕابران، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً: عَبْدٌمَمْلُوكٌ أَوْ إِمْرَأَةٌ أَوْ صَبِيٌّ أَوْ مَرِيضٌ﴾رواه أبوداود بإسناد صحيح، نوێژی جومعە واجبە لە سەر گشت موسڵمانێك بە جەماعەت بیکا، جگە لە چوار کەس: کۆیلە، ئافرەت، مندالّ، نەخۆش.

(وَلاَ جُمُعَةَ عَلَى مَعْذُورٍ) نوێژی جومعە واجب نیە لە سەر ئەو کەسەی عوزرێکی هەبێ (بِمُرَخِّصٍ فِيتركِ الْجَمَاعَةِ) لە یەکێك لەو عوزرانەی ڕێگەی نەکردنی جەماعەتی دەدا (وَالْمُكَاتَبِ) هەروەها جومعە واجب نیە لە سەر کۆیلەی نوسرلوپێدرلو (وَكَذَا مَنْ بَعْضُهُ رَقِيقٌ) هەروەها جومعە واجب نیە لە سەر کۆیلەی بەشێکی کۆیلەیەو بەشەکەیتریشی ئازادە (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەروەها لە سەر نێرامۆکیش جومعە واجب نیە، چونکە بە بێگومانی پیاو نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾ نوێژی جومعە لە سەر ڕێبوار واجب نیە بەڵکو سوننەتە، بەو مەرجەی سەفەرەکەی گوناهکاری نەبێ، هەرچەند سەفەرەکەشی کورت بێ، واتە: ئەگاتە دوو

وَمَنْ صَحَّتْ ظُهْرُهُ صَحَّتْ جُمُعَتُهُ، وَلَهُ أَنْ يَنْصَرِفَ مِنَ الْجَامِعِ إلاَّ الْمَرِيضَ وَنَحْوَهُ فَيَحْرُمُ انْصِرافُهُ إنْ دَخَلَ الْوَقْتُ إلاَّ أَنْ يَزِيدَ ضَرَرُهُ بانْتِظَارِه، وَتَلْزَمُ الشَّيْخَ الْهَرِمَ وَالزَّمِنَ إنْ وَجَدَا مَرْكَباً وَلَمْ يَشُقَّ الرُّكُوبُ وَالأَعْمَى يَجِدُ قائداً،

---

قۆناغ، بەڵام ئەگەر سەفەرەكەی گوناهكاری بوو، یان چوار ڕۆژ، یان زیاتر لە شوێنی جومعەدا مایەوە، یان نیەتی مانەوەی هێنا، ئەو كاتە نوێژی جومعەی لە سەر واجبە، بەڵام ژمارەی پێ تەواو ناكرێ، واتە: لە چل پیاوەكان ناژمێردرێ؟ چونكە خەڵكی شوێنەكە نیە، هەروەك لە (المجموع)و(الأنوار)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَمَنْ صَحَّتْ ظُهْرُهُ) هەر كەسێك -لەوانەی جومعەیان لە سەر واجب نیە- نوێژی نیوەڕۆی دروست بێ (صَحَّتْ جُمُعَتُهُ) نوێژی جومعەشی دروستە، وەك منداڵو كۆیلەو ئافرەتو ڕێبوار، واتە: ئەگەر ئەوانە نوێژی جومعەیان كرد، بۆیان دروست دەبێو بە بەر چوار ڕەكعەتەكەی نیوەڕۆ دەكەوێ، بە بەڵگەی (إجماع)ی زانایان.

(وَلَهُ) ئەو كەسەی جومعەی لە سەر واجب نیە، بۆی دروستە (أَنْ يَنْصَرِفَ مِنَ الْجَامِعِ) پێش دابەستنی نوێژی جومعە لە مزگەوت بڕواتە دەرەوەو نوێژی جومعە نەكاو نوێژی نیوەڕۆ بكا (إلاَّ الْمَرِيضَ) تەنها پیاوی نەخۆشو (وَنَحْوَهُ) ئەو پیاوەش كە عوزری وەكو نەخۆشە -وەك پیاوی كوێر- بۆیان دروست نیە، كەوابو: (فَيَحْرُمُ انْصِرافُهُ) لە هەریەكێك لەوانە حەرامە لە مزگەوت بڕواتە دەرەوە (إنْ دَخَلَ الْوَقْتُ) ئەگەر كاتی جومعە هاتبێ، چونكە تازە گەیشتونەتە مزگەوتو ئازارو ماندوویی ڕێگە نەماوە (إلاَّ أَنْ يَزِيدَ ضَرَرُهُ) مەگەر زیانو ئازاری زیاتر ببێ (بانْتِظَارِه) بە هۆی چاوەڕوانكردنو مانەوە، ئەو كاتە دروستە بڕواتە دەرەوە بەو مەرجەی ئیقامەتی جومعە نەكرابێ، ئەگینا: حەرامە.

هەروەها بۆ ئەوانیتریش دروست نیە: نوێژی جومعە ببڕنو بڕۆنە دەرەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَتَلْزَمُ الشَّيْخَ الْهَرِمَ) نوێژی جومعە واجبە: لە سەر پیری بەساڵداچوو (وَالزَّمِنَ) هەم لە سەر پیاوی پەككەوتووش كە توانای ڕۆیشتنیان نەبێ (إنْ وَجَدَا مَرْكَباً) ئەگەر پیرو پەككەوتووەكە شتێكی سوارییان دەست بكەوێو بە سواری ئەو شتە بگەنە شوێنی جومعە، جیاوازی نیە شتەكە: هی خۆیان بێ، یان بە خواستن بێ، یان بە كرێ بێو كرێیەكەشیان دەست بكەوێ (وَلَمْ يَشُقَّ الرُّكُوبُ) بەم مەرجەش سواربوون ئازاریان نەدا.

(وَالأَعْمَى) هەروەها لە سەر پیاوی كوێریش جومعە واجبە، كە (يَجِدُ قائِداً) یەكێكی دەست بكەوێ لە ڕێگەدا دەستی ڕابكێشێ بە خۆڕایی، یان بە كرێو كرێیەكەشی دەست بكەوێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ بەندكردن بە عوزر دانراوە، بەڵام ئەگەر لە بەندیخانەدا چل پیاو، یان زیاتر كۆ بونەوە، واجبە: نوێژی جومعە بكەن، هەروەك لە (نهایة)و(مغنی)دا فەرموویانە،

وَأَهْلُ الْقَرْيَةِ إنْ كانَ فِيهِمْ جَمْعٌ تَصِحُّ به الْجُمُعَةُ أَوْ بَلَغَهُمْ صَوْتٌ عَالٍ فِي هُـدُوٍّ مِـنْ طَرَف يَلِيهِمْ لِبَلَدالْجُمُعَة لِزِمَتْهُمْ، وَإلاَّ فَلاَ،

---

بەڵام لە (تحفة)دا دەفەرموێ: واجب نیە، بەڵکو هەر دروستیش نیە لە بەندیخانەدا نوێژی جومعە بکەن، چونکە بەندیخانەی(الحجاج الثقفي)–لە سەردەمی(السلف الصالح)دا– زۆر زانای ئایینی تێدا بون‌و جومعەیان نەدەکرد.

ئینجا (إبن قاسم) ڕەخنەی لە فەرموودەی دروستنەبوون گرتوەو دەشفەرموێ: لەوانەیە ڕێگەی جومعە کردنیان نەدرابێ. ئەوەش وا دەگەیەنێ: هەرچەند جومعەیان لە سەر واجب نیە، بەڵام دروستە لە بەندیخانەدا بیکەن، ئەگەر شوێنەکە ژمارەی جومعەی تێدا دروست بێ، وَاللهُ أعْلَم.

(وَأهْلُ الْقَرْيَةِ) دانیشتووانی گوند= دێ (إنْ كانَ فِيهِمْ جَمْعٌ) ئەگەر کۆمەڵە پیاوێکی وەهایان تێدا هەبو (تَصِحُّ بِهِ الْجُمُعَةُ) بەو کۆمەڵە نوێژی جومعە دروست دەبو: وەك چل پیاوی نیشتەجێ تەواو بێ، ئەوە نوێژی جومعەیان لە سەر واجبە، هەم واجبە: لە دێیەکەی خۆیاندا بیکەن، واتە: حەرامە بۆ جومعە کردن بڕۆنە شوێنێکی‌ترو دێیەکەیان جومعەی تێدا نەکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(أوْ) یان دێیەکە چل پیاوی نیشتەجێی تێدا نەبو، بەڵام لە شوێنێکی دیکەوە: کە جومعەی تێدا دەکرا (بَلَغَهُمْ صَوْتٌ عَالٍ) بانگی بانگدەرێکی دەنگ بەرز دەگەیشتە دێیەکەیان (فِي هُدُوٍّ) لە حاڵەتی وەستانی با و کپبوونی دەنگەکاندا، هەرچەند ووشەکانی بانگیش لێك جیا نەکرێنەوە (مِنْ طَرَفٍ يَلِيهِمْ لِبَلَدِ الْجُمُعَةِ) بانگدەرەکەش لە ڕۆخێکی ئەو شوێنەوە بێ: کە جومعەی تێدا دەکرێ‌و ڕۆخەکەش بکەوێتە لای دێیەکەو گوێگری بانگەکەش لە ڕۆخی دێیەکەوە بەلای شوێنی جومعەوە بێ، جا ئەگەر بەو مەرجانە گوێیان لە دەنگی بانگ دەبو (لِزِمَتْهُمْ) ئەوانیش جومعەیان لە سەر واجبە، کەوابو: واجبە بۆ جومعە کردن بڕۆنە ئەو شوێنە، یان شوێنێکی‌تر (وَإلاَّ) بەڵام ئەگەر دێیەکە چل پیاوی نیشتەجێی تێدا نەبو، هەم دەنگی بانگی شوێنی جومعەشیان نەدەگەیشتێ (فَلاَ) ئەو کاتە جومعەیان لە سەر واجب نیە.

ئینجا بزانە: لێرەدا مەبەست زەمینێکی ڕاستانە، کەواتە: ئەگەر دێیەك لە دۆڵاییدا بوو و دەنگی بانگی نەدەگەیشتێ، بەڵام ئەگەر لە ڕاستاندا بوایە، دەیگەیشتێ، ئەوە بە ڕاستان دادەندرێ‌و جومعەیان لە سەر واجبە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر وەها ڕێك کەوت ڕۆژی هەینی بووە جەژن، جا دانیشتووانی ئەو گوندو لادێیانەی جومعەیان تێدا ناکرێ، بۆ نوێژی جەژن هاتنە ئەو شارەی، یان ئەو

وَيَحْرُمُ عَلَى مَنْ لَزِمَتْهُ اَلسَّفَرُ بَعْدَالزَّوَالِ إِلاَّ أَنْ تُمْكِنَهُ الْجُمُعَةُ فِي طَرِيقِه أَوْ يَتَضَرَّرَ بِتَخَلُّفِــهِ عَنِ الرُّفْقَةِ، وَقَبْلَ الزَّوَالِ كَبَعْدِه فِي الْجَدِيدِ إِنْ كَانَ السَّفَرُ مُبَاحاً، وَإِنْ كَانَ طَاعَةً جَازَ،

---

شوێنەی جومعەی تیَدا دەکریَ، ئەوە لە دوای نوێژی جەژن بۆیان دروستە: بڕۆنەوە بۆ شوێنەکەی خۆیانو دووبارە بۆ جومعە کردن نەگەڕێنەوەو لە شوێنیخۆیاندا نوێژی نیوەڕۆ بکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: قَدْ اجْتَمَعَ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ فَمَنْ شَاءَ أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ﴾ رواه أبوداود والبيهقي وصححه الحاكم والذهبي، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەم ڕۆژەتاندا دوو جەژن کۆبونەتەوە، جا هەر کەسێك حەز دەکا: با بڕواتەوەو نوێژیجەژنی بۆ بە بەر جومعە دەکەویَ، بەڵام ئێمە بەخۆمان نوێژی جومعە دەکەین.

ئینجا بزانە: ڕستەی﴿أَجْزَأَهُ مِنَ الْجُمُعَةِ﴾ وا دەگەیەنیَ: کە تەنها جومعەیان لە سەر لادەچیَو واجبە: نوێژی نیوەڕۆ بکەن، هەروەها ڕستەی﴿وَإِنَّا مُجَمِّعُونَ﴾ وا دەگەیەنیَ: دانیشتووانی شوێنیجومعە، جومعەیان لە سەر لاناچیَو واجبە: جومعە بکەن، وَاللهُ أَعْلَم.

دووەم: کاسبکارو جوتیارەکان کە بۆ دروێنەو کاروباری خۆیان دەڕۆنە دەرەوە، ئەگەر پێش بەیان بڕۆنو دەنگی بانگی دێیەکەی خۆیان نەگاتیَ، جومعەیان لە سەر واجب نیە، هەرچەند دەنگی بانگی شوێنێکیتریشیان گویَ لیَبیَ، هەروەك لە (الشرواني)و(بجيرمي)دا فەرموویانە، واتە: بەڵام ئەگەر دەنگی بانگی دێیەکەی خۆیان دەگەیشتیَ، ئەو کاتە واجبە: بۆ جومعە کردن بگەڕێنەوە، وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ سەفەرکردن لە ڕۆژی جومعەدا ﴾

(وَيَحْرُمُ عَلَى مَنْ لَزِمَتْهُ) لە سەر ئەو کەسەی جومعەی لە سەرە، حەرامە: (اَلسَّفَرُ بَعْدَالزَّوَالِ) بە سەفەر بچیَ لە دوای لادانی ڕۆژ بەرەو لای ڕاستە، چونکە کاتی جومعە هاتووەو جومعەی لە سەر واجب بووە (إِلاَّ أَنْ تُمْكِنَهُ الْجُمُعَةُ فِي طَرِيقِهِ) مەگەر بزانیَ لە ڕێگەدا بۆی دەگونجیَ جومعە بکا، ئەو کاتە دروستە بچێتە سەفەر، بەڵام واجبە: لە سەفەردا جومعە بکا (أَوْ يَتَضَرَّرَ بِتَخَلُّفِهِ عَنِ الرُّفْقَةِ) یان زیانێکی تووش ببیَ بە هۆی دواکەوتنی لە هاوڕێکانی سەفەرەکەی، ئەو کاتەش دروستە لەگەڵیان بڕواتە سەفەر، بەو مەرجەی سەفەری گوناهکاری نەبیَ.

(وَقَبْلَ الزَّوَالِ) پێش لادانی ڕۆژ، واتە: نێوان بەیانو لادانی ڕۆژ (كَبَعْدِهِ) وەك دوای لادانی ڕۆژ وایە: لە حەرامیو دروستیی ڕابردوودا (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نویَدا (إِنْ كَانَ السَّفَرُ مُبَاحاً) ئەگەر سەفەرەکە حەڵاڵ بیَ: وەك سەفەری بازرگانی، بەڵام (وَإِنْ كَانَ طَاعَةً) ئەگەر سەفەرەکە خواپەرستی بوو: وەك حەجو غەزا (جَازَ) دروستە بڕواتە سەفەر

قُلْتُ: اَلأَصَحُّ أَنَّ الطَاعَةَ كَالْمُبَاحِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمَنْ لاَجُمُعَةَ عَلَيْهِمْ تُسَنُّ الْجَمَاعَــةُ فِــي ظُهْرِهِمْ فِي الأَصَحِّ، وَيُخفُونَهَا إِنْ خَفِيَ عُذْرُهُمْ، وَيُنْدَبُ لِمَنْ أَمْكَنَ زَوَالُ عُذْرِهِ تَــأْخِيرُ ظُهْرِهِ إِلَى الْيَأْسِ مِنَ الْجُمُعَةِ، وَلِغَيْرِهِ كَالْمَرْأَةِ وَالزَّمِنِ تَعْجِيلُهَا،

---

(قُلْتُ) ئیمام (النـواوي) دەفـەرموێ (اَلأَصَحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتتر (أَنَّ الطَاعَةَ كَالْمُبَـاحِ) سەفەری خواپەرستیش وەکو سەفەری حەلاڵە، واتە: لە هەردووکیاندا –لـە بەیانـەوەو بـەو لاوە– حەرامە: بڕواتە سەفەرو جومعەش نەکا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

بەلام شەوی هەینی پێش بەیانو بەم لایەوە، دروستە بڕواتە سەفەر، واتـە: جومعەشـی لـە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ لاَجُمُعَةَ عَلَيْهِمْ) ئـەو کەسـانەی جومعـەیان لـە سـەر نیـە: وەکـو ئـافرەتو نـەخۆشو ڕێبوارو، هتد (تُسَنُّ الْجَمَاعَةُ فِي ظُهْرِهِمْ) سوننەتە: نوێژی نیوەڕۆیـان بـە جەماعـەت بکـەن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَيُخفُونَهَا) سوننەتە: جەماعەتەکەش بە شاراوەیی بکەن (إِنْ خَفِيَ عُـذْرُهُمْ) ئەگـەر عـوزری جومعـە نـەکردنیان شـاراوە بـوو: وەك تـرسو قـەرزداریو ئـەو جۆرانـە، تـاکو تۆمـەتی نەویستنی ئایینیان پێنەکرێ، کـەوابو: ئەگـەر عوزرەکـەیان ئاشکرا بـوو: وەکـو ئـافرەتو ڕێبوار، ئەو کاتە سوننەتە ئەوانیش جەماعەتی نیوەڕۆ بە ئاشکرا بکەن.

(وَيُنْدَبُ لِمَنْ أَمْكَنَ زَوَالُ عُذْرِهِ) بۆ ئەو کەسەی دەگونجێو چاوەڕوانی لاچونی عوزرەکـەی دەکا: وەکـو ڕێبـوارو نـەخۆشو کۆیلـە، بـۆ هەریەکـەیان سـوننەتە (تَـأْخِيرُ ظُهْـرِهِ) نوێـژی نیوەڕۆی دوا بخا (إِلَى الْيَـأْسِ مِـنَ الْجُمُعَـةِ) تـا لـە جومعـە کردن بێئومێد دەبـێ، واتـە: تـا جومعـەی لـە دەسـت دەچـێ: بـەوەی ئیمـامی جومعـە لـە ڕوکـووعی دووەم هەڵسـێتەوە، کەوابو: ئەگەر پێش دابەستنیجومعە، ئەوانە نوێژی نیوەڕۆیان کـرد، نوێژەکـەیان دروسـت دەبێو ئەگەر لە دوای نوێژەکە فریای جومعەش بکەون، واجـب نیـە جومعـە بکـەن، بـەڵکو سوننەتە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەلام (وَلِغَيْرِهِ) بۆ ئـەو کەسـەی کـە ناگونجـێ عوزرەکـەی لابچـێ (كَـالْمَرْأَةِ وَالـزَّمِنِ) وەکـو ئافرەتو پەككەوتوو، سوننەتە (تَعْجِيلُهَـا) زوو نوێـژی نیـوەڕۆ بکـا تـاکو خێـری سـەرەتای کاتی لە دەست نەچێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەوەیڕابردوو دەربارەی ئەو کەسانە بـوو: کـە عوزریـان هـەبێ، بـەلام ئـەو کەسـەی جومعـەی لـە سـەرەو هـیچ عوزریشـی نیـە، دروسـت نیـە: نوێـژینیوەڕۆ بکـا تـا جومعەی لە دەست دەچێ: بەوەی ئیمامی جومعە لە ڕوکووعی دووەم هەڵسێتەوە، واتـە: ئەگەر پـێش لـە دەستچـوونی جومعـە نوێـژی نیـوەڕۆی کـرد، نوێژەکـەی بەتاڵـەو دروسـت نابێ، چونکە واجبی خۆی –کە جومعەیە– بە جێ نەهێناوە.

وَلِصِحَّتِهَا مَعَ شَرْطِ غَيْرِهَا شُرُوطٌ: أَحَدُهَا وَقْتُ الظُّهْرِ فَلاَ تُقْضَى جُمُعَةً، فَلَوْ ضَاقَ عَنْهَا صَلَّوْا ظُهْراً، وَلَوْ خَرَجَ وَهُمْ فِيهَا وَجَبَ الظُّهْرُ بِنَاءً وَفِي قَوْلٍ اسْتِئْنَافاً، وَالْمَسْبُوقُ كَغَيْرِهِ، وَقِيلَ:

---

کەوابو: ئەگەر دانیشتووانی دێیەك -کە چل پیاو، یان زیاتر بون- بە تێکڕایی جومعەیان نەکرد، ئەوە گشتیان گوناهبارن‌و بۆ هیچێکیان دروست نیە: نوێژی نیوەڕۆ بکەن تا لە جومعە کردن بێئومێد دەبن: بەوەی لە کاتەکەی نیوەڕۆ بەشی دوو خوتبەو نوێژی جومعە نەمێنێ، واتە: ئەگەر نوێژی نیوەڕۆیان کرد، نوێژەکەیان بەتاڵەو دروست نابێ، چونکە واجبی خۆیان -کە جومعەیە- بەجێ نەهێناوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ مەرجەکانی دروستبوونی جومعە ﴾

(وَلِصِحَّتِهَا) بۆ دروستبوونی‌نوێژی‌جومعە -(مَعَ شَرْطِ غَيْرِهَا) لەگەڵ پێنج مەرجەکانی‌تر: کە لە باسی مەرجەکانی‌نوێژدا ڕابران- (شُرُوطٌ) پێنج مەرجی‌تریش پێویستن:

(أَحَدُهَا) مەرجی‌یەکەم: (وَقْتُ الظُّهْرِ) دەبی جومعە -بە هەردوو خوتبەکانیەوە- لە کاتی نیوەڕۆدا بکرێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ نوێژی جومعەی لەو کاتەدا دەکرد کە ڕۆژ بەلای ڕاستەدا لای دەدا.

کەوابو: ئەگەر نوێژی جومعە لە کاتی نیوەڕۆدا نەکراو فەوتا (فَلا تُقْضَى جُمُعَةً) بە جومعەیی -بە دوو ڕەکعەتی- قەزا ناکرێتەوە، بەڵکو واجبە: -بە چوار ڕەکعەتی- نیوەڕۆ قەزا بکرێتەوە بە (إجماع)ی زانایان، هەروەها (فَلَوْ ضَاقَ عَنْهَا) ئەگەر کاتەکە تەنگ بوو: بەشی واجبی دوو خوتبەو دوو ڕەکعەتەکەی جومعە نەمابو (صَلَّوْا ظُهْراً) واجبە: یەکسەر نوێژی نیوەڕۆ بکەن، واتە: دروست نیە دەست بە جومعە بکەن‌و دروستیش نیە: چاوەڕوانی بەسەرچوونی کاتی نوێژ بکەن.

(وَلَوْ خَرَجَ) ئەگەر کاتەکە نەما (وَهُمْ فِيها) لەو حاڵەتەی ئەوان لە ناو نوێژی جومعەدا بون‌و هێشتا سەلامیان نەدابۆوە (وَجَبَ الظُّهْرُ) واجبە چوار ڕەکعەتی نیوەڕۆ بکەن (بِنَاءً) لە سەر بەشە کراوەکەی‌جومعە تەواوی دەکەن‌و پێویست بە نیەتی نیوەڕۆ ناکا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (إِسْتِئْنَافاً) لە سەرەتاوە دەست بە نوێژی نیوەڕۆ دەکەنەوە.

(وَالْمَسْبُوقُ) مەئمومی دواکەوتوو (كَغَيْرِهِ) وەکو مەئمومەکانی‌ترە، واتە: ئەگەر ڕەکعەتێکی کردو ئیمامەکەی سەلامی داوە، ئەویش هەڵساوە بۆ ڕەکعەتی دووەم بەڵام پێش سەلام بداتەوە کاتەکە نەما، ئەویش واجبە: بە چوار ڕەکعەتی نیوەڕۆ تەواو بکا (وَقِيلَ) لە

يُتمُّهَا جُمُعَةً. اَلثَّاني: أَنْ تُقَامَ فِي خِطَّةِ أَبْنِيَةِ أَوْطَانِ الْمُجَمِّعِينَ، وَلَوْ لاَزَمَ أَهْلُ الْخِيَامِ الصَّحْرَاءَ أَبَداً فَلاَ جُمُعَةَ فِي الأَظْهَرِ.

---

فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُتِمُّهَا جُمُعَةً) بە دوو ڕەکعەتی جومعە تەولو دەکا، واتە: جگە لەو ڕەکعەتەی لە پشت ئیمام کردویەتی تەنها ڕەکعەتێکیتر دەکاو سەلام دەداتەوە.

(اَلثَّانِي) مەرجیدووەم: (أَنْ تُقَامَ) دەبێ جومعە بکرێ (فِي خِطَّةِ أَبْنِيَةِ أَوْطَانِ الْمُجَمِّعِينَ) لە سنووری خانووەکانی وولاتی ئەو پیاوانەدا: کە جومعە دەکەن، جا شوێنەکە: شار بێ، یان دێ بێ، لە سەرچاوەکاندا بەڵگەیان بەوە هێناوە: ﴿کە لە سەردەمی پێغەمبەرو ﷺ هەر چوار خەلیفەکان ﷺ نوێژی جومعە تەنها لە ناو شاردا، یان لە ناو دێدا کراوە، لە هیچ حەدیسێکدا نەهاتوە جومعە لە دەرەوەی شار، یان لە دەرەوەی دێ کرابێ﴾.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي﴾ رواه البخاري، نوێژ بکەن بەو جۆرەی منتان دیت نوێژم کرد.

جا بە بەڵگەی ئەو حەدیسانە: ئەگەر خەڵکەکە –بۆ جومعە کردن– چوونە دەرەوەی شار، یان دەرەوەی دێ، جومعەکەیان دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵام مەرج نیە: جومعە لە ناو مزگەوتدا بکرێ، بەڵکو ئەگەر لە گۆڕەپانێکیشدا بکرێ جومعەکە دروستە، بەو مەرجەی گۆڕەپانەکە لە سنووری شارەکەدا، یان دێیەکەدا بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر شارێك، یان دێیەك وێران بوو، ئینجا خەڵکی دێیەکە لە سەری نیشتەجێ بون بۆ ئاوەدانکردنەوەی، لەو حاڵەتەشدا واجبە: جومعە بکەن، چونکە وولاتیخۆیانە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، لێرەدا مەبەست بە ئاوەدانکردنەوە ئەوەیە: لە دێیەکە نەگوازنەوە شوێنێکیتر، هەر چەند مەبەستی خانووکردنەوەشیان نەبێ، هەروەك لە (القليوبي)و(بجيرمي)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ لاَزَمَ أَهْلُ الْخِيَامِ الصَّحْرَاءَ) ئەگەر ڕەشماڵ نیشینەکان هەر لە چۆڵو بیاباندا بون (أَبَداً) بە بەردەوامی (فَلاَجُمُعَةَ) ئەوە جومعەیان لە سەر نیەو دروستیش نیە: لە هۆبە ڕەشماڵەکاندا جومعە بکەن (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بە هێزتردا، جیاوازی نیە: لە زستانو هاویندا هەر لە یەك شوێندا بمێننەوە، یان بگوازنەوە شوێنێکیتر ﴿چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ڕەشماڵ نیشینەکانی دەرەوەی (مدينة) نەکردوە جومعە بکەن﴾، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو بەڵگەیان هێناوەو هەم فەرموویانە: ئەگەر ڕەشماڵ نیشینەکان دەنگی بانگی شوێنێکی جومعەیان دەگەیشتێ، جومعەیان لە سەر واجب دەبێ، کەوابو: واجبە بۆ جومعە کردن بڕۆنە شوێنەکەی جومعە.

اَلثَّالِثُ: أَنْ لاَ يَسْبِقَهَا وَلاَ يُقَارِنَهَا جُمُعَةٌ فِى بَلْدَتِهَا إِلاَّ إِذَا كَبُرَتْ وَعَسُرَ اجْتِمَاعُهُمْ فِـــى مَكَانٍ،

---

﴿ ئاگـــاداری ﴾: ئەگـەر کاربەدەسـتێك دانیشـتووانی شـارێك، یـان دێیـەکی بـە زۆرلێکـردن گوازتنەوە شوێنێکیتروو لە وێدا نیشتەجێ بون، بـەڵام مەبەستیان ئـەوها بـوو: هـەر کاتێـك بۆیان بگونجێ بگەڕێنەوە شارەکەیخۆیان، یان دێیەکەیخۆیان، ئەوانـە جومعـەیان لـە سـەر نیەو دروستیش نیە: لەو شوێنەدا جومعە بکەن، چونکە لـەو شـوێنەدا وولاتنیشـی یـەکجاری نـینو نەبووەتـە وولاتیخۆیـان، هـەروەك لـە (تحفـة)و (نهایـة)دا ئـەو مەسـەلەیە روون کراوەتەوە، بەڵام ئەگەر گوێیان لە بانگی گوندێکیتر دەبو، واجبە: بۆ جومعـە کـردن بچـنە ئەوێ، هەروەها ئەگەر مەبەستیان ئەوەبێ نەگەڕێنەوە شارو دێیەکەی خۆیـان، ئـەو کاتـەش دروستە لە شوێنەکەدا جومعە بکەن، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویـەتی، کـەوابو: ئەگـەر تەنها چل پیاو مەبەستیان ئەوە بێ: نەگەڕێنەوە شـارو دێیـەکانیان، ئـەو ژمارەیـە بەسـە بـۆ دروستبوونی جومعەی گشت خەڵکەکە، وَاللهُ أَعْلَم.

(الثَّالِثُ) مەرجیسێیەم: (أَنْ لاَيَسْبِقَهَا) نابـێ هـیچ جومعەیـەکیتر پـێش ئـەم جومعەیـە بکرێو (وَلاَ يُقَارِنَهَا جُمُعَةٌ) نابێ هـیچ جومعەیـەکیتریش لەگـەڵ ئـەم جومعەیـە بکـرێ (فِـى بَلْدَتِهَا) لەو شوێنەی ئەم جومعەیەی تێدا دەکرێ، واتە: لـە هـیچ دێیـەكو لـە هـیچ شـارێك دروست نیە لە جومعەیەك زیاتر بکرێ: نە لەگەڵ یـەکترو نـە لـە دوایـیەکتر؟ ﴿چونکە لـە سەردەمی پێغەمبەروﷺ هەر چوار خەلیفەکان لە هـەر شـوێنێکدا تـەنها یـەك جومعـە کراوە، لەگەڵ ئەوەش هەر لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ لە (مدینـة)ی پیرۆزدا –جگـە لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبـەرﷺ– نـۆ مزگـەوتیـتر هـەبون، گشـتیان نوێـژیان تـێدا دەکـرا، بەڵام لە هیچ حەدیسێکدا نەهاتوە: پێغەمبـەرﷺ یـان هـەر چوار خەلیفـەکان ئیزنیـان دابێ –جگـە لـە مزگـەوتی پێغەمبـەرﷺ– لـە یـەکێك لـەو مزگەوتانـەدا جومعەیـەکیتر بکرێ﴾. هەروەك ئیمام (إبن حجر العسقلاني) –بۆ ئـەو مەسـەلەیە– ئـەو حەدیسـانەی لـە (التلخیص)دا بە بەڵگە هێناون.

(إِلاَّ إِذَا كَبُرَتْ) مەگەر شارەکە گەورە بێو (وَعَسُرَ اجْتِمَـاعُهُمْ فِـى مَكَانٍ) زەحمـەت بـێ: لـە یـەك شـوێندا خەڵکەکـە کۆ ببێتـەوە بـۆ جومعـە کـردن، ئـەو کاتـە دروسـتە: بـە گوێـرەی پێویست لە جومعەیـەك زیـاتر بکـرێ، بـەڵام لێرەشـدا مـەرج نیـە: شـوێنەکە مزگـەوت بـێ، واتە: ئەگەر لە هۆڵێك، یان لە گۆڕەپانێکدا دەگونجا بـۆ جومعـە کـردن کـۆ ببنـەوە، ئـەوە واجبە: تـەنها لـەوێدا یـەك جومعـە بکـەن، دوو جومعـەو زیـاتر دروسـت نیـە، هـەروەك لـە زۆربەی سەرچاوەکاندا بە ئاشکرایی دەفامێتەوە.

وَقِيلَ لاَ تُسْتَثْنَى هَذه الصُّورَةُ، وَقِيلَ إنْ حَالَ نَهْرٌ عَظِيمٌ بَيْنَ شقَّيْهَا كَانَا كَبَلَدَيْن، وَقِيلَ إنْ كَانَتْ قُرًى فَاتَّصَلَتْ تَعَدَّدَت الْجُمُعَةُ بعَدَدهَا، فَلَوْ سَبَقَهَا جُمُعَةٌ فَالصَّحيحَةُ السَّابقَةُ،

هەروەها لێرەدا مەبەست ئەو کەسانەیە: کە بە ئەغڵەبی دێنە جومعە کردن، واتە: ئەگەر ئەو کەسانە لە یەك شوێندا جێگەیان نەدەبۆوە، ئەوکاتە دروستە: لە جومعەیەك زیاتر بکرێ بەگوێرەی پێویست، بەڵام زیاتر لە پێویست بەتاڵەو دروست نابێ، واتە: ئەگەر پێویستیەکە بە دوو جومعە پێك دەهات ئەوە جومعەکەی سێیەم بەتاڵەو دروست نابێ ...بەو جۆرە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها ئەگەر خەڵکەکە جەنگو دوژمنایەتی لە نێوانیاندا بوو، ئەو کاتەش دروستە دوو جومعە بکرێن، کەواتە: هەر لایەنێك ئەگەر چل پیاو تەواو بوون، واجبە: لە لای خۆیان جومعە بکەن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (لاَ تُسْتَثْنَى هَذِهِ الصُّورَةُ) ئەو وێنەیەش جیا ناکرێتەوە، واتە: هەرچەند کۆبوونەوەش لە یەك شوێندا زەحمەت بێ، لە یەك جومعە زیاتر دروست نیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا (إنْ حَالَ نَهْرٌ عَظِيمٌ بَيْنَ شِقَّيْهَا) ئەگەر ڕووبارێکی گەورە کەوتە نێوان ئەم بەرو ئەو بەری شارەکە (كَانَا كَبَلَدَيْنِ) هەردوو لایەکانی وەکو دوو شارن، واتە: لە هەر لایەکدا جومعەیەك دروستە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا (إنْ كَانَتْ قُرىً) ئەگەر شارەکە لە پێشدا چەند دێیەك بوبێو (فَاتَّصَلَتْ) ئینجا یەکتریان گرتبێتەوەو بوبنە یەك شار (تَعَدَّدَتِ الْجُمُعَةُ بِعَدَدِهَا) ئەو کاتەش بە گوێرەی ژمارەی دێیەکان ژمارەیجومعەکانیش دروستە.

جا لەو چوار فەرموودانە، تەنها فەرموودەکەیەکەم ڕاستە: کە بە گوێرەیپێویست لە جومعەیەك زیاتر دروستە. لە (المجموع)دا بەڵگەی بەم ئایەتە هێناوە: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾ خوایگەورە لە ئاییندا هیچ زەحمەتێکی نەخستۆتە سەر ئێوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە هەر شوێنێکدا بە گوێرەی پێویست لە جومعەیەك زیاتر کراو نەیزانی جومعەکەیوی پێش ئەویتر کەوتوە، سوننەتە: بە چوار ڕەکعەتی نوێژی نیوەڕۆ دووبارە بکاتەوە، تاکو لە جیاوازی ئەو فەرموودانە ڕزگاری ببێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لە هەر شوێنێکدا لە جومعەیەك زیاتر دروست نەبو-چونکە پێویستی نەبو- لەگەڵ ئەوەشدا دوو جومعە، یان زیاتری تێدا کران، ئەو کاتە (فَلَوْ سَبَقَهَا جُمُعَةٌ) ئەگەر جومعەیەك پێش ئەویتر کرا (فَالصَّحِيحَةُ السَّابِقَةُ) ئەوە یەکەمەکە-کە پێشدا کراوە- دروست بووەو ئەوەیدوایوی بەتاڵەو دروست نەبووە، کەواتە: واجبە ئەوانە-بە چوار ڕەکعەتی- نوێژی نیوەڕۆ دووبارە بکەنەوە.

وَفِي قَوْلٍ إِنْ كَانَ السُّلْطَانُ مَعَ الثَّانِيةِ فَهِيَ الصَّحِيحَةُ، وَالْمُعْتَبَرُ سَبْقُ التَّحَرُّمِ وَقِيلَ التَّحَلُّلِ وَقِيلَ بِأَوَّلِ الْخُطْبَةِ، فَلَوْ وَقَعَتَا مَعاً أَوْ شَكَّ أُسْتُؤْنِفَت الْجُمُعَةُ، وَإِنْ سَبَقَتْ إِحْدَاهُمَا وَلَمْ تَتَعَيَّنْ أَوْ تَعَيَّنَتْ وَنُسِيَتْ صَلَّوْا ظُهْراً وَفِي قَوْلٍ جُمُعَةً. اَلرَّابِعُ: اَلْجَمَاعَةُ، وَشَرْطُهَا كَغَيْرِهَا،

---

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (إِنْ كَانَ السُّلْطَانُ مَعَ الثَّانِيةِ) ئەگەر گەورەی شار لەگەڵ دووەمەکەدا بوو (فَهِيَ الصَّحِيحَةُ) ئەو کاتە جومعەکەی دووەم دروستە، بەڵام لە فەرموودەی ڕاستردا ئەو کاتەش هەر یەکەمەکە دروستە (وَالْمُعْتَبَرُ) ئەوەی لە فەرموودەی ڕاستدا ڕەچاو کراوە بۆ وەپێشکەوتن (سَبْقُ التَّحَرُّمِ) وە پێشکەوتنی (الله أكبر)ی نوێژدابەستنە، واتە: کامەیان پێشدا (الله أكبر) بڵێ، ئەویان یەکەمەو دروستە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (اَلتَّحَلُّلِ) وە پێشکەوتنی سەلامدانەوەیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی‌تری بێهێزدا (بِأَوَّلِ الْخُطْبَةِ) بە سەرەتای خوتبەکەوە ڕەچاو دەکرێ.

جا ئەوەی‌ڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو: کە جومعەیەک لە دوای‌جومعەیەک بکرێ، بەڵام (فَلَوْ وَقَعَتَا مَعاً) ئەگەر هەردوو جومعەکان وێکڕا کران (أَوْ شَكَّ) یان گومان پەیدا بوو: نەزاندرا کامەیان پێشدایە (أُسْتُؤْنِفَتِ الْجُمُعَةُ) واجبە: هەردوو لا پێکەوە یەک جومعە لە سەرتاوە بکەنەوە، واتە: دروست نیە: هەر لایەو جومعەیەک بکەنەوە؟ چونکە سوودی نیە، دروستیش نیە نوێژی نیوەڕۆ بکەن؟ چونکە ماوەی‌جومعە ماوەو هێشتاش جومعەیەکی دروستبوو نەکراوە، هەروەک لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِنْ سَبَقَتْ إِحْدَاهُمَا) ئەگەر جومعەیەک پێش ئەوانی‌تر کرا (وَلَمْ تَتَعَيَّنْ) بەڵام دیار نەبو کام جومعەیە (أَوْ تَعَيَّنَتْ) یان دیار بوو کامەیە، بەڵام (وَنُسِيَتْ) لە بیر کرابو (صَلَّوْا ظُهْراً) واجبە: هەردوو لا‌-لە دوای جومعە- نوێژی‌نیوەڕۆش بکەن؟ چونکە نەزاندراوە جومعە درووستبووەکە کامەیانە، کەواتە: لە بنچینەدا گشتیان واجبەکەیان لە ئەستۆدا ماوە، جا لە بەر ئەوەی لە ڕاستی‌دا جومعەیەکی‌دروستبووش کراوە، دروست نیە جومعەیەکی‌تر بکرێ (وَفِي قَوْلٍ جُمُعَةً) لە فەرموودەیەکدا: واجبە گشتیان جومعەیەکی‌تر بکەن، بەڵام فەرموودەکەی‌تر ڕاسترە.

(الرَّابِعُ) مەرجی‌چوارەم: (اَلْجَمَاعَةُ) دەبی نوێژی‌جومعە بە جەماعەت بکرێو پیاویش ئیمامەتی جەماعەتەکە بکا، بە بەڵگەی (إجماع)ی زانایانی ئیسلام.

(وَشَرْطُهَا) مەرجی جەماعەتی جومعە (كَغَيْرِهَا) وەکو مەرجی جەماعەتی نوێژەکانی‌ترە، واتە: ئەو حەفت مەرجانەی لە باسی جەماعەتدا ڕابران، واجبە: لە جەماعەتی جومعەشدا بێنە جێ، بەڵام لە جومعەدا لە سەر ئیمامەکەش واجبە: نیەتی ئیمامەتی بێنێ، هەروەک لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَأَنْ تُقَامَ بِأَرْبَعِينَ مُكَلَّفاً حُرّاً ذَكَرَاً مُسْتَوْطِناً لاَ يَظْعَنُ شِتَاءً وَلاَ صَيْفاً إلاَّ لِحَاجَةٍ،

هەروەها (وَأَنْ تُقَامَ بِأَرْبَعِينَ) مەرجە: جەماعەتی جومعە -لایکەم- بە چل پیاو بکرێ، ئینجا بزانە: جەماعەت تەنها لە ڕەکعەتی یەکەمیجومعەدا مەرجە، بەڵام هەبوونی چل پیاوەکە لە سەرەتای خوتبەوە تا سەلامدانەوەی گشتیان مەرجە، کەواتە: ئەگەر ئیمام ڕەکعەتییەکەمی بۆ چل پیاو بە جەماعەت کرد، ئینجا بێدەستنوێژ بوو، ئەو کاتە دروستە: هەرکەسە بۆ خۆی ڕەکعەتەکەیدووەم بە تەنهایی تەواو بکا، جومعەکەشیان دروست دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر لە چل پیاو تەنها یەك پیاو پێش سەلامدانەوەیگشتیان بێدەستنوێژ ببێ، ئەو کاتە جومعەی گشتیان بەتاڵ دەبێ، چونکە ژمارەی چل پیاو لە نوێژدا کەم بۆتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتیو، لەمەودواش زیاتر ڕوونی دەکەینەوەإن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

بەڵگە: ﴿عَنْ كَعْب بن مَالكٍ ﷺ: أَوَّلُ مَنْ جَمَّعَ بِنَا أَسْعَدُ بنُ زُرَارَةَ فِي نَقِيعِ الْخَضِمَاتِ، قِيلَ: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ أَرْبَعُونَ﴾ حديث حسن رواه أبوداود وابن حبان والبيهقي، یەکەم کەس کە نوێژی جومعەی بە ئێمە کرد لە (مدینة)ی پیرۆزدا، (أسعد بن زرارة) بوو، ئێمە لەو کاتدا چل پیاو بوین. واتە: چونکە لە هیچ حەدیسێکدا نەهاتوە: بە کەمتر لە چل پیاو جومعە کرابێ، بۆیێ مەرجە: چل پیاو هەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەوها حەدیسەکەیان کردۆتە بەڵگەی ئەو مەسەلەیە.

ئینجا بزانە: مەرجە: هەر یەکێك لەو چل کەسەش (مُكَلَّفاً) داوا لێکراوی شەرعی بێ، واتە: بالغو عاقڵ بێ (حُرّاً) ئازاد بێ (ذَكَراً) نێر بێ، واتە: ژمارەی چل کەسەکەی جومعە بە منداڵو شێتو کۆیلەو ئافرەت تەواو نابێ، چونکە جومعەیان لە سەر واجب نیە (مُسْتَوْطِناً) هەروەها: وڵاتنیشی یەکجاری بێ لە شوێنی جومعەکەدا، واتە: (لاَ يَظْعَنُ) لە شوێنی جومعە لا نەچێ (شِتَاءً وَلاَ صَيْفاً) نە زستانو نە هاوین (إلاَّ لِحَاجَةٍ) تەنها بۆ پێویستی نەبێ: وەکو بازرگانیو سەردانو...ئەو جۆرە کارانە.

کەواتە: ژمارەی چل کەسەکەیجومعە بەو پیاوانە تەواو نابێ: کە لە دەرەوەی شوێنەکە دەنگی بانگیان دەگاتێو دێنە جومعە کردن؟ چونکە وڵاتنیشی شوێنی جومعەکە نین، هەروەها: ژمارەی چل کەسەکە بە ڕێبواریش تەواو نابێ؟ چونکە جومعەی لە سەر واجب نیە، هەروەها ژمارەکە بەو نیشتەجێیەش تەواو نابێ: کە نیەتی مانەوەی چوار ڕۆژ یان زیاتری هێناوە، هەرچەند ماوەیەکی زۆریش لە شوێنی جومعەدا بمێنێتەوە: وەکو قوتابیو بازرگانو سەربازو...ئەو جۆرە کەسانە؟ چونکە ئەوانە وڵاتنیشی یەکجاری نین، بەڵام بە هۆی نیشتەجێیی جومعەیان لە سەر واجب بووە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەوهایان ڕوون کردۆتەوە.

وَالصَّحِيحُ انْعِقَادُهَا بِالْمَرْضَى، وَأَنَّ الإِمَامَ لاَ يُشْتَرَطُ كَوْنُهُ فَوْقَ أَرْبَعِينَ، وَلَـوِ انْفَـضَّ الأَرْبَعُونَ أَوْ بَعْضُهُمْ فِي الْخُطْبَةِ لَمْ يُحْسَبِ الْمَفْعُولُ فِي غَيْبَتِهِمْ،

(وَالصَّحِيحُ) فـەرمووده‌ی ڕاسـت (اِنْعِقَادُهَـا بِالْمَرْضَـى) جومعـه دادەمـەزرێ بـه پیـاوانی نەخۆش، چونکه نەخۆش گشت مەرجەکانی تەواوە، بەلام بۆ بارسووکی ڕێگـەی دراوەتـێ جومعـه نـەکا، کـەوابو: لـه چـل پیاوەکـان دەژمێـردرێ (وَأَنَّ الإِمَـامَ لاَ يُشْـتَرَطُ كَوْنُـهُ فَـوْقَ أَرْبَعِينَ) هەم بە فەرموودەی ڕاست: مەرج نیه ئیمامی جومعه له ژمارەی چـل پیاوەکـه بـه سەرەوەتر بێ، بـەو مەرجـەی سیفەتەکانی دروسـتبوونی جومعـەی لێبێنـه جـێ، کەواتـه: دروسته مەئموومەکان سی‌و نۆ بن‌و بە ئیمامەکەوە ژمارەی چـل پیـاو تـەواو ببـێ، چـونکه حەدیسەکەی (كعب)ی‌ڕابردوو ئەوها دەگەیەنێ.

﴿ئاگاداری﴾ یەکەم: ئەگەر خـەلکی دێیـەك چـوونه هاوینەهـەوارەکانیان، دروسـت نیـه: لـه هاوینەهەوارەکەدا جومعه بکەن، بەلام ئەگەر بۆ جومعه کردن بگەڕێنـەوە دێیەکـەی خۆیـان‌و لەوێدا جومعه بکەن، لەو حالەتەدا جومعەکەیان دروستەو دادەمـەزرێ، هـەروەها ئەگـەر لـه هاوینەهەوارەکەدا دەنگی بانگی شوێنێکی جومعـەیان دەگەیشـتێ، ئـەو کاتـه جومعـەیان لـه سەر واجب دەبێ، جا ئەگەر بۆ جومعـه کـردن نەگەڕێنـەوە دێیەکـەی خۆیـان، واجبـه: بچـنه شوێنی جومعەکەو لەوێدا جومعه بکەن، هەروەك له (تحفة) دا ڕوونی کردۆتەوە.

دووەم: له فەرموودەیەکی کۆنی ئیمـامی(الشـافعي)دا: جومعـه بـه چـوار کەسـان دروسـت دەبێ، هەروەك له (المجموع)دا گێڕاویەتیەوەو بە نامۆشـی دانـاوەو ڕدی کردۆتـەوە، بـەلام لەگـەلّ ئەوەشـدا فـەرموودەی ئیمـام (أبوحنیفـه)ش ئەوهایـەو زۆر لـه زانایـانی مەزهـەبی (الشـافعي)ش دلّیـان بـۆ لای ئـەم فەرموودەیـه چـووە، هـەروەك لـه (بغيةالمسترشـدين)دا فەرموویـەتی. کـەوابو: ئەگـەر دانیشـتووانی دێیـەك-گونـدێك لـه چـل پیـاو کـەمتر بـون، دروسـتە: بـەو فـەرموودە کۆنـه بـێ‌هێزە ڕەفتـار بکـەن‌و جومعـه بکـەن، ئینجـا لـه دوای جومعەش-بۆ پارێزکاری- نوێژی نیوەڕۆش بکـەن، چـونکه جومعـه زۆر گەورەیـەو کردنـی له نەکردن باشترە. بۆ دلّنیایی بڕوانە (حاشية إعانةالطالبين).

(وَلَوِ انْفَضَّ الأَرْبَعُونَ) ئەگەر چل پیاوەکـەی جومعـه پـەرت بون‌و ڕۆیشـتن (أَوْ بَعْضُـهُمْ) یـان هەندێکیان پەرت بون‌و کـەمتر لـه چـل پیـاو مانـەوە، یـان بـه هۆیـەکی‌تر کـەم بونـەوە: وەك یەکێکیان بمرێ، یان بێ‌هۆش بێ (فِي الْخُطْبَةِ) کەمبوونەوەکە، یـان پەرتبوونەکـەش لـه کـاتی خوتبەدا بوو (لَـمْ يُحْسَـبُ الْمَفْعُـولُ فِـي غَيْبَـتِهِمْ) ئـەو ڕوکنـەی لـه کـاتی دیارنـەبوونی ئەوانـدا کراوە بە بەر خوتبە ناکەوێ، چونکه مەرجە: چل پیاو گوێیان لـه گشـت ڕوکنـەکانی هـەردوو خوتبەکان ببێ، کەواتە ئەگەر چل پیاو تەواو نەبون، دروست نیه دەست بـه خوتبـەکان بکـا، تا تەواو دەبن‌و گوێیان لێدەبێ، هەروەك له (المجموع)دا فەرموویەتی.

**وَيَجُوزُ الْبِنَاءُ عَلَى مَامَضَى إِنْ عَادُوا قَبْلَ طُولِ الْفَصْلِ، وَكَذَا بِنَاءُ الصَّلاَةِ عَلَى الْخُطْبَةِ إِن انْفَضُّوا بَيْنَهُمَا، فَإِنْ عَادُوا بَعْدَ طُولِه وَجَبَ الإِسْتِئْنَافُ فِي الأَظْهَرِ، وَإِن انْفَضُّوا فِي الصَّلاَةِ بَطَلَتْ وَفِي قَوْلٍ لاَ إِنْ بَقِيَ إِثْنَانِ، وَتَصِحُّ خَلْفَ الْعَبْدِ وَالصَّبِيِّ وَالْمُسَافِرِ فِي الأَظْهَرِ إِذَا تَمَّ الْعَدَدُ بِغَيْرِه،**

---

(وَيَجُوزُ الْبِنَاءُ) دروسته خوتبه‌كه‌ی ده‌ست پێبكاته‌وه (عَلَى مَامَضَى) له سه‌ر ئه‌و به‌شه‌ی پێش په‌رتبوون گوتویه‌تی (إِنْ عَادُوا قَبْلَ طُولِ الْفَصْلِ) ئه‌گه‌ر په‌رتبووه‌كان گه‌ڕانه‌وه پێش ئه‌وه‌ی ماوه‌یه‌كی درێژ بكه‌وێته نێوان (وَكَذَا بِنَاءُ الصَّلاَةِ) هه‌روه‌ها دروسته: نوێژه‌كه‌ش ده‌ست پێ بكا (عَلَى الْخُطْبَةِ) له سه‌ر خوتبه‌كه (إِن انْفَضُّوا بَيْنَهُمَا) ئه‌گه‌ر له نێوان خوتبه‌كه‌و دابه‌ستنی نوێژه‌كه‌دا په‌رت بون‌و زوو گه‌ڕانه‌وه.

به‌لام (فَإِنْ عَادُوا بَعْدَ طُولِه) ئه‌گه‌ر له‌و دوو مه‌سه‌له‌یه‌دا په‌رتبووه‌كان پاش ماوه‌یه‌كی درێژ گه‌ڕانه‌وه (وَجَبَ الإِسْتِئْنَافُ) له هه‌ردوو مه‌سه‌له‌دا واجبه: له سه‌ره‌تاوه هه‌ردوو خوتبه‌كان دووباره بكاته‌وه، ئینجا نوێژی جومعه دابه‌ستێ (فِي الأَظْهَرِ) له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا، چونكه ﴿پێغه‌مبه‌ر ﷺ خه‌لیفه‌كان خوتبه‌و نوێژی جومعه‌یان هه‌ر به دوای یه‌كدا كردوه‌و نێوانیان نه‌خستۆته‌﴾.

(وَإِن انْفَضُّوا فِي الصَّلاَةِ) به‌لام ئه‌گه‌ر چل پیاوه‌كه له ناو نوێژی جومعه‌دا په‌رت بون، یان به هۆیه‌كی‌تر ژماره‌یان كه‌م بۆوه (بَطَلَتْ) جومعه‌ی گشتیان به‌تاڵ ده‌بێ، چونكه هه‌بوونی چل پیاو مه‌رجه له سه‌رتای خوتبه‌وه تا گشت مه‌ئمومه‌كان سه‌لامی نوێژی جومعه ده‌ده‌نه‌وه، كه‌وابو: ئه‌گه‌ر ته‌نها یه‌ك پیاو له‌و چل پیاوه له ناو نوێژدا بێهۆش بوو، یان مرد، یان به هۆیه‌كی‌تر نوێژی به‌تاڵ بوو، ئه‌وه جومعه‌ی گشتیان به‌تاڵ ده‌بێ، جا ئه‌وانه‌ی ماونه‌وه، واجبه: به چوار ڕه‌كعه‌تی نوێژی نیوه‌ڕۆ ته‌واو بكه‌ن، چونكه ژماره‌ی چل پیاو كه‌م بۆته‌وه، هه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا ڕوون كراوه‌ته‌وه (وَفِي قَوْلٍ) له فه‌رمووده‌یه‌كدا (لاَ) جومعه‌كه به‌تاڵ نابێ (إِنْ بَقِيَ إِثْنَانِ) ئه‌گه‌ر دوو پیاو له پشت ئیمام بمێننه‌وه، چونكه جه‌ماعه‌ته‌كه ماوه، به‌لام فه‌رمووده‌ی یه‌كه‌م ڕاستتره.

(وَتَصِحُّ) نوێژی جومعه دروسته‌و داده‌مه‌زرێ (خَلْفَ الْعَبْدِ) له پشت كۆیله‌و (وَالصَّبِيِّ) له پشت منداڵی نێرینه‌ی فامیده‌و (وَالْمُسَافِرِ) له پشت ڕێبوار (فِي الأَظْهَرِ) له فه‌رمووده‌ی به‌هێزتردا، واته: دروسته هه‌ر یه‌كێك له‌و سێیانه ببێته ئیمامی جومعه (إِذَا تَمَّ الْعَدَدُ بِغَيْرِه) به‌و مه‌رجه‌ی ژماره‌ی چل پیاوه‌كه—به بێ ئه‌و ئیمامه— به‌وانی‌تر ته‌واو ببێ.

به‌لام ئه‌گه‌ر ئیمامه‌كه: ئافره‌ت بێ، یان كافر بێ، یان ژماره‌ی چل پیاوه‌كه به ئیمامێكی كۆیله، یان منداڵ، یان ڕێبوار ته‌واو ببێ، ئه‌وه جومعه‌ی هیچیان دروست نابێ، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

وَلَوْ بَانَ الإِمَامُ جُنُباً أَوْ مُحْدِثاً صَحَّتْ جُمُعَتُهُمْ -فِي الأَظْهَرِ- إِنْ تَمَّ الْعَدَدُ بِغَيْرِهِ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَمَنْ لَحِقَ الإِمَامَ الْمُحْدِثَ رَاكِعاً لَمْ تُحْسَبْ رَكْعَتُهُ عَلَى الصَّحِيحِ. الْخَامِسُ: خُطْبَتَانِ قَبْلَ الصَّلاَةِ، وَأَرْكَانُهُمَا خَمْسَةٌ: حَمْدُاللهِ تَعَالَى، وَالصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ،

---

(وَلَوْ بَانَ الإِمَامُ جُنُباً أَوْ مُحْدِثاً) ئەگەر -لە دوایسەلامدانەوە- ئاشکرا بوو: ئیمامی جومعە جەنابەتدار، یان بێدەستنوێژ بووە، یان پیسیەکینادیاری پێوە بووە (صَحَّتْ جُمُعَتُهُمْ) جومعەی مەئموومەکانیتر دروست دەبێ -(فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا- (إِنْ تَمَّ الْعَدَدُ بِغَيْرِهِ) بەو مەرجەی ژمارەی چل پیاوەکە -بە بێ ئەو ئیمامە- بەوانیتر تەواو ببێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ژمارەی چل پیاوەکە بە ئیمامە بێدەستنوێژەکە تەواو دەبو (فَلاَ) جومعەی هیچیان دروست نابێ، چونکە ژمارەی چل پیاو کەم بۆتەوە.

ئینجا بزانە: مەسەلەی بێدەستنوێژبوونی ئیمام لە ناو نوێژدا، لە بەشەکەی کۆتایی جومعەدا ڕوون دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَمَنْ لَحِقَ الإِمَامَ الْمُحْدِثَ) هەر مەئمومێك بگاتە ئیمامێکی بێدەستنوێژو، نوێژی لە پشت دابەستێ (رَاكِعاً) لەو حاڵەتەی ئیمامە بێدەستنوێژەکە لە ڕوکووع دا بێ (لَمْ تُحْسَبْ رَكْعَتُهُ) ئەو ڕەکعەتەی بۆ نازمێردرێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، کەواتە: ئەو ڕوکووعە بە بەر فاتیحە خوێندن ناکەوێ، جیاوازی جومعەو نوێژەکانیتریش نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، بەڵام ئەگەر ئیمامەکە بێدەستنوێژ، یان جەنابەتدار نەبو، ئەو کاتە ڕوکووعەکە بە بەر فاتیحەش دەکەوێو بە ڕەکعەتێکی تەواو بۆی دەژمێردرێ، هەروەك لە کۆتایی جەماعەتدا ڕوون کراوە.

## ﴿ خوتبەی جومعە ﴾

(الْخَامِسُ) مەرجی پێنجەمی دروستبوونیجومعە: (خُطْبَتَانِ) خوێندنەوەی دوو ووتارە (قَبْلَ الصَّلاَةِ) پێش دابەستنی نوێژیجومعە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِماً ثُمَّ يَقْعُدُ ثُمَّ يَقُومُ كَمَا تَفْعَلُونَ الآنَ﴾ رواه الشيخان وأحمد واللفظ له، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جومعە بە پێوە ووتاری دەخوێندەوە، ئینجا لە دوای ووتارییەکەم دادەنیشت، ئینجا بۆ ووتاریدووەم هەڵدەستا پێوە، هەروەك ئێستا ئێوە وا دەکەن.

(وَأَرْكَانُهُمَا) ڕوکنەکانی هەردوو خوتبەکان (خَمْسَةٌ) پێنجن، ئەگەر لەو پێنجانە یەك ڕوکن ناتەواو بێ، خوتبەکە دروست نابێ:

ڕوکنییەکەم: (حَمْدُاللهِ تَعَالَى) حەمدو سەنای خوایگەورەیە، هەروەك لە (صحیح مسلم)دا هاتوە. ڕوکنیدووەم: (وَالصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ) سەلاوات لێدانە لە سەر پێغەمبەر ﷺ، (چونکە (سلف)و(خلف) لە سەر سەلاواتیخوتبە یەکدەنگن)، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَفْظُهُمَا مَتَعَيَّنٌ، وَالْوَصِيَّةُ بالتَّقْوَى وَلاَ يَتَعَيَّنُ لَفْظُهَا عَلَى الصَّحِيحِ، وَهَذه الثَّلاَثَةُ أَرْكَانٌ فِى الْخُطْبَتَيْنِ. وَالرَّابِعُ قِرَاءَةُ آيَة فِى إحْدَاهُمَا وَقِيلَ فِى الأُولَى وَقِيلَ فِيهِمَا، وَقِيلَ لاَ تَجبُ. وَالْخَامسُ مَا يَقَعُ عَلَيْه اسْمُ دُعَاء لِلْمُؤْمنينَ

---

(وَلَفظُهُمَا) ووشەی حەمدو سەنای خوایگەورەو سەلاوات (مُتَعيَّنٌ) دیارکراوە، وەك بلّێ: (اَلْحَمْدُ لله)، یان (أَحْمَدُالله). هەروەها بلّێ: (وَالصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ الله)، یان (اَللّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ). چونکە لە سەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ تا ئێستا هەر بەو جۆرە گوتراون، کەواتە: ڕستەی (اَلشُكْرُ لِلّه)، یان (اَلْحَمْدُ لِلرَّحْمَنِ)، یان (اَلْعَظَمَةُ لِلّه) بە بەر ناکەوێ.
هەروەها (رَحِمَ اللهُ مُحَمَّداً)، یان ناوی پێغەمبەرﷺ نەلێو بە (ضمیر) سەلاواتی لێبدا، وەك بلّێ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْه)، یان (اَللّهُمَّ صَلِّ عَلَيْه) ئەوانە هیچیان بە بەر ناکەون، هەرچەند پێشداش ناوی پێغەمبەرﷺ گوترابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
ڕوکنیسێیەم: (وَالْوَصِيَّةُ بِالتَّقْوَى) ئامۆژگاریکردنە بە ترسان لە خوایگەورە (وَلاَ يَتَعَيَّنُ لَفظُهَا) ووشەی ئامۆژگاریکردن دیاری نەکراوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، بەڵکو هەر ووشەیەك هاندانی خواپەرستیو ڕێگرتن لە خراپەی لێبفامێتەوە، دروستە بە کاری بهێنێ: وەك (أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى الله)، یان (إتَّقُوا الله)، (أَطِيعُوا الله)...ئەو جۆرە ڕستانە ﴿عَنْ جَابِرِ بن سَمُرَةَ﴾: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ خُطْبَتَانِ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا يَقْرَأُالْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُالنَّاسَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جومعە دوو ووتاری هەبون، لە نێوان هەردووکیان دادەنیشت، لە خوتبەکەدا قورئانی دەخوێندو ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد.
(وَهَذه الثَّلاَثَةُ) ئەو سێ ڕوکنانە، واتە: حەمدو سەناو سەلاواتو ئامۆژگاریکردن (أَرْكَانٌ فِى الْخُطْبَتَيْنِ) هەرسێکیان ڕوکنن لە خوتبەی یەکەمو دووەمدا، واتە: واجبە: لە هەردووکیاندا بگوترێن.
(وَالرَّابِعُ) ڕوکنیچوارەم: (قِرَاءَةُ آيَةٍ فِى إحْدَاهُمَا) خوێندنەوەی ئایەتێکی قورئانە بە تەواوی لە یەکێکیاندا، واتە: یان لە خوتبەی یەکەمدا، یان لە دووەمدا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جابر)یڕابردوو، بەلاّم (إمام الْحَرَمَيْن) دەفەرموێ: دوور نیە نیوەی ئایەتێکی درێژ بەس بێو بە بەر بکەوێ، لە (نهایة)و(مغنی)دا ئەو فەرموودەیان بە بەهێز داناوە، ئینجا سوننەتە: لە خوتبەییەکەمدا ئایەتەکە بخوێنێ، بەلاّم (وَقِيلَ فِى الأُولَى) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: لە خوتبەییەکەمدا واجبە بخوێندرێ (وَقِيلَ فِيهِمَا) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا: لە خوتبەی یەکەمو دووەمدا واجبە بخوێندرێ (وَقِيلَ لاَيَجِبُ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا: واجب نیە بخوێندرێ.
(وَالْخَامِسُ) ڕوکنیپێنجەم: (مَا يَقَعُ عَلَيْهِ اسْمُ دُعَاءٍ لِلْمُؤْمِنِينَ) دوعا کردنە بۆ ئیمانداران کە بە ووشەیەکی وەها: ناوی دوعای بۆ بگوترێ، وەك بلّێ: (اَللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤْمِنِينَ

فِي الثَّانِيَةِ وَقِيلَ لاَ يَجِبُ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهَا عَرَبِيَّةً، مُرَتَّبَةَ الأَرْكَانِ الثَّلاَثَةِ الأُولَى، وَبَعْدَ الزَّوَالِ، وَالْقِيَامُ فِيهِمَا إِنْ قَدَرَ، وَالْجُلُوسُ بَيْنَهُمَا،

---

وَالْمُؤْمِنَاتِ)، چونكه (سلف)و(خلف) له خوتبه‌دا دوعایان كردوه (فِي الثَّانِيَةِ) واجبه: دوعایه‌كه‌ش له خوتبه‌ی دووه‌مدا بێ، واته: له خوتبه‌ی یه‌كه‌مدا به به‌ر ڕوكنی خوتبه ناكه‌وێ، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا فه‌رموویه‌تی (وَقِيلَ لاَ يَجِبُ) له فه‌رموده‌یه‌كی بێهێزدا دوعا كردن واجب نیه.

## ﴿ مه‌رجه‌كانی خوتبه ﴾

(وَيُشْتَرَطُ) به مه‌رج دا ده‌ندرێ بۆ دروستبوونی خوتبه‌كان، نۆ مه‌رج: مه‌رجی یه‌كه‌م: (كَوْنُهَا عَرَبِيَّةً) ڕوكنه‌كانی هه‌ردوو خوتبه‌كان به عه‌ره‌بی بگوترێن، چونكه ﴿له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر ﷺ هه‌ر چوار خه‌لیفه‌كان-تا ئێستاش- به هیچ زمانێكیتر نه‌گوتراون﴾. واته: به‌لام جگه له ڕوكنه‌كان، مه‌رج نیه: به‌شه‌كانیتری خوتبه‌كه به عه‌ره‌بی بن، هه‌روه‌ك له (تحفة)دا فه‌رموویه‌تی. (مُرَتَّبَةَ الأَرْكَانِ الثَّلاَثَةِ الأُولَى) سوننه‌ته: ڕوكنه‌كانی یه‌كه‌م و دووه‌م و سێیه‌م به دوای یه‌كتردا ڕیز بكرێن، واته: حه‌مدو سه‌نا، ئینجا سه‌لاوات، ئینجا ئامۆژگاری.

مه‌رجی دووه‌م: (وَبَعْدَ الزَّوَالِ) خوتبه‌كان له دوای ڕۆژ لادان به‌ره‌و لای ڕاسته، واته: له دوای هاتنی كاتی نیوه‌ڕۆ بخوێندرێته‌وه ﴿عَنِ السَّائِبِ بنِ يَزِيدَ ﷺ: كَانَ التَّأْذِينُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ حِينَ يَجْلِسُ الإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، له سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ردا ﷺ بانگی جومعه له‌و كاته ده‌درا: كه ئیمامی جومعه له سه‌ر مینبه‌ر داده‌نیشت.

مه‌رجی سێیه‌م: (وَالْقِيَامُ فِيهِمَا) به پێوه ڕاوه‌ستانه له هه‌ردوو خوتبه‌كاندا (إِنْ قَدَرَ) ئه‌گه‌ر توانای هه‌بێ، به به‌لگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی (ابن عمر)ی ڕابردوو، به‌لام ئه‌گه‌ر توانای نه‌بو، ئه‌و كاته به دانیشتوویی خوتبه‌كان ده‌خوێنێته‌وه، ئینجا ئه‌گه‌ر به دانیشتوویش توانای نه‌بو، ئه‌و كاته له سه‌ر ته‌نیشت خوتبه‌كان ده‌خوێنێته‌وه، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

مه‌رجی چواره‌م: (وَالْجُلُوسُ بَيْنَهُمَا) دانیشتنه له نێوان خوتبه‌ی یه‌كه‌م و دووه‌مدا، به به‌لگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی (ابن عمر)ی ڕابردوو، كه‌واته: ئه‌گه‌ر دانه‌نیشت، ئه‌وه هه‌ردوو خوتبه‌كان هه‌ر به یه‌ك خوتبه ده‌ژمێردرێن، كه‌وابو: واجبه دابنیشێ، جا هه‌ڵسێته‌وه خوتبه‌ی دووه‌میش بخوێنێته‌وه، هه‌روه‌ك له (تحفة)دا فه‌رموویه‌تی، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر به‌هۆی نه‌توانین به دانیشتوویی خوتبه‌ی ده‌خوێنده‌وه، واجبه: له نێوان هه‌ردووكیاندا ماوه‌یه‌ك بێده‌نگ ببێ، هه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

وَإِسْمَاعُ أَرْبَعِينَ كَامِلِينَ، وَالْجَدِيدُ أَنَّهُ لاَ يَحْرُمُ عَلَيْهِمُ الْكَلاَمُ، وَيُسَنُّ الإِنْصَاتُ، قُلْتُ: الأَصَحُّ أَنَّ تَرْتِيبَ الأَرْكَانِ لَيْسَ بِشَرْطٍ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

مەرجی پێنجەم: (وَإِسْمَاعُ أَرْبَعِينَ) ئەوەندە دەنگ بەرز بکا: تا چل پیاو گوێی لێدەبێ (كَامِلِينَ) لای کەم سیو نۆیان لەو جۆرە پیاوانە بن کە جومعەیان پێ دادەمەزرێ، بەڵام مەرج نیە: لێی تێبگەن، مەرجیش نیە: دەستنوێژیان هەبێ، جا ئەگەر لەو سیو نۆیانە تەنها یەکێك کەڕ بێو گوێی لێنەبێ، خوتبەکە دروست نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی ئیمامی(الشافعي) ئەمەیە: (أَنَّهُ لاَ يَحْرُمُ عَلَيْهِمُ الْكَلاَمُ) قسە کردن لە سەر ئامادەبووانیخوتبەکان حەرام نیە، بەڵکو (مَكْروه) ناپەسندە: لە کاتی خوتبەدا قسە بکەن، بەڵام لە سێ مەزهەبەکەیتردا: قسەکردن لە حاڵەتی خوتبەدا حەرامە، کەواتە: تا بۆی بگونجێ سوننەتە: بە ئاماژەکردن مەبەستەکانی جێبەجێ بکا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ: أَنْصِتْ–وَالإِمَامُ يَخْطُبُ– فَقَدْ لَغَوْتَ﴾رواه الشيخان، هەر کاتێك لە ڕۆژی هەینی–لەو حاڵەتەی ئیمام خوتبە دەدا– بە هاوڕێکەت گوت: بێدەنگ بە، ئەوە قسەی پوچو بێشەرعیت کرد. واتە: خێری جومعەکەت کەم دەبێتەوە.

جا هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە (وَيُسَنُّ الإِنْصَاتُ) سوننەتە: ئامادەبووەکان بێدەنگ بن، هەروەها سوننەتە: گوێ بدەنە خوتبەکانو ڕوو بە ڕووی ووتار خوێن دانیشنو خۆیان بە شتیتر خەریك نەکەن، تا ئەگەر یەکێك هاتە ناو مزگەوت ناپەسندە: سەلام بکا، بەڵام وەڵامی سەلامەکە واجبە، جا ئەگەر ناوی پێغەمبەرﷺ گوترا، سوننەتە: سەلاواتی لە سەر لێبدا، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ تَرْتِيبَ الأَرْكَانِ) ڕیزکردنی ڕوکنەکان (لَيْسَ بِشَرْطٍ) مەرج نیە (وَاللهُ أَعْلَمُ) بەڵکو سوننەتە، هەروەك باسمان کرد.

﴿ ئاگاداری ﴾ هەر کاتێك ووتارخوێن بۆ خوتبەدان چووە سەر مینبەر، حەرامە مرۆڤی دانیشتوو هەڵبستێ نوێژی سوننەت، یان واجب بکا، واتە: ئەگەر لەو حاڵەتەدا هەڵسێو نوێژێکی سوننەت بکا، یان نوێژێکی واجب قەزا بکاتەوە، گوناهبار دەبێو نوێژەکەش دانامەزرێو بە بەر ناکەوێ، بەڵام ئەگەر لەو حاڵەتەدا خەریکی نوێژکردن بوو، ئەو کاتە واجبە: پەلە بکاو بە سوکی نوێژەکە تەواو بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر لە حاڵەتیخوتبەخوێندنەوەدا هاتە ناو مزگەوت، ئەو کاتە سوننەتە: دوو ڕەکعەتی بە پەلە بکا: بە نیەتی(تَحِيَّةُ الْمَسْجِدِ)، یان سوننەتی پێش جومعە، یان هەردووکیان

وَالأَظْهَرُ اشْتِرَاطُ الْمُوالاَةِ، وَطَهَارَةُ الْحَدَثِ والْخَبَثِ، وَالسَّتْرُ،

﴿عَنْ جَابِرٍ﴿: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ-وَالنَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ- فَجَلَسَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَينِ وَتَجَوَّزْ فِيهِما، ثُمَّ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ -وَالإِمَامُ يَخْطُبُ- فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا﴾رواه مسلم وأصحاب السنن، (سُلَيْك) هاته ناو مزگەوتو دانیشت، لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ ووتاری جومعەی دەدا، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: هۆ (سُلَيْك) هەڵسە دوو ڕەکعەت سوننەت بکەو بە پەلە بە سوکی بیانکە. ئینجا فەرمووی: هەر کاتێك لە ڕۆژی هەینیدا یەکێکتان هاتە مزگەوتو لەو حاڵەتدا ئیمام خوتبەی دەخوێندەوە، با دوو ڕەکعەت سوننەت بکاو بە پەلەو بە سوکی بیانکا.

ئینجا بزانە: هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: ئەگەر هاتە ناو مزگەوتو بە قەسدی دانیشت، یان نەهاتە ناو مزگەوت، بەڵکو لە دەرەوەی مزگەوت بوو، ئەوە لە هەردوو حاڵەتدا لە کاتی خوتبەخوێندنەوەدا حەرامە: هەر جۆرە نوێژێك بکا، چونکە (تحيةالمسجد) وەدەست نایێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

مەرجیشەشەم: (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بە هێزتر: (اِشْتِرَاطُ الْمُوالاَةِ) مەرجە: ڕوکنەکانی خوتبەکان-بە بێنێوان- بە دوای یەکتردا بگوترێن، نوێژی جومعەش لە دوایخوتبەکان- بە بێنێوان-دابیەسترێ، واتە: نێوانێکی درێژی بە ئەندازەی دوو ڕەکعەتی بە پەلە، بە شتێکی وەها: کە پەیوەندی بەو خوتبەیەوە نەبێ، کەواتە: ئامۆژگاری، یان ئایەت خوێندنەوە، بە نێوان داناندرێو ڕوکنەکان لێك ناپچڕێنێ، هەرچەند ماوەکەش درێژ بێ، هەروەك لە (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئەگەر نێوانەکە بە ئامۆژگاری نەبو و بەو ئەندازەیڕابردووش نێوانەکە درێژ بوو، ئەو کاتە واجبە: لە سەرەتاوە ڕوکنەکانی خوتبەکان دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

مەرجیحەفتەم: (وَطَهَارَةُ الْحَدَثِ) پاکیی ووتارخوێنەکەیە: لە بێدەستنوێژیی گەورەو بچووك، هەم (وَالْخَبَثِ) پاکیەتی لە پیسیی لاشەو بەرگو شوێن: بە درێژیی ئەو ڕوونکردنەوەیەی لە مەرجەکانی نوێژدا ڕابرا، چونکە ﴿پێغەمبەرﷺ نە بە پیسیەوەو نە بە بێدەستنوێژی خوتبەی نەداوە﴾. کەوابو: ئەگەر ووتارخوێن پیسیەکی لێنەبوردراوی پێوەبوو، یان بێدەستنوێژ بوو: خوتبەکەی دروست نابێ، کەواتە: لە دوای دەستنوێژگرتنەوە واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە خوتبەکان بکاتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

مەرجیهەشتەم: (وَالسَّتْرُ) داپۆشینی عەورەتی ووتارخوێنەکەیە: بەو جۆرەی لە مەرجەکانی نوێژدا ڕابرا، چونکە ﴿پێغەمبەرﷺ بە عەورەت داپۆشراوی خوتبەی دەدا﴾.

وَتُسَنُّ عَلَى مِنْبَرٍ أَوْ مُرْتَفِعٍ، وَيُسَلِّمُ عَلَى مَنْ عِنْدَالْمِنْبَرِ وَأَنْ يُقْبِلَ عَلَيْهِمْ إِذَا صَعِدَ وَيُسَلِّمَ عَلَيْهِمْ، وَيَجْلِسَ ثُمَّ يُؤَذِّنُ،

---

بەلام واجب نیە: نیەتی خوتبە بێنێ، هەروەها مەرج نیە: ئامادەبووەکان پاك بن‌و بەدەستنوێژ بن‌و داپۆشراو بن، هەروەك لە (نهایة)و(مغنی) دا فەرموویانە. مەرجی‌نۆیەم: هەردوو خوتبەکان لە پێش نوێژی‌جومعەدا بخوێندرێنەوە، هەروەك باسمان کرد.

## ﴿ سوننەتەکانی خوتبەکان ﴾

(وَتُسَنُّ عَلَى مِنْبَرٍ) سوننەتە: لە سەر مینبەرێك خوتبە بدا (أَوْ مُرْتَفِعٍ) یان لە سەر شوێنێکی بەرز، چونکە ﴿پێغەمبەرﷺ لە سەر مینبەر خوتبەی دەدا﴾، هەروەك لە (بخاري ومسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

ئینجا سوننەتە: مینبەرەکەش لە لای ڕاستەی میحراب دابندرێ (وَيُسَلِّمُ عَلَى مَنْ عِنْدَ الْمِنْبَرِ) کە ئیمام هاتە ژووری مزگەوت سوننەتە: سەلام بکا لە دانیشتووانی مزگەوت‌و لەوانەی لە لای مینبەرەکەن.

(وَأَنْ يُقْبِلَ عَلَيْهِمْ إِذَا صَعِدَ) ئینجا کە چووە سەر مینبەر، سوننەتە ڕوو لە خەڵکەکان بکاو (وَيُسَلِّمَ عَلَيْهِمْ) دووبارە سەلام لە ئامادەبووان بکا، ئینجا بە (فرض الْكِفاية) واجبە: وەلامی سەلامەکانی بدرێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا (وَيَجْلِسَ) لە دوای سەلامکردن دابنیشێ (ثُمَّ يُؤَذِّنُ) ئینجا بانگی جومعە بدرێ‌و لە دوای تەواوبوونی بانگ دەست بە خوتبە دەکا ﴿عَنِ السَّائِب بن يَزِيدﷺ: كَانَ النِّدَاءُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوَّلُهُ إِذَا جَلَسَ الإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ وَكَثُرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى الزَّوْرَاءِ وَثَبَتَ الأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، لە سەردەمی پێغەمبەرﷺو ئیمامی (ابوبکر)و ئیمامی (عمر)رَضِيَ اللهُ عَنْهُما سەرەتای بانگی جومعە لەو کاتەوە بوو: کە ئیمام لە سەر مینبەر دادەنیشت، ئینجا کە سەردەمی ئیمامی عثمان هات‌و خەڵك زۆر بوو، بانگێکی‌تری–جگە لە بانگ‌و ئیقامەتی جومعە– زیاد کرد، لە سەر (الزوراء)–کە شوێنێکی بەرز بوو– ئەو بانگە دەدراو، ئەو بانگەی‌یەکەم بەو شێوەیە جێگیر بوو.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەو عادەتەی ئێستا هەیە: کە پێش دەست پێکردنی ووتارخوێن، یەکێك ئایەتی﴿إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ ﴾...الآية، دەخوێنێتەوە، هیچ بنچینەیەکی لە حەدیسدا نیە، بەلام بە (البدعةالحسنة) دادەندرێ، چونکە خوێندنەوەی ئەو ئایەتە پیرۆزە خەڵکی ئاگادار دەکاتەوەو هانیان دەدا: بۆ سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ لەو ڕۆژە پیرۆزەدا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

وَأَنْ تَكُونَ بَلِيغَةً مَفْهُومَةً قَصِيرَةً، وَلاَ يَلْتَفِتُ يَمِيناً وَشِمَالاً فِي شَيْءٍ مِنْهَا، وَيَعْتَمِدُ عَلَى سَيْفٍ أَوْ عَصاً وَنَحْوِهِ،

---

(وَأَنْ تَكُونَ بَلِيغَةً) سوننەتە خوتبەكە ڕێكوپێك بێو داڕشتنەكەی جوان بێو بە گوێرەی ڕووداوەكانی كاتەكە بێ (مَفْهُومَةً) خەڵكەكە زوو لێی تێبگاو ووشەكانی ئاشكرا بن، هەروەك ئیمامی(علي)ﷺ دەفەرموێ: (قسە لەگەڵ خەڵك بكەن بە گوێرەی تێگەیشتنی ئەوان).

(قَصِيرَةً) كورت بێ، واتە: مام ناوەنجی بێو خەڵك لێی وەڕەز نەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ طُولَ صَلاَةِالرَّجُلِ وَقِصَرَخُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ، فَأَطِيلُواالصَّلاَةَ وَأَقْصِرُوا الْخُطْبَةَ﴾ رواه مسلم، درێژی نوێژی پیاو و كورتی ووتارەكەی نیشانەی تێگەیشتنو شەرع زانینیەتی، كەوابو: نوێژی جومعە درێژ بكەنەوەو ووتارەكەشی كورت بكەنەوە.

هەروەها سوننەتە: ووتارخوێن خۆی توڕە بكاو دەنگی بەرز بكا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ جَابِرٍﷺ كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذا خَطَبَ إِحْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلاَ صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ﴾ رواه مسلم، كە پێغەمبەرﷺ خوتبەی دەدا، چاوی سور دەبو، دەنگی بەرز دەبو، زۆر بە هێز توڕە دەبو، وەك بڵێیترسێنەری لەشكرێكە.

جا بزانە: گوتنی (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) لە سەرەتای خوتبەی جومعەدا (بِدْعة)یەو دژ بە ڕەفتاری (السلف الصالح)ە، هەروەك لە (بغيةالمسترشدين)دا فەرموویەتی.

هەم (وَلاَ يَلْتَفِتُ يَمِيناً وَشِمَالاً) نابێ بە ڕاستەو چەپەدا ئاوڕ بداتەوە (فِي شَيْءٍ مِنْهَا) لە هیچ بەشێكی خوتبەكەدا، بەڵكو بەردەوام ڕوو لە خەڵكەكە دەكا، چونكە ئاوڕدانەوە ناپەسندەو (بِدْعة)یە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها ئاو خواردنەوەش لە حاڵەتی خوتبەدا بۆ ووتارخوێنو ئامادەبووان ناپەسندە، بەڵام ئەگەر تینوو بون، ئەو كاتە بۆ هیچیان ناپەسند نیە، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَيَعْتَمِدُ عَلَى سَيْفٍ أَوْ عَصاً) بۆ ووتارخوێن سوننەتە: لە حاڵەتیخوتبەدا شمشێرێك، یان عەسایەك بە دەستیەوە بگرێو هێزی بداتە سەر (وَنَحْوِهِ) یان شتێكی لەو جۆرە: وەكو ڕمو كەوان–واتە: یان چەكێكیتر– چونكە ئەوە ئاماژەیە: كە ئاینیئیسلام بە بەرگری چەك ڕاوەستاوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عَنِ الحَكَمِ بنِ حَزَنٍﷺ: شَهِدْنَاالْجُمُعَةَ مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ فَقَامَ مُتَوَكِّئاً عَلَى عَصاً أَوْ قَوْسٍ، فَحَمِدَاللهَ...﴾ حديث حسن رواه ابوداود وصححه إبن السكن، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ نوێژی جومعەمان كرد، كە بۆ خوتبە هەڵسا، پاڵیدا سەر دارعەسایەك، یان كەوانێك، جا ووتاری خوێندەوە.

وَيَكُونُ جُلُوسُهُ بَيْنَهُمَا نَحْوَ سُورَةِالإِخْلَاصِ، وَإِذَا فَرَغَ شَرَعَ الْمُؤَذِّنُ فِيالإِقَامَةِ وَبَادَرَ الإِمَامُ لِيَبْلُغَ الْمِحْرَابَ مَعَ فَرَاغِهِ، وَيَقْرَأُ فِيالأُولَى الْجُمُعَةَ، وَفِيالثَّانِيَةِ الْمُنَافِقِينَ جَهْراً.

(فَصْلٌ) يُسَنُّ الْغُسْلُ لِحَاضِرِهَا،

---

ئینجا سوننەتە: ئەو چەکە بە دەستیچەپیەوە بگرێو دەستیڕاستەشی لە سەر ڕۆخی مینبەر دابنێ، جا ئەگەر ئەو چەکەی بە دەستەوە نەگرت، با دەستیڕاستەی لە سەر دەستیچەپەی دابنێ، یان بە هەردوو تەنیشتیدا شۆڕیان بکاتەوە، واتە: ناپەسندە ئاماژەیان پێبکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَكُونُ جُلُوسُهُ بَيْنَهُمَا) سوننەتە دانیشتنی ووتارخوێن لە نێوان خوتبەی یەکەمو دووەمدا (نَحْوَ سُورَةِ الإِخْلَاصِ) بە قەد خوێندنی سوورەتی(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) بێو زیاتر نەبێ، جا سوننەتە: هەر ئەو سوورەتەش لەو دانیشتنەدا بخوێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، ئینجا سوننەتە: لە کۆتایی خوتبەیدووەمدا بڵێ (أَسْتَغْفِرُ اللهَ لِي وَلَكُمْ).

ئینجا (وَإِذَا فَرَغَ) کە لە خوتبەیدووەم بۆوە (شَرَعَ الْمُؤَذِّنُ فِيالإِقَامَةِ) یەکسەر بانگدەر دەست بە ئیقامەتی نوێژ دەکاو ئیمامەکەش دەست بە هاتنە خوارەوە دەکا–ئەگەر لە سەر مینبەر بێ– (وَبَادَرَ الإِمَامُ) هەروەها ئیمامەکەش پەلە دەکا (لِيَبْلُغَ الْمِحْرَابَ) تاکو زوو بگاتە میحراب بۆ نوێژ دابەستن (مَعَ فَرَاغِهِ) لەگەڵ لێبوونەوەی بانگدەر لە ئیقامەت کردن، تاکو نێوانێکی درێژ نەکەوێتە بەینی نوێژو خوتبەکە.

ئینجا نوێژی جومعە دادەبستێو (وَيَقْرَأُ فِيالأُولَى) لە ڕەکعەتییەکەمدا لە دوای فاتیحە سوورەتی(الْجُمُعَةِ) بە تەواوی دەخوێنێو (وَفِيالثَّانِيَةِ) لە ڕەکعەتیدووەمیشدا لە دوای فاتیحە سوورەتی(الْمُنَافِقِينَ) بە تەواوی دەخوێنێ، (چونکە پێغەمبەرﷺ ئەو دوو سورەتانەی دەخوێندن). هەروەها (هەندێ جاریش پێغەمبەرﷺ لە دوای فاتیحە: لە ڕەکعەتییەکەمدا (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى)ی دەخوێندو لە ڕەکعەتیدوومیشدا (هَلْ أَتَاكَ)ی دەخوێند). هەردوو حەدیسەکانیش لە (صحيح مسلم)دا هاتون.

(جَهْراً) سوننەتە: فاتیحەو سورەتەکان لە نوێژی جومعەدا بە دەنگی ئاشکرا بخوێندرێن، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

### ﴿ فَصْلٌ: لە باسی غوسلو سوننەتەکانی جومعە ﴾

(يُسَنُّ الْغُسْلُ) خۆشۆردن سوننەتە (لِحَاضِرِهَا) بۆ ئەو کەسەی دەیەوێ ئامادەی نوێژی جومعە ببێ، جیاوازی پیاو و ئافرەتو منداڵ نیە، چونکە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ﴾رواه الشيخان، هەر یەکێکیان ویستی بێتە نوێژی جومعە، با خۆی بشوا.

وَقِيلَ لِكُلِّ أَحَدٍ، وَوَقْتُهُ مِنَ الْفَجْرِ، وَتَقْرِيبُهُ مِنْ ذَهَابِهِ أَفْضَلُ، فَإِنْ عَجَزَ تَيَمَّمَ فِي الأَصَحِّ، وَمِنَ الْمَسْنُونِ غُسْلُ الْعِيدِ وَالْكُسُوفِ وَالإِسْتِسْقَاءِ وَلِغَاسِلِ الْمَيِّتِ وَالْمَجْنُونِ وَالْمُغْمَى عَلَيْهِ إِذَا أَفَاقَا،

---

(وَقِيلَ لِكُلِّ أَحَدٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: خۆشۆردنی ڕۆژی هەینی بۆ گشت موسڵمانێك سوننەتە، هەرچەند لە نوێژی جومعەش ئامادە نەبێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَقٌّ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْماً﴾ رواه الشيخان والنسائي وزاد: ﴿وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ﴾ لە سەر گشت موسڵمانێك ئەو مافە هەیە: لە گشت حەفت ڕۆژێكدا ڕۆژێك خۆی بشوا، ئەوەش ڕۆژی هەینییە.

(وَوَقْتُهُ مِنَ الْفَجْرِ) كاتی ئەو خۆشۆردنەی جومعە لە دەركەوتنی بەیانەوە دەست پێ دەكا، چونكە لە حەدیسەكاندا بە ووشەی (يَوْمُ الْجُمُعَةِ) واتە: ڕۆژی جومعە هاتوە، كەوابو: ئەگەر بە شەوێ، لە پێش بەیاندا خۆی بشوا، بە بەر غوسلی جومعە ناكەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَتَقْرِيبُهُ) نزیك خستنەوەی خۆشۆردنەكە (مِنْ ذَهَابِهِ) لە كاتی ڕۆیشتنی بۆ جومعە (أَفْضَلُ) خێری گەورەترە، چونكە زیاتر بۆنی ناخۆشی لادەچێ (فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر توانای خۆشۆردنی نەبو: لە بەر بێئاوی، یان لە بەر برینداری (تَيَمَّمَ) سوننەتە: تەیەمموم بكا، بە نیەتی تەیەممومی غوسلیجومعە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە مەبەست پاكیو خواپەرستیە، جا ئەگەر پاكیەكەش نەبێ، بە تەیەممومەكە خواپەرستیەكە وەدەست دێ.

(وَمِنَ الْمَسْنُونِ) لە غوسلە سوننەتەكانە: (غُسْلُ الْعِيدِ) خۆشۆردنی جەژنی ڕەمەزانو قوربان (وَالْكُسُوفِ) هەروەها خۆشۆردن بۆ نوێژی ڕۆژگیرانو مانگگیران‌و (وَالإِسْتِسْقَاءِ) بۆ نوێژی باران.

(وَلِغَاسِلِ الْمَيِّتِ) هەروەها خۆ شۆردن سوننەتە: بۆ ئەو كەسەی مردووی شۆردوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ غَسَّلَ مَيِّتاً فَلْيَغْتَسِلْ، وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ﴾ رواه الترمذي وحسنه، هەر كەسێك مردووێكی شۆرد با خۆی بشوا، هەر كەسێك مردووێكی هەڵگرت با دەستنوێژ بگرێتەوە.

(وَالْمَجْنُونِ) هەروەها خۆ شۆردنی شێت (وَالْمُغْمَى عَلَيْهِ) خۆ شۆردنی بێهۆشبوو (إِذَا أَفَاقَا) هەر كاتێك شێتەكەو بێهۆشەكە چاك بونەوە، سوننەتە خۆیان بشۆن ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُغْمَى عَلَيْهِ فِي مَرَضِ مَوْتِهِ ثُمَّ يُفِيقُ فَيَغْتَسِلُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشی مردنیدا بێهۆش دەبو، جا هۆشی دەهاتەوەو غوسلی دەكرد.

وَالْكَافِرِ إِذَا أَسْلَمَ وَأَغْسَالُ الْحَجِّ، وآكَدُهَا غُسْلُ غَاسِلِ الْمَيِّتِ ثُمَّ الْجُمُعَة، وَعَكَسَهُ الْقَدِيمُ، قُلْتُ: الْقَدِيمُ هُنَا أَظْهَرُ وَرَجَّحَهُ الأَكْثَرُونَ وَأَحَادِيثُهُ صَحِيحَةٌ كَثِيرَةٌ وَلَيسَ لِلْجَدِيدِ حَدِيثٌ صَحِيحٌ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُسَنُّ التَّبْكِيرُ إِلَيْهَا مَاشِياً بِسَكِينَة،

---

ئینجا بزانە: شێتیش (قیاس) کراوەتە سەر بێهۆش، بەڵام ئەگەر لە کاتی شێتیو بێهۆشیدا (مَني)یان هاتبو، یان جیماعیان لەگەڵ کرابو، ئەو کاتە واجبە: خۆیان بشۆن، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَالْكَافِرِ) هەروەها خۆ شۆردنی مرۆڤیکافر (إِذَا أَسْلَمَ) هەر کاتێك بووە موسڵمان سوننەتە خۆی بشوا ﴿عَنْ قَيْس بِن عَاصِمﷺ أَنَّهُ أَسْلَمَ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّﷺ أَنْ يَغْتَسِلَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، کە (قیس) بووە موسڵمان، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکرد خۆی بشوا بە ئاو وسیدر، واتە: سابوون.

بەڵام ئەگەر لە کاتیکافریدا غوسلی لە سەر بوو، ئەوە کە بووە موسڵمان واجبە غوسل بکا، چونکە غوسلی سەردەمی کافری بە بەر ناکەوێ، لە بەر ئەوەی نیەتەکەی دروست نەبوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَأَغْسَالُ الْحَجِّ) هەروەها غوسلەکانی حەجو عومرە گشتیان سوننەتن: کە لە باسیحەجدا روونیان دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

(وَآكَدُهَا) لە هەموو غوسلەکان خێرتر (غُسْلُ غَاسِلِ الْمَيِّتِ) خۆشۆردنی مردووشۆرە (ثُمَّ الْجُمُعَةِ) ئینجا خۆ شۆردنی ڕۆژی هەینی، ئەمە فەرموودەی نوێی ئیمام (الشافعي)بوو، بەڵام (وَعَكَسَهُ الْقَدِيمُ) فەرموودەی کۆن بە پێچەوانەی فەرمووە: خۆ شۆردنی هەینی لە گشتیان خێرترە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (اَلْقَدِيمُ هُنَا أَظْهَرُ) فەرموودەی کۆن لێرەدا بەهێزترە لە فەرموودەی نوێ (وَرَجَّحَهُ الأَكْثَرُونَ) زۆرترینی زانایان بەهێزیان کردوە (وَأَحَادِيثُهُ) حەدیسەکانی خۆ شۆردنی ڕۆژی هەینی (صَحِيحَةٌ كَثِيرَةٌ) ڕاستو زۆرنو لە (بخاري)و(مسلم)دا هاتون (وَلَيسَ لِلْجَدِيدِ حَدِيثٌ صَحِيحٌ) بەڵام فەرموودەی نوێ هیچ حەدیسێکی ئەوها ڕاستی نیە: کە بە یەکدەنگی(صحيح) ڕاست بێو ببێتە بەڵگەی خێرتری خۆشۆردنی مردووشۆر (وَاللهُ أَعْلَم).

(وَيُسَنُّ التَّبْكِيرُ إِلَيْهَا) سوننەتە: لە بەیانەوە زوو بڕوا بۆ نوێژیجومعە (مَاشِياً) سوننەتە: بە پیادە بڕوا، نەك بە سواری (بِسَكِينَةٍ) بە هێمنیو لە سەر خۆ، نەك بە غاردان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ: أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا﴾رواه أصحاب السنن بسندحسن، هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا ژنەکەی تووشی غوسل بکا–واتە: سوننەتە جیماعی لەگەڵ بکا– بە خۆیشی غوسل بکا، ئینجا لە

وَأَنْ يَشْتَغِلَ فِي طَرِيقِهِ وَحُضُورِهِ بِقِرَاءَ ةٍ أَوْ ذِكْرٍ، وَلاَ يَتَخَطَّى، وَأَنْ يَتَزَيَّنَ بِأَحْسَنِ ثِيَابِهِ، وَطِيبٌ، وَإِزَالَةُ الظُّفُرِ وَالرِّيحِ،

---

بەیانەوە زوو بڕوا بۆ جومعەو بگاتە سەرەتای خوتبە، بە پێیان بڕواو سوار نەبێ، لە ئیمام نزیك ببێتەوەو قسە نەكا، بە هەر هەنگاوێك خێری كردەوەی ساڵێك: شەو نوێژو ڕۆژووی بۆ دەنووسرێ.

ئینجا بزانە: ئەوە دەربارەی مەئموومەكان بوو، بەڵام بۆ ئیمامی جومعە ئەوها سوننەتە: تا كاتی خوتبە نەڕواتە مزگەوت، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ يَشْتَغِلَ) سوننەتە: خۆی خەریك بكا (فِي طَرِيقِهِ وَحُضُورِهِ) هەم لە ڕێگەو هەم لە كاتی ئامادەبوونی لە شوێنی جومعەدا (بِقِرَاءَ ةٍ) بە قورئان خوێندن (أَوْ ذِكْرٍ) یان بە زیكری خوای گەورەو سەلاوات لێدان لە سەر پێغەمبەرﷺ.

(وَلاَ يَتَخَطَّى) نابێ، واتە: ناپەسندە بە سەر ملیخەڵكدا ڕاببرێ، بەڵام ئەگەر ئیمام نەدەگەیشتە شوێنەكەی خۆی بۆ وی ناپەسند نیە بەسەر ملیمەئموومەكاندا ڕابرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها ناپەسندە -لە لای هەندێك زانایانیش حەڕامە-: دوو كەسان لێك جیابكاتەوەو بە بێئیزن لە نێوانیان دابنیشێ، هەروەك لە (المجموع)و (فتح الباري)دا فەرموویانە.

هەروەها ناپەسندە شوێنی خۆی بداتە یەكێكیتر، چونكە ناپەسندە: مرۆڤ مافی خواپەرستی خۆی بداتە یەكێكیتر، بەڵام ئەگەر بەخۆی بۆ ڕیزی پێشەوەتر چوو، ئەو كاتە ناپەسند نیە، ئینجا بزانە: حەڕامە یەكێك لە شوێنێك لابیا تاكو بە خۆی لە شوێنەكەی وی دابنیشێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ يَتَزَيَّنَ) سوننەتە: خۆی برازێنێتەوە (بِأَحْسَنِ ثِيَابِهِ) بە جوانترین جلو بەرگەكانی خۆی، هەروەك لە پاشكۆی جلو بەرگدا بەڵگەی بۆ دێنین، إن شاءَ اللهُ تَعالَى، ئینجا بزانە: بەرگی سپی لە گشتی خێرترە (وَطِيبٌ) سوننەتە بۆنی خۆش لە خۆی بدا.

(وَإِزَالَةُ الظُّفُرِ وَالرِّيحِ) هەروەها سوننەتە نینۆكو بۆنی ناخۆش لە خۆی لابباو سمێڵی كورت بكاو مووی بن هەنگڵو بەری لاببباو دەمو ددانەكانی پاك بكاو خۆی ڕێكوپێك بكا.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاسْتَنَّ وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ وَلَبِسَ أَحْسَنَ ثِيَابِهِ ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى يَأْتِيَ الْمَسْجِدَ وَلَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ ثُمَّ رَكَعَ مَاشَاءَ اللهُ أَنْ يَرْكَعَ وَأَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ الإِمَامُ، كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الَّتِي قَبْلَهَا﴾رواه أحمد وأبوداود وغيرهما بأسانيدحسنة، هەر كەسێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشواو سیواك بكاو خۆی بۆنخۆش بكا -ئەگەر هەیبێ- جوانترین جلەكانی دەبەر بكا، ئینجا بڕواتە

مزگەوتو بە سەر ملیخەڵکدا ڕانەبڕێو ئەوەندەی خوا حەز بکا نوێژ بکاو لە کاتی خوتبەدا بێدەنگ ببێ، ئەوە دەبێتە داپۆشەری گوناهەکانی نێوان ئەم جومعەو جومعەکەی پێشە وی.

ئینجا بزانە: ئەو ڕەوشتانەیڕابردوو بۆ گشت کەسێکو بۆ گشت کۆبوونەوەیەکیش سوننەتن، تەنها بۆ ئافرەت ناپەسندە: خۆی جوانو بۆنخۆش بکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَأَنْ يَقْرَأَ الْكَهْفَ) سوننەتە: سوڕەتی(الكهف) بخوێنێ (يَوْمَهَا وَلَيْلَتَهَا) هەم لە ڕۆژی هەینیداو هەم لە شەوی هەینیدا ﴿عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدْرِي ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ﴾ رواه البيهقي وقال الحاكم صحيح الإسناد، هەر کەسێك لە ڕۆژی هەینیدا سوڕەتی(الكهف) بخوێنێ نێوان هەردوو جومعەکانی لە ڕووناکی دەدرەوشێتەوە.

(وَيُكْثِرَ الدُّعَاءَ) سوننەتە: لە شەو و ڕۆژی هەینیدا زۆر دوعا بکا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فِيهِ سَاعَةٌ لَايُوَافِقُهَا عَبْدٌمُسْلِمٌ وَهُوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللهَ شَيْئاً إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ﴾ رواه الشيخان، لە ڕۆژی هەینیدا سەعاتێك=کاتێك هەیە، هەر بەندەیەکی موسڵمان لەو کاتەدا نوێژ بکاو داوای شتێك لە خوای گەورە بکا، خوا دەیداتێ.

(وَالصَّلَاةَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ) هەروەها سوننەتە: لە شەو و ڕۆژی هەینیدا زۆر سەلاوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لێبدا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ... فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَالُوا: وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرَمْتَ؟ فَقَالَ: إِنَّ اللهَ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَالأَنْبِيَاءِ﴾ رواه ابوداود والنسائي وغيرهما بأسانيد صحيحة، لە هەموو ڕۆژەکانتان گەورەتر: ڕۆژی هەینییە، کەوابو: لە ڕۆژی هەینیدا زۆر سەلاواتم لە سەر لێبدەن، چونکە سەلاواتەکانتان دەهێندرێتە بەرچاوم لە ناو گۆڕەکەمدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەریخوا ﷺ چۆن سەلاواتەکانی ئێمە دەهێندرێتە بەرچاوت، خۆ لاشەی جەنابت لە گۆڕەکەتدا ڕزیوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایگەورە لە زەمینی قەدەغە کردوە: لاشەی پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ بڕزێنێ.

کەواتە: پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ لە گۆڕەکانیاندا ساغو زیندوون، هەروەك لە چەند حەدیسێکی(صحيح)دا هاتوە.

ئینجا بزانە: لە حەدیسەکانی سەلاواتیجومعە وەردەگیرێ: کە سەلاوات لێدان لە شەو و ڕۆژی هەینیدا خێری زیاترە لە قورئانخوێندنو لە زیکرەکانیتر، تەنها لە سوڕەتی(الكهف)و زیکری دوای‌نوێژەکان نەبێ، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوونکراوەتەوە.

وَيَحْرُمُ عَلَى ذِيالْجُمُعَةِ: اَلتَّشَاغُلُ بِالْبَيْعِ وَغَيْرِهِ بَعْدَ الشُّرُوعِ فِـيالأَذَانِ بَـيْنَ يَـدَيِ الْخَطِيبِ فَإِنْ بَاعَ صَحَّ،

---

## ﴿ كاركردن‌و مامه‌ڵه كردن له ڕۆژى هه‌ينى‌دا ﴾

(وَيَحْرُمُ) حه‌ڕامه: (عَلَى ذِيالْجُمُعَةِ) له سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ى جومعه‌ى لـه سـه‌ر واجبـه (التَّشَاغُلُ) خۆى خه‌ريك بكا (بِالْبَيْعِ) به مامه‌ڵه كردن: وه‌ك كڕين‌و فرۆشتن (وَغَيْرِهِ) هـه‌م حه‌ڕامـه خـۆى به كاره‌كانى‌تريش خه‌ريك بكا: وه‌ك به‌كرێ‌دان‌و مامڵه‌ته‌كانى‌ترو گشت كـارو پيشـه‌يه‌ك (بَعْدَ الشُّرُوعِ فِيالأَذَانِ) پاش ده‌ست پێكردنى بـانگى جومعـه (بَيْنَ يَدَيِ الْخَطِيبِ) لـه به‌رده‌ستى ووتارخوێن له‌و كاته‌ى بۆ خوتبـه‌دان لـه سـه‌ر مينبـه‌ر داده‌نيشـێ، واتـه: لـه‌و كاتـه‌وه گشـت كـارو پيشـه‌يه‌كو گشـت مامڵـه‌تێك حه‌ڕامـه، تـا سـه‌لامى جومعـه ده‌درێتـه‌وه، خواى‌گـه‌وره ده‌فه‌رموێ: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَـى ذِكْـرِاللهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ...﴾ الآيتين، هۆ ئـه‌و كه‌سـانه‌ى ئيمانتـان هێنـاوه، هـه‌ر كاتێـك لـه ڕۆژى هـه‌ينى بـانگى جومعه درا، ئێوه بڕۆن بۆ نوێژى جومعه‌و واز له كڕين‌و فرۆشتن بێنن.

(فَإِنْ بَاعَ) جا ئه‌گـه‌ر لـه‌و كاتـه‌دا شـتێكى فرۆشـت، يـان كڕى‌ى (صَحَّ) مامه‌ڵه‌كـه دروسـت ده‌بێ، واته: شته فرۆشراوه‌كه‌و پاره‌كه حه‌ڵاڵ ده‌بن، به‌ڵام هه‌ردوو لا گوناهبار ده‌بن.

﴿ ئاگـاداری ﴾: لـه سه‌رچـاوه‌كاندا ئـه‌و ئايه‌تـه‌يان كردۆتـه به‌ڵگـه: كـه گشـت مامڵـه‌تێكو گشت كـارو پيشـه‌يه‌ك لـه دواى بانگى‌جومعـه –وه‌كـو كـڕين‌و فرۆشـتن– حـه‌ڕامن، كـه‌وابو: كاركردن له چايخانه‌و چێشتخانه‌و فرۆشگاو گشت ئه‌و شـوێنانه‌ى مامڵـه‌تيان تـێ‌دا ده‌كرێ –له دواى بانگى‌جومعه– حه‌ڕامه، جا به كرێ بـێ، يـان بـه خـۆڕايى، بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر يـه‌كێك به‌كرێ گيرابو: بۆ كاركردنێك، ئه‌گه‌ر بۆ جومعه ڕۆيشتبا كاره‌كه تێـك ده‌چـوو، ئـه‌وه تـه‌نها بۆ ئه‌و به‌كرێگيراوه دروسته نه‌ڕواته جومعـه، هـه‌روه‌ك لـه (تحفة)و (نهاية)دا فه‌رموويانـه، واته: به‌و مه‌رجـه‌ى كاره‌كـه‌ى لـه جـۆرى كـڕين‌و فرۆشـتن‌و مامڵه‌تـه‌كانى‌تر نـه‌بێ، چـونكه ئه‌وانه حه‌ڕامن، هه‌روه‌ك باسمان كرد.

ئينجا بزانه: ئه‌و حه‌ڕاميه تـه‌نها ئـه‌و پياوانـه ده‌گرێتـه‌وه: كـه جومعـه‌يان لـه سـه‌ر واجبـه، كه‌واته: ئه‌گـه‌ر دوو ئـافره‌ت، يـان دوو ڕێبـوار، يـان ئافره‌تێكو ڕێبوارێـك –لـه دواى بـانگ– مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ يه‌كترى بكه‌ن، يان هه‌ر كارێكى‌تر بكـه‌ن حـه‌ڕام نيـه؟ چـونكه جومعـه‌يان لـه سه‌ر نيه، هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر دوو پيـاويش –كـه جومعـه‌يان لـه سـه‌ره– بـۆ جومعـه بـڕۆن‌و لـه ڕێگه‌دا مامه‌ڵه بكه‌ن، ديسان حه‌ڕام نيه؟ چونكه له نوێژى‌جومعـه دوا نه‌كـه‌وتون‌و فـه‌رمانى ئايه‌ته‌كـه‌يان بـه‌جێ هێنـاوه، بـه‌ڵام ئه‌گـه‌ر لايـه‌نێك جومعـه‌ى لـه سـه‌ر بـوو: وه‌كـو پيـاو، لايه‌نه‌كه‌ى‌تريش له سه‌رى نه‌بو: وه‌كو ئافره‌ت، ئـه‌و كاتـه بـۆ هـه‌ردوو لا حه‌ڕامه: له دواى

وَيُكْرَهُ قَبْلَ الأَذَانِ بَعْدَ الزَّوَالِ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) مَنْ أَدْرَكَ رُكُوعَ الثَّانِيَةِ أَدْرَكَ الْجُمُعَةَ فَيُصَلِّي بَعْدَ سَلاَمِ الإِمَامِ رَكْعَةً، وَإِنْ أَدْرَكَهُ بَعْدَهُ فَاتَتْهُ فَيُتِمُّ بَعْدَ سَلاَمِهِ ظُهْراً أَرْبَعاً، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَنْوِي فِي إِقْتِدَائِهِ الْجُمُعَةَ،

---

بانگی‌جومعە مامەڵە لەگەڵ یەکتری بکەن، چونکە ئەمەیان دەبێتە یارمەتیدەری ئەوی‌تر بۆ تاوانی‌دواکەوتن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.
(وَيُكْرَهُ) ئەو کارو مامەڵەی‌ڕابردوو ناپەسندە (قَبْلَ الأَذَانِ) پێش بانگدان (بَعْدَالزَّوَالِ) پاش لادانی ڕۆژ، واتە: هاتنی کاتی نیوەڕۆ (وَاللهُ أَعْلَم) بەڵام-پێش هاتنی کاتی نیوەڕۆ- لە ڕۆژی هەینی‌دا هیچ کارو هیچ مامەڵەیەك حەرام نیەو ناپەسندیش نیە، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی وێڕاگەیشتنی نوێژی جومعە ﴾

(مَنْ أدرَكَ رُكُوعَ الثَّانِيَةِ) هەر کەسێك بگاتە ڕوکووعی ڕەکعەتی‌دووەم لە پشت ئیمامێکی بەدەستنوێژ، تا سەلامدانەوەش لەگەڵ ئیمامەکەدا بەردەوام بێ، ئەوە (أدرَكَ الْجُمُعَةَ) دەگاتە نوێژی جومعە، واتە: جومعەکەی لە دەست ناچێ، کەوابو: (فَيُصَلِّي بَعْدَ سَلاَمِ الإِمَامِ رَكْعَةً) لە دوای سەلامدانەوەی‌ئیمام، مەئموومەکە هەڵدەستێتەوە تەنها ڕەکعەتێکی‌تر دەکاو تەحیات دەخوێنێ‌و سەلام دەداتەوە، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى﴾رواه النسائي والدارقطني والحاكم بِأسانيدصحيحة، هەر کەسێك گەیشتە ڕەکعەتێکی نوێژی جومعە، با ڕەکعەتێکی‌تریشی بە دوای‌دا بکا.
بەڵام (وَإِنْ أدرَكَهُ بَعْدَهُ) ئەگەر پاش ڕوکووعی ڕەکعەتی‌دووەم، مەئموومەکە گەیشتە ئیمامی‌جومعە (فَاتَتْهُ) نوێژی جومعەی لە دەست دەچێ، بە بەڵگەی ئەو حەدیسە، هەروەها ئەگەر لە ڕوکووعی ڕەکعەتی‌دووەمیش مەئموومەکە گەیشتە ئیمام، بەڵام تا سەلامدانەوە لەگەڵی‌دا بەردەوام نەبو-وەك نوێژی‌ئیمامەکە بەتاڵ ببێ- لەو حاڵەتەشدا نوێژی جومعەی لە دەست دەچێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، لە باسەکەی داهاتووشدا ڕوونی دەکەینەوە،إن شاءَ اللهُ تَعالَى.
کەوابو: لەو دوو حاڵەتەدا (فَيُتِمُّ بَعْدَ سَلاَمِهِ ظُهْراً أَرْبَعاً) لە پاش سەلامدانەوەی‌ئیمام، مەئموومەکە هەڵدەستێتەوەو-هەر بە نیەتەکەی‌جومعە- چوار ڕەکعەتی‌نیوەڕۆ تەواو دەکاو نایەوێ نیەتی‌نیوەڕۆ بێنێ، چونکە (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ) ئەو مەئموومەی لە دوای ڕوکووعی‌ڕەکعەتی‌دووەم دەگاتە ئیمامی‌جومعە (يَنْوِي فِيإِقْتِدَائِهِ الْجُمُعَةَ) لە کاتی‌ئیقتیداش بە ئیمامەکەی، واجبە: نیەتی نوێژی‌جومعە بێنێ، نەك نوێژی‌نیوەڕۆ، ئینجا بزانە: لەو مەسەلەیەدا بە مەتەڵ دەگوترێ: (صَلَّيْتُ مَا نَوَيْتُ، نَوَيْتُ مَا صَلَّيْتُ) نوێژم کرد نیەتم نەهێنا، نیەتم هێنا نوێژم نەکرد.

وَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ مِنَ الْجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا بِحَدَثٍ أَوْ غَيْرِهِ جَازَ الإِسْتِخْلاَفُ فِى الأَظْهَرِ، وَلاَ يَسْتَخْلِفُ لِلْجُمُعَةِ إِلاَّ مُقْتَدِياً بِهِ قَبْلَ حَدَثِهِ،

---

## ﴿ دانانی جێگری ئیمام لە ناو نوێژدا ﴾

(وَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ) هەر کاتێك ئیمام وازی هێناو هاتە دەر (مِنَ الْجُمُعَةِ أَوْ غَيْرِهَا) لە نوێژی جومعە، یان لە نوێژەکانی‌تر (بِحَدَثٍ) هاتنەدەریشی بە هۆی بێ‌دەستنوێژی بوو: جیاوازی نیە بێ‌دەستنوێژیەکەی: پێش نوێژدابەستن بوبێ‌و لە بیری چوبێ، یان لە ناو نوێژدا بێ‌دەستنوێژ ببێ (أَوْ غَيْرِهِ) یان بە هۆی شتێکی‌تر بوو: لەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەن، یان هەر بە بێ‌هیچ هۆیەك وازی لە ئیمامەتی هێنا، لە گشت ئەو حاڵەتانەدا (جَازَ الإِسْتِخْلاَفُ) دروستە: ئیمامەکە جێگرێك بۆ خۆی دابنێ تاکو نوێژەکە بە مەئمومەکان تەواو بکا، هەم بۆ مەئمومەکانیش دروستە: بە ئامازەکردن یەکێك لە جێی ئیمامەکە دابنێن‌و نوێژی لە پشت تەواو بکەن (فِى الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا ﴿عَنْ سَهْلِ بنِ سَعْدٍ: كَانَ أَبُوبَكْرٍ يُصَلِّي بِالنَّاسِ فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالنَّاسُ فِي الصَّلاَةِ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُوبَكْرٍ وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَصَلَّى...﴾ الحديث رواه الشيخان، لە کاتێکدا ئیمامی (أبوبکر) پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، هەر لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە مزگەوت، ئینجا ئیمامی (أبوبکر) کشاوە دواوەو پێغەمبەر ﷺ چووە پێشەوەو لە جێی ئیمامی (أبوبکر) پێشنوێژی کرد.

هەروەها بەڵگەی بێ‌دەستنوێژی‌و ئەو شتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەن ئەوە بوو: ﴿کە ئیمامی (عمر) بریندار کرا، (عبدالرحمن بن عوف)ی لە جێی خۆی دانا﴾، هەروەك لە بەشەکەی کۆتایی‌جەماعەتدا حەدیسەکەمان هێنا.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئیمام‌و مەئمومەکانیش جێگرێك دانەنێن، دروستە یەکێك لە خۆیەوە ببێتە جێگر، جا لە بەر ئەوەی جەماعەت بە خۆی سوننەتە، لە هیچ نوێژێکدا دانانی جێگر واجب نیە، تەنها لە ڕەکعەتی یەکەمی نوێژی‌جومعەدا نەبێ، کەواتە: ئەگەر ئیمام لە ڕەکعەتی یەکەمی جومعەدا بێ‌دەستنوێژ بوو، یان نوێژی بەتاڵ بوو و هیچ کەسێکیش لە خۆیەوە نەبوە جێگری ئیمامەکە، ئەو کاتە لە سەر مەئمومەکان واجبە: جێگرێك -بە ئامازەکردن- دابنێن، تاکو جومعەکەیان دروست ببێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَلاَ يَسْتَخْلِفُ لِلْجُمُعَةِ) نە ئیمام‌و نە ئەوانی‌تریش نابێ هیچ جێگرێك دابنێن بۆ تەواوکردنی نوێژی‌جومعە (إِلاَّ مُقْتَدِياً بِهِ) تەنها ئەو جێگرە نەبێ: کە نوێژی جومعەی لە پشت ئیمامەکە دابەستبێ (قَبْلَ حَدَثِهِ) پێش بێ‌دەستنوێژبوونی ئیمامەکەی، بەڵام

وَلاَ يُشْتَرَطُ كَوْنُهُ حَضَرَ الْخُطْبَةَ وَلاَ الرَّكْعَةَالأُولَى فِيالأَصَحِّ فِيهِمَا، ثُمَّ إِنْ كَانَ أَدرَكَ الأُولَى تَمَّتْ جُمُعَتُهُمْ، وَإِلاَّ فَتَتِمُّ لَهُمْ دُونَهُ فِيالأَصَحِّ، وَيُرَاعِيالْمَسْبُوقُ نَظْمَ الْمُسْتَخْلَفِ، فَإِذَا صَلَّى رَكْعَةً تَشَهَّدَ وَأَشَارَ إِلَيْهِمْ لِيُفَارِقُوهُ أَوْ يَنْتَظِرُوا، وَلاَ يَلْزَمُهُمْ اسْتِئْنَافُ نِيَّةِالْقُدْوَةِ فِيالأَصَحِّ،

---

(وَلاَ يُشْتَرَطُ) بە مەرج دانانىرێ (كَوْنُهُ حَضَرَ الْخُطْبَةَ) جێگرەكە ئامادەی خوتبەی جومعە بووبێ (وَلاَ الرَّكْعَةَ الأُولَى) هەروەها بە مەرج دانانىرێ لە ڕەكعەتی یەكەمیش گەیشتبێتە ئیمامەكەی (فِيالأَصَحِّ فِيهِمَا) لە فەرموودەی ڕاستتر لە هەردوو مەسەلەكاندا.
(ثُمَّ) ئینجا كە لە نوێژیجومعەدا جێگرێك داندرا، تێبینی دەكرێ: (إِنْ كَانَ) ئەگەر جێگرەكە (أَدرَكَ الأُولَى) گەیشتبوە ڕەكعەتییەكەم، واتە: پێش لە دەستچوونی ڕوكووعی ڕەكعەتی یەكەم ئیقتیدای بە ئیمامەكەوە كردبو، ئەوە (تَمَّتْ جُمُعَتُهُمْ) جومعەی جێگرەكەو مەئموومەكان تەواو دەبێ (وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر جێگرەكە نەگەیشتبوە ڕەكعەتی یەكەم، وەك لە ڕەكعەتیدووەم ئیقتیدا بكا (فَتَتِمُّ لَهُمْ) ئەوە تەنها جومعەی مەئموومەكان تەواو دەبێ، واتە: كە دوو ڕەكعەتەكەیان تەواو كردن، تەحیات دەخوێننو نیەتی جیابوونەوە دێننو سەلام دەدەنەوە، یان چاوەڕوانی جێگرەكە دەكەن (دُونَهُ) بەلام جومعەی جێگرەكە تەواو نابێ، كەوابو: چوار ڕەكعەتی نیوەڕۆ تەواو دەكا (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.
(وَيُرَاعِيالْمَسْبُوقُ) جێگریدواكەوتوو، واجبە: بپارێزێ (نَظْمَ الْمُسْتَخْلَفِ) ڕیزی نوێژی جێگراوەكە، واتە: لە سەر جێگرەكە واجبە: بە گوێرەی ڕیزی نوێژی ئیمامەجێگراوەكە نوێژەكە بۆ مەئموومەكان تەواو بكا، نەك بە گوێرەی ڕیزی نوێژەكەیخۆی، كەوابو: (فَإِذَا صَلَّى رَكْعَةً) هەر كاتێك ڕەكعەتێكی كرد (تَشَهَّدَ) واجبە دانیشێ بۆ تەحیات خوێندن، چونكە كاتی تەحیاتی ئیمامەجێگراوەكەیە (وَ) هەر كاتێك هەلساوە تاكو نوێژەكەی خۆی تەواو بكا (أَشَارَ إِلَيْهِمْ) ئاماژە بۆ مەئموومەكان دەكا (لِيُفَارِقُوهُ) تاكو نیەتی جیابوونەوە بێننو سەلام بدەنەوە (أَوْ يَنْتَظِرُوا) یان چاوەڕوانی بكەن تا ئەویش نوێژەكەی تەواو بكاو پێكەوە سەلام بدەنەوە( وَلاَ يَلْزَمُهُمْ)لە سەر مەئموومەكان واجب نیە( اسْتِئْنَافُ نِيَّةِ الْقُدْوَةِ) دووبارە نیەتی ئیقتیدا بە جێگرەكەوە بێنن (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە جێگرەكە لە پلەی جێگراوەكەیەو بەگوێرەی ڕیزی ئەوی ئیمامەتی دەكا.
﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەیڕابردوو گشتی دەربارەی ناو نوێژ بوو، بەلام ئەگەر ئیمامەكە لە دوای خوتبەیجومعە یەكێكی لە جێیخۆی دانا: تاكو لە سەرەتاوە ئیمامەتی نوێژی جومعە بكا، ئەوەش دروستە، بەو مەرجەی جێگرەكە ئامادەی هەردوو خوتبەكان بوبێ بە تەواوی،

وَمَنْ زُوحِمَ عَنِ السُّجُودِ فَأَمْكَنَهُ عَلَى إِنْسَانٍ فَعَلَ، وَإِلاَّ فَالصَّحِيحُ أَنَّهُ يَنْتَظِرُ وَلاَ يُــومِئُ بِهِ، ثُمَّ إِنْ تَمَكَّنَ قَبْلَ رُكُوعِ إِمَامِهِ سَجَدَ، فَإِنْ رَفَعَ وَالإِمَامُ قَائِمٌ قَرَأَ،

---

هـەروەها دروستـه: لـه نـاو خوتبەكانيشـدا جێگرێـك دابنـێ تـاكو خوتبـەكان تـەواو بكـا، بـەو مەرجەی جێگرەكە گوێی لە بەشەگوترلوەكە بوبێ، هەر وەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

ئينجا بزانە: لەو هەموو مەسەلانەیڕابردوودا مەرجە: ئيمامەكە لە سـەرەوەی ژمـارەی چـل بێ، چونكە ئەگەر ژمارەی چل بەويەوە تەولو ببێو واز لە نوێژ، يان لـه خوتبـه بێنـێ، ئـەو كاتـه جومعـەی گشـتيان بـەتاڵ دەبـێ، چـونكە ژمارەكـەيان لـه چـل پيـاو كـەم بۆتـەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوونی كردۆتەوەو، لە مەرجیچوارەمیجومعەشدا ڕابرا.

﴿ پاڵە پەستەی ناو نوێژی جومعە ﴾

(وَمَنْ زُوحِمَ عَنِ السُّجُودِ) هەر كەسێك پاڵەپەسـتە ڕێگـەی سـوجدەی لێگرتو نـەيتوانی لـه ڕەكعەتیيەكەمدا سوجدە ببا (فَأَمْكَنَهُ عَلَى إِنْسَانٍ) ئينجا بـۆی گونجـا لـه سـەر ئەنـدامێكی ئادەميزادێـك، يـان لەسـەر شـتێكیتر سـوجدەيەكیتەولو ببـا (فَعَـلَ) واجبـە: لەسـەر ئادەميزادەكە، يان لە سەر شتەكە سوجدە ببا، بەو مەرجـەی لـه ئـاژاوە نەترسـێ ﴿عَـنْ عُمَرَ﷛: إِذَا اشْتَدَّ الزِّحَامُ فَلْيَسْجُدْ أَحَدُكُمْ عَلَى ظَهْرِ أَخِيهِ﴾رواه البيهقي بإسنادصـحيح، هـەر كاتێك پاڵەپەستە بەهێز بوو، با هەر يەكێكتان لە سەر پشتی برایخۆی سوجدە ببا.

(وَإِلا) بەڵام ئەگەر بۆی نەگونجا لـه سـەر هـيچ شـتێك سوجدە ببا، يان نـەگونجا بـه شـێوەی سـوجدەيەكیتەولو سـوجدە ببـا (فَالصَّحِيحُ) فـەرموودەی ڕاسـت (أَنَّـهُ يَنْتَظِـرُ) ئـەو نوێژكـەرە چاوەڕوان دەكا تا بۆی دەگونجێ (وَلاَ يُومِئُ بِـهِ) دروسـت نيـە: بـه ئاماژەكردن سـوجدە ببـا، ئينجا سوننەتە ئيمام خوێندنیڕەكعەتیدووەم درێژ بكاتەوە، تـاكو ئـەو جـۆرە دواكەوتووانـەش وەێڕا بكـەن (ثُـمَّ) ئينجـا ئـەو مەئمومـەی سوجدەی ڕەكعـەتی يەكـەمی نـەبردوە (إِنْ تَمَكَّنَ) ئەگـەر بـۆی گونجـا سـوجدەكەی ببـا (قَبْـلَ رُكُـوعِ إِمَامِـهِ) پـێش ئـەوەی ئيمامەكـەی بڕواتـه ڕوكووعی ڕەكعەتیدووەم (سَجَدَ) واجبـە سـوجدەكەی ببـا، ئينجـا كـە مەئمومەكـە سـوجدەی ڕەكعەتیيەكەم دەبا، ئيمامەكەش لە ڕەكعەتیدووەمدا چوار حاڵەتی هەنە:

حاڵەتیيەكـەم: (فَـإِنْ رَفَـعَ) ئەگـەر مەئموومەكـە لـە سـوجدەیڕەكعەتیيەكەم هەڵسـاوەو (وَالإِمَامُ قَـائِمٌ) هێشـتا ئيمامەكـەی هـەر بـە پێوە بوو و دەسـتی بـە ڕوكووعیدووەم نـەكردبو (قَـرَأَ) واجبـە: دەسـت بـە فاتيحەخوێنـدن بكـا، ئينجـا ئەگـەر تـەولوی كـرد، ئـەوە لەگـەڵ ئيمامەكـەی ڕێـك دەكەوێتـەوەو ئـەو دواكەوتنـەش زيـانی نيـە، بـەڵام ئەگـەر تـەولوی نـەكردبو ئيمامەكەی چووە ڕوكووعیدووەم، ئەو كاتە واجبـە: واز لـە فاتيحـە بێنـێو لەگـەڵ ئيمامەكـەی بڕواتـە ڕوكووع، كەواتـە: وەك مەئموومیدواكـەوتوو، ئيمـام فاتيحەكـەی لـە سـەر لادەبـاو بـەو ڕوكووعە ڕەكعەتێكی تەولوی بۆ دەنووسرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

أَوْ وَالإِمَامُ راكِعٌ فَالأَصَحُّ يَرْكَعُ وَهُوَ كَمَسْبُوق، فَإِنْ كَانَ إِمَامُهُ فَرَغَ مِنَ الرُّكُوعِ وَلَمْ يُسَلِّمْ وَافَقَهُ فِيمَا هُوَ فِيه ثُمَّ صَلَّى رَكْعَةً بَعْدَهُ، وَإِنْ كَانَ سَلَّمَ فَاتَتِ الْجُمُعَةُ، وَإِنْ لَمْ يُمْكِنْهُ السُّجُودُ حَتَّى رَكَعَ الإِمَامُ فَفِي قَوْلٍ يُرَاعِي نَظْمَ نَفْسِه،

---

حاڵەتیدووەم: (أَوْ) یان کە مەئموومەکە لە سوجدەیڕەکعەتییەکەم هەڵساوەو (وَالإِمَامُ رَاكِعٌ) لەو کاتەدا ئیمامەکەی لە ڕوکووعیدووەمدا بوو (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە: نابێ فاتیحە بخوێنێ، بەڵکو (يَرْكَعُ) یەکسەر لەگەڵ ئیمامەکەی ڕوکووع دەبا (وَهُوَ) ئەو مەئموومەش (كَمَسْبُوقٍ) وەك مەئموومیدواکەوتووە، واتە: ئەگەر لەو کاتەی ئیمامەکەی لە ڕوکووعدایە، ئەویش وێڕا بگا پێش هەڵسانەوەی ئیمامەکەی ڕوکووع بباو لە ڕوکووعەکەشدا خۆی ڕابگرێ، ئەو ڕوکووعەی بە ڕەکعەتێکی تەواو بۆی دەژمێردرێو ئیمام فاتیحەکەی لە سەر لادەباو جومعەکەشی تەواو دەبێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی، لە جەماعەتیشدا ڕوون کراوە.

حاڵەتیسێیەم: (فَإِنْ) ئەگەر-لەو کاتەی مەئموومەکە لە سوجدەیڕەکعەتییەکەم هەڵساوە-(كَانَ إِمَامُهُ فَرَغَ مِنَ الرُّكُوعِ) ئیمامەکەی لە ڕوکووعیدووەم هەڵسابۆوە، بەڵام (وَلَمْ يُسَلِّمْ) هێشتا سەلامی نەدابۆوە (وَافَقَهُ) ئەو مەئموومەش لەگەڵ ئیمام ڕێك دەکەوێ، واتە: وەگەڵ ئیمامەکەی دەکەوێ (فِيمَا) لەو ڕوکنەدا: کە (هُوَ فِيهِ) ئیمام تێیدایە، جا ئەوە ڕەکعەتەکەی دووەمی لە دەست دەچێ، کەوابو: (ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَةً) ئینجا مەئموومەکە ڕەکعەتێکیتر دەکا (بَعْدَهُ) لە پاش سەلامدانەوەیئیمام لە جیاتی ڕەکعەتە دووەمەکە.

حاڵەتیچوارەم: (وَإِنْ) ئەگەر -لەو کاتەی مەئموومەکە هەر لە سوجدەی ڕەکعەتی یەکەمدا بوو-(كَانَ سَلَّمَ) ئیمامەکەی سەلامی دابۆوە (فَاتَتِ الْجُمُعَةُ) جومعەی مەئموومەکە دەفەوتێ، چونکە ڕەکعەتێکیتەواوی لەگەڵ ئیمامدا نەکردوە، کەوابو: سوجدەکەی تەواو دەکاو یەکسەر هەڵدەستێتەوە چوار ڕەکعەتی نیوەڕۆ تەواو دەکا، بەڵام ئەگەر لە سوجدەی دووەم سەری بەرز کردەوە، ئینجا ئیمام سەلامی داوە، ئەوە جومعەی نافەوتێ؟ چونکە ڕەکعەتێکیتەواوی لەگەڵ ئیمامدا کردوە، کەوابو: لە دوای سەلامدانەوەی ئیمامەکەی، تەنها ڕەکعەتێکیتر دەکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو، دەربارەی ئەو مەئمومە بوو: کە پێش ڕوکووعیئیمامەکەی بۆی بگونجێ سوجدە ببا، بەڵام (وَإِنْ لَمْ يُمْكِنْهُ السُّجُودُ) ئەگەر مەئموومەکە بۆی نەگونجا سوجدەیڕەکعەتییەکەم ببا (حَتَّى رَكَعَ الإِمَامُ) تا ئیمامەکەی دەستی بە ڕوکووعی ڕەکعەتیدووەم کرد (فَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يُرَاعِي نَظْمَ نَفْسِهِ) ڕیزی

وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَرْكَعُ مَعَهُ، وَيُحْسَبُ رُكُوعُهُ الأَوَّلُ فِي الأصَحِّ، فَرَكْعَتُهُ مُلَفَّقَةٌ مِنْ رُكُوعِ الأُولَى وَسُجُود الثَّانية، وَيُدْرِكُ بِهَاالْجُمُعَةَ فِىالأَصَحِّ، فَلَوْ سَجَدَ عَلَى تَرْتِيبِ نَفْسِهِ عَالماً بِأَنَّ وَاجِبَهُ الْمُتَابَعَةُ بَطَلَتْ صَلاتُهُ، وَإِنْ نَسِيَ أَوْ جَهِلَ لَمْ يُحْسَبْ سُجُودُهُ الأَوَّلُ، فَإِذَا سَجَدَ ثَانِياً حُسِبَ، وَالأَصَحُّ إِدْرَاكُ الْجُمُعَةِ بِهَذِهِ الرَّكْعَةِ إِذَا كَمُلَت

---

نوێژەكەی خۆی دەپارێزێو سوجدە دەباو شوێن ئیمامەكەی ناكەوێ، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (أَنَّهُ) ئەو مەئمومە ڕیزی نوێژەكەی خۆی ناپارێزێو سوجدە نابا، بەڵكو (يَرْكَعُ مَعَهُ) هەڵدەستێتەوە لەگەڵ ئیمامەكەی ڕوكووع دەبا، بەڵام ئەم ڕوكووعەی بۆ بە ڕوكنی‌نوێژ نـاژمێردرێ؟ چونكە لە ڕیزی خۆی‌دا نەكراوەو تەنها بۆ شوێنكەوتنی ئیمامەكەی بووە، بەڵام (وَيُحْسَبُ رُكُوعُهُ الأَوَّلُ) ڕوكووعی ڕەكعەتی یەكەمی بۆ بە ڕوكن دەژمێردرێ (فِىالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە ئەویان لە ڕیزی خۆی‌دا كراوە، كەوابو: (فَرَكْعَتُهُ) ڕەكعەتەكەی مەئموم (مُلَفَّقَةٌ) لێكدراوە (مِنْ رُكُوعِ الأُولَى) لە ڕوكووعەكەی‌ڕەكعەتی‌یەكەم‌و (وَسُجُودِالثَّانِيَةِ) لە سوجدەكانی‌ڕەكعەتی‌دووەم (وَيُدْرِكُ بِهَا الْجُمُعَةَ) بەو ڕەكعەتە لێكدراوە دەگاتە نوێژی جومعەو جومعەی لە دەست ناچێ (فِى الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەوابو: لە دوای سەلامدانەوەی ئیمام هەڵدەستێتەوە تەنها ڕەكعەتێكی‌تر دەكا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(فَلَوْ سَجَدَ) جا ئەگەر ئەو مەئمومە بە قەسدی سوجدەی برد (عَلَىتَرتِيبِ نَفْسِهِ) لە سەر ڕیزی نوێژەكەی خۆی، واتە: هەڵنەستاوە لەگەڵ ئیمامەكەی ڕوكووع ببا (عَالِماً) مەئمومەكەش زانا بوو و دەیزانی (بِأَنَّ وَاجِبَهُ الْمُتَابَعَةُ) واجبی وی ئەوەیە: شوێن ئیمامەكەی بكەوێ (بَطَلَتْ صَلاتُهُ) نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ، چونكە بە گوێرەی شەرع لە شوێنی ڕوكووعدا بە قەسدی سوجدەی بردوە.

بەڵام (وَإِنْ نَسِيَ) ئەگەر لە بیری كردبو (أَوْ جَهِلَ) یان نەیزانی واجبە شوێن ئیمامەكەی بكەوێو ڕوكووع ببا، بۆیێ سوجدەی برد، ئەوە نوێژەكەی بەتاڵ نابێ، بەڵام (لَمْ يُحْسَبْ سُجُودُهُ الأَوَّلُ) ئەو دوو سوجدەی جاری یەكەم-كە لە ڕیزی‌نوێژی‌خۆی‌دا كردونی- بۆی بە ڕوكنی‌نوێژ نـاژمێردرێ، چونكە بە گوێرەی شەرع لە شوێنی‌خۆی‌دا نەكراوە (فَإِذَا سَجَدَ ثَانِياً) ئینجا كە جاری دووەم سوجدەی برد، واتە: هەڵساوەو فاتیحەو ڕوكووعێكی‌تری تەواو كردن‌و سوجدەی برد (حُسِبَ) ئەوەی بۆ بە ڕوكن دەژمێردرێو دەخرێتە پاڵ ڕەكعەتی یەكەم، واتە: بەو سوجدەیە ڕەكعەتەكەی تەواو دەبێ.

ئینجا (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (إِدرَاكُ الْجُمُعَةِ) ئەو مەئمومە دەگاتە نوێژی جومعە (بِهَذِهِ الرَّكْعَةِ) بەو ڕەكعەتە: كە بە سوجدەی جاری‌دووەم تەواو كراوە(إِذَا كَمُلَتِ

السَّجْدَتَان قَبْلَ سَلَامِ الإِمَامِ، وَلَوْ تَخَلَّفَ بِالسُّجُودِ نَاسِياً حَتَّى رَكَعَ الإِمَامُ لِلثَّانِيَةِ رَكَعَ مَعَهُ عَلَى الْمَذْهَبِ.

## (بابُ صَلاة الْخَوْف)

هِيَ أَنْوَاعٌ: اَلأَوَّلُ: يَكُونُ الْعَدُوُّ فِي الْقِبْلَةِ فَيُرَتِّبُ الإِمَامُ الْقَوْمَ صَفَّيْنِ وَيُصَلِّي بِهِمْ

---

السَّجْدَتَانِ) بەو مەرجەی هەردوو سوجدەکانیجاریدووەمی تەواو بىن (قَبْلَ سَلَامِ الإِمَامِ) پێش ئەوەی ئیمامەکە سەلام بداتەوە.

جا بزانە: ئەوەیڕابردوو، گشتی دەربارەی دواکەوتنی بە هۆی پاڵەپەستە بوو، هەروەها (وَلَوْ تَخَلَّفَ بِالسُّجُودِ) ئەگەر مەئمووم بە سوجدەیڕەکعەتیيەکەم لە ئیمامەکەی دواکەوت (نَاسِياً) لە حاڵەتێکدا: کە لە بیری کردبو سوجدە ببا، یان بە هۆی نەخۆشی، یان سستی دوا کەوتبو و سوجدەی نەبرد (حَتَّى رَكَعَ الإِمَامُ) تا ئیمامەکە ڕوکووعی برد (لِلثَّانِيةِ) بۆ ڕەکعەتیدووەم، ئەوە (رَكَعَ مَعَهُ) واجبە: هەڵسێتەوە لەگەڵ ئیمامەکەیدا ڕوکووع ببا (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەیڕاستیمەزهەب، ئینجا کە لە دوای فاتیحەو ڕوکووعی ڕەکعەتی دووەم سوجدەی برد، بەو سوجدەیە ڕەکعەتیيەکەمی بۆ تەواو دەبیّو دەگاتە نوێژی جومعە، کەوابو: لە دوای سەلامدانەوەی ئیمام هەڵدەستێتەوە ڕەکعەتێکیتر دەکا.

ئینجا بزانە ئەو پاڵەپەستەو دواکەوتنە لە گشت نوێژەکانیتریشدا دێتە جیّ، بەڵام چونکە لە نوێژی جومعەدا زیاتر ڕوو دەداو لقی زیاتری لیّ بڵاودەبێتەوە، بۆیە لە باسی جومعەدا باس کراوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموويانە. وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين، وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

## ﴿ بابُ صَلاةِ الْخَوْفِ: باسی چۆنیەتی نوێژیترس ﴾

بزانە: نوێژی کاتیترس هەر وەکو کاتەکانیترە: لە ڕوکنەکانو لە مەرجەکانو لە سوننەتەکاندا، بەڵام چەند شتێکیتایبەتی لە نوێژی کاتیترسدا هەیە لەو حاڵەتەی بە جەماعەت دەکریّ: لێرەدا باس دەکرێنو لە کاتەکانیتردا ڕێگەیان نادریّ (هِيَ) نوێژەکانیترس (أَنْوَاعٌ) شانزە جۆری هەنە، لە قورئانو لە حەدیسدا بەڵگەیان هەیەو ئیمامی(الشافعي) سیّ جۆری لیّ هەڵبژاردونو بە درێژی قسەی لیّکردوون، بەڵام لە (منهاج)دا چوار جۆر گوتراون:

(الأَوَّلُ) جۆرییەکەمی نوێژیترس ئەمەیە: (يَكُونُ الْعَدُوُّ فِي الْقِبْلَةِ) دوژمن لە لای قیبلە بیّو هیچ شتێکیش نەبێتە پەردە لە نێوان لەشکری موسڵمانانو دوژمنەکەدا (فَيُرَتِّبُ الإِمَامُ الْقَوْمَ صَفَّيْنِ) ئیمامینوێژ مەئموومەکان دەکاتە دوو ڕیزو پێکەوە نوێژیان پیّ دادەبەستیّ (وَيُصَلِّي بِهِمْ) نوێژ بە هەردوو ڕیزەکان دەکا، تا هەموويان پێکەوە لە ڕوکووعی ڕەکعەتیيەکەم

فَإِذَا سَجَدَ سَجَدَ مَعَهُ صَفٌّ سَجْدَتَيْهِ وَحَرَسَ صَفٌّ فَإِذَا قَامُوا سَجَدَ مَنْ حَرَسَ وَلَحِقُوهُ، وَسَجَدَ مَعَهُ فِي الثَّانِيَةِ مَنْ حَرَسَ أَوَّلاً وَحَرَسَ الآخَرُونَ، فَإِذا جَلَسَ سَجَدَ مَنْ حَرَسَ وَتَشَهَّدَ بِالصَّفَّيْنِ وَسَلَّمَ، وَهَذِهِ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، بِعُسْفَانَ، وَلَوْ حَرَسَ فِيهِمَا فِرْقَتَا صَفٌّ جَازَ، وَكَذَا فِرْقَةٌ فِي الأَصَحِّ. اَلثَّانِي: يَكُونُ فِي غَيْرِهَا فَيُصَلِّي مَرَّتَيْنِ كُلَّ مَرَّةٍ بِفِرْقَةٍ،

---

هەڵدەستنەوە، ئینجا (فَإِذَا سَجَدَ) هەر کاتێك ئیمامەکە لە ڕەکعەتی‌یەکەمدا سوجدەی برد (سَجَدَ مَعَهُ صَفٌّ سَجْدَتَيْهِ) ڕیزی‌یەکەم لەگەڵ ئیمامەکەدا هەردوو سوجدەکان دەباو (وَحَرَسَ صَفٌّ) ڕیزی‌دووەمیش لە هەڵسانەوەی ڕوکووعدا دەمێنێتەوەو چاودێری دوژمن دەکا، ئینجا (فَإِذَا قَامُوا) هەر کاتێك ئیمامو ڕیزی‌یەکەم لە سوجدە هەڵسانەوە (سَجَدَ مَنْ حَرَسَ) ئەو کاتە ڕیزی‌دووەم -کە چاودێری‌دوژمنی کردبو- سوجدە دەباو (وَلَحِقُوهُ) لە ڕاوەستانی ڕەکعەتی‌دووەم دەگەنەوە ئیمام، تاکو گشتیان پێکەوە فاتیحە بخوێننو پێکەوە بڕۆنە ڕوکوعو پێکەوە لە ڕوکووع هەڵبستنەوە، ئینجا ئیمام دەڕواتە سوجدەی ڕەکعەتی‌دووەم (وَسَجَدَ مَعَهُ فِي الثَّانِيَةِ) لە ڕەکعەتی دووەمدا لەگەڵ ئیمام سوجدە دەبەن (مَنْ حَرَسَ أَوَّلاً) ئەوانەی لە ڕەکعەتی یەکەمدا چاودێری دوژمنیان کردبو (وَحَرَسَ الآخَرُونَ) مەئموومەکانی ڕیزەکەی‌تر -ئەم جارە- لە ڕاوەستانی ڕوکووعدا چاودێری دەکەن (فَإِذَا جَلَسَ) جا کە ئیمام بۆ تەحیات دانیشت (سَجَدَ مَنْ حَرَسَ) ئەوکاتە ئەو ڕیزەی چاودێری‌ی کردبو سوجدە دەباو (وَتَشَهَّدَ بِالصَّفَّيْنِ) پێکەوە ئیمام تەحیات بە هەردوو ڕیزەکان دەخوێنێو (وَسَلَّمَ) پێکەوە سەلام بە هەردوو ڕیزەکان دەداتەوە.

(وَهَذِهِ) ئەو شێوەیە (صَلاَةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ) شێوەی نوێژی پێغەمبەر ﷺ بوو (بِعُسْفَانَ) لە گوندی (عوسفان)، کە لە (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

ئینجا بزانە: مەرج نیە مەئموومەکانی ڕیزەکە گشتیان تێکڕا چاودێری بکەن، بەڵکو (وَلَوْ حَرَسَ فِيهِمَا) ئەگەر چاودێری کرد لە هەردوو ڕەکعەتەکاندا (فِرْقَتَا صَفٍّ) دوو چین لە یەك ڕیزدا بە نۆبەت (جَازَ) دروستە (وَكَذَا فِرْقَةٌ) هەروەها دروستە: لە هەردوو ڕەکعەتەکاندا تەنها یەك چین -بە بێ نۆبەت- چاودێری بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەبەستی چاودێری‌کردن دێتە جێ، ئینجا بزانە: ئەگەر نوێژەکە لە دوو ڕەکعەتیش زیاتر بێ، هەمان بڕیاری‌ڕابردووی بۆ دەدرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(اَلثَّانِي) جۆری‌دووەمی نوێژی‌ترس ئەمەیە: (يَكُونُ فِي غَيْرِهَا) دوژمن لە لایەکی‌تری -جگە لە قیبلە- بێ، یان لە لای قیبلە بێ، بەڵام پەردە لە نێواندا هەبێ، لەو حاڵەتەدا ئیمام لەشکرەکە دەکاتە دوو کۆمەڵ، ئینجا (فَيُصَلِّي مَرَّتَيْنِ) ئیمام دوو جار نوێژەکە دەکا: (كُلَّ مَرَّةٍ بِفِرْقَةٍ) هەر جارێك بە پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێك، واتە: کۆمەڵێك چاودێری دوژمن

وَهَذه صَلاَةُ رَسُول اللهِﷺ ببَطْنِ نَخلٍ. أوْ تقفُ فرْقَةٌ في وَجْهه ويُصَلِّي بفرْقَــة رَكْعَــةً فإذَا قَامَ للثَّانيَة فارَقَتْهُ وَأتَمَّتْ وَذَهَبَتْ إلَى وَجْهه وَجَاءَ الْوَاقفُونَ فاقْتَدَوْا به فصَلَّى بهِــمُ الثَّانيَةَ، فإذَا جَلَسَ للتَّشَهُّد قَامُوا فأتَمُّوا ثانيَتَهُمْ

---

دەكاو كۆمەڵەكەیتریش نوێژەكە بە تەواوی لە پشت ئیمامەكە دەكا، ئینجا كە سەلامیان دلوە، ئەم كۆمەڵە دەچێتە بەرامبەر دوژمن بۆ چاودێری، كۆمەڵەچاودێرەكەش دێتەوەو ئیمامەكە دووبارە ئەو نوێژە بە پێشنوێژی بۆ ئەوانیش دەكا، بەلام ئەم نوێژەی دووەم بۆ ئیمام بە سوننەت دادەندرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَهَذِه صَلاَةُ رَسُولِ اللهِﷺ ببَطْنِ نَخْلٍ) رواه الشیخان، ئەوەش شێوەی نوێژیپێغەمبەرﷺ بوو لە (بَطْنِ نَخْلٍ): كە شوێنێكە لە خاكی(نجد).

ئینجا بزانە: ئەگەر بگونجێ ئیمامێكیتر-كە ئەو نوێژەی نەكردبێ- پێشنوێژی بە كۆمەڵی دووەم بكا، ئەوە خێرترە، نەوەك نوێژی واجب لە پشت ئەو ئیمامە بكەن: كە نوێژێكی سوننەت دەكا، واتە پێغەمبەرﷺ بۆیێ ئەو جۆرە نوێژەی كرد، چونكە سەحابەكانﷺ دڵیان نەدەهات نوێژ لە پشت كەسێكیتر بكەنو پێغەمبەریشﷺ لە نێوانیاندا بێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

**جۆریسێیەمی نوێژیترس** ئەمەیە: دوژمن لە لایەكیتری-جگە لە قیبلە- بێ، ئینجا ئیمام لەشكرەكە دەكاتە دوو كۆمەڵ، ئینجا: یان وەك جۆریدووەم دوو جار پێشنوێژییان بۆ دەكا (أوْ) یان تەنها یەك جار نوێژەكە دەكاو هەر لەو نوێژەدا پێشنوێژی بۆ هەردوو كۆمەڵەكان دەكا، بەم جۆرە: (تَقِفُ فِرْقَةٌ فِي وَجْهِهِ) كۆمەڵێك لە رووی دوژمن دەوەستێو چاودێری دەكا (ويُصَلِّي بِفِرْقَةٍ رَكْعَةً) ئیمامەكەش رەكعەتییەكەم-بە پێشنوێژی- بە كۆمەڵەكەیتر دەكا، ئینجا (فإذَا قَامَ لِلثَّانِيَةِ) هەر كاتێك ئیمام بۆ رەكعەتیدووەم هەڵساوە (فَارَقَتْهُ) ئەو كۆمەڵە-بە دڵ- نیەتی جیابوونەوە دێنێو (وأتَمَّتْ) سەربەخۆ نوێژەكەی تەواو دەكاو سەلام دەداتەوە، ئینجا (وَذَهَبَتْ إلَى وَجْهِهِ) دەڕواتە بەرامبەر دوژمنو چاودێری دەكا، ئیمامەكەش لە ڕاوەستانی رەكعەتیدووەمدا هەر چاوەڕوانی كۆمەڵەكەیتر دەكا، جا ئەوانە جێگەیخۆیان دەگرنو (وَجاءَ الْوَاقِفُونَ) ئەوانەش كە تا ئێستا لە بەرامبەر دوژمن وەستابون ئەوانیش دێن (فَاقْتَدَوْا بِهِ) لە رەكعەتیدووەمدا ئیقتیدا بە ئیمامەكە دەكەنو نوێژی لە پشت دادەبەستن (فَصَلَّى بِهِمُ الثَّانِيَةَ) جا ئیمام رەكعەتیدووەمیش-بە پێشنوێژی- بۆ ئەوانیش دەكا (فإذَا جَلَسَ لِلتَّشَهُّدِ) جا كە ئیمامەكە بۆ تەحیات دانیشت (قَامُوا) ئەوان بۆ رەكعەتیدووەم هەڵدەستنەوە پێوەو ئیمامەكەش لە تەحیاتدا چاوەڕوانیان دەكا (فَأتَمُّوا ثَانِيَتَهُمْ) ئەوانیش رەكعەتیدووەمی خۆیان تەواو دەكەنو

وَلَحِقُوهُ وَسَلَّمَ بِهِمْ، وَهَذِهِ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِﷺ بِذَاتِ الرِّقَاعِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهَا أَفْضَلُ مِـنْ بَطْنِ نَخْلٍ، وَيَقْرَأُ الإِمَامُ فِي إِنْتِظَارِهِ الثَّانِيَةَ وَيَتَشَهَّدُ، وَفِي قَوْلٍ يُؤَخِّرُ لِتَلْحَقَهُ، فَإِنْ صَلَّى مَغْرِباً فَبِفِرْقَةٍ رَكْعَتَيْنِ، وَبِالثَّانِيَةِ رَكْعَةً،

---

(وَلَحِقُوهُ) له تەحیاتدا دەگەنەوە ئیمامەکەو تـەحیات دەخوێننو (وَسَلَّمَ بِهِمْ) ئیمام لەگەڵ ئەوان پێکەوە سەلام دەدەنەوە.

(وَهَذِهِ صَلاَةُ رَسُولِ اللهِﷺ بِذَاتِ الرِّقَاعِ) رواه الشیخان، ئەوەش شێوەی نوێژی پێغەمبەرﷺ بوو له (ذَاتِ الرِّقَاعِ) هەر لـه خـاکی(نجد)، جـا (وَالأَصَحُّ) بـه فەرموودەیڕاسـتتر (أَنَّهَا) ئـەو جۆرەی سێیەم (أَفْضَلُ) خێرتره (مِنْ بَطْنِ نَخْلٍ) له جۆریدووەمی(بطـن نخل)، چـونکه ئـەم جـۆرەی سـێیەم نوێـژی واجـب لـه پشـت سـوننەتکەری تـێدا نیـەو سـوکترەو یەکسـانترە؟ چـونکه کۆمـەڵێك خێـری (الله أکـبر)ی نوێژدابەسـتنی لەگـەڵ ئیمامـدا وەدەسـت دێنـێو کۆمەڵێکیش خێری سەلامدانەوەی لەگەڵ ئیمامدا وەدەست دێنێ.

کەوابو: لەم جۆرەی سێیەمدا (وَيَقْرَأُ الإِمَامُ) ئیمام له ڕەکعـەتی دووەمـدا فاتیحـەو سـوڕتێکی درێژ دەخوێنێ (فِي إِنْتِظَارِهِ الثَّانِيَةَ) لـەو حاڵەتـەی چاوەڕوانی کۆمـەڵیدووەم دەکـا، تـاکو وێبڕابگـەن (وَيَتَشَهَّدُ) هـەروەهاش تـەحیات دەخوێنـێو لـه دوای تـەحیات دوعـا دەکـا، تـا کۆمـەڵی دووەم ڕەکعـەتی دووەمـی خۆیـان تـەواو دەکـەن (وَفِي قَوْلٍ) لـه فەرموودەیـەکی بێهێزدا: لەو چاوەڕوانکردنەدا زیکر دەکا، واتە: فاتیحـەو تـەحیات ناخوێنـێ، بـەڵکو (يُؤَخِّرُ) خوێنـدنی فاتیحـەو تـەحیات دوا دێخـێ (لِتَلْحَقَهُ) تـا ئـەو کاتـەی کۆمـەڵی دووەم دەیگاتـێو لەگەڵ کۆمەڵەکەدا دەخوێنێ.

ئینجـا بزانـە: ئـەو نوێـژەیترس بـۆ ئەوەیـە: گشـتیان خێریجەماعـەتیان بگاتـێ، چـونکه ئەگـەر گشـتیان نوێژەکـە بـە تـەنهاش بکـەن، هــەر دروسـتە، هـەروەها پێویسـتە جەماعەتەکـەش لـە شـوێنێکی وەهـادا بکـرێ: چـەکی دوژمـن نەیانگرێتـەوە، هـەروەك لـه زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هـەروەها بزانـە: ئـەوە دەربـارەی نوێـژی دوو ڕەکعـەتی بـوو: وەك نوێـژی سـبەینێو چـوار ڕەکعەتیی کورتکراوە، بەڵام (فَإِنْ صَلَّى مَغْرِباً) ئەگەر هەر بـەو جـۆرەی سـێیەم پێشنوێژی مەغریبی کرد (فَبِفِرْقَةٍ رَكْعَتَيْنِ) دوو ڕەکعەت-بە پێشـنوێژی- بـۆ کۆمـەڵێك دەکـاو (وَبِالثَّانِيَةِ رَكْعَةً) بـۆ کۆمـەڵی دووەمـیش ڕەکعـەتێك-بـه پێشـنوێژی- دەکـا، واتـە: ڕەکعـەتی یەکـەمو دووەم-بـه پێشـنوێژی- بـۆ کۆمـەڵێك دەکـاو کۆمەڵەکـە تـەحیاتی یەکـەم لەگـەڵ ئیمامـدا دەخوێنێ، ئینجا کە ئیمـام هەڵساوە پێـوە کۆمەڵەکـە-بـە دڵ- نیـەتی جیابوونـەوە دێنـێو سـەربەخۆ نوێژەکـەی تـەواو دەکـاو سـەلام دەداتـەوەو دەڕواتـە بەرامبـەر دوژمـن، ئینجـا

وَهُوَ أَفْضَلُ مِنْ عَكْسِهِ فِي الأَظْهَرِ، وَيَنْتَظِرُ فِي تَشَهُّدِهِ أَوْ قِيَامِ الثَّالِثَةِ، وَهُوَ أَفْضَلُ فِي الأَصَحِّ، أَوْ رُبَاعِيَّةً فَبِكُلٍّ رَكْعَتَيْنِ، فَلَوْ صَلَّى بِكُلٍّ فِرْقَةٍ رَكْعَةً صَحَّتْ صَلاَةُ الْجَمِيعِ فِي الأَظْهَرِ، وَسَهْوُ كُلِّ فِرْقَةٍ مَحْمُولٌ فِي أُولاَهُمْ،

---

کۆمەڵی دووەمیش دێو لە ڕاوەستانی ڕەکعەتی سێیەمدا ئیقتیدا بە ئیمامەکە دەکا، ئیمامەکەش ئەو ڕەکعەتەی سێیەم بە پێشنوێژی بۆ ئەو کۆمەڵە دووەمە دەکا، ئینجا کە ئیمام بۆ تەحیاتی ئاخیر دانیشت کۆمەڵەکە هەڵدەستەوە پێوەو ئیمامەکەش لە تەحیاتی ئاخیردا هەر چاوەڕوان دەکا، تا کۆمەڵەکە دوو ڕەکعەتەکەیتریش تەواو دەکاو لە تەحیاتدا دەگاتەوە ئیمامەکەو پێکەوە سەلام دەدەنەوە.

(وَهُوَ) ئەو جۆرەی ڕابرا (أَفْضَلُ) خێرترە (مِنْ عَكْسِهِ) لە پێچەوانەکەی کە دەفەرموێ: ڕەکعەتێك بە کۆمەڵی یەکەم دەکاو دوو ڕەکعەت بە کۆمەڵی دووەم دەکا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بە هێزتردا (وَيَنْتَظِرُ) ئیمام چاوەڕوانی کۆمەڵی دووەم دەکا (فِي تَشَهُّدِهِ) یان لە تەحیاتی یەکەمیدا (أَوْ قِيَامِ الثَّالِثَةِ) یان لە ڕاوەستانی ڕەکعەتی سێیەمدا (وَهُوَ أَفْضَلُ) چاوەڕوانکردن لە ڕاوەستاندا خێرترە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(أَوْ رُبَاعِيَّةً) یان ئەگەر -بە پێشنوێژی- نوێژێکی چوار ڕەکعەتیی کرد (فَبِكُلٍّ رَكْعَتَيْنِ) دوو ڕەکعەت -بە پێشنوێژی- بۆ هەر کۆمەڵێك لە دوو کۆمەڵەکە دەکا، واتە: ڕەکعەتی یەکەم و دووەم -بە پێشنوێژی- بۆ کۆمەڵی یەکەم دەکاو لە دوای تەحیاتی یەکەم ئەو کۆمەڵە -بە دڵ- نیەتی جیابوونەوە دێنێو سەربەخۆ نوێژەکەی تەواو دەکاو سەلام دەداتەوەو دەچێتە بەرامبەر دوژمن، ئیمامەکەش لە ڕاوەستانی ڕەکعەتی سێیەمدا هەر چاوەڕوان دەکا، تا کۆمەڵی دووەم دێو ئیقتیدا بە ئیمام دەکاو دوو ڕەکعەت لە پشت ئیمام دەکاو لەگەڵ ئیمام تەحیات دەخوێنێ، ئینجا کۆمەڵەکە هەڵدەستێتەوەو ئیمامەکەش لە تەحیات چاوەڕوانیان دەکاو کۆمەڵەکەش دوو ڕەکعەتەکەیتر تەواو دەکاو دەگاتەوە ئیمامو پێکەوە سەلام دەدەنەوە.

(فَلَوْ صَلَّى بِكُلٍّ فِرْقَةٍ رَكْعَةً) ئەگەر لە نوێژی چوار ڕەکعەتیدا ئیمام لەشکرەکە بکاتە چوار کۆمەڵو هەر ڕەکعەتێك -بە پێشنوێژی- بۆ کۆمەڵێك بکا (صَحَّتْ صَلاَةُ الْجَمِيعِ) نوێژی گشتیان دروست دەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، هەروەها لە نوێژی مەغریبیشدا دروستە: لەشکرەکە بکاتە سێ کۆمەڵو هەر ڕەکعەتێك بە پێشنوێژی بۆ کۆمەڵێك بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَسَهْوُ كُلِّ فِرْقَةٍ) سەهووی هەر کۆمەڵێك لە دوو کۆمەڵەکە (مَحْمُولٌ فِي أُولاَهُمْ) لە ڕەکعەتی یەکەمیاندا ئیمام هەڵیدەگرێ، کەواتە: هیچ کۆمەڵێك -بە هۆی ئەو سەهووەی لە ڕەکعەتی

وَكَذَا ثَانِيَةُ الثَّانِيَةِ فِي الأَصَحِّ لاَ ثَانِيَةُ الأُولَى، وَسَهْوُهُ فِي الأُولَى يَلْحَقُ الْجَمِيعَ، وَفِي الثَّانِيَةِ لاَ يَلْحَقُ الأَوَّلِينَ، وَيُسَنُّ حَمْلُ السِّلاَحِ فِي هَذِهِ الأَنْوَاعِ، وَفِي قَوْلٍ يَجِبُ.

---

یەکەمیدا کردوویەتی– نابێ سوجدەی سەهوو ببەن، چونکە لە کاتی سەهووەکە لە حاڵەتی ئیقتیدادا بونە (وَكَذَا ثَانِيَةُ الثَّانِيَةِ) هەروەها سەهووی ڕەکعەتی دووەمی کۆمەڵەکەی دووەم ئەویش ئیمام هەڵیدەگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هێشتا هەر لە حاڵەتی ئیقتیدادانەو ئیمام لە تەحیاتدا چاوەڕوانیان دەکا (لاَ ثَانِيَةُ الأُولَى) بەڵام سەهووی ڕەکعەتی دووەمی کۆمەڵەکەی یەکەم ئیمام هەڵیناگرێ، چونکە لە دوای نیەتی جیابوونەوە سەهوویان کردوەو لە حاڵەتی ئیقتیدادا نەبوە، کەوابو: بۆ خۆیان سوجدەی سەهوو دەبەن.

(وَسَهْوُهُ فِي الأُولَى) سەهووی ئیمام لە ڕەکعەتییەکەمدا (يَلْحَقُ الْجَمِيعَ) دەگاتە گشتیان، واتە: ئەگەر ئیمام لە ڕەکعەتییەکەمیدا سەهووی کرد، سوننەتە: کۆمەڵییەکەم پێش سەلامدانەوەی خۆی سوجدەی سەهوو ببا، کۆمەڵیدووەمیش لەگەڵ ئیمام سوجدەی سەهوو دەبا (وَفِي الثَّانِيَةِ) سەهوویئیمام لە ڕەکعەتیدووەمدا (لاَ يَلْحَقُ الأَوَّلِينَ) ناگاتە مەئمومەکانی کۆمەڵییەکەم، چونکە پێش سەهووکردنی ئیمام نیەتی جیابوونەوەیان هێناوە، بەڵام دەگاتە کۆمەڵیدووەم، کەوابو: لەگەڵ ئیمامدا سوجدەی سەهوو دەبەن.

(وَيُسَنُّ) سوننەتە: بۆ ئەو کەسەی نوێژیترس دەکا (حَمْلُ السِّلاَحِ) چەك هەڵبگرێ (فِي هَذِهِ الأَنْوَاعِ) لە هەر سێك جۆرەکەی نوێژیترسدا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (يَجِبُ) واجبە: لە نوێژیترسدا چەك هەڵبگرێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلْتَقُمْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا أَسْلِحَتَهُمْ﴾ با کۆمەڵێکی سەحابەکان لەگەڵ تۆدا ڕابوەستن نوێژ بکەنو چەکەکەی خۆیان بە دەستەوە بگرن. بەڵام فەرموودەی بەهێز ئەو فەرمانەی بە سوننەت داناوە.

ئینجا بزانە: مەرجە: چەکەکە پاك بێو ڕێگەی هیچ ڕوکنێکی نوێژ نەگرێ، چونکە ئەگەر چەکەکە پیس بوبێ، یان ڕێگەی ڕوکووع، یان سوجدە بگرێ، ئەو کاتە هەڵگرتنی حەرامەو نوێژ بەتاڵ دەکا، هەروەها ناپەسندە: هەڵگرتنی ئەو جۆرە چەکەی نوێژکەرەکانیتر ئازار دەدا.

هەروەها بزانە: ئەگەر مەترسی شکانو لەناوچوون هەبێ، ئەو کاتە چەك هەڵگرتن واجبەو دانانی حەرامە، بەڵام ئەگەر مەترسی نەبو، ئەو کاتە دانانی ناپەسندە، جامەبەست لە هەڵگرتنی چەك–لە نوێژیترسدا– ئەوەیە: بە ئاسانی دەستی بگاتێ، کەوابو: جیاوازی نیە بە شانیەوە بێ، یان لەبەردەستی دابنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

اَلرَّابِعُ: أَنْ يَلْتَحِمَ الْقِتَالُ أَوْ يَشْتَدَّ الْخَوْفُ فَيُصَلِّي كَيْفَ أَمْكَنَ رَاكِباً وَمَاشِياً، وَيُعْذَرُ فِي تَرْكِ الْقِبْلَةِ وَكَذَا الأَعْمَالِ الْكَثِيرَةِ لِحَاجَةٍ فِي الأَصَحِّ، لاَ صِيَاحٍ، وَيُلْقِي السِّلاَحَ إِذَا دَمِيَ، فَإِنْ عَجَزَ أَمْسَكَهُ، وَلاَ قَضَاءَ فِي الأَظْهَرِ،

---

(اَلرَّابِعُ) چوارەمین جۆری نوێژی‌ترس ئەمەیە: کە لە حاڵەتی‌ترسی بەهێزدا دەکرێ: وەك (أَنْ يَلْتَحِمَ الْقِتَالُ) جەنگاوەرەکان لە جەنگدا لەگەڵ دوژمن تێکەڵ ببن‌و نەگونجێ واز لە جەنگ بێنن (أَوْ يَشْتَدَّ الْخَوْفُ) یان ترس زۆر بە هێز ببێ‌و بترسێن-ئەگەر ببنە دوو کۆمەڵ- دوژمن هێرش بکاتە سەریان، کەوابو: لەو حاڵەتەدا (فَيُصَلِّي) واجبە: گشت کەسێك نوێژە واجبەکان بکا (كَيْفَ أَمْكَنَ) بە هەر چۆنیەتیێکی بگونجێ: (رَاكِباً) بە سواری‌و (وَمَاشِياً) بە پیادەیی، واتە: لەو حاڵەتانەدا دروست نیە: نوێژەکە لە کاتی خۆی دوا بێخێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿(فَإِنْ خِفْتُمْ فَرِجَالاً أَوْ رُكْبَانًا). قالَ ابن عمر رَضِيَ اللهُ عَنهُما فِي تَفْسِيرِها: (مُسْتَقْبِلِي الْقِبْلَةِ وَغَيْرَ مُسْتَقْبِلِيهَا)﴾ رواه البخاري، ئەگەر ترسان، نوێژەکەتان بکەن بە پیادەیی، یان بە سواری، جا ڕووتان لە قیبلە بێ، یان نا.

ئینجا هەر بە بەڵگەی ئایەتەکە (وَيُعْذَرُ) جەنگاوەر عوزری دەدرێتێ (فِي تَرْكِ الْقِبْلَةِ) لە وازلێهێنانی قیبلەدا، واتە: ئەگەر بە هۆی جەنگ نەیتوانی ڕوو لە قیبلە بکا، نوێژەکەی دروست دەبێ، هەرچەند لە حاڵەتی نوێژدابەستن‌و ڕوکووع‌و سوجدەشدا ڕوو لە قیبلە نەکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَكَذَا الأَعْمَالِ الْكَثِيرَةِ) هەروەها عوزری دەدرێتێ لە کردارە زۆرەکاندا: وەك لێدان‌و چەك هاویشتن‌و غاردان‌و ئەو جۆرە کردارانە (لِحَاجَةٍ) بە هۆی پێویستی جەنگ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: ئەگەر ئەو کردەوە زۆرانەی بە هۆی پێویستی جەنگ نەبون، نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(لاَ صِيَاحٍ) بەڵام عوزری نادرێتێ لە نەعرەتە لێدان‌و هاوارکردن‌و قسە کردن، واتە: هەر یەکێك لەوانە ئەگەر بە قەسدی بێ‌و دوو پیتی لێ ئاشکرا ببێ، نوێژەکەی بەتاڵ دەکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُلْقِي السِّلاَحَ) واجبە: جەنگاوەر چەکەکەی دابنێ (إِذَا دَمِيَ) هەر کاتێك چەکەکەی خوێناوی بو، یان بە پیسیەکی‌تر پیس بو: خوێنەکەو پیسیەکەش لەبەر زۆری لێیان نەدەبوردرا (فَإِنْ عَجَزَ) بەڵام ئەگەر توانای دانانی نەبو؟ چونکە ناچار بو هەڵیبگرێ (أَمْسَكَهُ) چەکە پیسبووەکەی بە دەستیەوە دەگرێ‌و نوێژەکەی دەکا (وَلاَ قَضَاءَ) دووبارەکردنەوەشی لە سەر نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بە هێزتردا، بەڵام لە سەرچاوەکاندا پشتیان بەم

وَإِنْ عَجَزَ عَنْ رُكُوعٍ أَوْ سُجُودٍ أَوْمَأَ وَالسُّجُودَ أَخفَضَ، وَلَهُ ذَا النَّوْعُ فِي كُلِّ قِتَالٍ وَهَزِيمَةٍ مُبَاحَيْنِ، وَهَرَبٍ مِنْ حَرِيقٍ وَسَيْلٍ وَسَبُعٍ، وَغَرِيمٍ عِنْدَ الإِعْسَارِ وَخَوْفِ حَبْسِهِ، وَالأَصَحُّ مَنْعُهُ لِمُحْرِمٍ خَافَ فَوْتَ الْحَجِّ،

---

فەرموودەیە نەبەستوە، بەڵکو ئەو فەرموودەیان بە بەهێزتر داناوە: کە بە هۆی ئەو پێسیە دووبارەکردنەوەی نوێژەکە واجبە، چونکە مەرجی پاکی ناتەواوە.

(وَإِنْ عَجَزَ عَنْ رُكُوعٍ أَوْ سُجُودٍ) ئەگەر جەنگاوەرەکە توانای نەبو ڕوکووع، یان سوجدە ببا (أَوْمَأَ) واجبە: ئاماژە بە ڕوکووعو سوجدە بکا (وَالسُّجُودَ أَخْفَضَ) واجبە: سوجدەکەی نزمتر بکا لە ڕوکووعەکەی.

(وَلَهُ) بۆ نوێژکەر دروستە: (ذَا النَّوْعُ) ئەو جۆرە نوێژەیچوارەم بکا: کە لە حاڵەتیترسی بە هێزدا دەکرێ (فِي كُلِّ قِتَالٍ) لە حاڵەتی گشت جەنگێکو (وَهَزِيمَةٍ) گشت بەزینێك (مُبَاحَيْنِ) کە جەنگەکەو بەزینەکە هەردووکیان حەڵاڵ بن: وەك بەرگریکردن لە ئاینو ماڵو ناموس، جەنگ لە دژی ڕێگرو هەڵگەڕاوەکان لە دەوڵەتی ئیسلامی ڕاستەقینە، هەروەها بەزینیموسڵمانان لە بەردەم لەشکرێکی سێ هەندی خۆیان، یان زیاتر، کەواتە: ئەگەر جەنگەکە، یان بەزینەکە حەڵاڵ نەبو ئەو جۆرە نوێژە دروست نیە: وەك جەنگ لە دژی موسڵمانان بە ناهەق، یان جەنگی عەشیرەتو گرۆهەکان بە هۆی ڕەگەز پەرستیو دەمارگیری، یان بەزینی موسڵمانان لە بەردەم لەشکرێکی دوو هەندی خۆیان، یان کەمتر، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَهَرَبٍ) هەروەها ئەو جۆرە نوێژەیچوارەمی بۆ دروستە لە حاڵەتیهەڵاتندا: (مِنْ حَرِيقٍ) لە ترسی سووتانو (وَسَيْلٍ) لافاو و (وَسَبُعٍ) دڕندەو ستەمکارو (وَغَرِيمٍ) خاوەن قەرز (عِنْدَ الإِعْسَارِ) کە نەبوویی بێو قەرزەکەی پێنەدرێتەوەو (وَخَوْفِ حَبْسِهِ) بشترسێ بەند بکرێ، واتە: ئەو جەنگاوەرو بەزیو و هەڵاتووانەیڕابردوو، چۆن بۆیان بگونجێ نوێژە واجبەکەیان دەکەنو ئاماژە بە ڕوکووعو سوجدە دەکەنو بە ڕێگەی خۆیاندا ڕادەکەن، جا ئەگەر نەگونجا، دروستە ڕوو لە قیبلە نەکەنو هیچیان دووبارەکردنەوەی نوێژەکەیان لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (مَنْعُهُ) ئەو جۆرە نوێژەیچوارەم قەدەغەیەو دروست نیە: (لِمُحْرِمٍ) بۆ ئەو حاجیەی ئیحرامی بەستوەو لە کاتی نوێژی عیشادا دەڕواتە عەرەفەو (خَافَ فَوْتَ الْحَجِّ) دەترسێ حەجەکەی بفەوتێ، چونکە ئەگەر لە شوێنێك بوەستێو نوێژی عیشا بکا فریای وەستانی (عرفة) ناکەوێ، کەواتە: واجبە: نوێژەکەی دوا بخاو بە پەلە بڕواتە (عرفة)، چونکە قەزاکردنەوەی نوێژ ئاسانترە لە قەزاکردنەوەی حەج، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَوْ صَلَّوْا لِسَوَادٍ ظَنُّوهُ عَدُوّاً فَبَانَ غَيْرُهُ قَضَوْا فِي الأَظْهَرِ.

(فَصْلٌ) يَحْرُمُ عَلَى الرَّجُلِ اسْتِعْمَالُ الْحَرِيرِ بِفَرْشٍ وَغَيْرِهِ، وَيَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ لُبْسُهُ، وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُ افْتِرَاشِهَا، وَأَنَّ لِلْوَلِيِّ إِلْبَاسَهُ الصَّبِيَّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ حِلُّ افْتِرَاشِهَا وَبِهِ قَطَعَ الْعِرَاقِيُّونَ وَغَيْرُهُمْ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَجُوزُ لِلرَّجُلِ لُبْسُهُ لِلضَّرُورَةِ كَحَرٍّ وَبَرْدٍ مُهْلِكَيْنِ أَوْ فَجْأَةِ حَرْبٍ وَلَمْ يَجِدْ غَيْرَهُ،

---

(وَلَوْ صَلَّوْا) ئەگەر ئەو جۆرە نوێژەی چوارەمیان کرد (لِسَوَادٍ) لە ترسی ڕەشایەتیەك: وەکو کۆمەڵە وولاغێك، یان کۆمەڵە درەختێکیان بینیو (ظَنُّوهُ عَدُوًّا) وا تێگەیشتن ڕەشایەتیەکە دوژمنە (فَبَانَ خِلاَفُهُ) جا ئاشکرا بوو: دوژمن نەبو (قَضَوْا) واجبە: نوێژەکە دووبارە بکەنەوە (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بە هێزتردا، چونکە لە ڕاستیدا هیچ ترسێك نەبوەو ئەوان بە هەڵەدا چوونە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی جلو بەرگ ﴾

(يَحْرُمُ عَلَىالرَّجُلِ) لە پیاوی بالغ حەرامە (اسْتِعْمَالُ الْحَرِيرِ) ئاوریشم بەکار بێنێ: (بِفَرْشٍ) وەك بە ڕاخستن بەکاری بێنێ بۆ لە سەر خەوتنو دانیشتن (وَغَيْرِهِ) هەروەها بەکارهێنانیتریش: وەك بیکاتە بەرگ، یان شتی پێ داپۆشێ.

(وَيَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ لُبْسُهُ) بۆ ئافرەت حەڵاڵە: بەرگی ئاوریشم دەبەر بکا، بە بەڵگەی(إجماع)، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَيْنِ-أَيِ الذَّهَبَ وَالْحَرِيرَ- حَرَامٌ عَلَىذُكُورِأُمَّتِي﴾ وفي رواية: ﴿حِلٌّ لإِنَاثِهَا﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، بەکارهێنانی زێڕو ئاوریشم لە نێرینەی ئوممەتم حەرامەو بۆ ئافرەتانی ئوممەتم حەڵاڵە.

ئینجابزانە: باسی حەرامی زێڕ بۆ پیاوان، لە زەکاتی زێڕو زیودا ڕوون دەکەینەوە، إن شاءالله تعالى.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەیڕاستتر (تَحْرِيمُ افْتِرَاشِهَا) حەرامە ئافرەت ئاوریشم ڕابێخێ، بەڵام ئەوە بێهێزە (وَأَنَّ لِلْوَلِيِّ) لە فەرموودەیڕاستتر: بۆ سەرپەرشتکاریمنداڵ دروستە (إِلْبَاسَهُ الصَّبِيَّ) بەرگیئاوریشم دەبەر منداڵینێرینە بکا، چونکە داوالێکردنیشەرع منداڵ ناگرێتەوە (قُلْتُ) ئیمام (النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە (حِلُّ افْتِرَاشِهَا) حەڵاڵە ئافرەت ئاوریشم ڕابێخێ (وَبِهِ قَطَعَ الْعِرَاقِيُّونَ وَغَيْرُهُمْ) بەو فەرموودەیە زانایانی عێراقو ئەوانیتر بڕیارەکەیان بڕاندۆتەوە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَيَجُوزُ لِلرَّجُلِ) بۆ پیاوی بالغ دروستە: (لُبْسُهُ لِلضَّرُورَةِ) بەرگی ئاوریشم دەبەر بکا لە بەر ناچاری (كَحَرٍّ وَبَرْدٍ مُهْلِكَيْنِ) وەکو گەرمایەكو سەرمایەکی بەهێز: کە گیانی، یان سوودی ئەندامێکی لە دەست بدەن، یان تووشی ئازارێکی زۆری بکەن (أَوْ فَجْأَةِ حَرْبٍ) یان لە ناکاو جەنگێك ڕوو بداو (وَلَمْ يَجِدْ غَيْرَهُ) جگە لە بەرگیئاوریشم هیچیتری دەست نەکەوێ

وَلِلْحَاجَةِ كَجَرَبٍ وَحِكَّةٍ وَدَفْعِ قَمْلٍ، وَلِلْقِتَالِ كَدِيبَاجٍ لاَ يَقُومُ غَيْرُهُ مَقَامَهُ، وَيَحْرُمُ الْمُرَكَّبُ مِنْ إِبْرِيسَمٍ وَغَيْرِهِ إِنْ زَادَ وَزْنُ الإِبْرِيسَمِ، وَيَحِلُّ عَكْسُهُ، وَكَذَا إِنِ اسْتَوَيَا فِي الأَصَحِّ، وَيَحِلُّ مَا طُرِّزَ أَوْ طُرِّفَ بِحَرِيرٍ قَدْرَالْعَادَةِ،

---

دەبەری بکا (وَلِلْحَاجَةِ) هەروەها لەبەر پێویستیش دروستە: بەرگی ئاوریشم دەبەر بکا (كَجَرَبٍ) وەکو خروشتیتەڕو (وَحِكَّةٍ) خروشتیوشك، هەروەها پۆشینی عەورەت ئەگەر پۆشاکیتری دەست نەکەوێو (وَدَفْعِ قَمْلٍ) بۆ چارەسەری ئەسپێ ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّهُ ﷺ رَخَّصَ لِعَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ لِحِكَّةٍ بِهِمَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ڕێگەیدا: (عبدالرحمن)و (زبير) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا بەرگی ئاوریشم دەبەر بکەن، چونکە خروشتیان هەبو.

(وَلِلْقِتَالِ) هەروەها لە حاڵەتی جەنگدا دروستە ئەو جۆرە ئاوریشمە دەبەر بکا: کە چەك کاری لێناکا (كَدِيبَاجٍ) وەکو ئاوریشمی ئەستوور، کە (لاَ يَقُومُ غَيْرُهُ مَقَامَهُ) شتێکیتر لە جێگەی ئەو ئاوریشمە ئەستوورە نەبێ دەبەری بکاو چەك کاری لێنەکا، واتە: چەکی وەکو شمشێرو تیر.

(وَيَحْرُمُ) لە پیاوی نێرینە حەرامە (الْمُرَكَّبُ) هەر شتێك کە بە تێکەڵاوی دروست کرابێ (مِنْ إِبْرِيسَمٍ) لە ئاوریشمو (وَغَيْرِهِ) شتیتر: وەکو لۆکەو کتانو خوری (إِنْ زَادَ وَزْنُ الإِبْرِيسَمِ) ئەگەر کێشی ئاوریشمەکە زیاتر بێ لە شتەکانیتر (وَيَحِلُّ عَكْسُهُ) بەڵام پێچەوانەکەی حەڵاڵە، واتە: ئەگەر کێشی شتەکان لە ئاوریشمەکە زیاتر بێ.

(وَكَذَا) هەروەها حەڵاڵە (إِنِ اسْتَوَيَا) ئەگەر کێشی ئاوریشمەکەو شتەکان یەکسان بێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: إِنَّمَا نَهَى النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الثَّوْبِ الْمُصْمَتِ مِنَ الْحَرِيرِ، فَأَمَّا الْعَلَمُ وَسَدَى الثَّوْبِ مِنَ الْحَرِيرِ فَلاَبَأْسَ بِهِ﴾ رواه ابوداود بإسنادصحيح، پێغەمبەرﷺ تەنها ئەو بەرگەی قەدەغە کردوە: کە هەر هەمووی لە ئاوریشم بێ، بەڵام ئەگەر نەخشی جلەکە، یان ڕایەڵەکەی لە ئاوریشم بێ، حەرام نیە.

(وَيَحِلُّ) حەڵاڵە بۆ پیاوی بالغ (مَا طُرِّزَ) ئەو بەرگەی ڕۆخەکانی تەنها لە ئاوریشم چنراوە، بەو مەرجەی لە چوار پەنجە زیاتر نەبێ، هەروەك لە (صحيح مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

(أَوْ طُرِّفَ) یان نەخشی لە سەر ڕۆخەکان کراوە (بِحَرِيرٍ) بە داوی ئاوریشم (قَدْرَ الْعَادَةِ) بە ئەندازەی عادەتی خەڵك ﴿عَنْ أَسْمَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا –وَقَدْ أَخْرَجَتْ جُبَّةً لَهَا لِبْنَةُ دِيبَاجٍ وَفَرْجَيْهَا مَكْفُوفَيْنِ بِالدِّيبَاجِ– وَقَالَتْ: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَانَ يَلْبَسُهَا، فَنَحْنُ نَغْسِلُهَا لِلْمَرْضَى يُسْتَشْفَى بِهَا﴾ رواه مسلم، (أسماء)ی کیژی ئیمامی(أبي‌بكر) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا جوببەیەکی هێنا دەرەوە، پشت ملو ڕۆخەکانی بە ئاوریشم نەخشێندرابونو فەرمووی: ئەمە جوببەکەی

وَلُبْسُ الثَّوْبِ النَّجِسِ فِي غَيْرِ الصَّلَاةِ وَنَحْوِهَا، لَا جِلْدِ كَلْبٍ وَخِنْزِيرٍ إِلَّا لِضَرُورَةٍ كَفَجْأَةِ قِتَالٍ، وَكَذَا جِلْدُ الْمَيْتَةِ فِي الأَصَحِّ، وَيَحِلُّ الإِسْتِصْبَاحُ بِالدُّهْنِ النَّجِسِ عَلَى الْمَشْهُورِ.

---

پێغەمبەرەﷺ کە لە ژیانـدا مـابو دەبـەری دەکـرد، ئێسـتاش ئێمـە بـۆ نەخۆشـەکان دەیشۆینو ئاوشۆرەکەشی دەدەینە نەخۆشەکانو شیفایان بۆ دێو چاك دەبنەوە.

ئینجـا بزانـە: ئـەو حەدیسـە یەکێکـە لـەو بەڵگانـە: کـە بەرەکـەت وەرگرتن سوننەتە: بـە ئاسەواری پیاوچاکانو بە جلەکانیان، واتە: لە دوای مردنیـان، هـەروەك ئیمـامی (النـواوي) لە (شرح مسلم)دا ڕوونی کردۆتەوە.

(وَلُبْسُ الثَّوْبِ النَّجِسِ) هەروەها دروستە: دەبەرکردنی بەرگی پیسبوو (فِـي غَيْرِ الصَّلَاةِ) لـە کاتەکانی جگە لە ناو نوێـژداو (وَنَحْوِهَـا) ئـەو شتانەی وکـو نوێـژن: وەك تـەوافی مـاڵیخواو خوتبەیجومعـەو سـوجدەی (تِـلاوَةِ)و (شُـكْرٍ)، واتـە: چـونکە نوێـژو ئـەوانیتر بـە بـەرگی پیسەوە دروست نابن، هـەروەها بـەو مەرجـەش دروسـتە بـەرگی پیسـبوو دەبـەر بکـا: کـە جلەکەو لاشەکەی وشك بن، چونکە ئەگەر جلەکەی، یـان لاشـەکەی تـەڕ بـێ، ئـەو کاتـەش –ئەگەر ناچـار نـەبێ– دروسـت نیـە دەبـەری بکـا، هەرچـەند لـە نوێـژو تەوافیشـدا نـەبێ، چونکە لاشەی پیس دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(لَا جِلْدِ كَلْبٍ وَخِنْزِيرٍ) بـەڵام دروسـت نیـە: پیسـتەی سـەگو بـەراز، یـان وەچـەی یـەکێکیان دەبەر بکا، چونکە گـڵاوە (إِلَّا لِضَرُورَةٍ) تـەنها لـە بـەر ناچـاری نـەبێ (كَفَجْأَةِ قِتَـالٍ) وەك لـە ناکاو جەنگێك ڕوو بدا، یان لە ترسی گەرما و سەرمای بەهێز، ئـەو کاتـە لـە بـەر ئـەو جـۆرە ناچاریانە دروستە پیستەکان دەبەر بکا، بەو مەرجەی هیچ بەرگێکیتری دەست نەکەوێ.

(وَكَذَا) هـەروەها حەرامـە (جِلْدُ الْمَيْتَـةِ) پیسـتەی ئـاژەڵیمردار دەبـەر بکـا پـێش دەباغکردنی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە بنچینەدا پیسە، کەوابو: هـەر کاتێـك دەبـاغ بکرێ دروستە دەبەری بکا، هەروەها ئەگەر هیچ بەرگێکیتری دەست نەکەوێ، ئـەو کاتـە لـە بەر ناچاری دروستە پیستەی مردار دەبەر بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَحِلُّ الإِسْتِصْبَاحُ) حەڵاڵـە چـرا دابگیرسـێنێ (بِالـدُّهْنِ النَّجِسِ) بـە ڕونـی پـیسو بـە نـەفتو گـازی پیسـبوو (عَلَى الْمَشْهُورِ) لـە سـەر فـەرموودەی ناسـراوی مەزهـەب، بـەو مەرجـەی لـە مزگەوتدا نـەبێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنِ الْفَأْرَةِ تَقَعُ فِي السَّمْنِ؟ فَقَالَ اسْتَصْبِحُوا بِهِ أَوْ فَانْتَفِعُوا بِهِ﴾ رواه الطحاوي وصححه، پرسیار لـە پێغەمبـەرﷺ کـرا: دەربارەی مشـك کـە بکەوێتە ناو ڕون؟ فـەرمووی: چـرای پـێ دابگیرسـێنن، یـان فـەرمووی: سـوودی لێوەربگرن.

هەروەها دروستە: شتی پیسبوو دەرخواردی ئـاژەڵ بـدرێو هـەنگوینی پیسـبوو دەرخـواردی مێشیهەنگوین بدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

................................................

## ﴿ پاشكۆ: دەربارەی چەند سوننەتێكی جل‌و بەرگ ﴾

١- سوننەتە: مرۆڤی موسڵمان بەردەوام شێوەو سیمای خۆی جوان‌و پوختە بكاو لاشەو بەرگی خۆی پاك‌و جوان ڕابگرێ‌و بە گوێرەی هەبوون بەرگی مامناوەنجی دەبەر بكا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ﴾حديث حسن رواه الترمذي وغيره، خوایگەورە پێی خۆشە نیشانەی نیعمەتی‌خۆی لە سەر بەندەی خۆی ببینێ.

هەروەها سوننەتە: بە بۆنەی كۆبوونەوەو ئامادەبوون لە دانیشگەی پیاو ماقوڵان‌و شوێنە گشتیەكان، بەرگی ڕێك‌و ناودارو ڕیزدار دەبەر بكا ﴿عَنْ أَسْمَاءَرضي الله عنها: أَنَّهَا أَخْرَجَتْ جُبَّةً مِنْ طَيَالِسَةٍ مَكْفُوفَةَ الْجِيبِ وَالْكُمَّيْنِ بِالدِّيبَاجِ، فَقَالَتْ: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللهِﷺ كَانَ يَلْبَسُهُ لِلْوَفْدِ وَالْجُمُعَةِ﴾رواه البخاري فیالأدب المفرد، (أسماء) جوببەیەكی هێنا دەرەوە، ڕۆخەكانی بە ئاوریشم نەخشێندرابو و فەرمووی: ئەمە جوببەی پێغەمبەرەﷺ كە لە ژیاندا مابو، بۆ پێشوازی وەفدی‌مێوان‌و بۆ خوتبەو نوێژی جومعە دەبەری دەكرد.

٢- هەروەها سوننەتە: نوێن‌و ڕایەخی ناوماڵیش بە پاك‌و ڕێك‌و پێكی ڕابگرێ‌و ناو ماڵ‌و دەوروبەری ماڵ پاك بكاتەوەو ماوە نەدا: تۆزو زبڵی لێ كۆببێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ طَيِّبٌ يُحِبُّ الطَّيِّبَ نَظِيفٌ يُحِبُّ النَّظَافَةَ، فَنَظِّفُوا أَفْنِيَتَكُمْ وَلاَ تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ﴾ رواه الترمذي بسندحسن، خوایگەورە پاك‌و بێ‌عەیبە، پاك‌و خاوێنی پێ‌خۆشە، كەوابو: دەوروبەری ماڵەكانتان پاك بكەنەوەو خۆتان وەجولەكەكان مەچوێنن.

كەوابو: سوننەتە: لاشەو جل‌و بەرگی لە چڵكنی پاك بكاتەوەو خۆی بە شێوەیەكی ناشیرین نەهێنێتە بەر چاو ﴿عَنْ جَابِرٍرضي الله عنه: رَأَى النَّبِيُّﷺ رَجُلاً شَعِثاً قَدْ تَفَرَّقَ شَعَرُهُ، فَقَالَ: أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَايُسَكِّنُ بِهِ شَعَرَهُ، وَرَأَى رَجُلاً آخَرَ عَلَيْهِ ثِيَابٌ وَسِخَةٌ، فَقَالَ: أَمَا كَانَ هَذَا يَجِدُ مَايَغْسِلُ بِهِ ثَوْبَهُ﴾رواه ابوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ پیاوێكی بینی مووەكانی ناڕێك‌و پەرت‌و بڵاو بووە، ئینجا فەرمووی: ئەوە هیچی دەست ناكەوێ مووەكانی پێ ڕێك بێخێ. هەروەها پیاوێكی‌تری بینی بەرگێكی چڵكنی دەبەر دایە، ئینجا فەرمووی: ئەوە هیچی دەست ناكەوێ جلەكەی پێ بشۆرێ.

٣- هەروەها سوننەتە: مێزەر بنێتە سەر، چونكە لە چەند حەدیسێكی(صحيح)دا هاتووە پێغەمبەرﷺ مێزەری لە سەر بەستوە ﴿عَنْ عُمَرَ بن حُرَيْثٍرضي الله عنه: رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ﴾رواه مسلم وأصحاب السنن، پێغەمبەرمﷺ بینی لە سەر مینبەر ووتاری دەدا، مێزەرێكی‌ڕەشی لە سەری بەستبو و لیچكی‌مێزەرەكەی بە نێوان هەردوو شانی‌دا شۆڕ كردبۆوە.

ئینجا بزانە: لیچکی مێزەرەکە شۆڕ بکاتەوە، یان شۆڕی نەکاتەوە، هەردووکی یەکسانە، واتە: شۆڕنەکردنەوەی لیچکی مێزەر ناپەسند نیە، چونکە لە هیچ حەدیسێکدا قەدەغە نەکراوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

٤- (طَیْلَسَان)، واتە: ئەو چەفیەی لە سەر سەر دادەندرێ، دوو جۆرە: یەکەم: (اَلْمُحَنَّك)، واتە: دەمامککراو، کە لە سەر کولاو، یان لە سەر مێزەر دادەندرێو بەشی زۆری ڕووی پێ دادەپۆشرێو لیچکەی ڕاستەی بە بن چەناگەدا ئەهێندرێتە سەر ئەستۆو دەورە لە هەموو ملی دەدلو بە سەر لا سینگی ڕاستەدا شۆڕ دەکرێتەوە، لیچکەکەیتریشی بە سەر لاسینگی چەپەدا شۆڕ دەکرێتەوە، جا ئەم جۆرەی یەکەم بە یەکدەنگی زانایان سوننەتەو چەند حەدیسێکی(صحیح)ی دەرهەق هاتوەو بنچینەیەکی ئەم جۆرە دەمامکە حەدیسەکەی کۆچکردنە، کە حەزرەتی(عائشة) دەفەرموێ: ﴿قَالَ قَائِلٌ لأَبِي بَكْرٍ ﷺ: هَذَا رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَقَنِّعاً﴾رواه البخاري، یەکێك بە ئیمامی(أبوبکر)ی گوت: ها ئەمە پێغەمبەرە ﷺ دەمامکی کردوە. هەروەك لە (فتح الباري)دا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: پێی دەگوترێ: (اَلْمُقَوَّر) واتە: ناوبڕکراو، کە هیچ لیچکێکی نەخرێتە بن چەناگە، بەڵکو یەکسەر هەردوو لیچکەکانی شۆڕ بکرێنەوە، جا ئەگەر بەو شێوەیە لە بن مێزەریش دابندرێ، هەر بە بەشێکی ئەم جۆرەیدووەم دادەندرێ، چونکە ئەم جۆرەیدووەم بە یەکدەنگی زانایان (مَكْرُوه) ناپەسندە، چونکە دروشمی ئەو حەفتا هەزار جولەکانەیە: کە لەگەڵ (دَجَّال)دانە، هەروەك لە حەدیسێکدا بە ڕیوایەتی ئیمام (أحمد) هاتووە، لە (تحفة)شدا مەسەلەی (طَیْلَسَان)ی بە درێژی ڕوون کردۆتەوە.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: کە ناپەسندە: مرۆڤی موسڵمان لە جلو بەرگدا خۆی وەکافران بچوێنێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ﴾رواه ابوداود والطبراني بسند حسن، هەر کەسێك خۆی وەگەلێك بچوێنێ، ئەویش یەکێکە لەم گەلە. واتە: لە ڕیزی ئەوان دەژمێردرێ.

٥- لە جلو پێڵاو داکەندندا سوننەتە: دەست بە لایچەپەی بکا، بۆ دەبەرکردنیش سوننەتە: دەست بە لایڕاستەی بکا، جا هەر کاتێك پێڵاوێك، یان جلێکی نوێی دەبەر کرد، سوننەتە بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ﴾حدیث صحیح رواه أصحاب السنن، خوایە حەمدو شوکر تەنها بۆ تۆیە، خوایە تۆ ئەم بەرگەت دەبەر کردوم (ناوی جلەکە دێنێ) خوایە لێت دەپاڕێمەوە چاکەی ئەم بەرگەم بدەیێو چاکەی ئەو شتەشم بدەیێ کە بۆی دروست

........

کراوە، خۆم بە تۆ دەپارێزم لە خراپەی ئەم بەرگەو لە خراپەی ئەو شتەش کە بۆی دروست کراوە.

ئینجا سوننەتە: بەرگە کۆنەکەش بە خێر بداتە کەسێك، چونکە ئەوها لە حەدیسێکی بێهێزدا هاتووەو ئیمامی(الترمذي) گێڕاویەتیەوە، هەروەها سوننەتە پیرۆزبایی لە خاوەنی بەرگە نوێیەکە بکرێو بگوترێ: ﴿تُبْلِي وَيُخْلِفُ اللهُ تَعَالَى﴾رواه البخاري وأصحاب السنن، واتە: ئەم بەرگە کۆن بکەیو خوای گەورە بەرگیتریشت بداتێ.

٦- بۆ پیاو حەرامە: دامێنی جلەکانی-وەك دامێنی کراسو دەلینگی شەڵوار- لە گۆزینگەکانی بەرەو خوارتر درێژ بکا بە مەبەستی دەعیەو لە خۆ ڕازیبوون، بەڵام ئەگەر بە هۆی دەعیە نەبو، ئەو کاتە درێژکردنی دامێنو دەلینگ حەرام نیە، بەڵکو ناپەسندە، هەروەك لە (المجموع)و (شرح مسلم)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿مَنْ جَرَّ إِزَارَهُ خُيَلاَءَ لَمْ يَنْظُرِاللهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَقَالَ أَبُوبَكْرٍ﷛: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أَحَدَ شِقَّيْ إِزَارِي يَسْتَرْخِي إِلاَّ أَنْ أَتَعَاهَدَ ذَلِكَ مِنْهُ، فَقَالَﷺ: لَسْتَ مِمَّنْ يَصْنَعُهُ خُيَلاَءَ﴾ رواه البخاري، هەر کەسێك لە بەر دەعیە جلیخۆی درێژ بکاو بە زەمیندا ڕایبخشێنێ، خوای گەورە بە چاویڕەحمەت تەماشای ناکا. ئیمامی(أبوبکر) فەرمووی: ئەی پێغەمبەریخواﷺ من لایەکی پەشتەماڵەکەم شۆڕ دەبێتەوە مەگەر ئاگاداری بم. پێغەمبەرﷺفەرمووی: تۆ لەو جۆرە پیاوانە نیت: کە بۆ دەعیە وا دەکەن.

ئینجا بزانە: بۆ ئافرەت وەها سوننەتە دامێنی کراسی زۆر شۆڕ بکاتەوە، تا بە زەمیندا ڕادەخشێ، هەروەك لە حەدیسی (صحیح)دا هاتوەو (أصحاب السنن) گێڕاویەتیانەوە.

٧- جگە لە زێڕو زیو و ئاوریشم، دروستە: دەبەرکردنی گشت جۆرە بەرگێكو پێڵاوێك، جا هەر ڕەنگێك بێ، بەڵام ڕەنگی سپی لە گشتی خێرترە، ئینجا بزانە: حەرامە پیاو و ئافرەت خۆ وەیەکتری بچوێنن: لە جلو بەرگو لە قسەکردنو لە ڕۆیشتنو...هتد ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: لَعَنَ النَّبِيُّﷺ الْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ، وَالْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ لەعنەتی لەو پیاوانە کردوە: کە خۆیان وە ئافرەتان دەچوێنن، لەعنەتی لەو ئافرەتانە کردوە: کە خۆیان وە پیاوان دەچوێنن.

٨- هەروەها حەرامە: ئافرەت بەرگێکی وەها دەبەر بکا: کە کورت بێو هەموو لاشەی دانەپۆشێ، یان تەنك بێو لاشەی تێدا دیار بێ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلاَتٌ مَائِلاَتٌ رُؤُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لاَيَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ وَلا يَجِدْنَ رِيحَهَا

## (بابُ صَلاة الْعيدَيْن)

هِيَ سُنَّةٌ وَقِيلَ فَرْضُ كِفَايَة، وَتُشْرَعُ جَمَاعَةً، وَلِلْمُنْفَرِد وَالْعَبْد وَالْمَرْأَة وَالْمُسَافِر،

---

وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَاوَكَذا﴾رواه مسلم، دوو چین لەوانەی بە ئاگری دۆزەخ سزا دەدرێن من نەمدیون چونکە لە دوای من پەیدا دەبن، **یەکەمیان:** چینە پیاوێکن قەمچی وەهایان پێیە: وەکو کلکی مانگایە، بەو قەمچییانە لە خەڵکی دەدەن‌و خەڵکی ئازار دەدەن (ئەوانە داروودەستەی کاربەدەستەکانن). **دووەمیان:** چینە ئافرەتێکن بەرگیان دەبەردایە، بەڵام ڕووتن (واتە: چونکە جلەکەیان کورتەو هەموو لاشەیان داناپۆشێ، یان تەنکەو لاشەیان تێدا دیارە)، لە ڕێگەی‌خوا لایانداوەو بە لەنجەولار دەڕۆن‌و خەڵکی لە ڕێگەی خوا لا دەدەن، مووی سەریان وەك قەپۆزە ووشتری بەلاداچووە، ئەو جۆرە ئافرەتانە- ئەگەر تۆبە نەکەن-ناچنە بەهەشتو بۆنی بەهەشتیان بۆ نایێ، لە حاڵەتێکدا بۆنی بەهەشت لە ڕێگەیەکی دووری ئەوەندەو ئەوەندەوە دێ. واتە: لە ئەندازەی ڕێگەی چل ساڵ، وَاللهُ أَعْلَم.

### ﴿ بابُ صَلاة الْعِيدَيْن: **باسی نوێژی هەردوو جەژنەکان** ﴾

(هِيَ) نوێژی جەژنی‌ڕەمەزان‌و جەژنی‌قوربان (سُنَّةٌ) سوننەتێکی(مۆکدة)و زۆر خێرە، چونکە پێغەمبەرﷺ لە جەژنی ڕەمەزانی ساڵی‌دووەمی کۆچی‌یەوە لە سەری بەردەوام بووە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (فَرْضُ كِفَايَة) نوێژی هەردوو جەژنەکان (فَرْضُ الْكِفَايَة)یە، چونکە لە دروشمەکانی ئایینی ئیسلامە.

(وَتُشْرَعُ جَمَاعَةً) سوننەتە: نوێژی جەژن بە جەماعەت بکرێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە جەماعەت کردویەتی، هەروەك لە (البخاري ومسلم)دا گێڕدراوەتەوە، ئینجا سوننەتە: خەڵکەکەش بۆ جەماعەت کردن لە یەك شوێندا کۆ ببنەوە، چونکە بە بێ‌پێویستی ناپەسندە: لە نوێژی جەژندا زیاتر لە جەماعەتێك بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: ئەو کەسەی ئیمامەتی پێنج نوێژەکانی دراوەتێ، مافی خوتبەو نوێژی جەژنی نیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر پێویستی هەبوو، ئەو کاتە ناپەسند نیە زیاتر لە جەماعەتێك وەکو-جومعە- بەگوێرەی پێویستی بکرێ.

(وَلِلْمُنْفَرِدِ) نوێژی جەژن سوننەتە: بۆ مرۆڤی بە تەنهاش، چونکە جەماعەت لە نوێژی جەژندا مەرجێکی دروستبوون نیە، بەڵکو بە جەماعەت خێری زیاترە (وَالْعَبْدِ) هەروەها نوێژی جەژن سوننەتە بۆ کۆیلەو (وَالْمَرْأَةِ) بۆ ئافرەتو (وَالْمُسَافِرِ) بۆ ڕێبوار.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێکی (صحیح)دا هاتوە: ﴿پێغەمبەر ﷺ لە (حجة الوداع)دا نوێژی جەژنی قوربانی نەکردوە﴾. جا ئەو نوێژ نەکردنەی پێغەمبەرﷺ بە هۆی

وَوَقْتُهَا بَيْنَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَزَوَالِهَا، وَيُسَنُّ تَأْخِيرُهَا لِتَرْتَفِعَ كَرُمْحٍ، وَهِيَ رَكْعَتَانِ يُحْرِمُ بِهِمَا ثُمَّ يَأْتِي بِدُعَاءِ الإِفْتِتَاحِ ثُمَّ سَبْعِ تَكْبِيرَاتٍ يَقِفُ بَيْنَ كُلِّ ثِنْتَيْنِ كَآيَةٍ مُعتَدِلَةٍ، يُهَلِّلُ وَيُكَبِّرُ وَيُمَجِّدُ، وَيَحْسُنُ: (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ)،

---

ڕێبـواری نـەبوە، بـەڵكو مـاوەی نـەبو، چـونكە خـەریكی كردەوەكـانی حـەج‌و فێركردنـی صەحابەكان بوو. هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(ووَقْتُهَا) كاتی نوێژی هەردوو جەژنەكان (بَيْنَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَزَوَالِهَا) لـە نێـوان ڕۆژهـەڵاتن‌و لادانی‌ڕۆژی‌دایە، واتە: هەر كاتێك ڕۆژ بەرەو لای چاوی ڕاسـتە لای‌دا، كـاتی نوێـژی نیـوەڕۆ دێ‌و كـاتی نوێـژی جەژنـەكان نامێنـێ، بـەڵام سـوننەتە قـەزا بكرێتـەوە، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا فەرموویانە (وَيُسَنُّ تَأْخِيرُهَا) سوننەتە: نوێژی هەردوو جەژنـەكان دوا بخـرێ (لِتَرْتَفِعَ كَرُمْحٍ) تا ڕۆژ بە قەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە.

(وَهِيَ) نوێژی هەردوو جەژنەكان (رَكْعَتَانِ) دوو ڕەكعەتـە، بـە (إجمـاع)ی زانایـانی ئیسـلام، ڕوكن‌و مەرج‌و سوننەتەكانی وەكو نوێژەكانی‌ترە، بەڵام بانگی بۆ نـادرێ‌و ئیقامەتیشـی بـۆ نـاكرێ ﴿عَنْ جابِرِ بن سَمُرَةَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ بِغَيْـرِ أَذانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ﴾ رواه الشيخان، زیاتر لـە جارێك‌و لـە دوو جـار نوێـژی هـەردوو جەژنـەكانم بـە جەماعەت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ كرد، بـە بـێ بـانگ‌و ئیقامـەت. كـەوابو: لـەجیاتی بـانگ‌و ئیقامەت یەكێك دوو جار دەڵێ: (اَلصَّلاَةُ جَامِعَــةٌ)، هـەروەك لـە باسـی بانگدا بـە بەڵگـەوە ڕوونمان كردەوە.

ئینجـا نوێـژی هـەردوو جەژنـەكان بـەم شـێوەیە دەكـرێ: (يُحْرِمُ بِهِمَا) بـە نیـەتی نوێـژی جەژنی ڕەمەزان، یان قوربان لەگەڵ (اللهُ أَكْبَر)دا نوێژەكە دادەبەستێ (ثُمَّ) ئینجـا یەكسـەر لە دوای نوێژدابەستن (يَأْتِي بِدُعَاءِ الإِفْتِتَاحِ) دوعای (تَوَجُّه) دەخوێنێ كە (وَجَّهْتُ وَجْهِــيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ...) تا كۆتایی.

(ثُمَّ) ئینجا لـە دوای ئـەو دوعایـە (سَبْعِ تَكْبِيرَاتٍ) حـەوت (اللهُ أَكْبَـر) دەڵـێ، جگـە لـە (اللهُ أَكْبَـر)ی نوێژدابەسـتن (يَقِـفُ بَـيْنَ كُـلِّ ثِنْتَـيْنِ) لـە نێـوان گشـت دوو (اَللهُ أَكْبَـر)ێـك لـەو حەفتانەدا سوننەتە: بوەستێ (كَآيَةٍ مُعْتَدِلَةٍ) بـە ئەنـدازەی ئایـەتێكی نـاوەنجی، ئینجا لـەو وەستانەدا (يُهَلِّلُ) تەهلیلە دەكاو (وَيُكَبِّرُ) تـەكبیر لێ‌دەداو (وَيُمَجِّدُ) گـەورەیی خـوا دەڵـێ، واتـە: حەمـدو تەسـبیحات دەكـا، هـەروەك (البيهقـي بسـند حسـن) لـە (إبـن مسـعود)ی گێڕاوەتەوە.

(وَيَحْسُنُ) وا جوانە: لـەو زیكرانـەی نێـوان (اَللهُ أَكْبَـر)ەكانـدا ئـەم ڕستانە بڵێ: (سُـبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَاللهُ أَكْبَـرُ)–كە بە (اَلْباقِيـاتُ الصَّـالِحَات) نـاو دەبـرـدرێن– واتـە:

ثُمَّ يَتَعَوَّذُ وَيَقْرَأُ، وَيُكَبِّرُ فِي‌الثَّانِيَةِ خَمْسَاً قَبْلَ الْقِراءَةِ، وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي‌الْجَمِيعِ، وَلَسْنَ فَرْضاً وَلاَ بَعْضاً، وَلَوْ نَسِيَهَا وَشَرَعَ فِي‌الْقِراءَةِ فَاتَتْ،

---

(اَللّهُ أكْبَر)ێك لەو حەفتانە دەڵێ، ئینجا ئەو زیکرانە دەڵێ، ئینجا (اَللّهُ أكْبَر)ێكی‌تر دەڵێ...بەو جۆرە.

(ثُمَّ) ئینجا كە (اَللّهُ أكْبَر)ەكان تەواو بون (يَتَعَوَّذُ) دەڵێ: (أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ).
ئینجا (وَيَقْرَأُ) فاتیحەو سورەتێك لە دوای فاتیحە دەخوێنێ.

(وَيُكَبِّرُ فِي‌الثَّانِيَةِ خَمْساً) لە ڕەكعەتی‌دووەمیشدا پێنج (اَللّهُ أكْبَر) دەڵێ، جگە لە (اَللّهُ أكْبَر)ی هەڵسانەوە (قَبْلَ الْقِراءَةِ) پێش (أَعُوذُ بِاللهِ...)و فاتیحە خوێندن، لە نێوان گشت دوو (اَللّهُ أكْبَر)ێكدا ئەو زیكرانەی‌ڕابردووش دەڵێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكَبِّرُ فِي‌الْعِيدَيْنِ فِي‌الأُولَى سَبْعاً قَبْلَ الْقِرَاءَةِ وَفِي‌الآخِرَةِ خَمْساً قَبْلَ الْقِرَاءَةِ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان‌و جەژنی قوربان: لە ڕەكعەتی یەكەمدا حەفت (اَللّهُ أكْبَر)ی دەگوتن پێش فاتیحە خوێندن، لە ڕەكعەتی دووەمیشدا پێنج (اَللّهُ أكْبَر)ی دەگوتن پێش فاتیحە خوێندن.

(وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ) سوننەتە: هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە، تا بەرامبەر شانەكانی (فِي الْجَمِيعِ) لە گشت (اَللّهُ أكْبَر)ەكاندا، ئینجا لە زیكرەكانی نێوان گشت دوو (اَللّهُ أكْبَر)ێكیشدا: دەستی ڕاستەی لە سەر دەستی چەپەی لە بن سینگی دادەنێ‌و لە (اَللّهُ أكْبَر)ەكاندا دەنگ هەڵدێنێ‌و زیكرەكانی نێوانیشیان بە دەنگی نهێنی دەڵێ.

ئینجا بزانە: ئەو زیكرانە لە نێوان (اَللّهُ أكْبَر)ی نوێژ دابەستن‌و (اَللّهُ أكْبَر)ی‌یەكەمی حەفتەكاندا ناگوترێن‌و لەدوای (اَللّهُ أكْبَر)ی‌حەفتەمیشدا ناگوترێن، لە ڕەكعەتی‌دووەمیشدا لە نێوان (اَللّهُ أكْبَر)ی هەڵسانەوەو (اَللّهُ أكْبَر)ی‌یەكەمی پێنجەكاندا ناگوترێن‌و لە دوای (اَللّهُ أكْبَر)ی‌پێنجەمیش ناگوترێن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَسْنَ فَرْضاً) ئەو حەفت‌و پێنج (اَللّهُ أكْبَر)ەی ناو نوێژی جەژن، ڕوكن نین، واتە: ئەگەر (اَللّهُ أكْبَر)ەكان نەشڵێ، نوێژەكە بەتاڵ نابێ (وَلاَ بَعْضاً) هەروەها سوننەتە ئەندامەكانی نوێژیش نین، بەڵكو وەكو سوننەتەكانی‌تری ناو نوێژن، كەواتە: ئەگەر (اَللّهُ أكْبَر)ەكانی نەگوتن، نابێ سوجدەی سەهوو ببا، كەوابو: ناپەسندە (اَللّهُ أكْبَر)ەكان نەڵێ، یان لە ژمارەی داندراو زیاتر، یان كەمتر بڵێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ نَسِيَهَا) ئەگەر (اَللّهُ أكْبَر)ەكانی لەبیر كردن، یان بە قەسدی نەیگوتن‌و (وَشَرَعَ فِي‌الْقِراءَةِ) دەستی بە خوێندنی فاتیحە كرد (فَاتَتْ) ئەوە (اَللّهُ أكْبَر)ەكان دەفەوتێن‌و قەزا ناكرێنەوە، بەڵام ئەگەر تەنها (أَعُوذُ بِاللهِ...)ی خوێندبو و دەستی بە فاتیحە نەكردبو، ئەو كاتە سوننەتە (اَللّهُ أكْبَر)ەكان بڵێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَفِي الْقَدِيمِ يُكَبِّرُ مَالَمْ يَرْكَعْ، وَيَقْرَأُ بَعْدَ الْفَاتحة: فِي الأُولَى (ق)، وفِي الثَّانِيةِ (اقْتَرَبَــتْ)، بِكَمَالِهِماَ جَهْراً، وَيُسَنُّ بَعْدَهُمَا خُطْبَتَان، أَرْكَانُهُمَا كَهِيَ فِي الْجُمُعَةِ،

(وَفِي الْقَدِيمِ) لـه فـەرمووده‌ی كۆنـدا: (يُكَبِّـرُ) ئه‌گـه‌ر ده‌سـتی بـه فاتیحـه‌ش كردبـێ، وازی لێدێنێو (اللهُ أكبَر)ه‌كان ده‌ڵێ، ئینجا واجبه: له سه‌ره‌تاوه فاتیحه بخوێنێ (مَالَمْ يَرْكَعْ) تـا به پێوه‌یه‌و نه‌چۆته ڕوكووع، كه‌واتـه: ئه‌گـه‌ر فاتیحه‌شـی تـه‌واو كردبـێ، (اللهُ أكبَـر)ه‌كـان ده‌ڵێ، به‌ڵام سوننه‌ته: فاتیحه‌ش دووباره بخوێنێته‌وه، جـا ئه‌گـه‌ر لـه ڕوكووعـه‌وه بـۆ (اللهُ أكبَــر)ه‌كــان بگه‌ڕێتــه‌وه‌و هه‌ڵسـێته پێــوه، نوێژه‌كـه‌ی بـه‌تاڵ ده‌بـێ، هــه‌روه‌ك لــه سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

(وَيَقْرَأُ بَعْدَ الْفَاتِحةِ) له نوێژی هه‌ردوو جه‌ژنه‌كاندا سوننه‌ته لـه دوای فاتیحـه: (فِـي الأُولَىَ) لـه ڕه‌كعـه‌تی یه‌كه‌مـدا (ق) سـوره‌تی (قٓ وَالْقُـرآنِ الْمَجِيـدِ)، یـان سـوره‌تی (سَبِّحِ اسْـمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) بخوێنـێ (وفِي الثَّانِيةِ) لـه ڕه‌كعـه‌تی دووه‌میشـدا سـوره‌تی (اقْتَرَبَـتِ السَّـاعَةُ)، یـان سـوره‌تی (هَـلْ أَتَـاكَ حَـدِيثُ الْغَاشِيَةِ) بخوێنـێ (بِكَمَالِهِمـا) هـه‌ردوو سـوره‌ته‌كانی هـه‌ردوو ڕه‌كعه‌تـه‌كان بـه تـه‌واوی بخوێنـێ، چـونكه هــه‌ردوو حه‌دیسـه‌كان لـه (صـحيح مسـلم)دا گێڕدراونــه‌وه (جَهْـراً) سـوننه‌ته: فاتیحـه‌و سـوره‌تی دوای فاتیحـه –لـه نوێـژی هــه‌ردوو جه‌ژنه‌كانـدا– بـه ده‌نگـی ئاشـكرا بخوێنـدرێ، بـه به‌ڵگـه‌ی (إجمـاع)ی زانایـانی ئیسـلام، هه‌روه‌ك له زۆربه‌ی سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

## ﴿ ووتاری هه‌ردوو جه‌ژنه‌كان ﴾

(وَيُسَــنُّ بَعْـدَهَا) سـوننه‌ته لــه دوای تــه‌واوبوونی نوێـژی جــه‌ژن (خُطْبَتَــانِ) دوو خوتبــه بخوێندرێنــه‌وه ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُوبَكْرٍ وَعُمَــرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا يُصَــلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ﴾رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئیمـامی(أبـوبكر)و ئیمـامی(عمـر) نوێـژی هه‌ردوو جه‌ژنه‌كانیان له پـێش خوتبـه‌دا ده‌كـرد. كـه‌وابو: ئه‌گـه‌ر لـه پـێش نوێـژی جه‌ژنـدا خوتبـه بخوێنێتــه‌وه، دروسـت نابـێو بـه بـه‌ر خوتبـه‌ی جـه‌ژن ناكـه‌وێ، هــه‌روه‌ك لــه سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

(أَرْكَانُهُمَـا) ڕوكنــه‌كانی هــه‌ردوو خوتبـه‌ی جه‌ژنـه‌كان (كَهِـيَ فِي الْجُمُعَـةِ) وه‌كـو ڕوكنــه‌كانی هــه‌ردوو خوتبــه‌ی جومعه‌یــه، هــه‌روه‌ها سوننه‌ته‌كانیشـیان وه‌كـو یــه‌كترن، بــه‌ڵام ئــه‌و مه‌رجانـه‌ی لـه خوتبـه‌ی جومعـه‌دا پێویست بـون، لـه خوتبـه‌كانی جه‌ژنـدا پێویسـت نـین، به‌ڵكو سوننه‌تن، هه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموویانه.

ئینجـا بزانـه: خوتبـه‌كانی دوای نوێـژی جه‌ژنــه‌كان بـۆ دروسـتبوونی نوێژه‌كـه بـه مــه‌رج دانه‌ندراون، به‌ڵكو ته‌نها له‌و حاڵه‌ته‌شدا خوتبـه‌كان سـوننه‌تن: كـه نوێژه‌كـه بـه جه‌ماعـه‌ت

وَيُعَلِّمُهُمْ فِي الْفِطْرِ اَلْفِطْرَةَ وَفِي الأَضْحَى اَلأُضْحِيَّةَ، يَفْتَتِحُ الأُولَى بِتِسْعِ تَكْبِيرَاتٍ وَالثَّانِيَةَ بِسَبْعٍ وَلاَءً، وَيُنْدَبُ الْغُسْلُ وَيَدْخُلُ وَقْتُهُ بِنِصْفِ اللَّيْلِ وَفِي قَوْلٍ بِالْفَجْرِ، وَالتَّطَيُّبُ وَالتَّزَيُّنُ كَالْجُمُعَةِ،

---

بکرێ، واته: ئەگەر نوێژی جەژنی بە تەنهایی کرد، ئەو کاتە خوتبەکان سوننەتیش نین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُعَلِّمُهُمْ فِي الْفِطْرِ) سوننەتە: لە خوتبەی جەژنی ڕەمەزاندا فێری خەڵکەکە بکا (اَلْفِطْرَةَ) زەکاتی سەرفیترەی ڕەمەزان (وَفِي الأَضْحَى) لە خوتبەی جەژن قوربانیش (الأُضْحِيَّةَ) چۆنیەتی قوربانی فێری خەڵکەکە بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ لە خوتبەی جەژنی قورباندا دەیفەرموو: ﴿مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا فَلاَ يَذْبَحْ حَتَّى يُصَلِّيَ﴾رواه الشيخان، هەر کەسێك ئەم نوێژەی ئێمە بکا، نابێ قوربانی سەر ببڕێ تا نوێژی جەژن دەکا.

(يَفْتَتِحُ الأُولَى) سوننەتە سەرەتای خوتبەیەکەمی جەژن دەست پێبکا (بِتِسْعِ تَكْبِيرَاتٍ) بە گوتنی نۆ (اللهُ أَكْبَر) بە دوایەکتردا (وَالثَّانِيَةَ) هەروەها سوننەتە: خوتبەی دووەمیش دەست پێبکا (بِسَبْعٍ وَلاَءً) بە گوتنی حەفت (اللهُ أَكْبَر) بە دوایەکتردا، واتە: سوننەتە لە نێوان (اللهُ أَكْبَر)ەکاندا نەوەستێو هیچ زیکرێکیش لە نێوانیاندا نەڵێ، کەوابو: ئەگەر لە نێوان (اللهُ أَكْبَر)ەکاندا زیکری (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ...)ی گوت، دروستەو خوتبەکان بەتاڵ نابن چونکە (اللهُ أَكْبَر)ەکان بەشێکی خوتبەکان نین، بەڵکو پێشەکی خوتبەکانن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ سوننەتەکانی هەردوو جەژنەکان ﴾

(وَيُنْدَبُ الْغُسْلُ) سوننەتە: بۆ هەردوو جەژنەکان خۆی بشۆرێ ﴿عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ﴾رواه الإمام مالك بسند صحيح، لە جەژنی ڕەمەزاندا (ابْن عمر) خۆی دەشۆرد، پێش ئەوەی بڕواتە نوێژی جەژن. (وَيَدْخُلُ وَقْتُهُ) کاتی خۆ شۆردنی هەردوو جەژنەکان دێ (بِنِصْفِ اللَّيْلِ) بە ڕۆیشتنی نیوەی شەوی جەژن (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: کاتی خۆ شۆردن دێ (بِالْفَجْرِ) بە دەرکەوتنی ڕۆناکی بەیانی ڕۆژی جەژنەکە، لە فەرموودەیەکیشدا: لە هەموو شەوی جەژنەکەدا غوسلەکە دروستە.

(وَالتَّطَيُّبُ) هەروەها سوننەتە خۆی بۆنخۆش بکا (وَالتَّزَيُّنُ) سوننەتە: خۆی برازێنێتەوە بە جوانترین جلو بەرگی خۆیو بە لا بردنی موو و نینۆکو بۆنی ناخۆش (كَالْجُمُعَةِ) وەکو لە ڕۆژی هەینیدا کە باسمان کرد ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَخَذَ عُمَرُ جُبَّةً مِنْ اسْتَبْرَقٍ فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللهِﷺ فَقَالَ: إِبْتَعْ هَذِهِ فَتَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَالْوُفُودِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِﷺ إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ

وَفعْلُهَا بالْمَسْجد أَفْضَلُ وَقيلَ بالصَّحْرَاء إلاَّ لعُذْر، وَيَسْتَخْلفُ مَنْ يُصَلِّي بالضَّعفَة، وَيَذْهَبُ فِي طَرِيقٍ وَيَرْجِعُ فِي أُخْرَى، وَيُبَكِّرُالنَّاسُ، وَيَحْضُرُالإِمَامُ وَقْتَ صَلاَته،

---

مَنْ لاَخَلاَقَ لَهُ﴾رواه الشيخان، ئیمامی(عمرﷺ) جوببەیەکی ئاوریشمی هێنا لای پێغەمبەرﷺو فەرمووی: ئەم جوببەیە بکڕە، تاکو بۆ جەژنو بۆ پێشوازی وەفدی مێوان خۆتی پێ برازێنیەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەمە بەرگی ئەو پیاوانەیە: کە هیچ بەشیان لە بەهەشتدا نیە. واتە: پێغەمبەرﷺ ڕەخنەی لەوە نەگرت: کە خۆی برازێنێتەوە، بەڵکو ڕەخنەی لە جوببەکە گرت چونکە لە ئاوریشم دروست کرابو.

ئینجا بزانە: لەو سوننەتانەیڕابردوو، یەکسانە: ئەو کەسەی ئامادەی نوێژی جەژن دەبێو ئەوەی ئامادە نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَفعْلُهَا بِالْمَسْجِدِ) نوێژی جەژن لە مزگەوتدا بکرێ (أَفْضَلُ) خێرترە نەك لە شوێنێکیتردا، چونکە مزگەوت بە شەڕەفە (وَقِيلَ بِالصَّحْرَاءِ) لە فەرموودەیەکیبێهێزدا نوێژی جەژن لە بیاباندا خێرترە (إلاَّ لِعُذْرٍ) تەنها بە هۆی عوزرێك نەبێ: وەکو باران و سەرما، ئەو کاتە لە مزگەوتدا خێرترە، بە بەلگەی: ﴿پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژیجەژن دەچووە دەرەوەی (مدینة)﴾. جا فەرموودەیبەهێز وەلامی داوەتەوە: چوونەدەرەوەکەی پێغەمبەرﷺ بە هۆی بچوکی مزگەوتەکەی بوو، هەروەك لە(تحفە)دا فەرموویەتی.

(وَيَسْتَخْلِفُ) ئیمام جێگرێك بۆ خۆی دادەنێ لەو حالەتەی بۆ نوێژی جەژن دەڕواتە بیابان (مَنْ يُصَلِّي بِالضَّعَفَةِ) جێگرێکی وەها: لە مزگەوتدا پێشنوێژی جەژن بۆ بێهێزو نەخۆشەکان بکا، بەلام ناپەسندە جێگرەکە بە بێئیزنی ئیمامەکە ووتار بدا (وَيَذْهَبُ فِي طَرِيقٍ) سوننەتە: بۆ نوێژی جەژن بە ڕێگەیەکدا بڕواو (وَيَرْجِعُ فِيأُخْرَى) بە ڕێگەیەکیتردا بگەڕێتەوە مالێ ﴿عَنْ جَابِرٍﷺ: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا كَانَ يَوْمَ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگەی دەگۆڕیو بە ڕێگەیەکیتردا دەگەڕاوە.

ئینجا سوننەتە: بە ڕێگە درێژترەکەدا بڕواتە نوێژ، تاکو خێری زیاتر بگاتێو هەردوو ڕێگەکەش شاهیدیی بۆ بدەن، کەوابو: ئەو ڕێگە گۆڕینە لە گشت خواپەرستیەکاندا سوننەتە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُبَكِّرُ النَّاسُ) سوننەتە: هەر لە بەیانەوە خەلکەکە زوو بڕواتە نوێژی جەژن، تاکو خێری چاوەڕوانکردنی نوێژیان بگاتێ، کەواتە: ئەگەر لە مزگەوتەکەدا نوێژی جەژن دەکرا، وا سوننەتە: لە دوای نوێژی سبەینێ لە مزگەوتەکەدا بمێننەوە تا نوێژی جەژن دەکەن، بەلام (وَيَحْضُرُ الإِمَامُ) ئیمامی نوێژی جەژن زوو نایێ، بەڵکو ئامادە دەبێ (وَقْتَ صَلاَتِه) لە کاتی نوێژکردنەکەدا ﴿عَنْ أَبِيسَعِيدٍﷺ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى

وَيُعَجِّلُ فِي الأَضْحَى، قُلْتُ: وَيَأْكُلُ فِي عِيدِالْفِطْرِ قَبْلَ الصَّلاَةِ وَيُمْسِكُ فِي الأَضْحَى، وَيَذْهَبُ مَاشِياً بِسَكِينَةٍ، وَلاَ يُكْرَهُ النَّفْلُ قَبْلَهَا لِغَيْرِ الإِمَامِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

إِلَى الْمُصَلَّى فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلاَةُ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە هەردوو جەژنەکاندا دەهاتە شوێنی نوێژو یەکسەر دەستی بە نوێژی جەژن دەکرد.

ئینجا کە کاتی نوێژی جەژن هات (وَيُعَجِّلُ) سوننەتە: ئیمام بە پەلە بێتە نوێژ (فِي الأَضْحَى) لە جەژنی قورباندا، تاکو زوو نوێژەکە بکەنو خەڵکەکە بگەڕێنەوە قوربانی بکەن، هەروەها سوننەتە نوێژی جەژنی ڕەمەزانیش درەنگ بکا، تاکو خەڵکەکە ماوەی سەرفیترەدانیان بۆ فراوان بێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَيَأْكُلُ فِي عِيدِ الْفِطْرِ) سوننەتە: لە جەژنی ڕەمەزاندا شتێك بخوا (قَبْلَ الصَّلاَةِ) پێش ئەوەی نوێژی جەژن بکا (وَيُمْسِكُ فِي الأَضْحَى) بەڵام لە جەژنی قورباندا هیچ نەخوا تا نوێژی جەژن دەکا، تاکو ڕۆژی هەردوو جەژنەکان لەگەڵ ڕۆژی پێشەخۆیان لێك جیاواز بن ﴿عَنْ بُرَيْدَةَ﴿: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ لاَ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلاَ يَطْعَمُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ﴾حديث حسن رواه احمد والترمذي، پێغەمبەرﷺ لە جەژنی ڕەمەزاندا نەدەڕۆیشتە نوێژی جەژن تا شتێکی دەخوارد، لە جەژنی قوربانیشدا هیچی نەدەخوارد تا نوێژی جەژنی دەکرد.

(وَيَذْهَبُ مَاشِياً) سوننەتە: بە پیادەیی بڕواتە نوێژی هەردوو جەژنەکان، مەگەر عوزرێکی هەبێ (بِسَكِينَةٍ) بە هێمنیو لەسەرخۆ، نەك بە غاردان (وَلاَ يُكْرَهُ النَّفْلُ قَبْلَهَا) نوێژی سوننەت ناپەسند نیە لە پێش نوێژی جەژندا، بەو مەرجەی بە قەد ڕمێك ڕۆژ بەرز بوبێ (لِغَيْرِ الإِمَامِ) بۆ خەڵکەکەی جگە لە ئیمام، چونکە نوێژی سوننەت لەو کاتەدا لە هیچ حەدیسێکدا قەدەغە نەکراوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

بەڵام بۆ ئیمامی نوێژی جەژن ناپەسندە هیچ سوننەتێك بکا لە پێش نوێژی جەژنو لە دوای نوێژی جەژن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: خَرَجَ النَّبِيُّﷺ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهُمَا وَلاَ بَعْدَهُمَا﴾رواه الشیخان، پێغەمبەرﷺ هات دوو ڕەکعەت نوێژی جەژنی ڕەمەزانی کردو هیچ سوننەتێکی نەکرد: نە لە پێشو نە لە دوای نوێژەکە.

## ﴿فَصْلٌ: لە باسی (تَكْبِيْر)لێدانی جەژنەکان﴾

بزانە: لە شەو و ڕۆژی جەژنەکاندا (تَكْبِير) لێدان، واتە: (اَللهُ أَكْبَر) گوتن، دوو بەشە:

یەکەم: (اَلْمُرْسَل)، واتە: بەرەڵدراو کە لە ماوەیەکی دیارکراودا لە گشت حاڵەتێكو لە گشت شوێنێکدا دەگوترێن.

دووەم: (اَلْمُقَيَّد) واتە: بەستراوە، کە لە دوای نوێژەکاندا دەگوترێن.

(فَصْلٌ) يُنْدَبُ التَّكْبِيرُ بِغُرُوبِ الشَّمْسِ لَيْلَتَيِ الْعِيدِ فِي الْمَنَازِلِ وَالطُّرُقِ وَالْمَسَاجِدِ وَالأَسْوَاقِ بِرَفْعِ الصَّوْتِ، وَالأَظْهَرُ إِدَامَتُهُ حَتَّى يُحْرِمَ الإِمَامُ بِصَلاَةِ الْعِيدِ، وَلاَ يُكَبِّرُ الْحَاجُّ لَيْلَةَ الأَضْحَى بَلْ يُلَبِّي، وَلاَ يُسَنُّ لَيْلَةَ الْفِطْرِ عَقِبَ الصَّلَوَاتِ فِي الأَصَحِّ،

---

جا دەربارەی بەشی‌یەكەم دەفەرموێ: (يُنْدَبُ التَّكْبِيرُ) گوتنی (اللهُ أكبَر)ی جەژنەكان سوننەتە بۆ پیاو و ئافرەت و ڕێبوارو نیشتەجێ، ئینجا كاتی (تَكْبِير)لێدان دەست پێ‌دەكا (بِغُرُوبِ الشَّمْسِ) لەو كاتەوە: كە ڕۆژ ئاوا دەبێ (لَيْلَتَيِ الْعِيدِ) لە شەوی جەژنی ڕەمەزان‌و قوربانـدا، جا ئەو (تَكْبِير) لێدانەش سوننەتە: (فِي الْمَنَازِلِ) لە ماڵەكاندا (وَالطُّرُقِ) لە ڕێگەكاندا (وَالْمَسَاجِدِ) لە مزگەوتەكاندا (وَالأَسْوَاقِ) لە بازاڕەكاندا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ﴾ تاكو ڕۆژووەكانی ڕەمەزان تەواو بكەن‌و (اللهُ أكبَر) بڵێن.

﴿وَعَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رضي الله عنها: كُنَّا نُؤْمَرُ يَوْمَ الْعِيدِ أَنْ نَخْرُجَ حَتَّى نُخْرِجَ الْحُيَّضَ فَيُكَبِّرْنَ بِتَكْبِيرِهِمْ، أي النَّاسِ﴾ رواه الشيخان، واتە: فەرمانمان پێ‌دەكرا: لە ڕۆژی جەژندا ئافرەتانی حەیزداریش لەگەڵ خۆمان ببەینە دەرەوە، ئەوانیش لەگەڵ پیاوان (اللهُ أكبَر) بڵێن.

كەواتە: لە فەرمانی ئایەتەكەدا جەژنی قوربان (قیاس) كراوەتە سەر جەژنی ڕەمەزان، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(بِرَفْعِ الصَّوْتِ) بە دەنگی بەرز پیاوەكان (تَكْبِيرْ) لێ‌دەدەن، بەڵام ئافرەت –لە لای پیاوی بێگانە– دەنگی نزم دەكاەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەو (تَكْبِير)لێدانە لە گشت حاڵەتێكدا سوننەتە، جا (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (إِدَامَتُهُ) كاتەكەی (تَكْبِير)لێدان لە هەردوو جەژنەكاندا بەردەوامە (حَتَّى يُحْرِمَ الإِمَامُ بِصَلاَةِ الْعِيدِ) تا ئیمام نوێژی جەژنەكە دادەبەستێ، بەڵام ئەگەر نوێژی جەژنەكەی بە تەنهایی دەكرد، ئەوە تا بە خۆی نوێژ دادەبەستێ كاتەكە بەردەوام دەبێ، واتە: هەر كاتێك نوێژی جەژن دابەسترا، (تَكْبِير)ی (مُرْسَل): بەرەڵدراو كۆتایی دێ.

(وَلاَ يُكَبِّرُ الْحَاجُّ لَيْلَةَ الأَضْحَى) بەڵام ئەو كەسەی خەریكی حەج كردنە، نابێ لە شەوی جەژنی قوربانـدا (اللهُ أكبَر) بڵێ (بَلْ يُلَبِّي) بەڵكو (تلبية)، واتە: (لَبَّيْكَ...) دەڵێ چونكە (لَبَّيْكَ...) دروشمی حەجە، هەروەك لە باسی حەجدا ڕوون دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

دەربارەی بەشی دووەم دەفەرموێ: (وَلاَ يُسَنُّ لَيْلَةَ الْفِطْرِ) لە شەوی جەژنی ڕەمەزاندا (تَكْبِير)ی (الْمُقَيَّد) سوننەت نیە (عَقِبَ الصَّلَوَاتِ) لە دوای نوێژەكان (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام لە فەرموودەیەكی‌تردا هاتووە: سوننەتە لە دوای نوێژەكانی شەوی جەژنی ڕەمەزان (تكبیر) لێبدرێ، واتە: لە دوای نوێژی مەغریب‌و عیشاو سبەینێ، لە (الأذكار)شدا ئەم فەرموودەی بە ڕاستتر داناوەو خەڵكیش ڕەفتاری لە سەر ئەم فەرموودەیە.

وَيُكَبِّرُ الْحَاجُّ مِنْ ظُهْرِ النَّحْرِ وَيَخْتِمُ بِصُبْحِ آخِرِ التَّشْرِيقِ، وَغَيْرُهُ كَهُوَ فِي الأَظْهَرِ، وَفِي قَوْلٍ مِنْ مَغْرِبِ لَيْلَةِ النَّحْرِ، وَفِي قَوْلٍ مِنْ صُبْحِ عَرَفَةَ وَيَخْتِمُ بِعَصْرِ آخِرِ التَّشْرِيقِ وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُكَبِّرُ فِي هَذِهِ الأَيَّامِ لِلْفَائِتَةِ وَالرَّاتِبَةِ وَالنَّافِلَةِ، وَصِيغَتُهُ الْمَحْبُوبَةُ: (اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللهُ أَكْبَرُ وَلِلهِ الْحَمْدُ)،

---

(وَيُكَبِّرُ الْحَاجُّ) ئەو کەسەی خەریکی حەج کردنە (تَکْبِیر)ی (مُقَیَّد)ی دوای نوێژەکان دەست پێدەکا (مِنْ ظُهْرِ النَّحْرِ) لە نیوەڕۆی جەژنی قوربانەوە (وَيَخْتِمُ) کۆتایی بە (تَکْبِیر) لێدان دێنێ (بِصُبْحِ آخِرِ التَّشْرِيقِ) بە کردنی نوێژی سبەینێی ئاخر ڕۆژی (أَيَّام التَّشْرِيق)، واتە: سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنی قوربان.

(وَغَيْرُهُ) ئەوەی بە حەج کردن خەریك نیە (كَهُوَ) هەر وەك ئەو خەریکبووەیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (مِنْ مَغْرِبِ لَيْلَةِ النَّحْرِ) لە مەغریبی شەوی جەژنی قوربانەوە دەست بە (تَکْبِیر) دەکا.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیسێیەمدا: (مِنْ صُبْحِ عَرَفَةَ) لە دوای نوێژی سبەینێی ڕۆژی عالفەوە دەست بە (تَکْبِیر) لێدان دەکا (وَيَخْتِمُ) کۆتایی بە (تَکْبِیر)ی دوای نوێژەکان دێنێ (بِعَصْرِ آخِرِ التَّشْرِيقِ) بە کردنی نوێژی عەسری ئاخیر ڕۆژی (أَيَّام التَّشْرِيق)، کە دەکاتە پێنج ڕۆژ، واتە: لە دوای ئەم عەسرەی ڕۆژی سێیەمی(أَيَّام التَّشْرِيقِ)ش (تَکْبِیر) لێدەدا، ئینجا واز دێنێ (وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا) ڕەفتاریموسڵمانانیش لە سەر ئەم فەرموودەی سێیەمە، لە سەرچاوەکانیشدا بە بەهێز دانراوە؟ چونکە لە ئیمامی(عمر)و ئیمامی(علي)و (إبن مسعود)و (ابْن عبّاس)ەوە ئەوها هاتوە، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی إبن قدامة)دا فەرموویانە، هەم (البخاري)ش لە ئیمامی(عمر)ی گێڕاوەتەوە.

جا بزانە: وەها سوننەتە: لە پێش زیکرەکانی دوایnوێژەکاندا (تَکْبِیر) لێبدا، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ) نوێژکەر (يُكَبِّرُ فِي هَذِهِ الأَيَّامِ) لەو پێنج ڕۆژانەدا (تَکْبِیر) لێدەدا (لِلْفَائِتَةِ) لە دوای نوێژە فەوتاوەکان کە لەو ڕۆژانەدا قەزایان دەکاتەوەو (وَالرَّاتِبَةِ) هەروەها لە دوای سوننەتەکانی دامەزراو لەگەڵ نوێژە فەڕزەکاندلو (وَالنَّافِلَةِ) هەروەها لە دوای گشت جۆرە سوننەتێکی بەناو و بێناو، واتە: ئەو (تَکْبِیر) لێدانە تایبەت نیە بە دوای نوێژە واجبەکان، چونکە (تکبیر) دروشمی ئەو پێنج ڕۆژانەیەو جیاوازی نیە: لە نێوان پیاو و ئافرەتو ڕێبوارو نیشتەجێو نوێژکەری بە تەنهاییو نوێژکەری بە جەماعەت.

(وَصِيغَتُهُ الْمَحْبُوبَةُ) ئەو ڕستە خۆشەویستەی داڕێژراوە بۆ (تَکْبِیر) لێدان، ئەمەیە: (اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ اَللهُ أَكْبَرُ، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللهُ أَكْبَرُ، وَلِلهِ الْحَمْدُ).

وَيُسْتَحَبُّ أَنْ يَزِيدَ: (كَبِيراً وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً).
وَلَوْ شَهِدُوا يَوْمَ الثَّلاَثِينَ قَبْلَ الزَّوَالِ بِرُؤْيَةِ الْهِلاَلِ اللَّيْلَةَالْمَاضِيَةَ، أَفْطَرْنَا وَصَلَّيْنَا الْعِيدَ، وَإِنْ شَهِدُوا بَعْدَالْغُرُوبِ لَمْ تُقْبَلِ الشَّهَادَةُ، أَوْ بَيْنَ الزَّوَالِ وَالْغُرُوبِ أَفْطَرْنَا، وَفَاتَتِ الصَّلاَةُ، وَيُشْرَعُ قَضَاؤُهَا مَتَى شَاءَ فِي الأَظْهَرِ، وَقِيلَ فِي قَوْلٍ:

---

ئینجا (وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە: (أَنْ يَزِيدَ) ئەمەش بە زیادە بڵێ: (اَللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً).

(وَلَوْ شَهِدُوا يَوْمَ الثَّلاَثِينَ) ئەگەر شاهیدەکان شاهیدییان دا: لە ڕۆژی سی‌یەمی مانگی ڕەمەزان (قَبْلَ الزَّوَالِ) پێش کاتی‌نیوەڕۆ شاهیدییان دا: (بِرُؤْيَةِالْهِلاَلِ) کە مانگی یەکشەوەی مانگی(شَوَّال) بینراوە (اللَّيْلَةَ الْمَاضِيَةَ) لە شەوی‌ڕابردوودا (أَفْطَرْنَا) واجبە: ڕۆژوو بشکێنین، چونکە ئاشکرا بوو: ئەم ڕۆژە جەژنەو یەکەمی شەشەلانە (وَصَلَّيْنَا الْعِيدَ) سوننەتە: نوێژی جەژنیش بە ئەدا بکەین ئەگەر ماوە مابێ، ئەگەر نا: قەزا دەکرێتەوە.

(وَإِنْ شَهِدُوا بَعْدَ الْغُرُوبِ) بەلام ئەگەر لە دوای ڕۆژئاوابوونی ڕۆژی سی‌یەمی ڕەمەزان شاهیدییان دا: کە مانگ شەوی‌ڕابردوو دیتراوە (لَمْ تُقْبَلِ الشَّهَادَةُ) ئەم شاهیدیە وەرناگیرێ، چونکە سی ڕۆژی ڕەمەزان تەواو بووە، کەوابو: سبەینێ دەکەینە جەژن‌و نوێژی جەژن بە ئەدا دەکەین.

(أَوْ بَيْنَ الزَّوَالِ وَالْغُرُوبِ) یان لە نێوان نیوەڕۆو ڕۆژئاوابووندا شاهیدییان دا: کە شەوی‌ڕابردوو مانگ بینراوە (أَفْطَرْنَا) واجبە: ڕۆژووەکە بشکێنین، چونکە ئاشکرا بوو ئەم ڕۆژە جەژنە (وَفَاتَتِ الصَّلاَةُ) نوێژەکەی جەژنیش دەفەوتێ، چونکە بە هاتنی کاتی نیوەڕۆ، کاتی نوێژەکەی جەژن دەرچووە، کەوابو: (وَيُشْرَعُ قَضَاؤُهَا) سوننەتە: نوێژی جەژن قەزا بکاتەوە (مَتَى شَاءَ) هەر کاتێك حەز بکا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا.

ئینجا ئەگەر بگونجێ: خەڵکەکە کۆ بکرێتەوە، ئەوە هەر لەم ڕۆژەدا بە جەماعەت قەزا دەکرێتەوە، ئەگەر نا: سبەینێ بە جەماعەت قەزای دەکەنەوە ﴿عَنْ أَبِي عُمَيْرٍ عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ: أَنَّ رَكْباً جَاؤُا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَشْهَدُونَ: أَنَّهُمْ رَأَوُا الْهِلاَلَ بِالأَمْسِ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا وَإِذَا أَصْبَحُوا يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ﴾رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، کاروانێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ شاهیدییان دا: دوێنێ‌شەو مانگی یەکشەوەیان دیتوە، پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ‌کردن ڕۆژوو بشکێنن‌و سبەینێ بێنە نوێژی جەژن.

ئینجا ئەگەر ویستی بە تەنهایی نوێژەکەی جەژن قەزا بکاتەوە، ئەو کاتە هەر لەو ڕۆژەدا بە پەلە قەزا بکاتەوە خێرترە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا (فِي قَوْلٍ) لە

تُصَلَّى مِنَ الْغَدِ أداءً.

---

فەرموودەیەکیتردا: بەو شاهیدیە نوێژی جەژن نافەوتێ، کەوابو: (تُصَلَّى مِنَ الْغَدِ أداءً) سبەینێ نوێژەکەی جەژن بە ئەدا دەکرێ.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی پیرۆزبایی‌و تۆقەو ڕێزلێنان ﴾

یەکەم: سوننەتە جەژنە پیرۆزە لە یەکتری بکەن، هەروەك لە (نهایة)و(مغنی)دا فەرموویانە ﴿عَنْ جُبَيْرِ بن نُفَيْرٍ وَمحمد بن زيادالألْهاني: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِﷺ إِذَا الْتَقَوْا يَوْمَ الْعِيدِ يَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: تَقَبَّلَ اللهُ مِنَّا وَمِنْكُمْ﴾ أخرجهما زاهر بن طاهر وأبوأحمدالفرضي بسندين حسنين، هەر کاتێك لە ڕۆژی جەژندا (صحابة)ی پێغەمبەرﷺ دەگەیشتنە یەکتر، جەژنە پیرۆزەیان لە یەکتری دەکردو دەیانگوت: خوای گەورە لە ئێمەو لە ئێوەش قبولّ بکا.

ئینجا بزانە: ئەو پیرۆزباییە تایبەت نیە بە جەژنەکان، بەڵکو هەر خۆشی‌و دڵشادیەك بگاتە موسڵمانێك، سوننەتە پیرۆزبایی لێبکرێ ﴿عَنْ أَنَسٍ﷜ فِي نُزُولِ سُورَةِ الْفَتْحِ: قَالَ أَصْحَابُ النَّبِيِّﷺ: هَنِيئاً مَرِيئاً يَا نَبِيَّ اللهِ﴾رواه البخاري والترمذي، کە سورەتی (إِنَّا فَتَحْنَا) بۆ پێغەمبەرﷺ هاتە خوارەوە، (صحابة)کان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پیرۆزت بێ ئەو ژیانە بێگوناهو بێدەردە.

هەروەها بە بۆنەی ڕزگاربوونیشی لە غەم‌و تەنگانەو ناخۆشی سوننەتە: پیرۆزبایی لێبکرێ ﴿عَنْ كَعْبِ بن مَالِكٍ﷜ فِي قِصَّةِ تَوْبَتِهِ: فَانطَلَقْتُ أَتَأَمَّمُ رَسُولَ اللهِﷺ يَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجاً فَوْجاً يُهَنِّئُونَنِي بِالتَّوْبَةِ﴾رواه الشيخان، (كعب) دەفەرموێ: کە خوای گەورە تۆبەی لێقبولّ کردم، ڕۆیشتم تاکو بچمە خزمەت پێغەمبەرﷺ، خەڵکیش کۆمەڵ کۆمەڵ دەمگەیشتنێ‌و پیرۆزباییان لێدەکردم. لە (فتاوی‌السیوطي)دا باسی پیرۆزبایی بە درێژی روون کراوەتەوە.

دووەم: لە کاتی بەیەکگەیشتن سوننەتە: تۆقە لەگەڵ یەکتری بکەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ فَتَصَافَحَا وَحَمِدَااللهَ وَاسْتَغْفَرَاهُ غُفِرَ لَهُمَا﴾ رواه ابوداود بسند صالح، هەر کاتێك دوو موسڵمان گەیشتنە یەکترو تۆقەیان کردو سوپاسی خوایان کردو داوای لێخۆشبوونیان لە خوا کرد–واتە: بلێن: (اَلْحَمْدُ للهِ، غَفَرَاللهُ لَنَا)– خوای‌گەورە لێیان خۆش دەبێ.

هەروەها لە کاتی تۆقەکردن سەلاواتیش سوننەتە، چونکە لە حەدیسێکی بێهێزدا هاتوە: ﴿مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ وَيُصَلِّيَانِ عَلَى النَّبِيِّﷺ إِلاَّ لَمْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يُغْفَرَ لَهُمَا ذُنُوبُهُمَا﴾ رواه أبويعلى وابن حبان فی‌الضعفاء لە، هەر دوو موسڵمانێك بگەنە یەکترو

..........................................

تۆقە بکەن‌و سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێبدەن، لێك جیا نابنەوە تا لە گوناهەکانیان دەبوردرێ.

ئینجا سوننەتە: بە زەردەخەنەو ڕووخۆشی تۆقە لەگەڵ یەکتری بکەن، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئاً وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهِ طَلِيقٍ﴾ رواه مسلم، هیچ چاکەیەك بە سوك دامەنێ، هەرچەند چاکەکەش ئەوەبێ: بە ڕووخۆشی بگەیە برای خۆت.

هەروەها بزانە: حەرامە پیاو و ئافرەتی نامەحرەم تۆقە لەگەڵ یەکتری بکەن، هەروەها حەرامە: پیاو تۆقە لەگەڵ کوڕێکی موو لێنەهاتوو بکا، چونکە تەماشاکردنیشی حەرامە، کەوابو: ماچ کردنیشی حەرامە، چونکە هەر کەسێك تەماشاکردنی حەرام بێ، دەست لێدانیشی حەرامە، هەروەك لە سەرچاوەکان لە سەرەتای(کتاب النكاح)دا ڕوون کراوەتەوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنهَا: مَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللهِ يَدَ امْرَأَةٍ إلاَّامْرَأَةً يَمْلِكُهَا﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ دەستی لە دەستی هیچ ئافرەتێك نەداوە، تەنها دەستی ئەو ئافرەتە نەبێ، کە حەڵاڵی خۆی بێ.

هەم پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿لأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطٍ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمَسَّ امْرَأَةً لاَ تَحِلُّ لَهُ﴾ رواه الطبراني بسند صحيح، ئەگەر یەکێکتان بە سوژنێکی ئاسن لە سەری بدرێ باشترە لە وەی دەست لە ئافرەتێکی وەها بدا: کە بۆی حەڵاڵ نەبێ.

سێیەم: دەست ماچ کردن سوننەتە، ئەگەر لە بەر باوكو دایکایەتی، یان زانست، یان پیاوچاکی، یان ڕێزداری ئایینی بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (فاطمة)ی‌داهاتوو، هەم ﴿عَنْ زَارِعٍ ﷺ-وَكَانَ فِي وَفْدِعَبْدِقَيْسٍ-: فَجَعَلْنَا نَتَبَادَرُ مِنْ رَوَاحِلِنَا فَنُقَبِّلُ يَدَ رَسُولِ اللهِﷺ وَرِجْلَهُ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند صحيح، ئێمە نوێنەری(عبدالقيس) بە پەلە لە وڵاغەکانمان دادەبەزین‌و دەستو پێی پێغەمبەرمان ﷺ ماچ دەکرد.

هەروەها ﴿وَعَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِيَ اللهُ عَنهُمَا فِي قِصَّةٍ: فَقَبَّلْنَا يَدَ النَّبِيِّﷺ﴾ رواه البخاري في الأدب المفرد وابوداود بسندحسن، ئێمە دەستی پێغەمبەرمان ماچ کرد. بەڵام ئەگەر دەست ماچ کردنەکە لە بەر خاتری دەوڵەمەندی، یان گەورەیی دونیا بێ، ئەوە ناپەسندە، بەڵکو ئیمامی (المتولّي) ئاماژەی کردوە: کە حەرامە دەستی ئەو جۆرە کەسانە ماچ بکرێ، هەروەك لە (المجموع)و (الأذكار)و (تحفة)دا فەرموویانە.

چوارەم: سوننەتە: باوەش لێوەرهێنان‌و ماچ کردنی ئەو کەسەی لە سەفەر گەڕاوەتەوە، ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنهَا: قَدِمَ زَيْدُ بن حَارِثَةَ الْمَدِينَةَ، فَأَتَى النَّبِيَّﷺ فَقَرَعَ الْبَابَ فَقَامَ إِلَيْهِ

النَّبِيُّ ﷺ فَاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ﴾رواه الترمذي بسند حسن، (زيد) لە سەفەر گەڕاوە (مدينة)و هاتە ماڵی پێغەمبەرﷺ لە دەرگەیدا، پێغەمبەرﷺ لەبەری هەڵساو باوەشی لێوەرهێناو ماچی کرد. ﴿وَتَلَقَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ جَعْفَرَ بن أَبِي طَالِبٍ فَالْتَزَمَهُ وَقَبَّلَ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، پێغەمبەرﷺ پێشوازی لە (جعفر) کرد-کە لە سەفەری(حَبَشَة) گەڕاوە- باوەشی لێوەرهێناو نێوچاوانی ماچ کرد.

ئینجا بزانە: ماچ کردنی ئافرەتی نامەحرەمو کوڕی نامەحرەمی موو لێنەهاتوو حەرامە، هەروەها ئەگەر پیاویش لە سەفەر نەگەڕابێتەوە، ناپەسندە: باوەشی لێوەربێنیٚو ماچی بکا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أَخَاهُ أَوْ صَدِيقَهُ أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: لا. قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: أَفَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ﴾رواه الترمذي بسند حسن، ئەی پێغەمبەری خواﷺ پیاو دەگاتە برای خۆی، یان دۆستی خۆی، ئایا سەروملی خۆی بۆ بچەمێنێتەوە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نا. گوتی: باوەشی لێ وەربێنیٚو ماچی بکا؟ فەرمووی: نا. گوتی: تۆقەی لەگەڵ بکا؟ فەرمووی: بەڵێ.

پێنجەم: هەڵسان لە بەر یەکتری سوننەتە، ئەگەر لە بەر باوکو دایکایەتی، یان ڕێزلێنانی زانست، یان پیاوچاکی، یان کاربەدەستی، یان ڕێزداری بیٚ، (سلف) پێشینەی ئوممەت بەردەوام لە بەر یەکتری هەڵساون، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەڵگەش لە حەدیسدا زۆرن، بۆ نموونە: حەدیسەکەی(زيد بن حارثة)یڕابردوو.

هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ مِنْ إِجْلاَلِ اللهِ تَعَالَى: إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ﴾رواه ابوداود بسند حسن، بەڕاستی بەشێك لە بە گەورە ناسینی خوا ئەمەیە: ڕێز لە پیری ڕیش سپیی موسڵمان بندریٚو، ڕێز لەو قورئانخوێنە بندریٚ: کە لە سنووری قورئان دەرناچیٚو لە خوێندنیشی دوور ناکەوێتەوەو، ڕێز لەکاربەدەستی دادپەروەر بندریٚ.

هەروەها ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ عَلَى فَاطِمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَامَتْ إِلَيْهِ فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ وَقَبَّلَتْهُ وَأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِهَا﴾رواه أصحاب السنن بسند حسن، کە پێغەمبەرﷺ دەچووە ماڵی (فاطمة)ی کیژی رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، (فاطمة) لە بەری هەڵدەستاو دەستی ماچ دەکردو لە شوێنی خۆی دایدەنیشاند.

﴿وَعَنْ كَعْبٍ ﷺ فِي قِصَّةِ تَوْبَتِهِ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ جَالِسٌ وَحَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ طَلْحَةُ يُهَرْوِلُ حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّأَنِي... فَكُنْتُ لاَ أَنْسَاهَا لَهُ﴾ رواه الشيخان، چوومە مزگەوت،

.................................................

پێغەمبەرﷺ دانیشتبو، خەڵکیش لە دەورەی بوو، (طلحة) لە بەرم هەڵساو غاریدا تۆقەی لەگەڵ کردمو پیرۆزبایی لێکردم، ئەو چاکانەی (طلحة)م لە بیر ناچێتەوە.

ئینجا بزانە: حەرامە: مرۆڤ بەخۆی دانیشێو خەڵکیش بە بێعوزر بە پێوە لە خزمەتی ڕابوەستن، لە بەر لەخۆ ڕازیبوونو دەعیەو زۆرداریو ئەو جۆرە شتانە، هەروەك ئیمامی (البيهقي) ئاماژەی بۆ کردوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَتَمَثَّلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَاماً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن، هەر کەسێك پێی خۆش بێ: پیاوان لەبەر دەستی ڕابوەستن، با جێگەی خۆی لە ئاگر ئامادە بکا. کەواتە: لە بەر هەڵسان سوننەتە، بەلام لە بەر ڕاوەستانی بە پێوە حەرامە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

شەشەم: سوننەتە: سەردانی پیاوچاكو خزمو دۆستو دراوسێ ڕێز لێنانیانو چاکە لەگەڵ کردنیان، بە گوێرەی پلەو پایەو ڕازیبوونیان، لە کاتێکی وەهاداو بە شێوەیەکی وەها: ڕقیان لە سەردانەکە نەبێتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (الأذكار)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ﴾رواه مسلم، ئەو خەڵکە لە پلەی خۆیان دابنێن. واتە: بەگوێرەی پلەی خۆیان ڕێزیان لێبنێن.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَادَ مَرِيضاً، أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ فِي اللهِ نَادَاهُ مُنَادٍ: أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً﴾ رواه الترمذي بسند حسن، هەر کەسێك سەردانی نەخۆشێك، یان سەردانی برا موسڵمانێك بکا لە بەر خاتری خوا، لە لای خواوە مەلائیکەتێك بانگی دەکا: بوویە پیاوی چاك، ڕۆیشتنەکەشت چاکەو شوێنێکیشت لە بەهەشت بۆ خۆت ئامادە کرد.

حەفتەم: خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَتَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا﴾ هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، نەچنە هیچ ماڵێك–جگە لە ماڵیخۆتان– تا ئیزن وەردەگرنو سەلام لە دانیشتووانی ماڵەکە دەکەن.

ئینجا بزانە: تا سێ جار ئیزن وەردەگرێ، جا ئەگەر ئیزن نەدرا، واجبە: بگەڕێتەوە، جا ئیزن وەرگرتن: یان بە قسەکردن دەبێ، یان بە لە دەرگە دان، بەلام نابێ بە لێدانێکی بەهێز لێبدا، ئینجا ئەگەر گوتیان کێیە؟ دەبی ناوی خۆی بلێ، بە جۆرێکی وەها: کە بیناسن، واتە: ناپەسندە بلێ: منم. یان بلێ: خۆمانە ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه أَتَيْتُ النَّبِيَّﷺ فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: مَنْ ذَا؟ فَقُلْتُ أَنَا. فَقَالَ: أَنَا، أَنَا. كَأَنَّهُ كَرِهَهَا﴾رواه الشيخان، هاتم لە دەرگەی ماڵی پێغەمبەرم داﷺ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم. جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: منم، منم. وەك ئەو وەلامەی پێ ناخۆش بوبێ.

ئینجا نابێ بە بێئیزنی خاوەن ماڵ لە شوێنی خاوەن ماڵ دانیشێو نابێ بە بێئیزن لە نێوان دوو کەس دانیشێو نابێ یەکێك هەڵسێنێو بەخۆی لە جێگەی وی دانیشێ، واتە: لە کوێ جێگە هەبوو، با لەوێ دانیشێ، ئەو ڕەووشتانە گشتی لە حەدیسی (صحیح)دا هاتوون، لە (المجموع)و (الأذكار)دا ڕوون کراونەوە.

**هەشتەم**: ناپەسندە: مرۆڤ لە شوێنێك هەڵسێو بڕوا پێش ئەوەی زیکری خوا بکاو سەلاوات لێبدا، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً لَمْ يَذْكُرُوااللهَ تَعَالَى فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ فِيهِ، إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةٌ، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ﴾ حديث حسن رواه الترمذي، هەر کەسانێك لە شوێنێك دانیشنو لەو شوێنەدا زیکری خوا نەکەنو سەلاوات لە سەر پێغەمبەرەکەیانﷺ لێنەدەن، لە لای خواوە ناتەواوی دێتە سەریان، جا ئەگەر خوا حەز بکا سزایان دەدا، ئەگەر حەزیش بکا لێیان خۆش دەبێ.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕزگاربوون لەو ناتەواوییە - لەگەڵ سەلاوات- ئەم زیکرانەی داناون، کە پێش هەڵسان لە شوێنەکەدا بگوترێن: ﴿سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّأَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: ناوەڕۆکی ئەو پاشکۆیە لە (المجموع)دا لە دوای نوێژی جومعەو لە جلو بەرگدا گوتراوە، لە (تحفة)شدا لە سەرەتای (کتاب الجهاد)دا گوتراوە، باسی سەلام کردنیش لە سەرەتای (کتاب الجهاد)دا ڕوون دەکەینەوە. إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

## ﴿ بابُ صَلاةِالْكُسُوفَيْنِ: باسی نوێژی ڕۆژگیران و مانگگیران ﴾

بزانە: (كُسُوفُ الشَّمْسِ) واتە: ڕۆژگیران، بە هۆی ئەوەیە: مانگ دەکەوێتە نێوان ڕۆژو نێوان نیمەی دانیشتووانی سەر زەمین. بەڵام (خُسُوفُ الْقَمَرِ) واتە: مانگگیران، بە هۆی ئەوەیە: زەمین دەکەوێتە نێوان ڕۆژو نێوان مانگ، سێبەری لێدەکاو تیشکەکەی ڕۆژ لە مانگ نادا؟ چونکە مانگ ڕووناکیخۆی لە ڕۆژ وەردەگرێو دەیداتە زەمین، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ﵁ إنْكَسَفَتِ الشَّمْسُ يَوْمَ مَاتَ إِبْرَاهِيمُ، فَقَالَ النَّاسُ: إِنْكَسَفَتِ الشَّمْسُ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتانِ مِنْ آيَاتِ اللهِ-تَعَالَى- لاَيَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَصَلُّوا وَادْعُوااللهَ حَتَّى يَنْكَشِفَ﴾رواه الشيخان، لەو ڕۆژەدا: کە (إبراهیم)ی کوڕی پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، ڕۆژ گیرا، خەڵکەکەش گوتی: لە بەر مردنی(إبراهیم) ڕۆژ گیراوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ڕۆژو مانگ دوو نیشانەن لە نیشانەکانی تاکو تەنیایی خوای گەورە، نە لە بەر مردنو نە لەبەر ژیانی هیچ کەسێك

هِيَ سُنَّةٌ، فَيُحْرِمُ بنِيَّة صَلاَة الْكُسُوف، وَيَقْرَأُالْفَاتحَةَ وَيَرْكَعُ ثُمَّ يَرْفَعُ ثُمَّ يَقْرَأُالفَاتحَةَ ثُـمَّ يَرْكَعُ ثُمَّ يَعْتَدلُ ثُمَّ يَسْجُدُ، فَهَذه رَكْعَةٌ، ثُمَّ يُصَلِّى ثَانيَةً كَذَلكَ، وَلاَ يَجُوزُ زِيَادَةُ رُكُوعٍ ثَالث لتَمَادىالْكُسُوف، وَلاَ نَقْصُهُ للإِنْجلاَء فِيالأَصَحِّ،

---

ناگیرێن، جا هەر کاتێك بینیتان یەکێك لەو دووانە گیران، نوێژ بکەنو دوعا بکەن تا ئەو گیرانە لادەچێ.

(هِيَ سُنَّةٌ) نوێژی ڕۆژگیرانو مانگگیران سوننەتێکی(مؤكَّدة)یە، بۆ پیاو و ئافرەتو مرۆڤی بە تەنهاو ڕێبوارو کۆیلە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، کەوابو: (فَيُحْرِمُ) نوێژەکە دادەبەستێ (بِنِيَّةِ صَلاَةِ الْكُسُوفِ) بە نیەتی نوێژی ڕۆژگیران، یان مانگگیران.

ئینجا بزانە: ئەو نوێژە دوو ڕەکعەتە، بەم سێ شێوەیە دروستە بکرێ:

یەکەم: دوو ڕەکعەتی وەك سوننەتی نوێژیسبەینێ، ئەمەیان لای کەمیەتیو خێری کەمترە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئەم شێوەیە لە (بخاري)دا گێڕدراوەتەوە.

دووەم: دوو ڕەکعەتی شێوەی تەواو، بە مەبەستی ئەم شێوەیە نوێژەکە دادەبەستێو دوعای (توجه) دەخوێنێو (أَعُوذُ بِاللهِ...) دەخوێنێو (وَيَقْرَأُ الْفَاتِحَةَ) سورەتی فاتیحە دەخوێنێ، هەروەها سورەتێکی کورتیش دەخوێنێو (وَيَرْكَعُ) ڕوکووع دەباو (ثُمَّ يَرْفَعُ) ئینجا لە ڕوکووع هەڵدەستێتەوە، بەڵام ناڕواتە سوجدە، بەڵکو (ثُمَّ يَقْرَأُ الْفَاتِحَةَ) لە دوای هەڵسانەوە دووبارە فاتیحەیەکیتر بە پێوە دەخوێنێ، هەروەها سورەتێکی کورتیش دەخوێنێ (ثُمَّ يَرْكَعُ) ئینجا دووبارە ڕوکووعێکیتریش دەبا (ثُمَّ يَعْتَدِلُ) ئینجا لە ڕوکووعەکە هەڵدەستێتەوە (ثُمَّ يَسْجُدُ) ئینجا دەڕواتە سوجدەو هەردوو سوجدەکان دەبا.

(فَهَذِهِ) ئەوەیڕابردوو (رَكْعَةٌ) ڕەکعەتێکییەکەمە (ثُمَّ) ئینجا کە هەردوو سوجدەکەی برد، هەڵدەستێتەوە پێوەو (يُصَلِّي ثَانِيَةً) ڕەکعەتێکیتریدووەمیش دەکا (كَذَلِكَ) وەك ڕەکعەتی یەکەم، واتە: فاتیحەو سورەت دەخوێنێو ڕوکووع دەباو هەڵدەستێتەوە، ئینجا دووبارە فاتیحەو سورەت دەخوێنێو ڕوکووع دەباو هەڵدەستێتەوە، ئینجا دەڕواتە سوجدەو هەردوو سوجدەکە دەبا، ئینجا تەحیات دەخوێنێو سەلام دەداتەوە، ئەم شێوەیەش لە (بخاري و مسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

(وَلاَ يَجُوزُ) لەو شێوەیەدا دروست نیە (زِيَادَةُ رُكُوعٍ ثَالِثٍ) لە ڕەکعەتێکدا ڕوکووعێکی سێیەم زیاد بکرێ (لِتَمَادِيالْكُسُوفِ) بە هۆی درێژبوونەوەی ماوەی گیرانی ڕۆژ، یان مانگ، بەڵکو لە هەر ڕەکعەتێکدا دوو ڕوکووعە (وَلاَ نَقْصُهُ) هەروەها دروست نیە لە ڕەکعەتێکدا لە دوو ڕوکووعیش کەمتر بکرێتەوە (لِلإِنْجِلاَءِ) بە هۆی ڕۆشنبوونەوەی ڕۆژ، یان مانگ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَالأَكْمَلُ أَنْ يَقْرَأَ فِي الْقِيَّامِ الأَوَّلِ بَعْدَالْفَاتحَةَ اَلْبَقَرَةَ، وَفِي الثَّـانِي كَمَـأَتَيْ آيَـةَ مِنْهَـا، وَفِي الثَّالث مأَة وَخَمْسِينَ، وَالرَّابِعِ مأَة تَقْرِيباً، وَيُسَبِّحُ فِي الرُّكُوعِ الأَوَّلِ قَدْرَ مِـأَةٍ مِـنَ الْبَقَرَةِ وَفِي الثَّانِي ثَمَانِينَ وَالثَّالِثِ سَبْعِينَ وَالرَّابِعِ خَمْسِينَ تَقْرِيباً،

---

ئینجا بزانە: لە چەند حەدیسێکی (صحیح)دا هاتوە: ﴿پێغەمبەرﷺ لە هەر ڕەکعەتێکدا سێ ڕوکووع‌و چوار ڕوکووع‌و پێنج ڕوکووعیشی بردوە﴾. بەڵام فەرموودەی‌ڕاستتر وەلامی داوەتەوە: کە حەدیسەکانی دوو ڕوکووع لە هەر ڕەکعەتێکدا ناسراوترن‌و بەهێزترن‌و، لە (بخاري ومسلم)دا گێڕدراونەوە.

هەروەها بزانە: ئەگەر نوێژەکەی تەواو کردو سەلامی داوە، هێشتا ڕۆژ، یان مانگ ڕۆشن نەبوبۆوە، دروست نیە: دووبارە بە تەنهایی نوێژێکی‌تر دابەستێتەوە، بەڵام ئەگەر نوێژەکەی بە تەنهایی کردبو، ئینجا بینی نوێژەکە بە جەماعەت دەکرێ، ئەو کاتە سوننەتە بە جەماعەت دووبارەی بکاتەوە، بەو مەرجەی لە کاتی نوێژدابەستندا ڕۆشن نەبوبنەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

سێ‌یەم: شێوەی(وَالأَكْمَلُ) تەواوتر، کە وەك شێوەی‌دووەمە، بەڵام نوێژەکە درێژتر دەکا، بەم جۆرە: (أَنْ يَقْرَأَ فِي الْقِيَّامِ الأَوَّلِ) بخوێنێ لە بەپێوە ڕاوەستانی یەکەمدا (بَعْدَ الْفَاتِحَةِ) لە دوای فاتیحە، سورەتی (الْبَقَرَةَ) بە تەواوی، یان بە ئەندازەی وی سورەتەکانی‌تر بخوێنێ (وَفِي الثَّانِي) لە بەپێوە ڕاوەستانی دووەمیشدا لە دوای فاتیحە (كَمأَتَيْ آيَةٍ مِنْهَا) بە ئەندازەی دوو سەد ئایەتی (البقرة) قورئان بخوێنێ (وَفِي الثَّالِثِ) لە بەپێوە ڕاوەستانی سێ‌یەمدا لە دوای فاتیحە (مأَةٍ وَخَمْسِينَ) بە قەد سەدو پەنجا ئایەت بخوێنێ (وَالرَّابِعِ) لە بەپێوە ڕاوەستانی چوارەمدا لەدوای فاتیحە (مِأَةٍ تَقْرِيباً) نزیکەی سەد ئایەت بخوێنێ.

(وَيُسَبِّحُ) تەسبیحات دەکا، واتە: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) دەڵێ (فِي الرُّكُوعِ الأَوَّلِ) لە ڕوکووعی‌یەکەمدا (قَدْرَ مِأَةٍ مِنَ الْبَقَرَةِ) بە ئەندازەی سەد ئایەتی سورەتی (البقرة)، هەروەها (وَفِي الثَّانِي) لە ڕوکووعی‌دووەمیشدا (ثَمَانِينَ) بە قەد هەشتا ئایەت (وَالثَّالِثِ سَبْعِينَ) لە ڕوکووعی‌سێ‌یەمیشدا بەقەد حەفتا ئایەت (وَالرَّابِعِ خَمْسِينَ تَقْرِيباً) لە ڕوکووعی‌چوارەمیشدا بەقەد نزیکەی پەنجا ئایەت.

ئینجا بزانە: لە هەر ڕوکووعێك هەڵساوە، سوننەتە بڵێ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ) هەروەك لە (بخاري ومسلم)دا هاتوە.

هەروەها سوننەتە: (حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ...) تا کۆتایی زیاد بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ يُطَوَّلُ السَّجدَات فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ تَطْوِيلُهَا ثَبَتَ فِي الصَّحِيحَيْنِ، وَنَصَّ فِي الْبُوَيْطِي: أَنَّهُ يُطَوِّلُهَا نَحْوَ الرُّكُوعِ الَّذِي قَبْلَهَا، وَاللهُ أَعْلَمُ. وَتُسَنُّ جَمَاعَةً

---

(وَلاَ يُطَوَّلُ السَّجدَاتِ فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا: سوجدەکان درێژ ناکاتەوە، (قُلْتُ) ئیمامی (النـووي) دەفەرموێ: (الصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: (تَطْوِيلُهَا) سوننەتە: گشت سوجدەکان درێژ بکاتەوە (ثَبَتَ فِي الصَّحِيحَيْنِ) چونکە لە (بخاري ومسلم)دا هاتوەو (وَنَصَّ فِي الْبُوَيْطِي) ئیمامی (الشافعي)ش لە کتێبی (البُوَيْطِي)دا فەرموویەتی: (أَنَّهُ يُطَوِّلُهَا) سوجدەکانیش درێژ دەکاتەوە: هەر سوجدەیەك (نَحْوَ الرُّكُوعِ الَّذِي قَبْلَهَا) وەك ڕکووعەکەی پێشە خۆی، واتە: سوجدەی‌یەکەم وەك ڕکووعی‌یەکەم درێژ دەکاتەوەو تێیدا دەڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى وَبِحَمْدِهِ)، سوجدەی‌دووەمیش وەك ڕکووعی‌دووەم...هتد (وَاللهُ أَعْلَم) بەڵام نە هەڵسانەوەی ڕکووعی‌دووەمو نە دانیشتنی نێوان سوجدەکانو نە تەحیات، هیچیان درێژ ناکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئەمەش حەدیسەکەی شێوەی سێیەمە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَامَ فَصَلَّى بِالنَّاسِ فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدْ انْجَلَتِ الشَّمْسُ فَخَطَبَ النَّاسَ...﴾ الحديث رواه الشيخان، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ڕۆژ گیرا، ئینجا پێغەمبەر ﷺ هەڵسا پێشنوێژی‌ی ڕۆژگیرانی بۆ خەڵکی کرد: ڕاوەستانەکەی بە پێوە درێژ کردەوە، ئینجا ڕکووعی بردو ڕکووعەکەشی درێژ کردەوە، ئینجا هەڵساوە دیسان ڕاوەستانەکەی درێژ کردەوە، بەڵام کەمتر لە ڕاوەستانی یەکەم، ئینجا ڕکووعێکی‌تری بردو ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، بەڵام کەمتر لە ڕکووعی یەکەم، ئینجا چووە سوجدەو سوجدەکانیشی درێژ کردنەوە، ئینجا لە ڕەکعەتی دووەمیشدا وەك ڕەکعەتی یەکەمی کرد، ئینجا کە نوێژی تەواو کرد، ڕۆژیش ڕۆشن بۆوە، ئینجا هەڵسا خوتبەی بۆ خەڵکەکە خوێندەوە...تا کۆتایی حەدیسەکە.

(وَتُسَنُّ جَمَاعَةً) سوننەتە: نوێژی ڕۆژگیرانو، مانگگیران بە جەماعەت بکرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو و داهاتوو، واتە: بە جەماعەت خێری زیاترە، سوننەتە: لەجیاتی بانگو ئیقامەت یەکێك بڵێ: ﴿اَلصَّلاَةُ جَامِعَةٌ﴾ رواه الشيخان.

جا ئەگەر بە جەماعەتیش نەیکا، بە تەنهاییش هەر سوننەتە بیکا، هەروەها دروستە: ئەو نوێژەی ڕۆژگیرانو مانگگیران لە زۆر شوێنانیشدا بکرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

وَيَجْهَرُ بِقِرَاءَ ةِ كُسُوفِ الْقَمَرِ، لاَالشَّمْسِ، ثُمَّ يَخْطُبُ الإِمَامُ خُطْبَتَيْنِ بِأَرْكَانِهِمَا فِي الْجُمُعَةِ، وَيَحُثُّ عَلَىالتَّوْبَةِ وَالْخَيْرِ، وَمَنْ أَدْرَكَ الإِمَامَ فِي رُكُوعٍ أَوَّلَ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ،

---

(وَيَجْهَرُ بِقِرَاءَ ةِ كُسُوفِ الْقَمَرِ) به دەنگی ئاشکرا فاتیحەو سورەت دەخوێنێ لە نوێژی مانگگیراندا، چونکە نوێژەکە سەر بە شەوێیە ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنهَا: جَهَرَالنَّبِيُّﷺ فِي صَلاَةِالْخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە نوێژیمانگگیراندا دەنگیخۆی ئاشکرا دەکرد بە خوێندنی فاتیحەو سورەت.

(لاَ الشَّمْسِ) بەڵام لە نوێژی ڕۆژگیراندا دەنگیخۆی ئاشکرا ناکا، بەڵکو بە نهێنی دەیخوێنێ ﴿عَنْ سَمُرَةَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّﷺ فِي كُسُوفٍ لاَنَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً﴾رواه أصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ نوێژیڕۆژگیرانی بۆ بە جەماعەت کردین گوێمان لە دەنگی نەدەبو.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای تەواوبوونی نوێژەکە (يَخْطُبُ الإِمَامُ خُطْبَتَيْنِ) سوننەتە: ئیمام دوو خوتبە بخوێنێتەوە (بِأَرْكَانِهِمَا) بە ڕوکنو سوننەتەکانیانەوە (فِيالْجُمُعَةِ) کە لە خوتبەکانی جومعەدا ڕوون کرانەوە، بەڵام مەرجەکان لێرەدا پێویست نین، بەڵکو سوننەتن، چونکە ئەو دوو خوتبەیە بۆ دروستبوونی نوێژەکە بە مەرج دانەنراون، واتە: بە بێخوتبەخوێندنەوەش نوێژەکە دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيَحُثُّ) لە خوتبەکاندا ئامۆژگاری خەڵکەکە دەکاو هانیان دەدا (عَلَىالتَّوْبَةِ) لە سەر تۆبەکردن (وَالْخَيْرِ) لە سەر چاکەکردن: وەك دوعای لێخۆشبوونو خێرکردنو ئاشتبوونەوەو پاڕانەوە لە خواو هەڵنەخەڵەتان بە دونیاو ئەو جۆرە باسانە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا فِي صَلاَةِالْكُسُوفِ: فَخَطَبَﷺ النَّاسَ ثُمَّ قَالَ: فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوااللهَ وَكَبِّرُوا وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە دوای نوێژی ڕۆژگیران ووتاری خوێندەوەو فەرمووی: هەر کاتێك بینیتان ڕۆژ، یان مانگ گیرا، دوعا بکەنو زیکری خوا بکەنو نوێژ بکەنو خێران بکەن.

(وَمَنْ أَدْرَكَ الإِمَامَ) هەر کەسێك لە نوێژی ڕۆژگیرانو مانگگیران بگاتە ئیمامی نوێژەکە (فِي رُكُوعٍ أَوَّلَ) لە ڕوکوعێکی یەکەمدا (أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ) دەگاتە ڕەکعەتەکە، جیاوازی نیە ڕوکوعە یەکەمەکە: هی ڕەکعەتییەکەم بێ، یان هی ڕەکعەتیدووەم بێ، واتە: ئەگەر لە ڕوکوعی یەکەمی ڕەکعەتییەکەمدا گەیشتە ئیمامی نوێژەکە، ئەوە ئیمام فاتیحەکەی یەکەمی لەجیاتی هەڵدەگرێو ئەم ڕەکعەتەی یەکەمی بە تەواو بۆ دەژمێردرێو لەگەڵ ئیمام سەلام دەداتەوە، هەروەها ئەگەر لە ڕوکوعییەکەمی ڕەکعەتیدووەمیش بگاتە ئیمام، ئەم ڕەکعەتەیدووەمی بە تەواو بۆ دەژمێردرێ، کەوابو: لە دوای سەلامدانەوەیئیمام ڕەکعەتێکیتر: بە دوو ڕوکوعەوەو بە دوو فاتیحەوە دەکاو سەلام دەداتەوە.

أَوْ فِي ثَانٍ أَوْ قِيَامٍ ثَانٍ فَلاَ فِي الأَظْهَرِ، وَتَفُوتُ صَلاَةُ الشَّمْسِ بِالإِنْجِلاَءِ وَبِغُرُوبِهَا كَاسِفَةً، وَالْقَمَرِ بِالإِنْجِلاَءِ وَطُلُوعِ الشَّمْسِ، لاَ الْفَجْرِ فِي الْجَدِيدِ، وَلاَ بِغُرُوبِهِ خَاسِفاً، وَلَوِ اجْتَمَعَ كُسُوفٌ وَجُمُعَةٌ أَوْ فَرْضٌ آخَرُ قُدِّمَ الْفَرْضُ إِنْ خِيفَ فَوْتُهُ، وَإِلاَّ

---

(أَوْ فِي ثَانٍ) یان لە ڕکووعێکی‌دووەمدا گەیشتە ئیمام (أَوْ قِيَامٍ ثَانٍ) یان لە بە پێوە ڕاوەستانێکی دووەمدا گەیشتە ئیمام (فَلاَ) ئەوە ناگاتە ڕەکعەتەکە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، جیاوازی نیە ڕکووعەدووەمەکەو ڕاوەستانەدووەمەکە: هی ڕەکعەتی‌یەکەم بن، یان هی ڕەکعەتی‌دووەم بن، چونکە هەرچی دەکەوێتە دوای ڕکووعی یەکەم لە هەر ڕەکعەتێکدا بێ، وەك هەڵسانەوەی ڕکووع وایەو بۆی ناژمێردرێ، هەروەك لە نوێژەکانی‌تریش وەهایەو، لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَتَفُوتُ صَلاَةُ الشَّمْسِ) نوێژی ڕۆژگیران دەفەوتێ بە دوو شت، یەکەم: (بِالإِنْجِلاَءِ) بە ڕۆشنبوونەوەی هەموو کولێرەی ڕۆژ، واتە: تا بەشێکی بە گیراوی مابێ، سوننەتە: نوێژەکە دابەستێ، هەروەك ئەگەر تەنها بەشێکیشی بگیرێ سوننەتە: نوێژەکە بکا. دووەم: (وَبِغُرُوبِهَا كَاسِفَةً) بە ئاوابوونی ڕۆژ بە گیراوی، واتە: ئەگەر ڕۆژ هەمووی ڕۆشن بۆوە، یان بە گیراوی ئاوا بوو، ئەوە ئەگەر نوێژەکەی دانەبەستبو، دروست نیە: نوێژەکە دابەستێ، چونکە هۆیەکەی نەماوەو قەزاش ناکرێتەوە، هەروەك لە باسی (قەزاکردنەوەی نوێژە سوننەتەکان)دا ڕابرا.

(وَالْقَمَرِ) نوێژی مانگگیرانیش دەفەوتێ بە دوو شت، یەکەم: (بِالإِنْجِلاَءِ) بە ڕۆشنبوونەوەی هەموو کولێرەی مانگ. دووەم: (وَطُلُوعِ الشَّمْسِ) بە هەڵاتنی ڕۆژ، واتە: ئەگەر مانگەکە هەمووی ڕۆشن بۆوە، یان هەر گیراو بوو بەڵام ڕۆژ هەڵات، ئەوە ئەگەر نوێژی دابەستبو نوێژەکەی تەواو دەکا، ئەگەر نوێژەکەی دانەبەستبو دروست نیە دایبەستێ، چونکە هۆیەکەی نەماوەو قەزاش ناکرێتەوە (لاَ الْفَجْرِ) بەڵام بە دەرکەوتنی بەیان نوێژەکە نافەوتێ (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا (وَلاَ بِغُرُوبِهِ خَاسِفاً) هەروەها ئەگەر بە گیراویش ئاوا ببێ، یان بکەوێتە پەنای هەور، نافەوتێ، کەوابو: ئەگەر بەشێکی مانگ گیرا، یان هەمووی گیراو بەشێکی ڕۆشن بۆوە، یان گیراو بەیان دەرکەوت، یان بەگیراوی ئاوا بوو، لەو حاڵەتانەدا سوننەتە: نوێژەکە بکا.

(وَلَوِ اجْتَمَعَ كُسُوفٌ وَجُمُعَةٌ) ئەگەر لەیەك کاتدا نوێژی ڕۆژگیران‌و نوێژی جومعە کۆ بونەوە (أَوْ فَرْضٌ آخَرُ) یان نوێژە واجبێکی‌تر: وەك نیوەڕۆ، یان عەسر (قُدِّمَ الْفَرْضُ) واجبە: نوێژە واجبەکە پێشدا بکرێ (إِنْ خِيفَ فَوْتُهُ) ئەگەر ترسی فەوتانی نوێژە واجبەکە هەبێ: جا جومعە بێ، یان نوێژێکی‌تر (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر ترسی فەوتانی نوێژە واجبەکە

فَالأَظْهَرُ تَقْدِيمُ الْكُسُوف، ثُمَّ يَخطُبُ لِلْجُمُعَة مُتَعَرِّضاً لِلْكُسُوف ثُمَّ يُصَلِّى الْجُمُعَـةَ، وَلَوِ اجْتَمَعَ عِيدٌ أَوْ كُسُوفٌ وَجَنَازَةٌ قُدِّمَت الْجَنَازَةُ.

---

نەبێ (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (تَقْدِيمُ الْكُسُوفِ) سوننەتە: نوێژی ڕۆژگیران وەپێش نوێژە واجبەکە بخا، بەڵام لە دوای فاتیحە سورەتیکورتی وەك (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) دەخوێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (ثُمَّ) ئینجا کە نوێژی ڕۆژگیرانی تەواو کرد (يَخْطُبُ لِلْجُمُعَةِ) دوو خوتبەی جومعە دەخوێنێتەوە (مُتَعَرِّضاً لِلْكُسُوفِ) لە ناو خوتبەی جومعەشدا باسی ڕۆژگیرانیش دەکا (ثُمَّ يُصَلِّي الْجُمُعَةَ) ئینجا نوێژی جومعەش دەکا، واتە: پێویست بە چوار خوتبە ناکا.

(وَلَوِ اجْتَمَعَ عِيدٌ أَوْ كُسُوفٌ) ئەگەر لە یەك کاتدا نوێژی جەژن، یان نوێژی ڕۆژگیران کۆ بۆوە (وَجَنَازَةٌ) لەگەڵ نوێژی جەنازە (قُدِّمَتِ الْجَنَازَةُ) نوێژی جەنازە وەپێش دێخرێ لە سەر نوێژی جەژنیش‌و لە سەر نوێژی ڕۆژگیرانیش، نەوەك مردووەکە بگۆڕێ، کەوابو: نوێژی جەنازە وەپێش نوێژە فەرزەکانیش دێخرێ، بەو مەرجەی ماوەی فەرزەکە بەرفراوان بێ.

بەڵام ئەگەر نوێژی جەژن‌و ڕۆژگیران پێکەوە کۆ بونەوە: ئەو کاتە وەك نوێژی واجب ڕەفتار دەکرێ، واتە: ئەگەر بترسێ نوێژی جەژن بفەوتێ، جەژنەکە وەپێش دێخێ، ئەگەر نا: نوێژی ڕۆژگیران دەکا، ئینجا نوێژی جەژن، ئینجا دروستە: بۆ هەردووکیان تەنها دوو خوتبە بخوێنێتەوەو تێیاندا باسی هەردووکیان دەکا.

ئینجا بزانە: نوێژی مانگگیرانیش لەگەڵ نوێژە واجبەکانی شەوێ، وەك ڕۆژێ ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، بەڵام ئەگەر نوێژی مانگگیران لەگەڵ تەراویح، یان لەگەڵ وەتر کۆ بونەوە، ئەوە نوێژی مانگگیران پێش دەخرێ، هەرچەند بشترسێ وەترو تەڕوایحەکان بفەوتێن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: چونکە دەگونجێ وەترو تەڕوایح قەزا بکرێنەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی زەمین لەرزین و تاریکایی‌و ڕەشەبا ﴾

هەر کاتێك زەمین لەرزی، یا دونیا تاریك بو، یان تۆزو غوبار، یان ڕەشەبا، یان لافاو و ئەو جۆرە مەترسیانە ڕویدا، سوننەتە: هەر کەسەو دوو ڕەکعەت نوێژ بکا، وەك سوننەتی نیوەڕۆ، بە نیەتی ڕووداوەکە، بەڵام بە تەنهایی، نەك بە جەماعەت، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَيْتُمْ آيَةً فَاسْجُدُوا﴾رواه ابوداود بسندحسن، هەر کاتێك ڕووداوێکی‌ترسناکتان دیت سوجدە ببەن. واتە: سوجدە بە واتەی نوێژیش هاتوە.

## (بابُ صَلاة الإسْتسْقاء)

**هِيَ سُنَّةٌ عِنْدَ الْحَاجَةِ، وَتُعَادُ ثَانِياً وَثَالِثاً إنْ لَمْ يُسْقَوْا، فَإنْ تَأَهَّبوا للصَّلاَة فَسُقُوا قَبْلَهَا اجْتَمَعُوا لِلشُّكْرِ**

---

هەروەها تۆبەو زیکرو دوعاش لەو ڕووداوانەدا هاتوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إنَّ هَـذِه الآيات يُرْسِلُ اللهُ لاَ تَكُونُ لِمَوْت أَحَد وَلاَلِحَيَاته، وَلَكِنَّ اللهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ، فَإذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئاً فَافْزَعُوا إلَىاللهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ﴾ رواه الشيخان، ئەو ڕووداوە ترسناکانەی وەك ڕۆژگیران کە خوای گەورە دەیاننێرێ: نە لە بەر مردنی هیچ کەسێکەو نە لە بەر ژیانی هیچ کەسێکە، بەڵام خوای گەورە دەیاننێرێ بەندەکانیخۆی پێ دەترسێنێ، جا هەر کاتێك شتێکتان لەو ڕووداوانە دیت، هانا ببەنە بەر زیکریخواو دوعاو پاڕانەوەو تکای لێخۆشبوونی گوناهەکانتان.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللهِ تَعَالَى تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَتَأْتِي بِالْعَذَابِ، فَإذَا رَأَيْتُمُوهَا فَلاَ تَسُبُّوهَا وَسَلُوااللهَ خَيْرَهَا وَاسْتَعِيذُوا بِاللهِ مِنْ شَرِّهَا﴾رواه ابوداود بإسنادٍ حسن، با لە ڕەحمەتیخوایە، ڕەحمەتو بەرکەتیش دێنێ، عەزابو ئازاریش دێنێ، جا هەر کاتێك دیتتان بایەك هات، جنێوی پێمەدەن، بەڵکو لە خوا بپاڕێنەوەو بڵێن: خوایە چاکەی ئەم بایەمان بدێ، خوایە لە خراپەی ئەم بایە بمانپارێزە.

### ﴿ بابُ صَلاَةالإسْتسْقاء: **باسی نوێژی باران** ﴾

(هِيَ) نوێژی باران، واتە: پاڕانەوەی ئاودان لە خوای گەورە (سُنَّةٌ) سوننەتێکی (مؤكدة)یە، بۆ گشت کەسێك: ڕێبوارو نیشتەجێی شارو لادێو ڕەشماڵ، بە تەنهایی، یان بە جەماعەت، چونکە پێغەمبەرﷺ کردویەتیو (البخاري ومسلم) گێڕاویەتیانەوە (عِنْدَ الْحَاجَةِ) لە کاتی پێویستیدا ئەو نوێژە سوننەتە، وەك باران نەبارێو زەمین تینوو بێ، یان سەرچاوەیئاو، یان ڕوبار ووشك ببێ، یان ئاوەکەیان کەم ببێتەوەو تێری خەڵك نەکا.

(وَتُعَادُ ثَانِياً) ئەم نوێژە دووەمجاریش دووبارە دەکرێتەوە (وَثَالِثاً) هەروەها سێیەمجاریشو زیاتریش (إنْ لَمْ يُسْقَوْا) ئەگەر ئاو نەدران، کەواتە: تا خوای گەورە ئاویان دەداتێ نوێژەکە هەر دووبارە دەکەنەوە.

(فَإنْ تَأَهَّبُوا لِلصَّلاَةِ) جا ئەگەر خەڵکەکە خۆیان ئامادە کرد بۆ نوێژی بارانو (فَسُقُوا قَبْلَهَا) جا پێش نوێژکردنەکە ئاودران، واتە: باران باری، یان ئاو ژیاوە (اجْتَمَعُوا) سوننەتە: لە شوێنی نوێژەکەدا کۆ ببنەوە (لِلشُّكْرِ) بۆ حەمدو شوکری خوای گەورە لە سەر ئەو نیعمەتە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ ئەگەر شوکری من بکەن نیعمەتی زیاترتان دەدەمێ.

وَالدُّعَاء، وَيُصَلُّونَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَيَأْمُرُهُمُ الإِمَامُ بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ أَوَّلاً، وَالتَّوْبَةِ وَالتَّقَرُّبِ إِلَى اللهِ تَعَالَى بِوُجُوهِ الْبِرِّ وَالْخُرُوجِ مِنَ الْمَظَالِمِ،

---

(وَالدُّعَاءِ) هەروەها بۆ دوعاكردنیش: كە خوا زیاتریان بداتێ (وَيُصَلُّونَ عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست نوێژی بارانیش دەكەن هەر بە نیەتی نوێژی باران، بۆ شوكری خوای گەورە.

ئینجا هەر كاتێك لە دوای نوێژیباران ئاو دران، واتە: باران باری، یان ئاو ژیاوە، سوننەت نیە نوێژەكە دووبارە بكەنەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَأْمُرُهُمُ الإِمَامُ) پێشەوای موسڵمانان، یان جێگرەكەی فەرمانیان دەداتێ (بِصِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ) بە بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژان بە دوایەكدا (أَوَّلاً) پێش ئەوەی بڕۆنە نوێژكردن، ئینجا بزانە: ئەگەر شوێنەكە پێشەوا، یان جێگری پێشەوای لێنەبو، ئەو كاتە زاناو پیاوماقوڵانی شوێنەكە یەكێك تەرخان دەكەن تاكو ئەو كارانە ئەنجام بدا، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

هەروەها بزانە: بە فەرمانیپێشەوا ئەو ڕۆژووانەی نوێژیباران لە سەر خەڵك واجب دەبنو واجبە: لە شەویدا نیەتەكەیان بۆ بهێنن، كەواتە: هەر كەسێك بە ڕۆژوو نەبێ، گوناهبار دەبێ، بەڵام واجب نیە ڕۆژووەكان قەزا بكاتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

هەروەها ڕۆژوویواجب لەو ڕۆژانەدا دروست دەبێو فەرمانی پێشەوای پێ جێبەجێ دەبێ: وەك لەو ڕۆژانەدا لە جیاتینەزر، یان (كفارة)، یان قەزا، بەڕۆژوو ببێ، یان كاتەكە ڕەمەزان بێ –هەروەك لە (نهاية)و (الشبراملسي)دا ڕوون كراوەتەوە– چونكە مەبەستیسەرەكی لێرەدا ئەوەیە: لەو ڕۆژانەدا خودی ڕۆژوو هەبێ، تاكو دوعا قبوڵ ببێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ثَلاثَةٌ لاتُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: اَلصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ، وَالإِمَامُ الْعَادِلُ، وَالْمَظْلُومُ﴾رواه الترمذي بسندحسن، سێ كەس دوعایان قبوڵ دەبێو ڕەد ناكرێتەوە: مرۆڤی بەڕۆژوو تا ڕۆژووەكەی دەشكێنێ، پێشەوای دادپەروەر، مرۆڤی ستەم لێكراو.

(وَالتَّوْبَةِ) هەروەها فەرمانیان دەداتێ: بە تۆبەكردن (وَالتَّقَرُّبِ إِلَى اللهِ تَعَالَى) بە خۆ نزیككردنەوە لە خوای گەورە (بِوُجُوهِ الْبِرِّ) بە ڕووی چاكەكان: وەك خێركردنو ئاشتبوونەوەو ڕوو لە خواپەرستیكردنو ئەو جۆرە شتانە.

(وَالْخُرُوجِ مِنَ الْمَظَالِمِ) هەروەها فەرمانیان پێدەكا: بە دەرچوونو خۆ پاككردنەوە لە گشت ستەمەكانی مافی ئادەمیزادان: وەك خوێنو ماڵو ئابڕوو، یان مافی خوای گەورە: وەك قەزاكردنەوەی نوێژو ڕۆژوو و زەكاتدانو ئەو جۆرە شتانە، چونكە ستەمو تاوانەكان دەبنە

وَيَخْرُجُونَ إِلَى الصَّحْرَاءِ فِي الرَّابِعِ صِيَاماً فِي ثِيَابِ بِذْلَةٍ وَتَخَشُّعٍ، وَيُخْرِجُونَ الصِّبْيَانَ وَالشُّيُوخَ وَكَذَا الْبَهَائِمَ فِي الأَصَحِّ،

---

هۆی نەبارینی باران، چاکەو تۆبەکردنیش دەبنە هۆی ڕەحمی خوای گەورەو قبوڵبوونی دوعای باران، خوای گەورە لە باسی حەزرەتی (هود)پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَيَاقَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا﴾ هۆ گەلەکەم تکای لێخۆشبوونی گوناهەکانتان لە خوای خۆتان بکەن، ئینجا تۆبە بکەن، تاکو خوای گەورە بارانێکی زۆر بە ئاوتان بۆ ببارێنێ.

(وَيَخْرُجُونَ إِلَى الصَّحْرَاءِ) بۆ نوێژی باران دەچنە بیابانێکی دەرەوەی شار (فِي الرَّابِعِ) لە ڕۆژی چوارەمی سێ ڕۆژەکەیڕابردوو (صِيَاماً) لەو ڕۆژەی چوارەمیشدا هەر بە ڕۆژوو دەبن کە دەچنە نوێژکردن تاکو دوعایان قبوڵ ببێ (فِي ثِيَابِ بِذْلَةٍ) لە بەرگێکی کۆنی کارکردندا (وَتَخَشُّعٍ) بە زەلیلیو ملکەچیو پاڕانەوەو نوزانەوە ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما -فِي صَلاَةِ الإِسْتِسْقَاءِ-: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَبَذِّلاً مُتَوَاضِعاً مُتَضَرِّعاً حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى فَرَقِيَ الْمِنْبَرَ فَلَمْ يَخْطُبْ خُطَبَكُمْ هَذِهِ وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژی باران لە (مدینة) چووە دەرەوە، لە بەرگێکی کۆندا، بە ملکەچیو لە خوا پاڕانەوە، تا هاتە شوێنی نوێژکردن لە دەرەوەی (مدینة)، ئینجا چووە سەر مینبەر، بەڵام ئەو جۆرە خوتبەی ئێوەی نەخوێندەوە، بەڵکو بەردەوام دوعای دەکردو ملکەچیی نیشان دەداو (اللّٰهُ أَكْبَرُ)ی دەگوت، ئینجا دوو ڕەکعەت نوێژی بارانی بۆ کردین وەك نوێژی جەژن.

(وَيُخْرِجُونَ الصِّبْيَانَ) منداڵەکانیش لەگەڵ خۆیان دەبەنە دەرەوە (وَالشُّيُوخَ) هەروەها پیرەژنو پیرەمێردیش لەگەڵ خۆیان دەبەنە دەرەوە، چونکە دوعای ئەوانە زووتر قبوڵ دەبێو، پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێ: ﴿وَهَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاَّ بِضُعَفَائِكُمْ﴾رواه البخاري وأصحاب السنن، ئایا ئێوە سەرکەوتنو ڕزقتان دەدرێتێ، تەنها لە بەر خاتری بێهێزەکانتان نەبێ.

(وَكَذَا الْبَهَائِمَ) هەروەها ئاژەڵەکانیش بە بێچووەکانیانەوە لەگەڵ خۆیان دەبەنە دەرەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە نەهاتو بێبارانی ئازاری ئاژەڵیش دەدا، ئینجا دایکەکانو بێچووەکان لێك جیا دەکەنەوە، تاکو بارەبارو قواڕەقواڕو حیلەحیل بەرز ببێتەوەو خوایگەورە زوتر ڕەحم بکاو دوعایەکان قبوڵ بکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿خَرَجَ سُلَيْمَانُ يَسْتَسْقِي، فَرَأَى نَمْلَةً مُسْتَلْقِيَةً عَلَى ظَهْرِهَا رَافِعَةً قَوَائِمَهَا إِلَى السَّمَاءِ -تَسْتَسْقِي- فَقَالَ: إِرْجِعُوا فَقَدْ سُقِيتُمْ بِدَعْوَةِ غَيْرِكُمْ﴾رواه احمد وصححه الحاكم،

وَلاَ يُمْنَعُ أَهْلُ الذِّمَّةِ الْحُضُورَ، وَلاَ يَخْتَلِطُونَ بِنَا، وَهِيَ رَكْعَتَانِ كَالْعِيدِ، لَكِنْ قِيلَ يَقْـرَأُ فِي الثَّانِيَةِ: إِنَّا أَرْسَلْنَا نُوحًا، وَلاَ تَخْتَصُّ بِوَقْتِ الْعِيدِ فِي الأَصَحِّ،

---

حـەزرەتی (سلیمان) پێغەمبـەرﷺ چـووە دەرەوە بـۆ نوێـژی بـاران، کـە تەماشـای کـرد مێرووێك لە سەر پشت درێژ بووەو پێیەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردونـەوەو دوعـای بـاران دەکا، حەزرەتی(سلیمان)ﷺ فەرمووی: بگەڕێنـەوە، خـوای گـەورە بـە دوعـای مێرووەکـە بارانتان بۆ دەبارێنێ.

(وَلاَ يُمْنَـعُ أَهْـلُ الذِّمَّـةِ) خـاوەن پەیمانـەکان: وەك جولەکـەو دیانـەکان قەدەغـە نـاکرێن (الْحُضُورَ) کە لەگەڵ ئێمەدا ئامـادە بـبن، ئەگـەر لەخۆیانـەوە هـاتن، چـونکە ئـەوانیش بـۆ ڕزقی خۆیان لە خوا دەپاڕێنەوە، بەڵام (وَلاَ يَخْتَلِطُونَ بِنَا) نابێ لەگەڵ ئێمـەدا تێکـەڵ بـبن، هـەر لـە کـاتی ڕۆیشـتنەوە تـا دەشـگەڕێینەوە، کـەوابو: ناپەسـندە ئێمـە لەگـەڵ خۆمـان بیانبەینە دەرەوە.

## ﴿ چۆنیەتی نوێژی باران ﴾

(وَهِـيَ) نوێـژی بـاران (رَكْعَتَـانِ) دوو ڕەکعەتـە (كَالْعِيـدِ) وەکـو نوێـژی جـەژن، بـە بەڵگـەی حەدیسەکەی (اِبْن عبـاس)ی‌ڕابردوو، کـەوابو: لـە جیـاتی بـانگو ئیقامـەت یـەکێك دەڵـێ: (اَلصَّلاَةُ جَامِعَةٌ). ئینجا لەگەڵ (اللهُ أَكْبَر)ی نوێژدابەستندا نیەتی(صَلاَةُ الإِسْتِسْقَاءِ): نوێـژی باران دێنێ‌و دوعای (تَوَجُّه) دەخوێنـێ، ئینجـا حـەفت (اللهُ أَكْبَـر) دەڵـێ‌و لـە نێـوان گشـت دوو (اللهُ أَكْبَر)ێکدا (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ...) تـا کۆتـایی دەڵـێ، ئینجـا (أَعُـوذُ بِـاللهِ...)، ئینجـا (فـاتیحـە) دەخوێنـێ، هـەروەها لـە ڕەکعەتی‌دووەمیشـدا –جگـە لـە (اللهُ أَكْبَـر)ی هەڵسانەوە –پێنج (اللهُ أَكْبَر) دەڵێ‌و لە نێوان گشت دوو (اللهُ أَكْبَر)ێکدا (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ...) تا کۆتایی دەڵێ، ئینجا (أَعُوذُ بِاللهِ...)و فاتیحە دەخوێنێ، هـەروەها لـە گشـت (اللهُ أَكْبَر)ەکاندا دەستەکانی بەرز دەکاتەوەو لە بن سینگی‌خۆی دایاندەنێتەوە.

هـەروەها لـە دوای فاتیحـەش: لـە ڕەکعـەتی یەکەمـدا سـوڕەتی(ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيـدِ)، یـان سوڕەتی (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ) دەخوێنێ، لە ڕەکعەتی دووەمیشدا سـوڕەتی(اقْتَـرَبَـتِ السَّـاعَةُ)، یان (هَلْ أَتَاكَ) دەخوێنێ، لە هەردوو ڕەکعەتەکانیشدا فاتیحەو سوڕەت بە دەنگی ئاشکرا دەخوێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوونیان کردۆتەوە.

(لَكِنْ قِيلَ) بەڵام لە فەرموودەی بێ‌هێزدا هاتووە: (يَقْرَأُ فِي الثَّانِيَـةِ) لـە ڕەکعـەتی دووەمـدا لە دوای فاتیحە، سوڕەتی(إِنَّـا أَرْسَـلْنَا نُوحـاً) دەخوێنـێ (وَلاَ تَخْـتَصُّ بِوَقْـتِ الْعِيـدِ) نوێـژی باران تایبەت نیە: بە کاتی‌نوێژی جـەژن، بـەڵکو لـە گشـت کـاتێکی شـەو و ڕۆژدا دروسـتە بکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

وَيَخْطُبُ كَالْعيد، لَكنْ يَسْتَغْفرُاللهَ تَعَالَى بَدَلَ التَكْبير، وَيَدْعُوا في الْخُطْبَة الأُولَى: (اَللّهُمَّ أَسْقنَا غَيْثاً مُغيثاً هَنيئاً مَريئاً مَريعاً غَدَقاً مُجَلّلاً سَحّاً طَبَقاً دَائماً، اَللّهُمَّ أَسْقنَا الْغَيْثَ وَلاَ تَجْعَلْنَا منَ الْقَانطينَ، اَللّهُمَّ إنَّا نَسْتَغْفرُكَ إنَّكَ كُنْتَ غَفَّاراً فَأَرْسلِ السَّمَاءَ عَلَيْنَا مدْراراً). وَيَسْتَقْبلُ الْقبْلَةَ بَعْدَ صَدْرِالْخُطْبَةالثَّانيَة،

---

(وَيَخْطُبُ) لە دوای نوێژی باران دوو خوتبە دەخوێنێتەوە (كَالْعيد) وەكو خوتبەكانی جەژن: لە ڕوكنو سوننەتو مەرجەكاندا ﴿عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَسْتَسْقي: فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ بِلاَ أذانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ ثُمَّ خَطَبَنَا﴾رواتە ثقات رواه احمد والبيهقي وغيرهما، پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژی باران لە (مدينة) چووە دەرەوەو دوو ڕەكعەتی بە جەماعەت بۆ كردین بە بێ بانگو ئیقامەت، ئینجا خوتبەی بۆ خوێندینەوە.

(لَكنْ) بەڵام لەمەدا جیاوازن: (يَسْتَغْفرُاللهَ تَعَالَى) ووتارخوێنەكە لە سەرتای خوتبەكاندا (أَسْتَغْفِرُ اللهَ) دەڵێ (بَدَلَ التَكْبِيرِ) لە جیاتی (اللهُ أكْبَر)ەكان، واتە: لە سەرەتای خوتبەی یەكەمدا نۆ جار دەڵێ: (أَسْتَغْفِرُاللهَ الَّذِى لاَإِلَهَ إِلاَّهُوَالْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ).

هەروەها لە سەرەتای خوتبەی دووەمیشدا حەفت جار دەیڵێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵگەش ئایەتی﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا﴾...الآيات، تكای لێخۆشبوونیگوناه لە خوایخۆتان بكەن، چونكە ئەو زۆر لە گوناهان خۆش دەبێ، تاكو لە ئاسمان بارانێكی زۆر بە ئاوتان بۆ ببارێنێ.

هەروەها لە خوتبەكانیشدا زۆر ئەو ئایەتە دووبارە دەكاتەوەو زۆر دەڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللهَ)، زۆر دەڵێ: (يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ نَسْتَغِيثُ وَمِنْ رَحْمَتِكَ نَرْجُو، فَلاَ تَكِلْنَا إِلَىأَنْفُسِنَا طَرْفَةَ عَيْنٍ وَأَصْلِحْ لَنَا شَأْنَنَا كُلَّهُ لاَإِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ). هەروەك لە (مغني)دا فەرموویەتی.

(وَيَدْعُوا فِيالْخُطْبَةِ الأُولَى) سوننەتە: لە خوتبەی یەكەمدا بە دەنگی ئاشكرا ئەم دوعایەی پێغەمبەرﷺ بكا: ﴿اَللّهُمَّ أَسْقنَا غَيْثاً مُغيثاً هَنيئاً مَريئاً مَريعاً غَدَقاً مُجَلّلاً سَحّاً طَبَقاً دَائماً، اَللّهُمَّ أَسْقنَا الْغَيْثَ وَلاَ تَجْعَلْنَا منَ الْقَانطينَ، اَللّهُمَّ إنَّ بالْعبَاد وَالْبلاَد وَالْخَلْق منَ الَّلأْوَاء وَالْجَهْد وَالضَّنْكَ مَا لاَنَشْكُو إلاَّإلَيْكَ، اَللّهُمَّ أَنْبتْ لَنَاالزَّرْعَ وَأَدرَّ لَنَاالضَّرْعَ وَأَسْقنَا منْ بَرَكَات السَّمَاء وَأَنْبتْ لَنَا منْ بَرَكَات الأَرْض، اَللّهُمَّ ارْفَعْ عَنَّاالْجَهْدَ وَالْجُوعَ وَالْعُرْيَ وَاكْشفْ عَنَّا منَ الْبَلاَء مَا لاَيَكْشفُهُ غَيْرُكَ، اَللّهُمَّ إنَّا نَسْتَغْفرُكَ إنَّكَ كُنْتَ غَفَّاراً فَأَرْسلِ السَّمَاءَ عَلَيْنَا مدْراراً﴾رواه الإمام الشافعي فيالأم.

ئینجا بزانە: ووتارخوێن لە خوتبەییەكەمداو لە سەرەتای خوتبەیدووەمدا ڕوو لە خەڵكەكە دەكا، ئینجا (وَيَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ) سوننەتە: ڕوو لە قیبلە بكاو پشت لە خەڵكەكە بكا (بَعْدَ صَدْرِ الْخُطْبَةِالثَّانِيَةِ) پاش دەست پێكردنی خوتبەیدووەم، واتە: كە سێیەكەكی

وَيُبَالِغُ فِي الدُّعَاءِ سِرّاً وَجَهْراً، وَيُحَوِّلُ رِدَاءَهُ عِنْدَاسْتِقْبَالِه فَيَجْعَلُ يَمِينَهُ يَسَارَهُ وَعَكْسَهُ، وَيَنْكُسُهُ عَلَى الْجَدِيدِ فَيَجْعَلُ أَعْلاَهُ أَسْفَلَهُ وَعَكْسَهُ، وَيُحَوِّلُ النَّاسُ مِثْلَهُ، قُلْتُ: وَيُتْرَكُ مُحَوَّلاً حَتَّى يَنْزِعَ الثِّيَابَ،

---

خوتبەیدووەمی خوێندەوە (وَيُبَالِغُ فِي الدُّعَاءِ) لەو حاڵەتەدا ووتارخوێنەکە زۆر دوعا دەکا (سِرّاً) بە نهێنیو (وَجَهْراً) بە ئاشکرایی، هەروەها خەڵکەکەش لە کاتی نهێنیدا بە نهێنی دوعا دەکەن، بەڵام لە کاتی ئاشکراییدا دەڵێن: (آمين).

هەروەها ووتارخوێنەکەو خەڵکەکەش لە کاتیدوعاکردندا دەستیان بەرز دەکەنەوە، بەڵام لێرەدا پشتە دەستەکانیان دەخەنە لای ئاسمان ﴿عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِسْتَسْقَى فَأَشَارَ بِظَهْرِ كَفَّيْهِ إِلَى السَّمَاءِ﴾رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ دوعای بارانی کردو بە پشتە دەستەکانی ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد. ئینجا کە دوعایەکانی تەواو کردن، ڕوو لە خەڵکەکە دەکاتەوەو ئامۆژگاریان دەکا: بە خوا پەرستیو سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێدەداو، دوعا بۆ ئیمانداران دەکاو ئایەتێك یان دوو ئایەت دەخوێنێتەوەو کۆتایی خوتبەکەی بە (أَسْتَغْفِرُ اللهَ لِي وَلَكُمْ) دێنێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

هەروەها (وَيُحَوِّلُ رِدَاءَهُ) ووتارخوێنەکە پەشتەماڵەکەیخۆی-واتە: پارچە جلەکەی سەر بەرگەکەی- وەردەگێڕێ (عِنْدَ اسْتِقْبَالِهِ) لەو کاتەی ڕوو لە قیبلە دەکا (فَيَجْعَلُ يَمِينَهُ يَسَارَهُ) لای ڕاستەی جلەکە دەباتە لای چەپەی (وَعَكْسَهُ) بە پێچەوانەش، هەروەها (وَيَنْكُسُهُ) سەراو ژێریشی دەکا، ئەگەر بگونجێ (عَلَى الْجَدِيدِ) لە سەر فەرموودەی نوێ، واتە: (فَيَجْعَلُ أَعْلاَهُ أَسْفَلَهُ) لای سەرەوەی دەباتە لای بنەوەی (وَعَكْسَهُ) بە پێچەوانەش.

(وَيُحَوِّلُ النَّاسُ مِثْلَهُ) خەڵکەکەش واتە: تەنها نێرینەکان وەکو ووتارخوێنەکە بە دانیشتوویی جلەکانیخۆیان وەردەگێڕن ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ زَيْدٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ إِسْتَسْقَى وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ وَقَلَّبَهُ ظَهْراً لِبَطْنٍ وَحَوَّلَ النَّاسُ مَعَهُ﴾حديث صحيح رواه الإمام احمد وغيره، پێغەمبەرﷺ دوعای بارانی کردو پەشتەماڵەکەی وەرگێڕاو بەرو پشتی کرد، خەڵکەکەش لەگەڵ ئەوی جلەکانیان بەروپشت کردن. ئینجا بزانە: نابێ ئافرەت بەرگەکەی وەرگێڕێ، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (وَيُتْرَكُ مُحَوَّلاً) جلەکەی ئیمامو خەڵکەکە بە وەرگێڕدراوی دەهێشترێتەوە (حَتَّى يَنْزِعَ الثِّيَابَ) تا هەر یەکەو جلو بەرگی خۆی دادەکەنێ: جا لە ماڵەوە، یان لە شوێنێکیتر، چونکە لە هیچ حەدیسێکدا نەهاتوە: پێغەمبەرﷺ پێش داکەندن دەستکاری جلە وەرگەڕاوەکەی کردبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَوْ تَرَكَ الإِمَامُ الإِسْتِسْقَاءَ فَعَلَهُ النَّاسُ، وَلَوْ خَطَبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ جَازَ، وَيُسَنُّ أَنْ يَبْرُزَ لأَوَّلِ مَطَرِ السَّنَةِ، وَيَكْشِفَ غَيْرَ عَوْرَتِهِ لِيُصِيبَهُ، وَأَنْ يَغْتَسِلَ أَوْ يَتَوَضَّأَ فِي السَّيْلِ،

---

(وَلَوْ تَرَكَ الإِمَامُ الإِسْتِسْقَاءَ) ئەگەر پێشەوای موسڵمانان نوێژی بارانی نەکردو جێگریشی بۆ نوێژکردن دانەنا، یان هەر پێشەواو جێگری لەو شوێنەدا نەبون (فَعَلَهُ النَّاسُ) سوننەتە: خەڵکەکە سەربەخۆ نوێژی باران بکەن، واتە: زاناو پیاوماقوڵانی شوێنەکە، یەکێك دیاری ئەکەن بۆ ئەم کارە، هەروەك بۆ جەژنو ڕۆژ گیرانو جومعەش وادەکەن، هەروەك لە (المجموع)و (شرح العباب)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ خَطَبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ) ئەگەر ئیمامی نوێژی باران لە پێش نوێژەکەدا خوتبەی خوێندەوە (جَازَ) دروستەو بە بەر دەکەوێ، چونکە لە حەدیسی (صحیح)دا ئەوەش هاتوە، بەڵام خوتبەکە بخرێتە دوای نوێژ خێری زیاترە، چونکە پێغەمبەرﷺ زۆرتر وای‌کردوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: پاڕانەوەی‌ناودان لە خوای‌گەورە سێ جۆرە، یەکەم: لای کەمترەکەی بە دوعاکردنی تەنهاتەنهاو کۆمەڵ کۆمەڵ بە بێ‌نوێژکردن. دووەم: ناوەنجیەکەی بە دوعاکردن لە دوای نوێژەکان‌و لە خوتبەکانی جومعەو شوێنە گشتیەکان ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: دَعَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَمُطِرُوا مِنْ جُمُعَةٍ إِلَى جُمُعَةٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە خوتبەی جومعەدا دوعای بارانی کرد، جا لەم جومعەیە تا جومعەکەی‌تر باران باری. سێیەم: تەواو و خێرترەکەی بەو جۆرە نوێژکردنەو خوتبەی باسمان کرد، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا بزانە: لەو سێ جۆرانەدا گشت کەسێك یەکسانە، واتە: نوێژکردنەکە بۆ مرۆڤی بە تەنهاش سوننەتە، بەڵام بە بێ‌خوتبە خوێندنەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيُسَنُّ) بۆ گشت کەسێك سوننەتە: (أَنْ يَبْرُزَ) خۆی وەدەر بێخێ (لأَوَّلِ مَطَرِ السَّنَةِ) بۆ یەکەم بارانی ساڵ (وَيَكْشِفَ) بەشێکی لاشەی خۆی ڕووت بکاتەوە (غَيْرَ عَوْرَتِهِ) جگە لە عەورەتی خۆی (لِيُصِيبَهُ) تاکو بارانی وێبکەوێ‌و بەرەکەتی پێ‌بگا ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَصَابَنَا مَطَرٌ فَحَسَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ثَوْبَهُ حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ، فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى﴾ رواه مسلم، باران باری‌و پێغەمبەرﷺ جلەکەی لە خۆ لادا، تا هەندێك بارانی بە لاشە پیرۆزەکەی کەوت، گوتمان: ئەی پێغەمبەری‌خوا بۆ وات کرد؟ فەرمووی: چونکە بارانەکە نوێیەو تازە خوای‌گەورە ناردوویەتی. واتە: بەرەکەتی لێوەردەگرم (وَأَنْ يَغْتَسِلَ) سوننەتە خۆی بشوا (أَوْ يَتَوَضَّأَ) یان دەستنوێژ بگرێ (فِي السَّيْلِ) لە ئاوەڕۆکانی‌باران، چونکە حەدیسێکی بێ‌هێزی دەرهەق هاتوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَيُسَبِّحَ عِنْدَ الرَّعْدِ وَالْبَرْقِ، وَلاَ يُتْبِعَ بَصَرَهُ الْبَرْقَ، وَيَقُولَ عِنْدَالْمَطَرِ: (اَللَّهُمَّ صَيِّباً نَافِعاً). وَيَدْعُو بِمَا شَاءَ، وَبَعْدَهُ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ. وَيُكْرَهُ مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا، وَسَبُّ الرِّيحِ، وَلَوْ تَضَرَّرُوا بِكَثْرَةِ الْمَطَرِ فَالسُّنَّةُ أَنْ يَسْأَلُوا اللهَ تَعَالَى رَفْعَهُ: اَللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا. وَلاَ يُصَلَّى لِذَلِكَ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(وَيُسَبِّحَ) سوننەتە: گشت كەسێك تەسبیحات بكا (عِنْدَالرَّعْدِ) كاتێ گوێی لە دەنگی هەور دەبێ، وەك (عبدالله بن الزبیرﷺ) دەیفەرموو: (سُبْحَانَ مَنْ يُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلاَئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ) رواه مالك بإسناد صحيح.

(وَالْبَرْقِ) هەروەها سوننەتە: لە كاتی بروسكیش تەسبیحات بكا، بە (قیاس) لە سەر هەور، كەواتە: دەڵێ: (سُبْحَانَ مَنْ يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً). هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە (وَلاَ يُتْبِعَ بَصَرَهُ الْبَرْقَ) سوننەتە: چاوی خۆی بە دوای بروسكدا نەگێڕێ، چونكە (السلف الصالح) پێیان ناخۆش بوو: ئاماژە بۆ بروسكو هەور بكەن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَقُولَ عِنْدَ الْمَطَرِ) سوننەتە لە كاتی باران باریندا سێ جار بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ صَيِّباً نَافِعاً﴾ رواه البخاري، خوایە بیكەیە بارانێكی سوود بەخش. (وَيَدْعُوَ بِمَا شَاءَ) هەروەها سوننەتە: چ دوعایەك حەز دەكا بیكا، چونكە لە حەدیسێكی بێهێزدا هاتوە: ﴿لە كاتی باران باریندا دوعا قبول دەبێ﴾.

هەروەها (وَبَعْدَهُ) لە دوای باران بارین بڵێ: (مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ) بارانمان بۆ باری بە گەورەییخواو بە ڕەحمەتیخوا (وَيُكْرَهُ) ناپەسندە بڵێ: (مُطِرْنَا بِنَوْءِ كَذَا) بارانمان بۆ باری بە كاتو نیشانەی فلانە ئەستێرە، جا ئەگەر باوەڕی وابێ: ئەستێرە باران دەبارێنێ، ئەوە كافر دەبێ، هەروەك لە حەدیسی (صحیح)دا هاتوەو، لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە (وَسَبُّ الرِّيحِ) ناپەسندە جنێو بە با بدا، هەروەك لە پاشكۆی نوێژی ڕۆژگیراندا بەڵگەمان بۆ هێناوە.

(وَلَوْ تَضَرَّرُوا) ئەگەر تووشی زەرەرو زیان بون (بِكَثْرَةِ الْمَطَرِ) بە هۆی زۆر بارین (فَالسُّنَّةُ أَنْ يَسْأَلُوا اللهَ تَعَالَى رَفْعَهُ) سوننەتە لە خوا بپاڕێنەوە: بارانەكە لا ببا، بەم دوعایانە: (اَللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا) خوایە بارانەكە ببە دەورەی ئێمە: لە دەشتو بەن، مەیهێنە سەر ئێمە لە ئاوەدانیو خانووبەرە ﴿اَللَّهُمَّ عَلَى الآكَامِ وَالظِّرَابِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ﴾ رواه الشیخان، خوایە لە سەر تەپۆلكەو چیاو دۆڵاییو لێڕستان بارانەكە ببارێنە.

(وَلاَ يُصَلَّى لِذَلِكَ) بۆ لابردنیباران نابێ نوێژ بكرێ، چونكە لە هیچ حەدیسێكدا –جگە لە دوعایڕابردوو– نەهاتوە (وَاللهُ أَعْلَمُ).

................................................................

﴿ پاشكۆ: دەربارەی پاڕانەوە لە خوا بە خاتری پێغەمبەرﷺو پیاو چاكان ﴾

١- لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە: سوننەتە لە دوعایەكانی نوێژی باراندا (توسُّل) بكا، واتە: لە خوای گەورە بپاڕێتەوە، بە خاتری كردەوە چاكەكانی خۆی، هەروەك ﴿سێ كەسەكەی دەرگای ئەشكەوتەكەیان لێگیرا، بە كردەوە چاكەكانیان لە خوا پاڕانەوە﴾، كە لە (بخاري ومسلم)دا گێڕدراوەتەوە.

هەروەها سوننەتە بە خاتری پیاوچاكانیش لە خوا بپاڕێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر پیاوچاكەكە لە خزمەكانی پێغەمبەرﷺ بێ، هەروەك ئیمامی(عمر) لە دوعای باراندا، بە خاتری ئیمامی(عبّاس)ی مامیپێغەمبەرﷺ لە خوا دەپاڕاوەو دەیفەرموو: ﴿اَللّهُمَّ إنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إلَيْكَ بِنَبِيِّناﷺ فَتَسْقِينَا، وَإنَّا نَتَوَسَّلُ إلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا، قَالَ-أيْ أَنَس-: فَيُسْقَوْنَ﴾ رواه البخاري، خوایە ئێمە لەمەو پێش بە خاتری پێغەمبەرمانﷺ لێت دەپاڕاینەوەو بارانت بۆ دەباراندین، ئێستاش بە خاتری مامی پێغەمبەرمانﷺ لێت دەپاڕێینەوە: بارانمان بۆ ببارێنە. (أنس) دەفەرموێ: ئینجا باران دەباری.

٢- (تَوَسُّل) پاڕانەوە لە خوا بە خاتری كەسێك، تایبەت نیە بە حاڵەتی زیندووەتیی، چونكە لە دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ (تَوَسُّل) بە پێغەمبەرﷺ كراوە، هەروەك لە باسی (جلو بەرگ)دا بەڵگەمان هێناوە، بەڵكو (صحابة) ڕاستەوخۆ لە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ تكای دوعایان لێكردوە ﴿عَنْ مَالِك الدّار: أصَابَ النَّاسَ قَحْطٌ فِي زَمَنِ عُمَرَ﷜ فَجَاءَ رَجُلٌ-وَهُوَ بلاَلُ بن الحَرث الْمُزَني الصَّحَابيُّ﷜-إلَى قَبْرِالنَّبيِّﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله اسْتَسْقِ لأُمَّتِكَ فَإنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا. فَأَتَى الرَّجُلَ فِي الْمَنَامِ فَقَالَ: أَقْرِئْ عُمَرَ مِنّي السَّلاَمَ وَأَخْبِرْهُ أَنَّهُمْ يُسْقَوْنَ، وَقُلْ لَهُ: عَلَيْكَ الْكَيْسَ الْكَيْسَ. فَأَتَى الرَّجُلُ عُمَرَ فَأَخْبَرَهُ فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: يَا رَبِّ مَا آلُوا إلاّ مَاعَجَزْتُ عَنْهُ﴾رواه البيهقي وابن أبيشيبة بإسناد صحيح، وذكرَهُ الحافظ إبن حجر في فتح الباري، والحافظ إبن كثير في البداية والنّهاية، لە سەردەمی ئیمامی(عمر) -واتە: لە(عام الرمادة)دا- قاتیو بێبارانی تووشی خەڵك بوو، (صحابة)یەك-كە ناوی (بلال الْمُزَني) بوو- هاتە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ گوتی: (یا رَسولَ الله) دوعای باران بۆ ئوممەتت بكە، چونكە بە هیلاك چون. ئینجا پێغەمبەرﷺ هاتە خەونی (صحابة)كەو پێی فەرموو: سەلامی من لە (عمر) بكەو پێی ڕابگەیەنە: بارانیان بۆ دەبارێو پێی بڵێ: با زیرەكو هۆشیاربێ با زیرەكو هۆشیاربێ بۆ ئیشو كاری موسڵمانان-واتە: با نوێژیباران بكا- ئینجا (صحابة)كە ڕووداوەكەی بە ئیمامی (عمر) ڕاگەیاند، ئیمامی(عمر)یش دەستی بە گریان كردو فەرمووی: خوایە كەمتەرخەمی ناكەم لە كاروباری موسڵماناندا مەگەر شتێك لە توانامدا نەبێ.

(بابٌ)

إِنْ تَرَكَ الصَّلاَةَ جَاحِداً وُجُوبَهَا كَفَرَ، أَوْ كَسَلاً قُتِلَ حَدّاً،

## ﴿ بابٌ: له باسی نوێژنەکەر ﴾

بزانە: نوێژنەکەر دوو بەشە، یەکەم: (إِنْ تَرَكَ الصَّلاَةَ) ئەگەر مرۆڤی بالغو عاقڵ نوێژی واجبی نەکردو (جَاحِداً وُجُوبَهَا) دانی بە واجببوونی نوێژ نەدەهێنا، واتە: دەیگوت نوێژ واجب نیە (كَفَرَ) بەو دانپێدانەهێنانە کافر دەبێ–بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام– چونکە فەرموودەکانی خواو پێغەمبەریﷺ بە درۆ داناوە، کەوابو: واجبە داوای تۆبەی لێبکرێ، جا ئەگەر تۆبەی کردو شادەی هێناوەو نوێژی کرد، وازی لێدێنین.

بەڵام ئەگەر تۆبەی نەکردو نەبۆوە موسڵمان، ئەو کاتە واجبە: بکوژرێو، نابێ نوێژی (جنازة)ی لە سەر بکرێو نابێ لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێشترێ، ماڵەکەشی نابێتە میرات، بەڵکو دەدرێتە (بيت المال)ی موسڵمانان، هەروەك لە باسی کافربووندا–نَعُوذُ بِاللهِ– ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

ئینجا بزانە: ئەگەر کەسێك نەیدەزانی نوێژ واجبە، بۆیێ دانی پێدا نەدەهێنا: وەك تازە موسڵمان بوبێ، یان لە شوێنێکی دوور لە زانایانی ئایینی پێگەیشتبێ، ئەو جۆرە کەسە بە کافر دانانرێ، چونکە عوزری بە دەستە، کەوابو: لەو واجبانە شارەزا دەکرێ، ئینجا ئەگەر لەمەودوا دانی پێدا نەهێنا ئەو کاتە بە کافر دادەنرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: (أَوْ كَسَلاً) یان بە تەمبەڵی نوێژی نەدەکردو باوەڕیشی هەبو: کە نوێژ واجبە (قُتِلَ) ئەوەش واجبە: بکوژرێ، بەڵام (حَدّاً) بە بڕیاری سزادان دەکوژرێ، نەك بە بڕیاری کافربوون، واتە: چونکە ئەگەر باوەڕی بە نوێژ هەبێ، بە نوێژنەکردن کافر نابێ، بەڵام سزای کوشتنی بۆ داندراوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداًرَّسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَائَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ تَعَالَى﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن، لە لای خوای گەورە فەرمانم پێکراوە: کافرەکان بکوژمو جەنگیان لەگەڵ بکەم تا شادە دێنن: (أَشْهَدُ أَن لاَّ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ)، وە تا پێنج نوێژەکان دەکەنو تا زەکات دەدەن، جا هەر کاتێك شادەیان هێناو نوێژیان کردو زەکاتیان دا، خوێنو ماڵیان لە من دەپارێزن، تەنها بە مافی ئیسلام نەبێ، لێکۆڵینەوەی ناو دڵیشیان لە سەر خوایە لە ڕۆژی قیامەت.

کەواتە: ئەگەر کافرێك شادەی هێناو بووە موسڵمان، بەڵام نوێژی نەکرد، یان زەکاتی نەدا، هەر واجبە بکوژرێ، چونکە مافی ئایینیئیسلامی بەجێ نەهێناوە.

**وَالصَّحِيحُ قَتْلُهُ بِصَلَاةٍ فَقَطْ بِشَرْطِ إِخْرَاجِهَا عَنْ وَقْتِ الضَّرُورَةِ، وَيُسْتَتَابُ ثُمَّ تُضْرَبُ عُنُقُهُ، وَقِيلَ يُنْخَسُ بِحَدِيدَةٍ حَتَّى يُصَلِّيَ أَوْ يَمُوتَ، وَيُغَسَّلُ وَيُصَلَّى عَلَيْهِ**

---

(وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: (قَتْلُهُ) واجبە: نوێژنەکەر بکوژرێ (بِصَلَاةٍ) بە نەکردنی تەنها یەك نوێژ (بِشَرْطِ إِخْرَاجِهَا) بەو مەرجەی نوێژەکە دەربچوێنێ (عَنْ وَقْتِ الضَّرُورَةِ) لە کاتی نوێژکردنی ناچاریدا: کە کاتی(جمع التأخیر)ە:

کەوابو: ئەگەر ڕۆژ ئاوا بوو و نوێژی نیوەڕۆ، یان نوێژی عەسری نەکرد، یان بەیان دەرکەوتو نوێژی مەغریب، یان عیشای نەکرد، یان ڕۆژ هەڵاتو نوێژی سبەینێی نەکرد، ئەو کاتە دەکوژرێ، بەڵام بەم مەرجەش: لە کاتی نوێژەکەدا فەرمانی پێ بکرێو هەڕەشەی کوشتنیشی لێبکرێ؛ ئەویش بە ڕقەکاری نوێژەکە نەکا.

ئینجا بزانە: ئەو فەرمانو هەڕەشە لێکردنە تایبەتە: بە پێشەوای موسوڵمانان، یان کاربەدەستێکی جێگری ئەوی، واتە: فەرمانو هەڕەشەی خەڵکیتر سودی نیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهایة)دا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: ئەگەر لە لای کاربەدەستی موسوڵمانان فەرمانی پێ نەکرا و هەڕەشەی لێنەکرا، دروست نیە بکوژرێ، هەرچەند لە زۆربەی تەمەنیشیدا نوێژی نەکردبێ، هەروەك لە حاشیەکانی (القلیوبي)و (البجیرمي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا کە بڕیاری کوشتنی لە سەر جێگیر بوو، سوننەتە بە پەلە نەکوژرێ، بەڵکو (وَيُسْتَتَابُ) سوننەتە: پێش کوشتنی داوای تۆبەی لێبکرێ، واتە: پێی بڵێن نوێژەکە قەزا بکەوە، ئەگەر نا: دەتکوژین، هەروەك لە (البجیرمي)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

ئینجا ئەگەر تۆبەی کردو نوێژەکەی قەزا کردەوە، ئەوە کوشتنی لە سەر لادەچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ﴾ ئەگەر تۆبەیان کرد: نوێژیان کردو زەکاتیان دا، وازیان لێ بێنن.

(ثُمَّ) ئینجا کە داوای تۆبەی لێکرا، تۆبەی نەکردو نوێژەکەی قەزا نەکردەوەو، هیچ عوزرێکی شەرعیشی نەبو (تُضْرَبُ عُنُقُهُ) بە فەرمانی کاربەدەستی موسوڵمانان بە شمشێر لە ئەستۆی دەدرێو دەکوژرێ. واتە: ئەگەر –لەو حاڵەتەدا– کەسێك بە بێئیزنی کاربەدەستی موسوڵمانان بیکوژێ تاوانبار دەبێ، بەڵام تۆڵەو (کفارة)ی ناکەونە سەر (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُنْخَسُ بِحَدِيدَةٍ) ئاسنێکی تیژەدەژەنێندرێ (حَتَّى يُصَلِّيَ) تا نوێژ دەکا (أَوْ يَمُوتَ) یان تا دەمرێ.

(وَيُغَسَّلُ) ئەو نوێژنەکەرەی بەشێوەم کە مرد، واجبە: بشۆرێو (وَيُصَلَّى عَلَيْهِ) واجبە: نوێژی (جنازة)شی لە سەر بکرێ.

وَيُدْفَنُ مَـــعَ الْــــمُـــسْلِـــمِـــينَ، وَلاَ يُطْـــمَـــسُ قَـــبْرُهُ.

(كِتابُ الْجَنائِزِ)

لِيُكْـثِرْ ذِكْـرَالْـمَـوْتِ وَيَسْتَعِـدَّ بِالـتَّوْبَةِ وَرَدِّالْـمَظَالِمِ، وَالْـمَرِيضُ آكَـدُ،

---

(وَيُدْفَنُ مَعَ الْمُسْلِمِينَ) دروسته: لەگەڵ موسڵمانان-لـه گۆڕستان- بنێشـترێ (وَلاَ يُطْمَسُ قَبْرُهُ) گۆڕەكەشی بێئاسەوار ناكرێ، واتـه: لەگـەڵ زەوی یەكسان نـاكرێ، بـەڵكو وەكو گۆڕی تاوانبارەكانیتر دەهێشترێتەوە.

ئینجا بزانـه: هـەر كەسێك بـه (إجماع) جومعـەی لـه سـەر بـێو بڵـێ: مـن نوێـژی نیـوەڕۆ دەكەمو جومعه ناكەم. یان ڕوكنێكینوێژ نـەكا، یـان مـەرجێكی نوێـژ جێبـەجێ نـەكا، كـه (إجماع)یان له سەر بێ، ئەو كەسەش وەكو نوێژنەكەر ڕەفتـاری لەگـەڵ دەكـرێ، هـەروەك له زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ كِتابُ الْجَنائِزِ: پەڕتووكی مردووەكان ﴾

(لِيُكْثِرْ ذِكْرَالْمَوْتِ) بـا گشت كەسێكی بالغو عـاقڵ زۆر یـادو باسـی مـردن بكـا، جیـاوازی ساغو، نەخۆش نیـه، بـەڵام بـۆ مرۆڤـی نـەخۆش زیـاتر سوننەتە: یـادو باسـی مـردن بكـا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَاذِمِ اللَّـذَّاتِ﴾ رواه الترمذي وغيره بأسانيد صحيحة، زۆر باسی پچڕێنەری خۆشیەكان بكەن: كه مردنه.

(وَيَسْتَعِدَّ) واجبه: گشت گوناهبارێك خۆی بۆ مردن ئامـادە بكـا (بِالتَّوْبَـةِ) بـه تۆبـەكردنێكی بـه پەلـەو (وَرَدِّ الْمَظَـالِمِ) بـه گەڕاندنـەوەی ئـەو سـتەمانەی لـه مـافی خـواو ئـادەمیزادان كردونی، واته: دانەوەی قەرزی خوای گەورە: وەك قەزاكردنـەوەی نوێـژو زەكـاتو ڕۆژوو و حەجو بەجێهێنانی نەزرو كەففارەت، هەروەها به دانەوەی قەرزی ئادەمیزادان.

ئینجـا (وَالْمَـرِيضُ آكَـدُ) مرۆڤـی نـەخۆش زیـاتر داوای جێبـەجێكردنی ئەوانـەیڕابردووی لێدەكرێ، چونكه پێشەكیەكانی مردن بووەته مێوانی.

ئینجا-بۆ نموونه-: ئەگەر نوێژنەكەرێك تۆبەی كردو زۆر نوێژی له سـەر بـونو بـه ماوەیـەكی زۆر قەزا دەكرانەوە، ئەوە با تۆبه بكاو بڕیار بدا گشتیان قەزا بكاتـەوەو هـەر لـه ئێسـتاوەش دەست به قەزاكردنەوەیان بكا، جا ئەگەر وێڕانەگەیشت گشـتیان قـەزا بكاتـەوە چـونكه لـەو ماوەیەدا مرد، ئەوە بـه گوناهبـاری نـامرێ، هـەروەها ئـەو مافـەی ئـادەمیزادان ئەگـەر داوای لێبـوردنی كردبـا فیتنـەی لێڕوودەدا: وەك زینـا كـردن-كـه ئاشـكرا نـەبوبێ- ئـەوەش نابـێ ئاشكرای بكا، بەڵكو له نێوان خـۆیو خـوای گـەورەدا تۆبـه دەكـاو بڕیـار دەدا هیچـیتر ئـەو گوناهه نەكا، جا ئەوەنده بەسه، هەروەك له (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَيُضْجَعُ الْمُحْتَضَرُ لِجَنْبِهِ الأَيْمَنِ إِلَى الْقِبْلَةِ عَلَى الصَّحِيحِ، فَإِنْ تَعَذَّرَ لِضِيقِ مَكَانٍ وَنَحْوِهِ أُلْقِيَ عَلَى قَفَاهُ وَوَجْهُهُ وَأَخْمُصَاهُ لِلْقِبْلَةِ، وَيُلَقَّنُ الشَّهَادَةَ بِلاَ إِلْحَاحٍ،

---

(وَيُضْجَعُ الْمُحْتَضَرُ) سوننەتە: ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە درێژ بکرێ (لِجَنْبِهِ الأَيْمَنِ) لە سەر تەنیشتی ڕاستەی (إِلَى الْقِبْلَةِ) بەرەو قیبلە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، ئینجا ئەگەر نەگونجا، ئەو کاتە لە سەر تەنیشی چەپە بەرەو قیبلە دەکرێ.

(فَإِنْ تَعَذَّرَ) جا ئەگەر لە سەر تەنیشتی چەپەش زەحمەت بوو (لِضِيقِ مَكَانٍ) چونکە شوێنەکە تەنگ بوو (وَنَحْوِهِ) هەروەها لەبەر هۆیەکیتر: وەك تەنیشتەکانی زامدار بێ، ئەو کاتە (أُلْقِيَ عَلَى قَفَاهُ) لە سەر پشت درێژ دەکرێ (وَوَجْهُهُ) دەمو چاو و (وَأَخْمَصَاهُ) بنە پێیەکانی (لِلْقِبْلَةِ) بەرەو قیبلە دەکرێن، واتە: شتێك لە بن پاشە سەری دادەندرێ، تاکو ڕووی بکەوێتە قیبلە ﴿عَنْ أَبِي قَتَادَةَ﴾: أَنَّ البراء بن معرور﴿ أَوْصَى أَنْ يُوَجَّهَ إِلَى الْقِبْلَةِ لَمَّا احْتُضِرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَصَابَ الْفِطْرَةَ﴾رواه البيهقي وصححه الحاكم، (البراء)–کە (صَحابَة) بوو–لە کاتیسەرەمەرگدا وەسیێتی کرد ڕووی لە قیبلە بکەن، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕەوشتێکی پاکی ئیسلامی وەدەست هێناوە.

(وَيُلَقَّنُ الشَّهَادَةَ) سوننەتە: لە حاڵەتی سەرەمەرگدا–پێش ڕوو لە قیبلە کردن– شەهادەی تەنها (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ)ی لە لا بگوترێ، واتە: (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ)ی لەگەڵ نەگوترێو (بِلاَ إِلْحَاحٍ) بەردەوامیش لە لای نەگوترێ، هەروەها فەرمانیشی پێنەکرێو نەگوترێ: بڵێ: (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ). نەوەك لە ڕقو قینەوە بڵێ: نایڵێم. یان قسەیەکیتری ناشیرین بکا، بەڵکو ماوەیەك بێدەنگ دەبێ، ئینجا (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ)ی لە لا دەگوترێتەوە، تاکو گوێی لێبێو بیڵێ.

ئینجا ئەگەر جارێك گوتی: (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ)، هیچیتر بۆی دووبارە ناکرێتەوە، مەگەر لە دوای گوتنەکەی قسەیەکیتر بکا، ئەو کاتە بۆی دووبارە دەکرێتەوە، تاکو ببێتە ئاخیر قسەی لە دونیادا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ﴾ رواه مسلم ﴿مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ رواه ابوداود باسناد حسن، لە لای ئەو نەخۆشانەتان کە نزیکە بمرن، (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ) بڵێن، هەر کەسێك دوا گوتەی لە دونیادا (لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ) بێ، دەچێتە بەهەشت.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو دەربارەی نەخۆشیموسڵمان بوو، چونکە نەخۆشیکافر– ئەگەر چاوەڕوانی ئیسلامبوونی لێدەکرا– واجبە: هەردوو شەهادەی پێبگوترێ، واتە: پێی بگوترێ: بڵێ: (أَشْهَدُ أَن لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ). تاکو موسڵمان ببێو بە موسڵمانی بمرێ ﴿عَنْ أَنَسٍ﴾: كَانَ غُلاَمٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَرِضَ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ: أَسْلِمْ. فَنظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهُوَ عِنْدَهُ؟ فَقَالَ: أَطِعْ أَبَاالْقَاسِمِ،

فَأَسْلَمَ فَخَرَجَ النَّبِيُّﷺ يَقُولُ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ﴾ رواه البخاري، کوڕێکی جولەکە خزمەتی پێغەمبەریﷺ دەکردو نەخۆش کەوت، جا پێغەمبەرﷺ هاتە سەردانی‌و لە لای سەری دانیشت‌و فەرمووی: ببە موسڵمان. کوڕەکەش تەماشەیەکی باوکی خۆی کرد، باوکەکەشی گوتی: گوێڕایەڵی باوکی قاسم ببە–واتە: بە قسەی‌پێغەمبەرﷺ بکە– ئینجا کوڕەکە موسڵمان بوو و پێغەمبەرﷺ چووە دەرەوەو دەیفەرموو: (اَلْحَمْدُ لِلّهِ) سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئەو کوڕەی لە ئاگر ڕزگار کرد.

(وَيُقْرَأُ عِنْدَهُ يس) سوننەتە: لە حاڵەتی سەرەمەرگدا سورەتی(یاسین)ی لە لا بخوێندرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اِقْرَأُوا عَلَى مَوْتَاكُمْ: يس﴾رواه ابوداود وصححه ابن حبان، سورەتی(یاسین) لە سەر ئەو نەخۆشانەتان بخوێنن کە نزیکە بمرن.

هەروەها سوننەتە: سورەتی (الرَّعْد)ش بخوێندرێ، بەڵام ئاگاداریە: هەرکاتێك نەخۆشەکە گیانی دەرچوو و مرد، دروست نیە: قورئانی لە سەر بخوێندرێ تا دەشۆرێ، چونکە بە هۆی مردن غوسلی واجب بووە، هەروەك لە (شرح الحاوی)دا فەرموویەتی، هەروەها سوننەتە: کەم کەمەش ئاوی بدرێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلْيُحْسِنْ ظَنَّهُ) با نەخۆشەکە دڵو بۆچوونی خۆی جوان بکا (بِرَبِّهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى) دەرهەق خوای خۆی، واتە: دڵو بۆچوونی ئەوها بێ: کە خوای‌گەورە لێی خۆش دەبێ‌و ڕەحمی پێ‌دەکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَمُوتُ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللهِ تَعَالَى﴾ رواه مسلم، هەر یەکێکتان تەنها لەو حاڵەتەدا بمرێ: کە دڵو بۆچوونی‌خۆی جوان بکا دەرهەق خوای گەورە. کەوابو: سوننەتە: ئەوانەی لە لای نەخۆشەکەنە، ئەوانیش دڵخۆشی بکەن‌و تەماعی ڕەحمی‌خوای بخەنە ناو دڵ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا (فَإِذَا مَاتَ) هەر کاتێك یەکێك مرد (غُمِّضَ) چاوەکانی دەچوقێندرێنەوە ﴿عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها: دَخَلَ رَسُولُ اللهِﷺ عَلَى أَبِي‌سَلَمَةَ رضي الله عنه وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ، فَأَغْمَضَهُ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ﴾رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ هاتە لای (أبی‌سلمة) کە مردبو و چاویشی کرابۆوە، جا پێغەمبەرﷺ چاوەکانی بۆ چوقاندەوەو فەرمووی: کاتێ گیان لە لاشە وەردەگیرێ، چاو بە دوای‌دا دەڕوانێ ئایا بۆ کوێ دەڕوا.

ئینجا بزانە: سوننەتە: لە حاڵەتی چوقاندنەوەدا بڵێ: (بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِﷺ). هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَشُدَّ لَحْيَاهُ بِعِصَابَةٍ، وَلُيِّنَتْ مَفَاصِلُهُ، وَسُتِرَ جَمِيعُ بَدَنِهِ بِثَوْبٍ خَفِيفٍ، وَوُضِعَ عَلَى بَطْنِهِ شَيْءٌ ثَقِيلٌ، وَوُضِعَ عَلَى سَرِيرٍ وَنَحْوِهِ، وَنُزِعَتْ ثِيَابُهُ، وَوُجِّهَ لِلْقِبْلَةِ كَالْمُحْتَضَرِ، وَيَتَوَلَّى ذَلِكَ أَرْفَقُ مَحَارِمِهِ، وَيُبَادَرُ بِغُسْلِهِ إِذَا تُيُقِّنَ مَوْتُهُ، وَغُسْلُهُ وَتَكْفِينُهُ وَالصَّلَاةُ عَلَيْهِ وَدَفْنُهُ فُرُوضُ كِفَايَةٍ،

---

(وَشُدَّ لَحْيَاهُ) هەردوو شەویلەکانی مردووەکە دەبەسترێن (بِعِصَابَةٍ) بە پارچە پەڕۆکێکی پانو بە لایسەرەوەیسەری دەبەسترێتەوە، چونکە ئەگەر دەمی کراوە بێ، شتی دەڕواتە ناوەوەی (وَلُيِّنَتْ مَفَاصِلُهُ) جومگەکانی نەرم دەکرێن، واتە: باسکەکانی بەرەو قۆڵەکانی دەبردرێنو دەگەڕێندرێنەوە، قاچەکانیشی بەرەوە ڕانەکانیو دەگەڕێندرێنەوە، تاکو شۆردنی ئاسان ببێ (وَسُتِرَ جَمِيعُ بَدَنِهِ) جا لە دوای بەرگ داکەندنی، گشت لاشەی مردووەکە دادەپۆشرێ (بِثَوْبٍ خَفِيفٍ) بە جلێکی سووك، بەڵام ئەگەر لە ژێر ئیحرامدا مردبێ، نابێ سەری پیاو و ڕووی ئافرەت داپۆشرێ.
(وَوُضِعَ عَلَى بَطْنِهِ شَيْءٌ ثَقِيلٌ) سوننەتە: شتێکی گران لە سەر زگی مردووەکە دابندرێ تاکو فوو نەدرێو هەڵنەئاوسێ، بەڵام نابێ قورئانو کتێبەکانی ئایینیی لە سەر دابندرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَوُضِعَ عَلَى سَرِيرٍ) سوننەتە: لە سەر تەختەیەك دابندرێ (وَنَحْوِهِ) یان شتێکیتری وەك تەختە (وَنُزِعَتْ ثِيَابُهُ) جلەکانی لێدادەکەندرێن، بەڵام شەهید جلەکانی داناکەنێندرێن (وَوُجِّهَ لِلْقِبْلَةِ) ڕوو لە قیبلە دادەندرێ (كَمُحْتَضَرٍ) وەك مرۆڤێکی لە سەرەمەرگدا بێ.
ئینجا بزانە: ئەگەر گونجا لە سەر تەنیشتێکی درێژ بکرێ، ئەوە شتە گرانەکەی بە داوێك، یان بە پەڕۆکێك لە سەر زگی دەبەسترێ، ئەگەر نا: لە سەر پشت بەرەو قیبلە دەکرێو شتە گرانەکەشی لە سەر دادەندرێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە (وَيَتَوَلَّى ذَلِكَ) سوننەتە: ئەو کارانەیڕابردوو بگرێتە ئەستۆ (أَرْفَقُ مَحَارِمِهِ) نەرمترین مەحرەمەکانی مردووەکە، تاکو بەزەیی پێدا بێ، ئینجا پیاو بۆ پیاو، ئافرەت بۆ ئافرەت، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی شۆردنی مردوو ﴾

(وَيُبَادَرُ بِغُسْلِهِ) سوننەتە: پەلە بکرێ بە شۆردنی مردووەکە (إِذَا تُيُقِّنَ مَوْتُهُ) هەر کاتێك مردنەکەی بێگومان بوو، بەڵام ئەگەر مردنەکەی بێگومان نەبو، وەك کتوپڕ مردبێ، یان ترسابێ، یان لە شوێنێکی بەرز کەوتبێ، ئەو کاتە دروست نیە پەلە بکرێ، بەڵکو واجبە: چاوەڕوان بکرێ تا دڵنیایی دەبێ: کە مردوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.
(وَغُسْلُهُ) شۆردنی مردووەکە (وَتَكْفِينُهُ) کفن کردنی (وَالصَّلَاةُ عَلَيْهِ) نوێژ لە سەرکردنی (وَدَفْنُهُ) ناشتنی (فُرُوضُ كِفَايَةٍ) هەر چواریان واجبن بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ)، بە (إجماع)ی

وَأَقَلُّ الْغُسْلِ تَعْمِيمُ بَدَنِه بَعْدَ إِزَالَةِالنَّجَسِ، وَلاَ تَجِبُ نِيَّةُ الْغَاسِلِ فِي‌الأَصَحِّ، فَيَكْفِي غَرَقُهُ أَوْ غُسْلُ كَافِرٍ، قُلْتُ: الصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ: وُجُوبُ غُسْلِ الْغَرِيقِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَالأَكْمَلُ وَضْعُهُ بِمَوْضِعٍ خَالٍ مَسْتُورٍ عَلَى لَوْحٍ، وَيُغَسَّلُ فِي قَمِيصٍ بِمَاءٍ بَارِدٍ،

---

زانایانی ئیسلام: لە سەر گشت کەسێك کە هەواڵی مردنەکەی گەیشتبێتێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَقَلُّ الْغُسْلِ) کەمترینی شۆردنی‌مردوو–کە واجبەکەی پێ پێك بێ– ئەمەیە: (تَعْمِيمُ بَدَنِهِ) بە ئاوێکی پاك گشت لاشەی بگرێتەوە، یەك جار (بَعْدَ إِزَالَةِالنَّجَسِ) لە دوای لادانی پیسی لە لاشەی مردووەکە، ئەگەر پیسی پێوە بێ (وَلاَ تَجِبُ نِيَّةُ الْغَاسِلِ) نیەتهێنانی مردووشۆرەکە واجب نیەو مەرج نیە بۆ دروستبوونی شۆردنەکە (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە مەبەست لەم شۆردنە پاکی‌یە، کەوابو: (فَيَكْفِي غَرَقُهُ) بە فەرموودەی‌بێ‌هێز ئەوەندە بەسە: مردووەکە نقوم ببێتە ناو ئاو (أَوْ غُسْلُ كَافِرٍ) یان کافرێك بیشۆرێ، چونکە مەبەستەکە پێك دێ.

بەڵام (قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ (الصَّحِيحُ الْمَنْصُوصُ) دەقی فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: (وُجُوبُ غُسْلِ الْغَرِيقِ) واجبە: مرۆڤی لە ئاودا خنکاو بشۆرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە شۆردنەکە لە سەر ئێمە واجبە، کەوابو: بە کرداری ئێمەی‌زیندوو نەبێ دروست نابێ، کەواتە: دروستە منداڵی‌فامیدەش مردووەکە بشۆرێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَالأَكْمَلُ) تەواترینی شۆردنی‌مردوو–کە سوننەتەکانیشی ئەنجام بدرێن– ئەمەیە: (وَضْعُهُ بِمَوْضِعٍ خَالٍ) بۆ شۆردن لە شوێنێکی‌چۆڵ دابندرێ، جگە لە مردووشۆرەکەو یارمەتیدەرەکانی، کەسی‌تری لێ‌نەبێ (مَسْتُورٍ) شوێنەکە داپۆشراو بێو خەڵك نەیبینێ، کەوابو: وا باشترە لە ژێر بانێکدا بشۆرێ (عَلَى لَوْحٍ) لە سەر تەختێك، یان تاتەشۆرێك بشۆرێ، تاکو پرۆشکە ئاوەکانی پێ‌نەکەونەوە.

(وَيُغَسَّلُ فِي‌قَمِيصٍ) سوننەتە: لە ناو کراسێکی‌کۆندا بشۆرێ، واتە: دەستەکانی بباتە ژێر کراسەکە، جا ئەگەر کراس دەست نەکەوت، یان نەگونجا تێیدا بشۆرێ، ئەو کاتە واجبە: عەورەتی‌مردووەکە بە جلێکی‌تر داپۆشرێ، چونکە لە مردووشۆرەکەش‌و لە یارمەتیدەرەکەشی حەرامە: تەماشای عەورەتی‌مردووەکە بکەن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی (بِمَاءٍ بَارِدٍ) سوننەتە: بە ئاوێکی سارد مردووەکە بشۆرێ، بەڵام ئەگەر مردووەکە چڵکن بوو، یان زۆر سەرما بوو، ئەو کاتە ئاوەکە نەختێك گەرم دەکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**وَيُجْلِسُهُ الْغَاسِلُ عَلَى الْمُغْتَسَلِ مَائِلاً إِلَى وَرَائِه، وَيَضَعُ يَمِينَهُ عَلَى كَتِفِه، وَإِبْهَامَهُ فِي نُقْرَةِ قَفَاهُ، وَيُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى وَيُمِرُّ يَسَارَهُ عَلَى بَطْنِه إِمْرَاراً بَلِيغاً لِيَخْرُجَ مَا فِيه ثُمَّ يُضْجِعُهُ لِقَفَاهُ وَيَغْسِلُ بِيَسَارِه -وَعَلَيْهَا خِرْقَةٌ- سَوْأَتَيْه ثُمَّ يَلُفُّ أُخْرَى، وَيُدْخِلُ أُصْبُعَهُ فَمَهُ وَيُمِرُّهَا عَلَى أَسْنَانِه، وَيُزِيلُ مَا فِي مَنْخَرَيْهِ مِنْ أَذًى، وَيُوَضِّئُهُ كَالْحَيِّ، ثُمَّ يَغْسِلُ رَأْسَهُ ثُمَّ لِحْيَتَهُ بِسِدْرٍ وَنَحْوِه**

---

(وَيُجْلِسُهُ الْغَاسِلُ) سوننەتە: مردووشۆرەکە مردووەکە دابنیشێنێ (عَلَى الْمُغْتَسَلِ) لە سەر شوێنی مردووشۆردن (مَائِلاً إِلَى وَرَائِه) سوننەتە: لە دانیشتاندنەکەدا نەختێك بەرەو لای پشتەوە خواری بکاتەوەو (وَيَضَعُ يَمِينَهُ عَلَى كَتِفِه) دەستە ڕاستەکەیخۆی لە سەر شانی ڕاستەیمردووەکە دابنێو (وَإِبْهَامَهُ فِي نُقْرَةِ قَفَاهُ) پەنجە گەورەکەشی لە ناو نەوبایی پشت ملی دابنێ، تاکو سەری بە لادا نەچێ (وَيُسْنِدُ ظَهْرَهُ إِلَى رُكْبَتِهِ الْيُمْنَى) پشتی مردووەکەش پاڵ وە ئەژنۆ ڕاستەکەیخۆی بدا.

(وَيُمِرُّ يَسَارَهُ عَلَى بَطْنِه) دەستەچەپەی خۆی بە سەر زگی مردووەکەدا بێنێ (إِمْرَاراً بَلِيغاً) بە پێداهێنانێکی زۆر (لِيَخْرُجَ مَا فِيه) تاکو ئەو پیسیەی لە زگیدایە بێتە دەرەوە، نەوەك لە دوای شۆردن بێتە دەرەوە، ئینجا لەو حاڵەتەشدا یارمەتیدەرەکە ئاوێکی زۆر بە سەر پیسیەکە دادەکا، تاکو زوو لابچێو بۆنی نەیێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(ثُمَّ يُضْجِعُهُ لِقَفَاهُ) ئینجا لە دوای دەست پێداهێنانەکە، مردووەکە لە سەر پشت درێژ دەکا، بەڵام لای سەری بەرزتر بێ (وَيَغْسِلُ بِيَسَارِه) ئینجا بە دەستەچەپەیخۆی تارەتی مردووەکە دەکا (وَعَلَيْهَا خِرْقَةٌ) لەو حاڵەتەدا واجبە: دەستەکەی لە ناو پەڕۆکێك، یان دەستەوانەیەك دابنێ (سَوْأَتَيْه) هەردوو عەورەتەکانی مردووەکە دەشوا، واتە: پێشەوەو پشتەوەیو دەوروبەرەکەیان چونکە حەرامە: بە دەستی ڕووت دەست لە عەورەتی مردووەکە بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا ئەو پارچە پەڕۆکە دادەنێو دەستەکانی خۆی پاك دەکاتەوە (ثُمَّ يَلُفُّ أُخْرَى) ئینجا پارچە پەڕۆکێکیتر، یان دەستەوانەیەك لە دەستی دەکا (وَيُدْخِلُ أُصْبُعَهُ فَمَهُ) پەنجەی شادەی دەستە چەپی خۆی دەنێتە ناو دەمی مردووەکە (وَيُمِرُّهَا عَلَى أَسْنَانِه) بە سەر ددانەکانیدا دێنێو بە ئاو بۆی پاك دەکاتەوە.

(وَيُزِيلُ مَا فِي مَنْخَرَيْهِ مِنْ أَذًى) بە پەنجەی بچکۆڵەشی چڵمو چڵکنی ناو لووتی لادەبا (وَ) هەروەها کە ئەوانەیڕابردووی تەواو کردن (يُوَضِّئُهُ) سوننەتە: دەستنوێژێکیتەواو بۆ مردووەکە بگرێ (كَالْحَيِّ) وەکو دەستنوێژی مرۆڤی زیندوو: لە واجبو سوننەتەکاندا.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای دەستنوێژ (يَغْسِلُ رَأْسَهُ) سەری مردووەکە دەشوا (ثُمَّ لِحْيَتَهُ) ئینجا ڕیشی مردووەکە دەشوا (بِسِدْرٍ) بە سیدر (وَنَحْوِه) یان شتێکی وەك سیدر کەف بکا: وەکو

وَيُسَرِّحُهُمَا بِمِشْطٍ وَاسِعِ الأَسْنَانِ بِرِفْقٍ، وَيَرُدُّ الْمُنْتَتَفَ إِلَيْه، وَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ ثُمَّ الأَيْسَرَ ثُمَّ يُحَرِّفُهُ إِلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ فَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ مِمَّا يَلِي الْقَفَا وَالظَّهْرَ إِلَى الْقَدَمِ ثُمَّ يُحَرِّفُهُ إِلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ فَيَغْسِلُ الأَيْسَرَ كَذَلِكَ فَهَذِهِ غَسْلَةٌ، وَيُسْتَحَبُّ ثَانِيَةٌ وَثَالِثَةٌ، وَأَنْ يُسْتَعَانَ فِي الأُولَى بِسِدْرٍ أَوْ خِطْمِيٍّ ثُمَّ يُصَبُّ مَاءٌ قَرَاحٌ مِنْ فَرْقِهِ إِلَى قَدَمِهِ بَعْدَ زَوَالِ السِّدْرِ،

---

سابوون (وَيُسَرِّحُهُمَا) سەرو ڕیشی مردووەکە شانە دەکا (بِمِشْطٍ وَاسِعِ الأَسْنَانِ) بە شانەیەکی ددان بەرین (بِرِفْقٍ) بە نەرمیو لە سەرخۆ (وَيَرُدُّ الْمُنْتَتَفَ إِلَيْهِ) ئەو مووانەی هەڵکەندراون دەگەڕێندرێنەوە لای مردووەکەو لە ناو کفنەکەی دادەندرێ، واتە: فڕێ نادرێن.

ئینجا بزانە: لە سەر مردووشۆرەکە واجبە نیەتی دەستنوێژی سوننەت بۆ مردووەکە بێنێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

ئینجا کە ئەوانەیڕابردوو گشتی تەواو بون (وَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ) لای ڕاستەی مردووەکە دەشوا، لە پێشەوەڕا: لە ئەستۆی تا پێی ( ثُمَّ الأَيْسَرَ) ئینجا لای چەپەی دەشوا، لە پێشەوەڕا: لە ئەستۆی تا پێی (ثُمَّ يُحَرِّفُهُ) ئینجا مردووەکە وەردەگێڕێ (إِلَى شِقِّهِ الأَيْسَرِ) بۆ سەر تەنیشی چەپەی (فَيَغْسِلُ شِقَّهُ الأَيْمَنَ) تەنیشی ڕاستەی مردووەکە دەشوا لە پشتەوەڕا، واتە: (مِمَّا يَلِي الْقَفَا وَالظَّهْرَ) لای پشت ملو پشتی (إِلَى الْقَدَمِ) تا دەگاتە پێی مردووەکە (ثُمَّ يُحَرِّفُهُ إِلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ) ئینجا مردووەکە وەردەگێڕیتە سەر تەنیشتی ڕاستەی (فَيَغْسِلُ الأَيْسَرَ) لای چەپەی دەشوا (كَذَلِكَ) لە پشتەوەڕا: لە پشت ملی تا پێی، ئینجا بزانە: حەڕامە مردوو لە سەر زگ –واتە: لای دەمو چاو– درێژ بکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَهَذِهِ) ئەو شۆردنانەی دوای شۆردنی سەرو ڕیشی تا ئێرە (غَسْلَةٌ) تەنها بە یەك شۆردن دەژمێردرێو واجبەکەشی پێ تەواو دەبێ.

بەڵام (وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە (ثَانِيَةٌ وَثَالِثَةٌ) شۆردنێکیتری دووەمو سێیەم، بەو شێوەی باسمان کرد، جا ئەگەر بە سێ جار پاك نەبۆوە، واجبە: زیاتر بشۆرێ، سوننەتە شۆردنەکانیش تاك بن (وَأَنْ يُسْتَعَانَ فِي الأُولَى) سوننەتە لەو سێ جارانەدا لە شۆردنەکەییەکەمیاندا یارمەتی ئاوەکە بدرێ (بِسِدْرٍ أَوْ خِطْمِيٍّ) بە یەکێك لەو دووانە، واتە: یان بە شتێکیتر، کە کەفی هەبێو چڵك لا ببا: وەکو سابوونو تایت.

(ثُمَّ) ئینجا لە هەر جارێك لەو سێ شۆردنانە (يُصَبُّ مَاءٌ قَرَاحٌ) ئاوێکی پاکی بێگەرد بە سەر مردووەکەدا دەکرێ (مِنْ فَرْقِهِ) لە تۆقی سەریەوە (إِلَى قَدَمِهِ) تا پێی مردووەکە (بَعْدَ زَوَالِ السِّدْرِ) پاش لابردنی سیدر، یان کەفەکەی سابوون بە ئاو، واتە: لابردنی کەفەکە بە

وَأَنْ يَجْعَلَ فِي كُلِّ غَسْلَةٍ قَلِيلَ كَافُورٍ، وَلَوْ خَرَجَ بَعْدَهُ نَجَسٌ وَجَبَ إِزَالَتُهُ فَقَطْ، وَقِيلَ مَعَ الْغُسْلِ إِنْ خَرَجَ مِنَ الْفَرْجِ، وَقِيلَ الْوُضُوءِ،

---

شۆردن ناژمێردرێو به بەر واجب ناکەوێ، چونکە بە هۆی کەفەکە ئاوەکە گۆڕاوەو لە کار کەوتوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ يَجْعَلَ فِي كُلِّ غَسْلَةٍ) سوننەتە: لە گشت جارێکی شۆردنەکەدا لە ناو ئاوە بێگەردەکە بکا (قَلِيلَ كَافُورٍ) کەمێکی کافوور، کە ئاوەکە نەگۆڕێو لە کاری نێخێ، تاکو لاشەی مردووەکە توند بکاو بە هۆی بۆنەکەشی مێشو مەگەز لێی دوور کەوێتەوە، ئینجا بەڵگەی ئەو شێوەیەیڕابردوو، ئەم حەدیسە:

﴿عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَرَضِيَ اللهُ عَنها: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ: إِبْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا﴾ وفي رواية: ﴿إِغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَاجْعَلْنَ فِي الْآخِرَةِ كَافُورًا، فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ، فَضَفَرْنَا شَعَرَهَا ثَلَاثَةَ قُرُونٍ وَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ دەربارەی شۆردنی (زینب)ی کیژی، فەرمووی: لە شۆردندا دەست بە لای ڕاستەکانی بکەنو دەست بە شوێنەکانی دەستنوێژ بکەن، سێ جار، یان پێنج، یان زۆرتر بە ئاو و بە سیدر بیشۆن، لە شۆردنی کۆتایشدا نەختێك کافوور تێکەڵی ئاوەکە بکەن. (أم عطية) دەفەرموێ: کە شۆردنەکەمان تەواو کرد، پێغەمبەرمانﷺ ئاگادار کرد، ئەویش پەشتەماڵە پیرۆزەکەیخۆی دایە دەستمانو فەرمووی: لە بن کفنەکەدا لێی وەرپێچن–واتە: تاکو بەرەکەتی پێبگا– ئینجا مووەکانی سەریشی–پاش شانەکردن– بۆمان کردنە سێ پەلکە–کەزیو بە لای پشتەوەی سەریدا بۆمان شۆڕ کردنەوە.

ئینجا سوننەتە لە دوای شۆردن: دووبارە جومگەکانی نەرم بکرێنەوەو زۆر باش ووشك بکرێتەوە، تاکو کفنەکەی تەڕ نەبێ.

(وَلَوْ خَرَجَ بَعْدَهُ نَجَسٌ) جا ئەگەر لە دوای تەواوبوونی شۆردن، مردووەکە پیسیەکی لێهاتە دەرەوە (وَجَبَ إِزَالَتُهُ فَقَطْ) واجبە: تەنها پیسیەکە بشۆرێو هیچیتر واجب نیە (وَقِيلَ مَعَ الْغُسْلِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا شۆردنی پیسیەکەو شۆردنەوەی مردووەکەش واجبە (إِنْ خَرَجَ مِنَ الْفَرْجِ) ئەگەر پیسیەکە لە کونی پێشەوە، یان لە پشتەوە هاتبێتە دەرەوە (وَقِيلَ الْوُضُوءِ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: شۆردنی پیسەکەو دەستنوێژ گرتنەوەی مردووەکە واجبە.

ئینجا بزانە: ئەگەر مردووەکە کفن کرابێو پیسیەکەی لێهاتە دەرەوە، ئەو کاتە ئەو شوێنەی پیس بووە لە لاشەیو لە کفنەکەی، واجبە: هەردووکی بشۆرێن، هەرچەند لە دوای نوێژ لە سەرکردنیش بێ، هەروەك لە (تحفة)و(الشرواني)دا فەرموویانە.

وَيُغَسِّلَ الرَّجُلَ الرَّجُلُ وَالْمَرْأَةَ الْمَرْأَةُ، وَيُغَسِّلُ أَمَتَهُ وَزَوْجَتَهُ وَهِيَ زَوْجَهَا، وَيَلُفَّانِ خِرْقَةً وَلاَ مَسَّ، فَإِنْ لَمْ يَحْضُرِ إِلاَّ أَجْنَبِيٌّ أَوْ أَجْنَبِيَّةٌ يُمِّمَ فِي الأَصَحِّ،

---

هەروەها بزانە: بە هیچ هۆیەك دەستنوێژی مردوو ناشكێ، هەروەها بە هاتنە دەرەوەی (منی)ی مردووەكە، یان بە جیماع لەگەڵكردنی، مردووەكە نابێتە جەنابەتدارو غوسلی لە سەر واجب نابێ، چونكە دواكاری شەرعیی لە سەر نەماوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی مردووشۆر ﴾

(وَيُغَسِّلُ الرَّجُلَ الرَّجُلُ) لە شەرعدا ئەوها داندراوە: پیاو پیاو دەیشوا (وَالْمَرْأَةَ الْمَرْأَةُ) ئافرەتیش ئافرەت دەیشوا (وَيُغَسِّلُ أَمَتَهُ) دروستە پیاو جاریەكەی خۆی بشوا (وَزَوْجَتَهُ) هەروەها دروستە: مێرد ژنی خۆی بشوا ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: لَوْ مُتِّ قَبْلِي لَغَسَّلْتُكِ﴾ رواه احمد وصححه ابن حبان، پێغەمبەر ﷺ فەرموویە حەزرەتی (عائشة): ئەگەر تۆ پێش من مردی من دەتشۆم.

(وَهِيَ) ژنیش (زَوْجَهَا) دروستە: مێردی خۆی بشوا ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِي مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا غَسَّلَهُ ﷺ إِلاَّ نِسَاؤُهُ﴾ رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، ئەگەر ئەوەی ئێستا دەیزانم لە ڕابردوومدا بمزانیایە، جگە لە ژنەكانی خۆی كەسیتر پێغەمبەری ﷺ نەدەشۆرد. (وَيَلُفَّانِ خِرْقَةً) ژن، یان مێرد-هەر یەكێك كە جەنازەی ئەویتر بشوا- سوننەتە: پارچە پەڕۆكێك، یان دەستەوانەیەك لە دەست بكەن (وَلاَ مَسَّ) بە دەستی ڕووت دەست لە لاشەی یەكتری نەدەن لە كاتی شۆردندا.

(فَإِنْ لَمْ يَحْضُرْ إِلاَّ أَجْنَبِيٌّ) جا ئەگەر بۆ شۆردنی ئافرەت-جگە لە پیاوی بێگانە- كەسیتر نەبو (أَوْ أَجْنَبِيَّةٌ) یان بۆ شۆردنی پیاو-جگە لە ئافرەتی بێگانە- كەسیتر نەبو (يُمِّمَ) مردووەكە تەیەمموم دەكرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام چەند زانایەك لای فەرموودەكەیتریان گرتوە: كە لەو دوو حاڵەتانەداو هەم ئەگەر مردووەكە نێرامۆك بێ، واجبە مردووەكە لە ناو بەرگیخۆیدا بشۆرێ: بە نقومكردنە ناو ئاو، یان بە ئاو پێداكردن بە شێوەیەكی وەها: ئاوەكە بگاتە گشت لاشەی، بەڵام واجبە: مردووشۆرەكە پەڕۆكێك، یان دەستەوانەیەك لە دەستی بكاو بێپێویستی تەماشای مردووەكە نەكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: غَسَّلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ وَعَلَيْهِ قَمِيصُهُ يَصُبُّونَ الْمَاءَ فَوْقَ الْقَمِيصِ وَيَدْلُكُونَهُ بِالْقَمِيصِ﴾ رواه ابوداود بسند صحيح، كە پێغەمبەریان ﷺ شۆرد، كراسەكەی دەبەردابو، ئاویان بە سەر كراسەكەیدا دەكردو بە كراسەكەی هەڵیاندەگوشی.

وَأَوْلَى الرِّجَال به أَوْلاهُمْ بالصَّلاَة، وَبِهَا قَرَابَاتُهَا، وَيُقَدَّمْنَ عَلَى زَوْجٍ فِي الأَصَحِّ، وَأَوْلاَهُنَّ ذَاتُ مَحْرَمِيَّة، ثُمَّ الأَجْنَبِيَّةُ، ثُمَّ رِجَالُ الْقَرابَة كَتَرْتِيب صَلاَتِهِمْ، قُلْتُ: إلاَّ ابْنَ الْعَمِّ وَنَحْوَهُ فَكَالأَجْنَبِيّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُقَدَّمُ عَلَيْهِمُ الزَّوْجُ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ يُقْرَبُ الْمُحْرِمُ طِيباً،

---

ئینجا بزانە: منداڵیبچکۆڵە: کچ، یان کوڕ -کە شەهوەتی لێهەڵنەستێ- دروستە: ئافرەتو پیاو بیشۆن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَوْلَى الرِّجَالِ بِهِ) لە پێشترینی پیاوەکان بۆ شۆردنی پیاو (أَوْلاَهُمْ بِالصَّلاَةِ) ئەو پیاوەیە: کە بۆ نوێژ لە سەرکردن لە پێشترە، هەروەك لە باسی نوێژی (جنازة)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى (وَبِهَا) لە پێشترینی ئافرەتەکان بۆ شۆردنی ئافرەت (قَرَابَاتُهَا) خزمەکانی خۆیەتی: وەکو کیژو خوشكو دایكو پورو کیژەمامو کیژە خاڵ...هتد (وَيُقَدَّمْنَ عَلَى زَوْجٍ) ئەو ئافرەتانەی خزمی ژنە مردووەکەن -بۆ شۆردن- وەپێش مێردی ئافرەتەکە دێخرێن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَأَوْلاَهُنَّ) لە پێشترینی ئافرەتەکانیخزم بۆ شۆردنی ئافرەتە مردووەکە (ذَاتُ مَحْرَمِيَّةٍ) ئەو ئافرەتەیە: کە مەحرەمی ئافرەتە مردووەکە بێ: وەکو خوشكو دایكو کیژ...هتد، واتە: ئەوانە وەپێش کیژە مامو کیژە خاڵو کیژە پوور دێخرێن (ثُمَّ) ئینجا لە دوای خزمەکان ئەو ئافرەتەی مەحرەمی مردووەکەیە بە هۆی شیرخواردن، ئینجا بە هۆی زاولو خەزورایەتی، ئینجا (الأَجْنَبِيَّةُ) ئافرەتی بێگانە لە پێشترە -بۆ شۆردن- لە خزمە پیاوەکانی مردووەکە.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای ئافرەتی بێگانە (رِجَالُ الْقَرَابَةِ) پیاوە خزمەکانی ئافرەتەکە: وەکو کوڕو باوكو براو مەحرەمەکانیتر (كَتَرْتِيبِ صَلاَتِهِمْ) وەکو ڕیزی نوێژ لە سەرکردن کە لە نوێژی(جنازة)دا باس دەکەین، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (إِلاَّ ابْنَ الْعَمِّ) تەنها کوڕە مام نەبێو (وَنَحْوَهُ) ئەوەی وەکو کوڕە مام تەماشاکردنی حەرامە: وەك خاڵۆزاو پوورزا (فَكَالأَجْنَبِيِّ) ئەوانە وەکو بێگانە مافی شۆردنی ئافرەتە مردووەکەیان نیە (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە نامەحرەمن (وَيُقَدَّمُ عَلَيْهِمُ الزَّوْجُ) مێردی ئافرەتەکە -بۆ شۆردن- وەپێش پیاوە مەحرەمەکان دێخرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو تەماشاکردنەی بۆ مێردەکە دروستە، بۆ مەحرەمەکانیتر دروست نیە.

## ﴿ باسی نینۆكو مووی مردوو ﴾

(وَلاَ يُقْرَبُ الْمُحْرِمُ طِيباً) حەرامە: بۆنی خۆش نزیك ئەو مردووە بێخرێ: کە لە ئیحرامدا مردوە، کەواتە: حەرامە ئاویشۆردنیشی کافووری تێبکرێ، یان بۆنیخۆش بە کفنەکەیدا بکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ يُؤْخَذُ شَعَرُهُ وَظُفْرُهُ، وَتُطَيَّبُ الْمُعْتَدَّةُ فِي الأَصَحِّ، والْجَدِيدُ أَنَّهُ لاَ يُكْرَهُ فِي غَيْرِ الْمُحْرِمِ أَخْذُ ظُفْرِهِ وَشَعَرِ إِبْطِهِ وَعَانَتِهِ وَشَارِبِهِ، قُلْتُ: الأَظْهَرُ كَرَاهَتُهُ وَاللهُ أَعْلَمُ.
(فَصْلٌ) يُكَفَّنُ بِمَا لَهُ لُبْسُهُ حَيّاً،

---

(وَلاَ يُؤْخَذُ شَعَرُهُ وَظُفْرُهُ) حەرامە: موو و نینۆکی ئەو مردووە لا ببردرێن: کە لە ئیحرامدا مردوە، جیاوازی نێر و مێ نیە (وَتُطَيَّبُ الْمُعْتَدَّةُ) دروستە: ئەو ئافرەتەی لە (عِدَّة)دا مردوە، بۆنخۆش بکرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.
(وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێ ئەمەیە: (أَنَّهُ لاَ يُكْرَهُ فِي غَيْرِ الْمُحْرِمِ) ناپەسند نیە: لەو مردووەی لە ئیحرامدا نەمردوە (أَخْذُ ظُفْرِهِ) نینۆکی بکرێنو (وَشَعَرِ إِبْطِهِ وَعَانَتِهِ وَشَارِبِهِ) مووی بن هەنگڵو بەرو سمێڵی لێبکرێنەوە (قُلْتُ) ئیمامی (النووي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (كَرَاهَتُهُ) ناپەسندە: نینۆکو مووی ئەو مردووەش لێبکرێنەوە: کە لە ئیحرامدا نەمردبێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە لە هیچ حەدیسێکدا نەهاتوە.
﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر موسڵمانێك بە سوننەتنەکراوی مرد، دروست نیە: لە دوای مردن سوننەت بکرێ، بەڵام واجبە: گۆی ئەندامەکەو بن چەرمەکەی پاك بکرێتەوەو بە ئاو بشۆرێ، جا ئەگەر نەگونجا گۆیەکەو بن چەرمەکەی بشۆرێن، ئەو کاتە واجبە: لە دوای تەواوبوونی شۆردنیمردووەکە-لە جیاتی نەشۆرانی ئەو ئەندامە- تەیەمومیش بکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.
هەروەها واجبە بن نینۆکەکانی مردووەکە: بە داروچکەیەك پاك بکرێنەوەو چڵکی ناو مووەکانیشی پاك بکرێتەوە، جا ئەگەر چڵکەکە لانەدەچو، ئەو کاتە واجبە مووەکان-واتە: هەم نینۆکەکان- لابدرێن، هەروەك لە (نهاية)و (الشبراملسي)دا ڕوون کراوەتەوە.
ئینجا بزانە: بۆ ئەو نەخۆشەی مەترسی مردنی لێدەکرێ وەها سوننەتە: نینۆكو ئەو مووانە لە خۆی لابدا: کە لابردنیان سوننەتە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ خُبَيْباً اسْتَعَارَ مُوسىً اسْتَحَدَّ بِهَا قَبْلَ قَتْلِهِ﴾ رواه البخاري، حەزرەتی (خُبَيْب) پێش ئەوەی شەهید بکرێ، گوێزانێکی وەرگرتو مووەکانی خۆی پێ تاشین.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی کفن کردنی مردوو ﴾

(يُكَفَّنُ) لە دوای شۆردن، مردووەکە کفن دەکرێ (بِمَا) بەو جۆرە بەرگەی: کە (لَهُ لُبْسُهُ حَيّاً) بۆی دروست بوو: دەبەری بکا لە حاڵەتی زیندووەتیدا، کەواتە: دروستە ئافرەتو منداڵو شێت لە ئاوریشمدا کفن بکرێن، بەڵام دروست نیە: پیاو و نێرامووك لە ئاوریشمدا کفن بکرێن، مەگەر هیچیتر دەست نەکەوێ، ئەو کاتە واجبە، کەواتە: ئەگەر ئاوریشمیش دەست نەکەوت، واجبە: لە ناو پیستەو نایلۆنو ئەو جۆرە شتانەدا مردووەکە کفن بکرێ،

وَأَقَلُّهُ ثَوْبٌ، وَلاَ تُنَفَّذُ وَصِيَّتُهُ بِإِسْقَاطِهِ، وَالأَفْضَلُ لِلرَّجُلِ ثَلاَثَةٌ وَيَجُوزُ رَابِعٌ وَخَامِسٌ، وَلَهَا خَمْسَةٌ،

---

جا ئەگەر ئەو جۆرەش نەبو، واجبە بە پووش‌و گیاو گەڵای دار کفن بکرێ، جا ئەگەر ئەوەش نەبو، واجبە: بە قوڕ کفن بکرێ، واتە: قوڕ لە لاشەی بدرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَقَلُّهُ) لای کەمی کفن: کە واجبەکەی پێ تەواو ببێ (ثَوْبٌ) تەنها پارچە جلێکە: عەورەتی مردووەکە داپۆشێ، بەڵام چەند زانایەکیش ئەو فەرموودەیان بە بەهێز داناوە: کە لای کەمی پارچە جلێکە: گشت لاشەی‌مردووەکە داپۆشێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ خَبَّابٍ ﷺ: قُتِلَ مُصْعَبٌ يَوْمَ أُحُدٍ فَلَمْ نَجِدْ لَهُ مَا نُكَفِّنُهُ بِهِ إِلاَّ بُرْدَةً، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُغَطِّيَ رَأْسَهُ وَأَنْ نَجْعَلَ عَلَى رِجْلَيْهِ مِنَ الإِذْخِرِ﴾رواه الشيخان، حەزرەتی (مُصْعَبٌ) لە غەزای ئوحود شەهید کرا، جگە لە پەشتەماڵەکەی هیچی‌تر نەبو تێیدا کفن بکەین، پەشتەماڵەکەشی بە هەموو لاشەی نەدەگەیشت، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لای سەری پێ داپۆشن‌و بە گیای ئیزخیر پێیەکانیشی داپۆشن.

کەوابو: (وَلاَ تُنَفَّذُ وَصِيَّتُهُ) وەسێتی مردووەکە بەجێ ناهێندرێ: (بِإِسْقَاطِهِ) بە کفن نەکردنی لە پارچە جلەکەدا، چونکە تەنها پارچەکە مافی خوای گەورەیەو بە وەسێتی مردووەکە لانابردرێ.

ئینجا بزانە: لە گشت کفن کردنێکدا مەرجە: کفنەکە ڕەنگی پیستەی‌مردووەکە داپۆشێ‌و ڕەنگەکەی دیار نەبێ—وەك لە نوێژیشدا مەرج بوو— هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

(وَالأَفْضَلُ) گەورەترین‌و خێرترین کفن (لِلرَّجُلِ) بۆ نێرینە: جا پیاو بێ، یان منداڵ بێ (ثَلاَثَةٌ) سێ پارچە جلە: کە هەموو لاشەی داپۆشێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: كُفِّنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَّةٍ بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ کفن کرا لە ناو سێ پارچە جلی یەمەنی سپی‌و پاك: کە لە لۆکە دروست کرابون، نە کراس‌و نە مێزەر لەگەڵ ئەو سێ پارچانەدا نەبو.

کەوابو: (وَيَجُوزُ) دروستە: بەڵام خێر نیە (رَابِعٌ وَخَامِسٌ) بۆ نێرینە پارچەیەکی چوارەم‌و پێنجەم وەگەڵ سێ پارچەکان بێخرێ. (وَلَهَا) گەورەترین‌و خێرترین کفن بۆ ئافرەت: جا گەورە بێ، یان منداڵ بێ (خَمْسَةٌ) پێنج پارچەنە، چونکە ئافرەت زیاتر پێویستی بە داپۆشین هەیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (لَيْلَى)ی‌داهاتوو، إن شاءَ الله تَعَالَى.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەی‌ڕابردوو لە حاڵەتێکدا بوو: کە مردووەکە بە ماڵی خۆی کفن بکرێ‌و قەرزدارێکی وەهاش نەبێ: قەرزەکەی گشت ماڵەکەی دابگرێ، ئەگینا: بەم بڕیارانەی‌داهاتوو ڕەفتار دەکرێ:

وَمَنْ كُفِّنَ مِنْهُمَا بِثَلاثَةٍ فَهِيَ لَفَائِفُ، وَإِنْ كُفِّنَ فِي خَمْسَةٍ زِيدَ قَمِيصٌ وَعِمَامَةٌ تَحْتَهُنَّ، وَإِنْ كُفِّنَتْ فِي خَمْسَةٍ فَإِزَارٌ وَخِمَارٌ وَقَمِيصٌ وَلِفَافَتَانِ،

---

١- ئەگەر مردووەكە هیچی نەبو، ئەو كاتە تەنها یەك پارچە كفن لە سەر ئەو خزمەیە: كە واجبە بەخێوی بكا، جا ئەگەر خزمی نەبو، تەنها پارچەكە لە (بيت المال) دەدرێو زیاتر دروست نیە، جا ئەگەر (بيت المال) نەبو، تەنها پارچەكە لە سەر موسڵمانە دەوڵەمەندەكانە، بەڵام بۆ خزمەكانو بۆ موسڵمانەكان دروستە: بۆی بكەنە سێ پارچە كفنو خێری زیاترە.

٢- ئەگەر مردووەكەماڵی خۆی هەبوو و بەو جۆرەش قەرزدار نەبو، واجبە: لە سێ پارچەدا كفن بكرێ، واتە: لە سێ پارچە كەمتر دروست نیە، هەرچەندە میراتگری شێت، یان یەتیمیشی هەبێ.

٣- ئەگەر مردووەكە ماڵی خۆی هەبوو و بەو جۆرەش قەرزدار نەبو، میراتگری شێتو یەتیمی نەبو، دروستە: لە پێنج پارچەدا كفن بكرێ، بەڵام خێر نیە، جا ئەگەر میراتگری شێت، یان یەتیمی هەبوو، یان بەو جۆرە قەرزدار بوو، ئەو كاتە لە سێ پارچە زیاتر دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ناوەڕۆكی ئەم ئاگاداریە ڕوون كراوەتەوە.

(وَمَنْ كُفِّنَ) هەر مردووێك كفن بكرێ (مِنْهُمَا) لە نێر، یان لە مێ (بِثَلاثَةٍ) بە سێ پارچە (فَهِيَ لَفَائِفُ) ئەوە هەرسێك پارچەكان سێ لەفافی یەكسانن‌و لە مردووەكە وەردەپێچرێن، بە جۆرێكی وەها: لە درێژیو لە بەرینیدا هەر یەكەیان گشت لاشەی مردووەكە دابپۆشێ، بەڵام (وَإِنْ كُفِّنَ فِي خَمْسَةٍ) ئەگەر نێرینە لە پێنج پارچەدا كفن بكرێ (زِيدَ قَمِيصٌ وَعِمَامَةٌ) بۆی زیاد دەكرێ كراسێكو مێزەرێك (تَحْتَهُنَّ) لە ژێر هەرسێك لەفافەكاندا.

ئینجا بزانە: مەبەست بە كراسی مردوو: كراسێكی بێقۆڵە، لە شانیەوە تا پێیەكانی، بە بێتیرێژو بە بێیەخەی سەر سینگی، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە، كەواتە: لەفافێك دووقات دەكرێتەوەو لای سەرەوەی بە قەد سەری مردووەكە كون دەكرێو سەری مردووەكەی تێهەڵدەكێشرێو لایەكی لەفافەكە بە پێشەوەی مردووەكەداو لایەكەیتریشی بە پشتەوەیدا دەهێندرێتە خوارەوە تا پێیەكانی، والله أعلم.

(وَإِنْ كُفِّنَتْ فِي خَمْسَةٍ) ئەگەر ئافرەت لە پێنج پارچەدا كفن بكرێ (فَإِزَارٌ) یەكەمەكەیان: پەشتەماڵێكە: لە نێوان ناوكو ئەژنۆیەكانی (وَخِمَارٌ) سێیەمەكەشیان: لەچكەیەكە سەری پێ دادەپۆشرێ (وَقَمِيصٌ) دووەمەكەشیان: كراسێكە بەو شێوەیەی باسمان كرد (وَلِفَافَتَانِ) چوارەمو پێنجەمەكەش: دوو لەفافە لە سەروەی ئەوانیتر ﴿عَنْ لَيْلَى الثَّقَفِيَّةِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: كُنْتُ فِيمَنْ غَسَّلَ أُمَّ كَلْثُومٍ بِنْتَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عِنْدَ وَفَاتِهَا، فَأَوَّلُ مَا أَعْطَانَا

وَفِي قَوْلٍ ثَلَاثُ لَفَائِفَ وَإِزَارٌ وَخِمَارٌ، وَيُسَنُّ الأَبْيَضُ، وَمَحَلُّهُ أَصْلُ التَرِكَةِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ فَعَلَى مَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ مِنْ قَرِيبٍ وَسَيِّدٍ وَكَذَا الزَّوْجُ فِي الأَصَحِّ،

---

النَّبِيُّ ﷺ اَلْحِقَا ثُمَّ الدِّرْعَ ثُمَّ الْخِمَارَ ثُمَّ الْمِلْحَفَةَ، ثُمَّ أُدْرِجَتْ بَعْدُ فِي الثَّوْبِ الآخَرِ﴾ رواه ابوداود واحمد بسندصالح، (ليلى) دەفەرموێ: کە (أم کلثوم)ی کیژی پێغەمبەرﷺ وەفاتی کرد، لە شۆردنیدا من بەشدار بوم، پێغەمبەرﷺ بۆ کفن کردنی، یەکەم پارچە: پەشتەماڵی نێوان ناوکو ئەژنۆی داینێ، دووەم پارچە: کراس، سێیەم: لەچکە، چوارەم: لەفافێك لە سەرەوەی ئەمانە، پێنجەم: لەفافێکیتری داینێ، ئینجا لە ناو ئەم لەفافە داندراو لێی وەرپێچرا.

(وَفِيقَوْلٍ) لە فەرموودەیەکیتردا (ثَلَاثُ لَفَائِفَ) لەو پێنجانە سێ پارچەیان دەکرێنە لەفاف (وَإِزَارٌ) یەکێکیش پەشتەماڵی نێوان ناوکو ئەژنۆ (وَخِمَارٌ) یەکێکیش لەچکە. بەڵام فەرموودەکەیتر بەهێزترە، چونکە حەدیس پاڵپشتیەتی.

(وَيُسَنُّ الأَبْيَضُ) سوننەتە: جلی سپی بکرێتە کفن، ڕەنگەکانیتریش دروستن، بە بەڵگەی کفنەکەی پێغەمبەرﷺ، هەم پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِلْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ﴾رواه أصحاب السنن بسندصحيح، بەرگی سپی دەبەر بکەن چونکە لە بەرگە باشەکانتانە، هەروەها مردووەکانیشتان لە بەرگی سپیدا کفن بکەن.

(وَمَحَلُّهُ) شوێنی مەسرەفی کفنو ئەرکەکانیتری مردووەکە (أَصْلُ التَّرِكَةِ) بنچینەی ئەو ماڵەیە: کە لە پاش مردووەکە بەجێ ماوە، واتە: پێش هەموو شتێك ئەرکی شۆردنو کفنو نوێژو ناشتن لە ماڵی مردووەکە جێبەجێ دەکرێ (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ) جا ئەگەر مردووەکە ماڵی نەبو (فَعَلَى مَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُ) مەسرەفی ئەو ئەرکانە لە سەر ئەو کەسەیە: کە بەخێوکردنی مردووەکەی لە ئەستۆدا بوو: (مِنْ قَرِيبٍ) لە خزمەکانی: وەك باوكو باپیرەو دایكو کوڕو کچو نەوەو (وَسَيِّدٍ) گەورەی کۆیلە.

(وَكَذَاالزَّوْجُ) هەروەهاش مێردی ژنەکە، واتە: لە سەر مێرد واجبە: مەسرەفی کفنو گشت ئەرکەکانیتری ژنە مردووەکەی بدا، هەرچەند ژنەکەشی دەوڵەمەند بێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا ئەگەر مێردەکەی ماڵی نەبو، ئەو کاتە لە ماڵی ژنە مردووەکە دەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر ژنە مردووەکە ناشیزە بوو، یان مارەبڕاو بوو و تەسلیمی مێردەکەی نەکرابو، یان تەڵاقدراوی(بائن) بوو و ئاوسیش نەبو، لەو حاڵەتانەدا: نە کفنو نە ئەرکەکانیتریشی لە سەر مێردەکە واجب نیە، ئینجا بزانە: هەر مردووێك ماڵی نەبو و

وَيُبْسَطُ أَحْسَنُ اللَّفَائِف وَأَوْسَعُهَا، وَالثَّانِيَةُ فَوْقَهَا، وَكَذَاالثَّالِثَةُ، وَيُذَرُّ عَلَى كُلِّ وَاحِدَةٍ حَنُوطٌ، وَيوضَعُ الْمَيِّتُ فَوْقَهَا مُسْتَلْقِياً وَعَلَيْهِ حَنُوطٌ وَكَافُورٌ، وَيُشَدُّ أَلْيَاهُ وَيُجْعَلُ عَلَى مَنَافِذِ بَدَنِه قُطْنٌ، وَيُلَفُّ عَلَيْهِ اللَّفَائِفُ وَتُشَدُّ، فَإِذَا وُضِعُ فِي قَبْرِه نُزِعَ الشِّدَادُ،

---

خزم، یان مێردیشی نەبو، ئەو کاتە کفنو ئەرکەکانیتر لە (بیت المال) دەدرێ، جا ئەگەر (بیت المال) نەبو، لە سەر موسڵمانانی دەوڵەمەند واجبە: گشت ئەرکەکانی جێبەجێ بکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ چۆنیەتی کفن کردن ﴾

(وَيُبْسَطُ أَحْسَنُ اللَّفَائِفِ وَأَوْسَعُهَا) سوننەتە: یەکەمجار جوانترینو بەرینترینی لەفافەکان ڕابێخسترێ (وَالثَّانِيَةُ فَوْقَهَا) ئینجا لەفافەکەی دووەمیش لە سەر لەفافی یەکەم ڕابێخسترێ (وَكَذَا الثَّالِثَةُ) هەروەها لەفافی سێیەمیش لە سەر لەفافی دووەم ڕابێخسترێ (وَيُذَرُّ عَلَى كُلِّ وَاحِدَةٍ) سوننەتە: بەسەر گشت لەفافێکیش وەربکرێ (حَنُوطٌ) چەند بۆنێکی خۆشی تێکەڵکراو (وَكَافُورٌ) هەم کافوورێکی زۆریشیان بە سەر وەربکرێ، ئینجا مردووەکە بە داپۆشراوی هەڵبگیرێو (وَيُوضَعُ الْمَيِّتُ فَوْقَهَا) مردووەکە لە سەر لەفافەکان دابندرێ، بە هێمنیو لە سەرخۆ (مُسْتَلْقِياً) مردووەکە لە سەر پشتی درێژ دەکرێ (وَعَلَيْهِ حَنُوطٌ وَكَافُورٌ) مردووەکەش بۆنە تێکەڵەکانو کافووری بە سەر لاشەیەوە بێ، تاکو لاشەی بەهێز ببێو مێشو مۆر لێی دوور کەونەوە.

هەروەها دەستەکانیشی: یان –وەکو نوێژ– ڕاستەی لە سەر چەپەی لە سەر سینگ دادەندرێ، یان بە تەنیشتەکانیدا شۆڕ دەکرێنەوە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

ئینجا هەندێك لۆکەی بۆنخۆشکراوی پەڕەکراو لە نێوان لاقینگەکانی دادەندرێو (وَيُشَدُّ أَلْيَاهُ) هەردوو لاقینگەکانی بە پارچە پەڕۆکێك دەبەسترێن (وَيُجْعَلُ عَلَى مَنَافِذِ بَدَنِهِ قُطْنٌ) هەروەها لۆکەی بۆنخۆشکراو لە سەر گشت کونەکانی لەشی دادەندرێ: وەك چاو و گوێو دەمو لووت، هەروەها لە سەر برینە کونبووەکانیشی دادەندرێ.

ئینجا (وَيُلَفُّ عَلَيْهِ اللَّفَائِفُ) هەرسێك لەفافەکانی لێوەردەپێچرێن: بە چەپو ڕاست، واتە: گشت لەفافێك یەکەمجار لای چەپەی لە مردووەکە وەردەپێچرێ، ئینجا لای ڕاستەی، ئینجا (وَتُشَدُّ) لەفافەکان بە چەند پارچە پەڕۆکێك لێی دەبەسترێنەوە.

ئینجا (فَإِذَا وُضِعُ فِي قَبْرِهِ) هەر کاتێك مردووەکە لە ناو گۆڕەکەی داندرا (نُزِعَ الشِّدَادُ) پارچە پەڕۆکەکان –کە کفنەکەیان پێ بەستراوەتەوە– لێدەکرێنەوە، چونکە ناپەسندە: شتی بەستراو لە ناو گۆڕدا بە مردووەکەوە بێ، ئینجا بزانە: سوننەتە درێژیی کفنەکە لە لای سەریەوە زیاتر بێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ يُلْبَسُ الْمُحْرِمُ الذَّكَرُ مُحِيطاً وَلاَ يُستَرُ رَأسُهُ وَلاَ وَجْهُ الْمُحْرِمَة، وَحَمْلُ الْجَنَازَة بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ أَفْضَلُ مَنَ التَّرْبِيعِ فِيالأَصَحِّ، وَهُوَ أَنْ يَضَعَ الْخَشَبَتَيْنِ الْمُقَدَّمَتَيْنِ عَلَى عَاتِقَيْهِ وَرَأْسُهُ بَيْنَهُمَا وَيَحْمِلُ الْمُؤَخَّرَتَيْنِ رَجُلاَنِ، وَالتَّرْبِيعُ أَنْ يَتَقَدَّمَ رَجُلاَنِ وَيَتَأَخَّرَ آخَرَانِ،

## ﴿ كفنى مردووى ژێرئیحرام ﴾

بزانە: ئەوەمان ڕوون کردەوە: کە هەر مردوویێك لە ئیحرامی حەج، یان عومرەدا بمرێ، دروست نیە: نە بە خۆی و نە کفنەکەی و نە ئاوی شۆردنی بۆنخۆش بکرێ و دروست نیە: نینۆك و مووەکانیشی لێبکرێنەوە و جیاوازی نێر و مێ نیە.

هەروەها (وَلاَ يُلْبَسُ الْمُحْرِمُ الذَّكَرُ) دروست نیە دەبەر ئەو مردووە نێرینەیە بکرێ: کە لە ژێر ئیحرامدا مردوە (مُحِيطاً) کفنێکی وەها: کە بە خۆی دەورە لە لاشەی مردووەکە بدا، یان دورواو بێ: وەکو کراس، هەروەها دروست نیە: کفنەکەشی بە گرێدان لێی ببەسترێتەوە، هەروەها (وَلاَ يُستَرُ رَأسُهُ) دروست نیە: سەری ئەو نێرینەیەش داپۆشرێ: کە لە ئیحرامدا مردوە (وَلاَ وَجْهُ الْمُحْرِمَةِ) هەروەها دروست نیە ڕووی ئەو ئافرەتەش داپۆشرێ: کە لە ئیحرامدا مردوە، بەلام دروستە: کفنی دورواوی دەبەر بکرێ و، واجبە: سەری داپۆشرێ ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهمَا: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي الْمُحْرِمِ الَّذِي مَاتَ: اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تُمِسُّوهُ طِيباً وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ﴾ رواه الشيخان، دەربارەی ئەو پیاوەی لە ئیحرامدا مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە ئاو و سیدر بیشۆن و بە هەر دوو پەشتەماڵەکەی ئیحرام کفنی بکەن، بۆنی خۆشی لێمەدەن و سەری دامەپۆشن.

## ﴿ چۆنیەتی هەلگرتنی مردوو ﴾

(وَحَمْلُ الْجَنَازَةِ) هەلگرتنی مردوو لە ناو جەنازەدا (بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ) لە نێوان دوو باسکەداردا (أَفْضَلُ) خێرترە (مَنَ التَّرْبِيعِ) لە هەلگرتنی چوار گۆشەیی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَهُوَ) هەلگرتنی نێوان دوو باسکەدار، بەم جۆرەیە:

(أَنْ يَضَعَ الْخَشَبَتَيْنِ الْمُقَدَّمَتَيْنِ عَلَى عَاتِقَيْهِ) یەك پیاو هەردوو باسکەدارەکانی پێشەوەی دارجەنازە لە سەر هەردوو شانەکانی خۆی دابنێ و (وَرَأْسُهُ بَيْنَهُمَا) سەری خۆی لە نێوان هەردوو باسکەدارەکان دابنێ (وَيَحْمِلُ الْمُؤَخَّرَتَيْنِ رَجُلاَنِ) هەردوو باسکەدارەکەی دواوەش دوو پیاو لە سەر شانی خۆیان هەلیبگرن: یەکێك لە ڕاستە و یەکێك لە چەپە، جا ئەگەر پیاوەکەی پێشەوە توانای نەبو، سوننەتە: دوو پیاوی‌تر یارمەتی‌ی بدەن: یەکێك لە ڕاستە و یەکێك لە چەپە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالتَّرْبِيعُ) هەلگرتنی چوارگۆشەیی ئەمەیە: (أَنْ يَتَقَدَّمَ رَجُلاَنِ) دوو پیاو پێشکەون و لای پێشەوەی دارجەنازەکە لە سەر شانی خۆیان دابنێن و (وَيَتَأَخَّرُ آخَرَانِ) دووی‌تریش بچنە

وَالْمَشْيُ أَمَامَهَا بِقُرْبِهَا أَفْضَلُ، وَيُسْرَعُ بِهَا إِنْ لَمْ يُخَفْ تَغَيُّرُهُ.

دواوەو لای‌دواوەی لە سەر شانی‌خۆیان دابنێن‌و هەڵیبگرن، ئینجا لە هەردوو شێوەدا سوننەتە: سەری‌مردووەکە لە لای پێشەوەی دار جەنازەکە بێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾ هەڵگرتنی جەنازە (فرض الْكفاية)یە، هیچ پیاوەتی‌و ڕێز کەم ناکاتەوە، چونکە چاکەو ڕێزلێنانی مردووەکەی تێدایەو (صحابة)و زانا بەڕێزەکان جەنازەیان هەڵگرتوە، هەروەها ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەدا بۆ گۆڕستان سوننەتێکی (مؤكَّدَة)یە بۆ پیاوان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ، اَلْقِيرَاطَانِ مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ﴾رواه الشيخان، هەر کەسێك ئامادەی وەرێکردنی مردوو بێ تا نوێژی لە سەر دەکا، بە قەد قیراتێك خێری دەگاتێ، وە هەر کەسێکیش ئامادەی بێ تا دەنێشترێ، بەقەد دوو قیرات خێری دەگاتێ، هەردوو قیراتەکان وەکو دوو چیای گەورەنە.

ئینجا بزانە: ڕۆیشتن لەگەڵ جەنازەدا بۆ ئافرەتان ناپەسندە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە ﴿عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَرضي الله عنها: نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا﴾ رواه الشيخان، لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ قەدەغە کراین: لە ڕەگەڵکەوتنی جەنازە، بەڵام بە توندیش لێمان حەرام نەکرا.

(وَالْمَشْيُ) ڕۆیشتن بە پیادەیی (أَمَامَهَا) لە پێش جەنازەدا (بِقُرْبِهَا) لە نزیکی جەنازەکەوە (أَفْضَلُ) خێرترە: لە ڕۆیشتنی بە سواری‌و لە ڕۆیشتنی لە دواوەی جەنازەو لە دوورەوەی جەنازەوە ﴿عَنْ ابْنِ عمَرَرضي الله عنهما: رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ وَأَبَابَكْرٍ وَعُمَرَرضي الله عنهما يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ﴾ رواه أصحاب السنن وغيرهم بإسناد صحيح، دیتم پێغەمبەرﷺو ئیمامی (أبوبكر)و ئیمامی (عمر) لە پێش جەنازەدا بە پیادەیی دەڕۆیشتن.

(وَيُسْرَعُ بِهَا) سوننەتە: لە هەڵگرتنی جەنازەدا بە تاڵوکە بڕۆن (إِنْ لَمْ يُخَفْ تَغَيُّرُهُ) ئەگەر ترسی‌گۆڕانی‌مردووەکە نەبێ، واتە: بەڵام ئەگەر ترسی‌گۆڕانی‌مردووەکە هەبێ، لە سەرخۆ دەڕۆن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا، وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ﴾رواه الشيخان، لە وەرێکردنی‌جەنازەدا بە تاڵوکە بڕۆن؟ چونکە ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی‌چاك بێ، ئەوە چاکێکە بۆ شوێنێکی‌چاکی دەبەن، ئەگەر مرۆڤێکی خراپیش بێ، ئەوە خراپێکە لە کۆڵ خۆتانی دەکەنەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئیمام(النواوي) لە (المجموع)و (شرح مسلم)دا ئەو فەرموودەی هەڵبژاردوە: کە سوننەتە مرۆڤ لە بەر جەنازە هەڵبستێ، چونکە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿إِذَا رَأَيْتُمُ

(فَصْلٌ لِصَلاَتِهِ أَرْكَانٌ: أَحَدُهَا: النِّيَةُ، وَوَقْتُهَا كَغَيْرِهَا، وَتَكْفِي نِيَّةُ الْفَرْضِ، وَقِيلَ تُشْتَرَطُ نِيَّةُ فَرْضِ كِفَايَةٍ، وَلاَ يَجِبُ تَعْيِينُ الْمَيِّتِ فَإِنْ عَيَّنَ وَأَخْطَأَ بَطَلَتْ، وَإِنْ حَضَرَ مَوْتَى نَوَاهُمْ.

---

الْجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ﴾رواه الشيخان، هەر كاتێك جەنازەتان بینی، ئێوە هەڵسن تا لێتان تێدەپەڕێ، یان تا دادەندرێ بۆ ناشتن.

بەڵام زۆر زانایتریش فەرموویانە: نا پەسندە مرۆڤ لە بەر جەنازە هەڵبستێ، مەگەر لەگەڵی بڕواتە گۆڕستان، ئەو كاتە نا پەسند نیە، هەم فەرموویانە: ئەو حەدیسەیڕابردوو (نسخ) كراوەتەوە بە حەدیسێكیتری(صحیح): كە پێغەمبەرﷺ هەڵنەستاوەو فەرمانی بە دانیشتن كردوە، بەڵام ئیمامی(النواوي) ئەو فەرموودەیەی ڕەد كردۆتەوەو فەرموویەتی: لە حەدیسی دانیشتندا هیچ (نسخ) كردنەوە نیە، چونكە دەگونجێ پێغەمبەرﷺ بۆیێ دانیشتبێ، تا ئێمە بزانین: دانیشتن دروستەو هەڵسانیش سوننەتە، وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی نوێژكردن لە سەر مردوو ﴾

(لِصَلاَتِهِ أَرْكَانٌ) نوێژی لە سەر مردوو حەفت ڕوكنی هەنە (أَحَدُهَا) ڕوكنی یەكەم: (اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَاالأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾رواه الشيخان، هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیەتهێنانەوە نەبێ دانامەزرێ. (وَوَقْتُهَا) كاتی نیەتهێنانەكە (كَغَيْرِهَا) وەك نیەتی نوێژەكانیتر واجبە: لەگەڵ (اللهُ أَكْبَر)ی نوێژدابەستندا بەرامبەر بكرێ.

(وَتَكْفِي نِيَّةُ الْفَرْضِ) نیەتی تەنها واجبیەكەی نوێژیجەنازە بەسە، وەك بە دڵ بڵێ: (نَوَيْتُ أَدَاءَ فَرْضِ صَلاَةِ الْجَنَازَةِ عَلَى هَذَاالْمَيِّتِ) نیەتمە فەرزی نوێژی جەنازە لە سەر ئەم مردووە دەكەم. جا واجبە: ئەو نیەتە لەگەڵ (اللهُ أَكْبَر)ی نوێژدابەستندا بەرامبەر بكا، بەڵام (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (تُشْتَرَطُ نِيَّةُ فَرْضِ كِفَايَةٍ) بە مەرج دادەندرێ: نیەتی (فَرْضُ الْكِفَايَةِ) بێنێ، وەك بڵێ: (بە (فَرْضُ الْكِفَايَةِ) نوێژ لە سەر ئەم مردووە دەكەم). ئیتر پێویست نیە بڵێ: بۆ خوای گەورە، بەڵكو سوننەتە.

(وَلاَ يَجِبُ تَعْيِينُ الْمَيِّتِ) واجب نیە: مردووەكە دیاری بكاو ناوی بێنێ، بەڵكو ئەوەندە بەسە: ئاماژەی بۆ بكاو بڵێ: (لە سەر ئەم مردووە). جیاوازی مردووی نێر و مێو گەورەو بچوك نیە (فَإِنْ عَيَّنَ) جا ئەگەر مردووەكەی دیاری كرد، وەك بڵێ: نوێژ لە سەر ئازاد دەكەم (وَأَخْطَأَ) لە دیاریكردنەكەدا هەڵەی كردو مردووەكە (نەوزاد) بوو (بَطَلَتْ) نوێژەكەی بەتاڵ دەبێ.

(وَإِنْ حَضَرَ مَوْتَى) ئەگەر كۆمەڵێك مردوو ئامادە بونو ویستی یەك نوێژ لە سەر گشتیان بكا (نَوَاهُمْ) نیەتی نوێژكردن لە سەر گشتیان دێنێ، وەك بڵێ: (لە سەر ئەم مردووانە).
واتە: مەرج نیە: ژمارەیان بزانێ، یان بیاناسێ.

اَلثَّانِي: أَرْبَعُ تَكْبِيرَات، فَإِنْ خَمَّسَ لَمْ تَبْطُلْ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ خَمَّسَ إِمَامُهُ لَمْ يُتَابِعْهُ فِي الأَصَحِّ، بَلْ يُسَلِّمُ أَوْ يَنْتَظِرُهُ لِيُسَلِّمَ مَعَهُ. اَلثَّالِثُ: اَلسَّلاَمُ كَغَيْرِهَا. اَلرَّابِعُ: قِرَاءَةُ الْفَاتِحَةِ بَعْدَ الأُولَى، قُلْتُ: تُجْزِىءُ الْفَاتِحَةُ بَعْدَ غَيْرِ الأُولَى وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئینجا بزانە : لە سەر مەئمووم واجبە: نیەتی ئیقتیدا، یان جەماعەت بێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(اَلثَّانِي) ڕوكنی‌دووەم: (أَرْبَعُ تَكْبِيراتٍ) گوتنی چوار (اللهُ أكبر)ە، بە (اللهُ أكبر)ی نوێژدابەستنەوە، بە (اجماع)ی‌زانایانی‌ئیسلام ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه أَنَّهُ صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ عَلَى النَّجَاشِي وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ تَكْبِيراتٍ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ بە جەماعەت نوێژی جەنازەی لە سەر نەجاشی كردو چوار (اللهُ أكبر)ی گوتن.

(فَإِنْ خَمَّسَ) جا ئەگەر بە قەسدی پێنج (اللهُ أكبر)ی گوتن (لَمْ تَبْطُلْ) نوێژەكە بەتاڵ نابێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەها (وَلَوْ خَمَّسَ إِمَامُهُ) ئەگەر ئیمامەكەی پێنج (اللهُ أكبر)ی گوتن (لَمْ يُتَابِعْهُ) سوننەت نیە شوێنی بكەوێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (بَلْ يُسَلِّمُ) بەڵكو: یان بەدڵ نیەتی جیابوونەوە دێنێ‌و سەلام دەداتەوە (أَوْ يَنْتَظِرُهُ) یان چاوەڕوانی ئیمامەكەی دەكا (لِيُسَلِّمَ مَعَهُ) تاكو لەگەڵ ئەودا سەلام بداتەوە، جائەم چاوەڕوانكردنە خێرترە.

(اَلثَّالِثُ) ڕوكنی‌سێیەم: (اَلسَّلاَمُ) سەلامدانەوەیە لە دوای تەواوبوونی(اللهُ أكبر)ی چوارەم، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (أبی‌أمامة)ی‌داهاتوو. (كَغَيْرِهَا) وەك سەلامدانەوەی نوێژەكانی‌تر لە واجب‌و سوننەت‌و ژمارەدا، كەواتە: ئیمام بە دەنگی ئاشكرا سەلام دەداتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(اَلرَّابِعُ) ڕوكنی‌چوارەم: (قِرَاءَةُ الْفَاتِحَةِ) خوێندنی سوڕەتی فاتیحەیە ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه: إِنَّ السُّنَّةَ فِي الصَّلاَةِ عَلَى الْجَنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَيُصَلِّيَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يُخْلِصَ لَهُ الدُّعَاءَ، ثُمَّ يُسَلِّمَ﴾ حديث صحيح أخرجه الحاكم وابن الجارود بإسناد رجاله مخرجٌ لهم في الصحيحين، ڕێگەی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی سەر مردوودا ئەوهایە: فاتیحە بخوێنێ‌و سەلاوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لێبدا، ئینجا بە دڵێكی بێگەرد دوعا بۆ مردووەكە بكا، ئینجا سەلام بداتەوە.

(بَعْدَ الأُولَى) سوننەتە: لەدوای (اللهُ أكبر)ی یەكەم–كە نوێژی پێ دادەبەستێ– فاتیحە بخوێنێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (أبی‌أمامة)ی‌داهاتوو.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (تُجْزِئُ الْفَاتِحَةُ بَعْدَ غَيْرِ الأُولَى) دروستە: لە دوای (اللهُ أكبر)ەكانی‌تری جگە لە یەكەمەكەش فاتیحە بخوێندرێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) بەڵام لە دوای

اَلْخَامِسُ: اَلصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِﷺ بَعْدَالثَّانِيَة، وَالصَّحِيحُ أَنَّ الصَّلاَةَ عَلَىالآلِ لاَ تَجِبُ. اَلسَّادِسُ: الدُّعَاءُ لِلْمَيِّتِ بَعْدَ الثَّالِثَة. اَلسَّابِعُ اَلْقِيَامُ عَلَىالْمَذْهَبِ إِنْ قَدَرَ، وَيُسَنُّ رَفْعُ يَدَيْهِ فِيالتَّكْبِيرَات

---

(الله أكبر)ىيەكەم خێرترە، ئینجا بزانە: سورەت خوێندن–واتە: یان ئایەت خوێندن– لە دوای فاتیحە سوننەت نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(اَلْخَامِسُ) ڕوكنى پێنجەم: (اَلصَّلاَةُ عَلَى رَسُولِ اللهِﷺ) سەلاوات لێدانە لە سەر پێغەمبەرﷺ بە بەڵگەی حەدیسەكەی(أبي أمامة)ىڕابردوو. (بَعْدَالثَّانِيَةِ) واجبە: لەدوای (الله أكبر)ى دووەم سەلاواتەكە لێبدا، چونكە لە پێشینەی ئوممەتەوە ئەوها هاتوە.

ئینجا لای كەم: كە واجبەكەی پێ پێك بێ، بڵێ: (اَللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ). چونكە (وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست (أَنَّ الصَّلاَةَ عَلَىالآلِ لاَ تَجِبُ) سەلاوات لێدان لە سەر (آل)ى پێغەمبەرﷺ واجب نیە، بەڵكو سوننەتە، هەروەها سەلامیش سوننەتە، وەك بڵێ: (اَللّٰهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلَى مُحَمَّدٍ وآلِهِ). بەڵام لێرەشدا شێوەی ئەو سەلاواتەی لە تەحیاتدا ڕابڕا، لەگشت شێوەیەكیتر خێرترە، هەروەك لە(تحفة)دا فەرموویەتی.

(اَلسَّادِسُ) ڕوكنى شەشەم: (اَلدُّعَاءُ لِلْمَيِّتِ) دوعاكردنە بۆ مردووەكە (بَعْدَالثَّالِثَةِ) واجبە لە دوای (الله اكبر)ىسێیەم دوعایەكە بكا، ئینجا لای كەم–كە واجبەكەی پێ پێك بێ– بڵێ: (اَللّٰهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اَللّٰهُمَّ ارْحَمْهُ). جا لەو دوعایەدا جیاوازی نێر و مێو گەورەوەو منداڵو شێت نیە، هەروەك لە(تحفة)و(نهاية)و حاشیەكانیدا ڕوون كراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَىالْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ﴾رواه ابوداود وصححه ابن حبان، هەركاتێك نوێژتان لە سەر مردوو كرد، بەدڵێكی بێگەرد دوعای بۆ بكەن.

(اَلسَّابِعُ) ڕوكنى حەفتەم: (اَلْقِيَامُ) ڕاوەستانە بە پێوە تا نوێژەكە تەواو دەبێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەموودەی ڕاستی مەزهەب (إِنْ قَدَرَ) ئەگەر توانای هەبێ، بەڵام ئەگەر توانای ڕاوەستانیبە پێوەی نەبو، ئەو كاتە بەگوێرەی توانینیخۆی نوێژی لە سەر دەكا، وەك نوێژە واجبەكانیتر، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)دا فەرموویانە.

(وَيُسَنُّ رَفْعُ يَدَيْهِ فِيالتَّكْبِيرَاتِ) سوننەتە: لە گشت (الله أكبر)ێكدا هەردوو دەستەكانی بەرز بكاتەوە تا بەرامبەر شانەكانی، هەروەها سوننەتە: ئیمام (الله أكبر)ەكان بە دەنگی ئاشكرا بڵێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەمروویەتی.

ئینجا بۆ گشت نوێژكەرێك سوننەتە: دەستی ڕاستەی لە سەر چەپەی لە سەر بنەوەی سینگی دابنێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، چونكە ئەوها لە حەدیسێكی بێهێزدا هاتوە.

وَإِسْرَارُالْقِرَاءَةِ، وَقِيلَ يَجْهَرُ لَيلاً، والأَصحُّ نَدبُ التَعَوُّذِ دُونَ الإِفْتِتَاحِ، وَيَقُولُ فِي الثَّالِثَـةِ: اَللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ إِلَى آخرِه،

---

(وَإِسْرَارُالْقِرَاءَةِ) له نوێژی مردوودا سوننەتە: فاتیحە بە دەنگی نهێنی بخوێنێ، جیاوازی نیە کاتی نوێژکردنەکە: شەو بێ، یان ڕۆژ بێ ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ﴾ اَلسُّنَّةُ فِي صَلاَةِ الْجَنَازَةِ أَنْ يَقْرَأَ فِي التَّكْبِيرَةِ الأُولَى بِأُمِّ الْقُرْآنِ مُخَافَتَةً، ثُمَّ يُكَبِّرُ ثَلاَثاً، وَالتَّسْلِيمُ عِنْدَالآخِرَةِ﴾ حديث صحيح رواه النسائي بإسناد على شرط الصحيحن، ڕێگەی پێغەمبەرﷺ لە نوێژی سەر مردوودا ئەوهایە: لە دوای (الله أكبر)ی یەكەم فاتیحە بخوێنێ بە دەنگی نهێنی، ئینجا سێ (الله أكبر)ی تریش بڵێ و لە دوای (الله أكبر)ی چوارەم سەلام بداتەوە. هەروەهاش سوننەتە: سەلاوات و دوعا بە دەنگی نهێنی بخوێندرێن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يَجْهَرُ لَيْلاً) لە شەوێدا فاتیحە بە دەنگی ئاشكرا دەخوێنێ.

(والأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (نَدْبُ التَّعَوُّذِ) سوننەتە: لە پێش فاتیحەدا (أَعُوذُ بِاللهِ...) بخوێنێ بە نهێنی (دُونَ الإِفْتِتَاحِ) بەڵام دوعای (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ...) سوننەت نیە، چونكە نوێژەكەی پێ درێژ دەبێتەوە.

ئینجا بزانە: گوتمان لای كەمی دوعای نوێژی جەنازە: (اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اَللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)، كەواتە: لە دوای ئەودوعایە، (اللهُ أكبر)ی چوارەم دەڵێ و سەلام دەداتەوەو نوێژەكە تەواو دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (أبی امامة)ی ڕابردوو.

بەلام (وَيَقُولُ فِي الثَّالِثَةِ) سوننەتە: لە دوای (اللهُ أكبر)ی سێیەم ئەم دوعایەش بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ هَذَا عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ، خَرَجَ مِنْ رَوْحِ الدُّنْيا وَسَعَتِهَا-وَمَحْبُوبُهُ وَأَحِبَّاؤُهُ فِيهَا- إِلَى ظُلْمَةِ الْقَبْرِ وَمَا هُوَ لاَقِيه، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّأَنْتَ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِه، اَللَّهُمَّ إِنَّهُ نَزَلَ بِكَ وَأَنْتَ خَيْرُ مَنْزُولٍ بِه، وَأَصْبَحَ فَقِيراً إِلَى رَحْمَتِكَ وَأَنْتَ غَنِيٌّ عَنْ عَذَابِه، وَقَدْ جِئْنَاكَ رَاغِبِينَ إِلَيْكَ شُفَعَاءَ لَهُ، اَللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِناً فَزِدْ فِي إِحْسَانِه وَإِنْ كَانَ مُسِيئاً فَتَجَاوَزْ عَنْهُ وَلَقِّهِ بِرَحْمَتِكَ رِضَاكَ وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَهُ وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ وَجَافِ الأَرْضَ عَنْ جَنْبَيْه، وَلَقِّهِ بِرَحْمَتِكَ الأَمْنَ مِنْ عَذَابِكَ حَتَّى تَبْعَثَهُ إِلَى جَنَّتِكَ يَا أَرْحَمَ الرَّحِمِينَ﴾ إِلْتَقَطَهُ الشَّافعي من مَجموع الأَحاديث الواردة.

ئینجا بزانە: لە نوێژی ئافرەتی مردوودا وەها سوننەتە: ووشەی (عَبْدُكَ) بكاتە (أَمَتُكَ)و (ضَمِير مُذَكَّر) بكاتە (ضَمِير مُؤَنَّث) واتە: لە جیاتی(لَهُ) بۆ ئافرەتان بڵێ (لَهَا) بەلام دروستیشە: گشت دوعایەكانی هەر بە (ضَمِير مُذَكَّر) بڵێ بە مەبەستی (اَلشَّخص)-مرۆڤ، یان (اَلمَيِّت)-مردوو، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَيُقَدِّمُ عَلَيْه: اَللَّهُمَّ اغفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، اَللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِه عَلَى الإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ. وَيَقُولُ فِي الطِّفْلِ مَعَ هَذَا الثَّانِي: اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ فَرَطاً لأَبَوَيْه وَسَلَفاً وَذُخْراً وَعِظَةً وَاعْتِبَاراً وَشَفِيعاً وَثَقِّلْ بِه مَوَازِينَهُمَا وَأَفْرِغِ الصَّبْرَ عَلَى قُلُوبِهِمَا. وَيَقُولُ فِي الرَّابِعَةِ: اَللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ. وَلَو تَخَلَّفَ الْمُقْتَدِي بِلاَ عُذْرٍ فَلَمْ يُكَبِّرْ حَتَّى كَبَّرَ إِمَامُهُ أُخْرَى بَطَلَتْ صَلاَتُهُ،

---

(وَيُقَدِّمُ عَلَيْهِ) سوننەتە: پێش ئەو دوعایەیڕابردوو، ئەم دوعایەش بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، اَللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِسْلَامِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح.

(وَيَقُولُ فِي الطِّفْلِ) لە نوێژ لەسەرکردنی منداڵ —نێر، یان مێ— سوننەتە: ئەم دوعایەی داهاتووش بکا (مَعَ هَذَا الثَّانِي) لەگەڵ تەنها ئەو دوعا دووەمەیڕابردوودا، واتە: لە نوێژی جەنازەی منداڵ دوعا درێژەکەیەکەم ناخوێنی، هەروەک لە(المجموع)دا ئاماژەی کردوە، کەوابو: لە دوای (فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ) بڵێ: (اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ فَرَطاً لأَبَوَيْهِ وَسَلَفاً وَذُخْراً وَعِظَةً وَاعْتِبَاراً وَشَفِيعاً، وَثَقِّلْ بِهِ مَوَازِينَهُمَا وَأَفْرِغِ الصَّبْرَ عَلَى قُلُوبِهِمَا). چونکە ئەو دوعایە لە نوێژی جەنازەی منداڵ دەوەشێتەوەو لە حەدیسێکی بێهێزیشدا فەرمانیدوعا بۆ دایکو باوکی منداڵە مردووەکە هاتوە.

ئینجا بزانە: لە نوێژی جەنازەی منداڵدا ئەو دوعایە بە تەنها بەسەو بە بەر دوعایەکەی نوێژ دەکەوێ، هەروەها (اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اَللَّهُمَّ ارْحَمْهُ)ش بە تەنها بەسەو بە بەردەکەوێ، هەروەک لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيَقُولُ فِي الرَّابِعَةِ) هەروەها سوننەتە: لە دوای (اللهُ أَكْبَر)ی چوارەم —پێش سەلامدانەوە— ئەم دوعایە بکاو، بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ لاَتَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَتَفْتِنَّا بَعْدَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح. ئینجابزانە: لە نوێژی مردوودا چەند دوعایتریش لە حەدیسی(صحيح)دا هاتون، لە بەر درێژی نەماننووسین.

(وَلَو تَخَلَّفَ الْمُقْتَدِي) ئەگەر مەئمووم لە ئیمامەکەی دوا کەوت (بِلاَ عُذْرٍ) بە بێعوزر (فَلَمْ يُكَبِّرْ) (اللهُ أَكْبَر)ی نەگوت (حَتَّى كَبَّرَ إِمَامُهُ أُخْرَى) تا ئیمامەکەی (الله أكبر)ێکیتری گوت (بَطَلَتْ صَلَاتُهُ) نوێژەکەی بەتاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر عوزرێکی هەبو: وەک خوێندنی فاتیحەی تەواو نەکردبێ، یان گوێی لە ئیمامەکەی نەبوبێ، ئەو کاتە بە دواکەوتنی (اللهُ أكبر)ێك نوێژەکەی بەتاڵ نابێ، کەوابو: بەگوێرەی ڕیزی نوێژەکەی خۆی بەردەوام دەبێ، تا تەواوی دەکا، هەروەک لە(تحفة)دا فەرموویەتی.

وَيُكَبِّرُ الْمَسْبُوقُ وَيَقْرَأُ الْفَاتِحَةَ وَإِنْ كَانَ الإِمَامُ فِي غَيْرِهَا، وَلَوْ كَبَّرَ الإِمَامُ أُخْرَى قَبْلَ شُرُوعِه فِي الْفَاتِحَةِ كَبَّرَ مَعَهُ وَسَقَطَتِ الْقِرَاءَةُ، وَإِنْ كَبَّرَهَا وَهُوَ فِي الْفَاتِحَةِ تَرَكَهَا وَتَابَعَهُ فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ تَدَارَكَ الْمَسْبُوقُ بَاقِيَ التَّكْبِيرَاتِ بِأَذْكَارِهَا، وَفِي قَوْلٍ لاَ تُشْتَرَطُ الأَذْكَارُ، وَيُشْتَرَطُ شُرُوطُ الصَّلاَةِ

---

(وَيُكَبِّرُ الْمَسْبُوقُ) مەئموومی دواکەوتوو (الله أكبر)ی نوێژ دابەستن دەڵێو (وَيَقْرَأُ الْفَاتِحَةَ) لە دوای (الله أكبر)ەکەش فاتیحە دەخوێنێ (وَإِنْ كَانَ الإِمَامُ فِي غَيْرِهَا) هەرچەند ئیمامەکەش لە (الله أكبر)ێکی‌تردابێ، بەڵام (وَلَوْ كَبَّرَ الإِمَامُ أُخْرَى) ئەگەر ئیمامەکەی (الله أكبر)ێکی‌تری گوت (قَبْلَ شُرُوعِهِ فِي الْفَاتِحَةِ) پێش ئەوەی مەئموومە دواکەوتووەکە دەست بە فاتیحە بکا: وەك لە دوای (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنیدا، ئیمام (الله أكبر)ێکی‌تر بڵێ (كَبَّرَ مَعَهُ) مەئموومەکەش لەگەڵ ئیمامەکەدا (الله أكبر) دەڵێو (وَسَقَطَتِ الْقِرَاءَةُ) خوێندنی فاتیحەی لە سەر لادەچێ، چونکە ئیمامەکەی لەجیاتی هەڵیدەگرێ، هەروەك لە چوونە ڕوکووعی نوێژەکانی‌تریش ئەوها بوو.

(وَإِنْ كَبَّرَهَا) ئەگەر ئیمامەکەی (الله أكبر)ێکی‌تری گوت (وَهُوَ فِي الْفَاتِحَةِ) مەئموومە دواکەوتووەکەش دەستی بە فاتیحە کردبو (تَرَكَهَا) واجبە: واز لە فاتیحە بێنێو (وَتَابَعَهُ) شوێن ئیمامەکەی دەکەوێو ئەوەندە فاتیحەی ماویەتی ئیمامەکەی لە جیاتی هەڵیدەگرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، وەك لە نوێژەکانی‌تریشدا ئەوها بوو، ئینجا (وَإِذَا سَلَّمَ الإِمَامُ) هەر کاتێك ئیمامەکەی سەلامی داوە (تَدَارَكَ الْمَسْبُوقُ بَاقِي التَّكْبِيرَاتِ) مەئموومی دواکەوتوو، واجبە: (الله أكبر)ەکانی ماون گشتیان بڵێ (بِأَذْكَارِهَا) بەزیکرەکانیانەوە: وەك سەلاوات‌و دوعا بۆ مردوو، ئینجا سەلام دەداتەوە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی‌تردا (لاَ تُشْتَرَطُ الأَذْكَارُ) بە مەرج داناندرێ زیکرەکانیش بڵێ، بەڵکو تەنها (الله أكبر)ەکان بە دوای‌یەکتردا دەڵێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر مەئموومی‌دواکەوتوو دەستی بە فاتیحە کردو ئیمامەکەشی سەلامی داوە، ئەو کاتە واجبە: فاتیحەکە تەواو بکا، چونکە ئیمام لە جیاتی‌ی هەڵیناگرێ، هەروەك لە (نهاية)و(مغني)دا فەرموویانە.

## ﴿ مەرجەکانی نوێژی جەنازە ﴾

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی نوێژی جەنازە بە مەرج دادەندرێ (شُرُوطُ الصَّلاَةِ) مەرجەکانی نوێژی تێدا بێنە جێ: وەك دەستنوێژو ڕوو لەقیبلەکردن‌و داپۆشینی عەوڕەت‌و پاکی‌ی لاشەو بەرگ‌و شوێنی نوێژ تێدا کردن، گشت ڕوکنەکانی نوێژەکەش بە عەڕەبی بن، واتە: ئەگەر لەو مەرجانە یەکێك نەبێ، نوێژی جەنازەش دروست نابێ، بەڵام کات مەرج نیە،

لاَ الْجَمَاعَةُ، وَيَسْقُطُ فَرْضُهَا بِوَاحِدٍ، وَقِيلَ يَجِبُ إِثْنَانِ وَقِيلَ ثَلاَثَةٌ وَقِيــلَ أَرْبَعَــةٌ، وَلاَ يَسْقُطُ بِالنِّسَاءِ وَهُنَاكَ رِجَالٌ فِي الأَصَحِّ، وَيُصَلَّى عَلَى الْغَائِبِ عَنِ الْبَلَدِ،

---

چونکه نوێـژی جـەنازە لـە گشـت کاتێکـدا دروسـتە، واتـە: لـەو کاتانەشـدا دروسـتە کـە نوێـژکردن تێیانـدا قەدەغەیـە، بـەو مەرجـەی بـە قەسـدی نوێژەکـە نەباتـە ئـەو کاتانـە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هـەروەها مەرجـە: شـۆردنی مردووەکـە وەپـێش نوێژەکـە بێخـرێ، مردووەکـەش لـە پـێش نوێژکەرەکـە دابنـدرێ، هـەروەك لـە مەسـەلە پـەرت و بڵاوەکـانی دوای ئێـرەدا ڕوونـی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى.

(لاَالْجَمَاعَةُ) بەڵام لە نوێژی جەنازەدا جەماعەت مەرج نیە، بـەڵکو سـوننەتە: بـە جەماعـەت بکرێ، کەوابو: (وَيَسْقُطُ فَرْضُهَا) واجبیەکەی نوێژی جەنازە لـە سـەر موسـوڵمانان لادەچـێ (بِوَاحِدٍ) بـە تـەنها یـەك کـەس کـە نوێـژ لـە سـەر مردووەکـە بکـا، هەرچـەند نوێژکەرەکـە منـداڵیش بـێ، بـەڵام مەرجـە: منـداڵێکی نێـری فامیـدەبێ، هـەروەك لـە سەرچـاوەکاندا فەرموویانە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بـێهێزدا (يَجِبُ إِثْنَـانِ) واجبـە: دوو پیـاو نوێـژی لـە سەر بکەن (وَقِيلَ) لە بێهێزێکیتردا (ثَلاَثَةٌ) واجبـە: سـێ کـەس (وَقِيـلَ) لـەبێهێزێکیتردا: (أَرْبَعَةٌ) واجبە: چوار کەس نوێژی لە سەر بکەن.

(وَلاَ يَسْقُطُ بِالنِّسَاءِ) واجبیەکەی نوێژی جەنازە بە ئافرەتـان و بـە نێرامـوك لاناچـێ (وَهُنَـاكَ رِجَالٌ) لە حاڵەتێکدا لە شوێنی نوێژ لـە سـەرکردندا پیـاو هـەبن، واتـە: یـان تـەنها پیاوێـك، یان منداڵێکی نێرینەی فامیدە هەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەواتـە: ئەگـەر لە شوێنی نوێژ لـە سـەرکردندا تـەنها منداڵێکی نێـری فامیـدە هـەبو، واجبـە: ئافرەتـەکان فەرمانی پێبکەن: نوێژ لە سەر جەنازەکە بکا، جا ئەگـەر بـە زۆرلێکـردنیش نوێژەکـەی لـە سەر نەکرد، ئەو کاتە دروستە ئافرەت نوێژ لە سەر جەنازەکـە بکـا، هـەروەك لـە (مغني)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر هیچ نێرینەی فامیدە نەبو و تەنها ئافرەت هـەبون، ئـەو کاتـە واجبـە: ئـافرەت نوێژی لە سەر بکـاو، واجبیەکـەش لـە سـەر موسـوڵمانان لادەچـێ، واتـە: ئەگـەر لـە دوای تەواوبوونی نوێژەکە پیاوێك پەیدا بوو، واجـب نیـە: نوێـژی لـە سـەر جەنازەکـە دووبـارە بکاتـەوە، هـەروەك لـە (الشـرواني)دا فەرموویـەتی، ئینجـا لـەو حاڵەتـەدا بـۆ ئافرەتـانیش سوننەتە: نوێژی جەنازە بە جەماعەت بکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ نوێژ لە سەر مردووی نادیار ﴾

(وَيُصَلَّى) دروسـتە: نوێـژی جـەنازە بکـرێ (عَلَىالْغَائِبِ) لـە سـەر مـردووی نادیـار، واتـە: (عَنِ الْبَلَدِ) لە شاری نوێژکەرەکەدا نەبێ، جیاوازی نیـە شـوێنی مـردووە نادیارەکـە: دوور

وَيَجِبُ تَقْدِيمُهَا عَلَى الدَّفْنِ، وَتَصِحُّ بَعْدَهُ، وَالأَصَحُّ تَخْصِيصُ الصِّحَّةِ بِمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ فَرْضِهَا وَقْتَ الْمَوْتِ، وَلاَ يُصَلَّى عَلَى قَبْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِحَالٍ.

---

بێ، یان نزیك بێ، له لای قیبله‌بێ، یان له لایه‌كی‌تر، به‌ڵام واجبه: نوێژكه‌ره‌كه له نیه‌تی نوێژدا ئاماژه بۆ مردووه نادیاره‌كه بكاو، واجبه: به‌خۆی ڕوو له قیبله بكا، نه‌ك له شوێنی مردووه‌كه.

هه‌روه‌ها پێویسته نوێژكه‌ره‌كه بزانێ، یان قه‌ناعه‌تی بێ: مردووه‌نادیاره‌كه شۆراوه، ئه‌گینا: نوێژه‌كه‌ی دروست نابێ، ئینجا به‌م نوێژه‌ی ئێره، واجبیه‌كه له سه‌ر دانیشتووانی شوێنی مردووه‌كه‌ش لاده‌چێ، هه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا ئه‌و مه‌سه‌له‌یه ڕوون كراوه‌ته‌وه ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: لَمَّا مَاتَ النَّجَاشِي صَلَّى عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ بِالْمَدِينَةِ﴾ رواه الشيخان، كه (نجاشی) له (حَبَشَة) مرد، پێغه‌مبه‌ر ﷺ له (مدينة)وه نوێژی جه‌نازه‌ی له سه‌ر كرد.

ئینجا بزانه: ئه‌گه‌ر مردووه‌كه له شاری نوێژكه‌ره‌كه‌دابێ، یان له گوندی نوێژكه‌ره‌كه‌دابێ، ئه‌و كاته دروست نیه: به نادیاری نوێژی له سه‌ر بكا، به‌ڵكو واجبه: له لای ئاماده‌بێ، هه‌رچه‌ند شاره‌كه‌ش زۆر به‌رفراوان‌و گه‌وره بێ، مه‌گه‌ر عوزرێك هه‌بێ: وه‌كو نه‌خۆشی، یان ترس، یان به‌ندكردن، ئه‌وكاته دوور نیه نوێژكه به نادیاری دروست بێ، هه‌روه‌ك له (نهاية)و (مغنی)دا فه‌رموویانه.

(وَيَجِبُ تَقْدِيمُهَا) واجبه: نوێژ له سه‌ر مردوو، وه‌پێش بێخرێ (عَلَى الدَّفْنِ) له سه‌ر ناشتنی مردووه‌كه، واته: ئه‌گه‌ر پێش نوێژ له سه‌ركردن مردووه‌كه ژێر خاك كرا، گشت ئه‌و كه‌سانه گوناهبار ده‌بن: كه هه‌واڵی مردنه‌كه‌یان زانیوه، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا دروست نیه: بۆ نوێژ له سه‌ركردن بیهێننه ده‌ره‌وه، به‌ڵكو نوێژی جه‌نازه له سه‌ر گۆڕه‌كه‌ی ده‌كه‌ن، چونكه (وَتَصِحُّ بَعْدَهُ) نوێژی جه‌نازه له دوای ناشتنیش دروست ده‌بێ‌و واجبه‌كه‌ی پێ لاده‌چێ، به‌ڵام (وَالأَصَحُّ) له‌م مه‌سه‌له‌یه‌دا فه‌رمووده‌ی ڕاستتر ئه‌مه‌یه: (تَخْصِيصُ الصِّحَّةِ) دروستبوونی نوێژی‌جه‌نازه‌ی له سه‌ر گۆڕ، تایبه‌ته (بِمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ فَرْضِهَا) به‌و نوێژكه‌ره‌ی نوێژی ئه‌م جه‌نازه‌یه‌ی له سه‌ر واجب بوبێ (وَقْتَ الْمَوْتِ) له كاتی مردنی‌دا، واته: مه‌رجه: له كاتی مردنی مردووی ناو گۆڕه‌كه‌دا، نوێژكه‌ره‌كه هه‌بوبێ‌و موسوڵمان بوبێ‌و بالغ‌و عاقڵ‌و پاك بوبێ.

كه‌وابو: (وَلاَ يُصَلَّى) دروست نیه: نوێژی جه‌نازه بكرێ (عَلَى قَبْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) له سه‌ر گۆڕی پێغه‌مبه‌ر ﷺ (بِحَالٍ) به هیچ حاڵه‌تێك: نه به‌ته‌نهایی‌و نه به‌جه‌ماعه‌ت، هه‌روه‌ها له سه‌ر گۆڕی پێغه‌مبه‌ره‌كانی‌تریش عَلَيهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ نوێژی جه‌نازه دروست نیه؟ چونكه له كاتی وه‌فاتی هیچ پێغه‌مبه‌رێكدا ئێمه له دونیادا نه‌بوین‌و واجبیه‌كه‌ی نوێژی جه‌نازه‌ی ئه‌وان ئێمه‌ی نه‌گرتۆته‌وه.

(فَرْعٌ) اَلْجَدِيدُ أَنَّ الْوَلِيَّ أَوْلَى بِإِمَامَتِهَا مِنَ الْوَالِي، فَيُقَدَّمُ الأَبُ ثُمَّ الْجَدُّ وَإِنْ عَلاَ، ثُمَّ الإِبْنُ ثُمَّ ابْنُهُ وَإِنْ سَفَلَ، ثُمَّ الأَخُ، وَالأَظْهَرُ تَقْدِيمُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ عَلَى الأَخِ لأَبٍ، ثُمَّ ابْنُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ ثُمَّ لأَبٍ، ثُمَّ الْعَصَبَةُ عَلَى تَرْتِيبِ الإِرْثِ، ثُمَّ ذَوُوالأَرْحَامِ، وَلَوِاجْتَمَعَا فِي دَرَجَةٍ فَالأَسَنُّ الْعَدْلُ أَوْلَى عَلَى النَّصِّ، وَيُقَدَّمُ الْحُرُّ الْبَعِيدُ عَلَى الْعَبْدِ الْقَرِيبِ،

---

ئینجا بزانە: مەسەلەی نوێژەکانیتر لە سەر گۆڕی پێغەمبەرﷺ خەڵکیتر، لە کۆتایی (باسی ئەوشتانەی نوێژ بەتاڵ دەکەن) ڕوونمان کردۆتەوە، وَالْحَمْدُ لله تعالَى.

## ﴿ فَرْعٌ: لە باسی لە پێشترین کەس بۆ نوێژی جەنازە ﴾

(اَلْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێی ئیمامی شافیعی (أَنَّ الْوَلِيَّ) خزمە نێرینەی مردووەکە (أَوْلَى) لەپێشترە (بِإِمَامَتِهَا) بۆ پێشنوێژی لە سەر مردووەکەی (مِنَ الْوَالِي) لە کاربەدەستی شوێنەکە، کەوابو: (فَيُقَدَّمُ الأَبُ) باوکی مردووەکە وەپێش گشت خزمێکیترو وەپێش کاربەدەستەکەش دێخرێ: بۆ ئیمامەتی نوێژی جەنازەکەی (ثُمَّ الْجَدُّ) ئینجا باپیرە: باوکی باوك (وَإِنْ عَلاَ) هەرچەند بەرەوسەرەوەتریش بێ (ثُمَّ) ئینجا لە دوای باوكو باپیرە (الإِبْنُ) کوڕی مردووەکە لە گشت کەسێکیتر لەپێشترە (ثُمَّ ابْنُهُ) ئینجا کوڕیکوڕ (وَإِنْ سَفَلَ) هەرچەند بەرەوخوارەوەتریش بێ (ثُمَّ) ئینجا لە دوای کوڕو نەوە (الأَخُ) برای مردووەکە لە گشت کەسێکیتر لەپێشترە.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (تَقْدِيمُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ) برای لە دایکیوباوکی وەپێش دێخرێ (عَلَى الأَخِ لأَبٍ) لە سەر برای تەنها لە باوکی (ثُمَّ) ئینجا لە دوای برای لە باوکی (ابْنُ الأَخِ لأَبَوَيْنِ) کوڕە برای لە دایکیوباوکی لەپێشترە (ثُمَّ) ئینجا لە دوای ویش (لأَبٍ) کوڕی برای تەنها لە باوکی (ثُمَّ) ئینجا لە دوای کوڕی برای لە باوکی (اَلْعَصَبَةُ) خزمە نێرینەکانیتری مردووەکە (عَلَى تَرْتِيبِ الإِرْثِ) لە سەر ڕیزی میرات وەرگرتن: وەك مامی لە دایکیوباوکی، ئینجا تەنها لە باوکی، ئینجا کوڕە مام...هتد، (ثُمَّ ذَوُوالأَرْحَامِ) ئینجا خزمە نێرینەکانی خاوەن ڕەحم: وەك باوکی دایك، ئینجا برای تەنها لە دایك، ئینجا خاڵ...هتد.

(وَلَوِ اجْتَمَعَا فِي دَرَجَةٍ) ئەگەر دوو خزمی مردووەکە لە پلەیەکدا کۆ بونەوە: وەك دوو کوڕ، یان دوو برا...(فَالأَسَنُّ الْعَدْلُ) ئەوەی بە تەمەنترو دادپەروەرە (أَوْلَى) لەپێشترە (عَلَى النَّصِّ) لە سەر دەقی فەرموودەی ئیمامی شافیعی (وَيُقَدَّمُ الْحُرُّ الْبَعِيدُ) خزمێکی ئازادی دوور، وەپێش دێخرێ (عَلَى الْعَبْدِ الْقَرِيبِ) لە سەر خزمێکی کۆیلەی نزیك.

﴿ **ئاگاداری** ﴾: لە نوێژی جەنازەدا واجبە: مردووەکە بکەوێتە لای قیبلەی نوێژ کەرەکە، ئینجا ئەگەر مردووەکە نێرینە بوو، سوننەتە: لایسەری بکەوێتە لایچەپەی نوێژکەرەکە؟ بە پێچەوانەی ڕەفتاری ئێستای خەڵك، بەڵام ئەگەر مێیینە، یان نێراموك بوو، سوننەتە:

لای سەری بکەوێتە لایڕاستەیﻧوێژکەرەکە؟ وەك ڕەفتاری ئێستای خەڵك، هەروەك لە حاشیەکانی (الشبراملسي)و (البجيرمي)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا (وَيَقِفُ) نوێژکەرەکەش ڕادەوەستێ (عَنْدَ رَأْسِ الرَّجُلِ) لە لای سەری نێرینەکەو (وَعَجُزِهَا) لە لای کەفەڵی ئافرەتەکە، جیاوازی ئیمامو نوێژکەری بە تەنها نیە، بەڵام مەئموم لە هەر لایەك بۆی گونجا لە ڕیزەکەدا ڕادەوەستێ، هەروەك لە(تحفة)و (مغني)دا فەرموویانە ﴿عَنْ أَبِيغَالِبﷺ صَلَّى أَنَسُ ابنُ مالك عَلَى جَنَازَةِ رَجُلٍ فَقَامَ حَيَالَ رَأْسِهِ، ثُمَّ صَلَّى عَلَى جَنَازَةِ امْرَأَةٍ فَقَامَ حَيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ، فَقَالَ لَهُ الْعَلاَءُ: هَكَذَا رَأَيْتَ النَّبِيَّﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ﴾ رواه الترمذي وابودلود وغيرهما بسند حسن، (أنس) نوێژی جەنازەی لە سەر پیاوێك کردو لە لای سەری ڕاوەستا، ئینجا نوێژی جەنازەی لە سەر ئافرەتێك کردو لە لای ناوەندی ڕاوەستا، (العلاء) لێی پرسی: ئایا پێغەمبەرﷺ ئەوها بینیوە: لە ڕاوەستاندا جیاوازی ئافرەتو پیاو بکا؟ فەرمووی: بەڵێ.

(وَتَجُوزُ عَلَى الْجَنَائِزِ صَلاَةٌ) دروستە: یەك نوێژیجەنازە لە سەر زۆر مردووان بکرێ، بەو مەرجەی خزمەکانی مردووەکان ڕازی بن، ئینجا ئەگەر مردووەکان گشتیان نێر بون، یان گشتیان مێ بون، ئەو کاتە کامەیان لە خواترسترو ئایین پەروەرتر بووە، ئەویان دێخرێتە لای نوێژکەرەکە، ئینجا ئەوانیتریش یەك لە دوای یەك دادەندرێن.

بەڵام ئەگەر مردووەکان نێرو مێ بون، ئەو کاتە نێرەکان دێخرێنە لای نوێژکەرەکە، واتە: پیاوی بالغ لە پێش ئیمام، ئینجا کوڕی نەبالغ، ئینجا نێراموك، ئینجا ئافرەت، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَنْ عَمَّارٍ: أَنَّهُ شَهِدَ جَنَازَةَ أُمِّ كَلْثُومٍ وَابْنِهَا فَجُعِلَ الْغُلاَمُ مِمَّا يَلِي الإِمَامَ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبُوسَعِيدٍ وَأَبُوهُرَيْرَةَ وَأَبُوقَتَادَةَﷺ: هَذِهِ السُّنَّةُ﴾ رواه ابودلود وغيره بسندصحيح ﴿وَصَلَّى ابْنُ عُمَرَرَضِىاللهُ عَنهُمـ عَلَى تِسْعِ جَنَائِزَ جَمِيعاً فَجُعِلَ الرِّجَالُ يَلُونَ الإِمَامَ وَالنِّسَاءُ يَلِينَ الْقِبْلَةَ فَصَفَّهُنَّ صَفّاً وَاحِداً﴾رواه البيهقي والنسائي بإسنادحسن، (أم كلثوم)ی ژنی ئیمامی (عمر) لەگەڵ کوڕەکەی وێکڕا مردنو یەك نوێژیان لە سەر کرا، کوڕەکەی لە لای ئیمامی نوێژەکە داندرا، جا ئەو چوار (صحابة)یەش فەرموویان: ئەوە ڕێگەی پێغەمبەرەﷺ.

هەروەها (ابن عمر) یەك نوێژی لە سەر نۆ جەنازە کرد بە تێکڕایی، پیاوەکانی خستنە لای ئیمامی نوێژو ئافرەتەکانیشی خستنە لای قیبلەو کردنیە یەك ڕیز.

ئینجا بزانە: وەها خێرترە: هەر مردووێك بە تەنها نوێژێکی لە سەر بکرێ هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا ئەگەر خزمەکانی مردووەکان ڕازی بون گشتیان تەنها یەك نوێژیان لە سەر بکرێ، ئەوە یەکێك دیاری دەکەن بۆ نوێژ لە سەر کردنیان، بەڵام

وَتَحْرُمُ عَلَى الْكَافِرِ وَلاَ يَجبُ غُسْلُهُ. وَالأَصَحُّ وُجُوبُ تَكْفِينِ الذِّمِّيِّ وَدَفْنِهِ، وَلَوْ وُجِدَ عُضْوُ مُسْلِمٍ عُلِمَ مَوْتُهُ صُلِّيَ عَلَيْهِ،

---

ئەگەر ڕازی نەبون، ئەو کاتە هەر کەسەو نوێژ لە سەر مردووەکەی خۆی دەکا، هەروەك لە(المجموع)و(تحفە)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ ئەو کەسانەی نوێژی جەنازەیان لە سەر ناکرێ ﴾

(وَتَحْرُمُ عَلَى الْكَافِرِ) نوێژی جەنازە حەرامە لە سەر کافری‌مردوو بکرێ، جیاوازی نیە: کافرەکە جولەکە بێ، یان گاور، یان بێ‌باوەڕ، یان هەر جۆرە کافرێکی‌تر، هەروەها جیاوازی نیە: نێر بێ، یان مێ بێ، بلوغی بوبێ، یان بە نەبالغی مردبێ؟ چونکە منداڵی کافران لە دونیادا وەك کافران ڕفتاریان لەگەڵ دەکرێ، بەلام لە قیامەتدا بەهەشتینە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، خوای‌گەورە دەفەموێ: ﴿وَلَاتُصَلِّ عَلَى أَحَدٍ مِنْهُمْ مَاتَ أَبَدًا﴾ نوێژی جەنازە لە سەر هیچ کەسێك لەو کافرانە مەکە هەتا هەتایێ.

(وَلاَ يَجِبُ غُسْلُهُ) شۆردنی کافری‌مردوو واجب نیە، بەلام دروستە (وَالأَصَحُّ) فەرمودەی ڕاستتر: (وُجُوبُ تَكْفِينِ الذِّمِّيِّ) واجبە: کافری پەیمان لە ئەستۆ و دڵنیاکراو کفن بکرێو (وَدَفْنِهِ) واجبە: ژێرخاکیش بکرێ لە شوێنێکی وەهادا: گۆڕستانی موسوڵمانان نەبێ، جا بزانە: ئەگەر کافرەکەماڵی‌خۆی هەبو، ئەوە بە ماڵی‌خۆی کفن‌و ناشتنی بۆ دەکرێ، ئەگەر نا: لە (بيت المال)، ئەگەر نەبو، لە ماڵی موسوڵمانانی دەوڵەمەند، بەلام ئەو کافرەی جەنگ لەگەڵ موسوڵمانان دەکاو ئەو موسوڵمانەی بوەتە کافر، کفن‌و ناشتنیان واجب نیە، جا ئەگەر بۆنەکەیان خەڵکی ئازار دەدا، ئەو کاتە ژێر خاك دەکرێن، هەروەك ﴿پێغەمبەرﷺ لە غەزای (بَدر) لاشەی کافرەکانی خستە ناو بیرێك﴾.

ئینجا بزانە: ئەگەر کافرێك مرد، جا تەنها یەك پیاوی دادپەروەر شاهیدی‌ی دا: کە پێش مردن بوەتە موسوڵمان، شاهیدی پێچەوانەش نەبو، ئەو شاهیدی‌یە تەنها بۆ نوێژەکە وەردەگیرێ، واتە: واجبە نوێژی لە سەر بکرێ، هەروەك لە (المجموع)و(تحفە)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ وُجِدَ عُضْوُ مُسْلِمٍ) ئەگەر ئەندامێکی لاشەی موسوڵمانێك دیتراوە (عُلِمَ مَوْتُهُ) بێگومان زاندرا: موسوڵمانەکە مردوەو ئەم ئەندامەشی لە دوای مردن لە لاشەی جیا بۆتەوە، واجبە: ئەم ئەندامە بشۆرێو لە پارچە پەڕۆکێکدا داپۆشرێ، ئینجا (صُلِّيَ عَلَيْهِ) واجبە: نوێژی جەنازەی لە سەر بکرێو بنێشترێ، چونکە ﴿سیسارکێك دەستێکی (صحابة)یەکی کوژراوی لە سەر شاری (مَكّة)ی پیرۆز خستە خوارەوەو (صحابة)کان بە ئەنگوستیلەکەی ناسییانەوەو نوێژی جەنازەیان لە سەر کرد﴾، هەروەك لە سەرچاوکاندا بە بەڵگەیان هێناوەتەوە.

وَالسِّقْطُ إن استَهَلَّ أوْ بَكَى كَكَبِيرٍ، وَإلاَّ فَإنْ ظَهَرَتْ أمَارَةُالْحَيَاةِ كَاخْتِلاَجٍ صُلِّيَ عَلَيْـهِ فِي الأظْهَرِ، وَإنْ لَمْ تَظْهَرْ وَلَمْ يَبْلُغْ أرْبَعَةَأشْهُرٍ

ئینجا بزانه: لەو حاڵەتەدا واجبه نیەتی نوێژکردن لـه سـەر تێکڕای مردووەکـه بێنـێ، وەك به دڵ بڵێ: (نیەتمه فەڕزی نوێژی جەنازه له سـەر تێکڕای ئـەو مـردووه دەکـەم: کـه ئـەم ئەندامەی لـێ جیا بۆتـەوه). جـا ئەگـەر دەیزانـی مردووەکـه نەشۆراوه، ئـەو کاتـه نیـەتی نوێژەکه له سەر تەنها ئەندامەکه دێنێ، هەر وەك ئیمامی (الزرکشی) باسی کردوه.

هەروەها بزانه: ئەگەر ئەندامەکـەپێش مـردن لـێی جیـا بوبێتـەوه، ئـەو کاتـه هـیچ واجـب نیەو نوێژیشی له سەر دروست نیه، بـەڵکو سـوننەته: پـەڕۆکێکی لـێوەربپێچرێو ژێرخـاك بکرێ، هەروەك له سەرچاوەکاندا فەرموویانه.

## ﴿ نوێژی جەنازه له سەر منداڵ ﴾

(وَالسِّقْطُ) کۆرپەی لەبارچوو دوو جـۆره، یەکـەم: (إنِ اسْتَهَلَّ) ئەگـەر دوای جیابوونـەوەی لـه دایکـی دەنگـی خـۆی بـەرز کـردەوه (أوْ بَكَى) یـان گریـا (كَكَبِيرٍ) ئـەوه وەك مرۆڤـی گەورەیه، واته: واجبه بشۆرێو نوێژیجەنازەی له سەر بکرێو کفن بکرێو بنێشترێ.

(وَإلاَّ) بـەڵام ئەگـەر دەنگـی بـەرز نـەکردەوەو نەشـگریا، ئـەوه (فَـإنْ ظَهَـرَتْ أمَـارَةُ الْحَيَـاةِ) ئەگـەر نیشـانەی زینـدووەتیی بـەدەر کـەوت (كَـاخْتِلاَجٍ) وەك لـەرزینی ئەنـدامێکی، یـان خۆجولاندنی (صُلِّيَ عَلَيْـهِ) ئـەوەش وەکـو مرۆڤـی گـەوره واجبـه: نوێژیجـەنازەی لـه سـەر بکـرێ، واتـه: هـەم واجبـه بشـۆرێو کفـن بکـرێو بنێشـترێ (فِيالأظْهَـرِ) لـه فـەرموودەی بەهێزتردا، کەواته: له فـەرموودەی بـەهێزتردا: جیـاوازی دەنـگو جـولان نیـه، لـه هـەردوو حاڵەتدا ئەو بڕیارەی مرۆڤـی گـەورەی بـۆ دەدرێ، چـونکه بـه زینـدووەتی هاتۆتـه دونیـاو ئینجا مردوه، پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَالطِّفْــلُ يُصَــلَّى عَلَيْــهِ﴾رواه أصحاب السنن بسندصحیح، منداڵ نوێژیجەنازەی له سەر دەکرێ.

ئینجـا بزانـه: بـه (إجمـاع)ی زانایانیئیسـلام واجبـه: نوێژیجـەنازه لـه سـەر منـداڵیمردوو بکرێ، ئەم حەدیسەش کـه دەفـەرموێ: ﴿أنَّ النَّبِيَّﷺ لَمْ يُصَــلِّ عَلَــى ابْنِــهِ إبْــرَاهِيمَ﴾. پێغەمبەرﷺ نوێـژی جـەنازەی لـه سـەر (ابـراهیم)ی کـوڕی نـەکرد. مەبەسـت ئەوەیـه: بـه خـۆی نوێـژی لـه سـەر نـەکرد؟ چـونکه پێغەمبـەرﷺ لـەو ڕۆژەدا بـه نوێـژی ڕۆژگیرانـەوه خەریك بوو—هەر وەك له نوێژی ڕۆژگیراندا ڕابـرا— واتـه: فـەرمانی بـه (صـحابه)کـان کـرد: نوێژی لـه سـەر بکـەن. هـەروەك لـه ڕیوایەتێکـدا هـاتوه: ﴿نوێـژی لـه سـەر کـردوه﴾. لـه (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوه.

دووەم: (وَإنْ لَمْ تَظْهَرْ) ئەگەر هیچ نیشانەیەکی زیندووەتیی بەدەر نەکەوتو بـه مردوویـی هاته دەرەوەو (وَلَمْ يَبْلُغْ أرْبَعَةَ أشْهُرٍ) تەمەنیشی لـه نـاو زگـی دایکـیدا نەگەیشـتبوه چـوار

**لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ وَكَذَا إِنْ بَلَغَهَا فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ يُغَسَّلُ الشَّهِيدُ وَلاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ، وَهُوَ مَنْ مَاتَ فِي قِتَالِ الْكُفَّارِ بِسَبَبِهِ، فَإِنْ مَاتَ بَعْدَ إِنْقِضَائِهِ أَوْ فِي قِتَالِ الْبُغَاةِ**

---

مانگ، واته: وێنەی ئادەمیزادی ئاشکرا نەبوبێ (لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ) دروست نیه: نوێژی لە سەر بکرێ، پێویستیش نیه بشۆرێ، بەڵکو تەنها سوننەتە: لە ناو پەڕۆکێك دابندرێو ژێر خاك بکرێ.

(وَكَذَا) هەروەها ئەو کۆرپەی بە مردوویی دێتە دەرەوە، دروست نیه: نوێژی لە سەر بکرێ (إِنْ بَلَغَهَا) ئەگەر تەمەنیشی لە ناو زگی دایکیدا گەیشتبێتە چوار مانگو سەرەوەتریش، واتە: وێنەی ئادەمیزادی ئاشکرا بوبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام ئەمەیان واجبە: بشۆرێو کفن بکرێو بنێشترێ.

کەواتە: ئەو کۆرپەیەی بە مردوویی دێتە دەرەوە، لە فەرموودەی بەهێزتردا جیاوازی نیه: نۆ مانگی تەواو کردبن، یان لە نۆ مانگ کەمتر بێ، لە هیچ حاڵەتێکدا نوێژی لە سەر ناکرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ نوێژی جەنازە لە سەر شەهید ناکرێ ﴾

(وَلاَ يُغَسَّلُ الشَّهِيدُ) دروست نیه: مرۆڤی شەهید بشۆرێ، تاکو ئاسەواری شەهیدبوونی هەر پێوە بمێنێ (وَلاَ يُصَلَّى عَلَيْهِ) دروست نیه: نوێژی جەنازەشی لە سەر بکرێ، چونکە بە فەرموودەی قورئان: شەهید هەر زیندووە، هەم ﴿وَعَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ فِي قَتْلَى أُحُدٍ: بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی شەهیدەکانی (أُحد) فەرمانی دا: بە بەرگی خوێناوییانەوە بنێشترێن، نەشۆرانو نوێژیان لە سەر نەکرا.

(وَهُوَ) مرۆڤی شەهید (مَنْ مَاتَ) ئەو کەسەیە: بمرێ (فِي قِتَالِ الْكُفَّارِ) لە جەنگی کافراندا، جیاوازی هیچ جۆرە کافرێك نیه (بِسَبَبِهِ) بە هۆی جەنگەکە لە حاڵەتی جەنگەکەدا بمرێ، جیاوازی نیه لە گەرمەی جەنگدا: بە دەستی کافرێك بکوژرێ، یان چەکی موسوڵمانێکی بە هەڵە وێبکەوێ، یان هەر چەکەکەی خۆی وێبکەوێتەوە، یان بکەوێتە ناو بیرێك، یان لە بەرزایی بکەوێتە خوارەوە، یان بە وڵاغ، یان بە ئوتومبیل بفەوتێ، یان موسوڵمانێکی بە کرێگیراوی کافرەکان بیکوژێ، هەروەها جیاوازی نیه شەهیدەکە: پیاو بێ، یان ئافرەت، گەورە بێ، یان منداڵ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ مَاتَ) جا ئەگەر موسوڵمانەکە بە هۆی جەنگی کافران مرد، بەڵام (بَعْدَ إِنْقِضَائِهِ) مردنەکەی لە دوای تەواوبوونی جەنگ بوو: وەك لە گەرمەی جەنگدا بریندار ببێ، بەڵام نەمرێ، ئینجا جەنگەکە تەواو ببێو برینداره‌کەش هێشتا گیانی جێگیری تێدا مابێ، ئینجا بمرێ (أَوْ فِي قِتَالِ الْبُغَاةِ) یان موسوڵمانەکە لە جەنگی ئەو موسوڵمانانە بکوژرێ:

فَغَيْرُشَهِيد فِي الأَظْهَرِ، وَكَذَا فِي الْقِتَالِ لاَ بِسَبَبِهِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلَوِ اُسْتُشْهِدَ جُنُبٌ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَ يُغَسَّلُ وَأَنَّهُ تُزَالُ نَجَاسَتُهُ غَيْرَالدَّمِ، وَيُكَفَّنُ فِي ثِيَابِهِ الْمُلَطَّخَةِ بِالدَّمِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ ثَوْبُهُ سَابِغاً تُمِّمَ.

---

كە لە دژی پێشەوای ئیسلام بە ناهەق جەنگ دەکەن، واتە: بە دەستی ئەو موسوڵمانانە بکوژرێ، یان کافرەکان بە دیل بیگرن، ئینجا پاش ماوەیەك بیکوژن (فَغَيْرُ شَهِيدٍ) ئەوە لە هەرسێك مەسەلەکەدا ئەو جۆرە شەهیدە نیە: کە ناشۆرێ‌و نوێژی لە سەر ناکرێ (فِي الأَظْهَرِ) لەفەرموودەی بەهێزتردا، بەڵکو لە هەرسێك مەسەلەکەدا–وەکو شەهیدی قیامەت–واجبە: بشۆرێ‌و نوێژی لە سەر بکرێ.

بەڵام لە مەسەلەی یەکەمدا ئەگەر برینداره‌کە لە کۆتایی جەنگدا تەنها جولەی سەربڕاوی مابو، واتە: بزوتنی بە ویستی خۆی نەبو، ئەوەیان وەك ئەو شەهیدەی لە جەنگدا مردبێ، بە شەهیدی تەواو دادەندرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَكَذَا) هەروەها ئەو کەسەش شەهید نیە: کە دەمرێ (فِي الْقِتَالِ) لە جەنگی کافراندا (لاَ بِسَبَبِهِ) بەڵام بە هۆی جەنگەکە نەمرێ: وەك کتوپڕ بمرێ، یان بە هۆی نەخۆشی، یان موسوڵمانێك بە قەسدی بیکوژێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَلَوِ اُسْتُشْهِدَ جُنُبٌ) ئەگەر جەنابەتدار، یان حەزیزدار شەهید بوو (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يُغَسَّلُ) دروست نیە بشۆرێ ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: اُسْتُشْهِدَ حَنْظَلَةُ يَوْمَ أُحُدٍ وَهُوَ جُنُبٌ وَلَمْ يُغَسِّلْهُ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: رَأَيْتُ الْمَلاَئِكَةَ تُغَسِّلُهُ﴾ رواه ابن حبان والبيهقي بإسناد جيد، (حنظلة) لە غەزای(أُحد) شەهید بوو و جەنابەتداریش بوو، پێغەمبەرﷺ نەیشۆردو فەرمووی: بینیم (ملائكة) دەیشۆن. واتە: ئەگەر شۆردنی واجب بێ، بە شۆردنی (ملائكة) لە سەر ئێمە لا ناچێ.

(وَأَنَّهُ تُزَالُ نَجَاسَتُهُ غَيْرَالدَّمِ) لە فەرموودەی ڕاستتردا واجبە: جگە لە خوێنی شەهیدبوون گشت پیسیەکیتری لێ‌لابردرێ، هەرچەند خوێنی شەهیدیشی لەگەڵ لابچێ (وَيُكَفَّنُ فِي ثِيَابِهِ الْمُلَطَّخَةِ بِالدَّمِ) سوننەتە: هەر لە جلە خوێناویەکانی‌خۆی‌دا شەهید کفن بکرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جابر)ی‌ڕابردوو (فَإِنْ لَمْ يَكُنْ ثَوْبُهُ سَابِغاً) جا ئەگەر جلەکانی شەهید هەموو لاشەی دانەدەپۆشی (تُمِّمَ) واجبە کفنەکەی بۆ تەواو بکرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (مصعب)ی‌ڕابردوو: لە باسی کفندا.

﴿ ئاگاداری ﴾ شەهید لە ئیسلامدا سێ بەشن، یەکەم: شەهیدی دونیاو قیامەت، واتە: لە دونیادا ناشۆرێ‌و نوێژی لە سەر ناکرێ، لە قیامەتیشدا پاداشێکی تایبەتی هەیەو لە لای خوای گەورە زیندووەو خواردنی دەدرێتێ، ئەم بەشە ئەو جۆرە شەهیدەیە: کە لە

ڕێگەی خوایگەورە بۆ بەرزکردنەوەی ئیسلام لە جەنگی کافراندا لە گەرمەی جەنگدا شەهید بوبێ، هەروەك باسمان کرد.

دووەم: شەهیدی دونیا –نەك قیامەت–: کە لە جەنگیکافراندا شەهید بوبێو لە گەرمەی جەنگیشدا مردبێ، بەڵام دزیی لە تاڵان کردبێ، یان لە حاڵەتی بەزینو هەڵاتندا کوژرابێ، یان بۆ ناوبانگی دونیاو مەدح کردن جەنگی کردبێ، ئەوە لە دونیادا وەك بەشییەکەم ناشۆرێو نوێژی لە سەر ناکرێ، بەڵام لە قیامەتدا پاداشی نیە، هەروەك لە چەند حەدیسێکی (بخاري)و (مسلم)دا هاتوە، بەڵام ئەگەر تەنها بە مەبەستیشەهیدبوون جەنگ بکا، ئەویش وەك بەشی یەکەم شەهیدی دونیاو قیامەتە، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

سێیەم: شەهیدی قیامەت –نەك دونیا–: وەك بە ناهەق کوژرابێ، یان بە نەخۆشیی زگ، یان بە تاعون، یان بە خنکان لە ئاودا، یان بە ڕوخانی شتێك بە سەریا، یان بە سووتانو بروسك لێدان، یان لە دوور وولات مردبێ، یان لە حاڵەتی خوێندنیئایینیدا مردبێ، یان بە هۆی منداڵ لێبوون مردبێ، یان بە هۆی عیشقێکی حەڵاڵو بێگوناه مردبێ، ئەوانە گشتیان لە دونیادا دەشۆرێنو نوێژیان لە سەر دەکرێ، بەڵام لە قیامەتدا پاداشتی تایبەتییان هەیە، هەروەك لە چەند حەدیسێکی(صحیح)دا هاتوەو، لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراونەوە.

ئینجا بزانە: هەر کەسێك بەخۆی خۆی بکوژێ، ئەوە بە شەهید دانانرێو بە دۆزەخیش سزا دەدرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْءٍ عُذِّبَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمِ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك بەخۆی خۆی بکوژێ بە شتێك، هەر بەو شتە لە ئاگری دۆزەخدا سزادەدرێ. (اَللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ) آمين.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ناشتنی مردوو ﴾

(أَقَلُّ الْقَبْرِ) لای کەمی گۆڕ: کە واجبەکەی پێ پێك بێ (حُفْرَةٌ) چاڵێکی وەك جۆگەیە: کە (تَمْنَعُ الرَّائِحَةَ) ڕێگەی بۆنیمردووەکە بگرێ: لە دوای ناشتن بۆنی مردووەکە نەیەتە دەرەوە (وَالسَّبُعَ) هەروەها ڕێگەی دڕندەش بگرێ: چاڵەکە هەڵنەکەنێو مردووەکە نەخوا، کەوابو: دروست نیە مردووەکە لە سەر ڕووی زەوی دابندرێو خۆڵو بەردێکی زۆری لە سەر دابندرێ، واتە: بە بەر ناشتن ناکەوێ، هەرچەند ڕێگەی بۆنهاتنو دڕندەش بگرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بە بەڵگەی حەدیسەکەیداهاتوو.

بەڵام ئەگەر عوزرێك هەبو: وەك چاڵەکە هەڵنەکەندرێ، یان زەویەکە ئاوی لێهەڵدەقوڵاو تەڕایەتیەکی وەهای لێ هەبو: زیانی بە مردووەکەو بە کفنەکەی دەگەیاندو شوێنێکی

وَيُنْدَبُ أَنْ يُوَسَّعَ وَيُعَمَّقَ قَدْرَ قَامَةٍ وَبَسْطَةٍ، وَاللَّحْدُ أَفْضَلُ مِنَ الشَّقِّ إِنْ صَلُبَتِ الأَرْضُ، وَيُوضَعُ رَأْسُهُ عِنْدَ رِجْلِ الْقَبْرِ، وَيُسَلُّ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ بِرِفْقٍ وَيُدْخِلُهُ الْقَبْرَ الرِّجَالُ،

---

تريش نەبو، ئەو كاتە-بە هۆی عوزرەكە- ئەو شێوەیەی سەر زەویش دروستە هەروەك لە (الشبراملسي)و (البجيرمي)دا فەرموویانە.

(وَيُنْدَبُ) سوننەتە: (أَنْ يُوَسَّعَ) گۆڕەكە فراوان بكرێ: لە بەرینیو لە درێژاییدا (وَيُعَمَّقَ) سوننەتە: گۆڕەكە قووڵ بكرێ (قَدْرَ قَامَةٍ) بە ئەندازەی بالای پیاوێكو، هەم (وَبَسْطَةٍ) لەگەڵ دەستێكیبەرزكراوەش، واتە: پیاوەكە لە ناو گۆڕەكەدا بە پێوە ڕابوەستێو هەردوو دەستەكانیشی بەرەو سەرەوە بەرز بكاتەوەو پەنجەكانیشی بكاتەوە، پێغەمبەرﷺ لە غەزای(أحد)دا فەرمووی: ﴿إِحْفِرُوا وَأَعْمِقُوا وَأَوْسِعُوا﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، لە زەویدا چاڵ هەڵكەنن، چاڵەكەش قووڵ بكەنو فراوانی بكەن.

(وَاللَّحْدُ) گۆڕی لادڕ (أَفْضَلُ) خێرترە (مِنَ الشَّقِّ) لە گۆڕی ناودڕ (إِنْ صَلُبَتِ الأَرْضُ) ئەگەر خاكەكە ڕەقو توند بێ ﴿عَنْ سَعد بنِ أَبِيوَقَّاصٍ: أَلْحِدُوا لِي لَحْداً كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللهِﷺ﴾ رواه مسلم، گۆڕێكی لادڕ بۆ من هەڵكەنن، هەروەك بۆ پێغەمبەرﷺ لادڕ هەڵكەندراوە.

ئینجا بزانە: لادڕ ئەوەیە: كە قووڵایی گۆڕەكە تەواو كرا، بنەوەی تەنیشتی لای قیبلە هەڵبدڕێو مردووەكەی لە ناو دابندرێ، ئینجا بە دیوارێك دا بپۆشرێو گۆڕەكە پڕ بكرێتەوە. هەروەها ناودڕ ئەوەیە: كە قووڵایی گۆڕەكە تەواو كرا، لەم لاو لەو لای دیوار بكرێو مردووەكە لە نێوان هەردوو دیوارەكە دابندرێ، ئینجا بانێكی لە سەر بكرێو كەلێنەكانی بگیرێو گۆڕەكە پڕ بكرێتەوە، جا ئەگەر خاكەكە ڕەقو توند نەبو، ئەو كاتە ئەم شێوەی ناودڕ خێرترە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيُوضَعُ رَأْسُهُ) سوننەتە: سەریمردووەكە دابندرێ (عِنْدَ رِجْلِ الْقَبْرِ) لە لای پێی گۆڕەكە، واتە: ئەو لایەی دەبێتە لای پێی مردووەكە، كە لە ناو گۆڕەكەی دادەندرێ (وَيُسَلُّ) سوننەتە: مردووەكە لە ناو دارجەنازە بهێندرێتە دەرەوە (مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ) لە لای سەریەوە (بِرِفْقٍ) بە هێواشی، تاكو لای سەریمردووەكە بە لای پێیگۆڕەكەدا بدرێتە دەست ئەو كەسەی لە ناو گۆڕەكەدا وەریدەگرێ.

(وَيُدْخِلُهُ الْقَبْرَ الرِّجَالُ) سوننەتە پیاوەكان مردووەكە بنێنە ناو گۆڕەكە، هەرچەند مردووەكەش ئافرەتێكی بێگانە بێ، چونكە پیاوەكان بەهێزترو داپۆشراوترن بۆ ئەوكارە قورسانە ﴿عَنْ أَنَسٍ: شَهِدْنَا بِنتَ رَسُولِ اللهِﷺ-وَرَسُولُ اللهِﷺ جَالِسٌ عَلَىالْقَبْرِ-فَأَمَرَ أَبَاطَلْحَةَ فَنَزَلَ فِي قَبْرِهَا فَقَبَّرَهَا﴾ رواه البخاري، بەشداری جەنازەی (أم كلثوم)ی كیژی

وَأَوْلاَهُمُ الأَحَقُّ بِالصَّلاَةِ، قُلْتُ: إِلاَّ أَنْ تَكُونَ امْرَأَةً مُزَوَّجَةً فَأَوْلاَهُمُ الزَّوْجُ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيَكُونُونَ وِتْراً، وَيُوضَعُ فِي اللَّحْدِ عَلَى يَمِينِهِ لِلْقِبْلَةِ، وَيُسْنَدُ وَجْهُهُ إِلَى جِدَارِهِ، وَظَهْرُهُ بِلَبِنَةٍ وَنَحْوِهَا،

---

پێغەمبەرمانﷺ کرد، لەو کاتەش پێغەمبەرﷺ لە سەر گۆڕەکەی دانیشتبو، جا فەرمانیدا: (أبو طلحة) چووە ناو گۆڕەکەی‌و جەنازەکەی لە ناو گۆڕەکە دانا.

(وَأَوْلاَهُمُ) لەپێشترینی پیاوەکان بۆ دانانی مردوو لە ناو گۆڕەکەی (الأَحَقُّ بِالصَّلاَةِ) ئەوانەن: کە بۆ نوێژ لە سەرکردن لەپێشتر بون (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفەرموێ: (إِلاَّ أَنْ تَكُونَ امْرَأَةً مُزَوَّجَةً) مەگەر مردووەکە ئافرەتێکی بەمێرد بێ، ئەو کاتە (فَأَوْلاَهُمُ الزَّوْجُ) مێردەکەی—ئەگەر توانای هەبێ—لەپێشترە بۆ دانانی لە ناو گۆڕەکەی: لە باوک‌و کوڕو گشت پیاوەکانی‌تریش، واتە: بەڵام لە جەنازەی (أم كلثوم)ی‌رابردوودا ئیمامی (عثمان)ی مێردی—بە هۆی دڵتەنگی— نەیتوانی بینێتە ناو گۆڕەکەی (وَاللهُ أَعْلَمُ).

(وَيَكُونُونَ وِتْراً) سوننەتە: ئەوانەی مردووەکە لە ناو گۆڕ دادەنێن تاک بن (وَيُوضَعُ فِي اللَّحْدِ) مردووەکە لە ناو گۆڕەکەی دادەندرێ (عَلَى يَمِينِهِ) لە سەر تەنیشتی ڕاستەی، واتە: ناپەسندە: لە سەر تەنیشتی چەپەی دابندرێ (لِلْقِبْلَةِ) واجبە: مردووەکە لە سەر تەنیشتەکەی بەرەو قیبلە دابندرێ، چونکە ﴿لە سەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ تا ئێستا گشت مردووێکی موسوڵمان هەر بەرەو قیبلە نێژراوە﴾.

کەوابو: ئەگەر مردووەکە ڕوو لە لایەکی‌تری جگە لە قیبلە نێشترابو، یان لە ناو گۆڕەکەی لە سەر پشت درێژ کرابو، دروست نیەو واجبە: لە گۆڕەکەی دەری بێنن‌و بەرەو قیبلە بکرێ، بەو مەرجەی تێک نەچوبێ، واتە: ئەگەر بۆن بوبێ، یان ڕزی بێ، ئەو کاتە دروست نیە: دەری بێنن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئافرەتێکی‌ناوسی‌کافر مردو کۆرپەیەکی موسوڵمانی لە زگدا بوو، کۆرپەکەش گیانی تێ‌کرابو، ئەو ئافرەتە لە نێوان گۆڕستانی موسوڵمانان‌و کافران دەنێشترێ‌و واجبە: پشتی لە قیبلە بکرێ، تاکو کۆرپە موسوڵمانەکە ڕووی بکەوێتە قیبلە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُسْنَدُ وَجْهُهُ إِلَى جِدَارِهِ) سوننەتە: ڕووی مردووەکە پاڵ وەدیواری گۆڕەکەی بدرێ، هەروەهاش پێیەکانیشی، تاکو بە سەر ڕوویدا نەکەوێ (وَظَهْرُهُ بِلَبِنَةٍ) سوننەتە: لای پشتیشی پاڵ وەخشتێك بدرێ (وَنَحْوِهَا) یان شتێکی وەکوخشت، تاکو بە لای پشتەوەدا نەکەوێ، ئینجا سوننەتە: کفنەکەی لە کوڵمەی ڕاستەی لابدرێ‌و کوڵمەکەی بە ڕووتی لە سەر کۆمەڵە خۆڵێك، یان لە سەر خشتێك دابندرێ، هەروەك لە سەرچاوکاندا فەرموویانە.

وَيُسَدُّ فَتحُ اللَّحْد بِلَبِنٍ، وَيَحْثُو مَنْ دَنَا ثَلاَثَ حَثَيَات تُرابٍ ثُمَّ يُهَالُ بالْمَسَاحِي، وَيُرْفَعُ الْقَبْرُ شِبْراً فَقطْ، وَالصَّحِيحُ أَنَّ تَسْطِيحَهُ أَوْلَى مِنْ تَسْنِيمِهِ، وَلاَ يُدْفَنُ إِثْنَان فِي قَبْرٍ إِلاَّ لِضَرُورَة، فَيُقَدَّمُ أَفْضَلُهُمَا،

---

ئينجا (وَيُسَدُّ فَتْحُ اللَّحْدِ) واجبه: زاركی لادڕەکه بگيرێ (بِلَبِنٍ) به خشت، يان به شتێکیتر، ئينجا گۆڕەکه پڕ بکرێتەوە، هەروەهاش واجبه: ديواری ناودڕەکه بانێکی له سەر بکرێ، به شێوەيەکی وەها: پاڵەپەستەی مردووەکه نەکا، ئينجا گۆڕەکه پڕ بکرێتەوە، هەروەك له مەو پێش ڕوونمان کردەوە.

(وَيَحْثُو مَنْ دَنَا) ئەو کەسەی له گۆڕەکه نزيکه، سوننەته: بيڕژێنێته ناو گۆڕەکه (ثَلاَثَ حَثَيَات تُرابٍ) سێ مستەخۆڵ به هەردوو دەستەکانی ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حَثَا عَلَى الْمَيِّتِ مِنْ قِبَلِ رَأْسِهِ ثَلاَثاً﴾ رواه ابن ماجه والبيهقي بإسناد جيد، پێغەمبەر ﷺ سێ مستەخۆڵی پڕژاندنه سەر مردووەکەی ناو گۆڕ له لای سەريەوە.

ئينجا سوننەته: لەگەڵ مستی يەکەمدا بڵێ: ﴿مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ﴾. له دووەمدا بڵێ: ﴿وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ﴾. له سێيەمدا بڵێ: ﴿وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾. چونکه ئەوانەش له حەديسێکی بێهێزدا هاتون (ثُمَّ) ئينجا له دوای ئەو مسته خۆڵانه (يُهَالُ) گۆڕەکه خۆڵی تێدەکرێتەوە (بِالْمَسَاحِي) به بێڵ و بەو جۆره شتانه.

(وَيُرْفَعُ الْقَبْرُ شِبْراً) سوننەته: گۆڕەکه به قەد بستێك بڵند بکرێ، وەکو گۆڕی پێغەمبەر ﷺ تاکو بزاندرێ: گۆڕه (فَقَطْ) زياتر بڵند نەکرێ (وَالصَّحِيحُ) به فەرموودەی ڕاست (أَنَّ تَسْطِيحَهُ) سەرگۆڕکردن=سەرتەختکردنی گۆڕەکه (أَوْلَى) خێرتره (مِنْ تَسْنِيمِهِ) له سەر باريککردنیی.

ئينجا بزانه: له حەديسێکی(صحيح)دا هاتوه: ﴿گۆڕی پێغەمبەر ﷺ سەرگۆڕ کراوه﴾. له حەديسێکیتری (صحيح)دا هاتوه: ﴿گۆڕی پێغەمبەر ﷺ سەرباريك بوو﴾. جا ئيمامی (البيهقی) وەڵامی داوەتەوە: که له سەرەتاوه سەرگۆڕ کرابو، بەڵام ديوارەکانی ڕوخان و له سەردەمی (أُمَوي)يەکاندا سەرباريك کرا، هەروەك له (المجموع)و(تحفه)دا فەرموويانه.

(وَلاَ يُدْفَنُ إِثْنَان فِي قَبْرٍ) دروست نيه: دوو مردوو، يان زياتر له ناو يەك گۆڕدا بنێشترێن، ئەگەر ديوارێك له نێوانياندا نەکرێته پەرده، واته: ئەگەر ديوارێك له نێوان هەردوو مردووەکەدا کرا پەرده، ئەوکاته دروسته، هەروەك له (تحفة)دا ئاماژەی بۆ کردوه (إِلاَّ لِضَرُورَة) تەنها له بەر ناچاری نەبێ: وەك مردوو زۆر بن و زەحمەت بێ هەر يەکەيان له گۆڕێکدا بنێشترێ، ئەو کاته دروسته: دوو مردوو، يان زياتر له ناو يەك گۆڕدا بنێشترێن، جا لەو حاڵەتەدا (فَيُقَدَّمُ أَفْضَلُهُمَا) کام مردوو گەورەتره، ئەو وەپێش دێخرێ بۆ لای قيبله

## وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى الْقَبْرِ وَلاَ يُوطَأُ،

﴿عَنْ هشام: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ فِي قَتْلَى أُحُد: إجْعَلُوا الرَّجُلَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي الْقَبْرِ، قِيلَ: فَأَيُّهُمْ يُقَدَّمُ؟ قَالَ أَكْثَرُهُمْ قُرْآناً﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، دەربارەی شەهیدەکانی (أحد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دوو پیاو و سێ پیاو لە ناو گۆڕێك دابنێن، گوترا: کامەیان لە لای قیبلە بێ؟ فەرمووی: ئەوەی زۆرتر قورئانی خوێندوە.

ئینجا بزانە: لەو حاڵەتەدا نێرینە لە لای قیبلە دادەندرێ، ئینجا ئافرەت، لە نێرینەکانیش: گەورە وەپێش منداڵ دێخرێ، هەروەها لە ئافرەتانیش: گەورە وەپێش منداڵ دێخرێ، بەڵام بە هەموو جۆرێك باوك وەپێش کوڕی خۆی دێخرێو دایکیش وەپێش کیژی خۆی دێخرێ، ئینجا سوننەتە: لە نێوان ئەم مردووەو مردووەکەی‌تردا خۆڵ دابندرێو بکرێتە پەردە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: ئەگەر گۆڕێك هەڵکەندراو گەیشتە ئێسقانی مردووێکی‌تر، تەماشا دەکرێ: ئەگەر چاڵەکە تەواو هەڵنەکەندرابو، واجبە: گۆڕەکە پڕ بکرێتەوەو وازی لێ‌بێنن.

بەڵام ئەگەر چاڵەکە تەواو هەڵکەندرابو، ئەوجا ئێسقانەکان دەرکەوتن، ئەو کاتە ئێسقانەکان لە لایەکی‌گۆڕەکە دادەندرێنو مردووەکەش تێیدا دەنێشترێ، واتە: دروست نیە مردووەکە لە سەر ئێسقانەکان بنێشترێ، چونکە حەرامە: مردووێك لە سەر مردووێکی‌تر بنێشترێ، مەگەر گشت ئێسقانەکانیشی ڕزی بن، ئەو کاتە دروستە، کەواتە: هەر کاتێك مردووەکە هیچ ئێسقانی نەمانو گشتی بووە خۆڵ، دروستە: گۆڕەکەی هەڵبکەندرێو مردووێکی‌تری تێدا بنێشترێ، بەو مەرجەی گۆڕەکە هی (صَحابَة)و پیاوچاکە ناودارەکان نەبێ، چونکە هەڵکەندنەوەی گۆڕی ئەوانە، لە دوای ڕزینیش قەدەغەیەو حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُجْلَسُ عَلَى الْقَبْرِ) نابێ، واتە: ناپەسندە دانیشتن لە سەر گۆڕی موسوڵمانان، هەروەها ناپەسندە پاڵی وێبدرێ، یان لە سەری پاڵ بدرێتەوە (وَلاَيُوطَأُ) نابێو ناپەسندە پێی لە سەر دابندرێ: جا لە سەری بڕوا، یان لە سەری ڕابوەستێ، چەند زانایەکیش فەرموویانە: ئەوانەی‌ڕابردوو گشتی حەرامن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ﴾رواه مسلم، یەکێکتان لە سەر پشکۆیەکی‌ئاگر دابنیشێو جلەکانی بسوتێنێ تا دەگاتە پیستەکەی، باشترە لەوەی لە سەر گۆڕی موسوڵمانێك دابنیشێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ناچار بوو: وەك نەگاتە گۆڕی مردووەکەی خۆی، یان نەدەگونجا گۆڕێکی‌تر لە تەنیشتی هەڵبکەنێ، یان گۆڕەکە گۆڕی کافرێك بوو، لەو حاڵەتانەدا ناپەسند نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَيَقْرُبُ زَائِرُهُ كَقُرْبِه مِنْهُ حَيّاً، وَالتَّعْزِيَةُ سُنَّةٌ قَبْلَ دَفْنِه وَبَعْدَهُ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ،

(وَيَقْرُبُ زَائِرُهُ) ئەو كەسەی زیارەتی مردوویێك دەكا، سوننەتە: لە گۆڕەكەی نزیك ببێتەوە (كَقُرْبِه مِنْهُ حَيّاً) بەو ئەندازەیەی لە حاڵەتی زیندووەتی‌دا لێی نزیك دەبۆوە، ئیتر لە باسی (زیارەتی گۆڕستاندا) ئێرە زیاتر ڕوون دەكەینەوە، إن شاء الله تعالى.

## ﴿ باسی تازیەو گریان ﴾

(وَالتَّعْزِيَـةُ) تازیـە، واتـە: دڵدانـەوەی خزمەكانی‌مردووەكـە (سُـنَّةٌ) سـوننەتەو خێـرە ﴿عَنْ عَبْدِالله بن عَمْرو رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قالَ لِفَاطِمَةَ: مَا أَخْرَجَكِ يَا فَاطِمَةُ مِنْ بَيْتِـكِ؟ قَالَتْ أَتَيْتُ أَهْلَ هَذَاالْمَيِّت فَتَرَحَّمْتُ إِلَيْهِمْ مَيِّتَهُمْ، أَوْ عَزَّيْتُهُمْ بِه﴾ حديث حسن رواه ابوداود والنسائي، پێغەمبەر ﷺ فەرموویە (فاطمـة)ی‌كیـژی‌خۆی: ئـەوە لـە بەرچی لـە ماڵـەوەت هاتویتـە دەرەوە؟ (فاطمـة) فـەرمووی: هاتمـە لای خزمـەكانی ئـەم مـردووە، دوعـام بـۆ مردووەكەیان كردو دڵم دانەوە.

ئینجا بزانە: سوننەتە: تازیە لە گشت خزمەكانی مردووەكە بكا: گـەورەو بچوكو ئـافرەتو پیاو، هەروەها لە دۆستو مێردو ژنو خەزورو خەسوشی، بـەڵام نابـێ ئافرەتی‌گـەنج تازیـە لە پیاوی بێگانـە بكـاو نابـێ بێگانـەش تازیـە لـە ئافرەتی‌گـەنج بكـا، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها بزانە: تازیە تایبەت نیە تەنها بە مـردن، بـەڵكو هـەر بەڵایـەكی‌گیانی، یـان مـاڵی، تووشـی موسـوڵمان ببـێ، سـوننەتە: تازیـەی لـێ‌بكرێو دڵـی بدرێتـەوە، پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّى أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ إِلاَّ كَسَاهُ اللهُ عزوجل مِنْ حُلَـلِ الْكَرَامَـةِ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ رواه إبن ماجه والبيهقي بإسناد حسن، هەر ئیماندارێك تازیە لـە برای‌خـۆی بكـا بـە هۆی بەڵایەك، خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا خشڵی ڕێزداری‌ی دەبەر دەكا.

ئینجا كاتی تازیە لـە مردنـەوە دەست پـێ دەكـا (قَبْـلَ دَفْنِـه) پـێش ناشتنی مردووەكـە، چونكە لەو كاتـەدا زۆرتـر دڵتـەنگن (وَبَعْدَهُ) لـە دوای ناشـتنیش تازیەكـە بـەردەوام دەبـێ (ثَلاَثَـةَ أَيَّـامٍ) سـێ ڕۆژان، واتـە: تازیـەكردن لـە دوای ئەوسـێ ڕۆژانـە ناپەسـندە، مەگـەر تازیەدارەكە لەو ماوەیەدا ئامادە نەبوبێ، یـان تازیەكەرەكـە هـەواڵی‌مردنی نـەزانیبێ، یان لـە سـەفەر بوبـێ، لـەو حاڵەتانـەدا لـە دوای سـێ ڕۆژەكـان ناپەسـند نیـە، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لە گشت سەرچاوەكاندا فەرموویانە: ناپەسندە خزمەكان لـە شـوێنێك دابنیشـنو كۆ ببنەوە تاكو خەڵك تازیەیان لێ‌بكا، بەڵكو دەبی هـەر كەسـەیان بـۆ كـارو پێویسـتیەكانی خۆی بڕوا، جـا هـەر كەسێك بیانگاتـێ، تازیـەیان لـێ‌بكا، هـەروەك لـە (المجموع)و(تحفة)دا فەرموویانە.

وَيُعَزَّى الْمُسْلِمُ بِالْمُسْلِمِ: أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ. وَبِالْكَافِرِ: أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَصَبَّرَكَ. وَالْكَافِرُ بِالْمُسْلِمِ: غَفَرَاللهُ لِمَيِّتِكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ. وَيَجُوزُ الْبُكَاءُ عَلَيْهِ قَبْلَ الْمَوْتِ وَبَعْدَهُ، وَيَحْرُمُ النَّدْبُ بِتَعْدِيدِ شَمَائِلِهِ وَالنَّوْحُ وَالْجَزَعُ بِضَرْبِ صَدْرِهِ وَنَحْوِهِ،

---

ئینجا له تازیه‌كردندا فه‌رمان به تازیه‌داره‌كان ده‌كا: خۆڕاگر بن له به‌رامبه‌ر ئه‌و به‌ڵایه‌و باسی پاداشتی قیامه‌تیان بۆ ده‌كا، كه‌واته: ئه‌وحه‌دیسانه‌شیان بۆ ده‌خوێنێته‌وه: كه باسی پاداشتی مردنی‌منداڵه‌كان‌و به‌ڵایه‌كانی‌تر ده‌كه‌ن.

هه‌روه‌ها دوعا بۆ مردووه موسوڵمانه‌كه‌ش ده‌كا، كه‌وابو: (وَيُعَزَّىالْمُسْلِمُ) كه تازیه له موسوڵمان ده‌كرێ (بِالْمُسْلِمِ) به هۆی مردووه موسوڵمانه‌كه‌ی، سوننه‌ته تازیه‌كه‌ره‌كه بڵێ: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ وَغَفَرَ لِمَيِّتِكَ) خوا پاداشت گه‌وره‌بكاو خوا سه‌برو دڵدانه‌وه‌یه‌كی جوانت بداتێ‌و خوا له مردووه‌كه‌ت خۆش ببێ.

(وَ) هه‌وره‌ها كه تازیه له موسوڵمان ده‌كرێ (بِالْكَافِرِ) به هۆی مردووه كافره‌كه‌ی، تازیه‌كه‌ره‌كه بڵێ: (أَعْظَمَ اللهُ أَجْرَكَ وَصَبَّرَكَ) خوا پاداشتت گه‌وره بكاو سه‌برت بداتێ.

(وَالْكَافِرُ) كه تازیه له كافر ده‌كرێ (بِالْمُسْلِمِ) به هۆی مردووه موسوڵمانه‌كه‌ی، تازیه‌كه‌ره‌كه بڵێ: (غَفَرَاللهُ لِمَيِّتِكَ وَأَحْسَنَ عَزَائَكَ) خوا له مردووه‌كه‌ت خۆش ببێ‌و سه‌برو دڵدانه‌وه‌یه‌كی جوانت بداتێ.

(وَيَجُوزُ الْبُكَاءُ عَلَيْهِ) گریان دروسته له سه‌ر مردووه‌كه (قَبْلَ الْمَوْتِ) پێش گیان ده‌رچوونی ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ-وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ- فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللهِ ﷺ تَذْرِفَانِ...﴾ الحديث رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌ر ﷺ (ابراهیم)ی كوڕی خۆی ماچ كردو بۆنی كرد-له‌و حاڵه‌ته‌دا (ابراهیم) گیانی ده‌رده‌چو- ئینجا چاوه‌كانی پێغه‌مبه‌ر ﷺ فرمێسكی لێ‌ده‌ڕژا خواره‌وه.

(وَبَعْدَهُ) هه‌روه‌ها له دوای مردنیش گریان دروسته ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: زَارَالنَّبِيُّ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ﴾رواه مسلم، پێغه‌مبه‌ر ﷺ زیاره‌تی گۆڕی دایكی‌خۆی كرد، جا به‌خۆی گریاو خه‌ڵكی ده‌وروبه‌ری خۆیشی گریاند.

(وَيَحْرُمُ النَّدْبُ)حه‌رامه: دولكه‌و پێداهه‌ڵگوتنی مردووه‌كه: (بِتَعْدِيدِ شَمَائِلِهِ) وه‌ك سیفه‌تی به‌رزی باس بكاو مه‌دحی بكا (وَالنَّوْحُ) حه‌رامه ده‌نگ هه‌ڵێنان به هاوارو ڕۆ ڕۆ، هه‌ر چه‌ند نه‌شگرێ (وَالْجَزَعُ) حه‌رامه: ده‌ربڕینی ناڕه‌زایی‌و بێ‌زاری: (بِضَرْبِ صَدْرِهِ) وه‌ك مست له سینه‌ی خۆی بداو (وَنَحْوِهِ) ئه‌و جۆره شتانه: وه‌ك ڕوو ڕنین‌و یه‌خه‌دادڕین‌و موو ڕاكێشان‌و قوڕو خۆڵ به سه‌رداكردن‌و جل گۆڕین‌و دوعای خراپ، پێغه‌مبه‌ر ﷺ

قُلْتُ: هَذِهِ مَسَائِلُ مَنْثُورَةٌ: يُبَادَرُ بِقَضَاءِ دَيْنِ الْمَيِّتِ وَوَصِيَّتِهِ، وَيُكْرَهُ تَمَنِّي الْمَوْتِ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ لاَ لِفِتْنَةِ دِينٍ، وَيُسَنُّ التَّدَاوِي

---

دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ﴾ رواه الشيخان، ئەو کەسە لە ئێمە نیە: کە چەپۆك لە ڕووی خۆی دەداو یەخەی دادەدڕێو بانگەوازی نەفامیی پێش ئیسلامەتی دەکا. واتە: وەك کافرەکان گریەوزاری بۆ مردووەکەی دەکا.

## ﴿ قەرزدانەوەی مردوو و خۆ دەرمانکردن ﴾

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفەرموێ (هَذِهِ) ئەوانەی‌داهاتوو (مَسَائِلُ مَنْثُورَةٌ) چەند مەسەلەیەکی پەرت‌وبڵاون لە بەشەکانی‌ڕابردووی جەنازەدا نەگوتراون:

(يُبَادَرُ) سوننەتە پەلە بکرێ (بِقَضَاءِ دَيْنِ الْمَيِّتِ) بە دانەوەی قەرزی‌مردووەکە، جا ئەگەر بکونجێ، با پێش شۆردن‌و واجبەکانی‌تر قەرزەکەی بدەنەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الترمذي، گیانی مرۆڤی‌ئیماندار –بە هۆی قەرزەکەی– قەدەغە دەکرێ: لە چونە بەهەشت تا قەرزەکەی بۆ دەدرێتەوە. جائەگەر نەگونجا زوو قەرزەکان بدرێنەوە، ئەو کاتە خزمێکی مردووەکە با داوا لە خاوەن قەرزەکان بکا: قەرزەکان حەواڵەی ئەستۆی وی بکەن، تاکو لە ئەستۆی مردووەکە لابچێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَوَصِيَّتِهِ) هەروەها سوننەتە: بە پەلە وەسێتەکانی جێبەجێ بکەن، تاکو زوو خێرەکەی بگاتێ.

(وَيُكْرَهُ) نا پەسندە (تَمَنِّي الْمَوْتِ) مرۆڤ خۆزگەی مردن بکا (لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ) بە هۆی زیانێکی گیانی، یان ماڵی: کە تووشی بوبێ (لاَ لِفِتْنَةِ دِينٍ) بەڵام لە ترسی فیتنەیەك کە تووشی ئایینەکەی ببێ، ناپەسند نیە خۆزگەی مردن بکا: بەم دوعایەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: ﴿لاَيَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَبُدَّ مُتَمَنِّياً لِلْمَوْتِ فَلْيَقُلْ: اَللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْراً لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْراً لِي﴾ رواه الشيخان، کەستان خۆزگەی مردن نەکا بە هۆی زیانێك کە تووشی بوبێ، جا ئەگەر هەر پێویست بوو خۆزگەی مردن بکا، با بڵێ: خوایە ئەوەندەی ژیان بۆ من باشتربێ بمژێنە، هەر کاتێکیش مردن بۆ من باشتر بوو بممرێنە. ئینجا بزانە: خۆزگەیی شەهیدبوون لە ڕێگەی خوا، سوننەتە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُسَنُّ التَّدَاوِي) بۆ مرۆڤی‌نەخۆش سوننەتە: خۆی دەرمان بکا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿تَدَاوَوْا فَإِنَّ اللهَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلاَّ وَضَعَ لَهُ دَوَاءً غَيْرَ الْهَرَمِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، خۆتان دەرمان بکەن چونکە خوای گەورە هەر دەردێکی دانابێ، دەرمانێکیشی بۆ داناوە جگە لە پیری، واتە: پیری دەرمانی نیە.

وَيُكْرَهُ إِكْرَاهُهُ عَلَيْه، وَيَجُوزُ لأَهْلِ الْمَيِّت وَنَحْوِهِمْ تَقْبِيلُ وَجْهِه، وَلاَ بَأْسَ بِالإِعْلاَمِ بِمَوْتِه لِلصَّلاَة وَغَيْرِهَا، بِخِلاَف نَعْيِ الْجَاهِلِيَّة، وَلاَ يَنْظُرُ الْغَاسِلُ مِنْ بَدَنِه إِلاَّ قَدْرَ الْحَاجَة مِنْ غَيْرِ الْعَوْرَة، وَمَنْ تَعَذَّرَ غُسْلُهُ يُمِّمَ،

---

(وَيُكْرَهُ إِكْرَاهُهُ عَلَيْهِ) نا پەسندە زۆر لە نەخۆشەكە بكرێ: بۆ خۆ دەرمانكردن، چونكە خۆ دەرمانكردن واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەلام لە فەرموودەیەكدا: ئەگەر برینێكی وەهای لێبێ: كە مەترسی لە ناوچوونی تێدابێ، ئەو كاتە دەرمانكردنی واجبە، واتە: ئەگەر بزانێ بە دەرمانكردن چاك دەبێتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ لأَهْلِ الْمَيِّتِ) دروستە بۆ خزمەكانی مردووەكەو (وَنَحْوِهِمْ) ئەوانەی وەك ئەوانیش: كە دۆستەكانیەتی (تَقْبِيلُ وَجْهِهِ) رووی مردووەكە ماچ بكەن ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ أَبَابَكْرٍ رضي الله عنه قَبَّلَ وَجْهَ النَّبِيِّ ﷺ بَعْدَ مَوْتِهِ﴾رواه البخاري، ئیمامی (أبوبكر) رووی پێغەمبەری ﷺ ماچ كرد لە دوای وەفاتی.

(وَلاَ بَأْسَ) هیچ نا پەسند نیە (بِالإِعْلاَمِ بِمَوْتِهِ) بە هۆی بانگەوازی كردن بە مردنی مردووەكە (لِلصَّلاَةِ) تاكو خەلك بزانێو بێن نوێژی لە سەر بكەن (وَغَيْرِهَا) بۆ جگە لە نوێژیش: وەك دوعا بۆ كردنو ناشتنو ئەو جۆرە شتانە (بِخِلاَفِ نَعْيِ الْجَاهِلِيَّةِ) بە پێچەوانەی پێداهەلگوتنی سەردەمی نەفامیی پێش ئیسلام، چونكە پێدا هەلگوتن نا پەسندە، هەروەك باسمان كرد.

## ﴿ مەسەلەكانی شۆردنو تەیەمومی مردوو ﴾

(وَلاَ يَنْظُرُ الْغَاسِلُ مِنْ بَدَنِهِ) ناپەسندەو نابێ مردووشۆرەكە تەماشای لاشەی مردووەكە بكا (إِلاَّ قَدْرَ الْحَاجَةِ) تەنها ئەندازەی پێویستی نەبێ: وەك تەماشا بكا باش شۆراوە، یان نا، جا ئەو تەماشاكردنەش كە دروستە (مِنْ غَيْرِ الْعَوْرَةِ) لە شوێنەكانیتری جگە لە عەورەت دروستە، چونكە تەماشاكردنیعەورەتو دەست لێدانیعەورەت بە دەستیڕووت هەردووكیان حەرامن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ تَعَذَّرَ غُسْلُهُ) هەر مردووێك نەگونجا بشۆرێ: لە بەر نەبوونیئاو، یان مردووكە سووتابو، یان ڕزیبو، یان بە دەردێكی وەها مردبو: كەس نەدەوێرا بیشوا؟ نەوەك دەردەكەی تووش ببێ، لەو حالەتانەدا (يُمِّمَ) واجبە –لەجیاتی شۆردن– مردووەكە تەیەموم بكرێ: وەك تەیەمومی مرۆڤیزیندوو: كە باسمان كرد.

جا ئەم تەیەمومەی مردوو –بۆ دروستبوون– پەیوەندی بە لابردنی پیسیەوە نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، بەلام لە (تحفة)دا فەرموویەتی: بەو مەرجەی

وَيُغَسِّلُ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ الْمَيِّتَ بِلاَ كَرَاهَةٍ، وَإِذَا مَاتَا غُسِّلاَ غُسْلاً وَاحِداً فَقَطْ، وَلْيَكُنِ الْغَاسِلُ أَمِيناً، فَإِنْ رَأَى خَيْراً ذَكَرَهُ أَوْ غَيْرَهُ حَرُمَ ذِكْرُهُ إِلاَّ لِمَصْلَحَةٍ، وَلَوْ تَنَازَعَ أَخَوَانِ أَوْ زَوْجَتَانِ أُقْرِعَ، وَالْكَافِرُ أَحَقُّ بِقَرِيبِهِ الْكَافِرِ، وَيُكْرَهُ الْكَفَنُ الْمُعَصْفَرُ وَالْمُغَالاَةُ فِيهِ، وَالْمَغْسُولُ أَوْلَى مِنَ الْجَدِيدِ،

---

نەگونجێ پیسیەکە لابدرێ، چونکە ئەگەر بگونجێ، واجبە: پیسیەکە لابدرێ ئینجا تەیەمموم بکرێ، ئەگینا: تەیەممومەکە دروست نابێ، هەروەك لە باسی تەیەممومیشدا ئێرەمان درێژتر ڕوون کردەوە، وَالْحَمْدُ لله تعالَى.

(وَيُغَسِّلُ الْجُنُبُ وَالْحَائِضُ الْمَيِّتَ) دروستە: مرۆڤی جەنابەتدارو ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار مرۆڤی مردوو بشۆن (بِلاَكَرَاهَةٍ) بە بێهیچ ناپەسندیەك (وَإِذَا مَاتَا) هەرکاتێك جەنابەتدارو زەیسانیو حەیزدار مردن (غُسِّلاَ غُسْلاً وَاحِداً) تەنها یەك غوسلیان بۆ دەکرێ: کە غوسلی مردنە (فَقَطْ) هیچیتر، واتە: واجب نیە لەجیاتی جەنابەت، یان حەیز غوسلێکیتریان بۆ بکرێ.

(وَلْيَكُنِ الْغَاسِلُ أَمِيناً) سوننەتە: مردووشۆرەکەو یارمەتیدەرەکەشی ئەمین بێو لێی دڵنیا بین: کە بە تەواوی مردووەکە دەشوا، هەروەها (فَإِنْ رَأَى خَيْراً) ئەگەر چاکەیەکی لە مردووەکە بینی: وەك بۆنخۆشیو درەوشانەوەی ڕووخساری (ذَكَرَهُ) باسی بکا (أَوْ غَيْرَهُ) بەڵام ئەگەر شتێکی خراپی بینی: وەك ڕوو ڕەشیو بۆگەنی (حَرُمَ ذِكْرُهُ)حەرامە باسی بکا (إِلاَّ لِمَصْلَحَةٍ) تەنها لە بەر بەرژەوەندیەك نەبێ: وەك مرۆڤە مردووەکە بیدعەچی، یان فاسقو ظالم بێ، ئەو کاتە دروستە: باس بکا، تاکو خەڵك لێی ئاگادار بنو لە ترسانیش تۆبە بکەن.

(وَلَوْ تَنَازَعَ أَخَوَانِ) ئەگەر دوو برا، یان دوو کوڕ لێیان بووە کێشە: بۆ شۆردن (أَوْ زَوْجَتَانِ) یان دوو ژن لێیان بووە کێشە (أُقْرِعَ) پشکەیان بۆ دەکرێ: ناوی کامەیان دەرچو، ئەویان مردووەکە دەشوا (وَالْكَافِرُ) مرۆڤی کافر (أَحَقُّ) لەپێشترە (بِقَرِيبِهِ الْكَافِرِ) بۆ وەرێکردنی مردووە کافرەکەی خۆی.

## ﴿ مەسەلەکانی کفنی مردوو ﴾

(وَيُكْرَهُ) ناپەسندە (الْكَفَنُ الْمُعَصْفَرُ) کفنی ڕەنگکراو بە گیای (عُصْفُر): کە ڕەنگی زەردە (وَالْمُغَالاَةُ فِيهِ) ناپەسندە کفنی زۆر بە نرخ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتُغَالُوا فِي الْكَفَنِ فَإِنَّهُ يُسْلَبُهُ سَرِيعاً﴾رواه ابوداود بإسناد حسن، جلی زۆر بە نرخ مەکەنە کفن، چونکە کفن زوو لە مردوو دادەڕنێ. (وَالْمَغْسُولُ) جلی شۆردراو (أَوْلَى) باشترە بۆ کفنی مردوو (مِنَ الْجَدِيدِ) لە جلی نوێ، چونکە ئەویان بۆ کێم و خوێنە.

وَالصَّبِيُّ كَبَالِغٍ فِي تَكْفِينِهِ بِأَثْوَابٍ، وَالْحَنُوطُ مُسْتَحَبٌّ وَقِيلَ وَاجِبٌ، وَلاَ يَحْمِلُ الْجَنَازَةَ إِلاَّالرِّجَالُ وَإِنْ كَانَ أُنْثَى، وَيَحْرُمُ حَمْلُهَا عَلَى هَيْئَةٍ مُزْرِيَةٍ وَهَيْئَةٍ يُخَافُ مِنْهَا سُقُوطُهَا، وَيُنْدَبُ لِلْمَرْأَةِ مَا يَسْتُرُهَا كَتَابُوتٍ، وَلاَ يُكْرَهُ الرُّكُوبُ فِي الرُّجُوعِ مِنْهَا، وَلاَ بَأْسَ بِاتِّبَاعِ الْمُسْلِمِ جَنَازَةَ قَرِيبِهِ الْكَافِرِ، وَيُكْرَهُ اللَّغَطُ فِي الْجَنَازَةِ

---

(وَالصَّبِيُّ) مندالّ: كوڕو كچ (كَبَالِغٍ فِي تَكْفِينِهِ) وەكو بالغ وايە لە كفن كردنىدا (بِأَثْوَابٍ) بە سێ پارچە جل (وَالْحَنُوطُ) پێوەركردنى بۆنىخۆش بە سەر كفنەكە (مُسْتَحَبٌّ) سوننەتە (وَقِيلَ وَاجِبٌ) لە فەرموودەيەكى بێهێزدا واجبە.

## ﴿ مەسەلەكانى هەڵگرتنى مردوو بۆ گۆڕستان ﴾

(وَلاَ يَحْمِلُ الْجَنَازَةَ) سوننەتە: جەنازە هەڵنەگرێ (إِلاَّالرِّجَالُ) تەنها پياوەكان نەبێ (وَإِنْ كَانَ أُنْثَى) هەرچەند مردووكەش مێينەبێ، چونكە پياو بۆ ئەو كارە بەهێزترە، كەوابو: ناپەسندە ئافرەتان جەنازە هەڵبگرن، بەڵام ئەگەر نێرينە دەست نەكەوت، ئەو كاتە واجبە: ئافرەتان جەنازەكە هەڵبگرن، هەروەك لە(نهاية)و(مغنى)دا فەرموويانە.

(وَيَحْرُمُ) حەرامە (حَمْلُهَا) جەنازەكە هەڵبگێرى (عَلَى هَيْئَةٍ مُزْرِيَةٍ) لە سەر شێوەيەكى سوكو بێڕێزانە: وەك بە هەرچوار پەلى هەڵىبگرن، يان بە بێدارجەنازە لە سەر شان دايبنێن (وَهَيْئَةٍ يُخَافُ مِنْهَا سُقُوطُهَا) هەروەها حەرامە لە سەر شێوەيەكى وەها هەڵيبگرن: كە ترسى كەوتنى هەبێ، بەڵام دروستە: يەك كەس جەنازەىمندالّ لە سەر دەستەكانى هەڵبگرێ، هەروەك لە سەر چاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيُنْدَبُ لِلْمَرْأَةِ) سوننەتە: بۆ جەنازەى ئافرەت (مَا يَسْتُرُهَا) دارجەنازەيەكى وەها: كە دايبپۆشێ (كَتَابُوتٍ) وەك سندوقێكى سەرپۆشكراو بە چادرێك، يان بە شتێكىتر (وَلاَ يُكْرَهُ الرُّكُوبُ) سوارى ناپەسند نيە (فِي الرُّجُوعِ مِنْهَا) كە لە ناشتنى جەنازە دەگەڕێتەوە، بەڵام كە لەگەڵ جەنازە دەڕواتە گۆڕستان، ناپەسندە بە سوارى بڕوا، مەگەر عوزرێكى هەبێ: وەك دوورى، يان بێهێزى، ئەو كاتە ناپەسندنيە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە (وَلاَ بَأْسَ) هيچ ناپەسندى نيە (بِاتِّبَاعِ الْمُسْلِمِ جَنَازَةَ قَرِيبِهِ الْكَافِرِ) پياوى موسوڵمان لەگەڵ جەنازەى خزمە كافرەكەى خۆى بڕواتە گۆڕستان.

(وَيُكْرَهُ اللَّغَطُ) ناپەسندە دەنگ هەڵێنان بە زيكرو دوعاو قورئان خوێندنو، دەف لێدانو شتىتريش (فِي الْجَنَازَةِ) لە حاڵەتى ڕۆيشتندا لەگەڵ جەنازە ﴿عَنْ قَيْسِ بنِ عَبَّادٍ﷛: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِﷺ يَكْرَهُونَ رَفْعَ الصَّوْتِ عِنْدَ الْجَنَائِزِ﴾ رواه البيهقي، سەحابەى پێغەمبەرﷺ بە ناپەسنديان دادەنا: دەنگ بەرز بكرێتەوە لە كاتى جەنازە بردندا. كەوابو: سوننەتە: بە بێدەنگ لەگەڵ جەنازەدا بڕواو بير لە مردن بكاتەوەو لە دڵدا زيكرى خوا بكا، هەروەك لە(تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە.

وَإِتْبَاعُهَا بِنَارٍ، وَلَواختَلَطَ مُسْلِمُونَ بِكُفَّارٍ وَجَبَ غُسْلُ الْجَمِيعِ وَالصَّـلاَةُ، فَـإِنْ شَـاءَ صَلَّى عَلَىالْجَمِيعِ بِقَصْدِ الْمُسْلِمِينَ، وَهُوَ الأَفْضَلُ وَالْمَنْصُوصُ، أَوْ عَلَى وَاحِد فَوَاحِـد نَاوِيَاً اَلصَّلاَةَ عَلَيْه إِنْ كَانَ مُسْلِماً، وَيَقُولُ: اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ إِنْ كَانَ مُسْـلِماً. وَيُشْـتَرَطُ لِصِحَّة الصَّلاَةِ تَقَدُّمُ غُسْلِه،

---

(وَإِتْبَاعُهَا بِنَارٍ) ناپەسندە: ئاگر لەگەڵ جەنازەدا ببردرێ بۆ گۆڕستان، مەگەر شەوێکی تاریك بێ، ئەو کاتە ناپەسند نیە چرا دابگیرسێنن لە بەر پێویستی، هەروەك لە(تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ مەسەلەکانی نوێژی جەنازە ﴾

(وَلَـوِ اخْـتَلَطَ مُسْلِمُونَ) ئەگەر تێکەڵ بون مردووەموسڵمانەکان (بِكُفَّارٍ) بە مردووە کافرەکان و نەتوانرا لێك جیابکرێنەوە (وَجَبَ غُسْلُ الْجَمِيعِ) واجبە: گشتیان بشۆرێن و کفن بکرێن و بنێشترێن، واتە: لە نێوان گۆڕستانی موسوڵمان و کافراندا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَالصَّلاَةُ) واجبە نوێژیجەنازە لە سەر گشتیان بکرێ، تاکو بە دڵنیایی لەو ئەرکە واجبانە دەرچین:

(فَإِنْ شَاءَ) جا لە نوێژکردنەکەشدا ئەگەر حەز دەکا: (صَلَّى عَلَىالْجَمِيعِ) لە سەر گشتیان یەك نوێژ دەکا (بِقَصْدِ الْمُسْلِمِينَ) بە مەبەستی مردووە موسوڵمانەکان، واتە: بە دڵ دەڵێ: **(نیەتمە فەرزی نوێژی جەنازە دەکەم لە سەر موسوڵمانەکانیئەم کۆمەڵە مردووە)**. هەروەها لە دوعای ناو نوێژیش بە عەرەبی دەڵێ: **(اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُسْلِمِينَ مِنْهُم)** خوایە لە موسوڵمانەکانیئەم کۆمەڵە مردووە خۆش ببە. هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی (وَهُوَ الأَفْضَلُ) ئەو جۆرە خێرترە لە جۆرەکەیداهاتوو (وَالْمَنْصُوصُ) دەقەقیفەرموودەی ئیمامی(شافعي)یە.

(أَوْ عَلَى وَاحِدٍ) یان نوێژێك لە سەر مردووێك دەکا (فَوَاحِدٍ) ئینجا نوێژێکیتر لە سەر مردووێکیتر دەکا...بەو جۆرە، تا یەکە یەکە نوێژ لە سەر گشتیان دەکا (نَاوِياً) نیەت دێنێ: (اَلصَّلاَةَ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مُسْلِماً) فەرزی نوێژیجەنازە لە سەر ئەم مردووە دەکەم ئەگەر موسوڵمان بێ. هەروەها (وَيَقُولُ) لە دوعای ناو نوێژەکەشدا بە عەرەبی دەڵێ: **(اَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ إِنْ كَانَ مُسْلِماً)** خوایە لەم مردووە خۆش ببە ئەگەر موسوڵمان بێ. ئینجا بزانە: ئەگەر شەهیدو کوژراوەکانیتریش تێکەڵ بون، واجبە: گشتیان بشۆرێن و نوێژ لە سەر گشتیان بکرێ:، بە نیەتی ئەوانەی شەهید نین، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ (لِصِحَّةِالصَّلاَةِ) بۆ دروستبوونی نوێژی جەنازە (تَقَدُّمُ غُسْلِهِ) دەبێ شۆردنی مردووەکە، یان تەیەمومکردنی وەپێش نوێژەکە بێخرێ، واتە:

**وَتُكْرَهُ قَبْلَ تَكْفِينِه، فَلَوْ مَاتَ بِهَدْمٍ وَنَحْوِهِ وَتَعَذَّرَ إِخْرَاجُهُ وَغُسْلُهُ لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ، وَيُشْتَرَطُ أَنْ لاَ يَتَقَدَّمَ عَلَى الْجَنَازَةِ الْحَاضِرَةِ**

---

تا مردووەکە نەشۆرێ، دروست نیە نوێژی لە سەر بکرێ، جا ئەگەر پێش شۆردنی، یان پێش تەیەمومکردنی نوێژی لە سەر کرا، ئەوە حەرامەو نوێژەکەش دروست نابێ، کەواتە: واجبە لە دوای شۆردنی، یان تەیەمومکردنی دووبارە نوێژی لە سەر بکرێتەوە، ئینجا بزانە: پێش کفن کردنی مردووەکە نوێژەکە دروستە، بەڵام (وَتُكْرَهُ) ناپەسندە نوێژ لە سەر مردوو بکرێ (قَبْلَ تَكْفِينِهِ) پێش کفن کردنی.

(فَلَوْ مَاتَ) ئەگەر یەکێك مرد (بِهَدْمٍ) بە هۆی بەسەرداڕوخانی شتێك (وَنَحْوِهِ) یان بە هۆیەکیتری ئەوها: وەك بکەوێتە کەلێنیچیایەك، یان ناو بیرێك، یان بکەوێتە ژێر لمو لیتەی لافاو (وَتَعَذَّرَ إِخْرَاجُهُ) نەشگونجا بهێندرێتە دەرەوە (وَغُسْلُهُ) تاکو بشۆرێ، یان تەیەموم بکرێ، هەم ئەگەر دڕندە خواردی، یان سووتاو بووە خۆڵەمێش، یان پارچەپارچە کراو پارچەکان نەدیترانەوە، لەو هەموو حاڵەتانەدا (لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ) حەرامەو دروست نیە نوێژیجەنازەی لە سەر بکرێ، چونکە مەرجێکی نوێژەکە: کە پاکیی مردووەکەیە، نەهاتۆتە جێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە: ئەگەر بە هۆی عوزرێك نەگونجا مردووەکە بشۆرێ، یان تەیەموم بکرێ، ئەو کاتە —بە هۆی عوزرەکە— دروستە: نوێژی جەنازەی لە سەر بکرێ، جا پێویستە لەو نوێژکردنەدا: (تقلید)ی ئەو زانایانە بکا، تاکو گوناهبار نەبێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

دیسان بزانە: لە ووشەی (وَتَعَذَّرَ إِخْرَاجُهُ) دەفامێتەوە: ئەگەر یەکێك بکەوێتە ژێر بەفر، جا پاش ماوەیەك دەگونجا بهێندرێتە دەرەوە، واجبە: چاوەڕوانیدەرهێنانی بکرێ، چونکە مردوو لە ژێر بەفردا ناگۆڕێ، وَاللهُ أَعْلَم.

دووەم: مەرجە بۆ دروستبوونی نوێژی جەنازە: کفنو لاشەی مردووەکەو ئەو شتەی لێی بەستراوە، گشتی پاك بن، هەروەك لە(تحفة)و (القليوبي)دا فەرموویانە، واتە: ئەگەر یەکێك لەوانەیڕابردوو پیس بن، نوێژەکە دروست نابێ، بەڵام ئەگەر شوێنێکی مردووەکە خوێنی لێدەهات، واجبە: شتێکی وەکو لۆکەی لە ناو دابندرێ، جا ئەگەر خوێنەکە نەوەستا، ئەو کاتە لە بەر ناچاری دروستە نوێژی لە سەر بکرێ، هەروەك لە (الشرواني)و (إعانةالطالبين)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُشْتَرَطُ) هەروەها بە مەرج دادەندرێ بۆ دروستبوونی نوێژی جەنازە (أَنْ لاَ يَتَقَدَّمَ عَلَى الْجَنَازَةِ الْحَاضِرَةِ) لە حاڵەتی نوێژکردندا وەپێش ئەو جەنازەیە نەکەوێ: کە لە لایەتی

وَلاَ الْقَبْرِ عَلَى الْمَذْهَبِ فِيهِمَا، وَتَجُوزُ الصَّلاَةُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ وَيُسَنُّ جَعْلُ صُفُوفِهِمْ ثَلاَثَةً فَأَكْثَرَ، وَإِذَا صُلِّيَ عَلَيْهِ فَحَضَرَ مَنْ لَمْ يُصَلِّ صَلَّى،

---

(وَلاَ الْقَبْرِ) هەروەها وەپێش گۆڕەکەش نەکەوێ لەو حاڵەتەی نوێژی جەنازە لە سەر گۆڕەکە دەکا (عَلَى الْمَذْهَبِ فِيهِمَا) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب لە هەردوو مەسەلەکەدا.

هەروەهاش مەرجە: نوێژکەرەکەو جەنازەکە لە یەك شوێن بن‌و نێوانیان لە سێسەد گەز -واتە: سەدوپەنجا مەتر- زیاتر نەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: واجبە لە شوێنی نوێژی جەنازەدا: مردووەکە، یان گۆڕەکە بکەوێتە قیبلەی نوێژکەرەکە، ئەگینا: نوێژەکەی دروست نابێ، بەڵام لە جەنازەی نادیاردا ئەوانە مەرج نەبون، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

(وَتَجُوزُ الصَّلاَةُ عَلَيْهِ فِي الْمَسْجِدِ) دروستە لە ناو مزگەوتدا نوێژی‌جەنازە لە سەر مردوو بکرێ، بەو مەرجەی بە هۆی مردووەکە مزگەوت پیس نەبێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى ابْنَيْ بَيْضَاءَ فِي الْمَسْجِدِ: سُهَيْلٍ وَأَخِيهِ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەنازەی لە ناو مزگەوتدا لە سەر (سُهَيْل)و برایەکەی کرد، کە کوڕی (بَيضاء) بون.

(وَ) هەرکاتێك نوێژکەرەکان شەش کەس، یان زیاتر بون (يُسَنُّ) لە حاڵەتی جەماعەتدا، سوننەتە (جَعْلُ صُفُوفِهِمْ ثَلاَثَةً فَأَكْثَرَ) ڕیزەکانیان بکەنە سێ ڕیزو زیاتریش، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عَلَيْهِ ثَلاَثَةُ صُفُوفٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ أَوْجَبَ﴾ رواه ابوداود والترمذي بسند حسن، هەر کەسێك بمرێ‌و سێ ڕیز لە موسوڵمانان نوێژی لە سەر بکەن، لێخۆشبوونی خوای‌گەورەی بۆ دەبێ.

هەروەها تا نوێژکەرەکان زۆرتر بن خێرترە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَيُشْرِكُونَ بِاللهِ شَيْئاً إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللهُ فِيهِ﴾ رواه مسلم، هەر پیاوێکی موسوڵمان بمرێ‌و چل پیاوی وەها نوێژی لە سەر بکەن: کە هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەنێن، خوای گەورە تکایان قبوڵ دەکا دەربارەی مردووەکە.

(وَإِذَا صُلِّيَ عَلَيْهِ) هەر کاتێك نوێژی جەنازە لە سەر مردووێك کرا (فَحَضَرَ مَنْ لَمْ يُصَلِّ) ئینجا یەکێکی وەها ئامادەبو: کە نوێژی لە سەر نەکردبو (صَلَّى) سوننەتە: ئەویش نوێژی لە سەر بکا، هەرچەند مردووەکە ژێر خاکیش کرابێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً -كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ- مَاتَتْ، فَفَقَدَهَا النَّبِيُّ ﷺ فَسَأَلَ عَنْهَا؟ فَقَالُوا: مَاتَتْ. فَأَتَى قَبْرَهَا فَصَلَّى عَلَيْهَا﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك -کە خزمەتی مزگەوتی دەکرد- مرد، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسیار

وَمَنْ صَلَّى لاَ يُعِيدُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلاَ تُؤَخَّرُ لِزِيَادَةِ مُصَلِّينَ، وَقَاتِلُ نَفْسِهِ كَغَيْرِهِ فِي الْغُسْلِ وَالصَّلاَةِ، وَلَوْ نَوَى الإِمَامُ صَلاَةَ الْغَائِبِ وَالْمَأْمُومُ صَلاَةَ حَاضِرٍ أَوْ عَكَسَ جَازَ، وَالدَّفْنُ فِي الْمَقْبَرَةِ أَفْضَلُ،

---

کرد: بۆ دیار نیه؟ گوتیان: مردوه. ئینجا گۆڕەکەیان بە پێغەمبەرﷺ نیشان داو نوێژی جەنازەی لە سەر گۆڕەکەی کرد. واتە: پێشداش سەحابەکان نوێژیان لە سەر کردبو.

(وَمَنْ صَلَّى) بەڵام هەر کەسێك جارێك نوێژی لە سەر مردووێك کرد (لاَ يُعِيدُ) سوننەت نیە لە سەر هەمان مردوو نوێژەکە دووبارە بکاتەوە (عَلَى الصَّحِحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە نوێژی جەنازە ناکرێتە سوننەت.

(وَلاَ تُؤَخَّرُ لِزِيَادَةِ مُصَلِّينَ) سوننەت نیە: نوێژی جەنازەکە دوا بخرێ تاکو نوێژکەرەکان زیاتر بن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ﴾رواه الشيخان، پەلە بکەن: لە وەرێکردنی مردوودا. بەڵام ئەگەر خزمێکیمردووەکە ئامادە نەبو، چاوەڕوانی وی دەکرێ، بەو مەرجەی ترسی گۆڕانی مردووەکە نەبێ، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

(وَقَاتِلُ نَفسِهِ) ئەو کەسەی بەخۆی خۆی کوشتوە (كَغَيْرِهِ) وەك موسوڵمانە مردووەکانیتر بڕیاری بۆ دەدرێ (فِي الْغُسْلِ) لە شۆردنو (وَالصَّلاَةِ) لە نوێژ لە سەرکردنو کفنو ناشتندا، هەروەها گشت موسوڵمانێکیتری گوناهباریش نوێژی جەنازەی لە سەر دەکرێ ﴿عَنْ بُرَيْدَةَ وَجَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّﷺ صَلَّى عَلَى الزَّانِي وَالزَّانِيَةِ﴾ رواهما البخاري ومسلم، پێغەمبەرﷺ نوێژی جەنازەی لە سەر زیناکەر کرد.

ئینجا بزانە: لە حەدیسی(صحيح)دا هاتوە: ﴿پێغەمبەرﷺ نوێژی لە سەر ئەو کەسە نەکرد: کە خۆی کوشتبو﴾. وەڵامەکەی ئەوەیە: بۆیێ نوێژی لە سەر نەکرد، تاکو خەڵك تەمبێ ببێو ئەو گوناهە نەکا، هەروەك لەزۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: سەحابە نوێژیان لە سەر کرد، هەروەك نوێژی لە سەر قەرزداریش نەکردو فەرمووی: خۆتان نوێژی لە سەر بکەن.

(وَلَوْ نَوَى الإِمَامُ صَلاَةَ غَائِبٍ) ئەگەر ئیمام نیەتی نوێژی لە سەر مردووێکی نادیار هێناو (وَالْمَأْمُومُ صَلاَةَ حَاضِرٍ) مەئمومەکەش نیەتی نوێژی لە سەر مردووێکی دیاربوو هێنا (أَوْ عَكَسَ) یان بە پێچەوانە، هەریەکە نیەتی مردووێکی هێنا (جَازَ) لە هەردوو مەسەلەدا دروستە، هەروەك نوێژی نیوەڕۆ لە پشت نوێژکەری عەسر دروست بوو.

## ﴿ مەسەلەکانی ناشتنی مردوو ﴾

(وَالدَّفْنُ) ناشتنی مردوو (فِي الْمَقْبَرَةِ) لە گۆڕستانی موسوڵماناندا (أَفْضَلُ) خێرترە لەوەی لە شوێنێکی بێگۆڕدا بنێشترێ، چونکە ﴿پێغەمبەروﷺ سەحابەکان مردووەکانیان لە گۆڕستانی (بقيع)دا دەناشتن﴾.

وَيُكْرَهُ الْمَبِيتُ بِهَا، وَيُنْدَبُ سَتْرُالْقَبْرِ بِثَوْبٍ وإِنْ كَانَ رَجُلاً، وَأَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ. وَلاَ يُفْرَشُ تَحْتَهُ شَيْءٌ وَلاَ مِخَدَّةٌ،

---

بەلام سوننەتە: شەهید لە شوێنی شەهیدبوونیدا بنێشترێ، هەروەك پێغەمبەرﷺ سەحابەكان وایان دەكرد ﴿عَنْ جَابِرٍ﵁ حَمَلْنَاالْقَتْلَى يَوْمَ أُحُدٍ لِنَدْفِنَهُمْ، فَجَاءَ مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَدْفِنُواالْقَتْلَى فِي مَضَاجِعِهِمْ فَرَدَدْنَاهُمْ﴾ رواه أصحاب السنن بسندصحيح، لە غەزای(أُحُد) شەهیدەكانمان هەلگرتن تاكو لە (مدينة)دا بیاننێشین، ئینجا بانگەوازكاریپێغەمبەرﷺ هاتو گوتی: پێغەمبەرﷺ فەرمانتان پێدەكا: شەهیدەكان لە شوێنیشەهیدبوونیاندا بنێشن. جا ئێمەش شەهیدەكانمان گەڕاندەوە بۆ (أحد)و لەوێدا ناشتمان.

جا بزانە: بۆیێ پێغەمبەرﷺ لە مالیخۆیدا نێشتراوە، چونكە پێغەمبەران عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ لە شوێنی وەفاتكردنیان دەنێشترێن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: دروست نیە موسولمان لە گۆڕستانی كافراندا بنێشترێ، بە پێچەوانەش دروست نیە، دووبارە بزانە: ئەگەر گۆڕستانە گشتیەكە هی(فاسق)و (أهل البدعة) بوو، یان نێماوی هەبو، یان شوبهە لە حەرامیدا هەبو، ئەو كاتە شوێنیتر خێرترن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا روون كراونەوە.

(وَيُكْرَهُ الْمَبِيتُ بِهَا) ناپەسندە بە تەنها–بە بێعوزر–لە گۆڕستاندا شەوێ بمێنێتەوە، نەوەك بترسێ، بەلام ئەگەر كۆمەلێك بن، ئەو كاتە ناپەسند نیە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَيُنْدَبُ) سوننەتە: (سَتْرُالْقَبْرِ بِثَوْبٍ) گۆڕەكە بە پارچە جلێك داپۆشرێ لەو حالەتەی مردووەكەی لە ناو دادەندرێ (وَإِنْ كَانَ رَجُلاً) هەرچەند مردووەكە نێرینەش بێ، نەوەك ئەندامێكی بەدەر بكەوێ، كەواتە: ئەو داپۆشینە بۆ مێیینە خێرترە، هەروەك لە سەر چاوەكاندا فەرموویانە.

(وَأَنْ يَقُولَ) ئەو كەسەی مردووەكە لە ناو گۆڕ دادەنێ، سوننەتە بلێ: ﴿بِسْمِ اللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، واتە: بە ناوی خواو لە سەر رێبازی پێغەمبەرﷺ دەتخەمەناو گۆڕ.

(وَلاَ يُفْرَشُ تَحْتَهُ شَيْءٌ) ناپەسندەو نابێ هیچ شتێك–لە ناو گۆڕدا– لە ژێر مردووەكە رابێخرێ (وَلاَمِخَدَّةٌ) نابێو ناپەسندە سەرین لە ژێر سەری دابندرێ، چونكە مالێ بە فیڕۆدانێكی بێسودە، كەوابو: بە رووتی رووی لە سەر كۆمەلە خۆلێك دادەندوێ، هەروەك روونمان كردەوە.

وَيُكْرَهُ دَفْنُهُ فِي تَابُوتٍ إِلاَّ فِي أَرْضٍ نَدِيَّةٍ أَوْ رِخْوَةٍ، وَيَجُوزُ الدَّفْنُ لَيْلاً وَوَقْتَ كَرَاهَةِالصَّلاَةِ مَا لَمْ يَتَحَرَّهُ، وَغَيْرُهُمَا أَفْضَلُ، وَيُكْرَهُ تَجْصِيصُ الْقَبْرِ وَالْبِنَاءُ وَالْكِتَابَةُ عَلَيْهِ، وَلَوْ بُنِيَ فِي مَقْبَرَةٍ مُسَبَّلَةٍ هُدِمَ،

---

(وَيُكْرَهُ دَفْنُهُ فِي تَابُوتٍ) ناپەسندە مردووەكە لە ناو سندوقدا بە سندوقەوە بنێشترێ (إِلاَّ) مەگەر عوزرێك هەبێ: وەك (فِي أَرْضٍ نَدِيَّةٍ) لە خاكێكی نێماویدا (أَوْ رِخْوَةٍ) یان لە خاكێكی نەرمی بێهێزدا بنێشترێ، یان لاشەی مردووەكە ڕزیبێ، یان سوتابێ، بە بێ سندوق چارەی نەكرێ، لەو حاڵەتانەدا ناپەسند نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَجُوزُ الدَّفْنُ لَيْلاً) دروستە: بە شەوێ مردوو بنێشترێ ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَفَنَ الرَّجُلَ الَّذِي كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالذِّكْرِ، لَيْلاً﴾رواه ابوداود بسندحسن، ئەو پیاوەی دەنگی بەرز دەكردەوە بە زیكركردن، پێغەمبەرﷺ بە شەوێ ناشتی.

(وَوَقْتَ كَرَاهَةِ الصَّلاَةِ) هەروەها دروستە لەو كاتانەشدا مردوو بنێشترێ: كە نوێژی سوننەتیان تێدا قەدەغە بوو (إِذَا لَمْ يَتَحَرَّهُ) بەو مەرجەی بە قەسدی نەیخاتە ئەو كاتانە، بەڵام ئەگەر بە قەسدی بیخاتە یەكێك لەو كاتانە، ناشتنەكە ناپەسندە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە (وَغَيْرُهُمَا أَفْضَلُ) كاتەكانیتری جگە لە شەو و ئەو كاتانەی نوێژی سوننەتیان تێدا قەدەغەیە، خێرترە بۆ مردوو ناشتن.

(وَيُكْرَهُ) ناپەسندە (تَجْصِيصُ الْقَبْرِ) گۆڕ بە گەچ، یان بە چەمەنتۆ مارنج بكرێ: لە ناوەوەی، یان لە دەرەوەی، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموویەتی، بەڵام مارنج كردن بە قوڕ ناپەسند نیە (وَالْبِنَاءُ) ناپەسندە خانوو لە سەر گۆڕ دروست بكرێ، ئەگەر گۆڕەكە لە ملكی خۆیدابێ، بەڵام ئەگەر لە گۆڕستانی گشتیدابو، ئەو كاتە خانوو لە سەركردن حەرامە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالْكِتَابَةُ عَلَيْهِ) ناپەسندە نووسین لە سەر گۆڕ، هەرچەند تەنها ناوی خاوەنەكەش بێ، جیاوازی نیە نووسینەكە: لە سەر گۆڕو كێلەكانی بێ، یان لە سەر شتێكیتر بێ: كە لە لای گۆڕەكە داندرابێ ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُجَصَّصَ الْقَبْرُ وَأَنْ يُقْعَدَعَلَيْهِ وَأَنْ يُبْنَىعَلَيْهِ﴾ رواه مسلم زاد الترمذي: ﴿وَأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهِ﴾ پێغەمبەرﷺ قەدەغەی كردوە: گۆڕ بە گەچ مارنج بكرێو لە سەری دانیشێو خانووی لە سەر بكرێو لە سەری بنووسرێ.

(وَلَوْ بُنِيَ) ئەگەر خانوو لە سەر گۆڕ دروست كرا (فِي مَقْبَرَةٍ مُسَبَّلَةٍ) لە گۆڕستانی خێرات، واتە: گشتیدا (هُدِمَ) واجبە خانووەكە بڕوخێندرێ؟ چونكە حەرامەو شوێنی گۆڕیتر دەگرێو بەرتەسكی دەكا، كەواتە: بەرزكردنەوەی گۆڕ بە بەردی گەورە: لە هەر چوار لایەوە، یان دروستكردنی حەوشێك، یان پەرژینێك لە دەرەوەی گۆڕ، هەمان بڕیاری خانووی بۆ دەدرێ، هەروەك لە(تحفة)دا ڕوونی كردۆتەوە.

وَيُنْدَبُ أَنْ يُرَشَّ الْقَبْرُ بِمَاء، وَيُوضَعَ عَلَيْهِ حَصىً، وَعِنْدَ رَأْسِه حَجَرٌ أَوْ خَشَبَةٌ، وَجَمْعُ الأَقَارِبِ فِي مَوْضِعٍ، وَزِيَارَةُالْقُبُورِ لِلرِّجَالِ، وَتُكْرَهُ لِلنِّسَاءِ وَقِيلَ تَحْرُمُ وَقِيلَ تُبَاحُ،

(وَيُنْدَبُ) سوننەته: (أَنْ يُرَشَّ الْقَبْرُ بِمَاءٍ) له دوای ناشتن گۆڕەکه ئاوی به سەردا بکرێ، تاکو خۆڵەکەی بڵاو نەبێ و ئاسەواری بمێنێ (وَيُوضَعَ عَلَيْهِ حَصىً) سوننەته: ورده بەرد له سەر گۆڕەکه دابندرێن ﴿عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَشَّ عَلَى قَبْرِ ابْنِه إِبْرَاهِيمَ الْمَاءَ﴾. هەم ﴿وَأَنَّهُ ﷺ وَضَعَ عَلَيْهِ حَصْبَاءَ﴾ رواهما الشافعي وابوداود مرسلاً، پێغەمبەر ﷺ ئاوی ڕشانده سەر گۆڕی (ابراهیم)ی کوڕی خۆی، هەم ورده بەردی له سەر دانا.

(وَعِنْدَ رَأْسِه حَجَرٌ) سوننەته: له لای سەری مردووەکەش -له دوای ناشتن- کێلێکی بەرد دابندرێ (أَوْ خَشَبَةٌ) یان دار، له فەرموودەیەکی بێهێزدا سوننەته: کێلێکی تریش له لای پێیەکانی دابندرێ ﴿عَنِ الْمُطَّلِب بن أَبِي وَدَاعَةَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ -لَمَّا دُفِنَ عُثْمَانُ بنُ مَظْعُونٍ- وَضَعَ حَجَراً عِندَ رَأْسِهِ، وَقَالَ: أَتَعَلَّمُ بِهَا قَبْرَ أَخِي وَأَدْفِنُ إِلَيْهِ مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِي﴾ رواه ابوداود بسند صالح، که (عثمان)ی براشیریەکەی پێغەمبەر ﷺ نێشترا، پێغەمبەر ﷺ کێلێکی بەردی له لای سەری داناو فەرمووی: گۆڕی برایەکەمم پێ دەناسمەوەو خزمەکانی خۆشم له لای ئەو دەنێشم. (وَجَمْعُ الأَقَارِبِ فِي مَوْضِعٍ) سوننەته: خزمەکان له یەك شوێن له گۆڕستاندا بنێشترێن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی تازە، چونکه بۆ سەرلێدانیش ئاسانتردەبێ و مردووەکانیش دڵخۆشتر دەبن.

## ﴿ زیارەتی گۆڕستان ﴾

(وَزِيَارَةُالْقُبُورِ لِلرِّجَالِ) سەردانی گۆڕەکان -گۆڕستانی موسوڵمان سوننەته: بۆ پیاوان، به (اجماع)ی زانایانی ئیسلام، واته: له سەرەتای ئیسلامدا زیارەتی گۆڕەکان قەدەغه بوو، بەڵام (نَسخ) کراوەو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿كُنتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِالْقُبُورِ، فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُذَكِّرُالآخِرَةَ﴾ رواه مسلم وأصحاب السنن، لەمەوپێش زیارەتی گۆڕەکان له ئێوەم قەدەغه کردبوو، بەڵام له مەو دوا زیارەتی گۆڕەکان بکەن، چونکه قیامەتتان به بیر دێنێتەوە.

(وَتُكْرَهُ لِلنِّسَاءِ) زیارەتیگۆڕ ناپەسنده بۆ ئافرەتان (وَقِيلَ تَحْرُمُ) له فەرموودەیەکی بێهێزدا: زیارەتیگۆڕ حەرامە: بۆ ئافرەتان، چونکه پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لَعَنَ اللهُ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ والسُّرُجَ﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، لەعنەتی خوا لەو ئافرەتانه بێ: که زیارەتی گۆڕەکان دەکەن، لەعنەت لەو کەسانه بێ : که مزگەوت له سەر گۆڕ دروست دەکەن و چرا له سەر گۆڕ دادەگیرسێنن. بەڵام فەرموودەی بەهێز وەڵامی داوەتەوە: ئەو لەعنەته بۆ ئەو ئافرەتانەیە: که له سەر گۆڕ دەگریێن و ماتەمینی نوێ دەکەنەوە. هەروەك له سەرچاوەکاندا فەرموویانه (وَقِيلَ تُبَاحُ) له فەرموودەیەکیتری بێهێزدا: حەڵاڵە، واته: ناپەسندیش نیه، بەو مەرجەی هیچ بێشەرعیەك ڕوونەدلو نەگریێن.

ئینجا بزانـە: سـەردانی گـۆڕ لـە گشـت کاتێکدا سوننەتە، بە تایبـەتیش لـە عەسری پێـنج شەممەوە تا ڕۆژی شـەممە، هـەروەهاش سـەردانی گـۆڕی دایكو بـاوكو خـزمو دۆسـتەکانی زیـاتر خێرتـرە، هـەروەك لـە حاشـیەکانی(الشبراملسـي)و(البجيرمـي)و(الشـرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئنجا (وَيُسَلِّمُ الزَّائِرُ) سوننەتە: زیارەتکەرەکە یەکەمجار سەلام لە تێکڕای گۆڕستانەکە بکـاو بڵـێ: ﴿اَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَقَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَاللهُ بِكُـمْ لاَحِقُـونَ﴾ رواه احمـد ومسـلم، وللترمذي: ﴿يَغْفِرُاللهُ لَنَا وَلَكُمْ أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالأَثَرِ﴾.

ئینجا پشت لە قیبلەو ڕوو لـە مردووەکـەی بکـاو بـە هـەمان ووشـەکانیڕابردوو سـەلامی لێبکـا، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَامِنْ عَبْدٍ يَمُرُّ بِقَبْرِ رَجُلٍ كَانَ يَعْرِفُهُ فِي الدُّنْيَا فَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِلاَّ عَرَفَهُ وَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ﴾رواه ابن عبدالبر فيالتمهيد والاستذكار باسناد صحيح، هـەر کەسێك بـە لای گـۆڕی پیاوێکدا بـڕوا-کـە لـە دونیـادا دەیناسـی- سـەلامی لێبکـا، مردووەکـە دەیناسـێتەوەو وەڵامی سەلامەکەی دەداتەوە.

(وَيَقْرَأُ) ئینجا لەدوای سەلام، سوننەتە: زیارەتکەرەکە-بـە گـوێرەی تـوانین- هەنـدێك قورئـان لە سەر گۆڕەکان بخوێنێ، ئینجا لە دوای قورئان خوێندن، ڕوو لە قیبلـە دەکـاو (وَيَدْعُو) دوعـا بۆ مردووەکەی دەکا، هەروەها بۆ مردووەکانیتریش دوعا بکا.

ئینجـا بزانـە: دەسـت پێـداهێنانی گـۆڕو دیوارەکـانیو قەفەسـەکەیو بـاوەش لێوەرهێنانیـانو مـاچ کردنیـانو لـە دەورە سـوڕان، گشـتی (بدعـة)یـەکی ناپەسـندو ناشـیرنن، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ خێرکردنو قورئـان خوێندن بۆ مردوو ﴾

یەکـەم: بـە (اجمـاع)ی زانایـانی ئیسـلام خێرکـردنو دوعـاکردن بـۆ مـردووان سـودی هەیـەو دەیانگاتێ، جیاوازی نیە: خزم بۆیان بکا، یان بێگانـە، هـەروەك لـە باسـی وەسـێتدا بـە درێـژی ڕوونی دەکەینـەوە، إن شاءَ الله تَعَالَى ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَاللهُ عَنهَا: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّﷺ فَقَالَ: يَارَسُـولَ اللهِ إِنَّ أُمِّي افْتُلِتَتْ نَفْسُها وَلَمْ تُوصِ وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَـدَّقْتُ عَنْهـا؟ قَالَ: نَعَمْ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك بـە پێغەمبـەریﷺ گـوت: دایکـم کتـوپڕ مـردو وەسـێتیشـی نەکردوە، وا تێدەگەم ئەگەر ماوەی قسەکردنی هەبوایە خێری دەکرد، ئایـا خێـری بـۆ دەبـێ ئەگەر من خێری بۆ بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. واتە خێرەکەی دەگاتێ.

دووەم: لـە فەرموودەیـەکی زانایـانی مەزهـەبی (شـافعی)و لـە هەرسـێك مەزهەبەکـەیتردا: خێری قورئان خوێندن دەگاتە مردوو، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان لـە باسـی وەسـێتدا ڕوون کراوەتەوە.

وَيَحْرُمُ نَقْلُ الْمَيِّتِ إِلَى بَلَدآخَرَ، وَقِيلَ يُكْرَهُ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِقُرْبِ مَكَّةَ أَوِالْمَدِينَةِ أَوْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ نَصَّ عَلَيْهِ، وَنَبْشُهُ بَعْدَ دَفْنِهِ لِلنَّقْلِ وَغَيْرِهِ حَرَامٌ إِلاَّ لِضَرُورَةٍ: بِأَنْ دُفِنَ بِلاَ غُسْلٍ

---

هەروەها ئیمام (أحمد بن حنبل) دەفەرموێ: هەر کاتێك چونە گۆڕستان، سوورەتی (فاتیحة)و (قُلْ هُوَ اللهُ أحَدٌ)و هەردوو (قُلْ أعُوذُ)ەکان بخوێننو خێرەکەش بدەنە مردووەکان، چونکە خێرەکە دەیانگاتێ، هەروەك لە (تَذْكِرَةُالقُرْطُبِي)و (إرشادالعباد)و (هدايةالمرتاب)دا گێڕاویەتیانەوە.

کەواتە: بە خوێندنی ئەو چوار سورەتانە، یان تەنها یەکێکیان، سوننەتەکە بەجێدێ، چونکە لە کاتی خوێندنیقورئاندا ڕەحمەتیخوا دێتە خوارەوە، هەروەك پێغەمبەرﷺ لە حەدیسەکەی سوورەتی(الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ بِالْقُرْآنِ﴾رواه الشيخان، ئەوە ڕەحمەتی خوایە دڵفراوانی تێدایەو بەهۆی خوێندنی قورئان دێتە خوارەوە.

## ﴿ گوازتنەوەی مردوو و هەڵکەندنەوەی گۆڕ ﴾

(وَيَحْرُمُ) حەرامە: (نَقْلُ الْمَيِّتِ) گوازتنەوەی مردوو، پێش ناشتنی لە شوێنی مردنی (إِلَى بَلَدٍ آخَرَ) بۆ شوێنێکیتر، هەرچەند مردووەکەش تێك نەچێو نەگۆڕێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يُكْرَهُ) ناپەسندە بگوازرێتەوە (إِلاَّ أَنْ يَكُونَ بِقُرْبِ مَكَّةَ) مەگەر مردووەکە لە نزیك (مكة)ی پیرۆز بێ (أَوِالْمَدِينَةِ) یان لە نزیك (مدینة)ی پێغەمبەرﷺ (أَوْ بَيْتِ الْمَقْدِسِ) یان لە نزیك (بيت المقدس) بێ، ئەو کاتە سوننەتە: بگوازرێتەوە بۆ یەکێك لەو سێیانە (نَصَّ عَلَيْهِ) ئیمامی شافیعی وەهای فەرمووە، چونکە ئەو سێ جێگایانە ڕێزی تایبەتییان هەیە.

کەوابو: ئەگەر مردووەکە وەسێتی کرد: بگوازرێتەوە بۆ یەکێك لەو سێیانە، واجبە: وەسێتەکەی جێبەجێ بکرێ، بەو مەرجەی لاشەکەی نەگۆڕێو بۆن نەبێ، هەروەك لە (نهاية)و(مغني)دا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر بۆ شوێنێکیتر-جگە لەو سێیانە- وەسێتی کرد: بگوازرێتەوە، دروست نیە وەسێتەکەی جێبەجێ بکرێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لە هەر حاڵەتێکدا گوازتنەوەی مردووەکە دروست بێ، واجبە: لە پێش گوازتنەوەدا بشۆرێو کفن بکرێو نوێژی لە سەر بکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَنَبْشُهُ) هەڵکەندنەوەی گۆڕ (بَعْدَ دَفْنِهِ) لە دوای ناشتنی مردووەکە (لِلنَّقْلِ) بۆ گوازتنەوەی مردووەکە بۆ شوێنێکیتر (وَغَيْرِهِ) هەروەها لە بەر هۆیەکیتری ناشەرعیش (حَرَامٌ) گشتی حەرامە، چونکە سوکایەتیکردنە بە مردووەکە (إِلاَّ لِضَرُورَةٍ) تەنها لە بەر ناچاری نەبێ، ئەو کاتە دروستە (بِأَنْ دُفِنَ بِلاَ غُسْلٍ) وەك بە بێغوسل نێشترابێ، واتە: نەشۆرابێو

تەیەمومیش نەکرابێ بە تەیەمومێکی‌دروستبوو، ئەو کاتە واجبە: مردووەکە بهێندرێتە دەرەوەو بشۆرێو نوێژی جەنازەی لە سەر بکرێ، بەو مەرجەی لاشەی تێك نەچوبێو بۆن نەبوبێ، ئەگینا: واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ فِي أَرْضٍ أَوْ ثَوْبٍ مَغْصُوبَيْنِ) یان لە خاکێکی داگیرکراودا نێژراوە، یان بەکفنێکی داگیرکراو، یان دزراو کفن کرابێ، لەو حاڵەتانەشدا واجبە: مردووەکە بهێندرێتە دەرەوە، هەر چەند لاشەکەشی تێك چوبێو بۆن بوبێ، تاکو مافەکە بدرێتەوە خاوەن ماف، جا ئەگەر خاوەن مافەکە چاوپۆشی‌ی کردو گەردەنی ئازاد کرد، یان بە تۆڵە وەرگرتن ڕازی بوو، ئەو کاتە حەرامە: بهێندرێتە دەرەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(أَوْ وَقَعَ فِيهِ مَالٌ) یان گۆڕەکە ماڵێکی بکەوێتە ناو: جا پارە بێ، یان شتێکی‌تر، ئەو کاتە –ئەگەر خاوەن ماڵەکە داوا بکا– واجبە: گۆڕەکە هەڵبکەندرێو ماڵەکە بهێندرێتە دەرەوە، هەروەها ئەگەر مردووەکە لە کاتی زیندووەتی‌دا پارە، یان زێڕی کەسێکی‌تری قووتدابێو خاوەنەکەشی داوای بکا، واجبە: بهێندرێتە دەرەوەو، وورگی هەڵبدرێو ماڵەکەی لێ‌دەربهێنن‌و بیدەنەوە خاوەن ماف، بەڵام ئەگەر پارەکە، یان زێڕەکە، یان هەر ماڵێکی‌تری خۆی بە زیندووەتی قووتدابێ، ئەو کاتە دروست نیە: نە بهێندرێتە دەرەوەو نە وورگیشی هەڵبدرێ بۆ دەرهێنانی ماڵەکەی، هەروەك لە سەرچاوەماندا فەرموویانە، واتە: تا مردووەکە بە تەواوی دەڕزێ، ئەو کاتە دروستە: ماڵەکە لە گۆڕەکە دەربهێنن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: لەو مەسەلەیە بۆمان ڕوون بۆوە: کە دروست نیە لاشەی مردووی موسوڵمان، یان ئەندامێکی لەت بکرێ تاکو وانەی پزیشکی‌ی لە سەر بخوێندرێ، یان بۆ ئەوەی پلاتین‌و ئەو جۆرە شتە بە نرخانە لە لاشەی مردووەکە دەربهێندرێن، چونکە لەتکردنی لاشەی مردوو بە بێ‌حەقێکی شەرعی حەرامە، لە (المجموع)دا بەڵگەی بەوە هێناوەتەوە: کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيّاً﴾رواه ابوداود بسندصالح، شکاندنی ئێسقانی‌مردوو، وەکو شکاندنی ئێسقانەکەیەتی بە زیندووەتی. واتە: حەرامە. ئینجا بزانە: دروستە دەرهێنانی ددانی زێڕ لە دەمی مردوو، چونکە ئەو لە تکردن‌و ئازاردانەی تێ‌دانیە، وَاللهُ أَعْلَم.

دووەم: هەر کاتێك ئافرەتێك مرد‌و کۆرپەیەکی‌زیندووی لە زگی‌دا بوو، ئەوە دوو حاڵەتی هەنە: حاڵەتی‌یەکەم: ئەگەر ژینی کۆرپەکەی ڕەچاو دەکرا: وەك تەمەنی شەش مانگ‌و بە سەرەوەتر بێ، ئەو کاتە واجبە: زگی ئافرەتەکە هەڵبدرن‌و کۆرپەکەی لێ‌دەربێنن، چونکە ڕزگارکردنی ئادەمیزادی بێ‌گوناه لە مردن واجبە، خوای‌گەورە دەفەرموێ:

أَوْ دُفِنَ لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ لاَ لِلتَّكْفِينِ فِي الأَصَحِّ، وَيُسَنُّ أَنْ يَقِفَ جَمَاعَةٌ بَعْدَ دَفْنِهِ عِنْدَ قَبْرِهِ سَاعَةً يَسْأَلُونَ لَهُ:

---

﴿وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾ هەر كەسێك ئادەمیزادێك لە مردن ڕزگار بكا، خێری وەك هەموو خەڵكی ڕزگار كردبێ وایە.

حاڵەتی دووەم: ئەگەر ژینی كۆرپەكەی ڕەچاو نەدەكرا: وەك تەمەنی لە شەش مانگ كەمتر بێ، ئەو كاتە دروست نیە: زگی ئافرەتەكە هەڵبدرێ و كۆرپەكەی بهێندرێتە دەرەوە، چونكە سوكایەتی‌كردنێكی بێ‌سوودە بە مردووەكە، هەروەها دروستیش نیە: ئافرەتەكە بنێشترێ تا كۆرپەكەی لە ناو زگی‌دا بەخۆی لە جولە دەكەوێ و دەمرێ، واتە: نابێ بە هیچ هۆیەك كۆرپەكەی بمرێندرێ، چونكە بە هیچ شێوەیەك كوشتنی ئادەمیزادی بێ‌گوناه دروست نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەومەسەلەیە ڕوون كراوەتەوە.

(أَوْ دُفِـنَ لِغَيْـرِ الْقِبْلَـةِ) یان مردووەكە بەرەولایەكی‌تری –جگە لە قیبلە– نێشترابێ، ئەو كاتەش واجبە: گۆڕەكە هەڵبكەندرێ و مردووەكە ڕوو لەقیبلە بكرێ، بەو مەرجەی تێك نەچوبێ، ئەگینا: واجب نیە، هەروەك لە باسی ناشتندا ڕوونمان كردەوە.

(لاَ لِلتَّكْفِينِ) بەڵام بۆ كفن كردن ناهێندرێتە دەرەوە، واتە: ئەگەر بە كفننەكراوی نێشترابێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە مەبەست لە كفن كردن داپۆشینی مردووەكەیە، وا ئێستاش بە هۆی ژێرخاككردن داپۆشراوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر گۆڕەكە لافاوی دەگەیشتێ، یان نێماوی لێ‌پەیدا بوو، یان هەر هۆیەكی‌تری شەرعی هەبێ، دروستە: مردووەكە دەربهێندرێ و لە گۆڕێكی‌تردا بنێشترێ، هەروەك لە سەر چاوەكاندا فەرموویانە ﴿عَنْ جابِرِ بن عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنهمـا: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُـلٌ آخَرُ فِي قَبْرٍ، ثُمَّ لَمْ تَطِبْ نَفْسِي أَنْ أَتْرُكَهُ مَعَ الآخَرِ، فَاسْتَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِأَشْهُرٍ فَـإِذَا هُـوَ كَيَوْمِ وَضَعْتُهُ هُنَيَّةً غَيْرَ أُذُنِهِ﴾ رواه البخاري، وفي رواية له: ﴿فَجَعَلْتُهُ فِي قَبْرٍ عَلَى حِـدَةٍ﴾. لە یەك گۆڕدا پیاوێك لەگەڵ (عبدالله)ی باوكم نێشترا–واتە: لە شەهیدەكانی(أُحد)– منیش دڵم بەوە خۆش نەبو ئەوها واز لە باوكم بێنم، ئینجا لە دوای شەش مانگ باوكمم لە گۆڕەكە دەرهێناو بە تەنهایی لە گۆڕێكی‌تردا ناشتمەوە، لاشەی باوكم هەروەك ئەو ڕۆژەی ناشتبوم ساغ بوو، جگە لە گوێ یەكی نەبێ.

ئینجا بزانە: ئەو حەدیسەش بەڵگەیە: كە لاشەی شەهیدان نارزێ، هەروەك لە (تَذْكِرَةِالْقُرْطُبِي)دا ڕوون كراوەتەوە، وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ باسی (تَلْقِين)ی مردوو ﴾

(وَيُسَنُّ) سوننەتە: (أَنْ يَقِفَ جَمَاعَـةٌ) كۆمەڵێك بمێننەوە (بَعْدَ دَفْنِـهِ) لە دوای ناشتنی مردووەكە (عِنْدَ قَبْرِهِ) لە لای گۆڕەكەی (سَاعَةً) سەعاتێك، واتە: ماوەیەك (يَسْأَلُونَ لَهُ

التَّثْبِيتَ) بۆ مردووەکە لە خوا بپاڕێنەوە: تاکو وەڵامی پرسیارەکانی ناو قەبر بداتەوە، واتە: بڵێن: خوایە لە گوناهەکانی خۆش ببە، خوایە وەڵامی ڕاست بێنە سەر زوبانی، خوایە وەڵامەکانی پێ بڵێ ﴿عَنْ عُثْمَانَ﴿: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: إِسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَاسْئَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ﴾رواه ابوداود وغيره بإسناد جيد، کە پێغەمبەرﷺ لە ناشتنی مردوو تەواو دەبو، لە سەر گۆڕەکەی ڕادەوەستاو دەیفەرموو: تکای لێخۆشبوونی گوناه بۆ براتان بکەن و لە خوا بپاڕێنەوە: وەڵامی ڕاست بهێنێتە سەر زوبانی، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ.

هەروەها سوننەتە: نەختێك قورئانیش لە لای گۆڕەکەی بخوێنن، ئیمامی (شافعی) دەفەرموێ: (ئەگەر هەموو قورئان لە لای گۆڕەکەی ختم بکەن جوانەو خێرترە). هەروەك لە (المجموع)و(الاذكار)دا گێڕاویەتیەوە.

هەم ﴿وَعَنْ ابنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ إِسْتَحَبَّ أَنْ يُقْرَأَ عَلَى الْقَبْرِ بَعْدَ الدَّفْنِ أَوَّلُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ وَخَاتِمَتُهَا﴾ رواه البيهقي بإسناد حسن، (ابن عمر) بە خێری دەزانی: سەرەتای سوورەتی (البقرة)و کۆتاییەکەی -لە دوای ناشتنی مردووەکە- لە سەر گۆڕەکەی بخوێندرێ.

ئینجا بزانە: هەر مردووێك بالغو عاقڵ بوبێ، سوننەتە: لە دوای ناشتن (تَلْقِين) بدرێ، واتە: بەڵام ئەگەر منداڵێك بمرێ، یان یەکێك لە منداڵیەوە شێت بوبێو بە شێتی بمرێ، سوننەت نیە (تَلْقِين) بدرێ.

ئینجا هەر چەند حەدیسەکەی (تَلْقِين) بێهێزە، بەڵام لە چەند حەدیسێکی(صحیح)دا (شاهد)ی هەیە: وەك حەدیسەکەی (عثمان)ی ڕابردوو، جگە لەوەش حەدیسی بێهێز بۆ کردەوەی چاك ڕەفتاری پێ دەکرێ، لە سەرچاوەکاندا ئەوها مەسەلەی (تَلْقِين) ڕوون کراوەتەوەو لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە: یەکێك لە لای سەری مردووەکە دادەنیشێ، واتە: ڕوو لە ڕووی مردووەکە دەکاو دەڵێ: (يَا عَبْدَاللهِ ابْنَ أَمَةِاللهِ أُذْكُرِ الْعَهْدَ الَّذِى خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنيا: شَهَادَةَ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ وَأَنَّ الْبَعْثَ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لاَرَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ، وَأَنَّكَ رَضِيتَ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ نَبِيّاً وَبِالْقُرْآنِ إِمَاماً وَبِالْكَعْبَةِ قِبْلَةً وَبِالْمُؤْمِنِينَ إِخْوَاناً، رَبِّيَ اللهُ لاَإِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ).

## ﴿ خواردەمەنیی تازیە ﴾

(وَلِجِيرَانِ أَهْلِه) بۆ دراوسێیەکانی کەسوکاری مردووەکەو هەم بۆ خزمە دوورەکانیشی سوننەتە: (تَهْيِئَةُ طَعَامٍ) خواردەمەنی دروست بکەن بۆ کەسوکاری مردووەکە، بە

**يُشْبِعُهُمْ يَوْمَهُمْ وَلَيْلَتَهُمْ، وَيُلَحُّ عَلَيْهِمْ فِي الأَكْلِ، وَيَحْرُمُ تَهْيِئَتُهُ لِلنَّائِحَاتِ وَاللهُ أَعْلَمُ.**

ئەندازەیەکی وەها: (يُشْبِعُهُمْ يَوْمَهُمْ وَلَيْلَتَهُمْ) خواردنەکە لە ڕۆژێكو شەوێکی ماتەمینیدا تێریان بکا، واتە: لە مردنیەوە ڕۆژو شەوەکە دەست پێدەکا.

(وَيُلَحُّ عَلَيْهِمْ فِي الأَكْلِ) زۆر داوایان لێدەکرێ: تاکو خواردەنەکە بخۆن، ئەوەك شەرم بکەن ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ جَعْفَرٍ رضي الله عنهما: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِصْنَعُوا لآلِ جَعْفَرَ طَعَاماً فَإِنَّهُ قَدْ جَاءَهُمْ مَايَشْغَلُهُمْ﴾ رواه الترمذي وابوداود بسندصحيح، کە هەواڵی شەهیدبوونی (جعفر) گەیشتە (مدينة)، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خواردەمەنیەك بۆ ماڵو منداڵەکانی (جعفر) دروست بکەن، چونکە ڕووداوێکی وەهایان تووش بووە: ماوەی دروستکردنی خواردنیان نیە.

ئینجا بزانە: سوننەتە دەست بە سەری یەتیمەکاندا بێنیو ڕێزیان لێبنێ، هەروەها لە دوای تەواوبوونی سێ ڕۆژەکەیتازیە، کوڵوخاوێنی بۆ تازیەدارەکان بکرێو سەری نێرینەکانیان بتاشرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی منداڵەکانی(جعفر): کە لە پاشکۆی دەستنوێژدا ڕوونمان کردەوە (وَيَحْرُمُ تَهْيِئَتُهُ) حەرامە: دروستکردنی خواردەمەنی (لِلنَّائِحَاتِ) بۆ ئەو ئافرەتانەی گریەو شین دەگێڕن، چونکە یارمەتیدانە لە سەر تاوانباری (وَاللهُ أَعْلَمُ).

ئینجا بزانە: (بدعة)یەکی ناپەسندە: کەسوکاری مردووەکە خواردن دروست بکەن، تاکو خەڵکی کۆ بکەنەوە بۆ خواردنی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: ئامادەبوونیش بۆ ئەو خواردنە هەر ناپەسندە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللهِ ﷺ: كُنَّا نَعُدُّ الإِجْتِمَاعَ إِلَى أَهْلِ الْمَيِّتِ وَصَنْعَهُمُ الطَّعَامَ مِنَ النِّيَاحَةِ﴾ رواه احمد وابن ماجه بإسناد صحيح، ئێمە کۆبوونەوەمان لە لای کەسوکاری مردووەکەو دروستکردنی خواردەمەنی ئەوانمان بە گریەوزاری دادەنا. واتە: لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ.

ئینجا بزانە: ئەو ناپەسندیە لە کاتێکدایە: کە خواردنەکە بە ماڵێکی وەها دروست نەکرابێ: کە بەشی شێتو یەتیمی تێدا بێ، ئەگینا: حەرامە، کەوابو: چارەی ئەو مەسەلەیە ئەمەیە: دراوسێو خزمە دوورەکانی مردووەکە خواردەمەنی دروست بکەنو بیبەخشنە ژنو منداڵو خزمە نزیکەکانی مردووەکە، جا ئەگەر ئەوان بیدەنە مێوانەکانی تازیە ناپەسند نیە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر خەڵکی گەڕەکەکە، یان دێیەکە بە خۆشی خۆیان خواردن بدەنە مێوانەکانی تازیە، ئەویش ناپەسند نیە، چونکە دانیشتن بۆ تازیە–کە ناپەسندە– مەسەلەیەکە، نان دانیش مەسەلەیەکیترە، وَاللهُ أَعْلَمُ.

ئینجا بزانە: چلە، واتە: بیرەوەریو تازیە نوێکردنەوە لە دوای چل ڕۆژ، (بدعة)یەکی ناشیرنە، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموویەتی.

﴿ پاشکۆ: دەربارەی سەردانی نەخۆش ﴾

سوننەتە: سەردانی نەخۆشی موسوڵمان بکا، جا نەخۆشەکە: خزم بێ، یان نا، دۆست بێ، یان نا، بیناسێ، یان نا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ﴾ رواه مسلم والترمذي واللفظ لە، هەر کاتێك موسڵمان سەردانی نەخۆشێکی موسڵمان بکا، تا دەگەڕێتەوە هەر لە میوە چنینی بەهەشتدا دەبێ.

هەروەها سەردانی نەخۆشی (أهل الذمة)=جولەکەو گاوریش سوننەتە، ئەگەر خزم بێ، یان دراوسێ بێ، یان چاوەڕوانی ئیسلامبوونی لێبکرێ، ئەگەر نا: سەردانەکە سوننەت نیە، بەڵکو دروستە ﴿عَنْ أَنَسٍ: كَانَ غُلَامٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّﷺ فَمَرِضَ، فَعَادَهُ النَّبِيُّﷺ فَقَالَ لَهُ: أَسْلِمْ. فَأَسْلَمَ﴾ رواه البخاري، کوڕێکیجولەکە خزمەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد، ئینجا نەخۆش کەوتو پێغەمبەرﷺ سەردانی کردو فەرمووی: ببە موسڵمان. ئەویش موسڵمان بوو.

ئینجا بزانە: سوننەت نیە سەردانی نەخۆشی ستەمکارو بیدعەچی بکا، ئەگەر تۆبەیان لێ ڕەچاو نەکرێ، هەروەها ئەگەر نەخۆشەکە بە هۆی سەردان تووشی ئازارو ناخۆشی دەبو، ئەو کاتە سەردانی ناپەسندە، هەروەها سوننەتە: سەردانەکە جار جارە بێ، مەگەر خزم، یان دۆستی نەخۆشەکە بێو نەخۆشەکە دڵی پێی خۆش ببێ، ئەو کاتە گشت ڕۆژێك سوننەتە، هەروەها ناپەسندە: زۆر لە لای نەخۆشەکە بمێنێتەوە، مەگەر نەخۆشەکە داوای مانەوەی لێبکا، ئەو کاتە سوننەتە بمێنێتەوە.

هەروەها سوننەتە: دڵی نەخۆشەکە خۆش بکاو بڵێ: ﴿لَابَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَاللهُ﴾ رواه البخاري، هیچ نیە إن شاءَ الله ئەم نەخۆشیە پاککەرەوەی گوناهەکانتە. هەروەها دوعای شیفای بۆ بکاو حەفت جار بڵێ: ﴿أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، لە خوایگەورەی خاوەنی عەرشیگەورە دەپاڕێمەوە شیفات بداتێ. جا ئەو دوعا بۆکردنە لە حاڵەتێکدایە: کە نەخۆشەکە زیانی موسڵمانانی نەبێ، ئەگینا: نابێ دوعای بۆ بکا، بەڵکو دوور نیە سوننەت بێ: دوعای مردنی لێبکا.

ئینجا بزانە: ناپەسند نیە نەخۆشەکە ناڵە ناڵ بکا، بەلام وا سوننەتە: زیکریخواو بکاو قورئان بخوێنێو دوعا بۆ خۆی بکا ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنهَا: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِه بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ﴾رواه الشيخان، کە پێغەمبەرﷺ نەخۆش دەبو، (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) لە سەر خۆی

دەخوێنـدنو فـووی دەکـردە خـۆی. هـەروەها ئەگـەر یـەکێکیش نـەخۆش کـەوتبا، پێغەمبەرﷺ ئەو سێ سورەتانەی لە سەر دەخوێندنو فووی لێدەکرد. جا ناوەڕۆکی ئەم پاشکۆیە لە زۆربەی سەرچاوەکان وەرگیراوە.

اَلْحَمْدُ لله لێرەدا پەرتووکی‌نوێژەکان تەواو بوو، پەرتووکی زەکاتی بە دوادا دێ، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

## ﴿ كِتَابُ الزَّكَاةِ: پەرتووکی زەکات ﴾

زەکات سێیەمین ڕوکنی ئیسلامە، لە مانگی (شوال)ی ساڵی دووەمی کۆچی‌دا واجب کراوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ نوێژ بکەنو زکات بدەن. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةَ أَن لاَّإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ﴾ رواه الشيخان، ئایینی ئیسلام لە پێنج ڕوکن پێك هاتوە: شادە هێنان، نوێژکردن، زەکاتدان، حەج کردن، بەڕۆژووبوونی ڕەمەزان.

کەوابو: هەر کەسێك لە ناو موسڵمانان گەورە بوبێو باوەڕی بە واجببوونی زەکات نەبێ، ئەوە کافرەو وەکو موسڵمانی کافربوو بڕیاری کوشتنی لە سەر دەدرێ، بەڵام ئەگەر باوەڕی بە واجببوونی زەکات هەبو و لە بەر بەخیلی زەکاتی نەدەدا، ئەوە کافر نابێ، بەڵام بە زۆر زەکاتەکەی لێوەردەگیرێ.

جا ئەگەر یەکێك، یان کۆمەڵێك بە پشتیوانی جەنگو چەك هەر ڕقەکاریی کردو زەکاتی نەدا، واجبە: موسڵمانان جەنگی لەگەڵ بکەنو زەکاتەکەی لێوەربگرن، هەروەك (ئیمامی (أبوبکر)و سەحابەکانﷺ جەنگیان لەگەڵ زەکاتنەدەرەکان کرد)و (بخاري و مسلم) گێڕاویەتیانەوە، لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر کەسێك تازە موسڵمان بوو، یان لە شوێنێکی دوور لە موسڵمانان پێگەیشتبو، بۆیێ باوەڕی بە واجببوونی زەکات نەبو، ئەوە یەکەمجار کافر نابێ، بەڵکو پێی دەگوترێ: زەکات واجبە، ئینجا ئەگەر لەمەودوا باوەڕی نەبو، ئەو کاتە کافر دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

## ﴿ بَابُ زَكَاةِ الْحَيْوَانِ: باسی زەکاتی ئاژەڵ ﴾

(إِنَّمَا تَجِبُ) زەکات واجبە (مِنْـهُ) لە چینی ئاژەڵ، تەنها (فِـي النَّعَمِ) لەو چوار جۆرەی پڕ لە نیعمەتن (وَهِـيَ) ئەو چوارانە: (اَلإِبِلُ) ووشترەو (وَالْبَقَـرُ) ڕەشەووڵاغەو (وَالْـغَنَمُ)

لاَالْخَيْلُ وَالرَّقِيقُ وَالْمُتَوَلِّدُ مِنْ غَنَمٍ وَظِبَاء، وَلاَ شَيْءَ فِي الإبِلِ حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسـاً فَفِيهَـا شَاةٌ، وَفِي عَشْرٍ شَاتَان، وَخَمْسَ عَشَرَةَ ثَلاثٌ، وَعِشْرِينَ أَرْبَعٌ، وَخَمْسٍ وَعِشْرِينَ بِنْـتُ مَخَاضٍ، وَستٌّ وَثَلاثِينَ بِنْتُ لَبُون، وَستٌّ وَأَرْبَعِينَ حِقَّةٌ، وإِحْدى وَستِّينَ جَذَعَةٌ، وَستٌّ وَسَبْعِينَ بِنْتَا لَبُون، وإِحْدى وَتِسْعِينَ حِقَّتَان، وَمِأةٍ وإِحْدى وَعِشْرِينَ ثَلاثُ بَنَات لَبُون،

---

کارەگەلە، واتە: بزن‌و مەڕ، کەوابو: جگە لەو چوار جۆرە لە هیچ ئاژەڵێکی‌تردا زەکات واجب نیە، هەروەك دەفەرموێ:

(لاَ الْخَيْلُ) لە وولاغەبەرزەدا -واتە: ئەسپ‌و ماین- زەکات واجب نیە، هەروەها لە کەرو هێستریشدا زەکات واجب نیە (وَالرَّقِيقُ) هەروەها لە کۆیلەشدا زەکات واجب نیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ وَلاَ فَرَسِهِ صَدَقَةٌ﴾ رواه الشيخان، لە سەر موسڵمان واجب نیە: لە کۆیلەی‌و لە وولاغەبەرزەکانی‌دا زەکات بدا. (وَالْمُتَوَلِّدُ) هەروەها لەو ئاژەڵەشدا واجب نیە: کە (مِنْ غَنَمٍ وَظِبَاءٍ) لە کارەگەل‌و ئاسك لە دایك بوبێ، یان لە مانگای کەیی‌و گای کێوی لە دایك بوبێ، یان لە نێری کەیی‌و بزنە کێوی لە دایك بوبێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر وولاغە بەرزەو ئاژەڵەکانی‌تریش بۆ بازرگانی بکرێن، ئەو کاتە زەکاتی بازرگانییان تێدا واجبە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ زەکاتی ووشتر ﴾

(وَلاَ شَيْءَ فِي الإبِلِ) هیچ زەکات واجب نیە لە ووشتردا (حَتَّى تَبْلُغَ خَمْساً) تا ژمارەیان دەگاتە پێنج ووشتر (فَفِيهَا شَاةٌ) لەو پێنج ووشترانەدا مەڕێك، یان بزنێك واجبە: لە زەکات بدرێ (وَفِي عَشْرٍ) لە دە ووشتردا (شَاتَانِ) دوو مەڕ، یان دوو بزن واجبن (وَخَمْسَ عَشَرَةَ) لە پانزە ووشتردا (ثَلاَثٌ) سێ مەڕ، یان سێ بزن (وَعِشْرِينَ) لە بیست ووشتردا (أَرْبَعٌ) چوار مەڕ، یان چوار بزن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فِي أَرْبَعٍ وَعِشْرِينَ مِنَ الإبِلِ فَمَا دُونَهَا الْغَنَمُ: فِي كُلِّ خَمْسٍ شَاةٌ﴾ رواه البخاري، لە بیست‌و چوار ووشتر بەرەو خوارتر، کارەگەل لە زەکات دەدرێ: لە هەر پێنج ووشترێکدا مەڕێك، یان بزنێك واجبە.

(وَخَمْسٍ وَعِشْرِينَ) لە بیست‌و پێنج ووشتردا (بِنْتُ مَخَاضٍ) فەرخە ووشترێکی مێی یەك ساڵە واجبە (وَستٍّ وَثَلاَثِينَ) لە سی‌و شەش ووشتردا (بِنْتُ لَبُونٍ) ووشترێکی مێی دوو ساڵە واجبە (وَستٍّ وَأَرْبَعِينَ) لە چل‌و شەش ووشتردا (حِقَّةٌ) ووشترێکی مێی سێ ساڵە واجبە (وَإِحْدَى وَستِّينَ) لە شەست‌و یەك ووشتردا (جَذَعَةٌ) ووشترێکی مێی چوار ساڵە واجبە (وَستٍّ وَسَبْعِينَ) لە حەفتاو شەش ووشتردا (بِنْتَا لَبُونٍ) دوو ووشتری مێی دوو ساڵە واجبە (وَإِحْدَى وَتِسْعِينَ) لە نەوەدو یەك ووشتردا (حِقَّتَانِ) دوو ووشتری مێی سێ ساڵە واجبە (وَمِأةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ) لە سەدو بیست‌و یەك ووشتردا (ثَلاَثُ بَنَاتِ لَبُونٍ) سێ ووشتری مێی دوو ساڵە واجبن.

ثُمَّ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ بِنْتُ لَبُونٍ وَكُلِّ خَمْسِينَ حِقَّةٌ، وَبِنْتُ الْمَخَاضِ لَهَا سَنَةٌ، وَاللَّبُونِ سَنَتَانِ، وَالْحِقَّةُ ثَلَاثٌ، وَالْجَذَعَةُ أَرْبَعٌ، وَالشَّاةُ جَذَعَةُضَأْنٍ لَهَا سَنَةٌ وَقِيلَ سِتَّةُ أَشْهُرٍ، أَوْ ثَنِيَّةُمَعِزٍ لَهَا سَنَتَانِ وَقِيلَ سَنَةٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ مُخَيَّرٌ بَيْنَهُمَا، وَلاَ يَتَعَيَّنُ غَالِبُ غَنَمِ الْبَلَدِ،

---

(ثُمَّ) ئینجا كه ژمارەی ووشترەكان گەیشتە سەدو سیو بە سەرەوەتر (فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ) لە گشت چل ووشترێكدا (بِنْتُ لَبُونٍ) ووشترێكی مێی دوو ساڵە دەدرێو (وَفِي كُلِّ خَمْسِينَ) لە گشت پەنجا ووشترێكیشدا (حِقَّةٌ) ووشترێكی مێی سێ ساڵە دەدرێ، هەروەك لە حەدیسی (البخاري وأصحاب السنن)دا گێردراوەتەوە، بۆ وێنە: لە سەدو سیدا: دوو (بنت لبون)و یەك (حقة) واجبن، چونكە دوو چلو یەك پەنجای تێدایە، هەروەها لە سەدو چل دا: دوو (حقة)و یەك (بنت لبون) واجبن، چونكە دوو پەنجاو یەك چلی تێدایەو، لە سەدو پەنجادا: سێ (حقة) واجبن، چونكە سێ پەنجای تێدانە...بەو جۆرە.

(وَبِنْتُ الْمَخَاضِ) فەرخە ووشتری یەك ساڵە ئەمەیە: (لَهَا سَنَةٌ) تەمەنی ساڵێك بوبێو گەیشتبێتە ساڵیدووەم، واتە: لەو تەمەنە كەمتر دروست نیە لە زەكاتدا بدرێ (وَاللَّبُونِ) ووشتری دوو ساڵەش (سَنَتَانِ) تەمەنی دوو ساڵ تەواو بوبێو گەیشتبێتە ساڵیسێیەم (وَالْحِقَّةُ) سێ ساڵەش (ثَلَاثٌ) سێ ساڵی تەواو كردبێو گەیشتبێتە ساڵیچوارەم (وَالْجَذَعَةُ) چوار ساڵەش (أَرْبَعٌ) چواری تەواو كردبێو گەیشتبێتە ساڵیپێنجەم.

(وَالشَّاةُ) مەڕو بزنی زەكات تەمەنیان ئەمەیە: (جَذَعَةُ ضَأْنٍ) یان كاوڕێكیمێیە: كە (لَهَا سَنَةٌ) ساڵێكی تەواو كردبێ، یان ددانەكانی پێشەوەی كەوتبن، واتە: مەڕی لەو تەمەنە كەمتر دروست نیە لە زەكاتدا بدرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (سِتَّةُ أَشْهُرٍ) شەش مانگی تەواو كردبن (أَوْ ثَنِيَّةُ مَعِزٍ) یان چوشتیرێك، واتە: بزنێك (لَهَا سَنَتَانِ) دوو ساڵی تەواو كردبن، واتە: بزنی لەو تەمەنە كەمتر دروست نیە لە زەكاتدا بدرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (سَنَةٌ) ساڵێكی تەواو كردبێ.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ مُخَيَّرٌ بَيْنَهُمَا) زەكاتدەر سەرپشكە لە نێوان كاوڕە یەك ساڵیەكەو چوشتیرە دوو ساڵیەكە: كامەیان لە زەكات بدا دروست دەبێ (وَلاَ يَتَعَيَّنُ) دیاری ناكرێ، واتە: مەرج نیە (غَالِبُ غَنَمِ الْبَلَدِ) ئەو جۆرە مەڕو بزنەی بە ئەغلەبی لە شاری زەكاتدا هەنە لە زەكات بدا، بەڵكو هەر جۆرە مەڕو بزنێكی شارەكە لە زەكات بدا، دروست دەبێ، بەڵام دروست نیە: جۆرێكی جیاوازی شوێنێكیتر لە زەكات بدا، مەگەر بەنرختر بێ، یان وەكو یەكتر بن، ئەو كاتە دروستە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەو چوار چینە ووشترەیڕابردوو–كە لە زەكاتدا دەدرێن– مەرجە: گشتیان مێ بن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵام ئەو مەڕو بزنەی لە زەكاتی ووشتردا

وَأَنَّهُ يُجْزِئُ الذَّكَرُ، وَكَذَا بَعِيرُ الزَّكَاةِ عَنْ دُونِ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ، فَإِنْ عَدِمَ بِنْتَ الْمَخَاضِ فَابْنُ لَبُونٍ، وَالْمَعِيبَةُ كَمَعْدُومَةٍ، وَلاَ يُكَلَّفُ كَرِيمَةً لَكِنْ تَمْنَعُ ابْنَ لَبُونٍ فِي الأَصَحِّ،

---

دەدرێن مەرج نیە: مێ بن، بەڵکو (وَأَنَّهُ) لە فەرموودەی ڕاستتر (يُجْزِىءُ الذَّكَرُ) نێرینەی کارەگەل دروستە لە زەکاتی ووشتردا بدرێ، واتە: یان کاوڕە نێرێک، یان نێرییێک لە زەکات بدا، هەرچەند ووشترەکانیش گشتی مێ بن.

(وَكَذَا) هەروەها دروستە (بَعِيرُالزَّكَاةِ) ووشترە مێیەکی زەکات بە تەواوی بدرێ: جا یەک ساڵە بێ، یان زیاتر (عَنْ دُونِ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ) لە زەکاتی کەمتر لە بیستو پێنج ووشتردا: لە جیاتی چوار مەڕ، یان سێ مەڕ، یان دوو مەڕ، یان یەک مەڕ، هەرچەند نرخی ووشترەکەش نەگاتە نرخی یەک مەڕ، چونکە ووشتری مێی یەک ساڵە لە زەکاتی بیستو پێنج ووشتردا دروست بوو، کەوابو: لە زەکاتی کەمتردا باشتر دروست دەبێ، بەڵام بۆیێ شەرع مەڕ، یان بزنی دانابو، تاکو زەرەرو زیان تووشی خاوەنەکەی نەبێ، جا ئەگەر ئەو دڵی بێ: ووشترێکی مێ بدا، ئەوە باشترەو تەواوی ووشترەکەش بە بەر واجب دەکەوێ، هەروەک لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَإِنْ عَدِمَ بِنْتَ الْمَخَاضِ) جا ئەگەر خاوەنی بیستو پێنج ووشترەکە -لە کاتی واجببوونی زەکاتدا- ووشتری مێی یەک ساڵەی نەبو لە زەکات بدا (فَابْنُ لَبُونٍ) ئەو کاتە دروستە: ووشترێکی نێری دوو ساڵە لە جیاتیی بدا، هەرچەندە نرخیشی لە یەک ساڵیە مێیەکە کەمتر بێ، هەروەها دروستیشە: مێیەکی یەک ساڵە بکڕێو لە زەکاتی بدا، جا ئەگەر نرخی نێرە دوو ساڵیەکە زیاتر بوو: نابێ خاوەنەکەی داوای ئەندازەی زێدەییەکە بکا، هەروەک لە (المجموع)دا، بە بەڵگەی حەدیسی(البخاری) فەرموویەتی.

(وَالْمَعِيبَةُ) ووشتری مێی یەک ساڵەی عەیبدار: وەک نەخۆش، یان شەلە، یان کوێر (كَمَعْدُومَةٍ) وەکو نەبوویی وایە، واتە: ئەگەر عەیبدارێکی مێی یەک ساڵەی هەبێ، وەک نەیبێ وایە، کەوابو: نێرە دوو ساڵیەکە دەدا، چونکە عەیبدار نابێتە زەکات.

(وَلاَ يُكَلَّفُ كَرِيمَةً) داوای ووشتریمێی یەک ساڵەی ڕێزدار لە خاوەنەکەی ناکرێ، لەو حاڵەتەی ووشترەکانی لاوازبن، چونکە پێغەمبەرﷺ بە(معاذ)ی فەرموو: ﴿فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْـوَالِهِمْ﴾ رواه الشيخان، ئاگاداربە: ئاژاڵە ڕێزدارەکانیان لە زەکاتدا لێ مەستێنە. (لَكِنْ تَمْنَعُ) بەڵام ئەو مێیە یەک ساڵیە ڕێزدارەی هەیەتی، قەدەغە دەکا (ابْنَ لَبُونٍ) ووشترە نێری دوو ساڵە لە زەکاتدا بدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: واجبە: ووشترێکی مێی یەک ساڵە بکڕێو لەجیاتی یەک ساڵیە ڕێزدارەکەی لە زەکات بدا، بەڵام ئەگەر بە خۆشیخۆی یەک ساڵیە ڕێزدارەکەی لە زەکات بدا، ئەوە خێرترە، هەروەک لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

وَيُؤْخَذُ الْحقُّ عَنْ بِنْت الْمَخَاضِ، لاَ لَبُون فِي الأَصَحِّ، وَلَوِ اتَّفَقَ فَرْضَان: كَمائَتَيْ بَعِيرٍ فَالْمَذْهَبُ لاَ يَتعَيَّنُ أَرْبَعُ حقَاقٍ، بَلْ هُنَّ أَوْ خَمْسُ بَنَات لَبُونٍ، فَإِنْ وَجَدَ بِمَاله أَحَدَهُمَا أَخَذَ، وَإِلاَّ فَلَهُ تَحْصِيلُ مَا شَاءَ، وَقِيلَ يَجبُ الأَغْبَطُ للْفُقَرَاء،

---

هەروەها ئەگەر ووشترەکانی گشتی رێزدار بون، ئەو کاتەش واجبە: مێیە یەك ساڵیە رێزدارەکە کە لە زەکات بدا، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُؤْخَذُ الحقُّ) دروستە: ووشترە نێری سێ ساڵەش لە زەکات وەربگیرێ ئەگەر خاوەنەکەی بە خۆشی خۆی بیدا (عَنْ بِنْتِ المَخَاضِ) لە جیاتی ووشترە مێی یەك ساڵە، بەو مەرجەی یەك ساڵیە مێیەکەی نەبێ، چونکە نێرە سێ ساڵیەکە لە نێرە دوو ساڵیەکەیڕابردوو خێرترە (لاَ لَبُونٍ) بەڵام دروست نیە: ووشترە نێری سێ ساڵە، لە جیاتی ووشترە مێی دوو ساڵە بدرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئاژەڵی دوو ساڵە وەك سێ ساڵی بەهێزە، مێینەش لە نێرینە چاکترە.

(وَلَوِ اتَّفَقَ فَرْضَانِ) ئەگەر لە زەکاتی ووشتردا دوو جۆرە واجب رێك کەوتن (كَمائَتَيْ بَعِيرٍ) وەك دووسەد ووشتر: کە پێنج چل، یان چوار پەنجای تێدایە، لەو حاڵەتەدا (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب ئەمەیە: (لاَ يَتَعَيَّنُ أَرْبَعُ حِقَاقٍ) دیار ناکرێ، واتە: واجب نیە چوار ووشتری مێی سێ ساڵە بدا (بَلْ هُنَّ) بەڵکو: یان ئەو چوارانە دەدا: بە حیسابی چوار پەنجایەکان (أَوْ خَمْسُ بَنَاتِ لَبُونٍ) یان پێنج ووشتری مێی دوو ساڵە دەدا: بە حیسابی پێنج چلەکان (فَإِنْ وَجَدَ) جا ئەگەر زەکاتوەرگر دەستی کەوت (بِمَالِهِ) لە ماڵی زەکاتدەرەکەدا (أَحَدَهُمَا) تەنها جۆرێك لەو دووانەیڕابردوو بە تەواوی، واتە: یان چواری تەواو، یان پێنجی تەواو (أَخَذَ) واجبە: زەکاتوەرگرەکە ئەو جۆرە وەربگرێو نابێ داوای وەدەستهێنانی جۆرەکەیتری لێبکا، هەرچەند سوودیشی زۆرتر بێ.

هەروەها ئەگەر جۆرێکی بە تەواوی هەبو و جۆرەکەیتریشی بە ناتەواوی، یان بە عەیبداری هەبو، ئەو کاتەش واجبە: جۆرە تەواوەکە وەربگرێ، چونکە ناتەواو و عەیبدار بە نەبوویی دادەندرێن، هەروەك لە (المجموع)و (مغني)دا فەرموویانە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لە ماڵی زەکاتدەرەکەدا هیچ جۆرێك -لەو دووانە- بە تەواوی نەبون، واتە: هەر نەبیون، یان هیچ جۆرێك ژمارەی تەواو نەدەبو، یان عەیبدار بون، لەو حاڵەتانەدا (فَلَهُ تَحْصِيلُ مَا شَاءَ) بۆ زەکاتدەرەکە دروستە: کامەیان حەز دەکا وە دەستی بێنێ، یان ژمارەی جۆرێکیان تەواو بکا، بە کڕین، یان بە قەرز، جا واجبە: زەکاتوەرگرەکەش پێی ڕازی بێو لێی وەربگرێ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يَجِبُ الأَغْبَطُ لِلْفُقَرَاءِ) کامەیان باشترە بۆ هەژاران واجبە: ئەویان وەدەست بێنێ.

وَإِنْ وَجَدَهُمَا فَالصَّحِيحُ تَعَيُّن الأَغْبَط، وَلاَ يُجْزِئُ غَيْرُهُ إِنْ دَلَّسَ أَوْ قَصَّرَ السَّاعِي، وَإِلاَّ فَيُجْزِئُ، وَالأَصَحُّ وُجُوبُ قَدْرِالتَّفَاوُت، وَيَجُوزُ إِخْرَاجُهُ دَرَاهِمَ، وَقِيلَ يَتَعَيَّنُ تَحْصِيلُ شِقْصٍ بِهِ، وَمَنْ لَزِمَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ فَعَدِمَهَا وَعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ دَفَعَهَا وَأَخَذَ شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، أَوْ بِنْتُ لَبُونٍ فَعَدِمَهَا دَفَعَ بِنْتَ مَخَاضٍ مَعَ شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً،

---

(وَإِنْ وَجَدَهُمَا) ئەگەر هەردوو جۆرەکەی‌ڕابردووی لە ماڵەکەی‌دا بە تەواوی دەست کەوتن (فَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (تَعَيُّنُ الأَغْبَطِ) کامەیان بۆ هەژاران باشترە ئەویان دیاری دەکریٚ‌و لیٚ‌وەردەگیریٚ‌و (وَلاَ يُجْزِىءُ غَيْرُهُ) جگە لە باشترەکە، جۆریٚکی‌تر دروست نابیٚ‌و بە بەر زەکات ناکەویٚ (إِنْ دَلَّسَ) ئەگەر زەکاتدەرەکە فیٚڵی کردبیٚ: وەك باشترەکەی شاردبیٚتەوە (أَوْقَصَّرَ السَّاعِي) یان زەکاتوەرگرەکە کەمتەرخەمی‌ی کردبیٚ: وەك هەوڵی نەدابیٚ باشترەکە وەربگریٚ، کەوابو: ئەمەیان دەگەڕیٚندریٚتەوە بۆ خاوەنەکەی‌و یەکیٚکی باشتری لیٚوەردەگیریٚ.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر هیچ لایەك کەمتەرخەمی‌و فیٚڵی نەکردبو (فَيُجْزِىءُ) ئەو کاتە دروست دەبیٚ‌و بە بەر زەکات دەکەویٚ، بەڵام ناتەواوە، کەوابو: (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (وُجُوبُ قَدْرِالتَّفَاوُتِ) واجبە: خاوەنەکەی ئەندازەی جیاوازی نرخی ئەمەیان‌و باشترەکە بدا؟ تاکو ناتەواویەکە پڕ بکریٚتەوە (وَيَجُوزُ إِخْرَاجُهُ دَرَاهِمَ) دروستە: بە ئەندازەی جیاوازیەکە پارەی شویٚنەکە بداتە زەکاتوەرگرەکە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بیٚ‌هیٚزدا (يَتَعَيَّنُ تَحْصِيلُ شِقْصٍ بِهِ) واجبە: بە ئەندازەی جیاوازیەکە بەشیٚکی ووشتریٚك پەیدا بکاو تەسلیمی زەکاتوەرگرەکەی بکا.

ئینجا بزانە: ئەگەر زەکاتدەر ووشتری لەو تەمەنەی نەبو: کە واجبە لە زەکاتدا بیدا، ئەو کاتە بۆی دروستە: پلەیەك بە سەرەوەتر بداو (جُبْران): پڕکردنەوەیەك لەزەکاتوەرگرەکە وەربگیریٚتەوە، یان پلەیەك بەرەو خوارتر بداو (جُبْـران): پڕکردنەوەیەکیش بداتە زەکاتوەرگرەکە، هەر پڕکردنەوەیەکیش بریتی‌یە: یان لە دوو مەڕ، یان لە بیست دیرهەمی زیو، کەوابو:

(وَمَنْ لَزِمَهُ بِنْتُ مَخَاضٍ) هەر کەسیٚك لە سەری واجب بوو: ووشتریٚکی میٚی یەك ساڵە لە زەکاتدا بدا (فَعَدِمَهَا) ووشترەکەشی نەبو، بەڵام (وَعِنْدَهُ بِنْتُ لَبُونٍ) ووشتریٚکی میٚی دوو ساڵەی هەبو (دَفَعَهَا) دروستە: ووشترە دوو ساڵیەکە بداو (وَأَخَذَ شَاتَيْنِ) پڕکردنەوەش: یان دوو مەڕ وەربگریٚتەوە (أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمَاً) یان بیست دیرهەم.

هەروەها (أَوْ بِنْتُ لَبُونٍ) یان ئەگەر ووشتریٚکی میٚی دوو ساڵەی لە سەر واجب بوو (فَعَدِمَهَا) ووشترەکەشی نەبو (دَفَعَ بِنْتَ مَخَاضٍ) دروستە پلەیەك دابەزیٚ‌و ووشتریٚکی میٚی یەك ساڵە بدا (مَعَ شَاتَيْنِ) پڕکردنەوەش: یان دوو مەڕ لەگەڵ بدا (أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَمَاً)

أَوْ حِقَّةٌ وَأَخَذَ شَاتَيْنِ أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً، وَالْخِيَارُ فِي الشَّاتَيْنِ وَالدَّرَاهِم لِدَافِعِهَا، وَفِي الصُّعُود وَالنُّزُول لِلْمَالِك فِي الأَصَحّ، إلاَّ أَنْ تَكُونَ إِبِلُهُ مَعِيبَةً، وَلَهُ صُعُودُ دَرَجَتَيْنِ وَأَخْذُ جُبْرَانَيْنِ وَنُزُولُ دَرَجَتَيْنِ مَعَ جُبْرَانَيْنِ بِشَرْط تَعَذُّر دَرَجَة فِي الأَصَحّ، وَلاَ يَجُوزُ أَخْذُ جُبْرَان مَعَ ثَنِيَّة بَدَلَ جَذَعَة عَلَى أَحْسَنِ الْوَجْهَيْنِ، قُلْتُ: الأَصَحُّ عِنْدَ الْجُمْهُور الْجَوَازُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

یان بیست دیرهەم (أَوْ حِقَّةٌ) یان پلەیەك سەركەوێو ووشترێكی مێی سێ ساڵە بدا (وَأَخَذَ شَاتَيْنِ) پڕكردنەوەش: یان دوو مەڕ وەربگرێتەوە (أَوْ عِشْرِينَ دِرْهَماً) یان بیست دیرهەم، هەروەك لە حەدیسی (البخاري)دا گێڕدراوەتەوە.

(وَالْخِيَارُ) سەرپشكی (فِي الشَّاتَيْنِ وَالدَّرَاهِمِ) لە نێوان دوو مەڕەكەو بیست دیرهەمەكەدا: (لِدَافِعِهَا) بۆ ئەو كەسەیە: كە پڕكردنەوەكە دەدا: جا زەكاتدەر بێ، یان زەكاتوەرگر، واتە: سەرپشكە: یان دوو مەڕەكە دەدا، یان بیست دیرهەمەكە دەدا، بەلاَم (وَفِي الصُّعُودِ) لە سەركەوتنی پلەیەكو (وَالنُّزُولِ) لە دابەزینی پلەیەكدا (لِلْمَالِكِ) سەرپشكی بۆ زەكاتدەرەكەیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (إلاَّ أَنْ تَكُونَ إِبِلُهُ مَعِيبَةً) مەگەر ووشترەكانی عەیبدار بن، ئەو كاتە دروست نیە: پلەیەك سەركەوێ بۆ ووشترێكی عەیبدارو داوای پڕكردنەوەش بكا.

(وَلَهُ) بۆ زەكاتدەرەكە دروستە: (صُعُودُ دَرَجَتَيْنِ) دوو پلە سەركەوێ: وەك لە جیاتی ووشتری یەك ساڵە، ووشترێكی سێ ساڵە بداو (وَأَخْذُ جُبْرَانَيْنِ) دوو پڕكردنەوەش وەربگرێ، واتە: یان چوار مەڕ، یان چل دیرهەم (وَنُزُولُ دَرَجَتَيْنِ) هەروەها بۆی دروستە: دوو پلە دابەزێ: وەك لەجیاتی سێ ساڵە: یەك ساڵەیەك بدا (مَعَ جُبْرَانَيْنِ) دوو پڕكردنەوەش لەگەڵ بدا، بەلاَم سەركەوتنو دابەزینەكە (بِشَرْطِ تَعَذُّرِ دَرَجَةٍ) بەو مەرجەی پلەی نزیكتر نەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەواتە: ئەگەر دوو ساڵەی هەبێ، دروست نیە: سەركەوێ بۆ سێ ساڵەو دروستیش نیە: دابەزێ بۆ یەك ساڵە.

(وَلاَ يَجُوزُ) دروست نیە (أَخْذُ جُبْرَانٍ) زەكاتدەرەكە پڕكردنەوەیەك وەربگرێتەوە (مَعَ ثَنِيَّةٍ) كە لەگەڵ ووشترێكی مێی پێنج ساڵەدایەو لە زەكاتدا داویەتی (بَدَلَ جَذَعَةٍ) لە جیاتی ووشتری چوار ساڵە (عَلَى أَحْسَنِ الْوَجْهَيْنِ) لە سەر جوانترینی دوو فەرموودەكان، بەلاَم (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ عِنْدَ الْجُمْهُورِ) فەرموودەی ڕاستتر لە لای كۆمەڵە زۆرەكەی زانایان (الْجَوَازُ) دروستە: پێنج ساڵەیەكە لەجیاتی چوار ساڵەیەكە بداو پڕكردنەوەش وەربگرێتەوە، بەو مەرجەی چوار ساڵەیەكەی نەبێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) كەوابو: ئەگەر بێ وەرگرتنی پڕكردنەوە بیدا، خێری زیاترە، بەلاَم دروست نیە: فەرخە ووشترێكی

وَلاَ تُجزِىءُ شَاةٌ وَعَشَرَةُ دَرَاهِمَ، وتُجزِئُ شَاتَان وَعِشْرُونَ لِجُبْرانَيْنِ. وَلاالْبَقَــرِ حَتَّــى تَبْلُغَ ثَلاَثِينَ فَفِيهَا تَبِيعٌ ابْنُ سَنَة، ثُمَّ فِى كُلِّ ثَلاثِينَ تَبِيعٌ، وَكُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ لَهَا سَنَتَان.

وەها بدا: كە تەمەنی لە ساڵێك كەمتر بێ، هەرچەند پڕكردنەوەش لەگەڵ بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلاَ تُجْزِئُ) دروست نابێ: لە یەك پڕكردنەوەدا زەكاتدەر (شَاةٌ وَعَشَرَةُ دَرَاهِمَ) مەڕێكو دە دیرهەم بدا، چونكە دروست نیە: یەك پڕكردنەوە پارچە بكرێ، بەڵام ئەگەر پڕكردنەوەكە لە لایەن زەكاتوەرگرەكە دەدراوە، زەكاتدەرەكەش پێی ڕازی بوو، ئەو كاتە دروستە پارچە بكرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

هەروەها دروستە: دوو پڕكردنەوە لێك جیاواز بن، كەوابو: (وَتُجْزِئُ) دروست دەبێ: (شَاتَانِ) دوو مەڕ لە لایەكو (وَعِشْرُونَ) بیست دیرهەم لە لایەكیتر (لِجُبْرَانَيْنِ) بۆ دوو پڕكردنەوە، ئینجا بزانە: ئەو پڕكردنەوەیە تایبەتە بە زەكاتی ووشتر، واتە: لە زەكاتی ڕەشە ووڵاغو مەڕو بزندا نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ زەكاتی ڕەشەووڵاغ ﴾

(وَلاالْبَقَرِ) هیچ زەكات واجب نیە لە ڕەشەووڵاغدا (حَتَّى تَبْلُغَ ثَلاَثِينَ) تا دەگاتە سی سەر، جیاوازی نیە: گشتی مانگا بێ، یان گامێش بێ، یان لەو دووانە تێكەڵ بێ (فَفِيهَا) واجبە: لە زەكاتی سی سەردا (تَبِيعٌ) گوێلكێكی نێر بدرێ، كە (ابْنُ سَنَةٍ) ساڵێكی تەواو كردبێو گەیشتبێتە ساڵیدووەم، واتە: لەو تەمەنە كەمتر دروست نابێ، جا ئەگەر گوێلكە مێیەك بەو تەمەنە لە زەكات بدا خێرترە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(ثُمَّ) ئینجا (فِى كُلِّ ثَلاَثِينَ) لە گشت سی سەرێكدا: (تَبِيعٌ) گوێلكە نێرێك واجبەو (وَكُلِّ أَرْبَعِينَ) لە گشت چل سەرێكدا: (مُسِنَّةٌ) مێنگوینێك واجبە لە زەكاتدا بدرێ: كە (لَهَا سَنَتَانِ) دوو ساڵی تەواو كردبێو گەیشتبێتە ساڵیسێیەم ﴿عَنْ مُعَاذٍ رضي الله عنه: بَعَثَنِى رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْيَمَنِ وَأَمَرَنِى أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلاَثِينَ بَقَرَةً: تَبِيعاً أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ: مُسِنَّةً﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ (یَمَنْ)و فەرمانی دامێ: لە گشت سی ڕەشەووڵاغێكدا: گوێلكێكی یەك ساڵەی نێر، یان مێ وەربگرم، لەگشت چل ڕەشە ووڵاغێكیشدا مێنگوینێكی دوو ساڵە وەربگرم.

كەوابو: لە شەست سەردا: دوو گوێلك واجبن، لە حەفتادا: گوێلكێكو مێنگوینێك واجبن، جا ئەگەر دوو جۆرە واجب ڕێك كەوتن: وەك سەدو بیست ڕەشە ووڵاغ، ئەوە ئەگەر حەز دەكا: چوار گوێلك دەدا بە حیسابی چوار سییەكان، یان سێ مێنگوین دەدا بە حیسابی سێ چلەكان، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

وَلاَالْغَنَمِ حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعِينَ فَشَاةٌ جَذَعَةُ ضَأْنٍ أَوْ ثَنِيَّةُ مَعِزٍ، وَفِي مِأَةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ شَاتَانِ، وَمِأَتَيْنِ وَوَاحِدَةٍ ثَلاَثٌ، وَأَرْبَعمِأَةٍ أَرْبَعٌ، ثُمَّ فِي كُلِّ مِأَةٍ شَاةٌ.

---

## ﴿ زەكاتی مەڕو بزن ﴾

(وَلاَالْغَنَمِ) هیچ زەكات واجب نیە لە بزنو مەڕدا (حَتَّى تَبْلُغَ أَرْبَعِينَ) تا دەگاتە چل سەر، جیاوازی نیە: گشتی بزن بێ، یان گشتی مەڕ بێ، یان لەو دووانە تێكەڵ بێ، نێر بێ، یان مێ بێ (فَشَاةٌ) یەك مەڕ، یان یەك بزن واجبە لە زەكاتی چل سەرەكەدا بدرێ، واتە: (جَذَعَةُ ضَأْنٍ) كاوڕێكی مێی یەك ساڵە (أَوْ ثَنِيَّةُ مَعِزٍ) یان چوشتیرێكی دوو ساڵە، واتە: لەو دوو تەمەنە كەمتر هیچیان دروست نابن، هەروەك ڕوونمان كردەوە.

(وَفِي مِأَةٍ وَإِحْدَى وَعِشْرِينَ) لە سەدو بیستو یەك سەردا (شَاتَانِ) دوو مەڕ، یان دوو بزن لە زەكاتدا واجبن (وَمِأَتَيْنِ وَوَاحِدَةٍ) لە دووسەدو یەك سەردا (ثَلاَثٌ) سێ مەڕ، یان سێ بزن واجبن (وَأَرْبَعمِأَةٍ) لە چوارسەد سەردا (أَرْبَعٌ) چوار مەڕ، یان چوار بزن واجبن (ثُمَّ) ئینجا هەر بەو شێوەیە (فِي كُلِّ مِأَةٍ) لە هەر سەدێكدا (شَاةٌ) مەڕێك، یان بزنێك واجبە، واتە: لە پێنج سەددا: پێنج، لە شەشسەددا: شەش...هتد.

﴿عَنْ أَنَسٍ‌ﷺ: أَنَّ أَبَابَكْرٍﷺ كَتَبَ لَهُ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِﷺ عَلَىالْمُسْلِمِينَ فِي صَدَقَةِ الْغَنَمِ فِي سَائِمَتِهَا إِذَا كَانَتْ أَرْبَعِينَ إِلَى عِشْرِينَ وَمِأَةٍ: شَاةٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى عِشْرِينَ وَمِأَةٍ إِلَى مِأَتَيْنِ: شَاتَانِ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى مِأَتَيْنِ إِلَى ثَلاَثمِأَةٍ: فَفِيهَا ثَلاَثٌ، فَإِذَا زَادَتْ عَلَى ثَلاَثمِأَةٍ: فَفِي كُلِّ مِأَةٍ شَاةٌ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، لە زەكاتی مەڕو بزنی لەوەڕاودا پێغەمبەرﷺ لە سەر موسڵمانانی واجب كردوە: لە چل سەر تا سەدو بیست سەر: تەنها یەك سەر زەكات بدرێ، لە سەدو بیست سەر زیاتر تا دووسەد سەر: تەنها دوو سەر بدرێن، لە دووسەد سەر زیاتر تا سێسەد سەر: تەنها سێ سەر بدرێن، ئینجا لە سێسەد زیاتر: لە هەر سەدێكدا سەرێك لە زەكات دەدرێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: ئەگەر خاوەنێك ئاژەڵەكانی لە چەند شوێنێكدا پەرت بون، ئەو كاتەش هەروەك لە یەك شوێندابن ڕەفتار دەكا، بۆ وێنە: ئەگەر بیست مەڕی لە وڵاتێكدا هەبو، بیستیتریشی لە وڵاتێكیتردا هەبو، ئەوە واجبە: زەكات بدا، هەروەها ئەگەر چل مەڕی لە وڵاتێكدا هەبو، چلیتریشی لە وڵاتێكیتردا هەبو، ئەوەش تەنها یەك مەڕ زەكاتی لە سەرە، هەرچەند وڵاتەكانیش لێك دوور بن، هەروەك لە (نهاية)و(مغنى)دا فەرموویانە.

دووەم: لە زەكاتی ئاژەڵدا ئەو ژمارەی دەكەوێتە نێوان ڕادەكانی زەكات: وەك نێوان پێنجو دە: لە زەكاتی ووشتردا، نێوان چلو سەدوبیستویەك: لە زەكاتی كارەگەلدا،

(فَصْلٌ) إِن اتَّحَدَ نَوْعُ الْمَاشِيَةِ أَخَذَالْفَرْضَ مِنْهُ، فَلَوْ أَخَذَ عَنْ ضَأْن مَعزاً أَوْ عَكْسَهُ جَازَ فِيالأَصَحِّ بِشَرْط رِعَايَةِالْقِيمَةِ، وَإِن اخْتَلَفَ كَضَأْن وَمَعزٍ فَفِي قَوْلٍ يُؤْخَذُ مِنَ الأَكْثَرِ، فَإِن اسْتَوَيَا فَالأَغْبَطُ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يُخرِجُ مَا شَاءَ مُقَسِّطاً عَلَيْهِمَا بِالْقِيمَةِ، فَإِذَا كَانَ ثَلاثُونَ عَنْزاً وَعَشْرُ نَعَجَات أَخَذَ عَنْزاً

---

نێوان سی‌و چل: له زەکاتی ڕەشەوڵاغدا ئەوانە گشتی لێبووردراوەو زەکاتی تێدا نیە، کەوابو: ئەگەر تۆ ووشتری هەبن، چواریان بمرن هیچ کار لە زەکاتەکە ناکاو مەڕێك هەر واجب دەبێ، هەروەك له (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

**﴿ فَصْلٌ: له باسی چۆنیەتی زەکاتدانی ئاژەڵ ﴾**

(إِنِ اتَّحَدَ نَوْعُ الْمَاشِيَةِ) ئەگەر ئاژەڵەکانی یەك جۆر بون: وەك گشت ووشترەکانی یەك قەپۆزی بن، یان گشتی دوو قەپۆزی بن، یان ڕەشەوڵاغەکان گشتی مانگا بن، یان گشتی گامێش بن، یان کارەگەلەکە گشتی مەڕ بێ، یان گشتی بزن بێ، ئەوە (أَخَذَ الْفَرْضَ مِنْهُ) زەکاتوەرگرەکە هەر لەو جۆرە ئاژەڵە زەکات وەردەگرێ، هەروەها دروستیشە: له جیاتی جۆرێك جۆرێکیتر وەربگرێ.

کەوابو: (فَلَوْ أَخَذَ عَنْ ضَأْنٍ مَعزاً) ئەگەر له جیاتی جۆری مەڕ، بزنی وەرگرت (أَوْ عَكْسَهُ) یان پێچەوانەکەی: له جیاتی جۆری بزن، مەڕی وەرگرت، یان لە جیاتی جۆری مانگا، گامێشی وەرگرت، یان پێچەوانەکەی، ئەوە (جَازَ) گشتی دروستە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە مەڕو بزن یەك ڕەگەزن، مانگاو گامێشیش یەك ڕەگەزن، بەڵام (بِشَرْطِ رِعَايَةِ الْقِيمَةِ) به مەرجی ڕەچاوکردنی نرخی ئاژەڵە وەرگیراوەکە، واتە: نرخەکەی بگاتە نرخی ئەو ئاژەڵەی له جۆری خۆی واجب بووەو وەرنەگیراوە.

(وَإِنِ اخْتَلَفَ) ئەگەر جۆری ئاژەڵەکان جیاواز بوو: (كَضَأْنٍ وَمَعزٍ) وەك کارەگەلەکەی له مەڕو بزن تێکەڵ بێ، یان گاڕانەکەی له مانگاو گامێش تێکەڵ بێ، یان ڕەوی ووشترەکانی له دوو قەپۆزیو یەك قەپۆزی تێکەڵ بێ (فَفِي قَوْلٍ) له فەرموودەیەکدا (يُؤْخَذُ مِنَ الأَكْثَرِ) زەکاتەکە لەو جۆرە وەردەگیرێ: کە ژمارەی زۆرترە.

(فَإِنِ اسْتَوَيَا) جا ئەگەر هەردوو جۆرەکە ژمارەیان یەکسان بوو (فَالأَغْبَطُ) ئەو کاتە کامەیان بۆ هەژاران باشترە، ئەویان وەردەگیرێ، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّهُ يُخْرِجُ مَا شَاءَ) زەکاتدەرەکە کامە جۆر حەز بکا: ئەویان لە زەکاتدا دەدا (مُقَسِّطاً) زەکاتەکەش بەش دەکا (عَلَيْهِمَا) لە سەر هەردوو جۆرەکە (بِالْقِيمَةِ) بەگوێرەی نرخەکەیان، واتە: هەر جۆرەو بەشە نرخی خۆی تێبینی دەکا:

بۆ وێنە: (فَإِذَا كَانَ ثَلاثُونَ عَنْزاً) هەر کاتێك سی بزنی هەبون (وَعَشْرُ نَعَجَاتٍ) دە مەڕیشی هەبون، ئەوە دەکاتە چل سەر، کەوابو: (أَخَذَ عَنْزاً) زەکاتوەرگرەکە، یان بزنێك وەردەگرێ

أَوْ نَعْجَةً بِقِيمَةِ ثَلاَثَةِ أَرْبَاعِ عَنْزٍ وَرُبُعِ نَعْجَةٍ، وَلاَ تُؤْخَذُ مَرِيضَةٌ وَلاَ مَعِيبَةٌ إِلاَّ مِنْ مِثْلِهَا، وَلاَ ذَكَرٌ إِلاَّ إِذَا وَجَبَ وَكَذَا لَوْ تَمَحَّضَتْ ذُكُوراً فِي الأَصَحِّ،

---

(أَوْ نَعْجَةً) یان مەڕێك وەردەگیرێ (بِقِيمَةِ ثَلاَثَةِ أَرْبَاعِ عَنْزٍ) نرخی بزنەکە، یان نرخی مەڕەکە بە ئەندازەی سێ چارێگی بزنێك بێو (وَرُبُعِ نَعْجَةٍ) بە چارێکی مەڕێك بێ، واتە: ئەگەر نرخی بزنەکە سەد دینار بوو و نرخی مەڕەکە دوو سەد دینار بوو، واجبە ئەو مەڕە، یان ئەو بزنەی لە زەکاتدا دەیدا: نرخەکەی سەدو بیستو پێنج دینار بێ، چونکە حەفتاو پێنج دینار سێ چارێگی نرخی بزنەکەیەو پەنجا دیناریش چارێگی نرخی مەڕەکەیە.

﴿ ئەو ئاژەڵانەی دروست نیە لە زەکاتدا بدرێن ﴾

یەکەم: (وَلاَ تُؤْخَذُ مَرِيضَةٌ) ئاژەڵی نەخۆش لە زەکاتدا وەرناگیرێ. دووەم: (وَلاَ مَعِيبَةٌ) ئاژەڵی عەیبدار لە زەکاتدا وەرناگیرێ، واتە: ئەو دوو ناتەواوانە وەبەر زەکات ناکەون (إِلاَّ مِنْ مِثْلِهَا) تەنها لە زەکاتی ئەو ئاژەڵانەدا نەبێ: کە گشتیان ناتەواو بن: بە هۆی نەخۆشی، یان عەیبداری، ئەو کاتە لە نەخۆشەکاندا نەخۆش دەدرێ، لە عەیبدارەکاندا عەیبدار دەدرێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُخْرَجُ فِي الصَّدَقَةِ هَرِمَةٌ وَلاَ ذَاتُ عَوَارٍ وَلاَ تَيْسٌ إِلاَّ مَاشَاءَ الْمُصَدِّقُ﴾ رواه البخاري، لە زەکاتدا: ئاژەڵی پیر نادرێ، ئاژەڵی عەیبدار نادرێ، نێریش نادرێ، مەگەر زەکاتوەرگرەکە حەز بکاو بۆ هەژاران باشتر بێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵەکان گشتیان نەخۆش، یان عەیبدار نەبون، بەڵکو ئاژەڵی ساغیشیان تێدا هەبو، ئەو کاتە واجبە: ئاژەڵی ساغ لە زەکاتدا بدرێ، لەگەڵ ڕەچاوکردنی نرخ، واتە: ئەگەر لە چل سەر بیستیان ساغو بیستیان نەخۆش بوو، واجبە: ئاژەڵێکی ساغ لە زەکاتدا بدا: کە نرخەکەی بە ئەندازەی نیوەی ساغێكو نیوەی نەخۆشێك بێ، جا ئەگەر هاتوو: لە ناو ئاژەڵەکاندا تەنها یەك سەر ساغ بوو، واجبە: ئاژڵێکی ساغ بدا.

هەروەها ئەگەر دوو ئاژەڵ زەکاتی لە سەر بون بەڵام تەنها دووانیان ساغ بون، واجبە: دوو ئاژەڵی ساغ بداو نرخەکەشیان ڕەچاو دەکرێ، هەروەها ئەگەر دوو ئاژەڵ زەکاتی لە سەر بوو، بەڵام تەنها یەکێکی ساغی هەبو، ئەو کاتە ساغێكو نەخۆشێك لە زەکاتدا دەدلو نرخی ساغەکەش ڕەچاو دەکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: (وَلاَ ذَكَرٌ) ئاژەڵی نێر لە زەکاتدا وەرناگیرێو بە بەر ناکەوێ (إِلاَّ إِذَا وَجَبَ) تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ کە نێر واجب بێ: وەك گوێلکە نێرێك لە سی ڕەشەوڵاغداو، وەك کارگەلی نێر لە زەکاتی کەمتر لە بیستو پێنج ووشتر، کە باسمان کردن (وَكَذَا) هەروەها دروستە: ئاژەڵی نێر لە زەکاتدا بدرێ (لَوْ تَمَحَّضَتْ ذُكُوراً) ئەگەر گشت ئاژەڵەکانی نێر بون (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

بەڵام ئەگەر گشتی نێر نەبون، بەڵکو ئاژەڵەکانی لە نێر و مێ تێکەڵ بون، ئەو کاتە واجبە: ئاژەڵی مێ لە زەکاتدا بدا، واتە: ئەگەر لە ناو ئاژەڵەکاندا تەنها یەکێك مێ هەبێ، واجبە: ئاژەڵێکی مێ لە زەکاتدا بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**چوارەم:** ئاژەڵی بچووك واتە: کە نەگەیشتبێتە تەمەنی زەکات، لە زەکات وەرناگیرێ، لەو حاڵەتەی ئاژەڵەکانی گشتی گەورەبن، یان لە گەورەو بچووك تێکەڵ بن، واتە: هەر چەندەش تەنها یەك ئاژەڵ لە ناویاندا گەورە بێ، واجبە: ئاژەڵێکی گەورە لە زەکاتدا بدا، لەگەڵ ڕەچاوکردنی نرخەکەی، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر ئاژەڵەکان گشتی بچووك بون، ئەو کاتە (وَفِي الصِّغَارِ) لە زەکاتی ئاژەڵی بچووکدا (صَغِيرَةٌ) ئاژەڵێکی بچووك دەدا (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، وك چل کارە مێی هەبێو ساڵێکی ئیسلامی بە سەردا سوڕابێتەوەو تەمەنیان نەبوبێتە دوو ساڵ، یان گشت مەڕەکانی بمرنو بەرخەکانیان لە پاش بەجێ بمێنێ، لەو حاڵەتانەدا کارێکی بچووك، یان بەرخێکی بچووك دەدا، هەروەك لە زەکاتی بێچوودا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاء الله تعالى ﴿عَنْ أَبِي بَكْرٍ ﷺ: وَاللهِ لَوْ مَنَعُونِي عَنَاقاً كَانُوا يُؤَدُّونَهَا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ لَقَاتَلْتُهُمْ عَلَى مَنْعِهَا﴾ رواه الشيخان، سوێند بە خوا ئەگەر لە زەکاتدا کاریلەیەك لە من قەدەغە بکەن: کە تەمەنی لە ساڵێك کەمتر بێو کاتی خۆی دەیاندا پێغەمبەرﷺ، من جەنگیان لەگەڵ دەکەم لە سەر ئەو نەدانە.

**پێنجەم:** جۆری خراپ لە زەکات وەرناگیرێ، مەگەر گشتی خراپ بن: وەك گشتی بزن بن، ئەو کاتە بزن وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر لە باشو خراپ تێکەڵ بون، ئەو کاتە زەکاتدەر بە خۆشیخۆی جۆرێك دەداو نرخەکەشی ڕەچاو دەکا، هەروەك لە باسی چۆنیەتی زەکاتدانی ئاژەڵدا ڕوون کراوە (وَلاَ رُبَّى) نابێ ئاژەڵی تازە زابی لە زەکاتدا وەربگیرێ، تا دوو مانگ بە سەر زانیدا تێدەپەڕێ، چونکە بێچووەکەی پەروەردە دەکا.

(وَأَكُولَةٌ) نابێ ئاژەڵی قەڵەوکراو بۆ خواردن لە زەکاتدا وەربگیرێ (وَحَامِلٌ) نابێ ئاژەڵی ئاوس لە زەکاتدا وەربگیرێ، چونکە ئاوس بە دوو ئاژەڵ دەژمێردرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: نابێ ئاژەڵ بە بێچووەوە لە زەکاتدا وەربگیرێ (وَخِيَارٌ) نابێ ئاژەڵی زۆر باش لە زەکاتدا وەربگیرێ (إِلاَّ بِرِضَا الْمَالِكِ) تەنها بە ڕەزامەندی خاوەنەکەیان نەبێ، واتە: ئەگەر خاوەنەکەیان ڕازی بێ، ئەو کاتە دروستە: ئەوانەی تازە ڕابردوو گشتیان لە زەکاتدا وەربگیرێن، پێغەمبەرﷺ بە (معاذ)ی فەرموو: ﴿فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ﴾ رواه الشيخان، ئاگادار بە: ئاژەڵە ڕێزدارەکانیان لە زەکاتدا لێمەستێنە.

وَلَواشتَرَكَ أَهلُ الزَّكَاة فِي مَاشِيَة زَكَّيَا كَرَجُلٍ، وَكَذَا لَوْ خَلَطَا مُجَاوِرَةً بِشَرْطِ أَنْ لاَ تَتَميَّزَ فِيالْمَشْرَب وَالْمَسْرَحِ وَالْمُراحِ وَمَوْضعِ الْحَلَب، وَكَذَا الْفَحْلِ وَالرَّاعِي فِي الأَصَحِّ، لاَ نِيَّةُالْخُلطَة فِيالأَصَحِّ، وَالأَظْهَرُ تَأْثِيرُ خُلْطَة الثَّمَرِ وَالزَّرْعِ وَالنَّقْد

---

ئينجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵەكان گشتيان ڕێزدارو قەڵەو بون، ئەو كاتە ئاژەڵی ڕێزدارو قەڵەو لە زەكات وەردەگیرێ، بەڵام ئەگەر گشتيان ئاوس بون، نابێ بۆ زەكات دلوای ئاوسی لێبكرێ، مەگەر بە خۆشی خۆی بیدا، ئەو كاتە دروستە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

## ﴿ زەكاتی ماڵی هاوبەش و تێكەڵ ﴾

(وَلَوْ اشْتَرَكَ أَهْلُ الزَّكَاة) ئەگەر ئەو كەسانەی زەكاتيان لە سەر واجبە، بونە هاوبەش (فِي مَاشِيَةٍ) لە كۆمەڵە ئاژەڵێكدا (زَكَّيَا كَرَجُلٍ) وەك يەك خاوەن زەكات دەدەن، بەو سێ مەرجانە: يەكەم: ماڵە هاوبەشەكەيان لە يەك ڕەگەز بێ. دووەم: كۆی بەشەكانی هەموويان بگاتە ڕادەی زەكات، يان كۆی بەشەكان نەگاتە ڕادەی زەكات، بەڵام يەكێك لە هاوبەشەكان هەندێك ماڵیتری هەبێو لەگەڵ بەشەكەیهاوبەش بگاتە ڕادەی زەكات، وەك لە ئاگاداریی يەكەمدا وێنەی بۆ دێنين، إن شاء الله تعالى. سێيەم: ساڵێكیئيسلامی تەواو هاوبەشيەكە بەردەوام بێ، ئەگەر ماڵەكە زەكاتەكەی ساڵانە بێ، جياوازی نيە هاوبەشيەكەيان: بە هۆی ميرات بێ، يان بە هۆی كڕين، يان بە هۆيەكیتر بێ.

(وَكَذَا) هەروەها وەك يەك خاوەن زەكات دەدەن (لَوْ خَلَطَا مُجَاوِرَةً) ئەگەر بە جياكراوەيی ئاژەڵەكانيان تێكەڵ كردبن، واتە: خودی ماڵی گشت خاوەنێك لەویتر ديار بوو، ئەو تێكەڵكردنەش–وەك هاوبەشی–كار لە واجبوونیزەكات دەكا، بەو سێ مەرجانەیڕابردوو، هەم (بِشَرْطِ أَنْ لاَ تَتَمَيَّزَ) بەو مەرجەش ئاژەڵەكانی هيچ خاوەنێك لەوانیتر جيا نەكرێنەوە، لەم حاڵەتانەیداهاتوو: (فِيالْمَشْرَبِ) لە شوێنی ئاو خواردنەوەداو (وَالْمَسْرَحِ) لە مۆڵگەی ڕۆژێو، هەم لە لەوەڕگەشدا (وَالْمُراحِ) لە شوێنی لێمانەوەی شەوێداو (وَمَوْضِعِ الْحَلَبِ) لە شوێنی دۆشينیداو (وَكَذَاالْفَحْلُ) هەروەها نێرەی پەڕينيشيان يەك بێ، واتە: بێ جياوازی نێرەكە بپەڕێتە سەر مێيەی گشتيان، بەڵام ئەگەر جۆری ئاژەڵەكانيان جياواز بون: وەك مەڕو بزن، ئەو كاتە جياوازی نێرەكە زيانی نيە (وَالرَّاعِي) هەروەها شوانيشيان يەك بێ، واتە: شوانێك، يان چەند شوانێك گشت ئاژەڵەكان پێكەوە بلەوەڕێنن، نەك تەنها تەنها (فِيالأَصَحّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ نِيَّةُالْخُلْطَةِ) بەڵام نيەتی تێكەڵكردن مەرج نيە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر: (تَأْثِيرُ خُلْطَةِالثَّمَرِ) كار لە واجببوونی زەكات دەكا: تێكەڵی ميوەجاتو (وَالزَّرْعِ) تێكەڵی داچاندنی دانەوێڵەو (وَالنَّقْدِ) تێكەڵی پارەو

وَعَرْضِ التِّجَارَةِ، بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَتَمَيَّزَ النَّاطُورُ وَالْجَرِينُ والــدُّكَّانُ وَالْحَــارِسُ وَمَكَــانُ الْحِفْظِ وَنَحْوُهَا،

---

پولو (وَعَرْضِ التِّجَارَةِ) تێكەڵیی كەلوپەلی بازرگانی، جیاوازی نیە: تێكەڵیەكە بە شێوەی هاوبەشی بێ، یان بە شێوەی جیاكراوەیی، هەروەها بە هۆی میرات، یان كڕین، یان هۆیەكیتر بێ، بەو سێ مەرجانەی لە هاوەبەشی ئاژەڵدا ڕابران.

هەم (بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَتَمَيَّزَ النَّاطُورُ) بەو مەرجەش پاسەوان لێك جیا نەكرێتەوەو (وَالْجَرِينُ) مشتاغو خەرمان لێك جیا نەكرێنەوەو (والدُّكَّانُ) شوێنی شت لێفرۆشتن لێك جیا نەكرێتەوە (وَالْحَارِسُ) چاودێر لێك جیا نەكرێتەوەو (وَمَكَانُ الْحِفْظِ) شوێنی لێپاراستن لێك جیا نەكرێتەوەو (وَنَحْوِهَا) ئەوانەی وەك ئەوانەش لێك جیا نەكرێنەوە: وەك فرۆشیارو تەرازوو و ڕێەو ئاودانو دروێنەو كێڵانو ژمێریار...هتد.

ئینجا بزانە: بەڵگەی زەكاتی ماڵی هاوبەشو تێكەڵ ئەم حەدیسەیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلاَ يُجْمَعُ بَيْنَ مُتَفَرِّقٍ وَلاَ يُفَرَّقُ بَيْنَ مُجْتَمِعٍ خَشْيَةَالصَّدَقَةِ، وَمَا كَانَ مِنْ خَلِيطَيْنِ فَإِنَّهُمَا يَتَرَاجَعَانِ بَيْنَهُمَا بِالسَّوِيَّةِ﴾رواه البخاري وأصحاب السنن، نابێ لە ترسی زەكات: ماڵی پەرتكراو تێكەڵ بكرێو نابێ ماڵی تێكەڵ پەرت بكرێ، جا هەر ماڵێكی تێكەڵكراو زەكاتی لێدرا، خاوەنەكانیان دەگەڕێنەوە سەر یەكتر: بە گوێرەی ئەندازەی بەشی خۆیان.

﴿ئاگاداری﴾ یەكەم: ئەو حەدیسە وادەگەیەنێ: كە هاوبەشیو تێكەڵكردن، هەندێ جار بارسووكییە بۆ خاوەنەكان: وەك دوو خاوەن هەشتا مەڕ بە یەكسانی-هەر یەكەو چل- تێكەڵ بكەن، یان سێ خاوەن سەدو بیست مەڕ بە یەكسانی-هەر یەكەو چل- تێكەڵ بكەن، ئەوانە لە حاڵەتی هاوبەشیو تێكەڵیدا تەنها یەك مەڕ دەدەن، بەڵام ئەگەر تەنها تەنها بن، واجبە: هەر یەكەو مەڕێك زەكات بدا.

هەندێ جاریش بارگرانییە: وەك دوو خاوەن چل مەڕ بە یەكسانی-هەر یەكەو بیست- تێكەڵ بكەن، لە حاڵەتی هاوبەشیو تێكەڵیدا واجبە مەڕێك بدەن، بەڵام تەنها تەنها هیچیان لە سەر واجب نیە.

هەندێ جاریش بۆ یەكێك بارسووكییەو بۆ یەكێك بارگرانییە: وەك دوو خاوەن بە یەكسانی بیست مەڕ-هەر یەكەو دە- تێكەڵ بكەن، بەڵام یەكێكیان سی مەڕیتری هەبێو تێكەڵی نەكردبێ، ئەوە لە حاڵەتی هاوبەشیو تێكەڵیدا واجبە: پێكەوە مەڕێك بدەن، واتە: پێنجێكی لە سەر خاوەنی دەیەكەیە، بەڵام تەنها تەنها خاوەنی دەیەكە هیچی لە سەر نیەو ئەویتر بە تەنهاییش مەڕێكی تەواوی هەر لە سەرە؟ چونكە لە ڕاستیدا خاوەنی چل سەرە.

........................................

ئینجا بزانە: هاوبەشیو تێکەڵی میوەو دانەوێڵەو پارەو بازرگانی تەنها بارگرانی دێنێ، چونکە ئەوانە وەکو ئاژەڵ لێبووردنیان تێدانیە، هەروەك هەر یەکەو لە شوێنی خۆیاندا ڕوونیان دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تعالَى.

دووەم: هەر بە بەڵگەی حەدیسەکە، دروستە: یەکێك لە هاوبەشەکان، یان لە خاوەنەکان بە بێئیزنی ئەوانیتر زەکات بداو نیەتی زەکاتدانیش بێنێ: هەم بۆ خۆیو هەم لە جیاتی ئەوانیتر، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە، جا ئەگەر لە خودیماڵە هاوبەشەکە زەکاتی دا، ئەوە هەر یەکەو بە ئەندازەی بەشی خۆی زەکاتی لێدەردەچێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئەگەر لە ماڵی یەکێکیان زەکاتەکە درا، ئەوە خاوەنەکەی بە ئەندازەی بەشەکانی ئەوانیتر نرخەکەیان لێوەردەگرێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: هەر بە بەڵگەی حەدیسەکە، هەر کاتێك خاوەنەکان ماڵەکەیان لێك جیاکردەوەو بە تەنها بەشەکەی خۆیان برد، ئەوە لەو کاتەوە هاوبەشیو تێکەڵی کۆتایی دێ، کەوابو: هەر یەکەیان-بە جیا- زەکاتی بەشەکەی خۆی دەدا ئەگەر بگاتە ڕادەی زەکات، ئەگەر نا: نا، بەڵام سەرەساڵەکەشی لەو کاتەوە دەست پێدەکا: کە بووەتە خاوەنی ئەو بەشە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

جا ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو، واتە: سەرە ساڵەکەیان بە تەنها تەنها دامەزرابو، ئینجا بونە هاوبەش، یان تێکەڵیان کرد، ئەوە تەماشا دەکرێ: ئەگەر سەرە ساڵەکەیان وەکو یەکتری بوو: وەك گشتیان لە مانگی (مُحَرَّم)دا بوبنە خاوەنی ماڵەکەو لە مانگی (صَفَر)ش بونە هاوبەش، یان تێکەڵیان کرد، ئەوە لە کۆتایی ساڵیەکەمدا هەر خاوەنێك زەکاتی خۆی بە جیا دەدا، ئینجا لە کۆتایی ساڵی دووەمو دواوەتر، وەکو یەك خاوەن زەکاتی تێکەڵاوی دەدەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر سەرە ساڵەکەیان لێك جیا بوو: وەك یەکێکیان لە (مُحَرَّم)دلو ئەویتریش لە (صَفَر)دا بوبێتە خاوەن، ئینجا لە مانگی مەولوددا تێکەڵیان کرد، ئەوانەش هەر یەکەو لە کۆتایی ساڵەکەی خۆیدا واجبە: بە تەنها زەکات بدا، ئینجا لە کۆتایی ساڵی دووەمو دواوەتر هەموویان وەکو یەك خاوەن زەکات دەدەن، بەڵام بەشێکی زەکاتەکە لە (مُحَرَّم)دا لە سەر خاوەنێکە بە گوێرەی بەشەکەی خۆیو بەشێکیتریش لە (صَفَر)دا لە سەر خاوەنێکە بە گوێرەی بەشەکەی خۆی، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

چوارەم: ووشەی (أهل الزكاة) وا دەگەیەنێ: کە هاوبەشیو تێکەڵی لەگەڵ ئەو خاوەنانەی زەکاتیان لە سەر نیە، وەك تەنهایی وایە، واتە: ئەگەر یەکێك لە خاوەنەکانی

وَلِوُجُوبِ زَكَاةِ الْمَاشِيَةِ شَرْطَانِ: مُضِيُّ الْحَوْلِ فِي مِلْكِهِ، لَكِنْ مَا نُتِجَ مِنْ نِصَابٍ يُزَكَّى بِحَوْلِهِ،

---

ماڵە هاوبەشەکە، یان تێکەڵەکە: کافر بوو، یان مزگەوت بوو، یان (بیت المال) بوو، یان ماڵەکە هی وەسێتو خێراتی گشتی بوو، لەو حاڵەتانەدا ئەم هاوبەشیو تێکەڵیە کار لە زەکات ناکا، چونکە ئەو جۆرە خاوەنانە زەکاتیان لە سەر واجب نیە، کەوابو: ئەگەر بەشی ئەو خاوەنەی کە زەکاتی لە سەر واجبە، بە تەنها دەگەیشتە ڕادەی زەکات، ئەوە تەنها زەکاتی بەشەکەی خۆی دەدا، ئەگەر بە تەنها نەدەگەیشتە ڕادەی زەکات، ئەویش زەکاتی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ زەکاتی بێچوو ﴾

(وَلِوُجُوبِ زَكَاةِ الْمَاشِيَةِ) بۆ واجببوونی زەکاتی ئاژەڵ (شَرْطَانِ)-جگە لە مەرجەکانی ڕابردوو- دوو مەرجیتر هەنە:

مەرجی یەکەم: (مُضِيُّ الْحَوْلِ) ساڵێکی ئیسلامی بە سەردا بڕوا (فِي مِلْكِهِ) ئاژەڵەکەش هەر لە ملکایەتی خاوەنەکەی دابێ ﴿عَنْ أَبِي بَكْرٍ وَعُثْمَانَ وَعَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ لاَزَكَاةَ فِي مَالٍ حَتَّى يَحُولَ عَلَيْهِ الْحَوْلُ﴾أثر صحيح رواه البيهقي وغيره، لە هیچ ماڵێکدا زەکات واجب نابێ تا ساڵی بە سەردا دەسوڕێتەوە.

کەوابو: بێچووی ئاژەڵەکان-کە تەمەنیان لە ساڵێك کەمتر بێ- چونکە ساڵێکیان بە سەردا نەسوڕاوەتەوە، زەکاتیان تێدا نیە، تەنها لە دوو حاڵەتدا نەبێ:

حاڵەتی یەکەم: (لَكِنْ مَا نُتِجَ مِنْ نِصَابٍ) بەڵام ئەو بێچووانەی لەو دایکانەی ڕادەی زەکات پەیدا بونە (يُزَكَّى بِحَوْلِهِ) هەر بە سوڕانەوەی ساڵی ڕادەی دایکەکان زەکاتیان لێدەدرێ، واتە: لە دوای تەواوبوونی ڕادەی یەکەمی زەکات، هەر بێچووێك پەیدا ببێ، ئەوە بۆ تەواوکردنی ڕادەی دووەمی زەکاتو سێیەمیو چوارەمیو...هتد، لەگەڵ دایکەکانیان سەرژمێر دەکرێنو دوو زەکات، یان زیاتریان لێدەدرێن، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ئیمامی (عمر)ی داهاتوو.

بۆ وێنە: ئەگەر سەد مەڕی هەبونو بیستو یەك بەرخ، یان زیاتریان لێپەیدا بون، هەروەها ئەگەر سی مانگای هەبونو دە گوێلك، یان زیاتریان لێپەیدا بون، ئەو بێچووانەش لەگەڵ دایکەکانیان سەرژمێر دەکرێنو ڕادەی دووەمی زەکاتو بە سەرەوەتریان پێ تەواو دەکرێ: دوو مەڕ، یان زیاتر، هەروەها مێنگوینێك، یان زیاتر، لە زەکاتیان دەدرێ، بەڵام بەو مەرجەش: پێش سوڕانەی ساڵ ئەو بێچووانە لە دایکیان پەیدا بوبن. هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: سودی كۆكردنەوەی بێچووەكان لەگەڵ دایكیاندا لەو حاڵەتەدا دەردەكەوێ: كە پێكەوە بگەنە ڕادەیەكی‌تری زەكات، هەروەك ڕوونمان كردەوە، كەواتە: ئەگەر پێكەوە نەگەنە ڕادەیەكی‌تر: وەك سەد مەڕ تەنها بیست بەرخی لێببێ، لەو حاڵەتەدا بێچووەكان سودیان نیەو تەنها یەك زەكاتیان تێدا واجب دەبێ.

هەروەها بزانە: ڕادەی‌یەكەمی زەكات بە بێچووەكان تەواو ناكرێ، كەواتە: ئەگەر تەنها بیست مەڕی هەبێو تەنها بیست بەرخیان لێببێ، یان بیستو نۆ مانگای هەبێو بیستو نۆ گوێلكیان لێببێ، ئەوە لەم ساڵەدا زەكاتی لە سەر نیە، بەڵكو لەو كاتەوە: كە ژمارەیان بە بێچووەكانیان تەواو بووە، سەرە ساڵێكی نوێ دەست پێدەكا.

هەروەها ئەگەر لە دوای سوڕانەوەی ساڵ بێچووەكانیان لێبون ئەو كاتەش بۆ ساڵی‌ڕابردوو سەرژمێر ناكرێن، بەڵكو بۆ ساڵی داهاتوو-لەگەڵ دایكەكانیان- سەرژمێر دەكرێن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانەیان ڕوون كردونەوە.

هەروەها بزانە: لەو حاڵەتانەی ئاژەڵەكان لە دایكەكانو بێچووەكانیان تێكەڵن، واجبە: ئاژەڵی تەمەنی‌زەكات لە زەكاتدا بدا، بەڵام نرخەكەشی ڕەچاو دەكرێ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

حاڵەتی‌دووەم: ئەگەر دایكەكان گشتیان بمرن، یان هەندێكیان بمرن، لەو حاڵەتەشدا بێچووەكانیان لە جێ دادەندرێنەوەو زەكاتیان لێدەدرێ: وەك تەنها چل مەڕی بە بەرخەوەی هەبێو گشت مەڕەكان بمرن، ئەو كاتە بەرخەكان لە جێی دایكەكانیان دادەندرێنو بەرخێكی‌بچووك لە زەكاتدا دەدرێ، یان تەنها لەو چلە بیست مەڕ بمرن، ئەو كاتەش بیست بەرخیان لە جێ دادەندرێ، بەڵام مەڕێك-بەگوێرەی‌نرخ- لە زەكاتدا دەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بە بەڵگەی‌حەدیسەكەی ئیمامی (أبی‌بكرالصدیق)ی‌ڕابردوو، هەم ﴿عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّهُ قَالَ لِساعِيهِ: إِعْتَدَّ عَلَيْهِمْ بِالسَّخْلَةِالَّتِي يَرُوحُ بِهَا الرَّاعِي عَلَى يَدَيْهِ﴾ رواه الإمامان مالك والشافعي بإسنادهماالصحيح، بۆ زەكات ئەو بەرخە ساوایەش سەرژمێر بكە: كە شوان لە سەر دەستەكانی خۆی دەیهێنێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەو بێچووانەی ساڵێكیان بە سەردا دەسوڕێتەوەو نەشگەیشتونە تەمەنی زەكات، لە ژمارە چوارەمی باسی ئاژەڵی بچووكدا ڕوون كرانەوە، وَالْحَمْدُ للهِ تَعالَى.

(وَلاَ يُضَمُّ الْمَمْلُوكُ) ئەو ئاژەڵەی وەدەستی هێناوە، كۆ ناكرێتەوە لەگەڵ ئەو ئاژەڵانەی پێشدا هەیەتی، جا وەدەستهێنانەكەی: (بِشِرَاءٍ) بە كڕین بێ (أَوْ غَيْرِهِ) یان بە هۆیەكی‌تر: وەك میراتو بەخشین، هەروەها جیاوازی گەورەو بێچووش نیە (فِي الْحَوْلِ) لە سوڕانەوەی ساڵدا، واتە: لە كۆتایی ساڵی ئاژەڵەكانی پێشدا، زەكاتی ئەم ئاژەڵە

دەستکەوتووانە نادا، بەڵام بۆ تەواوبوونی ڕادەی زەکات، گشتیان پێکەوە کۆ دەکرێنەوە، واتە: هەم ڕادەی یەکەمی پێ تەواو دەکرێ: وەك سیو نۆ مەڕی هەبێو مەڕێکیتریش بکڕێ، ئەوە لە کاتی کڕینیەوە سەرە ساڵەکەیان دەست پێدەکا، هەروەك لە (بجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەم ڕادەی دووەمو بە سەرەوەتریشی پێ تەواو دەکرێ: وەك لە (محرم)دا سی مانگا بکڕێو لە (صفر)دا دە مانگایتر بکڕێ، ئەوە کە ساڵ تەواو بوو، لە (محرم)دا گوێلکێك لە زەکاتی سییەکەدا دەدلو لە (صفر)دا: چوارێکە مێنگوینێك لە زەکاتی دەیەکە دەدا، ئینجا بۆ ساڵێکیتر: سێ چوارێکە مێنگوین لە (محرم)دا دەدلو چوارێکە مێنگوینێك لە (صفر)دا دەدا...بەو جۆرە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵە دەستکەوتووەکان بە تەنها ڕادەی زەکات بوون، بەڵام لەگەڵ ئاژەڵەکانی پێشدا نەدەگەیشتنە ڕادەیەکیتری زەکات، ئەوە لە ساڵی یەکەمدا وەك ئاژەڵی تێکەڵکراو ڕفتاریان لەگەڵ دەکرێ، بۆ وێنە: لە مانگی(محرم)دا چل مەڕی هەبو، ئینجا لە مانگی (صفر)دا چل مەڕیتری کڕی، ئینجا لە مانگی (مەولود)دا چل مەڕیتری کڕی، ئەوە کە ساڵ تەواو بوو، لە (محرم)دا یەك مەڕ زەکاتی چلەکەی یەکەم دەدلو لە (صفر)دا نیو مەڕ زەکاتی چلەکەی دووەم دەدلو لە (مەولود)دا: سێیەکە مەڕێك زەکاتی چلەکەی سێیەم دەدا، چونکە چلەکەی یەکەم بە تەنهایی سەرەساڵی دامەزراوەو هی دووەم بە هاوبەشیی یەکەم دامەزراوەو هی سێیەم بە هاوبەشیی یەکەمو دووەم دامەزراوە، ئینجا لە ساڵی دووەمو بە سەرەوەتردا هەرسێك چلەکان لێك دەدرێنەوە، لە سەرە ساڵی چلەکەی یەکەمەوە ساڵەکە بەردەوام دەبێو وەك یەك ماڵی یەك خاوەن زەکاتی لێدەدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

(فَلَوِ ادَّعَى) جا ئەگەر خاوەن ئاژەڵەکە ئیدیعای کردو گوتی: (النِّتَاجَ بَعْدَ الْحَوْلِ) پاش سوڕانەوەیساڵ بێچووەکان لە دایکیان بونە، یان گوتی بێچووەکان هی ئەم دایکانە نینەو کڕیونم، یان پێیم بەخشراون (صُدِّقَ) باوەڕی پێدەکرێو بێچووەکان لەگەڵ دایکەکان سەرژمێر ناکرێن (فَإِنْ اتُّهِمَ) جا ئەگەر خاوەنەکە تۆمەتی درۆی پێدەکرا (حُلِّفَ) سوننەتە: سوێند بدرێ، جا ئەگەر سوێندی نەخوارد وازی لێدەهێندرێو لە سەر سوێندنەخواردنەکە سزا نادرێ.

ئینجا بزانە: گوتمان: مەرجە: ساڵێکی تەواو ئاژەڵەکان لە ملکایەتی خاوەنەکەیاندابن، کەوابو: (وَلَوْ زَالَ مِلْكُهُ فِي الْحَوْلِ) ئەگەر لە ناو ساڵەکەدا ملکایەتیماڵەکەی نەما: وەك

فَعَادَ أَوْ بَادَلَ بِمِثْلِهِ اسْتَأْنَفَ.

---

بیفرۆشێ، یان ببیبەخشێ (فَعَادَ) ئینجا دووبارە ماڵەکەی هاتەوە ژێر ملکایەتی‌خۆی: وەك بیکڕێتەوە، یان بە میرات بۆی بێتەوە (أَوْ بَادَلَ بِمِثْلِهِ) یان ئەو ماڵەی بە ماڵێکی‌تر گۆڕییەوە، ئەوە ساڵەکەی دەپچڕێ، کەوابو: (اسْتَأْنَفَ) لەو حاڵەتانەدا سەرەساڵێکی نوێ دەست پێ‌دەکاتەوە، لەو کاتەوە: کە گەڕاوەتەوە ژێر ملکایەتی‌خۆی.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: هەر ماڵێك زەکاتی ساڵانە بێ، ئەویش وەکو ئاژەڵ مەرجە: ساڵێکی تەواو لە ملکایەتی خاوەنەکەی‌دا بێ، کەوابو: ئەگەر خاوەن ئاژەڵێك، یان بازرگانێك، یان خاوەن زێڕو زیو و پارەیەك پێش تەواوبوونی‌ساڵ مرد، ئەوە ساڵەکەی دەپچڕێ، کەوابو: میراتگرەکانیان لە ڕۆژی مردنیانەوە سەرەساڵێکی نوێ دەست پێ‌دەکەن، هەروەها ئەگەر خاوەنەکە خۆی کافر کرد، ئەو کاتە چاوەڕوان دەکەین: ئەگەر بۆوە موسڵمان، ئەوە ساڵەکەی ناپچڕێ‌و لە کۆتایی ساڵەکەی‌دا زەکاتەکەی لە سەر واجبە، بەڵام ئەگەر بە کافری مرد، ئەوە دەردەکەوێ: لە کافربوونیەوە ساڵەکەی پچڕاوەو زەکات لە ماڵەکەی‌دا واجب نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

دووەم: هەر کاتێك ماڵەکە زەکاتی تێ‌دا واجب بوو: وەك بگاتە ڕادەی زەکات‌و ساڵێکی بە سەردا بسوڕێتەوە، ئەوە یەکسەر –بێ‌دواخستن– واجبە زەکاتەکەی بدا، جا ئەگەر گونجا زەکاتەکەی بدا: وەك ماڵەکەی لە بەر دەستدابێ‌و زەکاتوەرگریش دەست بکەوێ، ئەویش بە قەسدی زەکاتەکەی نەداو ماڵەکەش لەناو چوو، ئەوە دەبێتە زامن‌و واجبە: زەکاتەکەی بدا، بەڵام ئەگەر لە دوای ساڵ سوڕانەوە بۆی نەگونجا زەکاتەکە بداو ماڵەکەش بە بێ‌کەمتەرخەمی گشتی لەناو چوو، ئەوە نابێتە زامن‌و هیچ زەکاتی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر بەشێکی لەناو چوو و بەشێکیش مایەوە، ئەو کاتە بە گوێرەی ئەو ئەندازەیەی ماوەتەوە زەکاتی لە سەر واجبە، بۆ وێنە: ئەگەر سی مانگای هەبێ‌و پاش سوڕانەوەی ساڵ پێنجیان لەناو چوون، ئەوە لە زەکاتی بیست‌و پێنجەکەی مایەوە پێنج شەشێکی گوێلکێکی لە سەر واجبە، نەك گوێلکێکی تەواو.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو: کە ماڵەکە بە بێ‌کەمتەرخەمی بەخۆی لەناو بچێ، بەڵام ئەگەر –لە دوای سوڕانەوەی ساڵ– خاوەنەکە بەخۆی ماڵەکە لەناو ببا، ئەوە دەبێتە زامن‌و واجبە: زەکاتەکەی بدا، هەرچەندەش بۆی نەگونجابێ زەکاتەکەی بدا، چونکە کەمتەرخەمی‌ی کردوە، هەروەها ئەگەر یەکێکی‌تری –جگە لە خاوەنەکە– ماڵەکە لەناو ببا، ئەوە تۆڵەی لێوەردەگیرێ‌و لەو تۆڵەیەش ئەندازەی زەکاتەکە دەدرێتە گەدلو هەژاران، هەروەك لە (المجموع)دا ئەم مەسەلەیە ئەوها بە درێژی ڕوون کراوەتەوە.

**وَكَوْنُهَا سَائِمَةً فَإِنْ عُلِفَتْ مُعْظَمَ الْحَوْلِ فَلاَ زَكَاةَ، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ إِنْ عُلِفَتْ قَدْراً تَعِيشُ بِدُونِه بِلاَ ضَرَرٍ بَيِّنٍ وَجَبَتْ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ سَامَتْ بِنَفْسِهَا أَوْ اعْتَلَفَتِ السَّائِمَةُ، أَوْ كَانَتْ عَوَامِلَ فِي حَرْثٍ وَنَضْحٍ وَنَحْوِه**

---

(وَ)مەرجی‌دووەمی زەکاتی ئاژەڵ: (كَوْنُهَا سَائِمَةً) ئاژەڵەکان لەوەڕاو بن، واتە: خاوەنەکە، یان جێگری خاوەنەکە لە پووش‌و گیای گشتی‌دا بیانلەوەڕێنێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (أنس)ی‌ڕابردوو لە زەکاتی مەڕو بزندا.

کەوابو: (فَإِنْ عُلِفَتْ) ئەگەر ئاژەڵەکان ئەڵفیان درابێ (مُعْظَمَ الْحَوْلِ) زۆرترینی ساڵ شەو و ڕۆژ (فَلاَ زَكَاةَ) زەکاتیان تێدا نیە، چونکە ئەرکی بەخێوکردنی زۆر گران بووە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر زۆرترینی ساڵ ئەڵفیان نەدرابێ، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (إِنْ عُلِفَتْ قَدْراً) ئەگەر ئەندازەیەکی‌وەها ئەڵف دران: کە (تَعِيشُ بِدُونِه) لەو ماوەیەدا بە بێ‌ئەڵف دەژیان (بِلاَ ضَرَرٍ بَيِّنٍ) بە بێ‌زیانێکی ئاشکرا (وَجَبَتْ) ئەوە زەکاتیان تێدا واجبە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر لەو ماوەیەدا بە بێ زیانێکی‌ئاشکرا، بێ‌ئەڵف نەدەژیان (فَلاَ) زەکاتیان تێدا واجب نیە، چونکە ئەرکی بەخێوکردنیان زۆر قورس بووە.

﴿ ئاگاداری ﴾ پوختەی دەرکەوتنی قورسایی بەخێوکردنی‌ئاژەڵەکان ئەمەیە: ئەگەر بە پارە ئەڵف‌و گەڵای درەخت‌و پووش‌و گیای دەرخوارد دان، ئەوە تێبینی دەکرێ: ئەگەر کۆی نرخی ئەو خواردنانەی‌ڕابردوو، کەمتر بوو: لە نرخی بەروبومی‌ئاژەڵەکان، یان لە نرخی خودی ئاژەڵەکان ئەگەر بەروبومیان نەبو، واتە: یان بە ئەندازەی تەنها یەکێك لەو دووانە بوو، ئەوە هەر بە لەوەڕاو دادەندرێ‌و زەکاتەکەیان واجبە، بەڵام ئەگەر نرخی ئەو خواردنانەی ڕابردوو زۆرتر بوو: لە بەروبومەکە، یان لە نرخی خودی‌ئاژەڵەکان ئەگەر بەروبومیان نەبو، ئەو کاتە زەکات واجب نیە، مەبەستیش لە بەروبوم لێرەدا: بێچووەکان‌و شیرو خوری‌و مووەکەیانە بە تێکڕایی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانەو، لە (شرح المنهج)و(تحفة)و چەند کتێبێکی‌تردا ناوەڕۆکی ئەم ڕوونکردنەوەیان بە بەهێز داناوە.

(وَلَوْ سَامَتْ بِنَفْسِهَا) ئەگەر ئاژەڵەکان بەخۆیان لەوەڕان، واتە: خاوەنەکە، یان جێگری خاوەنەکە، نەیناردنە لەوەڕگە: وەك لێی ون بوبن، یان دزرا بن، یان داگیر کرابن (أَوْ اعْتَلَفَتِ السَّائِمَةُ) یان ئاژەڵە لەوەڕاوەکان بەخۆیان ئەڵفیان خوارد بە ئەندازەیەکی وەها زۆر: کاری لە واجببوونی زەکات دەکرد، لەو هەردوو حاڵەتانەدا زەکات واجب نیە.

(أَوْ كَانَتْ عَوَامِلَ) یان ئەگەر ئاژەڵەکان کاریان پێ‌دەکرا بە کرێ، یان بە خۆڕایی (فِي حَرْثٍ) لە کێڵاندا (أَوْ نَضْحٍ) یان لە ئاوهێناندا (وَنَحْوِه) یان لە کارێکی‌تری ئەوەهادا: وەك بارکردن‌و

فَلاَ زَكَاةَ فِي الأَصَحِّ، وَإِذَا وَرَدَتْ مَاءً أُخِـذَتْ زَكَاتُهَـا عِنْـدَهُ وَإِلاَّ فَعِنْـدَ بُيُـوتِ أَهْلِهَا، وَيُصَـدَّقُ الْـمَالِكُ، فِي عَـدَدِهَا إِنْ كَانَ ثِقَـةً، وَإِلاَّ فَـتُعَدُّ عِنْدَ مَضِيقٍ.

## (بَابُ زَكَاةِ النَّبَاتِ)

---

سواری (فَلاَ زَكَاةَ) ئەوانەش زەكاتیان تێدا واجب نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە ئەوانە بۆ بەكارهاتن ئامادە كراون وەكو جلوبەرگو كەلوپەلی خانوو ﴿عَنْ عَلِـيٍّ ﷺ: لَيْسَ فِي الْبَقَرِ الْعَوَامِلِ صَدَقَةٌ﴾ رواه ابوداود وصححه إبن حبان، لە مانگای كاركردندا هیچ زەكات واجب نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەو ڕوونكردنەوەی ڕابردوو بەڵگەیە: كە ئوتۆمبیلی تایبەتیو ئوتۆمبیلی كارپێكردنی بە كرێو خانووی بەكرێدانو ئامێرو كەرەستەی كاركردن، ئەوانە هیچیان زەكاتیان تێدا واجب نیە، بەو مەرجەی بۆ بازرگانی نەبن، بەڵام ئەگەر پارەی بەرهەمەكەیان گەیشتە ڕادەی زەكاتو ساڵێكی بە سەردا سوڕاوە، ئەو كاتە زەكات لە پارەی بەرهەمەكەیاندا واجبە. وَاللهُ أَعْلَم.

(وَإِذَا وَرَدَتْ مَاءً) هەر كاتێك ئاژەڵەكان هاتنە سەر ئاوێك (أُخِذَتْ زَكَاتُهَا عِنْدَهُ) سوننەتە: لە لای ئاوەكە زەكاتەكەیان وەربگیرێ، چونكە بۆ گشت لایەك ئەوها ئاسانترە (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەهاتنە سەر ئاو: وەك وەرزەكە بەهار بێو پێویستیان بە ئاو نەبێ (فَعِنْدَ بُيُوتِ أَهْلِهَا) ئەو كاتە لە لای ماڵەكانی خاوەنەكانیان زەكاتیان لێوەردەگیرێ.

(وَيُصَدَّقُ الْمَالِكُ) خاوەنی ئاژەڵەكانو جێگرەكەشی باوەڕی پێدەكرێ (فِي عَدَدِهَا) لە ژمارەی ئاژەڵەكاندا (إِنْ كَانَ ثِقَةً) ئەگەر باوەڕپێكراو بێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر باوەڕپێكراو نەبو، یان گوتی: نازانم ژمارەیان چەندە (فَتُعَدُّ) واجبە: ئاژەڵەكان بژمێردرێن، ئینجا وا باشە (عِنْدَ مَضِيقٍ) لە لای شوێنێكی تەسكدا دارێكی درێژ بە دەستەوە بگرنو بیانژمێرن، تاكو هەڵە نەكەن.

ئینجا بزانە: ئەركی ئامادەكردنو هێنانی ئاژەڵەكەی زەكات بۆ لای زەكاتوەرگر، لە سەر خاوەنی ئاژەڵەكانە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

### ﴿ بَابُ زَكَاةِ النَّبَاتِ: باسی زەكاتی میوەو دانەوێڵە ﴾

پێشەكی بزانە: لە زەكاتی میوەو دانەوێڵەدا مەرج نیە: ساڵێك بە سەریاندا بسوڕێتەوە، بەڵكو هەر بە هەبوونیان زەكات واجب دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ﴾ زەكاتی میوەو دانەوێڵە بدەن لە كاتی بڕینەوەیدا. كەوابو: هەر بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: میوەو دانەوێڵە تەنها یەك جار زەكاتیان تێدا واجبە، واتە: ئەگەر جارێك زەكاتیان لێدرا، دووبارە زەكاتیان تێدا واجب

تَخْتَصُّ بِالْقُوت، وَهُوَ مِنَ الثِّمَارِ: اَلرُّطَبُ وَالْعِنَبُ، وَمِنَ الْحَبِّ: اَلْحِنْطَةُ وَالشَّعِيرُ وَالأَرُزُّ وَالْعَدَسُ وَسَائِرُ الْمُقْتَاتِ اخْتِيَاراً، وَفِي الْقَدِيمِ تَجِبُ فِي الزَّيْتُونِ وَالزَّعْفَرَانِ وَالْوَرْسِ وَالْقُرْطُمِ وَالْعَسَلِ، وَنِصَابُهُ خَمْسَةُ أَوْسُقٍ:

---

نابێ، هەرچەند ماوەی زۆر سالێش لە لای خاوەنەکەی بمێنێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(تَخْتَصُّ بِالْقُوتِ) زەکات تایبەتە بەو جۆرە خواردنەی ئادەمیزاد پێی دەژێ (وَهُوَ) ئەو خواردنەی ئادەمیزاد پێی دەژێ (مِنَ الثِّمَارِ) لە چینی میوە: (اَلرُّطَبُ) خورمایەو (وَالْعِنَبُ) ترێیە. (وَمِنَ الْحَبِّ) لە چینی دانەوێڵەش (اَلْحِنْطَةُ) گەنمە (وَالشَّعِيرُ) جۆیە (وَالأَرُزُّ) برنجە (وَالْعَدَسُ) نیسکە (وَسَائِرُ الْمُقْتَاتِ اخْتِيَاراً) هەم گشت دانەوێڵەیەکی تریش کە لە حاڵەتی هەرزانیدا بۆ پێژیان بخورێ: وەك نۆكو پاقلەو فاسۆلیەو هەرزنو هەر شتێکی تری بۆ پێژیان دابچیندرێ.

کەوابو: زەکات واجب نیە: لە گوڵە بەڕۆژەو گندۆرەو شفتیو خەیارو تەرۆزیو تەماتەو کونجی، هەروەها هەنارو گوێزو توو و سێو و قەیسیو لیمۆو پرتەقاڵو هەرمێو ئەو جۆرە شتانە، هەروەها زەکات واجب نیە: لەو جۆرە شتانەی لە حاڵەتی گرانیدا دەخورێن: وەکو بەڕوو و گوێژەو قەلۆکو تۆوی کەنگرو ئەو دەنكو گیایانەی لە دەشتو چیادا بە خۆیان دەڕوێن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَفِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی کۆندا (تَجِبُ فِي الزَّيْتُونِ) زەکات واجبە: لە زەیتونو (وَالزَّعْفَرَانِ) لە زەغفەرانو (وَالْوَرْسِ) لە بەری وەرس: کە ڕەنگی لێدروست دەکرێو (وَالْقُرْطُمِ) لە دەنکی قوڕتوم: کە ڕەنگی لێدروست دەکرێو (وَالْعَسَلِ) لە هەنگوین، بەڵام لە فەرموودەی نوێی بەهێزدا: لەوانەشدا زەکات واجب نیە.

ئینجا بزانە: هەر خواردەمەنیەك: کە زەکاتی تێدا واجب نەبێ، ئەگەر بە پارە فرۆشتی، یان بازرگانیی پێکردو پارەکەشی گەیشە ڕادەی زەکاتو ساڵێکی بە سەردا سوڕاوە، ئەو کاتە زەکات لە پارەکەدا واجبە، هەروەك لە زەکاتی پارەو بازرگانیدا ڕوونی دەکەینەوە، إِن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

(وَنِصَابُهُ) سەرەتای ڕادەی زەکاتی میوەو دانەوێڵە (خَمْسَةُ أَوْسُقٍ) پێنج بارە، هەر بارێکیش شەست ساعە، کۆی دەکاتە سێسەد ساع، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ فِيما دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ مِنْ تَمْرٍ وَلاَ حَبٍّ صَدَقَةٌ﴾ رواه الشيخان، لە پێنج بار کەمتر قەسپو دەغڵ زەکاتی تێدا نیە. ئینجا بزانە: لە زەکاتی میوەو دانەوێڵەدا لێبوردن نیە، واتە: هەر کامەیان لە پێنج بار زیاتر بێ، بە گوێرەی زێدەییەکەش زەکاتەکە دەدرێ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

وَهِيَ أَلْفٌ وَسِتُّمِأَة رِطْلٍ بَغْدَادِيَّةٌ، وَبِالدِّمَشْقِيِّ ثَلاَثُمِأَة وَسِتَّةٌ وَأَرْبَعُونَ رِطْلاً وَثُلُثَانِ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ ثَلَثُمائَة وَاثْنَان وَأَرْبَعُونَ رِطْلاً وَسِتَّةُ أَسْبَاعِ رِطْلٍ لأَنَّ اْلأَصَحَّ أَنَّ رِطْلَ بَغْدَادَ مِأَةٌ وَثَمَانِيَةٌ وَعِشْرُونَ دِرْهَماً وَأَرْبَعَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ، وَقِيلَ بِلا أَسْبَاعٍ وَقِيلَ وَثَلاَثُونَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَيُعْتَبَرُ تَمْراً أَوْ زَبِيباً إِنْ تَتَمَّرَ

---

(وَهِيَ) كێشى ئەو پێنج بارە (أَلْفٌ وَسِتُّمِأَة رِطْلٍ بَغْدَادِيَّةٌ) هەزارو شەشسەد ڕیتلى بەغدادیە (وَبِالدِّمَشْقِيِّ) بە ڕیتلى دیمەشقى دەکاتە (ثَلاَثُمِأَة وَسِتَّةٌ وَأَرْبَعُونَ رِطْلاً وَثُلُثَانِ) سێسەدو چلوشەش ڕیتلو دوو سێیەکى ڕیتلێك.

(قُلْتُ) ئیمامى (النواوى) دەفەرموێ (اَلأَصَحُّ) فەرموودەى ڕاستتر: (ثَلَثُمائَة وَاثْنَان وَأَرْبَعُونَ رِطْلاً وَسِتَّةُ أَسْبَاعِ رِطْلٍ) بە دیمەشقى دەکاتە سێسەدو چلو دوو ڕیتلو شەش حەفتێکى ڕیتلێك (لأَنَّ اْلأَصَحَّ) چونکە فەرموودەى ڕاستتر: (أَنَّ رِطْلَ بَغْدَادَ) کێشى ڕیتلى بەغدادیى (مِأَةٌ وَثَمَانِيَةٌ وَعِشْرُونَ دِرْهَماً) سەدو بیستو هەشت دیرهەمى زیوەو (وَأَرْبَعَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ) چوار حەفتێکى دیرهەمێکە (وَقِيلَ بِلاَ أَسْبَاعٍ) لە فەرموودەیەکدا: بە بێ چوار حەفتێك (وَقِيلَ وَثَلاَثُونَ) لە فەرموودەیەکدا: سەدو سى دیرهەمە (وَاللهُ أَعْلَم).

﴿ ڕوونکردنەوە ﴾ ئەندازەى پێنج بارەکە بە پێوانەى تەنەکەى نەفت: دەکاتە چل تەنەکەى سەرکوتەلکراو، واتە: هەر بارێك هەشت تەنەکەیە، بەلام ئەگەر تەنەکەکان دارمالّ بکرێن، ئەو کاتە دەبێتە چلو پێنج تەنەکەى دارمالکراو، هەروەها بە کێشانەى کیلۆ: دەکاتە نزیکەى (٧٢٥) حەفتسەدو بیستو پێنج کیلۆ، واتە: هەر بارێك (١٤٥) سەدو چلو پێنج کیلۆیە، ئینجا بزانە: لە ڕادەى زەکاتى میوەو دانەوێڵەدا، پێوان ڕەچاو دەکرێ، بەلام بۆ پارێزکارىو ڕوونبوونەوەى واجبەکە، زانایان بە کێشانیش ئەندازەیان داناوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا ئاگادارىبە: منیش لە لێکدانەوەى ساعو مستى زەکاتو حەجو ڕۆژوودا پارێزکاریم کردوە: ئەو غرامانەى دەشکێنەوە بە زیادەم ژماردون، ئەگینا: بە ڕیتلى بەغدایى پێنج بارەکان-بێپارێزکارى- دەکەنە (٧٢٠) حەفتسەدو بیست کیلۆ؟ چونکە کێشى ڕیتلى بەغدایى (٩٠) نەوەد میسقالە-هەروەك لە (المجموع)و (مغنى)دا فەرموویانە-کە دەکاتە (٤٥٠) چوار سەدو پەنجا غرام، کەوابو: هەر مستێك دەکاتە (٦٠٠)شەشسەد غرام، ساعیش دەکاتە (٢٤٠٠)دوو کیلۆو چوارسەد غرام، هەر بارێکیش دەکاتە (١٤٤) سەدوچلوچوار کیلۆ، وَاللهُ أعْلَم.

(وَيُعْتَبَرُ) ئەو پێنج بارەى خورماو ترێ بە ووشککراوەیى حیساب دەکرێن، واتە: (تَمْراً) لە حاڵەتى بوونە قەسپ (أَوْ زَبِيباً) یان لە حاڵەتى بوونە مێوژ (إِنْ تَتَمَّرَ) ئەگەر خورمایەکە

وَتَزَبَّبَ، وَإِلاَّ فَرُطَباً وَعِنَباً، وَالْحَبُّ مُصَفًّى مِنْ تِبْنِهِ، وَمَاادُّخِرَ فِي قِشْرِهِ كَالأَرُزِّ وَالْعَلَسِ فَعَشَرَةُ أَوْسُقٍ، وَلاَ يُكَمَّلُ جِنْسٌ بِجِنْسٍ،

---

ببێته قەسپو (وَتَزَبَّبَ) ترێیەکەش ببێته مێوژ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، هەروەها واجبە: مێوژو قەسپیش لە زەکاتیاندا بدرێ، واتە: ئەو ترێو خورمایەی دەبنە مێوژو قەسپ دروست نیە: ترێو خورما لە زەکاتیاندا بدرێو بە بەر زەکات ناکەوێ، کەواتە: ئەگەر وەرگیران، واجبە: ترێیەکەو خورمایەکە بۆ خاوەنەکەیان بگەڕێندرێنەوەو دووبارە مێوژو قەسپ لە زەکاتەکەدا وەربگیرێ، جا ئەگەر ترێو قەسپەکە نەمابون، واجبە تۆڵەیان بدرێتە خاوەنەکەیان، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەدەبونە قەسپو مێوژ؟ چونکە ئەگەر ووشك کرابانەوە ڕەق دەبون، یان تێك دەچون (فَرُطَباً) ئەو کاتە پێنج بارەکە حیساب دەکرێن لە حاڵەتی خورماییدا و (وَعِنَباً) لە حاڵەتیترێییدا، هەر ئەو دەمەش بێدواخستن زەکاتەکەیان بە تەڕی دەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ڕوونکردنەوە ﴾ ئەگەر خودی ئەو خورمایەی نابێتە قەسپو خودی ئەو ترێیەی نابێتە مێوژ–بە تەڕی– پێنج بار تەواو بوو، زەکاتی تێدا واجب دەبێ، لە سەر فەرموودەی ڕاستتر، هەروەك لە (شرح الوجين)و (روضة)و (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام ئاگاداربە: لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا ئەم مەسەلەیە لە سەر فەرموودەی بێهێز ڕوون کراوەتەوە، کە دەفەرموێ: وەها لێك دەدرێتەوە: ئەگەر ئەو خورمایە ووشك کراباوە پێنج بار قەسپ دەردەچوو؟ یان ئەگەر ئەو ترێیە ووشك کراباوە پێنج بار مێوژ دەردەچوو؟ ئەگەر دەربچێ: زەکاتی واجبە، ئەگەر نا: نا.

(وَالْحَبُّ) دانەوێڵەش پێنج بارەکەی حیساب دەکرێ (مُصَفًّى مِنْ تِبْنِهِ) لەو حاڵەتەدا: کە پاك کراوەتەوە لە کاو کۆتەکەی، واتە: لەو توێکڵەی لەگەڵیدا ناخورێ، کەوابو: (وَمَا ادُّخِرَ فِي قِشْرِهِ) ئەو دانەوێڵەیەی لە ناو توێکڵەکەیدا هەڵدەگیرێو لە گەڵیشی ناخورێ: (كَالأَرُزِّ) وەکو برنج لە ناو توێکڵەکەیدا–کەپێی دەگوترێ چەڵتوك–(وَالْعَلَسِ) هەم وەکو گەنمە سنعانی، کە هەر توێکڵێك دوو، یان سێ دەنکی تێدایە، ئەویش–وەکو چەڵتوك– بە هاڕینی دەستاڕ توێکڵەکەی لە سەر لادەچێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی (فَعَشَرَةُ أَوْسُقٍ) ڕادەی زەکاتی ئەو دووانە: دە بارە، جگە لەو دووانەش هیچ دانەوێڵەیەکیتر لە توێکڵەکەیدا هەڵناگیرێ، کەوابو: هەر بە توێکڵەوە زەکاتەکەیان وەردەگیرێو لە سەر خاوەنەکەیان واجب نیە: توێکڵەکەیان لە سەر لاببا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُكَمَّلُ) لە زەکاتی میوەو دانەوێڵەدا، تەواو ناکرێ (جِنْسٌ) ڕادەی زەکاتی ڕەگەزێك (بِجِنْسٍ) بە ڕەگەزێکیتر، واتە: ڕادەی زەکاتی قەسپ بە مێوژ تەواو ناکرێ، ڕادەی

وَيُضَمُّ النَّوْعُ إِلَى النَّوْعِ، وَيُخْرِجُ مِنْ كُلٍّ بِقِسْطِهِ، فَإِنْ عَسُرَ أَخْرَجَ الْوَسَطَ، وَيُضَمُّ الْعَلَسَ إِلَى الْحِنْطَةِ لِأَنَّهُ نَوْعٌ مِنْهَا، وَالسُّلْتُ جِنْسٌ مُسْتَقِلٌّ، وَقِيلَ شَعِيرٌ وَقِيلَ حِنْطَةٌ، وَلَا يُضَمُّ ثَمَرُ عَامٍ وَزَرْعُهُ إِلَى آخَرَ،

---

زەكاتی گەنم بە جۆ تەواو ناكرێ، نۆك بە نیسك تەواو ناكرێ، برنج بە ماش تەواو ناكرێ، كەواتە: ئەگەر ڕەگەزەكە هەر بە خۆی گەیشتە ڕادەی زەكات، ئەوە زەكاتی لێدەدرێ، ئەگەر نا: بە ڕەگەزێكیتر تەواو ناكرێو زەكاتی واجب نابێ.

بەلام (وَيُضَمُّ النَّوْعُ إِلَى النَّوْعِ) جۆری ڕەگەزێك كۆ دەكرێتەوە لەگەڵ جۆرێكیتری هەمان ڕەگەزو ڕادەی زەكاتی پێ تەواو دەكرێ: واتە: مێوژی ڕەشو سوورو گشت جۆرێكیتری مێوژ، پێكەوە حیساب دەكرێن، چونكە یەك ڕەگەزن، گەنمی قەندەهاریو ڕەشكۆڵو گشت جۆرێكیتری گەنم، پێكەوە حیساب دەكرێن، چونكە یەك ڕەگەزن، جۆی ڕەشو سپیو گشت جۆرێكیتری جۆ، پێكەوە حیساب دەكرێن، چونكە یەك ڕەگەزن...هتد.

ئینجا ئەگەر دوو جۆرە میوە، یان دوو جۆرە دانەوێڵە هەبونو پێكەوە گەیشتنە ڕادەی زەكات، ئەو كاتە (وَيُخْرِجُ) زەكاتەكەیان دەدا (مِنْ كُلٍّ) لە هەر جۆرێكیان (بِقِسْطِهِ) بە گوێرەی بەشی خۆی، بۆ وێنە: ئەگەر نیوەی گەنمی ڕەشكۆڵ بوو نیوەیشی قەندەهاری بوو، ئەوە نیوەی زەكاتەكەی لە ڕەشكۆڵ دەداو نیوەیشی لە قەندەهاری، بەلام (فَإِنْ عَسُرَ) ئەگەر زەحمەت بوو؟ لە بەر ئەوەی جۆرەكان زۆر بونو بەرهەمەكەشیان كەم بوو (أَخْرَجَ الْوَسَطَ) ئەو كاتە جۆرە ناوەنجییەكە لە زەكاتدا دەدا، واتە: نە زۆر باشەكەو نە زۆر خراپەكە.

(وَيُضَمُّ الْعَلَسُ إِلَى الْحِنْطَةِ) گەنمە سەنعانی كۆ دەكرێتەوە لەگەڵ گەنم (لِأَنَّهُ نَوْعٌ مِنْهَا) چونكە سەنعانیش جۆرێكە لە ڕەگەزی گەنم (وَالسُّلْتُ) شەیلەمی ئەورپی (جِنْسٌ مُسْتَقِلٌّ) ڕەگەزێكی سەربەخۆیەو لەگەڵ هیچ ڕەگەزێكیتر كۆ ناكرێتەوە بۆ تەواوكردنی ڕادەی زەكات (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا: (شَعِيرٌ) شەیلەم لە ڕەگەزی جۆیە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكیتری بێهێزدا (حِنْطَةٌ) لە ڕەگەزی گەنمە، بەلام فەرموودەی یەكەم ڕاستە: كە سەربەخۆیە، نەگەنمەو نە جۆیە.

(وَلَا يُضَمُّ) كۆ ناكرێتەوە: بۆ تەواوكردنی ڕادەی زەكات (ثَمَرُ عَامٍ) میوەی ساڵێك (وَ) هەروەها كۆ ناكرێتەوە (زَرْعُهُ) دانەوێڵەی ساڵێك (إِلَى آخَرَ) لەگەڵ میوەو دانەوێڵەی ساڵێكیتر، كەواتە: ئەگەر میوەی هەر ساڵێك بە تەنها، دانەوێڵەی هەر ساڵێك بە تەنها، گەیشتە ڕادەی زەكات، زەكاتی لێدەدرێ، ئەگەر نا: نا، بەڵكو ئەگەر ڕوو بدا: دارخورمایەكانی، یان دارمێوەكانی لە یەك ساڵدا دوو جار بەر بگرن، ئەو كاتەش هیچیان

وَيُضَمُّ ثَمَرُ الْعَامِ بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ وَإِنِ اخْتَلَفَ إِدْرَاكُهُ، وَقِيلَ إِنْ طَلَعَ الثَّانِي بَعْدَ جَذَاذِ الأَوَّلِ لَمْ يُضَمَّ، وَزَرْعَاالْعَامِ يُضَمَّانِ، وَالأَظْهَرُ اعْتِبَارُ وُقُوعِ حَصَادَيْهِمَا فِي سَنَةٍ، وَوَاجِبُ مَا شَرِبَ بِالْمَطَرِ أَوْ عُرُوقُهُ بِقُرْبِهِ مِنَ الْمَاءِ مِنْ ثَمَرٍ وَزَرْعٍ:

---

لەگەڵ ئەویتر کۆ ناکرێتەوە، واتە: هەر بەرێك بە میوەی ساڵێکیتر دادەندرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَيُضَمُّ ثَمَرُ الْعَامِ) کۆ دەکرێتەوە گشت میوەکانی یەك ساڵ (بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ) هەندێکی لەگەڵ هەندێکیتر (وَإِنِ اخْتَلَفَ إِدْرَاكُهُ) هەرچەندەش پێگەیشتنی هەندێکی لەویتر جیاواز بێ: بە هۆی جیاوازی جۆرەکانیان، یان بە هۆی جیاوازی گەرمیو ساردیو شوێنەکانیان: وەك هەندێکی لە عەرەبستان بێو هەندیکیتریش لە باکووری کوردستان بێ، کەواتە: لە هەر شوێنێکدا هەر جۆرە میوەیەکی یەك ڕەگەزی هەبێو لە ماوەی دوانزە مانگدا پێبگا، گشتی پێکەوە حیساب دەکرێو زەکاتی لێدەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (إِنْ طَلَعَ الثَّانِي) ئەگەر دووەمەکە بەر بگرێ (بَعْدَ جَذَاذِ الأَوَّلِ) لە دوای بڕینەوەی میوەی یەکەمەکە (لَمْ يُضَمَّ) کۆ ناکرێتەوە، چونکە وەك میوەی دوو ساڵ وایە، بەڵام لە بەر بێهێزی ڕەفتاری پێ ناکرێ.

ئینجا هەروەك گشت میوەکانی یەك ساڵ پێکەوە کۆ دەکرێنەوە، هەروەهاش (وَزَرْعَا الْعَامِ) دوو دانەوێڵەی یەك ساڵو زیاتریش (يُضَمَّانِ) پێکەوە کۆ دەکرێنەوە بۆ تەواوکردنی ڕادەی زەکات، بەو مەرجەی یەك ڕەگەز بن (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر: (اعْتِبَارُ وُقُوعِ حَصَادَيْهِمَا فِي سَنَةٍ) مەرجە: دروێنەی گشت دانەوێڵەکان بکەوێتە یەك ساڵ، واتە: نێوان دروێنەی یەکەمەکەو ئاخیرەکە لە دوانزە مانگ کەمتر بێ، مەبەستیش خودی دروێنە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: دانەکە بە جۆرێکی وەها ڕەق ببێ: کە بگونجێ بدروێتەوە، ئیتر مەرج نیە: دانەوێڵەکان لە یەك ساڵدا چێندرابن، چونکە هەر دروێنە مەبەستەو لەو کاتدا واجببوونی زەکات جێگیر دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ ئەندازەی زەکاتی میومو دانەوێلە ﴾

(وَوَاجِبُ مَا شَرِبَ) ئەندازەی ئەو زەکاتەی واجب دەبێ: لەو میوەو دانەوێڵەی ئاوی خواردۆتەوە (بِالْمَطَرِ) لە ئاوی بارانو بەفرو تەرزە، یان ئاوی ڕووبار، یان سەرچاوە، یان ئاوە زێیەکانیتر (أَوْ عُرُوقُهُ) یان ڕەگەکانی بێئاودان ئاویان خواردبۆوە (بِقُرْبِهِ مِنَ الْمَاءِ) بە هۆی نزیکی لە ئاو: وەك کەنارەکانی دەریاو ڕووبار (مِنْ ثَمَرٍ وَزَرْعٍ) لە میوەو دانەوێڵە:

اَلْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِنَضْحٍ أَوْ دُولاَب أَوْ بِمَا اشْتَرَاهُ نِصْفُهُ، وَالْقَنَوَاتُ كَالْمَطَرِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَمَا سُقِيَ بِهِمَا سَوَاءً ثَلاَثَةُ أَرْبَاعِه، فَإِنْ غَلَبَ أَحَدُهُمَا فَفِي قَوْلٍ يُعْتَبَرُ هُوَ، وَالأَظْهَرُ يُقَسَّطُ بِاعْتِبَارِ عَيْشِ الزَّرْعِ وَنَمَائِه،

---

ئەندازەی زەکات (اَلْعُشْرُ) دەیەکە، واتە: لە چل تەنەکەدا: چوار تەنەکە، لە پەنجادا: پێنج، لە سەدا: دە...هتد، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فِيمَا سَقَتِ الأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ﴾رواه الشيخان، لەو میوەو دانەوێڵەیەدا کە ڕووبارو هەور ئاویان داوە: دەیەك زەکاتە، لەوەشدا کە بە هۆی ئاژەڵ ئاو دراوە: نیوەی دەیەك زەکاتە.

جا هەر بە بەڵگەی ئەو حەدیسە: (وَمَا سُقِيَ) هەر میوەو دانەوێڵەیەکی ئاو درابێ (بِنَضْحٍ) بەو ئاوەی کە لە ڕووبار، یان لە بیر بۆی هێندراوە: بە ئاژەڵ، یان بە ئۆتۆمبیل (أَوْ دُولاَبٍ) یان بە هۆی دۆلاب: کە ئاژەڵ دەیسووڕێنێو ئاو لە ڕووبارو بیر دەردێنێ، یان بە هۆی ناعورە: کە ئاو بە خۆی دەیسووڕێنێو ئاو فڕێ دەداتە دەرەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە (أَوْ بِمَا اشْتَرَاهُ) یان بەو ئاوەی: کە کڕیویەتی، یان پێی بەخشراوە، ئەندازەی زەکاتی ئەوانەش: (نِصْفُهُ) نیوەی دەیەکە، واتە: لە چل تەنەکەدا: دوو تەنەکە، لە پەنجادا: دوو و نیو...هتد، چونکە ئەرکی زۆرەو هەندێکیش پێویستی بە چاککردنەوە هەیە ئەگەر بشکێ، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی.

ئەوەش وا دەگەیەنێ: کە ئەو میوەو دانەوێڵەی بەو ئامێرانە ئاو دەدرێ: کە بە کارەبا، یان بە گازو بەنزین کار دەکەن، ئەویش زەکاتەکەیان نیوەی دەیەکە، بەڵام (وَالْقَنَوَاتُ) ئاوی کارێز، هەم ئەو جۆگانەی لە ڕووبارەوە ئاویان تێکراوە (كَالْمَطَرِ) وەکو بارانن، واتە: دەیەکێکی زەکاتە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە خودی ئاو هێنانەکە ئەرکی نیەو بەخۆی دەڕوا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَا سُقِيَ بِهِمَا سَوَاءً) ئەو میوەو دانەوێڵەیەی بە یەکسانی بەو دوو جۆرەی ڕابردوو ئاو درابێ: وەك بە بارانو ناعورە (ثَلاَثَةُ أَرْبَاعِهِ) ئەندازەی زەکاتەکەی سێ چوارێکی دەیەکە، واتە: لە چل تەنەکەدا: سێ تەنەکە، تاکو هەر جۆرێك بە گوێرەی واجبی خۆی ڕەفتاری پێ بکرێ (فَإِنْ غَلَبَ أَحَدُهُمَا) جا ئەگەر جۆرێکیان لە جۆرەکەیتر زۆرتر بوو، واتە: یان بە باران زۆرتر ئاو درابو، یان بە ناعورە زۆرتر ئاو درابو (فَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا: (يُعْتَبَرُ هُوَ) کامەیان زۆرترە ئەویان ڕەفتاری پێدەکرێ، بەڵام (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر: (يُقَسَّطُ) زەکاتەکە بەش دەکرێ بە سەر هەردوو جۆرەکەدا (بِاعْتِبَارِ عَيْشِ الزَّرْعِ) بە گوێرەی ژینی دانەوێڵە، یان میوەکەو (وَنَمَائِهِ) هەم بە گوێرەی ماوەی گەورەبوونی دانەوێڵەکە، یان میوەکە.

بۆ وێنە: ئەگەر ماوەی دانەوێڵەکە لە داچاندنیەوە تا پێگەیشتنی، هەشت مانگ بوو و لە ماوەی شەش مانگدا پێویستی بە دوو ئاودان هەبو و ئەو دوو ئاوەشی درایێ بە هۆی باران، بەڵام دوو مانگەکەیتر پێویستی بە سێ ئاودان هەبو و ئەو سێ ئاوەشی بە هۆی ناعورە درایێ، ئەوە زەکاتەکەی: سێ چوارێکی دەیەك لەجیاتی شەش مانگەکەیە، چوارێکی نیوەی دەیەکیش هی دوو مانگەکەیە. (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ هێزدا: (بِعَدَدِ السَّقَيَاتِ) بە گوێرەی ئاودانەکان بە سەریاندا بەش دەکرێ.

(وَتَجِبُ) زەکاتی میوەو دانەوێڵە واجب دەبێ (بِبُدُوِّ صَلَاحِ الثَّمَرِ) بە هۆی ئاشکرابوونی پێگەیشتنی بەشێکی میوە: وەك خورمایەکە سوور ببێ، ترێیەکە ئاوی شیرنی بکەوێتێ، یان ڕەش ببێ (وَاشْتِدَادِ الْحَبِّ) هەم بە هۆی ڕەقبوونی بەشێکی دانەوێڵەکە، واتە: مەرج نیە: میوەکە بە تەواوی پێبگاو دەنکی دانەوێڵەکەش بە تەواوی ڕەق ببێ، هەروەها مەرج نیە: هەموو میوەکەش پێگەیشتنی ئاشکرا بێو هەموو دانەوێڵەکەش دەنکی ڕەق ببێ.

ئینجا بزانە: مەبەست بە واجببوون، ئەوە نیە: لەو کاتدا زەکات بدا، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: لەو کاتدا زەکاتی میوەو دانەوێڵەی لە سەر جێگیر دەبێ، تاکو لە دوای وشککردنەوەی میوەو لە دوای پاککردنەوەی دانەوێڵە زەکاتەکە بدا.

کەوابو: هەر کاتێك پێگەیشتنی میوە ئاشکرا بوو، یان دەنکی دانەوێڵە ڕەق بوو، دروستە: پێش بڕینەوەو دروونەوە -میوەیەکیتری وشكو دانەوێڵەیەکیتری پاككراوە- لە زەکاتدا بداو بە بەر زەکاتی ئەو میوەو دانەوێڵەیە دەکەوێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا لە باسی وەپێشخستنی زەکاتدا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر یەکێك چەند درەختێکی بە بەرەوە کڕی، یان بە میراتی گرت، ئینجا لە لای ئەوی پێگەیشتنی میوەکەیان ئاشکرا بوو، ئەوە زەکاتەکە لە سەر ئەوی واجب دەبێ، چونکە لە لای ئەوی هۆیەکەی واجببوون پەیدا بووە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: دانەوێڵەی چاندراویش هەمان بڕیاری بۆ دەدرێ.

دووەم: لەو کاتەوە: کە پێگەیشتنی میوە ئاشکرا دەبێو دەنکی دانەوێڵە ڕەق دەبێ -ئەگەر بگەنە ڕادەی زەکات- پێش زەکاتدانو قرساندنی میوە، لە سەر خاوەنەکەیان حەرامە: بەشێکی گوڵە دانەوێڵەکان، یان ترێ، یان خورما بدەنە هەژارانو خەڵکانیتر، هەروەها حەرامە: بەخۆیو منداڵەکانی لێیان بخۆنو حەرامە: بیانفرۆشێ، جا هەر کارێکی لەوانەیڕابردوو کرد، واجبە: لە لایخۆی زەکاتی ئەو ئەندازەیە بدا: کە پێش زەکاتدان لە دەستی داوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

وَيُسَنُّ خَرْصُ الثَّمَرِ إِذَا بَدا صَلاَحُهُ عَلَى مَالِكِه، وَالْمَشْهُورُ إِدْخَالُ جَمِيعِه فِي الْخَرْصِ، وَأَنَّهُ يَكْفِي خَارِصٌ، وَشَرْطُهُ الْعَدَالَةُ، وَكَذَا الْحُرِّيَّةُ وَالذُّكُورَةُ فِي الأَصَحِّ، فَإِذَا خَرَصَ فَالأَظْهَرُ أَنَّ حَقَّ الْفُقَراءِ يَنْقَطِعُ مِنْ عَيْنِ الثَّمَرِ وَيَصِيرُ فِي ذِمَّةِ الْمَالِكِ

---

بەلام ئەگەر خۆی (تقليد)ی مەزهەبی ئیمام (احمد) بكـا، ئـەو كاتـە بۆی دروسـتـە: خـۆیو منداڵەكانی بەگوێرەی عادەت بخۆن، هـەم بۆیشـی دروسـتـە: بـە خـەڵكیش ببەخشـێو لـە سەری نازمێردرێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيُسَنُّ) سوننەتە: (خَرْصُ الثَّمَرِ) قرسـاندنی ئـەو میوەیـەی زەكـاتی تـێدا واجبـە (إِذَا بَدا صَلاَحُهُ) هـەر كاتێـك پێگەیشتنی ئاشكرا بـوو (عَلَى مَالِكِهِ) لـە سـەر خاوەنەكـەی، واتـە: خورمایەكەو ترێیەكە لە سەر درەختەكەیانەوە تەخمین بكرێن: كـە لـە دوای ووشـككردنەوە ئەوەندە بارە مێوژ، یان ئەوەندە بارە قەسپەی لێدێتـەوە ﴿عَنْ عَتَّابِ بـنِ أَسِيدٍ ﷺ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُخْرَصَ الْعِنَبُ كَمَا يُخْرَصُ النَّخْلُ، وَتُؤْخَذَ زَكَاتُهُ زَبِيباً كَمَا تُؤْخَذُ صَدَقَةُ النَّخْلِ تَمْراً﴾رواه أصحاب السنن بسند حسن، پێغەمبەر ﷺ فـەرمانی داوە: تـرێ بقرسـێندرێ هەروەكو خورما دەقرسێندرێ، زەكاتەكەشی بە مێوژی وەربگیرێ هـەروەكو زەكـاتی خورمـا بـە قەسـپ وەردەگـیرێ. كـەوابو: هـەر بـە بەڵگـەی ئـەم حەدیسـە: دانەوێڵـە ناقرسـێندرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَالْمَشْهُورُ) فـەرموودەی ناسـراوی مەزهـەب: (إِدْخَالُ جَمِيعِهِ فِي الْخَرْصِ) كشـت میوەكـە دەقرسێندرێو زەكاتی گشتی لـە سـەر خاوەنەكـەی تۆمـار دەكرێو هیچی بـۆ خاوەنەكـە جیا ناكرێتەوە، ئینجا بزانـە: لـە حەدیسـێكی (صحيح)دا هـاتوە: ﴿هـەر كاتێـك میوەتـان قرسـاند، زەكاتەكـەی وەربگـرنو سـێیەكی، یـان چـوارێكی واز لێبێـنن﴾. بـەلام وەڵام دراوەتەوە كە مەبەسـت ئەوەیـە: سـێیەكی، یـان چوارێكی زەكاتەكـەی بـۆ خاوەنەكـە واز لێبێـنن تـاكو بـەخۆی بیداتــە هــەژارەكانی خـزمو دراوسـێی، هــەروەك لــە زۆربــەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَأَنَّهُ يَكْفِي خَارِصٌ) هـەروەها یـەك قرسـێنەریش بەسـە بـۆ قرسـاندن (وَشَرْطُهُ) مـەرجی قرسێنەر: (الْعَدَالَةُ) دادپەروەرییە (وَكَذَا الْحُرِّيَّةُ) هـەروەها مەرجـە: ئـازاد بـێو (وَالذُّكُورَةُ) نێرینـەش بـێ (فِي الأَصَحِّ) لـە فـەرموودەی ڕاسـتتردا، هـەروەها مەرجـە: قرسـاندنەكەش بزانێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(فَإِذَا خَرَصَ) جا هەر كاتێك میوەكەی قرساندو ئەندازەكـەی خستە ئەسـتۆی خاوەنەكـەی (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ حَقَّ الْفُقَراءِ) مـافی گـەداو هـەژاران (يَنْقَطِعُ مِنْ عَيْنِ الثَّمَرِ) لە خودیمیوەكـە دەپچڕێو (وَيَصِيرُ فِي ذِمَّةِ الْمَالِكِ) دەكەوێتـە ئەسـتۆی خـاوەنی

اَلتَّمْرُ وَالزَّبِيبُ لِيُخْرِجَهُمَا بَعْدَ جَفَافِهِ، وَيُشْتَرَطُ التَّصْرِيحُ بِتَضْمِينِهِ وَقَبُولُ الْمَالِكِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَقِيلَ يَنْقَطِعُ بِنَفْسِ الْخَرْصِ، فَإِذَ ضَمِنَ جَازَ تَصَرُّفُهُ فِي جَمِيعِ الْمَخْرُوصِ بَيْعًا وَغَيْرَهُ،

---

میوەکە: (اَلتَّمْرُ وَالزَّبِيبُ) ئەندازەی ئەو قەسپو مێوژەی بۆ زەکات لە سەری تۆمار کراوە (لِيُخْرِجَهُمَا) تاکو لە زەکاتی میوە قرساوەکەی بیاندا (بَعْدَ جَفَافِهِ) پاش ووشککردنەوەی میوەکە، کەوابو: دروستە: لە خودی ئەو میوەیە زەکاتەکە بداو هەم دروستە: لە میوەیەکیتر بیدا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.
(وَيُشْتَرَطُ) بۆ ئەو پچڕانو کەوتنە ئەستۆیە، بە مەرج داندراوە: (اَلتَّصْرِيحُ بِتَضْمِينِهِ) قرسێنەرەکە، یان جێگرەکەی بە ئاشکرایی بە خاوەنەکە بڵێ: تۆم کردە زامینی ئەوەندە قەسپە، یان ئەوەندە مێوژە: لە زەکاتی ئەم میوەیە. (وَقَبُولُ الْمَالِكِ) هەروەها مەرجە: خاوەنەکەش، یان جێگرەکەی ئەو زامینیە قبوڵ بکا (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يَنْقَطِعُ) مافی هەژاران دەپچڕێ (بِنَفْسِ الْخَرْصِ) بە خودی قرساندنەکە.
(فَإِذَ ضَمِنَ) جا هەر کاتێك خاوەنەکە کرا زامینو زامینیەکەشی قبوڵ کرد (جَازَ تَصَرُّفُهُ فِي جَمِيعِ الْمَخْرُوصِ) دروستە: دەستکاری گشت میوە قرساوەکە بکا (بَيْعاً) بە فرۆشتنو (وَغَيْرَهُ) بە دەستکاریتریش: وەك خواردنو بەخشین، واتە: پێش زامینی، ئەو دەستکاریانە دروست نیە، کەوابو: ئەگەر کاربەدەست قرسێنەری نەنارد، یان کاربەدەست نەبو، یان قرسێنەر نەبو، ئەو کاتە خاوەنەکە دوو پیاوی دادپەروەرو لێزان دەکاتە (حَكَم)؟ تاکو میوەکەی لە سەر بقرسێننو بیکەنە زامینو ئەویش قبوڵ بکا، تاکو مافی هەژاران لە میوەکە بپچڕێو بکەوێتە ئەستۆی خۆیو بتوانێ دەستکاری میوەکە بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەوها ڕوون کراوەتەوە.
﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر پێش دەنك ڕەقبوون، یان پێش ئاشکرابوونی پێگەیشتن، دانەوێڵەکە، یان میوەکەی فرۆشت، یان خواردی، یان بە هۆیەکیتر لە ناوی برد، ئەوە تۆڵەی لە سەر نیەو زەکاتی ناکەوێتە سەر، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە. بەڵام ئەگەر لە دوای دەنك ڕەقبوون، یان لە دوای ئاشکرابوونی پێگەیشتن، دانەوێڵەکە، یان میوەکەی لە ناو برد، ئەو کاتە تۆڵەی لە سەرە، واتە: واجبە: زەکاتی ئەو دانەوێڵەیە، یان ئەو میوەیە بدا: کە لە دەستی دلوەو لە ناوی بردوە، هەروەك باسمان کرد.
ئینجا تۆڵەی زەکاتیمیوە دوو حاڵەتی هەنە:
حاڵەتییەکەم: ئەگەر پاش قرساندنو زامینی لە ناوی ببا، ئەو کاتە واجبە: مێوژو قەسپی ووشك لە تۆڵەی زەکاتەکە بدا.

وَلَوِ ادَّعَى هَلَاكَ الْمَخْرُوصِ بِسَبَبٍ خَفِي كَسَرِقَةٍ، أَوْ ظَاهِرٍ عُرِفَ صُدِّقَ بِيَمِينِهِ، فَإِنْ لَمْ يُعْرَفِ الظَّاهِرُ طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ عَلَى الصَّحِيحِ، ثُمَّ يُصَدَّقُ بِيَمِينِهِ فِي الْهَلَاكِ بِهِ، وَلَوِ ادَّعَى حَيْفَ الْخَارِصِ أَوْ غَلَطَهُ بِمَا يَبْعُدُ لَمْ يُقْبَلْ،

---

حاڵەتیدووەم: ئەگەر پێش قرساندنو زامینی لەناوی ببا، ئەو كاتە لە فەرموودەی ڕاستتردا واجبە: میوەی تەڕ لە تۆڵەی زەكاتەكە بدا، لە فەرموودەیەكیشدا واجبە: میوەی ووشككراوە بدا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر میوەكە پێش ووشككردنەوە بە هۆی ڕووداوێك لەناو چوو، یان لە سەر درەختەكەوە، یان لە مشتاخدا دزرا، هیچ كەمتەرخەمیش لە خاوەنەكەی نەبو، ئەو كاتە هیچ تۆڵەو زەكاتی ناكەوێتە سەر خاوەنەكەی، بەڵام ئەگەر بەشێكی مایەوەو لەناو نەچوبو، ئەو كاتە واجبە: زەكاتی ئەو بەشە بدا، هەرچەند بە ئەندازەی ڕادەی زەكاتیش نەمابێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە، هەروەها ئەگەر خاوەنەكەشی كەمتەرخەمی كردبێ: وەك بەرگری نەكردبێ، یان لە شوێنێكی نەپارێزراو دایینابێ، ئەو كاتەش تۆڵەی زەكاتەكەی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

سێیەم: ئەگەر لە دوای قرساندنو زامینی-جگە لە خاوەنەكە- یەكێكیتر میوەكەی لەناو برد، ئەوە تۆڵەی لێوەردەگیرێ، خاوەنەكەش ئەندازەیزەكاتەكە لەو تۆڵەیە دەدا، واتە: لە سەری واجب نیە میوەی ووشك بۆ هەژاران بكڕێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوِ ادَّعَى هَلَاكَ الْمَخْرُوصِ) ئەگەر خاوەنەكە ئیددیعای كردو گوتی: میوە قرساوەكە گشتی، یان بەشێكی لەناو چووە (بِسَبَبٍ خَفِي) بە هۆیەكی شاراوە: (كَسَرِقَةٍ) وكو دزی (أَوْ ظَاهِرٍ) یان بە هۆیەكی ئاشكرا: كە (عُرِفَ) لە ناو خەڵكیدا زاندرا بوو: وەكو سوتانو سەرماو كڵۆو فەرهود (صُدِّقَ بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردنی باوەڕی پێدەكرێ: كە بەو هۆیە میوەكەی لەناو چووە.

(فَإِنْ لَمْ يُعْرَفِ الظَّاهِرُ) جا ئەگەر ئەو هۆیە ئاشكرایە لە ناو خەڵكیدا نەزاندرابو (طُولِبَ بِبَيِّنَةٍ) داوای شاهیدی لێدەكرێ: كە ئەو هۆیە ڕوویداوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (ثُمَّ) ئینجا لە دوای شاهیدیدانەكەش (يُصَدَّقُ بِيَمِينِهِ) بە سوێند خواردنی باوەڕی پێ دەكرێ: (فِي الْهَلَاكِ بِهِ) كە میوەكەی بەو هۆیەی شاهیدی لە سەر دراوە لەناو چووە؟ چونكە دەگونجێ میوەكەی سەلامەت بوبێو شاهیدەكان نەیانزانیبێ.

(وَلَوِ ادَّعَى حَيْفَ الْخَارِصِ) ئەگەر ئیددیعای كردو گوتی: قرسێنەرەكە ستەمی كردوەو زیادی داناوە (أَوْ غَلَطَهُ) یان گوتی: هەڵەی كردوە (بِمَا يَبْعُدُ) بە ئەندازەیەكی وەها: بە گوێرەی عادەت دوور بوو ئەو هەڵەیە ڕوو بدا (لَمْ يُقْبَلْ) بە بێشاهید دەعوایەكەی

أَوْ بِمُحْتَمَلٍ قُبِلَ فِي الأَصَحِّ.

وەرناگیرێ (أَوْ بِمُحْتَمَلٍ) یان دەعوایەکەی بە ئەندازەیەکی‌وەها بوو دەگونجا ڕوو بدا (قُبِلَ) دەعوایەکەی وەردەگیرێو ئەندازەکەی لە سەر لادەدرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو لەو حاڵەتەدا بوو: کە قرساوەکە نەمابێ، واتە: ئەگەر مابێ، دووبارە دەپیودرێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ پاشکۆ ﴾ یەکەم: هەروەك واجبە زەکاتی میوە بە ووشککراوەیی بدرێ، ئەوهاش واجبە: دانەوێڵە-جگە لە برنجو گەنمە سنعانی- لە کاو کۆت پاك بکرێتەوە، ئینجا لە زەکاتدا بدرێ، ئینجا بزانە: کرێی بڕینەوەی میوەو ووشککردنەوەی‌و کرێی درووێنەو گێرەو پاککردنەوەو بارکردن‌و پاراستن‌و گشت ئەرکەکانی‌تریش، هەمووی لە کیسەی خاوەنەکە دەدرێو دروست نیە: هیچی لە میوەو دانەوێڵەکە بدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا ئەگەر کرێی ئەو ئەرکانەی‌ڕابردووی لە میوەو دانەوێڵەکە دابێ، لە سەر خاوەنەکە واجبە: لە ماڵی‌خۆی زەکاتی ئەو بەشەش بدا: کە لە کرێی داوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، کەواتە: لە سەر خاوەنەکە واجبە: زەکاتی ئەو بەشە دانەوێڵەیەش بدا: کە لە کرێی درووێنە داویەتیە سەپانەکان، یان داویەتیە خاوەنی (درّاسة)=ئامێری درووێنە، وَاللّٰهُ أَعْلَم.

هەروەها ئەگەر زەویەکە بەکرێ درابو-بە نیوەتۆو، یان بە بنەتۆو-دروست نیە: کرێیەکەی لە پێش زەکاتدا لە دانەوێڵەکە بدرێ، کەواتە: ئەگەر خاوەن زەویەکە کرێیەکەی پێش زەکاتدان لە دانەوێڵەکە وەرگرت، ئەوە ئەندازەی زەکات نابێتە مڵکی ئەوی و واجبە: ئەندازەکەی لێوەربگێرێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

دووەم: ئەو خەرجی‌یەی بە ستەمو زۆرداری لە خاوەن دانەوێڵەکان وەردەگیرێ، بە بەر زەکات ناکەوێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: وەك ئەو سێیەکە، یان چوارێکە، یان دەیەکەی ئاغاو زۆردارەکان بە ناهەق لە جووتیارانی دەستێنن.

سێیەم: میوەو بەرهەمی زەویی (وقف)کراو بۆ سەر ڕووی گشتی: وەك مزگەوت‌و خوێندگاو (مجاهد)ان‌و هەژاران‌و ئەو جۆرە ڕووە گشتیانە، هیچی زەکاتی تێدا نیە، چونکە خاوەنێکی دیارکراوی نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر بۆ سەر دیارکراوێك، یان کۆمەڵێکی دیارکراو (وقف) کرا بون‌و گەیشتنە ڕادەی زەکات، ئەو کاتە واجبە: زەکاتیان بدەن.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە زەویەکی (وقف)کراودا، یان داگیرکراودا، دانەوێڵە بچێنێ، ئەو کاتەش زەکات لە سەر خاوەنی‌دانەوێڵەکە واجبە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی؟ چونکە

## (بابُ زَكاة النَّقْد)

نصَابُ الْفضَّة مأَتَا درْهَم، وَالذَّهَب عشْرُونَ مثْقَالاً بوَزْن مَكَّةَ، وَزَكَاتُهُمَا رُبُعُ عُشْر،

---

زۆربەی سەرچاوەكان لە باسی(المساقاة)دا فەرموویانە: (كشتوكاڵ پابەندی تۆوەكەیە).
ئەوەش وا دەگەیێنێ: ئەگەر بە سەپانی–بە نیوەتۆو، یان بە بنەتۆو–لە زەویی كەسێكدا دانەوێڵە بچێنێ، ئەوە زەكاتی بەشەكەی هەردووكیان لە سەر خاوەنیتۆوەكەیە، كەواتە: ئەندازەیزەكاتەكە تەنها لە بەشەكەیوی دەردەكرێ، جیاوازی نیە خاوەنیتۆوەكە: سەپانەكە بێ، یان خاوەن زەویەكە بێ، وَاللهُ أعْلَم.

### ﴿ بابُ زَكاةِالنَّقْد: باسی زەكاتی زێڕو زیو و پارە ﴾

(نِصَابُ الْفِضَّةِ) سەرەتای ڕادەی زەكاتی زیو (مِأَتَادِرْهَمٍ) دوو سەد دیرهەمە: كە بە كێشان دەكاتە (١٤٠) سەدو چل میسقال، واتە: (٧٠٠) حەفتسەد غرام (وَالذَّهَبِ) سەرەتای ڕادەی زەكاتی زێڕ (عِشْرُونَ مِثْقَالاً) بیست میسقالە، واتە: (١٠٠) سەد غرام.
ئینجا بزانە: كێشی هەر میسقالێك (٧٢) حەفتاو دوو دەنكە جۆیە: كە لە هەردوو لای دەنكەكە زلكە باریكەكەی قرتابێ، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەكاندا فەرموویانە.
(بِوَزْنِ مَكَّةَ) بە كێشانی(مكة)ی پیرۆز ڕادەی زەكاتی زێڕو زیو ڕەچاو دەكرێ (وَزَكَاتُهُمَا) ئەندازەی زەكاتی واجب: لە زێڕو زیودا (رُبُعُ عُشْرٍ) چوارێكی دەیەكێكە، واتە: لە بیست میسقالی زێڕدا: نیو مسقال، لە دوو سەد دیرهەمی زیودا: پێنج دیرهەم، كەواتە: ئەندازەی زەكاتی هەردووكیان لە سەدا: دوو و نیوە، هەم لە هەزاردا: بیستو پێنجە.
پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا كَانَتْ لَكَ مأَتَا دِرْهَمٍ وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ، وَلَيْسَ عَلَيْكَ شَيْءٌ حَتَّى تَكُونَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَاراً فَإِذَا كَانَ لَكَ عِشْرُونَ دِينَاراً وَحَالَ عَلَيْهَا الْحَوْلُ فَفِيها نِصْفُ دِينَارٍ، فَمَا زَادَ فَبِحِسَابِ ذَلِكَ﴾ حديث حسن رواه ابودلود وغيره، هەر كاتێك دوو سەد دیرهەمی زیوت هەبو و ساڵی بە سەردا سوڕلوە پێنج دیرهەم زەكاتی تێدا واجبە، هەر كاتێكیش بیست دیناری زێڕت هەبو و ساڵی بە سەردا سوڕلوە نیو دینار زەكاتی تێدا واجبە، ئینجا هەر كامەیان لە ڕادەی زەكاتی خۆیان زیاتر بون، ئەوە بە گوێرەی زێدەییەكە–بەو ئەندازەیرابردوو–زەكاتیان تێدا واجبە.
﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: ئەو حەدیسە بەڵگەیە: كە لە زەكاتی زێڕو زیو و پارەدا مەرجە: ڕادەی زەكاتەكەیان تا ساڵێكیتەولوی بە سەردا دەسووڕێتەوە هەر لە ملكی خاوەنەكەیدا بێ، واتە: ئەگەر لە ماوەیەكیكەم لە ناو ساڵدا ڕادەی زەكاتەكەیان كەم بۆوە، ئینجا دووبارە گەیشتەوە ڕادەی زەكات، ئەوە ساڵییەكەم دەپچڕێو لەكاتی بوونەوە ڕادەیزەكاتەوە سەرە ساڵێكی نوێ دەست پێ دەكا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

.......................................

جا هەر بە بەڵگەی حەدیسەکە: لە زەکاتی زێڕو زیو و پارەدا لێبوردن نیە، واتە: لە ڕادەی زەکات بە سەرەوەتر هەرچەند زیاد بێ، بەگوێرەی زێدەییەکە: چوارێکی دەیەك زەکاتی لێدەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

دووەم: زەکاتی زێڕو زیو و پارەش–وەکو زەکاتی ئاژەڵ– هەموو ساڵێك دووبارە دەبێتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، واتە: هەرچەند زێڕو زیو و پارەکەشی بە بێئیش دانابێ‌و زیادیشی نەکردبێ، چونکە خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەوانەی زێڕو زیو دەکەنە گەنجینە: کۆی دەکەنەوەو دایدەنێن‌و لە ڕێگەی خوا زەکاتی لێنادەن، مژدەیان بدێ بە سزایەکی زۆر بەئازار لە قیامەتدا. واتە: ئەگەر زەکاتی لێبدرێ هەرەشەکە نایگرێتەوە، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا بَلَغَ أَنْ تُؤَدَّى زَكَاتُهُ فَزُكِّيَ فَلَيْسَ بِكَنْزٍ﴾ رواه ابوداود وغيره بإسناد حسن، هەر ماڵێك بگاتە ڕادەی زەکات‌و زەکاتی لێدرا، ئەوە گەنجینە نیە.

سێیەم: پارەو دراوی ئەم سەردەمە–وەکو زێڕو زیو– زەکاتی تێدا واجبە؟ چونکە پارەی ئەم سەردەمە جێگری زێڕو زیوە، بەڵام بۆ زانینی ڕادەی زەکات تەنها بەرامبەری زیو دادەندرێ؟ چونکە ئەوها زووتر دەگاتە ڕادەی زەکات‌و بەرژەوەندی هەژارانی زیاتر تێدایە، زەکاتیش بۆ بەرژەوەندی هەژارانیش داندراوە، هەروەك لە باسی قرساندنی ماڵی بازرگانی‌دا ڕوونی کردۆتەوە، جگە لەمەش: پێغەمبەرﷺ زیوی بە پارەیەکی ڕاستەقینەو سەرەکی داناوە بۆ زانینی نرخی زێڕو شتی‌تریش:

بۆ نموونە: ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا يُغْنِيه؟ قَالَ خَمْسُونَ دِرْهَماً أَوْ قِيمَتُهَا مِنَ الذَّهَبِ﴾ رواه أصحاب السنن بأسانيد حسنة، گوترا: ئەی پێغەمبەریخوا ﷺ چی مرۆڤ دەوڵەمەند دەکا لە دەرۆزەکردن؟ فەرمووی: پەنجا دیرهەمی زیو، یان نرخی ئەو پەنجا دیرهەمە زێڕی هەبێ.

هەم لە حەدیسێکی‌تردا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ سَأَلَ وَلَهُ قِيمَةُ أُوقِيَّةٍ فَقَدْ أَلْحَفَ﴾ رواه ابوداود بسند صالح، هەر کەسێك دەرۆزە بکا لەو حاڵەتەی بە نرخی چل دیرهەم ماڵی هەبێ، بێگومان زێدەڕۆیی کردوەو تاوانبارە.

کەوابو: هەر کەسێك بە نرخی (١٤٠) سەدو چل میسقاڵ، واتە: (٧٠٠) غرامی زیو، یان زیاتر پارەی ئەم سەردەمەی هەبێ، زەکاتی لە سەرەو، واجبە: ئەندازەی لە چلدا: یەك، لە سەددا: دوو و نیو، لە هەزاردا: بیست‌و پێنج، لە زەکاتدا بدا، وَاللهُ أَعْلَمُ.

چوارەم: زێڕ ڕەگەزێکی سەربەخۆیەو زیویش ڕەگەزێکی سەربەخۆیە، کەوابو: ڕادەی زەکاتی هیچیان بەویتر تەواو ناکرێ، بەڵام بە جۆرەکانی هەر ڕەگەزێك زەکاتی

وَلاَ شَيْءَ فِي الْمَغْشُوشِ حَتَّى يَبْلُغَ خَالِصُهُ نِصَاباً، وَلَو اخْتَلَطَ إِنَاءٌ مِنْهُمَا وَجُهِلَ أَكْثَرُهُمَا زُكِّيَ الأَكْثَرُ ذَهَباً أَوْ فِضَّةً أَوْ مُيِّزَ، وَيُزَكَّى الْمُحَرَّمُ مِنْ حُلِيٍّ وَغَيْرِهِ،

---

جۆرێکیتری هەمان ڕەگەز تەواو دەکرێ، هەرچەند نرخیشیان لێك جیاواز بێ، کەواتە: زێڕی چاکو زێڕی خراپ ڕادەی زەکاتی یەکتری تەواو دەکەن؟ چونکە یەك ڕەگەزن، هەروەها زیوی چاکو زیوی خراپ ڕادەی زەکاتی یەکتری تەواو دەکەن؟ چونکە یەك ڕەگەزن، ئینجا بزانە: زەکاتەکەش بە سەر جۆرەکاندا بەش دەکرێ: بەگوێرەی ئەندازەی خۆیان، واتە: دروست نیە جۆری خراپ لەجیاتی جۆرێکی باش لە زەکاتدا بدا، بەڵام دروستە: جۆرێکی باش لەجیاتی جۆرێکی خراپ لە زەکاتدا بدا، هەروەها دروست نیە: ووردە لە جیاتی درشتە بدرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە دروستە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

پێنجەم: هەر لەو ڕوونکردنەوەیەش دەفامێتەوە: کە پارەی ئەم سەردەمەش-باشو خراپ-گشتی ڕادەی زەکاتی ئەویتر تەواو دەکا، جیاوازیش نیە گشت پارە باشەکە، یان گشت پارە خراپەکە: هی ووڵاتێك بێ، یان هی چەند ووڵاتی جۆراوجۆر بێ؟ چونکە گشتی بە ڕەگەزی زیو دەقرسێندرێ، کەواتە: ڕادەی زەکاتی پارەی ووڵاتێك بە پارەی ووڵاتێکیتر تەواو دەکرێ، هەروەها لە پارەشدا دروست نیە: ووردە لە جیاتی درشتە لە زەکاتدا بدرێو بە پێچەوانەش دروستە، وَاللهُ أَعْلَم.

(وَلاَ شَيْءَ) هیچ زەکات واجب نیە (فِي الْمَغْشُوشِ) لە زێڕو زیوی غەش تێداکراو: وەك لە زێڕو سفر تێکەڵ کرابێ، یان لە زیوو مس تێکەڵ کرابێ (حَتَّى يَبْلُغَ خَالِصُهُ) تا پوختەی زێڕەکە بە تەنها، یان زیوەکە بە تەنها دەگاتە (نِصَاباً) ڕادەی زەکات (وَلَوِ اخْتَلَطَ إِنَاءٌ مِنْهُمَا) ئەگەر قاپێکیچێشت لە زێڕو زیو بە تێکەڵی دروست کرابو و هەردووکیان بە تەنها تەنها دەگەیشتنە ڕادەی زەکات، بەڵام (وَجُهِلَ أَكْثَرُهُمَا) نەزاندرا: کامەیان زۆرترە، لەو حاڵەتەدا (زُكِّيَ الأَكْثَرُ ذَهَباً وَفِضَّةً) زەکاتی زۆرەکە دەدرێ، هەم لە زێڕو هەم لە زیو:

بۆ وێنە: ئەگەر کێشی قاپەکە بە هەردووکیان هەزار بوو، یەکێکیان شەشسەد بوو، یەکێکیشیان چوار سەد بوو، بەڵام نەزاندرا: کامەیان شەشسەدەکەیە، ئەوە واجبە: زەکاتی زێڕەکەشو هی زیوەکەش لە سەر حیسابی شەشسەد بدرێ (أَوْ مُيِّزَ) یان دەبێ بە هۆی ئاگر لێك جیابکرێتەوە، تاکو ئەندازەی زەکاتی هەر یەکەیان بزاندرێ.

## ﴿ باسی زێڕو زیوی حەڵاڵ و حەڕام ﴾

(وَيُزَكَّى الْمُحَرَّمُ) بە (إجماع) زانایانی ئیسلام واجبە: زەکاتی زێڕو زیوی حەڕامکراو بدرێ (مِنْ حُلِيٍّ) جا حەڕامکراوەکە لە چینی خشڵ بێ (وَغَيْرِهِ) یان چینێکیتر بێ: وەك

لاَ الْمُبَاحُ فِيالأَظْهَرِ، فَمِنَ الْمُحَرَّمِ: اَلإِنَاءُ وَالسِّوارُ وَالْخَلْخَالُ لِلُبْسِ الرَّجُلِ،

کەلوپەلی چێشت (لاَ الْمُبَاحُ) بەڵام زێڕو زیوی حەڵاڵکراو زەکاتی تێدا واجب نیە (فِی الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتری ئیمامی (الشافعي)و هەم لە مەزهەبی ئیمام (مالك)و ئیمام (احمد)دا ﴿عَنْ عَمْرو بن دينار: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ جَابر بن عَبْدالله عَنِ الْحُلِيِّ: أَفِيهِ زَكَاةٌ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: وَإِنْ كَانَ يَبْلُغُ أَلْفَ دينار؟ قَالَ: وَإِنْ كَثُرَ﴾ رواه الشافعي والبيهقي باسناده الصحيح ﴿وَصَحَّ عَنْ ابْنِ عُمَرَ وَعَائِشَةَ مِثْلُهُ﴾رواه مالك، پیاوێك پرسیاری لە حەزرەتی(جابر) کرد-کە سەحابەیەکی پێغەمبەر بووﷺ-: ئایا زەکات لە خشڵی ئافرەتدا واجبە؟ فەرمووی: نا، گوتی: ئەگەر هەزار میسقالیش بێ؟ فەرمووی: ئەگەر زۆریش بێ هەر واجب نیە. هەروەها زەکات نەدان لە خشڵی ئافرەتاندا لە حەزرەتی (ابنُ عُمَر)و حەزرەتی (عائشة)ش گێڕدراوەتەوە.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: زەکات لە خشڵی ئافرەتانیش واجبە، بە بەڵگەی چەند حەدیسێکی(صحیح)، بەڵام ئەو ئیمامانەی دەفەرموون: لە خشڵی ئافرەتاندا زەکات واجب نیە، وەڵامی حەدیسەکانیان داوەتەوە: کە لە سەرەتای ئیسلامدا خشڵی زێڕ لە سەر ئافرەتانیش حەرام بوو، ئینجا کە بۆ ئافرەتان حەڵاڵ کرا، زەکاتی لە سەر هەڵگیرا، دەشگونجێ: حەدیسەکان دەرهەقی ئیسراف هاتبن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، لە پێش کۆتایی ئەم باسەدا بەڵگەکە دێنین، إن شاءَ اللهُ تَعَالَی.

کەواتە: هەر شتێك لە زێڕ، یان لە زیو دروست کرابێ: ئەگەر شەریعەتی ئیسلام ناپەسند، یان حەرامی کردبێ بەکار بهێندرێ، یان دەبەر بکرێ، یان هەڵبگیرێ، ئەوە زەکاتی تێدا واجبە، بەڵام ئەگەر حەڵاڵی کردبێ، ئەوە زەکاتی تێدا واجب نیە، جیاوازی پیاو و ئافرەتیش نیە، چونکە ئەو (صحابة) بەرێزانە سەربەخۆ وایان نەفەرمووە.

بۆ وێنە: قاپو کەلوپەلی چێشت لە زێڕ بێ، یان لە زیو، هەڵگرتنو هەم بەکارهێنانیشی حەرامە: بۆ پیاو و بۆ ئافرەت، کەواتە: بە هۆیحەرامیەکە گوناهبار دەبن، جا ئەگەر قاپەکەش بگاتە ڕادەی زەکات، واجبە: زەکاتی لێبدەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(فَمِنَ الْمُحَرَّمِ) هەندێك لەو زێڕو زیوەی حەرامە، ئەمانەیە: (اَلإِنَاءُ) قاپو کەلوپەلیتری چێشت: بۆ پیاو و بۆ ئافرەت، هەروەك لە (کتاب الطهارة)دا ڕوونمان کردەوە (وَالسِّوارُ) هەروەها حەرامە: بازن (وَالْخَلْخَالُ) خلخاڵیشو گشت خشڵێکیتری ئافرەتان (لِلُبْسِ الرَّجُلِ) بۆ پیاو، بەو مەبەستەی بە خۆی دەبەری بکا، بە بەڵگەی حەدیسەکەیداهاتوو، چونکە مەبەستەکەی حەرامە.

فَلَو اتَّخَذَ سواراً بلاَ قَصْد أَوْ بقَصْد إجَارَته لمَنْ لَهُ استعمَالُهُ فَلاَ زَكَاةَ فيالأَصَحِّ، وَكَذَا لَــوِ انْكَسَرَالْحُليُّ وَقَصَدَ إِصْلاَحَهُ، وَيَحْرُمُ عَلَىالرَّجُلِ حُليُّ الذَّهَب إلاَّالأَنْفَ وَالأُنْمُلَةَ وَالسِّنَّ،

---

كەوابو: (فَلَوِ اتَّخَذَ سِواراً) ئەگەر پیاوێك بازنێك، یان چەند پارچە خشڵێكیتری كردە ملكی خۆیو دایانا (بِلاَ قَصْدٍ) بە بێهیچ مەبەستێك (أَوْ بِقَصْدِ إِجَارَتِهِ) یان بەو مەبەستەی بە كرێی بداتە (لِمَنْ لَهُ اسْتِعمَالُهُ) ئەو كەسەی كە بۆی دروست بێ خشڵەكە بەكار بێنێ: وەك ئافرەت (فَلاَ زَكَاةَ) لەو حاڵەتانەدا زەكات لە خشڵەكەدا واجب نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە بە مەبەستێكی حەرام خشڵەكەی دانەناوە.

(وَكَذَا لَوِ انْكَسَرَ الْحُلِيُّ) هەروەها ئەگەر خشڵەكە شكا (وَقَصَدَ إِصْلاَحَهُ) پیاوەكە مەبەستی بوو چاكی بكاتەوە، ئەویش زەكاتی تێدا نیە، هەرچەند ساڵیشی بە سەردا بسووڕێتەوەو هێشتا چاك نەكرابێتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر پیاو خشڵی زێڕو زیوی بەو مەبەستە دانابو: كە ئافرەتەكانی، یان منداڵەكانی پێ بڕازێنێتەوە، ئەوە لەو حاڵەتەشدا زەكات لە خشڵەكەدا واجب نیە، بەڵام ئەگەر بە مەبەستی گەنجینەیی دایناوبو–وەك ئەو كەسەی خشڵەكە دابنێ تاكو لە كاتی پێویستیدا بیفرۆشێ– ئەوە لەو حاڵەتەدا زەكاتی تێدا واجبە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا هەردوو حاڵەت ڕوون كراونەوە، جا لەم مەسەلەی گەنجینەدا جیاوازی پیاو و ئافرەت نیە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا فەرموویەتی.

(وَيَحْرُمُ عَلَىالرَّجُلِ) حەرامە لە سەر پیاو و هەم نێرامۆك (حُلِيُّ الذَّهَبِ) ڕازاندنەوە: بە هەر جۆرە خشڵێكی زێڕ ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيراً وَذَهَباً ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح زاد الترمذي: ﴿وَأُحِلَّ لإِنَاثِهِمْ﴾. پێغەمبەر ﷺ ئاوریشمو زێڕی بە دەستەوە گرتنو فەرمووی: ئەم دووانە لە سەر نێرینەی ئوممەتم حەرامنو بۆ مێینەكانیشیان حەڵاڵ كراون.

(إِلاَّ الأَنْفَ) تەنها لووت نەبێو (وَالأَنْمُلَةَ) سەرەپەنجە نەبێو (وَالسِّنَّ) ددان نەبێ، واتە: ئەگەر لووتی، یان سەرەپەنجەی لێكرابۆوە، یان ددانی هەڵكەندرابو، دروستە: لە زێڕ دروستیان بكاتەوەو لە شوێنی ئەندامەكە دایبنێتەوە ﴿عَنْ عَرْفَجَةَ ﷺ: أُصِيبَ أَنْفِي يَوْمَ الْكُلاَبِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ فَاتَّخَذْتُ أَنْفاً مِنْ وَرِقٍ فَأَنْتَنَ عَلَيَّ، فَأَمَرَنِي النَّبِيُّ ﷺ: أَنْ أَتَّخِذَ أَنْفاً مِنْ ذَهَبٍ﴾رواه أصحاب السنن بسند حسن، لە سەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا، لە جەنگی (كولاب)دا لووتم لە دەست چوو، منیش لووتێكم لە زیو دروست كردو لێم بۆگەن بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێكردم: لووتێك لە زێڕ لە خۆم بنێم. واتە: سەرەپەنجەو ددان (قیاس) كراونە سەر لووت، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(لاَ الأصبُعَ) بەلام پەنجەی تەواو لە زێڕ دروست نیە، چونکە کار ناکا، کەوابو: دەستی زێڕیش حەرامە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَحْرُمُ) لە سەر پیاو حەرامە (سِنُّ الْخَاتَمِ) ددانی ئەنگوستیلەکەی زێڕ بێ: کە لە گلێنەی ئەنگوستیلەدا مۆرییەکەی پێ ڕادەگیرێ (علَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، کەوابو: ئەگەر ئاڵقەو ئەنگوستیلەش لە زێڕ بن، ئەوانیش وەکو خشڵەکانیتر-بێگومان- لە سەر پیاوان حەرامن ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَرَضِىالله عنهما: إِصْطَنَعَ النَّبِيُّﷺ خاتَماً مِنْ ذَهَبٍ، فَاصْطَنَعَ النَّاسُ الْخَواتِيمَ مِنْ ذَهَبٍ، فَرَقِيَ الْمِنْبَرَ وَحَمِدَ اللهَ وأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: إِنّي كُنْتُ اصْطَنَعْتُهُ وَإِنِّي لاَ أَلْبَسُهُ. فَنَبَذَهُ، فَنَبَذَ النَّاسُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕی خستە پەنجەیی‌و خەڵکیش ئەنگوستیلەی زێڕیان خستە پەنجەیان، ئینجا کە زێڕ لە پیاوان حەرام کرا، پێغەمبەرﷺ ووتاری داو فەرمووی: لەمەودوا من ئەنگوستیلەی زێڕ ناخەمە پەنجەم‌و ئەنگوستیلەکەی فڕێدا، خەڵکیش ئەنگوستیلەکانیان فڕێدان.

(وَيَحِلُ لَهُ) بۆ پیاو حەڵاڵە: (مِنَ الْفِضَّةِ الْخَاتَمُ) ئەنگوستیلەی زیو بخاتە پەنجەی بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام، بەڵکو سوننەتە، وەهاش خێرترە: لە پەنجەی قلیچەی دەستی ڕاستەی بکا ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّﷺ لَبِسَ خَاتَمَ فِضَّةٍ فِي يَمِينِهِ﴾رواه مسلم وأصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زیوی خستە پەنجەی دەستی ڕاستەی.

هەروەها لە چەپەشدا خێرە ﴿عن أَنَسٍ رضي الله عنه: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّﷺ فِي هَذِهِ الْخِنْصَرِ مِنَ الْيُسْرَى﴾ رواه مسلم، ئەنگوستیلەی پێغەمبەرﷺ لە قلیچەی دەستە چەپیدابو. کەوابو: ناپەسندە: بیخاتە پەنجەکانیتری -جگە لە قلیچە- هەروەك لە (تحفة)و (مغنى)دا فەرموویانە ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه: نَهَانِي النَّبِيُّﷺ أَنْ أَتَخَتَّمَ فِي إِصْبَعِيَّ هَذِهِ وَهَذِهِ: الْوُسْطَى والَّتِي تَلِيهَا﴾رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردم: ئەنگوستیلە بخەمە پەنجەی ناوەڕاست‌و پەنجەی شادە.

ئینجا بزانە: حەڵاڵە ئاڵقە بخاتە پەنجەی، چونکە ئەویش ئەنگوستیلەیەکی بێگلێنەیە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

هەروەها دروستە: پیاو دوو ئەنگوستیلەو زیاتریشی هەبێ، تاکو بە نۆبەت دە پەنجەی بکا، بەلام لە لای چەند زانایەك ئەو فەرموودەیە بەهێزە: کە حەرامە: پیاو لە یەك کاتدا دوو ئەنگوستیلە، یان زیاتر بخاتە پەنجەی دەستێکی، یان پەنجەی هەر دوو دەستەکانی، چونکە لە هیچ حەدیسێکی (صحيح)دا زیاتر لە ئەنگوستیلەیەك نەهاتوە، هەم زیاتر لە یەك ئەنگوستیلە بووەتە دروشمی ئافرەتان‌و کەم عەقڵەکان، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَحِلْيَةُ آلاَتِ الْحَرْبِ كَالسَّيْفِ وَالرُّمْحِ وَالْمِنطَقَةِ، لاَ مَا لاَ يَلْبَسُهُ كَالسَّرْجِ وَاللِّجَامِ فِي الأَصَحِّ، وَلَيْسَ لِلْمَرْأَةِ حِلْيَةُ آلَةِ الْحَرْبِ، وَلَهَا لُبْسُ أَنْوَاعِ حُلِيِّ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، وَكَذَا مَا نُسِجَ بِهِمَا فِي الأَصَحِّ، وَالأَصَحُّ تَحْرِيمُ الْمُبَالَغَةِ فِي السَّرَفِ كَخَلْخَالٍ وَزْنُهُ مِائَتَا دِينَارٍ،

---

(وَحِلْيَةُ آلاَتِ الْحَرْبِ) هەروەها حەڵاڵە بۆ پیاوی(مجاهد): کەرستەکانی جەنگ بە زیو جوان بکا (كَالسَّيْفِ) وەکو شمشێرو (وَالرُّمْحِ) ڕمو (وَالْمِنطَقَةِ) تەکبەندی ناوقەدی‌و خودەو پۆلایی سەری‌و...هتد (لاَ مَا لاَ يَلْبَسُهُ) بەڵام ئەو کەرەستەیەی دەبەری ناکا، دروست نیە بە زیویش بیڕازێنێتەوە: (كَالسَّرْجِ) وەکو زینی وولاغەکەی‌و (وَاللِّجَامِ) جڵەوی وولاغەکەی‌و ...ئەو جۆرە شتانە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

هەروەها جوانکردنی کەرەستەی جەنگیش بە زێڕ دروست نیە، ئەو حەدیسەش کە دەفەرموێ: ﴿لە (فتح مكة)دا شمشێرەکەی پێغەمبەرﷺ زێڕ، یان زیوی لە سەر بوو﴾. دەگونجێ مەبەستی: زێڕکراوێکی کەم بێ‌و هەم (إبن القطان) حەدیسەکەی بە بێ‌هێز داناوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَيْسَ لِلْمَرْأَةِ) بۆ ئافرەت دروست نیە: (حِلْيَةُ آلَةِ الْحَرْبِ) کەرەستەی جەنگ بڕازێنێتەوە: نە بە زێڕو نە بەزیو، چونکە حەڕامە: ئافرەت خۆی وەپیاوان بچوێنێ‌و لە حەدیسدا بە لەعنەت کراوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام (وَلَهَا) بۆ ئافرەت دروستە: (لُبْسُ أَنْوَاعِ حُلِيِّ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ) هەموو جۆرە خشڵێکی زێڕو زیو دەبەر بکا: وەك بازن‌و گەردانەو ملوانکەو ئەنگوستیلەو ئاڵقەو ملەگۆو گوارەو تاس‌و خڵخاڵ‌و کەوش‌و...هەموو خشڵێکی‌تر، بە (إجماع)ی‌زانایانی‌ئیسلام‌و حەدیسەکەی ئیمامی (علي)ی‌ڕابردوو، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراونەوە (وَكَذَا) هەروەها بۆ ئافرەت حەڵاڵە: (مَا نُسِجَ بِهِمَا) ئەو جل‌و بەرگە دەبەر بکا: کە بە زێڕو زیو چندراوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە بەڵگەکانی حەڵاڵی زێڕ بۆ ئافرەت گشت جۆرێك دەگرنەوە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (تَحْرِيمُ الْمُبَالَغَةِ فِي السَّرَفِ) حەڕامە: ئافرەت زۆر ئیسراف بکا لەو شتانەدا: کە بە حەڵاڵ دانراون (كَخَلْخَالٍ وَزْنُهُ مِائَتَا دِينَارٍ) وەك خڵخاڵێکی‌زێڕ کێشی هەردوو تاکەکەی پێکەوە دوو سەد میسقال بێ، ئینجا بزانە: ئەگەر ئیسراف زۆر نەبو ئەو کاتە ئیسرافەکە ناپەسندە، بەڵام لە حاڵەتی حەڕامی‌و ناپەسندی‌دا، زەکات لە هەموو خشڵەکەدا واجب دەبێ، نەك تەنها لە ئەندازەی ئیسرافەکەدا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ عمرو بن شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ: أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّﷺ وَفِي يَدِ بِنْتِهَا مَسَكَتَانِ غَلِيظَتَانِ مِنْ ذَهَبٍ، فَقَالَ لَهَا: أَتُعْطِينَ زَكَاةَ هَذَا؟ قَالَتْ لاَ. قَالَ: أَيَسُرُّكِ أَنْ

وَكَذَا إِسْرَافُهُ فِي آلَةِالْحَرْبِ، وَجَوَازُ تَحْلِيَةِ الْمُصْحَفِ بِفِضَّةٍ، وَكَذَا لِلْمَــرْأَةِ بِــذَهَبٍ، وَشَرْطُ زَكَاةِ النَّقْدِ الْحَوْلُ،

---

يُسَوِّرَكِ اللهُ بِهِمَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ سِوَارَيْنِ مِــنْ نَــارٍ؟﴾رواه أصحاب السنن وقال النواوي: هذا إسناد حسن، وقال إبن القطان: صحيح، ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ دوو بازنی‌زێڕی گەورە لە دەستی کیژەکەی‌دا بون، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: زەکاتی ئەم بازنانە دەدەی؟ گوتی: نا. فەرمووی: پێت خۆشە بە هۆی ئەم بازنانە خوای‌گەورە لە ڕۆژی قیامەت دوو بازنی ئاگر دە دەستت بکا. واتە: لە ووشەی (غَليظَتان) دەردەکەوێ: کە ئیسرافی کردوە، ئەگینا: خشڵی ئافرەتان زەکاتی تیّدا نیە، هەروەك بەڵگەمان بۆ هێناوە.

(وَكَذَا إِسْرَافُهُ فِيآلَةِالْحَرْبِ) هەروەها لە سەر پیاویش حەرامە ئیسراف بکا لە ڕازاندنەوەی کەرەستەی جەنگی‌دا هەرچەند ئیسرافەکەش زۆر نەبێ (وَجَوَازُ تَحْلِيَةِالْمُصْحَفِ بِفِضَّةٍ) هەم بۆ پیاو و بۆ ئافرەت دروستە: بۆ ڕێز لێنان بەرگو پەڕەکانی قورئان بە زیو جوان بکەن، واتە: خودی پەڕەکان زیوبن، یان نووسینەکە زیو بێ.

(وَكَذَا لِلْمَرْأَةِ) هەروەها بۆ ئافرەتیش دروستە: (بِذَهَبٍ) قورئان بە زێڕ جوان بکا، هەروەها بۆ پیاو و بۆ ئافرەت دروستە: قورئان بە زێڕ بنووسنەوە، بەڵام جوانکردنی بەرگی قورئان بە زێڕ–بۆ ئافرەتیش– دروست نیە، هەروەها جوانکردنی کتێبەکانی ئایینی–نە بە زێڕو نە بە زیو– بۆ پیاو و بۆ ئافرەتیش دروست نیە، هەروەك لە (المجموع)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَشَرْطُ زَكَاةِالنَّقْدِ) مەرجی واجببوونی زەکاتی زێڕو زیو و پارە ئەمەیە: (الْحَوْلُ) ساڵێکی بە سەردا بسووڕێتەوەو هەر لە ملکایەتی خاوەنەکەی‌دابێ، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەدا بەڵگەمان هێناوە، واتە: هەرچەندەش لە لای خۆی نەبێ:

بۆ وێنە: ئەگەر بە ڕادەی زەکات پارەی هەبێ، ئینجا لە دوای شەش مانگ بە قەرز بیداتە یەکێکی‌تر، ئەوە ساڵەکەی ناپچڕێ، چونکە لە ملکایەتی وی دەرنەچوە، کەوابو: لە دوای شەش مانگی‌تر ساڵەکەی تەواو دەبێ‌و واجبە: زەکاتەکەی لێبدا، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر قەرزدارەکەش ساڵێکی‌تەواو خودی‌پارەکەی لە لا بمێنێتەوە، ئەویش لە سەری واجبە: زەکاتی پارەکە بدا، هەروەك لە (إعانة)دا فەرموویەتی، واتە: چونکە لەو حاڵەتەدا بە گەنجینە دادەندرێ، هەروەك لە (ئاگاداری)ی سەرەتاو پێش ئێرەدا ڕوونمان کردەوە.

ئینجا بزانە: هەر قەرزێك–لە پێش وەرگرتنەوەدا– واجب بێ زەکاتی بدرێ، ئەوە ڕادەی زەکاتی ئەو پارەیەشی پێ تەواو دەکرێ: کە لە لای خۆیەتی، ئینجا کە ساڵێکیان

وَلاَ زَكَــــــاةَ فِـــــــي سَــــــائِرِ الْجَـــــــوَاهِرِ كَـــــــاللُّؤْلُؤِ.

## (بابُ زَكَاةِ الْمَعْدِنِ وَالرِّكَازِ وَالتِّجارَةِ)

مَنِ اسْتَخْرَجَ ذَهَباً أَوْ فِضَّةً مِنْ مَعْدِنٍ لَزِمَهُ رُبُعُ عُشْرِهِ، وَفِي قَوْلٍ الْخُمُسُ وَفِي قَـوْلٍ إِنْ حَصَلَ بِتَعَبٍ فَرُبُعُ عُشْرِهِ

---

به سه‌ردا سوڕاوه، واجبه: زه‌كاتی هه‌ردووكیان بدا، به‌ڵام ئه‌گه‌ر زه‌كاتی قه‌رزه‌كه ئێستا واجب نه‌بێ، ئه‌وه ته‌نها زه‌كاتی پاره‌كه‌ی لای‌خۆی ده‌داو كه قه‌رزه‌كه‌شی وه‌رگرته‌وه، ئه‌و كاته زه‌كاته‌كه‌ی ده‌دا:

بۆ وێنه: ئه‌گه‌ر سه‌د دیرهه‌می‌زیوی به قه‌رز دابو و سه‌دی‌تریشی له لای‌خۆی بوو، ئه‌وه ڕاده‌ی زه‌كاتیان به یه‌كتری ته‌واو ده‌بێ‌و واجبه: پێنج دیرهه‌م له زه‌كات بدا، ئه‌گه‌ر قه‌رزه‌كه‌ی له سه‌ر مرۆڤێكی‌هه‌بوویی بێ‌و بیداته‌وه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر له سه‌ر یه‌كێكی نه‌بوویی بێ، یان نه‌یداته‌وه، ئه‌وه ته‌نها له زه‌كاته‌كه‌ی‌سه‌د دیرهه‌می لای‌خۆی دوو دیرهه‌م‌و نیو ده‌دا، زه‌كاته‌كه‌ی سه‌د دیرهه‌مه‌كه‌ی قه‌رزیش هه‌ر كاتێك وه‌ری‌گرته‌وه ده‌یدا، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

(وَلاَزَكَاةَ فِيسَائِرِالْجَوَاهِرِ) زه‌كات واجب نی‌یه له هیچ گه‌وهه‌رێكی‌تری به نرخ‌و جواندا جگه له زێڕو زیو (كَاللُّؤْلُؤِ) وه‌ك لوئلوء‌و یاقوت‌و مه‌رجان‌و ئه‌ڵماس‌و زوبه‌رجه‌دو ستیل‌و ئاسن‌و مس‌و شوشه‌و ئه‌و جۆره شتانه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ماڵی بازرگانی بون، ئه‌و كاته زه‌كاتی بازرگانیان تێ‌دا واجبه، هه‌روه‌ك له باسی بازرگانی‌دا ڕوونی ده‌كه‌ینه‌وه، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

## ﴿ بابُ زَكَاةِالْمَعْدِنِ وَالرِّكَازِ وَالتِّجارَةِ: **زه‌كاتی كانگه‌و گه نجینه‌و بازرگانی** ﴾

### ١- (زه‌كاتی كانگه‌ی زێڕو زیو)

(مَنِ اسْتَخْرَجَ ذَهَباً أَوْ فِضَّةً) هه‌ر كه‌سێك زێڕ، یان زیو بهێنێته ده‌ره‌وه (مِنْ مَعْدِنٍ) له كانگه‌یه‌ك، كانگه‌كه‌ش له ملكی خۆی‌دابو، یان له شوێنێكی‌گشتی‌ی بێ‌خاوه‌ندابو، ئه‌وه زێڕو زیوه‌كه ده‌بێته ملكی خۆی، كه‌وابو: (لَزِمَهُ) زه‌كاتی ئه‌و زێڕو زیوه‌ی له سه‌ر واجبه، به به‌ڵگه‌ی (إجماع)، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا فه‌رموویه‌تی، هه‌م به به‌ڵگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی داهاتووش، ئینجا ئه‌ندازه‌ی زه‌كاته‌كه‌ش له سه‌ر فه‌رمووده‌ی ڕاست: (رُبُعُ عُشْرِهِ) چوارێكی ده‌یه‌كی ده‌رهێندراوه‌كه‌یه، واته: له بیست میسقالی زێڕدا: نیو میسقال، له دوو سه‌د دیرهه‌می زیودا: پێنج دیرهه‌م، به به‌ڵگه‌ی حه‌دیسه‌كه‌ی‌ڕابردوو له زێڕو زیودا.

(وَفِي قَوْلٍ) له فه‌رمووده‌یه‌كدا (اَلْخُمُسُ) پێنجێكی ده‌رهێندراوه‌كه واجبه: له زه‌كاتی‌دا بدرێ (وَفِي قَـوْلٍ) له فه‌رمووده‌یه‌كی تردا (إِنْ حَصَلَ بِتَعَبٍ) ئه‌گه‌ر ده‌رهێندراوه‌كه به ماندووبوون وه‌ده‌ست بكه‌وێ (فَرُبُعُ عُشْرِهِ) ئه‌وه چوارێكی ده‌یه‌كی له زه‌كاتی‌دا ده‌درێ.

**وَإِلاَّ فَخُمُسُهُ، وَيُشْتَرَطُ النِّصَابُ لاَ الْحَوْلُ علَىالْمَذْهَبِ فِيهِمَا، وَيُضَمُّ بَعْضُهُ إِلَى بَعْضٍ إِنْ تَتَابَعَ الْعَمَلُ،**

---

(وَإِلا) بەلام ئەگەر بێماندوبوون وەدەستی بکەوێ (فَخُمُسُهُ) ئەو کاتە پێنجیەکی لە زەکاتیدا دەدرێ.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ واجببوونی زەکاتی دەرهێنراوی کانگە بە مەرج دادەندرێ: (اَلنِّصَابُ) زێڕەکە، یان زیوەکە بگاتە ڕادەی زەکات (لاَ الْحَوْلُ) بەلام سوڕانەوەی ساڵ –لە زەکاتی کانگەدا– بە مەرج داناندرێ، بەڵکو هەر بە خودی وەدەستکەوتن زەکاتی واجب دەبێ (علَى الْمَذْهَبِ فِيهِمَا) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەبی لە هەردوو مەسەلەکەدا.

ئینجا لە سەر دەرهێنەرەکە واجبە: بە ماڵیخۆی زێڕو زیوەکە لە خڵتو خۆڵ جیا بکاتەوەو پوختەی بکاو لە زەکاتدا بیدا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ بِلاَلِ بنِ الحَـرْثِ الْمُزَنِي﷛: أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَخَذَ مِنْ مَعَـادِنِ الْقَبَلِيَّـةِ اَلصَّـدَقَةَ﴾رواه مالك والشافعي وأبوداود وصححه الحاكم، پێغەمبەرﷺ لە کانگەکانی (القبلية) زەکاتی وەرگرت.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر کانگەکە لە زەویی کەسێکیتردا بوو، ئەو کاتە ئەو زێڕو زیوەی دەریهێناوە، هی خاوەنی زەوییەکەیەو واجبە بیداتەوە ئەوی، ئینجا کە ئەویش وەریگرتەوە، واجبە: زەکاتەکەی بدا، بەلام ئەگەر موسڵمانێك زەویەکی لە یەکێکیتر کڕی، ئینجا کانگەکەی تێدا وەدەر کەوت، ئەو کانگەیەش دەبێتە ملکی کڕیارەکە، جا ئەگەر حەز بکا دەریدێنێ، ئەگەر نا: وازی لێدێنێ، واتە: کەسیتر مافی بە سەردا نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو دوو مەسەلەیە ڕوون کراونەوە.

هەروەها بزانە: جگە لە زێڕو زیو، هیچ شتێکیتری دەرهێنراو لە کانگەکاندا زەکاتی تێدا نیە، هەرچەند زۆر بە نرخیش بێ، هەروەها ئەگەر دەرهێنەرەکە زەکاتی لە سەر نەبو: وەکو کافرو کۆیلە، ئەوانە زەکاتی کانگەشیان لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: بەو مەرجەی کافرەکە پێش قەدەغەکردن کانگەکەی دەرهێنابێ، چونکە نابێ کافری پەیمان لە ئەستۆش ڕێگەی بدرێتێ لە (دارالإسلام)دا گەنجینە، یان کانگە دەربێنێ، جا بزانە: ئەگەر دوو کەس، یان زیاتر بە ڕادەی زەکات لە کانگەیەك دەربێنن، ئەو کاتە واجبە: پێکەوە–وەك ماڵی تێکەڵاو– زەکاتەکەی بدەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کرانەوە.

(وَيُضَـمُّ) بۆ تەواوکردنی ڕادەی زەکات کۆدەکرێتەوە (بَعْضُـهُ إِلَـى بَعْـضٍ) بەشێکی دەرهێندراوەکە لەگەڵ بەشێکیتر (إِنْ تَتَابَعَ الْعَمَلُ) بەو مەرجەی: کارکردن لە کانگەکەدا بە دوای یەکتردا بێو دەرهێندراوەکەش یەك ڕەگەز بێو شوێنی لێدەرهێندرانەکەش یەك شوێن بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە

وَلاَ يُشْتَرَطُ اتِّصَالُ النَّيْلِ عَلَى الْجَدِيد، وَإِذَا قَطَعَ الْعَمَلَ بِعُذْرٍ ضُمَّ، وَإِلاَّ فَلاَ يَضُمُّ الأَوَّلَ إِلَى الثَّانِي، وَيَضُمُّ الثَّانِي إِلَى الأَوَّلِ كَمَا يَضُمُّهُ إِلَى مَا مَلَكَهُ بِغَيْرِ الْمَعْدَنِ فِي إِكْمَالِ النِّصَابِ. وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ، يُصْرَفُ مَصْرِفَ الزَّكَاةِ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَشَرْطُهُ النِّصَابُ،

---

(وَلاَ يُشْتَرَطُ اتِّصَالُ النَّيْلِ) به مەرج دانانرێ: بێپچڕان ڕادەی زەکاتەکەی دەست بکەوێ (عَلَى الْجَدِيدِ) لە سەر فەرموودەی نوێ.

(وَإِذَا قَطَعَ الْعَمَلَ بِعُذْرٍ) هەر کاتێك بە هۆی عوزرێك وازی لە کارکردن هێنا، ئینجا دەستی بە کار کردەوە (ضُمَّ) ئەو کاتەش بەشەکان لەگەڵ یەکتری کۆ دەکرێنەوە: بۆ تەواوکردنی ڕادەی زەکات (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر واز لە کارهێنانەکەی بە عوزر نەبو (فَلاَ يَضُمُّ الأَوَّلَ إِلَى الثَّانِي) ئەو کاتە بەشی جارییەکەم لەگەڵ جاری دووەمدا کۆ ناکرێتەوە، بەڵام (وَيَضُمُّ الثَّانِي إِلَى الأَوَّلِ) بەشی جاریدووەم لەگەڵ بەشی جارییەکەم کۆ دەکرێتەوە: بۆ تەواوکردنی ڕادەی زەکات:

بۆ وێنە: ئەگەر جارییەکەم پەنجا دیرهەمی زیوی دەست کەوت، جاری دووەمیش سەدو پەنجای دەست کەوت، ئەوە پەنجایەکەی جارییەکەم ئێستا زەکاتی تێدا نیە، بەڵام سەدو پەنجایەکەی جاری دووەم بە ئەندازەی خۆی هەر ئێستا زەکاتی تێدا واجبە.

(كَمَا يَضُمُّهُ) هەروەك دەرهێندراوەکەی کانگە کۆ دەکاتەوە (إِلَى مَامَلَكَهُ) لەگەڵ ئەو زێڕە، یان زیوەی هەیەتی (بِغَيْرِ الْمَعْدِنِ) بە هۆیەکیتری جگە لە کانگە: وەك کڕین، یان میرات (فِي إِكْمَالِ النِّصَابِ) لە تەواوکردنی ڕادەی زەکاتدا:

بۆ وێنە: ئەگەر لەماڵەوە سەد دیرهەمی زیوی هەبو، لە کانگەش سەدیتری دەست کەوت، ئەوە ڕادەی زەکاتی سەدەکەی کانگە بە سەدەکەی ماڵەوە تەواو دەکرێو هەر ئێستا زەکاتی سەدەکە دەدا، ئینجا کە ساڵێك سوڕاوە زەکاتی سەدەکەی ماڵەوەش دەدا، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ٢- (زەکاتی گەنجینەی دۆزراوە)

﴿وَفِي الرِّكَازِ الْخُمُسُ﴾ رواه الشيخان، لە گەنجینەی دۆزراوەدا: پێنجێك واجبە لە زەکاتیدا بدرێ. (يُصْرَفُ مَصْرِفَ الزَّكَاةِ) ئەو پێنجێکەش -وەکو کانگە- دەدرێتە ئەو هەشت جۆرانەی زەکات (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب (وَشَرْطُهُ) مەرجی واجبوونی زەکاتی گەنجینەی دۆزراوە، ئەوەیە: (النِّصَابُ) بگاتە ڕادەی زەکات، جا هەر بەخۆی بگاتە ڕادەی زەکات، یان بە هۆی کۆکردنەوەی لەگەڵ گەنجینەیەکیتر، یان لەگەڵ ئەو زێڕو زیوەی لە ماڵەوە هەیەتی، وەك ئەو درێژەپێدانەی لە کانگەدا ڕوون کراوە، هەروەك لە سەر چاوەکاندا فەرموویانە.

وَالنَّقْدُ عَلَى الْمَذْهَب، لاَ الْحَوْلُ، وَهُوَ الْمَوْجُودُ الْجَاهِلِيُّ، فَإِنْ وُجِدَ إِسْلاَمِيٌّ عُلِمَ مَالِكُهُ فَلَهُ، وَإِلاَّ فَلُقَطَةٌ، وَكَذَا إِنْ لَمْ يُعْلَمْ مِنْ أَيِّ الضَّرْبَيْنِ هُوَ، وَإِنَّمَا يَمْلِكُهُ الْوَاجِدُ وَتَلْزَمُهُ الزَّكَاةُ إِذَا وَجَدَهُ فِي مَوَات أَوْ مِلْك أَحْيَاهُ،

---

(وَالنَّقْدُ) هەروەها مەرجە: گەنجینە دۆزراوەکەش: زێڕ، یان زیو بێ (عَلَى الْمَذْهَب) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، واتە: جگە لەگەنجینەی زێڕو زیو هیچ گەنجینەیەکی‌تر زەکاتی تێدانیە (لاَ الْحَوْلُ) بەلاّم بە بەلگەی (اجماع): سوڕانەوەی ساڵ مەرج نیە، واتە: هەر ئەو کاتەی گەنجینەکەی دۆزیەوە، واجبە: پێنجێکی لە زەکاتی‌دا بدا.

(وَهُوَ) گەنجینەی دۆزراوە (الْمَوْجُودُ الْجَاهِلِيُّ) زێڕو زیوی دەستکەوتووی سەردەمی نەفامی‌ی پێش هاتنی ئیسلامە: کە لە زەمیندا شاردرابێتەوە، کەوابو: (فَإِنْ وُجِدَ إِسْلاَمِيٌّ) ئەگەر گەنجینەیەکی سەردەمی ئیسلام دۆزراوە: وەك قورئانی لە سەر نووسرابێ، یان ناوی پاشایەکی مۆسوڵمانی لێ‌نووسرابێ، یان نیشانەیەکی‌تری لە سەربێ، ئەوە ئەگەر (عُلِمَ مَالِكُهُ) زاندرا: خاوەنی گەنجینەکە کێیە (فَلَهُ) ئەوە هی خاوەنەکەیەتی‌و واجبە بیدرێتەوە (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر نەزاندرا: خاوەنی کێیە، ئەوە (فَلُقَطَةٌ) وەك ماڵی ونبوو ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، واتە: ساڵێك بانگەوازی‌ی بۆ دەکا، ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی دەست نەکەوت، دروستە بیکاتە ملکی خۆی.

(وَكَذَا) هەروەها گەنجینەکە: وەك ماڵی ونبوو ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ (إِنْ لَمْ يُعْلَمْ مِنْ أَيِّ الضَّرْبَيْنِ هُوَ) ئەگەر نەزاندرێ: لە کام سەردەمدا دروست کراوە، وەك خشڵ بێ، یان پارچەیەکی بێ نیشانە بێ.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو گشتی دەربارەی ئەو گەنجینەیە بوو: کە ئیسلامی بێ‌و لە شوێنە گشتیەکانی بێ‌خاوەندا بدۆزرێتەوە، چونکە ئەگەر گەنجینەی ئیسلامی لە ملکی کەسێکدا بدۆزرێتەوە، ئەو کاتە گەنجینەکە هی خاوەنی ملکەکەیەو واجبە: بۆی بپارێزرێ تا دەیدرێتەوە، جا ئەگەر خاوەنەکەی دەست نەکەوتو لێی بێ‌ئومێد بوین، ئەو کاتە گەنجینەکە-وەکو ماڵی بێ‌خاوەن- دەبێتە هی (بیت المال)، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَ) هەروەها بزانە: گەنجینەی سەردەمی نەفامی‌ی پێش ئیسلامیش (إِنَّمَا يَمْلِكُهُ الْوَاجِدُ) هەر بەو مەرجە دەبێتە ملکی ئەو کەسەی دۆزیویەتیەوەو (وَتَلْزَمُهُ الزَّكَاةُ) زەکاتیشی لە سەر واجب دەبێ: (إِذَا وَجَدَهُ فِي مَوَات) هەر کاتێك لە شوێنێکی گشتی وەهادا بیدۆزێتەوە: کە مردوو بێ، واتە: هیچ موسوڵمانێك ئەو شوێنەی نەکردبێتە ملکی‌خۆی، یان لە کاولکەو قەلاّتو گۆڕستانی کافرەکاندا بیدۆزێتەوە (أَوْ مِلْكٍ أَحْيَاهُ) یان لە شوێنێکی

فَإِنْ وُجِدَ فِي مَسْجِدٍ أَوْ شَارِعٍ فَلُقَطَةٌ عَلَى الْمَذْهَبِ، أَوْ فِي مِلْكِ شَخْصٍ فَلِلشَّخْصِ إِنْ ادَّعَاهُ، وَإِلاَّ فَلِمَنْ مُلِكَ مِنْهُ وَهَكَذَا حَتَّى يَنْتَهِيَ إِلَى الْمُحْيِي، وَلَوْ تَنَازَعَهُ بَائِعٌ وَمُشْتَرٍ أَوْ مُكْرٍ وَمُكْتَرٍ أَوْ مُعِيرٌ وَمُسْتَعِيرٌ صُدِّقَ ذُو الْيَدِ بِيَمِينِهِ.

---

وەهادا بیدۆزێتەوە: کە بەخۆی زیندووی کردبێتەوەو کردبێتیە ملکیخۆی، واتە: تەنها لەو دوو حاڵەتەدا گەنجینەکە دەبێتە ملکیخۆی، کەوابو: ئەگەر شوێنەکە (وقف)کرابوە سەر مزگەوت، یان ڕووێکیتری گشتی، ئەو کاتەش گەنجینەکە بۆ مزگەوتو ڕووە گشتیەکە سەرف دەکرێ، هەروەك لە (تحفە)دا فەرموویەتی.

بەلاّم (فَإِنْ وُجِدَ) ئەگەر گەنجینەکەی سەردەمی نەفامی دۆزراوە (فِي مَسْجِدٍ) لە مزگەوتێکدا (أَوْ شَارِعٍ) یان لە ڕێگەیەکدا (فَلُقَطَةٌ) ئەوەش-وەك گەنجینەی ئیسلامی- بە ماڵی ونبوو دادەندرێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب، کەواتە: ساڵێك بانگەوازیی بۆ دەکا، جا ئەگەر خاوەنەکەی دەست نەکەوت دروستە بیکاتە ملکیخۆی، بەلاّم لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەمەش بە گەنجینەی دۆزراوە دادەندرێ.

(أَوْ فِي مِلْكِ شَخْصٍ) یان گەنجینەکەی سەردەمی نەفامی لە ملکی کەسێکدا دۆزرایەوە (فَلِلشَّخْصِ) ئەو گەنجینەیەش-وەکو گەنجینەی ئیسلامی- هی خاوەنی ملکەکەیە (إِنْ ادَّعَاهُ) ئەگەر داوای بکا: بە بێسوێند دەیدرێتەوە (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر داوای نەکرد، وەك بلێ: نامەوێ، یان هی من نیە، ئەو کاتە (فَلِمَنْ مُلِكَ مِنْهُ) گەنجینەکە هی ئەو کەسەیە: کە ملکەکەی لێوەرگیراوە، جا ئەگەر مردبو: میراتگرەکانی دەبنە جێگری، ئەگەر ئەوانیش داوایان نەکرد، گەنجینەکە هی ئەو کەسەیە: کە لە پێش ئەواندا خاوەنی ملکەکە بووە (وَهَكَذَا) هەر بەو جۆرە بە دوای خاوەنەکەدا دەگەڕێ (حَتَّى يَنْتَهِيَ إِلَى الْمُحْيِي) تا دەگاتە ئەو کەسەی یەکەمجار ملکەکەی زیندوو کردۆتەوە، یان میراتگرەکانی.

ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی یەکەمیش نەدۆزراوەو لێی بێ ئومێد بون، ئەو کاتە پێشەوای موسوڵمانان-یان هەر ئەو کەسەی دۆزیویەتیەوە- دەیکاتە خێر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا ئەگەر ئەو کەسەی دۆزیویەتیەوە مافی لە (بیت المال)دا هەبو، دروستە: وەکو هەژارێك بەشێکیش بۆ خۆی دابنێ، هەروەك لە (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ تَنَازَعَهُ) ئەگەر لە ملکێکدا لە سەر گەنجینەکە بووە کێشەیان: (بَائِعٌ وَمُشْتَرٍ) کڕیارێكو فرۆشیارێك (أَوْ مُكْرٍ وَمُكْتَرٍ) یان بەکرێدەرو بەکرێگر (أَوْ مُعِيرٌ وَمُسْتَعِيرٌ) یان ئەو کەسەی ملکەکەی بە خواستن داوەو ئەوەی بە خواستن وەریگرتوە (صُدِّقَ ذُو الْيَدِ) ئەوە خاوەن دەست: کە کڕیارو بەکرێگرو بەخواستن وەرگرە، باوەڕی پێدەکرێ (بِيَمِينِهِ) بە سوێندخواردن، وَاللهُ أَعْلَم.

(فَصْلٌ) شَرْطُ زَكَاةِ التِّجَارَةِ اَلْحَوْلُ وَالنِّصَابُ مُعْتَبراً بآخرالْحَوْلِ، وَفِي قَولٍ بطَرَفَيْهِ، وَفِي قَوْلٍ بجَمِيعِه، فَعَلَىالأَظْهَرِ لَوْ رُدَّ إِلَىالنَّقْدِ فِي خِلاَلِ الْحَوْلِ وَهُوَ دُونَ النِّصَابِ وَاشْتَرَى بِهِ سِلْعَةً فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَنْقَطِعُ الْحَوْلُ وَيُبْتَدَأُ حَوْلُهَا مِنْ شِرَائِهَا،

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی زەكاتی بازرگانی ﴾

واتە: ئاڵوگۆڕكردنی ماڵ بە مەبەستی قازانج كردن. ئینجا بزانە: بە (اجماع)ی زۆرترینی زانایانی ئیسلام: زەكاتی كەلوپەلی بازرگانی واجبە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فِى الإِبِلِ صَدَقَتُهَا وَفِى الْغَنَمِ صَدَقَتُهَا وَفِى الْبَقَرِ صَدَقَتُهَا وَفِى الْبَزِّ صَدَقَتُهُ﴾رواه الدارقطني والبيهقي وصححه الحاكم على شرط الشيخين، ووشتر زەكاتی خۆی تێدایە، كارەگەل زەكاتی خۆی تێدایە، مانگا زەكاتی خۆی تێدایە، جلو بەرگی بازرگانیش زەكاتی خۆی تێدایە.

(شَرْطُ زَكَاةِالتِّجَارَةِ) مەرجی واجببوونی زەكاتی بازرگانی ئەمەیە: (اَلْحَوْلُ) ساڵێكی ئیسلامی بە سەردا بسوڕێتەوەو (وَالنِّصَابُ) بشگاتە ڕادەی زەكات، واتە: نرخی دووسەد دیرهەمی زیو، كە دەكاتە (١٤٠) سەدو چل میسقالی زیو (مُعْتَبَراً) لە سەر فەرموودەی بەهێزتر: ڕادەی زەكات ڕەچاو دەكرێ (بِآخِرِالْحَوْلِ) لە ئاخیری ساڵدا، چونكە كۆتایی ساڵ كاتی واجببوونی زەكاتە، واتە: ئەگەر لە سەرەتاو لە ناوەندیساڵدا نرخی كەلوپەكە لە ڕادەی زەكات كەمتر بوو، بەلاَم لە كۆتایی ساڵدا نرخەكەی گەیشتە ڕادەی زەكات، ئەوە زەكاتی تێدا واجبە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی (وَفِىقَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا (بِطَرَفَيْهِ) لە سەرەتاو ئاخیری ساڵدا ڕەچاودەكرێ (وَفِىقَوْلٍ) لە فەرموودەیەكیتردا (بِجَمِيعِهِ) لە هەموو ساڵەكەدا ڕەچاو دەكرێ، بەلاَم ئەو دووانە بێهێزن.

(فَعَلَىالأَظْهَرِ) جا لە سەر فەرموودەی یەكەمی بەهێزتر: (لَوْ رُدَّ إِلَىالنَّقْدِ) ئەگەر گشت كەلوپەلی بازرگانی كراوە پارە (فِى خِلاَلِ الْحَوْلِ) لە ناوەوەی ساڵدا، واتە: پێش سوڕانەوەی ساڵ گشتی بەو جۆرە پارەیە فرۆشتەوە: كە پێی دەقرسێندرێ (وَهُوَ دُونَ النِّصَابِ) پارەكەش لە ڕادەی زەكات كەمتر بوو، جگە لەو پارەیەش هیچ پارەیتری نەبو ڕادەی زەكاتی پێ تەواو بكا، ئینجا (وَاشْتَرَىَ بِهِ سِلْعَةً) هەر بەو پارەیەش كەلوپەلێكیتری بۆ بازرگانی كڕیەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ يَنْقَطِعُ الْحَوْلُ) ئەم ساڵەی دەپچڕێو (وَيُبْتَدَأُ حَوْلُهَا مِنْ شِرَائِهَا) سەرە ساڵی كەلوپەلە نوێیەكە لە كڕینیەوە دەست پێدەكاتەوە.

بەلاَم ئەگەر گشت كەلوپەلی بازرگانیی نەكردەوە پارە، بەلكو بە شێكی كەمی هێشتەوە، یان گشتی كردەوە پارە، بەلاَم پارەكەی گەیشتە ڕادەی زەكات، یان ئەو پارەیە بە تەنها نەگەیشتە ڕادەی زەكات بەلاَم جگە لەو پارەیە هەندێك پارەیتری هەبو

وَلَوْ تَمَّ الْحَوْلُ وَقِيمَةُ الْعَرْضِ دُونَ النِّصَابِ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُبْتَدَأُ حَوْلٌ، وَيَبْطُلُ الأَوَّلُ، وَيَصِيرُ عَرْضُ التِّجَارَةِ لِلْقِنْيَةِ بِنِيَّتِهَا، وَإِنَّمَا يَصِيرُ الْعَرْضُ لِلتِّجَارَةِ إِذَا اقْتَرَنَتْ نِيَّتُهَا بِكَسْبِهِ بِمُعَاوَضَةٍ كَشِرَاءٍ،

---

لەگەڵ ئەوەیتر دەگەیشتنە ڕادەی زەکات، لەو حاڵەتانەدا ساڵەکەی ناپچڕێو هەر بەردەوام دەبێ، هەروەك لە (بجيرمي)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ تَمَّ الْحَوْلُ) ئەگەر ساڵی بازرگانی تەواو بوو (وَقِيمَةُ الْعَرْضِ دُونَ النِّصَابِ) نرخی كەلوپەلی بازرگانیەکەش لە ڕادەی زەکات کەمتر بوو: وەك قازانجی نەکردبێ، یان نرخی بازاڕ دابەزی بێو زەرەری كردبێ، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ پارەیتریشی نەبو ڕادەی زەکاتی پێ تەواو بکا (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ يُبْتَدَأُ حَوْلٌ) لێرەوە دووبارە ساڵێکیتر دەست پێدەکاتەوەو (وَيَبْطُلُ الأَوَّلُ) ساڵەکەی یەکەمی بەتاڵ دەبێتەوە، واتە: زەکاتەکەی ساڵی یەکەم واجب نیە، بەڵکو کە ساڵێکیتر سوڕاوەو نرخەکەی گەیشتە ڕادەی زەکات، ئەو کاتە زەکاتی لێدەدا، بەڵام ئەگەر لە سەرەتای ساڵی یەکەمەوە هەندێ پارەیتری هەبو و لەگەڵ نرخەکەی کەلوپەلیبازرگانی ڕادەی زەکاتی پێ تەواو دەبو، ئەو کاتە ساڵەکەی بەتاڵ نابێو واجبە: زەکاتەکەی بدا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَصِيرُ عَرْضُ التِّجَارَةِ لِلْقِنْيَةِ) کەلوپەلی بازرگانی دەبێتە کەلوپەلی ڕاگرتنو زەکاتی لە سەر لادەچێ (بِنِيَّتِهَا) بە نیەتی ڕاگرتنەکە، واتە: هەر کاتێك نیەتی هێنا: گشت کەلوپەلەکەی بازرگانی دابنێ بۆ بەکارهێنانو سوود لێوەرگرتن، ئەوە لەو کاتەوە ساڵەکەی دەپچڕێو زەکات لە سەر گشتی لادەچێ، هەروەها ئەگەر نیەتی دانانی بەشێکی کەلوپەلەکەش بێنێ بۆ بەکارهێنانو سوود لێوەرگرتن، ئەوە ساڵی ئەو بەشە دەپچڕێو زەکات لە سەر ئەو بەشە لادەچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگەر کەلوپەلێکی بازرگانی بەکار بێنێو نیەتی ڕاگرتنی نەبێ، ئەوە هەر بە ماڵی بازرگانی دادەنرێو زەکاتی لە سەر لاناچێ، هەروەك لە (مغنی)و (الشرواني)دا فەرموویانە، ئینجا ئەگەر بیەوێ: ماڵە داندراوەکە بکاتەوە ماڵی بازرگانی، ئەوە پێویستە لەگەڵ ئاڵوگۆڕکردنیدا دووبارە نیەتی بازرگانی لێبێنێتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَإِنَّمَا يَصِيرُ الْعَرْضُ لِلتِّجَارَةِ) بەڵام کەلوپەل دەبێتە ماڵی بازرگانی، تەنها (إِذَا اقْتَرَنَتْ نِيَّتُهَا) بەو مەرجەی نیەتی بازرگانیەکە بەرامبەر بێ (بِكَسْبِهِ) لەگەڵ وەدەستهێنانی کەلوپەلەکە (بِمُعَاوَضَةٍ) وەدەستهێنانەکەش لە بەرامبەر شتێك بێ (كَشِرَاءٍ) وەکو کڕینی

وَكَذَا الْمَهْرُ وَعِوَضُ الْخُلْعِ فِيالأَصَحِّ، لاَ بِالْهِبَةِ وَالإِحْتِطَابِ وَالإِسْتِرْدَادِ بِعَيْبٍ،

کەلوپەلەکە بە مەبەستی بازرگانی: جا بە قەرز بێ، یان هەر ئەو دەم پارەکە بدا، یان کڕینەکە بە کەلوپەلێکی‌تری جگە لە پارە بێ.

(وَكَـذَاالْمَهْرُ) هـەروەهاش مـارەیی: وەك ئافرەتەکـە لـە کاتیمـارەبڕینی‌دا مەبەستی‌بێ: بازرگانی بە مارەییەکەی بکا (وَعِوَضُ الْخُلْعِ) هەروەهاش ئەو ماڵەی لە بەرامبـەر تەڵاقـدانی ژنەکەی وەردەگرێ: وەك لە کاتی تەڵاقداندا مەبەستی بێ: بازرگـانی بـە ماڵەکـە بکـا (فِـي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە ئەو دووانەش لە بەرامبەر شتێك وەرگیراون.

(لاَ بِالْهِبَةِ) نەك ئەو ماڵەی بە بەخشین وەدەستی کەوتوە (وَالإِحْتِطَابِ) هـەم بـە دارهێنـان‌و پووش هێنان‌و ڕاوکردن‌و میرات وەرگرتن‌و ئـەو جـۆرە کارانـە (وَالإِسْتِرْدَادِ بِعَيْبٍ) هـەم بـە ماڵ وەرگرتنەوە بە هۆی عەیبداری، ئەوانە هیچیان نابنە ماڵی بازرگانی، هەرچـەند نیـەتی بازرگانیشی هەبێ، چونکە لە بەرامبەر هیچ شتێك وەرنەگیراون.

کەوابو: ئەگەر ئەو ماڵەی بەو هۆیانەیڕابردوو دەستی کـەوتوە–بە مەبەستی بازرگـانی– بـە شـتێکی‌تری فرۆشـت، ئـەو کاتـە شـتەکەی‌تر دەبێتـە مـاڵی بازرگـانی، یـان ئەگـەر بـەو هۆیانەیڕابردوو پارەی وەدەست کـەوت‌و سـاڵێکی بـە سـەردا سوڕاوە، ئـەو کاتـە واجبـە: زەکاتی پارەکە بدا، هەروەك لە شوێنی‌خۆی‌دا ڕوون کراوە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾ یەکـەم: ئەگەر مرۆڤێك–بە مەبەستی بازرگانی– خودی خۆی بـە کـرێ بـدا، یان ماڵێکی خۆی بە کرێ بدا، یان ماڵی کەسێکی‌تر بە کرێ بگرێ‌و بـە مەبەسـتی بازرگـانی بە کرێی بداتەوە، ئەوانەش گشـتی بـە بازرگـانی دادەنـدرێن، هـەروەك لـە سەرچـاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: هەر کاتێك ساڵ سـوڕاوەو کرێیەکـەش هـەر لـە مڵکایـەتی خۆی‌دابو، واتە: سەرف نەکردبێ و دەشگەیشتە ڕادەی زەکات، ئەوە واجبـە: زەکـاتی کرێیەکـە بـدا، جیاوازی نیە: کرێیەکەی وەرگرتبێ، یان قـەرز بـێ، بـەڵام ئەگـەر پـێش تـەواوبوونی سـاڵ کرێیەکـەی سـەرف کردبـو و لـە مڵکایەتی‌یدا نـەمابو، یـان بـە ئەنـدازەی ڕادەی زەکـات نەمابو، ئەو کاتە زەکاتی تێ‌دا نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر خانووێك، یان زەویەکی بە کرێ گرتبو تاکو بـە مەبەستی بازرگـانی بـە کرێی بداتەوە، بەڵام ساڵ تەواو بوو و هێشتا بـە کـرێی نـەدابو، لـەو حاڵەتەشـدا واجبـە: زەکاتی بازرگانی بدا، واتە: کـرێی هاووێنـەی ئـەو خـانووە، یـان ئـەو زەوی‌یـە بـۆ مـاوەی ساڵێك چەندە؟ زەکاتی ئەو ئەندازەیە دەدا، هـەروەك لـە (تحفـة)و(الشـرواني)دا نـاوەڕۆکی ئەو ئاگاداری‌یە ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر سبوغی کڕی تاکو شتومەکی خەڵکی–بـە پـارە– پـێ سبوغ بکـا، ئـەوەش دەبێتە ماڵی بازرگانی‌و واجبە: زەکاتی لێ‌بدا، بەڵام ئەگەر سابوونی کڕی تـاکو جل‌وبـەرگی

وَإِذَا مَلَكَهُ بِنَقْد نصَاب فَحَوْلُهُ مِنْ حين مِلْك النَّقْد، أَوْ دُونَهُ أَوْ بِعَرْضِ قِنْيَة فَمِنَ الشِّرَاء، وَقِيلَ إِنْ مَلَكَهُ بِنِصَابِ سَائِمَةٍ بَنَى عَلَى حَوْلِهَا، وَيُضَمُّ الرِّبْحُ إِلَى الأَصْلِ فِي الْحَوْلِ إِنْ لَمْ يَنِضَّ،

---

خەڵكی پێ بشوا، ئەوە زەكات لە سابوونەكەدا نیە؟ چونكە خودی سابوونەكە ناكەوێتە دەستی كڕیار، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

كەوابو: دارو بزمارو شوشەی دارتاش‌و ئاسنی ئاسنگەرو گشت كەلوپەلی وەستاو سنعەتكاران: كە دەركەو پەنجەرەو سندوق‌و شتی‌تریان لێدروست دەكرێ، ئەوانەش گشتی بە ماڵی‌بازرگانی دادەندرێن‌و واجبە: زەكاتیان لێبدرێ، چونكە دەكەونە دەست كڕیار، بەڵام ئامێرو كەرەستەی پیشەسازی‌و كارپێكردن زەكاتی تێدا نیە، چونكە ئەوانەش -وەكو سابوون- ناكەونە دەستی كڕیارو، هەم لە كۆتایی زەكاتی ئاژەڵدا روونمان كردەوە، وَالْحَمْدُ لله تعالى.

(وَإِذَا مَلَكَهُ) هەر كاتێك كەلوپەلی بازرگانی‌ی كڕی (بِنَقْدِ نِصَابٍ) بە پارەیەكی وەها: كە دەگەیشتە ڕادەی زەكات، یان نەدەگەیشتێ بەڵام پارەی‌تری هەبو و بەویەوە دەگەیشتێ، ئەوە (فَحَوْلُهُ) سەرەتای ساڵی بازرگانیەكە دادەمەزرێ (مِنْ حِينِ مِلْكِ النَّقْدِ) لەو كاتەوە كە پارەكەی هەبووە، بۆ وێنە: لە ڕەمەزاندا بە نرخی دووسەد دیرهەمی زیو پارەی هەبو، ئینجا لە مانگی مەولوددا كەلوپەلێكی بازرگانی‌ی بەو هەموو پارەیە، یان بە بەشێكی ئەو پارەیە كڕی، ئەوە سەرە ساڵەكەی ئەو بازرگانیە لە ڕەمەزانەوە دامەزراوە.

(أَوْ دُونَهُ) یان كەلوپەلی بازرگانی‌ی بە پارەیەكی كەمتر لە ڕادەی زەكات كڕی‌و هیچ پارەی‌تریشی نەبو (أَوْ بِعَرْضِ قِنْيَةٍ) یان بە كەلوپەلی ماڵەوەی كەلوپەلی بازرگانی‌ی كڕی، یان بە قەرزی كڕی، ئەوە (فَمِنَ الشِّرَاءِ) لە هەرسێك مەسەلەدا لە كڕینیەوە سەرە ساڵ دەست پێدەكا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (إِنْ مَلَكَهُ بِنِصَابِ سَائِمَةٍ) ئەگەر كەلوپەلەكەی كڕی بێ: بە ڕادەی زەكاتی ئاژەڵی لەوەڕاو (بَنَى عَلَى حَوْلِهَا) ساڵی بازرگانی لە سەر ساڵی ئاژەڵەكان دادەمەزرێ، بەڵام لەبەر بێهێزی ڕەفتاری پێ ناكرێ.

(وَيُضَمُّ الرِّبْحُ) كۆ دەكرێتەوە: قازانجی كەلوپەلی‌بازرگانی (إِلَى الأَصْلِ) لەگەڵ سەرمایەكەو پێكەوە زەكاتیان لێدەدرێ (فِي الْحَوْلِ) لە كاتی تەواوبوونی ساڵی بازرگانی‌دا (إِنْ لَمْ يَنِضَّ) ئەگەر قازانجەكە گشتی نەبوبێتە پارە:

بۆ وێنە: لە مانگی(محرم)دا شتێكی كڕی بە نرخی دووسەد دیرهەمی زیو، ئینجا لە ناو ساڵدا، یان پێش تەواوبوونی ساڵ بە سەعاتێك، نرخی بووە سێسەد دیرهەم، ئەوە واجبە: زەكاتی سێسەد دیرهەمەكە بدا، ئیتر جیاوازی نیە قازانجەكە: بە هۆی بەرزبوونەوەی

لاَ إِنْ نَضَّ فِيالأَظْهَرِ، وَالأَصَحُّ أَنَّ وَلَدَ الْعَرْضِ وَثَمَرَهُ مَالُ تِجَارَةٍ، وَأَنَّ حَوْلَــهُ حَــوْلُ الأَصْلِ، وَوَاجِبُهَا رُبُعُ عُشْرِالْقِيمَةِ،

---

نرخی بازاڕ بێ، یان بە هۆی خودی کەلوپەلەکە بێ: وەك ئاژەڵەکانیبازرگانی گەورەو قەڵەو بوبن، هەروەك لە سەرچاوەکان ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

(لاَ إِنْ نَضَّ) نەك ئەگەر قازانجەکە گشتی بوبێتە پارە؟ ئەو کاتە لەگەڵ سەرمایەکە کۆ ناکرێتەوە، بەڵکو سەربەخۆی زەکاتی لێدەدرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا:

بۆ وێنە: بە نرخی دووسەد دیرهەمیزیو شتێکی کڕی، جا لە دوای شەش مانگ هەموو شتەکەی بە سێسەد دیرهەم فرۆشتو پارەکەشی هەڵگرت، یان شتێکیتری پێ کڕیەوە، ئەوە کە ساڵ سوڕاوە زەکاتی سەرمایەکەی -کە دووسەد دیرهەمە- دەدلو، لە دوای شەش مانگیتریش زەکاتی قازانجەکەی -کە سەد دیرهەمە- دەدا.

جا بزانە: ئەگەر ساڵ سوڕاوەو بازرگانیەکە هیچ قازانجی نەبو، ئەوە تەنها زەکاتی سەرمایەکە دەدا ئەگەر بگاتە ڕادەی زەکات، ئینجا ئەگەر لە دوای سوڕانەوەیساڵ قازانجی کرد، ئەو کاتە قازانجەکە بۆ ساڵیڕابردوو لەگەڵ سەرمایەکە کۆ ناکرێتەوە، بەڵکو بۆ ساڵی ئێستا کۆ دەکرێتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر ماڵی بازرگانیەکەی ئاژەڵ، یان میوەو خواردەمەنیەکانیتر بوو، ئەوە دوو حاڵەتی هەنە، یەکەم: وا دەبێ زەکات لە خودی ئاژەڵەکەو میوەکەو دانەوێڵەکەدا هەیە، ئەمەیان لە پێش کۆتایی ئەم باسەدا ڕوون دەکەینەوە،إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

دووەم: وا دەبێ زەکات لە خودی ئاژەڵەکەو میوەکەو خواردەمەنیەکانیتردا نیە: وەکو ئەسپو هێستر، یان هەنارو سێو، یان پەتاتەو تەماتەو خەیارو...هتد، ئەوانە تەنها زەکاتی بازرگانییان تێدا واجبە.

بەڵام (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە: (أَنَّ وَلَدَالْعَرْضِ) بێچووی ئاژەڵی بازرگانیو (وَثَمَرَهُ) میوەی درەختی بازرگانی، هەم بەری گیای بازرگانیو، هەم کاو کۆتو گشت بەرهەمێکیتریان (مَالُ تِجَارَةٍ) هەموویان ماڵی بازرگانینو زەکاتیان تێدا واجبە (وَأَنَّ حَوْلَهُ) تەواوبوونی ساڵی هەر یەکێکیان (حَوْلُ الأَصْلِ) تەواوبوونی ساڵی بنچینەکەیە، واتە: دایکەکەو درەختەکە، کەواتە: هەر کاتێك ساڵی بازرگانی بە سەر دایکەکانو بە سەر درەختەکاندا سوڕاوە، هەر ئەو کاتەش -لەگەڵ ئەواندا- زەکاتی بێچوو و میوەو بەرەکە دەدرێ.

(وَوَاجِبُهَا) ئەندازەی ئەو زەکاتەی لە بازرگانیدا واجب دەبێ (رُبُعُ عُشْرِ الْقِيمَةِ) چوارێکی دەیەکی نرخەکەیەتی، واتە: لە چل دیرهەمدا: یەك دیرهەم، لە سەدا: دوو و نیو، لە

فَإِنْ مُلِكَ بِنَقْدٍ قُوِّمَ بِهِ إِنْ مُلِكَ بِنِصَابٍ، وَكَذَا دُونَهُ فِي الأَصَحِّ، أَوْ بِعَرْضٍ فَبِغَالِبِ نَقْدِ الْبَلَدِ، فَإِنْ غَلَبَ نَقْدَانِ وَبَلَغَ بِأَحَدِهِمَا نِصَاباً قُوِّمَ بِهِ، فَإِنْ بَلَغَ بِهِمَا قُوِّمَ بِالأَنْفَعِ لِلْفُقَرَاءِ،

---

هەزاردا: بیستو پێنج، كەوابو: دروست نیە: خودی كەلوپەلی بازرگانی لە زەكاتدا بدا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، ئینجا بزانە: هەرچەندی لە ڕادەی زەكات زیاتر بێ، بەگوێرەی زێدەییەكەش زەكاتی لێدەدرێ، چونكە لە زەكاتی بازرگانیدا لێبوردن نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەها مەبەستیش لە نرخی بازرگانی: نرخی فرۆشتنەوەیەتی، نەك نرخی كڕینی، هەروەها ئەو نرخەش لە كۆتاییسالّدا ڕەچاو دەكرێ، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەو لە باسی قازانجدا ڕوونمان كردەوە، هەروەها بزانە: مەبەستیش بە نرخیفرۆشتنەوە ئەو نرخەیە: كە خەلّك لەو دەمەدا وێنەی ئەو كەلوپەلە بەو نرخە بكڕێ، هەروەك لە (الشبراملسي)دا ڕوون كراوەتەوە.

كەوابو: ئەگەر بازرگانەكە لە دوای سوڕانەوەیسالّ-پێش زەكاتدان- بەشێكی كەلوپەلەكەی بازرگانی ببەخشێ، یان بیكاتە مارەیی ژن، یان لە تۆلّەی شتێك بیدا، یان لە بەر خاترانە بە كەمتر لە نرخی خۆی بیفرۆشێتەوە، ئەوە لە سەر بازرگانەكە واجبە: زەكاتی ئەو كەلوپەلانەش بدا، چونكە ئەو دەستكاریانە لە ئەندازەی زەكاتدا دروست نەبوونە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ قرساندنی مالّی بازرگانی ﴾

ئینجا بۆ زانینی نرخەكەش واجبە: كەلوپەلەكەی بازرگانی بقرسێندرێ، كەوابو: (فَإِنْ مُلِكَ بِنَقْدٍ) ئەگەر كەلوپەلەكەی بازرگانیی بە جۆرە پارەیەك كڕیبو (قُوِّمَ بِهِ) هەر بە هەمان پارەش كەلوپەلەكە دەقرسێندرێ (إِنْ مُلِكَ بِنِصَابٍ) ئەگەر كڕینەكە بە پارەیەكی ڕادەی زەكات بوبێ (وَكَذَا دُونَهُ) هەروەها ئەگەر لە ڕادەیزەكاتیش كەمتر بوبێ، هەر بە هەمان پارە دەقرسێندرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەیڕاستتردا (أَوْبِعَرْضٍ) یان ئەگەر كەلوپەلەكەی بازرگانیی بە كەلوپەلێكیتر كڕیبو، ئەو كاتە (فَبِغَالِبِ نَقْدِالْبَلَدِ) بە پارەی شاری بازرگانیەكە دەقرسێندرێ، ئەو پارەیەی بە زۆری معامەلەی پێدەكرێ.

(فَإِنْ غَلَبَ نَقْدَانِ) جا ئەگەر لە شارەكەدا دوو جۆرە پارە هەبونو بە زۆری بە هەردووكیان بە یەكسانی معامەلە دەكرا (وَبَلَغَ بِأَحَدِهِمَا نِصَاباً) نرخی بازرگانیەكە تەنها بە یەكێكیان دەگەیشتە ڕادەی زەكات (قُوِّمَ بِهِ) ئەو كاتە هەر بە وی دەقرسێندرێ (فَإِنْ بَلَغَ بِهِمَا) جا ئەگەر بە هەردووكیان نرخەكە دەگەیشتە ڕادەی زەكات، ئەوكاتە (قُوِّمَ بِالأَنْفَعِ لِلْفُقَرَاءِ) كامەیان بە سوودترە بۆ هەژاران: بەوی دەقرسێندرێ

وَقِيلَ يَتخَيَّرُ الْمَالِكُ، وَإِنْ مُلِكَ بِنَقْدٍ وَعَرْضٍ قُوِّمَ مَا قَابَلَ النَّقْدَ بِهِ وَالْبَاقِي بِالْغَالِبِ، وَتَجِبُ فِطْرَةُ عَبِيدِ التِّجَارَةِ مَعَ زَكَاتِهَا، وَلَوْ كَانَ الْعَرْضُ سَائِمَةً، فَإِنْ كَمُلَ نِصَابُ إِحْدَى الزَّكَاتَيْنِ فَقَطْ وَجَبَتْ، أَوْ نِصَابُهُمَا فَزَكَاةُ الْعَيْنِ فِي الْجَدِيدِ،

---

(وَقِيلَ) له فەرموودەیەکدا: (يَتَخَيَّرُ الْمَالِكُ) خاوەنی بازرگانیەکە سەرپشکە: بە کامەیان بقرسێنێ دروست دەبێ.

ئینجا بزانە: لە چۆنیەتی ئەو قرساندنەدا ئاشکرا بوو: کە پارەی ئەم سەردەمەیێمەش بە زیو دەقرسێندرێ، چونکە -بە زیو- زووتر دەگاتە ڕادەی زەکاتو بۆ هەژاران بە سوودترە، هەروەك لە زەکاتی پارەو پولدا ڕوونمان کردەوە.

(وَإِنْ مُلِكَ بِنَقْدٍ وَعَرْضٍ) ئەگەر ماڵی بازرگانیەکەی کڕیبو بە پارەو بە کەلوپەلێکیتری جگە لە پارە، ئەو کاتە (قُوِّمَ مَا قَابَلَ النَّقْدَ بِهِ) ئەوەی بە پارە کڕاوە، هەر بە هەمان پارە دەقرسێندرێ (وَالْبَاقِي) ئەوەی بە کەلوپەلیتری کڕیوە (بِالْغَالِبِ) بە پارەی شارەکەی دەقرسێندرێ (وَتَجِبُ فِطْرَةُ عَبِيدِ التِّجَارَةِ) لە سەر بازرگانەکە واجبە: سەرفیترەی کۆیلەکانی بازرگانی بدا (مَعَ زَكَاتِهَا) هەروەها واجبە: زەکاتی بازرگانیەکەش بدا، چونکە هۆی زەکاتی بازرگانیو سەرفیترە لێك جیاوازن.

(وَلَوْ كَانَ الْعَرْضُ سَائِمَةً) ئەگەر کەلوپەلی بازرگانی ئاژەڵی لەوەڕاو بوو، یان خورماو ترێی بە درەختەوە بوو، یان دانەوێڵەی داچێندراو بوو، ئەوە تەنها یەك جۆرە زەکاتی تێدا واجبە، کەوابو: (فَإِنْ كَمُلَ نِصَابُ إِحْدَى الزَّكَاتَيْنِ فَقَطْ) ئەگەر تەنها ڕادەی زەکاتێك تەواو بوو (وَجَبَتْ) زەکاتی تەواوبووەکە واجب دەبێ:

بۆ وێنە: ئەگەر چل مەڕی بازرگانی نرخی سەدو نەوەد دیرهەمی زیو بوو، ئەوە لە کۆتایی ساڵی مەڕەکاندا واجبە: کاوڕێك لە زەکات بدرێ، بە پێچەوانەوەش: ئەگەر سیو نۆ مەڕی بازرگانی نرخی دوو سەد دیرهەم بوو، ئەوە لە کۆتایی ساڵی بازرگانیدا چوارێکی دەیەکی نرخی مەڕەکان -واتە: لە سەدا: دوو و نیو- واجبە: لە زەکاتدا بدرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئاژەڵەکانی دابەستنو نەیلەوەڕاندن، واتە: ئەڵفی دانێ، ئەو کاتە تەنها زەکاتی بازرگانیەکە واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە.

(أَوْ نِصَابُهُمَا) یان ئەگەر ڕادەی زەکاتی هەردووکیان تەواو بوو: وەك چل مەڕ نرخی دوو سەد دیرهەمی زیو بێ، یان چل تەنەکە گەنمی داچێندراو نرخی دوو سەد دیرهەمی زیو بێ، ئەوە (فَزَكَاةُ الْعَيْنِ) تەنها زەکاتی کەلوپەلەکە واجبە، نەك بازرگانی (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا، کەواتە: واجبە کاوڕێك لە زەکاتی مەڕەکاندا بدا، چوار تەنەکەش لە زەکاتی گەنمەکە بدا، هەم واجبە: درەختەکانو کاوکۆتەکەش بۆ بازرگانی بقرسێنێ.

فَعَلَى هَذَا لَوْ سَبَقَ حَوْلُ التِّجَارَةِ: بِأَنْ اشْتَرَى بِمَالِهَا بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ نِصَابَ سَائِمَةٍ فَالأَصَحُّ وَجُوبُ زَكَاةِ التِّجَارَةِ لِتَمَامِ حَوْلِهَا ثُمَّ يَفْتَتِحُ حَوْلاً لِزَكَاةِ الْعَيْنِ أَبَداً، وَإِذَا قُلْنَا: عَامِلُ الْقِرَاضِ لاَ يَمْلِكُ الرِّبْحَ بِالظُّهُورِ فَعَلَى الْمَالِكِ زَكَاةُ الْجَمِيعِ، فَإِنْ أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِ الْقِرَاضِ حُسِبَتْ مِنَ الرِّبْحِ

---

ئینجا بزانە لە هەر حاڵەتێکدا زەکات لە ئاژەڵەکاندا بدرێ، بێچووەکانیشیان لەگەڵ سەرژمێر دەکرێن، وەکو لە باسی زەکاتی بێچوودا ڕوونمان کردەوە، بەڵام ئەگەر زەکاتی بازرگانیان لێبدرێ، ئەو کاتە بێچووەکانو خوریو شیر لەگەڵ دایکەکان دەقرسێندرێو، درەختەکانو میوەکەو هەروەهاش دانەوێڵەو کاوکوتەکەو هەرچی نرخی هەبێ، گشتی پێکەوە دەقرسێندرێو کە ساڵی بازرگانی تەواو بوو، زەکات لە گشتی دەدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا بە درێژیو لە سەرچاوەکانیتریشدا ڕوون کراوەتەوە.

(فَعَلَى هَذَا) هەر لە سەر فەرموودەی نوێ: (لَوْ سَبَقَ حَوْلُ التِّجَارَةِ) ئەگەر ساڵی بازرگانی پێش ساڵی کەلوپەلەکە تەواو بوو: (بِأَنِ اشْتَرَى بِمَالِهَا بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ نِصَابَ سَائِمَةٍ) وەك بە ماڵی بازرگانیەکە -لە دوای شەش مانگ- چل مەڕ بکڕێو لە سەر لەوەڕاندنەکەش بەردەوام بێ (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (وَجُوبُ زَكَاةِ التِّجَارَةِ) یەکەم جار زەکاتی بازرگانیەکە واجبە (لِتَمَامِ حَوْلِهَا) کە ساڵی بازرگانیەکە تەواو بوو (ثُمَّ) ئینجا کە ساڵی بازرگانی تەواو بوو (يَفْتَتِحُ حَوْلاً) لەو کاتەوە سەرە ساڵێکیتر دەکاتەوە (لِزَكَاةِ الْعَيْنِ أَبَداً) بۆ زەکاتی کەلوپەلەکەی بازرگانی هەتا هەتایە، کەواتە: کە ساڵی بازرگانی سوڕاوە، زەکاتی بازرگانی لە سەدا: دوو و نیو دەدا، ئینجا لە دوای ساڵێکیتر کاوڕێك لە زەکاتی چل مەڕەکان دەداو زەکاتی بازرگانی نادا.

## ﴿ زەکاتی مامەڵەتی قازانجی هاوبەش ﴾

ئینجا بزانە: هەر کاتێك موسوڵمانێك پارەی دایە موسڵمانێکیتر: تاکو بازرگانیی پێ بکاو قازانجیش لە نێوانیاندا هاوبەش بێ، ئەوە کە ساڵ تەواو بوو، زەکات لەو بازرگانیەدا واجب دەبێ، کەوابو: (وَإِذَا قُلْنَا) هەر کاتێك لە سەر فەرموودەی ڕاستتر بڵێین: (عَامِلُ الْقِرَاضِ) ئەو کرێکارەی بە پارەی خەڵکی بازرگانی دەکا (لاَ يَمْلِكُ الرِّبْحَ بِالظُّهُورِ) بەشە قازانجەکەیخۆی نابێتە ملکیخۆی بە تەنها ئاشکرابوونیقازانجەکە، بەڵکو دەبی بەش بکرێ ئینجا دەبێتە ملکیخۆی (فَعَلَى الْمَالِكِ زَكَاةُ الْجَمِيعِ) ئەوە لە سەر فەرموودەی ڕاستتر: لە سەر خاوەن پارەکە واجبە زەکاتی گشت بازرگانیەکە بدا: بە سەرمایەو قازانجەوە؟ چونکە گشتی ملکی خاوەن پارەکەیە.

ئینجا (فَإِنْ أَخْرَجَهَا مِنْ مَالِ الْقِرَاضِ) ئەگەر خاوەنەکە لە خودی پارەی بازرگانیەکە زەکاتەکەیدا (حُسِبَتْ مِنَ الرِّبْحِ) ئەو زەکاتە لە قازانجەکە حیساب دەکرێ، نەك لە

فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ قُلْنَا يَمْلِكُ بِالظُّهُورِ لَزِمَ الْمَالِكَ زَكَاةُ رَأْسِ الْمَالِ وَحِصَّتِه مِنَ الرِّبْحِ، وَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ يَلْزَمُ الْعَامِلَ زَكَاةُ حِصَّتِه.

## (بابُ زَكَاةِ الْفِطْرِ)

تَجِبُ بِأَوَّلِ لَيْلَةِ الْعِيدِ فِي الأَظْهَرِ،

---

سەرمايەكە (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، كەواتە: كرێكارەكەش بەگوێرەی بەشە قازانجەكەی خۆی زەكاتی لە سەر حیساب دەكرێ، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموويەتی.

بەڵام ئەگەر خاوەن پارەكە لە پارەیەكیتری جگە لە پارەی بازرگانیەكە زەكاتەكەی دا، ئەوە گشتی لە كیس خۆی دەچێو دروست نیە هیچی لە كرێكارەكەو لە قازانج وەربگرێتەوە، هەروەك لە (الشبراملسي)و (بجيرمي)دا فەرموويانە.

(وَإِنْ قُلْنَا) ئەگەر بە فەرموودەی بێهێز بڵێین: (يَمْلِكُ بِالظُّهُورِ) كرێكارەكە بەشە قازانجەكەی دەبێتە ملكی خۆی بە تەنها ئاشكرابوون (لَزِمَ الْمَالِكَ) ئەو كاتە لە سەر خاوەن پارەكە واجبە: (زَكَاةُ رَأْسِ الْمَالِ وَحِصَّتِهِ مِنَ الرِّبْحِ) زەكاتی سەرمايەكەو زەكاتی بەشە قازانجەكەی خۆی بدا (وَالْمَذْهَبُ) مەزهەبی سەر ئەو فەرموودە بێهێزە: (أَنَّهُ يَلْزَمُ الْعَامِلَ زَكَاةُ حِصَّتِهِ) لە سەر كرێكارەكەش واجبە: زەكاتی بەشە قازانجەكەی خۆی بدا، چونكە ملكی خۆيەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر خاوەن پارەكە زەكاتی لە سەر نەبو: وەكو مزگەوتو كافر، ئەو كاتە زەكات لە بازرگانیەكەدا واجب نیە، بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە: خاوەن پارەكە زەكاتی لە سەر بوو و كرێكارەكە لە سەری نەبو، چونكە كافر بوو، ئەو كاتە گشت زەكاتەكە لە سەر خاوەن پارەكەیە، وەك باسمان كرد، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ بابُ زَكاةِالْفِطْرِ: باسی زەكاتی سەرفیترەی ڕەمەزان ﴾

(تَجِبُ) زەكاتی سەرفیترەی ڕەمەزان واجب دەبێ (بِأَوَّلِ لَيْلَةِالْعِيدِ) بە گەیشتنە سەرەتای شەوی جەژنیڕەمەزانو بەشێكیڕەمەزانیش (فِي‌الأَظْهَرِ) لە فەرموودەیبەهێزتردا ﴿عَنْ ابْنِ عمررضي‌الله عنهما: فَرَضَ رَسُولُ اللهِﷺ زَكَاةَالْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعاً مِنْ شَعِيرٍ: عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ والذَّكَرِ والأُنْثَى وَالصَّغِيرِ والْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا: أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى‌الصَّلاَةِ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ زەكاتی سەرفیترەی واجب كردوە: ساعێك لە قەسپ، یان لە جۆ، لە سەر كۆیلەو ئازاد، نێرو مێ، منداڵو گەورە، ئەگەر ئەوانە موسڵمان بن، هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمانیداوە: پێش چوونە نوێژی جەژن سەرفیترە بدرێ.

فَتَخْرَجُ عَمَّنْ مَاتَ بَعْدَ الْغُرُوب دُونَ مَنْ وُلِدَ، وَيُسَنُّ أَنْ لاَ تُؤَخَّرَ عَنْ صَلاَته، وَيَحْرَمُ تَأخيرُهَا عَنْ يَوْمه، وَلاَ فطْرَةَ عَلَى كَافر إلاَّ فِي عَبْده وَقَريبه الْمُسْلِمِ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ رَقيق

كەوابو: (فَتُخْرَجُ) واجبە: سەرفیترە بدرێ (عَمَّنْ) لەجیاتی ئەو موسڵمانەی لە ئاخیر ڕۆژی ڕەمەزان لە ژیاندا بوە، ئینجا (مَاتَ بَعْدَ الْغُرُوبِ) لە دوای ڕۆژئاوابوون –واتە: لە شەوی جەژندا– مردبێ؟ چونکە لە بەشێکی ڕەمەزاندا هەبووەو گەیشتۆتە سەرەتای شەوی جەژنیش (دُونَ مَنْ وُلِدَ) بەڵام سەرفیترە لەجیاتی ئەو منداڵە نادرێ: کە لە دوای ڕۆژئاوابوون–واتە: لە شەوی جەژندا– لە دایك بوبێ، هەروەها لە سەر ئەو کافرەش واجب نیە: کە لە شەوی جەژندا دەبێتە موسڵمان، چونکە ئەو دووانە لە بەشێکی ڕەمەزاندا بە تەواوی نەبونە.

هەروەها ئەگەر موسڵمانیش لە ئاخیری ڕەمەزاندا پێش ڕۆژئاوابوون بمرێ، ئەویش سەرفیترەی لەجیاتی نادرێ، چونکە نەگەیشتۆتە سەرەتای شەوی جەژن، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام ئەگەر بە ماوەیەکی کەم پێش ڕۆژئاوابوون لە دایك ببێو یەکسەر لە دوای ڕۆژئاوابوون بمرێ، واجبە: سەرفیترەی بۆ بدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، چونکە لە بەشێکی ڕەمەزانو لە سەرەتای شەوی جەژندا هەبوە (وَيُسَنُّ) سوننەتە: (أَنْ لاَ تُؤَخَّرَ عَنْ صَلاَتِهِ) زەکاتی سەرفیترە نەخرێتە دوای نوێژی جەژن، بەڵکو سوننەتە: لە پێش چوونە نوێژدا بدرێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو

هەروەها دروستە: لە یەکەمی ڕەمەزاندا سەرفیترە بدرێ، هەم لە ڕۆژی جەژندا تا ڕۆژ ئاوا دەبێ، کاتی زەکاتی سەرفیترە دەمێنێ، کەوابو: (وَيَحْرَمُ تَأْخِيرُهَا عَنْ يَوْمِهِ) حەرامە: زەکاتی سەرفیترە بخاتە دوای ڕۆژی جەژن، ئەگەر هیچ عوزرێکی نەبێ، کەوابو: ئەگەر ڕۆژی جەژن ئاوا بو و سەرفیترەی نەدا، گوناهبار دەبێو واجبە: بە پەلە قەزای بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَلاَ فِطْرَةَ عَلَى كَافِرٍ) سەرفیترە لە سەر کافریبنەڕەتی واجب نیە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو (إِلاَّ فِي عَبْدِهِ) تەنها سەرفیترەی کۆیلەکەیو (وَقَرِيبِهِ الْمُسْلِمِ) ئەو خزمە موسڵمانەی بەخێوکردنی لە ئەستۆیەتیو، هەم ژنە موسڵمانەکەشی–لە ماوەی (عدة)دا– واجبە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: کافرەکە سەرفیترەی ئەوانە دەداو نیەتەکەش دێنێ، بەڵام ئەم نیەتە نیەتی خواپەرستی نیە، بەڵکو نیەتی جیاکردنەوەیە، هەروەك لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(وَلاَ رَقِيقٍ) هەروەها لە سەر کۆیلە واجب نیە: سەرفیترەی خۆیو ژنەکەیو خزمەکانی بدا، بەڵکو واجبە: گەورەکەی سەرفیترەی وی بدا.

وَفِي الْمُكَاتَبِ وَجْهٌ، وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ يَلْزَمُهُ قِسْطُهُ، وَلاَ مُعْسِرٍ فَمَنْ لَمْ يَفْضُلْ عَنْ قُوتِهِ وَقُوتِ مَنْ فِي نَفَقَتِهِ لَيْلَةَ الْعِيدِ وَيَوْمَهُ شَيْءٌ فَمُعْسِرٌ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ فَاضِلاً عَنْ مَسْكَنٍ وَخَادِمٍ يَحْتَاجُ إِلَيْهِ فِي الأَصَحِّ، وَمَنْ لَزِمَهُ فِطْرَتُهُ لَزِمَهُ فِطْرَةُ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ

---

(وَفِي الْمُكَاتَبِ وَجْهٌ) دەربارەی كۆیلەی نووسراوپێدراو فەرموودەیەكی بێهێز هەیە: كە واجبە: سەرفیترەكانی بدا (وَمَنْ بَعْضُهُ حُرٌّ) هەر كۆیلەیەك بەشێكی ئازاد بێو بەشێكی كۆیلە بێ (يَلْزَمُهُ قِسْطُهُ) واجبە: بە ئەندازەی ئازادیەكەی سەرفیترەی خۆی بدا.

(وَلاَ مُعْسِرٍ) زەكاتی سەرفیترە لە سەر مرۆڤی نەبوویی واجب نیە، كەوابو: (فَمَنْ لَمْ يَفْضُلْ) هەر كەسێك زیادەی نەبێ: (عَنْ قُوتِهِ وَقُوتِ مَنْ فِي نَفَقَتِهِ) لە خواردنی خۆیو ئەو كەسانەی بەخێوكردنیانی لە ئەستۆیەتی (لَيْلَةَ الْعِيدِ وَيَوْمَهُ) لە شەو و ڕۆژی جەژندا (شَيْءٌ) هیچی زیاد نەبو (فَمُعْسِرٌ) ئەوە مرۆڤێكی نەبوویی‌یەو سەرفیترەی لە سەر واجب نیە، بەڵام ئەگەر تەنها یەك ساعی زیاتر هەبێ، ئەوە مرۆڤێكی هەبوویی‌یە، واتە: سەرفیترەی لە سەر واجبە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ فَاضِلاً) هەروەها بە مەرج دادەندرێ: ئەوەی دەیداتە سەرفیترە، زیادبێ (عَنْ مَسْكَنٍ) لە شوێنی تێدا حاوانەوە، كەواتە: ئەگەر خانووەكەی بە كرێ بێ، واجبە: سەرفیترەكە لە كرێی خانوو زیادبێ (وَخَادِمٍ يَحْتَاجُ إِلَيْهِ) هەروەها زیادبێ لە كرێی خزمەتكارێك كە پێویستی پێ هەبێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

﴿ ئاگاداری ﴾ لەو پێناسەیەدا دەركەوت: كە مرۆڤی نەبوویی جیایە لە مرۆڤی گەداو هەژار، واتە: مرۆڤی‌نەبوویی لە هەردووكیان حاڵی نزمترە، كەواتە: دەگونجێ مرۆڤێك لە سەرفیترەداندا هەبوویی بێ، بەڵام لە زەكات وەرگرتندا گەدا، یان هەژار بێ، هەروەك لە باسی ئەو هەشت كەسانەی زەكاتیان دەدرێتێ پێناسەیان دەكەین، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

كەوابو: دروستە: مرۆڤێكی‌گەدا، یان هەژار سەرفیترەی خۆی بداتە مرۆڤێكی‌تری وەك خۆی، ئینجا كە سەرفیترەكەی لێوەرگرتو قبوڵی كرد، دروستە: ئەمەش سەرفیترەی خۆی بداتە ئەو، ئەویش لێی قبوڵ بكا، چونكە هەردووكیان سەرفیترەیان لە سەرەو هەردووكیشیان دروستە: زەكات وەربگرن، هەروەك لە (مغنى)و (الشرواني)دا ئەو مەسەلەیە ڕوون كراوەتەوە.

(وَمَنْ لَزِمَهُ فِطْرَتُهُ) هەر كەسێك سەرفیترەی‌خۆی لە سەر واجب بێ (لَزِمَهُ فِطْرَةُ مَنْ تَلْزَمُهُ نَفَقَتُهُ) لە سەری واجبە: سەرفیترەی ئەو كەسانەش بدا كە بەخێوكردنیانی لە ئەستۆیەتی: وەك ژنەكەیو منداڵەكانیو دایكیو باوكی...هتد، بەڵام ئەگەر ئەوانە سەربەخۆ –بێ‌ئیزنی بەخێوكەرەكە– سەرفیترەی خۆیان بدەن، ئەوە سەرفیترەكەیان دروست دەبێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

لَكِنْ لاَيَلْزَمُ الْمُسْلِمَ فِطْرَةُ الْعَبْدِ وَالْقَرِيبِ وَالزَّوْجَةِ الْكُفَّارِ، وَلاَ الْعَبْدَ فِطْرَةُ زَوْجَتِه، وَلاَ الإِبْنَ فِطْرَةُ زَوْجَةِ أَبِيه، وَفِي الإِبْنِ وَجْهٌ، وَلَوْ أَعْسَرَالزَّوْجُ أَوْ كَانَ عَبْداً فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَلْزَمُ زَوْجَتَهُ الْحُرَّةَ فِطْرَتُهَا، وَكَذَا سَيِّدَالأَمَةِ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ لاَ يَلْزَمُ الْحُرَّةَ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوِ انْقَطَعَ خَبَرُ الْعَبْدِ فَالْمَذْهَبُ وُجُوبُ إِخْرَاجِ فِطْرَتِه فِي الْحَالِ، وَقِيلَ إِذَا عَادَ وَفِي قَوْلٍ لاَ شَيْءَ، وَالأَصَحُّ أَنَّ مَنْ أَيْسَرَ بِبَعْضِ صَاعٍ يَلْزَمُهُ،

---

ئینجا بزانە: مەرجە: ئەو بەخێوکراوانە موسڵمان بن، هەروەك دەفەرموێ (لَكِنْ لاَ يَلْزَمُ الْمُسْلِمَ) بەلام لە سەر موسڵمان واجب نیە (فِطْرَةُ الْعَبْدِ وَالْقَرِيبِ وَالزَّوْجَةِ الْكُفَّارِ) سەرفیترەی کۆیلە کافرەکەو خزمە کافرەکەو ژنە کافرەکەی بدا، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو، هەرچەندەش بەخێوکردنیان واجب بێ (وَلاَ الْعَبْدَ فِطْرَةُ زَوْجَتِهِ) هەم لە سەر کۆیلەش واجب نیە: سەرفیترەی ژنەکەی خۆی بدا، چونکە کۆیلە سەرفیترەی خۆیشی لە سەر نیە.

(وَلاَ الإِبْنَ فِطْرَةُ زَوْجَةِ أَبِيهِ) هەروەها لە سەر کوڕ واجب نیە: سەرفیترەی ژنی باوکی خۆی بدا، هەرچەند واجبیش بێ بەخێویان بکا، هەروەهاش لە سەر باوك واجب نیە: سەرفیترەی ژنی کوڕەکەی بدا (وَفِي الإِبْنِ وَجْهٌ) بەلام دەربارەی کوڕ فەرموودەیەکی بێهێز هەیە: کە سەرفیترەی ژنی باوکی لە سەرە.

(وَلَوْ أَعْسَرَ الزَّوْجُ) ئەگەر مێرد هیچی نەبو لە سەرفیترەی ژنەکەی بدا (أَوْ كَانَ عَبْداً) یان مێردەکە کۆیلە بوو (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يَلْزَمُ زَوْجَتَهُ الْحُرَّةَ) لە سەر ژنە ئازادەکەی واجبە (فِطْرَتُهَا) بەخۆی سەرفیترەی خۆی بدا (وَكَذَا سَيِّدَالأَمَةِ) هەروەها لە سەر گەورەی جاریەکەش واجبە: سەرفیترەی جاریە بەشوودراوەکە بدا.

(قُلْتُ) ئیمامی(النولوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ الْمَنْصُوصُ) دەققی فەرموودەی ڕاستتر ئەمەیە (لاَ يَلْزَمُ الْحُرَّةَ) لە سەر ژنە ئازادەکەی واجب نیە: سەرفیترەی خۆی بدا، بەڵکو سوننەتە (وَاللهُ أَعْلَمُ)، بەلام ئەگەر ژنەکە (ناشیزە) بوو، ئەو کاتەش لە سەر مێردەکەی واجب نیە، کەوابو: واجبە بە خۆی سەرفیترەی خۆی بدا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوِ انْقَطَعَ خَبَرُالْعَبْدِ) ئەگەر کۆیلەیەك بێهەواڵ بوو (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (وُجُوبُ إِخْرَاجِ فِطْرَتِهِ فِي الْحَالِ) واجبە: گەورەکەی -لە جەژندا- بێدواخستن سەرفیترەکەی بدا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (إِذَا عَادَ) هەر کاتێك گەڕاوە سەرفیترەکەی دەدا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (لاَ شَيْءَ) هیچ سەرفیترەی واجب نیە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ مَنْ أَيْسَرَ بِبَعْضِ صَاعٍ) هەر کەسێك تەنها بەشە ساعێکی زیادی هەبوو لە شەو و ڕۆژی جەژندا (يَلْزَمُهُ) واجبە: ئەو بەشە بداتە سەرفیترە.

وَأَنَّهُ لَوْ وَجَدَ بَعْضَ الصِّيعَانِ قَدَّمَ نَفْسَهُ ثُمَّ زَوْجَتَهُ ثُمَّ وَلَدَهُ الصَّغِيرَ ثُمَّ الأَبَ ثُمَّ الأُمَّ ثُمَّ الْكَبِيرَ، وَهِيَ صَاعٌ: وَهُوَ سِتُّمِائَةِ دِرْهَمٍ وَثَلاَثَةٌ وَتِسْعُونَ دِرْهَمَاً وَثُلُثٌ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ سِتُّمِائَةٍ وَخَمْسَةٌ وَثَمَانُونَ دِرْهَمَاً وَخَمْسَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ لِمَا سَبَقَ فِي زَكَاةِ النَّبَاتِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

(وَأَنَّهُ لَوْ وَجَدَ بَعْضَ الصِّيعَانِ) ئەگەر کەسێك تەنها چەند ساعێکی دەست کەوت بۆ سەرفیترە (قَدَّمَ نَفْسَهُ) واجبە: پێشدا سەرفیترەی خۆی بدا (ثُمَّ زَوْجَتَهُ) ئینجا سەرفیترەی ژنەکەی (ثُمَّ وَلَدَهُ الصَّغِيرَ) ئینجا منداڵە بچووکەکانی (ثُمَّ الأَبَ) ئینجا باوکی خۆی (ثُمَّ الأُمَّ) ئینجا دایکی خۆی (ثُمَّ الْكَبِيرَ) ئینجا منداڵە گەورەکەی: کە هەژار بێ‌و توانای کارکردنی نەبێ.

**﴿ ئەندازەی سەرفیترە ﴾**

(وَهِيَ) ئەندازەی سەرفیترەی یەك کەس: (صَاعٌ) یەك ساعە بە بەڵگەی حەدیسەکەی ڕابردوو (وَهُوَ) کێشی یەك ساع (سِتُّمِائَةِ دِرْهَمٍ وَثَلاَثَةٌ وَتِسْعُونَ دِرْهَمَاً وَثُلُثٌ) شەشسەدو نەوەدو سێ دیرهەم‌و سێیەکی دیرهەمێکە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (سِتُّمِائَةٍ وَخَمْسَةٌ وَثَمَانُونَ دِرْهَمَاً وَخَمْسَةُ أَسْبَاعِ دِرْهَمٍ) شەشسەدو هەشتاو پێنج دیرهەم‌و پێنج حەفتێکی دیرهەمێکە (لِمَا سَبَقَ فِي زَكَاةِ النَّبَاتِ) لەبەر ئەو لێکدانەوەی لە زەکاتی دانەوێڵەدا ڕابرا (وَاللهُ أَعْلَمُ).

ئینجا بزانە: کێشی یەك ساع‌ـبە پارێزکارییەوەـ دەکاتە (٢٤٢٠)غرام، واتە: دوو کیلۆو چوارسەدو بیست غرام.

**﴿ ئاگاداری ﴾** لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: کێشی یەك ساع‌ـبە پارێزکارییەوەـ دەکاتە (٣٦٣٠)غرام، واتە: سێ کیلۆو شەشسەدو سی غرام، ئینجا ئەگەر لە سەرفیترەدا: گەنم، یان ئاردیگەنم بدرێ، ئەو کاتە نیو ساع واجبە، کە دەکاتە (١٨١٥)غرام، واتە: یەك کیلۆو هەشتسەدو پانزە غرام، بەڵام ئەگەر قەسپ، یان جۆ، یان ئاردیجۆ بدرێ، ئەو کاتە ساعێکی تەواو واجبە.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی (حنفي)دا دروستە: سەرفیترە بدرێتە تەنها یەك گەدا، یان یەك هەژار، هەم دروستە لە جیاتی دانەوێڵە: نرخی دانەوێڵەکە لە سەرفیترەدا بدرێ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)و کتێبەکانی مەزهەبی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

کەوابو: ئەگەر یەکێك بیەوێ لە سەر مەزهەبی(حنفي) سەرفیترەی خۆی بدا، ئەوە نرخی نزیکەی دوو کیلۆ گەنم لە جیاتی هەر نەفەرێك دەداتە هەژارێك، بەگوێرەی نرخی بازاڕ لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزادا.

وَجِنسُهُ الْقُوتُ الْمُعَشَّرُ، وَكَذَا الأَقِطُ فِيالأَظْهَرِ، وَتَجِبُ مِنْ قُوتِ بَلَدِهِ، وَقِيلَ قُوتِهِ وَقِيلَ يَتَخَيَّرُ بَيْنَ الأَقْوَاتِ، وَيُجْزِئُ الأَعْلَى عَنِ الأَدْنَى وَلاَ عَكْسَ، وَالإِعْتِبَارُ بِالْقِيمَةِ فِي وَجْهٍ، وَبِزِيَادَةِ الإِقْتِيَاتِ فِيالأَصَحِّ، فَالْبُرُّ خَيْرٌ مِنَ التَّمْرِ وَالأَرُزِّ، وَالأَصَحُّ أَنَّ الشَّعِيرَ خَيْرٌ مِنَ التَّمْرِ وَأَنَّ التَّمْرَ خَيْرٌ مِنَ الزَّبِيبِ، وَلَهُ أَنْ يُخْرِجَ عَنْ نَفْسِهِ مِنْ قُوتِهِ وَعَنْ قَرِيبِهِ أَعْلَى مِنْهُ،

---

(وَجِنسُهُ) ڕەگەزی ئەو خواردەمەنیەی واجبە لە سەرفیترەدا بدرێ (اَلْقُوتُ الْمُعَشَّرُ) ئەو خواردەمەنیەیە: کە لە زەکاتیدا دەیەك واجب بوو، هەروەك لە باسی میوەو دانەوێڵەدا ڕابرا، چونکە لە حەدیسەکەیڕابردوو ناوی بەشێکی ئەو خواردەمەنیانە هاتوەو ئەوانیتریش (قیاس) کراونە سەر ئەوان هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

(وَكَذَا الأَقِطُ) هەروەهاش دروستە: کەشك لە سەرفیترەدا بدرێ (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە لە (بخاري‌ومسلم)دا هاتوە.

(وَتَجِبُ) لە فەرموودەی ڕاستتردا واجبە: سەرفیترە بدرێ (مِنْ قُوتِ بَلَدِهِ) لە خواردەمەنی شاری سەرفیترەبۆدراوەکە: کە بە ئەغڵەبی بۆ پێژیان دەیخۆن، کەواتە: ئەگەر سەرفیترەدەرەکە لە شوێنێك بوو، سەرفیترەبۆدراوەکەش لە شوێنێکیتر بوو، ئەو کاتە واجبە: خواردەمەنی شوێنی سەرفیترەبۆدراوەکە ڕەچاو بکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیبێهێزدا (قُوتِهِ) لەو خواردەمەنیەی بەخۆی بە ئەغڵەبی دەیخوا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکیتری بێهێزدا (يَتَخَيَّرُ بَيْنَ الأَقْوَاتِ) زەکاتدەرەکە سەرپشك دەبێ لە نێوان هەموو خواردەمەنیەکان یەکێکیان لە سەرفیترە دەدا، ئینجا بزانە: ئەم سێیەمە: مەزهەبی ئیمامی (حنفي)یە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

(وَيُجْزِئُ الأَعْلَى عَنِ الأَدْنَى) دروستە: خواردەمەنیی باشتر، لە جیاتی خواردەمەنیی نزمتر بدا (وَلاَ عَكْسَ) بەڵام بە پێچەوانەوە دروست نیە (وَالإِعْتِبَارُ بِالْقِيمَةِ) باشیو نزمی خواردەمەنی بە نرخەکەی ڕەچاو دەکرێ (فِي وَجْهٍ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (وَبِزِيَادَةِ الإِقْتِيَاتِ فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا: بە زیاتر خواردنی بۆ پێژیان ڕەچاو دەکرێ (فَالْبُرُّ خَيْرٌ مِنَ التَّمْرِ) کەوابو: گەنم باشترە لە قەسپو لە مێوژ (وَالأَرُزِّ) هەم لە برنجیشو لە جۆش (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّ الشَّعِيرَ خَيْرٌ مِنَ التَّمْرِ) جۆ لە قەسپ باشترە (وَأَنَّ التَّمْرَ خَيْرٌ مِنَ الزَّبِيبِ) قەسپ لە مێوژ باشترە (وَلَهُ) بۆ زەکاتدەرەکە دروستە: (أَنْ يُخْرِجَ عَنْ نَفْسِهِ مِنْ قُوتٍ) سەرفیترەی خودیخۆی لە خواردەمەنییێکی واجبی خۆی بداو (وَعَنْ قَرِيبِهِ أَعْلَى مِنْهُ) سەرفیترەی ئەوانەیتریش، واتە: خزمو ژنەکانی لە خواردەمەنیەکی باشتر بدا.

وَلاَ يُبَعَّضُ الصَّاعُ، وَلَوْ كَانَ فِي بَلَدٍ أَقْوَاتٌ لاَ غَالِبَ فِيهَا تَخَيَّرَ، وَالأَفْضَلُ أَشْرَفُهَا، وَلَوْ كَانَ عَبْدُهُ بِبَلَدٍ آخَرَ فَالأَصَحُّ أَنَّ الإِعْتِبَارَ بِقُوتِ بَلَدِ الْعَبْدِ، قُلْتُ: اَلْوَاجِبُ الْحَبُّ السَّلِيمُ، وَلَوْ أَخْرَجَ مِنْ مَالِهِ فِطْرَةَ وَلَدِهِ الصَّغِيرِ الْغَنِيِّ جَازَ كَأَجْنَبِيٍّ أَذِنَ،

---

(وَلاَ يُبَعَّضُ الصَّاعُ) دروست نيه: يەك ساع بكرێتـە دوو بـەش، يـان زيـاتر: وەك سـاعێك بـە گەنمو بە جۆ تەواو بكاو لە جياتى يـەك كـەس بيدا (وَلَوْ كَانَ فِي بَلَدٍ أَقْوَاتٌ) ئەگـەر لـە شوێنێكدا چـەند ڕەگـەز خواردەمـەنى هـەبون: گشـتيان بـۆ پـێژيـان دەخـوران‌و (لاَ غَالِبَ فِيهَا) هيچيان لە هيچيان بە ئەغلەبتر نـەدەخوران (تَخَيَّرَ) زەكاتدەرەكـە سەرپشـك دەبـێ: كامەيان بدا دروستە، بـەلام (وَالأَفْضَلُ) وەهـا خێرتـرە: (أَشْرَفُهَا) باشـترەكەيان بـدا (وَلَوْ كَانَ عَبْدُهُ بِبَلَدٍ آخَرَ) ئەگەر كۆيلەكەى لە شوێنێكى‌تر بـوو (فَالأَصَحُّ) فـەرموودەى ڕاسـتتر: (أَنَّ الإِعْتِبَارَ بِقُوتِ بَلَدِ الْعَبْدِ) خواردەمەنى شوێنى كۆيلەكە ڕەچاو دەكرێ.

(قُلْتُ) ئيمامى (النواوي) دەفـەرموێ (اَلْوَاجِبُ) ئـەو خواردەمەنيـەى واجبـە: لـە سـەرفيترە بدرێ (اَلْحَبُّ السَّلِيمُ) دەنكى ساغە، واتە: ئـاردو سـاوارو بـرِوش‌و گەنمـەكوتراو و پوچـەڵو، هەروەها دۆشاو و سركە، ئەوانە هيچيان دروست نينە لە سەرفيترەدا بدرێن.

(وَلَوْ أَخْرَجَ مِنْ مَالِهِ فِطْرَةَ وَلَدِهِ الصَّغِيرِ الْغَنِيِّ) ئەگـەر بـاوك لـە مـاڵى خـۆى سـەرفيترەى منداڵە بچووكە دەوڵەمەندەكەى بدا، يـان سـەرفيترەى منداڵـە شـێتە دەوڵەمەندەكـەى بـدا (جَازَ) هەردووكى دروسـتە، چـونكە بـاوك دەتوانـێ سـەربەخۆ شـتێك بكاتـە ملكـى منـداڵى بچووك‌و شێت، ئينجا بزانە: ئەگەر باوك نەبو، باپيرە جێگەى باوك دەگرێتەوە.

بـەلام ئەگـەر منـداڵ‌و شـێتەكە سەرپـەرشـتكاريان نـەبو، ئـەو كاتـە بـۆ چـاودێرو بەڕێوەبـەرەكانيان دروسـت نيـە: بـە بێ‌ئيزنى‌قـازى لـە ماڵى‌خۆيـان سـەرفيترەى منداڵ‌و شێتەكە بدەن، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا فەرموويانـە، جـا ئەگـەر سەرپـەرشتكار نـەبو، شوێنەكەش (قازى)ى نەبو، ئەو كاتە دروستـە: چاودێرو بەڕێوەبـەرەكانيان سـەرفيترەيان بۆ بدەن، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(كَأَجْنَبِيٍّ أَذِنَ) هەروەك ئەگەر مرۆڤێكى بێگانـە يـەكێك ئيـزن بـدا، دروسـتە: ئيزندراوەكـە لـە ماڵى خۆى سەرفيترەى بۆ بدا، واتـە: وەك سـەرفيترەكەى بـە قـەرز دابيتـێ، ئـەوها دروسـتە لێى وەربگرێتەوە، بەلام ئەگەر بێگانە ئيزنى نەدا، دروست نيە سـەرفيترەى بـۆ بـدا، چـونكە زەكاتى سەرفيترە خواپەرستيەو پێويستى بـە نيـەت هەيـە، كەواتـە: ئـەو خواپەرستيە بـە بێ‌ئيزن لە سەر مرۆڤ لاناچێ، هەرچەند زەكاتدەرەكەش بە پيـاوەتى بـەخێوى بكـا، كـەوابو: ئەگـەر سـەرفيترەكەى بـە بـێ‌ئيزن بـدا، بـە بـەر سـەرفيترە ناكـەوێ‌و بـۆى دروسـتە وەرى بگرێتەوە، هەروەك لە حاشيەكانى(الشبراملسي)و(الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

بخلاَفِ الْكَبِيرِ، وَلَوْ اشْتَرَكَ مُوسِرٌ وَمُعْسِرٌ فِي عَبْدٍ لَزِمَ الْمُوسِرَ نِصْفُ صَاعٍ، وَلَوْ أَيْسَرا وَاخْتَلَفَ وَاجِبُهُمَا أَخْرَجَ كُلُّ وَاحِدٍ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ وَاجِبِهِ فِي الأَصَحِّ، وَاللهُ أَعْلَمُ.

(بابُ مَنْ تَلْزَمُهُ الزَّكاةُ وَما تَجِبُ فِيه)

شَرْطُ وُجُوبِ زَكَاةِ الْمَالِ: اَلإِسْلاَمُ وَالْحُرِّيَّةُ،

---

(بِخلاَفِ الْكَبِيرِ) بەڵام دروست نیە: باوكو باپیرە –بە بێئیزن– سەرفیترەی منداڵی گەورەو هەبوویی بدەن، چونكە نە باوكو نە باپیرە ناتوانن شتێك بكەنە ملكی منداڵی گەورە، واتە: بالغو عاقڵ، كەوابو: بۆ دروستبوونی سەرفیترە، مەرجە: كوڕو كچی گەورەو هەبوویی –وەكو بێگانە– ئیزن بدەن سەرفیترەیان بۆ بدرێ، ئەگینا: سەرفیترەكەیان دروست نابێ؟ چونكە پێویستی بە نیەت هەیە، هەروەك تازە ڕوونمان كردەوە.

ئینجا بزانە: لێرەدا مەبەست لە منداڵی گەورەو هەبوویی ئەمەیە: لە شەو و ڕۆژی جەژندا ئەوەندە هەبوویی بێ: لەو كاتدا بەخێوكردنی لە سەر باوكو باپیرە واجب نەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە، چونكە ئەگەر نەبوویی بێ، ئەو كاتە بەخێوكردنی واجب دەبێو پێویست بە ئیزندان ناكا، هەروەك لە (بجيرمي)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر سەرفیترەكەی بە مەزهەبی(حنفي) بدا، ئەو كاتە دروستە: بە بێئیزن سەرفیترەی منداڵە گەورەكانیشی بدا، بەو مەرجەی ئەوانیش لەگەڵ ژنو منداڵە بچووكەكانیدا بنو یەك خێزان بنو پێكەوە بەخێویان بكا، هەروەك لە (مجمع الأنهر)ی مەزهەبی(حنفي)دا ڕوون كراوەتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك دروست نیە: بە بێئیزن سەرفیترەی براو برازاو برازاو ژنیكوڕی بدا، چونكە ئەوانە گشتی بێگانەن، وَاللهُ أعْلَم.

(وَلَوِ اشْتَرَكَ مُوسِرٌ وَمُعْسِرٌ) ئەگەر هەبوویەكو نەبوویەك بونە هاوبەش (فِي عَبْدٍ) لە كۆیلەیەكدا (لَزِمَ الْمُوسِرَ نِصْفُ صَاعٍ) لە سەر هەبووەكە واجبە: نیو ساعی بەشە كۆیلەكەی خۆی سەرفیترە بدا، هیچیش لە سەر نەبووەكە واجب نیە (وَلَوْ أَيْسَرا) ئەگەر هەردوو هاوبەشەكان هەبوویی بون، بەڵام (وَاخْتَلَفَ وَاجِبُهُمَا) واجبەكەیان جیاواز بوو: وەك یەكێك گەنمی لە سەر بوو، ئەویتریش جۆ (أَخْرَجَ كُلُّ وَاحِدٍ نِصْفَ صَاعٍ) ئەو كاتە هەر یەكەیان نیو ساع سەرفیترە دەدا (مِنْ وَاجِبِهِ) لە خواردەمەنیەكەی خۆی (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَاللهُ أَعْلَم).

﴿ بابُ مَنْ تَلْزَمُهُ الزَّكاةُ وَما تَجِبُ فِيه ﴾

**(باسی ئەو كەسانەی زەكاتیان لە سەر واجبەو ئەو حاڵەتانەی تێیاندا واجبە)**

(شَرْطُ وُجُوبِ زَكَاةِ الْمَالِ) مەرجی واجببوونی زەكاتی ماڵ، ئەوەیە: (اَلإِسْلاَمُ) خاوەن ماڵەكە موسڵمان بێ (وَالْحُرِّيَّةُ) هەم ئازاد بێ، كەوابو: كۆیلە زەكاتی لە سەر نیەو هەروەهاش كافری

وَتَلْزَمُ الْمُرْتَدَّ إِنْ أَبْقَيْنَا مِلْكَهُ، دُونَ الْمُكَاتَب، وَتَجِبُ فِي مَالِ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُون، وَكَـذَا عَلَى مَنْ مَلَكَ بِبَعْضِهِ الْحُرِّ نِصَاباً فِي الأَصَحِّ، وَفِي الْمَغْصُوب وَالضَّـالِّ وَالْمَجْحُـود فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ يَجِبُ دَفْعُهَا حَتَّى يَعُودَ،

---

بنەڕەتی زەکاتی لە سەر نیە، واتە: کە بووە موسڵمان زەکاتی ڕابردووی لە سەر لادەچێ، بەڵام (وَتَلْزَمُ الْمُرْتَدَّ) زەکات لە سەر موسڵمانی کافربوو واجبە (إِنْ أَبْقَيْنَا مِلْكَهُ) ئەگەر بڵێین: ملکایەتی‌ی دەمێنێ، بەڵام لە فەرموودەی ڕاستتردا ملکایەتیەکەی ڕادەگیرێ: ئەگەر ببێتەوە موسڵمان، ملکایەتی‌ی دەمێنێو واجبە: زەکاتەکەی بدا، ئەگەر نا: نا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(دُونَ الْمُكَاتَبِ) بەڵام لە سەر کۆیلەی نووسراو پێدراو واجب نیە، هەروەها لە سەر کۆرپەی ناو زگیش واجب نیە، چونکە هەبوونی بێگومان نیە، هەروەها ماڵی (وقف)کراو بۆ سەر ڕوویێکی گشتی زەکاتی تێدا نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَجِبُ) زەکات واجبە (فِي مَالِ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ) لە ماڵی منداڵو شێتدا، چونکە لە حەدیسەکەدا هاتووە: ﴿هَذِهِ فَرِيضَةُ الصَّدَقَةِ الَّتِي فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الْمُسْلِمِينَ﴾ رواه البخاري وأصحاب السنن، ئەمە ئەندازەی ئەو زەکاتەیە: کە پێغەمبەر ﷺ لە سەر موسڵمانانی واجب کردوە. واتە: (الْمُسْلِمِين) منداڵو شێتیش دەگرێتەوە.

ئینجا بزانە: واجبە: سەرپەرشتکارەکەی شێتو منداڵ زەکاتەکەیان بۆ بدا، جا ئەگەر نەیدا، گوناهبار دەبێو هەر کاتێکیش منداڵەکە بڵۆغی بوو، شێتەکەش چاك بۆوە، واجبە: زەکاتەکەی گشت ساڵەکانی‌ڕابردوو بدەن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (وَكَذَا) هەروەها زەکات واجبە: (عَلَى مَنْ مَلَكَ بِبَعْضِهِ الْحُرِّ نِصَاباً) لە سەر ئەو کۆیلە بەشکراوەی، بە بەشە ئازادیەکەی ڕادەی زەکاتی وەدەست هێناوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

## ﴿باسی زەکاتی قەرزو ماڵی داگیرکراو﴾

(وَفِي الْمَغْصُوبِ) زەکات واجبە: لە ماڵی داگیرکراودلو (وَالضَّالِّ) لە ماڵی ونبوودلو (وَالْمَجْحُودِ) لە ماڵی ئینکارکراودا: وەك بە ئەمانەت لە لای‌کەسێکی دانابێ، کەسەکەش بڵێ: لە لای من داتنەناوە. شاهیدیش نەبو، هەروەها لە ماڵی دزراودلو لە ماڵی شاردراوەدا: کە شوێنەکەی نەناسێتەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، بەڵام (وَلاَ يَجِبُ دَفْعُهَا) واجب نیە: پێش وەدەستکەوتنەوەی ئەو ماڵەی‌ڕابردوو زەکات بدا، بەڵکو چاوەڕوان دەکا (حَتَّى يَعُودَ) تا ماڵەکەی بۆ دەگەڕێتەوە، ئەو کاتە زەکاتی گشت ساڵەکانی‌ڕابردوو دەدا، کەواتە: ئەگەر ئەو جۆرە ماڵانەی‌ڕابردوو–پاش چەند ساڵێك–

وَالْمُشْتَرَى قَبْلَ قَبْضِه، وَقِيلَ فِيهِ الْقَوْلَانِ، وَتَجِبُ فِي الْحَالِ عَنِ الْغَائِبِ إِنْ قَدَرَ عَلَيْهِ، وَإِلاَّ فَكَمَغْصُوبٍ، وَالدَّيْنُ إِنْ كَانَ مَاشِيَةً أَوْ غَيْرَلاَزِمٍ كَمَالِ كِتَابَةٍ فَلاَزَكَاةَ، أَوْ عَرْضاً أَوْ نَقْداً فَكَذَا فِي الْقَدِيمِ،

---

بفەوتێن‌و نەکەونەوە بەر دەستی خاوەنەکەیان، ئەو کاتە زەکاتی ئەو ماڵانەی لە سەر لادەچێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: زەکاتی گشت ساڵەکانی‌ڕابردوو، لەو حاڵەتەدا واجبە: کە ماڵەکەی لە ڕادەیەکی زەکات زیاتر بێ، یان تەنها ڕادەیەك بێ‌و لە لای خۆی هەندێ ماڵی‌تری لەو ڕەگەزەی هەبێ، چونکە ئەگەر تەنها ڕادەیەك بێ‌و هیچی‌تریشی نەبێ، ئەو کاتە تەنها زەکاتی ساڵی یەکەم واجب دەبێ، چونکە بۆ ساڵەکانی‌تر ڕادەی زەکات کەم دەبێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە مەزهەبی‌ئیمام(مالك)دا: ماڵی‌داگیرکراو-کە چاوەڕوانی گەڕاندنەوەی دەکا- هەم ماڵی‌ونبوو-هەر کاتێك بۆی گەڕاوە- هەر یەکەیان زەکاتی تەنها یەك ساڵی تێدا واجبە بۆ گشت ئەو ساڵانەی بە سەریدا ڕابردوە، هەروەك لە(شرح الموطأ)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالْمُشْتَرَى قَبْلَ قَبْضِهِ) هەروەها زەکات لەو ماڵەشدا واجبە: کە کڕیویەتی‌و هێشتا نەیقەبڵاندوەو وەری‌نەگرتوە، واتە: کە لە کڕینیەوە ساڵێك تەواو بوو، واجبە زەکاتەکەی بدا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی‌بێ‌هێزدا (فِيهِ الْقَوْلاَنِ) لەو کڕاوەشدا دوو فەرموودەکە هەنە: بەهێزو بێ‌هێز، وەك ئەو ماڵانەی‌ڕابردوو.

(وَيَجِبُ فِي الْحَالِ) هەر ئەو دەمەی کاتی زەکات هات، واجبە: زەکاتەکە بدا (عَنِ الْغَائِبِ) لەو ماڵەی لە لای خۆی نیە (إِنْ قَدَرَ عَلَيْهِ) ئەگەر دەسەڵاتی بە سەردا هەبێ: وەك بە ئاسانی بیگاتێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی بە سەردا نەبێ: وەك ڕێگەکە بە ترس بێ، یان هەواڵی ماڵەکەی نەزانێ (فَكَمَغْصُوبٍ) ئەوەش وەك ماڵی داگیرکراو ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، واتە: هەر کاتێك کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی‌خۆی واجبە: زەکاتی ساڵەکانی‌ڕابردوو بدا.

(وَالدَّيْنُ) ماڵی بەقەرزدراو (إِنْ كَانَ مَاشِيَةً) ئەگەر ئاژەڵ بێ: وەك چل مەڕ بە قەرز بداو ساڵێکی لە سەر بسوڕێتەوە (أَوْ غَيْرَ لاَزِمٍ) یان قەرزەکە دانەوەی واجب نەبێ (كَمَالِ كِتَابَةٍ) وەکو ماڵی نوسراوپێدان: وەك بڵێتە کۆیلەکەی دووسەد دیرهەمم بۆ بێنە ئازادت دەکەم (فَلاَ زَكَاةَ) ئەو دوو جۆرە قەرزانە زەکاتیان تێدا واجب نیە، چونکە بەخۆی ئاژەڵەکانی نەلەوەڕاندوە، کۆیلەکەش دەتوانێ نوسراوپێدرانەکەی هەڵبوەشێنێتەوە (أَوْ عَرْضاً) یان قەرزەکەی کەلوپەلی بازرگانی بوو (أَوْ نَقْداً) یان پارە بوو (فَكَذَا) ئەوانەش زەکاتیان تێدا نیە (فِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی کۆندا.

وَفِي الْجَدِيد إنْ كَانَ حَالاً وَتَعَذَّرَ أَخْذُهُ لإِعْسَارٍ وَغَيْرِهِ فَكَمَغْصُوب، وَإِنْ تَيَسَّرَ وَجَبَتْ تَزْكِيَتُهُ فِي الْحَالِ، أَوْ مُؤَجَّلاً فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ كَمَغْصُوب، وَقِيلَ يَجِبُ دَفْعُهَا قَبْلَ قَبْضِه،

---

بەلام (وَفِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نویدا، کە-بە یەکدەنگی زانایانیمەزهەب-بە بەهێز داندراوە: (إِنْ كَانَ حَالاً) ئەگەر قەرزەکەی کاتی دانەوەی هاتبو، بەلام (وَتَعَذَّرَ أَخْذُهُ) نەدەکرا وەریبگرێتەوە (لإِعْسَارٍ) چونکە قەرزدارەکە هیچی نەبو (وَغَيْرِهِ) یان لە بەر هۆیەکیتر: وەك ئینکاری بکاو بلێ: قەرزدارت نیم. شاهیدیش نەبو، یان بە ڕقەکاری نەیداتەوە، یان خۆی شاردبێتەوە (فَكَمَغْصُوبٍ) ئەو جۆرە قەرزە وەکو مالی داگیرکراوە، واتە: هەرکاتێك قەرزەکەی وەرگرتەوە، واجبە: زەکاتی گشت سالەکانیڕابردووی لێبدا، بەو شێوەیەی لە باسی مالیداگیرکراودا ڕوونمان کردەوە.

(وَإِنْ تَيَسَّرَ) بەلام ئەگەر وەرگرتنەوەی قەرزەکە ئاسان بوو: چونکە قەرزدارەکە مالی هەبو و دانی بە قەرزەکەشدا هێنا، یان شاهید هەبو، ئەوە کە کاتی زەکاتیقەرزەکە داهات (وَجَبَتْ تَزْكِيَتُهُ فِي الْحَالِ) واجبە: خاوەن قەرزەکە لە لای خۆی یەکسەر زەکاتی قەرزەکە بدا، هەر چەند قەرزەکەشی وەرنەگرتبێتەوە.

(أَوْ مُؤَجَّلاً) یان ئەگەر قەرزەکە هێشتا کاتیدانەوەی نەهاتبو و سالیشی سوڕاوە (فَالْمَذْهَبُ) فەرموودەی ڕاستی مەزهەب ئەمەیە (أَنَّهُ كَمَغْصُوبٍ) ئەو جۆرە قەرزەش وەکو مالی داگیرکراوە، واتە: هەر کاتێك وەریگرتەوە زەکاتەکەیڕابردووی لێدەدا (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَجِبُ دَفْعُهَا قَبْلَ قَبْضِهِ) واجبە پێش وەرگرتنەوەی زەکاتەکەی بدا.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: هەر کاتێك سالێك، یان چەند سالێك بە سەر مالە بەقەرزدراوەکەدا سوڕاوە، ئینجا خاوەنەکەی گەردەنی قەرزدارەکەی ئازاد کرد، ئەوە لە ئەندازەیزەکات گەردەنی ئازاد نابێ، چونکە ئەندازەیزەکات لە گشت سالێکدا دەبێتە ملکی گەداو هەژاران، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر خاوەنەکە بە قەرزدارەکەی بلێ: قەرزەکەم لێت وەرناگرمەوەو بە بەر زەکاتی دێخم. یان بلێ: ئەوەندەم کردە زەکاتی قەرزەکەم. قەرزدارەکەش قبولْ بکا، ئەوە دروست نابێو بە بەر زەکات ناکەوێ، هەروەهاش دروست نیە: بەو مەرجە زەکات بداتە قەرزدارەکەی: کە لێی قبولْ بکا، ئینجا لەجیاتی قەرزەکەی بیداتەوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ئەو دوو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

سێیەم: لە مەزهەبیئیمام(مالك)دا: قەرزی وەرگیرایەوە لە دوایچەند سالێك، زەکاتی تەنها یەك سالی واجبە لێبدرێ، هەرچەند زۆر سالانیش لە لایقەرزدارەکە مابێتەوە، بەلام قەرزی بازرگانیهەلسوڕێنەر-کە لە بری کەلوپەلیبازرگانیەکەیە- وەك کەلوپەلی بازرگانیەکە بڕیاری

وَلاَ يَمْنَعُ الدَّيْنُ وُجُوبَهَا فِي أَظْهَرِ الأَقْوَالِ، وَالثَّالِثُ يَمْنَعُ فِي الْمَالِ الْبَاطِنِ: وَهُوَ النَّقْدُ وَالْعَرْضُ، فَعَلَى الأَوَّلِ لَوْ حُجِرَ عَلَيْهِ لِدَيْنٍ فَحَالَ الْحَوْلُ فِي الْحَجْرِ فَكَمَغْصُوبٍ، وَلَوْ اجْتَمَعَ زَكَاةٌ وَدَيْنُ آدَمِيٍّ فِي تَرِكَةٍ قُدِّمَتْ، وَفِي قَوْلٍ الدَّيْنُ وَفِي قَوْلٍ يَسْتَوِيَانِ، وَالْغَنِيمَةُ قَبْلَ الْقِسْمَةِ إِنِ اخْتَارَ الْغَانِمُونَ تَمَلُّكَهَا

---

بۆ دەدرێو واجبە: زەكاتیگشت ساڵەكانی لێبدا، هەروەك لە كتێبەكانی مەزهەبی (مالكی)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلاَ يَمْنَعُ الدَّيْنُ وُجُوبَهَا) قەرزداری ڕێگەی واجببوونی زەكات ناگرێ (فِي أَظْهَرِ الأَقْوَالِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، جیاوازی نیە قەرزەكە: قەرزی خوای گەورە بێ، یان هی ئادەمیزاد بێ، كاتی دانەوەی هاتبێ، یان نا، لە هەموو حاڵەتێكدا واجبە: قەرزدارەكە زەكاتی ماڵی خۆی بدا. لە فەرموودەی دووەمدا ڕێگە دەگرێ.

(وَالثَّالِثُ) فەرموودەی سێیەم: (يَمْنَعُ فِي الْمَالِ الْبَاطِنِ) لە ماڵی نادیاردا ڕێگە دەگرێ (وَهُوَ النَّقْدُ وَالْعَرْضُ) ماڵی نادیار پارەو كەلوپەلی بازرگانییە، بەلام لە ماڵی بەرچاودا ڕێگە ناگرێ: وەك ئاژەڵو میوەو دانەوێڵەو كانگە.

(فَعَلَى الأَوَّلِ) لە سەر فەرموودەی یەكەمی بەهێزتر (لَوْ حُجِرَ عَلَيْهِ) ئەگەر قەرزدارەكە (حجر)ی لە سەر داندرا، واتە: قەدەغە كرا دەستكاری ماڵی خۆی بكا (لِدَيْنٍ) بە هۆی قەرزێك (فَحَالَ الْحَوْلُ فِي الْحَجْرِ) ئینجا ساڵ بە سەر ماڵەكەیدا سوڕاوەو هەر لەژێر (حجر)دا بوو (فَكَمَغْصُوبٍ) ئەوە گشت ماڵەكەی وەكو ماڵی داگیركراوە، واتە: ئەگەر گەردەنی ئازاد كرا، یان یەكێك قەرزەكەی لە جیاتی داوە، ئەو كاتە ماڵەكەی بۆ دەگەڕێتەوەو واجبە: زەكاتی ڕابردووی بدا، بەلام ئەگەر ماڵەكەی قەرزی پێ دراوە خاوەن قەرزەكانو هیچی نەماوە، ئەو كاتە زەكاتی ئەو ماڵەی لە سەر لا دەچێ.

(وَلَوِ اجْتَمَعَ زَكَاةٌ وَدَيْنُ آدَمِيٍّ) ئەگەر زەكاتو قەرزی ئادەمیزادێك كۆ بونەوە (فِي تَرِكَةٍ) لە میراتێكدا: وەك یەكێك زەكاتی نەدابێو قەرزداری ئادەمیزادێكیش بێ، ئینجا بمرێو میراتەكەشی بەشی قەرزو زەكاتەكە نەبێ (قُدِّمَتْ) زەكاتەكە وەپێش قەرزەكە دێخرێ، هەروەها حەجو كەففارەتو نەزریش وەپێش قەرزی ئادەمیزادان دێخرێن، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ﴾رواه الشيخان، قەرزی خوایگەورە لەپێشترە: كە بدرێتەوە. (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا (الدَّيْنُ) قەرزی ئادەمیزاد لەپێشترە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودیەكیتردا (يَسْتَوِيَانِ) قەرزو زەكات هەردووكیان یەكسانن‌و ماڵەكەیان بە سەردا بەش دەكرێ.

(وَالْغَنِيمَةُ) تالان، واتە: ئەو ماڵەی لە جەنگی كافراندا دەست دەكەوێ (قَبْلَ الْقِسْمَةِ) پێش ئەوەی بەش بكرێ: (إِنِ اخْتَارَ الْغَانِمُونَ تَمَلُّكَهَا) ئەگەر جەنگاوەرە موسوڵمانەكان

وَمَضَى بَعْدَهُ حَوْلٌ وَالْجَمِيعُ صِنفٌ زَكَوِيٌّ وَبَلَغَ نَصِيبُ كُلِّ شَخْصٍ نِصَاباً أَوْ بَلَغَهُ الْمَجْمُوعُ فِي مَوْضِعِ ثُبُوتِ الْخُلْطَةِ وَجَبَتْ زَكَاتُهَا، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ أَصْدَقَهَا نِصَابَ سَائِمَةٍ مُعَيَّناً لَزِمَهَا زَكَاتُهُ إِذَا تَمَّ حَوْلٌ مِنَ الإِصْدَاقِ،

---

ئەوەیان هەڵبژارد: بیکەنە ملکی خۆیان (وَمَضَى بَعْدَهُ حَوْلٌ) لە پاش هەڵبژاردنەکەش ساڵێك تەواو بوو (وَالْجَمِيعُ صِنفٌ زَكَوِيٌّ) گشت تالانەکەش لەو جۆرە بوو: کە زەکاتی تێدا واجب بوو (وَبَلَغَ نَصِيبُ كُلِّ شَخْصٍ نِصَاباً) بەشی هەر نەفەرێکیش گەیشتە ڕادەی زەکات (أَوْ بَلَغَهُ الْمَجْمُوعُ) یان کۆی بەشی هەموویان گەیشتە ڕادەی زەکات (فِي مَوْضِعِ ثُبُوتِ الْخُلْطَةِ) لەو حاڵەتەی مەرجەکانی ماڵی تێکەڵاوی لێ‌دێتەجێ (وَجَبَتْ زَكَاتُهَا) واجبە: زەکاتی تالانەکە بدرێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر مەرجێك لەو مەرجانەی‌ڕابردوو نەبو (فَلاَ) زەکاتی تێدا واجب نیە.

## ﴿ زەکاتی مارەیی ژن ﴾

(وَلَوْ أَصْدَقَهَا نِصَابَ سَائِمَةٍ) ئەگەر مێرد ڕادەیەکی زەکات ئاژەڵی لەوەڕاوی کردە مارەیی ژنەکەی (مُعَيَّناً) ڕادە زەکاتەکەش دیارکراو بێ: وەك بڵێ: ئەم چل مەڕەم مارەیی تۆ بێ (لَزِمَهَا زَكَاتُهُ) لە سەر ژنەکە واجبە: زەکاتی ڕادەی زەکاتەکە بدا (إِذَا تَمَّ حَوْلٌ) هەر کاتێك ساڵێك تەواو بوو (مِنَ الإِصْدَاقِ) لەو کاتەوە: کە ئاژەڵەکان کراونەتە مارەیی، جیاوازی نیە: وەری‌گرتبێ، یان نا، جیماعی لەگەڵ ژنەکەی کردبێ، یان نا، هەر دەبێ ژنەکە زەکاتی بدا.

بەڵام ئەگەر چل مەڕەکەی دیاری نەکرد: وەك بڵێ: چل مەڕ مارەیی تۆ بێ. ئەو کاتە زەکاتی مەڕەکان لە سەر ژنەکە واجب نیە؟چونکە لەوەڕاندنی دیار نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر زێڕ، یان زیو، یان پارەی کردە مارەیی ژنەکەی‌و گەیشتە ڕادەی زەکات‌و ساڵێکی بە سەردا سوڕاوە، ئەویش هەر لە سەر ژنەکە واجبە: زەکاتەکەی بدا، هەر چەند زێڕو زیو و پارەکەش دیارنەکراوبن‌و ژنەکەش وەری‌نەگرتبێ‌و جیماعی لەگەڵ نەکردبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

کەواتە: ئەگەر گەردەنی مێردەکەی ئازاد بکا، ئەوە لە ئەندازەی زەکات گەردەنی ئازاد نابێ‌و هەر دەبێ زەکاتەکەی‌ڕابردوو بدا، هەروەك لە ئاگاداریەکەی‌ڕابردوودا ڕوونمان کردوە.

ئینجا ئەگەر ژنەکە داوای مارەیی لە مێردەکەی کرد، مێردەکەش مارەیی نەدایێ، ئەو کاتە مارەیەکە وەك ماڵی‌داگیرکراوە، واتە: هەر کاتێك لێی وەرگرتەوە، واجبە: زەکاتی ساڵانی‌ڕابردوو گشتی بدا، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَلَوْ أَكْرَى دَاراً أَرْبَعَ سِنِينَ بِثَمَانِينَ دِينَاراً وَقَبَضَهَا فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ لاَيَلْزَمُهُ أَنْ يُخْرِجَ إِلاَّ زَكَاةَ مَااسْتَقَرَّ، فَيُخْرِجُ عِنْدَ تَمَامِ السَّنَةِالأُولَى زَكَاةَ عِشْرِينَ، وَلِتَمَامِ الثَّانِيَةِ زَكَاةَ عِشْرِينَ لِسَنَةٍ وعِشْرِينَ لِسَنَتَيْنِ، وَلِتَمَامِ الثَّالِثَةِ زَكَاةَ أَرْبَعِينَ لِسَنَةٍ وَعِشْرِينَ لِثَلاَثِ سِنِينَ، وَلِتَمَامِ الرَّابِعَةِ زَكَاةَ سِتِّينَ لِسَنَةٍ وَعِشْرِينَ لأَرْبَعٍ، وَالثَّانِي يُخْرِجُ لِتَمَامِ الأُولَى زَكَاةَ الثَّمَانِينَ.

(فَصْلٌ) تَجِبُ الزَّكَاةُ عَلَىالْفَوْرِ إِذَا تَمَكَّنَ: وَذَلِكَ بِحُضُورِ الْمَالِ وَالأَصْنَافِ،

---

(وَلَوْ أَكْرَى دَاراً) ئەگەر خانوویكی بە كرێ دا (أَرْبَعَ سِنِينَ) بۆ ماوەی چوار ساڵان (بِثَمَانِينَ دِينَاراً) بە هەشتا دینار (وَقَبَضَهَا) هەشتا دینارەكەشی یەكسەر هەموو وەرگرتو تا كۆتایی چوار ساڵەكانیش لە لای مابۆوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ لاَ يَلْزَمُهُ أَنْ يُخْرِجَ) لە سەر خاوەن خانووەكە واجب نیە زەكاتی هەموو كرێیەكە ئێستا بدا، بەڵكو (إِلاَّ زَكَاةَ مَااسْتَقَرَّ) تەنها زەكاتی ئەو بەشە كرێیە دەدا: كە جێگیر بووەو بە تەواوی بووەتە ملكیخۆی.

كەوابو: (فَيُخْرِجُ عِنْدَ تَمَامِ السَّنَةِالأُولَى زَكَاةَ عِشْرِينَ) كە ساڵی یەكەم تەواو بوو، زەكاتی بیست دینار دەدا، چونكە تازە بیست دینارەكە بە تەواوی بووتە ملكی خۆی (وَلِتَمَامِ الثَّانِيَةِ) كە ساڵی دووەم تەواو بوو (زَكَاةَ عِشْرِينَ لِسَنَةٍ) بیست دینارەكەی ساڵییەكەم زەكاتی ساڵێكیتریشی لێدەداو (وَعِشْرِينَ لِسَنَتَيْنِ) بیستەكەی ساڵیدووەمیش -كە هیچ زەكاتی لێنەدراوە- زەكاتی دوو ساڵیڕابردووی پێكەوە لێدەدا (وَلِتَمَامِ الثَّالِثَةِ) كە ساڵیسێیەم تەواو بوو (زَكَاةَ أَرْبَعِينَ لِسَنَةٍ) زەكاتی چل دینار بۆ ساڵێكیتریش دەدا، واتە: بیستەكەی یەكەمو دووەم (وَعِشْرِينَ لِثَلاَثِ سِنِينَ) بیستەكەی ساڵیسێیەمیش -كە هیچ زەكاتی لێنەدراوە- زەكاتی سێ ساڵیڕابردووی پێكەوە لێدەدا (وَلِتَمَامِ الرَّابِعَةِ) كە ساڵی چوارەم تەواو بوو (زَكَاةَ سِتِّينَ لِسَنَةٍ) زەكاتی شەست دینار بۆ ساڵێكیتر دەدا، واتە: بیستەكەی یەكەمو دووەمو سێیەم (وَعِشْرِينَ لأَرْبَعٍ) بیستەكەیساڵیچوارەمیش زەكاتی چوار ساڵیڕابردووی پێكەوە لێدەدا، جا ئەمەیان لە سەر فەرموودەی یەكەمی بەهێزتر بوو (وَالثَّانِي) فەرموودەی دووەم: (يُخْرِجُ لِتَمَامِ الأُولَى زَكَاةَ الثَّمَانِينَ) هەر كە ساڵی یەكەم تەواو بوو، واجبە: زەكاتی هەموو هەشتا دینارەكە بدا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی شێوەی زەكاتدان ﴾

(تَجِبُ الزَّكَاةُ عَلَىالْفَوْرِ) واجبە: دەمودەست زەكات بدرێ هەر كاتێك ساڵ تەواو بوو، هەم (إِذَا تَمَكَّنَ) هەر كاتێك بۆی گونجا زەكاتەكەی بدا (وَذَلِكَ) گونجانی زەكاتدان (بِحُضُورِ الْمَالِ) بەوەیە: ماڵەكەی لە لایخۆی بێو (وَالأَصْنَافِ) ئەو چینانەی زەكاتیش وەردەگرن

وَلَهُ أَنْ يُؤَدِّيَ بِنَفْسِهِ زَكَاةَ الْمَالِ الْبَاطِنِ وَكَــذَاالظَّاهِرِ عَلَىالْجَدِيــدِ، وَلَــهُ التَّوْكِيــلُ وَالصَّرْفُ إِلَىالإِمَامِ،

---

ئامادە بن، یان جێگری ئەوان ئامادەبێ، کەواتە: ئەگەر ماڵەکەی لە لایخۆی نەبو، یان کەسی دەست نەکەوت زەکاتەکەی بداتێ، ئەو کاتە چاوەڕوان دەکاو گوناهبار نابێ، بەڵام ئەگەر گونجا زەکاتەکە بداو بە قەسدی نەیداو ماڵەکەشی فەوتا، ئەوە گوناهبار دەبێو زەکاتی لە سەر لا ناچێو هەر واجبە زەکاتەکە بدا.

هەروەها ئەگەر خاوەن ماڵەکە بشمرێ، هەر واجبە: لە میراتەکەی زەکاتەکەینەدراو بدرێ، بەڵکو ئەگەر چەند ساڵێك زەکاتی نەدابێ، واجبە: زەکاتی گشت ساڵەکان بدرێ، جا خاوەنەکە زیندوو بێ، یان مردبێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە، بەبەڵگەی حەدیسەکەی﴿فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ﴾یڕابردوو.

(وَلَهُ) بۆ زەکاتدەرەکە دروستە: (أَنْ يُؤَدِّيَ بِنَفْسِهِ زَكَاةَ الْمَالِ الْبَاطِنِ) هەر بەخۆی زەکاتی ماڵی نادیار بداو بەشی بکا: وەك زەکاتی پارەو بازرگانیو سەرفیترە (وَكَذَا الظَّاهِرِ) هەروەها بۆی دروستە: زەکاتی ماڵی بەرچاویش بەخۆی بداو بەشی بکا: وەك زەکاتی ئاژەڵو میوەو دانەوێڵە (فِيالْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێدا.

(وَلَـهُ التَّوْكِيـلُ) هەروەها بۆ زەکاتدەرەکە دروستە یەکێك بکاتە وەکیلی خۆی: تاکو زەکاتەکەی بۆ بەش بکا (وَالصَّرْفُ إِلَىالأَمَـامِ) هەروەها بۆی دروستە: زەکاتەکەی بداتە دەست پێشەوای موسوڵمانان، یان جێگری پێشەوا، چونکە پێشەوا جێگری ئەو هەشت کەسانەیە: کە زەکاتیان دەدرێتێ.

﴿ ئاگــاداری ﴾ هەر کاتێك زەکاتدەر زەکاتەکەی دایە دەست پێشەوا، یان جێگری پێشەوا، ئەوە زەکاتەکەی لە سەر لا دەچێ، هەر چەند زەکاتەکەش لە لای ئەوان بفەوتێو بەشی نەکەن، بەڵام ئەگەر بیداتە وەکیلو لە لای وەکیلەکە بفەوتێو بەشی نەکردبێ، ئەو کاتە زەکاتەکەی لە سەر لا ناچێو واجبە: دیسان زەکاتەکەی بدا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا ئەگەر پێشەوا، یان جێگرەکەی کەمتەرخەمییان کردبێ: وەك زەکاتەکەیان نەپاراستبێ، یان بەشکردنیان دواخستبێ، واجبە: ئەوان تۆڵەی زەکاتەکە بدەنە هەژاران، ئەگەرنا: نا، هەروەها ئەگەر وەکیلەکەش –جگە لە دواخستنی بەشکردن– کەمتەرخەمیتری کردبێ، واجبە تۆڵەی زەکاتەکە بداتەوە زەکاتدەرەکە، بەڵام ئەگەر کەمتەرخەمی نەکردبێ، تۆڵەی لە سەر نیە، هەرچەند بەشکردنی زەکاتەکەشی دواخستبێ، چونکە وەکیلەکە بەشکردنی زەکاتەکەی لە سەر واجب نیە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَظْهَرُ أَنَّ الصَّرْفَ إِلَى الإِمَامِ أَفْضَلُ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ جَائِراً، وَتَجِبُ النِّيَّةُ: فَيَنْوِي هَذَا فَرْضُ زَكَاةِ مَالِي، أَوْ فَرْضُ صَدَقَةِ مَالِي وَنَحْوَهُمَا، وَلاَ يَكْفِي هَذَا فَرْضُ مَالِي وَكَذَا الصَّدَقَةُ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بە هێزتر: (أَنَّ الصَّرْفَ إِلَى الإِمَامِ أَفْضَلُ) وەها خێرترە: زەکاتەکەی بداتە پێشەوای موسولمانان؟ چونکە ئەگەر پێشەوا زەکاتەکەی لێوەربگرێ: بێگومان زەکاتەکەی لە ئەستۆ لادەچێ، ئەگەر پێشەوا بە ڕێگەیەکی شەرعیش بەشی نەکا، خاوەنەکە بەرپرسیار نیە ﴿عَنْ ابْنِ عمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: إِدْفَعُوا صَدَقَاتِكُمْ إِلَى مَنْ وَلاَّهُ اللهُ أَمْرَكُمْ، فَمَنْ بَرَّ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَثِمَ فَعَلَيْهَا﴾ رواه البيهقي باسناد صحيح، زەکاتەکانتان بدەنە کاربەدەستەکانتان، جا هەر کاربەدەستێك لە بەشکردنی زەکاتدا چاکەی کرد، ئەوە خێری چاکەکەی بۆ خۆیەتی، ئەگەر تاوانباریی کرد، تاوانەکەی لە سەر خۆیەتی.

(إِلاَّ أَنْ يَكُونَ جَائِراً) مەگەر پێشەوایەکە، یان جێگرەکەی ستەمکار بێ لە زەکاتدا، ئەو کاتە وەها خێرترە: بەخۆی زەکاتەکەی بەش بکا.

## ﴿ نیەتی زەکات ﴾

(وَتَجِبُ النِّيَّةُ) واجبە: لە زەکاتداندا نیەتی زەکات بهێندرێ، چونکە زەکات خواپەرستیە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر کردەوەیەکی خواپەرستی بێ بە نیەتەوە نەبێ دانامەزرێ. کەوابو: ئەگەر هەموو ماڵی خۆی ببەخشێ و بیکاتە خێرو نیەتی زەکاتیشی لێنەهێنێ، ئەوە زەکاتی لە سەر لا ناچێ، هەروەك ئەگەر نوێژێکی واجبی لە سەر بێ و سەد ڕەکعەت سوننەت بکا، بە بەر نوێژە واجبەکە ناکەوێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

کەوابو: (فَيَنْوِي) بە دڵ نیەت دێنێ و دەڵێ: (هَذَا فَرْضُ زَكَاةِ مَالِي) ئەمە واجبی زەکاتی ماڵی خۆمە (أَوْ فَرْضُ صَدَقَةِ مَالِي) یان ئەمە واجبی سەدەقەی ماڵی خۆمە (وَنَحْوَهُمَا) وێنەی ئەو دووانەش، وەك بڵێ: ئەمە زەکاتە واجبەکەی ماڵی خۆمە (وَلاَ يَكْفِي) بەڵام دروست نیە و بە بەر ناکەوێ بڵێ: (هَذَا فَرْضُ مَالِي) ئەمە واجبی ماڵی خۆمە، چونکە ئەو ووشەیە کەففارەت و نەزریش دەگرێتەوە (وَكَذَا الصَّدَقَةُ) هەروەها دروست نیە بڵێ: ئەمە سەدەقەی ماڵی خۆمە، چونکە خێرکردنیش دەگرێتەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: مەرج نیە لە نیەتەکەی یەکەم و سێیەمدا لە گەڵ ووشەی زەکاتدا، نیەتی واجبیش بێنێ، بەڵکو سوننەتە، کەوابو: ئەگەر بە دڵ بڵێ: ئەمە زەکاتی ماڵی خۆمە، یان ئەمە زەکاتمە. ئەو نیەتە دروست دەبێ، چونکە زەکات تەنها بۆ واجب بەکار دێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلاَ يَجبُ تَعْيِينُ الْمَالِ، وَلَوْ عَيَّنَ لَمْ يَقَعْ عَنْ غَيْرِه، وَيَلْزَمُ الْوَلِيَّ اَلنِّيَّةُ إِذَا أَخرَجَ زَكَاةَ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ، وَتَكْفِي نِيَّةُالْمُوَكِّلِ عِنْدَالصَّرْفِ إِلَىالْوَكِيلِ فِيالأَصَحِّ، وَالأَفْضَلُ أَنْ يَنْوِيَ الْوَكِيلُ عِنْدَ التَّفْرِيقِ أَيْضاً،

---

(وَلاَ يَجِبُ تَعْيِينُ الْمَالِ) واجب نيه: له نيەتەكەیدا ئەو ماڵه دیاری بكا: كه زەكاتی لێدەدا، وەك بڵێ: ئەمە زەكاتی فلانە ماڵەم بێ (وَلَوْ عَيَّنَ) بەڵام ئەگەر ماڵەكەی دیاری كرد (لَمْ يَقَعْ عَنْ غَيْرِهِ) بە بەر زەكاتی ماڵێكیتر ناكەوێ، بۆ وێنە: ئەگەر دووسەد دیرهەمی لێرە هەبو، دووسەدیتریشی لەوێ هەبو، ئەوە دروستە: دە دیرهەم زەكات بداو دیاریش نەكا: ئەم پێنجە بۆ ئەو دووسەدە بێو ئەمەش بۆ ئەویتر، هەروەها دروستە: تەنها پێنج دیرهەم بداو دیاریش نەكا: پێنجەكە زەكاتی كام دووسەدە؟ كەواتە: ئەگەر یەكێك لەو دووسەدانە فەوتا، دەتوانێ: پێنج دیرهەمەكە بكاتە زەكاتی ئەو دووسەدەی ماوە، بەڵام ئەگەر دیاری كردبو: كە پێنجەكە زەكاتی ئەم دووسەدە بێ، ئەوە نابێتە زەكاتی دووسەدەكەیتر، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوونی كردۆتەوە.

(وَيَلْزَمُ الوَلِيَّ اَلنِّيَّـةُ) لە سەر سەرپەرشتكار واجبە: نیەتی زەكات بێنێ (إِذَا أَخْرَجَ زَكَاةَ الصَّبِيِّ وَالْمَجْنُونِ) هەر كاتێك زەكاتی منداڵ، یان شێت بدا، وەك بە دڵ بڵێ: ئەمە زەكاتی فلانە منداڵە، یان فلانە شێتەیە، كەوابو: ئەگەر بە بێنیەتهێنان زەكاتەكەیان بدا، بە بەر زەكات ناكەوێو تۆڵەشی دەكەوێتە سەر، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَتَكْفِي نِيَّةُالْمُوَكِّلِ) نیەتی وەكیلگرەكە بەسە، واتە: ئەگەر زەكاتدەرەكە وەكیلێك بگرێ بۆ بەشكردنی زەكات، ئەوە دروستە نیەتی زەكاتەكەی بێنێ (عِنْدَالصَّرْفِ إِلَىالْوَكِيلِ) لەو كاتەی زەكاتەكەی دەداتە دەست وەكیلەكەی (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، جا ئەگەر وەكیلەكە نیەتیش نەهێنێ هەر دروست دەبێ، بەڵام (وَالأَفْضَلُ) ئەوها خێرترە (أَنْ يَنْوِيَ الْوَكِيلُ) وەكیلەكەش نیەت بێنێ (عِنْدَالتَّفْرِيقِ أَيْضاً) لە كاتی بەشكردنی زەكاتەكە، بەڵام ئەگەر وەكیلگرەكە نیەت نەهێنێ، ئەوە زەكاتەكە دروست نابێ، هەر چەند وەكیلەكەش نیەت بێنێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لەو كاتەی زەكاتەكەی دەداتە زەكاتوەرگرەكە، دروستە: نیەتی زەكات بێنێ، هەم پێشداش دروستە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

كەوابو: ئەگەر ئەندازەی زەكاتی جیا كردەوەو لەو كاتدا نیەتیزەكاتی لێهێنا، یان لە مەودوا–پێش بیداتە زەكاتوەرگرەكە– نیەتی هێنا، ئەو نیەتەشی دروست دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەروەها بزانە: ئەگەر ئەندازەیەكی بۆ زەكات جیا كردەوە، مەرج نیە: هەر ئەو ئەندازەیەش لە زەكاتدا بدا، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا فەرموویانە، واتە: دروستە: ئەو ئەندازەیە بۆ خۆی دابنێتەوەو ئەندازەیەكیتر لە زەكاتدا بدا.

وَلَوْ دَفَعَ إِلَى السُّلْطَان كَفَت النِّيَّةُ عِنْدَهُ، فَإِنْ لَمْ يَنْوِ لَمْ يُجْزِئ عَلَى الصَّحِيحِ وَإِنْ نَوَى السُّلْطَانُ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يَلْزَمُ السُّلْطَانَ النِّيَّةُ إِذَا أَخَذَ زَكَاةَ الْمُمتَنِعِ وَأَنَّ نِيَّتَهُ تَكْفِي.

(فَصْلٌ) لايَصِحُّ تَعْجِيلُ الزَّكَاةِ عَلَى مِلْكِ النِّصَابِ، وَيَجُوزُ قَبْلَ الْحَوْلِ، وَلاَ تُعَجَّلُ لِعَامَيْنِ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَلَوْ دَفَعَ إِلَى السُّلْطَانِ) ئەگەر زەكاتەكەی دایە دەست گەورەی موسوڵمانان، یان جێگرەكەی (كَفَت النِّيَّةُ عِنْدَهُ) لەو كاتەی دەیداتە دەستی‌وی، نیەتەكەی بەسەو دروست دەبێ، هەر چەند كاربەدەستەكەش نیەت نەهێنێ.

(فَإِنْ لَمْ يَنْوِ) بەڵام ئەگەر خاوەنەكە لەو كاتدا نیەت نەهێنێ (لَمْ يُجْزِئ) زەكاتەكەی دروست نابێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست (وَإِنْ نَوَى السُّلْطَانُ) هەر چەند كاربەدەستەكەش نیەتی زەكات بێنێ، هەر دروست نابێ.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يَلْزَمُ السُّلْطَانَ النِّيَّةُ) لە سەر كاربەدەست واجبە: نیەتی زەكات بێنێ (إِذَا أَخَذَ زَكَاةَ الْمُمْتَنِعِ) لەو كاتەی زەكات لە زەكاتنەدەر دەستێنێ (وَأَنَّ نِيَّتَهُ تَكْفِي) ئەو نیەتەی كاربەدەست بە سەو بە بەر نیەتی زەكاتنەدەرەكەش دەكەوێ: بۆ دونیاو قیامەت، بەڵام ئیمامی(الغزالی) لە (احیاء العلوم)دا دەفەرموێ: بۆ قیامەت زەكاتەكەی هەر لە ئەستۆدا دەمێنێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر لەو كاتەی زەكاتەكەی لێ‌دەستێندرێ، نیەت بێنێ، ئەوە بێگومان لە دونیاو قیامەت زەكاتی لە سەر لا دەچێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی وەپێشخستنی زەكات ﴾

(لاَ يَصِحُّ) دروستە نیە (تَعْجِيلُ الزَّكَاةِ) زەكات وەپێش بێخرێ (عَلَى مِلْكِ النِّصَابِ) لە سەر هەبوونی ڕادەی زەكات، وەك ئێستا سەد دیرهەمی زیوی هەبێ، یان سی بزنی هەبێ، ئینجا پێنج دیرهەم، یان بزنێك زەكات بدا، تاكو ئەگەر بووە دووسەد دیرهەم، یان چل بزن، ئەوەی داویەتی ببێتە زەكات، ئەو زەكاتە دروست نابێ‌و بە بەر ناكەوێ.

بەڵام (وَيَجُوزُ) دروستە زەكاتەكەی بدا (قَبْلَ الْحَوْلِ) پێش تەواوبوونی‌ساڵ، بەو مەرجەی ماڵەكەی گەیشتبێتە ڕادەی زەكاتو ساڵەكەش دامەزرابێ، واتە: دروستە: هەر لە سەرەتای ساڵەوە بیدا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ الْعَبَّاسَ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فِي تَعْجِيلِ صَدَقَته قَبْلَ أَنْ تَحِلَّ؟ فَرَخَّصَ لَهُ فِي ذَلِكَ﴾رواه ابوداود والترمذي باسناد حسن، ئیمامی(عباس) پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ كرد: ئایا دروستە پێش تەواوبوونی ساڵ زەكاتەكەی بدا؟ پێغەمبەرﷺ ئیزنی دا. بەڵام (وَلاَ تُعَجَّلُ لِعَامَيْنِ) دروست نیە: بۆ دوو ساڵ، یان زیاتر زەكات وەپێش بێخرێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونكە زەكاتەكەی ساڵی دووەم‌و بە سەرەوەتر، هێشتا ساڵەكەیان دانەمەزراوە.

وَلَهُ تَعْجِيلُ الْفِطْرَةِ مِنْ أَوَّلِ رَمَضَانَ، وَالصَّحِيحُ مَنْعُهُ قَبْلَهُ، وَأَنَّهُ لاَ يَجُوزُ إِخْـراَجُ زَكَـاةِ الثَّمرِ قَبْلَ بُدُوِّ صَلاَحِهِ، وَلاَ الْحَبِّ قَبْلَ اشْتِدَادِهِ، وَيَجُوزُ بَعْدَهُمَا، وَشَرْطُ إِجْزَاءِ الْمُعَجَّـلِ بَقَاءُ الْمَالِكِ أَهْلاً لِلْوُجُوبِ إِلَىآخِرِالْحَوْلِ، وَكَوْنُ الْقَابِضِ فِي آخِرِ الْحَـوْلِ مُسْـتَحِقّاً، وَقِيلَ إِنْ خَرَجَ عَنِ الإِسْتِحْقَاقِ فِي أَثْنَاءِ الْحَوْلِ لَمْ يُجْزِهِ،

---

(وَلَهُ) بۆ زەکاتدەر دروستە (تَعْجِيلُ الْفِطْرَةِ) سـەرفیترەی ڕەمـەزان وەپـێش جـەژن بێخـیَو (مِنْ أَوَّلِ رَمَضَانَ) هەر لە یەکەمی ڕەمەزانەوە دروستە سەرفیترەکەی بدا ﴿عَنْ ابْنِ عُمَـرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُمـا: وَكَانُوا يُعْطُونَها قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ﴾ رواه البخاري، ڕۆژێـك، یـان دوو ڕۆژ پێش جەژن، خەڵك سەرفیترەیان دەدا.

(وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست (مَنْعُهُ قَبْلَهُ) دروست نیە: پێش ڕەمـەزان سـەرفیترە بـدریَ، چونکە هیچ هۆیەکیواجببوونی نەهاتوە.

(وَأَنَّهُ) هەر لە فەرموودەیڕاستدا (لاَيَجُوزُ إِخراَجُ زَكَاةِالثَّمرِ) دروسـت نیـە زەکـاتی میـوە بـدا (قَبْلَ بُدُوِّ صَلاَحِهِ) پێش ئاشکرابوونی پێگەیشتنی میوەکە (وَلاَ الْحَبُّ) هـەروەها دروسـت نیە زەکاتی دانەوێڵـەش بـدا (قَبْـلَ اشْـتِدَادِهِ) پـێش ڕەقبـوونی دەنکەکـەی، بـەڵام (وَيَجُـوزُ بَعْدَهُمَا) دروستە: لە دوای ئاشکرابوونی پێگەیشتنی میوەکـەو لـە دوای ڕەقبـوونی دەنکـی دانەوێڵەکە، زەکاتەکەیان بدا، کەواتە: پێش بڕینەوەو دروێنە، هـەم پـێش ووشـککردنەوەو پاککردنەوە، دروستە میوەیەکی ووشكو دانەوێڵەکی پـاککراوە، لـە زەکاتیانـدا بـدا، ئینجـا ئەگەر دەرکەوت: کەمی داوە واجبە تەواوی بکـا، ئەگـەر زیـادی دابـو بۆی بـەخێر دەچـیَ، هەروەك لە (تحفە)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَشَرْطُ إِجْزَاءِ الْمُعَجَّلِ) مەرجی دروستبوونی زەکـاتی وەپێشخسـتراو ئەمەیـە: (بَقَـاءُ الْمَالِـكِ أَهْلاً لِلْوُجُوبِ) خاوەنی ماڵەکە هەر لەوانە بێ: زەکاتی لە سـەر واجب بـیَ (إِلَـى آخِرِالْحَوْلِ) تا کۆتایی ساڵ، هەم ماڵەکەشی تا کۆتایی ساڵ بمێنیَ، واتە: ئەگـەر خـاوەن ماڵەکـە مـرد، یان ماڵەکەی فەوتا، ئەو زەکاتەی دراوە دروست نابیَ، واتە: بە بەر زەکات ناکەویَ.

(وَ) هەروەها مەرجە: (كَوْنُ الْقَابِضِ) ئـەوەی زەکـاتی وەرگرتـوە (فِـي آخِرِالْحَـوْلِ مُسْـتَحِقّاً) لـە کۆتـایی سـاڵدا مسـتەحەقی زەکـاتوەرگرتن بـیَ، واتـە: دروسـت بـیَ زەکـاتی بـدرێتیَ، کەواتە: ئەگەر پێش کۆتایی ساڵ زەکاتوەرگرەکە مردبیَ، یان کافر بوبیَ، یـان دەوڵەمـەند بوبیَ، ئەو زەکاتەی دراویەتیَ دروست نابیَ (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بـیَهێزدا (إِنْ خَـرَجَ عَنِ الإِسْتِحْقَاقِ فِي أَثْنَـاءِ الْحَوْلِ) ئەگـەر لـە نـاوەوەی سـاڵدا زەکاتوەرگرەکـە وای لـیَهات زەکـاتی پیَنەچـیَو لـە کۆتـایی ساڵیشدا زەکـاتی پیَدەچـوو (لَـمْ يُجْزِهِ) ئـەم زەکاتـەش دروست نابیَ.

وَلاَ يَضُرُّ غِنَاهُ بِالزَّكَاة، وَإِذَا لَمْ يَقَعِ الْمُعَجَّلُ زَكَاةً اسْتَرَدَّ إِنْ كَانَ شَرَطَ الإِسْتِرْدَادَ إِنْ عَرَضَ مَانِعٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ قَالَ: هَذِهِ زَكَاتِي الْمُعَجَّلَةُ فَقَطْ اسْتَرَدَّ، وَأَنَّهُ إِنْ لَمْ يَتَعَرَّضْ لِلتَّعْجِيلِ وَلَمْ يَعْلَمْهُ الْقَابِضُ لَمْ يَسْتَرِدَّ، وَأَنَّهُمَا لَوِ اخْتَلَفَا فِي مُثْبِتِ الإِسْتِرْدَاد صُدِّقَ الْقَابِضُ بِيَمِينِه، وَمَتَى ثَبَتَ وَالْمُعَجَّلُ تَالِفٌ وَجَبَ ضَمَانُهُ، وَالأَصَحُّ إِعْتِبَارُ قِيمَتِه وَقْتَ الْقَبْضِ، وَأَنَّهُ لَوْ وَجَدَهُ نَاقِصاً فَلاَ أَرْشَ، وَأَنَّهُ لاَ يَسْتَرِدُّ زِيَادَةً مُنْفَصِلَةً،

---

(وَلاَ يَضُرُّ) زیان له دروستبوونی زەکاتی وەپێشخستراو نادا (غِنَـاهُ بِالزَّكَاة) دەوڵەمەندبوونی زەکاتوەرگرەکە بە زەکاتی وەپێشخستراو: وەك زۆر زەکاتی وەپێشخستراوی وەگرتبێ، یان زەکاتەکە زاوزێی کردبێ، یان بازرگانیی پێکردبێ.

(وَإِذَا لَمْ يَقَعِ الْمُعَجَّلُ زَكَاةً) ئینجا هەر کاتێك زەکاتە وەپێشخراوەکە نەبێتە زەکات، چونکە مەرجێکیڕابردووی ناتەواو بوو (اسْتَرَدَّ) دروستە: خاوەنەکە زەکاتەکەی وەربگرێتەوە (إِنْ كَانَ شَرَطَ الإِسْتِرْدَادَ) ئەگەر لە کاتی زەکاتداندا بە مەرجی دانابێ زەکاتەکە وەربگرێتەوە (إِنْ عَرَضَ مَانِعٌ) ئەگەر قەدەغەیەکی دروستبوونی پەیدا ببێ.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّـهُ إِنْ قَـالَ) ئەگەر خاوەنەکە لە کاتی زەکاتداندا بڵێ: (هَذِهِ زَكَاتِي الْمُعَجَّلَةُ) ئەمە زەکاتە وەپێشخستراوەکەمە (فَقَـطْ) هیچیتری نەگوت (اسْتَرَدَّ) لەو حاڵەتەشدا دروستە وەریبگرێتەوە.

(وَأَنَّـهُ) هەر بە فەرموودەیڕاستتر (إِنْ لَـمْ يَتَعَـرَّضْ لِلتَّعْجِيـلِ) ئەگەر خاوەنەکە باسی وەپێشخستنی زەکاتی نەکردبوو (وَلَـمْ يَعْلَمْـهُ الْقَـابِضُ) زەکاتوەرگرەکەش نەیزانی ئەمە زەکاتی وەپێشخستراوە (لَمْ يَسْتَرِدَّ) دروست نیە وەریبگرێتەوە.

(وَأَنَّهُمَا لَوِاخْتَلَفَا) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر خاوەنەکەو زەکاتوەرگرەکە بووە کێشەیان (فِي مُثْبِتِ الإِسْتِرْدَاد) لەوەدا: مافی وەرگرتنەوە هەیە، مافی وەرگرتنەوە نیە (صُدِّقَ الْقَـابِضُ) زەکاتوەرگرەکە باوەڕی پێدەکرێ (بِيَمِينِـهِ) بەوەی سوێند بخوا: خاوەنەکە پێی نەگوتوە ئەمە زەکاتی وەپێشخستراوە، ئەویش نەیزانیوە.

(وَمَتَـى ثَبَـتَ) هەر کاتێك مافی وەرگرتنەوەی بۆ هەبو، بەڵام (وَالْمُعَجَّـلُ تَـالِفٌ) زەکاتە وەپێشخستراوەکە نەمابو (وَجَبَ ضَمَانُهُ) واجبە زەکاتوەرگرەکە تۆڵەی بدا (وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (إِعْتِبَـارُ قِيمَتِـهِ يَـوْمَ الْقَـبْضِ) لە تۆڵەدا نرخەکەی ڕۆژی وەرگرتنی ڕەچاو دەکرێ (وَأَنَّهُ لَوْ وَجَدَهُ نَاقِصاً) ئەگەر خودی زەکاتەکە مابو، بەڵام خاوەنەکە بە کەموکوڕیەوەی وەدەستی کەوتەوە (فَلاَ أَرْشَ) تۆڵەی کەموکوڕیەکەی نیە، واتە: بە بێتۆڵە وەریدەگرێتەوە.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: ئەگەر خودی زەکاتەکەی وەرگرتەوە (لاَ يَسْتَرِدُّ زِيَادَةً مُنْفَصِلَةً) دروست نیە ئەو زیدەییانە وەربگرێتەوە: کە لە زەکاتەکە جیا بونەتەوە: وەك

وَتَأْخِيرُ الزَّكَاة بَعْدَ التَّمَكُّنِ يُوجِبُ الضَّمَانَ وَإِنْ تَلِفَ الْمَالُ، وَلَوْ تَلِفَ قَبْلَ التَّمَكُّنِ فَلاَ، وَلَوْ تَلِفَ بَعْضُهُ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَغْرَمُ قِسْطَ مَابَقِيَ، وَإِنْ أَتْلَفَهُ بَعْدَ الْحَوْلِ وَقَبْلَ التَّمَكُّنِ لَمْ تَسْقُطِ الزَّكَاةُ،

---

شیرو خوریو بێچوو، بەڵام ئەگەر گەورەو قەڵەو بوبێ، ئەوها وەریدەگرێتەوەو تۆڵەی بەخێوکردنیشی دەداتە زەکاتوەرگرەکە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فەوتانی ماڵی زەکات ﴾

ئینجا بزانە: هەر کاتێك زەکاتی لە سەر واجب بوو، واجبە: دەمودەست –بێ‌دواخستن– زەکاتەکەی بدا، بەو مەرجەی بۆی بگونجێ، هەروەك لە سەرەتای‌زەکاتدا ڕوونمان کردەوە، کەوابو: (وَتَأْخِيرُالزَّكَاةِ) دواخستنی‌زەکاتدان (بَعْدَالتَّمَكُّنِ) لە دوای ئەوەی بۆی گونجا بیدا، بەڵام دوای خست (يُوجِبُ الضَّمَانَ) تۆڵەی لە سەر واجب دەکا، واتە: واجبە ئەندازەی‌زەکاتەکەی هەر بدا (وَإِنْ تَلِفَ الْمَالُ) هەر چەند گشت ماڵەکەشی فەوتابێ، یان فەوتێندرابێ، بەڵام (وَلَوْ تَلِفَ) ئەگەر ماڵەکەی فەوتا (قَبْلَ التَّمَكُّنِ) پێش ئەوەی بۆی بگونجێ زەکاتەکە بدا (فَلاَ) ئەو کاتە تۆڵەی لە سەر نیەو گوناهباریش نابێ، بەو مەرجەی کەمتەرخەمی نەکردبێ، ئەگینا: تۆڵەی دەکەوێتە سەر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ تَلِفَ بَعْضُهُ) ئەگەر لە دوای تەواوبوونی ساڵو پێش بۆگونجان بەشێکی ماڵەکەی فەوتاو بەشێکیشی مایەوە (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی‌بەهێزتر (أَنَّهُ يَغْرَمُ قِسْطَ مَابَقِيَ) خاوەنەکە بەشە زەکاتی ئەو ئەندازەیە دەدا: کە ماوەتەوە، هەر چەند بە ئەندازەی ڕادەی زەکاتیش نەمابێ، بۆ وێنە: پێنج ووشتری هەبون، لە دوای تەواوبوونی ساڵو پێش بۆگونجان یەکێکیان مرد، واجبە لە زەکاتی ئەو چوارەی ماوەتەوە: چوار پێنجیێکی‌مەڕێك بدا.

(وَإِنْ أَتْلَفَهُ) ئەگەر خاوەنەکە بەخۆی هەموو ماڵەکەی بفەوتێنێ (بَعْدَالْحَوْلِ وَقَبْلَ التَّمَكُّنِ) لە دوای تەواوبوونی‌ساڵو پێش بۆگونجان (لَمْ تَسْقُطِ الزَّكَاةُ) زەکاتەکەی لە سەر لاناچێو واجبە: هەموو زەکاتەکەی بدا، چونکە کەمتەرخەمی کردوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر –جگە لە خاوەن ماڵەکە– یەکێکی‌تر ماڵەکەی فەوتاند، ئەو کاتە مافی زەکاتوەرگرەکان لە سەر خاوەنەکە لا دەچێو دەکەوێتە لای تۆڵەی‌ماڵەکە، واتە: تۆڵەی ئەندازەی زەکات لە تاوانکارەکە دەستێندرێ بۆ زەکاتوەرگرەکان، جا ئەگەر خاوەن ماڵەکە تۆڵەی هەموو ماڵەکەی لێ‌وەرگرت، ئەو کاتە واجبە: ئەندازەی زەکات لەو تۆڵەیە بداتە زەکاتوەرگرەکان، هەروەك لە (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَهِيَ تَتَعَلَّقُ بِالْمَالِ تَعَلُّقَ شَرِكَةٍ، وَفِي قَوْلٍ تَعَلُّقَ الرَّهْنِ وَفِي قَوْلٍ بِالذِّمَّةِ، فَلَوْ بَاعَهُ قَبْلَ إِخْرَاجِهَا فَالأَظْهَرُ بُطْلاَنُهُ فِي قَدْرِهَا وَصَحَّتُهُ فِي الْبَاقِي.

---

(وَهِيَ) زەكات (تَتَعَلَّقُ بِالمَالِ) پەیوەندی بە خودی ماڵیزەكاتەوە هەیە (تَعَلُّقَ شَرِكَةٍ) وەك پەیوەندی هاوبەشی، واتە هەر ماڵێك زەكاتی تێدا واجب ببێ، ئەوە زەكاتوەرگرەكان بە ئەندازەی زەكات دەبنە هاوبەشی خاوەن ماڵەكە.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا (تَعَلُّقَ الرَّهْنِ) وەك پەیوەندی ماڵی ڕەهنكراو (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكیتردا (بِذِمَّةٍ) زەكات پەیوەندی بە ئەستۆی خاوەن ماڵەكەوەیە.

(فَلَوْ بَاعَهُ) جا ئەگەر خاوەنەكە گشت ماڵەكەی فرۆشت (قَبْلَ إِخْرَاجِهَا) پێش ئەوەی زەكاتەكە بدا (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (بُطْلاَنُهُ فِي قَدْرِهَا) فرۆشتنەكە لە ئەندازەی زەكاتدا بەتاڵ دەبێو دروست نابێ (وَصِحَّتُهُ فِي الْبَاقِي) لەویتریشدا دروست دەبێ، كەواتە: واجبە كڕیارەكە ئەندازەكەی زەكات بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەن ماڵەكە، تاكو لە زەكاتیدا بیدا، جا ئەگەر خاوەن ماڵەكە لە ماڵێكیتری-جگە لە فرۆشراوەكە- زەكاتەكەی بدا، ئەو زەكاتە دروست دەبێ، بەڵام كڕیارەكە مافی پەشیمانبوونەوەی هەر دەمێنێ، چونكە ئەندازەی زەكات نابێتە ملكی ئەو، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: هەرچەند زەكات پەیوەندی بە خودیماڵەكەوە هەیە، بەڵام ئەو پەیوەندییە تەنها لە ئەندازەی زەكاتدایە، واتە: ناگاتە ئەو زیدەییانەی لە دوای واجببوونی زەكات پەیدا دەبن:

بۆ وێنە: ئەگەر چل مەڕی هەبو و ساڵ بە سەر مەڕەكانیدا سوڕاوەو زەكاتەكەی نەدا، ئینجا مەڕەكان بێچوویان لێبو، هەم شیرو خوریی لێوەدەست كەوتن، ئینجا ویستی زەكاتەكەی بدا، ئەوە تەنها مەڕێك واجبەو خوریو شیرو بێچووەكان بۆ خۆی دەمێننەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ پاشكۆ: لە باسی دابەشكردنی زەكات بە سەر زەكاتوەرگرەكاندا ﴾

ئەم باسە لە پێش (كتاب النكاح)دا ئیمامی(النـواوي) نووسیویەتی، بەڵام ئێمەش لێرەدا كورتەیەك ڕوون دەكەینەوە، بزانە: واجبە زەكات بدرێتە ئەو هەشت چینانەی خوای گەورە دیاری كردون، كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللهِ وَاللهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ زەكات تەنها دەدرێتە هەژارانو گەدایانو كرێكارانی زەكاتو نوێموسوڵمانەكانو كۆیلەكانو قەرزدارەكانو جەنگاوەریڕێگەیخواو ڕێبوار، خوای گەورە ئەوەی واجب كردوەو خوای گەورە زانایەو كار لەجێیە.

١-(اَلْفَقِيرِ) واتە: هەژار، کەسێکە ئەوەندە ماڵەی نەبێو کارێکی وای پێنەکرێ: نیوەی پێویستیەکانی ژیانی پڕ بکەنەوە، بۆ وێنە: پێویستی بە دە دینار هەبێ، بەڵام ئەو تەنها سێ دینار، یان چوار دیناری دەست بکەوێ.
٢-(اَلْمِسْكِين) واتە: گەدا، کەسێکە ئەوەندە ماڵەی هەبێ، یان کارێکی وەها بکا: کە پێویستیەکانی ژیانی لە نیوە زیاتر پڕ بکاتەوە، بەڵام هەموویانی پڕ نەکاتەوە، وەك پێویستی بە دە دینار هەبێ، بەڵام تەنها هەشت، یان نۆ دیناری دەست بکەوێ.
٣-(اَلْعامِل) واتە: کرێکاری زەکات، ئەو کەسەیە: بە فەرمانی پێشەوای موسوڵمانان زەکات کۆ دەکاتەوەو بەشی دەکا.
٤-(اَلْمُؤَلَّفَـةِقُلُوبُهُمْ) واتە: نوێ موسوڵمانەکان، ئەو کەسەیە: تازە موسوڵمان بووەو نیەتەکەی بێهێزە، یان نیەتەکەی بەهێزە، بەڵام مرۆڤێکی ڕێزدارەو ئەگەر بەزەکات ڕێزی لێبندرێ، کەسانیتریش وەك ئەوی موسوڵمان دەبن.
٥-(الرِّقَاب) ئەو کۆیلانەیە: کە نووسراویان دراوەتێ: ئەگەر پارە بۆ گەورەکەیان بێنن، ئازاد دەبن.
٦-(اَلْغَارِمِين) قەرزدارەکان، کەسێکە: بۆ کاروباری خۆی-بە بێگوناهکاری- تووشی قەرزداری بوبێ: وەك خانووکردنو ژن هێنانو تووشبوونی کارەساتێك، یان بۆ نەهێشتنی ئاژاوەیەك تووشی قەرزداری بوبێ.
٧-(سَبِيل الله) جەنگاوەری ڕێگەیخوا، ئەو کەسەیە: کە بە بێمووچە لە ڕێگەیخوا جەنگ دەکا.
٨-(إبن السَّبِيل) ڕێبوار، ئەو کەسەیە: ئەیەوێ-بە بێگوناهکاری-بۆ شوێنێك بچێ، یان بگەڕێتەوە، پێویستی بە پارە هەیە.
﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: واجبە خودی زەکاتەکە بداتە ئەو هەشت چینانە، کەواتە: دروست نیە زەکاتەکەی بفرۆشێ، چونکە زەکاتەکە ملکیزەکاتوەرگرەکانەو هەر ئەوانیش بەرژەوەندی خۆیان دەزانن، هەم بۆ هیچ کەسێکیش دروست نیە-بە بێئیزن- ماڵی کەسێکیتر بفرۆشێ، واتە: ئەگەر تەنها یەك مەڕ زەکاتی لە سەر بوو، دروست نیە بیفرۆشێو پارەکەی بە سەر زەکاتوەرگرەکاندا بەش بکا، بەڵکو کۆیان دەکاتەوەو مەڕەکەیان بە هاوبەشی دەداتێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.
دووەم: بە هیچ مەزهەبێك دروست نیە: بە پارەی زەکات مزگەوتو پردو ڕێگەو بەرژەوەندیە گشتیەکان ئەنجام بدرێن، چونکە پێغەمبەرﷺ بە پیاوێکی فەرموو: ﴿إِنَّ اللهَ لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِيٍّ وَلاَ غَيْرِهِ فِي الصَّدَقَاتِ، حَتَّى حَكَمَ فِيها هُوَ فَجَزَّأَهَا ثَمَانِيَةَ

أَجْزَاء، فَإِنْ كُنْتَ مِنْ تِلْكَ الأَجْزَاءِ أَعْطَيْتُكَ حَقَّكَ﴾رواه ابوداود بسندصالح، خوای گەورە لە بەشکردنی زەکاتەکاندا بە بڕیاری هیچ پێغەمبەرێك‌و هیچ کەسێکی‌تر ڕازی نەبو، تا بەخۆی بڕیاری داو زەکاتوەرگرەکانی کردنە هەشت بەش، جا ئەگەر تۆ یەکێك بی لەو بەشانە مافەکەی زەکاتت دەدەمێ.

کەواتە: ئەگەر کەسێك خۆی بە زانا، یان بە پیاوماقوڵ دابنێ‌و مافی ئەو هەشت چینانە -بە پێچەوانەوەی بڕیاری‌خوا- لە پڕۆژەیەکدا سەرف بکا، ئەوە دژایەتی شەریعەتی خوای گەورە دەکا.

سێیەم: ئەو کەسەی زەکات وەردەگرێ، مەرجە: موسڵمان‌و بالغ‌و عاقڵ بێ، کەواتە: شێت‌و منداڵی یەتیم دەبی سەرپەرشتکارەکەیان زەکاتیان بۆ قبوڵ بکاو وەری‌بگرێ.

ئینجا بزانە: ئەو کەسەی لە لای دایك‌و باوك، یان کوڕو کیژ، یان لە لای مێردی بەخێو دەکرێ‌و پێویستیەکانی ژیانی دابین دەکرێن، دروست نیە: زەکات وەربگرێ، هەروەها ئەو ژنەی (ناشزة)یەو لە مێردەکەی تۆراوە، دروست نیە زەکاتی بدرێتێ، هەروەك لە باسی بەشکردنی زەکاتدا ڕوون کراوەتەوە.

چوارەم: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: زەکات بدرێتە تەنها یەك کەس لەو هەشتانە، هەروەها دروستە زەکات لە شوێنێك بۆ شوێنێکی‌تر بنێردرێ، هەروەك لە کتێبەکانی مەزهەبی(حنفي)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا دروستە: زەکات بدرێتە سەیدەکان بەو مەرجەی پێنجێکیان نەدرێتێ، زۆر لە زانایانیش بەو فەرموودە بێ‌هێزە ڕازینە، ئیتر لە باسی بەشکردنی‌زەکاتەکاندا ناوەڕۆکی ئەم پاشکۆیە درێژتر ڕوون دەکەینەوە، إن شاءَاللهُ تَعَالَى. ئینجا اَلْحَمْدُ للهِ پەرتووکی(زەکات) کۆتایی هات‌و پەرتووکی(ڕۆژووەکان)ی بە دوادا دێ، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

## ﴿ كِتابُ الصِّيامِ: پەرتووکی ڕۆژووەکان ﴾

ڕۆژووی‌ڕەمەزان چوارەمین ڕوکنی‌ئیسلامە، لە مانگی(شعبان)ی ساڵی‌دووەمی کۆچی‌دا واجب کراوە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِى أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ﴾ تا ﴿فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ﴾ مانگی ڕۆژووتان مانگی‌ڕەمەزانە، کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە... -تا- هەر کەسێك ئامادەی ئەم مانگە بوو، با تێیدا بەڕۆژوو بێ. هەم بە بەڵگەی حەدیسەکەی ﴿بُنِيَ الإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ﴾ی‌ڕابردوو لە سەرەتای زەکاتدا.

کەوابو: هەر کەسێك لە ناو موسڵمانان گەورە بوبێ‌و باوەڕی بە واجببوونی ڕۆژووی ڕەمەزان نەبێ، ئەوە کافرەو وەکو موسڵمانی کافربوو بڕیاری کوشتنی لە سەر دەدرێ،

يَجبُ صَوْمُ رَمَضَانَ بِإكْمَالِ شعْبَانَ ثَلاَثِينَ، أَوْ رُؤْيَةِ الْهِلاَلِ، وَثُبُوتُ رُؤْيَته بعَدْلٍ، وَفِي قَوْلٍ عَدْلاَنِ، وَشَرْطُ الْوَاحِد صفَةُ الْعُدُولِ فِي الأَصَحِّ، لاَ عَبْدٍ وَامْرَأَة،

---

بەلام ئەگەر تازە موسلمان بوبێ، یان لە شوێنێکی‌دوور لە زانایانی‌ئایینی گەورە بوبێ، ئەوە یەکەمجار کافر نابێ، بەلکو تێدەگەیەندرێ: کە ڕۆژووی ڕەمەزان واجبە، جا ئەگەر لەمەودوا باوەڕی نەبێ، ئەو کاتە کافر دەبێ.

ئینجا بزانە: هەر کەسێکیش باوەڕی بەڕۆژووی ڕەمەزان هەبێ‌و بە بێ‌عوزرێکی شەرعی -بە ڕقەکاری- بەڕۆژوو نەبێ، ئەوە لە بەندیخانەدا بەند دەکرێ‌و خواردن‌و خواردنەوەشی لە ڕۆژێدا لێقەدەغە دەکرێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

(يَجِبُ صَوْمُ رَمَضَانَ) ڕۆژووی‌ڕەمەزان واجب دەبێ (بِإكْمَالِ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ) بە تەواوکردنی سی ڕۆژی مانگی شەعبان (أَوْ رُؤْيَةِ الْهِلاَلِ) یان بە دیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان لە دوای ڕۆژ ئاوابوونی بیست‌و نۆی شەعبان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاكْمِلُواالْعِدَّةَ ثَلاَثِينَ﴾ رواه الشيخان وأصحاب السنن بألفاظ متقاربة، کە مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانتان دیت بەڕۆژوو بن، کە مانگی یەکشەوەی شەشەلانتان دیت بیکەنە جەژن، جا ئەگەر هەور بوو و مانگ نەدیترا، سی ڕۆژی شەعبان‌و سی ڕۆژی ڕەمەزان تەواو بکەن.

(وَثُبُوتُ رُؤْيَتِهِ) ئیسباتبوونی دیتنی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان بۆ ئەو کەسانەی بەخۆیان نەیاندیتوە (بِعَدْلٍ) بە شاهیدی دادپەروەرێك دەبێ، کە لە لای (قازی) شاهیدی بداو بلێ: (**شاهیدی دەدەم: من مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانی ئەم سالم دیتوە**).

ئینجا (قازی)ش بلێ: (بۆم ئیسبات بوو، یان بلێ: بڕیارم دا: سبەینێ ببێتە ڕەمەزان). واتە: بەم بڕیارە ڕۆژووی ڕەمەزان لە سەر خەلکی‌تریش واجب دەبێ، کە بەخۆیان مانگیان نەدیتوە ﴿عَنْ ابنِ عُمَر رضي الله عنهما: أَخْبَرْتُ رَسُولَ اللهِﷺ: أَنِّي رَأَيْتُ الْهِلاَلَ فَصَامَ وَأَمَرَالنَّاسَ بِصِيَامِهِ﴾ حديث صحيح رواه ابوداود وغيره، بە پێغەمبەرمﷺ ڕاگەیاند: من مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانم دیتوە، جا پێغەمبەرﷺ بەڕۆژوو بوو و فەرمانیشی‌دا خەلك بەڕۆژوو ببێ. (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (عَدْلاَنِ) پێویستە دوو دادپەروەر شاهیدی بدەن.

(وَشَرْطُ الْوَاحِدِ) مەرجی یەك دادپەروەر کە شاهیدی‌ی لێوەردەگیرێ ئەمەیە (صِفَةُ الْعُدُولِ) سیفەتی دادپەروەرانی لێبێتەجێ (فِي‌الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا (لاَ عَبْدٍ وَامْرَأَةٍ) نەك سیفەتی کۆیلەو ئافرەت، کەواتە: ئەو دووانە شاهیدی مانگ دیتنیان لێوەرناگیرێ، هەروەك لە پیاوی (فاسق)ش وەرناگیرێ.

(وَإِذَا صُمْنَا بِعَدْلٍ) هەر کاتێك بە شاهیدیی دادپەروەرێك بەڕۆژوو بوین (وَلَمْ نَرَ الْهِلَالَ بَعْدَ ثَلَاثِينَ) بەڵام لە دوای تەواوبوونی سی ڕۆژی ڕەمەزان مانگی یەکشەوەی شەشەڵانمان نەدیت (أَفْطَرْنَا) واجبە: بکەینە جەژن، واتە: هیچیتر بەڕۆژوو نەبین (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَإِنْ كَانَتِ السَّمَاءُ مُصْحِيَةً) هەرچەند ئاسمانیش ساماڵ بێو هەور نەبێ، چونکە بە بەڵگەیەکی شەرعی ژمارەمان تەواو کردوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: بە بەڵگە حەدیسەکەی﴿صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ﴾ی ڕابردوو، هەر کەسێك بە تەنها مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانی دیت، واجبە: بەڕۆژوو ببێ، هەروەهاش ئەگەر بە تەنها مانگی یەکشەوەی شەشەڵان ببینێ، واجبە: بکاتە جەژن، بەڵام بە پەنهانی؟ تاکو تۆمەتی پێنەکرێو سزا نەدرێ، ئیتر جیاوازی نیە: لە لای (قازی) شاهیدی لێوەربگیرێ، یان نا، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە، هەروەها هەر کەسێکیش باوەڕ بە یەکێکیتر بکا: کە مانگی دیتوە، واجبە: ئەویش بەڕۆژوو ببێ، هەرچەند مانگ بینەکەش ئافرەت بێ، یان کۆیلە بێ، یان فاسق بێو لە لای قازیش شاهێدی لێوەرنەگیرابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەگەر لە شەوی سییشەعبان مانگ نەدیتراو سبەینێ بەڕۆژوو نەبو، ئینجا —بە ڕۆژ— ئیسبات بوو: کە مانگی ڕەمەزان دیتراوە، واجبە: ئەو ڕۆژووە قەزا بکرێتەوە، هەروەها واجبە: تا ڕۆژ ئاوا دەبێ —لە بەر ڕێزلێنانی ڕەمەزان— (إمساك) بکا، واتە: خۆی قەدەغە بکا لە خواردنو خواردنەوەو دژەکانیتری ڕۆژوو، جیاوازی نیە خواردەمەنیی خواردبێ، یان نا، جا بەم (إمساك)کردنە خێری دەگاتێ، بەڵام بۆی نابێتە ڕۆژوو، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

هەروەهاش ئەگەر ڕۆژی سیی ڕەمەزان ئیسبات بوو: مانگ دیتراوە، واجبە: ڕۆژوو بشکێنێ ﴿عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ فَشَهِدَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِاللهِ: لَأَهَلَّا الْهِلَالَ أَمْسِ عَشِيَّةً، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ النَّاسَ: أَنْ يُفْطِرُوا وَأَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلَّاهُمْ﴾ رواه أبوداود واحمد بسندصحيح، لە ڕۆژی سییڕەمەزان دوو کەس لە دەرەوەی (مدینة)وە هاتن لە لای پێغەمبەر ﷺ شاهیدییان دا: کە دوێنێ شەو مانگییەکشەوەیان دیتوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا: ڕۆژوو بشکێننو سبەینێ وەرنە نوێژیجەژن.

سێیەم: مەرجە: مانگی یەکشەوە لە دوای ڕۆژ ئاوابوونەوە بدیترێ، واتە: ئەگەر بە ڕۆژ بدیترێ هیچ بڕیارێکی پێ نادرێ: نە بۆ ڕەمەزانو نە بۆ جەژن، نە لە ڕابردوو و نە لە

وَإِذَا رُؤِيَ بِبَلَدٍ لَزِمَ حُكْمُهُ الْبَلَدَالْقَرِيبَ دُونَ الْبَعِيدِ فِيالأَصَحِّ، وَالْبَعِيدُ مَسَافَةُالْقَصْرِ، وَقِيلَ بِاخْتِلاَفِ الْمَطَالِعِ، قُلْتُ: هَذَا أَصَحُّ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

داهاتوودا، هەروەها مانگ ئیسبات نابێ بە حیسابی حیسابکەرانو ئەستێرەناسان، چونکە پێغەمبەرﷺ ووشەی (رُؤْيَة)، واتە: دیتنی فەرمووە، هەروەها -جگە لە مانگیڕەمەزان- یەکشەوەی مانگەکانیتر بە تەنها یەك دادپەروەر ئیسبات نابێ، بەڵکو پێویستی بە دوو دادپەروەر هەیە، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە روون کراونەوە.

(وَإِذَا رُؤِيَ بِبَلَدٍ) هەر کاتێك مانگییەکشەوە لە شوێنێك دیترا (لَزِمَ حُكْمُهُ الْبَلَدَالْقَرِيبَ) بڕیاری دیتنی ئەم شوێنە واجب دەبێ: لە سەر گشت شوێنێکی نزیکی ئەم شوێنە، واتە: بۆ ڕەمەزانو بۆ جەژن لە سەر دانیشتووانی نزیك واجب دەبێ بە دیتنی ئەو شوێنە ڕەفتار بکەن (دُونَ الْبَعِيدِ) بەڵام لە سەر شوێنی دوور واجب نابێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە هەروەك کاتی ڕۆژهەڵاتنو ئاوابوونو کاتی نوێژەکانیان لێك جیاوازن، ئەوەش دەگونجێ سەرەتای مانگەکانیشیان لێك جیاواز بێ.

(وَالْبَعِيدُ) شوێنی دوور (مَسَافَةُالْقَصْرِ) ئەندازەی سەفەری نوێژ کورتکردنەوەیە: کە هەشتا کیلۆمترو بە سەرەوەترە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکدا (بِاخْتِلاَفِ الْمَطَالِعِ) دووری بەگوێرەی جیاوازی هەڵاتنو ئاوابوونی ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانە: وەك (حجاز)و (عراق)، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە (قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفەرموێ (هَذَا) ئەم فەرموودەیەیدووەم (أَصَحُّ) ڕاستترە (وَاللهُ أَعْلَم) بە بەڵگەی ئەم حەدیسە:

﴿عَنْ كُرَيْبٍ‌رضي الله عنه: قَدِمْتُ الشَّامَ فَرَأَيْتُ الْهِلاَلَ لَيْلَةَالْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فَسَأَلَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَاللهُ عَنْهُما؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَالْجُمُعَةِ وَصَامَ النَّاسُ وَصَامَ مُعَاوِيَةُرضي الله عنه. فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَالسَّبْتِ فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ أَوْ نَرَاهُ. فَقُلْتُ: أَوَلاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ قَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللهِﷺ﴾رواه مسلم وأصحاب السنن، (كريب) فەرمووی: چوومە (شام) لەوێ لە شەویهەینی مانگی یەکشەوەی ڕەمەزانمان دیت، کە گەڕامەوە (مدينة)ی پیرۆز، (ابن عباس) پرسیاری لێکردم؟ منیش گووتم: شەوی هەینی مانگمان دیتو (معاوية)و خەڵکەکەش بەڕۆژوو بون. (ابْن عباس) فەرمووی: بەڵام ئێمە لە شەوی شەممە مانگمان دیت، بۆیێ هەر بەڕۆژوو دەبین تا سی ڕۆژ تەواو دەکەین، یان بە خۆمان مانگی شەشەڵان دەبینین. منیش گووتم: چۆن دیتنی(معاوية)و بەڕۆژووبوونەکەی بەس نیە؟ فەرمووی: نا، پێغەمبەرﷺ ئەوها فەرمانی پێکردوین. واتە: چونکە (شام)و (مدينة) لە ڕۆژهەڵاتنو ئاوابووندا لێك جیاوازن، بۆیێ بڕیاری دیتنی مانگ لە (شام)، لە سەر (مدينة) واجب نابێ.

..........................................................

﴿ ئاگـــاداری ﴾ یەکـەم: مەبەسـت بـە (إخـتلاف المَطـالِع)، واتـە: جیـاوازی هـەڵاتن‌و ئاوابوونەکە، ئەوەیە: جیاوازی نێوان ڕۆژئـاوابوونی ئـەم شـوێنەو ئـەو شـوێنە، لـە هەشـت (دَرَجَة)، واتە: سی‌ودوو دەقیقە زیاتر بێ، چونکە ئەگەر سی‌ودوو دەقیقـە بـێ، یـان کـەمتر بێ، بە جیاوازی دانانرێ، هەروەك لە (بغیةالمسترشدین)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا هەر کاتێك جیاوازیەکە هەبو: ئەگەر مانگ لە شـوێنێکی ڕۆژ هـەڵات بدیترێ، پێویسـتە: لە شوێنەکەی ڕۆژئاواش بدیترێ، بەڵام بە پێچەوانەوە نابـێ، چـونکە لـە لای ڕۆژهەڵاتـەوە زووتر شەو دادێ–کەواتە: مـانگ فریـا ناکـەوێ خـۆی بـۆ دیـتن ئامـادە بکـا– هـەروەك لـە حەدیسەکەی ڕابردوودا (مدینة) دەکەوێتـە ڕۆژهـەڵاتی(شـام)و، لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: جگە لە مەزهەبی(شافعي) سێ مەزهەبـەکانی‌تر: ئـەو جیاوازی‌یـەی‌ڕابردوو ڕەچاو ناکـەن، واتـە: لـە هـەر شـوێنێك مـانگی یەکشـەوە بـدیترێ، بڕیارەکـەی لـە سـەر گشـت موسڵمانانی‌تر واجب دەبێ، هەروەك لـە (المجموع)و (مجمع الأنهر)و (میـزان الشـعراني)دا ڕوون کراوەتەوە.

کـەوابو: ئەگـەر لـە حاڵـەتی جیـاوازی‌ی‌ڕابردوودا (قـازی) بـە مەزهـەبێکی‌تر–وەکـو (حنفـي)– بڕیاری‌دا: ببێتە ڕەمەزان، ئەو کاتە هەر کەسێك لەژێر دەسەڵاتی ئـەو (قـازی)یـەدا بـێ، واجبـە: گوێڕایەڵی بڕیارەکەی ببێ‌و بەڕۆژوو ببێ، هەرچـەند ئـەو کەسـانە مەزهـەبیان (شـافعی)ش بـێ، هەروەك لە فەرموودەی (المجموع) وەردەگیرێ، کەواتـە: هەرکەسـێك بـەڕۆژوو نـەبێ، واجبـە: ڕۆژووەکە قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەگـەر لـە ژێـر دەسـەڵاتی ئـەو (قـازی)یـەدا نـەبون، ئـەو کاتـە لـە سـەریان واجـب نابێ، چـونکە (قـازی) تـەنها لـە شوێنی‌دەسـەڵاتی‌خۆی‌دا بڕیـاری جێبـەجێ دەکـرێ‌و لـە شوێنەکانی‌دەرەوەی دەسەڵاتی خۆی‌دا جێبەجێ ناکرێ، هـەروەك لـە (بغیةالمسترشـدین)و لە زۆربەی سەرچاوەکانیش لە باسی (قازی)دا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: هەوڵدانی دیتنی‌مانگی یەکشەوە (فَرْضُ الْكِفايَة)یە، جا ئەگـەر شـوێنێك (قـازی)ی لێنەبو، پیاوماقوڵانی‌شوێنەکە یەکێك دەکەنە (حَكَم) بۆ ئـەوەی لـەجیاتی(قـازی) شـاهیدی مانگ دیتن وەربگرێ، یان بە ڕێگەیەکی شەرعی بڕیار بدلو بکاتـە ڕەمـەزان، چـونکە ئەگـەر لە شوێنێکی‌نزیکیش مـانگ بـدیترێ، پێویسـتە: دوو شـاهید لـەوێوە بێن‌و لێرە شـاهیدی بدەن، کەواتە: ئەگەر کەسێکی وەهـا نـەبێ: شـاهیدیەکە وەربگرێ، یـان هـەبێ، بـەڵام بـە ڕقەکاری شاهیدیەکەی وەرنەگرت، ئەو کاتە دیـتنی مـانگ بـۆ ئـەم شـوێنە ئیسبـات نابێ، مەگەر کەسێك باوەڕ بە هەواڵدەرەکە بکا، ئەو کاتە لـە سـەر ئـەوی واجـب دەبـێ بـەڕۆژوو ببێ، هەروەك لە (تحفة)دا ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

وَإِذَا لَمْ نُوجِبْ عَلَىٰ الْبَلَدِ الآخَرِ فَسَافَرَ إِلَيْهِ مِنْ بَلَدِ الرُّؤْيَةِ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُوَافِقُهُمْ فِي الصَّوْمِ آخِراً، وَمَنْ سَافَرَ مِنَ الْبَلَدِ الآخَرِ إِلَى بَلَدِ الرُّؤْيَةِ عَيَّدَ مَعَهُمْ وَقَضَى يَوْماً، وَمَنْ أَصْبَحَ مُعَيِّداً فَسَارَتْ سَفِينَتُهُ إِلَى بَلْدَةٍ بَعِيدَةٍ أَهْلُهَا صِيَامٌ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُمْسِكُ بَقِيَّةَ الْيَوْمِ.

---

(وَإِذَا لَمْ نُوجِبْ) هەر کاتێك –بە شەرع– ڕۆژوو واجب نەکەین (عَلَىٰ الْبَلَدِ الآخَرِ) لە سەر شوێنەکەی‌تر؟ چونکە ڕۆژ هەڵاتن‌و ئاوابوونی جیاواز بوو و مانگیش لەوێ نەدیترابو (فَسَافَرَ إِلَيْهِ مِنْ بَلَدِ الرُّؤْيَةِ) جا لەو شوێنەوە: کە مانگی لێدیتراوە، یەکێك بە سەفەر چووە ئەوێ (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يُوَافِقُهُمْ فِي الصَّوْمِ آخِراً) واجبە: لە کۆتایی ڕەمەزاندا لەگەڵ ئەوان بەڕۆژوو ببێ، هەرچەند بە بڕیاری دیتنی شوێنەکەی‌خۆی سی ڕۆژیشی تەواو کردبن، چونکە بەو سەفەرە بووەتە دانیشتوویکی ئەو شوێنە.

بەڵام ئەگەر شوێنەکەی‌تریش بە شەرع ڕۆژوویان لە سەر واجب بوو؟ چونکە ڕۆژ هەڵاتن‌و ئاوابوونیان وەکو یەکتری بوو، لەو حاڵەتەدا هەر کاتێك ڕێبوارەکە سی ڕۆژی خۆی تەواو کرد، واجبە: بە پەنهانی بیکاتە جەژن، ئینجا ئەگەر دانیشتووانی شوێنەکەش بە شاهیدی ڕێبوارەکە، یان بە ڕێگەیەکی‌تر بۆیان ئیسبات بوبێ: کە لە شوێنە نزیکەکە مانگ دیتراوە، واجبە: ئەوانیش بکەنە جەژن‌و ڕۆژووی یەکەمیش قەزا بکەنەوە، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

بەڵام ئەگەر ڕێبوارەکە لە ڕۆژی یەکەمی ڕەمەزاندا بچێتە شوێنەکە، ئەو کاتە نابێ ڕۆژووەکەی بشکێنێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ سَافَرَ مِنَ الْبَلَدِ الآخَرِ) هەر کەسێك لەو شوێنەوە: کە مانگی لێنەدیتراوە، بە سەفەر بچێ (إِلَى بَلَدِ الرُّؤْيَةِ) بۆ ئەو شارەی مانگی لێدیتراوە (عَيَّدَ مَعَهُمْ) واجبە: لەگەڵ ئەواندا بکاتە جەژن‌و (وَقَضَى يَوْماً) هەم واجبە: ڕۆژوویێکیش قەزا بکاتەوە، ئەگەر بیست‌و هەشت ڕۆژووی گرتبن، بەڵام ئەگەر بیست‌و نۆی گرتبن، قەزا کردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ أَصْبَحَ مُعَيِّداً) هەر کەسێك بە ڕێگەیەکی شەرعی لە شوێنی‌خۆی کردیە جەژن (فَسَارَتْ سَفِينَتُهُ إِلَى بَلْدَةٍ بَعِيدَةٍ) ئینجا بە هۆی کەشتی، یان فرۆکە بە سەفەر چووە شوێنێکی دوور: کە (أَهْلُهَا صِيَامٌ) دانیشتووانی شوێنەکە بەڕۆژوو بون (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يُمْسِكُ بَقِيَّةَ الْيَوْمِ) واجبە: ئەویش تا ڕۆژ ئاوا دەبێ (إمساك) بکا، چونکە بووەتە دانیشتووی شوێنەکەو هەم واجبە: ڕێز لە ڕەمەزان بنێ.

﴿ پاشكۆ ﴾ پێغەمبەرﷺ هەر كاتێك مانگی یەكشەوەی دەدیت، دەیفەرموو: ﴿اَللّٰهُ أَكْبَرُ، اَللّٰهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ وَالإِيْمانِ وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ وَالتَّوْفِيقِ لِمَا تُحِبُّهُ وَتَرْضَى، رَبُّنَا وَرَبُّكَ اللّٰهُ﴾ رواه الدارمي وحسنه الترمذي من طريق آخر.

## ﴿ فَصلٌ: لە باسی نیەتی ڕۆژوو ﴾

(اَلنِّيَّةُ) نیەتهێنان (شَرْطٌ لِلصَّوْمِ) مەرجە: بۆ دروستبوونی ڕۆژوو، جیاوازی ڕۆژووی واجبو سوننەت نیە، هەم جیاوازی گەورەو منداڵیش نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَاالأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ رواه الشيخان، هەر كردەوەیەكی خوا پەرستی بێ بە نیەتەوە نەبێ دانامەزرێ. كەوابو: خواردنی پاشێو بە بەر نیەتهێنان ناكەوێ، ئەگەر لەو كاتدا ڕۆژووی بە سەر دڵدا نەیێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيُشْتَرَطُ لِفَرْضِهِ) بە مەرج دادەندرێ بۆ نیەتی ڕۆژووی واجب (التَّبْيِيتُ) نیەتەكە بە شەو بهێندرێ، واتە: لە نێوان ڕۆژئاوابوونو دەركەوتنی بەیاندا، جیاوازی نیە ڕۆژووەكە: ڕەمەزان بێ، نەزر بێ، كەففارەت بێ، ئەدا بێ، یان قەزا بێ، ڕۆژووگرەكەش: گەورە بێ، یان منداڵ بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلاَ صِيَامَ لَهُ﴾ رواه أصحاب السنن بإسناد صحيح، هەر كەسێك لە پێش دەركەوتنیبەیان نیەتی ڕۆژوو نەهێنێ، ڕۆژووی دروست نابێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ بۆ هەر ڕۆژێك واجبە: نیەتێكی سەربەخۆ –بە شەو– بهێندرێ، ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: بۆ ڕۆژووی ڕەمەزانو بۆ نەزری دیاركراو، هەم بە شەو و هەم بە ڕۆژیش تا پێش كاتی نیوەڕۆ دروستە: نیەت بێنێ، بەڵام بۆ نەزرەكانیترو بۆ كەففارەتەكانو بۆقەزاكردنەوەی ڕەمەزان –وەكو مەزهەبی شافیعی– واجبە: بە شەوێ نیەت بێنێ: هەروەك لە (المجموع)و كتێبەكانی(حنفي)دا ڕوون كراوەتەوە.

كەوابو: ئەگەر لە ڕەمەزاندا كەسێك –بە شەوێ– نیەتی لە بیر چوو، بۆی دروستە: خۆی (تقلید)ی ئیمامی(حنفي) بكاو پێش كاتی نیوەڕۆ نیەتی ڕۆژوو بێنێ، ڕۆژووەكەی دروست دەبێ.

**هەروەها** لە مەزهەبی ئیمام(مالك)دا دروستە: لە شەوی یەكەمی ڕەمەزاندا نیەتی هەموو ڕەمەزان بێنێ، جا ئەگەر هەموو شەوێكیش نیەت نەهێنێ، ڕۆژووەكانی دروست دەبن، بەو مەرجەی بە دوای یەكتریدا بەڕۆژوو ببێ، واتە: ئەگەر ڕۆژێك بەڕۆژوو نەبێ، واجبە: بۆ ئەو ڕۆژانەی ماون، نیەتەكەی نوێ بكاتەوە، هەروەها ڕۆژووەكانیتری

وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ النِّصْفُ الآخِرُ مِنَ اللَّيْلِ، وَأَنَّهُ لاَ يَضُرُّ الأَكْلُ وَالْجِمَاعُ بَعْدَهَا، وَأَنَّهُ لاَ يَجِبُ التَّجْدِيدُ إِذَا نَامَ ثُمَّ تَنَبَّهَ، وَيَصِحُّ النَّفْلُ بِنِيَّةٍ قَبْلَ الزَّوَالِ وَكَذَا بَعْدَهُ فِي قَوْلٍ، وَالصَّحِيحُ اشْتِرَاطُ حُصُولِ شَرْطِ الصَّوْمِ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ،

---

کەففارەتەکانیش: کە واجبە بە دوای یەکتری‌دا بن، ئەوانیش-وەکو رەمەزان- دروستە: لە شەوی یەکەمی دەست پێکردنیان نیەتی بەرۆژووبوونی هەردوو مانگەکە بێنێ، هەروەك لە (شرح الموطأ)دا ڕوون کراوەتەوە.

جا ئەگەر یەکێك بیەوێ لەو نیەتهێنانەدا (تقلید)ی ئیمام(مالك) بکا، پێویستە تێبینی بکا: لە مەزهەبی ئیمام(مالك)دا: ئەگەر کل دەچاوی خۆی بکاو ئاسەواری بگاتە ناو گەرووی، یان بە هۆی دەستبازیی‌و ماچ کردن (مَذي)ی بێتە دەرەوە، رۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، لە (فتح المعين)و (الشرواني)دا ئەو (تقليد)کردنەیان بە پێویست داناوە.

(وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی نیەت بە مەرج دانانرێ (النِّصْفُ الآخِرُ مِنَ اللَّيْلِ) لە نیوەی ئاخیری شەودا نیەتی رۆژوو بێنێ، بەڵکو هەر لە سەرەتای شەوەوە دروستە (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاست (لاَ يَضُرُّ الأَكْلُ وَالْجِمَاعُ) زیان لە رۆژوو نادا: خواردن‌و جیماع کردن‌و دژەکانی‌تری رۆژوو، بە شەو روو بدەن (بَعْدَهَا) لە دوای نیەتهێنان (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاست (لاَ يَجِبُ التَّجْدِيدُ) واجب نیە: نیەتەکەی نوێ بکاتەوە (إِذَا نَامَ) هەر کاتێك بە شەو لە دوای نیەتهێنان خەوتو (ثُمَّ تَنَبَّهَ) ئینجا لە خەو هەڵسا، چونکە نووستن دژایەتی لەگەڵ رۆژوودا نیە.

بەڵام ئەگەر بە شەو لە دوای نیەتهێنان کافر بوو، واتە: کوفرێکی کرد، ئینجا بووەوە موسڵمان، واجبە: دووبارە نیەتی رۆژوو بێنێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَصِحُّ النَّفْلُ) رۆژووی سوننەت دروستە: (بِنِيَّةٍ قَبْلَ الزَّوَالِ) بە نیەتهێنانێك: کە لە پێش کاتی نیوەڕۆدا بهێندرێ، لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَكَذَا بَعْدَهُ) هەروەها دروستە: لە دوای کاتی نیوەڕۆش نیەتەکە بێنێ (فِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا، بەڵام هەر بە یەکەمەکەی بەهێزتر رەفتار دەکرێ.

(وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست بۆ دروستبوونی نیەتەکە (اشْتِرَاطُ حُصُولِ شَرْطِ الصَّوْمِ) بە مەرج دادەندرێ: مەرجی رۆژوو لە مرۆڤەکەدا بێتەجێ (مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ) لە سەرەتای رۆژەوە-واتە: لە دەرکەوتنی‌بەیانەوە- هیچ دژێکی رۆژووی لێ روو نەدابێ، کەواتە: ئەگەر پێش نیەتهێنانەکە: کافر بوبێ، یان جیماعی کردبێ، یان شێت بوبێ، یان لە حەیز، یان

وَيَجبُ التَّعْيِينُ فِي الْفَرْضِ، وكَمَالُهُ فِي رَمَضانَ: أَنْ يَنْوِيَ صَوْمَ غَـدٍ عَـنْ أَدَاءِ فَـرْضِ رَمَضَانَ هَذه السَّنَة للّٰه تَعَالَى.

---

لـه نيفاسـدا بوبـێ، يـان شـتێكى خواردبـێ، يـان خواردبێتيـه‌وه، ئـه‌وه ڕۆژووه‌كـه‌ى دروسـت نابـێ، ئه‌گـه‌ر نـا: دروسـت ده‌بـێو لـه سـه‌ره‌تاى ڕۆژه‌كـه‌وه‌ش خێـرى ڕۆژووه‌كـه‌ى بـۆ ده‌نووسرێ، به‌ڵگه‌ش ئه‌م حه‌ديسه‌يه: ﴿عَنْ عَائشَةَ رضي الله عنها: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِـيُّ ﷺ ذَاتَ يَـوْمٍ فَقَالَ: هَلْ عنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ قُلْنَـا: لاَ، قَـالَ: فَـإِنِّي إِذاً صَـائِمٌ﴾رواه مسلم وأصحاب السنن، پێغه‌مبه‌رﷺ ڕۆژێك هاته ماڵه‌وه‌و فـه‌رمووى: چيتان هه‌يه بيخۆم؟ گوتمـان: نـا. فـه‌رمووى: كه‌وابو: من ئه‌م ڕۆ به‌ڕۆژوومه، واته: به‌ڕۆژوو ده‌بم.

﴿ **ئاگادارى** ﴾: واجبه: نيه‌تى ڕۆژوو به دڵ بهێندرێ، به ته‌نها زوبان دروست نابێ، بـه‌ڵام سوننه‌ته: بـه دڵو بـه زوبـان نيـه‌تى ڕۆژوو بێنـێ، هـه‌روه‌ك لـه (المجموع)دا فه‌رموويـه‌تى، واته: به به‌ڵگه‌ى﴿ فَإِنِّي إِذاً صَائِمٌ ﴾ى ڕابردوو.

(وَيَجِبُ التَّعْيِـينُ فِي الْفَرْضِ) لـه نيـه‌تى ڕۆژى واجبدا واجبـه: ڕۆژووه‌كـه ديـارى بكـا: وه‌ك هه‌موو شه‌وێك نيـه‌ت بێنـێ: سبه‌ينێ بـه‌ڕۆژوو ده‌بم لـه ڕۆژووى ڕه‌مـه‌زان، يـان لـه ڕۆژووى نه‌زره‌كه‌م، يان له ڕۆژووى كه‌ففاره‌ته‌كه‌م. پێغه‌مبـه‌رﷺ ده‌فـه‌رموێ: ﴿وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْـرِئٍ مَا نَوَى﴾رواه الشيخان، هـه‌ر مرۆڤێـك تـه‌نها خێـرى ئـه‌و كرده‌وه‌يـه‌ى بـۆ ده‌نووسـرێ: كـه نيه‌تى بۆ هێناوه.

ئينجـا بزانـه: لـه نيـه‌تى ڕۆژووى سـوننه‌تدا، واجـب نيـه: ڕۆژووه‌كـه ديـارى بكـا، بـه‌ڵكو ئه‌وه‌نده به‌سه نيه‌ت بێنێ: (به‌ڕۆژوو ده‌بم)، هـه‌روه‌ها ئه‌گـه‌ر ده‌يزانـى ڕۆژووێكـى واجبـى له سه‌ره، به‌ڵام نه‌يده‌زانى: ئايا هى ڕه‌مه‌زانـه، يـان نـه‌زره، يـان كه‌ففاره‌تـه، ئـه‌و كاتـه‌ش ئه‌وه‌نده به‌سه: نيه‌ت بێنێ: (سبه‌ينێ به‌ڕۆژوو ده‌بم له ڕۆژووێكى واجب)، هـه‌روه‌ك له سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموويانه.

هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر قه‌زاى دوو ڕه‌مه‌زانى له سه‌ر بون، يان دوو جۆره نـه‌زر، يـان دوو كـه‌ففاره‌تى له سه‌ر بون، ئه‌و كاته‌ش واجب نيه: ڕه‌مه‌زانه‌كه، يـان نه‌زره‌كه، يـان كه‌ففاره‌ته‌كـه ديـارى بكا، به‌ڵكو ئه‌وه‌نـده به‌سـه: (نيه‌تمه سبه‌ينێ به‌ڕۆژوو ده‌بم له قه‌زاى ڕه‌مـه‌زانم)، يـان (له نـه‌زرم)، يـان (لـه كـه‌ففاره‌تم). جـا ئه‌گـه‌ر ديارى‌ى كردنو بـه هه‌ڵـه‌دا چوو، ئـه‌و كاتـه ڕۆژووه‌كه‌ى دروست نابێ، هه‌روه‌ك له (المجموع)و (نهاية)دا ڕوون كراوه‌ته‌وه.

(وكَمَالُهُ) ته‌واوى دياركردن (فِي رَمَضانَ) له نيه‌تى ڕۆژووى ڕه‌مه‌زانـدا (أَنْ يَنْـوِيَ) ئه‌وه‌يـه بـه دڵ نيه‌ت بێنێ: (صَوْمَ غَدٍ عَنْ أَدَاءِ فَـرْضِ رَمَضَـانِ هَـذِهِ السَّنَةِ للّٰهِ تَعَالَى) سبه‌ينێ بـه‌ڕۆژوو ده‌بم له واجبى ڕه‌مه‌زانى ئه‌م ساڵ به ئه‌دا بۆ خواى گه‌وره.

وَفِي الأَدَاءِ وَالْفَرْضِيَّةِ وَالإِضَافَةِ إِلَى اللهِ تَعَالَى اَلْخِلاَفُ الْمَذْكُورُ فِي الصَّلاَةِ، وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ تعيينُ السَّنَةِ، وَلَوْ نَوَى لَيْلَةَ الثَّلاَثِينَ مِنْ شَعْبَانَ صَوْمَ غَدٍ عَنْ رَمَضَانَ إِنْ كَانَ مِنْهُ فَكَانَ مِنْهُ لَمْ يَقَعْ عَنْهُ إِلاَّ إِذَا اعْتَقَدَ كَوْنَهُ مِنْهُ بِقَوْلِ مَنْ يَثِقُ بِهِ: مِنْ عَبْدٍ أَوْ امْرَأَةٍ أَوْ صِبْيَانٍ رُشَدَاءَ، وَلَوْ نَوَى لَيْلَةَ الثَّلاَثِينَ مِنْ رَمَضَانَ صَوْمَ غَدٍ إِنْ كَانَ مِنْ رَمَضَانَ أَجْزَأَهُ إِنْ كَانَ مِنْهُ، وَلَوْ اشْتَبَهَ صَامَ شَهْراً بِالاِجْتِهَادِ:

---

(وَفِي الأَدَاءِ) دەربارەی گوتنی بە ئەدا، هەم (وَالْفَرْضِيَّةِ) گوتنی واجب، هەم (وَالإِضَافَةِ إِلَى اللهِ تَعَالَى) گوتنی بۆ خوای گەورە، لە گوتنی هەرسێکیاندا (اَلْخِلاَفُ الْمَذْكُورُ فِي الصَّلاَةِ) ئەو فەرموودە جیاوازانە هەنە: کە لە نوێژدا ڕابران، کەواتە: لە نیەتی ڕەمەزاندا –لە سەر فەرموودەی ڕاستتر– واجب نیە بڵێ: بە ئەدا، لە واجب، بۆ خوای گەورە، بەڵکو هەرسێکیان سوننەتن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست: (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ تَعْيِينُ السَّنَةِ) بە مەرج دانانرێ: ساڵی ڕەمەزانەکە دیاری بکا، واتە: واجب نیە: بڵێ ڕەمەزانی ئەم ساڵ، یان ڕەمەزانی ئەو ساڵە.

ئینجا بزانە: مەرجە: نیەتەکە بە بڕاوەیی بێنێ، کەوابو: (فَلَوْ نَوَى لَيْلَةَ الثَّلاَثِينَ مِنْ شَعْبَانَ) ئەگەر لە شەوی سی‌یەمی شەعباندا نیەتی هێنا: (صَوْمَ غَدٍ عَنْ رَمَضَانَ إِنْ كَانَ مِنْهُ) سبەینێ لە ڕەمەزان بەڕۆژوو ببێ، ئەگەر ڕەمەزان بێ. ئینجا (فَكَانَ مِنْهُ) سبەینێ ڕەمەزان بوو (لَمْ يَقَعْ عَنْهُ) ئەم ڕۆژووە بە بەر ڕەمەزان ناکەوێ، چونکە بە بڕاوەیی نیەتەکەی نەهێناوە (إِلاَّ إِذَا اعْتَقَدَ كَوْنَهُ مِنْهُ) مەگەر باوەڕی وابێ: سبەینێ ڕەمەزانە (بِقَوْلِ مَنْ يَثِقُ بِهِ) بە گوتەی ئەو کەسەی باوەڕی پێ دەکا (مِنْ عَبْدٍ) لە کۆیلە (أَوْ امْرَأَةٍ) یان ئافرەت، یان پیاوی فاسق (أَوْ صِبْيَانٍ رُشَدَاءَ) یان منداڵانی تاقیکرایەوە بە ڕاستگۆیی، ئەو کاتە نیەتەکەی دروست دەبێ، ئەگەر سبەینێ ڕەمەزان بوو ڕۆژووەکەی بە بەر ڕەمەزان دەکەوێ.

ئەم جارە (وَلَوْ نَوَى لَيْلَةَ الثَّلاَثِينَ مِنْ رَمَضَانَ) ئەگەر لە شەوی سی‌یەمی ڕەمەزاندا نیەتی هێنا: (صَوْمَ غَدٍ إِنْ كَانَ مِنْ رَمَضَانَ) سبەینێ لە ڕەمەزان بەڕۆژوو ببێ، ئەگەر ڕەمەزان بێ (أَجْزَأَهُ) دروستەو بە بەر ڕەمەزان دەکەوێ (إِنْ كَانَ مِنْهُ) ئەگەر ڕەمەزان بێ، چونکە لێرەدا بنچینە ئەوەیە ڕەمەزان مابێ.

(وَلَوِ اشْتَبَهَ) ئەگەر مانگی ڕەمەزان شێوا: لە بەدیلگیراوێك، یان لە بەندکراوێك، یان لە هەر کەسێکی تری لەم جۆرە (صَامَ شَهْراً بِالاِجْتِهَادِ) واجبە: بیر بکاتەوەو مانگێك بە (اجتهاد)ی خۆی بەڕۆژوو ببێ، واتە: ئەگەر بە بێ (اجتهاد) بەڕۆژوو ببێ، بە بەر ڕەمەزان ناکەوێ، هەرچەند ئاشکراش ببێ: کە لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بووە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئینجا ئەم سەر لێشێواوە چوار حاڵەتی هەنە:

فَإِنْ وَافَقَ مَا بَعْدَ رَمَضَانَ أَجْزَأَهُ وَهُوَ قَضَاءٌ عَلَى الأَصَحِّ فَلَوْ نَقَصَ وَكَانَ رَمَضَانُ تَامًّا لَزِمَهُ يَوْمٌ آخَرُ، وَلَوْ غَلِطَ بِالتَّقْدِيمِ وَأَدْرَكَ رَمَضَانَ لَزِمَهُ صَوْمُهُ وَإِلاَّ فَالْجَدِيدُ وُجُوبُ الْقَضَاءِ،

---

**حاڵەتی یەکەم:** (فَإِنْ وَافَقَ مَا بَعْدَ رَمَضَانَ) ئەگەر ئەو مانگەی تێیدا بەڕۆژوو بووە، کەوتبێتە دوای ڕەمەزان (أَجْزَأَهُ) مانگەکەی هەموو دروست دەبێ (وَهُوَ قَضَاءٌ) ڕۆژووی ئەو مانگەی بۆ بە قەزای ڕەمەزان دادەندرێ (عَلَى الأَصَحِّ) لە سەر فەرموودەی ڕاستتر، کەوابو: (فَلَوْ نَقَصَ) ئەگەر لە مانگەکەدا-بە کەمی- بیستو نۆ ڕۆژووی گرتبێ‌و (وَكَانَ رَمَضَانُ تَامًّا) ڕەمەزانی ئەو ساڵەش سی ڕۆژ تەواو بوو (لَزِمَهُ يَوْمٌ آخَرُ) واجبە: ڕۆژوویەکیتریش قەزا بکاتەوە، هەروەها ئەگەر لە مانگی شەشەڵان، یان لە مانگی قوربانیدا سی ڕۆژیش بەڕۆژوو بوبێ‌و ڕەمەزانیش سی‌ی تەواو بوبێ، واجبە: ڕۆژووەکانی جەژن‌و سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان قەزا بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

**حاڵەتی‌دووەم:** (وَلَوْ غَلِطَ بِالتَّقْدِيمِ) ئەگەر هەڵەی کردبێ: لە مانگێکی پێش ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بوبێ‌و (وَأَدْرَكَ رَمَضَانَ) بۆی ئاشکرا بوو هەڵەی کردوەو گەیشتە مانگی ڕەمەزان (لَزِمَهُ صَوْمُهُ) واجبە: لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو ببێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر نەگەیشتە ڕەمەزان، بەڵکو لە دوای ڕەمەزان هەڵەکەی ئاشکرا بوو (فَالْجَدِيدُ) بە فەرموودەی نوێ (وُجُوبُ الْقَضَاءِ) واجبە: هەموو ڕەمەزانەکە قەزا بکاتەوە، چونکە خواپەرستیەکەی لە پێش کاتی خۆی‌دا کردوە.

**حاڵەتی‌سێیەم:** ئاشکرا ببێ ئەو مانگەی تێیدا بەڕۆژوو بووە: ڕەمەزان بووە، ئەوە ڕۆژووەکانی دروستن.

**حاڵەتی‌چوارەم:** سەر لێشێوانەکەی بەردەوام بێ‌و هیچی بۆ ئاشکرا نەبێ، ئەو کاتەش ڕۆژووەکانی دروست دەبن‌و قەزا کردنەوەی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾ **یەکەم:** ئەگەر سەری لێشێواو نەیزانی کەینێ شەوەو کەینێ ڕۆژە؟ ئەو کاتەش واجبە بیر بکاتەوەو بەڕۆژوو ببێ، ئینجا ئەگەر بۆی ئاشکرا نەبو: ئایا لە شەوێدا بەڕۆژوو بووە، یان لە ڕۆژێ‌دا؟ ئەوە قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، بەڵام ئەگەر بۆی ئاشکرا بوو لە شەوێدا بەڕۆژوو بووە، واجبە: قەزا بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

**دووەم:** جگە لە ڕۆژووی‌ڕەمەزان هیچ ڕۆژوویێکی‌تر لە ڕەمەزاندا دروست نابێ، کەواتە: ئەگەر نەخۆشێك، یان ڕێبوارێك، یان هەر کەسێکی‌تر لە ڕەمەزاندا نیەتی ڕۆژووی سوننەت، یان نەزر، یان کەففارەت، یان قەزای‌ڕەمەزانێکی‌تر بێنێ، ئەو ڕۆژووانە هیچیان دروست نابن‌و بە بەر ڕۆژووی‌ڕەمەزانەکەش ناکەون، هەروەك لە(المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

وَلَوْ نَوَتِ الْحَائِضُ صَوْمَ غَدٍ قَبْلَ انْقِطَاعِ دَمِهَا ثُمَّ انْقَطَعَ لَيْلاً صَحَّ إِنْ تَمَّ لَهَا فِي اللَّيْلِ أَكْثَرُ الْحَيْضِ، وَكَذَا قَدْرُ الْعَادَةِ فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) شَرْطُ الصَّوْمِ الإِمْسَاكُ عَنِ الْجِمَاعِ

---

(وَلَوْ نَوَتِ الْحَائِضُ) ئەگەر ئافرەتی زەیسانی، یان حەیزدار-شەویّ-نیەتی هیّنا (صَوْمَ غَدٍ) سبەینیّ بەڕۆژوو بیّ (قَبْلَ انْقِطَاعِ دَمِهَا) پیّش ئەوەی خویّنی زەیسانی، یان حەیزی بوەستیّ (ثُمَّ) ئینجا لە دوای نیەتهیّنانەکە (انْقَطَعَ لَيْلاً) لە شەویّدا خویّنەکەی وەستا (صَحَّ) بەم نیەتە ڕۆژووەکەی دروستە (إِنْ تَمَّ لَهَا فِي اللَّيْلِ أَكْثَرُ الْحَيْضِ) بەو مەرجەی لە شەویّدا زۆرترینی ماوەی حەیزی بۆ تەواو بوبیّ، واتە: پانزە ڕۆژو شەو (وَكَذَا) هەروەها ڕۆژووەکەی دروست دەبیّ (قَدْرُ الْعَادَةِ) ئەگەر ئەندازەی عادەتی حەیزی خۆی لەو شەوەدا تەواو بوبیّ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا نیەتەکەی بە براوەیی هیّناوە، کەوابو: ئەگەر لە پیّش بەیاندا خویّنی بوەستیّو نیەتی نەهیّنابیّ، واجبە: یەکسەر نیەتی ڕۆژووی ڕەمەزان بیّنیّ، هەرچەند تا دوای بەیانیش خۆی نەشوا، هەروەك لە باسی حەیزدا ڕوونمان کردەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەن ﴾

یەکەم: جیماع کردن (شَرْطُ الصَّوْمِ) مەرجی دروستبوونی ڕۆژوو (الإِمْسَاكُ عَنِ الْجِمَاعِ) خۆقەدەغەکردنە: لە جیماع کردن، واتە: هەر کەسیّك جیماع بکا، ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبیّو کەففارەتیشی دەکەویّتە سەر، بەو مەرجەی بە ویستی خۆیو بە قەسدی جیماعەکە بکاو بشزانیّ جیماع کردن لە ڕۆژوودا حەرامە.

جا لەو بەتاڵبوونەشدا جیاوازی ئافرەتو پیاو نیەو جیاوازی نیە: ئاویان بیّ، یان نا، هەم جیاوازی نیە: جیماعەکە بە حەلاڵی بیّ، یان بە حەرامی، لە کونی پیّشەوەدا بیّ، یان لە پشتەوەدا، لەگەڵ ئادەمیزاددا بیّ، یان لەگەڵ ئاژەڵدا، خوای گەورە دەفەرمویّ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ﴾ بۆتان حەلاڵ کراوە: لە شەویڕۆژووەکاندا جیماع لەگەڵ ژنەکانتان بکەن. واتە: بەلاّم لە ڕۆژوودا هەر حەرامە، هەم بە بەلگەی حەدیسەکەی داهاتووش لە کەففارەتدا.

بەلاّم ئەگەر نەیدەزانی جیماع لە ڕۆژوودا حەرامە، چونکە تازە موسلّمان بوو، یان لە شویّنیّکی دوور لە زانایان گەورە بوبوو، یان لە بیری چوو بیّ: کە بەڕۆژووە، یان بە ویستی خۆی نەبیّ: وەك بە زۆرلیّکردن جیماعیان لەگەڵ کردبیّ، یان لە خەودا جیماعیان لەگەڵ کردبیّ، لەو حاڵەتانەدا ڕۆژوویان بەتاڵ نابیّ، بەلاّم ڕۆژووی بە ئاگایەکەو زۆردارەکە بەتاڵ دەبیّ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالإِسْتِقَاءَة، وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لَوْ تَيَقَّنَ أَنَّهُ لَمْ يَرْجِعْ شَيْءٌ إِلَى جَوْفِهِ بَطَلَ، وَإِنْ غَلَبَهُ الْقَيْءُ فَلاَ بَأْسَ، وَكَذَا لَوْ اقْتَلَعَ نُخَامَةً وَلَفَظَهَا فِي الأَصَحِّ، فَلَوْ نَزَلَتْ مِنْ دِمَاغِهِ وَحَصَلَتْ فِي حَدِّ الظَّاهِرِ مِنَ الْفَمِ فَلْيَقْطَعْهَا مِنْ مَجْرَاهَا وَلْيَمُجَّهَا فَإِنْ تَرَكَهَا مَعَ الْقُدْرَةِ فَوَصَلَتِ الْجَوْفَ أَفْطَرَ فِي الأَصَحِّ،

---

دووەم: خۆڕشاندنەوە (وَالإِسْتِقَاءَة) هەروەها مەرجێکیتری دروستبوونی ڕۆژوو: خۆقەدەغەکردنە لە خۆڕشاندنەوە (وَالصَّحِيحُ) بە فەرموودەی ڕاست (أَنَّهُ لَوْ تَيَقَّنَ) ئەگەر بێگومانیش بزانێ (أَنَّهُ لَمْ يَرْجِعْ شَيْءٌ إِلَى جَوْفِهِ) لەو ڕشانەوەیە هیچی نەگەڕاوەتەوە بۆ ناوەوەی (بَطَلَ) ڕۆژووەکەی هەر بەتاڵ دەبێ، بەلام (وَإِنْ غَلَبَهُ الْقَيْءُ) ئەگەر ڕشانەوە بە سەریدا زاڵ بوو، واتە: بە بێویستی خۆی ڕشاوە (فَلاَ بَأْسَ) ئەوە هیچ نیەو ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ وَهُوَ صَائِمٌ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ وَإِنْ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ﴾ رواه أصحاب السنن بسند حسن، هەر کەسێك ڕشانەوەی بە سەردا زاڵ بوو قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکەی لە سەر نیە، هەر کەسێکیش بە قەسدی خۆی بڕشێنێتەوە با ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە.

(وَكَذَا) هەروەها ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێ (لَواقْتَلَعَ نُخَامَةً) ئەگەر مرۆڤەکە بە خۆی چڵمێك، یان بەڵغەمێکی هەڵکەندو (وَلَفَظَهَا) فڕێیدا دەرەوە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، بەلام ئەگەر چڵمەکە، یان بەڵغەمەکە بگاتە بۆشایی دەمیو توانای هەبێ فڕێی بداتە دەرەوە، لەگەڵ ئەوەشدا قوتیداوە، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ، بەلام ئەگەر توانای فڕێدانی نەبو و بە خۆی ڕۆیشتە خوارەوە، ئەو کاتە ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێ، جا مەبەستیش بە بۆشاییدەم: شوێنی دەرچوونی پیتی (ح)و بە سەرەوەترە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(فَلَوْ نَزَلَتْ مِنْ دِمَاغِهِ) ئەگەر چڵمەکە بەخۆی لە مێشکیەوە هاتە خوارەوەو (وَحَصَلَتْ فِي حَدِّ الظَّاهِرِ مِنَ الْفَمِ) گەیشتە سنووری بۆشایی دەمی (فَلْيَقْطَعْهَا) با چڵمەکە بپچڕێنێ (مِنْ مَجْرَاهَا) لەو شوێنەوە کە لێیەوە دێو (وَلْيَمُجَّهَا) با فڕێی بداتە دەرەوە (فَإِنْ تَرَكَهَا) جا ئەگەر فڕێی نەدا دەرەوە (مَعَ الْقُدْرَةِ) لەگەڵ ئەوەی توانای فڕێدانیشی هەبو (فَوَصَلَتِ الْجَوْفَ) بەخۆی ڕۆیشتە ناو بۆشایی (أَفْطَرَ فِي الأَصَحِّ) ڕۆژوی دەشکێ، لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە کەمتەرخەمی کردوە، بەلام ئەگەر توانای فڕێدانی نەبو و بەخۆی ڕۆشتە خوارەوە، ئەو کاتە ڕۆژووەکەی ناشکێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ئاگاداری﴾: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: بە قوتدانەوەی چڵمو بەڵغەمی خۆی ڕۆژووی ناشکێ، هەروەك لە کتێبەکانیخۆیاندا فەرموویانە.

وَعَنْ وُصُولِ الْعَيْنِ إِلَى مَا يُسَمَّى جَوْفاً، وَقِيلَ يُشْتَرَطُ مَعَ هَذَا أَنْ يَكُونَ فِيهِ قُوَّةٌ تُحِيلُ الْغِذاءَ أَوِ الدَّواءَ، فَعَلَى الْوَجْهَيْنِ بَاطِنُ الدِّمَاغِ وَالْبَطْنِ وَالأَمْعَاءِ وَالْمَثَانَةِ مُفْطِرٌ بِالإِسْتِعَاطِ أَوِ الأَكْلِ أَوِ الْحُقْنَةِ أَوِ الْوُصُولِ مِنْ جَائِفَةٍ أَوْ مَأْمُومَةٍ وَنَحْوِهِمَا،

---

سێیەم: تێنانی شتێکە دەناو بۆشاییەکانی لاشە (وَعَنْ وُصُولِ الْعَيْنِ) هەروەها مەرجێکیتری دروستبوونی ڕۆژوو، خۆقەدەغەکردنە: لە گەیاندنی شتێك کە لاشەی هەبێ (إِلَى مَا يُسَمَّى جَوْفاً) بۆ ناو بۆشایی لاشەی ڕۆژووگرەکە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ﴾ لە شەوی ڕۆژوودا شتی حەلاڵ بخۆنو بخۆنەوە، تا تاریو ڕۆنی بەیانی لێك جیا دەبنەوە، ئینجا لەو کاتەوە ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن تا دەبێتە شەو.

ئیتر جیاوازی نیە: ئەو شتەی دەیباتە بۆشایی: خواردەمەنی بێ، یان شتێکیتر بێ، زۆر بێ، یان کەم بێ: وەکو یەك دەنکی هەنجیر، شل بێ، یان پەیت بێ، پیس بێ، یان پاك بێ: تێیدا بمێنێتەوە، یان لێی بێتە دەرەوە: وەکو پەنجە، یان دارێك، یان شتێکیتر دەکونێکی لاشەی خۆی بنێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَبَالِغْ فِي الإِسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِماً﴾رواه أصحاب السنن بسند صحيح، لە دەستنوێژدا ئاو لە لووتت وەربکەو بەرەو سەرەوەش هەڵیمژە، مەگەر بەڕۆژوو بی. واتە: لە حاڵەتی ڕۆژوودا هەڵینەمژێ؟ چونکە دەچێتە ناو بۆشاییو ڕۆژووەکە دەشکێ.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: (يُشْتَرَطُ مَعَ هَذَا) بە مەرج دادەندرێ لەگەڵ ئەوەش کە بۆشایی بێ: (أَنْ يَكُونَ فِيهِ قُوَّةٌ) ئەو بۆشاییەش هێزێکی وەهای تێدا بێ: کە (تُحِيلُ الْغِذاءَ أَوِالدَّواءَ) ئاسەواری خواردنو خواردنەوە، یان دەرمان، بگوازێتەوە بۆ لاشەی مرۆڤ (فَعَلَى الْوَجْهَيْنِ) جا لە سەر هەردوو فەرموودەکەی بەهێزو بێهێز: (بَاطِنُ الدِّمَاغِ) ناو مێشکە سەرو (وَالْبَطْنِ) ناو زگو (وَالأَمْعَاءِ) ناو ڕیخۆڵەکانو (وَالْمَثَانَةِ) ناو میزدان (مُفْطِرٌ) هەر یەکەیان ڕۆژوو دەشکێنن: (بِالإِسْتِعَاطِ) بە تێکردنو هەڵمژینی شتێك: لە ڕێگەی لووتەوە بۆ ناو بۆشایی سەر (أَوِالأَكْلِ) یان بە هۆی خواردن بۆ ناو زگ (أَوِالْحُقْنَةِ) یان بە تێکردنی دەرمانێك: لە کونی پشتەوە بۆ ناو ڕیخۆڵە، یان لە پێشەوە بۆ ناو میزدانە (أَوِالْوُصُولِ) یان شتەکە بگاتە بۆشایی (مِنْ جَائِفَةٍ) لە برینێکی دوودەرەوە: وەك زگی کون بوبێو دەرمانی لە کونەکەوە تێبکرێ (أَوْ مَأْمُومَةٍ) یان لە برینێکی مێشکە سەر: وەك ئێسقانی سەری شکابێو دەرمانەکە لە برینەکەوە بگاتە بۆشایی سەر (وَنَحْوِهِمَا) هەرچی وەك ئەو دوو برینەش بێ، کەوابو: ئەگەر بە خۆی، یان یەکێکیتر بە ئیزنی وی خەنجەرێك، یان شتێکیتری لێداو بگاتە بۆشاییەکی لاشەی، ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَالتَّقْطِيرُ فِي بَاطِنِ الأُذُنِ وَالإِحْلِيلِ مُفْطِرٌ فِي الأَصَحِّ، وَشَرْطُ الْوَاصِلِ كَوْنُهُ مِنْ مَنْفَذٍ مَفْتُوحٍ، فَلاَ يَضُرُّ وُصُولُ الدُّهْنِ بِتَشَرُّبِ الْمَسَامِّ، وَلاَ الإِكْتِحَالُ وَإِنْ وَجَدَ طَعْمَهُ بِحَلْقِهِ،

---

(وَالتَّقْطِيرُ) تێكردنی دڵۆپە دەرمان‌و ئاو و شتی‌تر (فِي بَاطِنِ الأُذُنِ) دەناوەوەی گوێو (وَالإِحْلِيلِ) ناو ئەندامی میزكردن (مُفْطِرٌ) ڕۆژوو دەشكێنێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، واتە: هەرچەند كونی گوێیەكانیش دوودەرنینەو ناگاتە هیچ بۆشاییەكی‌تر؟ چونكە لە فەرموودەی ڕاستتردا: مەرج نیە: بۆشاییەكە هێزی گوازتنەوەی خۆراكو دەرمانی هەبێ.

(وَشَرْطُ الْوَاصِلِ) مەرجی ئەو شتەی دەگاتە ناو بۆشاییلەش‌و ڕۆژووش دەشكێنێ، ئەوەیە: (كَوْنُهُ مِنْ مَنْفَذٍ مَفْتُوحٍ) لە كونێكی كراوەڕا بڕواتە ناو بۆشاییەكە، وەك ئەو كونانەی باسمان كردن، كەوابو: (فَلاَ يَضُرُّ) زیان لە ڕۆژوو نادا (وُصُولُ الدُّهْنِ بِتَشَرُّبِ الْمَسَامِّ) ڕون، یان دەرمان بگاتە ناو بۆشایی بە هۆی كونە ووردیلەكانی پیست، هەروەك ئەگەر ئاسەواری ئاو –لە كاتی خۆشۆردن– بە كونە ووردیلەكاندا بڕواتە ناو بۆشایی، زیان نادا ﴿عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ مِنَ الْحَرِّ أَوِ الْعَطَشِ﴾ رواه ابوداود وغيره بسند صحيح، پێغەمبەرم ﷺ بینی بەڕۆژوو بوو، لە بەر گەرما، یان لە تێنووەتی ئاوی بە سەری خۆی دادەكرد.

(وَلاَ الإِكْتِحَالُ) هەروەها كل دەچاو كردن زیان نادا (وَإِنْ وَجَدَ طَعْمَهُ بِحَلْقِهِ) هەرچەند ڕەنگ، یان تامی كلەكەش لە گەرووی بێ، چونكە چاو كونی كراوەی نیە، بەڵكو لە كونە ووردیلەكانیدا دەڕواتە ناو گەروو، بەڵام لە مەزهەبی ئیمام(مالك)دا ئەگەر كل بگاتە گەروو، ڕۆژوو دەشكێنێ ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: هەر ئەو حەدیسەش بەڵگەیە: ئەگەر دەرمان، یان خوێن، یان ئاوی‌ژیاندەر بە هۆی دەرزی‌شرونقە لە ڕێی پیستەوە، یان لە ڕێی دەمارەوە دەناو لاشەی مرۆڤ بكرێن، ڕۆژووی ناشكێ، هەروەك لە (الأنوار) وەردەگیرێ، واتە: چونكە ئەوانەش–وەكو ئاوی خۆشۆردن– لە كونێكی كرایەوەڕا ناچنە ناو بۆشایی، ئاسەواریش بە تەنها زیانی نیە.

دووەم: ئەو دەرمانانەی بە هێزی هەوا دەخرێنە ناو بۆشایی، ئەوانیش ڕۆژوو بەتاڵ دەكەن، بۆ وێنە–وەك (بَخاخ)– ئەو دەرمانانەی لە ناو قوتیەكدا لەگەڵ هەوا دادەگیرێو بە هێزی هەوایەكە دەردەچێو نەخۆشە پشووتەنگەكان بەكاری دێنن؟ چونكە دەرمانەكە لاشەی هەیەو ئەگەر لە سەر دەستت پووی بكەی لاشەكەی ئاشكرا دەبێ، هەروەك دوكەڵی جگەرەش لە ناو قەلنەكەدا قیرەكەی ئاشكرا دەبێو هەر بە هۆی ئەو قیرەش جگەرەكە ڕۆژوو بەتاڵ دەكاتەوە، هەروەك لە (الشرواني)و(إعانة)دا ڕوون كراوەتەوە.

وَكَوْنُهُ بِقَصْدٍ فَلَوْ وَصَلَ جَوْفَهُ ذُبَابٌ أَوْ بَعُوضَةٌ أَوْ غُبَارُ الطَّرِيقِ أَوْ غَرْبَلَةُالـدَّقِيقِ لَـمْ يُفطِرْ، وَلاَ يُفْطِرُ بِبَلْعِ رِيقِهِ مِنْ مَعْدِنِهِ، فَلَوْ خَرَجَ عَنِ الْفَمِ ثُمَّ رَدَّهُ وَابْتَلَعَهُ أَوْ بَلَّ خَيْطـاً بِرِيقِهِ وَرَدَّهُ إِلَى فَمِهِ وَعَلَيْهِ رُطُوبَةٌ تَنْفَصِلُ أَوْ ابتَلَعَ رِيقَهُ مَخْلُوطـاً بِغَيْـرِهِ أَوْ مُتَنَجِّسـاً أَفْطَرَ، وَلَوْ جَمَعَ رِيقَهُ فَابْتَلَعَهُ لَمْ يُفطِرْ فِي الأَصَـحِّ، وَلَـوْ سَـبَقَ مَـاءُ الْمَضْمَضَـةِ أَوِ الإِسْتِنْشَاقِ إِلَى جَوْفِهِ فَالْمَذْهَبُ أَنَّهُ إِنْ بَالَغَ

---

(وَكَوْنُهُ بِقَصْدٍ) هەروەها مەرجی ئەو شتەی دەچێتە بۆشایی‌و ڕۆژوو دەشکێنێ، ئەوەیە بە قەسدی بێ‌و بە حەزکردنی خۆی بێ، کەوابو: (فَلَوْ وَصَلَ جَوْفَهُ ذُبَابٌ) ئەگەر مێشێك چووە ناو گەرووی (أَوْ بَعُوضَةٌ) یان پێشولەیەك (أَوْ غُبَارُ الطَّرِيقِ) یان تۆزی ڕێگە (أَوْ غَرْبَلَةُ الدَّقِيقِ) یان تۆزی لە هێڵەنگدانی ئارد (لَمْ يُفطِرْ) بەوانەیرابردوو ڕۆژوو ناشکێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر کەسێك تووشی نەخۆشی مایسیری بوبێ‌و قینگی بێتە دەرەوە، دروستە قینگەکەی بباتەوە ژوورەوەو ڕۆژووەکەشی بەتاڵ نابێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يُفْطِرُ بِبَلْعِ رِيقِهِ مِنْ مَعْدِنِهِ) ڕۆژووی ناشکێ بەوەی تفی‌خۆی بە تەنهاو بە پاکی لە ناو دەمی‌خۆیەوە قوت بداتەوە، کەوابو: (فَلَوْ خَرَجَ عَنِ الْفَمِ) ئەگەر تفەکەی لە دەمی هاتە دەرەوە (ثُمَّ رَدَّهُ وَابْتَلَعَهُ) ئینجا گەڕاندیەوەو قوتی‌دا (أَوْ بَلَّ خَيْطاًبِرِيقِهِ) یان داوێکی بە تفی‌خۆی تەڕ کرد، یان سیواکی بە تفەکەی‌خۆی تەڕ کرد، یان بە ئاو تەڕی کرد (وَرَدَّهُ إِلَى فَمِهِ) داوەکەی، یان سیواکەکەی خستەوە ناو دەمی‌خۆی (وَعَلَيْهِ رُطُوبَةٌ تَنْفَصِلُ) داوەکە، یان سیواکەکە تەڕایەتیەکەی بە شێوەیەکی‌وەها پێوە مابو: لێی جیادەبۆوەو قوتی‌دا (أَوابْتَلَعَ رِيقَهُ مَخْلُوطاً بِغَيْرِهِ) یان تفەکەی تێکەڵی شتێکی‌تر بوبێ‌و قوتی بدا (أَوْ مُتَنَجِّساً) یان تفەکەی بە خوێن، یان بە شتێکی‌تر پیس بوبێ‌و قوتی بدا، یان تفی کەسێکی‌تر قوت بدا (أَفْطَرَ) لەو هەموو حاڵەتانەدا ڕۆژووی دەشکێ، بەڵام ئەگەر بەردەوام خوێن لە دەم‌و پوکەی دەهات‌و نەیدەتوانی خۆی بپارێزێ، ئەوە تەنها تف فڕێدانەکە بەسە، واتە: هەرچەند ناودەمیشی پیس بووە، لێی دەبووردرێ، هەروەك لە (نهاية)و(مغنى)دا فەرموویانە.

(وَلَوْ جَمَعَ رِيقَهُ) ئەگەر بە قەسدی تفەکەی لە ناو دەمی‌دا کۆ کردەوە (فَابْتَلَعَهُ) ئینجا قوتی‌دا (لَمْ يُفطِرْ) ڕۆژووی ناشکێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَلَوْ سَبَقَ) ئەگەر بە بێ‌ویستی‌خۆی پێشبڕکەی لێکرد (مَاءُ الْمَضْمَضَةِ أَوِالإِسْتِنْشَاقِ) ئاوی لە دەم‌وەرکردن، یان لە لووت‌وەرکردن لە غوسلی واجب‌و لە دەستنوێژدا (إِلَى جَوْفِهِ) چووە ناو بۆشایی گەرووی، یان بۆشایی سەری (فَالْمَذْهَبُ) بە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب (أَنَّهُ إِنْ بَالَغَ)

أَفْطَرَ وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ بَقِيَ طَعَامٌ بَيْنَ أَسْنَانه فَجَرى به رِيقُهُ لَمْ يُفطِرْ إِنْ عَجَزَ عَـنْ تَمْييـزِهِ وَمَجِّه، وَلَوْ أُوجِرَ مُكْرَهاً لَمْ يُفطِرْ، وَإِنْ أُكْرِهَ حَتَّى أَكَلَ أَفْطَرَ فِيالأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَرُ لاَيُفْطِرُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

ئەگەر لە سنوور زێدەڕۆیی کردبێ (أفطَرَ) ڕۆژووی دەشکێ، چونکە بە دژی حەدیسەکەی ﴿إلاّ أَنْ تَكُونَ صَائماً﴾ی ڕابردوو ڕەفتاری کردوە.

(وَإلاّ) بەڵام ئەگەر لە سنوور دەرنەچووبێ، یان نەیزانیبێ حەرامە، یان لە بیری چووبێ کە بەڕۆژووە (فَلاَ) لەو حاڵەتانەدا ڕۆژووی ناشکێ، بەڵام ئەگەر لەکارێکیتری جگە لە دەستنوێژو غوسلی واجبدا ئاوەکە چووە ناو دەمو لووتی، یان لە غوسلی واجبدا خۆی نقومی ناو ئاو کردو ئاوەکە چووە ناو دەمو لووتی، ئەوە لەو حاڵەتانەدا ڕۆژووی بەتاڵ دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: هەر کاتێك مرۆڤیبەڕۆژوو ئاوی لە دەمی خۆی وەرکرد، تەنها واجبە: ئاوەکە فڕێ بداتە دەرەوە، واتە: واجب نیە: دەمی خۆی ووشك بکاتەوە، کەواتە: ئەگەر لە دوای ئاو فڕێدانەکە تفی خۆی قووت بداتەوە، ڕۆژووی ناشکێ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە، هەروەها ئەگەر لە کاتی گوێ شۆردن لە غوسلی حەیزو جەنابەتدا، بە بێویستیخۆی ئاو بکەوێتە ناو گوێیەکانی، ڕۆژووی ناشکێ، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ بَقِيَ طَعَامٌ بَيْنَ أَسْنَانِهِ) ئەگەر خواردەمەنیەك لە نێوان ددانەکانیدا مایەوە (فَجَرى بِهِ رِيقُهُ) بە بێکرداریوی تفەکەی خواردنەکەی ڕۆیاندە خوارەوە (لَمْ يُفطِرْ) ڕۆژووی ناشکێ (إِنْ عَجَزَ عَنْ تَمْييزِهِ وَمَجِّهِ) ئەگەر توانای نەبێ: لە تفەکەی جیای بکاتەوەو فڕێی بداتە دەرەوە، بەڵام ئەگەر بە قەسدی قوتی بدا، یان توانای جیاکردنەوەو فڕێدانی هەبێو فڕێی نەدا، ئەو کاتە ڕۆژووەکەی دەشکێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَلَوْ أُوجِرَ مُكْرَهاً) ئەگەر بە زۆرلێکردن شتێکی خسترا ناو گەرووی: وەك دەمی لێك بکەنەوەو شتێکی بڕژێننە ناو گەرووی (لَمْ يُفطِرْ) ڕۆژووی ناشکێ، هەروەهاش ئەگەر لە حاڵەتی خەوتندا، یان لە حاڵەتی بێهۆشیدا خواردن، یان دەرمانی تێبکرێ، یان جیماعی لەگەڵ بکرێ، ڕۆژووی ناشکێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَإِنْ أُكْرِهَ) ئەگەر زۆری لێکرا (حَتَّى أَكَلَ) تا شتێکی خوارد (أَفْطَرَ فِيالأَظْهَرِ) ڕۆژووی دەشکێ لە فەرموودەیبەهێزتردا (قُلْتُ) ئیمامی(النواوي) دەفەرموێ (الأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: (لاَيُفْطِرُ) مرۆڤی زۆرلێکراو ڕۆژووی ناشکێ (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَااسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ﴾ حديث حسن رواه

وَإِنْ أَكَلَ نَاسِياً لَمْ يُفْطِرْ إِلاَّ أَنْ يَكْثُرَ فِي الأَصَحِّ، قُلْتُ: اَلأَصَحُّ لاَ يُفْطِـرُ وَاللهُ أَعْلَـمُ. وَالْجِمَاعُ كَالأَكْلِ عَلَى الْمَذْهَبِ، وَعَنِ الإِسْتِمْنَاءِ فَيُفْطِرُ بِهِ، وَكَذَا خُرُوجُ الْمَنِيِّ بِلَمْسٍ وَقُبْلَةٍ

---

ابن ماجه وغيره، خـوای گـەورە تـاوانی بەهەڵەداچـوون و لەبیرچـوون و زۆرلێکـردن، لـه سـەر ئۆممـەتی مـنی لاداوە. کـەوابو: ئەگـەر بـە زۆرلێکـردن جیماعیـان پـێکرد ڕۆژووی ناشـکێ، جیاوازی پیاو و ئافرەتیش نیە، هەروەك لە (المجموع)و (مغني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَإِنْ أَكَلَ) ئەگـەر شـتێکی خـوارد، یـان خواردیـەوە (نَاسِيا) لـەو حاڵەتـەدا: کـە لـە بـیری چوبێ بەڕۆژووە (لَمْ يُفْطِرْ) ڕۆژووی ناشکێ، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿مَنْ نَسِـيَ وَهُـوَ صَائِمٌ فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ فَإِنَّمَا أَطْعَمَـهُ اللهُ وَسَـقَاهُ﴾رواه الشيخان، هـەر کەسـێك بەڕۆژوو بوو و لەبیری چوو: شـتێکی خـوارد، یـان خواردیـەوە، بـا ڕۆژووەکـەی تـەواو بکـا، چونکە خوای گەورە ئەو شتەی دەرخـوارد داوە. (إِلاَّ أَنْ يَكْـثُـرَ فِيالأَصَحِّ) مەگـەر زۆر بـێ، لە فەرموودەی ڕاستردا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (الأَصَحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتر ئەمەیە: (لاَ يُفْطِرُ) ڕۆژووەکەی ناشکێ، هەرچـەند خـواردن و خواردنەوەکـەش زۆر بـێ (وَاللهُ أَعْلَم) چونکە حەدیسەکە، کەم و زۆر دەگرێتەوە.

(وَالْجِمَاعُ) جیماع کردن لەو حاڵەتەی لە بـیری چـوبێ بـەڕۆژووە (كَالأَكْلِ) وەکـو خواردنـە، ڕۆژووی پێناشکێ (عَلَى الْمَذْهَبِ) لـە سـەر فـەرموودەی ڕاسـتی مەزهـەب، هـەروەها گشـت ڕۆژووشکێنەکانیتریش وەکـو خـواردن و جیمـاعن، لـە حاڵـەتی زۆرلێکـردن و لـە بیرچـووندا ڕۆژوو ناشکێنن.

هــەروەها مرۆڤی نــەزان ئەگــەر نــەزانێ: کردنــی ڕۆژووشــکێنەکان حەرامــە؟ چـونکە تـازە موسڵمان بوو، یان لە شوێنێکی دوور لە زانایان گەورە بوبێ، ئـەویش ڕۆژووی ناشـکێ، بـەڵام ئەگەر بزانێ حەرامەو نەزانێ ڕۆژوو دەشکێنن، یان لە ناو موسڵمانان گەورە بوبـێ، ئـەو کاتـە ڕۆژووەکەی دەشکێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەم مەسەلانە ڕوون کراوەتەوە.

چـوارەم: هێنانـەوەی ئـاوی خـۆی، واتـە: خـۆ ڕەحـەتکردن، هـەروەك دەفـەرموێ (وَعَنِ الإِسْتِمْنَاءِ) مەرجێکیتری دروستبوونی ڕۆژوو ئەوەیـە: خـۆی قەدەغـە بکـا: لـە هێنانـەوەی ئاویخۆی (فَيُفْطِرُ بِهِ) بە هێنانەوەیئاویخۆی ڕۆژووی دەشکێ، بـە بەڵگـەی حەدیسـەکەی داهـاتوو، جیـاوازی نیـە: ئـاو هێنانەوەکـەی بـە شـێوەیەکی حـەڵاڵ بـێ: وەك بـە ئەنـدامی ژنەکـەیخۆی، یـان حـەڕام بـێ: وەك بـە ئەنـدامێکیخۆی، یـان بـە کەسـێکیتری جگـە لـە ژنەکەی خۆی.

(وكَذَا خُرُوجُ الْمَنِيِّ) هەروەها ئەگەر ئاوەکـەی بـە خۆیشـی بهێتـە دەرەوە، ڕۆژووی دەشـکێ: ئەگەر (بِلَمْسٍ) بـە هـۆی دەسـت لێدانیئافرەتێك، یـان ئەنـدامێکیخۆی بـێ (وَقُبْلَةٍ) یـان بـە

وَمُضَاجعَة، لاَ فِكْرٍ وَنَظَرٍ بِشَهْوَة، وَتُكْرَهُ الْقُبْلَةُ لِمَنْ حَرَّكَتْ شَهْوَتَهُ، وَالأَوْلَى لِغَيْرِهِ تَرْكُهَا، قُلْتُ: هِيَ كَرَاهَةُ تَحْرِيمٍ فِي الأَصَحِّ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

هۆی ماچ کردن بێ (وَمُضَاجعَة) یان به هۆی لەگەڵ پاڵدانەوە بێ، به بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو (لاَ فِكْرٍ) بەڵام ئەگەر به هۆی بیرکردنەوەو (وَنَظَرٍ بِشَهْوَة) تەماشاکردنی بە شەهوەت ئاوی بهێتە دەرەوە، ڕۆژووی ناشکێ.

(وَتُكْرَهُ الْقُبْلَةُ)ماچ کردنی ئافرەتو پیاو ناپەسندە، به ناپەسندیەکی حەرام (لِمَنْ) بۆ ئەو مرۆڤە بەڕۆژووەی (حَرَّكَتْ شَهْوَتَهُ) ماچ کردن شەهوەتی بجولێنێ (وَالأَوْلَى لِغَيْرِهِ تَرْكُهَا) ئەوەی شەهوەتیشی به ماچ کردن ناجولێ، وا باشترە ماچ نەکا.

(قُلْتُ) ئیمامی(النـووي) دەفەرموێ (هِيَ كَرَاهَةُ تَحْرِيمٍ) ئەو ناپەسندیه ناپەسندی حەرامکردنە (فِي الأَصَحِّ) له فەرموودەی ڕاستتردا (وَاللهُ أَعْلَمُ) چونکە مەترسی تووشبوونی حەرامی لێدەکرێ، کەوابو: گشت دەستبازیو دەست لەملانێش-وەکو ماچ کردن- بۆ ئەو جۆرە کەسانە حەرامە، هەروەك له (المجموع)و(تحفة)دا فەرموویانە ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ؟ فَرَخَّصَ لَهُ، وَسَأَلَهُ آخَرُ؟ فَنَهَاهُ، فَإِذَا الَّذِي رَخَّصَ لَهُ شَيْخٌ، وَالَّذِي نَهَاهُ شَابٌّ﴾ رواه ابوداود والبيهقي بإسناد جيد، پیاوێکیپیر پرسیاری له پێغەمبەرﷺ کرد: دەربارەی دەستبازی مرۆڤی بەڕۆژوو لەگەڵ ژنی خۆیدا؟ پێغەمبەرﷺ ڕێگەی دایێ، یەکێکیتری گەنج هەمان پرسیاری لێکرد؟ پێغەمبەرﷺ ڕێگەی نەدا، واتە: چونکە پیر مەترسی ئاوهاتنی لێناکرێو گەنج مەترسی لێدەکرێ.

ئینجا بزانە: ئەگەر به هۆی ماچ کردنو دەستبازی ئەندامەکەی هەڵساو (مَذْي)ی لێهاتە دەرەوە، ڕۆژووی ناشکێ بەڵام له مەزهەبی ئیمام(مالك)دا دەشکێ، هەروەها ئەگەر له خەودا (إحتلام)ی ببێو ئاوی بێتە دەرەوە ڕۆژووی ناشکێ، هەروەك له (المجموع)و (تحفة)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر له شەودا جیماع بکا، یان (إحتلام)ی ببێ، یان له حەیز، یان له زەیسانی پاك ببێتەوە، ئەوانە نیەتی ڕۆژوو دێنن، جا ئەگەر تا دوای بەیانیش خۆیان نەشۆن، گشتیان ڕۆژووەکەیان دروست دەبێ، هەروەك له (المجموع)دا فەرموویەتی، به بەڵگەی ئەم حەدیسە﴿عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ يُصْبِحُ جُنُباً مِنْ جِمَاعٍ فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ به هۆی جیماع کردن به جەنابەت دەبو، بەیان دەردەکەوت، ئینجا غوسلی دەکردو بەڕۆژووش دەبو.

**پێنجەم:** شێتبوون. **شەشەم:** کافربوون. **حەفتەم:** حەیز. **هەشتەم:** منداڵ لێبوونو زەیسانی. هەر یەکێك لەوانەش له بەشێکیڕۆژێدا ڕوو بدەن، ڕۆژووەکە بەتاڵ دەبێتەوە،

وَلاَ يُفطِرُ بالْفَصْدِ وَالْحِجَامَة، وَالإِحْتِيَاطُ اَنْ لاَ يَأْكُلَ آخرَ النَّهَارِ إلاَّ بِيَقِين، وَيَحِلُّ بالإِجْتِهَادِ فِي الأَصَحِّ، وَيَجُوزُ إذَا ظَنَّ بَقاءَ اللَّيلِ، قُلْتُ: وَكَذَا لَوْ شَكَّ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَلَوْ أَكَلَ بِاجْتِهَادٍ أَوَّلاً أَوْ آخِراً وَبَانَ الْغَلَطُ بَطَلَ صَوْمُهُ،

---

هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەرچەند كافربووەكەش لە بیری چوبێ: كە بەڕۆژووەو هەر ئەو دەمیش ببێتەوە موسڵمان، ڕۆژووەكەی هەر دەشكێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانەو لە مەرجەكانی واجببوونی ڕۆژوودا درێژتر ڕوونی دەكەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

(ولاَ يُفطِرُ) ڕۆژووی ناشكێ (بِالْفَصْدِ) بە هۆی خوێن لێوەرگرتن لە دەمارەوەو (وَالْحِجَامَة) بە هۆی خوێن لێوەرگرتن لە پیستەوە، جا بە هەر جۆرە ئامێرێك بێ ﴿عَنْ ابن عبّاس رَضِيَ اللهُ عنهما: إحتَجَمَ النَّبيُّ ﷺ وَهُوَ صَائِمٌ﴾رواه البخاري وأصحاب السنن، پێغەمبەر ﷺ خوێنی لە خۆی گرت لەو حاڵەتەی كە بەڕۆژوو بوو. ئینجا بزانە: لە چەند حەدیسی (صحيح)دا هاتوە: (بە هۆی خوێن لێوەرگرتن ڕۆژوو دەشكێ). بەڵام حەدیسەكان بەم حەدیسەو چەند حەدیسێكیتر (نسخ) بوینەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر بەڕۆژوو بوو، ئینجا لە ڕۆژێدا نیەتی هێنا: ڕۆژووەكەی بپچڕێنێو بەڕۆژوو نەبێ، ئەوە بەو نیەتهێنانە ڕۆژووی ناشكێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالإِحْتِيَاطُ) پارێزكاری لە ڕۆژوودا ئەوەیە: (أَنْ لاَ يَأْكُلَ آخِرَ النَّهَارِ) لە كۆتایی ڕۆژێدا —واتە: لە بەربانگدا— هیچ نەخواو نەخواتەوە (إلاَّ بِيَقِين) تەنها تا بێگومان دەبێ: كە ڕۆژ ئاوا بووە (وَيَحِلُّ بِالإِجْتِهَادِ) دروستە خواردنو خواردنەوە لە بەربانگدا: بە (اجتهاد)و هەم بە گوێلێبوونی بانگی دادپەروەرێكو هەم بە خەبەردانی دادپەروەرێك (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

(وَيَجُوزُ) لە پاشیودا خواردنو خواردنەوە دروستە (إذَا ظَنَّ بَقاءَ اللَّيلِ) هەر كاتێك واتێبگا: شەو ماوە (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ (وَكَذَا لَوْ شَكَّ) هەروەها ئەگەر بشكەوێتە گومان: ئایا شەو ماوە، یان نا، هەر دروستە: لە پاشیودا خواردنو خواردنەوە (وَاللهُ أَعْلَم) چونكە لێرەدا بنچینە ئەوەیە: شەو مابێ، كەوابو: ئەگەر باوەڕ پێكراوێك پێی ڕاگەیاند: كە بەیان دەركەوتوە، واجبە: واز لە خواردن بێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلَوْ أَكَلَ بِاجْتِهَادٍ) ئەگەر خواردی، یان خواردیەوە، بە (اجتهاد)ێك (أَوَّلاً) لە پاشیودا (أَوْ آخِراً) یان لە بەر بانگدا (وَبَانَ الْغَلَطُ) ئینجا ئاشكرا بو: هەڵەی كردوە، واتە: لە پاشیودا لە دوای بەیان خواردبوی، لە بەر بانگدا پێش ڕۆژئاوابوون خواردبوی (بَطَلَ صَوْمُهُ) لە

أَوْ بلاَ ظَنٍّ وَلَمْ يَبِنِ الْحَالُ صَحَّ إِنْ وَقَعَ فِي أَوَّلِه وَبَطَلَ فِي آخِرِه، وَلَوْ طَلَعَ الْفَجْرُ وَفِي فَمِه طَعَامٌ فَلَفَظَهُ صَحَّ صَوْمُهُ، وَكَذَا لَوْ كَانَ مُجَامِعاً فَنَزَعَ فِي الْحَالِ، فَإِنْ مَكَثَ بَطَلَ.

---

هەردوو حاڵەتدا ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ‌و واجبە: قەزای بکاتەوە، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا لە ڕۆژێدا خواردویەتی ﴿عَنْ أَسْمَاءَ رضي الله عنها: أَفْطَرْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ غَيْمٍ ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ. قِيلَ لِهِشَامٍ: فَأُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: لاَبُدَّ مِنْ قَضَاءٍ﴾ رواه البخاري، لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژێکی هەوردا بەربانگمان شکاند-واتە: فەتارمان کردەوە- ئینجا لە ژێر هەوردا ڕۆژ بەدەر کەوت، بە (هشام)ی حەدیسگێڕەوە گوترا: فەرمانیان پێکرا ڕۆژووەکە قەزا بکەنەوە؟ فەرمووی: واجبە: قەزا بکرێتەوە.

(أَوْ بِلاَ ظَنٍّ) یان ئەگەر بێ ئەوەی وا تێبگا شەو ماوە، هێرشی کردو خواردی، یان خواردیەوە (وَلَمْ يَبِنِ الْحَالُ) حاڵەتەکەش ئاشکرا نەبو: ئایا لە شەوێدا خواردوە، یان لە ڕۆژێدا (صَحَّ) ڕۆژووەکەی دروست دەبێ (إِنْ وَقَعَ فِي أَوَّلِه) ئەگەر خواردنەکەی لە پاشیودا بوبێ، چونکە لێرەدا بنچینە ئەوەیە: شەو مابێ (وَبَطَلَ فِي آخِرِه) ئەگەر خواردنەکەش لە بەر بانگدا بوبێ، ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ، چونکە لێرەدا بنچێنە ئەوەیە: ڕۆژ مابێ، بەڵام -لە هەردوو مەسەلەدا- لە هەریەکێکیاندا ئاشکرا ببێ هەڵەی کردوە، واجبە: ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە، ئەگەر ئاشکراش ببێ خواردنەکەی لە شەوێدا بووە ڕۆژووەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: لەو مەسەلانەی پاشیو و بەر بانگدا، گشت ڕۆژووشکێنەکانیتریش وەکو خواردن بڕیاریان بۆ دەدرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ خواردن‌و خواردنەوە لەگەڵ بانگی بەیانی ﴾

(وَلَوْ طَلَعَ الْفَجْرُ) ئەگەر بەیان دەرکەوت=بانگی سبەینێ درا (وَفِي فَمِه طَعَامٌ) لەو حاڵەتەدا خواردەمەنیەکی لە ناو دەمیدا بوو (فَلَفَظَهُ) جا دەمودەست فڕێیدا دەرەوە، ئەوە (صَحَّ صَوْمُهُ) ڕۆژووەکەی دروست دەبێ، بەڵام ئەگەر بە ویستیخۆی قوتی بدا، ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ، بە بەڵگەیحەدیسەکەی(إِنَّ بِلاَلاً)یداهاتوو.

(وَكَذَا لَوْ كَانَ مُجَامِعاً) هەروەها ئەگەر لە حاڵەتی بانگدان=دەرکەوتنی بەیاندا خەریکی جیماع کردن بوو (فَنَزَعَ فِي الْحَالِ) جا دەمودەست ئەندامەکەی لە ئەندامی ژنەکەی دەرهێنا، ئەوەش ڕۆژووی دروست دەبێ، هەرچەند ئاویشی بهێتەوە (فَإِنْ مَكَثَ) جا ئەگەر لە دوای دەرکەوتنی بەیان هەر لە سەر جیماع کردن مابۆوە (بَطَلَ) ڕۆژووەکەی بەتاڵەو دروست نابێ، هەرچەند نەشیزانیبێ بەیان دەرکەوتوە، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

جا ئەگەر لەو مەسەلەیەدا زانیبێتی بەیان دەرکەوتوەو بە قەسدی دەری نەهێنابێ، ئەو کاتە (کفارة)شی دەکەوێتە سەر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: لە حەدیسێکدا پێغەمبەرﷺ دەفەرمویێ: ﴿إذا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّداءَ وَالإِنـاءُ عَلى يَدِهِ فَلا يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حاجَتَهُ مِنْهُ﴾ حديث صحيح رواه الحاكم والبيهقي، هەر کاتێ یەکێکتان گوێی لە بانگ بوو و جامە ئاویشی لە سەر دەستی بوو، با جامەکە دانەنێ تا پێویستیخۆی لێ بەجێ دێنێ. لێرەدا مەبەست بانگییەکەمە-کە لە پێش بەیاندا دەدرێ- نەك بانگیدووەم؟ چونکە بۆ نوێژیسبەینێ دوو بانگ سونتەتن، یەکەمیان: پێش بەیان. دووەمیان: لە دوای دەرکەوتنیبەیان. هەروەك لە (باسی بانگو ئیقامەت)دا ڕابرا، جا پێغەمبەرﷺ بەخۆی ئەم مەبەستەی ئاشکرا کردوەو دەفەرمویێ: ﴿إنَّ بـلالاً يُـؤَذِّنُ بِلَيْـلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتّى يُنادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ-وَفِي رِوايَـةٍ-فَإِنَّهُ لايُؤَذِّنُ حَتّى يَطْلُـعَ الْفَجْـرُ﴾ رواه الشيخان، (بلال الحبشي) لە پێش بەیاندا بە شەوێ بانگ دەدا، ئێوە لە پاشیودا بخۆن و بخۆنەوە تا (عبدالله ابن أم مكتوم) بانگ نادا تا بەیان دەردەکەوێ. ئیمامی(البیهقی) لە (السنن الكبرى)دا ئەوها ڕوونی کردۆتەوەو ئیمامی (النواوی)ش لە (المجموع)دا گێڕاویەتیەوە، وَالْحَمْدُ لله تعالى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەکانی ڕۆژووگرو، کاتەکانی ڕۆژوو ﴾

(شَرْطُ الصَّوْمِ) مەرجی دروستبوونی ڕۆژوو، یەکەم: (الإِسْلاَمُ) ئیسلامەتییە، واتە: ڕۆژووی هیچ جۆرە کافرێك دروست نابێ. دووەم: (وَالْعَقْلُ) عاقڵییە، واتە: ڕۆژووی شێتو منداڵی نەفام دروست نابێ، بەڵام ڕۆژووی منداڵی فامیدە دروست دەبێ.

سێیەم: (وَالنَّقَاءُ عَنِ الْحَيْضِ والنِّفَاسِ) پاکییە: لە حەیزو نیفاس، واتە: ڕۆژووی ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار دروست نابێ، بە (إجماع)ی زانایانی ئیسلام.

ئینجا پێویستە ئەو سێ مەرجانە بەردەوام بن (جَمِيعَ النَّهَارِ) لە هەموو ڕۆژێدا، واتە: لە دەرکەوتنیبەیانەوە تا ڕۆژ ئاوا دەبێ، کەوابو: ئەگەر لە بەشێکی ڕۆژێدا: (کفر)ێك بکا، یان شێت ببێ، یان حەیز، یان نیفاسی تووش ببێ، یان منداڵی ببێ، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێو-جگە لە شێت- لە سەر گشتیان واجبە: ڕۆژووەکە قەزا بکەنەوە، هەرچەند کافربووەکەش هەر ئەو دەم ببێتەوە موسڵمان، هەروەك لە (فصل)ی داهاتووشدا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

﴿ ئاگاداری ﴾: دروستە ئافرەت دەرمان بە کار بێنێ بۆ نەهاتنی خوێنی حەیز، تاکو (طواف)ی حەج بە پاکی بکا، هەروەك (ابن حجر) لە (حاشية الإيضاح)دا فەرموویەتی،

وَلاَ يَضُرُّ النَّوْمُ الْمُسْتَغرِقُ عَلَى الصَّحِيحِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ الإِغْمَاءَ لاَ يَضُرُّ إِذَا أَفَاقَ لَحْظَةً مِنْ نَهَارِهِ، وَلاَ يَصِحُّ صَوْمُ الْعِيدِ وَكَذَا التَّشْرِيقُ فِي الْجَدِيدِ، وَلاَ يَحِلُّ التَّطَوُّعُ يَوْمَ الشَّكِّ بِلاَ سَبَبٍ، فَلَوْ صَامَهُ

---

ئەوەش وا دەگەیەنێ: کە دروستە دەرمان بە کار بێنێ بۆ دواخستنی حەیز لە ڕەمەزاندا، تاکو ڕەمەزانەکە بە تەواوی بگرێو قەزاکردنەوەی نەکەوێتە سەر، والله أعلم.

(وَلاَ يَضُرُّ النَّوْمُ الْمُسْتَغْرِقُ) زیان لە ڕۆژوو نادا: خەوتنی بەردەوامی ڕۆژێ، کە لە بەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون بە ئاگا نەبێ (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەیڕاست (وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ الإِغْمَاءَ) بێهۆشبوون (لاَ يَضُرُّ) زیان لە ڕۆژوو نادا (إِذَا أَفَاقَ لَحْظَةً مِنْ نَهَارِهِ) بەو مەرجەی لە ڕۆژەکەیدا دەمێکیکەم بە هۆش بێتەوە، بەڵام ئەگەر لە بەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون بێهۆش بوبێ، ڕۆژووەکەی بەتاڵەو واجبە: قەزای بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر بۆ پێویستی دەرمانێکی بێهۆشکەری بەکار هێناو بێهۆش بوو، ئەوەش-وەکو بێهۆشبوون- ئەگەر سەرتاسەری ڕۆژێ بێهۆش ببێ، ڕۆژووەکەی بەتاڵەو واجبە: قەزای بکاتەوە، بەڵام ئەگەر دەمێکیکەم-لە ڕۆژەکەیدا- هۆشی هەبوبێ، ئەو کاتە ڕۆژووەکەی دروست دەبێ، هەروەها ئەگەر لە شەوێدا شەرابو تریاکو ئەو جۆرە شتانە بەکاربێنێو لە ڕۆژێدا سەرخۆش ببێ، ئەویش-لە هەردوو حاڵەتدا- وەکو بێهۆشی بڕیاری بۆ دەدرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ ئەو ڕۆژانەی ڕۆژوویان تێدا حەرامە ﴾

(وَلاَ يَصِحُّ) دروست نیەو حەرامە: (صَوْمُ الْعِيدِ) لە جەژنی ڕەمەزان، یان قورباندا بەڕۆژوو بێ، هەرچەند نەزریشی کردبێ، واتە: لەو دوو ڕۆژانەدا هیچ جۆرە ڕۆژووەك دروست نابێ ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِ يَوْمَيْنِ: يَوْمِ الأَضْحَى وَيَوْمِ الْفِطْرِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردوە: لە جەژنی قوربانو لە جەژنی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بێ. (وَكَذَا التَّشْرِيقُ فِي الْجَدِيدِ) هەروەها حەرامە: لە (أيام التشريق)دا-واتە: لە سێ ڕۆژەکەی دوای جەژنیقورباندا- بەڕۆژوو ببێ، جا لەو سێ ڕۆژەدا هیچ جۆرە ڕۆژووەك دروست نابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرِ اللهِ تَعَالَى﴾ رواه احمد ومسلم، سێ ڕۆژەکەی (أيام التشريق)ی دوای جەژنیقوربان ڕۆژانی خواردنو خواردنەوەو زیکری خوای گەورەنە.

(وَلاَ يَحِلُّ التَّطَوُّعُ) حەڵاڵ نیەو حەرامە: ڕۆژووی سوننەت (يَوْمَ الشَّكِّ) لە ڕۆژی بەگوماندا (بِلاَ سَبَبٍ) بە بێهیچ هۆیەك لە هۆیەکانیداهاتوو (فَلَوْ صَامَهُ) جا ئەگەر لە ڕۆژی بەگوماندا

لَمْ يَصِحَّ فِي الأَصَحِّ، وَلَهُ صَوْمُهُ عَنِ الْقَضَاءِ وَالنَّذْرِ، وَكَذَا لَوْ وَافَقَ عَادَةَ تَطَوُّعِهِ، وَهُوَ يَوْمُ الثَّلاثِينَ مِنْ شَعْبَانَ إِذَا تَحَدَّثَ النَّاسُ بِرُؤْيَتِهِ أَوْ شَهِدَ بِهَا صِبْيَانٌ أَوْ عَبِيدٌ أَوْ فَسَقَةٌ،

---

بەڕۆژوویکی سوننەت بوو (لَمْ يَصِحَّ) ڕۆژووەکەی دروست نابیٚ‌و گوناهباریش دەبیٚ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی‌ڕاستتردا ﴿عَنْ ابن عمر رضي الله عنهما: مَنْ صَامَ يَوْمَ الشَّكِّ فَقَدْ عَصَى أَبَاالْقَاسِمِﷺ﴾ رواه أصحاب السنن بسندصحيح، هەر کەسێك لە ڕۆژی بەگوماندا بەڕۆژوو بیٚ، بە ڕاستی تاوانی بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ کردوە.

(وَلَهُ صَوْمُهُ) بۆی دروستە: لە ڕۆژی بەگوماندا بەڕۆژوو بیٚ (عَنِ الْقَضَاءِ) لە ڕۆژووی قەزاکراوەو (وَالنَّذْرِ) لە ڕۆژووی نەزرکراو و لە ڕۆژووی کەففارەت.

(وَكَذَا) هەروەها دروستە: لە ڕۆژی بەگوماندا بەڕۆژووی سوننەت بیٚ (لَوْ وَافَقَ عَادَةَ تَطَوُّعِهِ) ئەگەر ڕۆژە بەگومانەکە لەگەڵ عادەتی ڕۆژووە سوننەتەکانی تێك بکاتەوە، وەك عادەتی وابیٚ: دووشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو بیٚ، بە گومانەکەش بکەوێتە یەکێك لەو دوو ڕۆژانە، یان عادەتی وابیٚ: ڕۆژێك نا ڕۆژێك بەڕۆژوو بیٚ، یان مانگی شەعبان بە تەواوی بەڕۆژوو بیٚ، لەو حاڵەتانەدا دروستە لە بەگومانەکەدا بەڕۆژوو بیٚ، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿لاَ تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ إِلاَّ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْماً فَلْيَصُمْهُ﴾ رواه الشيخان، وەپێش ڕەمەزان مەکەون بە بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك، یان دوو ڕۆژ، تەنها ئەو کەسە نەبیٚ: کە بە عادەتی خۆی بەڕۆژوو دەبیٚ.

﴿ ئاگاداری ﴾ ئەگەر لە پێش نیوەی یەکەمی شەعباندا بەڕۆژوو نەبوبیٚ، ئەو کاتە حەرامە: لە شانزەداو بەو لاوەتردا بەڕۆژووی سوننەت بیٚ، ئەگەر یەکێك لە هۆیەکانی‌ڕابردوو نەبیٚ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرمویٚ: ﴿إِذَا انْتَصَفَ شَعْبَانُ فَلاَ تَصُومُوا﴾ رواه أصحاب السنن بسند صحيح، هەر کاتێك شەعبان بە نیوەیی بوو، هیچی‌تر بەڕۆژووی سوننەت مەبن.

(وَهُوَ) ڕۆژی بە گومان (يَوْمُ الثَّلاثِينَ مِنْ شَعْبَانَ) ڕۆژی سی‌ی شەعبانە (إِذَا تَحَدَّثَ النَّاسُ بِرُؤْيَتِهِ) هەر کاتێك کۆمەڵە خەڵکێك بڵێن: مانگ دیتراوە. نەشزانرێ: کێ دیتویەتی.

(أَوْ شَهِدَ بِهَا صِبْيَانٌ أَوْ عَبِيدٌ أَوْ فَسَقَةٌ) یان منداڵەکان، یان کۆیلەکان، یان فاسقەکان، یان ئافرەتان شاهیدی بدەن: کە مانگیان دیتوەو واتیٚبگا ڕاست دەکەن، جا لە بەر ئەوەی بە شەرع ئیسبات نەبوە: کە ئەو ڕۆژە ڕەمەزانە، دروست نابیٚ: بە نیەتی ڕەمەزان تیٚیدا بەڕۆژوو بیٚ، مەگەر کەسێك باوەڕ بەو کەسانەی‌ڕابردوو بکا، ئەو کاتە لە سەر ئەوی واجبە: بە نیەتی ڕەمەزان تیٚیدا بەڕۆژوو بیٚ، هەروەك لە زۆریەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَيسَ إِطْبَاقُ الْغَيْمِ بِشَكّ، وَيُسَنُّ تَعْجِيلُ الْفِطْرِ عَلَى تَمْرٍ، وَإِلاَّ فَمَـاءٍ، وَتَأْخِيرُالسُّـحُورِ مَالَم يَقَعْ فِي شَكٍّ،

---

بەلام (وَلَيسَ إِطْبَاقُ الْغَيْمِ بِشَكّ) سەرتاپا هەور لە ئاسمان نابێتـە هـۆی گومـان، چـونکە لـە حالـەتی هـەوردا، پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی داوە: ﴿سـی ڕۆژی شـەعبان تـەواو بکـەین﴾ هەروەك لە سەرەتای دیتنی مانگدا ڕوونمان کردەوە.

## ﴿ پاشیو و بەربانگ ﴾

(وَيُسَنُّ تَعْجِيلُ الْفِطْرِ) لە کاتی بەربانگ سـوننەتە: زوو-پـێش نوێـژکردن- فـەتار بکاتـەوە، ئەگەر بێگومان دەیزانی ڕۆژ ئاوا بووە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَـا عَجَّلُواالْفِطْرَ﴾رواه الشيخان، زاد الإمام احمد: ﴿وَأخَّرُواالسُّحُورَ﴾، خـەڵك بـەردەوام بـەرەو چاکە دەبن تا بەردەوام زوو فەتار بکەنەوەو درەنگ پاشیو بخۆن.

(عَلَى تَمْرٍ) سوننەتە: بە خورما، یان بە قەسپ فەتار بکاتەوە (وَإِلاَّ) ئەگەر قەسپو خورما نەبو (فَمَاءٍ) سوننەتە: بە ئاو فەتار بکاتـەوە، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِذَا أَفْطَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى تَمْرٍ فَإِنَّهُ بَرَكَةٌ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُفْطِرْ عَلَى مَاءٍ فَإِنَّهُ طَهُورٌ﴾رواه أصحاب السنن بسندصحيح، هەر کاتێك یەکێکتان فەتاری کردەوە، با بـە قەسـپ فـەتار بکاتـەوە، چـونکە قەسپ پیتو بەرەکەت دەداتە مرۆڤ، جا ئەگـەر قەسـپ نـەبو، بـا بـە ئـاو فـەتار بکاتـەوە، چونکە ئاو پاككەرەوەیە. ئینجا بزانە: واجبـە: تۆزێـك خـۆی ڕابگـرێ تـا بێگومـان ببـێ ڕۆژ ئـاوا بـووە، ئینجـا سـوننەتە: بـە سـێ دانـە قەسـپ، یان سـێ قومـە ئـاو فـەتار بکاتـەوە، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَتَأْخِيرُ السُّحُورِ) سوننەتە: درەنگ پاشیو بخوا، بە بەڵگەی حەدیسـەکەی ئیمـام(أحمـد)ی ڕابردوو (مَالَمْ يَقَعْ فِي شَكٍّ) تا ئـەو کاتـەی ناکەوێتـە گومـان: لـە دەرکـەوتنی بـەیان، واتـە: ئەگەر کەوتە گومان، دواخستنی پاشیو سوننەت نیە.

کەواتە: لای کەم دە دەقیقە بمێنێ بۆ دەرکەوتنی بەیان-کە ئێستا پـێی دەڵـێن: ئیمسـاك- سوننەتی دواخستن وەدەست دێنێ، لە (نهاية)دا بەڵگەی بەم حەدیسـە هێناوەتـەوە: ﴿عَـنْ زَيْد بن ثابتﷺ: تَسَحَّرْنَا مَعَ النَّبِيِّﷺ ثُمَّ قَامَ إِلَى الصَّلاَة، قُلْتُ كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَـالَ: خَمْسِـينَ آيَـةً﴾ رواه الشيخان، لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ پاشـیومان خـوارد، ئینجـا هەڵسـا بـۆ نوێژکردن، نێوان پاشیو و بانگدان بەقەد خوێندنی پەنجا ئایەت بوو.

ئینجا بزانە: کاتی پاشیو لە نیوەی شەوەوە دەست پێدەکا، پاشیو سوننەتەو بـە کـەمێك خواردن، یان ئاو، پێك دێ، ئەگەر بە بێپاشیوخواردن بەڕۆژوو ببـێ، هـیچ گوناهبـار نابـێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

وَلْيَصُنْ لِسَانَهُ عَنِ الْكَذِبِ وَالْغِيبَةِ وَنَفْسَهُ عَنِ الشَّهَوَاتِ، وَيُسْتَحَبُّ أَنْ يَغْتَسِلَ عَنِ الْجَنَابَةِ قَبْلَ الْفَجْرِ، وَأَنْ يَحْتَرِزَ عَنِ الْحِجَامَةِ وَالْقُبْلَةِ وَذَوْقِ الطَّعَامِ وَالْعَلْكِ، وَأَنْ يَقُولَ عِنْدَ فِطْرِهِ: اَللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ. وَأَنْ يُكْثِرَ الصَّدَقَةَ وَتِلاَوَةَ الْقُرْآنِ فِي رَمَضَانَ،

---

(وَلْيَصُنْ لِسَانَهُ) پێویسته: ڕۆژووگر زوبانی خۆی بپارێزێ (عَنِ الْكَذِبِ) له درۆکردن‌و (وَالْغِيبَةِ) له غه‌یبه‌ت کردن (وَنَفْسَهُ) هه‌روه‌ها سوننه‌ته: گیانی خۆی بپارێزێ (عَنِ الشَّهَوَاتِ) له حه‌زکردنه‌کان: وه‌ك ده‌نگی خۆش‌و بۆنی‌خۆش‌و ئه‌و جۆره حه‌لاڵانه.

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننه‌ته (أَنْ يَغْتَسِلَ عَنِ الْجَنَابَةِ قَبْلَ الْفَجْرِ) غوسلی جه‌نابه‌ت‌و حه‌یزو نیفاس له پێش به‌یاندا بکا (وَأَنْ يَحْتَرِزَ) سوننه‌ته: خۆی بپارێزی به‌رۆژ (عَنِ الْحِجَامَةِ) له خوێن له خۆگرتن‌و (وَالْقُبْلَةِ) له ماچ کردن‌و (وَذَوْقِ الطَّعَامِ) له تامکردنی خوارده‌مه‌نی به زوبانی‌و (وَالْعَلْكِ) له بنیشت جوین، به‌م مه‌رجه‌ی ئه‌و تفه‌ی تێکه‌ڵی بووه: قووتی نه‌داته‌وه، هه‌روه‌ك له (تحفة)دا فه‌رموویه‌تی، ئه‌گینا: ڕۆژووی ده‌شکێ.

(وَأَنْ يَقُولَ عِنْدَ فِطْرِهِ) سوننه‌ته: له کاتی فه‌تارکردنه‌وه‌دا (بِسْمِ الله) بکا، ئینجا له دوای فه‌تارکردنه‌وه‌ش بڵێ: ﴿اَللَّهُمَّ لَكَ صُمْتُ وَعَلَى رِزْقِكَ أَفْطَرْتُ﴾. ئینجا بڵێ: ﴿ذَهَبَ الظَّمَأُ وَابْتَلَّتِ الْعُرُوقُ وَثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شَاءَ اللّهُ﴾. رواهما ابوداود بسند صالح.

هه‌روه‌ها سوننه‌ته: له کاتی فه‌تاردا ڕۆژووگره‌کان به خواردن تێر بکا، جا ئه‌گه‌ر ده‌سه‌لاتی نه‌بو، با به‌ربانگ بداته ڕۆژووگره‌کان، هه‌رچه‌ند ته‌نها قومه ئاوێك، یان دانه قه‌سپێك بێ، پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رموێ: ﴿مَنْ فَطَّرَ صَائِماً كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَيَنْقُصُ مِنْ أَجْرِالصَّائِمِ شَيْئاً﴾ رواه الترمذي بسند صحيح، هه‌ر که‌سێك به‌ربانگ بداته ڕۆژووگرێك وه‌ك ڕۆژووگره‌که خێری بۆ ده‌نووسرێ، هیچیش له خێری ڕۆژووگره‌که که‌م ناکاته‌وه.

(وَأَنْ يُكْثِرَالصَّدَقَةَ) سوننه‌ته: زۆر خێرو به‌خشین بکا له ڕه‌مه‌زاندا، به تایبه‌تی به فراوانی خواردن بداته خێزان‌و منداڵه‌کانی‌و چاکه له‌گه‌ڵ خزم‌و جیرانه‌کانی بکا (وَتِلاَوَةَ الْقُرْآنِ) سوننه‌ته زۆر قورئان بخوێنێ (فِي رَمَضَانَ) له ڕه‌مه‌زاندا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍرضي الله عنهما: كَانَ رَسُولُ اللّهِﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَايَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُعليه السلام كُلَّ لَيْلَةٍ حَتَّى يَنْسَلِخَ فَيَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ الْقُرْآنَ﴾ رواه الشيخان، پێغه‌مبه‌رﷺ له هه‌موو که‌س سه‌خی‌تر بوو بۆ خێرو چاکه، له ڕه‌مه‌زانیشدا له هه‌موو کاته‌کانی‌تر سه‌خی‌تر بوو، که هه‌موو شه‌وێك (جبرائیلعليه السلام) ده‌هاته لای‌و پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌رسی قورئانی له لای ده‌گوته‌وه تا ڕه‌مه‌زان ته‌واو ده‌بو.

وَأَنْ يَعْتَكِفَ لاَ سِيَّمَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْهُ.
(فَصْلٌ) شَرْطُ وُجُوبِ صَوْمِ رَمَضَانَ: اَلْعَقْلُ وَالْبُلُوغُ وَإِطَاقَتُهُ، وَيُؤْمَرُ بِهِ الصَّبِيُّ لِسَبْعٍ إِذَا أَطَاقَ، وَيُبَاحُ تَرْكُهُ لِلْمَرِيضِ إِذَا وَجَدَ بِهِ ضَرَراً شَدِيداً،

---

(وَأَنْ يَعْتَكِفَ) سوننەتە: لە ڕەمەزاندا (إعتكاف) بكا لە مزگەوتدا (لاَ سِيَّمَا فِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْهُ) بە تايبەتی لە دە شەوەكەی ئاخيری ڕەمەزاندا، تاكو (ليلةالقدر)ی دەست بكەوێ، هەروەك لە باسی (إعتكاف)دا ڕوونی دەكەينەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی مەرجەكانی واجببوونی ڕۆژووی ڕەمەزان ﴾

(شَرْطُ وُجُوبِ صَوْمِ رَمَضَانَ) مەرجی واجببوونی ڕۆژووی ڕەمەزان، چوارن، يەكەم: ئيسلامەتی‌يە. دووەم: (اَلْعَقْلُ) عاقڵی‌يە. سێيەم: (وَالْبُلُوغُ) بالغی‌يە. چوارەم: (وَإِطَاقَتُهُ) توانای بەڕۆژووبوونە. بە شەرعو بە هەستكرلوی، كەوابو: مرۆڤی(كافر) داوای بەڕۆژووبوونی لێناكرێ لە دونيادا، چونكە ڕۆژوو ڕوكنێكی ئيسلامە، هەروەها ڕۆژوو لە سەر منداڵو شێت واجب نيە، چونكە داواكاری‌ی شەرع نايانگرێتەوە، هەروەها لە سەر بێتوانای وەكو پيرو نەخۆش واجب نيە، چونكە بە هەستكراوی توانای ڕۆژوويان نيە، هەروەها لە سەر ئافرەتی زەيسانی‌و حەيزدار واجب نيە، چونكە بە شەرع توانای ڕۆژوويان نيە، هەروەك لە دوای ئێرە بەڵگەی گشتيان دێنينەوە، إن شاءَ اللهُ تَعالَى.

(وَيُؤْمَرُ بِهِ الصَّبِيُّ) منداڵی‌فاميدە فەرمانی بەڕۆژووبوونی پێدەكرێ (لِسَبْعٍ) لە تەمەنی حەفت ساڵيەوە (إِذَا أَطَاقَ) هەر كاتێك توانای بەڕۆژووبوونی هەبێ، لە دەساڵيش لە سەر نەگرتنی‌ڕۆژوو سەرپەرشتكارەكەی لێ‌ی‌دەدا بە (قياس) لە سەر نوێژ، هەروەك لەوێدا بەڵگەمان ڕوون كردەوە.

ئينجا بزانە: حەرامە: موسڵمان لە ڕۆژانی ڕەمەزاندا خواردن‌و خواردنەوە بداتە ئەو كەسانەی ڕۆژوويان لە سەر واجبەو بە بێ‌عوزر بەڕۆژوو نابن، هەرچەند ڕۆژوونەگرەكە كافريش بێ، چونكە يارمەتيدانە لە سەر تاوانكردن، هەروەك لە (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾ يارمەتی يەكتری مەدەن لە سەر گوناهو دوژمنكاری.

## ﴿ ڕۆژووی نەخۆش و ڕێبوار ﴾

(وَيُبَاحُ تَرْكُهُ) دروستە: بەڕۆژوونەبوونی ڕەمەزان (لِلْمَرِيضِ) بۆ مرۆڤی نەخۆش (إِذَا وَجَدَ بِهِ ضَرَراً شَدِيداً) ئەگەر بە هۆی ڕۆژوو زيانێكی بەهێزی بگاتی: كە زيانەكە تەيەمومی بۆ دروست بكا، كەوابو: ئەگەر نەخۆشيەكەی كەم بێ: وەكو ژانە سەرو گوێ ئێشان، ئەوە دروست نيە بەڕۆژوو نەبێ.

وَلِلْمُسَافِرِ سَفَراًطَوِيلاً مُبَاحاً، وَلَوْ أَصْبَحَ صَائِماً فَمَرِضَ أَفْطَرَ، وَإِنْ سَافَرَ فَلاَ، وَلَوْ أَصْبَحَ الْمُسَافِرُ وَالْمَرِيضُ صَائِمَيْنِ ثُمَّ أَرَادَاالفِطْرَ جَازَ، فَلَوْ أَقَامَ وَشُفِيَ حَرُمَ الْفِطْرُ عَلَىالصَّحِيحِ، وَإِذَا أَفْطَرَ الْمُسَافِرُ وَالْمَرِيضُ قَضَيَا،

---

(وَلِلْمُسَافِرِ) هەروەها بۆ ڕێبواریش دروستە بەڕۆژوو نەبێ، بەو مەرجەی (سَفَراً طَوِيلاً) سەفەرەکەی هەشتا کیلۆمتر درێژ بێ و (مُبَاحاً) حەڵاڵیش بێ، هەروەك بە درێژی لە نوێژی ڕێبواردا ڕوونمان کردەوە، ئیتر جیاوازی نیە: بەردەوام لە سەفەردابێ، یان نا، هەروەك لە (تحفة)و(مغنی)دا فەرموویانە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾ هەر کەسێك لە ڕەمەزاندا نەخۆش بوو، یان لە سەفەردا بوو—ئەگەر بەڕۆژوو نەبو— واجبە: بە ژمارەی ئەو ڕۆژانەی نەیگرتون قەزا بکاتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر نەخۆشیەکەی بە شەو و بە ڕۆژ بوو، ئەوە بۆی دروستە: هەر لە شەوێدا نیەتی ڕۆژووەکە نەهێنێ، ئەگەر نا: واجبە بە شەو نیەتی ڕۆژوو بێنێ، ئینجا ئەگەر بە ڕۆژ نەخۆش بۆوە، دروستە: ڕۆژووەکەی بشکێنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها (وَلَوْ أَصْبَحَ صَائِماً) ئەگەر یەکێکی ساغ بەڕۆژوو بوو (فَمَرِضَ) ئینجا لە ڕۆژێدا نەخۆش بوو (أَفْطَرَ) دروستە: ڕۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە بە بێویستی خۆی نەخۆشی تووش بووە، کەوابو: (وَإِنْ سَافَرَ) ئەگەر مرۆڤێکی بەڕۆژوو لە ڕۆژێدا بە سەفەر چوو (فَلاَ) دروست نیە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، چونکە بە ویستی خۆی بۆ سەفەر دەڕوا، بەڵام ئەگەر پێش دەرکەوتنیبەیان بۆ سەفەر دەربچێ، ئەو کاتە بۆی دروستە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها (وَلَوْ أَصْبَحَ الْمُسَافِرُ وَالْمَرِيضُ صَائِمَيْنِ) ئەگەر مرۆڤی ڕێبوارو نەخۆش بە شەو نیەتیان هێناو بەڕۆژوو بوون (ثُمَّ أَرَادَا الفِطْرَ) ئینجا بە ڕۆژ ویستیان ڕۆژووەکەیان بشکێنن (جَازَ) بۆیان دروستە، چونکە لە شەوێوە عوزرەکەیان بەردەوامە (فَلَوْ أَقَامَ) بەڵام ئەگەر ڕێبوارەکە هەر بەڕۆژوو بوو و هاتەوەماڵەوەی، یان بووە نیشتەجێ (وَشُفِيَ) هەروەها ئەگەر نەخۆشیبەڕۆژوو شیفای بۆ هات (حَرُمَ الْفِطْرُ) لە هەردووکیان حەرامە: ڕۆژووەکەیان بشکێنن (عَلَىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، چونکە هۆیەکە نەماوە.

(وَإِذَا أَفْطَرَ الْمُسَافِرُ وَالْمَرِيضُ) هەر کاتێك ڕێبوارو نەخۆش بەڕۆژوو نەبون (قَضَيَا) لە سەر هەردووکیان واجبە: ڕۆژووەکانیان قەزا بکەنەوە، بە بەڵگەی ئایەتەکەیڕابردوو، ئینجا بزانە: مەبەست بە نەخۆش—لێرەدا— نەخۆشی کاتیە، چونکە نەخۆشی بەردەوام—وەکو پیر— قەزاکردنەوەی لە سەر نیە، بەڵکو (فدیة)دەدا، هەروەك لە باسی (فدیة)دا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: هەر کەسێك بە ئەندازەیەکی وەها برسی ببێ، یان تینوو ببێ: مەترسی لەناوچوونو نەمانی لێبکرێ، واجبە: ڕۆژووەکەی بشکێنێ، لەو حاڵەتەدا جیاوازی ساغو نەخۆشو ڕێبوارو نیشتەجێ نیە، بەڵام واجبە: ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە، لە (المجموع)و(مغنى)دا بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە: ﴿وَلاَ تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ خۆتان بە کوشت مەدەن، خوای گەورە لەگەڵتان بە ڕەحمە.

دووەم: بۆ دروێنەچیەکانو جوتیارەکانو کارکەرەکانی خانوو و کێڵگەو باغو کاسبکارەکانیترو گشت ئەو کەسانەیتر: کە بۆیان ناگونجێ بە شەو کار بکەنو بۆ بەخێوکردنی خۆیانو خێزانیان پێویستیشیان بەو کارە هەیە، بۆ گشتیان دروستە: ڕۆژووەکەیان بشکێنن، جیاوازی نیە: ئەو کارانەیڕابردوو بە کرێ بن، یان بە خۆڕایی بن، بەڵام واجبە: بە شەو نیەتی ڕۆژووەکە بێنن، ئینجا ئەگەر بە ڕۆژ بێهێز بون، ئەو کاتە دروستە: ڕۆژووەکەیان بشکێننو لە کاتێکیتردا ڕۆژووەکەیان قەزا بکەنەوە، هەروەك لە (تحفة)و(نهاية)و حاشیەکانیاندا ڕوون کراوەتەوە. واتە: بەڵام ئەگەر دەگونجا بە شەو ئەو کارە بکرێ، یان بۆ بەخێوکردنی خۆیانو خێزانیان پێویستییان پێنەبو، ئەو کاتە دروست نیە: بەڕۆژوو نەبن، وَاللهُ أَعْلَم.

سێیەم: -بۆ وێنە- ئەگەر کافرەکان هێرش بێننە سەر وڵاتی موسڵمانانو موسڵمانەکانیش بە هۆی بەڕۆژووبوون توانای بەرگرییان نەبو، دروستە ڕۆژوو بشکێنن، بەڵکو ئەگەر مەترسی سەرکەوتنیکافرەکان هەبێ، ئەو کاتە واجبە: ڕۆژووەکەیان بشکێنن، واتە: ئینجا لە دوای کۆتاییجەنگ قەزای بکەنەوە، هەروەك لە (الشبراملسي)دا ڕوون کراوەتەوە ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي سَفَرٍ فَصَامَ بَعْضٌ، وَأَفْطَرَ بَعْضٌ، فَتَحَزَّمَ الْمُفْطِرُونَ وَعَمِلُوا وَضَعُفَ الصُّوَّامُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرو ﷺ (صحابة)کان لە سەفەرێکیغەزادا بون، هەندێکیان ڕۆژوویان شکاندو بە هێز بونو کاری پێویستیان کرد، هەندێکیشیان بەڕۆژوو بونو بۆ هەندێك کاری پێویست بێهێز بون، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕۆژووشکێنەکان ئەم ڕۆ پاداشی گەورەیان بۆ خۆیان برد.

(وَكَذَاالْحَائِضُ) هەروەها لە سەر ئافرەتی حەیزدارو زەیسانیو منداڵ لێبوو، واجبە: ڕۆژووەکانیان قەزا بکەنەوە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّهُ كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ -أَيِ الْحَيْضُ- فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ﴾ رواه الشيخان، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ حەیز تووشمان دەبو، ئینجا فەرمانمان دەدرایێ ڕۆژووەکان قەزا بکەینەوەو، فەرمانمان نەدەدرایێ نوێژ قەزا بکەینەو

وَالْمُفْطِرُ بِلاَ عُذْرٍ وَتَارِكُ النِّيَّةِ، وَيَجِبُ قَضَاءُ مَا فَاتَ بِالإِغْمَاءِ وَالرِّدَّةِ، دُونَ الْكُفْرِ الأَصْلِيِّ وَالصِّبَا وَالْجُنُونِ، وَإِذَا بَلَغَ بِالنَّهَارِ صَائِماً وَجَبَ إِتْمَامُهُ بِلاَ قَضَاءٍ، وَلَوْ بَلَغَ فِيهِ مُفْطِراً أَوْ أَفَاقَ أَوْ أَسْلَمَ فَلاَ قَضَاءَ فِي الأَصَحِّ،

---

(وَالْمُفْطِرُ بِلاَ عُذْرٍ) هەروەها ئەو کەسەش کە بێعوزر ڕۆژووەکەی شکاندبێ، واجبە: قەزا بکاتەوە (وَتَارِكُ النِّيَّةِ) هەروەها ئەو کەسەش کە لە شەوێدا نیەتی نەهێنابێ: بە قەسدی، یان لەبیری چوبێ، واجبە: ڕۆژووەکەی قەزا بکاتەوە.

(وَيَجِبُ قَضَاءُ مَا فَاتَ بِالإِغْمَاءِ) واجبە ئەو ڕۆژووانە قەزا بکاتەوە: کە بە هۆی بێهۆشی فەوتاون (وَالرِّدَّةِ) هەروەها واجبە: ئەو ڕۆژووانەش قەزا بکاتەوە کە بە هۆی کافربوون فەوتاون، چونکە بە هۆی ئیسلامەتی ڕۆژووی لە سەر واجب بووە، کەوابو: بە کافربوون لە سەری لا ناچێ.

(دُونَ الْكُفْرِ الأَصْلِيِّ) جگە لە کوفری بنچینەیی، واتە: ئەو کافرەی لە بنچینەدا کافرە، کە بووە موسڵمان واجب نیە ڕۆژوو قەزا بکاتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنْتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ﴾ بە کافرەکان بڵێ: ئەگەر واز لە کوفر بێنن و ببنە موسڵمان، لە ڕابردوویان دەبوردرێ.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا موسڵمانیکافربووش-ئەگەر ببێتەوە موسڵمان-قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکانی ماوەیکافربوونی لە سەر نیە، هەروەك لە(المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالصِّبَا) هەروەها ئەو ڕۆژووانەی لە کاتی منداڵیدا نەیگرتون، واجب نیە: قەزایان بکاتەوەو (وَالْجُنُونِ) هەروەها ڕۆژووەکانی ماوەی شێتیش واجب نیە: قەزا بکاتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَبْلُغَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يُفِيقَ»رواه ابوداود وغيره باسناد صحيح، نووسینی تاوان لە سەر سێ کەسان هەڵگیراوە، لە سەر خەوتوو تا هەشیار دەبێتەوە، لە سەر منداڵ تا بلۆغی دەبێ، لە سەر شێت تا چاك دەبێتەوە.

(وَإِذَا بَلَغَ بِالنَّهَارِ) هەر کاتێك لە ڕەمەزاندا: منداڵ لە ڕۆژێدا بلۆغی بوو (صَائِماً) لەو حاڵەتیشدا بەڕۆژوو بوو (وَجَبَ إِتْمَامُهُ) واجبە: ڕۆژووەکەی تەواو بکا (بِلاَ قَضَاءٍ) قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژووەشی لە سەر نیە (وَلَوْ بَلَغَ فِيهِ) هەروەها ئەگەر لە ڕەمەزاندا منداڵ لە ڕۆژێدا بلۆغی بوو (مُفْطِراً) لەو حاڵەتیشدا بەڕۆژوو نەبو (أَوْ أَفَاقَ) یان شێت لە ڕۆژێدا چاك بۆوە (أَوْ أَسْلَمَ) یان کافر لە ڕۆژێدا موسڵمان بوو (فَلاَقَضَاءَ) قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژووە لە سەر هیچێکیان واجب نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

وَلاَ يَلْزَمُهُمْ إِمْسَاكُ بَقِيَّةِالنَّهَارِ فِي الأَصَحِّ، وَيَلْزَمُ مَنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ أَوْ نَسِيَ النِّيَّةَ، لاَ مُسَافِراً أَوْ مَرِيضاً زَالَ عُذْرُهُمَا بَعْدَ الْفِطْرِ، وَلَوْ زَالَ قَبْلَ أَنْ يَأْكُلاَ وَلَمْ يَنْوِيَا لَيْلاً فَكَذَا فِي الْمَذْهَبِ، وَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَلْزَمُ مَنْ أَكَلَ يَوْمَ الشَّكِّ ثُمَّ ثَبَتَ كَوْنُهُ مِنْ رَمَضَانَ، وَإِمْسَاكُ بَقِيَّةِ الْيَوْمِ مِنْ خَوَاصِّ رَمَضَانَ، بِخِلاَفِ النَّذْرِ وَالْقَضَاءِ.

---

(وَلاَ يَلْزَمُهُمْ) هەروەها لە سەر هیچێکیان واجب نیە (إِمْسَاكُ بَقِيَّةِالنَّهَارِ) ئەوەندەی لە ڕۆژێ ماوە ئیمساك بکەن، واتە: تا ڕۆژ ئاوا دەبێ خۆیان لە دژەکانی ڕۆژوو قەدەغە بکەن (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا.

(وَيَلْزَمُ مَنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ) ئیمساك واجبە: لە سەر ئەو کەسەی کە بە بێعوزر ڕۆژووەکەی شکاندوە (أَوْ نَسِيَ النِّيَّةَ) یان لەبیری چووە: بە شەو نیەت بێنێ، یان وایدەزانی شەو ماوەو خواردی، یان خواردیەوە، ئینجا ئاشکرا بوو: بەیان بووە، چونکە کەمتەرخەمییان کردوە (لاَ مُسَافِراً أَوْ مَرِيضاً) بەلام لە سەر ڕێبوارو نەخۆش واجب نیە ئیمساك بکەن (زَالَ عُذْرُهُمَا بَعْدَالْفِطْرِ) کە لە دوای ڕۆژووشکاندن عوزری سەفەرو نەخۆشییان نەمابێ.

(وَلَوْ زَالَ) ئەگەر عوزری نەخۆشیو ڕێبواری نەما (قَبْلَ أَنْ يَأْكُلاَ) پێش ئەوەی بخۆن، واتە: ڕۆژوو بشکێننو (وَلَمْ يَنْوِيَا لَيْلاً) بە شەوێش نیەتیان نەهێنابو (فَكَذَا) لەو حاڵەتەش ئیمساکیان لە سەر واجب نیە (فِي الْمَذْهَبِ) لە فەرموودەی ڕاستی مەزهەبدا، بەلام ئەگەر بە شەو نیەتیان هێنابو و ڕۆژووەکەشیان نەشکاندبو و عوزرەکەشیان نەما، واجبە: ڕۆژووەکەیان تەواو بکەن، هەروەك ڕوونمان کردوە.

ئینجا بزانە: لە سەر ئافرەتی زەیسانیو حەیزداریش واجب نیە ئیمساك بکەن، بەڵکو ئەگەر بە نیەتیعیبادەت ئیمساك بکەن حەرامەو گوناهبار دەبن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّهُ يَلْزَمُ مَنْ أَكَلَ يَوْمَ الشَّكِّ) ئیمساك لە سەر ئەو کەسەش واجبە: کە لە ڕۆژی بەگوماندا شتێکی خواردبو (ثُمَّ ثَبَتَ كَوْنُهُ مِنْ رَمَضَانَ) ئینجا ئاشکرا بوو: ڕۆژەکە یەکەمی ڕەمەزان بووە.

(وَإِمْسَاكُ بَقِيَّةِ الْيَوْمِ) ئیمساك کردن لەو بەشەدا: کە لە ڕۆژێ ماوە (مِنْ خَوَاصِّ رَمَضَانَ) تایبەتە بە مانگی ڕەمەزان؟ بۆ ڕێزلێنانی ڕۆژەکەیە، ئەو ئیمساککەرەی فەرمانی ئیمساکی پێکراوە خێری دەگاتێ، بەلام بۆی نابێتە ڕۆژوویێکی شەرعی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(بِخِلاَفِ النَّذْرِ وَالْقَضَاءِ) بەلام لە ڕۆژووی نەزرو قەزاکراوەدا –ئەگەر شکاندی– ئیمساك کردن واجب نیە: چونکە ڕۆژەکانیتر شەرەفو ڕێزی ڕەمەزانیان نیە.

(فَصْلٌ) مَنْ فَاتَهُ شَيْءٌ مِنْ رَمَضَانَ فَمَاتَ قَبْلَ إِمْكَانِ الْقَضَاءِ فَلاَ تَدَارُكَ لَهُ وَلاَ إِثْـــمَ، وإِنْ مَاتَ بَعْدَالتَمَكُّنِ لَمْ يَصُمْ عَنْهُ وَلِيُّهُ فِيالْجَدِيدِ بَلْ يُخْرِجُ مِنْ تَرِكَتِهِ لِكُلِّ يَوْمٍ مُدَّ طَعَـــامٍ، وَكَذَا النَّذْرُ وَالْكَفَّارَةُ،

---

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى (فِدْيَة)ى رِۆژوو ﴾

(مَنْ فَاتَهُ شَيْءٌ مِنْ رَمَضَانَ) هەر كەسێك رِۆژوویێك، یان زیاتری –بە عوزرێكیشەرعی– لێفەوتا: لە رِۆژووەكانی رِەمەزان (فَمَاتَ) ئینجا مرد (قَبْلَ إِمْكَانِ الْقَضَاءِ) پێش ئەوەی بۆی گونجابێ قەزای بكاتەوە: وەك لە رِەمەزانەكەدا مردبێ، یان لە دوای رِەمەزانەكە ماوەی قەزاكردنەوەی نەبوبێ: وەك نەخۆشیەكەی، یان حەیزەكەی، یان زەیسانیەكەی تا مردن بەردەوام بوبێ، لەو حاڵەتانەدا (فَلاَ تَدَارُكَ لَهُ) هیچ بۆكردنەوەی واجب نیە –واتە: نە قەزاكردنەوەو نە (فِدْيَة)– چونكە كەمتەرخەمی ی نەبوە.

(وَلاَ إِثْمَ) هەروەها مردووەكە گوناهباریش نابێ، بەڵام ئەگەر بە بێعوزر لە رِەمەزاندا رِۆژووی شكاندبێ، یان هەر بەرِۆژوو نەبوبێ، ئەوە هەم گوناهبار دەبێو هەم واجبە: یان (فِدْيَـة)ی بۆ بدرێ، یان بۆی قەزا بكرێتەوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وإِنْ مَاتَ بَعْدَالتَّمَكُّنِ) بەڵام ئەگەر لە دوای بۆگونجان مرد: وەك لە دوای رِەمەزانەكە ماوەی قەزاكردنەوەی هەبوبێو هیچ عوزرێكیشی نەبوبێو قەزای نەكردبێتەوەو مردبێ، جا لەم بەشەدا جیاوازی نیە: لە رِەمەزاندا بە عوزر، یان بە بێعوزر بەرِۆژوو نەبوبێ، كەوابو: لەو حاڵەتەدا (لَمْ يَصُمْ عَنْـهُ وَلِيُّـهُ) دروست نیە: خزمێكی رِۆژووەكانی لە جیاتی بگرێتەوە (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرمودەی نوێدا (بَلْ يُخْرِجُ مِنْ تَرِكَتِـهِ) بەڵكو واجبە: خزمەكەی لە میراتەكەی (فِدْيَة)ی بۆ دەربكا (لِكُلِّ يَوْمٍ مُدُّ طَعَامٍ) بۆ هەر رِۆژوویێك مستێك، واتە: (٦٠٥) شەشسەدو پێنج غرام دانەوێڵە.

بەڵام لە فەرمودەی كۆندا: بۆ گشت خزمێكی باڵغو عاقڵ دروستە: (فدية) بۆ مردووەكەی بدا، هەم دروستە: لە جیاتیشی بەرِۆژوو بێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ﴾رواه الشيخان، هەر كەسێك مردبێو رِۆژووی لە سەربێ، خزمەكەی لە جیاتیی بەرِۆژوو دەبێ.

(وكَذَاالنَّذْرُ) هەروەها رِۆژووی نەزركراو و (وَالْكَفَّارَةُ) رِۆژووەكانیكەففارەت وەكو رِۆژووەكانی رِەمەزانن: لە گشت بریارەكانیرِابردووداو هەم لە فەرمودەی كۆندا: بۆ خزمەكەی دروستە (فدية)ی بۆ بداو هەم دروستە لە جیاتیشی بەرِۆژوو ببێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەیرِابردوو و حەدیسەكەیداهاتوو.

قُلْتُ: اَلْقَدِيمُ هُنَا أَظْهَرُ، وَالْوَلِيُّ كُلُّ قَرِيبٍ عَلَى الْمُخْتَارِ، وَلَوْ صَامَ أَجْنَبِيٌّ بِإِذْنِ الْوَلِيِّ صَحَّ، لاَ مُسْتَقِلاً فِي الأَصَحِّ،

---

(قُلْتُ) ئیمامی(النولوي) دەفەرموێ (اَلْقَدِيمُ هُنَا أَظْهَرُ) فەرموودەی کۆن لێرەدا بەهێزترە لە فەرموودەی نوێ، چونکە حەدیسەکەی ڕابردوو و حەدیسەکەی داهاتوو بەڵگەیەتی، بەڵام فەرموودەی نوێ بەڵگەکەی حەدیسێکی بێ هێزە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا بزانە: ئەو ڕۆژووانەی بە دوای یەکتردا لە سەر مردووەکە واجب بوینە -وەك ڕۆژووەکانی کەففارەت- لە سەر زیندووەکە واجب نیە: بە دوای یەکتردا بۆی قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: ئەگەر مردووەکە میراتی لە پاش بەجێ مابێ، ئەوە واجبە: یان (فِدْيَة)ی بۆ بدرێ، یان ڕۆژووەکانی لەجیاتی قەزا بکرێنەوە، بەڵام ئەگەر میراتی نەبو، ئەو کاتە هیچێك لەو دووانە واجب نین، بەڵکو سوننەتە: خزمەکەی یەکێکی لەو دووانە بۆ بکا، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموویانە.

(وَالْوَلِيُّ) مەبەست بەو خزمەی بۆی دروستە: لەجیاتی مردووەکە بەڕۆژوو ببێ: (كُلُّ قَرِيبٍ) گشت خزمێکی مردووەکەیە، هەرچەند میراتگریش نەبێ، جیاوازی نێر و مێ نیە (عَلَى الْمُخْتَارِ) لە سەر فەرموودەی هەڵبژاردراو ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَتْ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟...قَالَ: فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ﴾ رواه الشيخان، ئافرەتێك گوتی: دایکم مردوەو ڕۆژووی نەزرکراوی لە سەر بوو، ئایا لەجیاتی ی بەڕۆژوو ببم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەجیاتی دایکت ڕۆژووە نەزرەکان بگرەوە.

ئینجا بزانە: دروست نیە بێگانەیەك -سەربەخۆ- بە بێ ئیزنی خزمی مردووەکە (فدية)ی ڕۆژوو بۆ مردووەکە بدا، بەڵام بە ئیزنی وی دروستە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا ڕوون کراوەتەوە.

هەروەها (وَلَوْ صَامَ أَجْنَبِيٌّ) ئەگەر لە سەر فەرموودەی کۆن: بێگانەیەکی بالغو عاقڵ لەجیاتی مردووەکە بەڕۆژوو بوو (بِإِذْنِ الْوَلِيِّ) بە ئیزنی خزمەکە، یان بە ئیزنی مردووەکە: وەك لە ژیانیدا وەسێتی پێکردبێ (صَحَّ) لە هەردوو حاڵەتدا بەڕۆژووبوونەکە دروست دەبێ، جیاوازی نیە: بە کرێ بێ، یان بە خۆڕایی.

(لاَ مُسْتَقِلاً) بەڵام ئەگەر بێگانەکە سەربەخۆ -بە بێ ئیزن- بەڕۆژوو بوو دروست نابێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

ئینجا بزانە: ئەگەر مردووەکە سی ڕۆژووی لە سەر بن، سی کەس لە یەك ڕۆژدا لە جیاتی ی بەڕۆژوو بن، گشتی دروست دەبن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَلَوْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صَلاَةٌ أَوِ اعْتِكَافٌ لَمْ يُفْعَلْ عَنْهُ وَلاَ فِدْيَةَ، وَفِي الإِعْتِكَافِ قَوْلٌ وَاللهُ أَعْلَمُ.

هەروەها بزانە: دروست نیە: هیچ کەسێك لەجیاتی مرۆڤێکی زیندوو بەڕۆژوو ببێ، هەرچەند توانای ڕۆژووشی نەمابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها دروست نیە: شێتو منداڵی نەبالغ لە جیاتی مردوو بەڕۆژوو ببن، هەروەك لە (الشرواني)و (بجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلَوْ مَاتَ) ئەگەر یەکێك مرد (وَعَلَيْهِ صَلاَةٌ) نوێژی واجبی لە سەر بونو قەزای نەکردبونەوە (أَوِ اعْتِكَافٌ) یان ئیعتیکافی نەزرکراوی لە سەر بوو و نەیکردبو (لَمْ يُفْعَلْ عَنْهُ) نە خزمو نە بێگانە، نوێژو ئیعتیکافەکەی لەجیاتی ناکاو (وَلاَ فِدْيَةَ) هەم (فدية)شی بۆ نادا، بەڵام (وَفِي الإِعْتِكَافِ قَوْلٌ) دەربارەی ئیعتیکاف فەرموودەیەکی ئیمامی(شافعي) هەیە: کە خزمەکەی لەجیاتیی دەیکا، یان مستە گەنمێکی(فدية)ی بۆ دەدا: لەجیاتی ئیعتیکافی شەو و ڕۆژێكو کەمتر لە شەو و ڕۆژێك (وَاللهُ أَعْلَم).

هەروەها فەرموودەیەکیتری هەیە: کە دروستە نوێژ لە جیاتی مردوو قەزا بکرێتەوە، هەم فەرموودەیەکیتری زانایانیش هەیە: کە دروستە لە جیاتی هەر نوێژێك مستە گەنمێك (فدیە)ی بۆ بدرێ، زۆر لە زانایانی مەزهەبی (شافعي) بەو دوو فەرموودانە ڕازینە، هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾ لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: (فدية)ی نوێژیش بۆ مردوو بدرێ، بەڵام (فدية)ی هەر نوێژێکی واجب، یان هەر ڕۆژوویێکی واجب، لە مەزهەبی(حنفي)دا: نیو ساع گەنمە، کە دەکاتە (١٨١٥) غرام، واتە: یەك کیلۆو هەشتسەدو پانزە غرام، هەروەها دروستە: نرخی ئەو نیوساعەش بدرێ، کەوابو: دروستە: خزمی مردووەکە خۆی (تقليد)ی مەزهەبی(حنفي) بکاو ئەو (إِسْقَاطُ الصَّلاَةِ)ی لە لای ئەوان هەیە، بۆ مردووەکەی بکا، هەروەك لە (الشرواني)دا فەرموویەتی، بەڵام ئەگەر مردووەکە وەسێتی کردبێ، ئەو کاتە (إِسْقَاطُ الصَّلاَةِ) واجب دەبێو لە سێیەکی میراتەکەی بۆی دەکرێ، کەوابو: نوێژەکانو ڕۆژووەکانو کەففارەتی سوێندەکانی گشتی حیساب دەکرێ، لە جیاتی هەر نوێژێك نیو ساع، یان نرخەکەیو لە جیاتی هەر ڕۆژوویێك نیو ساع، یان نرخەکەی دەدرێتە هەژاران، بەڵام کەففارەتی سوێندەکان واجبە بدرێتە دە کەسی هەژار.

ئینجا بزانە: ئەو (إِسْقَاط)کردنە بۆ مردوویێکە کە چەند نوێژێكو ڕۆژوویێکی فەوتابێو قەزای نەکردبنەوە، چونکە ئەگەر مردووەکە گوێڕایەڵی شەیتان بوبێو نوێژو ڕۆژووی نەکردبن، ئینجا لە کۆتایی تەمەنیدا تۆبەی کردبێو وەسێتی کردبێ: (إِسْقَاط)ی بۆ بکرێ، ئەو (إِسْقَاطُ الصَّلاَةِ)ە دروست نابێ، هەروەك لە (مجمع الأنهر)و کتێبەکانیتری مەزهەبی (حنفي)دا ڕوون کراوەتەوە.

وَالأَظْهَرُ وُجُوبُ الْمُدِّ عَلَى مَنْ أَفْطَرَ لِلْكِبَرِ، وَأَمَّا الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فَإِنْ أَفْطَرَتَا خَوْفاً عَلَى نَفْسِهِمَا وَجَبَ الْقَضَاءُ بِلاَ فِدْيَةٍ، أَوْ عَلَى الْوَلَدِ

## ﴿ باسی (فِدْيَة)ى پيرو نەخۆش و ئاوس و شيردەر ﴾

(وَالأَظْهَرُ) به فەرموودەى بەهێزتر (وُجُوبُ الْمُدِّ) مستێك دانەوێڵە بۆ (فدية)ى هەر ڕۆژووێك واجبە: (عَلَى مَنْ أَفْطَرَ) لە سەر ئەو كەسەى ڕۆژووى شكاندوە، يان بەڕۆژوو نەبوە (لِلْكِبَرِ) به هۆى پيرى و بێهێزى، يان بە هۆى نەخۆشيەكى بەردەوام: كە چاوەڕوانى چاكبوونەوەى نەكرێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَعَلَى الذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ). هِيَ لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْمَرْأَةِ الْكَبِيرَةِ لاَيَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُوما فَيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً﴾رواه البخاري وابوداود، واتە: خواى گەورە دەفەرموێ: لە سەر ئەو كەسانەى تواناى بەڕۆژووبوونيان نەماوە، واجبە بۆ هەر ڕۆژێك (فدية)ى بدەنە هەژارێك.

ئينجا بزانە: ئەگەر پيرەكە، يان نەخۆشەكە لە دواى بەڕۆژوونەبوون توانايان پەيدا بوو، واجب نيە: قەزا بكەنەوە، بەلام ئەگەر لە وەرزێكدا توانايان نەبو و لە وەرزێكيشدا توانايان هەبو، ئەو كاتە واجبە: لەم وەرزەدا ڕۆژووەكان قەزا بكەنەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)دا فەرموويانە، جا لەو بڕيارانەىڕابردووش جياوازى ڕۆژووى ڕەمەزان و نەزرو كەففارەت نيە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

﴿ ئاگادارى ﴾ لە مەزهەبى ئيمامى(حنفي)دا: (فدية)ى هەر ڕۆژووێك نيو ساع گەنم لە سەر پير واجبە، واتە: (١٨١٥) غرام، يان نرخەكەى، ئينجا دروستە: هەر لە سەرەتاى ڕەمەزانەوە (فدية)ى هەموو ڕەمەزانەكە بدا، هەروەك لە (شرح الملتقى)و (ابن عابدين)دا فەرموويانە.

بەلام لە مەزهەبى ئيمامى(الشافعي)دا واجبە: لە كۆتايى ڕەمەزان (فدية)كە بدرێ و دروستيشە: لە شەوێدا (فدية)ى ڕۆژووى سبەينێ بدرێ، دروست نيە: زياتر وەپێش بخرێ، جا ئەگەر (فدية)كەش دوا بێخن هيچيان لە سەر نيە، هەروەها ئەگەر پيرو نەخۆشى بەردەوام بەڕۆژوو ببن، ڕۆژووەكەيان دروست دەبێ و (فدية)ى ناوێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَأَمَّا الْحَامِلُ) بەلام ئافرەتى ئاوس و (وَالْمُرْضِعُ) ئافرەتى شيردەر، هەردووك بۆيان دروستە بەڕۆژوو نەبن، ئينجا (فَإِنْ أَفْطَرَتَا) ئەگەر ئافرەتى ئاوس و ئافرەتى شيردەر بەڕۆژوو نەبون (خَوْفاً عَلَى نَفْسِهِمَا) لە ترسى خۆيان: نەوەك زيانێكيان پێ بگا (وَجَبَ الْقَضَاءُ) واجبە: ڕۆژووەكان قەزا بكەنەوە (بِلاَ فِدْيَةٍ) بە بێ(فِدْيَة)دان (أَوْ عَلَى الْوَلَدِ) يان لە

لَزِمَتْهُمَا الْفِدْيَةُ فِي الأَظْهَرِ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُلْحَقُ بِالْمُرْضِعِ مَنْ أَفْطَرَ لإِنْقَاذِ مُشْرِفٍ عَلَى هَلاَكٍ، لاَ الْمُتَعَدِّي بِفِطْرِ رَمَضَانَ بِغَيْرِ جِمَاعٍ،

---

ترسی منداڵەکەیان بەڕۆژوو نەبون: نەوەك زیانێك بە منداڵەکەیان بگا، ئەو کاتە (لَزِمَتْهُمَا الْفِدْيَةُ) واجبە: (فدیة)ش بدەن‌و ڕۆژووەکەش قەزا بکەنەوە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: اَلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا﴾ رواه ابوداود بسندحسن، ئافرەتی ئاوس‌و ئافرەتی شیردەر ئەگەر ترسان، ڕۆژوو دەشکێنن‌و (فدیة) دەدەن.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا: هەردوو ئافرەتەکان تەنها قەزاکردنەوەیان لە سەر واجبەو (فدیة)یان لە سەر نیە، هەروەك لە (مجمع الانهر)دا فەرموویەتی، هەروەها بزانە: ئەگەر ئافرەتە ئاوسەکە بترسێ منداڵەکەی لەبار بچێ، یان ترسا منداڵەکەی لە برسان بمرێ، واجبە: ڕۆژووەکەی بشکێنێ‌و بەڕۆژوو نەبێ، هەروەك لە (مغنی)دا فەرموویەتی.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يُلْحَقُ بِالْمُرْضِعِ) وەکو ئافرەتی شیردەر بڕیاری بۆ دەدرێ (مَنْ أَفْطَرَ) ئەو کەسەی ڕۆژووەکەی شکاندبێ (لإِنْقَاذِ مُشْرِفٍ عَلَى هَلاَكٍ) بۆ ڕزگارکردنی کەسێك: کە نزیکی بەهیلاکچوون بێ، بەو مەرجەی بە بێڕۆژووشکاندن نەگونجێ ڕزگاری بکا، وەك خەریك بێ: بسوتێ، یان بخنکێ، یان درندە بیخوا، لەو حاڵەتانەدا واجبە: ڕۆژووەکە بشکێنێ‌و ڕزگاری بکا، هەم واجبە: قەزای بکاتەوەو (فدیە)ش بدا، چونکە وەکو شیردەرەکە لە بەرخاتری کەسێکیتر ڕۆژووەکەی شکاندوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ڕۆژووەکەی بشکێنێ تاکو گیانی خۆی، یان ماڵی خۆی ڕزگار بکا، ئەوە تەنها قەزاکردنەوەی لە سەرە، بەڵام ئەگەر ڕۆژووەکەی بشکێنێ تاکو ماڵی کەسێکیتر ڕزگار بکا، یان ئاژەڵی خۆی، یان ئاژەڵی کەسێکیتر ڕزگار بکا، ئەو کاتە واجبە: قەزا بکاتەوەو (فدیە)ش بدا، هەروەك لە (تحفە)دا ڕوون کراوەتەوە.

(لاَ الْمُتَعَدِّي بِفِطْرِ رَمَضَانَ) بەڵام (فدیة) واجب نیە: لە سەر ئەو کەسەی بە بێ‌عوزر ڕۆژووی ڕەمەزانی شکاندوە، یان بەڕۆژوو نەبوە، بەڵکو تەنها قەزاکردنەوەی لە سەر واجبە، هەم لە سەر کاربەدەستانیش واجبە: تەمبێی بکەن بەگوێرەی گەورەیی ئەو تاوانە، هەروەك لە (تحفە)و (نهایە)دا فەرموویانە.

(بِغَيْرِ جِمَاعٍ) بەو مەرجەی ڕۆژوو شکاندنەکەی بە شتێکی جگە لە جیماع کردن بێ، چونکە ئەگەر بە جیماع ڕۆژووەکەی بشکێنێ، کەففارەتیشی دەکەوێتە سەر، هەروەك لە (فصل)ی داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

وَمَنْ أَخَّرَ قَضَاءَ رَمَضَانَ مَعَ إِمْكَانِه حَتَّى دَخَلَ رَمَضَانٌ آخَرُ لَزِمَهُ مَعَ الْقَضَاءِ لِكُلِّ يَوْمٍ مُدٌّ، وَالأَصَحُّ تَكَرُّرُهُ بِتَكَرُّرِ السِّنِينَ، وَأَنَّهُ لَوْ أَخَّرَ الْقَضَاءَ مَعَ إِمْكَانِه

---

ئینجا بزانە: هەر کەسێك ڕۆژووی ڕەمەزانی لە سەر بون دروستە: لە گشت ڕۆژەکانی ساڵیدا قەزایان بکاتەوە، جگە لە ڕۆژانی ڕەمەزانو جەژنەکانو سێ ڕۆژەکانی دوای جەژنی قوربان، ئینجا وەها سوننەتە: بە دوای یەکتریدا قەزایان بکاتەوە، جیا جیاش دروستە، هەروەها سوننەتە: پەلە بکا لە قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکاندا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی،

کەوابو: (وَمَنْ أَخَّرَ قَضَاءَ رَمَضَانَ) هەرکەسێك قەزاکردنەوەی ڕۆژووەکانی ڕەمەزان دوا بخا (مَعَ إِمْكَانه) لەگەڵ ئەوەش بۆی گونجابو قەزایان بکاتەوە، بەلام بە بێعوزر قەزای نەکردنەوە (حَتَّى دَخَلَ رَمَضَانٌ آخَرُ) تا ڕەمەزانێکیتر داهات (لَزِمَهُ مَعَ الْقَضَاءِ) لە سەری واجبە:-لەگەڵ قەزاکردنەوە ڕۆژووەکاندا- (لِكُلِّ يَوْمٍ مُدٌّ) بۆ هەر ڕۆژێکیش مستێك دانەوێڵە (فدية)ی دواخستن بدا، بەلام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: تەنها قەزاکردنەوەی لە سەر واجبەو (فدية)ی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئەمەش بەلگەی (فديە)یە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاس وَابْنِ عُمَرَ وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّهُمْ قَالُوا فِيمَنْ عَلَيْهِ صَوْمٌ فَلَمْ يَصُمْ حَتَّى أَدْرَكَهُ رَمَضَانٌ آخَرُ: يَصُومُ الَّذِي أَدْرَكَهُ، ثُمَّ يَصُومُ الشَّهْرَ الَّذِي أَفْطَرَ فِيهِ، وَيُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً﴾رواه الدارقطني باسناد صحيح، هەر کەسێك ڕۆژووی ڕەمەزانی لە سەر بونو بەڕۆژوو نەبو تا ڕەمەزانێکیتر داهات، ئەوە ئەم ڕەمەزانە بەڕۆژوو دەبێ، ئینجا ئەو ڕۆژووانەی قەرزدارە بەڕۆژوو دەبێو لەگەڵ هەر ڕۆژووێکیش (فدية) دەداتە هەژارێك.

ئینجا بزانە: بەم دواخستنە گوناهباریش دەبێ، بەلام ئەگەر بە هۆی عوزرێکی شەرعی قەزاکردنەوەی دواخست: وەك هەرنەخۆش بوبێ، یان ئاوس، یان شیردەر بوبێ، لەو حاڵەتانەدا (فدية)ی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (تَكَرُّرُهُ) ئەو (فديە)یە دووبارە دەبێتەوە (بِتَكَرُّرِ السِّنِينَ) بە دووبارەبوونەوەی ساڵەکان، واتە: ئەگەر دوو ڕەمەزان بێنو قەزای نەکردبێتەوە، واجبە: بۆ هەر ڕۆژێك دوومست (فدية) بدا، بەلام لە فەرموودەیەکیتردا: دووبارە نابێتەوەو بۆ هەموو ساڵەکان مستێك بۆ هەر ڕۆژێك بەسە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (لَوْ أَخَّرَ الْقَضَاءَ مَعَ إِمْكَانِه) ئەگەر قەزاکردنەوەی ڕەمەزانی دوا خست، لەگەڵ ئەوەش بۆی گونجابو قەزا بکاتەوەو قەزای نەکردەوەو

فَمَاتَ أُخْرِجَ مِنْ تَرِكَتِه لِكُلِّ يَوْمٍ مُدَّان: مُدٌّ لِلْفَوَاتِ وَمُدٌّ لِلتَّأْخِيرِ، وَمَصْـرِفُ الْفِدْيَـةِ اَلْفُقَرَاءُ وَالْمَسَاكِينُ، وَلَهُ صَرْفُ أَمْدَادٍ إِلَى شَخْصٍ وَاحِدٍ، وَجِنْسُهَا جِـنْسُ الْفِطْـرَةِ.
(فَصْلٌ) تَجِبُ الْكَفَّارَةُ بِإِفْسَادِ صَوْمِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ بِجِمَاعٍ أَثِمَ بِهِ بِسَـبَبِ الصَّـوْمِ، فَلاَ كَفَّارَةَ عَلَى نَاسٍ،

---

(فَمَاتَ) ئینجا مرد (أُخْرِجَ مِنْ تَرِكَتِهِ لِكُلِّ يَوْمٍ مُدَّانِ) واجبه لـه میراتهکهی دوو مست دانهویّله له جیاتی گشت ڕۆژێك بدرێن: (مُدٌّ لِلْفَوَاتِ) مستێك له جیاتی فـهوتانی ڕۆژووهکـهو (وَمُـدٌّ لِلتَّـأْخِيرِ) مسـتهکهیتریش لـه جیـاتی دواخسـتنهکه. ئینجـا بزانـه لێرهشـدا لـه فهرموودهیهکیتردا: مستێك بهسه: لهجیاتی فهوتانی ڕۆژووهکه.
(وَمَصْـرِفُ الْفِدْيَـةِ) ئـهو کهسـهی (فدیـة)ی دهدرێتـێ (اَلْفُقَـرَاءُ وَالْمَسَـاكِينُ) تـهنها گـهداو هـهژارهکانن، جیـاوازی هـیچ (فدیـة)کـیش نیـه، چـونکه خـوای گـهوره لـه قورئانـدا فهرموویـهتی: ﴿ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ فیدیـهی لـه سـهره بداتـه گهدایـهك. واتـه: هـهژاریش دهگرێتهوه، چونکه دهستی کورتتره (وَلَهُ صَرْفُ أَمْدَادٍ إِلَى شَخْصٍ وَاحِدٍ) بـۆی دروسـته: چهند مستێکی (فدیة)، یان ههموو (فدیة)که بداته تهنها یهك نهفهر.
(وَجِنْسُهَا) ڕهگهزی (فدیة)ی واجب (جِنْسُ الْفِطْرَةِ) ڕهگهزی سهرفیترهیه، واتـه: دهنکـی سـاغ بێو، ئاردو ساوارو بڕوش نـهبێو عهیبـداریش نـهبێ، بـهڵام لـه مهزهـهبی ئیمـامی (حنفي)دا: گشت (فدیـة)کـان ئهنـدازهیان نیـو سـاع گهنمـه، واتـه: (١٨١٥)غـرام، هـهروهها دروسـتیشـه نرخی نیو ساعهکه له (فدية)دا بدرێ، ههروهك له (مجمع الأنهر)دا فهرموویهتی.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسی (كَفَّارَة)ی جیماعی ڕهمهزان ﴾

پێشهکی بزانـه: (فِدْيَـة) ئهوهیـه: لـه جیـاتی نهکردنیخواپهرستنێك واجب ببـێ، هـهروهك لهمهوپێش ڕوون کراوه. بهڵام (كَفَّارَة) ئهوهیه: به هۆی گوناهێك واجب ببـێ، هـهروهك لـه (الاشباه والنظائر، للسيوطي)دا فهرموویهتی.
(تَجِبُ الْكَفَّارَةُ) کهففارهت واجب دهبێ له سهر ئـهو کهسـهی لـه ڕۆژێکـی ڕهمـهزانـدا جیمـاع بکا: (بِإِفْسَادِ صَوْمِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ) بـه هـۆی تێکـدانی ڕۆژووی ڕۆژێکـی ڕهمـهزان (بِجِمَاعٍ أَثِمَ بِهِ) به جیماع کردنێکی وهها: که بهو جیماعه گوناهبار بوبێ (بِسَبَبِ الصَّوْمِ) بـه هـۆی ڕۆژووهکـه، بـه بهڵگـهی حهدیسـهکهیداهاتوو، ئینجـا جیـاوازی نیـه: خـودی جیماعهکـهش حهڵاڵ بـێ، یـان حـهڕام بـێ، لـه کـونی پێشـهوهدا بـێ، یـان لـه کـونی پشـتهوهدا، لهگـهڵ ئادهمیزاد بێ، یان لهگهڵ ئاژهڵدا، لهگـهڵ زینـدوودا بـێ، یـان لهگـهڵ مـردوودا، ئـاوی بێتـه دهرهوه، یان نا، ههروهك له سهرچاوهکاندا ڕوون کراوهتهوه.
(فَلاَ كَفَّارَةَ عَلَى نَاسٍ) کهففارهت واجب نیه: له سهر ئهو کهسهی لـهبیری چـوبێ بـهڕۆژووه، یان به زۆرلێکردن جیماعی پێکرابێ، یان نهیزانیبێ جیماع لـه ڕۆژووی ڕهمـهزانـدا حهڕامـه،

وَلاَ مُفْسِد غَيْرَ رَمَضَانَ، أَوْ بغَيْرِالْجِمَاعِ، وَلاَ مُسَافِرٍ جَامَعَ بنيَّةِ التَّرَخُّصِ وَكَذَا بِغَيْرِهَا فِيالأَصَحِّ، وَلاَ عَلَى مَنْ ظَنَّ اللَّيْلَ فَبَانَ نَهاراً، وَلاَ عَلَى مَنْ جَامَعَ بَعْدَ الأَكْلِ نَاسِياً وَظَنَّ أَنَّهُ أَفْطَرَ بِه وَإِنْ كَانَ الأَصَحُّ بُطْلاَنَ صَوْمِه،

---

چونکه ئەوانە ڕۆژوەکەیان بەتاڵ نابێتەوە، هەروەك لە باسی ڕۆژووشکێنەکاندا بە بەڵگەوە ڕوونمان کردەوە (وَلاَ مُفْسِدِ غَيْرَ رَمَضَانَ) هەروەها کەففارەت لە سەر ئەو کەسەش واجب نیە: کە لە ڕۆژێکی‌تری-جگە لە ڕەمەزاندا- ڕۆژووەکەی بە جیماع بەتاڵ بکاتەوە: وەك ڕۆژووی سوننەت، یان نەزر، یان کەففارەت، یان قەزای‌ڕەمەزان، چونکە ئەو گوناهە بە هۆی ڕێزداری‌ی مانگی‌ڕەمەزانە.

(أَوْ بِغَيْرِ الْجِمَاعِ) هەروەها لە سەر ئەو کەسەش واجب نیە: کە ڕۆژووەکەی بە شتێکی‌تری-جگە لە جیماع- بەتاڵ بکاتەوە: وەك خواردن‌و ئاو هێنانەوەو ...هتد، چونکە فەرمانی حەدیسەکەی‌داهاتوو تەنها دەرهەق جیماع هاتوە.

(وَلاَ مُسَافِرٍ) هەروەها کەففارەت لە سەر ئەو جۆرە نەخۆش‌و ڕێبوارەش واجب نیە: کە (جَامَعَ بِنِيَّةِ التَّرَخُّصِ) جیماعی کردبێ بە مەبەستی ڕوخسەتی نەخۆشی‌و سەفەر (وَكَذَا بِغَيْرِهَا) هەروەها ئەگەر بە بێ‌مەبەستی ڕوخسەتیش جیماعیان کردبی، کەففارەتیان لە سەر نیە (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا: چونکە شەرع ڕێگەی ڕۆژووشکاندنی داوەتە نەخۆش‌و ڕێبوار.

(وَلاَ عَلَى مَنْ ظَنَّ اللَّيْلَ) هەروەها کەففارەت لە سەر ئەو کەسەش واجب نیە: کە وا تێگەیشتبێ شەو ماوەو لە پاشیودا جیماع بکا، یان لە بەر بانگدا وا تێبگا: ڕۆژ ئاوابوەو جیماع بکا (فَبَانَ نَهَاراً) ئینجا لە یەکێك لەو دوو حاڵەتانەدا ئاشکرابێ لە ڕۆژێدا جیماعی کردوە، چونکە بەو جیماعە گوناهبار نەبوە، بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێ‌و واجبە: قەزای بکاتەوە، جا ئەگەر لە حاڵەتی جیماع کردندا ئاشکرا ببێ: ڕۆژە، واجبە: یەکسەر واز لە جیماع کردن بێنێ، ئەگینا: کەففارەتی دەکەوێتە سەر، هەروەك لە کۆتایی ڕۆژووشکێنەکاندا ڕوونمان کردەوە.

(وَلاَ عَلَى مَنْ جَامَعَ) هەروەها کەففارەت لە سەر ئەو کەسەش واجب نیە: کە جیماعی کردبێ (بَعْدَالأَكْلِ) لە دوای خواردن، یان خواردنەوەیەك: کە (نَاسِياً) لە حاڵەتی لەبیرچووندا خواردبێتی‌و (وَظَنَّ أَنَّهُ أَفْطَرَ بِهِ) وا تێگەیشتبێ: بەو خواردنە ڕۆژووی شکاوە (وَإِنْ كَانَ الأَصَحُّ بُطْلاَنَ صَوْمِهِ) هەر چەند فەرموودەی ڕاستریش ئەوەیە: بەم جیماعە ڕۆژووی بەتاڵ دەبێتەوە، وەکو مەسەلەی پاشیو و بەر بانگەکەی ڕابردوو، کەوابو: ئەگەر بە قەسدی خواردنی خواردبێ، ئینجا جیماع بکا، ئەو کاتەش کەففارەتی لە سەر نیە، چونکە ڕۆژووەکەی بە خواردن بەتاڵ بۆتەوە.

وَلاَ مَنْ زَنَى نَاسِياً، وَلاَ مُسَافِرٍ أَفْطَرَ بِالزِّنَا مُتَرَخِّصاً، وَالْكَفَّارَةُ عَلَى الزَّوْجِ عَنْهُ وَفِي قَوْلٍ عَنْهُ وَعَنْهَا وَفِي قَوْلٍ عَلَيْهَا كَفَّارَةٌ أُخْرَى، وَتَلْزَمُ مَنْ انْفَرَدَ بِرُؤْيَةِ الْهِلاَلِ وَجَامَعَ فِي يَوْمِهِ، وَمَنْ جَامَعَ فِي يَوْمَيْنِ لَزِمَهُ كَفَّارَتَانِ،

---

(وَلاَ مَنْ زَنَى نَاسِياً) هەروەها كەففارەت لە سەر ئەوكەسەش واجب نيە: كە زينای كردبێ لەو حاڵەتەدا: كە لە بيری چوبێ بەڕۆژووە (وَلاَ مُسَافِرٍ أَفْطَرَ بِالزِّنَا) لە سەر ئەو ڕێبوارەش واجب نيە: كە ڕۆژووەكەی بە زينا شكاندبێ (مُتَرَخِّصاً) بە مەبەستی ڕوخسەتی سەفەر، چونكە بە هۆی زينا گوناهبار بووە، نەك بە هۆی ڕۆژووشكاندن.

(وَالْكَفَّارَةُ) كەففارەتی جيماعی ڕەمەزان (عَلَى الزَّوْجِ) تەنها لە سەر ميردەكەيە، واتە: لە سەر جيماعكەرەكە واجبە (عَنْهُ) لە جياتی خۆی بيدا، جياوازی نيە: جيماعەكەی حەڵاڵ بێ، يان حەرام، چونكە لە حەديسەكەیداهاتوودا فەرمان بە ميردەكە كراوە: كەففارەت بدا، كەوابو: ئەگەر ميردەكە شێت بێ، يان منداڵ بێ، كەففارەت لە سەر هيچێكيان واجب نابێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتی، هەروەها كەففارەت لە سەر جيماع لێكراوەكەش واجب نيە، جياوازی نيە جيماع لێكراوەكە: پياو بێ، يان ئافرەت بێ، لە كونی پێشەوەیدا جيماعی لەگەڵ كرابێ، يان لە كونی پشتەوەیدا، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

جا بزانە: ئەگەر جيماع لێكراوەكەش بە خۆشیخۆی ڕێگە بدا جيماعی لەگەڵ بكرێ، ئەوە ڕۆژووەكەی دەشكێو واجبە: قەزای بكاتەوە، بەڵام ئەگەر بە زۆرلێكردن جيماعی لەگەڵ بكرێ، يان لە خەودا بێ، ئەو كاتە ڕۆژووەكەی ناشكێ، هەروەها ئەگەر جيماعكەرەكەش خەوتبێو ئافرەتێك ئەندامەكەی وی دەخڵ بنێ، ڕۆژووی خەوتووەكە ناشكێو كەففارەتيشی ناكەوێتە سەر، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەيەكدا (عَنْهُ وَعَنْهَا) كەففارەتەكە لە جياتی خۆیو ژنەكەيەتی (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەيەكیتردا (عَلَيْهَا كَفَّارَةٌ أُخْرَى) لە سەر ژنەكەش واجبە: كەففارەتێكیتر بدا (وَتَلْزَمُ مَنِ انْفَرَدَ بِرُؤْيَةِ الْهِلاَلِ) كەففارەت واجب دەبێ لە سەر ئەو كەسەی بە تەنها مانگی يەكشەوەی ڕەمەزانی ديتوەو بەڕۆژوو بووەو (وَجَامَعَ فِي يَوْمِهِ) لە ڕۆژەكەیدا جيماعی كردوە، چونكە بەشەرع لە لای وی بوەتە ڕەمەزان.

(وَمَنْ جَامَعَ فِي يَوْمَيْنِ) هەر كەسێك لە دوو ڕۆژی ڕەمەزاندا جيماع بكا (لَزِمَهُ كَفَّارَتَانِ) دوو كەففارەتی دەكەونە سەر، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژێكدا دوو جيماع، يان زياتر بكا، ئەوە تەنها كەففارەتی جيماعیيەكەمی لە سەر واجب دەبێ، هەر چەند لەگەڵ چوار ژنەكانيشی جيماع بكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

وَحُدُوثُ السَّفَرِ بَعْدَ الْجِمَاعِ لاَ يُسْقِطُ الْكَفَّارَةَ، وَكَذَا الْمَرَضُ عَلَىالْمَذْهَبِ، وَيَجِبُ مَعَهَا قَضَاءُ يَوْمِ الإِفْسَادِ عَلَىالصَّحِيحِ، وَهِيَ عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً،

---

(وَحُدُوثُ السَّفَرِ بَعْدَ الْجِمَاعِ) ڕۆیشتن بۆ سەفەر لە دوای جیماع کردن لە ڕۆژی ڕەمەزاندا (لاَ يُسْقِطُ الْكَفَّارَةَ) کەففارەتی لە سەر لانادا (وَكَذَاالْمَرَضُ) هەروەها نەخۆشبوونیش لە دوای جیماعەکە، کەففارەتی لە سەر لانادا (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

(وَيَجِبُ) لە سەر مێردەکە واجبە (مَعَهَا) لەگەڵ کەففارەتەکەدا (قَضَاءُ يَوْمِ الإِفْسَادِ) ئەو ڕۆژووەشی قەزا بکاتەوە: کە بە جیماع کردن بەتاڵی کردۆتەوە (عَلَى الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَهِيَ) کەففارەتی جیماعی ڕەمەزان بەگوێرەی ئەم ڕیزە واجبە: یەکەمجار (عِتْقُ رَقَبَةٍ مُؤْمِنَةٍ) ئازادکردنی کۆیلەیەکی موسوڵمانە، ئینجا (فَإِنْ لَمْ يَجِدْ) ئەگەر کۆیلەی دەست نەکەوت (فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ) واجبە: دوو مانگ بە دوییەکتردا ـ بە بێ‌نێوان ـ بەڕۆژوو بێ، ئینجا (فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ) ئەگەر لە بەر پیری، یان نەخۆشی توانای ڕۆژووی نەبو (فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِيناً) واجبە: خواردەمەنی بداتە شەست گەدا، یان هەژار: هەر نەفەرێك مستێك دانەوێڵەی ساغ، واتە: تا توانای ڕۆژووی هەبێ، دروست نیە دانەوێڵە بدا، هەروەك لە کەففارەتی (ظهار)دا بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ ﷺ: وَمَا أَهْلَكَكَ؟ قَالَ وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ. قَالَ ﷺ: هَلْ تَجِدُ مَا تُعْتِقُ رَقَبَةً؟ قَالَ: لاَ. قَالَ ﷺ: فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ ﷺ: فَهَلْ تَجِدُ مَا تُطْعِمُ بِه سِتِّينَ مِسْكِيناً؟ قَالَ: لاَ. ثُمَّ جَلَسَ فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيه تَمْرٌ فَقَالَ: تَصَدَّقْ بِهَذَا. فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنَّا؟ فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: إِذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ﴾ رواه الشيخان، پیاوێك گوتی: بە هیلاك چووم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چی بەهیلاکی دای؟ گوتی: لە ڕەمەزاندا جیماعم لەگەڵ ژنەکەم کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا دەستت دەکەوێ کۆیلەیەك ئازاد بکەی؟ گوتی: نا. جا فەرمووی: دەتوانی دوو مانگ بە دوای یەکدا بەڕۆژوو ببی؟ گوتی: نا. جا فەرمووی: دەستت دەکەوێ خۆراك بدەیە شەست گەدا؟ گوتی: نا. ئینجا پیاوەکە دانیشت و فەردە قەسپێکیان هێنا لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم فەردە قەسپە لە کەففارەتەکەت بدە. پیاوەکە گوتی: ئایا لە خۆم هەژار تر هەیە بیدەمێ؟ پێغەمبەر ﷺ پێکەنی و فەرمووی: برۆ بیدە منداڵەکانت.

﴿ ئاگاداری ﴾ لە مەزهەبی ئیمامی(حنفی)دا کەففارەتی جیماع کردنی ڕەمەزان نیو ساع گەنمە، واتە: (١٨١٥) غرام بۆ هەر هەژارێك، هەروەها دروستیشە نرخی ئەو ئەندازەیە

فَلَوْ عَجَزَ عَنِ الْجَمِيعِ اسْتَقَرَّتْ فِي ذِمَّتِهِ فِي الأَظْهَرِ، فَإِذَا قَدَرَ عَلَى خَصْلَةٍ فَعَلَهَا، وَالأَصَحُّ أَنَّ لَهُ الْعُدُولَ عَنِ الصَّوْمِ إِلَى الإِطْعَامِ لِشِدَّةِ الْغُلْمَةِ، وَأَنَّهُ لاَ يَجُوزُ لِلْفَقِيرِ صَرْفُ كَفَّارَتِهِ إِلَى عِيَالِهِ.

(بَابُ صَوْمِ التَّطَوُّعِ)

يُسَنُّ صَوْمُ الإِثْنَيْنِ، وَالْخَمِيسِ،

---

بدرێ، واته: ئەگەر توانای ڕۆژووی نەبو، دروستە: نرخی سی ساع گەنم بداتە شەست گەدا، یان هەژار، هەروەك لە كتێبەكانی خۆیاندا فەرموویانە.

(فَلَوْ عَجَزَ عَنِ الْجَمِيعِ) جا ئەگەر كەففارەتدەرەكە توانای هیچێكی لەو سێیانەی نەبو (اسْتَقَرَّتْ فِي ذِمَّتِهِ) كەففارەتەكەی هەر لە سەر دەمێنی (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە پیاوەكەیڕابردوو توانای هیچیانی نەبو و پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ كرد: بە فەردەقەسپەكە كەففارەت بدا، كەوابو: (فَإِذَا قَدَرَ عَلَى خَصْلَةٍ فَعَلَهَا) هەر كاتێك توانای یەكێكی لەو سێیانەی هەبو، واجبە: بیكا (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّ لَهُ الْعُدُولَ عَنِ الصَّوْمِ) بۆی دروستە لە ڕۆژووگرتن لابدا (إِلَى الإِطْعَامِ) بۆ بەخشینی دانەوێڵە (لِشِدَّةِ الْغُلْمَةِ) بە هۆی زۆر پێویستی حەز بۆچوونی جیماع كردن.

(وَأَنَّهُ) هەر لە فەرموودەی ڕاستتردا (لاَ يَجُوزُ لِلْفَقِيرِ) بۆ كەففارەتدەریهەژار دروست نیە (صَرْفُ كَفَّارَتِهِ إِلَى عِيَالِهِ) كەففارەتەكەیخۆی بداتە منداڵەكانیو خێزانەكەیخۆی، ئینجا بزانە: كە لە حەدیسەكەیڕابردوودا پێغەمبەرﷺفەرمووی: ﴿فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ﴾ بیدە منداڵەكانت. مەبەستی كەففارەت نەبو، چونكە ئەو پیاوە ئەوەندە هەژار بوو: توانای بەخێوكردنیمنداڵەكانیشی نەبو، شتێكی ئاشكراشە: بەخێوكردنیمنداڵەكان لەپێشترە: لە كەففارەتدان، بۆیێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێكرد: بەو فەردە قەسپە منداڵەكانی بەخێو بكا، كەففارەتەكەش لە ئەستۆیدا دەمێنێ تا توانای دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا ئەوهای ڕوون كردۆتەوە.

﴿ بَابُ صَوْمِ التَّطَوُّعِ: **باسی ڕۆژووی سوننەت** ﴾

١-(يُسَنُّ) سوننەتە (صَوْمُ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ) ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە بەڕۆژوو بیێ﴿عَنْ أُسَامَةَ ﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ صَوْمِ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ؟ قَالَ: إِنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُعْرَضُ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ﴾رواه اصحاب السنن بسندحسن، پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا: بۆچی لە ڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممەدا بەڕۆژوو دەبی؟ فەرمووی: لەو دوو ڕۆژەدا كردەوەكانیبەندەكان دەبردرێنەلای خوای گەورە، جا پێم خۆشە لەو حاڵەتەی من بەڕۆژوومە، كردەوەكانم ببردرێنە لای خوای گەورە.

٢-(وَعَرَفَةَ) هەروەها سوننەتە رۆژی عالفە، واتە: نۆیەمی(ذی‌الحجّة) بەرۆژوو ببێ، ئەگەر لە حەج کردندا نەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَالَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَالَّتِي بَعْدَهُ﴾رواه مسلم، بەرۆژووبوونی رۆژی عالفە تکام لە خوایە: گوناهە بچووکەکانی ساڵی ڕابردوو و ساڵی‌داهاتوو لاببا. بەلام بۆ ئەو کەسەی بە حەج کردن خەریکە، وەها سوننەتە بەرۆژوو نەبێ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما:أَنَّ النَّبِيَّﷺ أَفْطَرَ بِعَرَفَةَ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە وەستانی عەرەفەدا بەرۆژوو نەبو.

جا بزانە: رۆژی عالفە لە گشت رۆژەکانی‌ساڵێ گەورەترە، واتە: لە رۆژی هەینیش گەورەترە.

هەروەها سوننەتە: هەشت رۆژەکەی پێش عالفەش بەرۆژوو ببێ، چونکە لە حەدیسێکی (صحيح)-لە (أبوداود)و (أحمد)-دا هاتوە: ﴿پێغەمبەرﷺ لە هەر نۆ رۆژەکانی (ذی‌الحجة)دا بەرۆژوو بووە﴾. هەروەك لە (المجموع)و (تحفه)دا فەرموویانە، جا بەم نۆ رۆژانە دەگوترێ: (نۆمینەی‌حاجیان)، لە (صحيح البخاری) لە باسی(أيام التشريق)دا گەورەیی ئەو رۆژانە دیار کراوە.

٣-(وَعَاشُورَاءَ) هەروەها سوننەتە لە (عاشوراء)دا، واتە: رۆژی دەیەمی(مُحَرَّم) بەرۆژوو ببێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صِيَامُ يَوْمِ عَاشُوراءَ إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَالَّتِي قَبْلَهُ﴾رواه مسلم، بەرۆژووبوونی دەیەمی(محرم) تکام لە خوایە: گوناهە بچووکەکانی ساڵی‌ڕابردوو لاببا.

٤-(وَتَاسُوعَاءَ) هەروەها سوننەتە: لە (تاسوعاء)دا، واتە: نۆیەمی(محرم) بەرۆژوو ببێ، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ لأَصُومَنَّ الْيَوْمَ التَّاسِعَ﴾رواه مسلم، ئەگەر تا ساڵی‌داهاتوو بمێنم، رۆژی نۆیەمیش بەرۆژوو دەبم.

جا بزانە: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ وَسَّعَ عَلَى عِيَالِهِ فِي يَوْمِ عَاشُورَاءَ وَسَّعَ اللهُ عَلَيْهِ فِي السَّنَةِ كُلِّهَا﴾ رواه الطبراني والبيهقي بسند ضعيف، لكن له طرق اكتسبت قوة بضم بعضها لبعض، هەر کەسێك لە رۆژی(عاشوراء)دا بە فراوانی خواردنی خۆش بداتە خێزانی‌و منداڵەکانی، خوای گەورە لە گشت ئەو ساڵەی‌دا ڕزقی فراوان دەکا.

ئینجا بزانە: لە رۆژی(عاشوراء)دا: کل دەچاو کردن‌و دەست لە خەنەنان‌و نوێژکردنی تایبەتی‌و خۆجوان کردن‌و کولاندنی‌دانەوێڵەی تێکەلاو، گشتی (بدعة)یەو بکوژەکانی ئیمامی (الحسين‌ﷺ) دایاننناوە، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

٥-(وَأَيَّامِ الْبِيضِ) سوننەتە: سێ رۆژەکەی شەوە سپیەکان، واتە: سێزدەو چواردەو پانزەی گشت مانگێك-جگە لە سێزدەی(ذی‌الحجة)- بەرۆژوو ببێ ﴿عَنْ مِلْحَانَ‌ﷺ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ يَأْمُرُنا: أَنْ نَصُومَ الْبِيضَ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ وَخَمْسَ عَشْرَةَ، قَالَ:

هُنَّ كَهَيْئَةِالــدَّهْرِ﴾رواه اصحاب السنن بسندحسن، پێغەمبەرﷺ فەرمانی دەداینێ: لە (أيام البيض): سێزدەو چواردەو پانزەی مانگدا بەڕۆژوو ببین، فەرمووی: ئەو سێ ڕۆژە وەك سەرتاسەری ساڵ خێریان هەیە. جا بۆیێ بە سپی ناو دەبرێن؟ چونکە شەوەکانیان بە ڕۆناکی مانگ سپی دەبن.

ئینجا بزانە: ئەگەر لەو سێ ڕۆژەشدا بەڕۆژوو نەبێ، هەر سوننەتە: سێ ڕۆژ لە گشت مانگێکدا بەڕۆژوو بێو خێری سەرتاسەری ساڵی هەر دەگاتێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صُمْ مِنَ الشَّهْرِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَــا﴾ رواه الشيخان، سێ ڕۆژ لە گشت مانگێکدا بەڕۆژوو ببە، چونکە چاکە: یەك بە دەیە.

٦-(وَسِــتَّةٍ مِـنْ شَـوَّالٍ) سوننەتە: شەش ڕۆژیش لە مانگی شەشەلان بەڕۆژوو بێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتّاً مِنْ شَوَّالٍ فَكَأَنَّمَا صَــامَ الــدَّهْرَ﴾ رواه مسلم، هەر کەسێك لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو بێو شەش ڕۆژیش بە دوای ڕەمەزاندا لە مانگی شەشەلان بەڕۆژوو بێ، وەك سەرتاسەری ساڵ بەڕۆژوو بێ، وەها خێری دەگاتێ.

واتە: ڕەمەزان بە دەمانگە، ئەو شەشەش بە دوو مانگە، چونکە چاکە: یەك بە دەیە.

(وَتَتَابُعُهَا أَفْضَلُ) لە دوای جەژن ئەوشەش ڕۆژووە بە دوای یەکتردا بگرێ خێرترە، جیا جیاش دروستەو سوننەتەکە وەدەست دێنێ، هەروەها ئەگەر لە (شوال)دا شەش ڕۆژووی نەزر بگرێ، یان قەزا بکاتەوە، خودی سوننەتەکەی دەست دەکەوێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکان فەرموویانە.

(وَيُكْرَهُ) ناپەسندە: (إِفْرَادُ الْجُمُعَةِ) تەنها لە ڕۆژی هەینیدا بە ڕۆژوو بێ، تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێ: کە لەگەڵ عادتی ڕۆژووەکەی تێك بکاتەوە، یان ڕۆژێك لە پێشدا، یان ڕۆژێك لە دوایدا بەڕۆژوو بێ (وَإِفْرَادُ السَّبْتِ) هەروەها ناپەسندە تەنها لە ڕۆژی شەممەدا بەڕۆژوو بێ، مەگەر لەگەڵ هەینی دا، یان لەگەڵ یەك شەممەدا بەڕۆژوو بێ، یان لەگەڵ عادەتی ڕۆژووەکەی تێك بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانەو، گشتی بەڵگەی خۆی هەیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە ڕۆژی هەینی دا، یان شەممەدا ڕۆژووی قەزا، یان نەزر بگرێ، یان هەینی، یان شەممە لەگەڵ ئەو جۆرە ڕۆژانەدا تێك بکاتەوە: کە بەڕۆژووبوونیان سوننەتە، وەك (عالفە)و (تاسوعاء)و (عاشوراء)و (شەشەلان)، ئەو کاتە ناپەسند نیە، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِــيَامٍ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِي صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ﴾رواه مسلم، بە تایبەتی لە ڕۆژی هەینیدا بەڕۆژوو مەبن، مەگەر لە ڕۆژووەکی وەها دابێ: بە عادەت یەکێکتان بەڕۆژوو دەبو.

وَصَوْمُ الدَّهْرِ غَيْرَالْعِيدِ وَالتَّشْرِيقِ مَكْرُوهٌ لِمَنْ خَافَ بِهِ ضَرَراً أَوْ فَوْتَ حَقٍّ، وَمُسْتَحَبٌّ لِغَيْرِهِ، وَمَنْ تَلَبَّسَ بِصَوْمِ تَطَوُّعٍ أَوْ صَلاَتِهِ فَلَهُ قَطْعُهُمَا وَلاَ قَضَاءَ، وَمَنْ تَلَبَّسَ بِقَضَاءٍ حَرُمَ عَلَيْهِ قَطْعُهُ إِنْ كَانَ عَلَى الْفَوْرِ، وَهُوَ صَوْمُ مَنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ،

---

(وَصَوْمُ الدَّهْرِ) بەڕۆژووبوونی سەرتاسەری ساڵ (غَيْرَ الْعِيدِ وَالتَّشْرِيقِ) جگە لە ڕۆژەكانی جەژن‌و (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ)، (مَكْرُوهٌ) ناپەسندە (لِمَنْ خَافَ بِهِ ضَرَراً) بۆ ئەو كەسەی بترسێ زیانێكی پێبگا (أَوْ فَوْتَ حَقٍّ) یان مافێك بفەوتێنێ، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صُمْ وَأَفْطِرْ وَقُمْ وَنَمْ، فَإِنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حَقّاً وَإِنَّ لِعَيْنَيْكَ عَلَيْكَ حَقّاً وَإِنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقّاً وَإِنَّ لِزَوْرِكَ عَلَيْكَ حَقّاً﴾ رواه الشيخان، هەندێ جار بەڕۆژوو ببەو هەندێ جاریش پێ مەبە، شەونوێژ بكەو بخەوە، لاشەی خۆت مافێكی لە سەر تۆ هەیە، چاوەكانت مافێكی لە سەر تۆ هەیە، ژنەكەت مافێكی لە سەر تۆ هەیە، مێوانت مافێكی لە سەر تۆ هەیە.

(وَمُسْتَحَبٌّ لِغَيْرِهِ) بۆ خەڵكی‌تریش كە لە زیان نەترسێ‌و هیچ مافێك نە فەوتێنێ، سوننەتە، بەڵام جەژن‌و (ايام التشريق) حەرامن، هەروەك ڕوونمان كردەوە.

(وَمَنْ تَلَبَّسَ بِصَوْمِ تَطَوُّعٍ) هەر كەسێك دەستی بە ڕۆژوویەكی سوننەت كرد (أَوْ صَلاَتِهِ) یان دەستی بە نوێژێكی سوننەت كرد (فَلَهُ قَطْعُهُمَا) بۆی دروستە: ڕۆژووەكەی بشكێنێ‌و نوێژەكەش ببڕێ (وَلاَ قَضَاءَ) قەزاكردنەوەی هیچێكیان لە سەر نیە، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلصَّائِمُ الْمُتَطَوِّعُ أَمِيرُ نَفْسِهِ إِنْ شَاءَ صَامَ وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ﴾رواه اصحاب السنن بسند جيد، ڕۆژووگری سوننەت گەورەی خۆیەتی، ئەگەر حەز دەكا ڕۆژووەكەی تەواو دەكاو ئەگەر حەز دەكا دەیشكێنێ.

ئینجا بزانە: گشت خواپەرستیە سوننەتەكانی‌تریش -جگە لە حەج‌و عومرە- وەكو ڕۆژووی سوننەت دروستە وازیان لێبێنێ، بەڵام حەج‌و عومرەی سوننەت واجبە تەواو بكرێن، ئینجا بزانە: بە بێ‌عوزر ناپەسندە: واز لە خواپەرستیە سوننەتەكان بێنێ، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تُبْطِلُوا أَعْمَالَكُمْ﴾ كردەوەكانتان بەتاڵ مەكەنەوە. كەوابو: ئەگەر بە عوزر، یان بە بێ‌عوزر وازی لە خواپەرستیەكە هێنا، سوننەتە قەزای بكاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە، هەروەها ڕۆژووە سوننەتەكانی دامەزراویش-ئەگەر لە كاتی خۆیاندا نەیگرتن- سوننەتە: قەزایان بكاتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (نهاية)و حاشیەكانیاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَمَنْ تَلَبَّسَ بِقَضَاءٍ) هەر كەسێك دەست بە قەزاكردنەوەی ڕۆژوویێك بكا (حَرُمَ عَلَيْهِ قَطْعُهُ) لە سەری حەرامە بیبڕێ (إِنْ كَانَ عَلَى الْفَوْرِ) ئەگەر قەزاكردنەوەكەی بە پەلە واجب بێ (وَهُوَ) ئەوەی بە پەلە واجبە (صَوْمُ مَنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ) ڕۆژووی ئەو كەسەیە: كە

وَكَذَا إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَىالْفَوْرِ فِيالأَصَحِّ: بِأَنْ لَمْ يَكُنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ.

(كتابُ الإِعْتِكاف)

هُوَ مُسْتَحَبٌّ كُلَّ وَقْت، وَفِيالْعَشْرِالأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ أَفْضَلُ لِطَلَبِ لَيْلَةِالْقَدْرِ،

---

به بێعوزر ڕۆژووەكەی شكاندوە (وَكَذَا) هەروەها حەرامە ڕۆژووە قەزایەكە ببڕێ (إِنْ لَمْ يَكُنْ عَلَى الْفَوْرِ) ئەگەر قەزاكردنەوەكەش بە پەلە نەبێ (فِيالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (بِأَنْ لَمْ يَكُنْ تَعَدَّى بِالْفِطْرِ) وەك بە عوزر ڕۆژووەكەی شكاندبێ، چونكە دەستی بە واجب كردوە، واجبە: واجب تەواو بكرێ، هەروەها حەرامە: واز لە (جهاد)ش بهێنێ، هەر چەند (فرض الكفاية)ش بێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾ حەرامە: ژن –بێئیزنیمێردەكەی– ڕۆژووی سوننەت بگرێ، لەو كاتەی مێردەكەی لە ماڵەوەیە، بەڵام ڕۆژووی قەزاو كەففارەتو نەزر دروستن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەروەها نوێژی سوننەتو ئەو ڕۆژووە سوننەتانەی لە ساڵێ جارێك ڕوو دەدەن: وەكو (عرفة)و (تاسوعاء)و (عاشوراء)، ئەوانیش دروستن، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَ يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِهِ﴾رواه الشيخان، حەڵاڵ نیە: ژن بەڕۆژووی سوننەت ببێ، لەو كاتەدا: كە مێردەكەی لە ماڵەوەیە، تەنها بە ئیزنی مێردەكەی نەبێ.

ئینجا بزانە: هەرچەند ڕۆژووەكەی دادەمەزرێ، بەڵام حەرامەو بەگوێرەی مەزهەب خێریشی ناگاتێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

﴿(كِتابُ الإِعْتِكاف): پەڕتووكی ئیعتیكافو (لَيْلَةُالْقَدْرِ)﴾

(هُوَ) ئیعتیكاف، واتە: مانەوە لە مزگەوتدا بە نیەتی خواپەرستی (مُسْتَحَبٌّ كُلَّ وَقْتٍ) لە گشت كاتێكدا خێرە، بە بەڵگەی ئایەتو حەدیسەكانی داهاتوو، بەڵام (وَفِي الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ) ئیعتیكاف لە دە شەوەكەی ئاخیری ڕەمەزاندا (أَفْضَلُ) لە ئیعتیكافی گشت كاتەكانیتر خێری گەورەترە (لِطَلَبِ لَيْلَةِ الْقَدْرِ) بۆ هەوڵدانی وەدەستهێنانی خێری (ليلة القدر): كە لە گشت شەوەكانیساڵێ گەورەترە، واتە: لە شەوی هەینیش گەورەترە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿لَيْلَةُالْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾ خواپەرستی لە (ليلة القدر)دا خێرترە: لە خوا پەرستی هەزار مانگی وەها: كە (ليلة القدر)ی تێدا نیە. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قَامَ لَيْلَةَالْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾ رواه الشيخان، هەر كەسێك لە (ليلة القدر)دا خواپەرستی بكاو باوەڕی بەو شەوە هەبێو ڕازیبوونی خوای بوێ، لە گوناهە بچووكەكانیڕابردووی خۆش دەبێ.

ئینجا بزانە: سوننەتە لەو دە شەوانەدا زۆر نوێژ بكاو زۆر قورئان بخوێنێو زۆر دوعا بكاو...هتد خواپەرستیەكانیتر، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵكو

وَمَيْلُ الشَّافعِيِّ -رَحِمَهُ اللهُ- إلَى أنَّهَا لَيْلَةُ الْحَادِى أوِالثَّالِثِ وَالْعِشْرِينَ، وَإنَّمَا يَصِحُّ الإعْتِكَافُ فِى الْمَسْجِد،

ئەگەر ئەو خواپەرستیانەی‌رابردوو-لەو دە شەوانەدا- لە ماڵەوە، یان لە هەر شوێنێکی‌تردا بکا، خێری (لیلةالقدر)ی دەستگیر دەبێ، چونکە جگە لە (طواف)و (إعتکاف)و (تحیّةالمسجد)، هیچ خواپەرستنەکی‌تر پێویستی بە مزگەوت نیە، هەروەك لە (نهایة)و (مغنی)دا فەرموویانە.

هەروەها بزانە: (لیلةالقدر) لە هەر شوێنێکدا بە گوێرەی شەوی شوێنەکەیە، هەروەك لە (الشبراملسی)دا فەرموویەتی، ماوەکەشی لە ڕۆژئاوابوونەوە تا دەرکەوتنی بەیانە، بە بەڵگەی ﴿حَتّٰى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾. هەروەها سوننەتە: لە (لیلةالقدر)دا زۆر بڵێ: ﴿اَللّٰهُمَّ إنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنّى﴾ رواه الترمذي وصححه، ئینجا ئەگەر (لیلةالقدر)ی دیت، وا باشە لە لای خەڵکی باس نەکا.

هەروەها بزانە: لەو دە شەوانەش تاکەکان زیاتر جێگەی ئومێدن، بە بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو و چەند حەدیسێکی‌تر، ئینجا لە حەدیسی(صحیح)شدا هاتوە: کە (لَيْلَةُالْقَدر) دەکەوێتە شەوی بیست‌و حەفتی ڕەمەزان، هەروەها (وَمَيْلُ الشَّافعِيِّ رَحِمَهُ اللهُ تَعَالَى إلَى أنَّهَا) دڵی ئیمامی (الشافعي) بۆ ئەوە چووە: کە (لیلةالقدر) دەکەوێتە (لَيْلَةُالْحَادِى أوِالثَّالِثِ وَالْعِشْرِينَ) شەوی بیست‌و یەکی ڕەمەزان، یان بیست‌و سێی ڕەمەزان، بە بەڵگەی ئەم حەدیسە:

﴿...ثُمَّ أُتِيتُ فَقِيلَ لِى: إنَّهَا فِى الْعَشْرِ الأوَاخِرِ...وَإنِّى أُرِيتُهَا لَيْلَةَ وِتْرٍ وَأنِّى أسْجُدُ صَبِيحَتَهَا فِى طِينٍ وَمَاء. فَأصْبَحَ مِنْ لَيْلَةِ إحْدىٰ وَعِشْرِينَ لِصَلَاةِ الصُّبْحِ فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ فَأبْصَرْتُ الطِّينَ وَالْمَاءَ﴾ وفی روایة: ﴿فَمُطِرْنَا لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ فَصَلّٰى بِنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأثَرُ الْمَاءِ وَالطِّينِ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأنْفِهِ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئینجا (وحي)م بۆ هات: کە (لیلةالقدر) لە دە شەوەکەی ئاخیری ڕەمەزانەو...من لە شەوێکی تاکدا نیشانم درا، هەم لە بەیانیەکەی‌دا سوجدە لە قوڕو ئاودا دەبەم. ئینجا بۆ نوێژی سبەینێ باران باری‌و مزگەوت دڵۆپەی کردو پێغەمبەر ﷺ پێشنوێژی‌ی کرد، ئاسەواری قوڕو ئاو بە تەوێڵ‌و لووتیەوە دیار بوو، ئەو شەوەش بیست‌ویەکی ڕەمەزان بوو، لە ڕیوایەتێکدا: بیست‌وسێی ڕەمەزان بوو.

(وَإنَّمَا يَصِحُّ الإعْتِكَافُ) ئیعتیکاف کردن کە دروست دەبێ، تەنها (فِى الْمَسْجِد) لە مزگەوتدا دروست دەبێ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأنْتُمْ عَاكِفُونَ فِى الْمَسَاجِدِ﴾ دەستبازی‌و جیماع لەگەڵ ژنەکانتان مەکەن لەو حاڵەتەدا: کە ئێوە ئیعتیکاف لە مزگەوتەکاندا دەکەن.

وَالْجَامِعُ أَوْلَى، وَالْجَدِيدُ أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ اعْتِكَافُ امْرَأَةٍ فِي مَسْجِدِ بَيْتِهَا وَهُوَ الْمُعْتَزَلُ الْمُهَيَّأُ لِلصَّلاَةِ، وَلَوْ عَيَّنَ الْمَسْجِدَالْحَرَامَ فِي نَذْرِهِ الإِعْتِكَافَ تَعَيَّنَ، وَكَذَا مَسْجِدُالْمَدِينَةِ وَالأَقْصَى فِيالأَظْهَرِ، وَيَقُومُ الْمَسْجِدُالْحَرَامُ مَقَامَهُمَا، وَلاَ عَكْسَ، وَيَقُومُ مَسْجِدُالْمَدِينَةِ مَقَامَ الأَقْصَى،

---

(وَالْجَامِعُ أَوْلَى) ئیعتیكاف لەو مزگەوتەدا: كە جومعەی تێدا دەكرێ، خێری گەورەترە لە ئیعتیكافی مزگەوتەكانیتر، چونكە بۆ جەماعەت قەرەباڵغترە.

(وَالْجَدِيدُ) فەرموودەی نوێ (أَنَّهُ لاَ يَصِحُّ اعْتِكَافُ امْرَأَةٍ) دروست نابێ: ئافرەت ئیعتیكاف بكا (فِي مَسْجِدِ بَيْتِهَا) لە مزگەوتی ماڵەوەیدا (وَهُوَ) مەبەست بە مزگەوتی ماڵەوەی (الْمُعْتَزَلُ الْمُهَيَّأُ لِلصَّلاَةِ) ئەو شوێنەیە كە لە خانووەكە-بە جیا- بۆ نوێژ تێداكردن ئامادە كراوە، چونكە ئەوە مزگەوتێكی شەرعی نیە، كەوابو: مەرجە ئافرەتیش-وەكو پیاو- لە مزگەوتدا ئیعتیكاف بكا، هەروەك ژنەكانی پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتدا ئیعتیكافیان دەكرد، بەڵام حەرامە: ژن بە بێئیزنی مێردەكەی ئیعتیكاف بكا، كەواتە: بۆ مێردەكەی دروستە: لە دوای ئیزندانیش لە ئیعتیكافی سوننەت بیهێنێتە دەرەوە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلَوْ عَيَّنَ الْمَسْجِدَالْحَرَامَ) ئەگەر یەكێك (الْمسجدالْحَرام)ی(مكة)ی دیاری كرد (فِي نَذْرِهِ الإِعْتِكَافَ) لە نەزركردنی ئیعتیكافدا (تَعَيَّنَ) ئەوە لە سەری واجب دەبێ لە (المسجد الحرام)دا ئیعتیكاف بكا (وَكَذَا مَسْجِدُالْمَدِينَةِ) هەروەها ئەگەر مزگەوتی پێغەمبەرﷺ لە (مدینة)، دیاری بكا ئیعتیكافی تێدا بكا، واجبە: لەوێدا ئیعتیكاف بكا (وَالأَقْصَى) هەروەها ئەگەر (مَسْجِدِالأقصى) لە (فلسطین)، دیاری بكا: واجبە لەوێدا ئیعتیكاف بكا (فِيالأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَتُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: اَلْمَسْجِدِالْحَرَامِ، وَمَسْجِدِالرَّسُولِﷺ، وَمَسْجِدِالأَقْصَى﴾رواه‌الشیخان، بارگە ناپێچرێنەوە-واتە: سەفەر ناكرێ- بۆ خواپەرستی، تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێ: بۆ (المسجدالحرام)و بۆ مزگەوتی پێغەمبەروﷺ بۆ (مسجدالأقصى).

كەواتە: ئەگەر لە نەزرەكەیدا-جگە لەو سێ مزگەوتانە- مزگەوتێكیتر دیاری بكا، ئەو مزگەوتە دیاركراوەی لە سەر واجب نابێو دروستە لە مزگەوتێكیتردا ئیعتیكاف بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيَقُومُ الْمَسْجِدُالْحَرَامُ مَقَامَهُمَا) لە نەزركردندا (المسجدالحرام)ی(مكة) جێگەی هەردوو مزگەوتەكەیتر دەگرێتەوە، چونكە لە هەردووكیان گەورەترە (وَلاَ عَكْسَ) بە پێچەوانەوە نابێو هیچێك لە دووەكەیتر جێگەی (المسجدالحرام) ناگرنەوە (وَيَقُومُ مَسْجِدُالْمَدِينَةِ مَقَامَ الأَقْصَى) هەروەها مزگەوتی پێغەمبەرﷺ جێگەی (مسجدالأقصى) دەگرێتەوە، چونكە

وَلاَ عَكْسَ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُشْتَرَطُ فِي الإِعْتِكَافِ لُبْثُ قَدْرٍ يُسَمَّى عُكُوفاً، وَقِيلَ يَكْفِي مُرُورٌ بِلاَ لُبْثٍ، وَقِيلَ يُشْتَرَطُ مُكْثُ نَحْوِ يَوْمٍ، وَيَبْطُلُ بِالْجِمَاعِ، وَأَظْهَرُ الأَقْوَالِ أَنَّ الْمُبَاشَرَةَ بِشَهْوَةٍ كَلَمْسٍ وَقُبْلَةٍ تُبْطِلُهُ إِنْ أَنْزَلَ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَلَوْ جَامَعَ نَاسِياً فَكَجِمَاعِ الصَّائِمِ، وَلاَ يَضُرُّ التَطَيُّبُ وَالتَّزَيُّنُ وَالْفِطْرُ،

---

ئەو گەورەتره (وَلاَ عَكْسَ) بەلاّم بە پێچەوانەوە نابێ و (الأقصى) جێگەی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ ناگرێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ﴾ رواه الشيخان، زاد ابن ماجه: ﴿وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِأَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ﴾ زاد البزار والبيهقي: ﴿وَفِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَمْسُمِأَةِ صَلاَةٍ﴾ یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا خێرتره لە هەزار نوێژی لە مزگەوتەكانیتردا، جگە لە (المسجدالحرام)، چونكە یەك نوێژ لە (المسجدالحرام)دا خێرتره لە سەد هەزار نوێژی لە مزگەوتەكانیتردا، یەك نوێژ لە (مسجدالأقصى)دا خێرتره لە پێنجسەد نوێژی لە مزگەوتەكانیتردا.

(وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ يُشْتَرَطُ فِي الإِعْتِكَافِ) بە مەرج دادەندرێ لە ئیعتیكافدا: (لُبْثُ قَدْرٍ) ئەندازەیەكی وەها لە مزگەوتدا بمێنێتەوە: كە (يُسَمَّى عُكُوفاً) پێی بگوترێ: مانەوە، بەلاّم مەرج نیە: لەو مانەوەدا خواپەرستی بكا، چونكە خودی مانەوە لە مزگەوتدا خواپەرستنە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يَكْفِي الْمُرُورُ بِلاَ لُبْثٍ) ڕابردن بە ناو مزگەوتدا بەسە، بە بێمانەوە (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (يُشْتَرَطُ مُكْثُ نَحْوِ يَوْمٍ) بە مەرج دادەندرێ: نزیكەی ڕۆژێك بمێنێتەوە.

(وَيَبْطُلُ بِالْجِمَاعِ) ئیعتیكاف بەتاڵ دەبێتەوە بە جیماع كردن، جیاوازی نیە: لە مزگەوتدا جیماع بكا، یان لە دەرەوەی مزگەوتدا، بە بەڵگەی ئایەتەكەیڕابردوو (وَأَظْهَرُ الأَقْوَالِ) بەهێزترینی فەرموودەكان ئەمەیە: (أَنَّ الْمُبَاشَرَةَ بِشَهْوَةٍ) دەستبازی بە دەمارهەڵسانەوە: (كَلَمْسٍ) وەك دەست لێدانو (وَقُبْلَةٍ) ماچ كردنو ئەو جۆره شتانە (تُبْطِلُهُ) ئیعتیكاف بەتاڵ دەكەنەوە (إِنْ أَنْزَلَ) ئەگەر ئاوی بێتەوە (وَإِلاَّ) بەلاّم ئەگەر ئاوی نەیەتەوە (فَلاَ) ئیعتیكافەكەی بەتاڵ نابێتەوە، كەوابو: بە هۆی بێدەستنوێژیی بچووك ئیعتیكاف بەتاڵ نابێ و بە بێدەستنوێژییەوە دروست دەبێ.

ئینجا بزانە: ئەوەیڕابردوو لە حاڵەتێكدا بوو: كە بە قەسدیو بە ویستی خۆیو بشزانێ حەرامە، ئینجا جیماع بكا، كەوابو: (وَلَوْ جَامَعَ نَاسِياً) ئەگەر جیماعی كرد لەو حاڵەتەدا كە لە بیری چوبێ لە ئیعتیكافدایە، یان نەیزانیبێ حەرامە (فَكَجِمَاعِ الصَّائِمِ) وەكو جیماعی مرۆڤی بەڕۆژووە: ئیعتیكافەكە بەتاڵ ناكا (وَلاَ يَضُرُّ) زیان لە ئیعتیكاف نادا: (التَّطَيُّبُ) خۆ بۆنخۆش كردنو (وَالتَّزَيُّنُ) خۆ جوانكردنو خواردنو خواردنەوەو (وَالْفِطْرُ)

بَلْ يَصِحُّ اعْتِكَافُ اللَّيْلِ وَحْدَهُ، وَلَوْ نَذَرَ اعْتِكَافَ يَوْمٍ هُوَ فِيهِ صَائِمٌ لَزِمَهُ، وَلَوْ نَذَرَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَائِماً أَوْ يَصُومَ مُعْتَكِفاً لَزِمَاهُ، وَالأَصَحُّ وُجُوبُ جَمْعِهِمَا، وَيُشْتَرَطُ نِيَّةُ الإِعْتِكَافِ، وَيَنْوِي فِي الْمَنْذُورِ: الْفَرْضِيَّةَ، وَإِذَا أَطْلَقَ كَفَتْهُ، وَإِنْ طَالَ مُكْثُهُ، لَكِنْ لَوْ خَرَجَ وَعَادَ إِحْتَاجَ إِلَى الإِسْتِئْنَافِ، وَلَوْ نَوَى مُدَّةً فَخَرَجَ فِيهَا وَعَادَ، فَإِنْ خَرَجَ لِغَيْرِ قَضَاءِ الْحَاجَةِ لَزِمَهُ الإِسْتِئْنَافُ، أَوْ لَهَا فَلاَ،

---

ڕۆژووشكاندن‌و بەڕۆژوونەبوون (بَلْ يَصِحُّ اعْتِكَافُ اللَّيْلِ وَحْدَهُ) بەڵكو دروستە: تەنها لە شەوی‌دا ئیعتیكاف بكا.

(وَلَوْ نَذَرَ اعْتِكَافَ يَوْمٍ) ئەگەر مرۆڤ لە سەر خۆی نەزر كرد ڕۆژێك ئیعتیكاف بكا، كە (هُوَ فِيهِ صَائِمٌ) لەو ڕۆژەدا بەڕۆژووش بێ (لَزِمَهُ) لە سەری واجب دەبێ: لە ڕۆژێكی بەڕۆژووبوونی‌دا ئیعتیكاف بكا (وَلَوْ نَذَرَ) ئەگەر لە سەر خۆی نەزر كرد: (أَنْ يَعْتَكِفَ صَائِماً) ئیعتیكاف بكا لە حاڵەتی بەڕۆژووبوونی‌دا (أَوْ يَصُومَ مُعْتَكِفاً) یان بەڕۆژوو بێ لە حاڵەتی ئیعتیكافی‌دا (لَزِمَاهُ) ئیعتیكافەكەو ڕۆژووەكەی لە سەر واجب دەبن، ئینجا (وَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (وُجُوبُ جَمْعِهِمَا) واجبە: ئیعتیكافەكەو ڕۆژووەكە لە یەك كاتدا پێكەوە كۆ بكاتەوە.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ بۆ دروستبوونی ئیعتیكاف (نِيَّةُ الإِعْتِكَافِ) نیەتی ئیعتیكاف بێنێ، تاكو چوونە ناو مزگەوتی عادەتی‌و خوا پەرستی لێك جیا ببنەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى﴾ رواه الشیخان، هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیەتەوە نەبێ دانامەزرێ، گشت مرۆڤێك تەنها خێری ئەو كردەوەیەی بۆ دەنووسرێ: كە نیەتی بۆ هێناوە.

(وَيَنْوِي فِي الْمَنْذُورِ الْفَرْضِيَّةَ) واجبە: لە ئیعتیكافی نەزركراودا: نیەتی ئیعتیكافی واجب بێنێ، تاكو لە ئیعتیكافی سوننەت جیا ببێتەوە (وَإِذَا أَطْلَقَ) هەر كاتێك نیەتی ئیعتیكافەكەی بە بێ‌دیاری‌كردنی ماوەیەك هێنا (كَفَتْهُ نِيَّتُهُ) نیەتی ئیعتیكاف كردن بەسیەتی (وَإِنْ طَالَ مُكْثُهُ) هەرچەند ماوەیەكی زۆریش بمێنێتەوە، چونكە نیەتەكە دەیگرێتەوە (لَكِنْ لَوْ خَرَجَ) بەڵام ئەگەر لە مزگەوت چووە دەرەوەو (وَعَادَ) دووبارە گەڕاوە ناو مزگەوت (إِحْتَاجَ إِلَى الإِسْتِئْنَافِ) پێویستی بە نوێ‌كردنەوەی نیەتەكە هەیە.

(وَلَوْ نَوَى مُدَّةً) ئەگەر نیەتی ماوەیەكی هێنا: وەك سەعاتێك، یان ڕۆژێك (فَخَرَجَ فِيهَا) ئینجا لەو ماوەیەدا لە مزگەوت چووە دەرەوەو (وَعَادَ) گەڕاوە ناو مزگەوت، تەماشا دەكرێ: (فَإِنْ خَرَجَ لِغَيْرِ قَضَاءِ الْحَاجَةِ) ئەگەر چوبێتە دەرەوە بۆ كارێكی جگە لە میزو پیسایی كردن (لَزِمَهُ الإِسْتِئْنَافُ) واجبە: نیەتەكەی نوێ بكاتەوە (أَوْ لَهَا) یان بۆ میزو پیسایی كردن چوبوە دەرەوە (فَلاَ) واجب نیە: نیەتەكەی دووبارە بكاتەوە.

وَقِيلَ إِنْ طَالَتْ مُدَّةُ خُرُوجِه استأْنَفَ، وَقِيلَ لاَ يَسْتَأْنِفُ مُطْلَقاً، وَلَوْ نَذَرَ مُـدَّةً مُتَتَابِعَـةً فَخَرَجَ لِعُذْرٍ لاَ يَقْطَعُ التَّتَابُعَ لَمْ يَجب اسْتِئْنَافُ النِّيَّة، وَقِيلَ إِنْ خَرَجَ لِغَيْرِ حَاجَة وَغُسْلِ الْجَنَابَة وَجَبَ، وَشَرْطُ الْمُعْتَكِف: الإِسْلاَمُ وَالْعَقْلُ والنَّقَاءُ عَـنِ الْحَيْضِ وَالْجَنَابَـة، وَلَوارْتَدَّ الْمُعْتَكِفُ أَوْ سَكِرَ بَطَلَ، وَالْمَذْهَبُ بُطْلاَنُ مَامَضَى مِنْ اعْتِكَافِهِمَاالْمُتَتَابِعِ، وَلَوْ طَرَأَ جُنُونٌ أَوْ إِغْمَاءٌ لَمْ يَبْطُلْ مَامَضَى إِنْ لَمْ يُخرَجْ، وَيُحْسَـبُ زَمَـنُ الإِغْمَـاءِ مِـنَ الإِعْتِكَاف دُونَ الْجُنُونِ،

---

(وَقِيـلَ) لـه فەرمووده‌یـه‌کی بـێهێزدا (إِنْ طَالَـتْ مُـدَّةُ خُرُوجِـه) ئه‌گـه‌ر مـاوه‌ی چـوونه ده‌ره‌وه‌ی درێژ بێ (استأْنَفَ) واجبه: نیه‌ته‌که‌ی نوێ بکاتـه‌وه (وَقِيـلَ) لـه فه‌رمووده‌یـه‌کی بێهێزدا (لاَ يَسْتَأْنِفُ مُطْلَقاً) به هیچ جۆرێك نیه‌ته‌که‌ی دووباره ناکاته‌وه.

(وَلَوْ نَذَرَ مُدَّةً مُتَتَابِعَةً) ئه‌گه‌ر نه‌زری کرد ماوه‌یه‌کی به دوای‌یه‌کتردا ئیعتیکـاف بکـا (فَخَرَجَ لِعُذْرٍ) ئینجـا لـه ئیعتیکافه‌کـه‌ی چـووه ده‌ره‌وه، بـه هـۆی عـوزرێکی وه‌هـا: کـه (لاَ يَقْطَـعُ التَّتَابُعَ) عوزره‌که ماوه‌که‌ی لێك نه‌ده‌پچڕاند: وه‌ك خواردن، میز، حـه‌یز، پیسایی‌کردن (لَـمْ يَجِبِ اسْتِئْنَافُ النِّيَّـةِ) واجـب نیـه: نیه‌ته‌کـه‌ی نـوێ بکاتـه‌وه لـه‌و کاتـه‌ی ده‌گه‌ڕێتـه‌وه بـۆ ئیعتیکـاف (وَقِيـلَ) لـه فه‌رمووده‌یـه‌کی بێهێزدا (إِنْ خَرَجَ) ئه‌گـه‌ر چوبێته ده‌ره‌وه (لِغَيْـرِ الْحَاجَـةِ) بـۆ کـارێکی جگـه لـه میـزو پیسـایی‌کردن‌و (وَغُسْلِ الْجَنَابَـةِ) جگـه لـه غوسـلی جه‌نابه‌ت (وَجَبَ) واجبه: نیه‌ته‌که‌ی دووباره بکاته‌وه.

(وَشَرْطُ الْمُعْتَكِف) مه‌رجی ئـه‌و که‌سـه‌ی ئیعتکـاف ده‌کـا، یه‌کـه‌م: (الإِسْلاَمُ) ئیسلامه‌تیه. دووه‌م: (وَالْعَقْلُ) عاقڵی‌یه. سـێیه‌م: (والنَّقَاءُ) پاکی‌یه: (عَنِ الْحَيْضِ وَالْجَنَابَـةِ) لـه حـه‌یزو زه‌یسانی‌و جه‌نابه‌ت، واته: به‌ڵام ده‌ستنوێژی بچووك مه‌رج نیه.

(وَلَوِ ارْتَدَّ الْمُعْتَكِفُ) ئه‌گه‌ر ئیعتیکافکه‌ره‌که له دین وه‌رگه‌ڕاو کوفرێکی کـرد (أَوْ سَكِرَ) یـان سه‌رخۆش بوو (بَطَلَ) ئیعتیکافه‌که‌ی ماوه‌ی کافربوونه‌که‌و مـاوه‌ی سه‌رخۆشیه‌که‌ی بـه‌تاڵ ده‌بێتـه‌وه (وَالْمَـذْهَبُ) فـه‌رمووده‌ی ڕاسـتی مه‌زهـه‌ب (بُطْـلاَنُ مَـا مَضَـى) ئـه‌وه‌ی‌ڕابردوویش به‌تاڵ ده‌بێته‌وه (مَنْ اعْتِكَافِهِمَا الْمُتَتَابِعِ) له‌و ئیعتیکافـه‌یان کـه ماوه‌کـه‌ی بـه دوای‌یـه‌کتردا بووه، واته: بۆیان به به‌ر ناکه‌وێ، بـه‌ڵام (وَلَـوْ طَـرَأَ جُنُـونٌ) ئه‌گـه‌ر لـه حاڵـه‌تی ئیعتیکافـدا شێت بوو (أَوْ إِغْمَـاءٌ) یـان بـێهۆش بـوو (لَـمْ يَبْطُـلْ مَامَضَـى) ئیعتیکـافی ماوه‌ی‌ڕابردوویـان بـه‌تاڵ نابێتـه‌وه (إِنْ لَـمْ يُخْـرَجْ) ئه‌گـه‌ر شـێته‌که، یـان بێهۆشـه‌که بـه بـێ‌عوزر نه‌بردرێتـه ده‌ره‌وه، واتـه: ئه‌گـه‌ر بـه هـۆی عوزرێـك ببردرێتـه ده‌ره‌وه، ئیعتیکافه‌کـه‌یان بـه‌تاڵ نابێته‌وه، چونکه عوزریان به ده‌سته.

(وَيُحْسَـبُ زَمَـنُ الإِغْمَـاءِ مِـنَ الإِعْتِكَـافِ) مـاوه‌ی بێهۆشیه‌که‌ی بـه ئیعتیکـاف بـۆ حیسـاب ده‌کرێ (دُونَ الْجُنُونِ) به‌ڵام مـاوه‌ی شـێتبوونی بـۆ حیسـاب نـاکرێ، چونکه مرۆڤـی شـێت

أَوِالْحَيْضُ وَجَبَ الْخُرُوجُ، وَكَذَا الْجَنَابَةُ إِذَا تَعَذَّرَ الْغُسْلُ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَوْ أَمْكَنَ جَازَ الْخُرُوجُ وَلاَ يَلْزَمُ، وَلاَ يُحْسَبُ زَمَنُ الْحَيْضِ وَلاَ الْجَنَابَةِ. (فَصْلٌ) إِذَا نَذَرَ مُدَّةً مُتَتَابِعَةً لَزِمَهُ، وَالصَّحِيحُ أَنَّهُ لاَ يَجِبُ التَّتَابُعُ بِلاَ شَرْطٍ، وَأَنَّهُ لَوْ نَذَرَ يَوْماً لَمْ يَجُزْ تَفْرِيقُ سَاعَاتِهِ، وَأَنَّهُ لَوْ عَيَّنَ مُدَّةً كَأُسْبُوعٍ وَتَعَرَّضَ لِلتَّتَابُعِ وَفَاتَتْهُ لَزِمَهُ التَّتَابُعُ فِي الْقَضَاءِ،

---

خواپەرستیی دروست نابێ (أَوِالْحَيْضُ) یان لە حاڵەتی ئیعتیکافدا حەیز، یان زەیسانی تووش بوو (وَجَبَ الْخُرُوجُ) واجبە: بڕواتە دەرەوە، چونکە حەرامە: لە مزگەوتدا بمێنێتەوە (وَكَذَا الْجَنَابَةُ) هەروەها ئەگەر جەنابەتیشی تووش بوو، واجبە: بڕواتە دەرەوە (إِذَا تَعَذَّرَ الْغُسْلُ فِي الْمَسْجِدِ) ئەگەر نەگونجا لە مزگەوتدا غوسلی جەنابەت بکا (فَلَوْ أَمْكَنَ) ئەگەر گونجا لە مزگەوتدا غوسلەکە بکا (جَازَ الْخُرُوجُ) ئەوە بۆی دروستە بڕواتە دەرەوە (وَلاَ يَلْزَمُ) بەلام واجبیش نیە بڕواتە دەرەوە، بەڵکو دروستە: لە مزگەوتدا بە پەلە غوسلەکە بکا (وَلاَ يُحْسَبُ زَمَنُ الْحَيْضِ وَلاَالْجَنَابَةِ) ماوەی حەیزو زەیسانیو جەنابەت بە ئیعتیکاف حیساب ناکرێ، هەرچەند وەهاش ڕێك بکەوێ: بە هۆی عوزرێك ماوەیەك بە جەنابەتەوە، یان بە حەیزەوە لە مزگەوتدا بمێنێتەوە، چونکە ئیعتیکافی ئەو جۆرە کەسانە دروست نابێ.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی ئیعتیکافی نەزرکراو ﴾

(إِذَا نَذَرَ مُدَّةً مُتَتَابِعَةً) هەر کاتێك مرۆڤ نەزری کرد: ماوەیەکی بە دوای یەکتردا ئیعتیکاف بکا، وەك بڵێ: لە سەرم نەزربێ حەفتەیەك بە دوایەکتردا ئیعتیکاف بکەم (لَزِمَهُ) لە سەری واجب دەبێ: بە دوایەکتردا ئیعتیکافەکە بکا (وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست: (أَنَّهُ لاَ يَجِبُ التَّتَابُعُ بِلاَ شَرْطٍ) ئیعتیکاف بە دوایەکتردا واجب نابێ، ئەگەر لە سەرخۆی نەکاتە مەرج وەك بڵێ: لە سەرم نەزربێ حەفتەیەك، یان دە ڕۆژ ئیعتیکاف بکەم. ئەوە ئەگەر بە مەرج دانەنێ بە دوایەکتردا ئەو ماوەیە ئیعتیکاف بکا، دروستە: جیاجیاش ئەو ماوەیە ئیعتیکاف بکاو بە دوای یەکتریشدا دروستە.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاست (لَوْ نَذَرَ يَوْماً) ئەگەر نەزری کرد یەك ڕۆژ ئیعتیکاف بکا (لَمْ يَجُزْ تَفْرِيقُ سَاعَاتِهِ) دروست نیە: کاتەکانی ئەو ڕۆژە لێك جیا بکاتەوەو بە چەند ڕۆژێك تەواوی بکا، بەڵکو واجبە: لە پێش بەیانەوە تا دوای ڕۆژ ئاوابوون ئیعتیکاف بکا.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاست (لَوْ عَيَّنَ مُدَّةً) ئەگەر ماوەیەکی دیاریکرد (كَأُسْبُوعٍ) وەکو حەفتەیەك (وَتَعَرَّضَ لِلتَّتَابُعِ) لە نەزرەکەشدا باسی بە دوای یەکتریدای کرد، وەك: لە سەرم نەزربێ: ئەم حەفتەیە بە دوایەکتردا ئیعتیکاف بکەم. (وَفَاتَتْهُ) ئەو ماوە دیارکراوەشی لێفەوتاو ئیعتیکافی تێدا نەکرد (لَزِمَهُ التَّتَابُعُ فِي الْقَضَاءِ) واجبە: ئیعتیکافی

وَإِنْ لَمْ يَتَعَرَّضْ لَهُ لَمْ يَلْزَمْهُ فِي الْقَضَاءِ، وَإِذَا ذَكَرَ التَّتَابُعَ وَشَرَطَ الْخُرُوجَ لِلْعَارِضِ صَحَّ الشَّرْطُ فِي الأَظْهَرِ، وَالزَّمَانُ الْمَصْرُوفُ إِلَيْهِ لاَ يَجِبُ تَدَارُكُهُ إِنْ عَيَّنَ الْمُدَّةَ كَهَذَا الشَّهْرِ، وَإِلاَّ فَيَجِبُ، وَيَنْقَطِعُ التَّتَابُعُ بِالْخُرُوجِ بِلا عُذْرٍ، وَلاَ يَضُرُّ إِخْرَاجُ بَعْضِ الأَعْضَاءِ وَلاَ الْخُرُوجُ لِقَضَاءِ الْحَاجَةِ، وَلاَ يَجِبُ فِعْلُهَا فِي غَيْرِ دَارِهِ، وَلاَ يَضُرُّ بُعْدُهَا إِلاَّ أَنْ يَفْحُشَ فَيَضُرُّ فِي الأَصَحِّ،

---

ئەو ماوەیە بە دوایەکتردا قەزا بکاتەوە، بەڵام (وَإِنْ لَمْ يَتَعَرَّضْ لَهُ) ئەگەر لە نەزرەکەدا باسی بە دوایەکتریدای نەکردبو: وەك لە سەرم نەزربێ ئەم حەفتەیە ئیعتیکاف بکەم. ئەوە (لَمْ يَلْزَمْهُ فِي الْقَضَاءِ) لە قەزاکردنەوەی ئەو ماوەیەدا واجب نیە: بە دوای یەکتردا قەزایەکە بکاتەوە، بەڵکو واجبە: حەفت ڕۆژ قەزا بکاتەوە: یان جیا جیا، یان بە دوای یەکتردا، ئینجا بزانە: ئەگەر ماوەیەکە دیاری نەکا، وەك بڵێ: مانگێك، یان حەفتەیەك، ئەوە بە درێژایی تەمەنی نافەوتێو واجبە: ئەو ماوەیە ئیعتیکاف بکا.
(وَإِذَا ذَكَرَ التَّتَابُعَ) هەر کاتێك لە نەزرەکەیدا باسی کرد: ماوەکەی بە دوایەکتردا بێ (وَشَرَطَ الْخُرُوجَ لِعَارِضٍ) بە مەرجی دانا: بە هۆی ڕووداوێك لە مزگەوت بێتە دەرەوە (صَحَّ الشَّرْطُ) ئەو مەرج دانانەی دروست دەبێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا (وَالزَّمَانُ الْمَصْرُوفُ إِلَيْهِ) ئەو ماوەیەی لەو ڕووداوەی بەسەر بردوە (لاَ يَجِبُ تَدَارُكُهُ) واجب نیە بیکاتەوە (إِنْ عَيَّنَ الْمُدَّةَ) ئەگەر ماوەی ئیعتیکافەکەی دیاری کردبێ (كَهَذَا الشَّهْرِ) وەك نەزر بێ: ئەم مانگەی ڕەمەزان ئیعتیکاف بکەم (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر دیاری نەکردبو: وەك نەزربێ مانگێك ئیعتیکاف بکەم (فَيَجِبُ) واجبە: ئەو ماوەیەی لە ڕووداوەکەدا بەسەری بردوە بیکاتەوە، تاکو ئەندازەی مانگەکە تەواو ببێ. واتە: سوودی مەرجەکەی ئەوەیە: چوونە دەرەوە بە هۆی ئەو ڕووداوە، ماوەکەی لێناپچڕێنێ.
(وَيَنْقَطِعُ التَّتَابُعُ) ماوەی بە دوایەکتردا لێك دەپچڕێ (بِالْخُرُوجِ بِلا عُذْرٍ) بە چوونە دەرەوە لە مزگەوت بە بێعوزر، بە قەسدیو بە ویستی خۆیو بشزانێ چوونە دەرەوە حەڕامە، کەوابو: واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە ئیعتیکافی ئەو ماوەیە بکاتەوە (وَلاَ يَضُرُّ إِخْرَاجُ بَعْضِ الأَعْضَاءِ) زیان لە ئیعتیکاف نادا: بردنە دەرەوەی هەندێك ئەندامەکانی خۆی: وەك سەری، یان دەستی، یان پێی بباتە دەرەوەی مزگەوت (وَلاَ الْخُرُوجُ لِقَضَاءِ الْحَاجَةِ) هەروەها زیانی نیە، چوونە دەرەوە بۆ میز، یان پیسایی کردن (وَلاَ يَجِبُ فِعْلُهَا فِي غَيْرِ دَارِهِ) واجب نیە: میزو پیسایی لە شوێنێکیتری جگە لە خانووی خۆی بکا (وَلاَ يَضُرُّ بُعْدُهَا) زیانی نیە: دووریی خانووەکە لە مزگەوت (إِلاَّ أَنْ يَفْحُشَ) مەگەر زۆر زۆر دوور بێو شوێنێکی نزیکتری دەست بکەوێ، ئەو کاتە (فَيَضُرُّ) چوونە خانووی خۆی زیان لە ئیعتیکافەکەی دەدا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، کەوابو: دەبێ لە

وَلَوْ عَادَ مَرِيضاً فِي طَرِيقِهِ لَمْ يَضُرَّ مَا لَمْ يُطِلْ وُقُوفَهُ أَوْ يَعْدِلْ عَنْ طَرِيقِهِ وَلاَ يَنْقَطِعُ التَّتَابُعُ بِمَرَضٍ يُحْوِجُ إِلَى الْخُرُوجِ، وَلاَ بِحَيْضٍ إِنْ طَالَتْ مُدَّةُ الإِعْتِكَافِ، فَإِنْ كَانَتْ بِحَيْثُ تَخْلُو عَنْهُ الْقَطْعَ فِي الأَظْهَرِ، وَلاَ بِالْخُرُوجِ نَاسِياً عَلَى الْمَذْهَبِ، وَلاَ بِخُرُوجِ الْمُؤَذِّنِ الرَّاتِبِ إِلَى مَنَارَةٍ مُنْفَصِلَةٍ عَنِ الْمَسْجِدِ لِلأَذَانِ فِي الأَصَحِّ، وَيَجِبُ قَضَاءُ أَوْقَاتِ الْخُرُوجِ بِالأَعْذَارِ إِلاَّ وَقْتَ قَضَاءِ الْحَاجَةِ.

---

شوێنە نزیکەکەدا میزو پیسایی بکا، بەلام ئەگەر شوێنێکی نزیکی دەست نەکەوێ، ئەو کاتە چوونە خانووە زۆر دوورەکە زیانی نیە.

(وَلَوْ عَادَ مَرِيضاً فِي طَرِيقِهِ) ئەگەر لەڕێگەی چوونە سەراو، سەردانی نەخۆشێکی کرد (لَمْ يَضُرَّ) زیان لە ئیعتیکافەکە نادا (مَا لَمْ يُطِلْ وُقُوفَهُ) ئەگەر ماوەیەکی درێژ نەمێنێتەوە (أَوْ يَعْدِلْ عَنْ طَرِيقِهِ) یان لە ڕێگەی سەراو لانەدا، کەوابو: ئەگەر بە قەد نوێژی جەنازە لە لای نەخۆشەکە ڕاوەستا، یان لە ڕێگەی سەراو لایدا، ئەو کاتە سەردانەکە زیان لە ئیعتیکافەکەی دەدا.

(وَلاَ يَنْقَطِعُ التَّتَابُعُ بِمَرَضٍ) ماوەی بە دوایەکدای ئیعتیکاف لێك ناپچڕێ بە نەخۆشیەکی وەها: کە (يُحْوِجُ إِلَى الْخُرُوجِ) پێویست بکا: نەخۆشەکە بەردرێتە دەرەوەی مزگەوت: وەك بترسێ مزگەوت پیس بکا، یان پێویستی بە ڕایەخ و خزمەت هەبێ (وَلاَ بِحَيْضٍ) هەروەها ماوەکە بە حەیزو نیفاسیش لێك ناپچڕێ (إِنْ طَالَتْ مُدَّةُ الإِعْتِكَافِ) ئەگەر ماوەی ئیعتیکافەکە درێژبێ، بۆ وێنە: وەك مانگێك، چونکە بە ئەغلەبی لە مانگێکدا حەیز دەبینێ. بەلام (فَإِنْ كَانَتْ بِحَيْثُ تَخْلُو عَنْهُ) ئەگەر ماوەکەی ئیعتیکاف هەر ئەوەندە بوو: بە ئەغلەبی حەیزی تێدا نەدەدیت، وەك پانزە ڕۆژ (انْقَطَعَ فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: لێك دەپچڕێ، چونکە دەیتوانی لە دوای پاکبوونەوە ئیعتیکافەکە بکا (وَلاَ بِالْخُرُوجِ نَاسِياً) هەروەها لێك نابچڕێ بە چوونەدەرەوە، ئەگەر لە بیری چوبێ: لە ئیعتیکافدایە، یان بە زۆرلێکردن دەرکرا دەرەوە، یان نەیدەزانی چوونەدەرەوە حەڕامە (عَلَى الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی‌مەزهەب، چونکە ئەو حاڵەتانە دەبنە عوزر.

(وَلاَ بِخُرُوجِ الْمُؤَذِّنِ الرَّاتِبِ) هەروەها لێك نابچڕێ بە چوونەدەرەوەی بانگدەری دامەزراو (إِلَى مَنَارَةٍ مُنْفَصِلَةٍ عَنِ الْمَسْجِدِ) بۆ سەر مەنارەیەك: کە لە مزگەوت جیاکرابێتەوە (لِلأَذَانِ) بۆ بانگدان (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا (وَيَجِبُ قَضَاءُ أَوْقَاتِ الْخُرُوجِ) واجبە کاتەکانی چوونەدەرەوە قەزا بکاتەوە (بِالأَعْذَارِ) کە بە هۆی ئەو عوزرانەی‌ڕابردوو چوبێتە دەرەوە: کە ماوەکە لێك ناپچڕێنن (إِلاَّ وَقْتَ قَضَاءِ الْحَاجَةِ) تەنها ماوەی میزو پیسایی کردن واجب نیە قەزا بکاتەوە، هەروەها ماوەی بانگدان و غوسلی جەنابەتیش

## (كِــتابُ الْــحَــجِّ)

هُــوَ فَرْضٌ، وَكَذَا الْــعُمْرَةُ فِي الأَظْهَرِ،

---

واجـب نيـە قـەزا بكاتـەوە. الحمـد لله، ليـرەدا پـەرتووكى(ڕۆژووەكـان) كۆتـايى هـاتو پەرتووكى (حەجو عومرەى) بە دوادا دێ، إن شاءَ اللهُ تَعَالَى.

### ﴿كِتابُ الْحَجِّ: پەرتووكى حەجو عومرە﴾

(هُوَ) حەج كردن (فَرْضٌ) واجبەو ڕوكنى پێنجەمى ئیسلامە، لە ساڵى شەشەمى كۆچىدا واجب كراوە، كەوابو: هەر كەسێك باوەڕى بە حەج نەبێ كافر دەبێ، خواىگەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ خواى گەورە واجبێكى لە سەر خەڵك هەیە: كە حەج كردنى ماڵىخوایە-لە (مكة)- لە سەر ئەو كەسە واجبە: كە تواناى ڕێگەى هەبێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿بُنِيَ الْإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَإِلَــهَ إِلاَّاللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًارَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ، وَالْحَــجِّ﴾ رواه الشيخان، ئايينى ئیسلام لە سەر پێنج ڕوكن دامەزراوە: شادەهێنان، نوێژكردن، زەكاتدان، ڕۆژووى ڕەمەزان، حەج كردن. كەوابو: هەر كەسێك باوەڕى بە واجببوونى حەج نەبێ، ئەوە كافر دەبێ، بەڵام بە (اجماع)ى زانایانى ئیسلام: هەر كەسێك باوەڕى بە واجببوونى حەج هەبێو تواناى حەج كردنى هەبوبێو بە قەسدى حەجى نەكردبێو مردبێ، ئەوە كافر نیە، بەڵكو گوناهبارە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتى.

(وَكَذَا الْعُمْرَةُ) هەروەها عومرەش واجبە (فِىالأَظْهَرِ) لە فەرموودەى بەهێزتردا ﴿عَــنْ ابْــنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهُمَــا: إِنَّهَا لَقَرِينَتُهَا فِي كِتَابِ اللهِ تَعَالَى: وَأَتِمُّواالْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّــهِ﴾ رواه البخاري، عومرە لەگەڵ واجببوونى حەج جووت كراوە، كە خوا دەفەرموێ: حەجو عومرە بە تەواوى بۆ خوا بكەن. هەروەها پێغەمبەرﷺ بە پیاوێكى فەرموو: ﴿حُجَّ عَنْ أَبِيــكَ وَاعْتَمِــرْ﴾ رواه اصحاب السنن بسندصحيح، لەجیاتى باوكت حەج بكەو عومرە بكە.

ئینجا بزانە: بە فەرمانى شەرع تەنها یەك حەجو یەك عومرە لە درێژایى تەمەندا واجبە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ اَلْحَــجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ، أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً؟ قَالَ: بَلْ مَرَّةً وَاحِدَةً فَمَنْ زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ﴾رواه أبوداود وغيره بسندحسن، ورواه مسلم بلفظ آخر، ئایا حەج كردن هەموو ساڵێك واجبە، یان تەنها یەك جار؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووى: تەنها یەك جار واجبەو زیاتر سوننەتە.

ئینجا بزانە: لە مەزهەبى ئیمامى(حنفي)و ئیمام(مالك)دا: عومرە سوننەتەو واجب نیە، بە بەڵگەى ئەم حەدیسە: ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: سُئِلَ النَّبِيُّﷺ عَنِ الْعُمْرَةِ: أَواجِبَةٌ هِيَ؟ قَالَ: لاَ، وَأَنْ

وَشَرْطُ صِحَّتِه: اَلإِسْلاَمُ فَلِلْوَلِيِّ أَنْ يُحْرِمَ عَنِ الصَّبِيِّ الَّذِى لاَيُمَيِّزُ وَالْمَجْنُونِ، وَإِنَّمَا تَصِحُّ مُبَاشَرَتُهُ مِنَ الْمُسْلِمِ الْمُمَيِّزِ،

---

تَعْتَمِرُوا هُوَ أَفْضَلُ﴾ رواه الترمذي وقالَ: صحيح، لكن اتفق الحفاظ على أنّه ضَعيف، ئايا عومرِه واجبه؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا، بەڵكو عومرِە بكەن خێرترە. ئینجا بزانە: زانایانی حەدیس-جگە لە (الترمذي)- یەكدەنگن كە حەدیسەكە بێهێزە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، هەروەها حەدیسەكەی ﴿اَلْعُمْرَةُ تَطَوُّعٌ﴾ش بێهێزە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ حەجی منداڵو شێت ﴾

(وَشَرْطُ صِحَّتِهِ) مەرجی دروستبوونی حەجو عومرِە: (الإِسْلاَمُ) تەنها ئیسلامەتی‌یە، واتە: عاقڵیو بالغی مەرج نیە، كەوابو: (فَلِلْوَلِيِّ) بۆ سەرپەرشتكاریمالّی دروستە: (أَنْ يُحْرِمَ) نیەتی ئیحرامی حەج، یان عومرِە بێنێ (عَنِ الصَّبِيِّ الَّذِى لاَ يُمَيِّزُ) لەجیاتی منداڵی نەفامو (وَالْمَجْنُونِ) لەجیاتی شێت، ئینجا بەو شێوەیداهاتوو حەجو عومرِەیان پێبكا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: رَفَعَتْ إِمْرَأَةٌ صَبِيّاً لَهَا فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكِ أَجْرٌ﴾ رواه مسلم، ئافرەتێك منداڵێكیخۆی بەرز كردەوەو گوتی: ئەم منداڵە حەجی بۆ دەبێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەتۆش خێرت دەگاتێ كە حەجی پێدەكەی.

ئینجا بزانە: پێویستە سەرپەرشتكارەكە لە نیەتهێناندا بڵێ: (ئەم منداڵەم، یان ئەم شێتەم خستە ژێر ئیحرامی حەج، یان ئیحرامی عومرِە). یان بڵێ: (ئیحرامی حەج، یان عومرِەم بەست بۆ ئەم منداڵە، یان بۆ ئەم شێتە). ئینجا منداڵەكە، یان شێتەكە دەكەوێتە ژێر ئیحرامو واجبە: سەرپەرشتكارەكەی لەگەڵیدابێ بۆ گشت شوێنو واجبەكانو گشت واجبەكانی پێبكا، هەروەها بۆ ڕەجمی شەیتانەكانیش بەردەكانی دەداتە دەست، جا ئەگەر نەیتوانی بەردەكان بهاوێ، ئەو كاتە بەخۆی، یان یەكێكیتر بەردەكانی لە جیاتی دەهاوێ.

هەروەها واجبە بۆ تەواف كردن: منداڵو شێتەكە پاك بكرێنەوەو دەستنوێژیان بۆ بگیرێ، هەروەها واجبە: لە گشت قەدەغەكراوەكانی حەج قەدەغە بكرێن، جا لەو ڕوونكردنەوەیەدا جیاوازی منداڵی نێر و مێ نیە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَإِنَّمَا تَصِحُّ مُبَاشَرَتُهُ) حەج كردن كە بەخۆی بیكاو دروست ببێ، تەنها (مِنَ الْمُسْلِمِ الْمُمَيِّزِ) لە موسوڵمانیفامیدە دروست دەبێ.

كەواتە: دروستە: منداڵیفامیدە بەخۆی نیەتی ئیحرامی حەج، یان عومرِە بێنێ، بەڵام پێویستە: سەرپەرشتكارەكەی ئیزنی بدا، ئەگینا: ئیحرامەكەی دانابەسترێو دروست نابێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، ئینجا هەر بەخۆی گشت ڕوكنو واجبەكانی

وَإِنَّمَا يَقَعُ عَنْ حَجَّةِالإِسْلَامِ بِالْمُبَاشَرَةِ إِذَا بَاشَرَهُ الْمُكَلَّفُ الْحُرُّ، فَيُجْزِئُ حَجُّ الْفَقِيرِ دُونَ الصَّبِيِّ وَالْعَبْدِ، وَشَرْطُ وُجُوبِهِ: اَلإِسْلَامُ وَالتَّكْلِيفُ وَالْحُرِّيَّةُ

---

حەج و عومرە دەكا، هەروەك لە (شرح المنهج)دا فەرموویەتی، بەلام ئەگەر منداڵەكە قەدەغەكراوێكی كرد، ئەو كاتە گشت (فِدْيَة)كان دەكەونە ئەستۆی سەرپەرشتكارەكەی و واجبە: لە ماڵیخۆی (فِدْيَة)كانی منداڵەكە بدا.

جا بزانە: منداڵ خێری گشت چاكەو خواپەرستی‌یەكانی بۆ دەنووسرێ، بەلام هیچ گوناهێكی لە سەر نانووسرێ، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو و چەند حەدیسێكیتر، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَإِنَّمَا يَقَعُ عَنْ حَجَّةِالإِسْلَامِ بِالْمُبَاشَرَةِ) ئەو حەج و عومرەی بەخۆی دەیكا، كە بە بەر حەج و عومرەی ڕوكنیئیسلام دەكەوێ، تەنها (إِذَا بَاشَرَهُ الْمُكَلَّفُ الْحُرُّ) هەر كاتێك موسوڵمانێكی بالغ و عاقڵ و ئازاد حەج و عومرەكە بكا، كەوابو: (فَيُجْزِئُ حَجُّ الْفَقِيرِ) حەج و عومرەی موسوڵمانی گەداو هەژار دروست دەبێ و بە بەر ڕوكنیئیسلام دەكەوێ، جا هەر كاتێك دەوڵەمەند بوو، واجب نیە حەج و عومرەیەكیتر بكا.

(دُونَ الصَّبِيِّ وَالْعَبْدِ) بەلام حەج و عومرەی منداڵ و كۆیلە بە بەر ڕوكنی ئیسلام ناكەوێ، بەڵكو بۆیان بە حەج و عومرەی سوننەت دەنووسرێ، كەوابو: هەر كاتێك منداڵەكە بلۆغی بوو، یان كۆیلەكە ئازاد كرا–ئەگەر حەجیان لە سەر واجب بوو– واجبە: حەج و عومرەی ڕوكنیئیسلام بكەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَيُّمَا صَبِيٍّ حَجَّ ثُمَّ بَلَغَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى، وَأَيُّمَا عَبْدٍ حَجَّ ثُمَّ أُعْتِقَ فَعَلَيْهِ حَجَّةٌ أُخْرَى﴾رواه البيهقي وابن أبيشيبة بإسناد جيد، هەر منداڵێك حەجی كرد ئینجا بلۆغی بوو، با حەجێكیتر بكا، هەر كۆیلەیەك حەجی كرد ئینجا ئازاد كرا، با حەجێكیتر بكا.

ئینجا بزانە: لەو ڕوونكردنەوانەیڕابردوودا ئاشكرابو: دەربارەی حەج كردن خەڵك پێنج بەشن، یەكەم: بە هیچ جۆرێك حەجی دروست نابێ: وەكو كافر. دووەم: حەجی دروست دەبێ بەو مەرجەی سەرپەرشتكارەكەی ئیحرامی بۆ ببەستێ و لەگەڵیدابێ: وەكو شێت و منداڵینەفام. سێیەم: حەجی دروست دەبێ، كە بەخۆی حەجەكە بكا: وەكو موسوڵمانی فامیدە، هەرچەند منداڵیش بێ. چوارەم: حەجی دروست دەبێ و بە بەر ڕوكنیئیسلام دەكەوێ: وەكو موسوڵمانی بالغ و عاقڵ و ئازاد. پێنجەم: حەجی دروست دەبێ و واجبە: حەج بكا، هەروەك دەفەرموێ:

(وَشَرْطُ وُجُوبِهِ) مەرجی واجببوونی حەج، یەكەم: (الإِسْلَامُ) ئیسلامەتی‌یە، واتە: كافر–لە دونیادا– داوای حەجی لێناكرێ. دووەم: (وَالتَّكْلِيفُ) داوالێكردنی شەرعە، واتە: لە سەر منداڵ و شێت واجب نیە. سێیەم: (وَالْحُرِّيَّةُ) ئازادی‌یە، واتە: لە سەر كۆیلە واجب نیە.

وَالإِسْتِطَاعَةُ وَهِيَ نَوْعَانِ، أَحَدُهُمَا: إِسْتِطَاعَةُ مُبَاشَرَةٍ وَلَهَا شُرُوطٌ، أَحَدُهَا: وُجُودُ الزَّادِ وَأَوْعِيَتِهِ وَمُؤْنَةِ ذَهَابِهِ وَإِيَابِهِ، وَقِيلَ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ بِبَلَدِهِ أَهْلٌ وَعَشِيرَةٌ لَمْ تُشْتَرَطْ نَفَقَةُ الإِيَابِ، فَلَوْ كَانَ يَكْتَسِبُ كُلَّ يَوْمٍ مَا يَفِي بِزَادِهِ وَسَفَرُهُ طَوِيلٌ لَمْ يُكَلَّفِ الْحَجَّ، وَإِنْ قَصُرَ وَهُوَ يَكْتَسِبُ فِي يَوْمٍ كِفَايَةَ أَيَّامٍ كُلِّفَ. الثَّانِي: وُجُودُ الرَّاحِلَةِ لِمَنْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ مَكَّةَ مَرْحَلَتَانِ، فَإِنْ لَحِقَهُ بِالرَّاحِلَةِ مَشَقَّةٌ شَدِيدَةٌ اُشْتُرِطَ وُجُودُ مَحْمِلٍ وَاشْتُرِطَ شَرِيكٌ يَجْلِسُ فِي الشِّقِّ الآخَرِ،

---

چوارەم: (وَالإِسْتِطَاعَةُ) تواناى حەج كردنە، واتە: لە سەر گەدلو هەژار واجب نيە، بە بەلگەى ئايەتى﴿مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً﴾ى برابردوو، (وَهِيَ) توانينى حەج كردن (نَوْعَانِ) دوو جۆرە: (أَحَدُهُمَا) يەكەميان: (إِسْتِطَاعَةُ مُبَاشَرَةٍ) توانينى حەج كردنە بەخۆى (وَلَهَا شُرُوطٌ) توانينى حەج كردن بەخۆى پێنج مەرجى هەنە:

(أَحَدُهَا) يەكەم مەرجى‌توانين: (وُجُودُالزَّادِ) هەبوونى خواردەمەنى‌و ئاوە (وَأَوْعِيَتِهِ) هەبوونى ئەو شتەيە: كە خواردەمەنى‌و ئاوى تێدا هەلّدەگيرێ، يان هەبوونى پارەى ئەوانەيەو (وَمُؤْنَةِ ذَهَابِهِ) هەبوونى ئەركى ڕۆيشتنە بۆ (مكة)و (وَإِيَابِهِ) هەبوونى ئەركى گەڕانەوەيەتى بۆ شارەكەى خۆى (وَقِيلَ) لە فەرموودەيەكى بێ‌هێزدا: (إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ بِبَلَدِهِ أَهْلٌ وَعَشِيرَةٌ) ئەگەر لە شارەكەى خۆيدا خێزان‌و خزم‌و كەسى نەبن (لَمْ تُشْتَرَطْ نَفَقَةُ الإِيَابِ) هەبوونى ئەركى گەڕانەوە بە مەرج دانانرێ.

(فَلَوْ) ئەگەر ئەركى خواردن‌و چوون‌و هاتنەوەى نەبو، بەلام (كَانَ يَكْتَسِبُ مَا) لە ڕێگەى حەجدا كەسابەتێكى وەهاى دەكرد: كە (يَفِي بِزَادِهِ) بەشى خواردن‌و ئەركەكانى‌ترى سەفەرى دەكرد: وەكو خزمەتكردن، يان باركردن، يان شوفێرى (وَسَفَرُهُ طَوِيلٌ) سەفەرەكەشى دوو قۆناغ، يان زياتر درێژ بوو (لَمْ يُكَلَّفِ الْحَجَّ) ئەوە داواى چوونە حەجى لێناكرێ، بەلام (وَإِنْ قَصُرَ) ئەگەر سەفەرەكەى لە دوو قۆناغ كورتتر بوو (وَهُوَ) ئەو كەسەش لە ڕێگەدا (يَكْتَسِبُ فِي يَوْمٍ) لە ڕۆژێكدا كەسابەتێكى وەهاى دەكرد: كە (كِفَايَةَ أَيَّامٍ) بەشى چەند ڕۆژێكى دەكرد (كُلِّفَ) ئەوە داواى چوونە حەجى لێدەكرێ‌و واجبە: بچێ حەج بكا.

(الثَّانِي) دووەم مەرجى‌توانين: (وُجُودُالرَّاحِلَةِ) هەبوونى وولاغ، يان شتێكى‌تر بۆ سوارى: بە ملكايەتى، يان بە كرێ (لِمَنْ) بۆ ئەو كەسەى كە (بَيْنَهُ وَبَيْنَ مَكَّةَ مَرْحَلَتَانِ) نێوان شوێنەكەى وى‌و (مكة)، دوو قۆناغ، يان زياتر بێ (فَإِنْ لَحِقَهُ بِالرَّاحِلَةِ مَشَقَّةٌ شَدِيدَةٌ) جا ئەگەر بە سوارى وولاغ ئازارێكى زۆرى تووش دەبو، ئەو كاتە (اُشْتُرِطَ وُجُودُ مَحْمِلٍ) بە مەرج داندراوە: دارهەلگرێك لە سەر پشتى وولاغەكە هەبێ تێيدا دابنيشێ‌و (وَاشْتُرِطَ) هەم بە مەرج داندراوە: (شَرِيكٌ) هاوڕێيەكى هەبێ (يَجْلِسُ فِي الشِّقِّ الآخَرِ) لە لايەكەى‌ترى

وَمَنْ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا دُونَ مَرْحَلَتَيْنِ وَهُوَ قَوِيٌّ عَلَىالْمَشْيِ يَلْزَمُـــهُ الْحَـــجُّ، فَـــإِنْ ضَـــعُفَ فَكَالْبَعِيد، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُ الزَّاد وَالرَّاحِلَة فَاضِلَيْنِ عَنْ دَيْنه وَمُؤْنَة مَنْ عَلَيْه نَفَقَتُهُمْ مُـــدَّةَ ذَهَابه وَإِيَابه، وَالأَصَحُّ اشْتِرَاطُ كَوْنه فَاضِلاً عَنْ مَسْكَنه وَعَبْد يَحْتَاجُ إِلَيْه لخدْمَته،

---

دارهەلگرەکـە دابنیشـێ، بـەڵام (وَمَـنْ بَيْنَـهُ وَبَيْنَهَـا دُونَ مَـرْحَلَتَيْنِ) هـەر کەسـێك نێـوان شوێنەکەی وی‌و (مكة) دوو قۆناغ کەمتر بوو (وَهُوَ قَوِيٌّ عَلَىالْمَشْيِ) ئـەو کەسـەش توانـای هەبوو: بە پێیان بڕوا (يَلْزَمُهُ الْحَجُّ) ئەوە حەجی لە سەر واجبە، بەڵام (فَإِنْ ضَعُفَ) ئەگـەر بێ‌هێز بوو توانای ڕۆیشتنی نەبو (فَكَالْبَعِيدِ) ئەوە وەکـو دووری (مكـة)یـەو مەرجـە: وولاغ، یان شتێکی‌تری سواری‌ی هەبێ.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەنـدرێ (كَوْنُ الـزَّادِ وَالرَّاحِلَـةِ) هـەبوونی خواردەمـەنی‌و وولاغەکـەی سواری‌و گشت ئەرکەکانی‌تر، یان هەبوونی پارەکەیان (فَاضِلَيْنِ) زیـاد بـن (عَـنْ دَيْنِـهِ) لـەو قەرزەی لە سـەریەتی، جیـاوازی نیـە قەرزەکـە: کـاتی دانـەوەی هاتبـێ، یـان نـا، کەواتـە: ئەگەر تەنها بـە ئەنـدازەی قەرزەکـە مـاڵی هـەبو، یـان زیـاتری هـەبو بـەڵام بەشـی چوونە حەج‌و هاتنەوەی نەدەکرد، ئەوە حەجی لە سەر واجب نیە، هەرچەند خـاوەن قەرزەکـەش ڕازی ببێ، هەروەك لە (المجموع)و(تحفة)دا فەرموویانە.

جـا بزانـە: ئەگـەر ئـەو قـەرزی لـە سـەر کەسـێکی‌تر هـەبو و بـۆی دەگونجـا ئێسـتا وەری بگرێتەوە، ئـەوە وەهـا بڕیـار دەدرێ: کـە ئـەو ماڵـەی لـە دەسـتی خۆی‌دایـە، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئـەوە لـەبارەی واجببوونی‌حـەج بـوو، بـەڵام ئەگـەر قەرزدارەکـە هـەبوویی بـێ‌و کـاتی قەرزدانـەوەی هاتبـێ، ئـەو کاتـە حەرامـە بـێ‌ئیزنی خـاوەن قەرزەکـەی بچێتە سـەفەری حـەج‌و جیهـاد‌و...هتـد، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا لـە باسـی(جِهـاد)دا فەرموویانە، واتە: حەجی دروست دەبێ، بەڵام گوناهبار دەبێ.

(وَمُؤْنَةِ مَنْ عَلَيْهِ نَفَقَتُهُمْ) هەروەها بـە مـەرج دادەنـدرێ: خواردەمـەنی‌و گشـت ئەرکـەکانی‌تری سـەفەری حـەج، زیـاد بـن لـە ئـەرکی بـەخێوکردنی ئـەو کەسـانەی بـەخێوکردنیانی لـە ئەستۆیەتی: وەك ژن‌و منداڵ‌و دایك‌و باوك‌و ئاژەڵـەکانی (مُدَّةَ ذَهَابِـهِ وَإِيَابِـهِ) لـەو ماوەیـەدا: کە دەڕواتە حەج‌و دەگەڕێتەوە، واتە: دروست نیە بڕواتە حەج، تـا ئـەرکی بـەخێوکردنی ئـەو ماوەیـە بـۆ گشـتیان بـەجێ دێڵـێ (وَالأَصَحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتتر: (اشْـتِرَاطُ كَوْنِـهِ فَاضِـلاً) مەرجە: ئەرکی چوونە حەج زیاد بێ (عَنْ مَسْـكَنِهِ) لـە شـوێنی تـێ‌دا نیشـتەجێ‌بوون‌و (وَعَبْـدٍ يَحْتَاجُ إِلَيْهِ لِخِدْمَتِهِ) لە کۆیلەیەك: کە پێویستی پێ‌ی هەبێ بۆ خزمەتکردنی خۆی.

ئینجا بزانە: ئەگەر خانووی نەبو، بەڵام تەنها بەشـی خانووێك پـارەی هـەبو، ئـەوە ئەگـەر بیـەوێ خـانوو بکـڕێ، حـەجی لـە سـەر واجـب نیـە، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا

وَأَنَّهُ يَلْزَمُهُ صَرْفُ مَالِ تِجَارَتِهِ إِلَيْهِمَا. اَلثَّالِثُ: أَمْنُ الطَّرِيقِ فَلَوْ خَافَ عَلَى نَفْسِهِ أَوْ مَالِهِ سَبُعاً أَوْ عَدُوّاً أَوْ رَصَدِيّاً وَلاَ طَرِيقَ سِوَاهُ لَمْ يَجِبِ الْحَجُّ، وَالأَظْهَرُ وُجُوبُ رُكُوبِ الْبَحْرِ إِنْ غَلَبَتِ السَّلاَمَةُ، وَأَنَّهُ يَلْزَمُهُ أُجْرَةُ الْبَذْرَقَةِ، وَيُشْتَرَطُ وُجُودُ الْمَاءِ وَالزَّادِ فِي الْمَوَاضِعِ الْمُعْتَادِ حَمْلُهُ مِنْهَا بِثَمَنِ الْمِثْلِ،

---

فەرموویانە، بەڵام ئەگەر خانووی نەدەکڕی، یان ئەگەر خانووش بکڕێ هەر لە خانووی بەکرێدا نیشتەجێ دەبو، ئەو کاتە بۆ ئەو کەسە مەرج نیە: پارەی حەج لە خانوو زیاد بێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی ڕاستتر: (يَلْزَمُهُ) لە سەر مرۆڤ واجبە: (صَرْفُ مَالِ تِجَارَتِهِ إِلَيْهِمَا) ماڵی بازرگانیەکەی سەرف بکا بۆ خواردەمەنی‌و ئەرکی ڕێگەی حەج، هەروەها واجبە باغ‌و زەمین‌و درەخت‌و ئەو جۆرە شتانەی پێیان دەژیێ، گشتی بفرۆشێ بۆ حەج کردن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

ئینجا بزانە: ئەگەر پیاو حەجی لە سەر بوو، لە هەمان کاتیشدا پێویستی بە ژن هەبو، ئەوە دروستە: ئێستا ژن بێنێ، بەڵام حەجی هەر لە ئەستۆدا دەمێنێ‌و واجبە: لەمەودوا حەج بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(اَلثَّالِثُ) سێیەم مەرجی‌توانین: (أَمْنُ الطَّرِيقِ) ڕێگەی حەج ئەمین بێ: دەربارەی ماڵ‌و گیان‌و ناموس، کەوابو: (فَلَوْ خَافَ عَلَى نَفْسِهِ) ئەگەر ترسا لە ڕێگەدا: گیانی، یان ئەندامێکی بفەوتێندرێ (أَوْ مَالِهِ) یان ترسا ماڵی لێبستێندرێ، یان ترسا ناموسی بشکێندرێ، جیاوازی نیە ئەوەی لێ‌ی‌دەترسێ: (سَبُعاً) درندەیەك بێ (أَوْ عَدُوّاً) یان دوژمنێك بێ: جا موسوڵمان بێ، یان کافر بێ (أَوْ رَصَدِيّاً) یان لە ڕێگرێك بترسێ لە ڕێگەدا بە زۆرداری ماڵی لێبستێنێ (وَلاَ طَرِيقَ سِوَاهُ) هیچ ڕێگەی‌تریش جگە لەو ڕێگەیە نەبو (لَمْ يَجِبِ الْحَجُّ) لەو حاڵەتانەدا حەجی لە سەر نیە.

(وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (وُجُوبُ رُكُوبِ الْبَحْرِ) واجبە: بۆ چوونە حەج سواری کەشتی‌دەریا ببێ (إِنْ غَلَبَتِ السَّلاَمَةُ) ئەگەر بە ئەغلەبی ڕێگەی ئەو دەریایە سەلامەت بێ‌و هیچ ڕێگەی‌تریش لە زەوی‌دا نەبێ (وَأَنَّهُ) هەر بە فەرموودەی بەهێزتر: (يَلْزَمُهُ) لە سەری واجبە: (أُجْرَةُالْبَذْرَقَةِ) کرێی پاسەوانی ڕێگە بدا، هەروەها واجبە: کرێی ئەو کەسەش بدا: کە لە ڕێگە شارەزای دەکا، واتە: ئەگەر پێویستی بە پاسەوان‌و شارەزاکەرەکە هەبێ.

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ واجببوونی حەج بە مەرج دادەندرێ (وُجُودُ الْمَاءِ وَالزَّادِ) ئاو و خواردەمەنی هەبێ (فِي الْمَوَاضِعِ الْمُعْتَادِ حَمْلُهُ مِنْهَا) لەو شوێنانەی کە عادەتە: ئاو و خواردەمەنی‌ی لێ بار دەکرێ (بِثَمَنِ الْمِثْلِ) بە پارەی هاووێنە ئاو و خواردەمەنیەکە دەست بکەوێ

وَهُوَ الْقَدْرُاللاَّئِقُ بِه في ذَلِكَ الزَّمَان وَالْمَكَان، وَعَلَف الدَّابَّة في كُـلِّ مَرْحَلَـةٍ، وَفـي الْمَرْأَة أَنْ يَخْرُجَ مَعَهَا زَوْجٌ أَوْ مَحْرَمٌ أَوْ نسْوَةٌ ثقَاتٌ، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ لاَيُشْـتَرَطُ وُجُـودُ مَحْرَمٍ لإِحْداهُنَّ، وَأَنَّهُ يَلْزَمُهَا أُجْرَةُالْمَحْرَمِ إِذَا لَمْ يَخْرُجْ إِلاَّ بهَا.

---

(وَهُوَ) پارەی هاوڕێنە (اَلْقَدْرُاللاَئِقُ بِـه) ئـەو ئەندازەیـە: کـە لـە ئاوەکـەو لـە خواردەمەنیەکـە دەوەشـێتەوە (فِـی ذَلِـكَ الزَّمَـانِ وَالْمَكَـانِ) لـەو کاتـەو لـەو شـوێنەدا، واتـە: هـەر چـەند نرخەکەشی لەو شوێنەدا زۆر گران بێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَعَلَـفِ الدَّابَّـةِ فِـی كُـلِّ مَرْحَلَـةٍ) هـەروەها مەرجـە: ئـالیکی وولاغیش لـە گشـت قۆناغێکدا دەسـت بکـەوێ، کەواتـە: ئێسـتاش مەرجـە: بـەنزینو گـازو گشـت پێویسـتیەکانیتری ئوتومبیل لە شوێنەعادەتیەکاندا دەست بکەون، وَاللهُ أَعْلَم.

## ﴿ مەرجی حەجی ئافرەت ﴾

(وَفِی الْمَرْأَةِ) دەربارەی واجببوونی حەج لە سەر ئافرەت بـە مـەرج دانـدراوە: (أَنْ يَخْـرُجَ مَعَهَـا زَوْجٌ) مێردەکەی لەگەڵیدا بڕواتە حەج (أَوْ مَحْرَمٌ) یان مـەحرەمێکیخۆی لەگـەڵیدا بـڕوا: کـە تەماشـاکردنی یـەکتریان حـەلاڵ بـێ: بـە هـۆی خزمایـەتی، یـان شـیرخواردن، یـان بـە زاواو خەزورایـەتی (أَوْ نِسْـوَةٌ) یـان سـێ ئـافرەت، یـان زیـاتر لەگـەڵیدا بڕۆنـە حـەج: کـە (ثِقَـاتٌ) ئافرەتـەکان بـاوەڕپێکراو بـن، واتـە: ئەگـەر یـەکێکی لـەو سـێ هاوڕێیانـە دەسـت کـەوت، حـەجی لـە سـەر واجبـە، ئەگـەر هیچیانی دەسـت نەکـەوت، حـەجی لـە سـەر واجـب نیـە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿لاَ تُسَـافِرُ امْـرَأَةٌ يَوْمَيْنِ إِلاَّ وَمَعَهَا زَوْجُهَا أَوْ ذُومَحْرَمٍ﴾رواه الشیخان، نابێ ئـافرەت دوو ڕۆژان بـۆ سـەفەر بڕوا، تەنها ئەگەر مێردەکەی، یان مەحرەمێکیخۆی لەگەڵیدا بێ.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ لاَ يُشْتَرَطُ وُجُودُ مَحْرَمٍ لإِحْدَاهُنَّ) بـە مـەرج دانانـدرێ: مەحرەمێك، یـان مێـردی ئافرەتێـك لـەو سێیانە لەگەڵدا بـێ (وَأَنَّـهُ) هـەر بـە فـەرموودەی ڕاسـتتر (يَلْزَمُهَـا) لـە سـەر ئـافرەت واجبـە (أُجْـرَةُ الْمَحْـرَمِ) کرێی مەحرەمەکـەی، یـان مێردەکـەی بـدا (إِذَا لَـمْ يَخْـرُجْ إِلاَّ بِهَـا) ئەگـەر مەحرەمەکـە، یـان مێردەکـەی لەگـەڵیدا نەدەچونە حەج تەنها بە کرێ نـەبێ، جـا ئەگـەر مەحرەمەکـە، یـان مێردەکـەی بـە کـرێش لەگەڵی نەدەچون، نابێ زۆریان لێبکرێ، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەکاندا فەرموویانـە، واتە: چونکە لە سەریان واجب نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوەیڕابردوو، گشتی دەربارەی واجببـوونی حـەج لـە سـەر ئـافرەت بـوو، بەڵام دەربارەی چوونە حـەج: بـۆ ئـافرەت دروسـتە لەگـەڵ تـەنها یـەك ئافرەتیشـدا بچێتە حەجی ڕوکنیئیسلام، یان نـەزرکراو، یـان قـەزاکراوە، بـەڵام بـۆ حەجیسوننەت–جگـە لـە

**اَلرَّابِعُ: أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ بِلاَ مَشَقَّةٍ شَدِيدَةٍ، وَعَلَى الأَعْمَى الْحَجُّ إِنْ وَجَدَ قَائِداً وَهُوَ كَالْمَحْرَمِ فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ، وَالْمَحْجُورُ عَلَيْهِ بِسَفَهٍ كَغَيْرِهِ لَكِنْ لاَ يُدْفَعُ الْمَالُ إِلَيْهِ، بَلْ يَخْرُجُ مَعَهُ الْوَلِيُّ**

---

مێردو مەحرەم- لەگەڵ کەسیتردا دروست نیە، هەرچەند سێ ئافرەتیش بن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

جا بزانە: حەرامە ژن بێئیزنی مێردەکەی بچێتە حەج، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: بۆ مێردەکەشی دروستە ئیزنی نەدا بچێتە حەج، جا ئەگەر بێئیزنی مێردەکەی چووە حەج، ئەوە حەجەکەی دروست دەبێ، بەلام گوناهبار دەبێو بۆ مێردەکەشی دروستە: ئیحرامی پێ بشکێنێ، هەروەك لە کۆتاییحەجدا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

هەروەها بۆ دایكو باوکیشی دروستە: ڕێگە نەدەن کوڕو کیژیان بچنە سەفەری حەجیسوننەت، بەلام لە حەجی ڕوکنیئیسلامو نەزرو قەزاکراوە، بۆیان دروست نیە ڕێگەیان لێبگرن، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(اَلرَّابِعُ) چوارەم مەرجیتوانین: (أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ) توانای هەبێ: لە سەر وولاغ، یان ئوتومبیل، یان فڕۆکە خۆی ڕابگرێ (بِلاَمَشَقَّةٍ شَدِيدَةٍ) بە بێئازارو ماندووبوونێکی بەهێز، واتە: ئەگەر ئەو توانینەی نەبو، ئەو کاتە واجبە: یەکێکیتر لەجیاتیخۆی بنێرێتە حەج، هەروەك لە جۆری دووەمدا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

(وَعَلَى الأَعْمَى الْحَجُّ) لە سەر کوێرە-کوێر واجبە: حەج بکا (إِنْ وَجَدَ قَائِداً) ئەگەر-لەگەڵ مەرجەکانیڕابردوودا-دەستکێشێکی دەست بکەوێ، لە ڕێگەو لە شوێنەکانی حەجدا دەستی ڕابکێشی (وَهُوَ) ئەو دەستکێشەیکوێرەکە (كَالْمَحْرَمِ فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ) وەکو مەحرەمەکەیە دەرهەق ئافرەتیڕابردوو، کەواتە: ئەگەر دەستکێشەکە دلوای کرێ بکا، مەرجە: کوێرەکە کرێیەکەی ئەویشی هەبێ، ئەوجا حەجی لە سەر واجب دەبێ.

هەروەها پەککەوتووش-کە هەر چوارپەلی نیە-مەرجە: یارمەتیدەرێکی هەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: ئەگەر کوێرەکە دەستکێشی دەست نەکەوتو ئەو پەککەوتووەش یارمەتیدەری دەست نەکەوت، ئەو کاتە: واجبە: یەکێکیتر لەجیاتی خۆیان بنێرنە حەج، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالْمَحْجُورُ عَلَيْهِ) ئەو کەسەی (حَجْر)ی لە سەر داندراوە، واتە: قەدەغە کراوە لە دەستکاری ماڵیخۆی (بِسَفَهٍ) بە هۆی ئەوەی ماڵیخۆی بە فیڕۆ دەدا (كَغَيْرِهِ) وەکو خەڵکیتر حەجی لە سەر واجب دەبێ (لَكِنْ لاَ يُدْفَعُ الْمَالُ إِلَيْهِ) بەلام بۆ حەج کردن ماڵەکەی نادرێتە دەستە خۆی (بَلْ يَخْرُجُ مَعَهُ الْوَلِيُّ) بەڵکو سەرپەرشتکارەکەی لەگەڵی

أَوْ يَنْصِبُ شَخْصاً لَهُ. اَلنَّوْعُ الثَّانِي: اِسْتِطَاعَةُ تَحْصِيلِهِ بِغَيْرِهِ، فَمَنْ مَاتَ وَفِي ذِمَّتِهِ حَــجٌّ وَجَبَ الإِحْجَاجُ عَنْهُ مِنْ تَرِكَتِهِ،

---

دەڕواتـە حـەج (أَوْ يَنْصِـبُ شَخْصَـاً لَـهُ) يـان مرۆڤێكـی بـاوەڕپێكراوی بـۆ دادەنـێ، تـاكو سەرپەرشتی‌ی بكا.

مەرجی‌پێنجەمی‌توانین: دەبی گشت ئەو مەرجانەی واجبـبوونی حـەج لـە (أَشْهُرُالْحَجِّ): مانگەكانی حەجدا هەبن، لە دوای هەبوونیشیان ئەوەندە ماوە بمێنێ: كـە بگونجـێ بڕواتـە حەج‌و فریای حەج كردن بكەوێ، كەواتە: ئەگەر لە ڕەمەزاندا توانـای حـەجی هـەبو، بـەڵام لە شەشەڵاندا ماڵەكەی فەوتا، یان بەخۆی مرد ئەوە حەجی لە سەر واجب نابێ.

هەروەها ئەگەر لە كاتی ڕۆیشتنی حاجیـەكانیش توانـای هـەبێ‌و نەچێتە حـەج، بـەڵام پـێش ئەوەی حاجیەكان–لە (مكة)–حەج تەواو بكەن، ئەو بەخۆی مـرد، یـان مـاڵی فـەوتا، دیسـان حەجی لە سەر واجب نابێ، بـەڵام ئەگـەر ئـەو نەچـووە حـەج‌و حاجیـەكان چـون‌و هاتنـەوە، ئینجا مرد، یان شێت بوو، یـان مـاڵی فـەوتا، یـان حاجیـەكان حـەجیان تـەواو كـردو هـەر لـە (مكة) بون‌و ئـەویش مـرد، لـەو حاڵەتانەشـدا حـەجی لـە سـەر واجـب دەبـێ‌و لـە ئەسـتۆی‌دا جێگیر دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و (فتاوى ابن حجر)دا ڕوون كراوەتەوە.

كەواتە: واجبە مردووەكە حەجی لەجیاتی بكرێ‌و ماڵفەوتاوەكەش كەسابەت بكا، تـاكو بـۆ حەج كردن ماڵ كۆبكاتـەوە، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئینجا بزانە: هەركاتێك مەرجـەكان هاتنـەجێ‌و حـەجی لـە سـەر واجـب بـوو، سـوننەتە: بـە پەلە حەجەكە بكاو لە ئەستۆی‌خۆی لابدا، هەروەها دروستیشـە سـاڵ بـە سـاڵ دوای بخـا، بەو مەرجەی نەترسێ ماڵی بفەوتێ، یـان پـەكی بكـەوێ، ئـەگینا: دروسـت نیـە دوای بخـا، ئینجا ئەگەر حەجی لە سەر واجب بوو و بۆی گونجـا حـەج بكـاو حەجەكـەی نـەكردو دوای خست، ئینجا مرد، یان پەكی كەوت، ئەوە لە ئـاخیر سـاڵەكانی بۆگونجانـەوە بـە گوناهبـار دادەندرێ، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ حەجی مرۆڤی مردوو و پەككەوتوو ﴾

(اَلنَّوْعُ الثَّانِي) جـۆری دووەمی‌تـوانین (اِسْتِطَاعَةُ تَحْصِـيلِهِ بِغَيْـرِهِ) تـوانینی وەدەسـتهێنانی حەج كردنە بە هۆی كەسێكی‌تر، جا ئەم جۆرە دوو كەسن:

یەكـەم: (فَمَنْ مَاتَ) هەر كەسێك مردبێ (وَفِي ذِمَّتِهِ حَجٌّ) پێش مردن حـەج، یـان عـومرەی لـە سـەر واجـب بوبـێ‌و لـە ئەسـتۆی‌دا جـێگیر بوبـێ: وەك لـە مانگـەكانی حەجـدا توانـای حـەج كردنی هەبوبێ‌و حەجی نـەكردبێ، ئینجـا لـە دوای حـەج كردنـی خـەڵك مردبـێ، یـان حـەجی نەزركراو، یان قەزای لە سـەر بوبـێ، ئـەوە (وَجَبَ الإِحْجَاجُ عَنْـهُ) واجبـە: حـەج‌و عـومرە لـە جیاتی ئەو مردووە بكرێ (مِنْ تَرِكَتِهِ) لە میراتەكەی، هەم واجبـە: حـەج كردنەكـەش وەپـێش

............

بەشکردنی میراتەکەو وەپێش قەرزدانەوەی ئادەمیزادان بێخرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهما: قَالَتْ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ أُمِّي نَذَرَتْ أَنْ تَحُجَّ فَلَمْ تَحُجَّ حَتَّى مَاتَتْ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ حُجِّي عَنْهَا، أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟ أُقْضُوا اللهَ فَاللهُ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ﴾ رواه البخاري، دایکم مردوەو حەجێکی نەزری لە سەر بوو، ئایا حەجەکەی لەجیاتی بکەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ حەجی لەجیاتی بکە، ئایا ئەگەر قەرزێکی ئادەمیزادانی لە سەربایە، قەرزەکەت بۆ دەدلوە؟ قەرزی خوا بدەنەوە، خوایگەورە لەپێشترە قەرزی بدرێتەوە.

ئینجا بزانە: ئەگەر ئەو مردووەی حەجی لە سەر واجب بووە، هیچ میراتی بەجێ نەهێشتبو، ئەو کاتە حەجی لە ئەستۆدا دەمێنێو لە سەر میراتگرەکەش واجب نیە حەجی بۆ بکا، بەڵکو سوننەتە، ئینجا هەر کاتێك میراتگرەکە بەخۆی حەج لەجیاتی مردووەکەی بکا، یان کەسێك بەکرێ بگرێ تاکو حەجی لەجیاتی بکا، یان بێگانەیەك-بە بێئیزن- بەخۆی حەجی لەجیاتی بکا، یان بە ماڵی خۆی کەسێك بە کرێ بگرێ تاکو حەجی لەجیاتی بکا، لە هەر چوار حاڵەتدا حەجەکە دروست دەبێو لە سەر مردووەکە لادەچێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر یەکێك حەجی لە سەر واجب نەبوبێو مردبێ، بۆ میراتگرەکەیو بۆ بێگانەش سوننەتە: یان حەجی لەجیاتی بکەن، یان یەکێك بەکرێ بگرن تاکو حەجی لەجیاتی بکا، جا ئەو بڕیارە دەربارەی حەجی ڕوکنیئیسلام بوو، چونکە-ئەگەر مردووەکە وەسێتی نەکردبێ- دروست نیە حەجیسوننەتی لەجیاتی بکرێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

بەڵام لە فەرموودەیەکی بێهێزدا: ئەگەر مردووەکە وەسێتیشی نەکردبێ، دروستە: میراتگرەکەیو هەم بێگانەیەکیش بە ئیزنیمیراتگرەکەی، حەجیسوننەتی لەجیاتی بکا، هەروەك لە(شرح المنهج)دا فەرموویەتی.

**پێناسە**: مەبەست بە حەجو عومرەی ڕوکنیئیسلام ئەوەیە: کە بۆ یەکەمجار لە تەمەنیا دەکرێن، هەرچەند لە سەریشی واجب نەبوبن، واتە: حەجو عومرەکەی یەکەمجار بۆی بە بەر ڕوکنیئیسلام دەکەوێ. بەڵام حەج و عومرەی سوننەت ئەوەیە: کە لە دوای حەجو عومرەی ڕوکنیئیسلام-بێنەزرکردن- دووبارە دەکرێن.

جا بزانە: ئەگەر وەسێتی کردو گوتی فڵانکەس بەوەندە پارەیە بنێرن حەجم بۆ بکا. ئەوە دروست نیە لەو ئەندازەیە کەمتری بدرێتێ، هەرچەند کەسێکیتریش هەبێ بە کەمتر حەجی بۆ بکا، بەڵام ئەگەر هیچ کەسێکی دیاری نەکردو تەنها گوتی بەوەندە پارەیە حەجم بۆ

وَالْمَعْضُوبُ الْعَاجِزُ عَنِ الْحَجِّ بِنَفْسِهِ إِنْ وَجَدَ أُجْرَةَ مَنْ يَحُجُّ عَنْهُ بِأُجْرَةِ الْمِثْلِ لَزِمَـهُ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهَا فَاضِلَةً عَنِ الْحَاجَاتِ الْمَذْكُورَةِ فِيمَنْ حَجَّ بِنَفْسِهِ،

---

بكەن. ئینجا كەسێكیان دەست كەوت بە كەمتر لەو ئەندازەیە حەجی بۆ دەكرد، ئەو كاتە دروستە بە كەمتر بە كرێی بگرنو پاشماوەكەش بۆ میراتگرەكان دەگەڕێتەوە.

دیسان بزانە: ئەگەر وەسیّتكەرەكە لە وەسیّتەكەیدا یەكێكی دیاریكرد حەجێ بۆ بكا، ئینجا دیاركراوەكەش ڕەدی كردەوەو گوتی: هەرگیز حەجی بۆ ناكەم. ئەو كاتە واجبە یەكێكیتری بۆ بەكرێ بگرن تاكو حەجی بۆ بكا، بەلاّم ئەگەر دیاركراوەكە گوتی: ئەم ساڵ ناتوانمو لە دوای ساڵێكیتر حەجی بۆ دەكەم. ئەو كاتە تەماشا دەكەین: ئەگەر لە ژیانیا حەجی لە سەر واجب بوبێو بە هۆی كەمتەرخەمی حەجی نەكردبێ، ئەو كاتە واجبە: یەكێكیتری بۆ بەكرێ بگرن تاكو ئەم ساڵ حەجی بۆ بكا، بەلاّم ئەگەر حەجی لە سەر واجب نەبوبێ، ئەو كاتە دوا دێخرێ تاكو دیاركراوەكەیخۆی حەجی بۆ بكا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا لە (باسی وەسیّت) ئەم باسە ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ حەجی مرۆڤی پەككەوتوو ﴾

دووەم: (وَالْمَعْضُوبُ) پەككەوتوو (الْعَاجِزُ عَنِ الْحَجِّ بِنَفْسِهِ) كە توانای نەبێ: بە خۆی بڕواتە حەجو حەج بكا؟ چونكە دەردێكی بەردەوامی پێوەیەو تا مردن چاك نابێتەوە: وەك شەلەپەتەییو پیریو نەخۆشیەكی وەها: چاوەڕوانی چاكبوونەوەی نەكرێ، ئەو جۆرە كەسە (إِنْ وَجَدَ أُجْرَةَ مَنْ يَحُجُّ عَنْهُ) ئەگەر كرێی كەسێكی دەست بكەوێ: كە حەجیواجبی لەجیاتی بكا (بِأُجْرَةِالْمِثْلِ) بە كرێی هاوێنە، یان كەمتر (لَزِمَهُ) واجبە: كەسێك بنێرێتە حەج، تاكو حەجیواجبی لەجیاتی بكا، جا بەو حەج كردنە حەجە واجبەكەی لە سەر لادەچێ، جیاوازی حەجی ڕوكنیئیسلامو نەزرو قەزا نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

جا بزانە: ئەو كەسەی حەج لەجیاتی مردوو و پەككەوتوو دەكا، مەرج نیە –لە نێرایەتیو مێیایەتیدا– لەگەڵ ئەوان یەكسان بێ، هەروەك لە (الشروانی)دا فەرموویەتی ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَتْ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلَى عِبَادِهِ فِي الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَيْخاً كَبِيراً لاَ يَثْبُتُ عَلَى الرَّاحِلَةِ، أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ نَعَمْ. وَذَلِكَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ﴾ رواه الشیخان، لە (حجةالوداع)دا ئافرەتێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، باوكم حەجی لە سەر واجب بووەو زۆریش پیرە، خۆی لە سەر وولاغ ڕاناگرێ، ئایا حەجی لەجیاتی بكەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. واتە: حەجیواجب لەجیاتی باوكت بكە.

(وَيُشْتَرَطُ) بە مەرج دادەندرێ: (كَوْنُهَا فَاضِلَةً) ئەو كرێیە هاوێنەیەیڕابردوو، زیاد بێ (عَنِ الْحَاجَاتِ الْمَذْكُورَةِ) لەو پێویستیانەی باس كران (فِيمَنْ حَجَّ بِنَفْسِهِ) لە باسی ئەو

لَكِنْ لاَ يُشْتَرَطُ نَفَقَةُ الْعِيَالِ ذَهَاباً وَإِيَاباً، وَلَوْ بَذَلَ وَلَدُهُ أَوْ أَجْنَبِيٌّ مَالاً لِلأُجْرَةِ لَمْ يَجِبْ قَبُولُهُ فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ بَذَلَ الْوَلَدُ الطَّاعَةَ وَجَبَ قَبُولُهُ، وَكَذَا الأَجْنَبِيُّ فِي الأَصَحِّ.

---

کەسەدا: کە بەخۆی حەجی دەکرد: وەك قەرزو شوێنی نیشتەجێبوون (لَكِنْ لاَ يُشْتَرَطُ) بەڵام بە مەرج دانانرێ (نَفَقَةُالْعِيَالِ) کرێیەکە زیاد بێ لە ئەرکی بەخێوکردنی خێزان‌و منداڵەکانی (ذَهَاباً وَإِيَاباً) لە ماوەی چوونەحەج‌و هاتنەوەدا، چونکە پەککەوتووەکە بەخۆی ناڕوا، بەڵکو لەگەڵ خێزانەکەیدا دەمێنێتەوەو بە چەند ڕێگایەك دەتوانێ بەخێویان بکا.

(وَلَوْ بَذَلَ وَلَدُهُ) ئەگەر کوڕێکیخۆی، یان کیژێکیخۆی ماڵیان دایێ (أَوْ أَجْنَبِيٌّ مَالاً) یان بێگانەیەك ماڵی دایێ (لِلأُجْرَةِ) تاکو یەکێکی پێ بەکرێ بگرێ بۆ ئەوەی حەجیواجبی لەجیاتی بکا (لَمْ يَجِبْ قَبُولُهُ) واجب نیە: پەککەوتووەکە قبوڵی بکاو لێیان وەربگرێ (فی الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە منەتباریی تێدایە.

بەڵام (وَلَوْ بَذَلَ الْوَلَدُ الطَّاعَةَ) ئەگەر کوڕەکەی، یان کیژەکەی گوێڕایەڵیخۆی دایێ، واتە: بەخۆی بچێ حەجی واجبی لەجیاتی بکا (وَجَبَ قَبُولُهُ) واجبە: پەککەوتووەکە قبوڵی بکاو ئیزنی بدا حەجی واجبی لەجیاتی بکا.

(وكَذَا الأَجْنَبِيُّ) هەروەها بێگانەش ئەگەر بچێ حەجیواجبی لە جیاتی بکا، واجبە: قبوڵی بکاو ئیزنی بدا (فیالأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستردا، چونکە منەتباریەکەی زۆر نیە.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر پەککەوتووەکە حەجیشی لە سەر واجب نەبوبێ، هەر بۆی دروستە جێگرێك دابنێ–بە کرێ، یان بە خۆڕایی– تاکو حەجی ڕوکنیئیسلامی لەجیاتی بکا، هەم بۆ ئەوەش حەجێکیسوننەت، یان دوو، یان زیاتریشی لەجیاتی بکا، هەروەك لە (المجموع)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ پاشکۆ: دەربارەی حەج کردن لە جیاتی کەسێکیتر ﴾

پێشەکی بزانە: حەج‌و عومرە–واجب بێ، یان سوننەت بێ–جگە لە مردوو و پەککەوتوو، لەجیاتی هیچ کەسێکیتریتوانا دروست نیە، هەروەك لە (ابن قاسم)و (الشروانی)دا فەرموویانە، جا حەج‌و عومرەی لەجیاتیکەسێکیتر بەگوێرەی ئەم ڕوونکردنەوەیە:

یەکەم: ئەو کەسەی لەجیاتی کەسێکیتری مردوو، یان پەککەوتوو، حەج‌و عومرە دەکا –بە کرێ، یان بە خۆڕایی– مەرجە: بۆ خۆی حەجی ڕوکنیئیسلامی کردبێ‌و هیچ حەجی نەزرو قەزای لە سەر نەبێ، کەواتە: ئەگەر بۆ خۆی حەجی ڕوکنیئیسلامی نەکردبو، یان حەجی نەزر، یان حەجی قەزای لە سەر بوو، ئینجا لەجیاتی کەسێکیتر ئیحرامی حەجی بەست، ئەو ئیحرامە بۆ خۆی دادەبەسترێ‌و حەجەکە بۆ خۆی دەبێ‌و نابێتە حەجی

مردووەکە، یان پەککەوتووەکە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی. ﴿عَنْ ابـنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهما: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يَقُولُ: لَبَّيْكَ عَنْ شُبْرُمَةَ. قَالَ: مَنْ شُبْرُمَةُ؟ قَالَ: أَخٌ لِي أَوْ قَرِيبٌ. قَالَ: حَجَجْتَ عَنْ نَفْسِكَ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: حُجَّ عَنْ نَفْسِكَ، ثُمَّ حُجّ عَنْ شُبْرُمَةَ﴾رواه ابوداود باسنادصحيح على شرط مسلم، پیاوێك دەیگوت: (لَبَّيْكَ) لەجیاتی (شُبْرُمَةَ). پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (شُبْرُمَةَ) کێیە؟ گوتی: برایەکی خۆمە، یان خزمێکمە. فەرمووی: بۆ خۆت حەجت کردوە؟ گوتی: نا. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بۆ خۆت حەج بکە، ئینجا لەجیاتی (شُبْرُمَةَ) حەج بکە.

دووەم: مرۆڤی شێت وەکو پەککەوتوو نیە، کەواتە: ئەگەر کەسێك حەجی لە سەر واجب بوو و حەجی نەکرد، ئینجا شێت بوو، دروست نیە حەجی لەجیاتی بکرێ، چونکە لە چاکبوونەوەی بێئومێد نین، کەوابو: هەر کاتێك شێتەکە مرد حەجی لەجیاتی دەکرێ، هەروەها گشت نەخۆش‌و بێهێزێك کە لە چاکبوونەوەی بێئومێد نەبێن، ئەویش وەکو شێت بڕیاری‌ڕابردووی بۆ دەدرێ‌و نابێ حەجی لەجیاتی بکرێ.

سێیەم: ئەگەر پەککەوتووەکە حەجی لەجیاتی کرا، ئینجا شیفای هات‌و چاك بۆوە، ئەو حەجە بۆ پەککەوتووەکە دروست نابێ‌و واجبە: بەخۆی حەج بۆ خۆی بکا، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ بەکرێگرتن بۆ حەج و عومرە ﴾

ئینجا بزانە: بەکرێگرتن بۆ حەج کردن لەجیاتی پەککەوتوو، یان مردوو، دوو جۆرە:

یەکەم: بەکرێگرتنی لە ئەستۆ، وەك بڵێ: بە ئەوەندە کرێیە خستمە ئەستۆت حەجێك بۆ من، یان بۆ ئەو مردووە بکەی.

دووەم: بەکرێگرتنی خودی‌بەکرێگیراوەکە، وەك بڵێ: بە ئەوەندە کرێیە تۆم بە کرێ گرت بەخۆت حەجم لەجیاتی بکەی، یان بەخۆت حەج لەجیاتی ئەو مردووە بکەی.

ئینجا ئێمە لێرەدا ئەو جۆرەی دووەم ڕوون دەکەینەوە، چونکە زیاتر ڕوو دەدا، کەوابو: مەرجە: بەکرێگرتنی خودی‌بەکرێگیراوەکە لەو ساڵەدابێ: کە حەجی تێدا دەکا، ئینجا ئەگەر بەکرێگیراوەکە لە شاری (مکة)دا بوو، مەرجە: بەکرێگرتنەکە لە (أشْهُرالْحَج): مانگەکانی حەجدا بێ، واتە: لە (مکة)ی پیرۆزدا لە پێش (أشْهُرالْحَج)دا بەکرێگرتنەکە دروست نابێ.

بەڵام ئەگەر لە شوێنەکانی‌تری جگە لە (مکة)دا بوو، ئەوە مەرجە بەکرێگرتنەکە لەو کاتەدابێ: کە خەڵکەکە خۆیان بۆ سەفەری حەج ئامادە دەکەن، واتە: پێش ئەو کاتەدا بەکرێگرتنەکە دروست نابێ، هەروەك لە(المجموع)دا ڕوونی کردۆتەوە.

ئینجا بزانە: مەرجە: بەکرێگرەکەو بەکرێگیراوەکە کردارەکانی حەج بزانن، بەڵام مەرج نیە: (میقات)، واتە: شوێنی ئیحرام لێبەستن دیاری بکەن، چونکە هەر کەسێك-بە خۆڕایی، یان بە کرێ- حەج لەجیاتی کەسێکیتر بکا، واجبە: لە (میقات)ێکی شەرعیدا ئیحرام ببەستێ.

هەروەها مەرجە: بەکرێگیراوەکە گشت کردارەکانی حەج بەخۆی بکا، واتە: دروست نیە جێگرێك-بۆ کردارەکانی حەج- لە جێی خۆی دابنێ.

ئینجا ئەگەر لە ساڵی بەکرێگرتندا بەکرێگیراوەکە حەجی نەکرد، ئەوە بەکرێگرتنەکە هەڵدەوەشێتەوە، واتە: واجبە کرێیەکە بگەڕێنێتەوە، جیاوازی نیە: عوزری هەبوبێ، یان نا.

جا بزانە: ئەگەر بە هۆی مەرجێکی ناشەرعی بەکرێگرتنەکە دروست نەبوبێ، یان کرێیەکە ناشەرعی بوبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەکرێگیراوەکە حەجەکەی بە تەواوی کرد، ئەوە حەجەکە-بۆ پەککەوتووەکە، یان بۆ مردووەکە- دروست دەبێ، بەکرێگیراوەکەش مافی کرێی هاوێنەی هەیەو واجبە بیدرێتێ، هەروەك لە (المجموع)دا روون کراوەتەوە.

## ﴿ مردنی حاجی لە حاڵەتی حەج کردندا ﴾

ئەگەر ئەو کەسەی بۆ خۆی حەج دەکا، لە حاڵەتی حەج کردندا مرد، ئەوە حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەو بەشەی کردویەتی خێری بۆ دەنووسرێ، کەوابو: دروست نیە یەکێکیتر حەجەکەی بۆ تەواو بکا، چونکە حەج بە دوو کەسان تەواو ناکرێ، هەروەك نوێژو ڕۆژووش بە دوو کەسان تەواو ناکرێن، کەوابو: ئەگەر حەجی لە ئەستۆدا جێگیر بوبێ، واجبە: لە میراتەکەی لە سەرەتاوە حەجی بۆ بکرێ، بەڵام ئەگەر حەجی لە ئەستۆدا نەبو، یان حەجەکەی سوننەت بوو، واجب نیە: حەجی بۆ بکرێ.

ئینجا بزانە: لەو حەجەشدا کە لەجیاتی مردوو، یان پەککەوتوو دەکرێ، مەرجە: تەنها یەك کەس تەواوی حەجەکە بکاو دروست نیە: بە دوو کەسان، یان زیاتر حەجەکە بکرێ، کەوابو: ئەگەر بەکرێگیراوەکە مرد، ئەوە سێ حاڵەتی هەنە:

یەکەم: پێش ئیحرامبەستن-لە ڕێگەدا-بمرێ، ئەوە هیچ کرێی نادرێتێ، چونکە هیچ کردارێکی حەجی نەکردوە.

دووەم: لە دوای تەواوبوونی ڕوکنەکانی حەج بمرێ، ئەوە حەجەکە دروست دەبێو خوێنی ئەو واجبانەی ماون لە ماڵی بەکرێگیراوەکە دەدرێ.

سێیەم: لە دوای دەست پێکردنی ڕوکنەکانو پێش تەواوکردنیان بمرێ، ئەوە بەکرێگرتنەکە هەڵدەوەشێتەوەو دروستیش نیە: یەکێکیتر ئەو حەجە تەواو بکا، بەڵام بەکرێگیراوەکە مافی بەشە کرێی ئەو کردارانەی هەیە: کە پێش مردن کردونی.

(بابُ الْـمَـــواقـــيت)

وَقْتُ إِحْرَامِ الْحَجِّ: شَوَّالٌ وَذُوالْقَعدَة وَعَشْرُ لَيالٍ مِنْ ذِى‌الْحِجَّة، وَفِى لَيْلَةِالنَّحْرِ وَجْــهٌ، فَلَوْ أَحْرَمَ بِهِ فِى غَيْرِ وَقْتِه انْعَقَدَ عُمْرَةً عَلَى‌الصَّحِيحِ، وَجَمِيعُ السَّنَةِ وَقْتٌ لِإِحْرَامِ الْعُمْرَةِ،

---

ئینجا بزانه: جگه له (المجموع)، بەشێکی ئەم پاشکۆیه له‌(نهایة)و (مغنی)و (القلیوبي)و (بغیة)ش وەرگیراوه، وَاللهُ أَعْلَم.

﴿ بابُ الْمَواقِیت: باسی کات و شوێنەکانی ئیحرامبەستن ﴾

(وَقْتُ إِحْرَامِ الْحَجِّ) کاتی ئیحرامبەستن به حەج: هەردوو مانگەکەی (شَوَّالٌ وَذُوالْقِعدَة)یە، هەم (وَعَشْرُ لَيالٍ مِنْ ذِى‌الْحِجَّةِ) دە شەویش له سەرەتای(ذی‌الحجة)وە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿اَلْحَجُّ أَشْهُرٌمَعْلُومَاتٌ﴾ کاتی ئیحرامی حەج چەند مانگێکی زانداروان. هەروەها (ابن عمر رَضِيَ‌اللهُ عَنْهُما) دەفەرموێ: ﴿أَشْهُرُالْحَجِّ: شَوَّالٌ وَذُوالْقَعدَةِ وَعَشْرٌ مِــنْ ذِى‌الْحِجَّـــةِ﴾ رواه البخاري، مانگەکانی حەج: (شوّال)و (ذوالقعدة)و دە شەوی(ذی‌الحجة)یە.

(وَفِى لَيْلَـةِالنَّحْرِ وَجْـهٌ) دەربارەی شەوی جەژنی قوربان فەرموودەیەکی بێ‌هێز هەیە: کە ئیحرامی‌حەجی تێدا دروست نەبێ. بەڵام به فەرموودەکەی (ابن عمر)ی‌رابردوو ڕەد کراوەتەوه، کەوابو: لەو دوو مانگو دە شەوەدا، هەر کاتێك ئیحرام به حەج ببەستێ ئەوە ئیحرامەکەی به حەج دادەبەسترێ، بەڵام (فَلَوْ أَحْرَمَ بِهِ) ئەگەر ئیحرامی به حەج بەست (فِى غَيْرِ وَقْتِهِ) له مانگێکی‌تری جگه له مانگەکانی حەج، ئەوە ئیحرامەکەی به حەج دانابەسترێ، بەڵکو (انْعَقَدَ عُمْرَةً) ئیحرامەکەی به عومرە دادەبەسترێو به بەر عومرەی ڕوکنی‌ئیسلامیش دەکەوێ (علی‌الصَّحِيحِ) له سەر فەرموودەی ڕاست.

﴿ دوو عومرە و زیاتر له مانگێکدا ﴾

(وَجَمِيعُ السَّنَةِ) هەموو کاتەکانی ساڵ (وَقْتٌ لِإِحْرَامِ الْعُمْرَةِ) کاتی ئیحرامی عومرەیە، واتە: ئیحرامبەستن به عومرە له مانگەکانی حەجداو له مانگەکانی‌تریشدا دروست دەبێ، چونکه پێغەمبەرﷺ له مانگەکانی حەجدا عومرەی کردوه، هەروەك له (بخاری‌و مسلم)دا گێردراوەتەوه. هەم دەشفەرموێ: ﴿عُمْرَةٌ فِى رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً مَعِــى﴾ رواه الشيخان، عومرەیەك له ڕەمەزاندا وەك حەج کردنێکه لەگەڵ مندا.

ئینجا بزانه: له یەك ساڵدا تەنها یەك حەج دەکرێ، واتە: دوو حەج دروست نابن‌و ناکرێن، بەڵام دوو عومرەو زیاتریش له ساڵێکدا، یان له مانگێکدا، یان له ڕۆژێکدا دەکرێن، بەڵکو سوننەتە: زۆر عومرە بکا، به تایبەتی له ڕەمەزاندا، به بەڵگەی حەدیسەکەی‌رابردوو و هەم ﴿عَن عائشَةَ رضي‌الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّﷺ قالَ لَها يَوْمَ النَّفْرِ: يَسَعُكِ طَوافُــكِ لِحَجِّــكِ وَعُمْرَتِــكِ، فَأَبَتْ، فَبَعَثَ بِها مَعَ عَبْدِالرَّحْمنِ بنِ أَبِي‌بَكْرٍ رضي‌الله عنهما إِلَى‌التَّنْعِيمِ فَاعْتَمَرَتْ مِنْها بَعْــدَ الْحَــجِّ﴾

وَالْمِيقَاتُ الْمَكَانِيُّ لِلْحَجِّ فِي حَقِّ مَنْ بِمَكَّةَ نَفْسُ مَكَّةَ، وَقِيلَ كُلُّ الْحَرَمِ،

رواه مسلم، وَفِي رِوايَةٍ لَهُ: ﴿قالَ لَها النَّبِيُّ ﷺ: هَذِهِ مَكَانُ عُمْرَتِكِ﴾. حەزرەتی (عائشة) ئیحرامی بە حەج‌وعومرەی وێکرا بەستبو، جا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: تەوافەکەت بۆ حەج‌وعومرەکەت وێکرا دەبێ، جا حەزرەتی (عائشة)ش بە عومرەکەی گەڵ حەج دڵی خۆش نەبو، بۆیێ پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا (عبدالرحمن)ی برای(عائشة): لەگەڵ خۆیا بردیە (التَّنْعِيم)و لەوێ ئیحرامی بە عومرەیەکی‌تر بەست، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەم عومرەیەش لە شوێن ئەو عومرەیە کە دەتویست بە تەنهایی بیکەی. واتە: حەزرەتی (عائشة) لە یەك مانگدا دوو عومرەی کردن.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەو کەسەی خەریکی حەج کردنە تا ڕەجمی شەیتانەکان تەواو نەکاو لە (مِنَی) نەڕواتە دەرەوە، دروست نیە ئیحرامی عومرە ببەستێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، جا بزانە: عومرە خێری گەورەترە لە تەواف –لە سەر فەرموودەی بەهێزتر– ئەگەر کاتەکانیان یەکسان بێ، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

## ﴿ شوێنەکانی ئیحرامبەستن ﴾

(وَالْمِيقَاتُ الْمَكَانِيُّ لِلْحَجِّ) شوێنی ئیحرامبەستنی حەج (فِي حَقِّ مَنْ بِمَكَّةَ) دەرهەق ئەو کەسەی لە ناو شاری (مكة)یە (نَفْسُ مَكَّةَ) خودی شاری (مكة)یە، جیاوازی نیە: خەڵکی (مكة) بێ، یان ڕێبوار بێ‌و لە (مكة)دا دڵی بێتە سەر حەج کردن‌و بیەوێ ئیحرام ببەستێ، کەواتە: وەها خێرترە: لە دەرگەی خانووەکەی خۆیەوە ئیحرام ببەستێ، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراونەوە.

(وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (كُلُّ الْحَرَمِ) گشت (حَرَمِ مَكَّةَ) شوێنی ئیحرامی‌حەجە، بەڵام فەرموودەی‌یەکەم بەهێزترە، چونکە لە حەدیسەکەدا دەفەرموێ: ﴿حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ﴾رواه الشيخان، دانیشتووانی (مكة) لە (مكة)وە ئیحرام دەبەستن.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەوە دەربارەی ئەو کەسە بوو: کە بۆ خۆی حەج دەکا، بەڵام ئەگەر دانیشتووێکی شاری(مكة) لەجیاتی کەسێکی‌تری دەرەوەی(مكة) حەج بکا –بە کرێ، یان بە خۆڕایی– ئەوە لە فەرموودەی بەهێزتردا واجبە: بۆ ئیحرامبەستنی حەج‌و عومرە بڕواتە دەرەوەی(مكة)و لە (میقات)ێکی شەرعی‌دا ئیحرامی حەج، یان عومرە ببەستێ، ئەگینا: خوێنی دەکەوێتە سەر، بەڵام لە فەرموودەکەی‌تردا –کە کۆمەڵە زانایەکی‌پێشوو ڕەفتاریان پێ‌کردوەو ئیمام(الجمال الطبري) بە بەهێزی داناوە– دروستە: لە ناو شاری (مكة)دا ئیحرامی حەج ببەستێ‌و بۆ ئیحرامی‌عومرەش بڕواتە دەرەوەی (حَرَمِ مَكَّةَ)، خوێنیشی ناکەوێتە سەر، جا دروستە: (تَقْلِيد)ی ئەو فەرموودە دووەمە بکرێ‌و ڕەفتاری

وَأَمَّا غَيْرُهُ فَمِيقَاتُ الْمُتَوَجِّهِ مِنَ الْمَدِينَةِ ذُوالْحُلَيْفَةِ، وَمِنَ الشَّامِ وَمِصْرَ وَالْمَغْرِبِ اَلْجُحْفَةُ، وَمِنْ تِهَامَةِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمُ، وَمِنْ نَجْدِالْيَمَنِ وَنَجْدِالْحِجَازِ قَرْنٌ، وَمِنَ الْمَشْرِقِ ذَاتُ عِرْقٍ، وَالأَفْضَلُ أَنْ يُحْرِمَ مِنْ أَوَّلِ الْمِيقَاتِ، وَيَجُوزُ مِنْ آخِرِهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً لاَ يَنْتَهِي إِلَى مِيقَاتٍ

---

پێبكرێ، جیاوازیش نیه دانیشتووەكەی(مكة): خەڵكی(مكة)بێ، یان ڕێبواربێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَأَمَّا غَيْرُهُ) بەڵام ئەو كەسانەی لە ناو شاری (مكة)دا نینە، پێنج (میقات)ی شەرعیان بۆ داندراون: (فَمِيقَاتُ الْمُتَوَجِّهِ مِنَ الْمَدِينَةِ) شوێنی ئیحرامبەستنی ئەو كەسەی لە (مدینة)ی پیرۆزەوە دێ: (ذُوالْحُلَيْفَةِ)یە، كە پێی دەگوترێ: (بیریعەلی)، لە نزیك (مدینة)یەو لە گشت (میقات)ێكیتر لە (مكة) دوورترە (وَمِنَ الشَّامِ وَمِصْرَ وَالْمَغْرِبِ) ئەوانەی لە شامو میسرو مەغریبەوە دێن، شوێنی ئیحرامبەستنیان: (اَلْجُحْفَةُ)یە، (وَمِنْ تِهَامَةِالْيَمَنِ) ئەوەی لە لای نەوییایییەمەنەوە دێ، شوێنی ئیحرامبەستنی: (يَلَمْلَمَ)ە، (وَمِنْ نَجْدِالْيَمَنِ وَنَجْدِ الْحِجَازِ) ئەوانەی لە بڵندایییەكانی یەمەنو حیجازەوە دێن، شوێنی ئیحرامبەستنیان: (قَرْنٌ) چیای (قَرْنُ الْمَنَازِلِ)ە، (وَمِنَ الْمَشْرِقِ) ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتەوەش دێ: وەك عێراق، یان ئێران، شوێنی ئیحرامبەستنی: (ذَاتُ عِرْقٍ)ە، كە لە دوای گەڵی(الْعَقِيق)ە.

﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: وَقَّتَ النَّبِيُّ ﷺ لأَهْلِ الْمَشْرِقِ اَلْعَقِيقَ﴾رواه ابوداود بسند حسن، پێغەمبەرﷺ بۆ ئیحرامبەستنی ڕۆژهەڵاتیەكان (العقيق)ی داناوە.

هەروەها ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسرَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَاالْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ اَلْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ، وَقَالَ: هُنَّ لَهُمْ وَلِكُلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ﴾رواه الشيخان واصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ ئەو میقاتانەیڕابردووی دیاریكردنو فەرمووی: ئەوانە شوێنی ئیحرامبەستنن بۆ دانیشتووانی ئەو وڵاتانەو هەم بۆ ئەو كەسانەی كە بەو ڕێگایانەدا دێنو دەیانەوێ حەج، یان عومرە بكەن، هەر كەسێكیش دانیشتووی شوێنێكی نێوان (میقات)و (مكة) بێ، هەر لە شوێنەكەی خۆیەوە ئیحرام دەبەستێ، تا دانیشتووانی (مكة) هەر لە (مكة)وە ئیحرام دەبەستن.

(وَالأَفْضَلُ) وەها خێرترە (أَنْ يُحْرِمَ مِنْ أَوَّلِ الْمِيقَاتِ) لە سەرەتای(میقات)ەوە ئیحرام ببەستێ (وَيَجُوزُ مِنْ آخِرِهِ) دروستە: لە كۆتایی(میقات)ش ئیحرام ببەستێ.

(وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً) هەر كەسێك بۆ چوونە حەج بە ڕێگەیەكی وەهادا ڕۆیشت: كە (لاَ يَنْتَهِي إِلَى مِيقَاتٍ) نە دەگەیشتە هیچ (میقات)ێك، چونكە هیچ (میقات)ێكیڕابردوو لەو ڕێگەیەدا

فَإِنْ حَاذَى مِيقَاتاً أَحْرَمَ مِنْ مُحَاذَاتِه أَوْ مِيقَاتَيْنِ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ يُحْرِمُ مِنْ مُحَاذَاةِ أَبْعَدِهِمَا، وَإِنْ لَمْ يُحَاذِ أَحْرَمَ عَلَى مَرْحَلَتَيْنِ مِنْ مَكَّةَ، وَمَنْ مَسْكَنُهُ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمِيقَاتِ فَمِيقَاتُهُ مَسْكَنُهُ، وَمَنْ بَلَغَ مِيقَاتاً غَيْرَ مُرِيدٍ نُسُكاً ثُمَّ أَرَادَهُ فَمِيقَاتُهُ مَوْضِعُهُ، وَإِنْ بَلَغَهُ مُرِيداً لَمْ تَجُزْ مُجَاوَزَتُهُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ، فَإِنْ فَعَلَ لَزِمَهُ الْعَوْدُ لِيُحْرِمَ مِنْهُ

---

نەبو، ئەوە (فَإِنْ حَاذَى مِيقَاتاً) ئەگەر لە لای ڕاستەی، یان چەپەی بەرامبەر (میقات)ێك دەبو، ئەوە (أَحْرَمَ مِنْ مُحَاذَاتِه) لە بەرامبەر (میقات)ەکەوە ئیحرام دەبەستێ.
(أَوْ مِيقَاتَيْنِ) یان بەرامبەر دوو (میقات) دەبو، چونکە لە نێوانیاندا دەڕۆیشت، ئەوە (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر (أَنَّهُ يُحْرِمُ مِنْ مُحَاذَاةِ أَبْعَدِهِمَا) لە بەرامبەر دوورترەکەیانەوە ئیحرام دەبەستێ (وَإِنْ لَمْ يُحَاذِ) ئەگەر بەرامبەر هیچ (میقات)ێك نەدەبو، ئەوە (أَحْرَمَ عَلَى مَرْحَلَتَيْنِ مِنْ مَكَّةَ) ئیحرام دەبەستێ لە شوێنێکی وەهاوە: کە دوو قۆناغ=(٨٠) هەشتا کیلۆمەتر بمێنێ بۆ (مكة)، چونکە هیچ (میقات)ێك لە دوو قۆناغ کورتتر نیە.
(وَمَنْ مَسْكَنُهُ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمِيقَاتِ) هەر کەسێك شوێنی نیشتەجێبوونی لە نێوان (مكة)و (میقات)دا بوو (فَمِيقَاتُهُ مَسْكَنُهُ) ئەوە شوێنی ئیحرامبەستنی وی شوێنی نیشتەجێبوونیەتی، جیاوازی نیە: ڕەشماڵ بێ، یان دێ بێ، یان تاکە ماڵ بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی﴿وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ﴾ی ڕابردوو.

### ﴿ سزای تێپەڕبوون بە سەر شوێنی ئیحرامبەستندا ﴾

(وَمَنْ بَلَغَ مِيقَاتاً) هەر کەسێك بە (میقات)ێکی شەرعیدا تێپەڕیو (غَيْرَ مُرِيدٍ نُسُكاً) لە حاڵەتیتێپەڕبوونیدا نەیدەویست حەج، یان عومرە بکا (ثُمَّ أَرَادَهُ) ئینجا لە دوای تێپەڕبوون دڵی گۆڕاو ویستی حەج، یان عومرە بکا (فَمِيقَاتُهُ) ئەوە شوێنی ئیحرامبەستنی وی (مَوْضِعُهُ) ئەو شوێنەیە: کە دڵی لێیەوە گۆڕاوە، واتە: واجب نیە: بۆ ئیحرامبەستن بگەڕێتەوە لای (میقات)، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، بەڵام ئەگەر گەیشتە ناو (حَرَمِ مَكَّةَ)، ئینجا دڵی گۆڕاو ویستی عومرە بکا، ئەوە-بۆ ئیحرامیعومرە- واجبە: بڕواتە دەرەوەی (حَرَمِ مَكَّةَ)، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا فەرموویانە، بەڵام ئەگەر دڵی گۆڕاو ویستی حەج بکا، ئەوە واجبە: لە ناو (حَرَمِ مَكَّةَ)دا ئیحرامی حەج ببەستێ، هەروەك لەمەوپێش ڕوونمان کردەوە.
(وَإِنْ بَلَغَهُ مُرِيداً) هەر کەسێك گەیشتە (میقات)ێكو دەیویست حەج، یان عومرە بکا (لَمْ تَجُزْ مُجَاوَزَتُهُ) بۆی دروست نیە: لە (میقات)ەکە تێپەڕێ (بِغَيْرِ إِحْرَامٍ) بە بێئیحرامبەستن (فَإِنْ فَعَلَ) ئەگەر وای کرد، واتە: ئیحرامی نەبەستو لە (میقات) تێپەڕی (لَزِمَهُ الْعَوْدُ) واجبە: پێش ئیحرامبەستن بگەڕێتەوە بۆ (میقات)ەکە (لِيُحْرِمَ مِنْهُ) تاکو لەوێوە ئیحرام بە حەج، یان بە عومرە ببەستێو گوناهەکەی لە سەر لابچێ.

إلاَّ إذَا ضَاقَ الْوَقْتُ أَوْ كَانَ الطَّرِيقُ مَخُوفاً، فَإِنْ لَمْ يَعُدْ لَزِمَهُ دَمٌ، وَإِنْ أَحْرَمَ ثُمَّ عَادَ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ عَادَ قَبْلَ تَلَبُّسه بِنُسُكٍ سَقَطَ الدَّمُ، وَإِلاَّ فَلاَ، وَالأَفْضَلُ أَنْ يُحْرِمَ مِنْ دُوَيْرَةِ أَهْلِه، وَفِي قَوْلٍ مِنَ الْمِيقَاتِ،

---

جا بزانە: لێرەدا واجب نیە: بگەڕێتەوە خودی (میقات)ەکە، بەڵکو دروستە: بە ئەندازەی (میقات)ەکە بگەڕێتەوە شوێنێکیترو لەوێوە ئیحرام ببەستێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(إلاَّ إذَا ضَاقَ الْوَقْتُ) تەنها ئەگەر کاتەکە بەرتەنگ بێو فریای حەج نەکەوێ (أَوْ كَانَ الطَّرِيقُ مَخُوفاً) یان ڕێگایەکە بە ترس بێ، یان بەخۆی نەخۆش بێ، لەو حاڵەتانەدا واجب نیە: بگەڕێتەوە، بەڵکو واجبە: خوێن بدا، هەروەك دەفەرموێ: (فَإِنْ لَمْ يَعُدْ) ئەگەر نەگەڕاوەو ئیحرامیشی بەستو ڕۆیشتە (مَكّة)، ئەوە (لَزِمَهُ دَمٌ) خوێنی لە سەر واجب دەبێ، چونکە لە (میقات)دا ئیحرامی نەبەستوە.

جا بزانە: هەر کەسێك لە (میقات)ێکیشەرعی ئیحرام نەبەستێ، خوێنی لە سەر واجب دەبێ، جیاوازی نیە: نەزان بێ، یان لە بیری چوبێ، یان سەهووی کردبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، چونکە (ابن عباس) رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەفەرموێ: ﴿مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِه شَيْئاً أَوْ تَرَكَهُ فَلْيُهْرِقْ دَماً﴾رواه الإمام مالك والبيهقي باسنادصحيح، هەر کەسێك واجبێکی حەج لە بیر بکا، یان بە قەسدی نەیکا، دەبی خوێن بدا: ئاژەڵ سەرببڕێ.

(وَإِنْ أَحْرَمَ) بەلام ئەگەر مرۆڤەکە لە (میقات) تێپەڕیو ئیحرامی بەست (ثُمَّ عَادَ) ئینجا لە دوای ئیحرامبەستن گەڕاوە بۆ (میقات)، ئەوە (فَالأَصَحُّ) بە فەرموودەیڕاستتر دوو حاڵەتی هەنە، یەکەم: (أَنَّهُ إِنْ عَادَ) ئەگەر بگەڕێتەوە (قَبْلَ تَلَبُّسِه بِنُسُكٍ) پێش ئەوەی دەست بە هیچ کردارێکی حەج، یان عومرە بکا (سَقَطَ الدَّمُ) خوێنەکەی لە سەر لادەچێ.

دووەم: (وَإِلاَّ) ئەگەر پێش دەست پێکردن نەگەڕاوە، بەڵکو دەستی بە کردارێکی حەج، یان عومرە کرد (فَلاَ) خوێنی لە سەر لا ناچێ، جیاوازی نیە: کردارەکە ڕوکن بێ: وەکو وەستانی (عَرَفَة)، یان سوننەت بێ: وەکو (طَوافُ الْقُدُوم)، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(وَالأَفْضَلُ) بۆ ئەو کەسەی ماڵی لە شوێنێکی سەرەوەی (میقات)ێکی شەرعیە، وەها خێرترە: (أَنْ يُحْرِمَ مِنْ دُوَيْرَةِ أَهْلِه) لە خانۆچکەی خێزانەکەی خۆیەوە ئیحرام ببەستێ، لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)ش هەر ئەوها خێرترە، هەر چەند لە وڵاتێکیدووریشەوە بێ، چونکە کردارەکە زۆرتر دەبێو کۆمەڵە (صحابة)یەکیش وەهایان کردوە، بەلام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی ئیمامی(الشافعي)دا، وەها خێرترە: (مِنَ الْمِيقَاتِ) لە (میقات)ێکی شەرعیەوە ئیحرام ببەستێ.

قُلْتُ: اَلْمِيقَاتُ أَظْهَرُ وَهُوَالْمُوَافِقُ لِلأَحَادِيثِ الصَّحِيحَةِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَمِيقَاتُ الْعُمْرَةِ لِمَنْ هُوَ خَارِجَ الْحَرَمِ مِيقَاتُ الْحَجِّ، وَمَنْ بِالْحَرَمِ يَلْزَمُهُ الْخُرُوجُ إِلَى أَدْنَى الْحِلِّ وَلَوْ بِخَطْوَةٍ، فَإِنْ لَمْ يَخْرُجْ وَأَتَى بِأَفْعَالِ الْعُمْرَةِ أَجْزَأَتْهُ فِي الأَظْهَرِ وَعَلَيْهِ دَمٌ، فَلَوْ خَرَجَ إِلَى الْحِلِّ بَعْدَ إِحْرَامِهِ سَقَطَ الدَّمُ عَلَى الْمَذْهَبِ،

---

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوي) دەفـەرموێ (اَلْمِيقَاتُ أَظْهَرُ) فـەرموودەی ئیحـرام لـە (میقـات) بـەهێزترە (وَهُوَالْمُوَافِقُ لِلأَحَادِيثِ الصَّحِيحَةِ وَاللهُ أَعْلَم) هـەر ئـەو فـەرموودە بـەهێزەش لەگـەڵ حەدیسـەکانی(صـحیح) تێـك دەکاتـەوە، کـە دەفـەرموون: ﴿پێغەمبـەرﷺ لـە (میقات)ەوە ئیحرامی بەستوە﴾. لە (بخاري ومسلم)دا گێڕدراونەوە.

## ﴿ شوێنی ئیحرامی عومرە ﴾

(وَمِيقَاتُ الْعُمْرَةِ) شوێنی ئیحرامبەستنی عومرە (لِمَنْ هُوَ خَارِجَ الْحَرَمِ) بۆ ئـەو کەسـەی لـە دەرەوەی(حَـرَمِ مكـة)یـە (مِيقَـاتُ الْحَـجِّ) هـەر ئـەو (میقـات)یـە: کـە ئیحرامـی حـەجی لێدەبەسترا، چونکە لە حەدیسەکەیڕابردوودا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ﴿هُنَّ لَهُـمْ وَلِكُـلِّ آتٍ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَالْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ﴾رواه الشيخان، ئەوانـە شـوێنی ئیحرامبەسـتنن بـۆ ئەو کەسانەی بەو ڕێگایانەدا دێنو دەیانەوێ حەج، یان عومرە بکەن.

(وَمَنْ بِالْحَرَمِ) ئەو کەسەش کە لە ناو (حَـرَمِ مكـة)یـە (يَلْزَمُـهُ الْخُرُوجُ) بـۆ ئیحرامـی عـومرە واجبـە: لـە (حَـرَم) بڕواتـە دەرەوە (إِلَـى أَدْنَىالْحِـلِّ) بـۆ نـزیکترین شـوێنی زەمینیحـەلاڵ (وَلَـوْ بِخَطْـوَةٍ) هـەر چـەند بـە ئەنـدازەی هـەنگاوێکیش بڕواتـە دەرەوە هـەر دروسـتە، جـا لـەو چـوونەدەرەوەیەدا جیـاوازی خـەڵکی(مکـة)و ڕێبوارەکـان نیـە، واتـە: وەك ئـەو حاجیانەش کە حەجیان تەواو کردبێو بیانەوێ عومرەش بکەن، بـە بەڵگـەی حەدیسـەکەی (عائشة)یڕابردوو لە (باسی دوو عومرە لە مانگێکدا).

(فَإِنْ لَمْ يَخْرُجْ) جا ئەگەر بۆ ئیحرامیعومرە نەڕۆیشتە دەرەوەی(حَرَم)، بەڵکو لـە (حَـرَم)دا ئیحرامی بەستو (وَأَتَـى بِأَفْعَالِ الْعُمْرَةِ) کردارەکـانیعومرەی کـردن (أَجْزَأَتْـهُ) عومرەکـەی دروست دەبێو بە بـەر عـومرەی ڕوکنیئیسـلامیش دەکـەوێ (فِيالأَظْهَرِ) لـە فـەرموودەی بەهێزتردا، بـەڵام (وَعَلَيْـهِ دَمٌ) خـوێنی دەکـەوێتـە سـەر، چـونکە لـە (میقـات)ێکی شـەرعی ئیحرامی نەبەستوە.

(فَلَوْ خَرَجَ إِلَىالْحِلِّ بَعْدَإِحْرَامِهِ) جا ئەگەر لە دوای ئیحرامبەستن چووە دەرەوە بـۆ زەمینـی حەلاڵ (سَقَطَ الـدَّمُ) خوێنەکـەی لـە سـەر لادەچـێ، بـەو مەرجـەی پـێش دەسـت پێکردنـی (طَواف) بڕواتە دەرەوە (عَلَىالْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئـەوەیڕابردوو، دەربـارەی ئـەو کەسـە بـوو: کـە لـەو کاتـەی لـە (میقـات) تێپەڕ بووە مەبەستی عومرەی نـەبوبێ، چـونکە ئـەو جـۆرە کەسـە لـە سـەری واجبـە: بـۆ

وَأَفْضَلُ بِقَاعِ الْحِلِّ اَلْجِعْرَانَةُ ثُمَّ التَّنْعِيمُ ثُمَّ الْحُدَيْبِيَةُ.

(بَابُ الإِحْرَامِ)

يَنْعَقِدُ مُعَيَّناً: بِأَنْ يَنْوِيَ حَجّاً أَوْ عُمْرَةً أَوْ كِلَيْهِمَا، وَمُطْلَقاً: بِأَنْ لاَ يَزِيدَ عَلَى نَفْسِ الإِحْرَامِ، وَالتَّعْيِينُ أَفْضَلُ، وَفِي قَوْلِ الإِطْلاَقُ، فَإِنْ أَحْرَمَ مُطْلَقاً فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ صَرَفَهُ بِالنِّيَّةِ إِلَى مَا شَاءَ مِنَ النُّسُكَيْنِ

---

ئیحرامی عومرە بگەڕێتەوە ئەندازەی ئەو (میقات)ەی بە سەریدا تێپەڕیوە، هەروەك ڕوونمان كردەوە.

(وَأَفْضَلُ بِقَاعِ الْحِلِّ) خێرترینی شوێنەكانی زەمینیحەلاڵ بۆ ئیحرامبەستنی عومرە (اَلْجِعْرَانَة)یە، كە دەكەوێتە ڕێگەی شاری (طائف)، ﴿عَنْ أَنَسٍ ﷺ أَنَّهُ ﷺ اِعْتَمَرَ مِنَ الْجِعْرَانَةِ﴾ رواه الشيخان واصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ لە (الجعرانة)وە ئیحرامی عومرەی بەست. (ثُمَّ) ئینجا خێرترین شوێن بۆ ئیحرامی عومرە (اَلتَّنْعِيم)ە، كە پێی دەگوترێ مزگەوتی حەزرەتی(عائشة)، بە بەڵگەی حەدیسەكەی (عائشة)یرابردوو لە (باسی دوو عومرە لە مانگێكدا). (ثُمَّ) ئینجا خێرترین شوێنی ئیحرامی عومرە: (اَلْحُدَيْبِيَةُ)یە، كە پێكهاتنە بەناوبانگەكەی لێ ئیمزا كراوە، چونكە پێغەمبەرﷺ ویستی لەوێوە -بۆ عومرەكردن- بڕواتە ناو (مكة)، هەروەك لە (البخاري)دا گێڕدراوەتەوە.

﴿ بَابُ الإِحْرَامِ: باسی چۆنیەتی ئیحرامبەستن ﴾

(يَنْعَقِدُ مُعَيَّناً) ئیحرام دەبەسترێ بە دیاركراوی: (بِأَنْ يَنْوِيَ حَجّاً) وەك نیەت بێنێ: ئیحرام بە حەج ببەستێ (أَوْ عُمْرَةً) یان بە عومرە ببەستێ (أَوْ كِلَيْهِمَا) یان ئیحرام بە حەجو عومرەی وێكڕایی ببەستێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَاالأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّما لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى﴾ رواه الشيخان، هەر كردەوەیەكی خواپەرستی بێ، بە نیەتەوە نەبێ دانامەزرێ، هەر مرۆڤێكیش تەنها خێری ئەو كردەوەیەی بۆ دەنووسرێ كە نیەتی بۆ هێناوە.

(وَمُطْلَقاً) هەروەها ئیحرام بە دیارنەكراویش دادەبەسترێ (بِأَنْ لاَ يَزِيدَ عَلَى نَفْسِ الإِحْرَامِ) وەك جگە لە خودی ئیحرامبەستن هیچیتر زیاد نەكا، وەك بڵێ: نیەتمە ئیحرامم بەست.

(وَالتَّعْيِينُ أَفْضَلُ) لە فەرموودەی بەهێزتردا: دیاریكردنی ئیحرام خێرترە، وەك بڵێ: نیەتمە ئیحرامم بە حەج بەست، یان بە عومرەم بەست، یان بە حەجو عومرەم بەست (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكی بێهێزدا (الإِطْلاَقُ) دیارینەكردن خێرترە.

(فَإِنْ أَحْرَمَ مُطْلَقاً) جا ئەگەر ئیحرامی بەست بە دیارنەكراوی (فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ) لە مانگەكانی حەجدا، ئەوە (صَرَفَهُ بِالنِّيَّةِ إِلَى مَا شَاءَ) ئیحرامەكەی بە نیەتهێنان دەداتە ئەوەی حەز دەكا (مِنَ النُّسُكَيْنِ) لە یەكێكی هەردوو خواپەرستیەكان، واتە: یان نیەت

أَوْ إِلَيْهِمَا ثُمَّ اشْتَغَلَ بِالأَعْمَالِ، وَإِنْ أَطْلَقَ فِي غَيْرِ أَشْهُرِهِ فَالأَصَحُّ انْعِقَادُهُ عُمْـرَةً فَـلاَ يَصْرِفُهُ إِلَى الْحَجِّ فِي أَشْهُرِهِ، وَلَهُ أَنْ يُحْرِمَ كَإِحْرَامِ زَيْدٍ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ زَيْدٌ مُحْرِماً انْعَقَـدَ إِحْرَامُهُ مُطْلَقاً، وَقِيلَ إِنْ عَلِمَ عَدَمَ إِحْرَامِ زَيْدٍ لَمْ يَنْعَقِدْ، وَإِنْ كَانَ زَيْدٌ مُحْرِمـاً انْعَقَـدَ إِحْرَامُهُ كَإِحْرَامِهِ، فَإِنْ تَعَذَّرَ مَعْرِفَةُ إِحْرَامِهِ بِمَوْتِهِ جَعَلَ نَفْسَهُ قَارِناً

---

دێنێ ئیحرامەکەی بکاتە حەج، یان عومرە (أَوْ إِلَيْهِمَا) یان دەیداتە هەردووکیان، واتە: نیەت دێنێ ئیحرامەکەی بکاتە حەج‌و عومرەی وێکڕا (ثُمَّ اشْتَغَلَ بِالأَعْمَالِ) ئینجا لە دوای نیەتهێنانەکە دەست بە کردەوەکانی حەج‌و عومرە دەکا، واتە: هەر کردەوەیەکی لە پێش نیەتهێنانەکەدا بیکا، دروست نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو.

بەڵام (وَإِنْ أَطْلَقَ فِي غَيْرِأَشْهُرِهِ) ئەگەر جگە لە مانگەکانی حەج لە مانگێکی‌تردا ئیحرامی بە دیارنەکراوی بەست، ئەوە (فَالأَصَحُّ انْعِقَادُهُ عُمْرَةً) بە فەرموودەی ڕاستتر: ئیحرامەکەی بە عومرە دەبەسترێ، کەوابو: (فَلاَ يَصْرِفُهُ إِلَى الْحَجِّ فِي أَشْهُرِهِ) دروست نیە: ئەو ئیحرامە بداتە حەج لە دوای هاتنی مانگەکانی حەج، واتە: واجبە: بەو ئیحرامە عومرە بکاو دروست نیە: چاوەڕوانی هاتنی مانگەکانی حەج بکا، تاکو ئەو ئیحرامە بداتە حەج‌و حەجی پێ بکا.

(وَلَـهُ) بۆی دروستە (أَنْ يُحْرِمَ كَإِحْرَامِ زَيْدٍ) نیەت بێنێ: ئیحرام ببەستێ وەکو ئیحرامی زەید، یان وەکو ئیحرامی یەکێکی‌تر ﴿عَنْ أَبِي‌مُوسى‌ﷺ: أَنَّهُ أَحْرَمَ كَإِحْرَامِ النَّبِيِّ‌ﷺ فَلَمَّا أَخْبَرَهُ، قَالَ‌ﷺ لَهُ: أَحْسَنْتَ﴾رواه الشيخان، (أبوموسى) نیەتی هێناو گوتی: ئیحرامم بەست وەکو ئیحرامی پێغەمبەرﷺ، جا کە خەبەری‌دا پێغەمبەرﷺ، فەرمووی: باشت کرد.

(فَإِنْ لَمْ يَكُنْ زَيْدٌ مُحْرِماً) جا ئەگەر لەو کاتدا زەید ئیحرامی نەبەستبو (انْعَقَدَ إِحْرَامُهُ مُطْلَقاً) ئیحرامی ئەو مرۆڤەی‌ڕابردوو بە دیارنەکراوی دادەبەسترێ، کەواتە: نیەت دێنێ ئیحرامەکەی بداتە حەج، یان عومرە، یان هەردووکیان (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێ‌هێزدا: (إِنْ عَلِمَ عَدَمَ إِحْرَامِ زَيْدٍ) ئەگەر مرۆڤەکە دەیزانی زەید ئیحرامی نەبەستوە (لَمْ يَنْعَقِدْ) ئیحرامەکەی ئەویش دانابەسترێ (وَإِنْ كَانَ زَيْدٌ مُحْرِماً) بەڵام ئەگەر زەید ئیحرامی بەستبو، ئەوە (انْعَقَدَ إِحْرَامُهُ كَإِحْرَامِهِ) ئیحرامی مرۆڤەکەش وەکو ئیحرامی ئەوی دادەبەسترێ: ئەگەر ئیحرامی زەید بە حەج بوو ئیحرامی مرۆڤەکەش دەبێتە حەج، ئەگەر عومرە بوو دەبێتە عومرە، ئەگەر وێکڕایی بوو دەبێتە وێکڕایی.

(فَإِنْ تَعَذَّرَ مَعْرِفَةُ إِحْرَامِهِ) جا ئەگەر نەگونجا بزاندرێ: ئیحرامی زەید چی بووە (بِمَوْتِهِ) بە هۆی مردنی، یان شێتبوونی، یان نەدیتنەوەی، لەو حاڵەتەدا (جَعَلَ نَفْسَهُ قَارِناً) واجبە:

وَعَمـــــــــــــلَ أَعْمَـــــــــــــالَ النُّسُـــــــــــــكَيْنِ.

(فَصْلٌ) اَلْمُحْرِمُ يَنْوِي وَيُلَبِّي، فَإِنْ لَبَّى

خۆی بكاتە ئیحرامبەستەیوێكڕایی، واتـە: نیـەت بێنـێ ئیحرامەكـەی بكاتـە حـەج و عـومرەی وێكڕا (وَعَمِلَ أَعْمَالَ النُّسُكَيْنِ) كردەوەكانی هەردووكیان بكا، واتـە: كردەوەكـانی حـەج تـەنها یەك جار دەكاو ئەو حەجەی دروست دەبێ و بە بەر ڕوكنیئیسلام دەكەوێ، بـەڵام بـە بـەر عـومرە ناكـەوێ، واتـە: عـومرەی ڕوكنیئیسـلامی هـەر لـە سـەر دەمێنـێ و بـەو ئیحرامـەش خوێنی لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی نیەتی ئیحرام ﴾

(اَلْمُحْرِمُ) ئەو كەسەی دەیەوێ ئیحـرام ببەسـتێ (يَنْوِي) واجبـە: نیـەت بێنـێ، بـە بەڵگـەی حەدیسەكەی ﴿إِنَّمَاالأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾یڕابردوو، ئینجـا نیەتەكـەش واجبـە: بـە دڵ بـێ و بـە زوبانیش سـوننەتە، هـەروەك لـە سەرچـاوەكاندا فەرموویانـەو لـە نیـەتی نوێژدا بەڵگـەمان هێنـاوە، كـەوابو: بـە دڵو زوبـان لـە نیـەتی حـەج و عـومرەی وێكڕا دەڵـێ: (نَوَيْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْـرَةَ وَأَحْرَمْـتُ بِهِمَا لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمـە حـەج و عـومرە وێكـڕا بكـەم و ئیحـرامم بەسـت بـە حـەج و عومرە بۆ خوای گەورە. بـۆ حـەجی تـەنهاش دەڵـێ: (نَوَيْتُ الْحَجَّ وَأَحْرَمْـتُ بِـهِ لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمـە حـەج بكـەم و ئیحـرامم بەسـت بـە حـەج بـۆ خـوای گەورە. بـۆ عـومرەش دەڵـێ: (نَوَيْتُ الْعُمْـرَةَ وَأَحْرَمْتُ بِها لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمـە عـومرە بكەم و ئیحرامم بەست بە عومرە بۆ خوای گەورە.

هەروەها ئەگـەر لـەجیاتی مردووێك، یـان پەككـەوتووێك حـەج و عـومرەی دەكـرد، واجبـە: ئامـاژەی بۆ بكـا، وەك بڵـێ: (نَوَيْتُ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأَحْرَمْتُ بِهِما عَنْهُ لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمە حـەج و عـومرەی وێكڕا لـە جیـاتی(محمـد) بكـەم و ئیحـرامم بەسـت بـە حەج و عومرە لەجیاتی ئەوی بۆ خوای گەورە.

هـەروەها بـۆ حـەجی تـەنهاش دەڵـێ: (نَوَيْتُ الْحَجَّ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأَحْرَمْتُ بِـهِ عَنْهُ لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمە حەج لەجیاتی(محمد) بكەم و ئیحرامم بەست بە حـەج لـەجیاتی ئـەوی بۆ خوای گەورە. بۆ عومرەش دەڵێ: (نَوَيْتُ الْعُمْرَةَ عَنْ مُحَمَّدٍ وَأَحْرَمْتُ بِها عَنْهُ لِلَّهِ تَعَالَى) نیەتمە عومرە لـەجیاتی(محمـد) بكـەم و ئیحـرامم بەسـت بـە عـومرە لـەجیاتی ئەوی بۆ خوای گەورە. هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

(وَيُلَبِّي) سوننەتە: لە دوای نیەتهێنانەكـەش بڵـێ: ﴿لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْـكَ﴾...هتـد، هـەروەها سوننەتە لە حاڵەتی نیەتهێناندا ڕوو لە قیبلـە بكـا (فَـإِنْ لَبَّـى) جـا ئەگـەر (لَبَّيْكَ)ی گـوتو

بِلاَ نِيَّةٍ لَمْ يَنْعَقِدْ إِحْرَامُهُ، وَإِنْ نَوَى وَلَمْ يُلَبِّ انْعَقَدَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَيُسَنُّ الْغُسْلُ لِلإِحْرَامِ فَإِنْ عَجَزَ تَيَمَّمَ، وَلِدُخُولِ مَكَّةَ وَلِلْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ وَبِمُزْدَلِفَةَ غَدَاةَ النَّحْرِ وَفِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ لِلرَّمْيِ،

---

(بِلاَ نِيَّةٍ) نیەتی ئیحرامی نەهێنا (لَمْ يَنْعَقِدْ إِحْرَامُهُ) ئیحرامەکەی دانابەستریّ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی﴿إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ﴾ی رابردوو، جا هەر بە بەڵگەی حەدیسەکەش: (وَإِنْ نَوَى) ئەگەر نیەتی ئیحرامی هێنا (وَلَمْ يُلَبِّ) بەڵام (لَبَّيْكَ)ی نەگوت (انْعَقَدَ) ئیحرامەکەی دادەبەستریّ (على الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَيُسَنُّ الْغُسْلُ) سوننەتە: خۆی بشوا (لِلإِحْرَامِ) بۆ ئیحرامبەستن، بە نیەتی غوسلی ئیحرام ﴿عَنْ زَيْد بن ثابت ﷺ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ تَجَرَّدَ لإِهْلاَلِهِ وَاغْتَسَلَ﴾رواه الترمذي وحسنه، پێغەمبەرم ﷺ دیت بۆ ئیحرامبەستن خۆی ڕووت کردەوەو غوسلی کرد.

ئینجا بزانە: ئەم خۆشۆردنە پێش ئیحرامبەستنە، هەروەها سوننەتە: پێش ئیحرامبەستن خۆی بە سابون پاك بکاتەوەو سمێڵو نینۆکی بکاو مووی بەر و بن هەنگڵی لاببا، لەو غوسلو پاکیانەدا جیاوازی پیاو و ئافرەتو گەورەو منداڵ نیە.

(فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر نەیتوانی خۆی بشوا؟ چونکە ئاو نەبو، یان نەخۆش بوو (تَيَمَّمَ) سوننەتە: لەجیاتی خۆشۆردن تەیەمموم بکا، چونکە مەبەست لەو خۆشۆردنە پاکیو خواپەرستیە، جا ئەگەر پاکیەکەش نەگونجا، خواپەرستیەکە بە تەیەممومەکە وەدەست دێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: مرۆڤی جەنابەتدارو ئافرەتی زەیسانیو حەیزدار گشتیان ئیحرامیان دادەبەستریو دروست دەبێ، بەڵام ناپەسندە جەنابەتدار ئیحرام ببەستێ، هەروەها سوننەتە: ئافرەتی زەیسانیو حەیزداریش بۆ ئیحرام غوسل بکەن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنت عُمَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنها وَلَدَتْ مُحَمَّداً بِذِي الْحُلَيْفَةِ، فَأَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُهِلَّ﴾ رواه مالك ومسلم، (أسماء)ی ژنی ئیمامی (أبوبكر) لە ڕێگەی حەجدا (محمد)ی کوڕی لێبوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانیدا: بۆ ئیحرام خۆی بشواو لە حاڵەتی زەیسانیدا ئیحرام ببەستێ.

(وَ) هەروەها سوننەتە: غوسل بکا (لِدُخُولِ مَكَّةَ) بۆ چوونە ناو (مكة)ی پیرۆزو (وَلِلْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ) بۆ وەستانی عەرەفەو (وَبِمُزْدَلِفَةَ) بۆ وەستانی موزدەلیفە (غَدَاةَ النَّحْرِ) لە سبەینەی ڕۆژی جەژنی قوربانو (وَفِي أَيَّامِ التَّشْرِيقِ) هەم لە گشت ڕۆژێکی دوای جەژنی قورباندا غوسل بکا (لِلرَّمْيِ) بۆ ڕەجمی شەیتانەکان.

وَأَنْ يُطَيِّبَ بَدَنَهُ للإِحْرَامِ وَكَذَا ثَوْبَهُ فِي الأَصَحِّ، وَلاَ بَأْسَ بِإِسْتِدَامَتِهِ بَعْدَ الإِحْرَامِ وَلاَ بِطيبٍ لَهُ جِرْمٌ، لَكِنْ لَوْ نَزَعَ ثَوْبَهُ الْمُطَيَّبَ ثُمَّ لَبِسَهُ لَزِمَهُ الْفِدْيَةُ فِي الأَصَحِّ، وَأَنْ تُخَضِّبَ الْمَرْأَةُ لِلإِحْرَامِ يَدَيْهَا، وَيَتَجَرَّدُ الرَّجُلُ لإِحْرَامِهِ عَنْ مَخِيطِ الثِّيَابِ وَيَلْبَسُ إِزَاراً وَرِدَاءً أَبْيَضَيْنِ

---

(وَأَنْ يُطَيِّبَ بَدَنَهُ لِلإِحْرَامِ) هەروەها سوننەتە: لاشەی خۆی بۆنخۆش بکا بۆ ئیحرامبەستن، بە بەڵگەی حەدیسەکەیداهاتوو (وَكَذَا ثَوْبَهُ) هەروەها سوننەتە: جلو بەرگەکەشی بۆنخۆش بکا (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا.

جا بزانە: ئەو بۆنخۆشکردنە دەبی لە پێش ئیحرامبەستندا بێ، بەڵام (وَلاَ بَأْسَ) هیچ حەرامیو ناپەسندیەك نیە (بِإِسْتِدَامَتِهِ بَعْدَ الإِحْرَامِ) بە هۆی بەردەوامبوونی بۆنە خۆشەکە لە دوای ئیحرامبەستنو (وَلاَ بِطِيبٍ لَهُ جِرْمٌ) هەم بە هۆی بۆنێکی وەها: کە لاشەی هەبێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الْمِسْكِ فِي مَفْرَقِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ﴾ رواه الشيخان، لەبەر چاومە کە تەماشای بریقەی میسکم دەکرد لە ناوەندی سەری پێغەمبەر ﷺ لەو حاڵەتەی لە ئیحرامدا بوو.

ئینجا بزانە: بە پێچەوانەی (منهاج) لە (المجموع)دا فەرموویەتی: دروستە-بەڵام سوننەت نیە- پەشتەماڵەکانی ئیحرام بۆنخۆش بکا، بەڵکو لە (تحفة)دا فەرموویەتی: ناپەسندە جلی ئیحرام بۆنخۆش بکا (لَكِنْ) بەڵام (لَوْ نَزَعَ ثَوْبَهُ الْمُطَيَّبَ) ئەگەر جلە بۆنخۆشکراوەکەی دانا (ثُمَّ لَبِسَهُ) ئینجا دەبەر خۆی کردەوە (لَزِمَهُ الْفِدْيَةُ) ئەوە (فِدْيَة)ی دەکەوێتە سەر (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەك ئەگەر لە دوای ئیحرامبەستن کەسێك خۆی بۆنخۆش بکا (فِدْيَة)ی دەکەوێتە سەر (وَأَنْ تُخَضِّبَ الْمَرْأَةُ لِلإِحْرَامِ يَدَيْهَا) سوننەتە: ئافرەت بۆ ئیحرامبەستن هەردوو لەپەدەستەکانی تا جومگەکانی بە خەنە ڕەنگ بکا، تاکو ڕەنگی پیستەی دەستەکانی بە ڕەنگی خەنە داپۆشرێ.

(وَيَتَجَرَّدُ الرَّجُلُ لإِحْرَامِهِ) واجبە: پیاو-واتە: نێرینە- خۆی ڕووت بکاتەوە بۆ ئیحرامبەستن (عَنْ مَخِيطِ الثِّيَابِ) لە جلو بەرگی دوورواو، واتە: ئەو جلو بەرگەی بە هۆی دوورین، یان چنین دەورەی لە لاشەی دەدا، واجبە دایبکەنێو (وَيَلْبَسُ إِزَاراً) پەشتەماڵێك لە نێوان ناوکو ئەژنۆی لە خۆی وەرپێچێو (وَرِدَاءً) پەشتەماڵێکیتریش لای سەرەوەی پێ داپۆشێ (أَبْيَضَيْنِ) سوننەتە: هەردوو پەشتەماڵەکان سپی بن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا: إِنْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ بَعْدَ مَا تَرَجَّلَ وَادَّهَنَ وَلَبِسَ إِزَارَهُ وَرِدَاءَهُ هُوَ وَأَصْحَابُهُ﴾ رواه البخاري، پێغەمبەر ﷺ لە (مدينة) وەڕێکەوت بۆ حەج کردن پاش ئەوەی سەری خۆی شانە کردو چەوری کرد، خۆیو (صحابة)کانی پەشتەماڵەکانی سەرەوەو داوێنیان دەبەر کردن.

وَنَعْلَيْنِ، وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ الأَفْضَلُ أَنْ يُحْرِمَ إِذَاانْبَعَثَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ أَوْ تَوَجَّهَ لِطَرِيقِهِ مَاشِياً، وَفِي قَوْلٍ يُحْرِمُ عَقِبَ الصَّلَاةِ، وَيُسْتَحَبُّ إِكْثَارُ التَّلْبِيَةِ وَرَفْعُ صَوْتِهِ بِهَا فِي دَاوَامِ إِحْرَامِهِ،

---

(وَنَعْلَيْنِ) جووته نەعلێکیش دەپێ دەکا، واتـە: دروست نیـە: گۆرەوی‌و ئـەو جۆرە پـێڵاوە بکاتە پێی: کە پاشنەپێ‌و سەرە پەنجەکان دابپۆشێ، هەروەك لـە باسـی قەدەغـەکراوەکانی ئیحرامدا روونی دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعالَى.

جا بزانـە: ئـەو جـل دانـان‌و پەشتەماڵ‌و نەعلـەی رابـردوو، تایبەتـە بـە نێرینـە، واتـە: لـە سـەر ئافرەت‌و نێرامۆك واجب نیە بەرگی خۆیان دابنێن، هـەروەك لـە (نهایـة)و(مغنـی)دا فەرموویانـەو لە باسی قەدەغەکراوەکانی ئیحرامـدا بەڵگـەی بـۆ دێـنین، إِنْ شَـاءَ اللهُ تَعَـالَى، کـەوابو: بـۆ ئـافرەت‌و نێرامۆك دروستە: لە جل‌و بەرگی خۆیاندا، بە گۆرەوی‌و بە پێڵاوەوە ئیحرام ببەستن.

(وَ) هەر کەسێك ویستی ئیحرام ببەستێ (يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ) سوننەتە: پـێش ئیحرامبەسـتن دوو رەکعەت سوننەت بکا، بە نیەتی سوننەتی ئیحرام ﴿عَنْ جَـابِرِ وَابْـنِ عُمَـرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِذِي الْحُلَيْفَةِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ أَحْرَمَ﴾رواهما الشيخان، پێغەمبـەرﷺ لـە (ذِي الْحُلَيْفَـةِ) دوو رەکعەت سوننەتی کرد، ئینجا ئیحرامی بەست. جـا ئەگـەر لـە کـاتی نوێژێکی‌واجبدا بیەوێ ئیحرام ببەستێ، ئەوە ئەگـەر—پـێش ئیحرامبەسـتن—نوێژە واجبەکە بکـا، بـۆی بـە بەر دوو رەکعەت سوننەتەکە دەکەوێ، هەروەك لە (الإيضاح)دا فەرموویەتی.

(ثُمَّ الأَفْضَلُ) ئینجا وەها خێرتـرە (أَنْ يُحْرِمَ) ئیحـرام ببەسـتێ (إِذَا انْبَعَثَتْ بِـهِ رَاحِلَتُـهُ) هـەر کاتێك سواری ووڵاغەکەی بوو، یان سواری فڕۆکە، یـان سـواری ئۆتومبیـل بـوو و دەسـتی بـە ڕۆیشتن کرد (أَوْ تَوَجَّهَ لِطَرِيقِهِ مَاشِياً) یان بە پیادەیی دەستی بە ڕۆیشتن کـرد ﴿عَـنْ ابْـنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُهِلُّ حَتَّـى تَنْبَعِـثَ بِـهِ دَابَّتُـهُ﴾رواه الشيخان، نەمدیت پێغەمبەرﷺ ئیحـرام ببەسـتێ تـا سـواری ووڵاغەکـەی دەبـو و دەسـتی بـە ڕۆیشـتن دەکرد.

(وَفِـي قَـوْلٍ) لـە فەرموودەیەکـدا (يُحْـرِمُ عَقِـبَ الصَّـلَاةِ) هـەر لـە دوای نوێژەکـە، ئیحـرام دەبەستێ، بەڵام حەدیسەکانی فەرموودەکەی‌تر زۆرترو ڕاستترن.

(وَيُسْتَحَبُّ إِكْثَارُ التَّلْبِيَةِ) سوننەتە: زۆر (لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْـكَ)...هتد، بڵێ‌و (وَرَفْـعُ صَوْتِهِ بِهَا) سوننەتە: پیاو بە دەنگی‌بەرز (لَبَّيْكَ) بڵێ (فِـي دَوَامِ إِحْرَامِـهِ) لـە بـەردەوامی ئیحرامەکـەی‌داو لـە گشـت حاڵەتـەکانی ئیحرامەکـەی‌دا: بـە شـەو و بـە ڕۆژ، بـە دانیشـتوویی‌و بـە پێـوە، بـە سواری‌و بە پیادەیی، بە جەنابەتداری‌و بە حەیزداری، بەڵام ئافرەت‌و نێرامـوك بـە دەنگی‌نـزم (لَبَّيْكَ) دەڵـێن، هـەروەك لـە سەرچاوەکاندا فەرموویانـە، پێغەمبـەرﷺ فـەرمووی: ﴿أَتَـانِي جِبْرِيلُ-عَلَيْهِ السَّلَامُ- فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالْإِهْلَالِ أَوِالتَّلْبِيَـةِ﴾رواه اصحاب

وَخَاصَّةً عِنْدَ تَغَايُرِالأَحْوَالِ كَرُكُوبٍ وَنُزُولٍ وَصُعُودٍ وَهُبُوطٍ وَاخْتِلاَطِ رُفْقَةٍ، وَلاَ تُسْتَحَبُّ فِي طَوَافِ الْقُدُومِ، وَفِي الْقَدِيمِ تُسْتَحَبُّ فِيهِ بِلاَجَهْرٍ، وَلَفْظُهَا: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ. وَإِذَا رَأَى مَا يُعْجِبُهُ قَالَ: لَبَّيْكَ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَةِ. وَإِذَا فَرَغَ مِنْ تَلْبِيَتِهِ صَلَّى عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَسَأَلَ اللهَ تَعَالَى الْجَنَّةَ وَرِضْوَانَهُ وَاسْتَعَاذَ بِهِ مِنَ النَّارِ.

---

السنن وصححه الترمذي، حەزرەتی(جُبْرائيل) فەرمانی پێکردم: فەرمان بدەمە (صحابة)كانم: كە دەنگيان بەرز بكەنەوە بە (لَبَّيْكَ اللّهُمَّ لَبَّيْكَ)...هتد.

(وَخَاصَّةً) بە تايبەتی گوتنی (لَبَّيْكَ) خێرترە (عِنْدَ تَغَايُرِالأَحْوَالِ) لە كاتی گۆڕانی حاڵەتەكانی مرۆڤ: (كَرُكُوبٍ) وەكو سواربوونو (وَنُزُولٍ) دابەزينو (وَصُعُودٍ) سەركەوتن بۆ بەرزاييو (وَهُبُوطٍ) هاتنە خوارەوە لە بەرزاييو (وَاخْتِلاَطِ رُفْقَةٍ) تێكەڵبوونی هاوڕێكانو لەو كاتەی شەو دادێ، يان ڕۆژ دادێ، لەو كاتەی نوێژ تەواو دەبێ، ئينجا هەر جارێكيش هەموو (لَبَّيْكَ) سێ جار بە تەواوی دەڵێتەوە هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَلاَ تُسْتَحَبُّ) بەڵام گوتنی (لَبَّيْكَ) سوننەت نيە (فِي طَوَافِ الْقُدُومِ) لە (طَوَافُ الْقُدُومِ)داو لە هاتوچۆی سەفاو مەڕوەدا، چونكە ئەوانە زيكری تايبەتی خۆيان هەيە (وَفِي الْقَدِيمِ) لە فەرموودەی كۆندا (تُسْتَحَبُّ فِيهِ بِلاَ جَهْرٍ) سوننەتە: لە (طَوَافُ الْقُدُومِ)دا بە بێدەنگ هەڵێنان (لَبَّيْكَ) بڵێ. ئينجا بزانە: لە (طَوَافُ الإفاضَة)و لە (طَوَافُ الْوداع)دا گوتنی (لَبَّيْكَ) سوننەت نيە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَلَفْظُهَا) ووشەی (لَبَّيْكَ) كە پێغەمبەرﷺ فەرموويەتی، ئەمەيە: ﴿لَبَّيْكَ اللّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَشَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَشَرِيكَ لَكَ﴾رواه الشيخان.

(وَإِذَا رَأَى مَا يُعْجِبُهُ) هەر كاتێكيش شتێكی وەهای ديت: كە پێی خۆش بوو، يان پێی ناخۆش بوو (قَالَ) سوننەتە بڵێ: ﴿لَبَّيْكَ إِنَّ الْعَيْشَ عَيْشُ الآخِرَةِ﴾ رواه الشافعي والبيهقي عن مجاهد باسناد صحيح.

(وَإِذَا فَرَغَ مِنْ تَلْبِيَتِهِ) جا هەر كاتێك (لَبَّيْكَ)ی سێ جار تەولو كرد (صَلَّى عَلَى النَّبِيِّ ﷺ) سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێدەدا، چونكە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ﴾ ئەی پێغەمبەرﷺ ئێمە ناوی تۆمان بەرز كردۆتەوە: بەوەی لەگەڵ من ناوت بهێندرێ.

(وَسَأَلَ اللهَ تَعَالَى الْجَنَّةَ وَرِضْوَانَهُ) هەم تكای بەهەشتو ڕازیبوون لە خوای گەورە دەكاو (وَاسْتَعَاذَ بِهِ مِنَ النَّارِ) لە خوا دەپاڕێتەوە لە ئاگری دۆزەخ بيپارێزێ، چونكە ئەو دوعايانەش لە حەديسێكی بێهێزدا هاتون، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

## (بابُ دُخُوله مَكَّةَ)

اَلأَفْضَلُ دُخُولُهَا قَبْلَ الْوُقُوفِ، وَأَنْ يَغْتَسِلَ دَاخِلُهَا مِنْ طَرِيـقِ الْمَدِينَـةِ بِـذِىطَوًى، وَيَدْخُلَهَا مِنْ ثَنِيَّةِكَدَاءٍ،

---

### ﴿ بابُ دُخُولِه مَكَّةَ: باسی چوونه ناو شاری (مَكَّة)ی پیرۆز ﴾

بزانه: شاری (مكـة)ی پـیرۆز زۆر نـاوی هەنـەو-جگـە لـە گـۆڕی پێغەمبـەرﷺ- لـە گشـت شوێنێکی زەمین گەورەترە، پێغەمبەرﷺ دەرهەق (مَكَّة) دەفەرموێ: ﴿وَاللهِ إِنَّـكِ لَخَيْـرُ أَرْضِ اللهِ وَأَحَبُّ أَرْضِ اللهِ إِلَىاللهِ، وَلَوْلاَ أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْـكِ مَـا خَرَجْـتُ﴾رواه الترمذي وصـححه، سـوێندم بـە خـوا: تـۆ-ئـەی شـاری(مكـة)-چـاکترین زەمـینی خـوایو خۆشەویستترین زەمـینی خـوای لـە لای خوایگـەورە، ئەگـەر مـن لـە تـۆ وەدەر نەنـدرابام بەخۆم نەدەچوومە دەر.

بەڵام ئەو پارچە خاکەی گۆڕی پێغەمبەرﷺ-کە دەورەی لە لاشە پیرۆزەکەی داوە- ئـەو لـە (مكـة)ش گـەورەترە، بـە (إجمـاع) زانايـانی ئيسـلام، هـەروەك لـە سەرچـاوەكاندا فەرموويانـە، بـەڵكو لـە (عَرْش)ش گـەورەترە، هـەروەك لـە (حاشيةالإيضـاح)و (تحفـة)و (نهاية)دا فەرموويانە.

جا بزانە: خراپەکردن لە (حَرَمِ مَكَّة)دا سزای گـەورەترە: لـە خراپـەکردن لـە شـوێنەکانیتردا، هەروەك چاکەش لە ویٚدا خێری گـەورەترە، چـونکە لـە حەديسـدا هـاتوە: ﴿چاکەی (حَرَمِ مَكَّة) بە سەد هەزار چاکەيە﴾. هەروەك لە (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(اَلأَفْضَـلُ) بـۆ ئـەو کەسـەی ئيحرامـی بـە حـەج بەسـتوە، وەهـا خێرتـرە: (دُخُولُهَـا قَبْـلَ الْوُقُوفِ) پێش وەستانی(عَرَفَة) بچێتە ناو (مكة)ی پـيرۆز، چـونکە پێغەمبـەرﷺو (صَحابَة) ئـەوهايان حـەج کـردوە (وَأَنْ يَغْتَسِـلَ دَاخِلُهَـا) سـوننەتە ئـەو کەسـەی دەيـەوێ بچێتـە نـاو (مكة) غوسل بکا، ئينجا ئەوەی (مِنْ طَرِيقِ الْمَدِينَـةِ) لـە ڕێگـەی (مَدِينَـة)وە دێ، سـوننەتە: (بِذِیطَوًى) لە گەڵی (طوى) غوسل بکا (وَيَدْخُلَهَا) سوننەتە: گشت کەسێك کە دەچێتە نـاو شاری (مكـة)یپـيرۆز (مِـنْ ثَنِيَّةِكَداءٍ) لـە ڕێگـەی (كـداء)ی سـەرەوە بڕواتـە ژوورەوەو، لـە ڕێگەی (كُدًى)ی خوارەوەی (مكـة)وەش بڕواتـە دەرەوە ﴿عَنْ ابْـنِ عُمَـرَرَضِيَاللهُعَنْهُمَـا: أَنَّ النَّبِيَّﷺ دَخَلَ مِنْ كَدَاءٍ مِـنَ الثَّنِيَّـةِالْعُلْيا، وَخَـرَجَ مِـنَ الثَّنِيَّةِالسُّـفْلَى﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە ڕێگەی (كداء)ی سەرەوە چووە ناو (مكة)و لـە ڕێگـەی خـوارەوەش چـووە دەرەوە. جـا لـەم چـوونە نـاو (مكـة)يـەدا جيـاوازی حـاجیو خـەڵکیتر نيـە، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

وَيقُولَ إِذَا أَبْصرَ الْبَيْتَ: اَللَّهُمَّ زِدْ هَذَاالْبَيْتَ تَشْرِيفاً وَتَعْظيماً وَتَكْرِيماً وَمَهَابَةً وَزِدْ مَنْ شَـرَّفَهُ وَعَظَّمَهُ ممَّنْ حَجَّهُ أَواعْتمَرَهُ تَشْرِيفاً وَتَكْرِيماً وَتَعْظِيماً وَبِرّاً، اَللَّهُمَّ أَنْـتَ السَّـلاَمُ وَمنْـكَ السَّلاَمُ فَحَيِّنَا رَبَّنَا بِالسَّلاَمِ. ثُمَّ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ منْ بَاب بَنِىشَيْبَةَ وَيَبْتَدئُ بطَوَاف الْقُدُوم،

---

ئینجا بزانه: كه گەیشته (حَرَمِ مَكَّة) سوننەته بلّـێ: (اَللَّهُمَّ إِنَّ هَذَا حَرَمُكَ وَأَمْنُكَ فَحَرِّمْنـِـي عَلَىالنَّارِ وَآمِنِّي مِنْ عَذَابِكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ وَاجْعَلْنِي مِنْ أَوْلِيَائِكَ وَأَهْلِ طَاعَتِكَ). هـەروەك له (المجموع)و(الأذكار)دا فەرموويەتی.

ئینجا (وَيَقُولَ إِذَا أَبْصرَالْبَيْتَ) هەر كاتێك (بَيْت)=(كَعْبَة)ی دیت، سوننەته بلّێ: ﴿اَللَّهُـمَّ زِدْ هَذَاالْبَيْتَ تَشْرِيفاً وَتَعْظِيماً وَتَكْرِيماً وَمَهَابةً، وَزِدْ مَنْ شَرَّفَهُ وَعَظَّمَهُ مِمَّـنْ حَجَّـهُ أَواعْتَمَـرَهُ تَشْرِيفاً وَتَكْرِيماً وَتَعْظِيماً وَبِـرّاً﴾رواه الشـافعي والطبراني والبيهقي مرسلاً. ئینجا دەلّێ: ﴿اَللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ فَحَيِّنَا رَبَّنَا بِالسَّلاَمِ﴾رواه البيهقي باسناد ليس بقوي.

## ﴿(طَوافُ الْقُدُومِ)﴾

ئینجا كه ویستی بڕواته ناو ناو (الْمَسْجِدالْحَرام)، سوننەته بلّـێ: ﴿بِسْمِ اللهِ، اَلْحَمْـدُ لِلَّـهِ، وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلى رَسُولِ اللهِ، رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوابَ رَحْمَتِـكَ﴾، حديث حسن رواه الترمذي الاّ(التسمية والحمد) فابن السني.

ئینجا بلّێ: (بسم الله)و پێی ڕاستەی پێشدا بنێتـه ژوورەوەو نیـەتی (إعتكـاف) بێنـێ، جا بۆ هاتنه دەرەوەش هەمان زیكرو دوعا دەكا، بەلاّم ئەم جـاره دەلّـێ: ﴿وَافْتَحْ لِي أَبْـوابَ فَضْلِكَ﴾و پێی چەپەی پێشدا دەباته دەرەوه.

(ثُمَّ يَدْخُلُ الْمَسْجِدَ) ئینجـا دەچێته نـاو (الْمَسْجِدالْحَرام)-كـه دەورەی لـه (بَيْـت)=(كَعْبَـة) داوەو- جا سوننەته (مِنْ بَابِ بَنِىشَيْبَةَ) لـه دەرگـەی (بنیشَيْبة)وە-كـه ئێستا بـه (باب السلام) ناو دەبرێ- بچێته ژوورەوه (وَيَبْتَدِئُ بِطَوَافِ الْقُدُومِ) سـوننەته: یەكسـەر دەست به (طَوافُ الْقُدُوم) بكا، واتـه: (تَحيَّةالمسجد) ناكـا، هـەروەك لـه (المجمـوع)و (الشرواني)دا فەرموويانه ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَاللهُعَنهـا: أَوَّلُ شَيْءٍ بَدأَ بِهِ النَّبِيُّﷺ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ أَنْ تَوَضَّأَ ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ﴾ رواه الشيخان، كـه پێغەمبەرﷺ هاتـه (مكة)، یەكـەم شت دەستنوێژی گـرت، ئینجا تەوافی (بَيْت)ی كرد.

ئینجـا بزانـه: ئەگـەر دەترسـا نوێـژێكی واجبـی بفـەوتێ، یـان جەماعـەتی بفـەوتێ، یـان سوننەتێكی (مُؤَكَّدَة)ی بفەوتێ، ئەو كاته خۆی بـه ئەوانـه خـەریك دەكـاو لـه دوای ئەوانـه تەوافەكـه دەكـا، هـەروەها سـوننەته: تـەواف بكـا ئینجـا بارگـەو بارخانـەی دابمـەزرێنێ، هەروەك له سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانه ڕوون كراوەتەوه.

وَيَخْتَصُّ طَوَافُ الْقُدُومِ بِحَاجٍّ دَخَلَ مَكَّةَ قَبْلَ الْوُقُوفِ، وَمَنْ قَصَدَ مَكَّةَ لاَ لِنُسُكٍ اُسْتُحِبَّ لَهُ أَنْ يُحْرِمَ بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ، وَفِي قَوْلٍ يَجِبُ إِلاَّ أَنْ يَتَكَرَّرَ دُخُولُهُ كَحَطَّابٍ وَصَيَّادٍ.

---

جا بزانە: (طَوافُ القُدُوم) سوننەتە، کەواتە: ئەگەر (طَوافُ القُدُوم) نەکا، حەجی دروست دەبێ، بەڵام خێرە گەورەکەی لە دەست دەچێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَيَخْتَصُّ طَوافُ القُدُومِ) ئەو (طَوافُ القُدُوم)ەی حەج تایبەتە (بِحَاجٍّ) بەو کەسەی ئیحرامی بە حەج، یان بە حەج‌و عومرە بەستوەو (دَخَلَ مَكَّةَ قَبْلَ الْوُقُوفِ) پێش چوونە (عَرَفَة) هاتبێتە ناو (مکة)، چونکە لە دوای (عَرَفَة) کاتی تەوافی ڕوکنی حەج دادێ، ئەگەر ئیحرامیشی بە تەنها عومرە بەستبێ، ئەوە تەوافی ڕوکنی عومرە دەکا.

جا بزانە: هەر کەسێك بچێتە ناو (مکة)، سوننەتە (طَوافُ القُدُوم) بکا، جیاوازی حاجی‌و بازرگان‌و ڕێبوارەکانی‌تریش نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَمَنْ قَصَدَ مَكَّةَ) هەر کەسێك ویستی بڕواتە (مکة)ی پیرۆز (لاَ لِنُسُكٍ) بەڵام مەبەستی حەج‌و عومرەی نەبو (أُسْتُحِبَّ لَهُ) بۆی سوننەتە: (أَنْ يُحْرِمَ بِحَجٍّ أَوْ عُمْرَةٍ) ئیحرام بە حەج، یان بە عومرە ببەستێ—لە فەرموودەی بەهێزتردا— بەڵام (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی‌تردا (يَجِبُ) واجبە: ئیحرام ببەستێ (إِلاَّ أَنْ يَتَكَرَّرَ دُخُولُهُ) مەگەر زۆر چوونە(مکة)ی دووبارە ببێتەوە (كَحَطَّابٍ وَصَيَّادٍ) وەکو دارفرۆش‌و نێچیرەوان‌و شوفێرو ئەو جۆرە کەسانە، ئینجا بەڵگەی فەرموودەی بەهێزتر چەند حەدیسێکن: وەك ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ﴾ رواه مسلم واصحاب السنن، پێغەمبەرﷺ چووە ناو (مکة)و مێزەرێکی ڕەشی لە سەر بوو و ئیحرامی نەبەستبو.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی چۆنیەتی‌و واجبەکانی تەوافی ماڵی خوای گەورە ﴾

**پێناسە:** (كَعْبَة)-(بَيْت)-(بَيْتُ اللهِ الْحَرام)-ماڵی خوای‌گەورە—کە قیبلەی موسوڵمانانە—ئەو ژوورەیە: کە حەزرەتی (ابراهیم)پێغەمبەرﷺ بە فەرمانی خوا دروستی کردوەو لە قورئانی‌پیرۆزدا باس کراوە، ئەو ژوورە دەکەوێتە ناو (اَلْمَسْجِدالْحَرام)، (اَلْمَسْجِدالْحَرام)ش دەوری لە ژوورەکە داوە، هەروەها (اَلْمَسْجِدالْحَرام)ش دەکەوێتە ناو شاری (مکة)ی پیرۆز، (مکة)ش دەکەوێتە ناو (اَلْحَرَم)—واتە: زەمینی ڕێزدارو قەدەغەکراو— ئەو زەمینەش بەشێکە لە هەرێمی (حِجاز).

ئینجا بزانە: ئەو ژوورەی(كَعْبَة) بە چوار قوڕنەیی دروست کراوە: قوڕنەی یەکەمی—کە دەکەوێتە لای باشووری ڕۆژهەڵات— پێی دەگوترێ: (رُكْنُ الْحَجَرِالأَسْوَد)-قوڕنەی بەردە ڕەشەکە، چونکە بەردە ڕەشەکەی بەهەشتی تێدا داندراوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿نَزَلَ الْحَجَرُالأَسْوَدُ مِنَ الْجَنَّةِ وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضاً مِنَ اللَّبَنِ فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ﴾ رواه

الترمذي وحسنه، ئەو بەردە ڕەشەی قوڕنەی (بَيْت) لە بەهەشتەوە هاتۆتە خوارەوە، لە شیر سپی‌تر بوو، بەڵام تاوانەکانی ئادەمیزادان ڕەشی کردوە.

ئینجا کە چەپەت لە لای (بَيْت) بۆ بەرەو باکور دێ، دەگەیە دەرگەی (بَيْت)، نێوان قوڕنەی بەردە ڕەشەکەو دەرگە، پێی دەگوترێ: (اَلْمُلْتَزَم).

ئینجا کە لە دەرگە تێدەپەڕی لە لای ڕاستەت (مَقَامُ إِبْرَاهِيم) دانراوە: کە بەردێکە لە کاتی دروستکردنی (بَيْت) حەزرەتی (ابراهیم) پێغەمبەرﷺ لە سەری ڕاوەستاوەو شوێنی پێیەکانی دیارە، بەڵام ئێستا ئەو بەردە قەفەسێکی لە دەورە کراوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلرُّكْنُ وَالْمَقَامُ يَاقُوتَتَانِ مِنْ يَوَاقِيتِ الْجَنَّـــةِ﴾ رواه البيهقي باسناد صحيح، بەردە ڕەشەکەو بەردی (مَقام إبْراهِيم) دوو یاقووتن لە یاقووتەکانی بەهەشت.

هەر وەها نێوان (اَلْحَجَرالأَسْوَد)و (مَقامِ إبراهيم)، پێی دەگوترێ: (اَلْحَطِيم)، ئینجا دەگەیە قوڕنەی دووەمی (بَيْت) کە پێی دەگوترێ: (اَلرُّكْنُ الْعِراقِي)، لەم قوڕنەوە بەشێکی (بَيْت) بە دیوارێکی نەوی جیا کراوەتەوەو پێی دەگوترێ: (حِجْرِ إسماعيل)-عَلَيْهِ السَّلام- تا دەگاتە قوڕنەی سێیەمی (بَيْت)، کە پێی دەگوترێ: (اَلرُّكْنُ الشَّامِي) زۆر جاریش قوڕنەی دووەم‌و سێیەم-کە (حِجْرِ إسماعيل) لێیان جیا کراوەتەوە- هەردووکیان بە (اَلرُّكْنانِ الشَّاميان) ناو دەبرێن، ئینجا بەرەو باشور دەسوڕێیەوەو دەگەیە قوڕنەی چوارەم، کە پێی دەگوترێ: (اَلرُّكْنُ الْيَمانِي).

جا بزانە: تەواف ئەوەیە: حەفت جار بە دەورەی (بَيْت)دا بسوڕێیەوە، دووبارە بزانە: حەج سێ تەوافی هەنە، یەکەم: (طَوافُ الْقُدُوم)، ئەم تەوافە سوننەتەو کاتەکەشی ئەمەیە: کە لە دوای ئیحرامبەستنی بە حەج دێیە ناو (مكة)ی پیرۆز، هەروەك ڕوونمان کردەوە.

دووەم: (طَوافُ الإفاضَة)-(طَوافُ الرُّكْن)-(طَوافُ الزِّيارَة)-(طَوافُ الصَّدَر)، ئەم تەوافە ڕوکنی حەجە، ئەگەر نەیکا حەجی دروست نابێ‌و بە تەواوی لە ئیحرام دەرناچێ، کاتی ئەم تەوافە: کە لە وەستانی(عَرَفَة) گەڕاوە، لە دوای نیوەشەوی جەژنەوە دەست پێدەکا.

سێیەم: (طَوافُ الْوَداع) ئەم تەوافە واجبە، ئەگەر نەیکا حەجی دروست دەبێ، بەڵام خوێنی لە سەر واجب دەبێ، کاتی ئەم تەوافە: لە دوای تەواوبوونی حەج‌و عومرەیە، پێش ئەوەی لە (مكة) بڕواتە دەرەوە.

دیسان بزانە: عومرە دوو تەوافی هەنە، یەکەم: (طَوافُ الْعُمْرَة): کە ڕوکنی‌عومرەیە، ئەگەر نەیکا، عومرەکەی دروست نابێ، کاتەکەشی لە دوای ئیحرامبەستنەوە دەست پێدەکا.

دووەم: (طَوافُ الْوَداع) وەك (طَوافُ الْوَداع)ی حەج، بەڵام ئەگەر لە یەك سەفەردا حەج‌و عومرە بکا، ئینجا لە (مكة) بڕواتە دەرەوە، ئەو کاتە یەك (طَوافُ الْوَداع) دەکا بۆ هەردووکیان.

(فَصْلٌ) للطَّوَافِ بِأَنْوَاعِهِ وَاجِبَاتٌ وَسُنَنٌ، أَمَّاالْوَاجِبَاتُ: فَيُشْتَرَطُ سَتْرُالْعَوْرَةِ وَطَهَارَةُالْحَدَثِ

جگه لەو تەوافانەش تەوافی نەزرکراو هەیەو تەوافی سوننەتیش هەیە، کە پەیوەندییان بە حەج‌و عومرەوە نیە، چونکە وەها خێرە تا لە (مكة) بمێنێتەوە زۆر تەواف بکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

بەڵام لە سەر فەرموودەی بەهێزتر: نوێژی سوننەت لە ناو (اَلْمَسْجِدِالْحَرام)دا خێرترە: لە تەوافی سوننەت، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ باسی واجبەکانی تەواف ﴾

بزانە: لە تەوافەکانی حەج‌و عومرەدا نیەتهێنان واجب نیە، بەڵام لە تەوافەکانی‌تری نەزرو سوننەتدا واجبە نیەت بێنێ، ئینجا بزانە: لە هیچ تەوافێکدا دروست نیە سورانەوەی خۆی بۆ مەبەستێکی‌تر بەکار بێنێ، واتە: ئەگەر لە حاڵەتی‌تەوافدا ویستی بگاتە کەسێکی‌تر، یان ویستی لە بەر کەسێك خۆی بشارێتەوە، یان ڕا بکا، ئەوە تەوافەکەی دەپچڕێ، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ڕوون کراوەتەوە.

(لِلطَّوَافِ بِأَنْوَاعِهِ) بۆ تەواف کردن بە گشت جۆرەکانی واجب‌و سوننەتیەوە—کە باسمان کردن— (وَاجِبَاتٌ وَسُنَنٌ) چەند واجبێك‌و چەند سوننەتێکی هەنە: (أَمَّاالْوَاجِبَاتُ) هەرچی واجبەکانی تەوافن: هەشتن، ئەگەر یەکێکیان نەبێ تەوافەکەی دروست نابێ:

واجبی‌یەکەم: (فَيُشْتَرَطُ سَتْرُالْعَوْرَةِ) بە مەرج دادەندرێ عەورەتی داپۆشێ وەکو داپۆشینی نوێژ، واتە: نێرینە نێوان ناوك‌و ئەژنۆی داپۆشێ‌و ئافرەت‌و نێرامووك گشت لاشەیان داپۆشن، جگە لە ڕووخسارو لەپەدەستەکانیان ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: بَعَثَنِي أَبُوبَكْرٍ ﷺ فِي الْحَجَّةِ الَّتِي أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللهِ ﷺ يُؤَذِّنُ فِي النَّاسِ: أَلاَّ يَحُجَّ بَعْدَالْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ﴾ رواه الشيخان، لەو حەجەدا کە پێغەمبەرﷺ ئیمامی(ابوبكر)ی لە سەر کردبوە ئەمیر، ئیمامی(ابوبكر) منی نارد بانگەوازی بکەم: لەم ساڵ بەولاوە نابێ هیچ کافرێك حەج بکاو نابێ هیچ ڕووتێك تەواف بکا.

کەوابو: ئەگەر بەشێکی کەمی عەورەتی بەدەر بکەوێ: وەك بەشێکی مووی سەری ئافرەت، یان نینۆکێکی پێی، ئەو بەشە تەوافەی لەو حاڵەتەدا کردویەتی دروست نابێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

واجبی‌دووەم: (وَطَهَارَةُالْحَدَثِ) پاکی تەوافکەرەکەیە: لە بێدەستنوێژی گەورەو بچووك، واتە: ئەگەر بێدەستنوێژ بێ، یان جەنابەتدار بێ، یان حەیزدار بێ، حەرامە تەواف بکاو تەوافەکەشی دروست نابێ ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: أَوَّلُ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ

وَالنَّجَسِ، فَلَوْ أَحْدَثَ فيه تَوَضَّأَ وَبَنَى، وَفي قَوْلٍ يَسْتَأْنِفُ،

---

حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ أَنْ تَوَضَّأَ ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ﴾رواه البخاري، يەکەم شت پێغەمبەرﷺ دەستنوێژی گرت، ئینجا تەوافی (بَیْت)ی کرد. ﴿وَعَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: قَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَائِضٌ، فَقَالَ النَّبيُّﷺ: إِفْعَلِي كَمايَفْعَلُ الْحَاجُّ غَيْرَ أَلاَّتَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَّى تَغْتَسِلِي﴾ رواه الشيخان، کە هاتمە (مكة) لە حەیزدا بوم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کردارەکانی حەج بکە، بەڵام تەوافی (بَیْت) نەکەی تا پاك دەبیەوەو غوسل دەکەی.

ئینجا بزانە: هەر ئەو حەدیسەش بەڵگەیە: کە-جگە لە تەواف- هیچ کردارێکیتری حەج پێویستی بە دەستنوێژ نیە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

(وَالنَّجَسِ) هەروەها پاکی‌یە لە پیسی، واتە: ئەگەر لاشەی، یان جلەکانی پیس بوبێ، یان شوێنی تەوافی پیس بوبێ، تەوافەکەی دروست نابێ، (ابن عباس)رَضِيَ اللهُ عَنهُما دەفەرموێ: ﴿اَلطَّوَافُ حَوْلَ الْبَيْتِ مِثْلُ الصَّلاَةِ إلاَّ أَنَّ اللهَ أَبَاحَ فِيهِ الْكَلاَمَ﴾رواه الترمذي والبيهقي بسند حسن، تەواف لە دەورەی(بَیْت) وەکو نوێژە، بەڵام خوایگەورە قسەکردنی لە تەوافدا حەڵاڵ کردوە. واتە: هەروەك نوێژ بە پیسیەوە دروست نابێ، تەوافیش دروست نابێ.

(فَلَوْ أَحْدَثَ فِيهِ) جا ئەگەر لە ناو تەوافدا بێدەستنوێژ بوو، یان بەشێکی کەمی عەورەتی دەرکەوت، یان لاشەی، یان جلی پیس بوو (تَوَضَّأَ) دەستنوێژ دەگرێتەوە، هەروەها عەورەتی دادەپۆشێتەوە، هەروەها پیسیەکەی لادەبا، ئینجا (وَبَنَى) لە سەر ئەوەی کردویەتی دەست پێدەکاتەوە، واتە: لە کوێ بێدەستنوێژ بووە، یان عەورەتی دەرکەوتوە، یان پیس بووە، لەوێوە تەوافەکەی دەست پێدەکاتەوەو تەواوی دەکا، چونکە مەرج نیە تەواف بە دوای یەکتردا بکرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

بەڵام ئەو بەشە تەوافەی بە بێدەستنوێژی، یان بە عەورەتی دەرکەوتوو، یان بە پیسیەوە کردویەتی، دروست نەبوەو بەر نەکەوتووە، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرمودەیەکی کۆندا (يَسْتَأْنِفُ) واجبە: لە سەرەتاوە دەست بە تەواف بکاتەوە.

## ﴿ تەوافی بە مەزهەبی(حنفي) ﴾

لە کاتی تەواف کردندا زۆر ڕوو دەدا: ئافرەتو پیاو ئەندامێکی ڕووتیان وێك دەکەوێو دەستنوێژیان دەشکێ، بۆیێ وا باشە: لە سەفەری حەجدا ئافرەتو پیاو (تَقْلِيد)ی مەزهەبی ئیمامی(حنفي) بکەن، چونکە لە مەزهەبی ئەودا: بە وێککەوتنو دەست لێکدانی ئافرەتو پیاو دەستنوێژ ناشکێ، بەڵام هەر کەسێك لەم مەسەلەیەدا (تَقْلِيد)ی مەزهەبی (حنفي) بکا، واجبە: لە دەستنوێژدا لای کەم چوارێکی سەری مەسح بکاو هەم واجبە

..............................................................................

تێبینی ئەوەش بکا: کە لە مەزهەبی ئەودا: بە کێم، یان بە خوێن لێهاتن‌و بە ڕشانەوەی پڕ بە دەم‌و بە پێکەنینی بە دەنگ لە ناو نوێژدا دەستنوێژ دەشکێ، هەروەك لە کتێبەکانی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ تەوافی بە تەیەمموم ﴾

ئەو کەسەی پێش (طَوافُ الإفاضَة)ی ڕوکنی حەج، یان پێش تەوافی ڕوکنی عومرە، نەخۆش دەبێ، یان ئەندامێکی دەشکێ، یان بریندار دەبێ‌و ناتوانێ ئاو بەکار بێنێ، ئەوە ئەگەر شکستەکەی، یان برینەکەی داپۆشەرێکی لە سەر بوو، تەماشا دەکرێ: ئەگەر داپۆشەرەکە لە ئەندامی (تَیَمّم)دا نەبو و لە سەر بێ‌دەستنوێژیش داینەنابو، دروستە: بۆ تەوافەکانی ڕوکنی حەج‌و عومرە تەیەمموم بکاو تەوافەکانیشی دروست دەبن‌و لە ئەستۆی لادەچن، بەڵام ئەگەر داپۆشەرەکەی لە سەر بێ‌دەستنوێژی دانابو، یان لە ئەندامی (تَیَمّم)دا بوو، ئەوە مەرجە: کاتی گەڕانەوەی حاجی‌یەکان هاتبێ‌و بترسێ هاوڕێکانی بەجێی بهێڵن، ئینجا بۆ تەوافی ڕوکن تەیەمموم بکا، جا بەو تەیەممومە ناتەواوە تەوافەکەی دروست دەبێ، واتە: لە ژێر ئیحرام دەردەچێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەوافی ڕوکنی هەر لە ئەستۆدا دەمێنێ‌و هەر کاتێك بۆی بگونجێ، واجبە: بچێتەوە (مكة)و تەوافەکە دووبارە بکاتەوە، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: ئەوەی‌ڕابردوو بە گوێرەی فەرموودەی بەهێزی ئیمامی(الشافعي) بوو، بەڵام لە فەرموودەی بێ‌هێزی مەزهەبی(الشافعي)و بە فەرموودەی زانایەکانی‌تری-جگە لە مەزهەبی(الشافعي)-: ئەگەر داپۆشەرەکەی لە سەر بێ‌دەستنوێژی دانابێ، یان لە سەر ئەندامی (تَیَمّم) دانابێ، لە هیچ حاڵەتێکدا قەزاکردنەوەی نوێژی لە سەر نیە، هەروەك لە (المجموع)دا لە باسی (تَیَمّم) ڕوونی کردۆتەوە.

کەوابو: ئەو کەسەی داپۆشەری برینەکەی، یان شکستەکەی لە سەر بێ‌دەستنوێژی داناوە، یان لە سەر ئەندامی (تَیَمّم) دایناوە، بۆی دروستە: (تقليد)ی فەرموودە بێ‌هێزەکە بکا، یان (تقليد)ی زانایەکانی‌تر بکاو دەستنوێژ بگرێ‌و داپۆشەرەکەش بە ئاو مەسح بکاو تەیەممومیش بکاو هەر بەو تەیەممومەش تەوافی ڕوکن بکا، تەوافەکەشی دروست دەبێ‌و بە یەکجاری لە ئەستۆی لادەچێ‌و نایەوێ دووبارەی بکاتەوە، وَاللهُ أعْلَم.

## ﴿ تەوافی ئافرەتی حەیزدار ﴾

دروستە: ئافرەت دەرمان بەکار بێنێ: تاکو حەیزی پێش بکەوێ، یان دوا بکەوێ، بۆ ئەوەی بە پاکی (طَوافُ الإفاضَة)ی ڕوکنی‌حەج بکا، جا ئەگەر ئافرەتێك بۆ کاتی (طَوافُ الإفاضَة) حەیزی تووش بوو و ماوەی حەیزەکەش ئەوەندە درێژ دەبۆوە: هاوڕێکانی

وَأَنْ يَجْعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِه، مُبْتَدِئاً بِالْحَجَرِ الأَسْوَد مُحَاذِياً لَهُ فِي مُرُورِه بِجَمِيعِ بَدَنِـهِ، فَلَوْ بَدَأَ بِغَيْرِ الْحَجَرِ لَمْ يُحْسَبْ، فَإِذَا انْتَهَى اِلَيْه ابْتَدَأَ مِنْهُ،

---

بەجێیان دەهێشتو هەر پاك نەدەبۆوە، ئەو ئافرەتە بۆی دروستە بە فەرموودەکەیتری ئیمامی (الشافعي) ڕەفتار بکا، کە دەفەرموێ: (**لە ماوەی حەیزدا ئەو ڕۆژانەی خوێنیحەیز نایێو دەوەستێ، ڕۆژەکان بە پاکی دادەندرێن**).

جا ئەم فەرموودەیە لەگەڵ مەزهەبی ئیمام(مالك)و ئیمام(أحمد) تێك دەکاتەوە، کەوابو: هەر کاتێك ئافرەتەکە خوێنی وەستا، غوسل دەکاو (طَوافُ الإفاضَة) دەکاو بەو فەرموودەیە بۆی دروست دەبێو بە بەر ڕوکنی حەج دەکەوێ، جا ئەگەر خوێنی نەوەستا، دروستە: دەرمان بەکار بێنێو ماوەیەك خوێنەکە بوەستێنێ، هەروەك لە (حاشية الإيضاح)دا (ابن حجر) ئەو مەسەلەی ڕوون کردۆتەوە.

واجبیسێیەم: (وَأَنْ يَجْعَلَ الْبَيْتَ عَنْ يَسَارِهِ) دەبی لە هەموو تەوافەکەیدا (بَيْت) بخاتە لای چەپەیو ڕاستەی بکەوێتە دەرەوەو بەرەو پێشەخۆی بڕوا ﴿عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ أَتَى الْحَجَرَ فاسْتَلَمَهُ ثُمَّ مَشَى عَلَى يَمِينِهِ فَرَمَلَ ثَلاثاً وَمَشَى أَرْبَعاً﴾ رواه مسلم والترمذي، کە پێغەمبەرﷺ هاتە (مكة) بۆ تەواف کردن، ڕووی کردە (اَلْحجَرُالأَسْوَد)و دەستی لێدا، ئینجا بە لایڕاستەیدا ڕۆیشتو لە هەرسێك خولەکانی سەرەتایتەوافدا بە تاڵوکە دەڕۆیشتو لە چوارەکەیتریشدا بە عادەتی دەڕۆیشت.

کەوابو: ئەگەر پاشەوپاش ڕۆیشت، یا بە لای چەپەیدا ڕۆیشت، یان لە کاتی ڕۆیشتندا ماوەیەکی کەم سینگی سوڕا لای (بَيْت)، ئەو بەشە تەوافەی دروست نابێ، هەروەك لە (نهاية)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، ئیتر لەو چەپە تێکردنەو لە مەسەلەکانیتردا: جیاوازی گەورەو منداڵو پیادەو سوارو هەڵگیراو و دانیشتوو و درێژبوو و بە پێوە نیە، هەروەك لە (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

واجبیچوارەم: (مُبْتَدِئاً بِالْحَجَرِالأَسْوَدِ) لە قوڕنەی (اَلْحجَرُالأَسْوَد)ەوە دەست بە تەواف بکا، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو (مُحَاذِياً لَهُ فِي مُرُورِهِ) واجبە: لە سەرەتای تەوافەکەیدا بەرامبەر (الْحَجَرالأَسْوَد) بێ (بِجَمِيعِ بَدَنِهِ) بە هەموو لایچەپەی لاشەکەی، کەوابو: ئەگەر لە سەرەتای تەوافەکەیدا گشت لایچەپەی بەرامبەر (الْحَجَرالأَسْوَد) نەبێ، ئەم خولەی دروست نابێ.

هەروەها (فَلَوْ بَدَأَ بِغَيْرِالْحَجَرِ) ئەگەر لە شوێنێکیترەوە –جگە لە (الْحَجَرالأَسْوَد)– دەستی بە تەواف کرد (لَمْ يُحْسَبْ) ئەم خولەی دروست نابێو لە حەفت خولەکە نازمێردرێ، بەڵام (فَإِذَا انْتَهَى إِلَيْهِ) هەر کاتێك لە سوڕانەوە گەیشتە (الْحَجَرالأَسْوَد)، ئەوە (ابْتَدَأَ مِنْهُ)

وَلَوْ مَشَى عَلَى الشَّاذَرْوَان أَوْ مَسَّ الْجِدَارَ فِي مُوَازَاته أَوْ دَخَلَ مِنْ إِحْدَى فَتْحَتَيِ الْحِجْرِ وَخَرَجَ مِنَ الأُخْرَى لَمْ يَصِحَّ طَوَافُهُ، وَفِي مَسْأَلَةِ الْمَسِّ وَجْهٌ، وَأَنْ يَطُوفَ سَبْعاً، وَدَاخِلَ الْمَسْجِد.

---

لەوێوە دەبێتە سەرەتای تەواف‌و ئەم جارە لێرەوە خولەکانی بۆ دەژمێردرێن، کەوابو: وا باشە لای ڕاستەیخۆی بەرامبەر سەرەتای تەنیشتی (الْحَجَرالأسْوَد) بکا، ئینجا تۆزێك تەنیشت‌و تەنیشت بڕوا، تا ڕاستەی لە تەنیشتەکەیتری (الْحَجَرالأسْوَد) تێدەپەڕێ، ئینجا خۆی بسوڕێنێ‌و دەست بە تەواف بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

واجبی‌پێنجەم: لە هەموو تەوافدا دەبی هەموو لاشەی لە دەرەوەی (بَیْت) بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾ با تەواف بە دەرەوەی (بَیْت)دا بکەن. کەوابو: (وَلَوْ مَشَى عَلَى الشَّاذَرْوَانِ) ئەگەر بە سەر لێوە دیوارەکەی (بَیْت)دا ڕۆیشت–کە لە بەرینی‌ی‌دیوارەکە بە لای‌دەرەوەیە– (أَوْ مَسَّ الْجِدَارَ فِي مُوَازَاتِهِ) یان لە ئاستی لێوەدیوارەکە دەستی لە دیواری (بَیْت) دا، یان دەستی لە سەر دیواری (حِجْرِإسْماعِيل) دانا (أَوْ دَخَلَ مِنْ إِحْدَى فَتْحَتَيِ الْحِجْرِ) یان لە زارکێکی (حِجْرِإسْماعِيل) چووە ژوورەوەو (وَخَرَجَ مِنَ الأُخْرَى) لە زارکەکەیتر هاتە دەرەوە (لَمْ تَصِحَّ طَوْفَتُهُ) ئەو بەشە تەوافەی دروست نابێ، چونکە لە دەرەوەی (بَیْت)دا تەوافی نەکردوە، بەڵکو بە ناو (بَیْت)دا کردویەتی﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْجَدْرِ أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ نَعَمْ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ فەرمووی (جَدْر)–واتە: (حِجْرِإسْماعِيل)– پارچەیەکە لە (بَیْت). بەڵام (وَفِي مَسْأَلَةِ الْمَسِّ وَجْهٌ) لە مەسەلەی دەست لێدانی دیواری (بَیْت) فەرموودەیەکی بێ‌هێز هەیە: کە زیانی نیە.

واجبی‌شەشەم: (وَأَنْ يَطُوفَ سَبْعاً) دەبی حەفت خولی تەواو بە دەورەی (بَیْت)دا بسوڕێتەوە، هەر خولێکی لە (الْحَجَرالأسْوَد)ەوە بۆ (الْحَجَرالأسْوَد) بێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی (جابر)ی‌ڕابردوو، کەوابو: ئەگەر لەو حەفت خولە تەنها هەنگاوێکی ناتەواو بێ، تەوافەکەی دروست نیەو تەواو نابێ، بەڵام ئەگەر لە حەفت خول زیاتر بکا تەوافەکەی بەتاڵ نابێ، جا ئەگەر کەوتە گومان: چەند خولی کردون؟ واجبە: لای کەمی لێبگرێ‌و خولی‌تر بکا، تا بێگومان تەوافەکەی دروست ببێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

هەروەها مەرجە لە خولی کۆتایی‌تەوافدا بە تەواوی بەرامبەر (الْحَجَرالأسْوَد) ببێتەوە، ئینجا تەوافەکەی تەواو دەبێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا ڕوون کراونەوە.

واجبی‌حەفتەم: (وَدَاخِلَ الْمَسْجِدِ) دەبی تەوافەکەی لە ناو (الْمَسْجِدِالْحَرام)دا بێ، واتە: ئەگەر لە دەرەوەی مزگەوتدا بسوڕێتەوە، تەوافەکەی دروست نابێ، چونکە پێغەمبەرﷺو

وَأَمَّاالسُّنَنُ: فَأَنْ يَطُوفَ مَاشِياً، وَيَسْتَلِمَ الْحَجَرَ أَوَّلَ طَوَافِه وَيُقَبِّلَهُ وَيَضَعَ جَبْهَتَهُ عَلَيْـــهِ، فَإِنْ عَجَزَ اسْتَلَمَ، فَإِنْ عَجَزَ أَشَارَ بِيَدِه، وَيُرَاعِي ذَلِكَ فِي كُلِّ طَوْفَةٍ،

---

(صحابة) لـه نـاو مزگـەوتی(الحرام)دا تـەوافیان كـردوه، پێغەمبـەریش ﷺ فەرموویـەتی: ﴿لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ﴾ رواه مسلم، كردەوەكانی حەج و عومرە لە من وەربگرن.

واجبیهەشتەم: نیەتی تەواف كردن ئەگەر تەوافەكە سەربەخۆ بێ، واتە: تـەوافی حـەج و عومرە نـەبێ، هـەروەها جگـە لـە مەبەسـتی تـەواف كـردن، بـە هـیچ مەبەسـتێكیتر هـیچ هەنگاوێك نەڕوا، هەروەك لە سەرەتای ئەم باسەدا ڕوونمان كردەوە.

## ﴿ سوننەتەكانی تەواف ﴾

(وَأَمَّاالسُّنَنُ) هەرچـی سـوننەتەكانی تـەوافن هەشـتن، یەكـەم: (فَـأَنْ يَطُـوفَ مَاشِـياً) وەهـا خێرتـرە بـە پیـادەیی تـەواف بكـا، مەگـەر عـوزرێكی هـەبێ، ئـەو كاتـە ناپەسـند نیـە بـە سواری، یان بە هـەڵگیراوی تـەواف بكـا، چـونكە لـە حەدیسـی (بخاری و مسلم)دا هـاتوە: ﴿پێغەمبەر ﷺ بە سواری تەوافی كرد، تاكو خەڵك بیبینن و پرسیاری لێبكەن﴾.

دووەم: (وَيَسْتَلِمَ الْحَجَرَ) سوننەتە دەست لە (الْحَجَرالأَسْوَد)بدا (أَوَّلَ طَوَافِـهِ) لـە سـەرەتای تەوافەكەیدا (وَ) هەروەها (يُقَبِّلَهُ) سوننەتە: ماچیشی بكا.

(وَ) هەروەها (يَضَعَ جَبْهَتَهُ عَلَيْهِ) تەوێڵەی لـە سـەر دابنـێ، واتـە: سـوجدەی لـە سـەر ببـا، ئەو سێ سوننەتانەش لە حەدیسی (صحیح)دا هاتون.

جـا بزانـە: ئـەو سـێیانەی ڕابردوو لـەو حاڵەتـەدا سـوننەتن كـە خـەڵكیتر تووشـی ئـازارو ماندووبوون نـەكا ﴿عَنْ عُمَرَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يَاعُمَرُ إِنَّكَ رَجُلٌ قَوِيٌّ لا تُـزَاحِمْ عَلَـى الْحَجَرِ فَتُؤْذِيالضَّعِيفَ إِنْ وَجَدْتَ خَلْوَةً، وَإِلاَّ فَاسْـتَقْبِلْهُ وَهَلِّـلْ وَكَبِّـرْ﴾ رواه الامامان: الشافعي واحمد، ئـەی (عمر) تـۆ پیـاوێكی بەهێزی لـە سـەر ماچـكردنی (الْحَجَرالأَسْوَد) پاڵەپەستە مەكە، نەوەك خەڵكی بێهێز ئازار بدەی، ئەگەر كەلێنێك هـەبو دەسـتی لێبدە، ئەگەرنا: ئاماژەی بۆ بكەو (لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ)و(اللهُ أَكْبر) بڵێ.

(فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر توانای ماچكردنی و سوجدەی نـەبو (اسْتَلَمَ) تـەنها دەسـتی لێدەدا، ئینجا دەستە لێدراوەكەش ماچ دەكا (فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر توانـای دەسـت لێدانیشـی نـەبو (أَشَارَ بِيَدِهِ) بە دەستیڕاسـتەی، یان چـەپەی ئامـاژە بـۆ دەسـت لێدانەكـەی دەكـا، ئینجـا دەستەكەی ماچ دەكا، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَيُرَاعِـي ذَلِـكَ فِـي كُـلِّ طَوْفَـةٍ) سـوننەتە: لـە گشـت خـولێكی تەوافـدا ئـەو دەسـت لێـدان و ماچكردن و ئامازەكەیڕابردوو بكـا ﴿عَنْ ابْنِ عَبَاس رَضِيَ اللهُ عَنهُمـا: طَافَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَـى بَعِـيرٍ كُلَّما أَتَى الرُّكْنَ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ عِنْـدَهُ وَكَبَّـرَ﴾ رواه البخاري، پێغەمبـەر ﷺ بـە سـواری

وَلاَ يُقَبِّلُ الرُّكْنَيْنِ الشَّامِيَّيْنِ وَلاَ يَسْتَلِمُهُمَا، وَيَسْتَلِمُ الْيَمَانِيَّ وَلاَ يُقَبِّلُهُ، وَأَنْ يَقُولَ أَوَّلَ طَوَافِهِ: بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللَّهُمَّ إِيمَاناً بِكَ وَتَصْدِيقاً بِكِتَابِكَ وَوَفَاءً بِعَهْدِكَ وَاتِّبَاعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ مُحَمَّدٍﷺ. وَلْيَقُلْ قُبَالَةَ الْبَابِ: اَللَّهُمَّ إِنَّ الْبَيْتَ بَيْتُكَ، وَالْحَرَمَ حَرَمُكَ وَالأَمْنَ أَمْنُكَ وَهَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ النَّارِ. وَبَيْنَ الْيَمَانِيَّيْنِ: اَللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ. وَلْيَدْعُ بِمَا شَاءَ، وَمَأْثُورُ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ مِنَ الْقِرَاءَةِ،

---

ووشترێك تەوافی كرد، هەر جارێك دەگەیشتە قوڕنـەی (الْحَجَرالأَسْوَد) ئاماژەی بۆ دەكردو (الله أكبر)ی دەگوت.

(وَلاَ يُقَبِّلُ الرُّكْنَيْنِ الشَّامِيَّيْنِ) وەهـا سـوننەتە هـەردوو قوڕنـەكانی شـامی-واتـە: عێراقـی‌و شـامی- مـاچ نـەكاو (وَلاَ يَسْتَلِمُهُمَا) دەستیشـیان لێنـەدا، چـونكە پێغەمبـەرﷺ ماچـی نەكردون‌و دەستیشی لێنەداون (وَيَسْتَلِمُ الْيَمَانِيَّ) سوننەتە قوڕنـەی یـەمانی دەست لێبدا، بەلام (وَلاَ يُقَبِّلُهُ) ماچی نەكا، چونكە پێغەمبەرﷺ دەستی لەم قوڕنەیـە دەدا بـەلام ماچـی نەدەكرد، ئەو حەدیسانە لە (بخاری‌و مسلم)دا گێڕدراونەوە.

ئینجا بزانە: ئەو ماچكردن‌و دەست لێدانەی ڕابردوو بۆ ئـافرەت سـوننەت نیـە، تـەنها لـەو حاڵـەتـەدا نـەبێ: كـە دەورەی (بَيْت) پیـاوی لێنـەبن، هـەروەك لـە زۆربـەی سەرچـاوەكاندا فـەرموویانە، هەروەها ماچـكردن‌و دەست لێدانی (مَقَامِ إبراهِيم)ش سوننەت نیـە، بـەڵكو (بِدْعَة)یە، هەروەك لە (الايضاح)دا فەرموویەتی.

سێیەم: (وَأَنْ يَقُولَ أَوَّلَ طَوَافِهِ) سوننەتە: كـە لـە سـەرەتای تـەواف دەسـتی بـە ڕۆیشـتن كرد، بڵێ: (بِسْمِ اللهِ وَاللهُ أَكْبَرُ، اَللَّهُمَّ إِيمَاناً بِكَ وَتَصْدِيقاً بِكِتَابِكَ وَوَفَاءً بِعَهْدِكَ وَاتِّبَاعاً لِسُنَّةِ نَبِيِّكَ مُحَمَّدٍﷺ). ئینجا لـە گشت خولێكدا كـە گەیشـتەوە بەرامبـەر (الْحَجَرالأَسْوَد) ئـەو زیكرەی ڕابردوو بڵێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

(وَلْيَقُلْ قُبَالَةَ الْبَابِ) با لە بەرامبەر دەرگـەی (بَيْت) بڵـێ: (اَللَّهُمَّ إِنَّ الْبَيْتَ بَيْتُكَ وَالْحَرَمَ حَرَمُكَ وَالأَمْنَ أَمْنُكَ، وَهَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ النَّارِ).

ئینجا (وَبَيْنَ الْيَمَانِيَّيْنِ) لە نێوان قوڕنەی یـەمانی‌و (الْحَجَرالأَسْوَد)دا بڵـێ: ﴿اَللَّهُمَّ-رَبَّنَا-آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ رواه احمد وصححه الحاكم.

ئینجـا جگـە لـەو زیكرو دوعایانـەی ڕابـردووش (وَلْيَدْعُ بِمَا شَاءَ) بـا لـە گشـت خولـەكانی تەوافدا هەر دوعایەكی حەز دەكا بیكا، جا بە هەر زمانێك بێ، هـەروەها سوننەتە: لـە نـاو تەوافدا قوڕئـان بخوێنـێ، بـەلام (وَمَأْثُورُالدُّعَاءِ) ئـەو زیكرو دوعایانـەی لـە پێغەمبـەرﷺو (صحابە)كانەوە هاتون (أَفْضَلُ) خێرترن (مِنَ الْقِرَاءَةِ) لە قوڕئان خوێندنی ناو تەوافدا.

وَهِيَ أَفْضَلُ مِنْ غَيْرِ مَأْثُورِهِ، وَأَنْ يَرْمُلَ فِي الأَشْوَاطِ الثَّلاثَةِ الأُولَى: بِأَنْ يُسْرِعَ مَشْيَهُ مُقَارِباً خُطَاهُ، وَيَمْشِيَ فِي الْبَاقِي، وَيَخْتَصُّ الرَّمَلُ بِطَوَافٍ يَعْقُبُهُ سَعْيٌ، وَفِي قَوْلٍ بِطَوَافِ الْقُدُومِ، وَلْيَقُلْ فِيهِ: اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاً مَبْرُوراً وَذَنْباً مَغْفُوراً وَسَعْياً مَشْكُوراً. وَأَنْ يَضْطَبِعَ فِي جَمِيعِ كُلِّ طَوَافٍ يَرْمُلُ فِيهِ،

---

(وَهِيَ) قورئان خوێندنی ناو تەواف (أَفْضَلُ) خێرترە (مِنْ غَيْرِ مَأْثُورِهِ) لەو زیکرو دوعایانەی لە پێغەمبەرﷺو (صَحابة)کانەوە نەهاتبن.

ئینجا بزانە سوننەتە: زیکرو دوعاو قورئان خوێندنی ناو تەواف گشتی بە نهێنی بن، مەگەر بیەوێ یەکێکیتر فێر بکا، ئەو کاتە دەنگ هەڵدێنێ، بەو مەرجەی خەڵکیتر ئازار نەدا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

چوارەم: (وَأَنْ يَرْمُلَ) سوننەتە: نێرینە بە تاڵوکە بڕوا (فِي الأَشْوَاطِ الثَّلاثَةِ الأُولَى) لە هەرسێك خولەکەی سەرەتای تەوافدا (بِأَنْ يُسْرِعَ مَشْيَهُ) بەو شێوەیە: پەلە لە ڕۆیشتنەکەیدا بکاو (مُقَارِباً خُطَاهُ) هەنگاوەکانیشی لێك نزیك بکاتەوە، واتە: غار نەداو فورکەش لێنەدا (وَيَمْشِي فِي الْبَاقِي) سوننەتە: لە چوار خولەکەیتریشدا بە عادەتی بڕوا ﴿عَنْ ابن عُمر رضي الله عنهما: رَمَلَ رَسُولُ اللهِﷺ مِنَ الْحَجَرِ إِلَى الْحَجَرِ ثَلاثاً وَمَشَى أَرْبَعاً﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ سێ خول لە بەردە ڕەشەکەوە تا بەردە ڕەشەکە، بە تاڵوکە ڕۆیشتو چوار خولیش بە عادەتی ڕۆیشت.

(وَيَخْتَصُّ الرَّمَلُ) ئەو ڕۆیشتنە بە تاڵوکەیە تایبەتە (بِطَوَافٍ يَعْقُبُهُ سَعْيٌ) بە تەوافێکی وەها: هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوەی بە دوادا بکرێ (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا تایبەتە (بِـ) بە (طَوَافِ الْقُدُومِ)، جا لە سەر فەرموودەی ڕاستتر: هەر تەوافێك هاتوچۆی سەفاو مەڕوەی بە دوادا نەکرێ، ئەو تاڵوکەیەی تێدا سوننەت نیە.

(وَلْيَقُلْ فِيهِ) سوننەتە: لە هەرسێك خولەکەی بە تاڵوکەدا لەگەڵ زیکرەکانیتریش بڵێ: (اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ حَجّاًمَبْرُوراً وَذَنْباًمَغْفُوراً وَسَعْياًمَشْكُوراً). هەروەها لە چوارەکەیتریشدا بڵێ: (اللَّهُمَّ-رَبِّ-اغْفِرْ وَارْحَمْ وَاعْفُ عَمَّا تَعْلَمْ إِنَّكَ أَنْتَ الأَعَزُّالأَكْرَمُ، اَللَّهُمَّ-رَبَّنَا-آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ). هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

پێنجەم: (وَأَنْ يَضْطَبِعَ) سوننەتە: نێرینە پەشتەماڵەکەی بخاتە بن هەنگڵی (فِي جَمِيعِ كُلِّ طَوَافٍ) لە هەر حەفت خولەکەی گشت تەوافێکی وەهادا: کە (يَرْمُلُ فِيهِ) تاڵوکەی تێدا سوننەتە، هەر چەند بە تاڵوکەش نەڕوا ﴿عَنْ اِبْنِ عَبَّاس رضي الله عنهما: اضْطَبَعَ النَّبِيُّﷺ هُوَ وَأَصْحَابُهُ وَرَمَلُوا ثَلاثَةَأَشْوَاطٍ وَمَشَوْا أَرْبَعاً﴾ رواه ابوداود والبيهقي بسندصحيح، پێغەمبەرﷺو (صحابة) پەشتەماڵەکانیان لە بن هەنگڵ داناو سێ خولی سەرەتا بە تاڵوکە ڕۆیشتنو

وَكَذَا فِي السَّعْيِ عَلَى الصَّحِيحِ، وَهُوَ جَعْلُ وَسَطِ رِدَائِهِ تَحْتَ مَنْكِبِهِ الأَيْمَنِ وَطَرَفَيْهِ عَلَى الأَيْسَرِ، وَلاَ تَرْمُلُ الْمَرْأَةُ وَلاَ تَضْطَبِعُ، وَأَنْ يَقْرُبَ مِنَ الْبَيْتِ، فَلَوْ فَاتَ الرَّمَلُ بِالْقُرْبِ لِزَحْمَةٍ فَالرَّمَلُ مَعَ بُعْدٍ أَوْلَى إِلاَّ أَنْ يَخَافَ صَدْمَ النِّسَاءِ فَالْقُرْبُ بِلاَ رَمَلٍ أَوْلَى، وَأَنْ يُوَالِيَ طَوَافَهُ،

---

چوارەکەیتریش بە عادەتی ڕۆیشتن. (وكَذَا فِي السَّعْيِ) هەروەها لە هاتوچۆی نێوان سەفاو مەروەشدا سوننەتە: وا بکا (على الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست.

(وَهُوَ) دانان لە بن هەنگڵ بەم شێوەیە: (جَعْلُ وَسَطِ رِدَائِهِ تَحْتَ مَنْكِبِهِ الأَيْمَنِ) ناوەندی پەشتەماڵەکەی لە بن شانی ڕاستەی دابنێ (وَطَرَفَيْهِ عَلَى الأَيْسَرِ) هەردوولایەکانیشی لە سەر شانی چەپەی دابنێ، واتە: لایەکی بە لای پشتەوەداو لایەکەیتریش بە لای سینگیدا بخاتە سەر شانیچەپە، شانیڕاستەش بە ڕووتی بهێڵێتەوە (ولاَتَرْمُلُ الْمَرْأَةُ) نابێ ئافرەت، یان نێرامووك لە تەواف کردندا-وەکو پیاو- بە تاڵوکە بڕوا (ولاَ تَضْطَبِعُ) نابێ پەشتەماڵەکەشی-وەکو پیاو- لە بن هەنگڵ دابنێ، واتە: ئەو دووانە تەنها بۆ نێرینە سوننەتن.

شەشەم: (وَأَنْ يَقْرُبَ مِنَ الْبَيْتِ) سوننەتە نێرینە-لە کاتی تەوافدا- لە (بَيْت) نزیك ببێتەوە (فَلَوْ فَاتَ الرَّمَلُ بَالْقُرْبِ) جا ئەگەر بە هۆی نزیکبوونەوەی لە (بَيْت) سێ خولەکەی بە تاڵوکەی دەفەوتا (لِزَحْمَةٍ) لە بەر پاڵەپەستە پێی نەدەکرا (فَالرَّمَلُ مَعَ بُعْدٍ أَوْلَى) ئەو تاڵوکەیە لە دوورەوە خێرترە (إِلاَّ أَنْ يَخَافَ صَدْمَ النِّسَاءِ) مەگەر لە دوورەوەش لە خۆلێدانی ئافرەتان بترسێ، ئەو کاتە (فَالْقُرْبُ) نزیکبوونەوە (بِلاَرَمَلٍ) بە بێ تاڵوکە (أَوْلَى) خێرترە، نەوەك خۆی لە ئافرەتان بدا.

ئینجا بزانە: بۆ ئافرەتان وەها سوننەتە: لە دوورەوەی (بَيْت) تەواف بکەن، تاکو تێکەڵی پیاوان نەبن، هەروەها ئەگەر پیاویش تووشی ئازار دەبو، یان خەڵکی ئازار دەدا، سوننەتە تۆزێك دوور بکەوێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بە بەڵگەی حەدیسەکەی ئیمامی (عمر)ی ڕابردوو.

حەفتەم: (وَأَنْ يُوَالِيَ طَوَافَهُ) سوننەتە: هەر حەفت خولەکانی تەواف بە دوای یەکتردا بکا، واتە: ئەگەر پچڕ پچڕیش بیکا دروست دەبێ، جا ئەگەر لە کاتی تەوافدا ئیقامەتی نوێژ کرا، یان کارێکی پێویست ڕوویدا، با واز لە تەواف بێنێو نوێژەکە بکاو کارەکەی جێبەجێ بکا، ئینجا بگەڕێتەوە تەوافەکەی تەواو بکا، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، هەروەها لە ناو تەوافدا: قسەکردنو خواردنو خواردنەوە گشتی دروستن، بەڵام ناپەسندن، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَأَنْ يُصَلِّيَ بَعْدَهُ رَكْعَتَيْنِ خَلْفَ الْمَقَامِ، يَقْرَأُ فِي الأُولَى قُلْ يَاأَيُّهَاالْكَافِرُونَ، وَفِي الثَّانِيَةِ الإِخْلاَصَ، وَيَجْهَرُ لَيْلاً، وَفِي قَوْلٍ تَجِبُ الْمُوَالاَةُ وَالصَّلاَةُ،

---

**هەشتەم:** (وَأَنْ يُصَلِّيَ بَعْدَهُ رَكْعَتَيْنِ) سوننەتە: لە دوای تەواوبوونی تەواف دوو ڕەکعەت نوێژی سوننەت بکا، جا لە هەر شوێنێکی (الْمَسْجِدالْحَرام)دا ئەو دوو ڕەکعەتە بکا خێرەکەی دەگاتێ، بەڵام (خَلْفَ الْمَقَامِ) لە پشت (مَقَامِ إبراهيمﷺ) خێرترە، ئینجا بە نیەتی سوننەتی تەواف ئەو نوێژە دەکاو (يَقْرأُ فِيالأُولَى) لە ڕەکعەتی یەکەمدا لە دوای فاتیحە (قُلْ يَاأَيُّهَاالْكَافِرُونَ) دەخوێنێو (وَفِيالثَّانِيَةِ الإِخْلاَص) لە ڕەکعەتی دووەمیشدا لە دوای فاتیحە (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) دەخوێنێ ﴿عَنْ جَابِرﷺ: فِي صِفَةِ حَجِّ النَّبِيِّﷺ: ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَﷺ فَقَرأَ:(وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى). فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ، وَكَانَ يَقْرَأُ فِيالرَّكْعَتَيْنِ: (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ) وَ(قُلْ يَاأَيُّهَاالْكَافِرُونَ)﴾ رواه مسلم، ئینجا لە دوای تەواف کردن، پێغەمبەرﷺ ڕۆیشتە لای (مَقَامِ إبراهيمﷺ) ئایەتی﴿وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى﴾ی خوێندەوە-واتە: لە (مَقَامِ إبراهيمﷺ) نوێژ بکەن- ئینجا لە پشت (مَقَامِ إبراهيم) دوو ڕەکعەت نوێژی سوننەتی کرد: لە دوای فاتیحە (قُلْ هُوَاللهُ أَحَدٌ)و (قُلْ يَاأَيُّهَاالْكَافِرُونَ)ی خوێندن.

(وَيَجْهَرُ لَيْلاً) ئەگەر لە شەوێدا ئەم نوێژە بکا، بە دەنگی ئاشکرا فاتیحەو سورەتەکان دەخوێنێو لە ڕۆژێدا بە نهێنی دەخوێنێ، ئینجا بزانە: تا مردنی تەوافکەرەکە کاتی ئەو نوێژە هەر دەمێنێو ئەگەر بگەڕێتەوەو لە وڵاتی خۆیدا ئەو سوننەتە بکا، هەر دروست دەبێو لە گشت کاتێکی ڕۆژێو شەوێدا دروستە ئەو نوێژە بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکی ئیمامی (الشافعي)دا (تَجِبُ الْمُوَالاَةُ) واجبە: خولەکانی تەواف بە دوای یەکتردا بکرێن (وَالصَّلاَةُ) هەروەها واجبە: لە دوای تەوافیش ئەو دوو ڕەکعەت نوێژە بکا، بەڵام لە فەرموودەی بەهێزتردا: ئەوانە گشتی سوننەتن.

ئینجا بزانە: ئەو کەسەی لە جیاتی کەسێکیتر حەج دەکا، ئەویش ئەو دوو ڕەکعەتە دەکاو، نوێژەکەش-وەکو حەج- بۆ حەج بۆکراوەکە دەبێ، هەروەها سەرپەرشتکاریش لەجیاتی منداڵینەفام ئەو دوو ڕەکعەتە دەکا، بەڵام منداڵیفامیدە بە خۆی دوو ڕەکعەتەکە دەکا، هەروەها لە دوای تەواوبوونی نوێژەکە، سوننەتە ئەم دوعایە بکا:

(اَللَّهُمَّ هَذَا بَلَدُكَ وَالْمَسْجِدُالْحَرامُ وَبَيْتُكَ الْحَرامُ، وَأَنَا عَبْدُكَ ابْن عَبْدِكَ إِبْنُ أَمَتِكَ أَتَيْتُكَ بِذُنُوبٍ كَثِيرَةٍ وَخَطَايا جَمَّةٍ وَأَعْمَالٍ سَيِّئَةٍ وَهَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ النَّارِ فَاغْفِرْ لِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُالرَّحِيمُ، اَللَّهُمَّ إِنَّكَ دَعَوْتَ عِبَادَكَ إِلَى بَيْتِكَ الْحَرَامِ وَقَدْ جِئْتُ طَالِباً رَحْمَتَكَ مُبْتَغِياً

وَلَوْ حَمَلَ الْحَلاَلُ مُحْرِماً وَطَافَ بِهِ حُسِبَ لِلْمَحْمُولِ، وَكَذَا لَوْ حَمَلَهُ مُحْرِمٌ قَدْ طَافَ عَنْ نَفْسِهِ، وَإِلاَّ فَالأَصَحُّ أَنَّهُ إِنْ قَصَدَهُ لِلْمَحْمُولِ فَلَهُ، وَإِنْ قَصَدَهُ لِنَفْسِهِ أَوْ لَهُمَا فَلِلْحَامِلِ فَقَطْ.

(فَصْلٌ) يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بَعْدَ الطَّوَافِ وَصَلاَتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْ بَابِ الصَّفَا لِلسَّعْيِ، وَشَرْطُهُ

---

مَرْضَاتِكَ وَأَنْتَ مَنَنْتَ عَلَيَّ بِذَلِكَ فَاغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانەو ئەو دوعایەی هێناوە.

## ﴿ تەواف کردن بە هەڵگیراوی ﴾

(وَلَوْ حَمَلَ الْحَلاَلُ مُحْرِماً) ئەگەر یەکێکی بێئیحرام یەکێکی بەئیحرامی هەڵگرتو (وَطَافَ بِهِ) بە دەوری (بَیْت)دا تەوافی پێکرد (حُسِبَ لِلْمَحْمُولِ) تەوافەکە بۆ هەڵگیراوەکە حیساب دەکرێو تەوافەکەی دروست دەبێ -وەك سوار وولاغ- ئەگەر واجبەکانیڕابردووی تەواف لە هەڵگیراوەکە هاتبنە جێ، جیاوازی نیە: هەڵگرەکە تەنها یەك کەس بێ، یان زیاتر بێ.

(وكَذَا) هەروەها تەوافەکە بۆ هەڵگیراوەکە دەبێ (لَوْ حَمَلَهُ مُحْرِمٌ) ئەگەر یەکێکی بەئیحرام، یان زیاتر هەڵیبگرێ، بەو مەرجەی (قَدْ طَافَ عَنْ نَفْسِهِ) ئەو بەئیحرامە تەوافەکەی خۆی کردبێ (وَإِلاَّ) بەڵام ئەگەر بەئیحرامەکە تەوافیخۆی نەکردبو (فَالأَصَحُّ) فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ إِنْ قَصَدَهُ لِلْمَحْمُولِ) ئەگەر هەڵگرەکە مەبەستی بێ: تەوافەکە بۆ هەڵگیراوەکە بێ (فَلَهُ) ئەوە تەوافەکە بۆ هەڵگیراوەکە دەبێ (وَإِنْ قَصَدَهُ لِنَفْسِهِ) ئەگەر هەڵگرەکە مەبەستی بێ: تەوافەکە بۆ خۆی بێ (أَوْ لَهُمَا) یان مەبەستی بێ: بۆ هەردووکیان بێ (فَلِلْحَامِلِ فَقَطْ) ئەوە لە هەردوو مەسەلەدا تەوافەکە تەنها بۆ هەڵگرەکە دەبێ، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا مەبەستی خۆی هەبوەو تەوافێکیش بۆ دوو کەسان نابێ.

ئینجا بزانە: لەو مەسەلانەدا جیاوازی نیە هەڵگیراوەکە: یەك کەس بێ، یان زیاتر بێ، بەڵام ئەگەر لە سەر شتێکدا لە سەر زەمین ڕایدەکێشا، یان پاڵی دەدا، ئەو کاتە -ئەگەر مەبەستیان بێ- تەوافەکە بۆ هەردووکیان دروست دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسی (سَعْي) هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوە ﴾

(يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ) سوننەتە: تەوافکەرەکە دەست لە (الْحَجَرالأَسْوَد) بدا (بَعْدَالطَّوَافِ وَصَلاَتِهِ) لە دوای تەواوبوونی تەوافو دوو ڕەکعەت نوێژەکەی تەواف (ثُمَّ يَخْرُجُ مِنْ بَابِ الصَّفَا) ئینجا لە دەرگەی سەفاوە بڕواتە دەرەوە (لِلسَّعْيِ) بۆ (سَعْی)کردن، واتە: هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوە (وَشَرْطُهُ) مەرجی دروستبوونی (سَعْی) سەفاو مەڕوە سێ مەرجن:

أَنْ يَبْدَأَ بالصَّفَا، وَأَنْ يَسْعَى سَبْعاً، ذَهَابُهُ مِنَ الصَّفَا إلَىالْمَرْوَةِ مَرَّةٌ وَعَوْدُهُ منْهَا إلَيْهِ أُخْرَى، وَأَنْ يَسْعَى بَعْدَ طَوَافِ رُكْنٍ أَوْ قُدُومٍ بحَيْثُ لاَ يَتَخَلَّلُ بَيْنَهُمَا الْوُقُوفُ بعَرَفَةَ،

---

يەكەم: (أَنْ يَبْدَأَ بالصَّفَا) لە سەفاوە دەست بە هاتوچۆيەكە بكا ﴿عَنْ جَابرٍ ﷺ في صفَةِ حَجِّ النَّبيِّ ﷺ: ثُمَّ رَجَعَ إلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ ثُمَّ خَرَجَ منَ الْبَاب إلَى الصَّفَا فَقَرَأَ: (إنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ منْ شَعَائر الله)-إبْدَأُوا بمَا بَدَأَالله به- فَبَدَأَ بالصَّفَا﴾ رواه مسلم، ئينجا لە دواى نوێژەكە پێغەمبەرﷺ گەڕاوە لاى (اَلْحَجَرالأَسْوَد)و دەستى لێدا، ئينجا لە دەرگەوە بۆ لاى سەفا چووە دەرەوەو ئايەتى ﴿إنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ منْ شَعَائر الله﴾ى خوێندەوەو فەرمووى: لەو شوێنەوە دەست پێ بكەن: كە لە ئايەتەكەدا خوا دەستى پێ كردوە، ئينجا پێغەمبەرﷺ لە سەفاوە دەستى بە هاتوچۆ كرد.

دووەم: (وَأَنْ يَسْعَى سَبْعاً) واجبە: حەفت جار بە تەواوى هاتوچۆ بكا (ذَهَابُهُ منَ الصَّفَا إلَى الْمَرْوَةِ مَرَّةٌ) ڕۆيشتنى لە سەفاوە بۆ مەڕوە، جارێكە (وَعَوْدُهُ منْهَا إلَيْه أُخْرَى) گەڕانەوەشى لە مەڕوە بۆ سەفا، جارێكىترە.

ئينجا بزانە: ئەو هاتوچۆيە بە هەوادلو بە زەميندلو بە پيادەيىو بە سوارىو بە هەلگيراوى دروستە، بەلام واجبە: لە گشت جارێكدا بە تەواوى بگاتە سەفاو بگاتە مەڕوە، واتە: ئەگەر تەنها يەك هەنگاو بمێنێ، هاتوچۆيەكەى دروست نابێ، هەروەك لە (المجموع)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

سێيەم: (وَأَنْ يَسْعَى بَعْدَ طَوَافِ رُكْنٍ) واجبە: لە دواى (طَوَافُ الإفَاضَة)ى ڕوكنىحەج، يان تەوافى ڕوكنىعومرە، هاتوچۆى نێوان سەفاو مەڕوە بكا (أَوْ قُدُومٍ) يان لە دواى (طَوَافُ الْقُدُوم) سەفاو مەڕوە بكا، واتە: ئەگەر لە پێش تەوافدا هاتوچۆى نێوان سەفاو مەڕوە بكا، بە بەر ناكەوێو دروست نابێ ﴿عَنْ ابْن عمَرَ رَضيَ اللهُ عَنهُمَا: قَدمَ النَّبيُّ ﷺ مَكَّةَ فَطَافَ بالْبَيْت ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَة سَبْعاً﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ هاتە (مكة) تەوافى (بَيْت)ى كردو دوو ڕەكعەت نوێژى كرد، ئينجا (سَعْى) نێوان سەفاو مەڕوەى كرد.

كەواتە: ئەگەر تەوافەكەى دروست نەبوبێ، (سَعْى)شى دروست نابێو واجبە: دووبارە تەوافێكى دروستبوو بكا، ئينجا (سَعْى)ش بكاتەوە، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموويەتى.

ئينجا كە لە دواى (طَوَافُ الْقُدُوم) هاتوچۆيەكە دەكا (بحَيْثُ) مەرجە بە شێوەيەكى وەها بێ: كە (لاَ يَتَخَلَّلُ بَيْنَهُمَا الْوُقُوفُ بعَرَفَةَ) وەستانى (عرفات) نەكەوێتە نێوان (طَوَافُ الْقُدُوم)و هاتوچۆيەكە، واتە: ئەگەر لە دواى (طَوَافُ الْقُدُوم) هاتوچۆيەكەى نەكردو چووە (عرفات)، ئەو كاتە واجبە: هاتوچۆيەكە لە دواى (طَوَافُ الإفَاضَة) بكا.

وَمَنْ سَعَى بَعْدَ قُدُومٍ لَمْ يُعِدْهُ، وَيُسْتَحَبُّ أَنْ يَرْقَى عَلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ قَدْرَ قَامَةٍ، فَإِذَا رَقِيَ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ وَلِلَّهِ الْحَمْدُ، اللهُ أَكْبَرُ عَلَى مَا هَدَانَا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى مَا أَوْلاَنَا، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. ثُمَّ يَدْعُوا بِمَا شَاءَ دِيناً وَدُنْيَاً، قُلْتُ: وَيُعِيدُ الذِّكْرَ وَالدُّعَاءَ ثَانِيَاً وَثَالِثَاً وَاللهُ أَعْلَمُ. وَأَنْ يَمْشِيَ أَوَّلَ السَّعْيِ وَآخِرَهُ وَيَعْدُوَ فِي الْوَسَطِ، وَمَوْضِعُ النَّوْعَيْنِ مَعْرُوفٌ.

---

بەلام (وَمَنْ سَعَى بَعْدَ قُدُومٍ) هەر كەسێك لە دوای (طَوافُ القُدُوم) هاتوچۆیەكەی كردبێ (لَمْ يُعِدْهُ) سوننەت نیە: لە دوای (طَوافُ الإفاضَة) دووبارەی بكاتەوە.

ئینجا بزانە: سوننەتە، بەلام مەرج نیە: هاتوچۆیەكە یەكسەر لە دوای تەوافەكەدا بێ، بەلكو دروستە: چەند ڕۆژێك بكەوێتە نێوان، هەروەها سوننەتە: حەفت جارەكەش بە دوای یەكتردا بێ، واتە: دروستە: ماوەیەكیش بكەوێتە نێوانیان، هەروەها دروستە: بە پیسیەوەو بە بێدەستنوێژیو بە عەورەتی دانەپۆشراو، هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوە بكا، هەروەك لە (المجموع)دا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَيُسْتَحَبُّ) سوننەتە: (أَنْ يَرْقَى عَلَى الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ) لە گشت جارێكدا سەركەوێتە سەر سەفاو مەڕوە (قَدْرَ قَامَةٍ) بە ئەندازەی بالای پیاوێك، ڕووشی لە (بَيْت) بكا، ئینجا (فَإِذَا رَقِيَ) هەر جارێك لەو حەفت جارانە بە سەر سەفاو بە سەر مەڕوە كەوت (قَالَ) لە سەر هەردووكیاندا دەڵێ: ﴿اَللهُ أَكْبَر اَللهُ أَكْبَر اَللهُ أَكْبَر وَلِلَّهِ الْحَمْدُ، اَللهُ أَكْبَر عَلَى مَا هَدَانَا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى مَا أَوْلاَنَا، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ﴾ رواه مسلم والنسائي.

(ثُمَّ يَدْعُوُ بِمَا شَاءَ) ئینجا كە ئەو زیكرانەی تەواو كردن، سوننەتە: هەر دوعایەك حەز دەكا بیكا (دِيناً وَدُنْيَاً) دەربارەی ئاینو دونیا (قُلْتُ) ئیمامی (النواوي) دەفەرموێ: (وَيُعِيدُ الذِّكْرَ وَالدُّعَاءَ) ئەو زیكرو دوعایانە دووبارە دەكاتەوە (ثَانِيَاً وَثَالِثَاً) دوو جارو سێ جار (وَاللهُ أَعْلَمُ)، ئینجا كە زیكرو دوعایەكەی لە سەر سەفا تەواو كردن دادەبەزێو بۆ مەڕوە دەڕوا، هەروەهاش كە لە سەر مەڕوە تەواوی كردن دادەبەزێو بۆ سەفا دەگەڕێتەوە...بەم جۆرە: تا حەفت جار تەواو دەبن.

(وَأَنْ يَمْشِيَ أَوَّلَ السَّعْيِ وَآخِرَهُ) وەها سوننەتە: لە سەرەتای هاتوچۆیەكەو لە كۆتایی هاتوچۆیەكەدا بە عادەتی بڕوا (وَيَعْدُوَ فِي الْوَسَطِ) لە ناوەندی هاتوچۆیەكەشدا نێرینە بە غاردان بڕوا (وَمَوْضِعُ النَّوْعَيْنِ) شوێنی ڕۆیشتنو غاردانەكە (مَعْرُوفٌ) ناسراوەو نیشان

(فَصْلٌ) يُسْتَحَبُّ للإمَامِ أَوْ مَنْصُوبه أَنْ يَخطُبَ بمَكَّةَ فِي سَابع ذيالْحجَّة بَعْدَ صَلاَةِ الظُّهْرِ خُطْبَةً فَرْدَةً، يَأمُرُهُمْ فيهَا بالْغُدُوِّ إِلَى منىً، وَيُعَلِّمُهُمْ مَا أَمَامَهُمْ مِنَ الْمَنَاسِك، وَيَخرُجُ بِهِمْ منَ الْغد إِلَى منىً وَيَبِيتُونَ بهَا، فَإِذَا طَلَعَت الشَّمْسُ قَصَدُوا عَرَفَات، قُلْتُ: وَلاَ يَدْخُلُونَهَا بَلْ يُقيمُونَ بنَمرَةَ بقُرْب عَرَفَات حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

كراوه به ميلى سه‌وز، ئينجا بزانه: غاردانه‌كه بۆ ئافره‌تان سوننه‌ت نيه، به‌لاَم بۆپياوان ئه‌و ڕۆيشتن‌و غاردانه له چوون‌و له گه‌ڕانه‌وه‌دا له هه‌ر حه‌فت جاردا سوننه‌تن.

هه‌م سوننه‌ته: له نێوان سه‌فاو مه‌ڕوه‌دا گشت كه‌سێك له هه‌ر حه‌فت جاردا بڵێ: (رَبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَتَجاوَزْ عَمَّا تَعْلَمُ انَّكَ أَنْتَ الأَعَزُّ الأَكْرَمُ، اَللّهُمَّ-رَبَّنا-آتنا في الدُّنْيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَة حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النَّارِ). هه‌م سوننه‌ته: قورئانيش بخوێنێ، هه‌روه‌ك له (المجموع)دا ئه‌و مه‌سه‌لانه ڕوون كراونه‌وه.

## ﴿ فَصْلٌ: له باسى وه‌ستان له (عَرَفات) ﴾

(يُسْتَحَبُّ لِلإمَامِ) سوننه‌ته: بۆ كاربه‌ده‌ستى موسوڵمانان (أَوْ مَنْصُوبِهِ) يان جێگره‌كه‌ى بۆ كاروبارى حه‌ج (أَنْ يَخْطُبَ بِمَكَّةَ) له ناو شارى (مكة)دا ووتارێك بخوێنێته‌وه (فِي سَابِعِ ذىالْحِجَّة) له ڕۆژى حه‌فته‌مى مانگى (ذىالحجة)دا (بَعْدَ صَلاَةِالظُّهْرِ) له دواى نوێژى نيوه‌ڕۆ (خُطْبَةً فَرْدَةً) ووتارێكى تاك بخوێنێته‌وه (يَأْمُرُهُمْ فِيهَا بِالْغُدُوِّ إِلَى مِنىً) له ووتاره‌كه‌دا فه‌رمان به حاجيه‌كان ده‌كا سبه‌ينێ-كه هه‌شته‌مى(ذىالحجة)يه‌و پێى ده‌گوترێ: (يَوم التَّروية)- بڕۆنه (مِنَى)، هه‌روه‌ها (وَيُعَلِّمُهُمْ مَا أَمَامَهُمْ مِنَ الْمَنَاسِكِ) حاجيه‌كان فێرى ئه‌و واجب‌و سوننه‌تانه‌ى حه‌ج ده‌كا: كه له‌مه‌ودوا دێن.

ئينجا (وَيَخْرُجُ بِهِمْ مِنَ الْغَدِ إِلَى مِنىً) كاربه‌ده‌سته‌كه سبه‌ينێ له‌گه‌ڵ حاجيه‌كان-له دواى نوێژى سبه‌ينێ- ده‌ڕۆنه (مِنَى)و له‌وێ نوێژى نيوه‌ڕۆو عه‌سر ده‌كه‌ن‌و (وَيَبِيتُونَ بِهَا) شه‌وێ له (مِنَى) ده‌مێننه‌وه‌و نوێژى مه‌غريب‌و عيشاو سبه‌ينێش هه‌ر له (مِنَى) ده‌كه‌ن، ئينجا (فَإِذَا طَلَعَت الشَّمْسُ) هه‌ر كاتێك له ڕۆژى نۆيه‌مدا-كه ڕۆژى عالفه‌يه- ڕۆژ هه‌لاَت (قَصَدُوا عَرَفَاتٍ) به‌ره‌و (عرفات) ده‌كه‌ونه ڕێ‌و له ڕێگه‌دا زۆر (لَبَّيك) ده‌ڵێن‌و هه‌م ئه‌م دوعايه‌ش ده‌كه‌ن: (اَللّهُمَّ إِلَيْكَ تَوَجَّهْتُ وَلوَجْهكَ الْكَرِيمِ أَرَدْتُ فَاجْعَلْ ذَنْبِي مَغْفُوراً وَحَجِّي مَبْرُوراً وَارْحَمْنِي وَلاَ تُخَيِّبْنِي إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). هه‌روه‌ك له زۆربه‌ى سه‌رچاوه‌كاندا فه‌رموويانه.

(قُلْتُ) ئيمامى (النواوى) ده‌فه‌رموێ (وَلاَ يَدْخُلُونَهَا) وه‌ها سوننه‌ته: يه‌كسه‌ر نه‌چنه ناو خاكى (عرفات)، (بَلْ يُقِيمُونَ بِنَمِرَةَ) به‌ڵكو له (نَمِرَة) ده‌مێنێته‌وه-كه شوێنێكه (بِقُرْبِ عَرَفَاتَ) له نزيك (عرفات)- (حَتَّى تَزُولَ الشَّمْسُ) تا ڕۆژ به‌ره‌و چاوى ڕاسته لاده‌دا (وَاللهُ أَعْلَم).

ثُمَّ يَخْطُبُ الإِمَامُ بَعْدَ الزَّوَالِ خُطْبَتَيْنِ ثُمَّ يُصَلِّي بِالنَّاسِ اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمْعاً،

ئینجا دەچنە مزگەوتی(إبراهیمﷺ): کە پێشەکەی لە (عُرَنَة)یەو کۆتاییەکەشی لە (عَرَفَة)یە، واتە: (نَمرَة)و (عُرَنَة) هەردووکیان سەریەخۆنە: سەر بە (عَرَفَة) نینو سەر بە (حَرَم)ش نین، کەواتە: (عَرَفَة)ش بەشێك نیە لە (حَرَم)، هەروەك لە (المجموع)و (الإيضاح)دا فەرموویەتی.

(ثُمَّ يَخْطُبُ الإِمَامُ) ئینجا پێشەوای حەج لەو مزگەوتەدا ووتار دەخوێنێتەوە (بَعْدَالزَّوَالِ) پاش ڕۆژلادان بەرەو چاوی‌ڕاستەو پێش نوێژی نیوەڕۆ (خُطْبَتَيْنِ) دوو ووتار دەخوێنێتەوە، لە ووتاری یەکەمدا باسی چۆنیەتی وەستانی(عَرَفَة)و کردەوەکانی‌تری حەج دەکاو هانیان دەدا: زۆر (ذِكر)و (تَلْبِيَة)و (تَهْلِيل)و زیکرەکانی‌تر بکەن، ئینجا لە نێوان ووتارەکان دادەنیشێ، ئینجا بۆ ووتاری دووەم هەڵدەستێتەوە، بانگدەریش بانگی نیوەڕۆ دەست پێ‌دەکاو لەگەڵ کۆتایی‌بانگ کۆتایی بە ووتارەکەی دێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿(جَمْع) کۆکردنەوەی نوێژەکان لە (عَرَفات)و لە (مُزْدَلِفَة) ﴾

(ثُمَّ) ئینجا کە بانگو ووتارەکە تەواو بون، ئیقامەتی نوێژ دەکرێو (يُصَلِّي بِالنَّاسِ اَلظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمْعاً) ئیمام نوێژی نیوەڕۆو عەسر بە (جَمْع التَّقْدِيم)و بە جەماعەت بۆ خەڵکی دەکا، واتە: تەنها بۆ ئەو حاجیانەی ڕێبوارنو بۆیان دروستە (قَصْر)و(جَمْع) بکەن؟ چونکە ئەو حاجیانەی خەڵکی (مَكَّة)نو ئەوانەی ڕێبوارنو لە پێش وەستانی (عَرفات)دا چوار ڕۆژ، یان زیاتر لە (مَكَّة)دا ماونەتەوە—بە فەرموودەی‌ڕاستتر—: بۆیان دروست نیە: (قَصْر)و (جَمْع) بکەن: نە لە (مَكَّة)و نە لە (عَرفات)و نە لە (مُزْدَلِفَة)و نە لە (مِنَى)، هەروەك لە نوێژی ڕێبواردا ڕوون کراوەتەوە، هەم لە سەرچاوەکانیشدا فەرموویانە.

جا بزانە: لەفەرموودەیەکی‌تردا—کە ئیمامی (الصَّيْمَري)و (الماوَرْدِي) بڕاندویەتیانەوە—: ئەم کۆکردنەوەیە بە هۆی حەج کردنە، کەواتە: بۆ گشت کەسێك دروستە (جَمْع) بکا، واتە: نوێژەکان کۆ بکاتەوە— لە (عَرفات)و لە (مُزْدَلِفَة)— جیاوازی خەڵکی (مَكَّة)و ڕێبوارەکان نیە.

بەڵام (قَصْر): کورتکردنەوەی‌نوێژ—جگە لە ڕێبوارەکانی‌ڕابردوو— لە هیچ فەرموودەیەکدا بۆ هیچ کەسێك دروست نیە ﴿عَنْ عُمر بن الخطّابﷺ: أَنَّهُ لَمَّا قَدِمَ مَكَّةَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ فَإِنَّا قَوْمٌ سَفْرٌ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ بِمِنَى—قَالَ— وَلَمْ يَبْلُغْنِي أَنَّهُ قَالَ لَهُمْ شَيْئاً﴾رواه‌الإمام مالك باسناده‌الصحيح، کە ئیمامی (عُمَر) بۆ حەج کردن هاتە (مَكَّة)، نوێژی چوار ڕەکعەتی‌ی بە (قَصْر) دوو ڕەکعەت کردو فەرمووی: هۆ خەڵکی

(مكّة)، ئێوه نوێژەکەتان چوار ڕەکعەتی تەواو بکەن، ئێمە ڕێبوارین بۆیێ دوو ڕەکعەتمان کردن، ئینجا له(مِنَی)ش دوو ڕەکعەتی کردن و پێم نەگەیشتوه هیچیتری به خەڵکی(مکّة) گوتبێ. واته: چونکه لەمەوپێش لە (مکّة)دا تێی گەیاندبون بۆیێ دوو بارەی نەکردەوە، هەروەك له (المجموع)دا ئەو مەسەلەی ڕوون کردۆتەوە.

ئینجا (وَيَقِفُوا بِعَرَفَةَ) حاجیەکان لە زەمینی(عَرَفات)دا ڕادەوەستن و دەمێننەوە (إِلَى الْغُرُوبِ) تا ڕۆژ ئاوا دەبێ ﴿عَنْ جَابِرٍ: فَأَجَازَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَنَزَلَ بِنَمِرَةَ حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِي فَخَطَبَ النَّاسَ...ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، ثُمَّ رَكِبَ حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ...﴾ الحديث رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ ڕابرد تا هات لە نزیك (عَرَفَة) لە (نَمِرَة) دابەزی، ئینجا هاتە شیوی(عُرَنَة) ووتاری خوێندەوە، ئینجا بانگدەر بانگی نیوەڕۆی داو ئیقامەتی نوێژی کرد، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆو عەسری بە (جمع التقديم) کردن، ئینجا هاتە شوێنی وەستانی(عَرَفَة)و ڕووی لە قیبلە کردو تا ڕۆژ ئاوا بوو، هەر لە وەستانی (عَرَفات) بەردەوام بوو.

(وَيَذْكُرُوا اللهَ تَعَالَى) لە ڕۆژی وەستانی(عرفات)دا هەندێ جار زیکری خوایگەورە دەکەن و (وَيَدْعُوهُ) هەندێ جاریش دوعایان دەکەن و هەندێ جار قورئان دەخوێنن، بە تایبەتی سورەتی (الْحَشْر)و (قُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) زۆر دەخوێنن، هەندێ جار سەلاوات لە سەر پێغەمبەر ﷺ لێدەدەن، هەندێ جاریش (أَسْتَغْفِرُ الله) دەکەن.

ئینجا لە ناو زیکرەکانیشدا (وَيُكْثِرُوا التَّهْلِيلَ) زۆر دەڵێن: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ). ئینجا دەڵێن: (اَللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً وَفِي سَمْعِي نُوراً وَفِي بَصَرِي نُوراً، اَللَّهُمَّ اشْرَحْ لِي صَدْرِي وَيَسِّرْ لِي أَمْرِي).

ئینجا دەڵێن: (اَللَّهُمَّ-رَبَّنَا-آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، اَللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْماً كَثِيراً وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، اَللَّهُمَّ انْقُلْنِي مِنْ ذُلِّ الْمَعْصِيَةِ إِلَى عِزِّ الطَّاعَةِ وَاكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ، اَللَّهُمَّ نَوِّرْ قَلْبِي وَقَبْرِي وَأَعِذْنِي مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ وَاجْمَعْ لِيَ الْخَيْرَ كُلَّهُ، اَللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى).

ئینجا هەر دوعایەك سێ جار دەڵێنەوە، بەڵام ئاگاداربە: بە سەرکەوتنی کێوی(الرَّحْمَة) خێر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

فَإِذَا غَرَبَت الشَّمْسُ قَصَدُوا مُزْدَلِفَةَ، وَأَخَّرُواالْمَغْرِبَ لِيُصَلُّوهَا مَعَ الْعِشَاء بِمُزْدَلِفَةَ جَمْعاً، وَوَاجِبُ الْوُقُوف حُضُورُهُ بِجُزْءٍ مِنْ أَرْضِ عَرَفَاتٍ وَإِنْ كَانَ مَارّاً فِي طَلَبِ آبِقٍ وَنَحْوِهِ، وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ أَهْلاً لِلْعِبَادَةِ لاَ مُغْمَىً عَلَيْهِ،

---

(فَإِذَا غَرَبَت الشَّمْسُ) جا هەر كاتێك ڕۆژ ئاوا بوو (قَصَدُوا مُزْدَلِفَةَ) بەرەو (مُزْدَلِفَة) دەكەونە ڕێ (وَأَخَّرُواالْمَغْرِبَ) سوننەتە: نوێژی مەغریب دوا بێخن (لِيُصَلُّوهَا مَعَ الْعِشَاء بِمُزْدَلِفَةَ جَمْعاً) تاكو بە (جمع التَّأخير)-لە (مُزدَلِفَة)- لەگەڵ عیشادا بیكەن ﴿عَنْ أُسامَةَ﴾: أنَّهُﷺ دَفَعَ مِنْ عَرَفَةَ، فَلَمّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ وَتَوَضَّأَ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثُمَّ أُقِيمَت الْعِشاءُ فَصَلاّها﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ لە (عَرَفَة) گەڕاوە، ئینجا هات لە موزدەلیفە دابەزیو دەستنوێژی گرتو نوێژی مەغریبی كرد، ئینجا نوێژی عیشای كرد.

ئینجا بزانە: مەرجی ئەم (جمع التَّأخير)ەش وەكو مەرجی(جَمْع التَّقْدِيم)ی (عَرَفَة)یەو هەردوو فەرموودەكانیئەوێ لێرەشدا دێنەجێ، هەم لەو حاڵەتەدایە: كە نوێژی عیشا لە سێیەكی شەوێ-كە كاتیبژاردەیە- دوا نەكەوێ، ئەگینا: هەر لە ڕێگەدا هەردوو نوێژەكان دەكەن، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە.

## ﴿ كاتو واجبەكانی وەستانی (عَرَفات)﴾

(وَوَاجِبُ الْوُقُوف) واجبی وەستانی (عَرَفَات) ئەم دووەیە:

یەكەم: (حُضُورُهُ) حاجیەكە ئامادە ببێ (بِجُزْءٍ مِنْ أَرْضِ عَرَفَاتٍ) لە بەشێكی زەمینی (عَرَفات)دا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَقَفْتُ هَهُنا وَعَرَفَةُ كُلُّها مَوْقِفٌ﴾رواه مسلم واصحاب السنن، من لە (عَرَفات)دا لێرە وەستام، (عَرَفات) گشتی شوێنی لێوەستانە.

(وَإِنْ كَانَ مَارّاً فِي طَلَبِ آبِقٍ وَنَحْوِهِ) هەر چەند لەو ئامادەبوونەشدا بە دوای شتێكدا بگەڕێو بە (عَرَفات)دا ڕابرێ، كەواتە: دوور نیە ئەگەر لە ئاسمانی(عَرَفات)دا بفڕێ دروست ببێو بە بەر وەستانی زەمینی(عَرَفات) بكەوێ، هەروەك لە (الشبراملسي)و (الشرواني)دا ڕوون كراوەتەوە.

دووەم: حاجیەكە لە حاڵەتی وەستانی (عَرَفات)دا لە ژێر ئیحرام دابێ، هەم (وَيُشْتَرَطُ كَوْنُهُ أَهْلاً لِلْعِبَادَةِ) حاجیەكەش لەو كەسانە بێ: كە خواپەرستیەكانی دروستن.

(لاَ مُغْمَىً عَلَيْهِ) لە حاڵەتی وەستاندا بێهۆش نەبێو شێت نەبێو سەرخۆش نەبێ، واتە: وەستانی ئەو سێ جۆرە كەسانە بۆ حەجی واجب دروست نابێو دەبێتە سوننەت، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموویانە، بەڵام لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا: وەستانی ئەو سێ جۆرە كەسانەش لە (عَرَفات)دا دروست دەبێو بە بەر واجب دەكەوێ، هەروەك لە (المجموع)و (ابن عابدين)دا فەرموویانە.

وَلاَ بَأْسَ بِالنَّوْمِ، وَوَقْتُ الْوُقُوفِ مِنَ الزَّوَالِ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَالصَّحِيحُ بَقَاؤُهُ إِلَى الْفَجْرِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَلَوْ وَقَفَ نَهَاراً ثُمَّ فَارَقَ عَرَفَةَ قَبْلَ الْغُرُوبِ وَلَمْ يَعُدْ أَرَاقَ دَماً اسْتِحْبَاباً، وَفِي قَوْلٍ يَجِبُ، وَإِنْ عَادَ فَكَانَ بِهَا عِنْدَ الْغُرُوبِ فَلاَ دَمَ، وَكَذَا إِنْ عَادَ لَيْلاً فِي الأَصَحِّ، وَلَوْ وَقَفُوا الْيَوْمَ الْعَاشِرَ غَلَطاً أَجْزَأَهُمْ،

---

(وَلاَ بَأْسَ بِالنَّوْمِ) هیچ باسێك نیه به هۆی نووستن له حاڵەتی وەستاندا، هەر چەند لە تەواوی وەستانەکەشدا هەشیار نەبێتەوە، هەروەها ئەگەر بە بێدەستنوێژی، یان بە جەنابەتەوە، یان بە حەیزەوە، یان بە پیسیەوە، یان بە عەورەتی دەرکەوتووەوە لە (عَرَفات) بوەستێ، وەستانەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ کاتی وەستانی (عَرَفات) ﴾

(وَوَقْتُ الْوُقُوفِ) کاتی وەستانی(عَرَفات) کە حەجی پێ دروست ببێ (مِنَ الزَّوَالِ يَوْمَ عَرَفَةَ) لە نیوەڕۆی ڕۆژیعالفەوە -کە ڕۆژی نۆیەمی(ذیالْحِجَّة)یە- دەست پێدەکا (وَالصَّحِيحُ) فەرموودەی ڕاست ئەمەیە: (بَقَاؤُهُ) کاتی وەستانەکەش دەمێنێ (إِلَى الْفَجْرِ يَوْمَ النَّحْرِ) تا بەیانیی ڕۆژی جەژنیقوربان دەردەکەوێ، واتە: لەو ماوەیەدا ئەگەر دەمێکی کەم لە زەمینی (عَرَفات) ئامادە ببێ، حەجی دروست دەبێ، جیاوازی نیە وەستانەکەی: بە سواری بێ، یان بە پیادەیی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلْحَجُّ يَوْمُ عَرَفَةَ مَنْ جَاءَ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ مِنْ لَيْلَةِ جَمْعٍ فَتَمَّ حَجُّهُ﴾رواه اصحاب السنن بسند صحيح، حەج بریتییە لە وەستانی ڕۆژیعالفە لە (عَرَفات)، هەر کەسێك پێش نوێژی سبەینێ لە شەوی جەژنی قورباندا بێتە (عَرَفات)، ئەوە حەجی تەواوە.

(وَلَوْ وَقَفَ نَهَاراً) ئەگەر بە ڕۆژ لە (عَرَفات)دا وەستا (ثُمَّ فَارَقَ عَرَفَةَ قَبْلَ الْغُرُوبِ) ئینجا پێش ڕۆژ ئاوابوون لە (عَرَفات) ڕۆیشتە دەرەوەو (وَلَمْ يَعُدْ) شەوێ نەگەڕاوە بۆ (عَرَفات)، ئەوە حەجەکەی دروست دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، بەلام (أَرَاقَ دَماً اسْتِحْبَاباً) سوننەتە: ئاژەڵێك سەر ببڕێ لە خوێنی نەمانەوەی شەوێ (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەکدا (يَجِبُ) ئەو خوێنە واجبە، چونکە ﴿پێغەمبەرﷺ لە دوای نیوەڕۆوە تا ڕۆژئاوابوون لە (عَرَفات) ماوەتەوە﴾، هەروەك لە حەدیسەکەی (جابر)دا ڕابرا.

(وَإِنْ عَادَ) بەلام ئەگەر گەڕاوەو (فَكَانَ بِهَا عِنْدَ الْغُرُوبِ) لە کاتی ڕۆژ ئاوابوون لە (عَرَفات) ئامادە بوو (فَلاَ دَمَ) ئەوە خوێنی لە سەر نیە (وَكَذَا إِنْ عَادَ لَيْلاً) هەروەها ئەگەر شەوێش بگەڕێتەوە، هەر خوێنی لە سەر نیە (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، چونکە لە هەردوو مەسەلەدا ڕۆژو شەوی وێکڕا کۆ کردونەوە.

(وَلَوْ وَقَفُوا الْيَوْمَ الْعَاشِرَ غَلَطاً) ئەگەر هەموو حاجیەکان هەڵەیان کردو لە ڕۆژی دەیەمی (ذی الْحجة) لە (عَرَفات)دا وەستان (أَجْزَأَهُمْ) ئەو وەستانەیان دروست دەبێ، بە بەڵگەی

إلاَّ أَنْ يَقلُّوا عَلَى خلاَف الْعَادَة فَيَقْضُونَ فِي الأَصَحِّ، وَإِنْ وَقَفُوا فِي الثَّـامِنِ وَعَلِمُـوا قَبْلَ الْوُقُوف وَجبَ الْوُقُوفُ فِي الْوَقْت، وَإِنْ عَلمُوا بَعْدَهُ وَجبَ الْقَضَاءُ فِي الأَصَحِّ.
(فَصْلٌ) وَيَبِيتُونَ بِمُزْدَلِفَة، وَمَنْ دَفعَ منْهَا بَعْدَ نصْف اللَّيْلِ أَوْ قَبْلَهُ وَعَـادَ قَبْـلَ الْفَجْـرِ فَلاَ شَيْءَ عَلَيْه، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ بهَا فِي النِّصْف الثَّانِي أَرَاقَ دَماً، وَفِي وُجُوبه الْقَـوْلاَن،

---

(اجماع)، كەواتە: ڕۆژەكانی جەژن و (أيام التشريق)ش هەر لە سەر ئەو وەستانەی (عَرَفـات) حساب دەكرێن، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.
(إلاَّ أَنْ يَقلُّوا) مەگەر حاجیەكان كەم بن (عَلَى خِلاَفِ الْعَادَةِ) لـە سـەر عادەتیحەج زۆر نـەبن، ئەو كاتە (فَيَقْضُونَ) واجبە: ئەم حەجە قەزا بكەنەوە (فیالأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.
(وَإِنْ وَقَفُوا فیالثَّـامِنِ) ئەگـەر لـە ڕۆژی هەشـتی مانگدا بـە هەڵـە لـە (عَرَفـات)دا وەسـتان و (وَعلِمُوا قَبْـلَ الْوُقُـوفِ) پـێش فـەوتانی كـاتی وەسـتانەكە زانییـان هەڵـەیان كـردوە (وَجَـبَ الْوُقُوفُ فیالْوَقْتِ) واجبە: لە كاتی ڕاستەقینەدا لـە (عَرَفـات)دا دووبـارە ڕابوەسـتن، بـەڵام (وَإِنْ عَلِمُوا بَعْدَهُ) ئەگەر لە دوای فەوتانی كاتی وەستانەكە زانییان هەڵەیان كـردوە (وَجَـبَ الْقَضَاءُ) واجبە: حەجەكە قەزا بكەنەوە (فیالأصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاسترتردا.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مانەوەی شەوێ لە (مُزْدَلِفَة)﴾

ئینجـا كـە لـە (عَرَفـات) گەڕانـەوە (وَيَبِيتُـونَ بِمُزْدَلِفَـةَ) واجبـە: شـەویجەژن لـە (مزدلفـة) بمێننـەوە: كە گشتی لە زەمینی(حَرَم) دەژمێردرێ.
جا بزانـە: لـە فەرموودەیەكدا مانـەوەی شـەوێ لـە (مزدلفـة) سـوننەتە، لـە فـەرموودەی بـە هێزتردا واجبـە، ئینجـا واجبەكـەش بەوەنـدە پێـك دێ: ماوەیـەكی كـەم لـە نیـوەی دووەمـی شەویجەژندا لە (مزدلفة)دا ئامادە بێ، جیاوازی نیە لـەو مـاوە كەمەشدا: لـەوێ ڕابوەسـتێ، یان ڕاببرێ، پیادە بێ، یان سوار بێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.
(وَمَنْ دَفعَ مِنْهَا بَعْدَ نِصْفِ اللَّيْـلِ) هـەر كەسـێك لـە دوای نیـوەی شـەویجەژن لـە (مزدلفـة) بڕواتـە دەرەوەو نەگەڕێتـەوە (أَوْ قَبْلَـهُ) یـان پـێش نیـوەی شـەو ڕۆیشـتە دەرەوە، بـەڵام (وَعَادَ قَبْلَ الْفَجْرِ) لە پێش بەیانیدا گەڕاوە (فَـلاَ شَـيْءَ عَلَيْـهِ) ئـەوە لـە هـەردوو مەسـەلەدا هیچ خوێنی لە سەر نیە.
(وَمَـنْ لَـمْ يَكُـنْ بِهَـا فیالنِّصْـفِ الثَّـانِي) هـەر كەسێك لـە نیـوەی دووەمـی شـەویجەژن لـە (مزدلفة)دا نەبێ (أَرَاقَ دَماً) دەبی ئاژەڵێك لـە خـوێنی نەمانـەوە سـەر ببڕێ (وَفِـي وُجُوبِـهِ الْقَـوْلاَنِ) دەربـارەی واجببـوونی ئـەو خوێنـەش دوو فەرموودەكـەی ڕابردووی(عَرَفَـة) هەنـە، بەهێزترەكەیان –لێرەدا– واجبە: خوێنی نەمانەوە بدا، ئەگـەر هـیچ عـوزرێكی نـەبێ، بـەڵام ئەگەر عـوزرێكی شـەرعی هەبێ: وەك بە خۆی نەخۆش بێ، یان سەرپەرشتی نەخۆشێكی

وَيُسَنُّ تَقْدِيمُ النِّسَاءِ وَالضَّعَفَةِ بَعْدَ نِصْفِ اللَّيْلِ إِلَى مِنىً، وَيَبْقَى غَيْرُهُمْ حَتَّى يُصَلُّوا الصُّبْحَ مُغَلِّسِينَ ثُمَّ يَدْفَعُونَ إِلَى مِنىً، وَيَأْخُذُونَ مِنْ مُزْدَلِفَةَ حَصَى الرَّمْيِ، فَإِذَا بَلَغُوا الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ وَقَفُوا وَدَعَوْا إِلَى الإِسْفَارِ،

---

بێکەس بکا، یان بە دوای شتێکی ونبوودا بگەڕێ، یان پەلەی کردبێ و بە ڕێگەیەکیتردا چووبێتە (مکة)و (طَوافُ الإفاضَة)ی کردبێ، یان هەر لە (عَرَفات)دا مابێتەوەو فریا نەکەوتبێ بگاتە (مزدلفة)، لەو حاڵەتانەدا خوێنی لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَيُسَنُّ تَقْدِيمُ النِّسَاءِ وَالضَّعَفَةِ) سوننەتە: ئافرەتو بێهێزەکان وەپێش گشت کەسێکیتر بخەن (بَعْدَ نِصْفِ اللَّيْلِ) لە دوای نیوەی شەویجەژن (إِلَى مِنَى) بەرەو (منَى) ڕەوانەیان بکەن، تاکو لە پێش قەرەباڵغیو پاڵەپەستەدا ڕەجمی شەیتان بکەن ﴿عَنْ ابن عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهما: أنا مِمَّنْ قَدَّمَ النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ فِي ضَعَفَةِ أَهْلِهِ﴾ رواه الشيخان، من یەکێك بووم لەو بێهێزانەی کە لەگەڵ خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە شەوی (مزدلفة) لە پێش خەڵکیدا ڕەوانەی کردین.

(وَيَبْقَى غَيْرُهُمْ) خەڵکیتریش سوننەتە لە (مزدلفة)دا بمێننەوە (حَتَّى يُصَلُّوا الصُّبْحَ) تا لەوێدا نوێژی سبەینێ دەکەن (مُغَلِّسِينَ) لە کاتێکی زووی بەیانیدا ﴿عَنْ جَابر رضي الله عنه: ثُمَّ اضْطَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ وَصَلاَّهُ حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ ثُمَّ أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ فَدَعَا اللهَ وَكَبَّرَهُ وَهَلَّلَهُ وَوَحَّدَهُ فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفاً حَتَّى أَسْفَرَ جِدّاً﴾ رواه مسلم، ئینجا پێغەمبەر ﷺ لە (مزدلفة) پاڵی داوە تا بەیان دەرکەوت، نوێژی سبەینێی لە کاتی دەرکەوتنی بەیاندا کرد، ئینجا هاتە (الْمَشْعَرَ الْحَرَام)و ڕووی لە قیبلە کردو دوعاو زیکری خوای دەکرد، تا بە تەواوی دونیا ڕۆناك بوو.

(ثُمَّ يَدْفَعُونَ إِلَى مِنىً) ئینجا بۆ لای (مِنَى) دەکەونە ڕێو (وَيَأْخُذُونَ مِنْ مُزْدَلِفَةَ حَصَى الرَّمْيِ) سوننەتە: لە (مُزْدَلِفة) بەردەکانی ڕەجمی شەیتان هەڵبگرنەوە، ئینجا (فَإِذَا بَلَغُوا الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ) هەر کاتێك گەیشتنە شاخە بچکۆلەکەی(الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ)–کە لە کۆتایی (مزدلفة)یە– (وَقَفُوا) سوننەتە: لەوێ ڕابوەستنو (وَدَعَوْا إِلَى الإِسْفَارِ) بەرەو قیبلە دوعایان بکەنو زیکری خوا بکەن تا دونیا تەواو ڕۆناك دەبێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەیڕابردوو، هەم خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ﴾ هەر کاتێك لە (عَرَفات) گەڕانەوە، لە لای (الْمَشْعَرِ الْحَرام) زیکری خوا بکەن.

جا بزانە: لە تەواوی ئەو شەوەیجەژندا گشت جۆرە زیکرێكو دوعاو (لَبَّيْك) گوتنو (أَسْتَغْفِرُ الله) هەموویان خێرن، هەم سوننەتە لە (الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ)دا زۆر بڵێن: (اَللَّهُمَّ –رَبَّنَا– آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ).

ثُمَّ يَسيرُونَ فَيصلُونَ منىً بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ فَيَرْمِي كُلُّ شَخصٍ حِينَئذٍ سَبْعَ حَصَيَاتٍ إِلَى جَمْرَةِالْعَقَبَةِ، وَيَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ عِندَ ابْتِدَاءِ الرَّمْيِ، وَيُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ،

---

ئینجا بزانە: لە فەرموودەی بەهێزتردا وەها سوننەتە: حەفت بەردەکانی ڕەجمی شەیتانیگەورە لە(مزدلفة) هەڵبگیرێنەوە، بەلاّم لە فەرموودەیەکدا هاتوە: بەردەکانی ڕەجمی شەیتانەکانی دوایجەژنیش هەر لە(مزدلفة) هەڵدەگرێتەوە، هەروەها بزانە: دروستە لە شوێنەکانیتری جگە لە(مزدلفة)ش گشت بەردەکان هەڵبگرێتەوە بۆ ڕەجمی هەرسێك شەیتانەکان، هەروەك لە زۆربەیسەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

## ﴿ کردەوەکانی ڕۆژی جەژنی قوربان ﴾

**پێشەکی** بزانە: ڕۆژییەکەمی جەژنیقوربان پێی دەگوترێ: (يَوْمُ الْحَجِّ الأكْبَرِ)، چونکە زۆرترینی کردەوەکانی حەج لەو ڕۆژەدا دەکرێن، کەواتە: (الْحَجُّ الأكْبَرِ) بە خودی حەج دەگوترێ، (اَلْحَجُّ الأَصْغَر)ش بە عومرە دەگوترێ، هەروەك لە (الإيضاح)دا ڕوون کراوەتەوە، جا بزانە: کردەوەکانی ڕۆژی جەژن چوارن:

### ١-ڕەجمی شەیتانی گەورە

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای دونیا ڕۆناکبوونی ڕۆژی جەژنی قوربان پێش ڕۆژ هەلاتن (يَسيرُونَ) دەڕۆن (فَيَصلُونَ مِنىً بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ) جا لە دوای ڕۆژهەلاتن دەگەنە (مِنَى)و (فَيَرْمِي كُلُّ شَخْصٍ حِينَئِذٍ) ئینجا گشت کەسێك دەست بە ڕەجمی شەیتانیگەورە دەکا لەو کاتەی دەگاتە (مِنَى)، واتە: (سَبْعَ حَصَيَاتٍ) حەفت بەرد دەهاوێ (إِلَىجَمْرَةِالْعَقَبَةِ) بۆ شەیتانی (الْعقبة): کە شەیتانیگەورەی پێدەگوترێو سێیەم شەیتانە، سنوری (مِنَى) لە لای (مکة) دەگاتە ئەو شەیتانەو کۆتایی دێ، هەروەك لە (نهاية)و (مغنى)دا فەرموویانە.

جا بزانە: ئەم شەیتانەیگەورە تەنها لایباشووری شوێنی ڕەجم کردنیەتی، کەوابو: لە هەر لایەك بەردەکان بهاوێتە باشووری ئەم شەیتانە، ئەوە ڕەجمەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە (شرح مسلم)دا فەرموویەتی، بەلاّم وەها سوننەتە: ڕوو لە شەیتانەکە بکاو ڕاستەی بکەوێتە لای (مِنَى)و چەپەشی بکەوێتە لای (مکة)، ئینجا -یەکە یەکە- حەفت بەردەکەی بۆ بهاوێو (وَيَقْطَعُ التَّلْبِيَةَ عِندَ ابْتِدَاءِ الرَّمْيِ) لەگەڵ دەست پێکردنی ڕەجمی ئەم شەیتانە بە یەکجاری واز لە (لَبَّيْك) گوتن دێنێ.

(وَيُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ) سوننەتە: لەگەڵ هەر بەردێکدا-کە دەیهاوێ-بڵێ: (اَللهُ أكْبَر)، ﴿عَنْ جَابِرٍ: فَرَماها بِسَبْعِ حَصَيات يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنهـا﴾رواه مسلم پێغەمبەر ﷺ بە حەفت بەرد شەیتانیگەورەی ڕەجم کردو لەگەڵ هەر بەردێکدا دەیفەرموو: (اَللهُ أكبَر).

ئینجا بزانە: بە (اجماع)یزانایان لە ڕۆژی جەژندا لە هەرسێك شەیتانەکان تەنها شەیتانی گەورە ڕەجم دەکرێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

ثُمَّ يَذْبَحُ مَنْ مَعَهُ هَدْيٌ ثُمَّ يَحْلِقُ أَوْ يُقَصِّرُ، وَالْحَلْقُ أَفْضَلُ، وَتُقَصِّرُ الْمَرْأَةُ، وَالْحَلْقُ نُسُكٌ عَلَى الْمَشْهُورِ، وَأَقَلُّهُ ثَلاَثُ شَعَرَاتٍ: حَلْقاً أَوْ تَقْصِيراً أَوْ نَتْفاً أَوْ إِحْرَاقاً أَوْ قَصّاً،

## ٢-سەربڕینی (هَدْي)و قوربانی

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای ڕەجمی شەیتانیگەورە (يَذْبَحُ مَنْ مَعَهُ هَدْيٌ) ئەو کەسەی ئاژەڵی بە دیاری لەگەڵخۆی هێناوە، ئاژەڵەکەی سەردەبڕێ، ئەو کەسەش کە قوربانی دەکا، قوربانیەکەی سەردەبڕێ. جا بزانە: (هَدْي) بەو ئاژەڵە دەگوترێ: کە مرۆڤ لەگەڵخۆی بە دیاری دەیبا بۆ (حَرَم)ی(مکة)، تاکو لە ڕێگەیخوا لەوێ سەری ببڕێ، سیفەتەکانی ئاژەڵی (هَدْي)ش وەکو ئاژەڵی قوربانییە، بەلاّم ئێستا خەڵك بە زۆری وازی لەو سوننەتە هێناوە، هەروەك لە (الإيضاح)و لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ٣-سەرتاشینی حەج

(ثُمَّ يَحْلِقُ) ئینجا سەریخۆی دەتاشێ (أَوْ يُقَصِّرُ) یان موویسەری دەبڕێ، واتە: جیاوازی نیە: مووی‌سەری بتاشێ، یا ببڕێ، هەردووکی دروستە، بەلاّم (وَالْحَلْقُ أَفْضَلُ) بۆ نێرینە تاشین خێرترە ﴿عَنْ ابن عُمر رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قالَ: رَحِمَ اللهُ الْمُحَلِّقِينَ...ثُمَّ قالَ فِي الرَّابِعَةِ: وَالْمُقَصِّرِينَ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ سێ جار فەرمووی: خوا ڕەحم بەو کەسانە بکا کە سەریخۆیان دەتاشن، ئینجا لە جاری چوارەمدا فەرمووی: خوا ڕەحم بەو کەسانەش بکا کە موویسەریان دەبڕن.

(وَتُقَصِّرُ الْمَرْأَةُ) بەلاّم ئافرەت موویسەری دەبڕێ، واتە: کورتی دەکا، چونکە ناپەسندە بیتاشێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى النِّسَاءِ الْحَلْقُ إِنَّمَا عَلَى النِّسَاءِ التَّقْصِيرُ﴾رواه ابوداود بسند حسن، سەرتاشین لە سەر ئافرەتان نیە، تەنها بڕینی مووی سەر لە سەر ئافرەتان واجبە.

(وَالْحَلْقُ) ئەو سەرتاشینەی لە حەج‌و عومرەدایە (نُسُكٌ) خواپەرستیەو خێری پێدەگاتێ، چونکە ڕوکنێکی حەج‌و عومرەیە، ئەگەر نەیکا، حەج‌و عومرەی دروست نابن (عَلَى الْمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب (وَأَقَلُّهُ) لای کەمی سەرتاشین کە ڕوکنەکەی پێتەواو ببێ (ثَلاَثُ شَعَرَاتٍ) لابردنی سێ داوە مووە لە سەریخۆی (حَلْقاً) بە تاشین (أَوْ تَقْصِيراً) یان بە کورتکردن (أَوْ نَتْفاً) یان بە هەڵکەندن (أَوْ إِحْرَاقاً) یان بە سووتاندن (أَوْ قَصّاً) یان بە بڕینی بە مەقەس، واتە: بە هەر یەکێك لەو پێنج کردارانە: سێ داوە موو، یان زیاتر لە سەریخۆی لاببا ڕوکنەکەی پێتەواو دەبێ، بەلاّم ناپەسندە: بەشێکی سەری لە حەجدا بتاشێ‌و بەشێکیتریش لە عومرەدا بتاشێ، بەڵکو وەها سوننەتە: بە یەکجاری هەموو سەری بتاشێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَمَنْ لاَ شَعْرَ بِرَأْسِه يُسْتَحَبُّ إِمْرَارُ الْمُوسَى عَلَيْه، فَإِذَا حَلَقَ أَوْ قَصَّرَ دَخَلَ مَكَّةَ وَطَافَ طَوَافَ الرُّكْنِ، وَسَعَى إِنْ لَمْ يَكُنْ سَعَى، ثُمَّ يَعُودُ إِلَى مِنىً، وَهَذَا الرَّمْيُ وَالذَّبْحُ وَالْحَلْقُ وَالطَّوَافُ يُسَنُّ تَرْتِيبُهَا كَمَا ذَكَرْنَا،

---

(وَمَنْ لاَ شَعْرَ بِرَأْسِهِ) ئەو كەسەی هیچ مووی بە سەریەوە نیە (يُسْتَحَبُّ إِمْرَارُ الْمُوسَى عَلَيْهِ) سوننەتە: موس، یان گوێزان بە سەری خۆیدا بێنێ، کەواتە: ئەگەر مووی سەری کورت بوو، یان تەنها داوە مووێك، یان دوو داوە مووی بە سەریەوە بون، واجبە: لایانببا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ٤-(طَوافُ الإِفاضَة)ی روکنی حەج

ئینجا (فَإِذَا حَلَقَ أَوْ قَصَّرَ) هەر کاتێك سەری تاشی، یان مووەکانیسەری بڕی (دَخَلَ مَكَّةَ) یەکسەر دەچێتە (مكة)و (وَطَافَ طَوَافَ الرُّكْنِ) یەکسەر (طَوافُ الإِفاضَة)ی روکنیحەج دەکا (وَسَعَى) لە دوای ئەم تەوافە (سَعْي) سەفاو مەڕوە دەکا (إِنْ لَمْ يَكُنْ سَعَى) ئەگەر لە دوای (طَوافُ الْقُدُوم) نەیکردبێ، چونکە ئەگەر لە دوای (طَوافُ الْقُدُوم) سەفاو مەڕوەی کردبێ، سوننەت نیە دووبارەی بکاتەوە، هەروەك ڕابرا.

(ثُمَّ) ئینجا لە دوای تەواوبوونی تەواف (يَعُودُ إِلَى مِنىً) دەگەڕێتەوە بۆ (مِنى)، تاکو شەوێ لەوێ بمێنێتەوە ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنَى﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژندا (طَوافُ الإِفاضَة)ی کرد، ئینجا گەڕاوەو نوێژی نیوەڕۆی لە (مِنَى)دا کرد.

ئینجا بزانە: لە حەدیسێکیتردا هاتوە: ﴿فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ وَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەر ﷺ (طَوافُ الإِفاضَة)ی کردو نوێژی نیوەڕۆی لە (مكة)دا کرد. واتە: یەکەم جار نوێژی نیوەڕۆی لە (مكة)دا کرد، ئینجا گەڕاوە (مِنى)و لەوێش بە جەماعەت دووبارەی کردەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەوها حەدیسەکانیان کۆ کردونەوە.

(وَهَذَا الرَّمْيُ) ئەو ڕەجمکردنەی شەیتانیگەورەو (وَالذَّبْحُ) سەربڕینی ئاژەڵو (وَالْحَلْقُ) سەرتاشینو (وَالطَّوَافُ) تەوافی ڕوکنی حەج-کە هەر چواریان لە ڕۆژی جەژندا دەکرێن- (يُسَنُّ تَرْتِيبُهَا كَمَا ذَكَرْنَا) سوننەتە: بەو ڕیزەی گوتمان یەك لە دوای یەك بیانکا، واتە: ئەو ڕیزەیڕابردوو واجب نیە، کەوابو: ئەگەر لە پێش هەموویاندا تەواف بکا، یان پێش ڕەجمکردن سەری بتاشێ، گشتیان دروست دەبن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: وَقَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَقَالَ رَجُلٌ: حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ؟ قَالَ: اِذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ. وَقَالَ آخَرُ: نَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ؟ قَالَ اِرْمِ وَلاَ حَرَجَ. فَمَا سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَأُخِّرَ إِلاَّ قَالَ اِفْعَلْ وَلاَ حَرَجَ﴾رواه الشيخان، لە (حجةالْوَداع)دا پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردو

وَيَدْخُلُ وَقْتُهَا بنصْف لَيْلَةالنَّحْرِ، وَيَبْقَى وَقْتُ الرَّمْيِ إِلَى آخرِ يَوْمِ النَّحْـرِ، وَلاَ يَخْـتَصُّ الذَّبْحُ بِزَمَنٍ، قُلْتُ: اَلصَّحِيحُ اخْتِصَاصُهُ بِوَقْتِ الأُضْحِيَّةِ وَسَـيَأْتِي فِـي آخِـرِ بَـابِ مُحَرَّمَاتِ الإِحْرَامِ عَلَى الصَّوَابِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَالْحَلْقُ وَالطَّوَافُ وَالسَّعْيُ لاَ آخِرَ لِوَقْتِهَا،

---

گوتی: پـێش سـەربڕینیئاژەڵ سـەرم تاشیوە؟ فـەرمووی: سـەری ئاژەڵەکـە ببڕەو گوناه نیە. یەکێکیتر گوتی: من پـێش ڕەجمکردن ئاژەڵم سـەربڕیوە؟ فـەرمووی: ڕەجم بکـەو گوناه نیە. جا لـەو ڕۆژەیجەژنـدا لـە هـەر شتێك پرسیاری لێکرابا-جا دوا خرابێ، یان پێش خرابێ- پێغەمبەرﷺ هەر دەیفەرموو: بیکەو گوناه نیە.

﴿ کاتی ڕەجمی شەیتان و سەرتاشین و تەوافی ڕوکنی حەج ﴾

ئینجا جگـە لـە سـەربڕینی ئـاژەڵ (وَيَـدْخُلُ وَقْتُهَـا) ڕەجمـی شـەیتانیگەورەو سەرتاشـین و تەوافیڕوکن، هەر سێکیان کاتەکەیان دێ (بِنِصْفِ لَيْلَـةِالنَّحْرِ) بـە تـەواوبوونی نیـوەی شـەوی جەژن، بەو مەرجەی لە پـێش نیوەشـەودا لـە (عَرَفـات)دا وەسـتابێ، واتـە: کـە لـە (عَرَفـات) گەڕاوە، لە دوای نیوەی شـەویجەژن هـەر یـەکێك لـەو سێیانە بکـا، دروست دەبـێ ﴿عَـنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَرْسَلَ أُمَّ سَلَمَةَ لَيْلَةَالنَّحْرِ فَرَمَتْ قَبْلَ الْفَجْرِ ثُـمَّ أَفَاضَـتْ﴾ رواه ابـودلود باسـناد صـحيح، پێغەمبـەرﷺ (أم سـلمة)ی نـارد شـەویجەژن لـە پـێش بەیانـدا ڕەجمیشەیتانی کرد، ئینجا ڕۆیشتە (مكة)و (طَوافُ الإفاضَة)ی کرد.

(وَيَبْقَى وَقْتُ الرَّمْيِ) کاتی بژاردەی ڕەجمی شەیتانیگەورە دەمێنـێ (إِلَـى آخِـرِ يَـوْمِ النَّحْـرِ) تا ئاخیری ڕۆژی جەژن ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍرَضِيَاللهُ عَنهمـا: قَالَ رَجُلٌ: رَمَيْتُ بَعْدَ مَا أَمْسَيْتُ؟ فَقَـالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَحَرَجَ﴾رواه البخاري، پیاوێك گوتی: لە کـاتی ئێـوارێدا ڕەجمـی شـەیتانم کـرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: هیچ گوناه نیە.

جا بزانە: لە فەرموودەی بەهێزتردا: تا ئاخیری ڕۆژی چـوارەمیجەژن، کـاتی دروسـتبوونی ڕەجمی شەیتانیگەورە دەمێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَلاَ يَخْتَصُّ الذَّبْحُ بِزَمَنٍ) بەڵام سەر بڕینی(هَدْي) تایبەت نیە بە هـیچ کاتێـك (قُلْتُ) ئیمـامی (النـواوي) دەفـەرموێ (اَلصَّحِيحُ) بـە فـەرموودەی ڕاسـت: (اخْتِصَاصُـهُ بِوَقْـتِ الأُضْـحِيَّةِ) سـەربڕینی(هَـدْي) تایبەتـە بـە کاتیقوربـانی، واتـە: لـە ڕۆژی جەژنیقوربانـەوە-کـە ڕۆژ هەڵات- تا ئاخیری ڕۆژی چوارەمیجەژن (وَسَيَأْتِيفِيآخِرِبَابِ مُحَرَّمَاتِ الإِحْرَامِ عَلَىالصَّوَابِ وَاللهُ أَعْلَمُ) لە کۆتایی باسی قەدەغەکراوەکانیئیحرامدا ڕاستیەکەی دێ،إن شاءَ اللهُ تعالَى.

(وَالْحَلْقُ) سەرتاشین و (وَالطَّوَافُ) تەوافی ڕوکنیحەج و (وَالسَّعْيُ) هاتوچـۆی سـەفاو مـەروە (لاَ آخِرَ لِوَقْتِهَا) کاتەکەیان کۆتایی نایێ تا لە ژیانـدا مابـێ، واتـە: لـە دوای نیـوە شـەوی جـەژنی قوربانەوە تا پێش مردن، لە هەر کاتێکدا ئەو سێیانە بکرێن دروست دەبن، بـەڵکو دروسـتە

وَإِذَا قُلْنَا: اَلْحَلْقُ نُسُكٌ فَفَعَلَ اثْنَيْنِ مِنَ الرَّمْيِ وَالْحَلْقِ وَالطَّوَافِ حَصَلَ التَّحَلُّـــلُ الأَوَّلُ، وَحَلَّ بِهِ اللُّبْسُ وَالْحَلْقُ وَالْقَلْمُ، وَكَذَا الصَّيْدُ وَعَقْدُ النِّكَاحِ فِي الأَظْهَرِ، قُلْتُ: اَلأَظْهَـــرُ لاَ يَحِلُّ عَقْدُ النِّكَاحِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَإِذَا فَعَلَ الثَّالِثَ حَصَلَ التَّحَلُّلُ الثَّانِي

---

له وولاتیخۆی، یان لـه شـوێنێکیتری جگـه لـه (مَكَّة)، سـەریخۆی بتاشـێ، هـەروەك لـه (الإيضاح)دا فەرموویەتی، بەڵام وەها سوننەتە: له ڕۆژی جەژنیقوربانـدا ئـەو سـێیانه بکرێن، ناپەسندە—بێعوزر— له ڕۆژیجەژن دوا بخرێن، دواخستنیان لـه سـێ ڕۆژەکـەی دوای جـەژن ناپەسندترە، چونکه ئەگەر یەکێکی لـەو سـێیانه لـه سـەر بمێنـێ لـه ژێـر ئیحـرام دەرناچـێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانه.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگـەر (طَوافِ الإفاضَة)ی ڕوکنی حەجی نەکردبو، بـەڵام (طَـوافِ الْـوَداع)ی کرد، ئـەم (طَوافِ الْوَداعَ)ی بەر (طَوافِ الإفاضَة)ی ڕوکنیحـەج دەکـەوێو لـه ژێـر ئیحرامـی حەج دەردەچێ، بەڵام ئەگەر لەو دووانە هیچیانی نەکرد، ئەوە بـه تـەواوی لـه ژێـر ئیحـرام دەرناچێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ حەڵاڵبوونی ئیحرامی حەجو عومرە ﴾

بزانه: ئیحرامیحـەج دوو حەڵاڵبوونی هەنە، له کوردەواریدا پـێیدەڵێن: ئیحـرام شـکاندن:

**حەڵاڵبوونییەکەم:** (وَإِذَا قُلْنَـا) ئەگـەر لـه سـەر فـەرموودەی بـەهێز بڵـێین: (اَلْحَلْـقُ نُسُـكٌ) سەرتاشین خواپەرستییە: له حەجو عومرەدا (فَفَعَلَ اثْنَيْنِ) جا حاجیەکه دووی کـردن لـەم سێیانە: (مِـنَ الرَّمْـيِ وَالْحَلْـقِ وَالطَّوَافِ) لـه ڕەجمـی شـەیتانیگەورەو لـه سەرتاشـینو لـه تـەوافی ڕوکنیحـەج، واتـه هـەر کاتێـك تـەنها ڕەجمو تاشـینی کـردن، یـان تـەنها ڕەجمو تـەوافی کـردن، یـان تـەنها تاشـینو تـەوافی کـردن، ئـەوە (حَصَـلَ التَّحَلُّـلُ الأَوَّلُ) حەڵاڵبوونییەکەمی بۆ دێته جێو (وَحَلَّ بِهِ) بەو حەڵاڵبوونەییەکەم، ئـەم قەدەغەکراوانـەی بۆ حەڵاڵ دەبن: (اَللُّبْسُ) جلو بـەرگی دەبـەر بکاتـەوەو (وَالْحَلْـقُ) مـووی لاشـەی بتاشـێو (وَالْقَلْمُ) نینۆکی بکـاو خـۆی بۆنخـۆش بکـاو (وَكَذَاالصَّيْدُ) هـەروەها ڕاو بکـاو (وَعَقْدُالنِّكَاحِ فِيالأَظْهَرِ) ژن مارە ببڕێ.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ (الأَظْهَـرُ) فـەرموودەی بـەهێزتر: (لاَ يَحِـلُّ عَقْدُالنِّكَاحِ) بـه حەڵاڵبوونییەکەم مارەبڕینو جیماع کردنو دەستبازی حەڵاڵ نـابن (وَاللهُ أَعْلَـم) پێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: ﴿إِذا رَمَيْتُمُ الْجَمْرَةَ فَقَد حَلَّ لَكُمْ كُلُّ شَيْءٍ إلاَّ النِّسَـــاءَ﴾ رواه النسائي باسناد جيد، هەر کاتێك شەیتانیگەورەتان ڕەجم کرد، گشت قەدەغـەکراوەکانتان بـۆ حـەڵاڵ دەبـن تەنها ئافرەتان نەبن.

**حـەڵاڵبوونیدووەم:** (وَإِذَا فَعَـلَ الثَّالِـثَ) هـەر کاتێـك سێیەمەکەشـی کـرد، واتـه: ڕەجـمو تاشینو تەوافی ڕوکنی حەجی هـەرسێك کردن، ئەوە (حَـصَلَ التَّحَلُّلُ الثَّانِي) حـەڵاڵبوونی

وَحَــــلَّ بِــــــهِ بَـــــاقِي الْمُحَرَّمَـــــاتِ.

(فَصْلٌ) إِذَا عَادَ إِلَى مِنىً بَاتَ بِهَا لَيْلَتَيِ التَّشْرِيقِ،

دووەمیشی بۆ دێتەجێو (وَحَلَّ بِهِ بَاقِي الْمُحَرَّمَاتِ) بەو حەلاڵبوونەیدووەم گشت قەدەغەکراوەکانیتری بۆ حەلاڵ دەبن، بە (إجماع)ی زانایان.

بەلام ئاگاداربە: ئەگەر لە دوای (طَوافُ الْقُدُومِ)، (سَعْي) سەفاو مەڕوەی نەکردبێ، پێویستە: لە دوای (طَوافُ الإفاضَةِ)یڕوکنیحەج (سَعْي) سەفاو مەڕوە بکا، ئینجا حەلاڵبوونیدووەمی بۆ دێتە جێ، واتە: هەر کەسێك (سَعْي) سەفاو مەڕوەی نەکردبێ، بە تەواوی لە ژێر ئیحرام دەرناچێ.

هەروەها ئاگاداربە: ئەگەر هەر چوار ڕۆژەکەی جەژن تەواو بونو شەیتانیگەورەی ڕەجم نەکردبو، ئەوە دەبێ خوێنی ڕەجم نەکردن بدا، ئینجا حەلاڵبوونی بۆ دێتەجێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: عومرە تەنها یەك حەلاڵبوونی هەیە: بە تەواف کردنو (سَعْي)و سەرتاشین دێتە جێو عومرەکەی تەواو دەبێ، هەروەك لە (المجموع)و (بجيرمي)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ فَصْلٌ: لە باسی مانەوەی شەوێ لە (مِنَى)و ڕەجمی سێ شەیتانەکان ﴾

بزانە: هەرسێك ڕۆژەکەی دوای ڕۆژی جەژنیقوربان پێیان دەگوترێ: (أَيّامُ التَّشْرِيقِ)، هەم: (الأَيّامُ الْمَعْدُوداتُ)، هەروەك لە (الإيضاح)دا فەرموویەتی.

ئینجا (إِذَا عَادَ إِلَى مِنىً) هەر کاتێك لە ڕۆژی جەژندا (طَوافُ الإفاضَةِ)یڕوکنیحەجی کردو گەڕاوە بۆ (مِنَى)، (بَاتَ بِهَا لَيْلَتَيِ التَّشْرِيقِ) واجبە: هەردوو شەوەکەی(أَيّامُ التَّشْرِيقِ)ی دوای ڕۆژیجەژن لە (مِنَى)دا بمێنێتەوە، مەبەستیش ئەوەیە: بەشە زۆرترەکەی شەوێ لە (مِنَى)دا بمێنێتەوە، واتە: بە ئەندازەیەکی کەمتر واجبەکە پێك نایێ.

ئینجا بزانە: هەر کەسێك هیچ عوزرێکیشەرعی نەبێو شەوێ لە (مِنَى)دا نەمێنێتەوە، خوێنی لە سەر واجب دەبێ.

بەلام ئەگەر عوزرێکیشەرعی هەبێ: وەك بەخۆی نەخۆش بێ، یان سەرپەرشتی نەخۆشێکی بێکەس بکا، یان نەخۆشەکە دڵی بەویەوە خۆش ببێ، یان بە شوێن یەکێکی ونبوودا بگەڕێ...لەو حاڵەتانەدا ئەگەر شەوێ لە (مِنَى)دا نەمێنێتەوە خوێنی لە سەر نیە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە ﴿عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِلْعَبَّاسِ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيالِي مِنَى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ﴾ رواه الشيخان، پێغەمبەر ﷺ ئیمامی(عباس)ی ئیزن دا شەوەکانی(مِنَى) لە (مِنَى)دا نەمێنێتەوەو لە (مكة)دا بمێنێتەوە، تاکو ئاوی خواردنەوە بۆ حاجیان ئامادە بکا.

وَرَمَى كُلَّ يَوْمٍ إِلَىالْجَمَرَاتِ الثَّلاَثِ كُلَّ جَمْرَةٍ سَبْعَ حَصَيَاتٍ، فَإِذَا رَمَىالْيَوْمَ الثَّانِي وَأَرَادَ النَّفرَ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ جَازَ وَسَقَطَ مَبِيتُ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ وَرَمْيُ يَوْمِهَا، فَإِنْ لَمْ يَنْفِرْ حَتَّى غَرَبَتْ وَجَبَ مَبِيتُهَا وَرَمْيُ الْغَدِ،

---

هەروەها (وَرَمَى كُلَّ يَوْمٍ إِلَى الْجَمَرَاتِ الثَّلاَثِ) واجبە: گشت ڕۆژێكی دوای جەژنیش هەرسێك شەیتانەكان ڕەجم بكا، واتە: (كُلَّ جَمْرَةٍ سَبْعَ حَصَيَاتٍ) گشت شەیتانێك حەفت بەردی بۆ بهاوێ ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَرْمِي الْجَمْرَةَالدُّنْيا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَصَاةٍ ثُمَّ يَتَقَدَّمُ فَيَقُومُ فَيَسْتَقْبِلُ الْقِبْلَةَ ثُمَّ يَدْعُو وَيَرْفَعُ يَدَيْهِ وَيَقُومُ طَوِيلاً، ثُمَّ يَرْمِي الْوُسْطَى ثُمَّ يَأْخُذُ ذَاتَ الشِّمَالِ وَيَقُومُ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَيَدْعُو وَيَقُومُ طَوِيلاً، ثُمَّ يَرْمِي جَمْرَةَ ذَاتِ الْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِي وَلاَ يَقِفُ عِنْدَهَا ثُمَّ يَنْصَرِفُ﴾ رواه البخاري وأبوداود، پێغەمبەرﷺ شەیتانییەكەمی نزیك مزگەوتی (مِنَى)ی بە حەفت بەرد ڕەجم كردو لەگەڵ هەر بەردێكدا (اَللّٰهُ أَكْبَر)ێكی دەگوت، ئینجا بەرەو پێش ڕۆیشتو ڕوو لە قیبلە ماوەیەكی درێژ ڕاوەستاو دوعای دەكردو دەستی بەرز دەكردنەوە، ئینجا شەیتانی ناوەندی ڕەجم كردو ڕێگەی لای چەپەی دەگرتو ڕادەوەستاو دوعای دەكردو دەستی بەرز دەكردنەوە، ئینجا شەیتانیگەورەی ڕەجم كردو لەوێ ڕانەدەوەستا، ئینجا دەڕۆیشت.

## ﴿ (نَفر) چوونەدەرەوە لە (مِنَى) ﴾

ئینجا (فَإِذَا رَمَى الْيَوْمَ الثَّانِيَ) هەر كاتێك لە ڕۆژی دووەمی دوایجەژندا، هەرسێك شەیتانەكانی بە تەواوی ڕەجم كردو (وَأَرَادَ النَّفرَ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ) ویستی –لە دوای نیوەڕۆ– پێش ڕۆژئاوابوون بڕواو (مِنَى) بەجێ بهێڵێ (جَازَ) دروستەو گوناهبار نابێو (وَسَقَطَ مَبِيتُ اللَّيْلَةِالثَّالِثَةِ) مانەوەی شەویسێیەمی لە سەر لادەچێ، بەو مەرجەی دوو شەوەكەی دوایجەژن لە (مِنَى)دا مابێتەوە (وَرَمْيُ يَوْمِهَا) هەم ڕەجمی شەیتانەكانیشی لە ڕۆژی سێیەمدا لە سەر لادەچێ، خوایگەورە دەفەرموێ ﴿فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾ هەر كەسێك لە دوو ڕۆژەكانی دوایجەژندا ڕەجم بكاو پەلە بكاو لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوە هیچ گوناهێكی لە سەر نیە، هەر كەسێكیش ڕۆیشتنەكەی بۆ ڕۆژی سێیەم دوا بێخێ هیچ گوناهێكی لە سەر نیە.

كەوابو: (فَإِنْ لَمْ يَنْفِرْ حَتَّى غَرَبَتْ) ئەگەر لە (مِنَى) نە ڕۆیشتە دەرەوە، تا ڕۆژ ئاوا بوو هەر لەوێ ماوە (وَجَبَ مَبِيتُهَا) واجبە: ئەم شەوەش لە (مِنَى)دا بمێنێتەوەو (وَرَمْيُ الْغَدِ) هەم واجبە: سبەینێش هەرسێك شەیتانەكان ڕەجم بكا، ئینجا (مِنَى) بەجێ بهێڵێ.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەكەم: ئەگەر خەریكی ڕۆیشتن بوو بەڵام هێشتا هەر لە (مِنَى)دا بوو و ڕۆژ ئاوا بوو، ئەوە لە سەر ڕۆیشتنەكەی بەردەوام دەبێو واجب نیە شەوێ بمێنێتەوە،

هەروەها ئەگەر لە پێش ڕۆژئاوابووندا لە (مِنَى) چووە دەرەوە، ئینجا پێش ڕۆژئاوابوون، یان دوای ڕۆژئاوابوون بۆ کارێکیتر گەڕاوە (مِنَى)، دیسان واجب نیە: لە (مِنَى)دا بمێنێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

دووەم: هەر کەسێك -بە بێ‌عوزر- شەوی یەکەمو دووەمی دوایجەژن لە (مِنَى)دا نەمابێتەوە، بۆی دروست نیە: لە ڕۆژی دووەمی دوایجەژندا لە دوای ڕەجمی شەیتانەکانیش (مِنَى) بەجێ بهێڵێ، بەڵکو واجبە شەویسێیەم بمێنێتەوەو سبەینێش هەرسێك شەیتانەکان ڕەجم بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

سێیەم: مەرجە: لە دوای هاتنی کاتینیوەڕۆ لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوە، چونکە ئەگەر لە پێش هاتنی کاتینیوەڕۆ لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوە، چوونەدەرەوەی دروست نابێو واجبە: بۆ دوای نیوەڕۆ -پێش ڕۆژئاوابوون- بگەڕێتەوە (مِنَى)و ڕەجم بکا، ئینجا پێش ڕۆژئاوابوون دروستە: بڕواتە دەرەوە، کەواتە: ئەگەر تا ڕۆژئاوا بوو نەگەڕاوە (مِنَى)، ئەوە خوێنی نەمانەوەی شەوی سێیەمو خوێنی ڕەجمی ڕۆژی سێیەمی دەکەونە سەر، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

چوارەم: ئەگەر لە ڕۆژی دووەمی دوای جەژندا بە تەواوی ڕەجمی نەکرد: وەك هەرسێك شەیتانەکانی ڕەجم نەکردبن، یان ڕەجمی کردبن بەڵام تەنها بەردێکی ناتەواو بوبێ، ئەوە چوونەدەرەوەی لە (مِنَى) دروست نابێ، کەوابو: ئەگەر لە دوای نیوەڕۆ ڕۆیشتو ڕۆژ ئاوا بوو، ئەو هەر لە دەرەوەی (مِنَى) بوو، ئەوە خوێنی نەمانەوەی شەوێو خوێنی ڕەجم نەکردنی دەکەوێتە سەر، واتە: ئەگەر لە دوای ڕۆژئاوابوون بشگەڕێتەوە (مِنَى)، لە سەری لاناچێ، چونکە بەو چوونەدەرەوەیە وازی لە (مِنَى)و لە حەج هێناوە، بەڵام هەر کەسێك -لەوانەیڕابردوو- ئەگەر پێش ڕۆژئاوابوون بگەڕێتەوە (مِنَى)و ڕەجمی شەیتانەکان بکا، خوێنی ناکەوێتە سەر، ئینجا کە گەڕاوەو ڕەجمی کرد، دووبارە پێش ڕۆژئاوابوون دەڕواتە دەرەوە، چونکە ئەگەر ڕۆژ ئاوا ببێو هەر لە (مِنَى)دابێ، واجبە: شەوێ بمێنێتەوەو سبەینێش شەیتانەکان ڕەجم بکا، هەروەك لە (المجموع)و (ابن قاسم)و (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ کاتی ڕەجمکردنی هەرسێك شەیتانەکان ﴾

(وَيَدْخُلُ رَمْيُ التَّشْرِيقِ) کاتی ڕەجمکردنی هەرسێك شەیتانەکان لە هەرسێك ڕۆژەکانی دوایجەژندا دێ (بِزَوَالِ الشَّمْسِ) بە لادانی ڕۆژ بە لای چاویڕاستەدا: کە سەرەتای کاتی نیوەڕۆیە، واتە: پێش هاتنی کاتینیوەڕۆ -ڕەجمی شەیتانەکانی هەمان ڕۆژ- دروست

وَيَخْرُجُ بِغُرُوبِهَا، وَقِيلَ يَبْقَى إِلَى الْفَجْرِ، وَيُشْتَرَطُ رَمْيُ السَّبْعِ وَاحِدَةً وَاحِدَةً،

نابێ ﴿عَنْ جَابِرٍ﷛: رَمَى رَسُولُ اللهِ ﷺ الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحىً وَأَمَّا بَعْدُ فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ﴾ رواه مسلم، پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جەژندا لە کاتی چێشتەنگاودا شەیتانی گەورەی ڕەجم کرد، بەڵام لە ڕۆژەکانی دوای جەژندا، هەر کاتێك ڕۆژ لایدەدا هەرسێك شەیتانەکانی ڕەجمی دەکردن.

(وَيَخْرُجُ بِغُرُوبِهَا) کاتی بژاردەی ڕەجمکردن بە ڕۆژئاوابوونی ئەو ڕۆژە تەواو دەبێ، بەڵام کاتی دروستبوونی ڕەجمکردنی هەرسێك شەیتانەکان لە هەرسێك ڕۆژەکاندا-لە سەر فەرموودەی بەهێزتر- تا ڕۆژئاوابوونی ڕۆژیسێیەمی دوایجەژن دەمێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: ئەگەر لەم ماوەیەدا ڕەجمی شەیتانەکانی نەکرد، ڕەجمەکە دەفەوتێو قەزاش ناکرێتەوە، بەڵکو خوێنی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لەمەو دواش ڕوونی دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (يَبْقَى إِلَى الْفَجْرِ) تا دەرکەوتنی بەیان کاتی ڕەجمکردن دەمێنێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: لەلای ئیمامی(الحرمين)و ئیمامی(الرافعي)و ئیمامی(الإسنوي) دروستە: پێش (زوال) -واتە: پێش هاتنی کاتینیوەڕۆ- سێ شەیتانەکان ڕەجم بکرێن، هەروەك لە (تحفة)دا ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو بە بێهێزی داناوە، بەڵام لە بێهێزیدا لەو پلەیە نیە: کە ڕەفتاری پێنەکرێ، هەروەك (الشرواني) فەرموویەتی.

کەوابو:-لە حاڵەتێکی زۆر پێویستدا- بۆ پیرو بێهێزەکان دروستە: (تَقْلِيد)ی ئەوسێ ئیمامانە بکەنو بۆ خۆیان ڕەفتار بە فەرموودەکەیان بکەنو لە کاتێکی نێوان بەیانو نیوەڕۆدا هەرسێك شەیتانەکان ڕەجم بکەن، چونکە لەو ماوەیەدا قەرەباڵغی نیە، بەڵام بە هیچ جۆرێك دروست نیە لە پێش نیوەڕۆدا لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوەو نەشکەڕێتەوە، هەروەك لە ئاگاداریەکەیڕابردوودا ڕوونمان کردەوە، وَالْحَمْدُ للهِ تَعَالَى.

## ﴿ مەرجەکانی دروستبوونی ڕەجمی شەیتانەکان ﴾

(وَيُشْتَرَطُ) بۆ دروستبوونی ڕەجمی شەیتانەکان بە مەرج دادەنرێ:

یەکەم: (رَمْيُ السَّبْعِ وَاحِدَةً وَاحِدَةً) لە ڕۆژیجەژنو لە دوایجەژندا هەر حەفت بەردەکان یەکە یەکە بۆ هەر شەیتانێك بهاوێ، بە بەڵگەی ﴿يُكَبِّرُ عَلَى إِثْرِ كُلِّ حَصَاةٍ﴾یڕابردوو لە حەدیسەکەی(ابن عمر)دا، واتە: پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هەر بەردێکدا (اللهُ أَكْبَرُ)ێکی دەگوت. کەواتە: ئەگەر دوو بەردان وێکڕا بهاوێ، یان گشتیان وێکڕا بهاوێ، هەر بە یەك جار دەژمێردرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

وَتَرْتِيبُ الْجَمَرَات، وَكَوْنُ الْمَرْمِيِّ حَجَراً، وَأَنْ يُسَمَّى رَمْياً فَلاَ يَكْفِي الْوَضْعُ، وَالسُّنَّةُ أَنْ يَرْمِيَ بِقَدْرِ حَصَى الْخَذْفِ، وَلاَ يُشْتَرَطُ بَقَاءُ الْحَجَرِ فِي الْمَرْمَى وَلاَ كَوْنُ الرَّامِي خَارِجاً عَنِ الْجَمْرَة،

---

دووەم: (وَتَرْتِيبُ الْجَمَرَاتِ) هەروەها مەرجە: بەو ڕیزەی حەدیسەکەی(ابن عمر)ی ڕابردوو، هەرسێك شەیتانەکان ڕەجم بکا، واتە: یەکەم جار شەیتانەکەی لای مزگەوتی (الْخَيْف)-کە دەکەوێتە لای(عَرَفَة)- ڕەجم بکا، ئینجا شەیتانەکەی ناوەند، ئینجا شەیتانەکەی گەورە-کە دەکەوێتە لای(مکة)- کەواتە: ئەگەر بە پێچەوانەوە ڕەجمیان بکا، تەنها ڕەجمی شەیتانی یەکەمی دروست دەبێ، هەروەها ئەگەر ڕەجمی شەیتانێکی بە تەواوی نەکردبێ، دروست نیە دەست بە شەیتانەکەی‌تر بکا، هەر چەند تەنها یەك بەردیش مابێ، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموویانە.

سێیەم: (وَكَوْنُ الْمَرْمِيِّ حَجَراً) مەرجە: ئەو شتەی بۆ شەیتانەکانی دەهاوێ: بەرد بێ، چونکە لە حەدیسەکەدا ناوی بەرد هاتوە، کەوابو: جیاوازی نیە بەردەکان لە پێشدا ڕەجمیان پێ‌کرابێ، یان نا، بەلام بە دارو ئاسنو گڵمەت ڕەجمکردن دروست نیە.

چوارەم: (وَأَنْ يُسَمَّى رَمْياً) مەرجە: بەردەکان بە هاویشتن بهاوێو بکەونە ناو حەوزی شەیتانەکە، کەوابو: (فَلاَ يَكْفِي الْوَضْعُ) دانانی بەردەکان لە ناو حەوزی شەیتانەکان بەس نیەو دروست نابێ، بەلام ئەگەر بەردەکانی دەهاویشتنو بە کێلەکەی ناو حەوزی شەیتانەکان دەکەوتن، ئینجا دەگەڕانەوە ناو حەوزەکە، ئەو ڕەجمەی دروست دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَالسُّنَّةُ أَنْ يَرْمِيَ بِقَدْرِ حَصَى الْخَذْفِ) وەها سوننەتە: شەیتانەکان ڕەجم بکا بەو بەردە بچوکانەی بە ئەنگوست دەهاویشترێن: کە بە قەد دەنکی باقلەیە.

پێنجەم: مەرجە بێگومان بزانێ بەردەکان کەوتونەتە ناو حەوزەکە، واتە: ئەگەر گومانی هەبوو: ئایا بەردێك، یان زیاتر کەوتۆتە ناو حەوزەکە، یان نا، ئەو ڕەجمکردنەی دروست نابێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، بەلام (وَلاَ يُشْتَرَطُ بَقَاءُ الْحَجَرِ فِي الْمَرْمَى) بە مەرج دانانرێ: بەردەکان-لە دوای‌لێدان- لە ناو حەوزەکەدا بمێننەوە، واتە: ئەگەر لە دوای وێکەوتن غلۆر بونەوەو هاتنە دەرەوە، زیانی نیە (وَلاَ كَوْنُ الرَّامِي خَارِجاً عَنِ الْجَمْرَةِ) هەروەها مەرج نیە: ئەو کەسەی ڕەجمی شەیتانەکان دەکا لە دەرەوەی حەوزی شەیتانەکەوە لێ‌بدا، بەڵکو دروستە: لە ناو حەوزەکەدا لێ‌بدا.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە سەر حەوزی شەیتانەکان نهۆمێکی‌تر دروست کرا، دروستە لەوێشەوە شەیتانەکان ڕەجم بکرێن، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە، جا لە

هەر لایەك شەیتانی یەکەمو دووەم ڕەجم بکرێن دروست دەبێ، بەڵام شەیتانیگەورە تەنها لایباشووری ڕەجم دەکرێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەواتە: لە هەر لایەکەوە بەردەکان بهاوێتە باشووری شەیتانیگەورە، ڕەجمەکەی دروست دەبێ، هەروەك لە(ڕەجمیشەیتانیگەورە)دا ڕوون کراوە.

## ﴿ ڕەجمی شەیتانەکان لە جیاتی کەسێکیتر ﴾

(وَمَنْ عَجَزَ عَنِ الرَّمْيِ) هەر کەسێك توانای ڕەجمی شەیتانەکانی نەبو: لە بەر بێهێزی، یان نەخۆشیەکی وەها: کە نەتوانێ بە پێوە نوێژ بکا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی، یان لە بەر بەندکردن (اسْتَنَابَ) واجبە: یەکێك بکاتە جێگری خۆی تاکو شەیتانەکانی لە جیاتی ڕەجم بکا، بەم دوو مەرجانە:

یەکەم: هۆیەکەی نەتوانینی بە شێوەیەکی وەها بەردەوام بێ: چاوەڕوان نەکرێ پێش کۆتایی چوارەمین ڕۆژیجەژن هۆیەکە لابچێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، کەوابو: ئەگەر دەیزانی هۆیەکەینەتوانین بەردەوام نابێو لە سێیەمی(أيام التشريق)دا -کە چوارەم ڕۆژیجەژنە- توانای ڕەجمکردنی دەبێ، ئەو کاتە دروست نیە جێگر دابنێ، هەروەك لە (نهاية)دا فەرموویەتی، کەواتە: هەر بەخۆی لە ڕۆژی چوارەمیجەژندا ڕەجمی هەرسێك شەیتانەکان دەکا: بۆ ئەم ڕۆژەیو بۆ ڕۆژەکانیڕابردووش، هەروەك لە دوای ئاگادریەکەیداهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعَالَى.

دووەم: مەرجە: لە کاتی ڕەجمکردندا جێگرەکەی دابنێ، هەم مەرجە: جێگرەکەش لە پێشدا ڕەجمی هەرسێك شەیتانەکان بە تەواوی بۆ خۆی بکا، ئینجا بگەڕێتەوەو لەجیاتی بێتوانایەکەش ڕەجمیان بکاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، بەڵام بە فەرموودەیەکی (المهمات): مەرج نیە هەرسێك شەیتانەکان بۆ خۆی ڕەجم بکا، بەڵکو هەر کاتێك شەیتانییەکەمی بۆ خۆی ڕەجم کرد، دروستە یەکسەر لەجیاتی بێتوانایەکەش ڕەجمی بکا پێش ئەوەی دووەکانیتر بۆ خۆی ڕەجم بکا، جا ئەم فەرموودەی (المهمات)ش بە بەهێز داندراوە، هەروەك (ابن قاسم)و(الشرواني) گێڕاویەتیانەوە.

﴿ ئاگاداری ﴾: دروست نیە بێتوانایەکە لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوە، تا جێگرەکە لە دوای نیوەڕۆ هەرسێك شەیتانەکان بە تەواوی لەجیاتیوی ڕەجم دەکا، چونکە ئەگەر جێگرەکە لەجیاتیوی هەرسێك شەیتانەکانی ڕەجم نەکردبن، یان ڕەجمی کردبن بەڵام تەنها بەردێکی ناتەواو بوبێ، یان بێتوانایەکە پێش هاتنی کاتینیوەڕۆ لە (مِنَى) بڕواتە دەرەوە، ئەوە لەو حاڵەتانەدا چوونەدەرەوەی لە (مِنَى) دروست نابێ، هەروەك لە ئاگاداریەکەیڕابردوودا ڕوونمان کردەوە.

ئینجا بزانە: جگە لە ڕەجمی شەیتانەکان لە هیچ کردارێکیتری حەجدا دانانی جێگر دروست نیە، واتە: هەر کەسێك کردارێکیتری حەج لەجیاتی کەسێکیتر بکا، دروست نابێو بە بەر ناکەوێ، هەر چەند عوزرێکی شەرعیشی هەبێ، هەروەك لە (القليوبي)و (بغية)دا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ ڕەجمی شەیتانەکان لە شەوێو لە ڕۆژێدا دروستە ﴾

(وَإِذَا تَرَكَ رَمْيَ يَوْمٍ) هەر کاتێك بە سەهوو، یان بە نەزانی، یان بە قەسدی لە ڕۆژێکدا ڕەجمی شەیتانەکانی نەکرد، ئەوە دروستە-لە دوای ڕۆژئاوابوون- لە شەوێدا گشت شەیتانەکان ڕەجم بکا، هەروەك لە (الإيضاح)دا فەرموویەتی.

جا ئەگەر لە شەوێشدا ڕەجمی نەکردن، ئەو کاتە (تَدَارَكَهُ فِي بَاقِي الأَيَّامِ) لەو ڕۆژانەی ماون شەیتانەکان بە داوی یەکتردا ڕەجم دەکا بەگوێرەی ڕیزی خۆیانو ڕۆژەکانیان، جیاوازی ڕۆژی جەژنو دوای جەژن نیە (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا ﴿عَنْ عاصم‌﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَخَّصَ لِرِعاءِ الأبِلِ فِي الْبَيْتُوتَةِ: أَنْ يَرْمُوا يَوْمَ النَحْرِ ثُمَّ يَجْمَعُوا رَمْيَ يَوْمَيْنِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ، ثُمَّ يَرْمُونَ يَوْمَ النَّفْرِ﴾رواه اصحاب السنن بسندصحيح، پێغەمبەرﷺ ڕێگەیدا: شوانی ووشترەکان شەوێ لە (مِنَى) نەمێننەوەو کە ڕۆژیجەژن ڕەجمی شەیتانیان کرد، ڕەجمی دوو ڕۆژەکانی دوای جەژن کۆ بکەنەوە، ئینجا لەو ڕۆژەدا کە خەڵك (مِنَى) بەجێ دێڵن، ئەوان ڕەجمی گشت ڕۆژەکان بکەن.

جا بزانە: دروستە هەم لە شەوێدا، هەم لە پێش نیوەڕۆدا، هەم لە دوایعنیوەڕۆدا: ڕەجمی ڕۆژانیڕابردوو بکا، بەگوێرەی ڕیزی خۆیان، جا ئەگەر لە دوای نیوەڕۆدا ڕەجمی ڕۆژانیڕابردوو بکا، ئەو کاتەش واجبە: ڕەجمی ڕۆژانیڕابردوو لە پێش ڕەجمی ئەمڕۆدا بکا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بۆ وێنە: ئەگەر ڕەجمی ڕۆژی جەژنو دوو ڕۆژەکانی دوای جەژنی نەکردبو و ویستی لە ڕۆژی سێیەمی جەژندا گشت ڕەجمەکان بکا، واجبە: یەکەم جار ڕەجمی شەیتانیگەورە لەجیاتی ڕۆژیجەژن بکا، ئینجا بڕواتە لای شەیتانی یەکەمو لەویەوە دەست بە ڕەجمی هەرسێك شەیتانەکان بکا لەجیاتی ڕۆژی یەکەمی دوایجەژن، ئینجا دووبارە بگەڕێتەوەو ئەم جارەش لە شەیتانی یەکەمەوە دەست بە ڕەجم بکاتەوە لە جیاتی ئەم ڕۆژەی دووەمی دوای جەژن، کەواتە: ئەگەر بۆ هەر شەیتانێك چواردە بەرد بهاوێ، ئەوە تەنها ڕەجمیدوێنێی دروست دەبێو ڕەجمی ئەمڕۆی دروست نابێ، چونکە بە ڕیزی ڕۆژەکان ڕەجمەکانی نەکردون، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

وَلاَ دَمٌ، وَإِلاَّ فَعَلَيْهِ دَمٌ، وَالْمَذْهَبُ تَكْمِيلُ الدَّمِ فِي ثَلاَثِ حَصَيَاتٍ، وَإِذَا أَرَادَ الْخُـرُوجَ مِنْ مَكَّةَ طَافَ لِلْوَدَاعِ،

---

(وَلاَ دَمَ) هیچ خوێنێك له سەر ئەو كەسە نیە: كە ڕەجمی ڕۆژانیڕابردوو–بەگوێرەی ڕیزی شەیتانەكانو ڕۆژەكان– له ڕۆژانیداهاتوودا دەكا.

(وَإِلاَّ) بەلام ئەگەر هەر ڕەجمی شەیتانەكانی نەكرد (فَعَلَيْـهِ دَمٌ) ئـەو كاتـە خـوێنی ڕەجم نەكردنی له سەر واجب دەبیّ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍرَضِيَاللهُ عَنهُما: مَنْ نَسِيَ مِنْ نُسُكِهِ شَـيْئاً أَوْ تَرَكَـهُ فَلْيُهْرِقْ دَماً﴾ رواه الإمام مالك والبيهقي بسند صحيح، هەر كەسێك واجبێكـی حـەج لـە بیر بكا، یان بە قەسدی نەیكا، دەبی ئاژەلێك سەر ببڕیّ.

ئینجا بزانە: ئەگەر تەنها بەردێكی ڕەجمكردنی ناتەواو بیّ، یـەك مست دانەوێلـە لـە خوێن دەدا، ئەگـەر دوو بـەرد ناتـەواو بـن، دوو مسـت دانەوێلـە دەدا، هـەم (وَالْمَـذْهَبُ) بـە فەرموودەی ڕاستی مەزهەب: (تَكْمِيلُ الدَّمِ) خـوێنێكی تـەواوی دەكەوێتـە سـەر (فِـی ثَـلاَثِ حَصَيَاتٍ) له ناتەواوی سیّ بەرد، یـان زیـاتر، واتـە: ئەگـەر تـەنها سـیّ بـەردی لـە شـەیتان نەدابو، یان تەنها شەیتانێكی ڕەجم نەكردبو، یان هەر هـیچ شـەیتانێكی ڕەجـم نـەكردبون، واجبە: مەڕێك سەر ببڕیّ، یان دە ڕۆژ بەرۆژوو ببیّ.

هەروەها ئەگەر بە بیّعوزر تەنها شەوێك له (مِنَـى) نـەماوە مسـتێكی دانەوەێلـەی لـە سـەر واجب دەبیّ، ئەگەر دوو شەو نەماوە دوو مستی لـە سـەر واجـب دەبن، ئەگـەر هـەر هـیچ شەوێك نەماوەو (مِنَى)ی بەجیّهێشت، ئـەو كاتـە واجبـە: مـەڕێك سـەر ببڕیّ، یـان دە ڕۆژ بەرۆژوو ببیّ، بەو جۆرەی له خوێنەكانیحەجدا ڕوونی دەكەینەوە، إنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

ئینجـا بزانـە: جیـاوازی نیـە بـە قەسـدی لـە (مِنَـى)دا نەمابێتـەوە، یـان لـە بـیری چـوبیّ، هەروەك له (المجموع)دا فەرموویەتی.

## ﴿ باسی (طَواف الْوَدَاع)- تەوافیماڵئاوایی ﴾

بزانە: هـەر كاتێـك حـاجی ئیحرامـی حـەلاڵ بـو، واتـە: شـكاندی، دروسـتە پـیّی بگـوترێ: حاجی، هەروەك له(المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجـا (وَإِذَا أَرَادَالْخُـرُوجَ مِـنْ مَكَّـةَ) هـەر كاتێـك حـەج، یـان عـومرەی تـەواو كـردو ویسـتی له(مكة) بڕواتە دەرەوە، واتە: بۆ ئەندازەی (قصـر)=(٨٠)هەشـتا كیلـومتر لـە(مكة) دوور بكەوێتەوە، ئەوە (طَافَ لِلْوَدَاعِ) واجبـە: (طَـوافُ الْـوَدَاع) تـەوافی ماڵئـاوایی بكـا ئینجـا لـە (مكة) بڕواتە دەرەوە، جیاوازی نیە: نیەتی هـەبیّ لـە دوای دەرچـوونەكەی بگەڕێتـەوە بـۆ (مكه)، یان نا ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍرَضِيَاللهُ عَنهُما: أُمِرَالنَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُعَهْـدِهِمْ بِالْبَيْـتِ إِلاَّ أَنَّـهُ خُفِّفَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ﴾ رواه الشيخان، له لای پێغەمبەرﷺ فـەرمان بە خـەڵك كراوە:

وَلاَ يَمْكُثُ بَعْدَهُ، وَهُوَ وَاجِبٌ يُجْبَرُ تَرْكُهُ بِدَمٍ، وَفِي قَوْلٍ سُنَّةٌ لاَ يُجْبَرُ، فَإِنْ أَوْجَبْنَاهُ فَخَرَجَ بِلاَ وَدَاعٍ وَعَادَ قَبْلَ مَسَافَةِ الْقَصْرِ سَقَطَ الدَّمُ، أَوْ بَعْدَهَا فَلاَ عَلَى الصَّحِيحِ، وَلِلْحَائِضِ النَّفْرُ بِلاَ وَدَاعٍ،

---

كە ئاخیر كردەوەیان تەوافی (بَیْت) بێ، بەڵام بۆ بارسوكی ڕێگە دراوەتە ئافرەتیحەیزدار: تەواف نەكاو بڕواتە دەر.

(وَلاَ يَمْكُثُ بَعْدَهُ) نابێ لە دوای (طَوافُ الْوَداع) لە (مَكّة)دا بمێنێتەوە، واتە: ئەگەر بە بێعوزر لە دوای (طَوافُ الْوَداع) مایەوە، یان خۆی خەریك كرد بە سەردانو شت كڕینو ئەو جۆرە شتانە، واجبە: دووبارە تەوافەكەی بكاتەوە، بەڵام ئەگەر لە دوای تەوافەكەی ئیقامەتی نوێژ كراو جەماعەتی كرد، یان خۆی بە كاروباری سەفەر خەریك كرد، وەك ڕێكخستنو باركردنی كەلوپەلو چاوەڕوانكردنی ڕۆیشتنی كاروان، ئەو كاتە زیانی نیەو نایەوێ دووبارەی بكاتەوە، هەروەك لە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

(وَهُوَ وَاجِبٌ) ئەو (طَوافُ الْوَداع)ە واجبەو (يُجْبَرُ تَرْكُهُ بِدَمٍ) هەم واجبە: نەكردنی پڕ بكرێتەوە بە خوێن، واتە: بە سەربڕینی مەڕێك، یان بە دە ڕۆژوو (وَفِي قَوْلٍ سُنَّةٌ) لە فەرموودەیەكدا (طَوافُ الْوَداع) سوننەتەو (لاَ يُجْبَرُ) بە نەكرنی خوێن واجب نابێ (فَإِنْ أَوْجَبْنَاهُ) جا ئەگەر بە فەرموودەی بەهێزتر بڵێین: (طَوافُ الْوَداع) واجبە (فَخَرَجَ بِلاَ وَدَاعٍ) ئینجا بێئەوەی (طَوافُ الْوَداع) بكا، لە (مكة) چووە دەرەوەو (وَعَادَ قَبْلَ مَسَافَةِالْقَصْرِ) پێش ئەوەی بە ئەندازەی (قصر)=(٨٠) هەشتاكیلۆمەتر بڕوا، گەڕاوە ناو (مكة)و (طَوافُ الْوَداع)ی كرد (سَقَطَ الدَّمُ) خوێنەكەی لە سەر لادەچێ (أَوْ بَعْدَهَا) یان لە دوای ئەوەی بە ئەندازەی(قصر) ڕۆیشت، ئینجا گەڕاوە (فَلاَ علىالصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست خوێنەكەی لە سەر لاناچێ، چونكە خوێنەكەی لە ئەستۆدا جێگیر بووە.

(وَلِلْحَائِضِ) بۆ ئافرەتی حەیزدار دروستە (النَّفْرُ بِلاَوَدَاعٍ) بێ ئەوەی (طَوافُ الْوَداع) بكا لە (مكة) بڕواتە دەرەوە، بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو.

﴿ ئاگاداری ﴾: بە فەرموودەی ڕاستتر (طَوافُ الْوَداع) بەشێك نیە لە كردەوەكانی حەجو عومرە، كەواتە: هەر كەسێك -بەو ئەندازەیڕابردوو- لە (مكة) بڕواتە دەرەوە، واجبە: (طَوافُ الْوَداع) بكا، هەرچەند بۆ حەجو عومرەش نەچووبێتە ناو شاری(مكة)، هەروەك لە (الإيضاح)دا ڕوون كراوەتەوە -بە بەڵگەی حەدیسەكەیڕابردوو- بەڵام لە (تحفة)دا فەرموویەتی: (طَوافُ الْوَداع) -بۆ حاجیو عومرەچی- پابەندی كردەوەكانی حەجو عومرەیە. كەواتە: (طَوافُ الْوَداع) بەر (طَواف الإفاضَة)ی ڕوكنیحەج دەكەوێ بۆ ئەو كەسەی (طَواف الإفاضَة)ی نەكردوە، هەروەك لە پێش حەڵاڵبوونی حەجو عومرەدا ڕابرا.

ئینجا کە (طَوافُ الوَداع)ی تەواو کرد، دوو ڕەکعەت سوننەتی تەواف دەکا، ئینجا سوننەتە: لە لای (الْمُلتَزم)-نێوان (الْحَجَرالأسْوَد)و دەرگەی (بَيْت) ڕابوەستێ‌و ئەم دوعایە بخوێنێ: (اَللّهُمَّ إنَّ الْبَيْتَ بَيْتُكَ وَالْعَبْدَ عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ حَمَلْتَنِي عَلَى مَاسَخَّرْتَ لِي مِنْ خَلْقِكَ حَتَّى صَيَّرْتَنِي فِي بَلَدِكَ وَبَلَّغْتَنِي بِنِعْمَتِكَ حَتَّى أَعَنْتَنِي عَلَى قَضاءِ مَناسِكِكَ، فَإِنْ كُنْتَ رَضِيتَ عَنِّي فازْدَدْ عَنِّي رِضًى، وَإلاَّ فَمُنَّ الآنَ قَبْلَ أَنْ تَناءَى عَنْ بَيْتِكَ دارِي وَيَبْعُدَ عَنْهُ مَزارِي، وَهَذا أَوانُ إنْصرافِي إنْ أَذِنْتَ لِي غَيْرَ مُسْتَبْدِلٍ بِكَ وَلاَ بِبَيْتِكَ وَلاَراغِبٍ عَنْكَ وَلاَ عَنْ بَيْتِكَ، اَللّهُمَّ فَأَصْحِبْنِي الْعَافِيَةَ فِي بَدَنِي وَالْعِصْمَةَ فِي دِينِي وَأَحْسِنْ مُنْقَلَبِي وَارْزُقْنِيالْعَمَلَ بِطَاعَتِكَ مَا أَبْقَيْتَنِي وَاجْمَعْ لِي خَيْرَيِ الدُّنْيا وَالآخِرَةِ، إنَّكَ قَادِرٌ عَلَى ذَلِكَ).

ئینجا سەلاوات لە سەر پێغەمبەرﷺ لێدەدا، هەر دوعایەکی‌تریش حەز دەکا، سوننەتە: بیکا، هەروەها بۆ ئافرەتی‌حەیزداریش سوننەتە: لە دەرگەی(الْمَسْجِدالْحَرام) ڕابوەستێ‌و ئەو دوعایەی‌ڕابردوو بکا، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

## ﴿ ئاوی زەمزەم ﴾

(وَيُسَنُّ شُرْبُ مَاءِ زَمْزَمَ) بۆ گشت کەسێك سوننەتە: ئاوی زەمزەم بخواتەوە ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنهما: شَرِبَ النَّبيُّﷺ مِنْ زَمْزَمَ﴾رواه الشيخان، پێغەمبەرﷺ ئاوی زەمزەمی خواردەوە.

هەم سوننەتە: پڕ بە ورگی‌خۆی بیخواتەوەو پێش خواردنەوەی (بِسْمِ الله) بکاو بڵێ: خوایە بۆ ئەم مەبەستەم ئاوی زەمزەم دەخۆمەوە، چونکە وام پێگەیشتوە: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ﴿ئاوی زەمزەم بۆ هەر مەبەستێك بخورێتەوە، دەبێ﴾.

هەروەها سوننەتە: ئاوی زەمزەم لەگەڵ خۆیا بباتەوە وولاتی‌خۆی ﴿عَنْ عَائِشَةَرَضِيَ اللهُ عَنهَا: أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ كَانَ يَحْمِلُ مِنْ مَاءِ زَمْزَمَ﴾ رواه الترمذي وصححه، پێغەمبەرﷺ هەندێك ئاوی زەمزەمی لەگەڵ خویا دەبردەوە (مدينة).

هەروەها سوننەتە: لە (مكة)دا زیارەتی ئەم شوێنانە بکا: ئەو ژوورەی پێغەمبەرﷺ تێیدا لە دایك بووە، ماڵی حەزرەتی(خَديجَة)، مزگەوتی خانووی(الأرقم)، ئەشکەوتی (حِراء)و ئەشکەوتی(ثَوْر).

ئینجا کە لە (مكة) چووە دەرەوە، سوننەتە: سێ جار بڵێ: (اَللهُ أَكْبَر)، ئینجا بڵێ: (لاَإلَهَ إلاَّالله وَحْدَهُ لاَشَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ عابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنا حامِدُونَ، صَدَقَ اللهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ).

## ﴿ زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ ﴾

(وَزِيَارَةُ قَبْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ) بۆ گشت کەسێك سوننەتە: زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ بکا، هەر کەسێکیش بڵێ: سوننەت نیە، خۆی گومڕایەو خەڵکیش گومڕا دەکا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

ئینجا بۆ حاجیەکان وەها سوننەتە: (بَعْدَ فَرَاغِ الْحَجِّ) لە دوای تەواوبوونی حەج زیارەتی گۆڕی پێغەمبەرﷺ بکەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ زَارَ قَبْرِي وَجَبَتْ لَهُ شَفَاعَتِي﴾رواه ابن خزيمة فىصحيحه، قال السبكي وهو حسن، وصححه ابن حجرالهيتمي، وقال الإمام النواوي: رواه الدارقطني والبيهقي باسنادين ضعيفين. واتە: هەر کەسێك زیارەتی گۆڕەکەم بکا، شەفاعەتی منی بۆ دەبێ.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّاللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ﴾ رواه ابوداود بسندصحيح، هەر کەسێك سەلامم لێبکا، خوای گەورە گوفتارم دەداتەوە تا وەڵامی سەلامی ئەدەمەوە.

جا ئەو حەدیسە بەڵگەیە: کە پێغەمبەرﷺ ئاگای لەو کەسە هەیە: کە زیارەتی دەکا، جگە لەوەش لە حەدیسێکیتردا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلأَنْبِيَاءُ أَحْيَاءٌ فِي قُبُورِهِمْ يُصَلُّونَ﴾ رواه أبويعلى قال الإمام المناوي: هو حديث صحيح، پێغەمبەران-عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ- زیندوونە لە گۆڕەکانیاندا نوێژ دەکەن.

ئینجا سوننەتە: بۆ چوونە (مَدِينَة)ی پیرۆز غوسل بکاو پۆختەترین بەرگ دەبەر بکاو لە ڕێگەدا زۆر سەلاوات لێبدا، ئینجا کە چاوی بە درەختو خانووەکانی(مَدِينَة) کەوت، زیاتر سەلاوات لێبدا.

ئینجا کە ویستی بڕواتە ناو (حَرَم)ی مزگەوتیپێغەمبەرﷺ، سوننەتە بڵێ: ﴿بِسْمِ اللهِ، اَلْحَمْدُ لِلَّهِ، وَالصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ عَلَى رَسُولِ اللهِ، رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ﴾حديث حسن رواه الترمذي إلاّ (التسمية والحمد) فابن السني.

ئینجا بڵێ: (بسم الله)و پێی ڕاستەی پێشدا بنێتە ژوورەوەو نیەتی (إعتكاف) بێنێ، جا بۆ هاتنە دەرەوەش هەمان زیکرو دوعا دەکا، بەڵام ئەم جارە دەڵێ: ﴿وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ﴾و پێی چەپەی پێشدا دەباتە دەرەوە.

ئینجا دانەنیشێ یەکسەر ڕوو بکاتە (اَلرَّوْضَةُ الْمُطَهَّرَة)-کە نێوان گۆڕەکەو مینبەری پێغەمبەرەﷺ-لە وێدا دوو ڕەکعەت (تَحِيَّةُالْمَسْجِد) بکا، چونکە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ﴿مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ﴾ رواه الشيخان، نێوان گۆڕەکەمو مینبەرەکەم مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت.

..................................................

ئینجا ڕوو بکاتە گۆڕە پیرۆزەکەی پێغەمبەرﷺ پشت لە قیبلەو ڕوو بکاتە سەری گۆڕەکەی‌و بە دەنگێکی نزم بڵێ:

(اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا حَبِيبَ اللهِ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا سَيِّدَ الْمُرْسَلِينَ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا خَيْرَالْخَلاَئِقِ أَجْمَعِينَ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ وَعَلَى آلِكَ وَأَهْلِ بَيْتِكَ وَأَزْوَاجِكَ وَأَصْحَابِكَ أَجْمَعِينَ، اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ وَعَلَى سَائِرِالأَنْبِيَاءِ وَالْمُرْسَلِينَ، جَزَاكَ اللهُ-يَا رَسُولَ اللهِ- عَنَّا خَيْرَالْجَزَاءِ وَصَلَّى عَلَيْكَ أَفْضَلَ وَأَكْمَلَ مَا صَلَّى أَحَدٌ مِنْ خَلْقِهِ أَجْمَعِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ الرِّسَالَةَ وَأَدَّيْتَ الأَمَانَةَ وَنَصَحْتَ الأُمَّةَ وَجَاهَدْتَ فِي‌اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ، اَللَّهُمَّ آتِهِ الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداًالَّذِي وَعَدْتَهُ). ئینجا سەلاواتەکەی دوای تەحیات لێدەدا.

جا ئەگەر نەیتوانی ئەو سەلامکردنە درێژە بکا، با بڵێ: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ). هەروەها ئەگەر یەکێك سەلامی پێدا ناردبوو، دەڵێ: (اَلسَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ، لەجیاتی فلانکەس). یان بڵێ: (يَا رَسُولَ اللهِ، فلانکەس سەلامت لێدەکا). هەروەك لە (الإيضاح)و (المجموع)دا فەرموویەتی.

ئینجا بە قەد گەزێك بەرەو ڕاستەی دەڕواو سەلام لە ئیمامی(أبوبكر) دەکا، ئینجا بە قەد گەزێکی‌تر بەرەو ڕاستەی دەڕواو سەلام لە ئیمامی(عُمَر) دەکا، چونکە ئەو دوو بەڕێزانەش لە ژوورەکەی گۆڕی‌پێغەمبەرداﷺ نێژراون، ئینجا دەگەڕێتەوە بەرامبەر پێغەمبەرﷺ بۆ هەر کارێکی حەز دەکا بە خاتری پێغەمبەرﷺ لە خوا دەپاڕێتەوە، ئینجا ڕوو لە قیبلە دەکاو تا حەز دەکا: دوعا بۆ خۆی‌و بۆ موسوڵمانان دەکا، بەڵام حەرامە: بە دەورەی گۆڕەکەدا بگەڕێ‌و ناپەسندە دیوارەکەی ماچ بکاو دەستی لێبداو پشت‌و زگی پێوە بنێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها سوننەتە: زیارەتی (قُبَاء)و گۆڕستانی(الْبَقِيع)و، گشت شوێنە ناودارەکانی‌تری (مدينة) بکا، سوننەتە: زۆر لە (مدينة)دا بەڕۆژوو بێ‌و خێرو چاکە بکاو گشت نوێژەکانی بە جەماعەت لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ بکا، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي‌هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَاسِوَاهُ إِلاَّالْمَسْجِدَالْحَرَامَ﴾رواه الشيخان، نوێژێك لەم مزگەوتەی‌مندا خێرترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی‌تردا، تەنها (الْمَسْجِدالْحَرام) نەبێ. واتە: چونکە نوێژێك لە (الْمَسْجِدالْحَرام)دا لە سەد هەزار نوێژی مزگەوتەکانی‌تر خێرترە، هەروەك لە ڕیوایەتی (ابن ماجه)دا هاتوە.

(فَصْلٌ) أَرْكَانُ الْحَجِّ خَمْسَةٌ: اَلإِحْرَامُ، وَالْوُقُوفُ، وَالطَّوَافُ، وَالسَّعْيُ، وَالْحَلْقُ إِذَا جَعَلْنَاهُ نُسُكاً.

---

## ﴿ خواحافيزى له (مَدِينَة)ى پيرۆز ﴾

هەركاتێك ويستى لە (مَدِينَة)وە بگەڕێتەوە وڵاتى‌خۆى، سوننەتە: دوو ڕەكعەت نوێژ لە مزگەوتى پێغەمبەرداﷺ بكاو هەرچەند پێى خۆشە دوعا بكا، ئینجا بڕواتە خزمەت گۆڕى پێغەمبەرﷺو هەمان سەلامو دوعاى‌ڕابردووى زيارەت دووبارە بكاتەوە، ئینجا بڵێ: (أَللّهُمَّ لاتَجْعَلْ هَذا آخِرَالْعَهْدِ بِحَرَمِ رَسُولِكَ وَيَسِّرْ لِيالْعَوْدَ إِلَيالْحَرَمَيْنِ سَبِيلاً سَهْلَةً وَارْزُقْنِي الْعَفْوَ وَالْعافِيَةَ فِيالدُّنْيا وَالآخِرَةِ وَرُدَّنا سَالِمِينَ غَانِمِينَ). ئینجا بەرەو پێشەوە لە مزگەوت دەڕواتە دەرەوە—نەك پشتەوپشت—هەروەك لە(الإيضاح)دا فەرموويەتى.

﴿پاشكۆ﴾: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَجَّ لِلّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ خَرَجَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ﴾رواه الشيخان، هەر كەسێك بۆ خوا حەج بكاو لە حەجەكەى‌دا قسەى ناشيرين‌و بێ‌شەرعى نەكا، لە گوناهەكانى دەردەچێ‌و پاك دەبێتەوە، وەك ئەو ڕۆژەى لە دايكى بووە. كەوابو: ئەى حاجى‌ى ڕێزدار ئەو پاكبوونەوەيە لە دەست مەدەو جارێكى‌تر مەگەڕێوە سەر گوناه كردن.

ئینجا—هەروەك لە (المجموع)و(الأذكار)دا فەرموويەتى— ئەو كەسەى پێشوازى لە حاجيەكە دەكا، سوننەتە دوعاى بۆ بكاو بڵێ: ﴿قَبِلَ اللهُ حَجَّكَ وَغَفَرَ ذَنْبَكَ وَأَخْلَفَ نَفَقَتَكَ﴾ حديث غريب رواه إبن السني، خوا حەجت قبوڵ بكاو لە گوناهت خۆش بێ‌و ئەوەى سەرفت كردوە خوا لەجياتى‌ى بتداتەوە.

ئینجا سوننەتە: حاجيەكەش دوعاى بۆ بكاو بڵێ: (خوا لە گوناهى تۆش خۆش بێ)، چونكە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْحاجِّ وَلِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُ الْحَاجُّ﴾ رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم، خوايە لە حاجى خۆش ببەو لەو كەسەش خۆش ببە: كە حاجى دوعاى لێخۆشبوونى گوناهى بۆ دەكا.

## ﴿ فَصْلٌ: لە باسى ڕوكن‌و واجبەكانى حەج‌و عومرە ﴾

(أَرْكَانُ الْحَجِّ خَمْسَةٌ) ڕوكنەكانى حەج پێنجن، يەكەم: (اَلإِحْرَامُ) نيەتى ئيحرامبەستنە. دووەم: (وَالْوُقُوفُ) ڕاوەستانە لە (عَرَفَات). سێيەم: (وَالطَّوَافُ) تەواف كردنە، واتە: (طَوافُ الإفاضَة). چوارەم: (وَالسَّعْيُ) هاتوچۆى نێوان سەفاو مەروەيە. پێنجەم: (وَالْحَلْقُ) سەرتاشينە (إِذَا جَعَلْنَاهُ نُسُكاً) هەر كاتێك لە سەر فەرموودەى ڕاست: بە خواپەرستى‌ى دابنێين.

جا بزانە: مەرجە ئەو ڕوكنانە بە ڕيز بكرێن، واتە: نيەتى ئيحرامبەستن لە پێش كشتياندابێ، وەستانى (عَرَفَات) لە پێش (طَوافُ الإفاضَة)و لە پێش سەرتاشيندابێ.

وَلاَ تَجْبَرُ بِدَمٍ، وَمَا سِوَىالْوُقُوف أَرْكَانٌ فِيالْعُمْرَة أَيْضاً، وَيُؤَدَّىالنُّسُكَان عَلَى أَوْجُــه، أَحَدُهَا: اَلإِفْرَادُ بِأَنْ يَحُجَّ ثُمَّ يُحْرِمَ بِالْعُمْرَةِ: كَإِحْرَامِ الْمَكِّيِّ وَيَأْتِيَ بِعَمَلِهَا.

---

(وَلاَ تُجْبَرُ بِدَمٍ) ڕوکنەکانیحەج بە خوێن پڕ ناکرێنەوەو هەر دەبی بکرێن، کەواتـە: ئەگـەر تەنها یـەکێك لـەو ڕوکنانـەی حـەج نـەکا، یـان ڕوکنێکی ناتـەواو بـێ، حەجەکـەی دروست نابێو لە ژێر ئیحرام دەرناچێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: واجبەکانیحەج پێنجن، یەکەم: ئیحرامبەستن لـە میقاتێکیشـەرعی. دووەم: ڕەجمیشـەیتانەکان لـە جـەژنو لـە دوای جەژنـدا. سێیەم: مانـەوەی شـەوێ لـە (مزدلفـة). چوارەم: مانـەوەی شـەوێ لـە (مِنـى). پێنجەم: (طَـوافُ الْـوَداع). جـا ئـەو واجبانەیحـەج جیـاوازن لـە ڕوکنەکانیحـەج، چـونکە ئەگـەر واجبێـك، یـان گشـت واجبـەکان نـەکا، حـەجی دروست دەبێ، بەلام بـە نـەکردنی هـەر واجبێك خـوێنێکی دەکەوێتـە سـەر، هـەروەك ڕوونمـان کردەوەو لە خوێنەکانی حەجدا خوێنەکەش ڕوون دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

(وَمَا سِوَىالْوُقُوفِ) جگە لە وەستانی(عَرَفات)، گشـت ڕوکنـەکانیڕابردوو (أَرْكَانٌ فِيالْعُمْرَةِ أَيْضاً) ڕوکنن لە عومرەداو مەرجە هەرچواریان بەم ڕیزە بکرێن: ئیحرامبەستن بـە عـومرە، ئینجا تەوافی ڕوکنیعومرە، ئینجا (سَعْي) سـەفاو مـەروە، ئینجا سەرتاشـین، یـان بـڕینی موو. جا ئەگەر ئەو چوار ڕوکنانەی بەو ڕیزە بـە تـەواوی کـردن، عومرەکـەی تـەواو دەبێ، بـەلام ئەگـەر تـەنها ڕوکنێـك لـەو چـوارانە نـەکا، یـان ڕوکنێکـی ناتـەواو بـێ، عومرەکـەی دروست نابێو لـە ژێـر ئیحـرام دەرناچـێ، چـونکە بەلگـەکانی ڕوکنەکانیحـەج بەلگەنـە بـۆ ڕوکنەکانی عومرەش، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها بزانە: واجبەکانیعومرە تەنها ئیحرامبەستنە لـە میقاتیشـەرعیو خۆپاراستنە لـە قەدەغەکراوەکانی ئیحرام، هەروەك لە (نهاية)و (مغني)دا فەرموویانە.

## ﴿ شێوەی حەجو عومرە کردن: وێکڕا، بە تەنها ﴾

(وَيُــؤَدَّى النُّسُــكَانِ عَلَــى أَوْجُــهٍ) حــەجو عــومرە دەکــرێن بــە ســێ شــێوە: (أَحَدُهَا) شێوەییەکەم: (اَلإِفْرَادُ) حەجی تـەنهای جیاکراوەیە (بِـأَنْ يَحُجَّ) وەك لـە پێشـدا حەج بکا (ثُمَّ يُحْرِمَ بِـالْعُمْرَةِ) ئینجـا لـە دوای تەواوبوونیحـەج، ئیحرام بـە عـومرە ببەسـتێ (كَـإِحْرَامِ الْمَكِّيِّ) وەك ئیحرامـی دانیشـتووی(مَكّـة)، واتـە: بڕواتـە دەرەوەی(حَـرَمِ مَكّـة)و ئیحرام بە عومرە ببەستێو (وَيَأْتِـيَ بِعَمَلِهَا) ئینجا بێتـەوە (مَكّـة)و کردەوەکـانیتری عـومرە بکا: کە تەوافو (سَعي)و سەرتاشینە ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَمِنَّـا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَــلَّ بِحَــجٍّ، وَأَهَــلَّ رَسُــولُ اللهِ ﷺ بِالْحَجِّ﴾ رواه الشيخان، لەگەڵ پێغەمبـەرداﷺ چووینە حـەج: جا هەندێکمان ئیحرامـی بـە

اَلثَّانِي: اَلْقِرَانُ بِأَنْ يُحْرِمَ بِهِمَا مِنَ الْمِيقَاتِ وَيَعْمَلَ عَمَلَ الْحَجِّ فَيَحْصُلاَنِ، وَلَوْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ ثُمَّ بِحَجٍّ قَبْلَ الطَّوَافِ كَانَ قَارِناً، وَلاَ يَجُوزُ عَكْسُهُ فِي الْجَدِيدِ. اَلثَّالِثُ: اَلتَّمَتُّعُ بِأَنْ يُحْرِمَ بِالْعُمْرَةِ مِنْ مِيقَاتِ بَلَدِهِ وَيَفْرَغَ مِنْهَا ثُمَّ يُنْشِئَ حَجّاً مِنْ مَكَّةَ،

---

عومرەی تەنها بەست، هەندێکمان ئیحرامی بە حەج و عومرەی وێکڕا بەست، هەندێکمان ئیحرامی بە حەجی تەنها بەست، پێغەمبەرﷺ ئیحرامی بە حەجی‌تەنها بەست.

(اَلثَّانِي) شێوەی‌دووەم: (اَلْقِرَانُ) حەج و عومرەی وێکڕایە (بِأَنْ يُحْرِمَ بِهِمَا مِنَ الْمِيقَاتِ) وەك لە مانگەکانی‌حەجدا –لە میقاتی‌حەج– نیەتی ئیحرامی حەج و عومرە وێکڕا بێنێ، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو، ئینجا (وَيَعْمَلَ عَمَلَ الْحَجِّ) تەنها کردەوەکانی‌حەج بکا (فَيَحْصُلاَنِ) بەو شێوەیە حەج و عومرەی هەردووك بۆ دەبن، واتە: عومرەکەی لە ناو حەجدا دێتە جێ و بە بەر حەج و عومرەی ڕوکنی‌ئیسلام دەکەون ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: طَوَافُكِ بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ يَكْفِيكِ لِحَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ﴾ رواه ابوداود ومسلم، تەوافێکی (بیت)و هاتوچۆیەکی نێوان سەفاو مەروەت بەسە بۆ حەج و عومرە.

(وَلَوْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ) ئەگەر لە مانگەکانی‌حەجدا ئیحرامی بە عومرە بەست (ثُمَّ بِحَجٍّ) ئینجا لە دوای ئیحرامی ئەو عومرەیە ئیحرامی بە حەجیش بەست، واتە: نیەتی هێنا حەج بێنێتە سەر عومرە (قَبْلَ الطَّوَافِ) پێش ئەوەی تەوافی عومرە بکا، ئەوە دروستە و (كَانَ قَارِناً) وای لێدێ: نیەتی حەج و عومرەی وێکڕای هێناوە، هەروەك لە (بخاری و مسلم)دا لە (عائشة) گێڕدراوەتەوە، بەڵام ئەگەر دەستی بە تەواف کردبێ، ئەو کاتە دروست نیە: نیەتی ئیحرامی‌حەج بێنێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

هەروەها (وَلاَ يَجُوزُ عَكْسُهُ) پێچەوانەی‌ڕابردووش دروست نیە، واتە: ئەگەر لە پێشدا ئیحرامی بە حەج بەستبوو، دروست نیە: نیەتی ئیحرامی‌عومرە بێنێ، چونکە عومرە نابردرێتە سەر حەج (فِي الْجَدِيدِ) لە فەرموودەی نوێی ئیمامی(الشافعي)دا.

(اَلثَّالِثُ) شێوەی‌سێیەم: (اَلتَّمَتُّعُ) حەجی بە لەززەتی دوای عومرەیە: (بِأَنْ يُحْرِمَ بِالْعُمْرَةِ مِنْ مِيقَاتِ بَلَدِهِ) وەك لە مانگەکانی‌حەجدا لە (میقات)ی وڵاتەکەی‌خۆی ئیحرام بە عومرە ببەستێ و (وَيَفْرَغَ مِنْهَا) عومرەکەی تەواو بکا (ثُمَّ يُنْشِئَ حَجّاً مِنْ مَكَّةَ) ئینجا –لە دوای تەواوبوونی عومرە– هەر لە (مكة) ئیحرام بە حەج ببەستێ و بڕواتە (عَرَفات)و حەجەکەش تەواو بکا.

جا بزانە: بۆیێ بەم شێوەیە دەگوترێ حەجی بە لەززەت، چونکە لە تەواوبوونی عومرەوە تا ئیحرامی‌حەج، لەززەتی کردوە: کە گشت قەدەغەکراوەکانی لێ‌حەڵاڵ بوینە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَأَفْضَلُهَا الإِفْرَادُ، وَبعْدَهُ التَّمتُّعُ وَبَعْدَ التَّمتُّعِ الْقِرَانُ، وَفِي قَوْلٍ التَّمتُّعُ أَفْضَلُ مِنَ الإِفْـرَادِ، وَعَلَى الْمُتَمَتِّعِ دَمٌ بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَكُونَ مِنْ حَاضِرِى الْمَسْجِدالْحَرَامِ، وَحَاضِرُوهُ مَـنْ دُونَ مَرْحَلَتَيْنِ مِنْ مَكَّةَ، قُلْتُ: الأَصَحُّ مِنَ الْحَرَمِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَأَنْ تَقَعَ عُمْرَتُهُ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ

---

(وَأَفْضَلُهَا) لەو سێ شێوەیە خێرترەكەیان (اَلإِفْرَادُ) حەجیتەنهایە، چونكە ئـەو حەدیسانە زۆرترن: كە پێغەمبەرﷺ حەجیتەنهای كردوە، هەم وەك حەدیسـەكەی یەكـەمیڕابردووش (وَبعْدَهُ التَّمتُّعُ) لە دوای حەجیتەنها حەجی بە لەززەتی دوایعومرە خێرترە.

(وَبَعْدَ التَّمتُّعِ الْقِرانُ) ئینجا حەجیوێكڕا (وَفِي قَوْلٍ) لە فەرموودەیەكدا: (التَّمتُّعُ أَفْضَـلُ مِـنَ الإِفْـرَادِ) حـەجی بـە لـەززەتی دوایعـومرە خێرتـرە لـە حەجیتـەنها، چـونكە حـەجی بـە لەززەتی دوایعومرەش لە چەند حەدیسێكی (صحیح)دا هاتوە، وَاللهُ أَعْلَم.

(وَعَلَى الْمُتَمَتِّعِ دَمٌ) ئەو كەسەی حەجی بە لـەززەتی دوایعـومرە دەكـا، لـە سـەری واجبـە: خوێن بدا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَـدْيِ﴾ هەر كەسێك لەززەتوخۆشیی دیت بە تـەواوبوونیعومرە تـا ئیحرامبەستنی حـەج، واجبـە ئەو خوێنە بدا: كە بۆی ئاسانە.

﴿ ئاگـاداری ﴾: ئەگـەر لـە پـێش حـەج كردنـدا عـومرە دووبـارەش بكاتـەوە، تـەنها یـەك خوێنی لە سەر واجب دەبێ، هـەروەك لـە(تحفـه)دا فەرموویـەتی، خوێنەكـەش بـەم چـوار مەرجانە واجب دەبێ:

مەرجییەكەم: (بِشَـرْطِ أَنْ لاَ يَكُـونَ مِـنْ حَاضِرِيالْمَسْجِدِالْحَرَامِ) بـەو مەرجـەی ئـەو كەسـە خـەڵكی (الْمَسْجِدالْحَرام) نـەبێ، چـونكە ئـەوان خوێنیـان لـە سـەر نیـە، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِيالْمَسْـجِدِالْحَرَامِ﴾ ئـەو خوێنـە لـە سـەر ئـەو كەسە واجبە: كە دانیشتووی (الْمَسْجِدالْحَرام) نەبێ.

(وَحَاضِرُوهُ) خەڵكی(الْمَسْجِدالْحَرام) كە ئەو بڕیارە بیانگرێتەوە (مَنْ دُونَ مَرْحَلَتَيْنِ مِنْ مَكَّةَ) ئەو كەسـەیە: ماڵەكـەی لـە (حَـرَمِ مكة)دابێ، یان ماڵەكـەی دوو قۆنـاغ كـەمتر دوور بێ لـە شـاری(مكـة)ی پـیرۆز (قُلْتُ) ئیمـامی(النـولوی) دەفـەرموێ (الأَصَحُّ) فـەرموودەی ڕاسـتتر ئەمەیـە: (مِـنَ الْحَـرَمِ) ماڵەكـەی دوو قۆنـاغ كـەمتر دوور بـێ: لـە (حَـرَمِ مَكَّـة)، واتـە: هەشتاكیلۆمەتر دوور نەبێ (وَاللهُ أَعْلَم).

مەرجیدووەم: (وَأَنْ تَقَعَ عُمْرَتُهُ فِـي أَشْهُرِالْحَجِّ) نیـەتی ئیحرامیعومرەكـەی بكەوێتـە نـاو مانگەكانیحەج، كەواتـە: ئەگـەر لـە مانگـەكانی پـێش (أَشهُرالْحَجّ)دا عـومرە بكـا، یـان لـە ڕەمەزانـدا نیـەتی عـومرە بێنـێو لـە (أَشهُرالْحَجّ)دا كردەوەكـانیتری عـومرە تـەواو بكـا، خوێنی ناكەوێتە سەر، چونكە نیەتی عومرەكەی نەكەوتۆتە نـاو (أَشهُرالْحَجّ)، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا ڕوون كراوەتەوە.

مِنْ سَنَتِهِ، وَأَنْ لاَ يَعُودَ لإِحْرَامِ الْحَجِّ إِلَى الْمِيقَاتِ وَوَقْتُ وَجُوبِ الدَّمِ إِحْرَامُهُ بِالْحَجِّ،

مەرجی سێیەم: (مِنْ سَنَتِهِ) لە هەمان ساڵی حەج کردن عومرەکەی بکا، کەواتە: ئەگەر ئەم ساڵ لە مانگەکانی حەجدا عومرەی کرد بەڵام حەجی نەکرد، خوێنی لە سەر نیە ﴿عَنْ سَعِيد بن الْمُسَيَّبِ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَعْتَمِرُونَ فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ فَإِذا لَمْ يَحُجُّوا مِنْ عامِهِمْ لَمْ يُهْدُوا﴾ رواه البيهقي باسناد حسن، (صحابة)ی پێغەمبەر ﷺ لە مانگەکانی حەجدا عومرەیان دەکرد، جا ئەگەر هەمان ساڵ حەجیان نەکردبا، خوێنیان نەدەدا.

مەرجی چوارەم: (وَأَنْ لاَ يَعُودَ لإِحْرَامِ الْحَجِّ إِلَى الْمِيقَاتِ) بۆ ئیحرامی حەج نەگەڕێتەوە (میقات)ێکی شەرعی: وەك لە دوای تەواوبوونی عومرە، لە (مكة)دا ئیحرام بە حەج ببەستێ و بڕواتە (عَرَفات)، یان هەر لە (عَرَفات)دا ئیحرام بە حەج ببەستێ، واتە: چونکە حەج و عومرەی بە ئیحرامی دوو (میقات) نەکردوون، بەڵکو (میقات)ێکی قازانج کردوە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

کەوابو: ئەگەر لە دوای تەواوبوونی عومرە، گەڕاوە بۆ (میقات)ێکی شەرعی و لەوێ ئیحرامی بە حەج بەست، یان لە (مكة) ئیحرامی بە حەج بەست، ئینجا بە ئیحرام بەستراوی -پێش وەستانی (عَرَفات)- گەڕاوە بۆ (میقات)ێکی شەرعی، ئینجا لەوێوەش گەڕاوەو چووە (عَرَفات)، ئەو کاتە خوێنی لە سەر لادەچێ، هەروەك لە (المجموع) و (تحفة) و (حاشية الإيضاح)دا ڕوون کراوەتەوە، واتە: چونکە هیچ قازانجی نەکردوە.

ئینجا بزانە: لێرەدا جیاوازی نیە: بگەڕێتەوە هەمان (میقات)ی عومرە، یان (میقات)ێکی تر، یان ئەندازەی (میقات)ێکی شەرعی، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ کات و چۆنیەتی خوێنی حەجی بە لەزەت ﴾

**پێشەکی بزانە**: مەبەست لە خوێنی ئێرەو گشت خوێنەکانی تری حەج و عومرە: یان مەڕێکە تەمەنی ساڵێك تەواو بوبێ، یان بزنێکە تەمەنی دوو ساڵ تەواو بوبن، یان حەفتێکی وشترێك، یان مانگایەك، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە و لە خوێن و (فِدْيَة)کانی حەجدا درێژتر ڕوونی دەکەینەوە، إنْ شاءَ اللهُ تَعالَى.

ئینجا (وَوَقْتُ وُجُوبِ الدَّمِ) کاتی واجببوونی ئەو خوێنە لە سەر ئەو کەسەی حەجی بە لەزەتی دوای عومرەی کردوە (إِحْرَامُهُ بِالْحَجِّ) ئیحرامبەستنیەتی بە حەج، واتە: هەر کاتێك لە دوای تەواوبوونی عومرە ئیحرامی بە حەج بەست، خوێنەکەی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ (میقات)ێکی شەرعی، ئەو کاتە خوێنەکەی لە سەر لادەچێ، هەروەك تازە ڕوونمان کردەوە.

ئینجا لە فەرموودەی بەهێزتردا: دروستە: هەر لە دوای تەواوبوونی عومرە -پێش ئیحرامبەستنی بە حەج- ئەو ئاژەڵە سەر ببڕێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

وَالأَفْضَلُ ذَبْحُهُ يَوْمَ النَّحْرِ، فَإِنْ عَجزَ عَنْهُ فِي مَوْضِعه صَامَ عَشَرَةَ أَيَّامٍ: ثَلاَثَةً فِـي الْحَجِّ تُسْتَحَبُّ قَبْلَ يَوْمِ عَرَفَةَ وَسَبْعَةً إِذَا رَجعَ إِلَى أَهْله فِي الأَظْهَرِ، وَيُنْـدَبُ تَتَـابُعُ الثَّلاَثَـةِ، وَكَذَا السَّبْعَةُ، وَلَوْ فَاتَتْهُ الثَّلاَثَةُ فِي الْحَجِّ فَالأَظْهَرُ أَنَّهُ يَلْزَمُهُ أَنْ يُفَرِّقَ فِي قَضَـائِهَا بَيْنَهَـا وَبَيْنَ السَّبْعَة،

---

بەڵام (وَالأَفْضَلُ) وەها خێرترە: (ذَبْحُهُ يَوْمَ النَّحْرِ) لە ڕۆژی جەژنی قورباندا ئاژەڵەکە سەر ببڕێ، چونکە لە مەزهەبەکانیتردا: پێش ڕۆژی جەژن دروست نیە.

ئینجا بزانە: ئەگەر لە (حَرَمِ مَكَّة)دا ئاژەڵی دەست بکەوێ، دروست نیە: بەڕۆژوو بێ، بەڵام (فَإِنْ عَجزَ عَنْهُ فِـي مَوْضِـعِهِ) ئەگـەر لـە (حَـرَم)دا لـەو خوێنـە بێتوانا بوو: وەك ئاژەڵەکەی دەسـت نەکـەوێ، یـان پـارەی نـەبێ بیکڕێ، یـان پـارەی هـەبێ بـەڵام بـۆ کـاری پێویسـت پارەکەی بوێ، ئەوە (صَامَ عَشَرَةَ أَيَّامٍ) واجبە: لەجیاتی خوێنەکە دە ڕۆژان بەڕۆژوو بێ:

(ثَلاَثَةً فِي الْحَجِّ) سێ ڕۆژان: لە دوای ئیحرامبەستنیحەج بەڕۆژوو دەبێ، جا ئەگـەر بگونجێ (تُسْتَحَبُّ قَبْلَ يَوْمِ عَرَفَةَ) وەها سوننەتە پێش ڕۆژی عالفە سـێ ڕۆژەکـان بـەڕۆژوو بـێو هـەم (وَسَبْعَةً إِذَا رَجَـعَ إِلَىأَهْلِـهِ) حـەفت ڕۆژانـیش هـەر کاتێـك گـەڕاوە بـۆ وولاتیخـۆی بـەڕۆژوو دەبـێ (فِيالأَظْهَـرِ) لـە فەرموودەیبـەهێزتردا. کەواتـە: پـێش ئیحرامبەسـتنیحەج سـێ ڕۆژووەکان دروست نابن، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

خوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْـتُمْ تِلْـكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ هەر کەسـێك ئاژەڵەکـەی دەسـت نەکـەوێ، بـا سـێ ڕۆژان لـە حەجدا بـەڕۆژوو بێو حەفت ڕۆژانیش هەر کاتێك گەڕانەوە وولاتیخۆتان، ئەوە دە ڕۆژی تەواوە.

کەواتە: دروست نیە لە ڕێگەدا حـەفت ڕۆژەکـان بـەڕۆژوو بـێ، بـەڵام لـە فەرموودەکەیتری ئیمامی(الشافعي)و لە هەرسێك مەزهەبەکەیتردا دروستە: هـەر لـە دوای تـەواوبوونی حـەج ئـەو حەفت ڕۆژانەش بەڕۆژوو بێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيُنْـدَبُ تَتَـابُعُ الثَّلاَثَـةِ) سـوننەتە: سـێ ڕۆژەکەیحـەج بـە دوایـەکتردا بـەڕۆژوو بـێو دروستە: نێوانیشیان بخاتێ (وَكَذَاالسَّبْعَةُ) هـەروەها حـەفت ڕۆژەکـەیتریش سـوننەتە: بـە دوایەکتردا بەڕۆژوو بێو بە نێوانیش دروستن.

(وَلَـوْ فَاتَتْـهُ الثَّلاَثَـةُ فِـيالْحَجِّ) ئەگـەر سـێ ڕۆژەکـەی لێفـەوتانو لـە حەجدا بـەڕۆژوو نـەبو (فَالأَظْهَرُ) فەرموودەی بەهێزتر ئەمەیە: واجبە سـێ ڕۆژووەکە قـەزا بکاتـەوە، هـەم (أَنَّـهُ يَلْزَمُهُ أَنْ يُفَرِّقَ فِي قَضَائِهَا) واجبە: لە قەزاکردنەوەی ئەو سێ ڕۆژانەدا ماوەیەك پشوو بدا (بَيْنَهَـا وَبَيْـنَ السَّبْعَةِ) لـە نێـوان سـێیەکەو حەفتەکـە، پشـووەکەش بـە ئەندازەی چوار ڕۆژەکـەی جـەژنو مـاوەی ڕۆیشـتنی ڕێگەیگەڕانـەوە بـۆ وولاتیخـۆی بـێ، واتـە:

وَعَلَى الْقَارِنِ دَمٌ كَدَمِ التَّمَتُّعِ، قُلْتُ: بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَكُونَ مِنْ حَاضِـرِى الْمَسْـجِدِالْحَرَامِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

له ماڵەوه سێ ڕۆژەکه قەزا دەکاتەوه، ئینجا به قەد ڕۆژانی جەژن‌و ئەو ڕۆژانەی له ڕێگەدا ڕۆیشتوه تا گەیشتۆتەوه وولاتی خۆی، پشوو دەدا، ئینجا حەفتەکەی ماڵەوەش بەڕۆژوو دەبێ.

## ﴿ خوێنی حەج‌و عومرەی وێکڕا ﴾

(وَعَلَى الْقَارِنِ دَمٌ) ئەو کەسەی حەج‌و عومرەی وێکڕا دەکا، خوێنی له سەر واجبە (كَدَمِ التَّمَتُّعِ) وەك خوێنی حەجی به لەززەتی دوایعومرە-کە به دریژی ڕوونمان کردەوە- چونکه ئەمەش-وەکو ئەو-حەج‌و عومرەی به ئیحرامی یەك (میقات) کردون‌و (میقات)ێکی قازانج کردوه.

کەوابو: ئەگەر ئەو کەسەی حەج‌و عومرەی وێکڕا دەکا-له پێش وەستانی (عَرَفات)دا- بگەڕێتەوه میقاتێکی شەرعی، ئەویش خوێنەکەی له سەر لادەچێ، هەروەك له زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانه.

(قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ: هەم (بِشَرْطِ أَنْ لاَ يَكُونَ مِنْ حَاضِرِيالْمَسْجِدِالْحَرَامِ) بەم مەرجەش خوێنی له سەر واجب دەبێ: که خەڵکی (الْمَسْجِدالْحَرام) نەبێ، که به دریژی ڕوونمان کردەوه، واته: خەڵکی ئەوێ به هۆی حەج‌و عومرەی وێکڕا خوێنیان له سەر واجب نابێ (وَاللهُ أَعْلَم).

جا بزانه: له ڕۆژووی حەجی به لەززەتدا نیەتی (فِدْيَة)ی حەجی به لەززەت دێنێ، له ڕۆژووی حەجی وێکڕادا نیەتی (فِدْيَة)ی حەجی وێکڕا دێنێ، هەروەك له (المجموع)دا فەرموویەتی.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر ئەو کەسەی حەج‌و عومرەی وێکڕا دەکا، یان حەجی به لەززەتی دوای عومرە دەکا، له حاڵەتی حەج کردندا مرد، یان له دوای حەج کردن مرد، بەڵام خوێنەکەی سەر نەبڕیبو، ئەوه خوێنەکەی له ئەستۆدا جێگیر بووەو به مردن له سەری لاناچێ. کەوابو: ئەگەر توانای خوێندانی هەبوبێ، واجبه: له میراتەکەی خوێنەکەی بۆ بدرێ، بەڵام ئەگەر توانای نەبوبێ، ئەو کاته تێبینی دەکرێ:

ئەگەر بۆی گونجابێ بەڕۆژوو بێ‌و ڕۆژووەکانی نەگرتبێ، ئەوەش وەکو ڕەمەزان: یان (فِدْيَة)ی بۆ دەدرێ، یان خزمێکی لەجیاتیوی بەڕۆژوو دەبێ.

بەڵام ئەگەر بۆی نەگونجابێ بەڕۆژوو بێ‌و مردبێ، ئەو کاته خوێنەکەی له سەر لادەچێ، هەروەك له (المجموع)و (مغنی)دا ڕوون کراوەتەوه.

## (بـــابُ مُـــحَـــرَّمــــاتِ الإِحْـــرامِ)

أَحَـــدُهَا: سَـــتْرُ بَعْضِ رَأْسِ الـــرَّجُلِ بِمَا يُعَدُّ سَـــاتِراً إلاَّ لِحَاجَةٍ، وَلُبْسُ الْمَـــخِيطِ

**﴿ بابُ مُحَرَّماتِ الإِحْرامِ: باسى قەدەغەكراوەكانى ئيحرام ﴾**

بزانـە: هـەر كاتێك مـرۆڤ نيـەتى ئيحرامبەسـتنى هێنـا –بـە حـەج، يـان بـە عـومرە– ئـەو شتانەى داهاتووى لێحەرامن:

### ١- دەبەركردنى بەرگى دورواو بۆ پياوان

(أَحَدُهَا) يەكەميان: (سَتْرُ بَعْضِ رَأْسِ الرَّجُلِ) داپۆشينى بەشێكى سـەرى نێرينەيـە (بِمَا يُعَدُّ سَاتِراً) بە شتێكى وەها: كـە بـە داپۆشـەر دابنـدرێ، هـەر چـەند داپۆشـەرەكەش ڕەنگى پيسـتەى سـەرى تـێدا ديـار بـێ: وەكـو شووشـە، يـان پـەڕۆكێكى تـەنك، جيـاوازى نيـە داپۆشەرەكە: دورواو بێ، يان نا، دەورەى لە سەرى بدا: وەكو كڵاو، يان نـا: وەكـو پارچـە پـەڕۆكێك، هـەروەها جيـاوازى نيـە: لـە دواى ئيحرامبەسـتن سـەرى دابپۆشـێ، يـان پـێش ئيحرامبەستن داپۆشرا بێو لە دواى ئيحرامبەستن داپۆشينەكە بەردەوام بێ، بە گشت ئەو داپۆشينانەىڕابردوو: هەم گوناهبار دەبێو هەم (فِدْيَة)ى لە سەر واجب دەبێ ﴿عَـنْ ابـنِ عَباسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: قال النَّبيُّ ﷺ فِي الْمُحْرِمِ الَّذي وَقَصَتْهُ نَاقَتُهُ فَمَـاتَ: لا تُمِسُّـوهُ بِطِيـبٍ وَلا تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ﴾ رواه الشيخان، دەربارەى ئەو پياوەى لـە ووشـترەكەى كەوتـە خـوارەوەو لـە ئيحرامدا بوو و مرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: بۆنى خۆشى لێمەدەنو سەرى دامەپۆشن.

(إِلاَّ لِحَاجَةٍ) تەنها لە بەر پێويستى نەبێ: وەك سـەرما، گـەرما، دەرمـانكردن، واتـە: سـەرى برينـدار بوبـێو پـەڕۆكێكى لێبەسـتبێ، يـان پێچـەرێكى لـە سـەر دانابێ، لـەو حاڵەتانـەدا دروستە: هەمووى، يان بەشێكى دابپۆشێ، واتە: گوناهبـار نابێ، بـەڵام (فِدْيَة)ى لـە سـەر واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

جا بزانـە: ئـەو (فِدْيَـة)ى داپۆشـينى بـرين تـەنها تايبەتـە بـە سـەرى پيـاو–نـەك ئـافرەت– كەواتە: ئەگـەر شـوێنێكىترى لاشـەى پيـاو برينـدار ببـێو بيپێچێتەوە، (فِدْيَـة)ى لـە سـەر واجب نابێ، هەروەك لە (المجموع)و (نهاية)دا فەرموويانە.

هەروەها ئەگەر بە مەبەستى سێبەركردن شتێك لە سەر سەرى ڕابگرێ، يـان لـە بـن چـادر، يـان لـە بـن بانێـك دابنيشـێ، يـان دەسـتىخۆى لـە سـەر سـەرى دابنـێ، يـان شـتێك بـە مەبەستى هەڵگرتن لە سەر سەرى دابنێ، (فِدْيَة)ى لە سەر واجب نابێ.

بەڵام ئەگەر بـە مەبەسـتى داپۆشـين ئـەو دووانـە دابنـێ، (فِدْيَـة)ى لـە سـەر واجـب دەبـێ، هەروەك لە زۆربەى سەرچاوەكاندا فەرموويانە.

(وَلُبْسُ الْمَخِيطِ) هـەروەها حەرامـە لـە سـەر نێرينـە: شـتێكى دوورواوى وەهـا دەبـەر بكـا كە بە هـۆى دوروين دەورە لە لاشـەى بدا، يان دەورە لە ئەندامێكى بدا: وەكـو كـراسو

دەرپێو کەوێ، هەرچەند دەستەکانیشی نەخاتە ناو قۆڵی کەوایەکە (أَوِ الْمَنْسُوجِ) یان چنراوێکی وەها دەبەر بکا کە بە هۆی چنین دەورە لە لاشەی بدا، یان دەورە لە ئەندامێکی بدا: وەکو دەستەوانەو گۆرەوی‌و بلوزو پێڵاو (أَوِ الْمَعْقُودِ) یان گرێدراوێکی وەها دەبەر بکا: کە بە هۆی گرێدان دەورە لێبدا، یان بە هۆی پێوە لکاندن دەورە لێبدا: وەك جلەکەی ئیحرام لێك گرێ بدا، یان بە قولاب‌و دمبوز، یان بە زنجیر پێکیەوە بلکێنێ (فِي سَائِرِ بَدَنِهِ) لە گشت بەشەکانی‌لاشەکەی‌دا ئەوانەی‌رابردوو حەرامن‌و ئەگەر یەکێکیان دەبەر بکا، (فِدْيَة)ی لە سەر واجب دەبێ، هەر چەند بۆ ماوەیەکی کورتیش بێ، هەروەك لە (المجموع)دا فەرموویەتی، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿لاَيَلْبَسْ-أي الْمُحْرِمُ-الْقُمُصَ وَلاَالْعَمَائِمَ وَلاَ السَّراويلاتِ وَلاَالْبَرانِسَ وَلاَالْخِفَافَ﴾ رواه الشيخان، نابێ پیاوی بە ئیحرام: نە کراس‌و نە مێزەرو نە دەرپێو نە چەفیەو نە گۆرەوی دەبەر بکا.

(إِلاَّ إِذَا لَمْ يَجِدْ غَيْرَهُ) مەگەر جگە لەوانەی‌رابردوو هیچی‌تری دەست نەکەوێ، ئەو کاتە دروستە: ئەوانەی‌رابردوو دەبەر بکا، جا ئەگەر بۆ داپۆشینی عەورەت دەبەریان بکا، (فِدْيَة)ی لە سەر واجب نابێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ لَمْ يَجِدْ إِزاراً فَلْيَلْبَسْ سَراوِيلَ﴾ رواه الشيخان، هەر کەسێك پەشتەماڵی نەبو عەورەتی پێ داپۆشێ، با دەرپێ دەبەر بکا.

بەڵام ئەگەر لە بەر نەخۆشی‌و سەرماو گەرما دەبەریان بکا، ئەو کاتە (فِدْيَة)ی لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا روون کراوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ...﴾ هەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو و جل‌و بەرگی خۆی دەبەر کرد، یان ئازارێك لە سەری‌دا هەبو و سەری تاشی، واجبە: (فِدْيَة) بدا.

ئینجا بزانە: پیاوی بە ئیحرام بۆی دروست نیە: پێڵاو دەبەر بکا، بەڵام بۆی دروستە: جووتە نەعلێکی وەها دەبەر بکا: کە پاشنەی پێ‌و سەرەپەنجەکانی‌پێی تێ‌دا دیار بێ، واتە: زیانی نیە نەعلەکان پشتەپێی داپۆشێ، یان بەشێکی پەنجەکانی داپۆشێ، هەروەك لە (تحفة)و حاشیەکانی‌دا روون کراوەتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿إلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ﴾رواه الشيخان، تەنها یەکێك نەبێ: کە جووتە نەعلێکی دەست نەکەوێ، با جووتە خوففێك دەبەر بکاو لە گۆزینگ بەرەو خوارتر لێیان بکاتەوە. واتە: دەبەرکردنی نەعل دروستە.

﴿ **ئاگاداری** ﴾ بۆ پیاوی بەئیحرام دروستە: بە دوو قات‌و سێ قات پەشتەماڵەکان لە خۆی وەربپێچێ، هەروەك لە (الإيضاح)دا فەرموویەتی، کەواتە: دروستە بەتانی‌و لێفەو

وَوَجْهُ الْمَرْأَةِ كَرَأْسِهِ، وَلَهَا لُبْسُ الْمَخِيطِ إِلاَّ الْقُفَّازَ فِي الأَظْهَرِ.

ئەو جۆرە شتانە بە سەر خۆی دابداو لە خۆی وەربپێچێ لە بەری پێیەکانیەوە تا بن چەناگەی، بەلام دروست نیە: بە سەر سەری دابداو سەری پێداپۆشێ، چونکە (فِدْيَة)ی لە سەر واجب دەبێ، هەروەها دروستە: ئەنگوستیلە بخاتە پەنجەی‌و هەم بۆی دروستە: تەکبەند لە ناوقەدی ببەستێ‌و جانتا دەملی بکا، یان لە قەدی ببەستێ.

هەروەها دروستە: پەشتەماڵی لای خوارەوەی لێك گرێ بداو هەم دروستە: قایش، یان داوێکی لە سەر ببەستێ تاکو ڕابوەستێ.

بەلام دروست نیە پەشتەماڵی لای سەرەوە: نە لێك گرێ بداو نە قولابو دمبوزی لێبداو نە بە دوگمەو نە بە زنجیر بیبەستێ‌و نە لە پەشتەماڵی خوارەوەی گرێ بدا، واتە: ئەگەر یەکێك لەوانە بکا، (فِدْيَة)ی لە سەر واجب دەبێ، چونکە ڕاگرتنی پەشتەماڵی لای سەرەوە گرنگ نیە، بەلام دروستە لیچکەی پەشتەماڵی لای‌سەرەوە بخاتە ژێر پەشتەماڵی‌خوارەوە، تاکو ڕابوەستێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ناوەڕۆکی ئەو ئاگاداری‌یە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ بەرگی ئیحرامی ئافرەت و نێرامو ك ﴾

(وَوَجْهُ الْمَرْأَةِ) داپۆشینی‌ڕووی‌ئافرەت (كَرَأْسِهِ) وەکو داپۆشینی‌سەری‌نێرینە حەرامە، بەلام (وَلَهَا لُبْسُ الْمَخِيطِ) بۆ ئافرەت دروستە: گشت جلێکی دوورراو و چنراو دەبەر بکا (إِلاَّ الْقُفَّازَ) تەنها دروست نیە: دەستەوانە دە دەستی بکا (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، کەوابو: ئەگەر لە حاڵەتی‌ئیحرامدا ئافرەت ڕووی خۆی داپۆشێ، یان دەستەوانە دە دەستی بکا، (فِدْيَة)ی لە سەر واجب دەبێ ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ النِّسَاءَ فِي إِحْرَامِهِنَّ: عَنِ الْقُفَّازَيْنِ وَالنِّقَابِ وَمَا مَسَّ الْوَرْسُ وَالزَّعْفَرَانُ مِنَ الثِّيَابِ، وَلْتَلْبَسْ بَعْدَ ذَلِكَ مَا أَحَبَّتْ مِنْ أَلْوَانِ الثِّيَابِ: مُعَصْفَرًا أَوْ خَزًّا أَوْ حُلِيًّا أَوْ سَرَاوِيلَ أَوْ قَمِيصًا أَوْ خُفًّا﴾ رواه اصحاب السنن بسند صحيح، پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد: ئافرەتان لە حاڵەتی ئیحرامدا دەستەوانە بخەنە دەستیان‌و ڕوویان داپۆشن‌و ئەو بەرگەش دەبەر بکەن کە بۆنی‌خۆشی لێدرابێ، جگە لەوانە هەر بەرگێکی پێی خۆشە با دەبەر بکا: جا ڕەنگکراو بێ، یان ئاوریشم بێ، یان خشڵ بێ، یان دەرپێ بێ، یان کراس بێ.

ئینجا بزانە: دروست نیە: نێرامو ك سەرو ڕووی وێکڕا داپۆشێ، کەوابو: ئەویش وەکو ئافرەت ڕەفتار دەکا، واتە: هەر جۆرە جلێك دەبەر بکا دروستەو (فِدْيَة)ی لە سەر واجب نابێ، هەروەها دروست نیە ڕووی داپۆشێ، بەلام سەری دادەپۆشێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

اَلثَّاني: اسْتِعْمَالُ الطِّيب في ثَوْبِه أَوْ بَدَنه وَدَهْنُ شَعْرِ الرَّأسِ أَوِ اللِّحْيَة، وَلاَ يُكْرَهُ غَسْلُ بَدَنه وَرَأسه بخطْميٍّ. اَلثَّالثُ: إِزَالَةُالشَّعَرِ أَوِالظُّفرِ،

---

## ٢ - خۆ بۆنخۆش كردن

(اَلثَّـاني) دووەم قەدەغـەكراوى ئيحـرام: (اسْـتِعْمَالُ الطِّيـبِ) بـەكارهێنانى بۆنىخۆشـە (فِـى ثَوْبِهِ أَوْ بَدَنِه) لە جلو بەرگەكەىدا، يان لە لاشەىدا، هـەر چـەندەش بـە خـۆى هەست بـە بۆنەكە نەكا، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيابِ شَـيْئاً مَسَّـهُ زَعْفَـرانٌ أَوْ وَرْسٌ﴾ رواه الشيخان، هيچ جلێكـى وەهـا دەبـەر مەكـەن كـە بـۆنى زەعفـەران، يـان بـۆنى وەرسى لىٚدرابىٚ.

جا بزانە: لە حەرامىى بۆنىخۆشدا: جياوازى ئـافرەتو پيـاو نيـە، هـەروەها جيـاوازى نيـە بۆنـە خۆشـەكە: بخـوا، يـان بـۆنى بكـا، يـان هـەڵيبگرێ، هـەروەها جيـاوازى نيـە بۆنـە خۆشەكە: گيا بێ، يان دار بێ، يان تۆز بێ، شل بێ، يان پەيت بێ، بۆنەكـە لـە خـۆى بـدا، يان خۆى لە بۆنەكە بدا، يان لـە سـەرى دابنيشـێ، يـان بـەرگێكێكى بۆنخۆشـكراو دەبـەر بكا، لە گشت ئەو حاڵەتانەىڕابردوودا (فِدْيَة)ى دەكەوێتە سەر.

بەڵام ئەگەر شتە بۆنخۆشەكە بۆ دەرمانكردنو خـواردنو خۆشـكردنى خواردەمـەنى بـەكار دەهات: وەك پرتەقاڵو سێو و دارچينو بەهاراتو مەڵحەمو ئەو جۆرە شـتانە، يـان لـە لاى بۆنفرۆشێك دابنيشێو بۆنى بۆ بێ، يان بۆنە خۆشەكەى لـە نـاو شـتێكىداخراودا هـەڵگرت: وەك شووشـەيەكى سـەر داپۆشـراو، لـەو حاڵەتانـەدا (فِدْيَـة)ى لـە سـەر نيـە، هـەروەك لـە سەرچاوەكاندا ئەو مەسەلانە ڕوون كراونەوە.

(وَدَهْنُ شَعَرِ الرَّأْسِ أَوِاللِّحْيَةِ) هەروەها حەرامە چـەوركردنى مـووى سـەرو ڕيشو سمێڵ بـە هـەر جـۆرە ڕونێك، كەواتـە: هـەر مرۆڤێـك مـووى سـەرى، يـان ڕيشو سمێڵـى چـەور بكـا (فِدْيَة)ى لە سەر واجب دەبێ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿اَلحَـاجُّ الشَّـعِثُ التَّفِـلُ﴾رواه الترمذي ورجاله رجال الصحيح، حاجى تۆزاوىو بۆن ناخۆشە.

(وَلاَ يُكْرَهُ) ناپەسند نيە (غَسْلُ بَدَنِه وَرَأْسِه بِخِطْمِيٍّ) سەرو لاشـەى بـە شـتێكى وەهـا بشـوا كـە چـلك لا ببـا: وەك تايـتو سـابوون، بـەو مەرجـەى مووەكـانى هەڵنەكـەنێن، هـەم سـابوونەكەش بۆنخـۆش نـەبێ، هـەروەك لـە (الشـرواني)دا فەرموويـەتى، واتـە: ئەگـەر سابوونەكە بۆنخۆش بێ، حەرامەو (فِدْيَة)ى لە سەر واجب دەبێ، وَاللهُ أَعْلَم.

## ٣- لابردنى نينۆكو موو

(اَلثَّالِثُ) سـێيەم قەدەغـەكراوى ئيحـرام: (إِزَالَةُالشَّعَرِ) لابردنـى مووىلاشـەيەتى (أَوِالظُّفرِ) يان نينۆكى دەستەكانى، يان پێيەكـانى، جيـاوازى نيە: لابردنى بە تاشين بێ، يان بە

وَتَكْمُلُ الْفِدْيَةُ فِي ثَلاَثِ شَعَرَاتٍ أَوْ ثَلاَثَةِ أَظْفَارٍ، وَالأَظْهَرُ أَنَّ فِي الشَّعْرَةِ مُدَّ طَعَامٍ وَفِي الشَّعْرَتَيْنِ مُدَّيْنِ، وَلِلْمَعْذُورِ أَنْ يَحْلِقَ وَيَفْدِيَ. اَلرَّابِعُ: اَلْجِمَاعُ، وَتَفْسُدُ بِهِ الْعُمْرَةُ،

---

هەڵكەندن بێ، یان بە سووتاندن بێ، یان بە دەرمان بێ، لە سەرو ڕیشی بێ، یان لە شوێنەكانیتری لاشەی بێ، بە خۆی لایببا، یان یەكێكیتر بە ئیزنی وی لایببا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَحْلِقُوا رُؤُوسَكُمْ﴾ لە حاڵەتی ئیحرامدا سەرتان مەتاشن.
جا بزانە: نینۆك (قیاس) كراوەتە سەر موو، جا ئەگەر نینۆكی شكاو ئازاری دەدا، دروستە لێی بكاتەوەو (فِدْيَة)ی لە سەر نیە.
﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر خۆی خوراندو دیتی مووی لێبۆتەوە، بەڵام نەیزانی ئایا بەخۆی هەڵكەندراوە، یان ئەو هەڵیكەندوە، ئەوە (فِدْيَة)ی لە سەر نیە، هەروەها ئەگەر یەكێك بە زۆرلێكردن، یان لە خەودا سەری تاشی، یان مووەكانی سوتاندنو توانای نەبو قەدەغەی بكا، ئەو كاتە (فِدْيَة) لە سەر خۆی نیە، بەڵكو لە سەر تاوانبارەكەیە، بەڵام ئەگەر كەسێكیتر مووەكانیوی لابردنو بە قەسدی ڕێگەی نەگرت، یان ئاگرێك مووەكانی سوتاندنو بە قەسدی خۆی لێلانەدا، لە هەردوو حاڵەتدا (فِدْيَة) لە سەر خۆی واجب دەبێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەكاندا ڕوون كراونەوە.
(وَتَكْمُلُ الْفِدْيَةُ) واجبە: (فِدْيَة)كی تەولو بدا (فِي ثَلاَثِ شَعَرَاتٍ) بە لابردنی سێ داوەموو، یان زیاتر (أَوْ ثَلاَثَةِ أَظْفَارٍ) یان بە لابردنی سێ نینۆك، یان زیاتر (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (أَنَّ فِي الشَّعْرَةِ) بە لابردنی تەنها یەك داوەموو، یان تەنها یەك نینۆك: (مُدَّ طَعَامٍ) مستێك—واتە: (٦٠٥)غرام— دانەوێڵە لە (فِدْيَة) دەدرێ (وَفِي الشَّعْرَتَيْنِ) بە دوو داوەموو، یان دوو نینۆك: (مُدَّيْنِ) دوو مست دانەوێلە لە (فِدْيَة) دەدرێن، جا لەو سێ (فِدْيَة)دا جیاوازی نیە: نینۆكێكو داوەمووێكی تەواو بێ، یان پارچەیەكی نینۆكەكەو داوەكە بێ.
(وَلِلْمَعْذُورِ) بۆ ئەو كەسەی عوزرێكی شەرعی هەبێ، دروستە: (أَنْ يَحْلِقَ) مووەكانی خۆی بتاشێ (وَيَفْدِيَ) بەڵام واجبە (فِدْيَة) بدا: وەك نەخۆش بێ، یان بریندار بێو بۆ دەرمان كردن پێویستی بە لابردنی مووەكان بێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ﴾ هەر كەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو، یان ئازارێك بە سەرییەوە بوو و سەری تاشی، واجبە (فِدْيَة) بدا.

## ٤- جیماع كردن

(اَلرَّابِعُ) چوارەم قەدەغەكراوی ئیحرام: (اَلْجِمَاعُ) جیماع كردنە، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ﴾ جیماع كردنو گوناهو ململانێ لە حەجدا نیە.
(وَتَفْسُدُ بِهِ الْعُمْرَةُ) بە جیماع كردن عومرەی ژنەكەو مێردەكە تێك دەچێو بەتاڵ

وَكَذَا الْحَجُّ قَبْلَ التَّحَلُّلِ الأَوَّلِ، وَيَجِبُ بِهِ بَدَنَةٌ وَالْمُضِيُّ فِي فَاسِدِهِ وَالْقَضَاءُ وَإِنْ كَانَ نُسُكُهُ تَطَوُّعاً، وَالأَصَحُّ أَنَّهُ عَلَى الْفَوْرِ.

---

دەبێتەوە (وكَذَا الحَجُّ) هەروەها بە جیماع کردن حەجی ژنەکەو مێردەکەش تێك دەچێ‌و بەتاڵ دەبێتەوە، بەو مەرجەی (قَبْلَ التَّحَلُّلِ الأَوَّلِ) پێش حەڵاڵبوونی‌یەکەمی حەج جیماع بکا، هەم بەو مەرجەش: جیماع کردنەکە بە قەسدی‌و بە خۆشی‌خۆی بێ‌و بێ‌زۆرلێکردن جیماع بکاو بشزانی جیماع کردن لە ئیحرامدا حەرامە، واتە: هەر یەکێك لە ژنەکەو مێردەکە لە بیری چوبێ: کە لە ئیحرامدایەو جیماع بکا، یان نەزانێ جیماع کردن حەرامە، یان لە خەودا، یان بە زۆرلێکراوی جیماع بکا، لەو حاڵەتانەدا حەج‌و عومرەی تێك ناچێ‌و (فِدْیَة)شی لە سەر واجب نابێ.

﴿ ئاگاداری ﴾: (فِدْیَة)کە تەنها لە سەر پیاوەکە واجب دەبێ‌و لە سەر ژنەکە واجب نابێ، بەڵام ئەگەر ژنەکەش بە خۆشی‌خۆی بوبێ‌و زانیبی (جیماع) حەرامە، ئەویش حەجەکەی تێك دەچێ، جا بزانە: ئەگەر ئاوی‌خۆی بە ئەندامێکی‌خۆی، یان بە ئەندامێکی کەسێکی‌تر بێنێتەوە، یان ماچ‌و دەستبازی لەگەڵ ئافرەت بکا، (فِدْیَة)ی بچوکی دەکەوێتە سەر، بەڵام حەج‌و عومرەی تێك ناچێ، جیاوازی نیە: بە دەستبازیەکە ئاوی بێتەوە، یان نا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

دووبارە بزانە: لە دوای جیماعی‌یەکەم هەر جارێك جیماع بکا، مەڕێکی لە سەر واجب دەبێ، هەروەها لە نێوان حەڵاڵبوونی یەکەم‌و دووەمدا هەر جارێك جیماع بکا، مەڕێکی لە سەر واجب دەبێ، بەڵام حەجەکەی تێك ناچێ، هەروەك لە (المجموع)و(تحفة)دا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

(وَيَجِبُ بِهِ بَدَنَـةٌ) بەو جیماعەی کە حەج‌و عومرە تێك دەدا، ووشترێکی پێنج ساڵە لە (فِدْیَة)دا واجبە، جا ئەگەر نەبو: مانگایەکی دوو ساڵە، ئەگەر نەبو: حەفت مەڕ، هەم واجبە: دەمودەست (فِدْیَة)کە بدا، هەروەك لە (تحفة)دا فەرموویەتی.

(وَالْمُضِيُّ فِي فَاسِدِهِ) هەروەها واجبە: بەردەوام بێ‌و بە حەج‌و عومرەی تێکچوودا بڕواو تەواویان بکا، خوای‌گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ حەج‌و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن. (وَالْقَضَاءُ) هەم واجبە: ئەو حەج‌و عومرەیەی بە جیماع تێك چووە، قەزا بکاتەوە (وَإِنْ كَانَ نُسُكُهُ تَطَوُّعاً) هەر چەند حەج‌و عومرەکەش سوننەت بێ، هەر واجبە تەواویان بکاو قەزاشیان بکاتەوە.

(وَالأَصَحُّ) بە فەرموودەی ڕاستتر: (أَنَّهُ عَلَى الْفَوْرِ) قەزاکردنەوەی حەج‌و عومرەی‌تێکچوو لە سەر تاڵوکەیەو دەمودەستە، واتە: هەر ئێستا عومرەکەی قەزا دەکاتەوەو لە ساڵی

اَلْخَامِسُ: اصْطِيَادُ كُلِّ مَأْكُولٍ بَرِّيٍّ، قُلْتُ: وَكَذَا الْمُتَوَلِّدُ مِنْهُ وَمِنْ غَيْرِه وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

داهاتووشدا حەجەکەی قەزا بکاتەوە ﴿عن عمرو بن شعيب عن أبيه: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ الْعَبادِلَةَ: ابنَ عَمْرٍو وَابنَ عُمَرَ وابنَ عَبَّاسٍ ﷺ عَنْ مُحْرِمٍ وَقَعَ بِامْرَأتِه؟ فَقَالُوا: بَطَلَ حَجُّكَ، وَاخْرُجْ مَعَ النَّاسِ وَاصْنَعْ مايَصْنَعُونَ فَإِذا أَدْرَكْتَ قابِلَ فَحُجَّ وَأَهْدِ﴾ رواه البيهقى باسناد صحيح، وفى رواية: ﴿فَأَمَرَهُ أنْ يَنْحَرَ بَدَنَةً﴾رواه الامام مالك باسناد صحيح، هەرسێك (عبدالله)یەکان پرسیاریان لێکرا: دەربارەی پیاوێك کە جیماعی لەگەڵ ژنی خۆی کردبێ لە حاڵەتی ئیحرامدا؟ فەرموویان: حەجەکەی بەتاڵەو واجبە: تەواوی بکاو لە ساڵی دا هاتووشدا قەزای بکاتەوەو ووشترێك بکاتە (فِدْيَة).

## ﴿ کافربوون لە حاڵەتی حەج و عومرەدا ﴾

بزانە: حەج و عومرە بە دووشت تێك دەچن و بەتاڵ دەبنەوە، یەکەم: بە جیماع کردن، هەروەك ڕوون کراوە. دووەم: بە کافربوون، واتە: هەر کەسێك لە حاڵەتی ئیحرامی حەج، یان عومرەدا کوفرێك بکا، حەج و عومرەکەی بەتاڵ دەبنەوە، ئەگەر هەر ئەو دەمیش شادە بێنێ و ببێتەوە موسوڵمان، دروست نیە حەج و عومرەکەی تەواو بکا، واتە: ئەگەر تەواویشیان بکا دروست نابن، بۆیێ (کفارة)شی لە سەر نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە، ئەوەش وادەگەیەنێ: واجبە -لە دوایئیسلامبوونەوە- سەرلەنوێ ئیحرام بە عومرەیەکیتر ببەستێ و بەم ئیحرامە نوێیە ئەمساڵ عومرە بکا، هەم ئەگەر کاتی وەستانی (عَرَفَة)ش مابێ، ئەوە سەرلەنوێ ئیحرام بە حەجیئەمساڵ دەبەستێ و بەم ئیحرامە نوێیە ئەمساڵ حەج دەکا، بەلام ئەگەر کاتی وەستانی(عَرَفَة) نەمابێ، واجبە: ساڵێکیتر حەجەکەی قەزا بکاتەوە، هەروەك لە (المجموع)-لە باسی (إحْصار)-دەفامێتەوە، والله أعلم.

## ٥- ڕاوکردن

(اَلْخَامِسُ) پێنجەم قەدەغەکراوی ئیحرام: (اِصْطِيَادُ كُلِّ مَأْكُولٍ بَرِّيٍّ) ڕاوکردنی گشت گۆشت حەلاڵێکی کێویە: جا ئاژەڵ بێ، یان باڵندە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ تا لە ژێر ئیحرامدا بن، نێچیری کێویتان لێحەرام کراوە. واتە: کوشتنی و گرتنی و بریندارکردنی و ئازاردانی و ڕەواندنەوەی (قُلْتُ) ئیمامی(النواوی) دەفەرموێ (وَكَذَا الْمُتَوَلِّدُ مِنْهُ وَمِنْ غَيْرِه) هەروەها ڕاوکردنی ئەو نێچیرەش حەرامە: کە لە نێوان ئاژەڵێکی کێوی و خۆماڵیدا لە دایك بوبێ (وَاللهُ أَعْلَم).

ئینجا بزانە: نێچیری ئاوی -کە تەنها لە ناو ئاودا بژیێ- حەلاڵە، بەلام ئەگەر لە ناو ئاو و وشکانیدا بژیێ حەرامە، هەروەها گشت ئاژەڵێك و باڵندەیەکی خۆماڵی -کە لە بنچینەیدا

وَيَحْرُمُ ذَلِكَ فِي الْحَرَمِ عَلَى الْحَلاَلِ، فَإِنْ أَتْلَفَ صَيْداً ضَمِنَهُ: فَفِي النَّعَامَةِ بَدَنَةٌ، وَفِي بَقَرِ الْوَحْشِ وَحِمَارِهِ بَقَرَةٌ، وَالْغَزَالِ عَنْزٌ، وَالأَرْنَبِ عَنَاقٌ، وَالْيَرْبُوعِ جَفْرَةٌ،

---

کێوی نەبوبێ- حەڵاڵە، جیاوازی نیە: بە خۆی بیکوژێتەوە، یان کەسێکی‌تر، هەروەها هەر ئاژەڵێك‌و هەر باڵندەیەکی کێوی: کە گۆشتی نەخورێ، ڕاوکردنی حەرام نیەو ئەگەر بشیکوژێ، (فدْيَة)ی لە سەر واجب نیە، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە.

جا بزانە: بە فەرموودەی ئیمامی(الماوردي): مراوی‌و ئەو قازەی نافڕێ، بە نێچیر داناندرێ‌و سزای نیە، هەروەك لە(نهاية)دا فەرموویەتی.

(وَ) هەروەها (يَحْرُمُ ذَلِكَ) ڕاوکردنی نێچیری‌کێوی‌ی گۆشت حەڵاڵ حەرامە (فِي الْحَرَمِ) لە ناو (حَرَم)دا (عَلَى الْحَلاَلِ) لە سەر ئەو کەسەش کە لە ئیحرامدا نیە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿أَلاَ وَإِنَّها مِنْ ساعَتِي حَرامٌ لاَيُخْبَطُ شَوْكُها وَلاَيُعْضَدُ شَجَرُها وَلاَيُنَفَّرُ صَيْدُها﴾ رواه الشيخان، ئاگادار بن: (حَرَم)ی(مَكَّة) لەم سەعاتەمەوە حەرامەو ڕێزدارە، نابێ دڕك‌و گیای بە سەرێکدا بشکێندرێ‌و ببڕدرێ‌و نابێ درەختەکانی ببڕدرێ‌و نابێ نێچیرەکانی تەنگاو بکرێن‌و برەوێندرێنەوە.

کەوابو: (فَإِنْ أَتْلَفَ صَيْداً) هەر کەسێك لە (حَرَم)دا نێچیرێك بفەوتێنێ، هەم هەر کەسێك لە حاڵەتی ئیحرامدا نێچیرێك لە هەر شوێنێکدا بفەوتێنێ (ضَمِنَهُ) تۆڵەی دەکەوێتە سەر، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَاالَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْتُلُواالصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ وَمَنْ قَتَلَهُ مِنْكُمْ مُتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ﴾ هۆ ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە، لە حاڵەتی ئیحرامدا نێچیر مەکوژن، هەر کەسێك لە ئێوە بە قەسدی نێچیر بکوژێ، سزای دەکەوێتە سەر: ئاژەڵێکی خۆماڵی وەکو کوژراوەکە لە تۆڵەبدا.

ئینجا بزانە: لە واجببوونی ئەو تۆڵەیەدا جیاوازی نیە: بە قەسدی بیکوژێ، یان بە هەڵە، بزانێ حەرامە، یان نەزانێ، تۆڵەی هەر لە سەرە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ تۆڵەی نێچیرەکان ﴾

ئینجا هەر بە بەڵگەی ئایەتەکەی‌ڕابردوو: (فَفِي النَّعَامَةِ) لە کوشتنی نەعامەیەکدا (بَدَنَةٌ) ووشترێك لە تۆڵەدا واجبە (وَفِي بَقَرِ الْوَحْشِ وَحِمَارِهِ) لە کوشتنی ڕەشەووڵاغی کێوی‌و کەرەکێوی‌دا (بَقَرَةٌ) مانگایەك لە تۆڵەدا واجبە (وَالْغَزَالِ) لە کوشتنی ئاسکدا (عَنْزٌ) بزنێك لە تۆڵەدا واجبە (وَالأَرْنَبِ) لە کوشتنی کەروێشکدا (عَنَاقٌ) کارەمێ‌یەك لە تۆڵەدا واجبە (وَالْيَرْبُوعِ) لە کوشتنی جورجەکێوی‌دا (جَفْرَةٌ) کارەمێ‌یەکی چوار مانگی لە تۆڵەدا واجبە.

وَمَا لاَ نَقْلَ فِيهِ يَحْكُمُ بِمِثْلِهِ عَدْلاَنِ، وَفِيمَا لاَ مِثْلَ لَهُ اَلْقِيمَةُ،

هەروەها لە تۆڵەی کۆترێکدا مەڕێك واجبە، چونکە ئەو تۆڵانەی‌ڕابردوو: یان لە پێغەمبەرەوەﷺ، یان لە (صحابة)کانەوە پێمان گەیشتون.

(وَمَا لاَ نَقْلَ فِيهِ) ئەو نێچیرەی هیچ تۆڵەی بە ئێمە نەگەیشتوە: نە لە پێغەمبەروەﷺ نە لە (صحابة)کان (يَحْكُمُ بِمِثْلِهِ عَدْلاَنِ) دوو کەسی دادپەروەرو لێزان بڕیار بە وێنەی نێچیرەکە دەدەن: کە لە ئاژەڵی خۆماڵی لە تۆڵەدا بدرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَحْكُمُ بِهِ ذَوَاعَدْلٍ مِنكُمْ﴾ دوو کەسی دادپەروەر لە ئێوە بڕیار دەدەن بە وێنەی نێچیرەکە، تاکو لە تۆڵەدا بدرێ.

(وَفِيمَا لاَ مِثْلَ لَهُ) لەو نێچیرەدا کە وێنەی نەبێ: لە ئاژەڵی خۆماڵی‌داو هیچ تۆڵەیەکیشمان پێ‌نەگەیشتبێ (اَلْقِيمَةُ) نرخی نێچیرەکە لە تۆڵەدا واجبە، کەوابو: ئەگەر نێچیرەکە وەکو کۆتر بوو، یان لە کۆتر گەورەتر بوو، یان بچوکتر بوو: وەکو چۆلەکەو کلۆ، ئەوە نرخەکەی واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، واتە: دوو کەسی دادپەروەر نرخەکەی دادەنێن.

﴿ ئاگاداری ﴾ یەکەم: ئەگەر نێچیرێك بریندار بکاو دەیەکی نرخەکەی کەم بکاتەوە، واجبە: دەیەکی تۆڵەکەی بدا، بۆ وێنە: ئەگەر ئاسکێك بریندار بکاو دەیەکی نرخەکەی کەم ببێتەوە، واجبە: دەیەکی مەڕێك لە تۆڵە بدا، بەڵام ئەگەر بە هۆی برینەکە هێزی ڕۆیشتن، یان هێزی فڕینی نەما، ئەو کاتە تۆڵەیەکی تەواوی لە سەر واجب دەبێ، واتە: لە هەر دوو مەسەلەکەدا ئەگەر برینەکەش چاك ببێتەوە، تۆڵەی لە سەر لاناچێ، هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلەیە ڕوون کراوەتەوە.

دووەم: ئەو کەسەی دەیەوێ حەج، یان عومرە بکا، ئەگەر نێچیرێکی لە ماڵەوە هەبو: وەك کۆترەکێوی، یان کەو، یان ئاسك، یان بزنەکێوی‌و کەروێشك‌و ئەو جۆرە شتانە، واجبە پێش ئیحرامبەستن: یان بیداتە کەسێك، یان بەرەڵڵای بکا، هەر چەند نێچیرکەش کەیی بوبێ، جا ئەگەر بەرەڵڵای نەکردو ئیحرامی بەست، ئەوە بە هۆی ئیحرامبەستن نێچیرەکە لە ملکایەتی وی لادەچێ‌و بۆ گشت کەسێکی‌تر حەڵاڵ دەبێ.

جا ئەگەر نێچیرەکەی بەرەڵڵا نەکردو سەری بڕی، یان بەخۆی مرد، تۆڵەی لە سەر واجب دەبێ، جیاوازی نیە: لە حاڵەتی ئیحرامی‌دا نێچیرەکە بفەوتێ، یان لە دوای حەڵاڵبوونی‌ئیحرام، کەواتە: ئەگەر لە حەج گەڕاوەو نێچیرەکە مابو، واجبە: بەرەڵڵای بکا، چونکە ئەگەر لەمەودواش بفەوتێ، تۆڵەی هەر لە سەر واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

وَيَحْرُمُ قَطْعُ نَبَاتِ الْحَرَمِ الَّذِى لاَيُسْتَنْبَتُ، وَالأَظْهَرُ تَعَلُّقُ الضَّمَانِ بِهِ وَبِقَطْعِ أَشْـجَارِهِ، فَفِى الشَّجَرَةِ الْكَبِيرَةِ بَقَرَةٌ، وَالصَّغِيرَةِ شَاةٌ، قُلْتُ: وَالْمُسْتَنْبَتُ كَغَيْـرِهِ عَلَى الْمَـذْهَبِ، وَيَحِلُّ إِذْخِرٌ وَكَذَا الشَّوْكُ كَالْعَوْسَجِ وَغَيْرِهِ

---

سێیەم: ئەگەر یەکێك لە حاڵەتی ئیحرامدا نێچیرێك سەر ببڕێ، یان هەر کەسێکی‌تر لە (حَرَمِ مَكَّة)دا نێچیرێك سەر ببڕێ، لە هەر دوو مەسەلەدا ئەو سەربڕاوە مردارەو گۆشتەکەی لە سەربڕەکەش حەرامەو لە خەڵکی‌تریش حەرامە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

چوارەم: هەر نێچیرێك کوشتنی حەرام بێ، هێلکەکەشی حەرامە، کەواتە: ئەگەر باڵندەیەك بفڕێنی‌و هێلکەکەی تێك بچێ، یان هێلکەی باڵندەیەك بشکێنێ، ئەوە بە نرخی هێلکەکەی تۆڵەی دەکەوێتە سەر، ئینجا بزانە: هەروەك گۆشتی نێچیرەکە حەرامە، ئەوهاش خواردنی هێلکەکەشی حەرامە، هەروەك لە (المجموع)دا ڕوون کراوەتەوە.

﴿ تۆڵەی درەختو گیای (مَكَّة)و (مَدینَة) ﴾

(وَيَحْـرُمُ) لە گشت کەسێك حەرامە (قَطْـعُ نَبَـاتِ الْحَـرَمِ) بڕینو هەڵکەندنی ئەو گیاو درەختەی لە (حَـرَم)دا ڕواوە (الَّذِى لاَ يُسْتَنْبَتُ) ئەو جۆرە گیاو درەختەی کە خەڵك نایچێنێ، بەڵکو بە خۆی دەڕوێ (وَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر (تَعَلُّقُ الضَّمَانِ بِهِ) تۆڵە واجب دەبێ بە بڕینو هەڵکەندنی گیای(حَـرَم)و هەم (وَبِقَطْعِ أَشْجَارِهِ) تۆڵە واجب دەبێ بە بڕینو هەڵکەندنی درەختی‌تەڕی (حَـرَم)، بە بەڵگەی حەدیسەکەی‌ڕابردوو لە باسی نێچیردا.

کەوابو: (فَفِى الشَّجَرَةِ الْكَبِيرَةِ) لە هەڵکەندن، یان بڕینی درەختێکی‌تەڕی گەورەدا (بَقَرَةٌ) مانگایەك لە تۆڵەی واجبەو (وَالصَّغِيرَةِ) لە درەختێکی بچووکدا (شَاةٌ) مەڕێك واجبە، هەروەها لە بڕینو هەڵکەندنی گیاو درەختی زۆر بچووکدا نرخەکەیان واجبە.

ئینجا بزانە: درەختی ووشك دروستە: هەم ببڕدرێو هەم هەڵبکەندرێ، بەڵام پووش-واتە: گیای ووشك- تەنها دروستە: ببڕدرێ، واتە: دروست نیە هەڵبکەندرێ، چونکە هەر کاتێك ئاو بدرێ، لە سەر ڕەگەکەی دەژێتەوە، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النـواوی) دەفەرموێ (وَالْمُسْتَنْبَتُ) ئەو درەختەی ئادەمیزاد دەیچێنێ (كَغَيْرِهِ) وەکو ئەو درەختەیە کە بە خۆی ڕوابێ، واتە: ئەگەر ببڕدرێ، یان هەڵبکەندرێ، واجبە: خوێنی بدرێ (على الْمَذْهَبِ) لە سەر فەرموودەی ڕاستی مەزهەب.

بەڵام گیا وەکو درەخت نیە، واتە: ئەو جۆرە گیایەی ئادەمیزاد دەیچێنێ دروستە: ببڕدرێتەوەو هەڵبکەندرێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَيَحِلُّ الإِذْخِرُ) حەڵاڵە: گیای(ئیزخیر) ببڕدرێتەوەو هەڵبکەندرێ، چونکە پێغەمبەرﷺ ئیزنی‌داوە (وَكَذَاالشَّوْكُ) هەروەها دڕکیش دروستە ببڕدرێ (كَالْعَوْسَجِ وَغَيْرِهِ) وەکو دڕکی

عِنْدَالْجُمْهُورِ، وَالأَصَحُّ حِلُّ أَخْذِ نَبَاتِهِ لِعَلْفِ الْبَهَائِمِ وَلِلدَّوَاءِ وَاللهُ أَعْلَمُ. وَصَــيْدُالْمَدِينَةِ حَرَامٌ، وَلاَ يُضْمَنُ فِي الْجَدِيدِ،

---

عەوسـەج‌و ئـەو بابەتانـە (عِنْدَ الْجُمْهُورِ) لـە لای کۆمەڵـە زۆرەکـەی زانایـان (وَالأَصَحُّ) بـە فەرموودەی ڕاستتر: (حِلُّ أَخْذِ نَبَاتِـهِ) حەڵاڵـە گیـاو درەخـتی (حَـرَم) لێبکرێتـەوە (لِعَلْـفِ الْبَهَائِمِ) بۆ ئالیکی وڵاغەکان‌و (وَلِلدَّوَاءِ) هەم بۆ دەرمانکردنیش (وَاللهُ أَعْلَمُ).

هـەروەها دروسـتە: ئـاژەڵ لـە گیـاو درەخـتی(حـَرَم) بلەوەڕێنـدرێ، هـەم دروسـتە: لکـە باریکەکانی دارسیواك‌و بەری گشت درەختێکیش لێبکرێتەوە.

ئینجا بزانە: بە هیچ جۆرێـك دروسـت نیـە: بـەردو گڵـی (حـَرَم) ببردرێتـە دەرەوەی(حـَرَم)، کەواتە: ئەگەر یەکێك گڵ، یان بەردی (حَرَم) لەگەڵ خۆیا بهێنێ، واجبە: بیگەڕێنێتـەوە بـۆ (حَرَم)، ئەگینا: گوناهباریەکەی بەردەوام دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئـەو مەسـەلانە ڕوون کراونەوە.

## ٦- مارەبڕینی ژن

شەشەم قەدەغـەکراوی ئیحـرام: مـارەبڕینی ژن، واتـە: ئەگـەر ژنەکـە، یـان مێردەکـە، یـان (وَلـی)ی یـەکێکیان لـە ئیحرامـدابێ، حەڕامـە: ژنەکـە مـارە بـبڕێ، جـا ئەگـەر مـارە بـڕا، مارەبڕینەکەی بەتاڵەو دروست نابێ، بۆیێ (فِدْیَة)ش واجب نابێ، جیاوازی نیـە: مێردەکـەو (وَلـی)یەکـە، یـان وەکیلـەکانیان مـارە بـبڕن، هـەروەك لـە (المجمـوع)دا فەرموویـەتی‌و لـە سەرچاوەکانی‌تریشـدا لـە باسـی مـارەبڕین ڕوون کراوەتـەوە، پێغەمبـەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿لاَيَنْكِحِ الْمُحْرِمُ وَلاَيُنْكِحُ وَلاَيَخْطُبْ﴾رواه مسلم واصحاب السنن، نابـێ پیـاوی بـەئیحرام بۆ خۆی مارە ببڕێ‌و نابێ لە خەڵکی‌تریش مارە ببڕێ‌و نابێ ژنیش داخواز بکا.

(وَصَيْدُالْمَدِينَةِ) نێچیری (مدینـة)ی پـیرۆز، هـەم درەخـت‌و گیـاو بـەردو گڵەکەشـی، گشـتی (حَرامٌ) حەڕامە-وەکو (مکة)ی پیرۆز- پێغەمبەرﷺ دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْــراهِيمَﷺ حَــرَّمَ مَكَّةَ وَإِنِّي حَرَّمْتُ الْمَدِينَةَ وَما بَيْنَ لابَتَيْها لاَ يُقْطَعُ عَضاها وَلاَ يُصادُ صَــيْدُها﴾ رواه مسلم، حەزرەتی (ابراهیم)پێغەمبەرﷺ (مکة)ی حەڕام کرد، منـیش (مدینـة)م حـەڕام کـرد: نێـوان هەردوو زەمینەکەی بەردەڕەشـەکان‌و نێوان هـەردوو کێوەکـەی (عـیر)و(ثـور)، نابێ داری ببڕدرێ‌و نابـێ نێچیری ڕاو بکـرێ. بـەڵام (وَلاَ يُضْـمَنُ فِي الْجَدِيـدِ) لـە فـەرموودەی نـوێدا: تۆڵەی نێچیرو درەختەکانی نادرێ، چونکە شوێنی حەج کردن نیە.

ئینجا بزانە: لەم مەسەلەیەدا فەرموودەی کۆن هەڵبژاردراوە کـە دەفـەرموێ: ئـەو کەسـەی نێچیری(مدینـة) دەکـوژێ، یـان درەخـت‌و گیایەکـەی دەبـڕێ، واجبـە سـزا بـدرێ: گشـت کەلوپەلێك‌و جلێکی کە لەبەریدایە-جگە لە داپۆشـەری عـەورەت- هـەمووی لێبسـتێندرێ

﴿عَن سَعْد بن أَبِيوَقَّاص﴾: أَنَّ النَّبِيَّﷺ قَالَ: مَنْ قَطَعَ مِنْ شَجَرِ الْمَدِينَةِ شَيْئاً –وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ وَجَدَ أَحَداً يَصِيدُ فِيهِ– فَلْيَسْلُبْهُ ثِيَابَهُ﴾ رواه ابوداود، وَنَحوهُ في صحيح مسلم، هەر كەسێك درەختێكی (حَرَم)ی(مدينة) ببڕێ، يان ديتی يەكێك نێچيرەكەی ڕاو دەكا، با جل‌و بەرگەكەی لێ دابڕنێ‌و لێی بستێنێ.

## ﴿ خوێن‌و (فِديَة)كانی حەج‌و عومرە ﴾

پێشەكی بزانە: خوێنەكانی حەج‌و عومرە چوار جۆرن، هەروەها بزانە: مەبەست لە خوێن‌و (فِديَة)ی حەج‌و عومرە سەربڕینی ئاژەڵێكە –كە لە سەر مرۆڤ واجب دەبێ– بە هۆی نەكردنی واجبێك، يان بە هۆی كردنی قەدەغەكراوێك، هەروەها (فِديَة) بەو دانەوێڵەو ڕۆژووەش دەگوترێ: كە لەجياتی سەربڕينی ئاژەڵەكە واجب دەبێ.

ئينجا بزانە: ئەو ئاژەڵەی لە خوێن‌و (فِديَة)دا واجب بووە، مەرجە: بە قوربانی بچێ، واتە: سەلامەت بێ لە گشت ئەو عەيبانەی گۆشت كەم دەكەنەوەو دەبنە هۆی دروست نەبونی قوربانی، هەم ئەگەر مەڕ بوو، مەرجە: ساڵێكی تەواو كردبێ، ئەگەر بزن، يان مانگا بوو، مەرجە: دوو ساڵی تەواو كردبن، ئەگەر ووشتر بوو، مەرجە: پێنج ساڵی تەواو كردبن.

ديسان بزانە: لە نەكردنی واجبەكانی حەج‌و عومرەدا جياوازی نيە: لە نێوان ئەو كەسەی بە قەسدی نەيكردوە، يان بە نەزانی، يان بە سەهوو، يان لەبيری چوبێ، واتە: گشتيان خوێنيان لە سەر واجب دەبێ، بەڵام كردنی قەدەغەكراوەكان دوو جۆرن:

يەكەم: ئەگەر قەدەغەكراوەكە لەناوبردن بێ: وەكو لابردنی موو و نينۆك، كوشتنی نێچير، بڕينی گياو درەخت، ئەوەش –وەكو نەكردنی واجب– جياوازی نيە: لە نێوان ئەو كەسەی بە قەسدی قەدەغەكراوەكەی كردبێ، يان بە نەزانی، يان بە سەهوو، يان لەبيری چوبێ كە لە ئيحرامدايە، گشتيان تۆڵەيان لە سەر واجب دەبێ.

دووەم: ئەگەر قەدەغەكراوەكە خۆشی‌و خۆجوانكردن بێ: وەكو داپۆشينی سەری پياو و ڕووی ئافرەت، پێڵاو و جلیدرواو، خۆ بۆنخۆشكردن، جيماع كردن، دەستبازی‌و خۆ ڕەحەتكردن، لەوانەدا تەنها ئەو كەسە خوێنی لە سەر واجب دەبێ: كە بە قەسدی وایكردبێ‌و زانيبی حەرامەو بە خۆشیخۆی بوبێ، كەواتە: بەهەڵەداچوو و نەزان‌و زۆرلێكراو خوێنيان لە سەر واجب نابێ، هەروەك لە چەند شوێنێكی سەرچاوەكاندا ناوەڕۆكی ئەم پێشەكی‌يە ڕوون كراوەتەوە، جا خوێن‌و (فِديَة)كانی حەج‌و عومرە چوار جۆرن:

**خوێنی‌یەكەم:** پێی دەگوترێ: (تَخْيِير وَتَعْدِيل) سەرپشكی‌و قرساندن، كە بە هۆی كوشتنی نێچيرو بڕينی گياو درەخت واجب دەبێ، كەوابو: (وَيَتَخَيَّرُ فِي الصَّيْدِ الْمِثْلِيّ)

بَيْنَ ذَبْحِ مِثْلِهِ وَالصَّدَقَةِ بِهِ عَلَى مَسَاكِينِ الْحَرَمِ، وَبَيْنَ أَنْ يُقَوِّمَ الْمِثْلَ دَرَاهِمَ وَيَشْتَرِيَ بِهِ طَعَامَاً لَهُمْ، أَوْ يَصُومَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْمَاً، وَغَيْرُ الْمِثْلِيِّ يَتَصَدَّقُ بِقِيمَتِهِ طَعَامَاً أَوْ يَصُومُ، وَيَتَخَيَّرُ فِي فِدْيَةِ الْحَلْقِ بَيْنَ ذَبْحِ شَاةٍ، وَالتَّصَدُّقِ بِثَلاثَةِ آصُعٍ لِسِتَّةِ مَسَاكِينَ، وَصَوْمِ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ،

---

خوێندەرەکە سەرپشکە لە تۆڵەی ئەو نێچیرەی وێنەی هەیە: (بَيْنَ ذَبْحِ مِثْلِهِ) لە نێوان سەربڕینی ئاژەڵێکی خۆماڵی وێنەی نێچیرەکەو (وَالصَّدَقَةِ بِهِ عَلَى مَسَاكِينِ الْحَرَمِ) سەربڕاوەکەش بکاتە خێرو بە سەر هەژارەکانی(حَرَم)دا بەشی بکا (وَبَيْنَ أَنْ يُقَوِّمَ الْمِثْلَ دَرَاهِمَ) یان ئاژەڵە خۆماڵیەکە بە پارە بقرسێندرێو (وَيَشْتَرِيَ بِهِ طَعَامَاً لَهُمْ) بەو پارەیەش دانەوێڵە بۆ هەژارەکانی(حَرَم) بکڕێو بیانداتێ (أَوْ يَصُومَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْمَاً) یان لەجیاتی هەر مستێکی دانەوێڵەکە ڕۆژێك بەڕۆژوو ببێ.

هەروەها لە خوێنیدرەختیشدا لە نێوان ئەو سێیانەیڕابردوودا سەرپشکە، هەروەك لە (المجموع)و (شرح المنهج)دا فەرموویانە.

(وَغَيْرُ الْمِثْلِيِّ) لەو نێچیرەی وێنەی نیەو تۆڵەی دیاری نەکراوە لە ئاژەڵی خۆماڵیدا، خوێندەرەکە سەرپشکە: (يَتَصَدَّقُ بِقِيمَتِهِ طَعَامَاً) یان بە ئەندازەی نرخی نێچیرەکە، یان درەختەکە دانەوێڵە دەداتە هەژاران (أَوْيَصُومُ) یان لە جیاتی هەر مستێکیدانەوێڵەکە ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَلِكَ صِيَامًا﴾ تۆڵەینێچیرەکە ئاژەڵێك بێ: بگاتە (حَرَم)و لەوێ سەر ببڕێ، یان بە نرخی ئاژەڵەکە دانەوێڵە بدرێتە هەژاران، یان بە قەد دانەوێڵەکە بەڕۆژوو ببێ.

**خوێنیدووەم**: پێی دەگوترێ: (تَخْيِير وَتَقْدِير) سەرپشکیو دیارکراو، کە واجب دەبێ: بە هۆی لابردنی موو و نینۆك، بە بەرگی دوورواو، بە داپۆشینی سەری پیاو و ڕووی ئافرەت، بە خۆبۆنخۆشکردنو چەورکردن، بە ماچو بە دەستبازیو بە خۆ ڕەحەتکردنو بە جیماعی جاری دووەمو بە جیماعی نێوان هەردوو حەلاڵبوونەکانی حەج.

کەوابو: (وَيَتَخَيَّرُ فِي فِدْيَةِ الْحَلْقِ) خوێندەرەکە سەرپشکە: لە (فِدْيَة)ی لابردنی موو و لە (فِدْيَة)ی ئەوانەیتری تازە ڕابران (بَيْنَ ذَبْحِ شَاةٍ) لە نێوان سەربڕینی مەڕێك، یان بزنێك، گۆشتەکەشی بداتە هەژارەکانی(حَرَم)، (وَالتَّصَدُّقِ بِثَلاثَةِ آصُعٍ) یان سێ ساع دانەوێڵە بکاتە خێر (لِسِتَّةِ مَسَاكِينَ) بیانداتە شەش هەژاری (حَرَم)—هەر ساعێك (٢٤٢٠) دوو کیلۆو چوارسەدو بیست غرامە—، واتە: هەر هەژارێك نیو ساعی بداتێ (وَصَوْمِ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ) یان سێ ڕۆژان بەڕۆژوو ببێ ﴿عَنْ كَعْب بن عُجْرَة ﷺ:... أَنَّ الْقَمْلَ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِحْلِقْ رَأْسَكَ، ثُمَّ اذْبَحْ شَاةً نُسُكاً، أَوْ صُمْ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ، أَوْ أَطْعِمْ ثَلاثَةَآصُعٍ مِنْ تَمْرٍ

وَالأَصَحُّ أَنَّ الدَّمَ فِي تَرْكِ الْمَأْمُورِ كَالإِحْرَامِ مِنَ الْمِيقَاتِ دَمُ تَرْتِيبٍ، فَإِذَا عَجَزَ اشْتَرَى بِقِيمَةِ الشَّاةِ طَعَاماً وَتَصَدَّقَ بِهِ، فَإِنْ عَجَزَ صَامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً، وَدَمُ الْفَوَاتِ كَدَمِ التَّمَتُّعِ، وَيَذْبَحُهُ فِي حَجَّةِ الْقَضَاءِ فِي الأَصَحِّ،

---

عَلَى سِتَّةِ مَسَاكِينَ﴾ رواه الشيخان، (كعب) ئەسپی زۆری لە سەریدا بوو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: سەرت بتاشەو لە (فِدْيَة)دا: یان مەڕێك سەر ببڕە، یان سێ ڕۆژان بەڕۆژوو ببە، یان سێ ساع قەسپ بدە شەش هەژاران.

**خوێنیسێیەم:** پێی دەگوترێ: (تَرْتِيب وَتَقْدِير) ڕیزو دیارکراو، کە واجب دەبێ: بە هۆی حەجی بە لەززەتو حەجیوێکرا، نەکردنیڕەجمیشەیتان، نەمانەوەیشەوێ لە (مِنَى)و لە (مزدلفة)، ئیحرام نەبەستن لە(میقات)، نەکردنی(طَوافُ الْوَداع)، لەدەستچوونی وەستانی (عَرَفات)، ئەگەر هەر یەکێکی لەو فەرمان پێکراوانە نەکرد، واجبە: مەڕێك، یان بزنێك سەر ببڕێ، ئینجا ئەگەر دەستی نەکەوت، سێ ڕۆژان لە حەجو حەفت ڕۆژان لە ماڵەوە بەڕۆژوو دەبێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ﴾ هەر کەسێك لەززەتی دیت بە تەواوبوونیعومرە تا ئیحرامبەستنیحەج، واجبە: ئەو ئاژەڵەی ئاسانە لە (فِدْيَة)دا بدا، جا هەر کەسێك ئاژەڵەکەی دەست نەکەوت، واجبە: سێ ڕۆژان لە حەجداو حەفت ڕۆژانیش هەر کاتێك گەڕانەوە بەڕۆژوو بێ، ئەوە دە ڕۆژیتەواوە.

جا بزانە: ئەوەی تازە ڕابرا لە سەر فەرموودەی ڕاستتر بوو، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە، واتە: لێرەدا (منهاج) بە فەرموودەی بێهێز ڕەفتاری کردوە، کە دەفەرموێ: (وَالأَصَحُّ أَنَّ الدَّمَ فِي تَرْكِ الْمَأْمُورِ) خوێنی نەکردنی فەرمان پێکراو (كَالإِحْرَامِ مِنَ الْمِيقَاتِ) وەکو نەبەستنی ئیحرام لە (میقات) (دَمُ تَرْتِيبٍ) خوێنی ڕیزو قرساندنە، کەوابو: (فَإِذَا عَجَزَ) ئەگەر ئاژەڵەکەی دەست نەکەوت (اشْتَرَى بِقِيمَةِ الشَّاةِ طَعَاماً) بە نرخی مەڕەکە، یان بزنەکە دانەوێڵە دەکڕێو (وَتَصَدَّقَ بِهِ) دەیکاتە خێر (فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر توانای نەبو: دانەوێڵە بکڕێ (صَامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً) لە جیاتی هەر مستێك ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێ.

(وَدَمُ الْفَوَاتِ) خوێنی لە دەستچوونی(عَرَفات)، (كَدَمِ التَّمَتُّعِ) وەکو خوێنی حەجی بە لەززەت وایە: لەو ڕیزو دیارکردنەیڕابردوودا، بەڵام (وَيَذْبَحُهُ فِي حَجَّةِ الْقَضَاءِ) خوێنی لە دەستچوونی (عَرَفات) لە حەجی قەزا کراوەدا سەر دەبڕێ (فِي الأَصَحِّ) لە فەرموودەی ڕاستتردا، هەروەك لە باسەکەی دوایئێرەدا ڕوونی دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

**خوێنیچوارەم:** پێی دەگوترێ: (تَرْتِيب وَتَعْدِيل) ڕیزو قرساندن کە واجب دەبێ: بە هۆی ئەو جیماع کردنەی حەج تێك دەدا، واتە: ئەگەر لە خوێنی جیماعدا ووشتر نەبو و مانگا

وَالدَّمُ الْوَاجِبُ بِفِعْلِ حَرَامٍ أَوْ تَرْكِ وَاجِبٍ لاَ يَخْتَصُّ بِزَمَانٍ، وَيَخْتَصُّ ذَبْحُهُ بِالْحَرَمِ فِي الأَظْهَرِ، وَيَجِبُ صَرْفُ لَحْمِهِ إِلَى مَسَاكِينِهِ،

---

نەبو و حەفت مەڕ نەبون، ووشترەکە بە پارە دەقرسێنێ‌و بەو پارەیە دانەوێڵە دەکڕێ بۆ هەژارەکانی(حَرَم)، جا ئەگەر توانای کڕینی نەبو، لەجیاتی هەر مستێکی دانەوێڵەکە ڕۆژێك بەرۆژوو دەبێ، هەروەك لە باسی جیماعدا بەڵگەمان هێناوە.

هەروەها خوێنی ڕێ‌لێگرتنی تەواوکردنی حەجیش ئەوهایە: ئەگەر بزن، یان مەڕێکی دەست نەکەوت، دەیقرسێنێ‌و بە ئەندازەی‌نرخەکەی، دانەوێڵە بۆ هەژاران دەکڕێ، ئەگەر توانای نەبو، لەجیاتی هەر مستێك ڕۆژێك بەرۆژوو دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو دوو خوێنانە ئەوها ڕوون کراونەوەو لە باسەکەی داهاتوودا خوێنی ڕێ‌لێگرتن درێژتر ڕوون دەکەینەوە، إِنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى.

## ﴿ کات‌و شوێنی سەربڕینی خوێنەکان ﴾

(وَالدَّمُ الْوَاجِبُ بِفِعْلِ حَرَامٍ) ئەو خوێنەی واجب دەبێ: بە هۆی کردنی قەدەغەکراوێکی حەرام (أَوْ تَرْكِ وَاجِبٍ) یان بە هۆی نەکردنی واجبێك (لاَ يَخْتَصُّ بِزَمَانٍ) تایبەت نیە بە هیچ کاتێك، واتە: لە هەر کاتێکدا ئاژەڵی‌خوێنەکە سەر ببڕێ دروست دەبێ، ئەوهاش سوننەتە: لە کاتی قوربانی‌دا سەری ببڕێ.

بەڵام (وَيَخْتَصُّ ذَبْحُهُ بِالْحَرَمِ) سەربڕینی ئاژەڵەکەی‌خوێن تایبەتە بە (حَرَم)، واتە: ئەگەر لە زەمینی(حَرَم)دا سەری نەبڕێ، دروست نابێ‌و بە بەر ناکەوێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ﴾ ئاژەڵی خوێنەکە بگاتە (حَرَم)و لەوێ سەر ببڕێ.

(وَيَجِبُ صَرْفُ لَحْمِهِ إِلَى مَسَاكِينِهِ) واجبە: پێویستەو گۆشتی خوێنەکە بداتە گەداو هەژارەکانی (حَرَم)، جیاوازی نیە گەداو هەژارەکان: نیشتەجێی(حَرَم) بن، یان ڕێبوار بن، جا بزانە: واجبە گۆشتەکەش: لای‌کەم بداتە سێ کەسان، جا ئەگەر لە (حَرَم)دا گەداو هەژار نەبون، واجبە: سەربڕینەکە دوابێخێ تا پەیدا دەبن.

هەروەها واجبە: لە کاتی دابەشکردنی‌گۆشتەکە، یان لە پێشدا نیەتی خوێنەکە بێنێ، ئیتر جیاوازی نیە: بە پارچەکراوی گۆشتەکەیان بداتێ، یان لاشەی‌سەربڕاوەکەیان بداتێ، بەڵام دروست نیە: بەخۆی هیچی لێ‌بخوا، هەروەك لە سەرچاوەکاندا ئەو مەسەلانە ڕوون کراونەوە ﴿عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: لاَ يُؤْكَلُ مِنْ جَزَاءِ الصَّيْدِ وَالنَّذْرِ وَيُؤْكَلُ مَا سِوَى ذَلِكَ﴾ رواه الشيخان، نابێ لە خوێنی سزای‌نێچیرو لە ئاژەڵی نەزرکراو بخورێ، جگە لەوانەش دروستە لێی بخورێ.

وَأَفْضَلُ بُقْعَةٍ لِذَبْحِ الْمُعْتَمِرِ الْمَـرْوَةُ، وَلِلْحَـاجِّ مِـنًى، وَكَـذَا حُكْـمُ مَـا سَـاقَا مِـنْ هَـدْيٍ مَكَانـاً، وَوَقْتُـهُ وَقْـتُ الأُضْـحِيَّةِ عَلَى الصَّـحِيحِ.

## (بَابُ الإِحْصَارِ وَالْفَوَاتِ)

مَنْ أُحْصِرَ تَحَلَّلَ، وَقِيلَ لاَ تَتَحَلَّلُ الشِّرْذِمَةُ،

---

ئینجا بزانە: لە مەزهەبی ئیمامی(حنفي)دا دروستە: دانەوێڵەو گۆشتی خوێنەکان لە (حَرَم) بگوازرێنەوەو بدرێنە گەداو هەژارەکانی شوێنەکانیتر، واتە: تەنها سەربڕین لە (حَرَم)دا واجبە، هەروەك لە (شرح الوجين)و کتێبەکانی خۆیاندا ڕوون کراوەتەوە.

(وَأَفْضَلُ بُقْعَةٍ لِذَبْحِ الْمُعْتَمِرِ) گەورەترین شوێنی(حَرَم) بۆ سەربڕینی ئاژەڵی ئەو کەسەی عومرە دەکا، (اَلْمَرْوَةِ)یە-کە بەرامبەر (صفا)یە- چونکە لەوێدا سەری خۆی دەتاشێو عومرەی تەواو دەکا، بەلام ئێستا (اَلْمَرْوَة) کەوتۆتە ناو (الْمَسْجِدالْحَرام)و ناگونجێ لەوێدا ئاژەڵ سەر ببڕێ.

(وَلِلْحَاجِّ) گەورەترین شوێنی(حَرَم) بۆ سەربڕینی ئاژەڵی ئەو کەسەی حەج دەکا، (مِنَى)یە، چونکە لەوێ حەج تەواو دەبێ، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ﴿نحرْتُ هَهُنا وَمِنى كُلُّها مَنْحَرٌ﴾ رواه مسلم، من لێرەدا ئاژەڵم سەربڕی، (مِنَى) گشتی شوێنی سەربڕینە.

(وَكَذَا حُكْمُ مَا سَاقَا مِنْ هَدْيٍ) هەروەهایە بڕیاری سەربڕینی ئەو ئاژەڵەی حاجیو عومرەچی بە (هَدْي): بە دیاری هێناویانە بۆ(مَكَّة)، (مَكَانَاً) لە ڕووی شوێنەوە: (الْمروة)و (مِنَى)یە، بەلام (وَوَقْتُهُ) کاتی سەربڕینی ئاژەڵی(هَدْي)-دیاری (وَقْتُ الأُضْحِيَّةِ) کاتی قوربانییە: کە چوار ڕۆژەکەی چەژنی قوربانە (على الصَّحِيحِ) لە سەر فەرموودەی ڕاست، هەروەك لە باسی ڕەجمی شەیتانیگەورەدا بە درێژی ڕوون کراوە.

## ﴿ بابُ الإِحْصارِ: باسی ڕێلێگرتن لە تەواوکردنیحەجو عومرە (وَالْفَواتِ) لەدەستچوونی (عَرَفات)﴾

(مَنْ أُحْصِرَ) هەر کەسێك ئیحرامی بەست، جا لە دوایئیحرامبەستن لە گشت ڕێگایەکەوە قەدەغە کرا: حەج، یان عومرە تەواو بکا (تَحَلَّلَ) دروستە: خۆی حەلاڵ بکاو ئیحرامەکەی بشکێنێ، واتە: ئاژەڵێك سەر ببڕێو سەری بتاشێ، خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَااسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلاَ تَحْلِقُوا رُؤُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّـهُ﴾ ئەگەر لە گشت ڕێگەیەکەوە قەدەغەکران: حەج، یان عومرە تەواو بکەن، ئەو ئاژەڵەی بۆتان ئاسانە سەری ببڕن، بەلام سەرتان مەتاشن تا ئاژەڵەکە دەگاتە شوێنی خۆی، واتە: سەردەبڕێ. (وَقِيلَ) لە فەرموودەیەکی بێهێزدا (لاَ تَتَحَلَّلُ الشِّرْذِمَةُ) کۆمەڵێکیوەها: کە

وَلاَ تَحَلُّلَ بِالْمَرَضِ فَإِنْ شَرَطَهُ تَحَلَّلَ بِهِ عَلَى الْمَشْهُورِ،

تەنها ئەوان قەدەغە کرابن، دروست نیە خۆیان حەلاڵ بکەن، بەلام بە فەرموودەی ڕاستتر: گشت قەدەغەکراوێك بۆی دروستە، جا یەك کەس بێ، یان زیاتر.

﴿ ئاگاداری ﴾: ئەگەر لە تەواوکردنیعومرە قەدەغە کرا، بەلام دەیزانی پێش سێ ڕۆژان قەدەغەکردنەکەی نامێنێ، یان دەگونجا لە ڕێگایەکیتر عومرەکەی تەواو بکا، ئەوە واجبە: خۆی لە ئیحرامدا ڕابگرێو عومرەکەی تەواو بکاو دروست نیە خۆی حەلاڵ بکا، بەلام ئەگەر لە تەواوکردنیحەج قەدەغە کرا، ئەوە چوار حاڵەتی هەنە:

یەکەم: ئەگەر گومانی بەهێز بوو: پێش وەستانی(عَرَفَة) قەدەغەکردنەکەی نامێنێ، یان دەگونجا لە ڕێگایەکیتر حەجەکەی تەواو بکا، ئەوە واجبە: خۆی لە ئیحرامدا ڕابگرێ: بۆ ئەوەی حەجەکەی تەواو بکا، واتە: دروست نیە خۆی حەلاڵ بکا تا ئەو کاتەی لە فەوتانی وەستانی(عَرَفَة) دەترسێ.

دووەم: ئەگەر گومانی بەهێز نەبو، بەلام ئومێدی هەبو: پێش وەستانی(عَرَفَة) قەدەغەکردنەکەی نەمێنێو کاتێکی بەرفراوانیش مابو بۆ وەستانی(عَرَفَة)، ئەو کاتە سوننەتە خۆی لە ئیحرامدا ڕابگرێ، تا ئەو کاتەی لە فەوتانی وەستانی(عَرَفَة) دەترسێ.

سێیەم: ئەگەر کاتەکە بەرتەنگ بوو و لە فەوتانی وەستانی(عَرَفَة) دەترسا، یان هیچ ئومێدێکی نەبو: قەدەغەکردنەکەی نەمێنێ، ئەوە سوننەتە: بە پەلە خۆی حەلاڵ بکا؟ چونکە لەم حاڵەتەدا ئەگەر هەر لە ژێر ئیحرامدابێو وەستانی(عَرَفَة)ی لێبفەوتێ، قەزاکردنەوەی لە سەر واجب دەبێ، هەم دوو خوێنیشی لە سەر واجب دەبن: خوێنێکی فەوتانی (عَرَفَة)و خوێنێکی خۆحەلاڵکردن.

چوارەم: ئەگەر بە هۆی قەدەغەکردن–یان عوزرێکیتر– خۆی حەلاڵ کرد، بەلام لە دوای خۆحەلاڵکردنەکە کاتێکیبەرفراوان مابو بۆ وەستانی(عَرَفَة)، لەم حاڵەتەدا ئەوها باشترە: سەرلەنوێ ئیحرام بە حەجی ئەمساڵ ببەستێو هەر لەم ساڵەیدا حەج بکا، هەروەك لە (المجموع)و (تحفة)دا ناوەڕۆکی ئەم ئاگادارییە ڕوون کراوەتەوە.

## ﴿ ئیحرام شکاندن بە هۆی نەخۆشیو عوزرەکانیتر ﴾

(وَلاَ تَحَلُّلَ بِالْمَرَضِ) خۆحەلاڵکردن دروست نیە بە هۆی نەخۆشی، ئەگەر مەرجی دانەنابێ، بەڵکو واجبە: خۆی ڕابگرێ تا چاك دەبێتەوە، بەلام (فَإِنْ شَرَطَهُ) ئەگەر لەگەڵ نیەتی ئیحرامبەستندا مەرجی دانابو: هەر کاتێك نەخۆش ببێ، یان عوزرێکیتری ببێ، خۆی حەلاڵ بکا (تَحَلَّلَ بِهِ) ئەو کاتە دروستە: بە هۆی نەخۆشیو شکستو برینداربوونو عوزرەکەیتر خۆی حەلاڵ بکا (علىالمَشْهُورِ) لە سەر فەرموودەی ناسراوی مەزهەب

وَمَنْ تَحلَّلَ ذَبَحَ شاةً حَيْثُ أُحصِرَ، قُلْتُ: إِنَّمَا يَحْصُلُ التَّحلُّلُ بِالـذَّبْحِ وَنِيَّـةِ التَّحلُّـلِ وَكَذَا الْحَلْقُ إِنْ جَعَلْنَاهُ نُسُكاً،

---

﴿عَنْ عائشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى ضُباعَةَ فَقالَت: يارَسُولَ اللهِ اِنِّي أُرِيـدُ الْحَـجَّ وَأَنا شاكِيَةٌ؟ فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: حُجِّي وَاشْتَرِطِي: أَنَّ مَحِلِّي حَيْـثُ حَبَسْـتَنِي﴾ رواه الشيخان، (ضباعة) گوتی: دەمەوێ حەج بکەمو گیانیشم بە ئازارە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئیحرام بە حەج ببەستەو مەرج دابنێو بڵێ: لە هەر شوێنێك بە هۆی نەخۆشی ڕاگیرام، لەوێ خۆم حەلاڵ بکەم.

ئینجا بزانە: ئەگەر بە مەرجی دانابێ: بە بێخوێندان خۆی حەلاڵ بکا، ئەو کاتە خوێنەکەشی لە سەر واجب نابێ، ئەگینا: واجب دەبێ، هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

﴿ ئاگاداری ﴾: دروستە –لەگەڵ نیەتی ئیحرامبەستنیحەج– بە مەرج دابنێ: حەجەکەی بگۆڕێو ببێتە عومرە، هەر کاتێك نەخۆشی، یان عوزرێکیتری وەکو نەخۆشی لێیڕوودا، جا لە کاتی پەیدابوونیعوزرەکە، حەجەکەی دەبێتە عومرەو بەر عومرەی ڕوکنیئیسلام دەکەوێ، هەروەك لە زۆبەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

(وَمَنْ تَحَلَّلَ) هەر کەسێك ویستی خۆی لە ئیحرام حەلاڵ بکاو ئیحرام بشکێنێ: بە هۆی قەدەغەکردن، یان نەخۆشی، یان عوزرێکیتر (ذَبَحَ شَاةً) واجبە: مەڕێك، یان بزنێك سەر ببڕێ، بە بەڵگەی ئایەتەکەیڕابردوو (حَيْثُ أُحْصِرَ) سەربڕینەکەشی لەو شوێنە بێ: کە لێیەوە قەدەغە کراوە –جا (حَرَم) بێ، یان دەرەوەی(حَرَم)– بە بەڵگەی حەدیسەکەی داهاتوو، واتە: شوێنیقەدەغەکردن –دەرهەقیقەدەغەکراوەکە– وەکو (حَرَم)ی لێدێو سەربڕینەکەی لە شوێنێکیتری جگە لە شوێنیقەدەغەکردنەکە دروست نابێ، هەروەك لە زۆبەی سەرچاوەکاندا ڕوون کراوەتەوە.

ئینجا بزانە: واجبە: گۆشتەکەش بداتە گەداو هەژارەکانی ئەو شوێنەی لێیەوە قەدەغەکراوە، جا ئەگەر گەداو هەژاری لێنەبون، دەیگوازێتەوە نزیکترین شوێنو دەیداتە هەژارەکانی ئەوێ، هەروەك لە (تحفه)و (الشروانی)دا ڕوون کراوەتەوە.

(قُلْتُ) ئیمامی (النواوی) دەفەرموێ: (إِنَّمَا يَحْصُلُ التَّحلُّلُ) حەلاڵبوون لە ئیحرام دێتە جێ، تەنها (بِالذَّبْحِ) بە سەربڕینی ئاژەڵەکەو هەم (وَنِيَّةِ التَّحلُّلِ) بە نیەتی خۆحەلاڵکردن لە کاتی سەربڕینی ئاژەڵەکەداو (وَكَذَا الْحَلْقُ) هەروەها بە سەرتاشینیش (إِنْ جَعَلْنَاهُ نُسُكاً) ئەگەر بە خواپەرستیی دابنێین.

ئینجا واجبە: سەرتاشینەکە بکەوێتە دوای سەربڕینی ئاژەڵەکە، بە بەڵگەی ئایەتەکەیڕابردوو، هەم ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما: خَرَجْنا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مُعْتَمِرِينَ فَحالَتْ كُفّـارُ

فَإنْ فُقِدَ الدَّمُ فَالأَظْهَرُ أَنَّ لَهُ بَدَلاً وَأَنَّهُ طَعَامٌ بقيمَة الشَّاة، فَإنْ عَجَزَ صَامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً، وَلَهُ التَّحَلُّلُ فِي الْحَالِ فِي الأَظْهَرِ وَاللهُ أَعْلَمُ.

---

قُرَيْشٍ دُونَ الْبَيْتِ فَنَحَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بُدْنَهُ وَحَلَقَ رَأْسَهُ –أَيْ بِالْحُدَيْبِيَةِ–﴾ رواه البخاري، لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بۆ عومرە چووینە (مكة)، بەلام كافرەكان ڕێگەیان لێگرتینو نەگەیشتینە (بَيْت)، ئینجا پێغەمبەرﷺ لە (اَلْحُدَيْبِيَة)دا ووشترەكانی سەر بڕینو سەری خۆی تاشی. واتە: (اَلْحُدَيْبِيَة) لە دەرەوەی زەمینی (حَرَم)ە.

ئینجا (فَإِنْ فُقِدَالدَّمُ) ئەگەر لە شوێنیقەدەغەكردندا ئاژەڵی خوێنەكە نەبو، یان پارەی نەبو، یان ڕێگەی نەدرایێ بیكڕێ (فَالأَظْهَرُ) بە فەرموودەی بەهێزتر: (أَنَّ لَهُ بَدَلاً) لەجیاتی خوێنەكە (فِدْيَة) هەیە (وَأَنَّهُ طَعَامٌ) ئەو (فِدْيَة)یەش دانەوێڵەیە (بِقِيمَةِالشَّاةِ) بە ئەندازەی نرخی مەڕەكە، یان بزنەكە لەو شوێنەدا، واتە: دانەوێڵەكە دەداتە هەژارەكانی ئەو شوێنە، ئینجا سەری دەتاشێ، هەم واجبە: لەگەڵ بەشكردنیدانەوێڵەو سەرتاشیندا نیەتی حەلاڵبوون بێنێ، هەروەك لە (تحفة)و (الشرواني)دا فەرموویانە.

(فَإِنْ عَجَزَ) جا ئەگەر توانای دانەوێڵەی نەبو: وەك دەستی نەكەوێ، یان پارەی نەبو بیكڕێ (صَامَ عَنْ كُلِّ مُدٍّ يَوْماً) واجبە: لەجیاتی هەر مستێكی دانەوێڵەكە ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ، جا لە هەر شوێنێكدا بەڕۆژوو ببێ دروست دەبێ، ئینجا (وَلَهُ التَّحَلُّلُ فِيالْحَالِ) لە حاڵەتی ڕۆژووگرتندا بۆی دروستە: هەر ئەودەم خۆی حەلاڵ بكا، واتە: پێش دەست پێكردنی بەڕۆژووبوون سەری بتاشێو لەگەڵ سەرتاشیندا نیەتی حەلاڵبوون بێنێ (فِي الأَظْهَرِ) لە فەموودەی بەهێزتردا (وَاللهُ أَعْلَم).

﴿ ئاگاداری ﴾ بە فەرموودەیەكیتری ئیمامی(الشافعي): ئەگەر لە شوێنیقەدەغەكردندا ئاژەڵیخوێنەكە نەبو، ئەوە لەجیاتیئاژەڵەكە دە ڕۆژان بەڕۆژوو دەبێ: وەك دە ڕۆژووەكانی خوێنی(تَمَتُّع)–حەجی بە لەززەت، جا بەم فەرموودەیەش–وەك فەرموودەكەی بەهێزتر– بۆی دروستە: هەر ئەو دەم پێش ڕۆژووگرتن خۆی حەلاڵ بكا، هەروەك لە (المجموع)و حاشیەی (عُمَيرة)دا ڕوون كراوەتەوە.

كەوابو: ئەو كەسەی ئیحرامی بەستوەو ڕێگەی نادەن حەجو عومرە تەواو بكاو یەكسەر لە فڕۆكەخانەكانو خاكی(حِجَاز) دەیگەڕێننەوە، مۆڵەتیشی نادەن دابەزێو (فِدْيَة) سەر بڕێ، دروستە: بۆ خۆێ (تَقْلِيد)ی ئەم فەرموودەیە بكاو بە نیەتی حەلاڵبوون–پێش ڕۆژووگرتن– سەریخۆی بتاشێو لەگەڵ سەرتاشیندا نیەتیحەلاڵبوون بێنێ، ئینجا دە ڕۆژەكان بە نیەتی(فِدْيَة) بەڕۆژوو ببێ، والله أعلم.

وَإذَا أحْرَمَ الْعَبْدُ بِلاَ إذْنٍ فَلِسَيِّدِهِ تَحْلِيلُهُ، وَلِلزَّوْجِ تَحْلِيلُهَا مِنْ حَجِّ تَطَوُّعٍ لَمْ يَأْذَنْ فِيهِ، وَكَذَا مِنَ الْفَرْضِ فِي الأظْهَرِ، وَلاَ قَضَاءَ عَلَى الْمُحْصَرِ الْمُتَطَوِّعِ، فَإنْ كَانَ نُسُكُهُ فَرْضاً مُسْتَقِرّاً بَقِيَ فِي ذِمَّتِهِ، أوْ غَيْرَ مُسْتَقِرٍّ اُعْتُبِرَتْ الأسْتِطَاعَةُ بَعْدُ،

---

(وَإذَا أحْرَمَ الْعَبْدُ بِلاَ إذْنٍ) هەر کاتێك کۆیلە بێئیزنی گەورەکەی ئیحرامی بەست: بە حەج، یان بە عومرە (فَلِسَيِّدِهِ تَحْلِيلُهُ) بۆ گەورەکەی دروستە: ئیحرامەکەی پێ حەڵاڵ بکا، واتە: فەرمانی پێبکا: سەری بتاشێو نیەتی حەڵاڵکردنی ئیحرامیش بێنێ، ئینجا لە (فِدْيَة)ی ئیحرام شکاندنەکەدا کۆیلەکە بەڕۆژوو دەبێ، هەروەك لە (الشرواني)دا ڕوون کراوەتەوە.

(وَلِلزَّوْجِ) هەروەها بۆ مێرد دروستە: (تَحْلِيلُهَا) ئیحرام بە ژنەکەی حەڵاڵ بکا (مِنْ حَجِّ تَطَوُّعٍ) لە حەجو عومرەی سوننەت، کە (لَمْ يَأْذَنْ فِيهِ) مێردەکە ژنەکەی ئیزن نەدابێ: حەج سوننەتەکە، یان عومرە سوننەتەکە بکا.

(وَكَذَا مِنَ الْفَرْضِ) هەروەها بۆ مێردەکە دروستە: ئیحرامی حەجو عومرەی واجبیش بە ژنەکەی حەڵاڵ بکا، ئەگەر ئیزنی نەدابێ (فِي الأظْهَرِ) لە فەرموودەی بەهێزتردا، چونکە حەرامە: ژن بە بێئیزنی مێردەکەی حەج بکا، هەروەك لە سەرەتای حەجدا ڕوونمان کردەوە، کەوابو: واجبە ژنەکە مەڕێك سەر ببڕێو نیەت بێنێو مووی سەری کورت بکا، جا ئەگەر ئاژەڵی دەست نەکەوت، ئەو کاتە وەکو قەدەغەکراوێرابردوو ڕەفتار دەکا، وَاللهُ أعْلَم.

(وَلاَ قَضَاءَ) قەزاکردنەوەی حەجو عومرە واجب نیە (عَلَى الْمُحْصَرِ) لە سەر ئەو کەسەی قەدەغەکراوە حەجو عومرە تەواو بکا (الْمُتَطَوِّعِ) کە حەجو عومرەکەی سوننەت بێ ﴿چونکە لە (الحديبية)دا هەزارو چوارسەد (صحابة) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ قەدەغەکران لە عومرە تەواوکردن، بۆ ساڵی داهاتووش تەنها دووری حەفتسەد (صحابة) لەگەڵ پێغەمبەرﷺ هاتنەوە بۆ عومرە کردن﴾. هەروەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا فەرموویانە.

بەڵام (فَإنْ كَانَ نُسُكُهُ فَرْضاً مُسْتَقِرّاً) ئەگەر حەجو عومرەکەی واجبێکی جێگیربوو بێ لە ئەستۆیدا: وەك لە پێش ئەم ساڵەیدا لە سەری واجب بوبێ، ئەوە (بَقِيَ فِي ذِمَّتِهِ) لە ئەستۆیدا هەر دەمێنێو واجبە: حەجو عومرەکە لە مەودوا بکا.

(أوْ غَيْرَ مُسْتَقِرٍّ) یان ئەگەر حەجو عومرەکە واجبێکی جێگیربوو نەبێ: وەك هەر لەم ساڵەیدا حەجو عومرەی لە سەر واجب بوبێ، ئەوە (اُعْتُبِرَتِ الأسْتِطَاعَةُ بَعْدُ) ڕەچاو دەکرێ لەمەودوا توانای حەج کردنی ببێ، ئینجا لە سەری واجب دەبێتەوە حەجو عومرەکە بکا.

وَمَنْ فَاتَهُ الْوُقُوفُ تَحَلَّلَ بِطَوَافٍ وَسَعْيٍ وَحَلْقٍ، وَفِيهِمَا قَوْلٌ، وَعَلَيْهِ دَمٌ وَالْقَضَاءُ.

## ﴿ له دهستچوونی وهستانی(عَرَفات)﴾

(وَمَنْ فَاتَهُ الْوُقُوفُ) ههر کهسێك وهستانی(عَرَفات)ی لێفهوتا، واته: وێرانهگهیشت بچێته (عَرَفات) تا بهیانیی ڕۆژی جهژن دهرکهوت، جیاوازی نیه: عوزری ههبوبێ، یان نا، له گشت حاڵهتێکدا (تَحَلَّلَ) واجبه: یهکسهر ئیحرامیخۆی حهڵاڵ بکا؟ چونکه ئیحرامیساڵێك بۆ ساڵێکیتر نابێ، ههروهك له (تحفة)دا فهرموویهتی.

جا ئهگهر بگونجێ، ئهوه واجبه به کردهوهکانیعومره خۆی حهڵاڵ بکا، واته: (بِطَوَافٍ وَسَعْيٍ وَحَلْقٍ) به تهواف کردنو هاتوچۆی نێوان سهفاو مهڕوهو سهرتاشین.

بهڵام ئهگهر نهگونجا تهوافو (سَعْي) بکا، ئهو کاته-وهك قهدهغهکراوی‌ڕابردوو-خۆی حهڵاڵ دهکا: به سهربڕینی ئاژهڵو نیهتی خۆحهڵاڵکردنو سهرتاشین، ههروهك له (تحفة)و(الشرواني)دا ڕوون کراوهتهوه.

جا بزانه: ئهم کردهوانهیعومره-که به هۆی لهدهستچوونی وهستانی(عَرَفات) دهکرێن- بهر عومرهی ڕوکنیئیسلام ناکهوێ، ههروهك له زۆربهی سهرچاوهکاندا فهرموویانه، (وَفِيهِمَا قَوْلٌ) دهربارهی (سَعْي)و سهرتاشین فهرمودهیهك ههیه: که بۆ حهڵاڵبوونی ئیحرام پێویست نینه.

(وَعَلَيْهِ دَمٌ) ئهو کهسهی وهستانی(عرفات)ی لهدهست چووه، خوێنی له سهره، ههم (وَالْقَضَاءُ) واجبه: حهجهکهشی قهزا بکاتهوه، جیاوازی حهجی واجب و سوننهت نیه، ههروهك له (شرح المَحلِي)و (شرح المَنْهَج)دا فهرموویانه.

جا بزانه: ئهو خوێنهی فهوتانی(عرفات) له ساڵی قهزاکردنهوهی حهجهکهدا دهدرێ، بهم جۆره: ههر کاتێك ئیحرامی به حهجیقهزاکراوه بهست، واجبه: مهڕێك، یان بزنێك سهر ببڕێ، جا ئهگهر دهستی نهکهوت، ده ڕۆژان بهڕۆژوو دهبێ: سێ ڕۆژان له حهجی قهزاکراوهداو حهفت ڕۆژیش که له حهجیقهزاکراوه گهڕاوه، به بهڵگهی:

﴿عَنْ سُلَيْمانَ بن يَسارٍ﷽: جاءَ هَبّارُ بن الأَسْوَدِ يَوْمَ النَّحْرِ فَقالَ: يا أَميرَالْمُـؤمنينَ أَخْطَأْنـا الْعِدَّةَ كُنّا نَظُنُّ أَنَّ هَذاالْيَوْمَ يَوْمُ عَرَفَةَ؟ فقال: عُمَرُ﷽: اذْهَبْ إلى مَكَّةَ فَطُـفْ أَنْـتَ وَمَـنْ مَعَكَ، وَاسْعَوْا بَيْنَ الصَّفا وَالْمَرْوَةِ وَانْحَرُوا هَدْياً إنْ كانَ مَعَكُمْ، ثُمَّ احْلقوا أَوْ قَصِّـرُوا، ثُـمَّ ارْجِعُوا، فَإذا كانَ عامٌ قابِلٌ فَحُجُّوا وَأَهْدُوا، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيامُ ثَلاثَةِ أَيامٍ فِيالْحَجِّ وَسَـبْعَةٍ اذا رَجَعَ﴾ رواه الامام مالك باسناد صحيح وروى نحوه الامام الشافعي والبيهقي باسنادين صحيحين، (هبار) له ڕۆژی جهژنیقوربانـدا هاته لای ئیمامی(عُمَر)و گوتی: له ژمارهی ڕۆژهکاندا ههڵهمان کردبو، واماندهزانی ئهمڕۆ ڕۆژی عالفهیه-واته: وهستانی (عَرَفات)

........................................................................................

فەوتا– جا ئیمامی (عُمَر) فەرمووی: خۆتو هاوڕێکانت بڕۆنە (مَكّة)، تەواف بکەنو (سَعْي) نێوان سەفاو مەروە بکەنو ئەگەر ئاژەڵی دیاریتان پێیە سەری ببڕن، ئینجا سەری خۆتان بتاشن، یان مووەکانی کورت بکەن، ئینجا بگەڕێنەوە وولاتی خۆتان، جا هەر کاتێك ساڵیداهاتوو کاتی حەج هات، وەرنەوە حەج بکەنو ئاژەڵێك لەو حەجەدا سەر ببڕن، جا هەر کەسێك ئاژەڵەکەی دەست نەکەوت، با سێ ڕۆژان لەو حەجەدا بەرۆژوو بێو حەفت ڕۆژانیش هەر کاتێك گەڕاوە بۆ وولاتیخۆی...کۆتایی.

الحمد لله، لێرەدا–بە تەواوبوونی پەڕتووکی حەجو عومرە– بەرگی دووەمی ﴿ ڕووناکی (رَبُّ الْعالَمِين) ڕوونکردنەوەی (مِنْهاجِ الطَّالِبِين)﴾ کۆتایی هات، لە شەوی پێنج شەممە (١٦)ی (محرم)ی ساڵی (١٤٢١)ی کۆچی، إن شاء الله، بەرگی سێیەمی بەدوادا دێ: کە بە (كِتَابُ الْبَيْعِ: پەڕتووکی کڕینو فرۆشتن) دەست پێدەکا، لە خوایگەورە دەپاڕێمەوە: هێزو توانام بداتێ بۆ تەواوکردنی ڕوونکردنەوەی هەموو (مِنْهاج)ی ئیمامی (النَّوَوِي) رحمه الله تعالی، منیش بەندەی بێچارەو گوناهبار: (عبدالله عبدالعزیز هەرتەلی)م، خودا لە خۆمو لە دایكو باوکمو لە خۆشەویستەکانم خۆش ببێ، آمین، وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَآلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين وَالْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعالَمِين وَلاحَوْلَ وَلا قُوَّةَ الاّ بِاللهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيم

هەولێر– کوردستان

١٦ ی محرم– ١٤٢١ی کۆچی.

٣١ ی خاکەلێوە– ٢٧٠٠ی کوردی.

٢٠ ی نیسان– ٢٠٠٠ی زایینی.

## شارەزاکردن:

## ئەی خوێنەری بەڕێز، هەر کاتێك دانەر دەڵێ:

* رواه الشيخان، مەبەستی ئیمامی (البخاري و مسلم)ن.

*رواه اصحاب السنن، مەبەستی ئیمامی (أبوداود و النسائي و الترمذي)ن.

* هەروەك لە سەرچاوەکاندا فەرموویانە، یان ڕوون کراوەتەوە، مەبەستی ئەم چوار کتێبەنە:

١ -(المجموع: شرح المهذب) دانراوی (الإمام النواوي).

٢ -(تحفةالمحتاج: شرح المنهاج) دانراوی (الإمام إبن حجرالهيتمي).

٣ -(نهايةالمحتاج: شرح المنهاج ) دانراوی (الإمام محمدالرملي).

٤ -(مغنيالمحتاج : شرح المنهاج) دانراوی (الإمام محمد الخطيب الشربيني).

جا ئەگەر یەکێك لەو چوارانە لە گەڵدا نەبێ، ئەو کاتە دەڵێ: هەر وەك لە زۆربەی سەرچاوەکاندا...

## ئەی قوتابیی خۆشەویست و ڕێزدار، تکایە:

**١- پێشەکیەکەلە بەرگی یەکەمدا بە بیرلێکردنەوەیەکی ورد بخوێنەوە.**

**٢- بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە پشت مەبەستە بە تەنها زانستیخۆت، بەڵکو لە لای مامۆستایئایینی بیخوێنە، چونکە چەند پێناسەو زاراوەیەکی شەرعی هەنە، لە لای مامۆستای ئایینی باشتر لێی تێدەگەی.**

## *دانراوەکانیتری دانەر:

١ - هـۆنـراوەی ﴿ ئیمان و ئیسلام ﴾

٢ - ڕوونکردنەوەی ﴿ الأربعين النواوية ﴾

٣ - ﴿ عـەقـیدەی ئیسـلامـی ﴾

٤ - ڕوونکردنەوەی ﴿ العقيدةالطحاوية ﴾

٥ - چەند گوڵێك لە ﴿ گوڵزاری ئیسلام ﴾

٦ - ڕوونکـردنەوەی ﴿ متن فتح القريب ﴾

٧ - ڕوونکردنەوەی ﴿ قطرالعارض فى علم الفرائض ﴾

٨ - چۆنیەتی ﴿ حەج و عومرە ﴾

# ناوەڕۆكی بەرگی دووەمی ﴿ ڕووناكی(رَبّ العالَمين)﴾

# ناوەڕۆکی بەرگی دووەمی ﴿ڕووناکی(رَبُّ الْعالَمين)﴾

## دەربارەی شەریعەتی ئیسلام

١- خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلاَ نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ ﴾ (التوبة:١٢٢)، واتە: دەبوا لە هەر هۆزێکی موسوڵمانان کۆمەڵێك ڕاپەڕیبان بۆ (جهاد)کردنو کۆمەڵێکیش بۆ خوێندن، تاکو لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن.

٢- پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێ: ﴿ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ﴾ رواه البخاري و مسلم، واتە: هەر کەسێك خوای گەورە بیەوێ چاکەی بداتێ، لە (شەریعەتی ئیسلام) تێیئەگەێنێ.

٣- ئیمام (عمر بن الخطابt) دەفەرموێ: ﴿ تَفَقَّهُوا قَبْلَ أَنْ تُسَوَّدُوا، فَمَنْ سَوَّدَهُ قَوْمُهُ عَلَى فِقْهٍ، كانَ حَيَاةً لَهُ وَلَهُمْ ﴾ رواه الدارمي، واتە: لە (شەریعەتی ئیسلام) تێبگەن پێش ئەوەی بکرێنە گەورە، چونکە هەر کەسێك (شەرع) بزانێو گەلەکەی خۆی بیکاتە گەورە، ئەبێتە هۆی ژیانێکی خۆش بۆ خۆیو بۆ ئەوان.

٤- ئیمام (الأعمش) دەفەرموێ: ﴿ يَا مَعْشَرَ الْفُقَهاءِ أَنْتُمُ الأَطِبَّاءُ وَنَحْنُ الصَّيَادِلَةُ ﴾ رواه الصيمري، واتە: ئەی چینی (شەرعزانان) ئێوە پزیشکن، ئێمەی (حەدیس گێڕەوەش) دەرماننناسی دەرمانخانەین.

٥- ئیمام (الشافعي) دەفەرموێ: ﴿ مَنْ حَفِظَ الْفِقْهَ عَظُمَتْ قِيمَتُهُ وَمَنْ تَعَلَّمَ الْحَدِيثَ قَوِيَتْ حُجَّتُهُ ﴾ رواه ابن حجر الهيتمي، واتە: هەرکەسێك لە (شەریعەتی ئیسلام) شارەزا بێ، نرخی بەرز ئەبێتەوەو هەر کەسێك (حەدیس) فێر ببێ، بەڵگەی بەهێز دەبێ.

٦-ئیمامی (البخاري) دەفەرموێ: ﴿ هُوَ-أَيَ الْفِقْهُ- ثَمَرَةُ الْحَدِيثِ، وَلَيْسَ ثَوابُ الْفَقِيهِ دُونَ ثَوابِ الْمُحَدِّثِ ﴾ رواه القسطلاني، واتە: (شەریعەتی ئیسلام) بەرهەمی حەدیسە، پاداشتی (شەرعزان) کەمتر نیە لە پاداشتی (حەدیس گێڕەوە).